# ئینسایكلۆپیدیای كەركوك



## ئەدەب و ڕۆشنبیریی لە دەڤەری كەركوك

- خوێندن و پەروەردە لە كەركوك
- ئەدەب و ڕۆشنبیری لە ناوچەی كەركوكدا
- مێژووی زار و زاراوەكان لە كەركوك

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە
سمكۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی نۆیەم



# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی نۆیەم

## ئەدەب و ڕۆشنبیریی لە دەڤەری کەرکوک

- خوێندن و پەروەردە لە کەرکوک.
- ئەدەب و ڕۆشنبیری لە ناوچەی کەرکوکدا.
- مێژووی زار و زاراوەکان لە کەرکوک.

سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

٢٠٢٣

بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
زنجیرە: (١٤٦)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

**ناوی کتێب: ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک- بەرگی نۆیەم: خوێندن پەروەردە لە کەرکوک - ئەدەب و ڕۆشنبیری لە ناوچەی کەرکوکدا - مێژووی زار و زاراوەکان لە کەرکوک**
**نووسینی: کۆمەڵێك نووسەر**
**سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)**
**سەرپەرشتیاری زانستی و ئەکادیمی: د. یوسف گۆران**
**سەرپەشتیاری کارگێڕی: زاهیر شکور**
**دیزاینی ناوەوە: ئەنجام سەعید**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**تایپ: زەینەب حەمید**
**نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٣**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**چاپ: چاپخانەی تاران**

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی**
**(٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی نۆیەم

## ئەدەب و ڕۆشنبیریی لە دەڤەری کەرکوک

- خوێندن و پەروەردە لە کەرکوک.
- ئەدەب و ڕۆشنبیری لە ناوچەی کەرکوکدا.
- مێژووی زار و زاراوەکان لە کەرکوک.

### بەشداران


د. دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان
ئاریان جەمال هەرزانی
ئەحمەد باوەڕ (ئەحمەد محەمەد ناسر)
محەمەد شاکەلی
سەربەست کەرکوکی
مەلا محەمەد مەلا ساڵح گونبەدی
غازی حەسەن
دانا عەسکەر
شێرزاد عەبدولڕەحمان
حەسەن جاف
ئازاد ئەحمەد ئەسوەد
هاشم عاسی کاکەیی
سەرکەوت عەبدوڵڵا حوسێن
عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی
فاروق مستەفا
جەمال نووری
سیروان سەمین ئەحمەد
سامان کەریم
د. ڕەفیق شوانی
د. دڵشاد عوسمان
د. عەدنان هەریر ئەلشجویەری
د. مارف خەزنەدار
د. محەمەد کەساس
حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ
حەمید عەبدوڵڵا ساڵح
شاکر فەتاح
ئارەزوو نووری
فەرهاد عەبدولعەزیز
ستار کەریم سەعید
سمکۆ بەهرۆز
لەتیف فاتیح فەرەج
مستەفا ساڵح کەریم
عەبدولستار جەباری
لەتیف هەڵمەت
بوار نورەددین


٢٠٢٣

# بەشی یەکەم

## خوێندن و پەروەردە لە کەرکوك

سمکۆ بەهرۆز

تاکو ئێستاکە هیچ بەڵگەیەکی شوێنەواری ئەوتۆ نەدۆزراوەتەوە ئەو ڕاستییە یەکلا بکاتەوە یاخود تاوتوێی ئەو بوارە بکات کە باس لە چۆنییەتی زمانی ئەو نەتەوانەی سەردەمی چاخە بەردینەکان بخاتەڕوو، بەڵام ڕێی تێناچێت کە خاوەنی ئەو شارستانیانە زمانێکیان نەبووبێت تاوتوێی کارەکانی ڕۆژانەیانی پێ کردبێت، یان بە بارێکی تردا بڵێین ئەو ئاوازە دەنگییەو جوولەیە چی بووە هەموویانی پێکەوە گرێ داوەو ئاخافتنیان پێی کردبێت.

گۆڕانکاری چاخە بەردینەکان هەنگاو بە هەنگاو ئەو ڕاستییەی یەکلا کردووەتەوە کە بتوانێت پێشکەوتن لە هەموو بوارەکاندا بەدەس بهێنێت کە پێشکەوتنی زمان‌و گۆکردنی دەوری هەبووە لەبەرەو پێشچوونی بنەماکانی لێکگەیشتن.

ئەوەی لە چاخە بەردینەکان بۆمان بەجێ ماوە یان دەوری بینیوە لە تێگەیشتنی مادی بۆ شتەکان تەنها ئەو کەرەستە بەردینانەیە کە بە کاریان هێناوە لەبەرەو پێشچوونی ژیانیان زیاتریش ئەو کەرەستانەی لەناو ماڵ‌و پیشە کشتوکاڵییەکاندا بەکارهاتووە لەسەر بنەمای گونجاندنی ژیان یان هەوڵدان بۆ ئەوەی بتوانرێت ژیان بخاتە سەر بارێکی هاوگونجاو، بەڵام تاکو ئێستاکە هیچ بەڵگەیەکی سادەی ئەو کەرەستە بەردینانەمان بەدەست نەگەیشتووە تاکو ئەو ڕاستییە بسەلمێنێت تا چەندێك توانیویانە دەرهاویشتەی ئاوەزی خۆیان بخەنە دوو توێی کەرەستە بەردینەکانەوە، هەموو ئەو کەرەستە بەردینانەش کە بەجێماون یان قۆناغێك لە قۆناغەکاندا هەندێکیان نەخش‌و هێڵی جۆر بەجۆریان تێدایە لەوانەیە هێمایەکی ئاوەزی بێت بۆ تێگەیشتن لەمەڕ دەربڕینی ئەو زمانەی کەبەکاری هێناوە. پێشکەوتنەکانی بواری ژیانی مرۆڤ لەچاخە بەردینەکان لەیەك بواردا چەقی نەبەست‌و بەستەڵەکی گۆڕانەکانی بە هەموو لایەکدا تەفرو تونا کرد توانی بیرکردنەوەکانی فراوان بکات کە هەندێ جار دەربڕی ئەو بیرکردنەوانە ڕەنگی داوە لە هێماکانی نەخش‌و نیگارو هێڵ‌و تواناکانی بەر جەستەکردنی ڕەنگ، لەوانەیە لەسەردەمانێکدا توانایەکی بەهێز بووبێت بۆ دەربڕینی ئاخاوتنەکانی تا بتوانێت تێبگات لەدەوروبەرەکەی یان ئاماژە بەدەنگەکان بدات لەتوانای ڕەنگدانەوەی هێڵ‌و نەخش‌و ڕەنگەکان. هیچ کاتێك ڕێی تێناچێت خەڵکی چەرموو یاخود مەتارە یاچاتاڵ هۆیۆك یا جایۆنۆ یا گەنجدارە یا بەردە بەڵکە یان پاڵە گەورە زمانێك یاخود هێمایەك نەبووبێت ڕایەڵەی پەیوەندییەکانی ڕۆژانەیانی پێکەوە گرێ دابێت.

*** گەشە کردنی نووسین‌و زمان لەسەردەمە مێژووییەکاندا :-**

جیاوازییەك کە هەبێت لەنێوان چاخە بەردینەکان‌و ماوە مێژووییەکاندا خۆی دەبینێتەوە لەپێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری‌و بازرگانی و تەلارسازی‌و ئاییندا لەپاڵ سەرهەڵدانی یان گەشەکردنی زمان‌و نووسین لەو سەردەمانەدا، سەردەمە مێژووییەکان ئەو وەرچەخانە بوو توانی بیرکردنەوەی ئاوەزی مرۆڤ فراوان بێت‌و پەی بە شتە گرنگەکان بدات لەدیاری کردنی تێگەیشتن بۆ ئەو شتانە، ئەویش لەسەر بنەمای هەوڵدان بۆ وەرگرتنی ڕاستی‌و دروستی ئاوەزەکانی لێکگەیشتن. سەردەمە مێژووییەکان مرۆڤی خستە سەر ڕێچکەیەك کە هەوڵ بدات یان دەبێت خۆبگونجێنێت لەگەڵ پێشکەوتنی پێویستییەکانی سەردەم بۆ چاکتر کردنی، باری ژیانی خۆی. گەورەترین شتێك کەلەسەردەمە مێژووییەکاندا وەرچەخانی دروستکرد گۆڕان بوو بۆ تێگەیشتن لە ئایین‌و داهێنانی نووسین، بەتایبەتی نووسینی بزماری‌و وێنەیی لەپاڵ پێشکەوتنی لەهونەری بیناکاری‌و هەوڵدان بۆ پێشکەوتن لەبوارەکانی بازرگانی و ئاڵو وێرە بازرگانییەکان. قوڕ کۆنترین کەرەستەیە کە تاکو ئێستا کە بەکار هێنرا بێت لەسەر هەڵدانی نووسین‌و بەکارهێنانی ڕەقیمە قوڕییەکان لە نووسینی بزماریدا. بەکارهێنانی (قوڕی تەڕ)و قەڵەمی قامیش بۆ نووسین دەوری گەورەیان بینی بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بەشێوەیەکی ئاسان‌و لەبار نووسینی پێ بکات.

لە سەرەتای خەتی بزماریدا، قەڵەمی نووسینی پێك هاتبوو لە قەڵەمی داری، کە سەرێکی سێ سووچی هەبوو لە سەرەتای زووی مێژوو باریك بووە، ئەم بەکارهێنانە بەردەوام بووە تا بەکار هێنانی خەتی بزماری، زۆربەی ڕەقیمە قوڕییەکانی پاشایەتی کۆتایی هاتووە بەمۆری لوولەکی پاشایەتی، کە لە دار یان لە قوڕی سوورەکراو هەڵکەنراوە کە هەڵکەندنەکەی بەشێوەی پێچەوانە بووە.

ڕەقیمە قوڕییە سادەکان سوور نەکراوەتەوە، بەڵام ئەو ڕەقیمە قوڕییانەی کە گرنگو پێویست بووە لەنێو ئاگر سوور کراوەتەوە، کەپلەیەکی گەرمی دیاری کراو تا بەوەی بتەوی خۆی بپارێزێت. ئەوەی جێگەی گووتنە هێما بزمارییەکان، لەسەرەتادا لەشێوەی وێنەییدا بووە، پێویستی ئەو بابەتە بەکار هێنراوە کە مەبەستیان بووە، بەڵام قەڵەمی سێ سێگۆشەیی، کاری دروستکردنی هێڵەکان بووە بە وێنەیی لەسەر شێوەی بزمار بۆیە خەتەکەش بەو ناوە بەناوبانگ بووە، پێکهاتەکانی کۆنترین هێمای بزماری دووجۆر، لەنیشانە وێنەییەکان، بەشێکیان ئەو هێمایانەن لەشێوەی وێنەدا، هەوڵدان بۆ نووسینی هەرشتێك وێنەکەی کێشراوە، ئەم جۆرەیان دەگمەنەوە تایبەتە لەسەر ئەو شتە تایبەتانە کە ویستوویانە بینووسن وەکو شێرو بزنی کێویو گەلێکی تر. بەڵام جۆری دووەم ئەو هێما بزمارییانەن کە وێنەی دیاریکراوە لەسەر شێوەی بنەڕەتییەکەیو دەسکاری شێوە بنەڕەتییەکە کراوە.

ئەوەی جێگەی شك نییە سۆمەرییەکان نووسینی بزمارییان داهێناوە کە وەریانگرتووە لەنووسینێکی تر لەپێش سەر هەڵدانی نووسینی بزماری، ئەم جۆرە هێما بزمارییانە لە هەندێك جاردا هێمای وێنەیی هەیە کە هیچ پەیوەندی لەگەڵ ئەو وێنەیەی کە پێویستە بنووسین، وەکو ئەوەی کاتێك وێنەیەی بەرخیان کردووە، کەوانە یەکیان کردووەو دوو هێڵی دژ بەیەکیان تێدا کشاوە هەر لەم ڕووانگەیەوە دەبینین جیاوازی هەیە لەنێوان نووسینی بزمارییو نووسینی هیرۆگلۆفیدا، ئەویش لەچۆنییەتی بەکار هێنانی هێما بزمارییەکان بەشێوەیەك کە زۆر لە بنەڕەتی خۆی دوور کەوتووەتەوە، بەڵام لە خەتی هیرۆگلۆفیدا، هەستاون بەنووسینی ئاژەڵەکان تەنها بەکێشانی وێنەکانی. هەروەها لەهەمان کاتدا قەڵەمی دار سەر سێ سووچ دەوری گرنگی هەبووە لەوەی کەلەهەندێك باردا نەتوانرێت سووچی چەماوە بکێشرێت لەبەر ئەوەی توانای قەڵەم، ڕێگربووە لەکێشانی بە شێوەیەکی ڕێكو پێك.

"سۆمەرییەکان یەکێکە لەو نەتەوانەی کە زۆر لەکۆنەوە لە میزۆپۆتامیا نیشتەجێی بوونە، سەرچاوە کۆنەکان ناویان بە سۆمەرییەکان هێناوە، بەڵام دەربارەی بنەڕەتو حەقیقەتی ئەم نەتەوەیە لێکۆڵێرەوەکان گەلێك بابەتو لێکۆڵینەوەیان نووسیووەو لەو باوەڕەدان کە ئەمانە دانیشتوانی عێراق نینو لە ناوچەیەکی ترەوە کۆچیان کردووە بەرەو خواروو ناوەڕاستی عێراق، بەڵام زۆربەی سەرچاوەکان لەو باوەڕەدان لە سەرووی عێراقەوە هاتوونەتە بەشی خواروی عێراق لە شێوەی کۆمەڵ.. کۆمەڵ ئەویش بەهۆی زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان لەو ناوچانەی کە تێیدا ژیاون، بەتایبەتی لە سەردەمی شارستانی (سامەرا)و (حەلەف)، ئەویش لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە هاوگونجاو نەبووە لەنێوان ئەو بەرهەمەی بەدەستیان هێناوە لەگەڵ زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوانیاندا، بۆیە بیریان لە کۆچکردن کردووەتەوە هەر کۆچکردنێکیش کۆچکردنی"[1] تری بەدواوە هاتووە.

بەکارهێنانی خەتی بزماری لە دەوری ساڵی (٣٠٠٠) پێش زاینی بەکارهاتووە تا سەرەتاکانی لەدایکبوونی مەسیح کە ماوەی سێ هەزار ساڵی خایاندووە، دوا ڕەقیمی قوری کە پێمان گەیشتووە لە ساڵی (٥٠) ی زاینی بووە "[2] پێویستە ئەوەش بڵێن لە پاڵ سەر هەڵدانی خەتی نووسینی ئارامی لە نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی پێش زاینو سەر هەڵدانی خەتی ئەغریقی لە سەردەمی هیلنستی بوو بەهۆی کەم کردنەوەی بەهای خەتی بزماری پارچەیی، بۆیە تەنها بەکارهێنانی وەستایە سەر ئەو ئەستێرە ناسە بابلیانە بۆ تۆمارکردنی سەرنجەکانیان لەسەر ئەستێرە لە زانستی ئەستێرە ناسییدا کە لەو سەردەمەدا لە زاراوە سازی بابلییەکاندا بەناو بانگ بوو یا بەکارهێنانی دەوری مابوو.

هەموو لێکۆڵەرەوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە سۆمەرییەکان یەکەم کەس بوونە نووسینیان داهێناوەو لە دوایدا هەریەکە لە ئەکەدیو بابلیو ئاشورییەکان سوودیان لەو داهێنانە وەرگرتووەو، بایەخیان بە پێشکەوتنی زمانەکانی خۆیان داوە، هەروەها خەتی بزماری لەهەر یەك لە وڵاتی عیلام کە دەکاتە بەشی خوارووی ئێرانو عەرەبستانو ئەهواز، هەروەها حیسییەکانیش سوودیان لێ بینیوەو لە وڵاتی شام بڵاویان کردووەتەوە، بەڵام ئەخمینییەکان داهێنانێکی تریان داهێنا کە جۆرێکی هاوشێوەیە لە نووسینی (هیجائی) و داستانەکانیانی پێ نووسراوەتەوەو ئەکەدییەکان هەستان بە داهێنانێکی تر ئەویش بەهەندێ گۆرانکاری لە نووسینی خەتی بزماری بۆ ئەوەی هاو گونجاو بێت لەگەڵ نووسینی زمانەکەیان کە هیچ پەیوەندییەکی بە زمانی سۆمەرییەوە نییە.

زمانی سۆمەریو بابەتەکانیان مایەوە تا کۆتایی سۆمەرییەکانو لەماوەی دەسەڵاتی بابلییەکانیشدا بەتایبەتی لەسەردەمی بابلی کۆندا زمانی سۆمەری زمانی زانست بووە لە تۆمارکردنی لێکۆڵینەوەکاندا لەپاڵ هەر یەکە لە زمانی بابلیو ئاشورییەکاندا. بۆیە هەریەکە لە زمانی سۆمەریو بابلی دوو زمانی هاوبەش بوونە کە تاماوەیەکی زۆر لە ماوە مێژوویەکانی عێراقی کۆندا بە کار هێنراوە"[3].

سۆمەرییەکان بەپێی ئەو بەڵگە نوێیانەی کە لەم ساڵانەی دوایدا دۆزراوەتەوە یاخود هەندێك لەو بەڵگانەی لەوەو پێشدا ئامارەی پێکراوە ئەو ڕاستییە دەخەنە ڕوو کە سۆمەرییەکان لە کوردستانەوە کۆچیان کردووە، لە ناوچەکانی کوردستان بەرەو خواروو و ناوەڕاست، بۆیە ئەو داهێنانەی کە سۆمەرییەکان کردیان سەر لەبەری هەموو هزری خەڵکی کوردستان بووە لەوێوە پریشکی هاویشتووە بەرەو ناوچەکانی ترو داهێنەکانیان کەلەکە بوون، هەموو توانای مرۆڤی ئەو ناوچانە بووە کە شارستانییەتیان تێدا

گەشەی کردووە. داهێنانی سۆمەرییەکان لە بواری خوێندنو نووسیندا داهێنانێکی گرنگ بووە لە هەموو خەڵکی ناوچەکانی دەوروبەر بەشداریان کردووە. لە پێگەیشتنو پێشکەوتنی بەرهەمەکانی داهێنان کەرکوکیش بەشێکی گرنگی بووە لە بەر کەوتنی ئەو پشکە گەورەیەی داهێنان لە خزمەت مرۆڤایەتی.

*** ڕەقیمە قوڕییەکانی نوزیو کوروخانی ناوچەی کەرکوك لە سەردەمی (هوری- میتانییەکان):-**

نوزی ناوچەیەکی ئاوەدانی سەردەمی (هوری-میتانییەکان) بووە لە دووری (١٢) میل کەوتووەتە خوارووی ڕۆژئاوای کەرکوکەوە یان لە دووری دوو میل لە خوارووی ڕۆژئاوای گوندی ترکەڵانەوە کە بەناوبانگە بە (یۆرغان تەپە – وێران شار).

لە کاتی خۆیدا کۆمەڵێك خەڵکی ناوچەکەیان، بازرگانی کرینی شوێنەوار، هەستاون بەکنەو پشکنینی شوێنەوار بەشێوەیەکی نا دروستو نا زانستیانە لەکاتی خۆیدا گەلێك ڕەقیمی قوڕی گەورەیان دۆزیوەتەوە کە بەخەتی بزماری نووسراوەو بەشێکی زۆریان بە بازرگانو شوێنەوار فرۆشتووەو لەناو چووە، هەموو ئەوانە رووی داوە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو لەسەرەتای سەدەی بیستەم.

لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٢٥) تا (١٩٣١) گەلێك هەڵکۆڵینو بە دوادا گەڕان لە ناوچەی نوزی کراوە، کۆمەڵێك زاناو شوێنەوار ناسی بەناوبانگ کاریان تێدا کردووە نموونەمان وەك (ئەدوارکیرا – سپیزەر – ستار – ولنسکی – وترمان) و گەلێکی تر توانیان لە ماوەی هەڵکۆڵینو بەدوادا گەڕاندا گەلێك پاشماوەو شاراوەی نهێنی بدۆزنەوە کە مێژووی ئەم ناوچەیەو دانیشتوانە کۆنەکانی دیاری دەکات، کە تیایاندا بە هەزاران ڕەقیمی قوڕی جۆر بە جۆر دۆزراوەتەوە لەدوای هەڵکۆڵینو دۆزینەوەدا گەلێ لەم پاشماوە ڕەقیمە قوڕیانە گوازراونەتەوە بۆ مۆزەخانەکانی عێراقو مۆزەخانە جۆر بە جۆرەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا وەکو مۆزەخانەی بەریتانیاو لۆڤەرو بەشێك لە دەزگا شوێنەوارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

لە دوای دۆزینەوەی ئەم ڕەقیمە قوڕیانە زانایانی شوێنەوار، هەستان بەخوێندنەوەی ئەم دەستنووسە کۆنانە کە بە زمانی بزماری نووسراوەتەوە، هەروەك هەستاون بە بڵاوکردنەوەو وەرگێرانی بۆ سەر زمانەکانی خۆیانو پشتڕاستکراوەتەوە بە گەلێك بەڵگەو لێکۆڵینەوەو مێژووی جۆر بە جۆر. زۆری پاشماوەکانی ئەم ڕەقیمە قوڕیانە دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی سەدەی پازدەهەمی پێش زاینی کە هەندێك لەمانە ناوی نوزی بووە بە (گاسور) لە سەردەمی ئەکەدییەکان لە هەزارەی سێیەمی پێش زاین هەروەها لە چینەکانی ژێرەوەی کۆنی نوزی گەلێك رقیمی کۆن دۆزراوەتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی پێش هەزارەی دووەمی پێش زاین.

ژمارەی ئەو ڕەقیمە قوڕیانەی کە لە نوزی دۆزراوەتەوە زیاتر لە (٤٠٠٠) ڕەقیمی قوڕی دەبێت، بابەتی نووسینەکانی جۆراو جۆرەو دەگەینە ئەو ڕاستییەی کەبابەتەکانی هاو پەیوەستی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئەو ناوچەیە بووە دەربارەی کاروباری خێزانو کاروباری یەکە کارگێڕیو یەکە بەڕێوبەرەکانی دەوڵەتو بوارەکانی کڕینو فرۆشتنو باری کۆمەڵایەتی خەڵکی (هوری-میتانی) باجو جۆرەکانی دارشتنی باج لەسەر بنەمای یاساکانی ئەوکاتەی ئیمبراتۆرییەتی (هوری-میتانییەکان) بووە. لەم دواییدا ڕۆژهەڵاتناسەکانو ئەوانەی کە بەدوای شوێنەواردا دەگەڕێن توانیان گەلێك یاسای کۆنی جۆراو جۆر لە ڕەقیمە قوڕییەکانی نوزی بدۆزنەوە کە هاوشێوەی یاسا کۆنەکانی ئەو کاتە بووە، هەندێکی تۆمارکراوە دەربارەی کاروبارەکانی دادگاو دادنووسەکانی نوزی، هەندێك ڕەقیمی قوڕی تایبەت بە یاساکانی سزادانو دزی.

زۆری ئەو ڕەقیمە قوڕیانەی کە لە نوزی دۆزراوەتەوە تایبەتمەندی بازرگانیو یاساییو کارگێڕی پێوە دیارەو ئەگەر زیاتر بچینە نێو بابەتەکانەوە دەبینین گەلێ بڕیاری گرنگی دادگاو داواکاری یاسایی تێدایە لەگەڵ دەستنووسی هاوپەیوەست بە (سەر بە سەر)، هەروەها گەلێك نامەی جۆر بە جۆری تێدایە دەربارەی پەرستگاکانو خشتەی کرێی ناوی ئەو کرێکارانەی کە لە پەرستگاکانی نوزیدا کاریان کردووە لەگەڵ خشتەی تری ڕاگەیاندراوە دەربارەی کەرەستە گرنگەکانی گواستنەوەی موڵکدارێتی لە نێو بنەچەی خێزانەکەی نوزیدا بەتایبەتی ئەوانەی کە لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زاین تۆمارکراوە.

ئەم ڕەقیمە قوڕیانەی نوزی گرنگەیەکی گەورەی هەیە بۆ مێژوو نووسەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆن ئەوانەی لێکۆڵینەوەی مێژووی دەنووسن دەربارەی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی، گرنگی ئەم ڕەقیمە قوڕیانە لەوەدایە کە لەپاڵ بەکارهێنانی بێژەتی ئەکەدیدا جۆرەها بێژەتو وشەی هوری تێدایە کە گرنگی خۆی بۆ بەراوردکردن لەنێوان فەرهەنگی ئاشوریو ئەکەدییەکاندا، هەروەها لە پاڵ گرنگییە مێژووییەکەی خۆیدا گرنگی جوگرافی خۆشی هەیە لەناو هێنانی گەلێك شوێن، کە هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ ناوی کۆنی کەرکوك وەك (ئەرافاو ئەراپخا)[٤].

ئەم ڕەقیمە قوڕیانە لە شێوەو قەبارەدا جۆراو جۆرن لەنێوان چوار گۆشەو لاکێشەو خڕیو هەندێکیشیان لەم ڕەقیمە قوڕیانە لێوارەکان لوولەکی شێوە دانیشتووە.

بەڵام ڕەقیمە قوڕییەکانی کوروخانی لە ناوچەیەکی گرنگی سەردەمی هوری-میتانییەکانە، گەلێك پاشماوەی جۆر بەجۆری لێ دۆزراوەتەوە تا ڕادەیەکی باش هاوپەیوەستە لەگەڵ ڕەقیمە قوڕییەکانی نوزیدا. بابەتی ڕەقیمە قوڕییەکانی کوروخانی تایبەتن بە کاروباری ڕۆژانەی خەڵکی هوری-میتانی لە ناوچەی کەرکوك لەگەڵ گەلێك پاشماوەی موڵکدارێتیو کشتوکاڵو ئاژەڵداریو بازرگانی بە کەرەستە پیشە سازییەکانی کە لە ناوچەی کوروخانیو نوزیدا بەناو بانگ بووە.

نووسینی ڕەقیمە قوڕییەکانی کوروخانی گەلێك یاسای گرنگی تێدایە کە باسی لە مێژووی کۆمەڵگەی ئەو کاتە دەکات لەڕووی ژنهێنانو منداڵ بەخێوکردنو منداڵ هەڵگرتنەوەو

چۆنییەتی گواستنەوەی موڵكدارێتی زەوی بۆ كەسەكانی كۆمەڵگەی ئەو كاتەو چۆنییەتی ڕێگاكانی یاسایی بۆ ئەوەی بتوانین بە شێوەیەكی سروشتی یاخود بە فێڵێكی یاسای موڵكدارێتییەكەی بگوازێتەوە یان دەسبەسەر موڵكداری تردا بگرێت، ئەویش لە چوارچێوەی ئیمبراتۆرییەتی هوری-میتانییەكان كە سەرتاپای كوردستان لە ژێر دەستیان بووەو بەشێكی گەورەی دەرەوەی كوردستان لەژێر ڕكێفی ئەو ئیمبراتۆرییەتەدا بووە.

ڕەقیمە قوڕییەكانی كوڕوخانی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە كە توانیویەتی یاسایەكی كامڵ بوو بە دەست بهێنێت، گرێدراوی ئەو یاسایانە بوو كە لەوەو پێشوو تر لە ناوچەكانی ئەو كاتەی ئیمبراتۆرییەتی هوری-میتانییەكان بڵاو ببۆوە. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێ بكەین ئەوەیە، ڕەقیمە قوڕییەكانی هوری-میتانییەكان چ ئەوانەی لە نوزیدا هەیە یان لە كوڕوخانی گرێدراوی یاسایەكی گەورەی ئیمبراتۆرییەتی هوری-میتانییەكان بووە، بۆیە لەسەر بنەمای خەڵكی هوری‌و دەوڵەتی میتانی بنیات نراوە.

بۆ ئەوەی یاساكانی چوارچێوەیەكی بازرگانی‌و ئابووری‌و كۆمەڵایەتی‌و ئایینی‌و تەلارسازی لە خۆبگرێت، دەر هاویشتەی ئەو كاتە بووە یاخود ئەو یاسایە كە ئیمبراتۆرییەتەكەی لەسەر دامەزراوە.

"گرنگترین ئەو دۆزراوانەی كە لە (كوڕوخانی-تل فخار) دۆزراوەتەوە، نزیكەی (٦٠٠) ڕەقیمی قوڕی لەنێوان تەواو و شكاودا، زۆربەی ئەم ڕەقیمە قوڕیيانە لە بەشێكی گەورە لە ژوورەكانی (كۆشكی سەوز) بڵاوبووەتەوە.

..بابەتەكانی ئەم ڕەقیمە قوڕیيانە بریتییە لە: نامە، قەرز، پەیمان، كارڕایكردنی دۆسییەی تایبەت بە بەخێوكردن، كڕین‌و فرۆشتنی زەوی‌و زار، بابەتی ئایینی‌و یاسایی‌و كارگێڕیی‌و لیستی ئەو كەسانەی قەرزی دانەوێڵەیان كردووە.

زاراوەی (هوری-یە) Hurrianئەم ڕەقیمە قوڕیيانە هەمان شێوەی ئەو نووسینانەیە كە لە ناوەندی سەدەی پانزەهەمی پێش زایینی بەناوبانگ بووەو دۆزراوەتەوە لە هەر یەكە لە شاری (ئەراپخا-كەركوك)و شوێنی (نوزی)"[٥].

".. ئەو زمانەی لە میرنشینی میتانیدا بڵاوببووە ئەگەرچی بناغە هیندو ئەورووپییەكەی لقی ڕۆژهەڵاتی پاراستووە، بەڵام لەهەمان كاتدا زۆر ووشەی ناوچەیی خۆی تێدا ماوەتەوە، كە سەر بە زمانێكی ناوچەیی ئایینی‌و ڕۆشنبیری بووە، ئەمرۆ بە زمانی هوری نێوداره، ئەگەرچیش هێندێك جار ئەو ناونانە لەگەڵ ناوی سوبارتۆدا تێكەڵ دەكرێت.

لەم بوارەدا دەتوانین ئەوە بڵێین كەوا ئەو زمانە ناوچەییە ئەسڵییە، كە ئەمرۆ بە هوری ناوبانگی دەركردووە زمانێكی پیرۆزی دانیشتوانی وولاتی سوبارتۆ بووە تا ماوەیەك، شوێنەوارەكانی بە نووسینی مێخی بە تۆماركراوی بۆمان بەجێماوە".

".. ئەوەی ئەم بەڵگەنامانە لە هی دی جیا دەكاتەوە ئەو نێوە تایبەتییانەن كە هی دانیشتووانی ناوچەكە بوون، ئەوسا سەرنج ڕاكێش نەبوون، بابەتەكانی تابلۆكان بازرگانی‌و یاسایی بوون‌و هیچ شوێنەوارێكی دەسەڵات دارێتی ڕامیاری ئاشووریان لەنێو ئەم بەڵگە نامانەدا نەبوون‌و هەروا هیچ نێوێكی كەسی ئاشووریان لە نێویدا بەدی ناكرێت، تەنانەت نێوی خوداوەندی (ئاشوور)یشی تێدا نەهاتووە"[٦].

بەپێی ئەو سەرچاوانەی كە پێمان گەیشتووە لە هەریەكە لە (نوزی)و (كوڕوخانی)و (ئەراپخا) ئەو ڕاستییە دەخەنە ڕوو، كەركوك لە سەردەمی هوری-میتانییەكاندا گەلێك فراوان بووەو خاوەنی فەرهەنگی ڕۆشنبیری گرنگی خۆی بووەو بەجێهێشتنی ڕەقیمە قوڕییەكان ئەو ڕاستییانەی یەكلا كردووەتەوە، خەڵكی كەركوك چەندێك بایەخیان بە بواری ڕێكخستن‌و ژیان‌و بوارە فەرهەنگی‌و ڕۆشنبیرییەكان داوە لە خزمەت پێگەیاندن‌و ڕێكخستن‌و كاروبارەكانی ژیاندا.

دۆزینەوەی ڕەقیمێكی قوری زۆرو جۆر بەجۆر خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەكی گەورە لە بواری پێشكەوتنی ڕۆشنبیری‌و خوێندەواری ئەوكاتەی نوزی‌و بایەخی موفرەداتی ووشەو بێژەت كردنی (هوری) لە پاڵ زمانە سووبارییە ناوخۆییەكەی كوردستاندا ڕاستییەكانی گرنگی فەرهەنگی ئەوكاتە دەخەنە ڕوو.

"هەندێك لەو پارچە دۆزراوانەی كە لە بەڵگەنامەكانی ئەمیر (شیلوا.. تیشوب) دۆزراونەتەوە، ئەو ڕاستییە دەخەنەڕوو، كە ئەمیر موڵك‌و ماڵێكی فراوانی هەبووە كە لەژێر دەستیدا كاسبكارو نووسەرو شوان‌و پیاوانی جەنگڵ‌و كۆیلەو ئێشكگری زۆر هەبوونە، ئاقارە كشتوكاڵییەكانیان پێك هاتووە لە دارستانی میوەو بەسەدان لە مێگەلی ئاژەڵ‌و مەڕدا"[٧].

دۆزینەوەی ژمارەیەكی زۆری مۆری لوولەكی بەڵگەیەكی گەورەی فراوانی ڕۆشنبیری‌و كاروبارە كارگێڕی‌و یاساییەكانی ئەوكاتە دەخەنەڕوو، تا چەندێك بایەخیان بە ڕێكخستنی كاروبارەكان داوەو ڕەقیمە قوڕییەكان ئەو ڕاستییەن بایەخ دان بە نووسینەوەو لێكۆڵینەوەكانیان دەخاتەڕوو بۆ بە جێگەیاندنی ڕێكخستن‌و كاروباری ڕۆژانە.

دۆزینەوەی بەڵگە هونەرییەكانی وەكو پاشماوەكانی كۆتەڵ‌و گۆزەو نەخشی سەر دیوارو بەكارهێنانی ڕەنگ لە كۆشكەكانی هەریەكە لە (نوزی)و (كوڕوخانی) ئەوە دەخەنە ڕوو ئاوەزی ڕۆشنبیری ئەو كاتە چەندێك فراوان بووە كە هاوپەیوەستی لێكگرێدراوی باری ڕۆشنبیری‌و فەرهەنگی فراوانی ئەوكاتەی ئیمپراتۆرییەتی (هوری-میتانی)یەكان بووە.

دروستكردنی كۆشكی گەورەی هەر یەكە لە (نوزی)و (كوڕوخانی) ڕێی پێ ناچێت كە بایەخیان بە ڕۆشنبیری‌و فێركردنی زمان‌و نووسینی نەدابێت‌و هەوڵیان نەدابێت كە ڕەقیمە قوڕییەكان هەڵگرن‌و لە فەوتان ڕزگارییان بكەن، دۆزینەوەی ڕەقیمە قوڕییەكان لە هەردوو كۆشكەكاندا بەڵگەی ئەو ڕاستییەیە كە ژووری تایبەتیان هەبووە بۆ فێركردن‌و هەڵگرتنی دەسنووس‌و ڕەقیمە قوڕییەكانیان لە فەوتان، بۆ نموونە كۆشكی سەوز لە كوڕوخانی هەم شوێنی دانیشتن‌و لەهەمان كاتدا شوێنی بەڕێوەبردنی كاروبارە كارگێڕییەكانی ئەمیری ئەو دەسەڵاتە بوونە.

پەیوەندییە دەرەكییەكانی هوری-میتانییەكان لەگەڵ

میسرییەکانو گۆڕینەوەی نامەکانی هەردوو لا بەڵگەن بۆ فراوانی پەیوەندییەکانو توانای هوری-میتانییەکان لەسەر ئاستی دەرەوەو فراوانی باری ڕۆشنبیریو سیاسی ئەوکاتەی هەردوو دەوڵەتەکە.

لە پاڵ فراوانی هونەری بیناکاریو بایەخ دان بە دروستکردنی هونەرێکی بیناکاری یەکگرتووی ئیمپراتۆرییەتەکە، ئەوە یەکلا دەکاتەوە، تا چەندێك تواناو ئاوەزی دەروونیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری فراوان بووە بۆ تێگەیشتن یان هەولدان لە بەرجەستەکردنی فەرهەنگی ئەو کاتەی شارستانییەتەکە.

لایەنێکی گرنگی تر لەو کاتەدا گەشەکردنی ئایینی بووە، قۆناغێکی فراوانی بڕی لە سەردەمی هوری-میتانییەکانو بایەخ دان بە دروستکردنی پەرستگاو، بەکارهێنانی سرووتە ئایینییەکانو کاروباری ڕێکخستنی پەرستگا لە وڵاتی میتانیدا خۆی لە خۆیدا هەنگاو بوو بۆ خۆ بە ڕۆشنبیرکردنی ئایینی، دەروازەی دۆزینەوەی فێرکردنی ئایینی لە پەرستگاکانی هەریەکە لە (نوزی)و (کورروخانی) لایەنێکی بەرچاو بوو بۆ هەوڵدانی نووسینو بایەخ بە موفرەداتی ووشەی ئایینی لە پەرستگاکاندا.

بیروباوەڕە ئایینییەکانی هوری-میتانیو لە پاڵ بایەخیان بە ئایینەکانی تری ئەو شوێنانەی کە داگیریان دەکرد بوو بە کۆکراوەیەکی ڕۆشنبیریو ئایینی گەورە تا بتوانێت هەنگاو بنێت لەپێناو فراوان کردنی ئاوەزی ئەو کاتەی مرۆڤ لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی ئەو بابەتانە، هەر لەم ڕووانگەیەوەیە، بێژەتی هوریو سووباریو زاراوە ناوخۆییەکانی تر دەوریان هەبووە لە بەهێزکردنی هزری ڕۆشنبیری (هوری-میتانیاندا).

گەورەیی پەیوەندییە ئابووریو بازرگانییەکانی ئاقارەکانی میتانیان خۆی لە خۆیدا هەنگاو بووە بۆ فراوان بوونو پتەوکردنی لایەنەکانی تری کۆمەڵایەتیو زمانو تەلارسازیو ڕۆشنبیریو شارستانی وڵاتانی نەتەوەکانی میتانی کە هورییان بەشێکی گرنگیان بووە. بەهێزی ئەم دەوڵەتە زۆر بەڕوونی لەسەردەمی ئاشووری ناوەڕاستدا بەدەردەکەوێت، تا چەندێك باڵادەستی میتانیان بەسەر ئاشورییانەوە بەدەردەخات.

زۆری ڕەقیمە قوڕییەکانی (نوزی)و (کورروخانی) و هەمە چەشنەیی بابەتەکانو گرنگی زاراوەو جۆری نووسینەوەکەیو بە پێزی ناوەڕۆکی ئەو ڕەقیمە قوڕییانە ئەو ڕاستییە دەخەنەڕوو کە هزری ڕۆشنبیری لەو سەردەمەدا چەندێك فراوان بووەو بایەخ بە نووسینو هەڵگرتنی ئەو ڕەقیمە قوڕییانە دراوە.

*** قوتابخانەو پێویستییەکانی نووسین:-**

وەکو سەرەتایەك زانراوە کە سۆمەرییەکان پێشەنگی ئەو بووارە گرنگە بوونەوەو لەودوا، نەتەوەکانی تر بایەخیان بە بواری نووسین داوەو لە خەتی بزمارییەوە گەشەیان بە نووسینو زمانەکانی خۆیان داوە.

بۆیە سۆمەرییەکان گەلێك زاراوەی جۆربەجۆریان بەکارهێناوە لە بواری نووسینو خوێندن وەکو: (ئای - دوبا - Edubba)، (دووما- ئای - دوبا dumu - Edubba)، (ئومیا umia)، (DUB-SAR NISHIT) - (DUB-SAR-KI-EN-GI).

دەربارەی شوێنی خوێندن، هەندێك لە بەڵگەو خانووەکان کە دروستکراوە، یان بە تەك پەرستگاکانەوە بنیات نراوە ئەوە دەخەنە ڕوو، یان بەڵگەیە بۆ ئەوەی ژووری تایبەت بە خوێندن بووە کە بەکارهێنراوە وەکو قوتابخانە.

هەروەها بەپێی بەڵگەکان ڕێی پێدەچێت کە دوو جۆر قوتابخانە هەبووە: جۆرێکیان تایبەت بووە، کۆمەڵێك لە نووسەر بەڕێوەیان بردووە، جۆری دووەمیان گشتی بووە کە لەژێر چاودێری دەوڵەتو پەرستگادا بوونە.

بەڵگەی فراوانی کۆشکەکانی (نوزی)و (کورروخانی) بوونی ژوور لە تەك پەرستگاکانیان، ئەو ڕاستییە دەخەنە ڕوو شوێنی خوێندنو نووسینو هەڵگرتنی ڕەقیمە قوڕییەکان هەبووە.

قوڕ کەرەستەیەکی سەرەکی بووە لە بەکارهێنانی نووسیندا، لەسەرەتادا قوڕەکەیان بە تەڕی شێلاوەو جوان چاکیان کردووە بۆ نووسین لەسەری، یان هەندێکی تری لەدوای بەکارهێنان سوورکراوەتەوە لە فرنی تایبەتیدا.

قوڕەکەی بریتی بووە لە جۆری پاك، کە خوێو قووم و پووشی تێدا نەبووە، ئەویش لە ڕێگای کەناری ڕووبارەکان بەدەستیان هێناوە، یان هەستاون بە پاککردنو بەکارهێنانی بە شێوازێکی ڕێکوپێك، لەهەمان کاتدا کەسی تایبەت هەبووە هەستاوە بەشێلانی قوڕەکەو ئامادەکردنی بۆ کاری نووسین.

ڕێگای نووسین بریتی بووە لە کێشانی هێما بزمارییەکان لەسەر قوڕە تەڕەکە، لە ڕێگای قەڵەمێکی دروستکراو لە دار یان لە قامیش کە نووکەکەی سێگۆشە بووە، لەسەرەتادا سەر ڕووی قوڕەکەو ئینجا لێوارەکانی نووسیوەتەوە تا ووشك بووەتەوە، دووایی هەستاوە بە نووسینی دیوەکەی تری لەگەڵ لێوارەکانی، بەڵام لە هەندێك باردا لێوارەکانی نووسینی پێوە نەبووە، لەبەر ئەوەی قوور زۆر بە پەلە ووشك دەبێتەوە بۆیە بنووسی ڕووی یەکەمی ڕەقیمەکەی لەیەك باردا تەواو کردووە.

لە هەندێك باردا بنووسی پارچەیەك کەتانی تەڕی بەکار هێناوە بۆسەر قوورەکە بۆ ئەوەی زوو ووشك نەبێتەوە، یان لە هەندێك باردا ڕەقیمە قوڕییەکان گرنگ بووە پێویستی بە کات بووە بۆ نووسینەوەی، بۆیە بە کەتانێکی تەڕ دایان پۆشیوە.

بۆ نموونە لە گردی (عەلی-ناتمانی) لە نزیك حەویجە ڕەقیمێکی قوڕی دۆزراوەتەوە بە قوماشێکی کەتان پێچراوە بەڵگەیە بۆ ئەوەی گرنگ بووە لەڕووی ئابوورییەوە.

هەندێك ڕەقیمی قووری دۆزراوەتەوە کە قەبارەیان بچووك بووە، بۆ نموونە ڕیزێك یان دوو ڕیزی بزماری لەسەر نووسراوە، یان هەیانە پسوولەی کاروبارەکانە وەکو ئەوەی دۆزراوەتەوە لە بابلو نوزیو کورروخانی.

ڕەقیمە قوڕییەکان شێوەی جۆراوجۆریان هەبووە لەنێوان

چوارگۆشە، لاکێشەیی، پەپکەیی، تۆپی، شێوە ئاژەڵی و مرۆیی، لوولەکی، شەش پاڵوویی، گەلێك جۆری تر.

قەبارەی پارچەی رەقیمە قورییەکان جیاوازییان هەبووە لەجۆری درێژی و پانی و خری و قەبارەی جیاواز. جیاوازترین، گەورەترین رەقیمی قوری لەنێوان (٥٠×٥٠) سانتیمەتر بووە. چونکە نووسینی خەتی بزماری ئەو توانا بە هێزەی نەبووە بۆ وەرگرتنی بەشێکی زۆری نووسینی لەسەر قوڕو گەورەی دەبێتە گرانی هەڵگرتنی، هەر لەبەر ئەمە بووە کاتێك شتی زۆریان هەبووە لە نووسینەوەیدا چەندان پارچە رەقیمی قورییان بەکارهێناوە بۆ نموونە کاتێك داستانی گەلگامش نووسراوەتەوە ١٢ پارچەی رەقیمی قورییان بەکارهێناوە یان داستانی (الخليقة البابلية) بە ٧ پارچەی رەقیمی قوری نووسراوە.

لە پاڵ رەقیمی قوری، بەردو کەرەستەی تریش بەکارهاتووەو لە نووسینەوەی خەتی بزمارییدا، بەتایبەتیش لەکاتی هەڵکۆڵین لەسەر مۆری لوولەکی بەرد یان قوری سوورەوەکراو بەکارهاتووە.

قەڵەم کەرەستەیەکی سەرەکی بووە بەتایبەتی قەڵەمی قامیش لەسەر قوری تەڕ، چونکە نووسینی جوان و رێکوپێك دەردەچێت. هەروەها بەکارهێنانی جۆرەها قەڵەمی قامیشی گەورەو نووك تیژ لەپاڵ قەڵەمی بەردی و ئاسنین باوی هەبووە.

باڵادەستی هوری-میتانییەکان تا ماوەیەکی دوورو درێژ دەورێکی کاریگەری بینی لە بواری رۆشنبیری و هزری تێکەیشتنە رۆشنبیرییەکان لە ناوچەکە.

بەپێی ئەو بەڵگانەی کە دۆزراوەتەوە، ئەو راستییە یەك لا دەبێت دەوڵەتی میتانییەکان، لە هەوڵداندا بوون بۆ ئەوەی بتوانن یەکگرتوویەکی هەمە لایەنی لە هەموو بوارەکاندا دروست بکەن تا ببێتە خاڵێکی گەورەو گرنگ لە یەکخستنی بوارەکانی وەکو رۆشنبیری و ئابووری و پەروەردەو تەلارسازی لە هەموو پارچەکانی ئیمپراتۆرییەتەکەدا تا ببێتە وەرچەرخانی پێشکەوتن.

ئەوانەی کە باسمان کرد بە کردەوە گەلێك لایەنی گرنگی ئەم یەکخستنانە بەرچاو دەکەوێت کە دەربڕی ئەو فراوانی و پێشکەوتنە بووە بۆ هەوڵدانی یەکخستنی هەموو شتەکان.

بۆ نموونە ئەگەر سەیری بوارەکانی تەلارسازی بدەین دەبینین دروستکردنی کۆشکێك لە (نوزی) یان (کوروخانی) هەمان هاوشێوەی ئەو هونەرەیە لە ناوچەکانی تری وەکو کوردستان و سوریا یان پارچەیەکی تری سەر بە ئیمپراتۆرییەتەکە.

* زمان و خوێندن لە دەوڵەتی میتانی:-

بواری زمان و رۆشنبیری و پەروەردە هیچی کەمتر نەبووە لە تێگەیشتن و هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی زمانی میتانی و بەکارهێنانی زاراوەو بێژەتی سووباری باوی ناوچەکە لەگەڵ تێکەڵ بوونی هورییەکان، بەوەی کەلەپورێکی گەورەی رۆشنبیری و نووسینێکی زۆری رەقیمی قوریمان بۆ بەجی ماوە کە بەو تێکەڵییە زمانەوانییە نووسراوەتەوە.

"بەڵگە زمانەوانییە دیارەکانی دەوڵەتی میتانییەکان، بەشێوەیەکی سەرەکی بریتی بووە لە هوری و ئەکادیی و ئەنادۆڵی کۆن، لەگەڵ بەکارهێنانی گەلێك وشەی هیندی و ئاری، وەکو بەکارهێنانی هەندێك ناوی کەسان و نازناوی کەس و گەلێك ناوی خوداوەندەکان.

دەوڵەتی میتانییەکانیش وەکو بەشێك لە دەوڵەتەکانی تر پێکهاتووە لە تێکەڵاوییەکی زمانەوانی جۆراوجۆر کە بەشێوەی بنەرەتی پێك هاتووە لە هورییەکان و ئەمورییەکان و ئاشوری و ئارامییەکان و کۆمەڵەی هیندو ئارییەکان.."[٨].

گرنگی دەوڵەتی میتانی لەوەدا بوو کە توانیبووی کۆمەڵێك زمانی ناوچەیی گرنگ کۆبکاتەوە تا ببێتە بناغەیەکی گرنگی ئەو دەوڵەتەو گرێدراوی رابردووی ئەو زمانانەو ئێستای ئەو دەوڵەتە بێت و دەوڵەمەنی ئەو دەوڵەتە بخاتەڕوو لە هەموو بوارەکاندا.

لەم بارەیەوە (فولغرام ڤۆن زودن) دەڵێت:

"زۆرجار سەرسام دەبووم کاتێك لەنامەو بەڵگەنامەکانی ئۆگاریت و عەمارنەدا نامەی باکوری سوریام بەرچاو دەکەوت بە نووسینی ئاشووری لە جیاتی بابلی نووسرابوون، زانراویشە زمانی بابلی دیالێکتی ئەکەدی زمانی ئاخاوتن بووە لە فەلەستینەوە تاکو ئەنادۆڵ و وڵاتی نێوان دوو رووبار لە سەدەی پانزەوە تا سیانزەی پێش زایین.

سەرسامییەکەم زیاتر بوو کاتێك زانیم کە وشەی ئاشووری لە بەڵگەنامەکانی (نوزی) نزیك سنووری رۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشوور کەمتر بەکار هێنراوە لەچاو بەڵگەنامەکانی باکوری سوریا، هەر چەندە دەبوایە بە پێچەوانەوە بووایە"[٩].

"هوری-خوری وەك گەلێکی خاوەن زمان و داب و نەریت و خاوەن سیماو پێکهاتەی ئەنترۆپۆلۆجیای جیاکراوە، کە توانیویەتی دووهەزار ساڵ خۆی لەناوچوون بپارێزێت و رەوتی مێژوویی خۆی هەبێت و کاریگەری بخاتە سەر گەلانی دەوروبەری.

زمانی هوری لە هەزارەی سێ وەو بەتایبەتی لە سەرەتای هەزارەی دووی پێش زایندا لە بەشێکی بەرفراوانی (هلال الخصيب)دا قسەو نووسینی پێکراوە، کە ناوچەکانی باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی عێراق، باکووری سوریاو باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا (کوردستان) دەگرێتەوە، کە لە کۆنەوە بە سوبارتوو دواتر بە میتانی ناوبراوە.

سەرەرای دابەشبوونی هوری بەسەر چەندین هەرێمی جوگرافی جیاوازدا، توانیوویەتی وەك زمانێکی سەربەخۆ خۆی بپارێزێت، بەڵام دەتوانین بۆ دوو زاراوەی سەرەکی، کۆن و نوێ دابەشی بکەین. ئەم زمانە تا کۆتاییەکانی تۆمارە

ئاشورییەکان لە ناوچەکانی زێی بچووك تا دەریاچەی وان بەردەوام بووەو ناوە کەسێتییە خورییەکان بەکارهاتووە، ئەمیش بووەتە هۆی ئەوەی پاشماوەی ناوو هەندی پاشگری هوری، لەناو زمانی کوردیدا بمێنێتەوە"[١٠].

هەروەها دەڵێت:

"کە ئیمبراتۆرییەتی میتانی لەپاڵ زمانی بابلی زمانی ئاشوریشی بەکار دەهێناو چەندین هۆ پاڵپشتی ئەم بۆچوونەمانە، ئەگەر زمانی هوری زمانی ڕەسمی ئیمبراتۆرییەتی میتانی بوایە ئەوا چەندین بەڵگەنامەو نامەی هوریمان دەدۆزییەوە.

ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەستمدایە ڕێگامان نادات هیچ بۆچوونێکی تر پەسەند بزانین جگە لەوەی کە زمانی ئەکەدی زمانی ئیداری ئەو ئیمبراتۆرییەتە بوو، یەکێ لەو هۆکارانەی ئەم ڕاستییە دەردەخات ئەوەیە کە زمانێکی هوری ئەوەی نەبووەو ئەو دەقە هورییانەی تا ئێستا دۆزراوەتەوە بە دیالێکتی جیاجیا نووسراوە.

بە هەر حاڵ زمانی ئیداری ئیمبراتۆرییەتی میتانی لە نوزییەوە تاکو دەریای ناوەڕاست زمانی ئەکەدی بووەو زمانی بابلی لە زۆر شوێن بەکار نەدەهات سەرەڕای ئەوەی لە هەزارەی سێهەمی پێش زایینییەوە لە وڵاتی نێوان دوو ڕووبار بەکار دەهێنراو بە زمانی ئەدەبی دادەنرا لەچاو زمانی ئاشووریدا"[١١].

".. لە مەوە دەتوانین پێشنیاری ئەوە بکەین کە پاشا میتانییەکانی پێش (توشراتا) زمانی ئاشووریان وەك زمانی ئیداری لە ئیمبراتۆرییەتەکە بەکار دەهێنا، بەمەش مەبەستیان بوو ناوەندێکی شارستانی لە (واشۆکانی) پایتەخت دابمەزرێنن و ململانێی لەگەڵ بابل و ئەنادۆڵ و سوریاو میسری پێ بکەن".

میتانییەکان بیریان لە دامەزراندنی ناوەندێکی شارستانی کردەوە بۆ ئیمبراتۆرییەتەکەیان و لەوەی تەنیا پایتەختێکی ئیدارییان هەبێت، ئەو گەل و هۆزانەی لە وڵاتی نێوان دوو ڕووباردا دەژیان شارستانییەت و زمانی بابلیان فەرامۆش نەدەکرد، لەبەر ئەوەی زمانی بابلی زمانێکی نێو دەوڵەتی و دبلۆماسی بوو بەڵگەشمان ئەرشیفی (عەمارنە)و (خاتوو شاو)و (ئۆگارین).

سەرەڕای کاریگەری زمانی هوری و کەنعانی و حیسی لەسەر زمانی بابلی، بەڵام توانی ببێتە نووسینی ڕەسمی نووسەرەکان هەر چەندە نووسەرەکان زاراوەو هێمای بابلی و ئاشووریان تێکەڵ دەکرد[١٢].

باڵا دەستی میتانییەکان هەر لە سەرەتاوە بەردەوام بووە تا سەردەمی ئاشووری ناوەڕاست و ئاشوورییەکان تەنها بەناو فەرمانڕەوایی ئەو شوێنانە بوونە، زیاتر (هوری – میتانییەکان) دەسەڵاتداری ئەو شوێنانە بوونە کە لەژێر دەسەڵاتیاندا بوونە.

بەڵام هەموو بەڵگەکان ئەو ڕاستییە پشت ڕاست دەکەنەوە کە هەریەکە لە (نوزی)و (کورروخانی)، لە چینی دووەمدا کەوتوونەتە بەر هێرشی ئاشوورییەکان و بە دەسەڵاتی یەکێك لە پاشای ئاشوورییەکان لەناوچووە بەڵگەی سووتانی هەردوو کۆشکەکەو ڕووخاندن و کاولکردن ئەوە دەخەنەڕوو کە بەرهێرشی دەرەکی کەوتوونەو لەناوچوونە، "لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە خێزانی (تیخیب تیللا) لە توانایدا بووە کە موڵکەکانی فراوان بکات، بەڵام دەسەڵاتی ئەم خێزانە بەرەو ڕووخاندن چووە پلە بە پلە تا گەیشتووەتە قۆناغی ڕووخاندن، ئەویش بە هۆکاری شەڕو کاولکاری کە لە دەرەوەی دەوڵەتەکەوە کراوەتە سەری، کە ڕێگای پێدەچێت لەلایەن ئاشوورییەکانەوە بێت.."[١٣].

زۆری بەڵگەکان دەستی ئەو هێرشە بۆ ئاشوورییەکان دەخەنەڕوو، زیاتر لەماوەی فەرمانڕەوای، پاشای ئاشووری (ئاشوور ئۆباڵتی یەکەم)، کە لەنێوانساڵانی (١٣٦٥-١٣٣٠) پێش زایینی فەرمانڕەوایی دەوڵەتەکەی کردووە، ئەویش زیاتر لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە گوایە ئەم پاشا ئاشوورییە زیاتر بایەخی داوە بە شەڕو کاروباری هێرشکردنە سەر ناوچەکان و بەتایبەتی ناوچەکانی دەوڵەتی (هوری–میتانی)، بۆیە چارەنووسی هەریەکە لە (نوزی)و (کورروخانی) بەر ئەو هێرشانە کەوتووە.

دەگەینە ئەو بەڵگە گرنگانە کە سەردەمی دەسەڵاتی هوری–میتانییەکان، ماوەیەکی مێژوویی پرشنگدار بووە لە خزمەت گەشەکردنی باری زمان و ڕۆشنبیری و ئایینی و تەلارسازیدا. زمان و باری ڕۆشنبیری توانایەکی فراوانی ئەو ماوەیە بووەو فراوانی دەوڵەتەکە توانایی ئەو بوارانە دەخاتە ڕوو تا چەندێك توانیوویانە مامەڵە لەگەڵ زمانی هوری و زمانە ناوچەییەکان و چۆنییەتی جۆری نووسین و بەکارهێنانی خەتی نووسینی بزماری.

نووسەرە هوورییەکان بە شێوەیەکی جۆراوجۆر بەشدارییان لە دەوڵەمەندکردنی شارستانییەتی وڵاتی دوو ڕووباردا کردووە کە گرنگترینیان بریتییە لە:

١. ئەو بابەتانەی کە لە وڵاتی دوو ڕووباردا زۆر باو بووە، هوورییەکان وەریانگرت و جارێکی تر بەشێوازی تایبەتی خۆیان دایانڕشتووەتەوەو نووسیویانەتەوە.

٢. هوورییەکان چەندین تێکستیان وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی هووری.

٣. ئەو ڕووداوانەی کە بە شێوەی زارەکی وەکو ئەفسانە یان چیرۆك وەرگێردراون، هوورییەکان وەریانگرت و جارێکی تر بەزمانی هووری و بە شێوازێکی تر نووسیویانەتەوە.

٤. هوورییەکان بە تەواوی چوارچێوەی تێکستە ئەدەبییەکانیان فراوان کرد، ئەویش بە خستنە پاڵی تێکستەکانی تایبەت بە ئەفسانەو فاڵ لە فۆلکلۆری تایبەتی خۆیان.

*** ئاشوورییەکان و مێژووی نووسینەوە:-**

ئەوەی لێرەدا بەرچاو دەکەوێت، هەرچەندە لێکۆڵینەوەی زۆر کراوە لەسەر هەریەکە لە (نوزی)و (کورروخانی) بەڵام هێشتا پێویستی بە لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی زیاترە لەپێناوی دۆزینەوەی ناوچەی تری هەمان سەردەم کە تاکو ئێستاکە لێکۆڵینەوە نەگەیشتووە پێی.

لەدوای لەناوچوونی دەوڵەتی (میتانی)و فراوانی دەسەڵاتی

ئیمبراتۆرییەتی ئاشووری نوێ لە ساڵی (٩١١)ی پێش زایینی بەشێکی گەورەی هەموو ناوچەکانی کەوتە ژێر رکێفی.

"لە سەرەتای ئەم دیاردە مێژووییەدا بوژاندنەوەی ئیمبراتۆرییەتی ئاشوور بەرەو گەشانەوە دەڕۆیشت، کە لەکاتی فەرمانرەوایی (ئەدەد نیراری ٩١١-٨٩١)ی پێش زایینیدا دەستی پێ کردبوو، ئەو هێرشانە، کە ئەم پاشایە بردبوونیە دژ دانیشتووی چیاکانی رۆژهەڵاتی ئاشوورو بەکۆمەڵ خەڵکی لەنێو بردبوو، هەروەکو خۆی دەڵێت، لە راستیدا مەبەستی بەرەنگارکردنی ئەو هۆزانەی کۆچەرانی نوێی هەرێمەکە بووە، بێگومان تۆمارکردنی هەواڵی ئەو کارەساتانە لەو هێرشەدا رۆشناییەکی باشی خستووەتە سەر ئەو تاریکییە مێژووییانەی میللەتانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئاشوور، زیرەکی لە جەنگداو حەزکردنێکی بێ سنوور لە نووسینی مێژوودا دوو تایبەتی سەرەکی ئاشوورین بەتایبەتی لەم چەرخەی ئیمبراتۆرییەتدا کە لەنێوان ساڵانی (٧٤٧-٦١٢)ی پێش زایینی فراوانتر بووەتەوەو بە نێوی (چەرخی سەرگۆنی) نێوبانگی دەرکردووە"[١٤].

لە لایەکی ترەوە ئەم هێرشانەی پاشایانی ئاشوور وا دەگەیەنێت، کە دانیشتوانی کۆنی وڵاتی کوردەواری، پاش ئەو هەموو کوشتن و برین و ماڵ وێرانییەی سەدەها ساڵ، پلە بە پلە خۆیان لە دەسەڵاتدارێتی رامیاری و سەربازی و ئایینی ئاشوور رزگار دەکردو ئەو بۆشاییە رامیاری و ئایینیە لەلایەن هۆزانی (ماد)و (سەکەس) پڕ دەکرایەوە، بەرێگای ئەمانەوە رووداوی بڵاوبوونەوەی جۆرە پەروەردەیەکی ئایینی نوێ بە رێگای خێڵی (ماگ) شێوە زمانێك لە کوردستاندا جێی خۆی چەسپاند، کە بێگومان دارشتن و شێوازی دەربرینی ئەو زمانە دیالێکتێکی (مادی) بووەو ئەمرۆ بە زمانی (ئاڤێستا)ی مردوو دەژمێردرێت، کە بۆ نزیکەی ١٤٠٠ ساڵ زمانێکی پیرۆزی پەرستگایان بووە لە کوردستان و وڵاتانی دیدا[١٥].

ئەوەی پێویستە لە سەرمان کە ئەو رەقیمە قوڕیانە بخوێنینەوە دەربارەی تۆمارکردنی کاروبارەکانی پاشای ئاشوورییەکان، یەکێکە لە پاشماوە کۆنەکانی کتێب لە بارەی زانستی نووسینەوەی مێژوودا، هەرچەند خوێندنەوەی ئەو پاشماوانە تووشی بێزاری و ناخۆشیت دەکات ئەویش دەربارەی ئەو کارە درندانەی کە تۆمار کراوە.

ئەم رەقیمانە لە سەرەتادا تەنها تۆمارکردنی سەرکەوتنەکان بووەو پیاهەڵدانی سەرکەوتنی پاشای ئاشوورییەکان بووە بەڵام لە دوایدا کاری ئەم رەقیمانە نووسینەوەی بە شێوەیەکی ئەدەبی رێکوپێك بووەو باسی هەر پاشایەکی کردووە، گرنگترین شتێك کە لە پاشای ئاشوورییەکان بەجێ ماوە کتێبخانەکانیان بووە، بۆ نموونە (ئاشور پانیپال) نزیکەی سی هەزار (٣٠,٠٠٠) رەقیمی قوڕی بەجێ هێشتووە کە هەر هەمووی پۆلین کراوە بە شێوەیەکی رێکوپێك و دانراوەو زۆربەی کاری کۆپیکردنی لەوەو پێشەوەی پێوە دیارە[١٦].

ماوەی فەرمانرەوایی ئاشوورییەکان بەربەرەکانی و شەڕو شۆڕ بووەو پاشای ئاشوورییەکان بەردەوام لە بەربەرەکانیدا بوونە لەگەڵ میتانی و مادی و بابلییەکان و شوێنی هەڵکەوتەی دەوڵەتی ئاشوورییەکان وای خواستووە کە لە بەردەوام بوونی هێرشە سەربازییەکاندا بێت و هەوڵی ئەوە بدات قەڵەمرەوی خۆی فراوان بکات لەسەر حیسابی ئاقارو ناوچەکانی تر.

یەکێك لە هۆکاری کەوتن و رووخاندنی ئیمبراتۆرییەتی ئاشوورییەکان فراوانی و گەورەیی هێرشەکان بووە بۆ سەر ناوچەکانی و هۆکارێکی گرنگی ئەو کاولکارییانە بووە کە بەسەر ئاشوورو ئاقارەکانی تری هێناوەو بووەتە هۆکارێکی گرنگ بۆ لەدەستدانی پاشماوە رۆشنبیری و نووسراوە جۆر بەجۆرەکانی ئەو ناوچانە کە هەموو ناوچەکانی ئەوکاتەی (ئەراپخا) هەر لە سەردەمی میتانییەکانەوە بەر ئەو هێرش و کاولکارییانە بوونەو (نوزی)و (کوروخانی) بەو دەردە چوونە.

ئەگەر سەیری هێرشی پاشا ئاشوورییەکان بکەین دەبینین بەردەوام ناوچەکانی کەرکوك (ئەراپخا) بەردەوام تووشی هێرشی پاشا یەك لەدوا یەکەکانی ئاشوورییەکان بوونەو کاولکاری سوپای ئاشووری پاشماوەیەکی زۆری رۆشنبیری و رەقیمی قوڕیمان لەدەست داوەو بەپێی بەڵگەنامەو مێژووییەکان ئەراپخا بەشێك بووە لە ئیمپراتۆرییەتی ئاشوورییەکان.

"... کەچی ئەراپخا بەشێك بووە لە ئیمپراتۆرییەتی ئاشوور لە هێرشی دووەمی (سەنحاریب)دا کاشییەکانی چیاکان لەگەڵ (یاموبیگالی)یەکان، پاکی گوێزرانەوەیان بەدەست ئاشوورییەکان، لە شارەکانی وڵاتی (نامری)دا (شاری هار دشپی)و (شاری کوبانتی) نزیك رووباری دیالە جێنشین کران و خرانە ژێر چاودێری حاکمی وڵاتی (ئاراپخا)دا کە سەر بە ئاشوورییەکان بووە.

لەلایەکی ترەوە وولاتی (ئەراپخا) کەوتبوە سەرووی چیای حەمرین واتە باکوری وڵاتی (نامری)و رووباری دیالە لەم وڵاتەی (هالمان- ئیالمان- ئارمان- هەڵبەن-ئەڵوەند) جیاکردبۆوە. لە باشوریش وڵاتی (ئاراپخا) دەگەیشتە زێی بچووك و لە رۆژهەڵاتیشەوە پاڵی دابووە وڵاتی زاموا"[١٧].

لە هەزارەی دووی پێش زایینیدا، کۆچەرانی هیندو ئەوروپایی لەم وڵاتەی کوردەواری و چیاکانی زاگرۆسدا جێگربوون و ژمارەیەکی باش لە واژەو وشەکانیان لای میتانیان و کاسیاندا بەرچاو کەوتووەو بەهەمان جۆر رەگی ئایینیی و میللی خۆیان لەم هەرێمەدا چەسپاندووە، لەگەڵ ئەمەشدا دانیشتووە کۆنەکانی تاوەکو ناوەراستی هەزارەی یەکی پێش زایینی دابونەریتی و نێوو زمان و ئایینی خۆیان پاراستووەو پلە بە پلە لەژێر کاریگەری شەپۆلی کۆچەرانی (مادو سەکەس و کیمیری)دا لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاینیدا ئەو دیاردانە بەرەو کزی و گۆڕین بوون و لەم سەردەمەدا ئەو کارەساتانە رێیان خۆش کردووە، بە تێکەڵاوی شێوە کۆنەکانی میتانی لەگەڵ شێوەکانی ئەم کۆچەرە نوێیانە، بۆ پەیدابوونی زمانێکی هاوبەشی بۆ گشت دانیشتوانی هەرێمەکە، بێگومان دەشێ ئەو پلەیە بە پلەی سەرەتایی زمانی کوردی بزانرێت، چونکە ئەو نێوە کاسی و تۆپۆنۆمی و ئەپنونومی (نێوی هۆزان)ە کە لە تابلۆی پادشایانی ئاشووردا بەدیار دەکەون، ئەمرۆ بێجگە لە کوردی هیچ زمانێکی دی نییە لەو هەرێمەدا خاوەنی

ئەو کەلەپوورە زمانەوانیی و مێژووییە دەوڵەمەندەی ئەم دانیشتووانە بێت، کە زۆربەی زۆری ئەمڕۆ لە کوردیدا بە شێوەیەکی پێشکەوتوو بەکاردێن"[١٨].

لە دوای فراوان بوونی دەوڵەتی (ماد)و بەربەرەکانی بەردەوامی لەگەڵ ئاشوورییەکاندا، ململانێیەکی گەورەبوو، کە دەرئەنجامی ئەو ڕێکەوتنە گەورەیەی مادەکان لەگەڵ کلدانییەکان دەرئەنجامی ڕووخاندنی ئاشوورییەکان، وەرچەرخانێکی قۆناغێکی ترو دەروازەی ڕێگایەکی تری پێشکەوتن لە هەموو بوارەکاندا بە تایبەتی بواری رۆشنبیریی و زمان یەکێك بوو لەو دەسکەوتانەی ئەو قۆناغە.

"لە بارەی فەرهەنگی مەعنەوییەوە (شێوەی خەت و نووسینی ماد) ئەبی بڵێین کە لەم بارەیەوە ئەوەی کە هینی سەدەی حەوتەمە زانیاریمان لە هی پلەی فەرهەنگی مادی کەمترە، لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینی خەت و نووسینی لەسەر زەمینی ماد هەبووە.

لەبارەی دانیشتووانی مادی مەرکەزیی و ڕۆژهەڵاتەوە باسەکە ئاڵۆزترە، تا ئێستا هیچ سەرچاوەیەك ڕاستەوخۆ کە دانی بەوەدا نابێت ئەوانە لەگەڵ خەت و نووسیندا ئاشنایەتیان هەبووە، بەدەستەوە نییە، بەڵام بەبیروڕای ئێمە، هەر چۆن بەراورد بکرێت ئەوانە لەسەدەی حەوتەمی پێش زایینیدا خەت و نووسینیان هەبووە، ئەمە هەمان خەت و نووسینە کە ئەمڕۆ بە (خەتی کۆنی پارسی) یان (خەتی هەخامەنشی ڕیزی یەکەم)ی دادەنێین، بەڵام لە واقیعدا ئەمە ڕەگەزی مادییە"[١٩].

"لە بەهاری ساڵی (٦١٥)ی پێش زایینیدا سنووری نێوان بابل و ئاشوور لە نزیك کەرکوکی ئێستاوە دەستی پێ کردو نەختێك بەلای خوارووداو لە ئاشوور تاکو (عانەی) ئێستا لەسەر فورات درێژ دەبووەوە"[٢٠].

ساڵی دوایی (٦١٤) پێش زایینی لەشکری (ماد) بە فەرمانی (کیاکسار) لەڕێگای تەپۆڵکەکانی (ئاراپخا)وە لە ژوورو نەینەواوە چوونە سەر دیجلەو شاری (گربیس)یان داگیر کرد، دوای ئەوە لە دیجلە پەڕینەوە لەلای ڕاستی ئەو ڕووبارە تا ئاشوور ڕۆیشتن"[٢١].

لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە لەدوای مێژووی (٦١٤)ی پێش زایینییەوە، وەرچەرخانێکی گەورەبوو کە (ئەراپخا - کەرکوك)و ناوچەکە لە ژێر دەسەڵاتی ئاشوورییەکان ڕزگار بووەو قۆناغێکی نوێ لە بواری فەرهەنگ و زمان و کەلەپووری (ماد)دا گەیشتە ئەم ناوچانە:

١. لە دوای ڕووخاندنی ئاشوورییەکان وەرچەرخانێکی فەرهەنگی گەورە دروست بووە کە لکاندنەوەی زمان و ڕۆشنبیری لەوەو پێشی کوردستان بوو کە کەرکوکیش پشکێکی گەورەی ئەو هەگبە ڕۆشنبیرییەی بەرکەوت.

"بەم جۆرە ئەو دامرکاندن و جێ خۆشکردنە زمانەوانییە مەزنەی هەزارەی یەکی پێش زایینی، لە کۆمەڵێك زمانە ناوچەییەکانی کوردستان لەگەڵ زمانی کۆچەری هیندو.. ئێرانییەکانداو بوژاندنەوەی زمانی کوردی لە کۆتاییدا، بەڕێگاو کاریگەری سێ زمانی سەر بەیەك خێزان هاتووەتە کایەوە.. یەکەم پاشماوەی چینی دەسەڵاتداری دەوڵەتی میتانیانەو دووەم بە بڵاوبوونەوەی هۆزانی (سەکس) و (کیمیری) لە باشووری کوردستاندا، سێیەم پەیدابوونی ئیمبراتۆرییەتی مادەکانە"[٢٢].

٢. دەوڵەمەندی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری دەوڵەتی ماد ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ ئەوەی زمان و شارستانی ژێر ڕکێفی دەوڵەتی مادی پێ دەوڵەمەند بکرێت و تاکو ئێستاکە گەلێك پاشماوەی ئەو بێژەتانە لە لادێ و گوندو شارەکانی کوردستان و کەرکوکدا پاشماوەیان بەجێ ماوە وەکو (ماد هۆز - ماحوز)، (زەردك)، (لەیلان)، (تۆپزاوە)، (ئەراپخا - عەرەفە)و (زێویە)و گەلێکی تری جۆراو جۆر.

٣. جێگەی کەرکوك لە شوێنی دەوڵەتەکەداو جێگەی گەشەکردنی دەوری هەبوو لە پێگەیاندنی ئەو فەرهەنگە ڕۆشنبیرییەدا.

٤. گەشەکردنی ئایینیش دەورێکی سەرەکی و گەورەی بینی لە خزمەت فەرهەنگی زمان و ڕۆشنبیری ئەو ناوچانەی مادەکان، بەتایبەتیش ئایینی زەردەشتی وەرچەرخانی یەکخستنی هەموو فەرهەنگەکان بوو لەو ئاقارانەی مادەکاندا. تاکو ئێستاکەش گەلێك لە فەرهەنگی ئەو ئاینە قورسایی و بارستایی خۆی هەیە بەسەر فەرهەنگی ڕۆشنبیری کوردستان و پاشماوەکانی گەواهی ئەو ڕاستییەن.

### * دەوری چەرخی هیلینستی لە پێگەیاندنی فەرهەنگ و ڕۆشنبیریدا:-

هیلینستی لە ناوەڕۆکدا بریتییە لە شارستانییەتی یۆنانی کۆن (ئەغریقی) بە شێوەیەکی گشتی، یان بە دەربڕینێکی تر بریتییە لەو شارستانییەی کە هەڵگری هەموو بنەماکانی هزرو ڕۆشنبیریی ئەغریقییەکانە بۆ دەرەوەی ئاقاری یۆنان. دەرکەوتنی هیلینستە بۆ کاتی داگیرکردنی سوریاو میسرو عێراق و ئاسیا دەگەڕێتەوە لەلایەن ئەسکەندەری مەکەدۆنی، لە ساڵی (٣٣٣)ی پێش زایینی.

ڕۆشنایەتی ئەم دیاردەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بایەخی بە بڵاوبوونەوەی زمانی یۆنانی و دروست بوونی زمانێکی تایبەت و فەلسەفەیەکی نوێ لەو وڵاتانەی کە داگیر کراوەو بڵاوبووەتەوە لە هەموو ئیمبراتۆرییەتی ڕۆمانی، دەرکەوتنی بێ هێزی ئەم دیاردەیە بۆ چاخی تاریکی ئەورووپا دەگەڕێتەوە لەسەدەی چوارو پێنجی زایینی بەڵام دووبارە گەشەی کردەوە لە هەریەکە لە ئیتالیاو ئیسپانیا لەسەدەی چواردەهەمی زایینی.

زۆربەی مێژوونووسەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە گوایە سەردەمی هیلینستی سەرەتا لە هاتنی ئەسکەندەرو کۆتایی بە داگیرکردنی ڕۆما بۆ میسرو سوریا دێت، بەڵام مێژوو نووسەکان هاوکۆك نین لەسەر پێناسەیەکی گشتی هیلینستی، نزیکتر لە ڕاستی ڕێککەوتوونە لەسەری:

"... لەو سەردەمەدا شارستانییەتی هیللینی کۆن لەسەر بنەما بنەڕەتییەکەی بەردەوام بووە لە ناوەڕۆکدا بەڵام لە کرۆکدا تێکەڵاوبووە بە بنەماکانی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی، لە دەرهاویشتەی ئەو تێکەڵبوونەی هەردوو ئەو شارستانییەتە بووەتە هۆی کۆکردنەوەی ڕووکاری

هەردوو شارستانییەتی ئەغریقی و ڕۆژهەڵاتی، هەر بۆیە شارستانییەتی سلۆقییەکان تێکەڵاوییەکی شارستانی بووە لە هەموو ئاقارەکانی ڕۆژهەڵاتدا".

سەرەتای ئەم دەست پێکردنەی ئەسکەندەر لەوەدا سەرچاوەی گرت کە هەستا بە ڕێنمایی گەورە ئەفسەرەکانی سوپاکە بۆ ژنهێنان لە ڕۆژهەڵات، بۆیە گەورەترین ژن هێنان لەنێوان نەوەو کچی فارسی لەگەڵ نەوەو کوڕی یۆنانی.

"...هیللینیزم، واتا سەرەتای دەست پێکردنی چەرخێك بوو کە شارستانییەتی یۆنانی تێدا بڵاو دەبۆوە، لەبەر ئەوەی ئەم شارستانییەتەو کەلچەرە ببوو بە ڕووداوێکی جیهانی، دەتوانرێت بگوترێت، کەوا وڵاتی یۆنانی خۆی بەلایەك لەلایانی ئەو جیهانە کەلچەرییە فراوانە دەژمێردرا کە پەلی هاویشتبووە ناوەراستی ئاسیاو هیندستان و سەرووی ئەفریقیاو ئەوروپا تا ئەو وڵاتانەش کە کەوتبوونە سەر ئەتلەنتیك و دوورگەی بەریتانیا، بەڵام لێرەدا دەبێت ئەوە بزانین کەوا گرنگ نییە هەر میللەتێك بە یۆنانی قسەی نەکردبێت نەکەوتبێتە ژێر کاریگەری کەلچەری هیللینی تەنانەت چینی دەسەڵاتدارێتی دەوڵەتی (پورپ) کە دووژمنی ڕۆمان بوون لەم ڕووداوە ڕزگاریان نەبووە[٢٣].

لە ڕاستیدا هیللینی لە یۆنان بوو بە شێوازێکی دیارو تایبەت لە شێوازەکانی ژیان، لەسەرەتادا خۆی لەنێو یاسایەکی سەرەکیدا دەنواند، کە ئەویش (دەوڵەتی شار) بوو، هەموو کەسێکیش، کە لەنێو شاردا پێرەو دەکرا، بە هیللینی دەژمێردرا با جیاوازی لە بنچینەو پەروەردە کردنیدا هەبووبێ ئەو شتەی کە ئەو کەلچەرە بەدیار دەخات سوود وەرگرتنی بوو لەو یاسایە، کە کردبوویە هۆیەکی کاریگەر بۆ دەربڕینی تێڕوانینێکی تایبەتی بۆ هەبوون (وجود)و کەوا ئادەمیزاد پێوانەی هەموو شتێکەو گەورەی هەبوونە، بۆیە دەتوانرێت بگوترێت، کەوا کەلچەری هیللینی یەکەمین کەلچەرە، کە باوەڕی ئاینزا (مذهب)ی برواهێنانی بەشێوەیەکی ئاشکراو دیار بە ئادەمیزاد هێناوە"[٢٤].

کەرکوکیش وەکو بەشێکی گرنگی کوردستان، پارچەیەکی دانەبڕاوبووە، لە گەشەکردنی لە چوارچێوەی ئەو سەردەمەی (هیللینی)دا ئەویش لە توانای کاریگەری ئەو بوژاندنەوەیە لە بوارەکانی فەرهەنگ و زمان و ڕۆشنبیری و تەلارسازیدا.

بەپێی ئەو پشکنینانەی کە لە کەرکوکدا ئەنجامدرا، گەلێك پاشماوەی ئەو سەردەمانەی هیللیزم دۆزراوەتەوە، بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە دەدات کە کەرکوکیش کەوتووەتە ژێر ئەو کاریگەرییەو بەپێی دوور نزیك کەوتووەتە چوارچێوەی ئەو گەشەسەندنە.

دۆزینەوەی کۆتەڵی خوداوەند (ڤینۆس)و چرادانێکی ئەو سەردەمە، دەوری بنیات نانەوەی قەڵای کەرکوك لە سەردەمی ئەسکەندەرو سلۆقییەکان لە ڕووی بیناکاری و بەکارهێنانی ئەو کەرەستانەی لە سەردەمی هیللیزم باو بووەو بەشێکیان لەو ماوەیەدا ڕووی تەلارسازی کەرکوکی ڕازاندۆتەوە.

کاریگەری هەموو بوارەکان دوورو نزیك دەوریان هەبووە لە خزمەت ئەو سەردەمەو توانیوویەتی توناکانی ئەو بوارە لە هەموو ناوچەکان بەپێی پێویست بقۆزێتەوە ئەگەر پشکنینی زیاتر بکرێت شوێنەوارەکانی کەرکوك و دەوروبەری هەڵبدرێتەوە بەڵگەی زیاتری ئەو پاشماوانە بەدەردەکەوێت.

لە ماوەی هاتنی سلۆقییەکان و تا کۆتایی دەوڵەتی ساسانییەکان، سەردەمێکی دوورودرێژی هەڵبەزودابەز بوو لە بەربەرەکانی لە ڕووی سیاسی و لە ڕووی ئاینییەوە تا ڕادەیەك چاك توانی هەریەکەی تێگەیشتنی بەرامبەر ئەوی تر یان لێکدانەوەی ڕووداوەکان ببێتە هەوێنی گەلێك کارەساتی خوێناوی، بەربەرەکانی ئایینی و پانتایی فراوانی لێکدانەوەکان بۆ بۆچوونە سیاسییەکان.

ئایینی جولەکایەتی و ئایینی زەردەشتی و بڵاوبوونەوەی دواتری ئایینی مەسیحی تا هاتنی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام دەوریان هەبوو لە پێگەیاندنی فەرهەنگێکی ڕۆشنبیری گەورە لەخزمەت پێگەیاندنی هزرو زماندا.

هەرچەندە لە هەندێك کاتدا بەربەرەکانییە ئایینییەکان زۆر خوێناویی بوونە، بەڵام سیاسەتی دەوڵەتەکان دەوریان هەبووە لە پێگەیاندنی ئەو سیاسیانەدا بەتایبەتی باڵادەستی ئایینێك بەسەر ئایینێکی تردا دەوری ئەو بەربەرەکانییەی فراوان کردووە.

"جوولەکەکانی کوردستان مێژوویەکی دوورودرێژیان هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمبراتۆرییەتی ئاشوورییەکان لەنێوان ساڵانی (٩١١-٦١٢)ی پێش زایین، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لەشکرکێشییەی ئاشوورییەکان بۆ سەر جوولەکەکانی فەلەستین و بەندکردن و تاڵان کردنیان و دابەشکردنیان بەسەر ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا"[٢٥].

بەشێکی ئەو بەندییانەی جوولەکەکان بەر کەرکوك کەوتووەو نیشتەجێی سەرقەڵا بوونەو لەدوایدا بەشێك لە گەڕەکەکانی کەرکوکیان ئاوەدان کردووەتەوە.

"هەر لە سەردەمی سەدەی یەکەمی زاینیدا، ئیمارەتێکی وەکو (حدیاب) لە شوێنی نێوان هەردوو زێدا ڕوویدا، کە (هەولێر-ئەربیل) پایتەختەکەی بووەو پەلووپۆی بۆ گەلێك شوێن هاویشتووەو هەموو شوێنەکانی ئاشووری کۆنی گرتووەتەوە، ئەم ئیمارەتە لەژێر ئاقاری دەسەڵاتی ئیمبراتۆرییەتی پرسییەکاندا (٢٤٧-٢٢٦)ی پ.ز بووە، چونکە ئەم ئیمبراتۆرییەتە بریتی بووە لە شوێن و ناوچەی نیمچە سەربەخۆ لەچوارچێوەی ئیمبراتۆرییەتەکە، کە ئیمارەتی (حدیاب) یەکێك بووە لەو ناوچانە"[٢٦].

لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە، سەرەتای هاتنی جوولەکەکان وەکو بەندی و لە دواییدا بەشداری کردنیان لە پێگەیاندنی فەرهەنگی ڕۆشنبیری و فراوانی ئیمارەتی (حدیاب) لەو شوێنەداو پەلهاویشتنی بۆ دەوروبەری کەرکوك، بێ سێ و دوو کاریگەری خۆی بینیوە لە سەرهەڵدان و تێگەیشتنی ئەو ڕۆشنبیرییەی تایبەت بە جیهانی جوولەکەو هزری زمان و فەرهەنگی جوولەکە.

مانەوەی جوولەکەکانی کەرکوك تا ساڵی (١٩٥٠) ژمارەیان نزیکەی (٣٨٦٣)[٢٧] هەزار کەس بووەو لە ناوچەکانی کفری و چەمچەماڵ و خورماتوو ناو کەرکوك بڵاوببوونەوە، بەڵام تاکو ئێستاکە گەلێك پاشماوەی شوێنەواری و دەسنووسیان

بەجێ ماوە بەڵگەی دەوڵەمەندی ئەو پێکهاتەیە دەگەیەنێت. لە ماوەی مانەوەی جوولەکەکان لەم شارەدا گەلێک پەرستگا (تەوراتگە)و قوتابخانەی ئایینیان بەجێ ماوە، بەلام زانیاریمان کەمە دەربارەی سەرەتاکانی هاتنی جوولەکەکان بۆ ئەم شارە، چونکە رێگەی پێ ناچێت، بایەخیان بە فەرهەنگی رۆشنبیری نەدابێت، پاشماوە شوێنەوارییەکان بەڵگەو گەواهی ئەو راستییەن.

بوونی گەلێک رێکخراوی جوولەکەو قوتابخانەی جوولەکەکان لە عێراق و کەرکوکدا پشت راستی بڵاوبوونەوەی فەرهەنگی ئەو پێکهاتەیە دەخەنەروو.

"دکتۆر جەمال رەشید لەو باوەرەدایە کە: راستی ناوچەی (حدیاب) لەوەدایە، بریتییە لە تێکەڵێکی هۆزەکانی (سکیسییە-میدی) تا لە دواییدا تێکەڵ کورد بوونە لەگەڵ پێکهاتەی ئارامی و بت پەرستی پاش ئەوەی هاتوونەتە نێو مەسیحییەتەوە دوای گەیشتنی ئەم ئاینە بۆ کوردستان"[٢٨].

"بە هۆی بوونی رێژەیەکی زۆر لە جوولەکە لە وڵاتی نێوان دوو رووبار، هۆکارێکی گرنگی سەرەتایی بووە لەسەدەی یەکەمی زایینیدا بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی، هەرچەندە بەڵگەی باوەرپێکراوی کاروبارەکانی کڵێسەمان نییە دەربارەی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لەنێوان دوو رووباردا، بەڵام بەڵگەی راستەوخۆمان هەیە کە لە سەدەی دووەمدا بڵاوبووەتەوە.

لە سەرەتاکانی سەدەی یەکەمی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحیدا، هیچ بەربەرەکانێیەک روویندداوە لەلایەن دەزگا سیاسی و موغەکانی ئایینی زەردەشتیدا، بەتایبەتی ئەگەر مۆژدە بەخشەکە لە ئایینی بت پەرستیدا هاتبێتە سەر ئایینی مەسیحی، بەلام گۆڕینی زەردەشتییەکان بۆسەر ئایینی مەسیحی قەدەغە بووە، زۆربەی ئەوانە لە فارس و چینی دەسەڵاتدار بوونە.

سەرەتا بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەی (حدیاب) یان ئەدیابین و دهۆک و سلێمانی و کەرکوک بڵاوبووەتەوە، لەسەدەی چوارەمی زایینیدا گەلێک ئەسقەف و قەشەو ئەبرەشیەکان لەو ناوچانەدا بڵاوبوونەتەوە"[٢٩].

لە پاڵ بڵاوبوونەوەی ئەم ئاینەدا کە لەرووی ئایینییەوە گرنگی خۆی هەبووە، لەهەمان کاتدا لەرووی فەرهەنگی رۆشنبیریشەوە دەورێکی باڵای هەبوو لە نووسینەوەی مێژوو بڵاوبوونەوەی زمانی ئارامیدا.

ئەوانەی کاریان کردووە لە خزمەت رێنمایی ئەم ئایینە هەوڵیانداوە، بایەخێکی زمانەوانی ئایینی بەکاربهێنن یان گەلێک بێژەتی ناوچەیی بخەنە خزمەت چوار چێوەی زمان و ئایینەکەیانەوە.

هەر لەم روانگەیەوە گەلێک قوتابخانەی ئایینی لەو ناوچانەدا کراوەتەوە لەپاڵ دێرو کڵێسەکاندا بۆ فێربوونی زمان (بەتایبەتی زمانی ئارامی)و فەرهەنگی ئایینی، بۆ ئەوەی خزمەتێکی گەورەی زمان و ئایینەکە بکات، پاشماوەی کڵێسەکان لە کەرکوک هەمان ئەو شوێنانە بوونە دەوریان بینیوە لە پێگەیاندنی قوتابی ئایینی و پەروەردەکردنی بۆ نووسین.

"کەرکوک لە رابردودا گەلێک قوتابخانەی مەسیحی تێدا بووە، گەورەترین و بەرزترین پێگەی ئەو قوتابخانەیە وەکو ئەوەی کە (مەلفان دنحا) لە سەدەی شەشەمی زایینیدا وانەی تێدا وتووەتەوە. بەناوبانگترین کەسێک کە لەم قوتابخانەیە پێگەیشتووە هەر یەکە لە (شەهید یەزدین)، (ئەسقەف تیتۆس)و (مەتران شوحلمارن) بووە"[١].

لە دوای هاتنی (ئەخمینی)یەکان و بایەخیان دانیان بە فەرهەنگ و شارستانی میدییەکان داو لە کاروبارەکانی دەوڵەتدا بەکاریان هێنا:

١. ئەخمینییەکان هەستان بە بەکارهێنانی زاراوەی میدییەکان بەتایبەتی ئەوانەی تایبەت بوون بە کاروبارە کارگێرییەکان.

٢. بەردەوامی و کارکردن لەسەر شێوازی کۆڵەگەی رێکخستنی کاروبارەکانی میدییەکان.

٣. چاککردن و چاکسازی حکومەت لەسەردەمی ئەخمینییەکان لەسەر ئەو بنەمایە.

لە پاڵ نووسینەوەی بابەتەکانیان بەخەتی بزماری، لەهەمان کاتدا بایەخیان داوە بە لێکۆڵینەوەو پشکنینی زمانە ئێرانییەکان[٣٠].

لە دوای بزربوونی داریوشی سێیەم ساڵی (٣٣١)ی پێش زایین، دوای شکاندنی لە گۆرەپانی شەری (گوگامیلا) لە سەرووی هەولێر، بووە هۆکاری رووخاندنی ئیمپراتۆرییەتی ئەخمینی لەسەر دەستی مەقدۆنییەکان و دانیشتووانی کەوتنە ژێر کاریگەری رۆشنبیری هیللینیستییە، نووسین تەنها نەمایەوە لە چوارچێوەی زاراوەی خوارووی رۆژئاوایی (فارسی کۆن) لەسەرخەتی بزماری، بەڵکو هەولدرا بەبەکارهێنانی زاراوەی ئێرانی سەروو (البرسییە)و بە خەتی ئارامی و ئەغریقی (لەنێوان سەدەی دووەمی پێش زایین و سەدەی سێیەمی زایینی)، کوردیش کەوتە داوی نووسینەوەی بەڵگەکانی و لەژێر کاریگەری ئەواندا بوو[٣١].

بەلام دەتوانین ئەو راستییە بڵێین کە زمانی کوردی زمانی نووسین و زانست بووە تا رووخاندنی دەوڵەتی ساسانی و سەرهەڵدانی دەوڵەتی (ئومەوی)، بەڵام لە دواییدا کەوتە ژێر کاریگەری زمانی عەرەبی و بووە پێگەی نووسینەوەکانی و بە یەکێک لە نووسینی ئارامی دادەنرێت.

پێش ئەو ماوەیە کورد زمان و فەرهەنگ خەت و پیتی خۆی هەبووەو بەکارهێنراوە، بەڵام هاتنی ئیسلام هەموو ناوچەکانی کوردستان کەوتە ژێر کاریگەری ئەو ئاینەوە.

*** سەرچاوەکان:**


١- قواعد اللغة السومرية، د.فەوزی رەشید، وزارە الإعلام، مديرية الثقافة العامة، بغداد، ساڵی ١٩٧٢، لاپەرە (٢٦).
٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٧).
٣- تأريخ العراق القديمة، بەرگی دووەم، طه باقر، دکتۆر فازڵ عەبدولواحید عەلی، دکتۆر عامر سلێمان، چاپخانەی (جامعة بغداد) ساڵی ١٩٨٠، لاپەرە (١٦٢-١٦٣).
٤- خزائن الكتب القديمة في العراق، گۆرگیس عەواد، چاپخانەی (المعارف) بەغدا، ساڵی ١٩٤٨، لاپەرە (٦٩-٧٢).
٥- گۆڤاری (سۆمەر)، لاپەرە ٤٤.
٦- لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، د.جەمال رەشید، ١٩٨٨ دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، لاپەرە (٢١٠-٢١١).
٧- ئەم بابەتە لەسەر تۆری ئەنتەرنێت بڵاوکراوەتەوە.
٨- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی ئاشوری و میتانی لە تۆری ئەنتەرنێت وەرگیراوە.
٩- گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە ٩، ساڵی سێیەم، ١٩٩٩. لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: "زمانی ئاشووری لە ئیمبراتۆرییەتی میتانیدا" نووسینی فولغرام ڤۆن زوون، لاپەرە ١٨.
١٠- گۆڤاری هەزار مێرد، ژمارە ٢٥، ساڵی حەوتەم، ٢٠٠٤ لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:"نوزی لە هەزارەی دووەمی پێش زاینیدا، کامەران کویخا جەلال" بەشی یەکەم، لاپەرە ٢٦-٢٧.
١١- گۆڤاری هەزار مێرد، ژمارە ٩، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٢٠.
١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٢٢.
١٣- گۆڤاری هەزار مێرد، ژمارە ١٠، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی "نوزو عاصمة اتحاد الولايات الشرقية الخورية- دکتۆرە رافیدە عەبدوڵڵا عەبدولسەمەد" لاپەرە ١٨٦.
١٤- لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، د.جەمال رەشید، ساڵی ١٩٨٨، لاپەرە ٢٦٨-٢٦٩.
١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٢٧٠.
١٦- موسوعة قصة الحضارة، ول دايريل ديورانت، بەرگی سێیەم، بڵاوکراوەی (دار النشر نوبليس) لاپەرە (٣٠-٣١).
١٧- لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٢٩١ .
١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٩٨-٢٩٩).
١٩- میدیا، ئی.م.دیاکۆنۆف، ١٩٨٧، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، لاپەرە ٥١٠-٥١١.
٢٠ -هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤١٧.
٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤١٨.
٢٢- لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٣٠٤.
٢٣-هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٩٨.
٢٤-هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٠٠.


* هیلینزم:
ناوی هیللینزم واتای کەڵچەرێك دەردەبڕێت، کە رەگەزی یۆنانی توانایەکی دیاریکراویان لە دەرەوەی وڵاتی خۆیاندا تێیدا هەبووەو لە نێوی (هیللاس- Hellas)ەوە دارێژراوە. لەسەرەتادا ناوی ناوچەیەك بووە لە دەوروبەری بەشی باکووری کەنداوی (مالیا) لەلای ئەو سنوورەی، کە نێوەراستی وڵاتی یۆنان لە باکوری جیا دەکاتەوە، دوور نییە وشەی (هیللینی) مانای (خەڵکی هیللاس) بگەیەنێت، کە مانا فراوانەکەی بۆ ئاماژەی ئەندامانی کۆمەڵەی هیللینی وەرگیراوەو بە رێگەی بەکارهاتنی بۆ ناوی کۆمەڵێك گەلانی یەکگرتووی ناوچەی بروانە:
التأريخ اليوناني، عەبدوللەتیف ئەحمەد عەلی، بەرگی یەکەم، بەیروت، ساڵی ١٩٧٦، لاپەرە ١٠٩.


٢٥- ملامح من التأريخ القديم اليهود العراق، ئەحمەد سووسە، مركز الدراسات الفلسطينية، زانکۆی بەغدا، لاپەرە (٢٠).
٢٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٠.
٢٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٧.
٢٨- دراسات في تأريخ اليهودية والمسيحية في كوردستان، د.فرست، مرعی، لاپەرە ١٤.
هەروەها بروانە:
ظهور الكورد في التأريخ، د.جەمال رەشید، ٢٠٠٣، لاپەرە ٢٦٠.
٢٩- گۆڤاری (مسارات)، ژمارە ١٤، ساڵی پێنجەم ٢٠١٠، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی "جذور المسيحية في العراق حتى دخول الإسلام"، دکتۆر سوها رەسام. لاپەرە ١٨-١٩.
(٣٠) (مدارس العراق قبل الإسلام)، روفائيل بابو ئیسحاق، (دار الوراق للنشر المحدوده)، لەندەن، ٢٠٠٦، لاپەرە ١٤٥.
٣٠- ظهور الكورد في التأريخ، هەمان سەرچاوەی پێشوو بەرگی دووەم، لاپەرە ٤٥٤.
٣١- هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٩٣).

*** خوێندن و نووسین لە ماوەی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ناوچەی کەرکوك:-**

**سمکۆ بەهرۆز**
**ئاریان جەمال هەرزانی**

پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، ئەو ماوە مێژووییەی لە ناوچەکەدا سەری هەڵدا بوو بە هۆکاری گەشە کردنی گەلێك زمان و زاراوەی ناوچەیی گرنگ کە خۆی بینیوە لە سەرهەڵدانی زمانە ئێرانی و زمانی کوردی و زمانی فارسی و گەشە کردنی گەلێك زمانی ناوچەیی گرنگ.

کەرکوك بەشێکی گرنگ بوو لەو سەرهەڵدانەو پشکێکی گەورەی بەرکەوت لە گۆڕان و پێشکەوتن و بەرەوە پێش چوونی گۆڕانە زمانەوانییەکان.

گۆڕانەکانی ئەو کەلتوورو شارستانییەتیانەی دەوری باڵای بینی لە خۆ ئامادەکردنی پاشخانێکی زمانەوانی تا بەوەی توانی بەرەو رووی لە سەردەمەکانی لەو دوای خۆی بێت و کاریگەری خۆی بەجێبهێڵێت لەسەر بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام.

پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام هەموو نەتەوەکانی ئیمپراتۆرییەتی ساسانییەکان خاوەنی زمان و پیتی خۆی بووە لە تۆمارەکانی مێژووی خۆیدا، بەڵام بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام هەمووی راپێچایە نێو تێکدان و توانەوەی لە چوارچێوەی زمان و فەرهەنگی عەرەبییدا، کە تاکو ئێستا کە ئەو کاریگەرییە رەنگ و بۆو بنەمای خۆی بە جێ هێشتووە لە هەموو بوارەکاندا.

دیاردەیەکی تریش هەبوو، ئەویش لەپاڵ کاریگەرییە زمانەوانییەکە، کاریگەرییە جۆربە جۆرەکانی کەلتوورو شارستانیش دەوری بینی لە ژێر کاریگەری ئایین و کەلەپوری یەکتریدا یان ئەو نەتەوانەی هاتنە نێو ئایینی ئیسلامەوەو ئایینەکەی خۆیان واز لێ هێنا.

دوا شەری نێوان موسڵمان و ئیمپراتۆرییەتی ساسانییەکان وەرچەرخانێکی گەورەبوو لەگۆڕینی نەخشەی ناوچەکەو دووبارە دارشتنەوەی لەسەر شێوازێکی تر کە لەگەڵ خواستی دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا بگونجێنێت و ببێتە بنەمایەکی گرنگ لە خواستی جێ بە جێ کردنی بیروباوەری ئیسلام بۆ دروست بوونی دەوڵەت و گەشەکردنی پێگەی زمان لەو دەوڵەتانەی کە داگیر کرا.

لە (هەژدەی) کۆچییەوە، وەچەرخانێکی گەورەبوو لە داگیرکردنی هەموو ناوچەکانی کەرکوك و دەوروبەری بەتایبەتی لەسەردەمی خەلیفە (عومەر کوری خەتاب).

بەڵام هەموو بەڵگەکان ئەو راستییە یەك لا دەکەنەوە کە هەرلە داگیرکردنی تکریت لە (١٦)ی کۆچی هەموو ناوچەکانی دەوروبەری تکریت کەوتە دەست هێزی ئیسلام و داگیر کرا:

"زۆر لە مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکن کە گیرانی (تکریت) لە ساڵی ١٦ ی کۆچی دابووە.

کاتێك هەواڵ گەیشت بە (سەعد کوری ئەبی وەقاس) کە خەڵکی موسڵ و کوردە (شەهارجەکان) و هەندێ هۆزی عەرەب بە هەموڵی سوپایەکی بێزەنتی بە فەرماندەی (ئەنتاق) لە تکریت ئۆردوویان خستووە، سەعد نامەیەکی بۆ خەلیفە عومەر ناردو ئاگاداری کردەوە، خەلیفە عومەریش وەڵامی دایەوەو فەرمانی پێدا لە شکرێك بنێرێتە سەریان بە فەرماندەی (عەبدوڵڵا کوری ئەلمعتەم) و لە پێشەنگی دا (رەبعی کوری ئەلئەفکەل ئەلعەنزی) بێت و لەسەر سوارە (عەرەفەجە کوری هەرسەمە ئەلبارقی) بێت.

ئەم لەشکرە بەرەو شاری تکریت کشان و ژمارەیان پێنج هەزار جەنگاوەر بوو، گەیشتنە تکریت و بۆ ماوەی چل رۆژ گەمارۆیان داو لەو ماوەیەدا (٢٤) جار پەلاماری هێزی بەرگری ئەم شەرەیان دا بەڵام سوودی نەبوو نەیانتوانی لە شووراکانی ئەم شارە بپەڕنەوە بەهۆی پتەوی شووراکان و بەرگری توندی جەنگاوەرانی نێو شووراکە.."[1]. بەڵام لە دوایدا و بەهۆی فرت و فێڵەوە توانیان داگیری بکەن.

ئەوەی لێرە دا گرنگە هاتنی ئایینیی ئیسلام داگیرکردنی ناوچەکان پاشەخانێکی گەورەی دروستکرد، تا لە دوارۆژدا ببێتە دەورێکی باڵا لە تێکەیشتن بۆ زمانی عەرەبی و کاریگەری بەسەر زمانەکانی تردا، بەڵام نەیانتوانی ئەو هاوسەنگییە دروست بکات وەکو ئەوەی لە هێرشەکاندا بەرچاو دەکەوت، چونکە کاریگەری زمانی عەرەبی بەسەر داموو دەزگانی دەوڵەت زۆر بەسستی رێچکەی خۆی دەگرت.

هەر لەم روانگەیەوە بوو زۆربەی یەکە کارگێری و زمانی دەزگاکان زمانی نەتەوەکانی ئەو ناوچانە بوونەو تا سەردەمی عەباسییەکان رۆڵی خۆی بینی:

"تا دوا دوایی فەرمانرەوای عەباسییەکان، زمانی خوێندن و نووسین لە کوردستان کوردی بوو، لەوە بەولاوە لەسایەی.. بێگانە پەرستەکان و چەند کوردێکی ناپاك و دڵرە شەوە رووناکی چرای زمانی کوردی رووی لە خامۆشی کرد.

لە چاخی (عەبدولمەلیك کوری مەروانی) ئەمەویدا لە هەموو کوردستاندا زمانی دەوڵەتی لە دائیرەکان و قوتابخانەو مزگەوتەکاندا کوردی بووە، هەر چەندە تەواوی دەفتەرو کاروباری دەوڵەت و مووچە خۆرەکان لە بندەستی عەرەباندا بوو، بەڵام دانیشتووانی هەموو وڵاتێکی کتێبی قانوون و دەفتەرەکانی دیوانی و نووسین و کاروباری دەوڵەتی بە زمان و خەتی وڵاتەکەی خۆیان بوو.

کوردەکانیش وەکو (میسر) و (شام) تەنها زمان و خەتی کوردییان لە کوردستاندا بە کاردەبرد، دیوان و دەفتەرداری عێراقی بەتەواوەتی لە ژێردەستی کورداندا بوو، زمانی رەسمی تەنها کوردی بوو.

لە چاخی (حەجاج)دا تەواوی دیوانەکانی میری لە ژێر چاودێری کوردێکدا بوو کە ناوی (زادان فەردووخ) بوو ژێردەستی نووسەرکانیش ناوی (سالح کوری عەبدولرحمان) بوو، کە موسوڵمانان باوکی ئەویان لە لایەکی ترەوەی کوردستانەوە بە دیلی هێنابوو.

لە رووی ئەوە کە (سالح) لە لای (حەجاج) رێز و قەدری نەدەگیرا، پێشی شەرم بوو کەلە ژێردەستی (زادان فەرووخی)دا بژی دەماری توندبوو، رۆژێك بە زادانی گوت:

(ئەمیر بۆیە رێزم ناگریت چونکە بەهۆی تۆوەیە، ناشمەوێ بگەمە پایەیەك لە تۆ بەرزترو پێش تۆ بکەوم).
(زادان فـەرووخ) گـوتـی: (دلـی خـۆت بەشتی وا سەغلەت مەکە، ئەوەندە بزانە کە ئەمیر پێوستی بە من هەیە، چونکە لـە مـن بـەدەر کەسێکی تـری دەسـت نـاکـەوێـت کـە هەموو کاروبارەکانی دیوانی پێ هەلسوورێنی). (سـالح) گوتی: (من دەتوانم هەمووی هەلبسورێنم، حەزیش دەکەی هەمووی دەتوانم وەربگێرمە سەر زمانی عارەبییەوە).
زادان گوتی: (نەکەی شتی وا بکەیو دەستت هەلبوەرێ، ئەگەر شتی وا بکەی).
بەلام شۆفاران ئەو مشتوومرەیان بە گوێی (حەجاجدا) دادوا، سەبارەت بە تێکدانی زمانی کوردیو زادان مەرووخیان بە کووشت دا لە هەراکەی (ابن اشعث)و بەکووشت چوو لەو کەینو بەینەدا، (حەجاج)، سالحی لە شوێنی ئەو داناو تکای لێکرد کە هەموو دەفتەرو کاروباری دەولەتی لە کوردییەوە بگۆرێتە سەر (ئارەوی – عەرەبی) (مەر دانشا کوری زادان مەرووخی) چووە لای (سالح) زۆری لەبەر پارایەوەو هەولیدا کە پێش بەو کارە بگرێتو پەشیمانی بکاتەوە بەلام کاتێك نائومێد بوو لە سالح پیێ ووت:
(خوارشیەت لە دونیادا هەلکەنێتو پەنجەکانت هەلوەرێنێت، هەر وەکو زمانی کوردیت لە رەگو ریشەوە دەرهێنا).
تا ئەو دەمەی پارەی ئیسلامیانیش لە وولاتی کوردستاندا هـەر بە زمـانو خەتی کـوردی بـوون، ئەویش لەناو چوون هەموو ئەوانەش کورد بوون لە کاروبارەکان دەرکرانو یان لە ناو چوون، کە ئەمە تا دوا فەرمانرەوای عەباسییەکان درێژەی کێشاو زمانی کوردی بە دزی لە شوێنەکانو مالان دەخوێنراو دەنووسرا وەکو نامیکلەکانی ئاوێستا، زەند، بازند، زەند ئاوێسا، دیوانی باب تاهیر، شیرینو فەرهادو شیرینو خەسرەو، رۆستەمو گەلێك تر"[٢].
بەپێی بەلگەو سەرچاوە عەرەبییەکان ئەو راستییە یەکلا دەبێتەوە کە زمانی عەرەبی وەکو زمانی کارگێری نووسین بە کارهاتووەو لە سەردەمی عەباسییەکانەوە دەست کراوە یان کار لە بە عەرەبی کردنی دیوانو دەزگاکانی خوێندن کراوە، ئەویش لەبەر نەبوونی شارەزایی لە زمانی کاروبارو کارگێری دەولەتەکەداو بە بوونی شارەزا لەو بوارەدا.
سەرقالی عەرەبەکان بە داگیرکارییو شەرو بگرەو بەردەوە نەدەپەرژانە سەر ئەوەی کاریگەری خۆیان لە بواری نووسینو خوێندنو کارگێریدا بسەپێنن، بۆیە لە هەولی ئەوەدا بوون دۆخەکە وەکو خۆی بمێنێت، زیاتر کار لە بوارە سەربازیو سیاسییەکەدا بکەن، کارکردن لە بواری خوێندنو نووسین لە هەموو ناوچەکان وەکو خۆی مایەوە، چونکە نەیاندەویست گۆمەکە زیاتر بشەلەقێ تابۆ ئـەوەی تـووشـی راپـەریـنـی جەماوەری نەبن، تا بۆ ئەوەی کارەکەیان بە رێچکەی خۆیدا بروات.
هەر لە سەردەمی خەلیفە (عومەر کوری خەتاب)دا هەستیان بە مەترسی ئایینەکانی تر کردبوو، بۆیە هەولیان دا بە کۆکردنەوەی کتێبی ئایینەکانی تر وەکو ئایینی زەردەشتی، لەبەر ئـەوەی لـە رووی زمـانو ئـەدەبو نووسینەوە زۆر گرنگ بوو، بەلام نەیاندەتوانی بە شێوەیەکی فراوان کار لـەسـەری بکەن نەکو تـووشـی راپـەریـنو هـەلـگـەرانـەوە لە ئایینەکەدا بێت، تا کار گەیشتە ئەوەی لە سەردەمی کۆتای عەباسییەکان بە تەواوەتی کاریان لەسەر سووتانو تێکدانو بە دواداگەرانی زمانو فەرهەنگی نەتەوەکان دەکردو کاریان لەسەر قەدەغەکردنی دەست پێکرد، نەشارەزایی عەرەبەکان لە بواری کارگێریدا، وای کرد نەتوانن بە شێوەیەکی خێرا کار لەسەر گۆرینی زمانو فەرهەنگی ناوچەکان بکەن، پێوستی کەسی پسپۆر دەوری هەبوو، لەبەگەر خستنی ئەو بووارە.
"ئێمە هەموومان دەزانـین کە فەرمانرواییی ئەمەوییەکان لەسەر فشار خستن لەسەر خەلكو بەکارهێنانی توندوتیژی دامـەزرابـوو. ئەو جۆر فەرمانرەواییەو ئەو سروشتەی کە خەلیفەکانی لەسەری راهاتبوون سروشتێکی خێلەکیو لادێـیـانـە بـوو، لـەگـەل زانـسـتو زانـیـاریـدا نـەدەگـونـجـا و تەنیا چێژیان لە شیعرو ووتاربێژیو پەندی پێشینانیان وەردەگـرت تەنها شانازییان بە شمشێرو زمانـەوە دەکرد هەر وولاتو شوێنێکیان بە غەزا بخستایە ژێر حوکمرانی خۆیانەوە، تەنیا بۆ خۆیان رەوا دەبینی فەرمانرەوای تیا بکەنو دەرفەتی غەیری خۆیانو خەلکی شوێنەکەیان نەدەدا دەست بخاتە ناو کاروبارەوە، ئەم رەوشتە کە نەیان دەتوانی وازی لێ بێنن ناچاری کردن کە بەپێی پێوستی خۆیانو بەرژەوەندییەکانیان بایەخ بە خوێندنو نووسین بدەن، بەلام لەناو چوارچێوەی قورئاندا، تا ئەوانەی کە دەکران کاربەدەستی ناوچەو ولاتە داگیرکراوەکان هیچ نەبێ ئەو قورئانەی کە ئەوانی گەیاندە ئەو پایەیە بزانن بیخوێننەوە.
لە هیچ سـەرچاوەیـەکدا بـەرچاوم نـەکـەوتـووە کە ئەوانە بیریان بۆ تروسکەیەك چووبێت بۆ دامەزراندنی قوتابخانەو پەروەردەی مندالان جوولابێ"[٣].
ئەوەی لە سەرچاوەکاندا بەرچاو دەکەوێت کەرکوك وەکو پاشماوەیەکی دەولـەتـی ساسانی کـەوتـە ژێـر دەسـەلاتـی ئومەوییەکان بەلام هیچ گرینگییەکی پێ نـەدراو لە رووی کارگێرییەوە بەشێکی لکێندرا بە کوفەوە بەشەکەی تری بە شوێنێکی تـرەوە، ئەم دابەشبوونەی ناوچەکە کاریگەری خۆی بەجێ هێشت لەسەر هەموو بوارەکانی کارگێرییو ئابووریی و رۆشنبیریی و خوێندنو تەنانەت تەلارسازیش.

*** داقوق وەکو بنکەیەکی ئەدەبیو زانستی لە دەولەتی ئیسلامیدا:**
هەر لە سەردەمە جیاجیاکانی ئیسلامدا داقوق بنکەیەکی گرنگی زانستو ئەدەب بووە لە دەولەتی ئیسلامدا، گەلێك زانای جۆربەجۆریان تیادا هەلکەوتووە کە بە ناوبانگ بوونە لە ئاقاری دەولەتە ئیسلامییەکان، بەشدارییان کردووە لە ژیانی زانستی لە شارۆچکەی داقـوقو دەرەوەیـدا، بەلام دەربـارەی دەزگا فێرکارییەکانی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە خوێندن تێیدا لە مزگەوت بـووە، بـەلام دەربـارەی بوونی قوتابخانەکان تەنها ئاماژەیەك بە بوونی قوتابخانەیەك دەکات لە شاری (کەرخینی) کە بەناوبانگترین بوارە زانستییەکانی بەم جۆرە بووە:-

*** زانستی فیقە:-**

لەم بوارەدا لە شارۆچکەیەکی وەکو داقوق گەلێك زانای شارەزا لە بواری فیقە سەریان هەڵداوەو خزمەتیان بە هەموو بوارەکان کردووە لە دەرەوەو ناوەوەی شارۆچکەکە، نموونەیان بریتییە لە:

١. (عەبدوڵڵا کوڕی حوسێن کوڕی دەلال کوڕی دەلهەم ئەبو ئەلحەسەن ئەلفەقییە ئەلکەرخی)، کە خەڵکی (کەرخ جەدان) بووە، لەساڵی (٨٧٤)ی زایینی لەدایکبووە، لە بواری خوێندندا فیقهی (ئەبی حەنیفە)ی خوێندووە، لە ساڵی (٩٥١)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[٤].

٢. (ئەبو ئەلفەرەج ئەلبەجلی ئەلبەوازیجی)، خوێندنی فیقهی لەلایەی (ئەبی ئیسحاق ئەلشیرازی) خوێندووە، هەروەها گوێگری وتارەکانی (ئیبن ئەلموهتەدی) بووە لە بواری فیقهدا، تاوەکو ساڵی (١٢٠٧)ی زایینیدا ژیاوە[٥].

٣. (ئەحمەد کوڕی سەلامە کوڕی موخەلەد کوڕی ئیبراهمی ئەلبەجلی ئەلکەرخی ئەبو عەبّاس)، بە ناوبانگە بە (ئیبن ئەلروتبی)، لە بنەڕەتدا خەڵکی (کەرخ جەدان) بووە، لە ساڵی (١٠١٥)ی زایینییدا لەدایکبووە، لە زیرەکیدا لە بواری فیقهدا هەموو کاتێك باسی هاتووەو وەکو نموونە هێنراوەتەوە، هەروەها شارەزایی تەواوی هەبووە لە زانستی (النظر، التحقیق)، لە ساڵی (١٠٣٣)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[٦].

٤. (سالم کوڕی عەبدولسەلام کوڕی عەلون کوڕی عەبدون کوڕی ئەلروبیع کوڕی ئەلمەرجی ئەلسوق ئەلدەقوقی)، بەناوبانگە بە (ئەلبەوازیجی)، لە ساڵی (١١٨٤)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[٧].

٥. (شێخ شەهاب ئەحمەد کوڕی ئەلنەزیر ئەلدەقوقی)، کە لە ساڵی (١٢٢٣)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[٨].

٦. (سەعید کوڕی مەودود کوڕی سەعید کوڕی ئەلسەبەح کوڕی ئەلموبارك)، لە ساڵی (١٢٣٣)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[٩].

٧. (ئەبو ئەلقاسم مەنسور کوڕی عومەر ئەلکەرخی ئەلفەقییە ئەلشافعی)[١٠].

*** زانستی ئەلحەدیس (الحدیث):**

یەکێکە لە سەرچاوەکانی تەشریعی ئیسلامی، کە بریتییە لە هەموو ئەو قسانەو کردارانەی یان ئەو شتانەی کە پێغەمبەر محەمەد (درودی خوای لەسەر بێت) بە باشی زانییوە، ئەم زانستەیش گرنگی خۆی هەیە لە دوای قورئانەوە[١١]. لەبەر گرنگی ئەم زانستە گەلێك زانای بە ناوبانگی تێدا هەڵکەوتووە کە بە گەلێك شوێنی جیهاندا گەڕاون، وەکو:

١. (محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی ئەلحەسەن کوڕی عەزە کوڕی ئەلموغیرە کوڕی سالح ئەبو بەکر ئەلکەرخی)، کە خەڵکی (کەرخ جەدان) بووە، لە ساڵی (٩١٤)ی زایینی لەدایکبووە[١٢].

٢. (محەمەد کوڕی ئەحمەد کوڕی سەنعون کوڕی یەحیا کوڕی عەبدئەلسەید کوڕی ئەلفەزڵ کوڕی عەلی) بەناوبانگ بە (هادی ئەبو عەبدوڵڵا ئەلدەقوقی)، لە ساڵی (١٠٤١)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[١٣].

٣. (محەمەد کوڕی عەبدولباقی کوڕی ئەحمەد کوڕی سەلمان کوڕی ئەبو ئەلفەتح کوڕی ئەبو ئەلقاسم ئەلحاجب)، بەناوبانگ بە (کوڕی ئەلبەتی)، لە ساڵی (١٠٨٦)ی زایینی لەدایکبووە، لە ساڵی (١١٦٨)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[١٤].

٤. (ئەحمەد کوڕی عەبدولباقی ئەبو بەکر کوڕی ئەلبەتی)، لە ساڵی (١١٦٩)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[١٥].

٥. (ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی ئەلفەزڵ کوڕی بەختیار ئەلیەعقوبی ئەلواعین)، بەناوبانگ بە (بەهائەددین)و یان (الحوجحە)، لە ساڵی (١١٤٨)ی زایینی لە بەعقوبە لەدایکبووەو لە ساڵی (١٢٢٠)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[١٦].

٦. (عەبدولمونعم کوڕی محەمەد کوڕی ئەبو ئەلمەزا ئەلدەقوقی)[١٧].

٧. (ئەبو محەمەد موهەزەبەددین عەبدولرەزاق کوڕی ئەبی ئەلغەنائم کوڕی یاسین کوڕی ئەبی ئەلاعەلا ئەلدەقوقی ئەلعێراقی)، لە ساڵی (١١٧٤)ی زایینی لە داقوق لەدایکبووە، لە ساڵی (١٢٤٥)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[١٨].

*** زانستی (القراءات):**

ئەو زانستەیە کە لێکۆڵینەوە دەکات لە چۆنییەتی خوێندنەوەی بێژەت کردنی قورئان لە ڕووی جیاوازی خوێندنەوەکان و پۆلێنکردنی، ئەو زانایانەی کە لەم بوارەدا لەم ناوچەیە ناوبانگیان دەرکردووە بریتییە لە:

١. (ئیبن خەرستە ئەلبەوازیجی)، قوتابی (ئیبن سەعدون ئەلقوتبی) بووە، هەر حەوت خوێندنەوەکەی بە جوانی زانییوە، لە ساڵی (١٢٢٥)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە[١٩].

٢. (ئەبو محەمەد موهەزەب ئەلدین عەبدولرەزاق کوڕی ئەبی ئەلغەنائیم).

*** ئەو بابەتو زانستانەی لە مزگەوتە ئایینییەکانی کەرکوك دەخوێندرا:**

ئەگەر بێتو سەیری پرۆگرامی خوێندن بکەین لەو قوتابخانانەی کەرکوك دەبینین هاوپەیوەست بووە بە گەلێك بابەتی زانستی و ئایینیی جۆراوجۆر کە هەر یەکەی بەپێی پێویست لە قۆناغە جیاجیاکانی خوێندندا خوێندراوەو زیاتر لە چوارچێوەیەکی ئایینیی بایەخی پێ دراوە تا بۆ ئەوەی شارەزای هەموو لایەنە ئایینییەکان بن، قوتابی و مامۆستاش بەپێی پێویستی ساڵەکان بابەتەکانی خوێندنیان دابەش کردبوو تا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕێکوپێك پرۆگرامی خوێندن لە قوتابخانە ئایینییەکان بەڕێوەبچێت، بابەتەکان بریتی بوون لە:

١. زانستی قورئانی پیرۆز، ئەویش بریتی بووە لە (علم التفسیر، علم القراءات، علم التجوید، علم الخط والکتابة، علم الناسخ والمنسوخ، علم الجرح والتعدیل، علم اصول القران، علم النحو).

٢. زانستی (الحدیث)، بریتی بووە لە (علم روایة الحدیث، علم

دراية الحديث، علم اصول الحديث، علم نقد رواة الحديث، علم تدوين الاحاديث، علم سند الحديث).

٣. زانستی ئەلفیقە، بریتی بووە لە (علم الفقه، علم اصول الفقه، علم المذاهب الفقهية، علم الفرائض والحلال والحرام في القران، علم القانون والحقوق، علم الاقتصاد).

٤. زانستی زمانی عەرەبی، بریتی بووە لە (علم الصرف، علم النحو، علم اللغة والمعاجم، علم البلاغة، علم الاعراب، علم قوانين الكتابة، علم الادب، علم الشعر، علم العروض والقافية، علم النثر والمقالة والامثال والطرائف والقصص، علم الخطابة، علم النقد الادبي).

٥. زانستی فەلسەفەو مەنتیق.

٦. تەسەوفی ئیسلامیو زانستی مۆسیقا.

٧. زانستی دەروون زانیو هەڵسوكەوتی مرۆڤ.

٨. زانستی پەروەردە بە تایبەتی پەروەردەی ئیسلامی.

٩. زانستی پزیشكی، تایبەت بە زانستی پزیشكی مرۆییو ئاژەڵی.

١٠. زانستی مێژوو و جوگرافیا.

١١. زانستی (الكلام والعقائد والتوحيد).

١٢. زانستی ئەستێرە ناسیو ئاسمانو هەسارەكانی.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. (کوردستان و پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، سیاسییە)، شوان عوسمان مستەفا، ٢٠٠٢، سلێمانی، لاپەڕە (١٥٣-١٥٤).
٢. (فەرهەنگی مەهاباد)، گیو موکریانی، چاپی یەکەم، (٢٥٧٣)ی کوردی، لاپەڕە (٧٧٣-٧٧٥).
٣. (مێژووی پەروەردەو خوێندن لە حوجرەکانی کودرستاندا)، حەمە کەریم هەورامی، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٨، لاپەڕە (٢٤٢-٢٤٣).
٤. (تأریخ بغداد)، ئەلخەتیب ئەلبەغدادی، بەرگی دەیەم، لاپەڕە (٣٣٥).
٥. (تأریخ الإسلام)، ئەلزەهەبی، بەرگی دەیەم، لاپەڕە (٦٦٣).
٦. بڕوانە:
- (الوافي بالوفيات)، ئەلسەفدی.
- (سيرة إعلام النبلاء)، ئەلزەهەبی.
- (الإعلام)، ئەلزەرکەلی، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٢٧).
٧. (تأریخ الإسلام)، ئەلزەهەبی، بەرگی نۆیەم، لاپەڕە (٨٧).
٨. (تأریخ الإسلام)، ئەلزەهەبی، بەرگی دەیەم، لاپەڕە (٣٩).
٩. (قلائد الجمان)، ئیبن ئەلشەعار، بەرگی دووەم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٤٠ - ٤١).
١٠. (تأریخ بغداد)، ئەلخەتیب ئەلبەغدادی، بەرگی سیانزە، لاپەڕە (٨٧).
١١. (تأریخ الإسلام)، حەسەن ئیبراهیم حەسەن، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٢٦٩).
١٢. (تأریخ بغداد)، ئەلخەتیب ئەلبەغدادی، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٢٢٨).
١٣. (الوافي بالوفيات)، ئەلسەفدی، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٧٦).
١٤. بڕوانە:
- (الوافي بالوفيات)، ئەلسەفدی، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٠٩ - ٢١٠).
- (المنتظم)، ئیبن ئەلجەوزی، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٢٩).
١٥. (لسان الميزان)، ئیبن حەجەر ئەلعەسقەلانی، بەیروت، ١٩٨٦، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢١٠).
١٦. بڕوانە:
- (تأریخ الإسلام)، ئەلزەهەبی، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤).
- (المختصر المحتاج اليه من تأريخ ابن الدبيثي)، بەشی ١٥، بەیروت، ١٩٩٧، لاپەڕە (٥٩).
- (ذيل طبقات الحنابلة)، ئیبن رەجەب، لاپەڕە (٢٣٣).
- (الإعلام)، ئەلزەرکەلی، بەشی شەشەم، لاپەڕە (٣٣٠).
١٧. (تبصير المنتبه بتحرير المشتبه)، ئیبن حەجەر ئەلعەسقەلانی، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٣٦).
١٨. بڕوانە:
- (تأریخ الإسلام)، ئەلزەهەبی، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣١٨).
- (الوافي بالوفيات)، ئەلسەفدی، بەشی شەشەم، لاپەڕە (١٥٢).
- (نكث الهميان في نكت العميان)، لاپەڕە (١٩٠).
- (تكملت اكمال الاكمال)، جەمالەددین ئەبی حامید محەمەد کوڕی عەلی ئەلمەحمودی (ئیبن ئەلسابونی)، بەغدا، ١٩٥٧، لاپەڕە (٢٦٢).
- (صلة التكملة في وفيات النقلة)، ئەلحافیز عیزەددین ئەحمەد محەمەد کوڕی عەبدولڕەحمان (ئەلحوسێنی)، بەیروت، ٢٠٠٧، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٤٧ - ١٤٨).
١٩. (تأریخ الإسلام)، ئەلزەهەبی.

*** یادنامەی مەلاو فەقێ و کەلە پوورەکانیان لە کەرکوکدا**
**مەلا محەمەد سالح گونبەدی**

*** پلەکانی خوێندن لە دێرینەوە لە کوردستان:**
شتێکی روون و ئاشکرایە کە هەموو کارێك لەهەوەڵەوە یەك تەن نابێ باوەش بەهەموویدا بکرێت. بەڵکو وردە وردە مرۆڤ ئەبێ بەپێی ئەو کارەو چۆنییەتییەکەی هەنگاو هەنگاو پێدا برواو تیادا سەر بکەوێت، بێگومان ئازیزترین و بەبایەخترین کار کە ئادەمیزاد لەکاتەکانی دێرینەوە هەر هەوڵی بۆ دابێ و خۆی تیا ماندوو کردبێ ئەوە زانست و خوێدن بووە، لەبەر ئەوە کە ئەمەش رێگەی فێربوونی هەر تاقە شتێکە کە بەراستی مرۆڤ ئەگەیەنێت بەئامانج: ئەو تاقە شتەش بریتییە لەخوێندن، لەبەر ئەوە کە هیچ نەبووەو نەبینراوە کە مرۆڤ لەپرێکەوە ببێتە کورێك جا لەبەر ئەمانە هەمووی هەر لەکۆنەوە تێگەیشتووە پێ گەیشتوەکانی ناو وولاتەکەمان ئەم راستییەیان هێناوەتە کایەوە: دەبینی کە پلەیان بۆ خوێندن تەرخان کردووە ئەوجا. پلەی خوێندنیان بەش بەش کردووە بەم شێوەی خوارەوە:

یەکەم: پلەی قوتابییەتی.
دووەم: پلەی سووختەیی.
سێیەم: پلەی (مقدمات)، کە پێی وتراوە: جارجار: پلەی تازە (مستعد)یی، یا پلەی ناسکە (مستعد)یی.
چوارەم: پلەی (مستعد) یی، یان: (مستعد)یی تەواو.
پێنجەم: پلەی (آخر مادە).

هەر یەکێك لەم پلانە. فەقێ ماوەیەك تیا ماوەتەوە، چەند کتێبی تیا خوێندوە هەتا رەت بووە بۆ پلەیەکی بەرزتر، هەر بەم شێوەیە هەتا گەیشتووە بە پلەی (آخر مادە) کە پلەی پێش ئیجازە وەرگرتنە. جا لەبەر ئەمانە هەمووی، لەهەوەڵەوە خاوەنی ئەو منالە لە دێیەکەی خۆی منالەکەی دائەنا لەلای فەقێکانی ئەو دێیە. لەئەوێ منالەکە دەستی ئەکرد بەخوێندن هەتا (قورئان)ی پیرۆزی ئەخوێند لەگەڵ چەند وردە کتێبێك وەك کتێبی: عەقیدەی کوردیی و ئەحمەدییە، لەگەڵ لەبەرکردنیاندا هەروەکو مەولوود نامە لەگەڵ هەندێك لە دیوانەکانی خواجە، حافیزی شیرازیی، گولستان و، پەندی مەتار هەر ئەخوێندرا، ئەوکاتە ئەتبینی ئەم مندالە پڕ چەك بووە بەبیرو باوەرێکی پاك و خاوێن، زمانی فارسییەکی باش فێر بووە، ئەمجا لێرانەدا ئەم پلەیە بەتەواو بوو ئەژمێردرا. ئێرە بەدواوە پلەی دووەم دەستی پێ ئەکرد، لەم (پلەی تازەوە) کە ناو ئەبرا بە پلەی سوختەیی ئەگەر منالەکە بەچکەگەدا بوویێ یا بەچکە پاشا هەر لەئەم رۆژەوەی هەتا کۆتایی خوێندنی هەمووی بەیەك شێوەیەك لە پەروەردەو فێکردن بە یەك چاو سەیری هەمووی کراوە. جا لەئەم رۆژەوە کە ئەم منالە ویستی بچێتە پلەی سوختەییەوە. هەستاوە کۆڵ و بوخچەی پێچاوەتەوەو رۆیشتووە بە فەقێیەتی بۆ ناو مەدرەسەکان. لەم رۆژەوە ناوبراوە بە (فەقێ): کە تاشراوە لەوشەی (فقیە). ئەوجا لەهەر مەدرەسەیەك ئەوەندە کە خوا توانای پێ دابێ خوێندوویە، لەهەر جێگەیەك خوێندنی کردبێ نەهاتوەتەوە ماڵی بابی. مەگەر بۆ سەردان، یا لەبەر نەخۆشیی خوا نەخواستە، یا لەبەر پێویستی.

جا لەم پلەیەدا زۆربەی دەرسەکانی لە ئەم کتێبانە ئەبوو: (العوامل في نحو مائة عامل. شرح الأجرومیة. تصریف الزنجاني. بناء. عزی. صراح الأرواح) لەگەڵ لەبەرکردنیاندا تا ئەمەندەی ئەخوێند ناو ئەبرا بە تازە سوختە، دوای ئەم کتێبانە ئەمجا هەندێك لە ئەم کتێبانەشی ئەخوێند: (انموذج في النحو) لەگەڵ لەبەرکردنی مەتنەکەیدا. (تصریف ملا علي الاشنوي، اظهار للبرکوي، وضع واستعارة) کە لە نووسینی مەلا ئەبوو بەکری میر رۆستەمییە لەگەڵ لەبەر کردنیاندا، جا فەقێ لە کاتی خوێندنی ئەم کتێبانەدا ناوئەبرا بە دەستە سوختە. ئەمجا ئەم فەقێیە کاتی ئەوەی ئەهات دەست بکا بە (پلەی مقدمات) کە پلەی سێیەمە. جا لەم پلەیەدا کە بەشی (تازە مستعدیيە) لەهەوەڵەوە دەستی ئەکرد بەخوێندنی کتێبی جامی لەگەڵ لەبەرکردنی مەتنەکەی. ئەمجا ئەمانەی ئەخوێند: (فناري، عبد الله یزدي، شرح الشمسیة) لەگەڵ لەبەرکردنی مەتنەکانیاندا. کتێبی (سیوطي) لەگەڵ لەبەرکردن (الفیە)کەی، (شافیە)ش هەروا ئەمجا دوای ئەم کتێبانە دەستی ئەکرد بە پلەی چوارەم، فەقێ لەم کاتەی بەدواوە ناو ئەبرا بە (مستعد). یا (مستعدی تەواو). جا لەم پلەیەدا دەستی ئەکرد بەکتێبی (مختصر المعاني) یا بە (مطول) لەگەڵ (جامع الجوامع) لەگەڵ لەبەرکردنی مەتنەکانیان. کتێبی (تهذیب الکلام)، جا لەم کاتە بەدواوە کە کاتی پلەی پێنجەم ئەهات. بە فەقێکە ئەوترا: لە (پلەی آخر مادەیە) جا لەم پلەی دواییەدا ئەم فەقێیە دەستی ئەکرد بە خوێندنی (ریاضیات)، وەك (تشریح الأفلاك)، (أسطرلاب)، (رسالة الحساب). هەروەکو بایەخ ئەدرا بە (فن الحکمة)، هەندێك کتێب ئەخوێندرا لەم بوارەدا ئەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە فەقێ لە هەموو پلەیەك لەپلەکانی خوێندن زۆر کتێبی دیکەیانیش خوێندووە، بۆ ماوەیەکی زۆر هەر خوێندوویانە، زۆریان ماوەی سی ساڵ، تا چل ساڵ بەڵکو زیاتریش خوێندوویانە لەناو مەدرەسەکان، رۆیشتوونە بە وولاتەکاندا: چوونەتە وولاتی: (تورکیا، شام، میسر، حیجاز، کەنداو، ئێران، هیندستان، ئەفغانستان، پاکستان، بلخ، بوخارا).

هەر کەس بەتواناو هێزی خۆی خوێندنی کردووە، چونکە خوێندنی فەقێیەتی پەیوەند نەبووە بەدەستوورێکی دەوڵەتەوە. هەر وەکو گەراون بەهەر چوار گۆشەی کوردستانی خۆشەویستدا: لەهەر جێگەیەك مامۆستایەکی، بەهونەر، باسی کرابێ چوونە بۆ مەدرەسەکەی کە پیت و بەرەکەتی لێ وەرگرتووە لەو بەهرە دارانەی چوار چێوەی وولاتەکانی ئیسلام. هەروەکو فەقێ لەهەوەڵ پلەی خوێندنییەوە دەرسی (تفسیر، حدیث، فقه)ی هەر وەرگرتووە. تا دوا پلەی خوێندنی. زۆر بایەخی داوە هەردەم بە (اصول) لەگەڵ (عقائد) تا هەر یەکێك لەوانە بووەتە رێ رووناك کەرەوەیەك بۆ گەلانی ئیسلام بەگشتیی ئەوسا ئەوەی کە ویستوویە مەلایەتی بکا، نیشتەجێ ببێ، بۆ ئەوە کە هەستێ بەو ئەرکە بەدواوە. بۆ خۆی و گەلەکەی و وولاتەکەی و ئاینەکەی و

دەوڵەتەکەی. ئەو کاتە ئەم فەقێیە لەخزمەت ئەو مامۆستایە کە کتێبەکانی (آخر مادە)ی لەلای خوێندووە لەلای ئەو ئیجازەی عیلمی وەرئەگرت.

*** ئیجازەی عیلمی:**

ئەم ئیجازەیە: ناو ئەبرا بە ئیجازەی دوانزە عیلمی چونکە ئەو مامۆستا مجیزە وەك ئیجازەکەی ئەدا بە مجازەکە لەناو ئیجازەنامە نووسراوەکەدا روونی ئەکردەوە، ئەیەوت: ئەم (مجاز)ە شایانی ئیجازە وەرگرتنە لەم عیلمانە کە بریتین لە (عقلی)و (أصول وفروع) لە (عەرەبی)و (ئایین)، ئەمانەش بریتین لە دوانزە (مادە) جا هەر لەبەر ئەمە، بەم (إجازە)یە وتراوە: (إجازە)ی دوانزە عیلمی دەنا فەقێ لەم دوانزە عیلمە گەلێك زیاتر عیلمی دیکەشیان خوێندووە بەڵام چونکە ئەم دوانزە عیلمە پێویستە بۆ یەکێ بیەوێ شەرعی موسڵمانان بکا لەبەر ئەمە وتوویانە: ئیجازەی دوانزە عیلمی.

جا دوای ئەوە کە مەلایەك ویستی ئیجازە بدا بە فەقێیەك ئەوکاتە دەعوەتنامە ئەنێردرا بۆ مەلاو فەقێی ناو شارو دێیەکان ئەوەندە کە بگونجایە بۆ هاتن ئەوانەی هەبوون هەموو گرد ئەبوونەوە بۆ ئاهەنگو زەماوەند بەم هۆیەوە، بەتایبەتی لە شاری کەرکوکی خۆشەویستدا عادەت وا بوو چەند ڕۆژێك ئاهەنگو زەماوەند ئەبەسترا بەم بۆنەیەوە، لە ئەو مزگەوتە کە ئەم فەقێیە تیایە ئەیخوێند لەکاتی ئیجازە وەرگرتنی، جا بۆ هاوبەشی کردن لەم ئاهەنگە نامەی دەعوەتی ئەچوو بۆ هەموو مەلاو فەقێکانی ناوشار، هەر وەکو نامە ئەچوو بۆ مەلاو فەقێکانی دێیەکانی دەوروبەری شارەکەش، هەندێك لەو مەلاو فەقێیانەی ناوشارەکانی هەولێرو سلێمانیش جا بەپێی ئەو وەختە کە بۆ میوانەکان دانرابوو هەموو ئامادە ئەبوون، هەموو جارێکیش، ئەو کۆبوونەوەیە ماوەی سێ ڕۆژێك بۆی تەرخان ئەکرا پێش ڕۆژی ئیجازە خوێندنەوەکە ئەوجا شایی فەقێیانەو شایی هەر پێداو پێداو گۆرانی دەستی پێ دەکرد بۆ ماوەی ئەوەندە ڕۆژە کە تەرخان کرابوو بۆ ئەم شاییە، ئەمە هەر بەردەوام ئەبوو، لە بەیانیی دوای نان خواردن هەتا خۆرئاوابوون تا ڕۆژی هەینی کاتی نیوەڕۆ. بەڵام پاش نوێژی هەینی شایی و هەڵپەرکێ کۆتایی پێ ئەهێندرا چونکە کاتی خۆ ئامادەکردن ئەهات بۆ خوێندنەوەی ئیجازەنامەکە لەو مزگەوتە کە تیایە خوێندوویە. جا لەوێدا ئەگەر مزگەوتەکە فراوان ببوایە، یا لەنزیکترین مزگەوت کە وا جێگەکەی فراوان تر ببوایە. لەوێدا هەموو پێویستییەك ئامادە ئەکرا، وەك: قەنەفەو رایەخ و شەربەتو جگەرەو هەموو شتە پێویستییەکانی دیکەش. بۆ ئامادەبوونی ئاهەنگەکە لەکاتی خوێندنەوەی ئیجازە عیلمییەکە نامەی دەعوەتی ئەچوو بۆ هەموو پیاو ماقوڵان و لێوەشاوەکانی ناوشار. هەروەها بۆ سەرگەورەکانی وەك پارێزگارو بەڕێوەبەری پۆلیسو سەرۆکی شارەوانیو دادوەرەکانو ئەوقاف بەگشتی.

لەگەڵ بانگی عەسر هەموو دەعوەت کراوەکان ئامادە ئەبوون، دوای نوێژی عەسر یەکسەر لەکاتێکدا کە هەزاران مرۆڤ لەنەوەکانی ئەم گەلە لەخوا پەرستە، کۆ ئەبوونەوە لەدەوروبەری ئەم ئاهەنگە کە بۆ خوێندنەوەی ئیجازە نامەکە ئەبەسترا، هەموو سەربانەکانی چوار دەورەی ئەو مزگەوتە پردەبوو لەبینەران. باو وا بوو پێش ئیجازە خوێندنەوە بەچەند ڕۆژێك یەکێك لەپیاوە ماقوڵەکانی ناوشار مێزەرو جبەیەکی ئەکرد بە خەڵات بۆ ئەو (مجازە) جا ئەو ڕۆژە کە ڕۆژی هەینی بوو. وەك کاتی پێش ئیجازە خوێندنەوەکە ئەهات، بۆ کاتی ئامادەبوون بۆ ناو ئاهەنگەکە جێگەیەکی تایبەتی تەرخان ئەکرا بۆ (مجیز)و (مجاز)، لەوکاتەدا کە دوای نوێژی عەسر بوو، هەموو دەعوەتکراوەکان هەر کەس لە شوێنی خۆی دائەنیشتو چاوەڕوانی خوێندنەوەی (ئیجازە نامەکەیان) ئەکرد ئەوکاتە ئەو مێزەرو جبە خەڵاتییەکەیان ئەکردە بەر (مجازەکە) ئەیان برد بۆ ناو ئاهەنگەکەو دایان ئەنا لەو جێگە تایبەتییە کە بۆی تەرخان کرابوو، ئەویش لەدانیشتنیا پشتی ئەکەوتە میوانە بەڕێزەکان، رووی ئەکەوتە (مجیز)ەکە ئەو کاتە هەزار سەڵەواتت گوێ لێ ئەبوو. لەلای موسڵمانانەوە دوای ئەوە کە هەموو شت تەواو ئامادە ئەبوو، لەوکاتە دیاری کراوەدا (مجیز) ئامادە ئەبوو لەجێگەی خۆیو دوای خوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز بەخێرهاتنێکی گەرمی میوانەکانی ئەکرد بەگشتی، ئەو کاتە (مجاز)ەکەش هەڵ ئەستاو بۆ پێشوازی لەمیوانە بەڕێزەکانی وتارێکی پێشکەش ئەکردو بەخێرهاتنێکی گەرمی هەموویانی بەو وتارە ئەکرد. دوای پێشوازییەکی ئەو چەند وتارێك لەبارەی زانستو زانایانو ئایینەوە، پێشکەش ئەکرا لەلایەن لێ وەشاوەکانی وڵاتەکەمانەوە. ئەوجا (مجیز) دەستی ئەکرد بەخوێندنەوەی ئیجازە نامەکە بەدەنگێکی بەرزو زوڵاڵو بەشێوەیەکی زۆر لێ وەشاوەو باشو حەماسەوە بەخوێندنەوەی ئەم ئیجازەنامەیە بەتەواوی کۆبوونەوەکە کۆتایی ئەهات. هەموو لا پیرۆز باییان ئەکرد لە (مجیزو مجاز)، دووعای خێریان بۆ هەموو لا دەکردو خوا حافیزییان لە هەمووان ئەکرد.

*** مەساریفی ئیجازەی عیلمی:-**

جا با بێینەوە سەر باسی مەساریفی ئەو ئاهەنگو زەماوەندە کە لەماوەی ئەو ڕۆژانەدا کراوە. هەمو خەڵکی دەوروبەری ئەو مزگەوتانەی کەرکوك کە فەقێکە تیا خوێندوویەتی هەمووی ئەوان پێی هەڵ دەستان. دەست بەسینگەوە بۆی رادەوەستان هەرچەندێکیش لە هەموو لایەکەوە سوپاس بۆ یەزدان موسڵمانان خێرخوازان مەسرەفیان بەزۆری ئەنارد، یارمەتیان ئەدا بێوچان.

ئەمەش باسی ئەو مەسرەفانەیە کە ئەکرا:

ئەی برای شیرینم خەڵکی ئەو گەرەکە هەرکەس بەتوانای خۆی پارەی ئەدا: کۆیان ئەکردەوە. (ماشاء الله) خێرەومەند گەلێك زۆرە، لە حیسابی ئەو پارە کۆ کراوە، ڕۆژیی (سێ ژەم خواردن) دروست ئەکرا: ژەمی بەیانیو ژەمی نیوەڕۆو ژەمی نانی ئێوارە. هەر لەو مزگەووتەوە یا لەجێگەیەکی نزیك لەوێ ئەو میوانانە. کە بانگ کرابوون هەر سێ ژەمەکە نانیان ئەخوارد هەتا ئاهەنگو زەماوەندەکە تەواو ئەبوو. ئەوجا ئەو میوانانەش ئەڕۆیشتنەوە بۆ شوێنی خۆیان.

سەرت سوور نەمێنێ کە خەڵکی ئەو گەرەکە چۆن ئەو مەسرەفەیان کردووە ؟!!

چونکە، لەو سەردەمەدا مەلا و فەقێ گەلێك خۆشەویست بوونە جا دانیشتوانی گەرەکی ئەو مزگەوتە کە مەلاکەی لە ئاستی (مجین)ی بووایە فەقێکانی حوجرەکەی لە ئاستی (مجاز)ی بوونایە. ئەوەندە بەمە خۆشحاڵ دەبوون ماڵ و سامانیان نەدەهاتە بەر چاویان. چونکە ئەمە باشترین سەربەرزیی بوو، بۆ دانیشتوانی ئەو گەرەکە لە شارێکی وەکو کەرکوکدا.

*** پێشوازی و خەڵاتیی موجاز:-**

ئەمجا کە فەقێیەك ئیجازەی وەربگرتایە ئەتبینی زۆر کەس یارمەتی ئەهێنا بۆ ئەو مەلایە، جۆرەها خەڵات کراوە لە هەموو لاوە پیاوە گەورەکانی عێلەکانی ناوچەکەمان داوایان ئەکرد لە مجیزکە ئەو مجازە بۆ دێیەکەمان، لە حیسابی خۆمان هەموو پێویستییەکی بۆ ئامادە بکەین، دەست لەسەر کامە کچ لەدێیەکەمان دابنێ دەستبەجێ لێی مارە ئەکەین، خانووی باشی بۆ ئامادە دەکەین، ناوماڵی بۆ تەواو ئەکەین، بەدڵی خۆی مەدرەسەی بۆ دروست دەکەین و فەقێی بۆ رائەگرین و باشترین خزمەتیان ئەکەین، هەرچی پێویستە بۆی ئەکەین. بەس ئەو مجازە رازی بێ مەلایەتی دێیەکەی ئێمە بکا، لەدوای تەواو بوونی ئاهەنگی ئیجازەکە، ئەو دێیە کە مجازەکە دڵی بیگرتایە، هەموو پیاو ماقووڵەکانی لەخزمەت ئەو مامۆستا تازەیە ئەرۆیشتنەوە بۆ دێیەکەیان، کاتێ کە مامۆستا ئەچووە دێیەکەی ئەیبینی سوپاس بۆ خوا مزگەوت و مەدرەسەو ماڵ بۆ مەلای ئاوایی هەمووی تەواوە، ئەوجا مەلا هەر کچێکی لەدێیەکە دەسنیشان بکردایە، خاوەنی بەهەموو دڵخۆشی و سەربەرزییەوە کچەکەی پێشکەشی ئەکرد، دانیشتوانی ئاوایی ماڵیان بۆی دائەنا بەتەواوی، ئەوسا مامۆستا ئەکەوتە ناو ژیانێکی تازەوەو خزمەتی دێیەکەی ئەکرد لەبارەی ئایینی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە ئەوەندە کە توانای هەبووایە، دەرسی ئەوت بەفەقێ و وەعزو ئیرشادی ئەو دێیەو ناوچەکەی ئەکرد، هەتا ئەوەندە کە توانای هەبووایە.

ئەمە هەندێك بوو لەشێوەی ژیانی مەلاو فەقێ، باسی ئیجازەی علمییەکەیانەوە بەشێوەیەکی زۆر بەکورتی لەووڵاتەکەماندا، لەپێش سەدان ساڵەوە، هەر بەم شێوەیە خزمەتی مەلا و فەقێ ئەکرا لەم ناوچەیەدا، هەموو کاروباریان بۆ هەڵ ئەسووڕێندرا، هەتا ئەم دواییە، کە (کاتی جەنگی جیهانی دووەم) بوو بەڵام لەدوای ئەم جەنگە بەدواوە، لەشارەکاندا رێز لێ نانی مەلاو فەقێ وەك جاران لەو پلەیە نەما، نەختێك کز بوو لەلایەن میرییەوە. بەڵام لەلایەن کۆمەڵی گەلەوە رێزیان هەر مابوو، بەپێی ئەم رۆژگارە، هەر باش بوو تا ساڵی (١٩٥٨)ی زایینی، ئەو کاتە باری ناوچەکە رۆژ بەرۆژ لە خواربوون بوو، باری ژیانی مەلاو فەقێ رۆژ بەرۆژ هەر لەشکستە بوو، تا ساڵی (١٩٥٩)ی زایینی ئەو کاتە، ئەوەندە فەقێیە کە حەزیان لێ هەبوو میریی (دەورە)ی کردەوە بۆیان، بەناوی: (الدورة التربوية لرجال الدين) لە ساڵی (١٩٦٠)ی زایینی دا ئەمانە دامەزران بە (معلم التربية الدينية والعربية للمدارس الأبتدائية)، ئەوانە کە دامەزران نزیکەی دوو هەزار فەقێ و مەلا ئەبوون. ئەمانە دوا دوایی وەچەکان بوون، لە فەقێکانی ناو ووڵاتەکەمان، بەهەموو داخێکەوە جا بە ئەمانە کۆتایی هات بەخوێندنی فەقێیەتی لەسەر ئەم شێوەیە کە باسم کردو، لێرەدا لەگەڵ ئەوەشدا کە فەقێیەك ببوایە بە (مجاز) عەفو ئەبوو لە خزمەتی سەربازی.

لە ساڵی (١٩٦٠)ی زایینی بەدواوە ئەم (امتیازەش) نەما، جا لەم مێژووە بەدواوە فەقێیەتی نەما لەناوچەکەدا بەتەواوی، وەرە سەیرکە: وەکو حاجی قادر وتوویە وایە، وەك دەڵی:

مەسجیدو میحراب و مینبەر بێ کەسە
هەر مەپرسە حاڵی چۆنە مەدرەسە

بەهەموو داخێکەوە، ئێستا بۆ دەرمانیش بگەرێی فەقێیەکت دەست ناکەوێ. ئەگەر لەباری راستییەوە بڵێی: وەچی ئەم کاتە هەر نازانن فەقێیەتی چییە؟!!. فەقێ لە کام چینە؟!!. چونکە لە کاتی خۆیاندا بابەتێك نابینن پێیان بۆترێت: ئەمانە فەقێن.

جا، چۆن بزانن فەقێ بەچ جۆرە کەسێك ئەووترێ؟، فەقێیەتی چۆن چۆنییە؟. (إنا لله وإنا إليه راجعون). وەك فەرمایشتەکەی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویە هەر وایە: کە فەرموویە: ((إن الله لايقبض العلمَ إنتزاعا يَنتزعه من العباد ولكن يقبض العلماءَ حتى إذا لم يبق عالماً إتخذ الناس رءوسا جهالا فسئلوا فافتوا بغير علم فضلوا واضلوا)). صدق رسول الله.

*** شایی فەقێیانەو شایی هەر پێداو پێدا:**

وتمان لەناو باسەکەی رابوردوودا کە لە شاری (کەرکوك) دوو جۆرە شایی هەبوون شایی: فەقێیانەو شایی: هەر پێداو پێدا. جا لێرەدا وا یادی هەردووکیان ئەنووسم بەکورتی:

١. شایی فەقێیانە جۆرە شاییەکە لەم شارەدا زۆر بایەخی پێ درابوو، لەلایەن مەلاو، فەقێ و ئەوەش بریتی بوو، لە هەڵپەرکێیەك کە هەموو مەلاکان و فەقێکان تیا بەشدار ئەبوون، هەموویان زۆر بەجوانی پێی هەڵئەستان، ئەم هەڵپەرکێیە هەر ئەوان ئەیانکرد، بەڵام بابەتی نامەلاو، نەخوێندەوار بەشدارییان تێدا نەدەکرد، چونکە لەگەر شاییەکەدا شیعرەکانی (الفية)ی (ابن مالك)ی تێدا ئەخوێندرایەوە، هەرجارێك کە تابلۆیەکی هەڵپەرکێ بکردایە بە ئاوازێکی تر ئەکرایەوە، هەندێك جاریش لەیەك تابلۆ هەڵپەرکێ چەند جار ئاوازەکەیان دەگۆڕی، ئەمەش شتێکی ئاشکرایە کە هەر ئاوازێك جۆرە جووڵەو ئیقاع و غرینگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو لەرزەو لارەو لەرینەوەو ئینفعالاتە کە لە ئاوازێك هەیە هەمووی لەئاوازێکی تر ئەگۆڕێت، جا با بڵێین: کابرایەکی نەخوێندەوار کە لەبنەرەتا هەر نازانێ (الفية)ی (ابن مالك) چییە؟ چۆن ئەتوانێ باوەش بکا بەم هەموو ئاوازو ئینفعالاتەدا، جا چونکە هەر ئەوان ئەیان توانی ئەم جۆرە شاییە بگێڕن، لەبەر ئەمە کە زانیت لێرەدا، بەم شاییە لەم ناوچەیەدا ئەوترا (شایی فەقێیانە).

٢. شایی هەرپێداو پێدا: ئەم شاییە لە شاری کەرکوك وەك وتوومانە، لەکاتی ئاهەنگی ئیجازەی علمیی

مەلاکاندا ئەبەستراو بەس، ئەوەش هۆیەکەی ئەوە بوو لە هەوەڵەوە ئەم شاییە لە وڵاتی کەرکوک دەگمەن بووە، بەڵام لەدواکاتی دەوڵەتی عوسمانیدا، لەپێش هاتنی ئینگلیز بۆ عێراق، دەوڵەتی رووسی قەیسەری هێرشی هێناوە بۆ سەر کوردستانی عێراق، تا گەیشتووتە خانقین و رەواندوز. هەرچەندێك پیاو خەراپی هەبووە هەموو جۆرە کردەوەیەکی کردووە، پیاوی کوشتووە و مەمکی ئافرەتی بریوە و (ئیباحەی) خستووتە ناو ئەو ئافرەت و گەنجانەوە کە دەستی لێیانگیر بووە. بردوویانییە بۆ ناو لەشکرگاکەی خۆی بە دیلیی.

جا لەبەر ئەو کردارە نارەوایانەیان، ئەو عێلانەی کەوتوونەتە سەر رێگەی ئەو لەشکرە ناپەسەندەیان هەموویان پیاویان ماوەتەوە بەرانبەر ئەو دوژمنە، شەڕو بەرهەڵستیان کردووە، ئافرەت و پیرەمێرد و بێ هێزەکانیش هەموو بەرە و پاش کشاونەتەوە و ژیانی خۆیان پاراستووە، تا زۆریان گەیشتوونەتە شاری کۆیە، جا لەکاتێکا کە شۆڕشی ئۆکتۆبەر کرا لەسەر قەیسەرو دەوڵەتەکەی رووخا، ئەو کاتە لەشکری رووس گەراوەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان جا لەو کاتەدا لە کۆیە چەند هەزار کەسێك کە کۆبووبوونەوە لەو عێلانەی کە ئاوارە کەوتبوون و گەیشتبوونە کۆیە، لەخۆشی گەرانەوەی لەشکری رووس بۆ وڵاتی خۆی و گەرانەوەی خۆیان بۆ ناوچەکانیان، ئەو کاتە ئەو عێلە ئاوارانە بەتایبەتی عێلی (شکاك) کە هەموویان گەیشتبوونە ناو شاری کۆیە، دەست ئەکەن بەشایی کردن بۆ ماوەی یەك هەفتە، هەموو دانیشتوانی شارەکەش بەشدارییان کردووە لە شایی و زەماوەندەکانیان، هەر وەکو هەموو فەقێکانی ناو شاریش بەشدارییان کردووە لەگەڵیان. ئەو کاتە ئەو عێلانە ئەو جۆرە شاییە ئەکەن، فەقێکان لەوانەوە فێر ئەبن، لێرەدا شایانی باسە کە بڵێین:

ئەو فەقێیانە کە خەڵکی کەرکوك بوونە، لەکۆیە فێر بوونە ژمارەیان لە دە کەس رەت نەبووە و پتر لەدوو سەد کەس لە فەقێکانی ناو شاری کەرکوك لەو چەند فەقێیانەوە فێر بوو بوون، کەواتە بە هەردوو وەجبەکە گەلێك پتر بوون لەدوو سەد شایی گێر، هەر ئەوەندە بوون لەکەرکوك کە ئەم شاییەیان ئەکرد کەسی دی نەبوو لەگەڵیان، هەر لەمانەوە فەقێکانی دیکە فێری بوونە، ئەڵێن ئەم شایە نزیکە لەشایی (شێخانی) یەوە، کە دائەبەسترێ لە وڵاتی بادینان، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەڵێن، جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، ئەم شایەش لەکەرکوکی خۆشەویستمان کە دائەبەسترا، لەسەرەتاوە و تا کۆتاییەکەی هەڵبەستی هەر پێداو پێدای تێدا ئەگوترا، ئەوەی لەیادم بێ ئەم دێرە هەڵبەستە:

هەر پێداو پێدا تەممۆ لە رێدا
دەچمە باشۆکێ یارم لەرێدا

داخەکەم دێرەکانی دیکەم لەبیر نەماوە، ئەم هەڵبەستەش هەر جارەی یەکێك لەشایی کەرەکان هەر جارەی دێرێکی دەووت، بەدەنگێکی روون و ئاشکراوە، ئەمجا هەموویان دیسانەوە بەیەك دەنگێکی بەرز و ئاوازێکی رێکوپێك ئەم دێرەیان دەگووتەوە هەر پێداو پێدا تەممۆ لەرێدا دەچمە باشۆکێ یارم لەرێدا جا لەبەر ئەوە کە ئەم دێرە دەوترایەوە بەدرێژایی ماوەی شاییەکە. ئەم جۆرە هەڵپەرکێیە لەکەرکوکی نازدارمان ناو براوە بەشایی هەر پێداو پێدا.

ئەم باسەی ئەم شاییە لەگەڵ باسی کردارەکانی هێرشی رووسی قەیسەری بۆ سەر کوردستانی عێراق هەمووی بەفراوانی بەم دوو گوێچکەی خۆم زۆر کەرەت بیستوومە لە باوکم، وەك لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆی پێکەوە باسیان ئەگێرایەوە لەناو خۆیادا، چونکە خۆی هاوبەشی کردبوو لەو کاتانەدا لە غەزا دژی هێرشەکەی رووسی قەیسەری بۆ سەر کوردستان بەو شێوە کە باسم کردووە لەناو باسەکەدا.

*** خوو رەوشتی پاك لەناو حوجرەی فەقێ و مەلادا:**

بەراستی حوجرەی فەقێ و مەلا شوێنی خووی بەرز و رەوشتی پاك و جوان بوو، جێگەی فێربوونی ئەدەب و ئیحترام بوو، هەموو کات ئەوەی پلەی خوێندنی زۆر تر بوو. سەرگەورەی ئەوەبوو پلەی خوێندنی خوارتربوو، کاروباری ناو حوجرە هەمووی سووختە ئەیکرد، چونکە ئەو پلەی زانینی لەهەموان خوارتربوو، گەردنکەچ بوو هەردەم، بۆ هەموو بابەتە فەقێیەك، ئەو دەرسی ئەخوێند لەلای (مقدمات) خوێنەکان، هەر لەو کاتەشدا دەرسی ئەدا بە قوتابییەکان، (مقدمات) خوێنەکانیش، دەرسیان ئەخوێند لەلای ((مستعد)ەکان) و لەهەندێك کاتدا ئەیان خوێند لەلای (آخر مادە) خوێنەکان و (مستعد)ی تەواو، لەگەڵ (آخر مادە) خوێنەکاندا. ئەم دووبابەتە هەردەم دەرسیان ئەخوێند لەلای مامۆستای مودەررس بێ ئەو دەرسیان ئەوەستا.

لە هیچ کاتێکدا بابەتێك لەم بابەتانەی فەقێ ووشەی (نا) ی بەکار نە ئەهێنا بەرانبەر لەخۆی گەورەتر. هەموو کات بەقەدرو رێزبوون بۆ یەك، هەموو مامۆستا بوون بۆ ئەو خۆشەویستانەی هاورێیان بوون، ئەو کەسەی هەردەم هاتوچۆی حوجرەکانیانی ئەکرد پاش ماوەیەك رەووشتی ئەگۆرا، گەلێك باشتر ئەبوو، چونکە بەچاوی خۆی ئەیدیت، ئەم هەموو مەلاو، فەقێیانە چەند بەرێزن لە ئاست یەك، ئەو کاتە، ئەو کەسەش فێری ئەو رەووشتە جوانە ئەبوو لە ئەوانەوە، بەراستی جوان و راستە، فەرمایشتەکەی پێغەمبەری ئێمە دروودی خوای لێ بێ، وەك فەرموویە: ((مَثل الجَليس الصالح كمثل العطار أن لم يعطيك من عطره أصابك من ريحه).

*** راتبەی فەقێ و دەقنە:**

راتبەی فەقێ بریتییە لەخەرجی و خواردەمەنی ناو حوجرەیان جا لە مەدرەسەیەکدا کە کۆبووەتەوە سوختەو مقدمات خوێن و (مستعد) و (اخر مادە) خوێن، ژیانی ئەمانە بەگشتی لە گوندەکان هەمووی هەر لەسەر دانیشتوانی ئەو گوندانە بوو، بەم شێوەیەی وەك لەخوارەوە باسی ئەکەم:

هەموو ژەمی بەیانییەك سوختەکان ئەچوونە ناو گوندەکەو هەر ماڵێك ماست و چێشت و نانی ئەدا پێیان، لەو ماڵانەوە کە پێشتر ئەم خواردەمەنیانەیان تەرخان و ئامادە ئەکرد بۆیان و ئەوانیش ئەیانهێنایەوە بۆ مەدرەسەکەیان، لەوێدا هەموو فەقێکان پێکەوە بێ فەرق و جیاوازی ئەیانخوارد، بۆ

خواردنی نانی نیوەڕۆو شێوانیش هەر بەم شێوەیە بوو، ئەم سێ ژەمە خواردنە بەم جۆرەی وا باسمان کرد پێی دەگوترا ڕاتبەی فەقێ، چونکە سوختەکان لەکاتی کۆکردنەوەی ئەم خواردنانەیان وەك (دق الباب)یان دەکرد لەماڵەکان لەگەڵ ئەمەشدا بەدەنگێکی بەرزەوە لەناوچەی کەرکوك دەیانگوت (ڕاتب ڕەحمەتتان لێ بێت)، لەهەندێ ناوچەشدا دەیانگوت (ڕاتبە ڕەحمەتوو لێ بێت) هەروەك لەهەندێ ناوچەدا دەیانگوت (ڕاتبەی فەقێیان بچنە بەحەشتی) هەروا لەهەر ناوچەیەك لەناوچەکانی کوردستانمان بەشێوەو زاراوەیەکی تایبەتی داوای خواردنەکانیان دەکرد، لەبەر ئەوەی هەمووی هەر بەناوی ڕاتبەوە بوو ئەم ووشەیە بوو بوو بەناوی ئەم جۆرە خواردەمەنیانە یان هەروەك ناو دەبرا بە: (ڕاتبەی فەقێ).

لە کاتی وەرزی زستاندا هەموو گوندێك تەواوێك زەخیرەیان دادەنا بۆ فەقێکان لە حوجرەیەکی مەدرەسەکە، ئەو فەقێیانە لەکاتێك دڵیان ویستی خواردنێکی تایبەتی ئەو کاتە بەدەستی خۆیان دروستیان کردووە بۆ خۆیان لەو زەخیرەیە، جگە لەو خواردنانە کە هەموو ژەمێك سوختەکان کۆیان ئەکردەوە لەناو گوندەکە، ئەم زەخیرەیە ناو ئەبرا بە دەقنەی فەقێ.

لە هەندێك کاتدا فەقێکان ڕاسپێریی ماڵێکیان ئەکرد لە گوندەکە ئەو کاتە بەپێی داواکردنی خۆیان، بەهەموو شانازییەوە ئەو ماڵە ئەو خواردنەی دروست ئەکرد، ئەو کاتە بۆیانی ئەبرد بەکوڵاوی هەر وەك لەزۆر گوند پیشەیان وا بوو، هەر شەوێك لەشەوەکانی هەینی، فەقێکان بانگ ئەکران بۆ ماڵێك بۆ نان خواردن هەر بەم شێوە بەدەورە بەدرێژایی ساڵ، شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، کە مامۆستاش لەم جۆرە دەعوەتانە لە پێش فەقییەکانییەوە بوو لەگەڵ پیاوە ماقووڵەکانی ئەو گوندەدا، جا ئەو شەوە لەو ماڵەدا خۆشترین کات ئەبرایە سەر، فەقێکان وایان هەست ئەکرد کە هەموو لەناو کەس و کاری خۆیانن، ئەمەش کە ئەکرا هەر بۆ قەدرو ڕێزی ئەو مەلاو فەقێیانە بوو، هەر وەك لە کاتی بەهاردا، هەر کەس مەڕو ماڵاتدار بووایە، کارێك وەیان بەرخێکی ئەدا بەفەقێکان، ئەو کاتە هەموو دەبوو بەمێگەلێك، ئەوسا ئەوانیش ئەیانفرۆشت بۆ خۆیان، ئەیانکرد بەجلوبەرگ و پێویستییەکانیان.

هەر وەك پیشەی هەموو کوردان وابوو، پیاوێکی ماقووڵ و لێ وەشاوە بچووبایەتە گوندێك ئەچوو سەردانی فەقێکانی دەکرد، با نەشیانی ناسیبایە، چونکە ئەم سەردانە (من باب المجاملة والتقدیر لرجال الدین) بوو. بە توانای خۆی ئەو میوانە یارمەتی پێشکەش ئەکرد بۆ فەقێکان، هەروا ژیانی هەموو فەقێکان لەناو شارەکاندا شێوەی ژیانی فەقێکانی دەشت بوو، بەجۆرێکی شیکراوەتر بڵێم بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

سوختەکاتی ئێواران بەسەعاتێك پێش نوێژی عەسر ئەچووە ناو گەڕەك ڕاتبەی کۆ ئەکردەوە لەو ماڵانە کە ڕاتبیان ئەدا بەفەقێکان، هەندێ کەس پارەیان ئەدا بۆ ئەوەی کە بەدەستی خۆیان خواردن دروست بکەن، هەر وەك بۆ ژەمی نیوەڕۆش ڕاتبەی چێشت ئەکرا لەناو گەڕەك، لەو ماڵانەوە کە ئەم وەجبە خواردنەیان تەرخان کردبوو بۆ فەقێکان لەم کاتەدا. ئەوەی شایانی باسە لەم بارەیەوە ئەوەیە: زۆر بەخۆشی و دڵخۆشی ئەژیان لەناو شاردا چونکە سوپاس بۆ خوا موسڵمانی خێرخواز گەلێك زۆر بوون. هەروەك لەناو شاریش فەقێ دەقنەیان ئەکرد.

*** شوێنی حوجرەی فەقێ و مەلا:**

پێویستە بزانین: هەموو کات فەقێ لەشارو لەدەشت حوجرەی جیاو تایبەتی خۆی هەبوو لەحەوشی مزگەوت ناو دەبرا بەحوجرەی فەقێ. کەس دەخڵی نەبوو بەسەر ئەم حوجرانەوە چونکە لە کاتی خۆی، بەتایبەتی بۆ فەقێ دروستکرابوون، هەر وەك لەم شوێنەدا حوجرە بۆ مەلاش بەتایبەتی دروستکرابوو، ناودەبرا بە (حوجرەی مەلا).

هەردوولا بەخۆشی ڕایان ئەبوارد لەحوجرەی خۆیان کەس بارییانی گران نەدەکرد بەهیچ جۆرێك، چونکە مەلاو فەقێ وەك زانراوە لەمەوبەر، هەر کەس ئەرکی سەرشانی خۆی هەبوو، هەر کەس تێدەکۆشا بۆ بەجێهێنانی ئەو ئەرکەی سەرشانی خۆی بەشەوو بەڕۆژ.

*** پشوودان و حەسانەوەی فەقێکان:**

وتمان فەقێ لە هەموو کات هەر خەریکی خوێندن بوون، بەڵام لەکاتی پشوودانیان خۆیان وا بوو نەیان ئەخوێند بەڵکو زۆربەیان خەریك ئەبوون بەئیش و پێویستی خۆیانەوە، یا ڕایان ئەبوارد بەو جۆرەی کە سوودی زانستی هەبوو.

جا وا کاتەکانی پشوودانەکانتان بۆ باس ئەکەم:

١. ڕۆژی دووشەممە: پاش نوێژی نیوەڕۆ تا ڕۆژی سێ شەممە پاش نوێژی نیوەڕۆ.

٢. ڕۆژی پێنج شەممە: دوای نوێژی نیوەڕۆ تا ڕۆژی هەینی دوای نوێژی نیوەڕۆ.

٣. ئەو ڕۆژە کە فەقێ لەکاتی دانی بەیانی بچووبایەتە سەفەر، چونکە سەفەری لەپێش بوو، دڵی لەلای خۆی نەبوو، بەڵام ئەو ڕۆژە کە ئەگەڕایەوە، دوای حەسانەوەیەك ئەچوو بۆ خوێندن لەبەر ئەوەی دڵی خۆش و هێمن بوو چاوی لەهیچ شوێنێك نەبوو.

جا لەم بارەوە خوالێخۆش بوو خانزادە خاتوون کە ناسراوە لەکاتی خۆیدا بە میری سۆران فەرموودەیەکی زۆر جوان و ناسکی هەیە زۆر بەکاریان ئەهێنا مەلاو فەقێکان، کاتێك بیان دیتایە فەقێیەك سەفەری هەبێ وا خەریکی خوێندنە، یا لە سەفەر گەڕابێتەوە بەڵام ئەو ڕۆژە نەی خوێندایە، پێیان ئەوت: خانزادە خاتوون فەرموویە: (ئەو فەقێیە کە سەفەری لە پێشەو خەریکی خوێندنە بەقوربانم بێت، ئەو فەقێیەش لەسەفەر هاتووەتەوەو ناخوێنێ هەر بەقوربانم بێت).

خۆتان باش ئەزانن پلەو پایەی بەرزیی خانزادە خاتوون چۆن بووە لەناو گەلی کوردان بەگشتی، لەناو مەلاو، فەقێدا بەتایبەتی، جا لەبەر ئەمە فەرموودەکەی هەمووکەس گەردن کەچ بوون بۆی.

٤. کاتێك کە چەند ڕۆژێك باران بەردەوام بووایە، ڕۆژی

پاش ئەو بارانە فەقێ دوای دەرز خوێندن لەکاتی دوای نیوەڕۆ تا دانی ئێوارە هەموو ئەچوونە ئەو دەشتە بۆ رابواردن‌و یاریکردن، خۆتان دەزانن کە لە هەموو دێیەك لە وڵاتەکەماندا گۆڕەپانی یاریکردنی تۆپ‌و جورغێن‌و هەموو جۆرە یارییەك هەبوو، وەك شارەکان جا لەو گۆڕەپانەدا جۆراو جۆر یاری‌و تۆپێن‌و بازدان‌و کەوشەك‌و شەقێنیان ئەکرد لەگەڵ گەنجەکانی ناو شارو دێیەکاندا.

*** کۆبوونەوەی فەقێکان بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی:**

لەناو شاری کەرکوك فەقێکانی چەند مەدرەسەیەك کۆبوونەوە لە مزگەوتێك، لەکاتەکانی پشوودانیان، ئەوجا جۆراو جۆر خۆشیی‌و بەزمیان ئەکرد لەو کۆبوونەوەدا، هەروەکو بەشێکیش لەو کۆبوونەوەیان تەرخان ئەکرد بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی. ئەو کاتە جۆراو جۆر پرسیارو، بەربەرەکایی تیا ئەکرا، هەر کەسێك مەسەلەیەکی بۆ روون نەکرایەتەوە، لەو کۆبوونەوەدا لەگەڵ فەقێکان دەکەوتنە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی تا ئەگەیشتنە ئەنجامی، هەر وەکو بەشێکت ئەدیت خەریکی شەرە شیعر بوون، هەندێك خەریکی پرسیارو بەربەرەکانی زانستی ئەبوون.

بەکورتی با بڵێین: ئەو پشوودانەی دووشەممەو سێ شەممە لەگەڵ پێنج شەممەو هەینی دیسانەوە هەر سوودی زانستی ئەبەخشی، چونکە زۆربەی کاتی ئەو، دوو پشوودانەش، هەر بەلێکدانەوەی مەسەلەکانی زانستییەوە بوون، هەر وەکو لە گوندەکانیش فەقێکان هەر بەم شێوەی سەرەوە بوون‌و بەزیادەوەش، لەهەر پشوودانێك تاقمە فەقێیەك بە نۆرە ئەچوونە گوندێکی دیکەی دەوروبەری کەرکوك لەلای فەقێکانی ئەوێ رایان ئەبوارد بەیەکەوە.

پرسیارو، شی کردنەوەو، لێکۆڵینەوەی زانستی‌و شەرە شیعریان ئەکرد، جگە لەگەشت‌و رابواردنەکانیان بەوێنەی فەقێکانی مزگەوتەکانی ناو شار.

*** لە هەموو گوندو مزگەوتێکی ناو شار مەلاو فەقێ هەبوو:**

بەڵێ هەر گوندێك لەوڵاتەکەمان مەلایەکی تێدا هەبوو ئەگەر گوندەکە نزیکەی پەنجا ماڵ ببوایە بێگومان ئەوە مەدرەسەیەکی زۆر بەنرخی تیا ئەبوو، بەتەك مزگەوتەکەوە، لەوانە بوو دە تا پانزە فەقێی بەردەوام تێدا ببوایە.

ئەگەر گوندێك سەد ماڵێك ببوایە، ئەوە بێگومان مەدرەسەیەکی تێدا ئەبوو هیچ کات لە بیست فەقێ کەمتری تێدا نەدەبوو، ئەو شوێنە ئەژمێردرا بە مەدرەسە ناودارەکان، ئەگەر گوندێك بچووك بایە، با بڵێین بیست ماڵێك ببوایە بێگومان ئەو گوندە هیچ کات مەدرەسەکەی لە پێنج یا شەش فەقێ کەم تری تێدا نەدەبوو.

ئەگەر گوندەکە چەند ماڵێك کەم ببوایە با بڵێین پێنج شەش ماڵێك بووایە، ئەو کاتە مەلای گوندەکە، لەحەوشی مزگەوتەکە حوجرەی فەقێیی هەبوو ئەوجا لەو حوجرەیە دەرسی ئەدا بە منالی ئاوایی بەکورتی با بڵێین: هیچ گوندێك بێ مەلا و فەقێ، یا قوتابی نەبوو لەناوچەکەماندا.

هەر مزگەوتێك لەناو شارەکانی وڵاتەکەمان سەیریت بکردایە ئەت دیت ئەو مزگەوتە لەکاتێکدا کە جێگەی نوێژە لەهەمان کاتدا مەدرەسەیەکی زۆر گەرمەو بەجۆشەو لە هەموو لاوە ئەوا فەقێ دەرز ئەخوێنێ‌و ئەوا هەندێك دەور ئەکاتەوە ناریێ بابە دەڵێ‌و دەرزەکانی ئەکاتە بەر، ئەوا هەندێك دەرز ئەڵێتەوەو هەندێکیش بەربەرەکانی‌و شیی کردنەوەی دەرسەکانیان ئەکەن لەگەڵ یەك. هەر بەم جۆرە هەرچەند مزگەوت هەبوون لەشارەکاندا هەمووی هەر وابووە، هەمووی مەدرەسەو پڕ لەفەقێ و مەلا بوون چ دەرس ووتنەوە، چ دەرس خوێندن هەمووی هەر بۆ خوا بوو.

لە زۆربەی کاتەکاندا فەقێی مزگەوتەکە دەرسی ئەخوێند لەلای مەلای ئەو مزگەوتە، بەڵام هەندێك جاریش ئەت دیت مزگەوتێك مەلاکەی زۆر لەپلەیەکە باڵایەو بلیمەتێکە، مزگەوتەکانی دەورو بەری ئەم مەلاو مزگەوتە پلەی مەلایەتی مەلاکانیان نیمچەیە جا لەم کاتەدا، ئەو (مستعد)و (آخر مادە) خوێنەکان کە لەحوجرەی ئەو مزگەوتانە ئەژیان ئەت دیت بۆ دەرس خوێندن ئەهاتنە لای ئەم مەلایەی کەوا زانایەو خاوەنی پلەیەکی وا باڵایە، مزگەوتەکەشی لەنزیك ئەوانە ئەو کاتە لەلای ئەم دەرزیان ئەخوێند.

*** ئەوناچانەی وڵاتەکەمان کەناسرابوون بەزۆری مەلاو فەقێ:**

وەکو زانراوە هەردەم لەچوارچێوەی وڵاتەکەماندا هەموو گوندو مزگەوتێك لە هەموو کاتدا پڕبوون لەمەلاو فەقێ، بەڵام شتێکی روون‌و ئاشکرایە کە هەموو کات ناوچە لەگەڵ ناوچە دەگۆڕێت‌و کۆمەڵ لەگەڵ کۆمەڵ جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، جا لێرانەوە ئەبینیت ئەو ناوچانەی کە لێرە بەدواوە وا باسیان ئەکەم هەردەم لەپێش هەموو گەلەکەمانەوە بوون بۆ خزمەتی مەلا و فەقێ، لەبەر ئەمە هەموو کات ئەمانە بەتایبەتی ناویان هاتووە لەم بارەوە:

١- شاری کۆیە: ئەم شارە لەکۆنەوە، بەڵکو لەپێش چەند ساڵیش لەئەمرۆ بەپێشەوە، هەتا فەقێیەتی دوای براوە لەساڵی ١٩٦٠ ی زاینیدا هەر ناسرا بوو بە (دار العلوم)، لەپێش جەنگی جیهانی یەکەم هەموو کات تا هەزار فەقێ پتر لەناو ئەم شارە خۆشەویستەمان خوێندوویانە لە مزگەوتەکان، هەردەم ئەمانە جگە لە مامۆستاکانی خۆیان هاتوچۆی مزگەوتی گەورەیان کردووەو سوودی زانستیان وەرگرتووە لە مەلاکانی بنەماڵەی جەلی زادە، هەروەك هەموو مزگەوتەکان راتبەی ماڵی حەمەغایان هەر کردووە، کەواتە لە بارییە ووتەکەی خوالێخۆش بوو: حاجی قادر وەك ئەڵێ:

کەسێ پیاوە کە دانێ وەك حەمەغا
لەبۆ ئەبنایی جینسی نان‌و خوانی
وە یاخود وەك ئەمیناغا بەهیممەت
بکا بۆ قەصری میللەت پاسەبانی

هەروەك بە حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە دەڵێ:

بەغەیری جەددی ئێوە کیهە دانا
لەکوردستان ئەساسی عیلمی دانا

هەرچەند هۆیەك بووبێ بۆ کۆبوونەوەی ئەمانە لەئەم شارەدا پتر لە دووهەزار کۆبووەتەوە تیا، لەکاتێکدا کە مەلاو فەقێکانی گوندەکانی دەورو بەری هەمووی هاتوونەتە ناو شارەکەوە، خوالێخۆش بوو باوکم زۆر کات باسی شاری کۆیەی ئەگێرایەوە بۆمان: کە چەند مەلاو فەقێ بەنرخ بوونەو رێزیان لێ نراوە لەم شارە خنجیلانەدا، لەکاتی دەولەتی عوسمانیدا. وەك باوکم خۆی فەقێ بووە لەوێ لەو کاتەنەدا، لە مزگەوتی گەورە، لە پلەی سوختەیی بووە.

٢- وولاتی دەشتی هەولێر: هەندێك لەمەلاکانی ئەم وولاتە گەلێك جار ئەهاتن بۆ سەردانی باوکم لە کەرکوك، لە کاتی دانیشتنیان بەیەکەوە زۆر ستایشی دانیشتووانی دەشتی هەولێریان ئەکرد، بەتایبەتی دەشتی دزەیی.

منیش خزمەتی ئەو میوانانەم ئەکرد لەو کاتانەدا گوێم راگرت لە ووتەکانیان ئەیان وت: ئێستاکە لەم کاتەدا، لە وولاتی دەشتی هەولێر هەر گوندێك مەلایەکی زۆر باش‌و بالای تێدایە، هەموویان تێ کۆشاون بۆ خزمەتی، فەقێ‌و دەرس ووتنەوە، دەیانوت: لەدەشتی هەولێر پتر لەسەد مەدرەسە هەیە، کە هەر یەکێك لەئەوانە دە تا بیست فەقێی تێدا ئەخوێنێت، ئەم مەلایانە زۆریان لەپلەی زۆر بەرزدان لەعیلمەکان، هەندێك لەئەمانە، لەپلەی (مجین)ی دان.

ئەم مەلایانە کە ئەم باسانەیان ئەکرد لەناو خۆیاندا لەگەڵ باوکم لەکاتێکدا کە دوای جەنگی جیهانی یەکەم‌و پێش ساڵی ١٩٥٠ی زاینی دا بوو.

٣- ناوچەی خۆشناو: هەموو نەوەکانی ئەم گەلە ئەزانن ئەم وولاتە ژیانیان لەکۆنەوە لەسەر فرۆشتنی مێوە بوو، هەتا کاتی پێش ساڵی (١٩٦٠)ی زاینی ئەم وولاتە خۆشەویستەمان رێگای ئۆتۆمبیل بۆ دێهاتەکانی نەدەرۆیشت، لەبەر ئەمە، زۆر لەمێوەجاتەکانیان خەسار ئەبوو، نەدەگەیشت بەشارەکان بۆ فرۆشتن، بۆیە هەر پیاوێك لەخەڵکی ئەم وولاتە ئەت دیت چەند گوێ درێژێکی هەبوو باریانی ئەکرد لەو مێوەجاتەو ئەی هێنا بۆ دەشتی گەرمیان لەو دێهاتانە مێوەکانی ئەگۆڕیەوە بەگەنم‌و جۆ پاش ساغەوەکردنی مێوە جاتەکەی ئەو گەنم‌و جۆیەی بەو گوێ درێژانەی ئەبردەوە بۆ وولاتەکەی خۆی، بۆ ژیانی ماڵ‌و منالەکانی، لەبەر ئەمە کە هۆی ژیانیان بەم شێوەیە بوو، ناسرابوون لەناو هەموو ناوچەکەو دەوترا: خۆشناوەتی نانیان لەسەرپشتی گوێ درێژە. ئەو کەسەی ئاوهای بۆ نەکرایە، نانی ساڵانەی منالەکانی بۆ دانەدەنرا، ئەبوو ئەوکەسە خۆی ئامادە بکردایە بۆ برسییەتی وەرزی زستان. جا ئەی برای خۆشەویستم ژیانی دانیشتووانی ئەم وولاتەمان بەم کولەمەرگییە بوو، تا دوای ئەم مێژووەی سەرەوە، جا ئەم وولاتە هەژارە لەبارەی خزمەتی مەلاو، فەقێوە با باسی بکەین:

ئەی برای شیرینم: هەرچەند کە مەلاو فەقێ کۆ ئەبوونەوەو باسی ناوچەی خۆشناوەتیان ئەکرد سەرت سوڕ ئەما!

ئەیانوت: هیچ ناوچەیەك ناگاتە ئەم ناوچەیە بۆ خزمەتی مەلاو فەقێ، ئەیانوت: ئەگەر گوندێك هەروا دە پازدە ماڵێکیش ببێ ئەوە مەلایەکی تێدا هەیەو مەدرەسەی هەیەو پڕ لە فەقێیە. ئەیانوت: هیچ گوندێك نییە بێ مەلاو قوتابخانە. ئەیانوت: لەم ناوچەیە کەس خاوەنی سەرو ماڵ نیە بۆ خزمەتی مەلاو فەقێ لە کاتێکدا کە خاوەن ماڵ مانوو بەدەس ژیانی خۆی‌و ماڵ‌و منالەکەیەوە، بەلام لەهەمان کاتدا سەرو ماڵی بەخت ئەکا بۆ خزمەتی ئەم خوا پەرستانە لە پێشەوە باسم کردووە، جا دانیشوانی ئەم ناوچەیە لە کۆنەوە کە باوك‌و باپیرانی تۆن ئەئاوها کە دیوتە-خزمەتی ئەم خوا پەرستانەیان کردووە. وەکو خوای گەورە فەرموویە: (ویؤثرون علی انفسهم ولو کان بهم خصاصة).

ئەمەش هەمووی هۆیەکەی هەر ئەوەیە کە خەڵکی ئەم ناوچەیە زۆر بەدین بوون، لەبەر ئەوە زۆر رێزی مەلاو فەقێیان لەلای هەبوو. باسی ناوچەی حەریر هەر ئایەتە باسکردن.

٤- ناوچەی پشدەر: هەرچەند کە باسی وولاتی پشدەرایەتی بکرا بایە مەلاو فەقێی ئەم وولاتە ئەیانەووت: ئەم وولاتە دەریایەکەو شەپۆل ئەدا بەعیلم هیچ گوندێك نیە بێ مەلایەکی باش‌و پر لەفەقێ نەبێ ئەیانەووت: خەڵکی ئەم وولاتە وەکو خولام وان بۆ مەلاو، فەقێ خاوەنی سەرو ماڵ نین بۆ خزمەتیان. ئەیانەووت: کام ئاغا کە لە هەمووی گەورەترە کە بریتییە لە بابکر سەلیم ئاغا، (لەو کاتەدا)، لە ئاستی مەلاو، فەقێ خۆی بەخاوەنی هیچ فەرمانێك دانانێ. جا ئەگەر ئەمە قەدرو رێزی ئاغاکانیان بێت بۆ ئەم خوا پەرستانە، ئایا ئەبێ عێلەکانیان چەند رێزیان بگرن؟. ئەم بارە لەم ناوچەیەدا بەردەوام بوو لەکۆنەوە لەزەمانی دێرینەوە، تا گەیشتە دەورو پشتی ساڵی ١٩٦٠ی زاینی. دوای ئەم مێژووە ئەم خزمەت‌و رێزەیان وردە وردە کزبوو، بەهۆی بارە ئالۆزەکانی ناو وولاتەکەمانەوە، بەلام هێشتا هەر خەڵکی ئەم ناوچەیە باشترن لەگەلێك شوێنی دیکە، چاکە: هێشتا هەر رێزی ئایینییەکان بەپێی زەمانە هەر ماوە لەلایان، هەرچەند وەك جاری جارانیش نەبن، بەلام وەك وتراوە وایە: (ما لا یدرك کله لا یترك کله).

٥- وولاتی سالەیی: ئەم دیوو ئەو دیوی بەلێ وولاتی سالەیی، هەردوو دیوی، پاش جەنگی جیهانی دووەم بەجۆرێکی تایبەتی قۆڵ‌و باسکیان لێ هەڵکرد بۆ خزمەتی مەلاو فەقێ، ئەو کاتانە ئەمە باو بوو لەناو برا گەورەکانی ئەم ناوچەیە، هەردەم لەسەر پاو: دەس بەسنگ بوون بۆ قەدرو رێز لێنانیان، شێخانی سالەیی هەر باسی شۆخایەتییان تەواو نابێت: هەر یەکێك لەوان حاتەمێك بوو بۆ خزمەتیان، لە هەموو کارێکدا مەلایان کردبوو بەبرای گەورەو خاوەنی گوندەکانیان، بەلام داخی بەجەرگم بەهاتنی باری ناخۆشی ناوچەکە تێك چوو، هەروەك ناوچەی رەواندوز، بالەکاتی‌و قەلا سیوکەو قەرەداغ‌و پێنجوێن‌و قزلجە هەموو هەر خاوەنی دەستێکی زۆر درێژ بوون لەچەرخەکانی کۆنەوە لەبارەی خزمەتی عیلم‌و پێ گەیاندنی مەلاو، فەقێ‌و بەپێی فەرمایشتەکەی خوای گەورە وەك فەرموویەتی: ((ولتکن منکم امة یدعونَ إلی الخیر ویأمرون بالمعروف وینهون عن المنکر واولئكَ هم المفلحون)). صدق الله العظیم.

*** کتێبخانەکانی وولاتەکەمان:**

کتێب هەموو کات چەکی خوێندەوارە، ئەو خۆشەویستە کە خوێندەوارە هەموو کات هەولی بۆ داوەو خۆی بۆ هەلدەکوتی و خۆی بۆ بەخت دەکا بێگومان ئەوە هەر کتێبە. چونکە هەر ئەوە ڕێگە بە ئادەمیزاد نیشان دەداو فێری هەموو پایە بەرزییەکی ئەکاو ئەیگەیەنێ بەیەکەمین پلەو سەری ئەخا تا بەرزترین پلەی کۆمەلایەتی و زانین، چاوی ئەکاتەوەو بیری روون ئەکاتەوەو دلی پڕ بەهرە ئەکاو مێشکی بەتوانا ئەکا ئەوەی کە دەس بەکتێبە هەردەم دەس بە قەلەمە، چونکە قەلەم چەکی نەخشی رازی دلە، هەتا هەتا، کەواتە ئەم دووچەکە کتێب و قەلەم پێکەوە بوونە، هەردەم پێکەوە ئەبن هەردوولا بەندی یەکن. ((إقرا باسم ربك الذي خلق. خلق الأنسان من علق. إقرا وربكَ الأكرم الذي علم بالقلم. علم الأنسان ما لم يَعلم)).

جا لەبەر ئەمانەو لەبەر ئەوە کە وولاتەکەمان بەسەدان سال لە ئێستا بەپێشەوە هەر شوێنی خوێندەواران بووەو مەیدانی پێش کەوتن بووە لەنێوانیاندا. لەبەر ئەمانە هەموو مەلاو فەقێ و خوێندەوارانی ئەم گەلە، کتێبیان خۆش ویستووەو زۆریان لێ کۆکردووەتەوە لەلای خۆیان شتێکی روون و ئاشکرایە ئەمەش بووەتە بناغە بۆ پەیدابوونی گەلێك کتێبخانە لە وولاتەکەماندا. جا ئەم هۆیە کاری کردووە بەرادەیەکی وا کە هەر مەلایەك لەهەر گوندێك، یا مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی ناوشار، ئەگەر بچوویتایە بۆ حوجرەکەی ئەت دیت: پڕە لە کتێب بۆ خوێندنەوەی خوێندەوارانی وولاتەکەمان. کەواتە بزانە چەند مزگەوت هەبوو لە وولاتەکەمان ئەوەندەش کتێبخانە هەبوو. هەر کتێبخانەیەك دانرابوو لە حوجرەیەکی تایبەتی: کە بریتی بوو لە حوجرەی مەلا وەك بۆی دروستکرابوو لەناو حەوشی مزگەوت، مەلا چونکە ئەو کتێبخانە مالی خۆی بوو، کەس دەس کاریانی نەدەکرد بە هیچ جۆرێك بەبێ رەزامەندی ئەو.

*** ئەو کتێبخانانەی زۆر کۆن و گرنگ بوون:**

لەناو ئەم هەموو کتێبخانە تایبەتیانەشدا کە هەبوون لەپانایی ئەم وولاتەدا، دیسانەوە کتێبخانەی زۆر گەورە کۆن و بەنرخ هەبوون، کە مرۆڤ سەرسام دەبوو بەدیتنیان چۆن پێك هێنرابوون؟ لەئەمانە، ئەوانەی بیان زانم و، ناویان لەیادم بێ، هەندێکیان ئەمانەن:

١. **کتێبخانەی حەیدەری:** کە لەناوچەی، خۆشناوەتی، بووە لەپارێزگای، هەولێر بە سەدان سال لەئێستا بەپێشەوە: زۆربەی کتێبەکانی لە نووسین و دارشتنی مەلاکانی بنەمالەی مەلازادەی حەیدەرین کە بۆ ماوەی چەند چەرخ هەر لە خزمەتی زانستدا بوونە، بەهەموو داخەوە زۆربەی کتێبەکانی نەماون. لەکاتێکدا کە ئەم کتێبانە لەدێی ماوەدان بوونە.

٢. **کتێبخانەی بنەمالەی جەلی زادە:** ئەم کتێبخانەیە زۆرەکەی ماوە، هەر لە شوێنی خۆیەتی: لە شاری کۆیە لەمزگەوتی گەورە. ئەمیش دیسانەوە بە سەدان سال لەئێستا بەپێشەوە بناغەی دانراوە، زۆری کتێبەکانی لەدارشتن و نووسینی مەلا خوالێ خۆشبووەکانی ئەم بنەمالەن.

٣. **کتێبخانەی بنەمالەی مەلا ئەفەندی هەولێر (کچك مەلا):** ئەم کتێبخانەیە لەمزگەوتی گەورە بوو، لەقەلاتی هەولێر ئەیانەووت: کتێبەکانی لەکۆنەوە باری چل حوشتر بوون. پڕ بوون لەنووسین و حاشیەو تەعلیقاتی ئەم بنەمالەیە.

٤. **کتێبخانەی مەدرەسەی مەحمود خال:** کە لەناو حەوشەی مزگەوتی مەیدان بوو: لەقەلای کەرکوك. هەموو کتێبەکانی دەسنووس بوو. چونکە هەمووی نووسرابوونەوە لەپێش چەند سەد سال لەمەوبەر. هەندێك لە مێژووی هەزار سال پێش ئێستاکە نووسرابوون لە هەزار کتێب زیاتری تیابوو وقف کرابوو بۆ هەموو خوێندەوارانی شاری کەرکوك، بەو مەرجەش کە لەناو ئەم مەدرەسەیەدا بمێنێتەوە. ئەم کتێبخانەیە کاروبارەکەی بەدەستی باوکم بوو چونکە ئەو (مدرس)ی ئەم مەدرەسەیە بوو لە هەوەل دامەزراندنی لە ئەوقافی کەرکوك لە یەکی ئایاری سالی (١٩٣٠)دا تا کاتی دوای سالی (١٩٦٠)ی زایینی جا ئەو کاتە کە باوکم ویستی خۆی خانەنشین بکا کتێبخانەکەی تەسلیم کردەوە بەئەوقافی کەرکوك، ئەوانیش بەپێی داواکردنی (مديرية الاوقاف العامة في بغداد) ئەم کتێبخانەیەیان گواستەوە بۆ ناو کتێبخانەی ئەوقاف لە بەغدا.

٥. **کتێبخانەی مەدرەسەی مهرانی:** ئەم خوێندنگایە زۆر بایەخدار بوو لە کەرکوك هیچ کاتێك لەبیست و پێنج فەقێ کەمتر تێیدا نەیخوێندووە، بەجۆرێك هەر پێویستییەکیان لەسەر (موقوفات)ەکەی بووە، خواردنیان هەر سێ ژەمەکەی هەر لە ژوورەوە بۆ ئامادە کراوە، لەسەر شێوەی مەدرەسەیەکی داخیلی، ئەوانەی کە شارەزا بوون ئەیانووت کتێبخانەیەکی یەکجار زۆر بەبایەخ و بێ هاوتا کە پێك هاتبوو لە هەزاران کتێب لەناو هۆدەیەك لەناو حەوشەکەیدا هەبوو.

بەلام بەرۆیشتنی دەولەتی عوسمانی و هاتنی دەولەتی ئینگلیز بۆ عێراق، بنیاتنانی (مديرية اوقاف منطقة كركوك) داخی گرانم نازانم چۆن ئەم مەدرەسەیە لەگەل کتێبخانەکەیدا لەلایەن ئەوقافی کەرکوکەوە لە ناو درا؟

٦. **کتێبخانەی مەدرەسەی (السلطانية):** ئەم مەدرەسەیە لەگەل کتێبخانەکەی لە شاری کەرکوك، لەکاتی دەولەتی عوسمانیدا تاقە مەدرەسەو کتێبخانە بوو لەم شارەدا کە میریی بروای پێ کردبوو، کردبوویان بەخاوەنی (نظام)و (ادارە)و (معلمين)و (مدير)، هەموو جۆرە پێویستییەکی بۆ جێ بەجێ کرابوو، ناویان نابوو بە (المدرسة السلطانية). شەهادەت نامەکەی جێگەی بروابوو. لە هەوەلی دامەزراندنی حکوومەتی عێراقدا لەحەوشی خانەقای سەیید ئەحمەد بینایەکی تازەیان بۆی دروستکردبوو لە دوونهۆم کتێبخانەیەکی تێدا بوو لە هەموو زانست و هونەرێکی تێدا بوو. باشترین کتێب و ئامێرو هۆکارەکانی فێرکردنی بۆ پێکهێنرا بوو بەلام بەخت رەشی ئەم مەدرەسەو کتێبخانەیەی گرتەوە وەکو کتێبخانەو مەدرەسەکانی دیکەی وولاتەکەمان، هەروەك ئەم بینایەش دیسانەوە رووخاندرایەوە لەدەورو بەری سالی (١٩٥٧)ی زایینی دا. لە شوێنەکەی بینایەکی دیکەی لێ دروستکراوە: کراوە بە (المكتبة العامة في كركوك).

٧. **کتێبخانەی مەدرەسەی بیارە:** بیارە کە لەناوچەی هەورامانە لەپارێزگای سلێمانی. ئەم شارە دێیە لەچەرخەکانی کۆنەوە هەر جێگەی خوا پەرستن و کانگەیەکی ئایینی بووە هەموو کات مەدرەسەکەی قیبلەی مەلا و فەقێکان بووە. هەردەم لەم چاوگەیەدا سەد تا سەدو پەنجا فەقێ دەیان خوێند بەجۆرێك هەموویان هەر لەسەر خوان و کیسەی بنەماڵەی شێخەکان بوون هەر سێ ژەمەکە.

ئەم بنەماڵە پیرۆزە کتێبخانەیەکی یەکجار زۆر دەوڵەمەندو گرنگ و بێ هاوتایان لەناو ئەم مەدرەسەیەدا پێك هێنا بوو. هەموو بابەتە کتێبێکی تیا کۆ کرابوەو، ئەمەش بەدرێژایی چەند پشت بەم جۆرە هاتبوە خوارەوە. بەڵام داخەکەم لە پاش ساڵی ١٩٥٨ی زایینی باری وڵاتەکەمان تێك چوو: ژیان تیایا وەك جاران نەما ئەو کاتە کتێبخانەکەش هەمووی تاڵان کران لەلایەن ئاژاوەچییەکانەوە. جا هیچ چار نیە لەوە زیاتر کە بڵێین: (إنا لله وانا اليه راجعون).

٨. **کتێبخانەی خانەقای عومەر گونبەدی:** ئەم کتێبخانەیە لەچەرخەکانی کۆنەوە پێك هێنرابوو لەناو ئەم خانەقایەدا، لە شاری کەرکوك لەگەڕەکی ئیمام قاسم، بەهەوڵ و تەقەلای بنەماڵەی مەلازادەی دەربەندیی، بەڵام داخەکەم لەدوا بەشی جەنگی جیهانی یەکەمدا، ئەم کتێبخانەیە هەمووی دزراوەو تاڵان کراوە. ئەوەی ماوە ئێستاکە چەند کتێبێکە دەسمان کەووتنەوە بەکرینەوەیان لەناو کتێبخانەکاندا.

٩. **کتێبخانەی شاری قەڵاچوالان:** ئەم کتێبخانەیە لەم دواییەدا گواستیانەوە بۆ ناو سلێمانی لەدوای دروستکردنی ئەم شارە خۆشەویستەمان. ئێستا هیچ ناوی نەماوە لەناودا بەهەموو ئەسەفەوە.

١٠. **کتێبخانەی مەلاکانی خەیلانیی:** ئەم، کتێبخانەیە، یەك جار زۆر بەنرخ بوو هەروەك لەحوجرەی مزگەوتی گەورەی شارەکەی ڕەواندزیی و مەلا (محەمەد خەتی) و هەموو مەلاکانی بنەماڵەی، خەیلانییەکان، بوو، بەڵام بەپێی بیستنم بەهەموو داخەوە لەئاخری ژیانی مامۆستا مەلا (عەبدولکەریم ئەفەندی ئەلخەیلانی) بۆ جاری دووەم لە ساڵی (١٩٦٤) ی زایینی دا ئاگری تێ بەر بوو: هەر لە شوێنەکەی خۆی هەمووی سووتا. (إنا لله وانا اليه راجعون).

١١. **کتێبخانەی کاك ئەحمەدی شێخ.**

* **هەموو کاروباری ناو وڵاتەکەمان بەڕەزامەندی مەلاکانەوە بوو:**

بۆمان دەرکەوتووە لەناوەرۆکی ئەڵقەکاندا، ئەبینین کە لە هەموو کەس بەرێزترو بەدەسەڵات تر لەم وڵاتەدا مەلاکان بوونە. چونکە هەر ئەوان ڕێ نیشادەرو پێشرەوو کارسازو بریاردەر بوونە لەناو ئەم گەلە مەزنەدا. هەر ئەوان خاوەنی بیرو باوەڕو، مێشکێکی پڕ هۆش و رووناك بوونە، هەر ئەوانن هەردەم فەرمایشتەکانی خواو پێغەمبەریان بەخەڵك گەیاندووە.

جا لەبەر ئەمانە هەموو جەماوەری گەلی وڵاتەکەمان بەهەموو بەشەکانییەوە گەردن کەچ و دەس بە سنگ و لەسەرپێ بوونە، بۆ فەرمایشتەکانیان لەبارەی هەموو کاروبارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سەربازی و کارگێڕی.

هەر ئەوان ڕێگەی کردن و نەکردنیان داوە، لەناو ئەم گەلە پیرۆزەدا. بەتایبەتی شێخەکان و ئاغاکان و برا گەورەکان بەگشتی هەموویان هەر دەس بەسنگ بوون بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانیان، دەوڵەتی عوسمانی هەموو کات داوای یارمەتی لە مەلاکان کردووە بۆ سەرکووتانەوەی گەل و سووراندنی کاروباری ناو ئەم وڵاتە، بەو شێوەیە کە خۆی ویستوویە. ئەمە یەکێکە لەبەڵگەو نموونەکان لەبارەی دەسەڵاتی مەلاکانەوە با بۆتانی باس بکەم.

لەیادمە، هەرگیز لەیادم ناچێ، وەك لەهەوەڵی ساڵەکانی ژیانم هەتا ساڵی (١٩٥٥)ی زایینی دەم بینی: هەموو پیرە تەمەن درێژە تێ گەیشتووە دڵ بریندارەکان، لەناو خۆیاندا، ئەم باسانەیان دەگێڕاوە، دەیانگوت:

(پاشای گەورەی ڕەواندوز) لە کاتەکانی پێش کۆتایی ژیانیدا، لەبەر ئەوە کە هەست و توانایەکی زۆرو بێ ئەندازەی هەبوو، بایەخی بەدەوڵەتی عوسمانی نەدەدا، ئەیەویست یاخی ببێ لەڕژێمی ئەم دەوڵەتە، بەخۆی کاروباری سەربەخۆیی وڵاتەکەی برانێت و بپارێزێت بۆ هەتا هەتا ڕژێم هێن گەل بێ و بۆ گەل بێ. بەڵام پاشا نەیتووانی سەربەخۆ بەم کارە هەستێ بەڵکو ئەم ناوەرۆکەی ناو دڵی خۆی روون کردەوە بۆ مەلاکانی کە یەکێ لەئەوانە مەلا محەمەد خەتێ بوو ئەم مەلایە وا دانرابوو کە مەلای تایبەتی پاشایە، هەموو هەست و بیرو ڕای هەر لەگەڵ ئەودایە. بەڵام، لەکاتێکدا کە مەلای خەتی ئەم ئاوەخنەی دڵی پاشا تێ گەیشت وەڵامی دایەوە وتی:

(بەهیچ جۆرێك ئاین ڕێ نادا بۆ یاخی بوون لەبڕیارەکانی خەلیفەی ئیسلام).

بەم چەند ووشەیە ئۆمێدی پاشای نەهێشت و بۆ هەتا هەتا، پاشا زانی کار لە کارترازا تازە بەتازە هەرچەند هەوڵ بدا، هەر سەرناکەوێت چونکە مەلاکان بەگشتی لەگەڵی نین لەم یاخی بوونەی کە مەبەستی وایە پێی هەڵسێ. لەگەڵ ئەمەشدا کە بەشێکیان هانیان داوە بۆ مەبەستەکەی.

ئەوجا پاشا دوای ئومێد برینی لەسەرکەوتنی بەسەر عوسمانییەکاندا، بەناچاریی، بەسەری رووت و پێی پەتی ڕۆیشت خۆی دا بەدەس ئەم لەشکرەی عوسمانییەوە کە هاتبوونە سەر ئەمارەتی ڕەواندوز بۆ سەرکووت کردنیان.

ئەوجا ئەو عوسمانیانەش لەبەر خوێن خۆریان سەر نگوومیان کرد. جا ئەی کەسی هەموو کەسم یەکێك لەو مەلایانە کە هەردەم مەبەستەکەی پاشایان بەدڵ بوو لەم بارەیەوە (ئیبن ئادەم)ە کە ناوی محەمەدەو مەلایەکی زۆر باش بووە لەباڵەکاتی وەك دەڵێ لەم پارچە هەڵبەستەیدا:

هەوران کردە گۆڵە گۆڵ میکائیلا ئەتۆش دەی
تووتن و ماشان برشێنە دەبا نۆش بێتە سەری دەی
ڕۆمی ئەوا پەیا بوون کوتنجانان دەکەن تەی
میری بۆتان و سۆران لەناو چوون بەدەسییەی
کوردستانما چی لێ هات کوردان بۆ ماتن تا کەی؟؟

ئەم بارەی نێوان پاشاو، مەلای خەتی و، ئەنجامەکەی نموونەیەکە لەجۆرەها نموونە، بۆ ئەوەی کە بزانی لەئەم وڵاتەدا هەموو کات کاروبار هەمووی هەر بە ڕەزامەندیی مەلاکانەوە بوو.

هەر وا بوونە لەچەرخەکانی پێشوودا. بەڵام لەدەورو بەری ساڵی (١٩٥٨)ی زایینی بەدواوە. ئەم دەسەڵاتەیان نەما، هەر کەس بوو بەخاوەنی کاروباری خۆیو بەس ((لکل إمرئ منهم يومئذ شأن يغنيه)).

*** نووسین لەووڵاتەکەماندا:**

وتوومانە لە پێشوودا کە چەند بایەخ درابوو بە زانست لە ووڵاتەکەماندا، بەڵێ ئەمە راستە، فەرموون سەیرکەنو بیر بکەنەوە لەم هەموو هەوڵو کۆشش کردنە کە مەلاو فەقێ کردوویانە لەبارەی ئەم بایەخدانەوە تا رۆژ گەیشتووە بەو رۆژە کە هەزاران نووسەری زانستی پەیدا بوونە لەناو ئەم گەلەدا.

ئەم کتێبێکی نووسیوەتەوەو ئەو کتێبێکی دیکەی نووسیوەتەوە، یەکێکی دی (تعليقات)و (توجيهات)ی پێشکەش کردووە. ئەم هەر نووسینێکی کردبێ ئەو (شرح) و (حاشيه)و (قيد)ی بۆ کردووە. ئەوەی توانای هەبووە (تذهيب)ی کردووە. هەرکەس بەتوانای خۆی (اعراب)ی کردووە.

هەزاران نووسەری (نحو)و (صرف)و (منطق)و (آداب البحث والمناظرة)و (بلاغة)و (اصول الفقه)و (اصول الحديث)و (كلام)و (عقائد)و (رياضيات)و (حكمة)و (تفسير)و (حديث) و (فقه) وجۆرەها (علوم)و (فنون) لەناو حوجرەی مەلاو فەقێکاندا بەشەوو بەرۆژ لەگەڵی قەڵەمیان لەکاردا بووەو بەرهەمی علمیان پێشکەش بەگەلان کردووە، هەر کەس بەتوانای خۆی هەوڵو تەقەلای داوە بۆ خوێندن، بە نووسین، بە زمان، بۆ پتەوکردنی بنچو بناغەی زانستو مەلاو مەلایەتی لەووڵاتەکەماندا بەدرێژایی ئەم هەموو چەرخانەی رابوردوومان، تا گەیشتین بە ئەمرۆکە. ئەی ئەو هەزاران مەدرەسەو ئەو هەزاران هەزار کتێبە کە هەبوون لە مزگەوتو مەدرەسەکانداو لەناوچەکاندا لە گوندو شارەکاندا ئەمانە هەمووی رەنجو پاشماوەی کێ بوو؟ ئەو هەموو نووسەرانە کە نووسینیان کردووە بەرەنجی کێ پێ گەیشتبوون؟ سەیری ئەم کتێبانەکەن سەدان ساڵو بەڵکو بەهەزار ساڵیش زیاتر کە هەن، ئەو هەموو ئەوانە رەنجو تەقەلای کێن؟

ئەو هەموو کتێبە رزیوانە دەس نووسی کێن؟ کێن ئەوانەی کە لەناویاندا خوێندوویانە؟ تا هەمووی ئاوها ئەبینین: وا دارزاون برۆیتە ناو هەر کتێبخانەیەكو دەست بدەیتە هەر کتێبێکی نووسراوی کۆنی رزیو دەبینی کتێبەکە لەنووسینو دارشتنی مەلایەکە. سەیری حاشیەکانی بکە، یەکەم حاشیەی لە نووسینی مەلایەکەو دووەم حاشیەی لەنووسینی مەلایەکی دیکەیە هەر بەم جۆرە ئەو حاشیەو تعليقاتو (إيضاحاته) دەبینی لەدەوری ئەو کتێبە تا ئەگەیتە دوا دێری.

بەڵام بەداخەوە، ئەوا بارو ئەنجامی ئەم هەموو رەنجەی مەلاو، فەقێ سووراوە بۆ ئەو بارەی وەك حاجی قادر کۆیی روونی کردووەتەوە بەم دێرە شیعرەی:

قەدیدو تەذییبو حاشیەو ئیعراب

هەموو با بردی بوونە مەوجی سەراب

*** رۆشنبیری مەلایانی کورد رۆشنبیرییەکی عەرەبیو ئایینی بووە، لەهەڵەوەوە:**

مەلایانی کورد لەچەرخەکانی هەوەڵی ئیسلامەوە نووسینەکانیان بەعەرەبی کردووە، چونکە زمانی عەرەبی زمانی (قورئان)و (حدیث)ی پیرۆزە، لەبەر ئەمە هەموو کات ئەم زمانە کەس توانای نەبوو پشتی تێ بکا، نووسینی هەموو جۆرە کتێبو نووسراوەکانیان هەر بەعەرەبی کردوویانە، هەموو کات هەوڵیان داوە بۆ ئەوەی لەم زمانەدا باڵابن، چونکە رێگای فامی مانای ئایەتو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (د.خ)، هەر ئەوەیە کە مرۆڤ فامی ئەم زمانە بکا، زۆر باشو ئەمەش بەوە ئەبێ، ئادەمیزاد ئەم زمانە باش بزانێ، هەوڵو کۆششێکی باشی تیا بکا. جا لەبەر ئەمە توانای خۆیان هەمووی تەرخان کردووە بۆ فامی ووشەکانی ئەم زمانە.

هەر لەبەر ئەمەشە کە گەلی کورد بەگشتی هەردەم دەس بەسنگەوە بوونە بۆ خزمەتی ئەم زمانە، هەردەم گەلی عەرەبیان داناوە لەناو گەلانی ئیسلامدا بەبرای گەورەی هەمووان، دڵخۆش بوونە بەدڵخۆش بوونیانو خەم بارو زەبوون بوونە، بەخەم خواردنو زەبوون بوونیان.

هەر ئەمەشە وای کردووە، کە نووسەرانی کورد نووسینەکانیان بێگومان لە سەدا نەوەدو نۆی بەزمانی عەرەبی نووسیوە، لەچەرخەکانی کۆنەوە، تاوەکو ئێستاکەش، سەیری کتێبەکان کەن لەنووسینەکانی ئەو مەلایانە، دەبینن هەردەم ئەمانە دڵ پاك بوونە، بەرانبەر بە گەلی عەرەبو زمانەکەیان. (إنما المؤمنون إخوة)، و (إن اكرمكم عند الله اتقاكم)، (إن هذه امتكم أمة واحدة)، (كلكم من آدم. وآدم من تراب).

ئەم دروشمانە هەردەم هەمووی دروشمی ئەو مەلاو، نووسەرانەی گەلی کورد بوونە، لەناو نووسینەکانیاندا، بۆ هەموو گەلانی ئیسلام بەگشتی. سەرەرای ئەوەش کورد پەنای بردوەتە سەر زمانی فارسیو تورکی لەئەدەبو ئایندا.

*** کوا ئەو هەموو کتێبانە کە هەبوون لەناو کتێبخانەکانی ووڵاتەکەمان لەکاتەکانی کۆندا؟**

لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمو هاتنی دەوڵەتی ئینگلیز بۆ عێراق، ئەوکاتە کۆمەڵ کۆمەڵ لە موبەشیرەکانی ئەورووپایی هاتنە ناو عێراقی خۆشەویستمانو دەسیان کرد بە تەبشیر. بێگومان ئەم کارە بەرەزامەندیی رژێمی عێراقی پاشایەتی بوو. ئەمانە هەروەك بیرو باوەرو ئایینی مەسیحیەیان بڵاو ئەکردەوە، بەگەلێك شێوە لەووڵاتەکەدا. لەهەمان کاتدا بەشێوەیەکی تایبەتیو نهێنی دەستیان کرد بەکرینی کتێبی دەسنووسی کۆن لە هەموو ناوچەکاندا.

جا بۆ ئەم مەبەستەیان، لەهەر شارێك، چەند کەسێك بوو بوون بەکرێ گیراویان، ئەمانەش هەر ئەژمێردران لەریزی مەلا چونکە هەر لەبەرگو شێوەی ئەوانەدا بوون. ئەم کتێبانەیان ئەکری بەنرخێکی زۆر گران، ئەم کارە وای لێ هاتبوو کتێبێك ئەگەر یەك درهەمی بکردایە ئەوانە بەچەند قات ئەیان کری، ئەم بەکرێ گیراوانەش، وایان دەنواند لەلای

خەڵك كە ئەمانە بۆ خۆیان ئەیكرن، زۆر دڵخۆشن بەئەم جۆرە كتێبانە، لەبەر ئەمە، بەم نرخە بێ ئەندازەیە ئەیكرن، لەگەڵ ئەمەشدا قسەی خۆمان بێ: خەڵقی وولاتەكەمانیش لەبەر ساویلكەیی و نەزانین هەر كەس كەیفی ئەهاتەوە كاتێ، كە كتێبەكانی، بەو نرخە بێ ئەندازەیە ئەفرۆشت. زۆر كەس كتێبخانەكەی خۆی هەمووی فرۆشت بە هەزاران كتێبی نایاب فرۆشرا بەداخەوە، بەڵام زۆر كەس لەمەلا تێگەیشووە پێگەیشووەكان خەفەت باربوون لەداخی ئەم كتێب فرۆشتنە چونكە ئەوانە ئەیانزانی، ئەم بەكرێ گیراوانە كە ئەم كتێبانە ئەكرن بێگومان بۆ خۆیان نایكرن، چونكە عەقڵ رێ نادا ئەم مرۆڤانە بتوانن ئەم نرخە بێ ئەندازەیە بدەن بۆ كرینی كتێب، بۆ خۆیان، بەعەقڵی خۆیان ئەیانزانی، كە ئەم كارەیان لەئەنجامدا كتێب نایەڵێت لەوولاتەكەماندا، بێگومان یەكێك لەهیواكانی داگیركەر ئەوەیە نابلوقەی نان و زانین بدا، لەوولاتە خۆشەویستەكەماندا. بەڵام نە ئەو بەكرێ گیراوانەو، نە ئەو كتێب فرۆشانەش گوێچكەیان رادەگرت بۆ قسەو ئامۆژگاری ئەم تێگەیشتووانەی ناو وولاتە خۆشەویستەكەمان.

ئەم جۆرە نامەردییە لە ژێرەوە هەر بەردەوام بوو تا ساڵی (١٩٥٨)ی زاینی، ئەو كاتە شۆرشی (١٤)ی گەلاوێژ هات و، هەموو (مبشر)ەكانی دەركرد لە عێراق. ئەوسا ئەم بابەتە كتێب فرۆشتنە نەما لەوولاتەكەمان بەڵام لەدوای چی؟

لەدوای ئەوەی چەند كتێبخانە فرۆشران و، پەرپووت بوون و، كتێبی وایان تیا نەما كە بایەخدار بێ، چەند كتێب هەبوون ناویان دابووە، لەبەر باشی و، سوودە بەخشیی كە چەند كەس چوونە بۆ ئەو مەدرەسانەی كە ئەو كتێبانەی تیایە بۆ ئەوەی كە سوودیان لێ وەربگرن، بەڵام كاتێك زانراوە، ئەو كتێبانە نەماون.

بێگومان كەس سۆراخیانی نەئەزانی، كەس نەیئەوت: ئایا دزراون، یان فرۆشراون؟. هەر ئاوها زۆر كەس كتێبی ئەدرزا لەناو كتێبخانەكەی خۆی كەس نەی ئەزانی كێ دزیی؟ بۆ كوێ برا؟ ئەگەر ئەتەوێ بەراستی بزانی ئەو كتێبانەی هەموو فرۆشران، یا وون بوون و دزراون و نەماون لەناو كتێبخانەكانی وولاتەكەماندا ئەنجامیان بەچی گەیشت؟ با بەكورتی پێت بڵێم:

ئەو كتێبانە هەمووی، بەكرێ گیراوەكان هەر كەس بەتوانای خۆی، لەكرداره چەپەڵەكەیدا، بەچەند قات، بەقازانج ئەیانی فرۆشتەوە، بە (مبشر)ەكانی، ئەوانیش هەر كەس ئەو كتێبانەی ئەنارد بۆ وولاتەكەی خۆی. ئێستا هەموو ئەو كتێبانە وا دانراون لەناو كتێبخانەكانی ئەوروپا لە ئینگلتراو فەرەنساو ئەڵمانیاو ڤاتیكان و ئەم بابەتە وولاتانە. لە كارەساتی ئەنفالی ساڵی (١٩٨٨) پاش رووخاندنی (٤٥٠٠) گوندی كوردستان رژێمی بەعس هەموو دەسنووسە ئایینی و ئەدەبیەكانی گەلی كوردی بردە (دار مخطوطات صدام) لە بەغداو پاش رووخانی رژێم ساڵی (٢٠٠٣) كەس نازانێ ئەو دەسنووسانە ماون یان فەوتاون و تاڵان كران.

هەروەها لە راپەرینەكەی ساڵی (١٩٩١) لە شارێكی وەكو كەركوك پاش ئەوەی كە خەڵكەكە كۆرەوی كرد بۆ ناوچەكانی سنوور رژێمی بەعس هەستا بە تاڵانكردنی ماڵ و موڵكی كوردان لەو شارەو كۆكردنەوەی هەموو ئەو كتێب و دەسنووسە كۆنانەی كە لە ماڵەكانی كورد هەبوو لەم شارەو بەرەو شوێنێكی نادیار راپێچیان كرد، گەلێك كتێبخانەی گرنگی ماڵەكانی ئەم شارە بەرەو فەوتان چوو.

*** ساڵەكانی خوێندنی فەقێیەتی لەم وولاتەدا:**

خوێندن لەوولاتەكەماندا بەند نەكرابوو بە ساڵەوە، هەر كەس بە كەیفی خۆی خوێندوویەتی، چەند ساڵ كە خوێندوویەتی، زۆر فەقێ هەبوون خوێندوویانە هەتا ریشیان زۆری سپی بووە هەر لەفەقێیەتی ماونەتەوە، چونكە خوێندن بۆ خوا كراوە، هەر كەس خۆی هەرچەندێك ماندوو كردبێت بەخوێندنەوە، مانای وایە ئەو كەسە زیاتر بۆ خوا رەنجی داوە، بەڵام لەكاتی عێراقی پاشایەتیدا، دەوڵەت یاسای دانا بۆ خوێندنی فەقێیەتی، جا هەتا چەند ساڵێك ماوەی خوێندنیان دانا بەشەش ساڵ، لەدوای فێربوونی خوێندنەوەو نووسین، بەو مەرجەش كە هەموو ساڵ فەقێكان بەشداربن لە تاقیكردنەوەكانی كۆتایی ساڵدا، بەپێی ئەو یاسایەی كە دانرا بوو بۆ تاقیكردنەوەكانیان، جا لەدوای خوێندنی ئەم ماوەیە فەقێكان بە (دەرچوو) ئەژمێردران، ئەو كاتە دائەنران بە (دەرضوو الصف السادس في المدارس الملحقة بالمعابد)، ئەم (تخرج)ەش هیچ سوودێكی تیا نەبوو بۆ ئەم خەریجانە، ئەوەندە نەبێت كە سەرفراز ئەبوون لە خزمەتی عەلەم بەئیلزامی و بەس، لەدوای رژێمی پاشایەتیدا، ماوەی خوێندنی فەقێیەتی كرا بەدوانزە ساڵ، یاسای تازەی بۆ دانرایەوە، ئەو كاتە دەبوایە فەقێكان خوێندنیان بەپێی ئەو یاسایە بێت، هەموو ساڵ لە تاقیكردنەوەكاندا بەشدارو سەركەوتوو بن، بۆ ئەوەی كە بچنە پۆلێكی بەرەو ژوورتر تا لەپۆلی دوانزەیەمین سەرفراز ئەبوون، ئەوجا ئەم فەقێیانە ناوئەبران بە (دەرضوو الصف الثاني عشر في المدارس الملحقة بالمعابد). دیسانەوە ئەم خوێندن و یاساو تاقیكردنەوەو (ناجح) بوونەش سوودەكەی هەر ئەوەندە بوو كە ئەم فەقێیانە ئەژمێردران بە (دەرچوو)، ئەو كاتە زۆریان لێ نەدەكرا بۆ خزمەتی عەلەم بە ئیلزامی، ئەمجا ئەم فەقێیانە كە بەم شێوەی سەرەوە باسمان كردوون، بەپێی ئەم یاسایە بوو بوون بەكۆمەڵ كۆمەڵ، هەر كۆمەڵێ خۆیان ناونووس كردبوو بەیەكێك لەو مەدرەسانە كە بەپێی یاساكە ناسرابوون، شوێنی بڕوابوون لەلایەن میرییەوە، جا بەپێی ئەم یاسایە هەموو ساڵێك لە هەوەڵی هاویندا لە كاتی تاقیكردنەوەی كۆتایی ساڵەكانی خوێندن لە خولی یەكەمدا، هەموو فەقێكان ئامادەی تاقیكردنەوەكە ئەبوون، كە لەناو یەكێك لە مزگەوتە گەورەكان ئەكرا بەشێوەی زارەكی و بە نووسین، ئەوجا هەموو ساڵێك لیژنەیەك بۆ ئەم تاقیكردنەوەیان پێك ئەهات لە هەموو لیوایەك لە لیواكانی عێراق لەلایەن (مديرية الاوقاف ومديرية التجنيد)ەوە، كە پێكهاتنەكەش لەسەر ئەم شێوەیەی خوارەوە ئەبوو:

١. قاضي المحكمة الشرعية، رئيسا للجنة الامتحانية.

٢. مدير التجنيد او ضابط التجنيد، مشرفا في اللجنة

الامتحانیة.
٣. اثنین من رجال الدین من الأوقـاف، عضوین في اللجنة الامتحانیة.
ئـەم خوێندنەی فەقێیەتی بـەم شـێوەی باسمان کـردووە بەردەوام بوو، تا ساڵی (١٩٥٩)ی زاینی، ئەوکاتە کۆماری عێراقی دەورەی کردەوە بۆ (رجال الدین) لە ژێر ناونیشانی (الـدورة التربویة لرجال الدین)، هەموویانی دامەزراند لە (٢٧)ی تشرینی دووەمـی سـاڵی (١٩٦٠)ی زایـنی دا بە (معلم التربیة الدینیة في المـدارس التابعة لـوزارة المعارف) بە دامـەزراندنی ئـەم دەورەیـە، فەقێ بەشێوەیەکی گشتی نـەما لـەووڵاتـەکـەمـان، ئـەوجا ئـەوانـەش کـە دڵخۆشـبوون بەخوێندنەکەیان، نەچووبوون بۆ ئەم دەورەیە باری ژیانیان وای لێکردن کە دەست لەخوێندن هەڵبگرن، دەست بکەن بەکاروباری تایبەتی ژیانی خۆیان و ماڵ و کەس و کاریان، ئەمیش بەهۆی ئاژاوەو تێکچوونی باری ناو ووڵاتەکەمانەوە بوو لە ساڵی (١٩٥٨)ی زاینی بەدواوە.
ئەم دەستووورو یاسایەی لێرەدا وا باسم کردووە ئەمەش هەر نەما لەناودا، چونکە ئەم جۆرە خوێندنە نەما لەووڵاتەکەماندا، ئەوەی ویستی بخوێنێ لە مێژووەی سەرەوە بەدواوە ئەبێ لەسایەی (وزارة التربیة والتعلیم)دا لەوێ بخوێنێ.

*** کاتی گەشتی مەلاو فەقێ لەچوارچێوەی ووڵاتەکەماندا:**
چونکە کـەژی بەهار کەژێکی خۆش و کاتی خۆشی بوو، ئاژەڵدارەکانی گوندەکانی چوارچێوەی ووڵاتەکەمان لەم کەژەدا لە هەموو لاوە هەر ماڵێك بنەگەیەکی ئەبردە دەرەوەی ئاوایی لەو چۆڵی و دەشت و دەرەدا لەناو گوڵ و گوڵاڵەو حاجییلەدا ڕەشماڵێکی هەڵدەدا. ئەو دۆڵی و هـەردەو ناو شاخانە، ئەودەشت و چیا و چۆڵانە، ئەو هەموو تەپەو مێرگ و ڕەندانە، هەمووی پڕ دەبوو لەو ئاژاڵ دارانە.

*** گەشتی مەلاو فەقێی شاری کەرکوك:**
لە شاری کەرکوکی خۆشەویستمان گەشتەکانیان لەگەڵ ئەم ئاوانەشدا دیسانەوە ناو دەبرانەوە بە چوارشەمە سوورە، ئەم ناوەش زۆر ڕێکوپێك و گونجاوە بۆ ئەم گەشتانە، چونکە لەدەورو بەری شاری کەرکوك، شایی و خۆشی بەهەر جۆرێك بێت پێی دەڵێن سوور، ئەم گەشتەی مەلاو فەقێ لەم شارەدا بە شێوەیەکی زۆر بایەخدار هەر لە ڕۆژی چوار شەممەدا دەکرا، هەر وەك گەشتەکانی هەموو چینەکانی دانیشتوانی ئەم شارە کە دەکران، کەواتە چوار شەمە سوورە بەمانای (گەشت و خۆشی و سەیرانی ڕۆژانی چوارشەمەیە)، ئەبێ ئەمەش لەیاد نەکەین ئەگەر بەهارەکەی زۆر خۆش بووایە زۆر جار ئەم گەشتەیان پاش چەند ڕۆژێك دووبارە دەکرایەوە لەلایەن هەموو مـەلاو فەقێکانەوە، ئەمجارە زۆر خۆشحاڵم بەوەی لێرانەدا باسی گەشتەکەیان لەم شارەدا بکەم بۆ ئێوەی بەرێزم. بیبوورن، ناچارم چونکە خۆم خەڵکی ئەم شارەم زۆرم پێخۆشە هەردەم باسەکانیان بکەم بۆتان، جا ئەی برایانی بەرێزم مەلاو فەقێ لەم شارەدا زۆر پێکەوە تەبا بوون، هەر بەخۆشی و دڵخۆشی و بێ جیاوازی ڕایان ئەبوارد، هەموو بەهارێك کاتی ئەم گەشتە کۆبوونەوەکیان ئەکرد لەمزگەوتێك لەوێ هەر شتێك پێویست بایە بۆ ئەم مەبەستە هەموویان ناونووس ئەکرد، مامۆستاکان ئەوەی بەماڵ توانای باش بوو هەر کەس یارمەتییەکی باشی ئەدا، ئەوانەی دیکەش هەر یەك بەتوانای خۆی، زۆر کەس هەبوون لەخێرخوازەکانی ناو شار، ئەوانیش هەر یەکەو یارمەتیان ئەدا بۆ پێویستییەکان، ئەو کاتە ئەم کۆکراوە ئەبوو بەمەبلەغێکی زۆر باش، زیاد ئەبوو لە کرینی هەموو شتێك، ئەمن بەخۆم لـەدەورو بەری ساڵی (١٩٣٥)ەوە هـەتا (١٩٥٥)ی زایـنی هـەموو سـاڵێ هاوبەشی ئەم گەشتەم دەکرد.

*** ئەو ڕۆژەی ئەم گەشتەی تێدا دەکرا:**
ئەو ڕۆژەی تەرخان کرابوو بۆ ئـەم گەشتە لە بەیانییەوە هەموو مەلاو فەقێ ڕوویان ئەکردە ئەو مێرگە کە دەستنیشان کرابوو بۆ ئەو مەبەستە. ئەوجا نزیکەی سەد مەلا لەگەڵ چوارسەد فەقێ لەگەڵ ئەو بەرێزانەی داوەت کرابوون هەموو گرد ئەبوونەوە لەو مێرگەدا.
بە کورتی با بڵێم: هەموو پیاوەکانی ئایینی بەشداریی ئەم گەشت و چوارشەمە سوورەیـان هـەر ئەکرد، ئەوجا چەند کەسێك خۆیان تەرخان دەکرد نان و چێشت و خواردنەکانیان ئامادە ئەکرد. خەڵکەکەی دێت دەستیان ئەکرد بەبەزم و شایی و گۆرانی و زەماوەند و تۆپێن و (تمثیل) و جۆرەها یاری کردن. ئەوانەی کە ئەچوون بۆ ئەو دەشت و گەشتە هەموویان بەشداریی ئەو یارییانەیان ئەکرد.
هەر لەبەر چاومە ساڵێك لە ساڵان، ئەو داوەت کراوە بەرێزانە کە بریتی بـوون لە (موتەسەریفی کـەرکوك: شێخ مستەفا قـەرەداغـی) و (دادوەری دادگـای شـەرعـی: شێخ حەسەن قەرەداغی) و (سەرۆکی شارەوانی: شامیل ئەلیەعقوبی) و (بەرێوەبەری ئەوقاف) بەهەموو کار بەدەستەکانییەوە. ئەوجا دوای نوێژکردن و، خواردنی نیوەڕۆیان (حاجی مەلا عومەری کوری مەلا سالحی کوری مەلا عەبدوڵلای عومەر گونبەدی) چووە دیار سەریان، ڕووی کردە (موتەسەریف) وتی: یاشێخ ئێوە وا دیارە، نانی پاڵەوان ئەخۆن، پاڵەوان بازیش ناکەن.
ئەو کاتە (موتەسەریف) هاتە جواب و گوتی: مامۆستا، هەر ئێستا هەموومان دەکەوینە پاڵەوان بازیی.
ئەو میوانانە، لە هەموو ئەو یارییانەدا کە دەکران بەشدارییان کـرد: شایی دابـەستراو گشتیان تیا بـەشداربـوون. لەبەر چاومە جەنابی شێخ مستەفا قەرەداغی بە خۆی سەرچۆپی شاییەکەی گرتبوو: ئەم بەزمو، خۆشییە بـەردەوام بوو، تا کاتی پاش نوێژی عەسر. ئەمجا میوانەکان دوعا خوازییان کردو سواری ترومبێلەکانیان بـوون و بەجوانترین ڕێـزەوە بەرێ خران.

*** لەکاتی گەرانەوەی ئەم مەلاو فەقێیانە بۆ ناو شار:**
لـەدوای ڕۆیشتنی ئـەم بـەرێزانـە، ئەمجا ئـەم هەموو مەلاو فەقێیانە ڕیزیان بەستبوو لەدوای یەك، مەلاکان لەپێشەوەو (مستعد)ەکان لـەدوای ئـەوان، لـەدوای ئەوانیش ئەوانەی دیکەو هـەر کـەس بەپێی پلەی خۆی هەموو هـەر جۆرەها

بەستەو ستایشیان ئەووت، لەو کاتەدا وەك بەرەو ماڵ ئەهاتنەوە، ئەبێ ئەمەش بڵێم کە کۆبوونەوەکەش کرابوو لەئەو پانایی و مێرگو سەوزەڵانییەی کە هەبوو لەبەردەمی (ئاشی قەرەباش)دا، لەلای ژوورووی گردی زەیتونلیەوە وەك دەکاتە شوێنو دەوروبەری گەرەکی سەر چەمی ئێستاکە کە لە رەحیماوای کۆنە، ئەوجا هەر لەئەوێوە ئەو هەموو فەقێو مەلایانە بە چەپڵە رێزانەوە بەکەناری خاسەدا ئەهاتنەوە بۆ ناو شار، هەتا هەتا هەر لە پێش چاومە وەك باوکم لەریزی پێشەوە ئەرۆیشتو ستایشی (یا مستەفا یا مستەفا)ی ئەخوێندەوە بە جۆرێك وەك دەستی کرد بەدێرە شیعرەکەی یەکەمی لەسەر ئاوازەکەی هەموویان هەر وردە وردە چەپڵەیەکی نەرمیان لێ دەدا، وەك باوکم دێرە شیعرەکەی تەواو کرد ئەمجا هەموو بەیەك دەنگو یەك ئاواز لەگەڵ چەپڵە لێدان ئەم دێرە شیعرەیان دەووتەوە (یا مستەفا یا مستەفا ئەنوەری عالم مستەفا) ئەمجا باوکم دەستی کرد بەخوێندنەوەی دێری دووەم بەشێوەی دێرە شیعرەکەی یەکەم، وەك تەواو خوێندییەوە هەموو بەچەپڵە لێدانەوە ئەم دێرە شیعرەیان بۆ گێرایەوە:

(یا مستەفا یا مستەفا ئەنوەری عالم مستەفا) هەر بەم جۆرە باوکم شیعرەکانی ئەخوێندەوەو ئەوانیش هەموو لا دێرە شیعرەکەی (یا مستەفا یا مستەفا)یان بۆ ئەگێرایەوە بەچەپڵە رێزانەوە بەهەموو ئاوازەکەیەوە تا کۆتایی ستایشەکە هات.

جا هەر وا ئەم خۆشیە بەردەوام بوو تا گەیشتنە عاستی ئاشی کۆشکلی. ئەوجا لەوێوە، هەموو بڵاوەیان لێکرد هەر کەس، بۆ لای ماڵی خۆی رۆیشت، دوای دوعا خوازیی و، گەلێك قسەی خۆشو نوکتەبازیی.

ئەمەش ئەو ستایپشەیە فەرموون ئێوە بۆ خوێندنەوەکەی:

یا مستەفا یا مستەفا ئەنوەری عالم مستەفا

ئەی سەیدی سەرداری من ئەی مەحرەمی ئەسراری من
ئەی ئەحمەدی موختاری من سەڵات لەسەر تۆ یاری من
لوتفی بفەرموو سەروەرم شافعی رۆژی مەحشەرم
هەر تۆی لە گەرما سێبەرم شاهی عەرەب شاسواری من
نوری بناغەی عالەمە بۆ پێغەمبەران خاتەمە
ئادەم لەبەر ئەو ئادەمە تەحقیق بکەن گوفتاری من
نوری لە ئادەم پشت بە پشت هەتا بەعەبدوڵڵا گەیشت
هەم ئامینە حۆری سروشت مەحفوز بۆ تۆ سەرداری من
لە ئاسمانا تۆ ئەحمەدی لەسەر زەمین محەمەدی
بۆ ئوممەتت هەر ئەمجەدی سەیدی عالم یاری من
لە جەننەتی دارو ئەلبەقا حۆریان دەکەن سەیرو سەفا
رۆحم فیدات یا مستەفا سەلام لە تۆ سەرداری من
ئەی شەمعی جەمعی مورسەلین تۆی رەحمەت للعالەمین
هەر تۆی (شفیع المذنبین) حەبیبی عالم یاری من
ئەی خالقی رۆژو شەوێ هەرکێ محەمەدی دەوێ
بە بەر (شفاعة)ی کەوێ (شفاعة) ئەی سەرداری من

ئەمەش بزانە، کە ئەم ستایشە فۆلکلۆرییە، لەناوچەی کەرکوك ناسراوە بە، ستایشی یا مستەفا یا مستەفا.

ئەو رۆژە، وەك مەلا و فەقێ ئەچوون بۆ چوار شەممە سوورە ئەم گەشتەیان دەنگی ئەدایەوە لەکەرکوکدا چونکە دانیشتووانی ئەم شارە هەموو دڵخۆش ئەبوون بە دڵخۆشی ئەم پیاوە ئایینیانە، خەڵقی خەبەریان دەدا بەیەکترو دەیانگوت: ئەمرۆکە چوار شەمە سوورەی مەلاو فەقێیە. هەموو دانیشتووانی ئەم شارە بەمە دلخۆش ئەبوون.

ئەمەش بزانە کاتێك کە لەپاش نوێژی عەسر ئەگەرانەوە بەرەو مزگەوت و حوجرەکانیان، هەموو بەچەپڵە رێزانو ستایشەوە بەو جۆرە وەك لە پێشەوە باسم کردووە، ئەو کاتە ئەتبینی لەم بەرو لەوبەری رووباری خاسەوە ئەوانەی چاویان پێیان بکەوتایە هەموویان رادەوەستان، کەس رۆیشتنی نەدەکرد چونکە سەیری دیمەنی ئەو جەماوەرەیان ئەکرد، کە چ زەماوەندێك دەکەنو چەند بەدڵخۆشیەوە دەگەرێنەوەو چەند دڵ پڕ هیواو مەبەستن، هەرچەند ئەوان کەیف خۆشتر ببونایە دانیشتوانی ئەو شارەش کەیف خۆشتر دەبوون، ئەمەش هەمووی هەر لەبەر ئەوە بوو کە ئەو جەماوەرە هەموویان پیاوانی ئایینیو رێ روون کەرەوەی ئایینی ئیسلامو میراتگری پێغەمبەر (د.خ) بوون، خەڵك بەئەرکی سەر شانی خۆی دەزانی هەردەم بۆیان دەست بەسنگ بێو رێزیان لێ بنێ، بەسە بۆ ئەم مەبەستە فەرمایشتەکەی خوای گەورە وەك فەرموویەتی: (وما كان المؤمنون لينفروا كافة فلولا نفر من كل فرقة منهم طائفة ليتفقهوا في الدين ولينذروا قومهم إذا رجعوا إليهم لعلهم يحذرون) (صدق الله العظيم).

* رئيس العلماء:

(رئيس العلماء) لە وڵاتەکەماندا لە هیچ کاتێکدا بەتەرخان کردنو دانانی میری، یاخود بەهەڵبژاردن نەبووە بە (رئيس) چونکە رەئیسی ئەمانە کاربەدەستیو بەرامبەر بەمووچەیەك نەبووە هەر نازناوو رێزلێنانێکی ئەدەبی بووەو بەس، واتە بزانە مەلایەك لەناو مەلاکان کە ناوبراوە بە رەئیس لە ئەنجامی ئەوەدا بووە کە ئەم مەلایە تەمەنی لە هەموویان درێژتر بووەو زۆر خزمەتی زانستی هەبووەو زۆر دەرسی بەفەقێکان داوەو مەلایەکی زۆر باڵاو زیرەكو مەشرەب خۆش بووەو زۆر ئیجازەی عیلمی بەمەلاکان داوەو زۆر فەقێی پێگەیاندووەو زۆربەی ئەو مەلایانە لە خزمەتی خوێندویانە جا بەهۆی ئەمانەیەوە، لە کاتێکدا کە ئەو مەلایەی پێش ئەو ئەخوێندرایەوە بەسەرداریان چووەتە رەحمەتی خواوە ئەو کاتە ئەم مەلایەی ئێستا کە بەم شێوەی٠٠ سەرەوەیە، هەموو مەلاکان هەڵقەو خەرمانەن بۆی، بەجۆرێکی سروشتی، هەموویان گوێیان بۆ فەرمایشتەکانی راگرتووەو قەبووڵیان کردووە بەسەرداری خۆیان ئەو کاتە ئەم مەلایە ناوبراوە بە (رئيس العلماء) واتە ئەوەی کە ناوبراوە بەم ناوە پیرۆزە لە چەرخو رۆژەکانی پێشوودا ئەوە هەر بەهۆی (فضل)ی خۆی بووە بەسەر هەموو مەلاکانی ناوچەکەدا، جا بۆ نموونە با بڵێین: وا خۆت دەبینی لەچەند چەرخ لەمە بە پێشەوە، هەتا ئێستاش بنەماڵەی (جەلی زادە) گەردنیان بۆ کەچ کراوە بەناوی ئەوەی کە بنەماڵەی (رئيس العلماء)ی هەموو کوردستانی عێراقن، مامۆستای زۆربەی مەلاکانن، کەواتە بەهۆی (علم)و (فضل)ی خۆیانە وەك هەموو مەلا گەردنیان بۆ کەچ کردوون بەدرێژایی چەرخەکانی رابردوو،

هەر وەکو بنەماڵەی (حیدری) لە هەموو کات مەلاکانیان بە (رئیس العلماء) ناوبراون بەهۆی (علم و فضل)یانەوە، ئەم بنەماڵەش بەدرێژایی چەند چەرخ باوك بوونە بۆ هەموو مەلاو فەقێ لە وولاتەکەماندا، هەردەم دەستیان ماچ کراوەو دەست بەسینگەوە لە خزمەتیان وەستاون و پێیان وتوون ماموستا، یان وتوویانە قوربان، هەر وا مەلا لە هەموو شارێك لە شارەکانی وولاتەکەمان لەچەرخەکانی کۆنەوە وەك یەکێکیان بووە بە (رئیس العلماء) هەر بەهۆی ئەوانەوە بووە کە باسمان کردوون لەپێشەوە لەگەڵ باوکداری کردنی بۆ چینی مەلاو فەقێ.

*** کۆبوونەوەی مەلاکانی شاری کەرکەك لەرۆژەکانی هەینی دا:**
لە شاری کەرکوکی خۆشەویستمان هەموو رۆژانی هەینی دوای نوێژی عەسر کاتێکی تایبەتی بوو لەناو مەلاکاندا، هەموویان لەم کاتەدا ئەچوون بۆ سەردانی یەکێکیان بە سرە هەروا بەم شێوەیە لە بیرمە لەتەمەنی پێنج شەش ساڵیم بەدواوە هەر وام دەبینی:

وەك خوالێخۆش بوو ماموستا مەلا (ناسیح – مدرس زادە العثماني) لەکەرکوك ئەو دادەنرا بە (رئیس العلماء) چونکە ئەو لەو کاتانەدا، لەناو مەلاکان کە دەوریان لێ دابوو لە هەموویان تەمەن درێژتر بوو، ماموستای هەموویان بوو هەرچەند مرۆڤ باسی گونجاویی و لێ وەشانەوەی ئەو خوالێخۆش بووە بکا بۆ سەرۆکایەتیی مەلاکان هەر مافی خۆیە چونکە دڵی گچکەی رائەگرت و چاودێریی سوختەکانی ئەکرد، وەك ئاخر ماددە خوێنەکان پێش هەموو کەس، سەردانی نەخۆشەکانی ئەکرد زۆر دڵ نەوایی دڵ بریندارەکان و باوك داری هەموو لایانی دەکرد.

یەکێ ئاوها بێ، بێگومان هەموو لایەك هەر بەگەورەی خۆیان ئەیناسن. دیمەنە پیرۆزەکەی وا لە پێش چاومە وەك لەکاتی هاویندا، کەواو عەباکەی لە قوماشی سیلکی سپی ئەکرد. پیرێکی لاواز، بالا ناوەنجی و خولکێکی نەرم و لەسەر خۆ بوو. (نور) لە رووخساری دەباریی وەك قسەی بفەرمووایە پیاو لەبەرانبەی شەرمی لێ دەکرد.

ئەکەوتە پێش مەلاکانەوە وەك بۆ لای یەکێکیان ئەرۆیشتن، ئەوجا لەو مزگەوتەی تیا کۆدەبوونەوە چای لێ دەنرا، مێوە ئامادە دەکرا. لە دانیشتنەکانیاندا هەردەم لەسەر رایەخ دا ئەنیشتن. چونکە خوالێخۆش بوو ماموستا مەلا ناسیح حەزی نەبوو لەدانیشتنی سەر تەخت و قەنەفە. هەڵسان و دانیشتنەکانیان چەند بفەرمووی بەرێزەوە بوو کۆبوونەوەکەیان ئاییني و ئەدەبی بوو کاتەکانیان هیچ بەفیرۆ نەدەدا. دوای حەسانەوەو نوکتەبازیی و قسە خۆشەکانیان ئەمجا کتێب دائەنراو، ریز ئەکرا لەناو ئەو مەلایانەدا. هەر کەس لە مەیانی ئەو هەفتەیەدا چ پرسیارێکی هەبووایە، یاخود هەر جۆرە یارمەتییەکی زانستی پێویست بووایە لە دانیشتنەکەیاندا لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەو بارەیەوە ئەکرا، ئەنجامێکی بۆ دادەنرا. هەندێك جار باسەکەیان دوا دەخست بۆ کۆبوونەوەی رۆژی هەینی داهاتوو. ئەگەر باسەکەی پێویستی بەلێکدانەوەیەکی تەواو بکردایە، بۆ ئەوەی کە هەر کەس لێکۆڵینەوەی خۆی بەتەواوی بکا، توواناي خۆی بەتەواوی وەربگرێ.

هەر وا رایان ئەبوارد. بەم شێوەیە، تا کاتی پێش بانگی ئێوارە. ئەمجا هەموو میوانەکان بەیەکجار هەڵدەسان و دوعا خوازییان ئەکرد و ئەرۆیشتن بەلام پەنا بەخوا، جا وەرە بتوانە بەتەواوی باسی ئەم دیمەنە بکە ئەم هەموو مەلایانە پێکەوە، ماموستا مەلا ناسیح لە پێشیانەوە بەخۆی و گۆچانەکەیەوە هەموو هەر نووریان لێ دەباری، کە بەو رێگایە هەموو خەڵك هەڵدەستانە سەر پێ و رادەوەستان لە خزمەتیان دەس بەسنگەوە هەتا ئەو ماموستایانە رەت ئەبوون. ئەم کۆبوونەوەیان بەم شێوەی کە باسم کرد بۆتان هەر بەردەوام بوو هەتا ماموستا مەلا ناسیح لە ساڵی (١٣٥٩)ی کۆچی لەمانگی رەمەزاندا چووە رەحمەتی خواوە.

لەدوای ئەو ماموستا حاجی مەلا ئەحمەد مەلا حەکیم ئەو کە لەهەموان گەورەتر بوو بەتەمەن و بە عیلم، ماموستای زۆربەی ئەو مەلایانە بوو ئەم بوو بە (رئیس العلماء) لە کەرکوك. ئەم خوالێخۆش بووەش هەروەك لە کاتی خۆیدا فەقێی ماموستا مەلا ناسیح بووە، لەهەمان کاتدا، پەیرەوی ئەوی ئەکرد لە رەوشتەکانیا رەحمەتی خوا لە هەموویان بێ. جا لە کاتەکانی ئەمیشدا، ئەو کۆبوونەوەیان بەو شێوە کە باسمان کردووە، هەر بەردەوام بوو رۆژ بەرۆژ زیاتر باوك داری هەموو لای ئەکرد زیاتر هەوڵی ئەدا بۆ پتەو کردنی ئەم کۆبوونەوەیان بەهەموو جۆرێك هەوڵی ئەدا کە مەلاکان یەك بن و یەك بگرن یەك ووتارو یەك کارو یەك دڵ بن. چونکە زۆر باش بۆی دەرکەوتبوو کە رەگەزێکی خراپ هەبوو لەناو ئەو مەلایانەدا، هەردەم ئەیەویست ئەو کۆبوونەوەیان تێك بچێ و نەمێنێت و دابڕ دابڕ ببن.

ئەوجا خوالێخۆشبوو بەردەوام بوو لەسەر باوك دارییەکەی، بۆ چینی مەلاو فەقێ هەتا ساڵی (١٩٥٩)ی زاینی بەهەموو داخێکەوە، لەم مێژووەی سەرەوە بەدواوە هەموو چشتێك گۆڕا، خوالێخۆش بوو لەگەڵ چەند مەلایەکی دیکەیدا، لەو مێژووەی سەرەوەدا، لەلایەن میرییەوە زۆر غەدریان لێ کرا، برانە بەندیخانە، بەهۆی ئەو بوختانەی کە بۆیان هەڵبەسترا بوو، زۆر سزا دران بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك، لەگەڵ ئەوەشدا کە بێ تاوان بوون.

بەلام ماموستا لە دوای دەرچوونی لە بەندیخانە هەر لەماڵەوە بوو، دەرنەدەچوو بۆ ئەملاو ئەولا، مەگەر بەدەگمەن، ئەوەندەی کە ژیا لە دوای ئەو بەندو، سزایەی بەراستی رستە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وەك فەرموویەتی: (العلماء ورثة الأنبياء) سەیری پێغەمبەرەکان بکەی دەبینی کە چەند تووشی ئازارو خەم و ئەشکەنجەو مەرگ هاتوونە لەسەر دەستی گەلەکانیان، لەسەردەمەکانیاندا، کەواتە مەلاکان لە هەموو چەرخێکدا ئەبێ ئەم کارەساتانە بچێژن وەکی ئەوان. دەنا چۆن دەبنە، میرات گریان؟!

بەلام، دوای ئەوەی کە ماموستا حاجی مەلا ئەحمەد ئەویش چووە رەحمەتی خواوە لە ساڵی (١٩٦٢)ی زاینی لەکەرکوك ئەو کاتە ئەو کۆبوونەوەیان بەو وەزعەی وەك باسم کردووە

لەناو باسی ئەم دوو مامۆستا خوالێخۆش بووانەدا داخی گرانم ئەوەشیان هەر نەما. بەڵکو هەرکەس بوو بەدزی گای خۆی، یاری مەسەلە مەشهوورەکە وەك دەڵێ: من منم تۆ کێ؟ یان وەك کابرای دەڵێت: ئەمە منم بەم هەسپەوە بەم توورەکەی پڕ قەسپەوە. یا وەك دەڵێن: کەس نەبوو ڕەجەب سەرپاڵەیە. بەڵێ بەقوربان هەر فەرمایشتەکەی، حاجی قادری کۆییە، وەك دەڵێ:-

گەر لە سەحرا مەلا نەمردایە گورگە شین با کەری بخواردایە
شێری درڕونـدە وەك لە پێشە نەما گورگو مام ڕێوی دێنە ڕەقس و سەما

*** سەردانی مەلاکانی ناوشار بۆ لای مەلای دێهاتەکان:-**

بەدرێژایی تەمەنم هەر وام دیت: کە هەموو ساڵێك بەپێی توانا مەلاکانی ناوشاری کەرکوك سەردانێکی مەلاکانی دێهاتەکانیان ئەکرد، زۆر لەم سەردانەش ئەخرایە کەژی بەهار، لەبەر خۆشی ئەم کەژە.

گەلێك جاریش ئەخرایە کەژی هاوین. ئەوجا هەموو مەلاکانی دێهاتەکان دلخۆش و سەربەرز ئەبوون، لە کاتێکدا کە ئەم هەموو مەلایانەی ناوشار ئەچوون بۆ سەر لێ دانی ئەوان. ئەو ڕۆژە کە ئەچوون بۆ لای یەکێك لەو مەلایانە بەپێی ڕێك کەوتنی هەموو لایەکیان بوو لەگەڵ مامۆستای خانە خوێ. ئەمجا ئەگەر دێیەکە نزیك بایە ئەوە هەر بەپیاسە ئەچوون. دەنا ئەوە بەترومبێل ئەچوون، هەندێك جار بۆ شەویش دەمانەوە لەو دێیەدا.

ئەمجا هەرچەند بڵێمو بنووسم لەبارەی دلخۆش بوونی مامۆستای خانە خوێ، دانیشتووانی دێیەکەش ئەوە بەهیچ جۆرێك کاتەکانمان یاریدەمان نادا، کە هەمووی بۆتان باس بکەین بەقەڵەم.

بەڵام ئەوە بزانە کە مەلای خانە خوێ لە خۆشیا پای بەزەویی نەدەکەوت لەخزمەتی میوانەکانیدا هەموو کات خونچەی دەکردو نەی دەزانی چی بکاو، چی بڵێو، چۆن چۆنی هەڵسێو دانیشێ؟ هەموو ڕووی دەبووە یەك پارچە خۆشیی و گەشیی، هەستی ئەکرد بەپلەو ڕێزیی خۆی لەناو مەلاکان و دێیەکەی و گەلەکەیدا.

ئەگەر باسی دلخۆشیی دانیشتووانی دێیەکەی بگێڕمەوە ئەوە هەر ناتوانم بەتەواوی باسی بەنووکە قەڵەم وەشاندنێك تەواو بکەم. بەڵام ئەوەش هەر ڕاستە وەك دەڵێ: (ما لا یدرك کله لا یترك کله).

کەواتە ئەبێ ئەمانەی خوارەوە هەر باسی بکەمو بڵێم: هەموو دانیشتووانی ئەو دێیە کۆ ئەبوونەوەو ئابلووقەی میوانەکانیان ئەداو لەچواردەورەیان دەست بەسنگەوە ڕادەوەستان. لەخۆشیدا نەیان دەزانی چی بکەن؟ ئەوەندە کە دلخۆش و سەر بەرز ئەبوون بەهاتنی ئەو مامۆستایانە.

چونکە سەر بەرزی خۆیان بووو ئەگەر ڕاستەو ڕاست سەیرکەی ئەمە ڕاستە وایە: ئەگەر ئەوان ڕێزو نرخی مەلاکەی خۆیان لەلا نەبووایە ئەو مەلایەش بۆی نەدەگونجا ئەوەندە خزمەت و خواردن و پیاوەتی بکا.

چونکە ئەو مەسرەفە کە ئەکرا بۆ ئەو میوانانە، هەمووی هەر دانیشتووانی ئەو دێیە ئەیان نارد بۆماڵی مەلا. لەئەوێ ئەکرا بەخواردن بۆیان بەڵکو ئەو مەسرەفە کە پێویست بوو بەچەند قات لەوە زیادیان ئەنارد ئەوەش هەر بۆ یارمەتی مەلا بوو.

هەر سەردانێك لەو سەردانانە، بۆ لای هەر یەکێك لەو مەلایانەی دێهاتەکان سەر گوزشتە، وردە قسەی زۆر خۆشی تێدا هەیە. جا لەم بارەیەوە با باسێکی زۆر خۆشتان بۆ بگێڕمەوە:

خوالێخۆشبوو حاجی مەلا عەلی لەیلانی لەکاتێکدا کە مەلای (لەیلان) بوو. لە یەکێکە لەناحیەکانی سەر بە کەرکوك. مەلاکانی ناوشار هەموویان لەکاتێکی سەر لە بەیانی چوون بۆ سەردانی، بۆ شەویش هەر لەئەوێ مانەوە، ئەوجا بابەکەی بابم ئەوە باسی خزمەت و مەسرەف هەر ناگێردرێتەوە. چونکە خوالێخۆش بوو نایەتە ووتار، کە چەند سەخی بوو؟ هەردەم، چەند خوانی ڕازاندەوە لەو شەوو ڕۆژەدا کە ئەومەلایانە چوو بوون بەسەردانی.

ئەوجا ئەوەی شایانی باسە کە بڵێم لەم کاتەدا ئەمەیە: ئەو کاتە کە مەلاکان ویستیان بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك. خوالێخۆش بوو لەگەڵ شێخەکانی تاڵەبانی، کە ئەوانیش هەردەم لەوێ ئامادە بوون بۆ خزمەتی میوانەکان، لەگەڵ پیاوە ماقوولەکانی ناو ئاوایی، هەموو هەوڵیان دەدا کە مامۆستاکانی میوان نەڕۆنو ئەو ڕۆژەش بمێننەوە لەوێ. بەڵام لەکاتێك کە خوالێخۆش بوو زانی هەوڵەکەیان هیچ سوودێك نادا چونکە ئەو ڕۆژە هەر نامێننەوە. ئەو کاتە گوتی:

میوانەکان منەتتان نەبێ ئەمێننەوە یان نا. چونکە لەماوەی ئەم شەوو ڕۆژەدا ئەمن چوار سەر بەرخم سەربڕیوە بۆتان بەڵام واللە خەڵکی لەیلان بیست و پێنج سەر حەیوانیان ناردووەتە ماڵمان، هەمووی بۆ ئەوەی کە سەری ببڕم بۆتان، ئەمێنن لێرە ئەوە باشە؟ دەنا ئەوە هەموو ئەو حەیوانانە بۆ خۆم ئەمێنێتەوە.

من بەخۆم لەم سەردانەدا لەگەڵ مەلاکاندا بووم هەر وەکو لەسەردانەکانی پێش تر هەر بەشدار بووم. ئەمجا لێرەدا، ئەی چاوی چاوم: سەخاو قاپی بەرزیو خۆ بەخت کردن و یارمەتی دان و مرۆڤایەتی و میوان پەروەریی هەمووی دەرئەکەوێت لەلای دانیشتووانی دێهاتەکان و ڕۆڵەکانی گەلەکەمان. بەڕاستی دێهاتی هەموو لە هەموو بڵێی: یا دانە دانە، هەموویان هەردەم نموونەی پیاوەتی و، ناموس و، ڕێزگرتنن بەهەموو ماناوە.

وەکو حاجی قادری کۆیی باسیان دەکاو دەڵێ:

بەشەجاعەت هەموو وەکو ڕۆستەم
بەسەخاوەت هەموو وەکو حاتەم

*** هەردەم دەوترا، مەلا دژی میوانداریی بووە:**

ئەم ووتەیە وەك مەسەلێکی بەناوبانگ وابوو، هەروەك دەوترا: مەلا ڕقی لەمیوانەو، حەز ناکا میوان ڕووی تێ بکا. جا ئەگەر تۆ ئەم ووردە ووتەیە بکەیتە ڕەخنە لەدژی مەلا، لام وایە هیچ سوودێك بەتۆ ناگات: چونکە مەلا لەو ڕۆژەوەی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو، دانیشتووە لەسەر مەدرەسەکەی یەك

سەر خۆی بەخت کردووە بۆ خزمەتی ئاین و دەرس ووتنەوە.
ئەوجا هەردەم ئەتبینی مەلا لەکاتی بەیانیان لەگەڵ بانگا هەڵ ئەستاو، رووی ئەکردە مزگەوت و مەدرەسەکەی لەدوای نوێژی بەیانی خەریکی دەرس ووتنەوە ئەبوو تا کاتی چێشتەنگاو. ئەو کاتە دیسانەوە، پاش نان خواردن دەستی ئەکردەوە بەدەرس ووتنەوە تا کاتی نوێژی نیوەڕۆ ئەوجا دوای قاوەڵتی کردن ئەگەر نەختێك بخەوتایە دەنا ئەهات بۆ مزگەوت و لەحوجرەی خۆی خەریکی دەرس ووتنەوە ئەبوو، هەتا کاتی دوای نوێژی عەسر هەروا، دوای نوێژی شێوان خەریکی خوێندن و ئامادەکردنی دەرسەکانی دەبوو بۆ رۆژی داهاتوو. هەروا بەردەوام بوو، تا کاتی خەوتن چونکە مەلا ئەگەر بەراستی مەلا بووبێ ئەوە هەموو کات مەدرەسەکەی پڕ بوو لەفەقێ و دەرسی پڕ کاتەکانی هەبوو. هیچ کاتی دوورکەووتنەوەی نەبوو لەکتێب، کەواتە لێرەدا سەیرکە میوان کە لەماڵت بوو: ئەبێ خەریك بی بەخزمەت و بەحەکایەت کردن لەگەڵیا و دای بخوێنی و وردە وردە قسەی بۆ بکەیت و وردە وردەش گوێ بگریت لەوتەکانی. واتە بەکورتی با بڵێین: میوان هەموو کاتی خانە خوێ ئەکوژێ.
خۆت ئەزانی ئەم مەلایە پێویستە وەختەکەی بباتە سەر لەناو فەقێکانی، نەك بیبا بەفیڕۆ لەگەڵ میوانەکانی. چونکە ئەو فەقێیانە هەموویان غەریب و نەناس بوون: وڵاتی خۆیان جێ هێشتبوو، هاتبوونە لای مامۆستا لێرە دەرسیان پێ بڵێ. ئەویش دانیشێ لەگەڵ میوان وەختی خۆی بباتە سەر ئەم کارە نەبووەو، نابێ ببێ. ئەگەر مامۆستاکەش با بڵێین: دەرسەکانی ووتەوە، ئەمجا بابچێ حەکایەت خوانی میوانەکانی بکا. یا بڵێین با (مطالعة) نەکا بۆ رۆژی داهاتوو، ئەوکاتە، ئەبێ بزانین ئەگەر چەند رۆژێك دەرسەکانی ووتەوە بەبێ (مطالعة)ی باش ئەوکاتە ئەو مامۆستایە لاواز ئەبێ لە دەرس ووتنەوەو شیی کردنەوەی باسەکان. ئەو کاتە نرخ و رێزی ئەروا لەناو فەقێکانی و، دەڵێین: مەلا توانای ووتنەوەی ئەم دەرسانەی نییە، دەرسەکان نازانێت. ئەوکاتە فەقێکانی هەموو بڵاوەی لێ دەکەن و ناخوێنن لەلای و، ئەڕۆن. ئەوجا کار گەیشتە ئەم پلەیە، مەدرەسەکەش لەدەستی دەچێت و بایەخەکەشی دەروات لەناو هەموو لایەکدا، ئەو کاتە ئەم مەلایە ئەبێتە جاجگی بن ددانی هەموو لۆمەکەران.
ئەو هەموو تیرو توانجە بەم هۆیەوە کە دێتە سەر ئەم مەلایە، هەمووی هەر لەبەر ئەوەیە کە زۆر لەکاتی خۆی سەرف کردووە بەمیوانەکانییەوە کاتی تەواوی نەماوە بۆ فەقێکانی. جا لەبەر ئەمە، بزانە هەمووکات مەلا ئەبێ مەشغوڵ ببێ بەفەقێ و مەدرەسەکەی پشت بکا لەمیوان داریی خانە خۆیەتی. خەڵکیش پەنا بەخوا هەر لە خوایان ئەوێت رەخنە بگرن و بەس نەپرسن و نەکۆڵنەوە لەهۆی شت. ئەوجا لەم بارەیەوە کە خەڵك ئەیانەووت: مەلا رقی لەمیوانەو، میوان داناکا. زۆر ووتەو مەسەلە رێك خرا بوو، لەکاتی کۆندا لەدژی مەلا لەلایەن توانج لێ دەرەکانەوە. هەرچەندێکیش هەمووی هەر نارەوایە.
وەك ئەڵێین جارێك لە جاران کابرایەك رێبوار بەرێگادا ئەڕۆیشت، لەو دەشتە سەیری کرد زەبەلاحێك راوەستاوە لە قەراغ رێگاکەی پای لەعەرد و سەری لە ئاسمان بوو. دەهۆڵێکی لەمل بوو دارێکی درێژی بەدەستەوە بوو. ئەم رێبوارە پرسی لەم زەبەلاحەو گوتی: تۆ چیت؟ ئەم دەهۆڵە زلە چییە لەملت؟ ئەم دارە درێژە چییە بەدەستەوە؟
زەبەلاحەکە لەوەڵامدا گوتی: من فریشتەی خوام، ئەرکی سەرشانم ئەوەیە ئەگەر مەلایەك ژەمە نانێك بدا بەمیوانێك ئەمن یەك کەرەت بەم دارە لەم دەهۆڵە ئەدەم. ئەگەر دوو کەرەت نانی دا بەمیوان ئەوە دوو کەرەت بەم دارە لەم دەهۆڵە ئەدەم. ئەمە ئەرکی سەرشانی منە، چەند جار نان بدا منیش ئەوەندە جار لێی ئەدەم. ئەوجا کابرای رێبوار پرسی گوتی: تا ئێستاکە چەند کەرەت بەم دارە لەم دەهۆڵەت داوە؟
زەبەلاحەکە گوتی لەوەڵامدا: ئەگەر لێی بدەم ئەکا یەك.
هەر وەکو دەڵێن جارێکی مەلایەك لەگەڵ کابرایەکی نەخوێندەوار لەسەر رووبارێك دانیشتبوون سەیریان کرد ئەوا چوار شووتی بەناوەکەدا دێ مەلاکە یەك سەر هەر بە بەرگەکەی بەرییەوە، خۆی فڕێ دایە رووبارەکەوە و سێ شووتی گرتەوە، یەکێکی گرت بەدەستی راستی و یەکێکی گرت بەدەستی چەپی و یەکێکشی بستەکەی گرت بەدگانەکانی. ئەو کاتە، سەیری کرد کابرای هاورێی ئەوا چوارەم شووتی گرتەوە بۆ خۆی مەلا هەر لەناو رووبارەکەوە، بەو شپرزەییەوە کە تیابوو بانگی کابراکەی ئەکردو، لەگەڵ ئەوەشدا نەی دەتوانی لەکاتی بانگ کردندا دەمی باش بکاتەوە. دەنا بستەی شووتییەکە لەدگانەکانی بەر ئەبوو. ئەوجا مەلا بانگی ئەکردو دگانەکانشی زیاتر ئەبردە جیرەوەو ئەیەوت: بەقورعانەکەی خۆم لێم خوێندووە، بەشم لەشووتییەکەی تۆشا هەیە.
ئەوجا ئەی برای بەرێزم: ئەم دوو ووتەو، مەسەلەیە کە باسم کردووە لێرەدا هەردووکیان لەو وردە ووتانەن کە بیستومە بەم دوو گوێچکەی خۆم لەمامۆستا حاجی مەلا ئەحمەد مەلا حەکیم. لەکاتێکدا کە، بەرێوەبەر، بوو لە (المدرسة العلمية الدينية المنظمة في كركوك). لەکاتێکدا کە بینای ئەم مەدرەسەیە لەقەڵای کەرکوك بوو، لەناو حەوشەی (ئۆلو جامع) بوو.
ئەمەش کە باسی ئەکەم لەنێوانساڵی (١٩٤٠) تا ساڵی (١٩٤٦)ی زاینی بوو. جێگای بەهەشت بێت، هەموو رۆژێك. دوای ئەوە کە دەرسەکەی پێمان ئەداو تەواوی ئەکرد ئەمجا مەسەلەیەکی بۆمان باس ئەکرد لەو مەسەلە خۆشانە کە هەردەم ئادەمیزاد ئەیەوێ بەدڵ و بە گیان گوێچکەی خۆی رابگرێ. ئەوجا هەردەم بەم جۆرە دەرسی پێ ئەداین هەموو رۆژێك هەتا کتێبی (قدوری) لە (فقه) هەمووی پێمان تەواو کرد، بە ماوەی سێ ساڵ، ئەم ماوەیە بریتی بوو لە پۆلی دووهەم. لەگەڵ کتێبی (ملتقى الابحر) ئەمەش هەر لەماوەی سێ ساڵدا. وەك ئەم ماوەیەش ئەکا ماوەی پۆلی سێ هەمین. وەك هەمووی دەکا شەش ساڵ.
پۆلەکەمان بریتی بوون، لە ئەمەندە فەقێیە:
١. خورشید سیا مەنسووریی، کوری ئەمین بەگ.
٢. مەنسور، لەعەشرەتی زەنگەنە (خوالێخۆشبوو).
٣. سەید ئەحمەد، مەشهوور بە نائب عەریف لە عەشیرەتی

شێخانی (خوالێخۆشبوو).
٤. محەمەد عەبدلمەجید چیمەنی، لەعەشرەتی جەباری.
٥. محەمەد سالح مەلا عومر عومەر گونبەدی، دەربەندیی.
ئەمەش بزانە وەك دەوام لەم مەدرەسەیەدا لەهەشتی بەیانیی دەستی پێ دەكرد هەتا سەعاتی دوانزەی نیوەڕۆ. دەوام كردن و تاقیكردنەوە هەمووی هەر بەشێوەیەكی یاسایی بوو، بەپێی یاسای ئەم جۆرە مەدرەسانە لەو كاتانەدا كە ٤ خوێندنگا هی ئایینی بوون لە هەموو عێراقدا شتێكی روون و ئاشكرایە ئەم وورده ووتەو، مەسەلانە هەمووی هەر توانج تێگرەكان دروستیان كردووەو بەس دەنا ئەوەی ئێمە دیومانە لەمامۆستاكانمان بەپێچەوانەی ئەم ووتانە بوو هەردەم كردارەكانیان هەمووی هەر ئەوە بوو كە خەڵك لەمەلاوە فێری میوان داریی و، خانە خوێیەتی و، بەخشین و، پیاوەتی و، یارمەتی و، داوەت كردن و، رابواردن ئەبوون.
ئەمەش شایەتی دانێكە لە هەموو كاتێ هەر ئەدرێت: (ولا تكتموا الشهادة ومن يكتمها فإنه آثم قلبه والله بما تعملون عليم).

*** مەلاكانی وولاتەكەمان بایەخیان نەدابوو بەنووسینی جۆرەكانی ئەدەبی:-**

هەردەم لەمەو بەر وتوومانە كە وولاتەكەمان هەمووی هەر پڕ بوو لەنووسەر، لەم بارەیەوە زۆرمان وتووە. بەلام ئەبێ ئەمەش لەیاد نەكەین كە زۆربەی ئەو نووسەرانە عیلمی بوون ئەوەی كە ئەیان نووسی بریتی بوو لە كتێبی زانست و ئایین و شەرح و، شیكردنەوەو، تەعلیق و، حاشیەو، ئیعراب، ئەم جۆرە نووسینانە. ئەمانەش هەمووی هەر بۆ فێركردن و بەس.
نووسینەكانیان بایەخی نەدەدا بەهونەرو ئادابی ئەم گەلە، بەهیچ جۆرێك، بەڵكو هەر هەمیشە بایەخیدەدا بە فێركردن و تێگەیاندن و، كردنە زانیارو بەس. دەوەرە بۆ ئەم مەبەستە دەیان كتێب لە نووسینەكانیان بگرە دەستەوەو سەیریان بكە هەمووی هەر لە ئایینییەكانە، مەگەر بەدەگمەن ببینی نووسراویك لەبارەی جۆرەكانی ئەدەب باس بكا. جا لەهەر بارێك بێ لەبارەكانییەوە. كوا بفەرموو: چەند كتێب نووسراوەتەوە لەسەر (العروض والقوافي) و دلداریی و نوكتەو ووتە خۆشەكان و جۆرەكانی ئەدەب و شانۆگەری و حكایەت و وەرگێران و یاداشت و ووتە بەناوبانگەكان و ئادابی دانیشتن و خوو ڕەووشتی ئەم گەلەو گەشتەكانیان و ژیانی مەلاكان و شاعیرەكان و پیاوە باشەكان و كاربەدەستەكان و سەردارەكان و شۆرشگێرەكان و ئەوانەش وەك سەرخۆیان هەڵگرتووەو لەوولات دەرچوونە لەداخی ئەم گەلەمان لەماوەكانی چەرخەكانی رابوردوودا؟!
بەراستی جوانی فەرمووە خوالێخۆشبوو حاجی قادری كۆیی وەك وتوویە:

كتێب و دەفتەرو تەئریخ و كاغەز
بە كوردی گەر بنوسرایە زەمانێ
مەلا و زانا و میرو پادشامان
هەتا مەحشەر دەما ناوونیشانی

لەبەر ئەوەی وولاتەكەمان تێكەڵیی و هاتووچۆی لەگەڵ وولاتەكاندا نەبووە هەستیان نەكردووە بەگرنگی و بایەخی ئەم جۆرە نووسینانە.
وەكو حاجی قادر وتوویە:-

خۆتان دەڵێن ئەگەر چی مەشهووری خاص و عامە
هەر رێویەك گەرابێ ئازاترە لەشێران

ئەم هەست نەكردنەش هەر بەشی وولاتی ئێمە نەبووەو بەس بەڵكو مەلاكانی هەموو وولاتەكانی ئیسلام هەر وابوونە سەیركەن چاوگەیەكی عیلمی وەك (جامع الازهر) كە لەناو گەلانی ئیسلامدا تاقە چاوگەیە كە لەهەزار ساڵ زیاتر لەپێش ئێستاوە تاوەكو ئێستاش ئەوە هەر زانین بلاوئەكاتەوە بەناو وولاتاندا لەگەڵ ئەمەشدا هەتا پاش جەنگی جیهانی دووەم ئەمجا هەستی كرد كە لەبارەی (الفنون الأدبية)، زۆر دوواكەوتووە ئەوكاتە ئەمجا ئەنجوومەنی مەلاكانی ئەزهەر بڕیاریاندا كە ئەدەب بەهەموو جۆرەكانییەوە ببێ بە (منهج)، سەپاندیان بەسەر هەموو قوتابی پلەكانی خوێندن، كەواتە وولاتێكی وەك وولاتی ئێمەی كلۆڵ چۆن دوا نا كەوێت؟
نەك هەر لەبارەی نووسینی جۆرەكانی ئەدەبەوەو بەس بەڵكو لە هەموو بارێكەوە بەهەموو داخێكەوە. بەلام بێگومان، هێشتا هەر باشە كە مەلاكانمان توانیویانە ئەم هەموو زانستانە بپارێزن لەوولاتەكەدا دەس بەدەس بەدرێژایی ئەم چەرخانەی رابوردوو تا گەیاندیان بەدەستی ئەم وەچانەی ئەمرۆ. ئەو خوایەی كە ئەم هەموو زانا و، زانین و، وولات و، نەتەوەی پاراستووە تا ئێستاكە.

*** خانە خوێیەتی مەلا و فەقێ بۆ یەكتری:**

هەردەم مەلا دەبووە میوانی مەلا و فەقێ دەبووە میوانی فەقێ. لەكاتێكدا كە ئەم میوانە بێ خانە خوێ بووایە. ئەمەش دەستوورێكی گشتی بوو لە هەموو كاتێكدا. جا ئەگەر مەلایەك بچوایەتە سەفەر، بڕۆیشتایەتە هەر شوێنێك لەناوچەكانی وولاتەكەمان لەشارەكان و لەدێییەكان. ئەوە هەر میوان دەبوو لەماڵی مەلا چونكە لەوانەبوو برادەربن، یا هاورێی كاتی فەقێیەتی بن. وەك هیچ نەبێت لەبەر ئەوە كە هاوچینی بوو باشتر لەیەك حاڵی دەبوون و لەشانی یەك خۆشتربوون، لە كاتێكدا كە یەكیانیش نەناسیایە. ئەگەر خان خوێی تایبەتی نەبووایە ئەو لەو شوێنەدا هەر ئەبووە میوانی ماڵی مەلا، چونكە بەهۆی ئەوەی هەردووكیان مەلا بوون، ئەوە هەردووكیان بۆ لای یەكتر باشتر بوون. جا لەبەر ئەمانە هەر ئەچووە ماڵی مەلای ئەو شوێنە.
ئەی چاوی چاوم: لەم بارەیەوە گەلێك وردە مەسەلە هەبوو زۆر خۆش و بەئارایشت بوون، بە دانسقە، هونەرمەندەكان و نوكتەبازەكان ئەیان ووتەوە لەكاتی خۆیدا. توانام نیە بیان گێرمەوە كەواتە یەكێك لەئەوانە بگێرمەوە بۆتان بەسە ئەوەش ئەمەیە:
زۆر جار كە مەلاكان كۆ ئەبوونەوەو، دائەنیشتن وەك ئەكەوتنە سەر باسی ئەم جۆرە قسانە، باوكم ئەیەوت: خوالێخۆش بوو مەلا عیسای هەرتەلی كە یەكێك بووە لەمەلاكانی وولاتەكەمان لەكاتی خۆیدا لەناوچەی خۆشناو.

جارێك لەجاران لەگەڵ کاروانێکا ئەبێت و شەویان بەسەردا دێت لەو کاتەدا لەنزیکی دێیەك دەبن، تاقمی کاروانەکە هەموو بریار ئەدەن کە ئەو شەوە بمێننەوە رێگا نەبرن بچنە ئەو دێیە هەر وەکو عادەت وابووە. لە هەموو کاتێکدا لەناوچەکەدا ئەوکاتە زەلامەکانی کاروانەکە هەر کەس ئەروات بۆ ماڵی ئاشناکەی خۆی، بەڵام مەلا عیسا ئەڵێ: ئەمن بێ خانە خوێم لەم دێیە کەواتە ئەچمە ماڵی مەلای دێیەکە هەرچەند کە یەکتر ناناسین، بەڵام مەلا هەر ئەبێ ببێ بەمیوانی مەلا ئەو شەوە هەر یەکێك لەمیوانەکان لەماڵی خانە خوێکەی زۆر قەدرو رێزی لێ ئەگرن. ئەوجا بۆ بەیانی هەر کە کاروان ئەکەوێتە رێگەو هەرکەس ئەکەوێتە باسی خانە خوێیەکەی خۆی ئەو کاتە مەلا عیسا وەك هەست رائەگرێت دەبینێ هەموو هاورێکانی زۆر خزمەت کراون. بەڵام ئەو کە لەماڵی مەلا بووە هیچ خزمەت نەکراوەو بەبێ بایەخی سەیری کراوە. ئەوجا مەلا عیسا پەشیمان ئەبێتەوە کە بۆ چی نەرۆیشت لەگەڵ هاورێکانی؟ بۆ چی بوو بەمیوانی مەلا؟ کە ئەوەندە خانە خوێیەکی بێ رێز بوو.

ئەوجا لەو کاتەدا مەلا عیسا رووی دەکردە ئاسمان و تفی هەڵ دەدا سەرەو ژوورو، ئەو ریشە پیرۆزەی خۆی ئەدایە بەتفەکەی خۆی، وەك لە ئاسمانەوە ئەهاتەوە خوارەوەو لەگەڵ ئەمەشدا ئەیەوت بەخۆی: عیسا ئەگەر خەڵکت نەدەناسی خۆ خۆت دەناسیی، بۆ بووی بەمیوانی ماڵی مەلا ؟ سەیرکە خەڵقی بەچ جۆرێك خزمەتی میوانی خۆیان ئەکەن، مەلاش بەچ جۆرێك خزمەتی میوانی خۆی ئەکا؟

ئەمجا با باسی خانە خوێی فەقێکانت بۆ بکەم: کە فەقێ گەلێك زۆر بووە لەم وڵاتەدا هەموو مزگەوتەکانی دێهاتەکان و ناو شارەکان هەر پڕ بوون لەفەقێ. ئەوانەش هەمووی هەر نەوەی ئەم گەلە پیرۆزە بوون، زۆربەیان هەر رۆڵەی رەنج دەران و رەش و رووت و هەژارو داماو و کۆڵنەدەرەکان بوون.

جا فەقێ لەو رۆژەوە کە چووەتە ناو مەدرەسەکان و نیشتەجێ بووە لە حوجرەی فەقێکان. لەو رۆژەوە بووەتە رۆڵەی ئەم گەلەو دوورکەوتووەتەوە لەماڵی باوك مەگەر بەسەردان چووبێتەوە ماڵی بابی هەتا گەیشتووە بە پلەی ئاخر مادە خوێن و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. جا ئەم فەقێیە ئایا پارەو پوولی ئەبێت ئەوەندە هەبێ هەردەم تا لە کاتی هات و چۆ کردن وەك بچێت بۆ هەر شوێنێك ئەوە نەچێ بۆ ماڵی خانە خوێ بەڵکو با بڵێین بچێتە شوێنێك پارە بداو بخەوێت؟!

شتێکی روون و ئاشکرایە ئەمە هیچ لەتوانای چینی فەقێ نیە لەهیچ کاتێکدا ئەمجا لەبەر ئەمەی کە وتمان ئەم فەقێیە بۆ هەر شوێنێك رۆیشتبێ لەکاتی سەفەردا ئەبێ هەر ببێ بەمیوانی فەقێ جێگەی بایەخ نییە بیانناسیت یا نا. چونکە هەموویان هەر فەقێ بوون، هەموو هەر ئاوارەو بێ نەوا بوون، هەموو هەر لەسەر کیسەی ئەو خەڵقە بوون کە لەدەوروبەری ئەو مەدرەسەیە بوون جا ئەوەی خوا ناردی لە راتبەی فەقێ و خێری خێرخوازەکان لەکاتی هەرسێ جەمەکان ئەوە فەقێکانی ئەو مەدرەسەیە لەگەڵ فەقێ میوانەکە هەموو پێکەوە ئەیان خوارد.

کەواتە فەقێ هەر لەلای فەقێ ئەبووە میوان، رزقی هەموو لایەکیش هەر لەسەر خوا بوو. خوا خۆی فەرموویە: (إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ) صدق الله العظيم.

* داپیری فەقێیان لە وڵاتەکەماندا:

داپیر دەکا نەنك ئەوجا دایکی دایك، یاخود دایکی باوك بێت. ئەوەی بایەخ دارو شایانی باس بێت لەم باسەدا ئەمەیە: لەهەر گوندێك، پیرەژنێك کە ماڵی لەنزیك حوجرەی فەقێکان بووایە، ئەو فەقێیانە دەیانکرد بەداپیرەی خۆیان، ئەوجا ئەویش بەتایبەتی لەکاتی زستاندا هەموو رۆژێك لەگەڵ نوێژی بەیانی ئاوی گەرم ئەکرد بۆ خۆشۆرین و دەست نوێژی فەقێکان ئەوجا یا پیاوێکی ئەو ماڵە یاخود سوختەکانی حوجرە ئەرۆیشتن ئاوە گەرمەکەیان ئەهێنا بۆ ئەو فەقێیانە کە پێویستیان بە ئاوی گەرم هەبوو، ئەم داپیرە کە ئەم خزمەتەی ئەکرد لەرێی خودا بوو، چونکە هەردەم ئەم فەقێیانە هەموو غەریب بوون، هیچی خەڵکی ئەم گوندە نەبوو، ئەم خێرە گەورەیە کە لەنزیك حوجرەی فەقێیان بوایە زۆر دڵخۆش و سەر بەرز ئەبوو، ئەمەش هەر لەبەر ئەوە بوو کە کارەکە بۆ خوایەو هیچ ریاکاری تێدا نییە، ئەم داپیرەیە لەبەر ئەوەی کە زۆر پیرو دنیا دیدە بوو، زۆر هاتوچۆی فەقێکانی ئەکرد، وای لێدەهات هەر دەم خەمی هەموویانی هەڵ دەگرت، وەك بڵێی گەلێك لەداپیرەی خۆیان زیاتر دڵی لەلایان و ئاگاداریان ئەبوو، چونکە ئەیزانی کە ئەم فەقێیانە هەموو هەر ئاوارەو بێ کەسن، لەم وڵات و لەم گوندە، جا لەبەر ئەوە هەموو نەوەکانی ئەم داپیرەش هەردەم خزمەتی فەقێکانیان دەکرد بەجۆرێکی تایبەتی، زۆر دڵخۆش بوون، بەدڵخۆشی ئەم بێ نازانە، ئەگەر سەیرت بکردایە لەکاتێکدا کە نەوەکانی ئەهاتن بۆ ناو حوجرەکانیان، وات ئەزانی کە ئەمانە هەموو خزم و کەسی یەکن، داپیرەکەش ئەوە هەر مەپرسە، کە چەند رێزی لێ دەنان و خۆشیانی دەویست، فەقێکانیش چەند رێزی ئەمیان دەگرت، بەراستی ئەم داپیرانە لە شوێنی دایك و داپیری راستەقینە بوون بۆ هەموو فەقێکان لە هەموو گوندەکانی وڵاتەکەمان خوا پاداشتیان بداتەوە بەهەموو جۆرە خۆشیەك لەم دونیا و لەو دونیا. ئەمەی وتمان لەبارەی فەقێکانی ناو گوندەکانەوە بوو، بەڵام فەقێکانی ناو شارەکان چوونەتە هەر حەمامێك لەنزیك خۆیان پارەیان لێ نەسەنراوە، لە هەر کاتێکدا کە رۆیشتبن، وەك حەمامی حاجی باقی لە کەرکوك کە دەکەوێتە ناو بازاری گەورەوە، ئەوە لەکاتی خۆیدا خاوەنی وەك دروستی کردووە، وای بریار داوە کە مەلاو فەقێ بۆ خۆشۆرین لەهیچ کاتێکدا پارەیان لێ وەرنەگیرێت، ئەم خێرە هەر بەردەوام بوو، تا کاتێك کە فەقێیەکی قەشمەر داوەتی هەموو فەقێکانی برادەری خۆی کردووە بۆ خۆشۆرین لەو حەمامە لەسەر کیسەی خۆی، بەڵام ئەیانبات بۆ حەمامی حاجی باقی ئەو فەقێیانەش هەرکەس لەئەوێ خۆی ئەشوات و دەروات بۆ دەرەوەو بەحەمامچی ئەڵێ، پارەکە لەسەر فلان کەسە ئەو ئێمەی داوەت کردووە هەر بەم جۆرە هەتا هەموویان ئەرۆن و کەسیان پارەی حەمام نادەن، تاوەکو ئەمێنێ ئەو فەقێیە کە ئەم داوەتەی کردووە

بۆ ئەم حەمامە، کاتێك کە ئەویش ئەیەوێت دەربچێ، داوای پارەی هەموویانی لێ دەکەن، ئەو کاتە وەڵام ئەداتەوەو ئەڵێ) خاوەنی ئەم حەمامە خۆشۆرینی مەلاو فەقێی کردووە بەخێر لەکاتی خۆیدا (ئێمەش بۆیە کە هاتووینە بۆ خۆشۆرین، ئەو کاتە حەمامچی تەقەڵێك لەدەمی خۆی دەداو دەها دەنگ ناکات و زیانێکی زۆری لێ دەکەوێت، چونکە مەسرەفی حەمام گەرم کردن زۆرە، ئەمجا دوای ئەم رووداوە دەها لە هەموو کەرکوك وەك حەمامی حاجی باقی بە تایبەتی، ئەم جۆرە خێرە نەما.. لەم کارەساتە بەدواوە هەر کەسێك چوویێ بۆ حەمام پارەیان لێ وەرگرتووە کەواتە تا کاتی ئەم رووداوە لە شاری کەرکوکی خۆشەویستمان، خۆشۆرینی فەقێ و مەلا لە هەموو حەمامەکان بەبێ پارە بووە، وەك هەموو شارەکانی دیکەی وولاتەکەمان، ئەم باسە: کە حەمامەکان پارەیان نەدەسەند لەمەلاو فەقێ، باسی رووداوەکەی حەمامی حاجی باقی، لەلایەن ئەو فەقێیەوە وەك باسم کرد لێرەدا هەموویم بەگوێی خۆم بیستوومە لەمامۆستا مەلا عەبدولمەجید قوتب لەکاتێکدا کە دەرسی پێمان ئەووت لە (المدرسة العلمية الدينية المنظمة في كركوك) لە ساڵانی (١٩٤٠ – ١٩٤٦)ی زایینی، وەك ئەم مەدرەسەیە لەناو حەوشەی (ئۆلو جامع) بوو لە قەڵای کەرکوك هەر وەك مامۆستاکانی بریتی بوون لەئەم خۆشەویستانە:

١. مامۆستا (مەلا ئەحمەد مەلا حەکیم)، بەڕێوەبەری قوتابخانە.

٢. باوکم.. مامۆستا (مەلا عومەر ئەلعومەر گونبەدی)، مامۆستا.

٣. مامۆستا (مەلا عەبدولمەجید قوتب) مامۆستا.

*** شۆرینی کەلوپەلی فەقێیان:**

فەقێ هەر وەکو خەڵکی دیکە پێویستیان هەیە بەپاك و خاوێنی و کەلوپەل شۆرین، لەکاتێکا کە باری ناو حوجرەش ناگونجێ لەگەڵ، کەلوپەل شۆرین. لەبەر ئەوەش کە فەقێکان هەردەم هەر خەریکی خوێندن و نووسین و لەبەرکردنی دەرسەکانیان بوونە لەهەر گوندێك بووبن، یا لەهەر مزگەوتێك لەناو شاردا ئەوە دانیشتووانی ئەو شوێنە. هەموو کات کەلوپەلەکانیان بۆیان شۆردوون بەهەموو شانازیی و دڵخۆشییەوە.

لەدوای شۆرین و وشك کردنەوەی ئەگەر دراویی ببوایە ئەوە بۆیان ئەدوورینەوەو پینەیانیش ئەکردو ئەوجا بەپاك و پوختەیی بەخۆیان ئەیان هێنایەوە بۆیان. هەر وەکو هەموو بابەتە پینەو پەرۆیەکیان بۆیان ئەکرد لە هەموو کاتێکدا. لەکاتەکانی نەخۆش کەوتنی یەکێك لەو فەقێیانە ئەوە خەڵکی دەوروپشتەکەی هەموو هەر ئەبوونە خەم خوارو کەس و کاری هەتا خوا شفای ئەدا.

بەبۆنەی ئەم قسەی ئێستاکە ڕەت بوو با ئەم باسەتان بۆ بگێڕمەوە کەرووی داوە لە کۆیە، خوالێخۆش بوو نوری عەبدوڵلا کە فرۆکەوان بوو لە هەوەڵی پێك هێنانی (هێزی ئاسمانی عێراقی). خۆیشی کە خەڵکی کۆیە بوو. بۆمانی باس دەکردو دەیوت: لەنێوانی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا فەقێیەك کە خەڵکی وولاتی زێ بوو لە کۆیە ئەیخوێند لە ئەوێ نەخۆش کەوت: دانیشتووانی ئەم شارە زۆر بەخەمییەوە بوون هەردەم حوجرەکەی پڕ بوو لەئەوانەی سەریان لێ دەداو پرسیاری نەخۆشیەکەیان دەکرد. خوالێخۆشبوو مەلا حەویز ئاغا لەگەڵ کاکە زیاد ئاغای کوری حەمە ئاغاداو، چەند پیاوێك، لە پیاوە ناودارەکانی ناو شارەکە دەچن بۆ پرسینی تەندروستی ئەم فەقێیە.

جا لەو کاتەدا وەك لەلای دانیشتوونە هەوڵ ئەدەن لەگەڵی بەڵکو دڵی شتێك بباو بیخوا. هەروا وردە وردە ناوی خواردنەکان ئەبەن لەبەردەمی ئەوجا ئەو فەقێ نەخۆشە دەڵێ: حەزم لەم کفتەیە ئەوکاتە ئەم پیاوانەی کە لەدەوری دانیشتوون هەر کەس لەباخەڵی پارە دەرئەکاو چاوەڕوانی ئەوە ناکەن هەر کە چێشتی بۆ بەرادان بدەن بەڵکو زەڵام ئەنێرن بۆ ناو شارەکەو پێیان ئەڵێن بگەڕێن بەهەموو ماڵەکاندا بزانن کێ چێشتی کفتەی هەیە ئەو پارەیەی کە مەسرەفی کردووە بە زیادەوە بدەنەوە پێی، بەقازانەکەوە بیهێنن بۆ ئێرە بەڵکو ئەم نەخۆشە شتێك ئەخواو دڵی دائەکەوێت. بەڵام (سبحان الله) هەموو زەلامەکان بەهەموو شارەکەدا گەڕان ئەم چێشتەیان دەست نەکەوت. هەموویان گەڕانەوە بۆ حوجرەی نەخۆشەکە، بەپیاوەکانیان ڕاگەیاند کە ئەم چێشتەیان دەست نەکەوت بەڵام ئەوەی کە هیچ بەخەیاڵدا نەدەهات ئەمەیە: کاتێك کە فەقێ نەخۆشەکە سەیری کرد کفتە دەست نەکەوت لەناو شارەکە چاوەڕێی نەکرد کە چێشتەکەی بۆ بدەن ڕادان بەڵکو بەپیاوەکانی گوت: کەواتە سەیرکەن ئەو کیسەیە کە هەڵواسراوە هینی خۆمە دایگرن کفتەم کردووەتە ناوی دەری کەن بۆم، پارەکە لەناوی دا بێنن ئەوکاتە کیسەکەیان داگرت سەیریان کرد ئەوە چەند کفتەی تیایە لە ئەوێ دایناوە نەی خواردووە. بەڵام هەمووی بۆگەن بووە لەبەر کۆنی. ئەوجا پیاوەکان کە ئەمەیان دیت بەچاوی خۆیان کفتەکەیان نایە بەردەمی ئەو نەخۆشەو پارەکەیان کردە ناو کیسەکەی ئەوکاتە هەموو هەستان ڕۆشتن جا لێرانەدا سەیرکەن کە فەقێ چەند بەرێزەوە سەیرکراوە لەناو ئەم گەلە پیرۆزەدا دەنا کابرایەکی بێ کەس و کارو نەناس ئەم هەموو پیاوە ماقووڵانە چۆن ئەچوون بۆ سەردان و هەواڵ پرسینی؟

*** ئایا ئەوەی مێزەرو جبەی کردە بەر مەلایە؟!**

ئایا وا دەزانی مەلا بەمانا کەسێکە مێزەری لەسەربێ و جبەی لەبەربێ و، بەس.؟!! ئایا وا دەزانی مەلا ئەو کەسەیە هەردەم ئاین دارو خواناس بێ و، بەس؟! یاخود وادەزانی مەلا ئەو کەسەیە کە لەمەعبەدێك بۆی ڕێك کەوتبێ و لەئەوێ بوویێ بەمووچە خۆرو، بەس؟! نەخێر کاکە گیان ئەم بابەتانەی کە وتوومانن هیچیان مەلا نین.

ئەوجا پیاوێکی خواناس وەك دوو، مەتر پەڕۆی سپی بەستە سەرییەوە هەر بەئەمەندە چۆن ئەبێت بەمەلا؟! ماڵ ئاوەدان نابینی کە هەموو زورنا لێ دەرەکان و دەهۆڵ ژەنەکانی فلیمەکانی میسری هەمووی هەر مێزەری سپی لەسەریان و جبەیان لەبەرە؟! یاخود کابرایەك لەژێر دروشمی مەلادا

لەمزگەوتێك یا لەتەکییەو خانەقایەك ببینی: جا چونکە لەو، مەعبەدەیە، وریشێکی پاك‌و جوانی پەروەردە کردووە. بڵێی: (ماشاء الله). کە چەند مەلایە خوا تەمەنی درێژ کاو بابەتی هەر زۆر کات؟!

نەخێر بابە گیان زۆر کەس هەیە لەو بابەتەیە بەڵام بەهەموو داخـەوە ئەگـەر هـەر باوشـە تـووکێك لـەدەم‌و چـاو هاتبی بیکەیتە نیشانەی پیاو باشی. ئەوەش بزانە کە ئەو باوشە لەدەم‌و چاوو هەموو گیانی هەموو ئادەمیزادێك شین ئەبێت. زۆر کەس وا دەبێت ئەگەر بێ توو سەیری جبەو مێزەرەکەی بکەی ئەڵێی بێگومان ئەم مەلایە (ڕەئیس عولەما)یە بەڵام داخی گرانم ئەگەر بێتو بەڕاستی بیناسی ئەو کاتە ئەزانی کە ئـەبێ وەکـو سوختەیەك دەرسـی پـێ بـدەیـت‌و هەموو خوتبەکانی ڕۆژانی هەینی بۆ بنوسێتەوەو هێواش هێواش پێشی ڕەوان بکەیت هەتا بتوانێت بەڕەوانی بیخوێنێتەوە لەسەر (مینبەر).

ئەی برای بەڕێزم وتراوێکی کۆنە هەیەو، دەڵێت: (اذا جاء القاف، قل لا تخاف). کەواتە لێرانەدا ئەتوانم ئەم باسەتان بۆ بگێڕمەوە:

مـەلا تـەمەن درێـژەکـان وەك کۆ ئـەبوونـەوەو باسی خۆش خۆشیان دەگێڕایەوە دەیان وت: جارێك لەجاران هەموو مەلاو فەقێکانی شاری هەولێرو دەورو پشتەکەی کۆ ئەبنەوە بەهۆی گرتنی ئاهەنگی ئیجازە نامەی مەلایەکەوە کە لەکاتی، نێوان، جەنگی جیهانی یەکەم‌و جەنگی جیهانی دووەمدا بەستراوە لەناو یەکێك لەمزگەوتەکانی ناو شاری هەولێر. ئەوجا ئەم هەموو مەلایانە بەهەموو ڕێـزەوە دادەنیشن هەر کەسە لە شوێنی خۆی جا لەم کاتەدا (مەلا ئیبراهیم) کە خەڵکی دزەیی بووەو ناسراوە بە (مەلا ئیبراهیمی کەلۆس) کە چەند باسی وتە خۆشەکانی بکەی هەر کەمە. ئەویش هەر دانیشتووە لەجێگەی خـۆی کە لـەلای خـوار مـەلاکـانـەوە بـووە جا لەو کاتەدا مەلایەکی زەبەلاح دێتە ناو مزگەوتەکەوەو وردە وردە ڕەت ئەبێت بۆ لای سـەرەوە لەگەڵ ئەمەشدا نەگونجاوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئەیەوێت لێی دانیشێت بەڵام (ماشاء الله) دیمەنەکەی هەروا سەڵەواتی پێویست بوو: کەواو، جبەیەکی سپی‌و فش‌و فۆڵ‌و مێزەرێکی گەورەو شل‌و شاوی لەسەرو مێـزەرێـکی گـەورەی لەپشت‌و مێـزەرێـکی گـەورەی لەمل پێچابوو. سەرو سیمایە خۆی کردبۆ بەمەلایەکی وا کە هەر نەبێت ئەبێ سەرۆکی هەموو مەلاکانی شاری هەولێر بێ بەڵام لەڕاستیدا کابرایەکی نـەزان‌و تێ نەگەیشتووش بـوو. جا لێرەدا مەلا ئیبراهیمی کەلۆس سەر هەڵ ئەبرێت‌و سەیرێکی قەدو باڵای ئەم مەلایە ئەکاو بەدەنگێکی بـەرزەوە ئەڵێت: (ماشاء الله ماشاء الله والله). هەر دەمی یان دەڵێی عیلمی لەقوون دەتکێتەوە.

ئەوجا بۆ زانین ئەمەش بزانە کە باوکم خوالێخۆش بوو یەکێك بوو لەو مەلایانە، هەردەم ئەم باسەی دەگێڕایەوە بۆمان. جا ئەی نەوەکانی دوا ڕۆژمان ئایا ئەم بابەتانە مەلان؟!

لەوەڵامدا ئەڵێن نەخێر ئەم بابەتانە مەلا نین. مەلا نین. مەلا نین. بەهەموو داخێکەوە لەم بابەتە پیاوە لە هەموو شوێن‌و کاتێکدا هەر هەیە. بەڵام هیچ چاریشی نییە. ووشەی مەلا زۆر پڕ مانایەو زۆر پڕ هیوایەو پلەیەکی زۆر بەرزو بەڕێزی هەیە، کەواتە بەس بۆ ئەو کەسە ئەگوترێ کە گونجابێ بۆ ئەو ووشەیەو ئەویش بگونجێ بۆی. ئەبێ هەموو پلەکانی خوێندنی ڕەت دابێ‌و ئەبێ خۆی تەرخان‌و بەخت کرد بێت.

بەبناغەکانی ئاین‌و ئەرکەکانی هەموو تین‌و توانای خۆی بەخت بکا لەڕێگای سەربەرزی‌و کەرامەت بۆ خۆی‌و هەموو برا ئایینییەکانی. لەم ڕێگایەدا هـەوڵ‌و تەقەلابدا ئەوەندە کە خـوا تەمەنی بـدا. جا مێـزەرو جبەی لـەبـەرە یـان نا ؟! ئەمە بۆ خۆی بایەخدارەو بەس (والاجر عند الله) هەر لەم بارەیـەوە دیسان با باسێکتان بۆ بگێڕمەوە لەکاتێك وەك سەید ئەحمەدی قازی– بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوك بوو لەدوای جەنگی جیهانی دووەم ئەم خوا لێخۆشبووە ئەچێتە لای شێخ جەمیل تاڵەبانی، کە شێخی تەکییەی تاڵەبانی بوو لەکەرکوك بەڕێکەوت لەو کاتەدا خوالێخۆشبوو: حاجی مەلا محەمەد نوور عومەر گونبەدی لەلای خوالێخۆشبوو شێخ جەمیل ئەبێت، حاجی مەلا محەمەد نووریش مەلایەکی زۆر زاناو دانا بوو لەو سەردەمەدا، دوانزە عیلم بوو، بلیمەتی چەرخەکەی خۆی بوو هەموو مەلاکان لەناوچەی خۆیاندا گەردن کەچ بوون بۆی، لەبەر زانایی‌و بەڕێزی‌و خواناسینی، بـەڵام لەبارەی نەبوونییەوەی هەرچەند باسی بکرێت هەر کەم بـوو، داماوێکی کلۆڵی جەم بەجەم‌و جبەیەکی کۆن‌و مێزەرێکی بچووك‌و بەرگێکی ناتەواو، لەم کاتەدا جەنابی شێخ جەمیل ئەکەوێتە مەدح‌و سەنای حاجی مەلا محەمەد نوور، یەکجار زۆر هەڵی دەنێت بۆ جەنابی سەید ئەحمەدی قازی وەك ئەم پیاوەش هەر پیاوێکی زۆر ماقووڵ‌و پیاوانە بـوو، علیم‌و تێگەیشتوو بـوو، ئـەم ستایشانەی جەنابی شێخ وای کـرد کە ئـەم پیاوەش زۆر ئیخلاسی پەیدا کرد بۆ مامۆستا حاجی مەلا محەمەدی نـوور، ئەو کاتە سەید ئەحمەدی قازی ڕوو ئەکاتە حاجی مەلا محەمەد نوورو پێی ئەڵێت (کە مادام جەنابت لەم وولاتە دائەنیشی، مەلایەکی ئاوهای وەکو جەنابی شێخ باسی کردی بۆ نایەیتە لای من بەڵکو لە مزگەوتێك دات بمەزرێنم)، ئەو کاتە حاجی مەلا محەمەد نـوور وەڵامـی ئـەداتـەوەو ئەڵێ: (چونکە من مەلام لەبەر ئەوە نایەم بۆ لای تۆ)، جا لێرانەدا هەڵوێستێك بکە لەسەر فەرمایشتەکەی مامۆستا حاجی مەلا محەمەد نوور، لەگەڵ ئەمەشدا پێشینان وتوویانە (نعم الأمیر علی باب الفقیر، بئس الفقیر علی باب الأمیر) ئەگەر کەسێك بەڕاستی مەلا بێ ئەبێ خەڵك بچێتە خاك‌و پای نەك ئەو ببێ بەخولخولەیەك‌و بخولێتەوە لەم لاو لەو لاو لەم کون‌و لەو کون‌و لەم دەرگەو لەو دەرگە بەپێچەوانەی ئەمانەوە ئەبێ هەردەم بەو شێوە بێت کە وتراوە (العلم یزار، ثم یزار، ثم یزار) نابێ حورمەتی، خۆی‌و جبەو مێزەرەکەی‌و چینەکەی ببا، ئەگەر حورمەتی خۆی نازانێ با حورمەتی جبەو مێزەرەکەی بزانێ وەك هیچ نەبێت با لەبەریان نەکات، ئەوەندە چینی مەلاکان نەکات بەبنێشتی بن ددانی ئەم گەلە پڕ ئێش‌و دڵ ڕەنجاوە.

*** ئایا قورئان خوێنی ناو تەعزییە و سەر قەبرستانەکان و مەولود خوێنەکان مەلان؟**

مەلا ئەو کەسەیە پلەکانی خوێندن تەواو ئەکات و ئەگا بەئەوەی

کە ئیجازەی مەلایەتی وەربگرێت، ئەگەر وا نەبوو ئەوە ئەمێنێتەوە بەکۆڵکە مەلایی ئەو کاتە بەپێی پلەی خوێندن و زانستی خۆی نرخی کۆمەڵایەتی و عیلمی بۆ دادەنرێت. واتە یەکێك بە هەوڵێکی زۆرو بە چنگە کرێ تا ریشی لێی سپی ئەبێ و لە هەموو پلەکانی خوێندن بێبەش ئەبێ ئەمجا (یا الله یا الله) هەتا دەتوانێت چەند سوورەتێك لە قورئانی پیرۆز رەوان بکات و بیخوێنێ لەناو تەعزیەکان، یاخود سورەتی یاسین بخوێنێ لەسەر قەبرستان جا ئەمە کەی مەلایە! هەر لەبەر ئەوە ناوی دەبەی بە مەلا چونکە قورئان دەخوێنێ بەدەنگێکی گریانا وییەوە لەناو تەعزییەکان؟! یاخود لەسەر قەبرستان؟! یا لەیلی بانگ دەکات لەناو مەولودەکان، هەر بەم دەنگ لەرانەوەیە ئەم قورئان خوێنە بە قودرەتی قادر گەیشت بەپلەی مەلایی، شایانی ناوبردن بوو بەمەلا؟! جا ئەگەر مەلایەتی ئەوەندە ئاسان بێت بریتی بێ لەدەنگ خۆشی و لەرانەوەی ئەو کاتە ئەکا هەموو ئەو گۆرانی بێژانەی لەئێستگەو تەلەفزیۆن دەر دەکەون، یا گوێت لەدەنگەکەیان دەبێت، ئەو کات هەموویان باشترین مەلا بن چونکە ئەم بابەتانە دەنگیان یەکجار خۆش و یەکجار زۆر ئەلەرێننەوە. جوانی دەفەرموو خوالێخۆش بوو مامۆستا (حاجی مەلا ئەحمەد مەلا حەکیم) وەك هەموو کەرەت کە دەرسی پێمان ئەدایەوە، باسی خۆشی خۆشی بۆمان ئەکرد، ئەی فەرموو: زۆربەی ئەم خەڵکە فەرقی مەلاو نا مەلا نازانن، لایان وایە ئەوەی کە دەنگی خۆشتر بوو ئەوە مەلایەکی باشترە، دەیفەرموو: ئێستاکە من کە هەموو تەمەنی خۆم رابوارد هەر بەخزمەتی دەرسی عیلم و دین و مەلاو فەقێ، یەکێك وەك (مەلا عەبدوڵڵای لۆبیا فرۆش) هەر کە تەمەنی خۆی رابوارد، هەر لە قورئان خوێندنی ناو پرسەکان و خوێندنەوەی مەولود نامەو تەواشیح بۆ جەماوەری گەل، ئەگەر لە هەموو خەڵکی شاری کەرکوك بپرسن و بڵێن مەلا ئەحمەد مەلا حەکیم و مەلا عەبدوڵڵای لۆبیا فرۆش کامەیان مەلایەکی باشترە، ئەو کاتە زۆربەی خەڵکەکە وەڵام ئەدەن و ئەڵێن: مەلا عەبدوڵڵای لۆبیا فرۆش مەلایەکی باشترە. چونکە وەك وتمان لەلای زۆربەی ئەم خەڵکە مەلایەتی بریتییە لەدەنگی خۆش و لەرانەوەی باش. ئەوجا عیلمی هەیە یان نا ئەوە بێ بایەخە لەلایان، کەواتە باش بزانە ئەم بابەتانەی باسیانمان کرد مەلا نین. کارەکانشیان کاری مەلایانە نیە. کەواتە ووشەی مەلا ئەبوو بەکار نەهاتایە تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت کە بەراستی مەلا بێ. چونکە هەموو کات وتراوە: بەراستی شتێکی باشە، (وجه التسمیة). لەکاتی ناو لێناندا.

*** کۆڵکە مەلا:**

ئەم ناوە ئەوترا بەو جۆرە خوێندەوارانە وەك لەکاتی فەقێیەتی پلەکانی خوێندنیان بۆ تەواو نەدەکراو نا ئومێد دەبوون و نەدەگەیشتنە پلەی ئاخر مادە خوێن ئەوجا بەناچاری وازیان لەخوێندن دەهێنا. ئەوکاتە ناچار دەبوون کارێك بگرنە دەست بۆ ژیانیان. ئەم جۆرە خوێندەوارانە بەم شێوەی سەرەوە کە باسیانم کرد ناوبراون بەئەم ناوەو ئەم ناوەش زۆر جوان گونجاوە چونکە ووشەی کۆڵکە زۆر دەگوترێت بەو تەرەو میوەجاتەی کە هێشتا کاڵ بن و پێ نەگەیشتبن و سوودی خواردنیان بەتەواوەتی نەبێت. هەروا بەم رەنگە ئەم چەشنە خوێندەوارانەش هێشتا بەتەواوەتی نەگەیشتبوونە کاتی پێ گەیشتنیان کە پێی وتراوە: ئاخر مادە خوێن.

*** ئەنجامی کۆڵکە مەلایی:**

هەندێك لەو کۆڵکە مەلایانە کە ئومێدیان براوە لەتەواو کردنی خوێندنەکەیان ئەوکاتە وەکو وتراوە (کل میسر لما خلق له) هەر یەکێك بەپێی بۆلووانی تێکۆشاوە بۆ ژیانی. ئەوجا ئایا بەکرین و فرۆشتنەوە بێت یا بە کشتوکاڵەوە، یا بەهەر شتێك بێ کە ببێ بەهۆی ژیانێکی بەرێزو پر خۆشی و کامەرانی بۆ خۆی و ماڵ و منالی. هەندێکیش لە ئەمانە لە گوندێکی چەند ماڵی کە توانای ئەوەیان نەبووە مەلاو مودەریس بهێنن ئەو کاتە لەلای ئەوان بووەتە مەلا بۆ پێش نوێژیی و ئەو ئەرکە ئایینیانە کە پێویستە هەردەم جێ بەجێ بکرێن لەو گوندەدا. هەندێك جاریش ئەتبینی جوتیارێکی دەوڵەمەند کە بەتاقی تەنیا لەناو زەویی و زارەکەی خۆی خانووی کردبوو ئەو کاتە ئەم فەلاحە کۆڵکە مەلایەکی دانابوو لەپاڵ خۆی هەموو خزمەت و پێویستییەکی بۆ جێبەجێ ئەکرد لەسەر کیسەی خۆی هەر بۆ ئەوەی ئەو کۆڵکە مەلایە ئەو ئەرکە ئایینییانەی هەرچی کە هەیەو پێویستە هەمووی بۆ جێ بەجێ بکا.

هەندێك جاریش کە گوندێك گەورە بوو و خەڵکەکەی زۆر خزمەت گوزار بوون، مەلای مودەرس و باشیان هەبوو. بەڵام لەکاتێکدا کە مەلا مودەریسەکە هەموو کاتی خۆی بەخت کردبوو بۆ دەرس ووتنەوەو زۆر ماندوبوون بەئەرکە ئایینییەکانی گوندەکەوە. جا لەم کاتەدا یەکێك لەو کۆڵکە مەلایانەشیان هەر لەو گوندە دائەناو خزمەتیان ئەکرد بەتەواوی بۆ ئەوەی کە ببێ بەیارمەتی دەر بۆ مەلا مودەریسەکە. ئەو کاتە هەندێك لەکاروباری ئایینی ناو گوندەکە دراوەتە دەستی ئەم کۆڵکە مەلایەوە. هەر بۆ ئەوەی کە ئەم مودەریسە تەرخان ببێ، خۆی بەخت بکا بۆ دەرس ووتنەوەو پێش نوێژیی و ئیرشادو جۆرەها لە ئامۆژگارییە ئایینییەکانی ناو گوندەکەو ناوچەکە.

*** ئایا دەرس ووتنەوەی ناو مزگەوتەکان بەشێوەی ئەڵقە بوو یان بەیەك یەك؟**

ئەمن بەخۆم ژیاوم لە مزگەوت و حوجرەی فەقێدا لە ساڵی (١٩٣٥)ی زاینی بەدواوە هەتا فەقێ دواچۆری هات لە وولاتەکەماندا لە (١٩٦٠)ی زاینی بەدواوە. بەدرێژایی تەمەنم هەر لەخزمەتی مەلاو فەقێ ژیاوم. خوێندنەکەمیش هەر لەناو حوجرەی فەقێ بووو لەخزمەتی زۆر مامۆستای بەرێزو ناودارو بەهرەمەند خوێندوومە.

لەگەڵ ئەمەشدا باوکم مەلایەکی (مدرس و مجیز) بوو و میوان پەروەرو خاوەنی خانەقاو مزگەوت و مەدرەسە بوو. بەهۆی ئەمانەوە لەبارەی ئەم باسەی ئێستامانەوە زۆرم لە لا هەیە.

مەلای مودەرس دوای نوێژی بەیانی هەتا دوای نوێژی شێوان و کاتی نووستن ئەوە هەموو کاتەکانی خۆی تەرخان

دەکرد بۆ دەرس ووتنەوە، ئەوجا ئەم مەلایە لە دێهاتەکان بووبێت یان لەشارەکاندا چونکە هیچ جیاوازی نەبووە لەنێوانی مەلای دێهات و ناو شار، لە بارەی زانین و رێگەی فێرکردن و راهێنانەوە هەر وەك فەقێکان ئەوانیش هەر دابەش دابەشەکەیان بەسەر مەدرەسەکانی دێهات و شارەکاندا هەر دەم بەکەیفی خۆیان بوو:

١. لە دێهات و شارەکان مامۆستاو فەقێ هەردووکیان لەسەر رایەخێکی بە نوێژ دادەنیشتن لەکاتی دەرسەکاندا، رایەخەکەش بریتی بوو لە حەسیرێکی مزگەوت، گەلێ جاریش لەسەرییەوە بەرماڵێك بۆ مامۆستا دادەخرا ئەمەش (من باب الاحترام) بوو، هەروەك بالیفێك لەبەردەمی دادەنرا کتێبەکەی لەسەری دادەنا، لە دانیشتنەکەشی رووی دەکەوتە قیبلە لەگەڵ ئەمانەشدا مامۆستا دەستنوێژێکی هەڵدەگرت و ماوەیەك دوعای خێری دەکرد و دەکەوتە پارانەوە لە خواو داوای تۆفیق و پیت و بەرهەمی دەکرد، ئەوجا دەکەوتە دەرس ووتنەوە.

٢. لە هەموو دێهات و ناو شارەکانی وولاتەکەماندا هەردەم خوێندن بەشێوەی یەك یەك بوو لە هەموو دەرسەکانی عەرەبی و عیلمی دا مەگەر بەدەگمەن هەروەك ئامادەبوون و رێگای دەرس ووتنەوە هەر بەم جۆرەی خوارەوە بوو:
ئەوەندە فەقێیە کە مامۆستا دەرسی پێ ئەدان کە بریتی بوون لە موستەعیدی تەواو و ئەوانەی کە دواین مادەکان دەخوێنن لەدوای ئەوەی دەرسەکەیان بەباشی دەخوێندەوەو هەموو ئەو (شروح، حواشي، قيود، تذبيب، راجع و مرجع)ەی کە هەبوون لەسەری هەموویان دەخوێندەوە، توانای تەواویان پەیدا دەکرد بۆ لێکۆڵینەوەی بەهەموو وردبینیەکەوە، ئەو کاتە یەك لەدوای یەك بەنۆرە دادەنیشتن لەسەر چۆك و لەبەردەم مامۆستا کتێبەکانیان پان دەکردەوە، ئەوجا لەدوای بەیەکەوە گرێدانی باسی دەرسەکەیان بەباسەکانی پێشەوە لەلایەن مامۆستای بەرێزەوە، ئەو کاتە مامۆستاو یان فەقێکە دەستی دەکرد بەخوێندنەوەی کتێبەکە لەدوای خوێندنەوەی چەند دێرێك مامۆستا دەکەوتە سەر راپۆرتەکەو راڤەکردن و شیکردنەوەی، ئەوجا لەنێوان مامۆستاو فەقێکە دەبوو بە تۆپێن و کێشمەکێش و پاڵەوان بازی و گوریس کێشەکی، دەفەرموون سەیرکەن!! لەم مرخێش مرخێشە لەنێوانی ئەم دوو شاسوارەدا، مامۆستا بەو هەموو عیلم و ئامادەبوونەوەی، فەقێکەشی بەو هەموو خوێندنەوەیەی، ئەم دوو دلێرە لەسەر هەر ووشەو رستەیەك دەوەستان و یەکتریان دەهێناو دەبردو لێکدانەوەیان دەکرد بەجۆرێك، وەك مامۆستا وەڵامی پرسیارەکەی دەدایەوە، فەقێکەی بەرپەرچی وەڵامەکەی دەدایەوە، جا بەپێی ئەو بەرپەرچدانەوەی زۆر جار وا دەبوو مامۆستاکە ئەوەندە بێ چارو تەنگاو دەبوو تا قەیسەری لێدەبوو بە کونە مشك، ئەم دەرسە بەم جۆرە بەردەوام دەبوو لە هەموو بارێکەوە وەك بارەکانی (نحو. صرف. فنون البلاغة. منطق. أصول. اداب البحث والمناظرة) ئەوەندە کە لە توانایان هەبوو، مامۆستا دەبوو لەناو دەرس هەردەم ئامادە بێت بۆ هەر پرسیارێك کە بکرێت لەلایەن ئەو فەقێیەوە دەنا شکست بوو بۆی، زۆر کەرەت دەبوو ماوەی دەرسەکە درێژای دەکرد بۆ دوو سەعات یاوەکو زیاتر. ئەم دوو شۆرە سوارە ئەگەر ناویانت ببردایە بەدوو شێر یا دوو پاڵەوان یا دوو هەڵۆ یا دوو مەلەوان، یا بەهەر جۆرێك لەجۆرەکانی هەڵکێشانیان، ئەوە هەر پڕ بەپێست و بەقەدو باڵایان بوو. ئەبەم جۆرە مامۆستا دەرسی ئەدا بەفەقێکانی یەکە یەکە هەتا هەموویان دەرسەکانیان دەخوێند زۆر کەرەت بەشێك لەم فەقێیانە بێجگە لە دەرسەکانی خۆیان هاوبەش دەبوون لەدەرسەکانی فەقێکانی دیکەدا بەڵام بەشێوەی گوێگر نەك بۆ تاوتوێکردن و خوێندن چونکە ئەو دەرسە هەر بۆ ئەو فەقێیە بوو بەس. ئەگەر گوێگر پرسیارێکی هەبایە ئەوە لەدوای دەرس تەواو بوون لەکاتێکی تایبەتی ئەوجا دەیتوانی ئەو پرسیارە بکا لە مامۆستا دەنا دەبوو بەئازاردان بۆ فەقێ دەرس خوێنەکە. ئەمەش بزانە هەر فەقێیەك لە رۆژێکدا یەك دەرسی تایبەتی بۆخۆی دەخوێند.

٣. لە دەرس (فقە)و (تفسیر)و (حدیث) هەموو دەرس خوێنەکانی مامۆستای بەرێز لەناو مەدرەسەکەیدا وەك یەك تیا هاوبەش دەبوون بەشێوەی ئەڵقەو هەموویان لەکاتی ئەم سێ دەرسەدا بەشدار دەبوون لە موناقشەکەی پێکەوە. چونکە ئەم دەرسانە بۆ هەموویان بوو بەگشتی.

٤. لە شارە خۆشەویست و خنجیلانەکەی کۆیە مەلاکانی بنەماڵەی (جەلی زادە)، بەتایبەتی (حاجی مەلا عەبدوڵلا)و (مەلا محەمەد)ی کوری. لە هەموو مادەکاندا زۆر دەرسیان بەئەڵقە داوەتەوە بەفەقێکان. هەروەك لەمەدرەسەی (مەحمودی خاڵ) وەك لەناو مزگەوتی مەیدان بوو لە قەڵای کەرکوك لەوێش دەرس وتراوەتەوە بەئەڵقە لە هەموو مادەیەك، لە (المدرسة العلمية الدينية المنظمة في كركوك) کە بیناکەی لەناو حەوشەی (ئۆلو جامیع) بوو، هەر لە قەڵای کەرکوك دەرس ووتنەوە لێرەش لە هەموو مادەیەك دیسانەوە هەر بەئەڵقە بوو. هەر وەك بە (نظام وصفوف) بوو.

خوالێخۆش بوو باوکم وەك مدرس بوو لەم مەدرەسەیەو ئەمن یەکێك بووم لە فەقێکانی وام ئەدیت. هەموو رۆژێك وەك باوکم دەرسی ئەدا پێمان لەدوای ئەوە ئەمجا زۆر هانمانی ئەدا بۆ خوێندن و لەبەرکردنی دەرسەکانمان. لەبەر چاومە وەك یەکێك لە فەقێکان پرسیی و وتی: ئایا دەرس لە بەرکردنی باشترە یان فەمی ماناکەی؟ هەر یەکێك لەفەقێکان شتێکیان وت ئەوجا باوکم وتی: ئەگەر لەبەرکردن بەبێ فامی مانا بێت ئەوە هەر خۆ ئازاردانەو بەس؟ ئەگەر لەگەڵ فامی مانا دابێ ئەوە باشترین شتە؟ وتی: ئەوەی فامی دەرسەکەی باش بکا ئەوجا لەبەری بکا هەردەم چەکەکەی پڕەو لەسەر پێیە هەر مەسەلەیەکی ویست وا قاعیدەکەی لەبەرییە لەهەمان کاتدا ئەیخوێنێتەوە؟

وتی من بەخۆم هەرچی کتێبێك وەك خوێندبێتم مەتنەکەیم کردووەتە بەر لە هەموو مادەکان. هەردەم هانی فەقێکانی ئەدا بۆ لەبەرکردنی متون، هەردەم ئەم رستەی دەووتەوە: (وعلیکم بالمتون).

هەر لەبیرمە لەپێش چاومە وەك فەقێکان لێیان پرسی و ووتیان بەچ شێوەیەك مامۆستا دەرس بڵێتەوە باشترەو؟ باوکم گوتی: بەچ شێوەیەك بتوانێت وابکا فەقێکە دڵی

هەموو بكەوێتە سەر دەرسەكەی، وای لێ بكا هەموو حەواسی لەگەڵیابێت ئەوە باشترین ڕێگاو شێوەیە بۆ دەرس ووتنەوەو تێگەیاندنی ئەو فەقێیە.

*** ئاریێ بابەی فەقێكان:**

ووتوومانە لەمەو بەر كە فەقێكان هەموو كات هەر خەریكی خوێندنو لەبەركرنی دەرزەكانیان بوون ئەو دەرزەی وەك دەخوێنرا دەبوو ڕۆژ بەڕۆژ لەبەری بكەن، یا مەتنەكەی بكەنە بەر، فەقێكانی پلەی سوختەیی و (مقدمات)بۆ ڕۆژی داهاتوو دەرزەكانیان پێ نەدەوتن، هەتا دەرزەكانی پێشوویان لەبەردەكرد وەك لەناو باسەكانی پێشوودا زانیوتە، كە باو وابوو لەپێشدا خوێندنو لەبەر كردن هەردەم لەگەڵ یەك بوون، ئەوجا بەپێی ئەم باوە هەردەم خەریكی لەبەركردن بوون، ئەبوو هەموو ڕۆژێك دەوری كتێبو متوونەكانیان بكردایەتەوە لەبەر بۆ ئەوەی لەبیریان نەچێتەوە، لەدوای ئەوە ئەمجا دەكەوتنە سەر لەبەركردنی دەرسە تازەكانیان ئەوجا هەموو فەقێكان وەك دەوریان دەكردەوە، هەر بەپێوە دەبوونو هاتوچۆیان دەكرد، هەر یەكێك لەئەمانە لە شوێنێك بۆ خۆی ڕێچكەیەكی كردبوو بەدرێژایی چەند مەترێك بەهۆی زۆر هاتوچۆكەی، چونكە لەوانە بوو هەر لەو جێگایە بۆ ماوەی ساڵو دوو ساڵ یان زیاتر دەوروو هاتوچۆی كردبێت، تا وا دەبوو هەندێك جار ئەو جێگایە دەناسرا بەو فەقێیەوەو دەیان وت ئەوە ڕێچكەی فڵانە فەقێیە لەفلانە كاتا بوو! ئەوجا ئەم فەقێیە بەهۆی ئەوەی هەموو ڕۆژ دەورەكانی هەر ئەكردەوە لەبەر، ئەوەندە جوان ئەوبەرو ڕەوانی كردبوو، وەكو پێنج تیر خێرابوو لەخوێندنەوەكەیدا، ئەگەر لەكاتێكدا وەستانێكی بكردایە هەرچەند ماوەكەی كەمو هۆیەكەی بێ هەممییەت بووایە، ئەوا لەناو فەقێكان باو وابوو یەكسەر ووتەی ئاریێ بابەی بەدەما دەهاتو دوابەدوای یەك دەیووتەوە هەر وەك ئەو ووشەو ڕستەیەی لەسەریان ڕاوەستابوو ئەیانی ووتەوەو لەهەمان كاتدا بیری لەو ووشەو ڕستانەش دەكردەوە وەك لەبیری دەرچوو بوون، هەروا بەمێشكی هەر بیری دەكردەوە، بەزمانی ئاریێ بابەی دەووتەوە لەبەر خۆیەوە هەتا ئەوەی وەك لەبیری دەرچوبوو ئەهاتەوە بیری، لەبەر ئەوەی ووتەی ئاریێ بابە هەردەم بەشێوەی بەردەوامی لەسەر زمانیان بوو، لە ئەوان زیاتر كەسێ تر بەكاری نەدەهێنا، هەردەم ئەم ووتەیە ناسرابوو لەگەڵ فەقێكاندا پێكەوە دەگوترا: ئاریێ بابەو فەقێكان وەك لازمو مەلزوم بوون.

*** بەرگەكانی مەلاو فەقێ لەووڵاتەكەماندا:**

شتێكی ڕوونو ئاشكرایە كە هەموو چینێك لەچینەكانی ئەم گەلە جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، بەهۆی شێوەی بەرگەكانیانەوە هەر لەدوورەوە دەناسرێن، واتە ئەمەش بزانە، چینی مەلاو فەقێ ئەوانیش هەر لەكۆنەوە خۆیان بەخەڵك ناسیوە، بەهۆی بەرگەكانیانەوە.

هەرچی لەبەر بكردایە بەكەیفی خۆی بوو لەكاتی ناو قوتابخانەو دەرەوەیشی. فەقێ لەهەردوو پلەی سوختەییو مقدماتدا هەردەم باو وابوو كورتەكو شەرواڵیان لەبەر دەكردو فەقێیانەیان هەبوو. ئەگەر بەشێوەی یەكە یەكە لەسوختەكان شەرواڵیان نەكردایەتە بەر ئەوە هەر لەبەر ئەوە بوو زەوقی خۆی وابوو ئاوهابێ ئەو كەسە هەروەك بۆ ماوەیەكی تەرخان كراو بوو بەس، مستعدی تەواو لەگەڵ ئاخر مادە خوێنەكان هەردەم هەموویان كەواو سەڵتەیان لەبەر دەكرد ئەوجا لەسەر ئەمانەوەش لەناوچەكانی گەرمیان عابایان دەدا بەشاندا.

لەناوچەكانی كوێستانەتی قاپووت دەكرایە بەر لەجیاتی عابا بەپێی باری ناوچەكان لەگەڵ ئەمانەشدا بزانە: فەقێ لەم دوو پلەیەدا لەناو گەل سەیری دەكرا بەچاوێكی پڕ حورمەتەوەو قەدرو ڕێزی لێدەنرا. وەك مەلایەكی دوانزە عیلمە هەروەك ئەویش ئەبوو هەمووكات لەوقاری مەلایەكی تەواودا بێت. مەلا ئەو ڕۆژەی ئیجازەی دوانزە عیلمەی وەردەگرت، بۆ كاتی ئیجازە خوێندنەوەكەی مێزەرو جبەیەكیان ئەكردە بەری ئەوجا لەو كاتەوە ئەم بەرگە پیرۆزە ئەبوو بەبەرگی، هەر ئەمانەی لەبەر دەبوو ئەوەندە كە خوا تەمەنی پێ كەرەم بكردایە. لەگەڵ ئەمانەشدا لەچوارچێوەی ووڵاتەكەماندا باو وابوو لەژێر ئەم بەرگە پیرۆزەوەش كەواو سەڵتەیان ئەكردە بەر، ئەگەر لەكوێستانەتی هەندێك جار لەژێر ئەمانەوەش شەرواڵ بكردرایەتە بەر ئەوە هەر لەبەر پێویستی باری ناوچەكەیان بوو. ئەمەش بزانە بەهیچ جۆرێك فەقێ سەرپێچی مشكی نەبەستووەتە سەرییەوە بەرادەیەكی دەگمەنیش چونكە لەقوماشی ئاورێشم بوو، بەڵكو كڵاوو جامانەی ڕەشو سپی لەسەر بەستووە، لە كوێستانەتی هەندێك لەفەقێكان سەرپێچی سپییان پێچاوەتە سەریانەوە بەڵام ئەم سەرپێچەیان شێوەو جۆری بەستانەوەكەی جیاوازی هەبوو لەگەڵ مێزەری مەلاكاندا ئەمجا لێرانەوە جوان دەبینی وەك، كەواو سەڵتە بەرگی تایبەتی مەلاو فەقێ بوون، هەردەم لەگەڵ فەقیانەدا هەر وەك مێزەرو جبە بەرگی تایبەتی مەلا بوو، بەهۆی بەرگەكانیانەوە هەر لەدوورەوە دەزانرا كە مەلان یان فەقێن

*** پلەی قوتابییەتی لەشارەكاندا:**

باسمان كردووە لەهەوەڵی بەشی یەكەم وتوومانە قوتابی لەدێهاتەكان هەر كەس لەدێیەكەی خۆی ئەم پلەیە ی تەواو دەخوێند لەكن فەقێكان وەك لەماڵی بابی بوو پێش ڕۆیشتنی بۆ فەقێیەتی، ئەوجا لێرانەدا دەمەوێت باسی ئەم پلەیە بكەم بەپێی ناو شارەكان بۆ ئێوەی بەڕێزم واتە بزانن لەناو شارەكان لە هەموو مزگەوتێك كورەكانی دەورو پشتەكەی لەئەوێ دەیانخوێند لەكن فەقێكان یان بانگدەرەكە، یا مامۆستای تایبەتی وەك هەردەم هەبوو لەناو مزگەوتەكاندا دەرسی دەووتەوە بەمناڵەكان بەمانگانە هەتا قورئانیان هەموو خەتم دەكرد لەگەڵ چەند وردە كتێبێك بەرادەیەكی وا لەهەندێك مزگەوت سەد تا دوو سەد منداڵ یا زیاتر دەیانخوێند هەروەك دیسانەوە لەناو هەموو شارەكانی ووڵاتەكەمان زۆر ئافرەت هەبوون، قورئان خوێنی باش بوون لەخانوو و بەرەی خۆیان ژووریان تەرخان كردبوو بۆ قوتابخانەی ئایینی، بەتایبەتی بۆ وانە ووتنەوەی بەشی ئافرەتان،هەندێ جاریش كوڕیان وەردەگرت لەناو كچەكان

لەکاتێکدا کوڕەکان بچووك بوونایە بەتەمەن، واتە هەر بۆ نموونە با ناوی هەندێك لەو ئافرەتانە بنووسمەوە لێرانەدا وەك وانەی قورئانی پیرۆزیان دەووتـەوە لە شاری کەرکوك لەگەڕەکی ئیمام قاسم لەنزیکی ئەم مزگەوتە بەپێی دیتنی ئەمن بەخۆم، هەروەك ئەمن لەدانیشتوانی ئەم گەڕەکەم، ئەم ئافرەتانە هەردەم بەماموٚستا ناو دەبران ئەمانەش وەك:

١. ماموٚستا مـەلا بەهییەی کچی محێدینی کـوڕی.. وەك ماڵی لـەخوار شاخەکەی مـەترێـزەوە بـوو بۆ لای گەڕەکی دۆمەکانەوە، نزیکەی دوو سەد مەترێك دوور بوو لەمزگەوتی ئیمام قاسم.

٢. ماموٚستا مەلا ئایشە خانی کچی حاجی مستەفای حاجی قوربانی، وەك ماڵەکەی لەناو بازاڕەکە بوو هـەروا نزیکەی پەنجامەترێك دوور ئەبوو لەم مزگەووتەوە واتە مزگەوتی ئیمام قاسم.

٣. ماموٚستا مەلا حەمدییەی ژنی حاجی خدر قوربانی وەك ماڵەکەی هەر لەتەك بازاڕەکە بوو، بەدووری پەنجا مەترێك بوو لەمزگەوتەکەوە.

٤. ماموٚستا مەلا بەهییەی کچی حاجی خدر قوربانی کچی ماموٚستا مەلا حەمدییە بوو، ئەمیش هەر ماڵەکەی لەخوار شاخەکەی مەترێزەوە بوو، هەروەك لەنزیك ماڵی ماموٚستا مەلا بەهییەوە بوو.

٥. ماموٚستا مەلا حەنیفی.. وەك ماڵەکەی لەگەڕەکی سەید سەروەر بوو، نزیکەی پێنج دەقیقە ڕێ دوور بوو لەمزگەوتی ئیمام قاسم.

لە چەرخەکانی کۆنەوە، لەکاتەکانی جەنگی جیهانی یەکەم بـەدواوەش مزگەوتەکان‌و قوتابخانەکانی بەشی ئافرەتانی ماڵەکان لە هەموو شارەکاندا پڕبوون لەقوتابی ئایینی، بەڵام لەدوای کردنەوەی قوتابخانەکانی سەر بەپەروەردەی میری، بەشێوەیەکی نیمچە زۆر لێ کردن زۆربەی کوڕو کچەکانیان بـرد بۆ قوتابخانەکانی سـەر بـەپـەروەردە، جا وردە وردە خوێندنی ئایینی لە قوتابخانەکانی ناو مزگەوت‌و بەشی ئافرەتان لەماڵەکاندا هاتە کزبوون، تا نزیکی ساڵی (١٩٥٨) ی زایینی لەم مێژووە بەدواوە ئەم شوێنانە هەر یەکە لەپێنج شەش قوتابی زیاتر تێیدا نەما بۆ خوێندن، لەشەستەکان بەدواوە ئەم قوتابیانەش بەیەکجارەکی دوایان بڕایەوە.

*** دەرس خوێندنی قورئانی پیرۆز:**

لە هەموو دێهاتەکان‌و ناو شارەکانی وڵاتەکەمان قوتابی دەرزی قورئانی پـیرۆزی دەخوێند لەمزگەوتەکان‌و لەماڵی ئەو ئافرەتانەدا وەك ژووریان تەرخان کردبوو بۆ خوێندن‌و دەرز ووتنەوەی بەشی ئافرەتان، ئەوجا لێرانەدا با باسی ئەو خوێندنەتان بۆ بکەم بەشێوەیەکی ڕوون‌و شیکراوەتر، منال دەستی دەکرد بەخوێندن لەلای یەکێك لەماموٚستای منـاڵان، ئەوجا دەفتەرێکی ئەلف‌و بێ دەدرایـە دەستی‌و ماموٚستاش لەسەرەتاوە (حروف الهجا)ی پێ دەوت، هەتا هەمووی ڕەوان دەکـرد لەگەڵ هەموو بزوێنەکانیان ئەوجا دەستی دەکرد بەخوێندنی (جوز عەمە) لەدوای ئەوە جزمی تەبارەك، هەر ئاوا هەتا دەگەیشتە سورەتی بەقەرە، ئەوجا جگە لەو مانگانەیە وەك دەدرا بەماموٚستاکە، لەگەڵ ئەمەشدا وەك قوتابی سورەتی نەسری ئەخوێندو دەگەیشتە (انە کان توابا) هەموو قوتابییەکان بەیەك کەڕەت بەدەنگێکی بەرزەوە دەیانوت (مریشکە ڕەشە سەوابە) ئەوجا دەبوو خاوەنی ئەو مناڵە مریشکێکی ڕەش بنێرێت بۆ ماڵی ماموٚستا بەخەڵات، هـەروەك لەسورەتی ئەلماعون وەك دەگەیشتە (ویمنعون الماعون) ئەو کاتە دیسانەوە هەموو قوتابییەکان دەیانوت (بێنە بۆ ماموٚستا قالبێك سابوون) ئەو کاتە ئەمەش بەخەڵات ئـەنـێردرا بـۆ مـاڵـی ماموٚستا لـەلایـەن قوتابییەکەوە، وەك لەسورەتی (الانشراح) گەیشتە (والـی ربك فارغب) هەموو قوتابییەکان بەیەك دەنـگـەوە دەیـانـوت (بێنە بۆ ماموٚستا قوتوویەك مـەرەکـەب) ئـەو کاتە دیسانەوە ماموٚستا بزەی لێوی ئەهات‌و چاوەڕوانی قوتووە مەرەکەبی دەکرد، ئەوجا هەتا هەموو قورئانی دەخوێند بەم شێوەیە دەبوو خەڵاتێ بچێت بۆ ماڵی ئەو ماموٚستایە، بێگومان هەر کەس بەپێی تواناو باری ژیانی خۆی لەناردنی ئەم خەڵاتە، وەك گەیشتە سورەتی بەقەرە ئەو کاتە دەوترا قوتابییەکە خەتمی قورئانی کـردووە، بەهۆی ئەمەوە دەبوو خاوەنی خەڵاتێکی گونجاو بنێرێت بۆ ماڵی ئەو ماموٚستایە، هەر وەك نانێکی زۆر باشی دروست دەکرد بۆ قوتابییەکان، هەموویانی داوەت ئەکرد بۆ ماڵی خۆی، لە هەموو لاوە قوتابییەکە خەڵات ئەکرا.

لە کاتی سـەر لەبەیانیدا لە قوتابخانەکەوە قوتابییەکان ریز دەبوون لەدوای یەك بەشێوەی دوو دوو یان سێ سێ، ئەوجا هەموو خۆیان دەڕازانەوە بەڕێك‌و پێکی، هەر لەوێوە دەڕۆیـشـتن بـۆ مـاڵـی ئـەو قوتابییە، هـەر وەك خەلفەکەی ماموٚستاش دوعای خەتمی قورئانی دەخوێندو قوتابییەکان (ئامین ئامین) یـان دەوت بەجۆرێك وەك خەلفەکە کە دوو سێ ڕستەی دەوت‌و قوتابییەکان بەیەك دەنگ‌و یەك ئاوازو دەنگێکی بەرز هەموو دەیانووتەوە ئامین، هەتا دەگەیشتنە ماڵی قوتابییەکەو لەوێ ئەو ژەمە نانیان دەخـوارد، باوکی خەرجیەکی باشی دەدا بەهەموویان یەکە یەکە، جا ئەو ڕۆژە بۆ ئەو قوتابیانە دادەنرا بەرۆژێکی تایبەتی بۆ پشوودانیان، ئەمەش بزانە هەموو ماموٚستایەکی مناڵان قوتابییەکانیان کردبوو بەئەم بەشانەوە:

١. قوتابی ئەلف‌و بـێ خـوێـن، ئـەم بابەتە خوێندنەوەیان نەدەزانست هەردەم دەبوو دەرزیان پێ ڕەوان بکرێت پیت پیت.

٢. قوتابی قورئان خوێن، ئەمانە ئەوانە بـوون وەك چەند جزمێك لە قورئانیان خوێندبوو، وردە وردە (حروف الهجا) یان دەناسی‌و، وردە وردە بەخۆیان هەوڵیان دەدا قورئانیان دەخوێندەوەو بەرەو پێش دەچوون بۆ خەتم کردنی.

٣. قوتابی خەلفەی ماموٚستا، ئەم بەشە ئەوانە بوون وەك قورئـانـی پـیرۆزیـان خـەتم کـردبـوو، چـەنـد وردە کتێبیان خوێندبوو، وایان لێ هاتبوو لەجێی ماموٚستاکەیان دەرزیان ئـەدا بەقوتابییەکان، بـوو بـوون بـەیـاریـدەدەری لە هەموو پێویستی ناو قوتابخانەکەدا، هەروەها ئەمەش بزانە ئەم جۆرە ماموٚستایانە هەموویان هـەردەم بۆ دەرز ووتنەوەو زەبتی قوتابییەکان داریان بەکار دەهێنا، هەردەم شوولێکی

وەك حەیزەران بەدەستیانەوە بوو، رووحی قوتابییەکانیان بردبوو بەو دارە، باسی شەقازلەو گوێ راکێشان و فەلاقەکردنیان هەر مەپرسە چۆن بوو (ماشەڵلا)ئەمانە هەر وەك تەزرەو باران بوون بەسەر ئەم قوتابیانەدا، بەڵام ئەمەش هەر بزانە: ئەو مامۆستا خوالێخۆشبووانەش ئەگەر ئاوها توندو تیژ نەبوونایە لەسەر ئەو قوتابیانە، لەئەنجاما ئەو جۆرە مەلایانە پەیدا نەدەبوون، وەك هاتوون لەپێش ئێستادا بەهەموو عیلمەکانیانەوە بۆ خزمەتی هەموو ئیسلام، وەك ئەوانەش هەموو تواناى خۆیان سەرف کردووە لەرێگای خودادا، خودا پاداشتی هەموو لایەکیان بداتەوە (جزاهم الله عنا خير الجزاء) (قال الله هذا يوم ينفع الصادقين صدقهم لهم جنات تجري من تحتها الانهار خالدين فيها ابدا رضي الله عنهم ورضوا عنه ذلك الفوز العظيم)، صدق الله العظيم.

* نموونەیەك لە چۆنییەتی ئیجازەدانی قوتابیان لەلایەن زانایانی ئایینی کەرکوکەوە:

مەلا محەمەد ساڵح گونبەدی

لە کەرکوك گەلێك قوتابخانەو مزگەوت سەریان هەڵداوە کە جەمیان هاتووە لە قوتابی و لە زۆربەی شارەکانی کوردستانەوە روویان لە کەرکوك کردووەو لەلایەن زانایانی ئایینی کەرکوکەوە فێری زانستەکانی ئایین بوونە، کە بەشێك لەم قوتابیانە لە سەردەمانێکدا زاناو مامۆستای ئایینی بوونەو خزمەتیان بە خوێندن و پەروەردەی ئایینی کردووەو بەشێکیان پاشماوەو دەسنووسەکانیان گەواهی راستی ئەوە دەخاتە روو کە کەرکوك لە رووی خوێندن و پەروەردەوە چەندێك گرنگ بووە، یەکێك لەو یاداشتانەی کە لە بواری خوێندن و ئیجازەی ئایینیدا بیرەوەری و سرووتی ئەو جۆرە ئیجازانە دەخاتە روو کە لە سەردەمانێکدا باوی بووەو لە ژێر دەستی مەلا عومەری عومەر گونبەدی ئیجازەی زانستەکانی ئایینیان وەرگرتووە.

* ( مجاز )ەکانی خوالێخۆشبوو:

خوا لێ خۆش بوو گەلێك رەنجی کێشاوەو هەوڵ و تەقەلای داوە بۆ پێ گەیاندنی ئەو کەسانەی وەك پێویستیان بەیارمەتی ئەو هەبووە. بەتایبەتی بۆ مەلاو فەقێ هەندێك لەم کەسانە کە بەهرەیان لێ وەرگرتووەو (تخرج)یان لەسەر دەستی کردووەو ئیجازەیانیش لەخزمەتی وەرگرتووە. بریتین لەم مامۆستا بەرێزانەی کە ناونووسیانم کردووە بۆتان. لێرە بەدواوە لەبارەی ئاهەنگی ئیجازەی هەندێکیانەوە هەندێك دوواوم کەواتە فەرموون ئێوەو ئەوانە:

١. حاجی مەلا عەبدوڵلای بەردەسپی:

ناوی تەواوی مامۆستای بەرێزمان مەلا عەبدوڵلای کوڕی دەروێش حوسێنی کوڕی مەحمودی کوڕی مستەفای کوڕی عەبدولقادری کوڕی عومەرەو لە عەشیرەتی لەکەو لەدێی بەردە سپی کە سەر بە کۆیسنجاقە. لە ساڵی (١٩٠٥)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە. وەکو هەموو فەقێیەك لە وڵاتەکەماندا خوێندنی کردووەو گەراوە بەمەدرەسەکانی بەهرەی وەرگرتووە لەبەهرەمەندەکان. لەکاتێکدا کە پلەی خوێندنی گەیشتە (مستعد)یی هاتە کەرکوك و لە خانەقای عومەر گونبەدی دانیشت بەفەقێیەتی و لەلای باوکم خوێندنی تەواوکرد. لەگەڵ مامۆستا مەلا ساڵحی دەرماناوی گەورەدا هەردووکیان بەیەك ئاهەنگ ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرت لەلای ئەو شایییە وەك گێردار لە حەفلەی ئیجازەی ئەم دوو مامۆستا بەرێزانە. شتی وا هەر نەبیینرابوو لەوە پێشی لەم شارەدا چونکە باوکم یەکەم جاری بوو کە ئیجازە بدا بە فەقێ، زۆر بایەخی دا بەم ئاهەنگ و شایی و زەماوەندە وەك گێرای بەم بۆنەیەوە زۆر لە مەلاو فەقێ کانی سلێمانی و هەولێرو دەشتی دزەیی لەگەڵ هەموو مەلاو فەقێ کانی وڵاتی شوان و شێخ بزێنی و ساڵەیی و دەورووبەری کەرکوك بانگ کران بۆ بەشداری کردن لەم ئاهەنگە لەگەڵ هەموو مەلاو فەقێی ناو شاری کەرکوك.

بۆ ماوەی یەك حەفتە بەشەو بەرۆژ ئاهەنگ و شایی فەقێیانەو شایی هەر پێداو پێداو جۆرلو جۆرلو جۆرەکانی تەمسیل و بەزم و بەستەو گۆرانی هەر بەردەوام بوو. ئەوجا بۆ ئەم مەبەستانە چەند کەس لە ئەکتەران و گۆرانی بێژەکان و بەهرە مەندەکان هەردەم ئامادە بوون. لەمزگەوتی ئیمام قاسم و خانەقای عومەر گونبەدی، هەموو مەسرەفی حەفلەکەو خواردنی هەر سێ ژەمی میوانەکان: هەمووی هەر لەکیسەی دانیشتوانی گەرەکی ئیمام قاسم و ئاخور حوسێن بوو.

خواردن لەحەوشەی ماڵی باوکم دروست دەکراو سفرە لەم خانەقایە رادەخرا ئەوجا لەدوا رۆژدا: وەك دەکا (جومعە) بۆ کاتی پاش نیوەرۆ ناو حەوشەی مزگەوتی (ئیمام قاسم) هەمووی ئامادەو پڕ تەخت و قەنەفە کرا. لەگەڵ پاش نوێژی عەسردا بەپێی داوەت نامە هەموو مەلاو فەقێ و ئەدیبان و پیاو ماقوڵان و بەرپرسانی میریی لەکەرکوك لەگەڵ هەموو خێر خوازان و دانیشتووانی ئەم دوو گەرەکەدا ئامادەی ئاهەنگەکە بوون، سەربانی مزگەوت و هەموو سەربانەکانی دەوروپشتی پڕ بوون بۆ سەیرکردنی ئەم ئاهەنگە لەبەر زۆری سەیرکەران کەس توانای نەبوو ژمارەیان دیاری بکات چونکە لەو کاتەندا (مجان) زۆر خۆشەویست بوو وا دادەنرا، کە ئەستێرەیەکی تازەیە: وا هەڵ هاتووە لەبەختی موسڵمانان و رێ روون کەرەوەیەکی گەشی دیکەیە هاتووەتە خوارەوە بۆ رووناك کردنەوەی رێرەوی ئیسلام. ئەتبینی هەر تاخمێك و هەر سەرۆکی عەشیرەتێك روویان دەکردە باوکم و داوایان لێ دەکرد کە مامۆستا مەلا عەبدوڵلا، یا مامۆستا مەلا ساڵح بنێرێت بۆ دێیەکەی ئەوان و دەیان ووت:

بەگەیشتنی مامۆستا بۆ لای ئێمە دەبینی ئەوەی کە بیەوێت هەمووی بۆی ئامادەکراوە ئەوجا. لەم رۆژە پیرۆزەدا، لەدوای نوێژی عەسر لە حەوشی مزگەوت و ناو ئەو جەماوەرەدا کە هەموو هەر چاوەروانی ئەم کاتەیان بوو. باوکم ئیجازە نامەکەیانی خوێندەوە ئەمەش لە ساڵی (١٣٥٨)ی کۆچی دا بوو ئەوجا لەدوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە شێخانی وڵاتی ساڵەیی، بەشی دێی دوبز کە هەردەم حازری ئاهەنگەکە بوون زۆر بەشانازییەوە مامۆستا مەلا (عەبدوڵلا)یان برد بۆ دێی دوبز لەئەوێ دایان نا بە ئیمام و خەیب و مامۆستا لەگەڵ هەڵگری هەموو کارەکانی ئایینی. لەگەڵ ئەمەشدا هەموو پێویستییەکی بۆ ئامادەکرابوو لەلایەن دانیشتووانی ئەم دێیەوە.

حوجرەی فەقێ و مەدرەسەو خانووی مەلا هەمووی بەتەواوی لەکۆنەوە هەر هەبوو چونکە لەهەوەڵەوە هەردەم مەلاو مەدرەسەی تێدا هەر هەبوو ئەوجا ئەم مامۆستا بەرێزە کەوتە سەر دەرس وتنەوەو شەرع و شەرع کاری و رێ نیشاندان و هەموو ئەرکە ئایینییەکانی ئەم گەلە موسڵمانە ئەوەندە کە لەم دێیە بوو هەمووکاتێك مەدرەسەکەی پڕ بوو لەخوێندکاران و ئێستاکەش مامۆستا وا لە کەرکوك لەمزگەوتی گەورەی رەحیماوایە هەر بەردەوامە لەسەر ئیمامەت و هەموو ئەرکەکانی ئایینی بەبێ دریخی کردن.

**٢. مەلا ساڵحی دەرماناوی گەورە:**
ناوی تەواوی ماموستای بەرێزمان مەلا محەمەد ساڵحی کوڕی فەقێ ئەمینی کوڕی حاجی محەمەدەو لەعەشیرەتی لەکەو لەدێی دەرماناوی گەورەی سەر بە پردێ لە ساڵی (١٨٨٧)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە.
باسمان کردووە لەگەڵ باسی: مامۆستا حاجی مەلا (عەبدوڵلا)ی بەردە سپی دا، گوتوومانە بەیەك ئاهەنگ هەردووکیان پێکەوە ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرت لای باوکم. لە ساڵی (١٩٣٩)دا. مامۆستای بەرێز دوای وەرگرتنی ئەم ئیجازەیە دانیشتوانی دێی دەرماناوی گەورە کە ئامادەی ئاهەنگەکەی بوون هەموو لەخزمەتی چوونەوە بۆ دێیەکەی خۆیان هەر لەوێ مەدرەسەو فەقێیان بۆی ڕاگرت. ئەویش دەستی کرد بە دەرس وتنەوەو ئیرشادی ئایینی لەناوچەکەدا.

**٣. حاجی مەلا محەمەد ئەمینی قالەقژە:**
ناوی تەواوی ئەم خوالێخۆش بووە: مەلا محەمەد ئەمینی کوڕی دەروێش قادری ناسراوە بە قالەقژەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مستەفای کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدەو لەنەوەی میر ئیسماعیلی حوکمداری ناوچەکەیەو لە عەشیرەتی زەنگەنەیە.
لەدێی گەراویی کە نزیکەی دوانزە کیلۆمەتر دوورە لە (ناحیة قادر کەرەم) لە ساڵی (١٩٠٧)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە. لەکاتی خوێندنو فەقێیەتی لەسەرەتاوە زۆربەی ژیانی لە کەرکوك بووە. بەتایبەتی لەکاتی پلەی (مستعد) یی و (اخر مادە)دا ماوەیەکی چەند ساڵیی دانیشت لە حوجرەی فەقێکانی مزگەوتی دڵی باش کە لەناو زێویەی ژوورو، کە لەکۆندا ناو ئەبرا بە مزگەوتی مەلا ئەمینە گردە خوالێخۆشبوو دەرسەکانی دەخوێند لەلای باوکم لەپاش ئەوەی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت لەخزمەتی لەساڵی (١٩٤٠)دا، لەناو حەرەمی خانەقای عومەر گونبەدی.
لەبەرانبەری کۆمەڵێك لە مەلاکانی ناوشار کە کۆبوونەوە بۆ ئەم مەبەستە بەبێ شایی و زەماوەند ئەوجا دامەزرا بە (ئیمامو خەتیب) لەمزگەوتەکەی ناو خانەقای سەید ئەحمەد لە کەرکوك. خوالێخۆشبوو هەردەم تێ دەکۆشا بۆ دەرس گوتنەوەو ڕێنیشان دانی ئایینی بەهەموو توانای خۆی لەو مزگەوتەی خۆیدا بەڵام داخی گرانم تەمەنی بەدەمییەوە نەمابوو لە (٢٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٨)ی زایینیدا. لەکاتی بانگی نوێژی عەسردا لە کەرکوك لەگەرەکی شۆریجە لەجنگلاوە چووە ڕەحمەتی خواو (إنا لله وإنا اليه راجعون).

**٤. مەلا سەید قادری قرشاغلویی:**
ناوی تەواوی ئەم خوالێخۆش بووەمان: مەلا سەید عەبدولقادری کوڕی سەید مەحمود لەعەشیرەتی دزەییەو لەدێی قوشتەپەی سەر بەپارێزگای هەولێر هاتووەتە دنیاوە. خوێندوویە هەروەکو هەموو فەقێکانی دیکە: کە ڕۆیشتوونە بە وواڵتو مەدرەسەکاندا بۆ بەهرە وەرگرتن لەبەهرەمەندەکان. تا لەئەنجامدا لەکەرکوك پلەی (اخر مادە)ی لەلای باوکم خوێندوە لەخزمەتی ئەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت. لە ساڵی (١٩٤٠)دا لەناو حەرەمی خانەقای مەلا عومەری عومەر گونبەدی، لەناو کۆمەڵێك لە مەلاکان ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی بەبێ شایی و زەماوەند.
خوالێخۆش بوو دامەزرا لە سوپا بە ئیمام فەوج، مایەوە لەم کارەیدا تا خۆی خانەنشین کرد.
لەدوایدا ماڵو منالەکانی بردەوە هەولێر لەوێ نیشتەجێ بوون. هەردەم خوالێخۆش بوو: تێدەکۆشا بۆ خزمەتی دین تا لە هەولێر کۆچی دوایی کرد (إنا لله وإنا إليه راجعون).

**٥. مەلا حەسەن کوڕی دەروێش عەلی قلانچغانی:**
ئەم مامۆستایە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت لەخزمەتی باوکم لە ساڵی (١٩٤٠) دا. ئیجازە نامەکەی خوێندرایەوە لە ڕۆژی (جومعە)دا لەحەوشەی خانەقای مەلا عومەری عومەر گونبەدی بەڵام لەئەمەندە زیاتر هیچ لەباسو خواسی نازانم هەتا بۆتانی باس بکەم.

**٦. مەلا محەمەد کوڕی مەلا عەبدوڵلای چەمکی:**
ئەم مامۆستا بەرێزە (مستعد) بوو لە خانەقای عومەر گونبەدی مایەوە لێرەدا تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت لەلای باوکم.
لە ساڵی (١٩٤١)دا. ئاهەنگی ئیجازەکەی لەحەوشەی ئەم خانەقایەدا کرا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، لە ڕۆژی (جومعە)دا لەپاش نیوەڕۆ حەوشەی خانەقا هەمووی پڕ تەختو قەنەفە کرا. هەموو داوەت کراوەکان لەگەڵ هەموو مەلاو فەقێکاندا بۆ نوێژی عەسر لێرانەدا ئامادە بوون ئەوجا لەدوای نوێژ لەناو ئەم جەماوەرە کە هەمووی چاوەڕوانی ئەم کاتەیان دەکرد. دوای خوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە (قورئان)ی پیرۆز چەند وتارێك بەم بۆنەیەوە ئەوکاتە باوکم ئیجازەنامەکەی خوێندەوە بەدەنگێکی بەرزو پڕ سۆزو حەماسەوە لەدوای تەواو بوونی ئەم ئاهەنگە بەچەند ڕۆژێك ئەم مامۆستا بەرێزە ڕۆیشتەوە بۆ ووڵاتی خۆی لەوە بەدواوە هیچ هەواڵی نازانم. داواکارین لە خوای گەورە (موفق) بووبێ لەژیاندا.

**٧. مەلا محەمەدی مامیلی عومەر گونبەدی:**
ناوی تەواوی ئەم مامۆستا بەرێزەمان: حاجی مەلا محەمەدی کوڕی دەروێش عومەری کوڕی مەولودی کوڕی عومەری کوڕی مامیلی کوڕی حاجی بنچینەی دەربەندییەو لەبەرەبابی مامیلە. لەدێی عومەر گونبەدی سەر بە کۆیسنجاق لە ساڵی (١٩٠٧)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە. لەپلەی (قوتابییەتی) لە ساڵی (١٩١٢)دا قورئانی پیرۆزی لەخزمەتی مامۆستا بەناوبانگ مەلا (عەبدولرەحمان)ی ئەحمەد خەدیجە خوێندووە. خوێندنی پلەی (مستعد)یی و (اخر مادە)ی لەکەرکوك کردووە لەلای باوکم، لە حوجرەی فەقێکانی خانەقای عومەر گونبەدی دانیشتووە. ئەوجا لەم کاتانەیدا گەلێك لەفەقێکانی ناو شار دەهاتنە خزمەتی: دەرسیان ئەخوێند لەلای بۆ پیتو بەرەکەت وەرگرتن لەخزمەتی مامۆستای بەرێز ئاهەنگی ئیجازەی مەلایەتییەکەی بەسترا لەناو حەوشەی مزگەوتی (ئیمام قاسم) بۆ ماوەی سێ ڕۆژ

هەردەم جۆراو جۆرەکانی شاییەکان بەردەوام بوو. لە ڕۆژی هەینی، لەکاتی پاش نوێژی عەسردا لەناو حەوشەی ئەم مزگەوتەدا باوکم ئیجازە نامەکەی خوێندەوە: بەدەنگێکی بەرز ئاوازێکی کۆك و پڕ سۆزو حەماسەوە ئەمەش لە ساڵی (١٩٤٤) دا بوو ئەوجا ئەم ئاهەنگە کە بەسترا هەر وەك ئەو ئاهەنگە بەسترا کە باسمان کردووە. لەناو باسی ئیجازەی مامۆستا مەلا (عەبدوڵڵا)ی بەردەسپیی و مامۆستا مەلا (سالح)ی دەرماناوی گەورەدا لەدوای تەواو بوونی ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنەکەی خزمەکانی عومەر گونبەدی مامۆستایان بردەوە دێی عومەر گونبەدی هەموو پێویستییەکیان بۆ جێبەجێکرد، بۆ ماوەی ئەوەندە ساڵەی وەك لەوێ بوو. هەردەم بەردەوام بوو لەسەر دەرس وتنەوەو ئیمامەت و ئیرشادی ئایینی تا لەئەوێ ڕۆیشت هەردەم مەدرەسەکەی پڕ بوو لە فەقێ. لەبەهاری ساڵی ١٩٩١ لە شاری هەولێر ئەمری خوای بەجێگەیاند.

٨. مەلا عەلی محەمەد ئەمینی عومەر گونبەدی:

ناوی تەواوی مامۆستای بەرێزمان مەلا عەلییەو کوڕی محەمەد ئەمینی کوڕی عەلی کوڕی عومەری کوڕی مامیلەو بنچینەو عەشیرەتی دەربەندییەو لەبەرەبابی مامیلە.

لەدێی عومەر گونبەدی سەر بەشاری کۆیە لە ساڵی (١٩١٨)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە، لە ساڵی (١٩٢٥) ی زایینی دا قورئانی پیرۆزی هەر لەئەم دێیە خوێندووە لەگەڵ چەند وردە کتێبێکدا. خوێندنی پلەی (سوختەیی) هەر لەم دێیە کردووە. خوێندنی پلەی (مستعد)یی و (اخر مادە)ی لەکەرکوك، لە خانەقای عومەر گونبەدی لەلای باوکم وەگرتووە، ئیجازەی مەلایەتی لەلای وەرگرت. ئەوجا پاش ماوەیەکی سێ ڕۆژی کە تەرخان کرا بۆ ئاهەنگ گێڕان و شایی فەقێیانەو شایی هەرپێداو پێدو شایی ئایشۆکێو شایی سێ پێیی بەم هۆیەوە. ئەمجا لە ڕۆژی هەینیی لەکاتی پاش نوێژی عەسر. باوکم ئیجازە نامەکەی خوێندەوە لەناو حەوشەی مزگەوتی ئیمام قاسم. پاش ڕێکخستن و پڕکردنی بەقەنەفەو پێویستییەکان بەئامادەبوونی هەموو مامۆستاو فەقێکان و پیاو ماقووڵان و داوەتکراوان لەگەڵ دانیشتووانی ئەم گەڕەکەدا ئەمەش لەساڵی (١٩٤٨)دا بوو. دوای کۆتایی هاتنی ئاهەنگی ئیجازەکە شێخانی دێی دوبز مامۆستایان برد بۆ دێیەکەی خۆیان. هەموو کارو خزمەت و پێویستەکانیان خستە سەرشانی خۆیان. ئەوجا مامۆستا حاجی مەلا عەلی بەبێوچان لەدێی دوبز تێدەکۆشاو هەڵدەستا بەهەموو ئەرکەکانی دینی سەرشانی، بەهەموو توانایەوە هەموو کات مەدرەسەکەی پڕ بوو لەفەقێ. تا لە ساڵی (١٩٦٠)ی زایینی دا دامەزرا بەمامۆستا بۆ (العربیة والدین) لە قوتابخانەکانی (وزارة التربیة والتعلیم) بەپێی (تخرج) کردنی لە (الدورة التربویة لرجال الدین) مامۆستا مایەوە لەمەدرەسەکانی دێهاتەکانی دەورو پشتی دوبز بۆ ماوەی چەند ساڵێك. هەر وەك مایەوە لەمەدرەسەکانی ناو دوبز بۆ ماوەی چەند ساڵێك تا لە ساڵی (١٩٨١)ی زایینی دا خۆی خانە نشین کرد. مامۆستای بەڕێز: لەکۆڕەوی کە کورد کردی بۆ ئێران لەبەهاری ساڵی (١٩٩١) لە حاجی ئۆمەران ئەمری خوای بەجێ گەیاند. گۆڕەکەی لە شاری مەهابادی ئێرانە. هەزار ڕەحمەت لەخۆیی و سیفاتی ئەو خواپەرستە بێ.

٩. مەلا عەبدوڵڵای مەلا قادری سێگردکانی:

ناوی تەواوی ئەم مامۆستا بەرێزەمان مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مامۆستا مەلا قادری کوڕی مەولود لەدێی عەلەغێر، کە دەکەوێتە گەرمیانی ناوچەی کەرکوك، لەدێیەکانی سەید ئەحمەدی خانەقایە. لە ساڵی (١٩٢٨)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە. زۆربەی خوێندنی لە پلەکانی خوێندن لە خزمەتی باوکی خوێندووە. هەر وەك لە کەرکوك لە خانەقای عومەر گونبەدی لەپلەی (اخر مادە)دا لەلای باوکم دەیخوێند. لەگەڵ مامۆستا مەلا سەید حوسێنی کوڕی سەید محەمەد ئەمین هەردووکیان بەیەك ئاهەنگ لە مزگەوتی: ئیمام قاسم لە ساڵی (١٩٤٨)دا ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرت لەلای باوکم. ئینجا بەم هۆیەوە بۆ ماوەی چوار ڕۆژ شایی فەقێیانەو شایی هەرپێداو پێداو شایی ئایشۆکێ و شای سێ پێیی بەردەوام بوو لە ئیمام قاسم و لە خانەقای عومەر گونبەدی هەموو مەلاو فەقێی دێهات و ناوشار بەپێی داوەتکردنیان بەشدارییان تێدا دەکرد هەردەم ئەم ئاهەنگە یەکجار زۆر بایەخی پێ درابوو: بۆ ماوەی هەر چوار ڕۆژەکەی هەر سێ ژەمەکانی نان خواردنی میوانەکان لەخانەقای خۆمان ئەبوو. هەموو مەسرەف لەکیسەی دانیشتووانی گەڕەکی ئیمام قاسم و ئاخور حوسێن ئەکرا. بەشێوەی یارمەتی و (تبرع) ئەوجا لە ڕۆژی هەینی: پاش نوێژی عەسر لەکاتێکدا کە مزگەوتی ئیمام قاسم ئارایش درابوو، هەموو حەوشەی ئەم مزگەوتە پڕ تەخت و قەنەفە کرابوو. بەئامادەبوونی هەموو مەلاو فەقێ و لێپرسراوانی میریی و پیاو ماقووڵانی شارەکەو داوەتکراوەکان و دانیشتووانی ئەم گەڕەکە.

لەدوای خوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزو پێشکەش کردنی چەند وتارێك لەبارەی زانست و زانایانی ئایینەوە ئەوکاتە باوکم ئیجازە نامەکەی هەردووکیانی خوێندەوە لەناو ئەم جەماوەرەدا بەدەنگێکی بەرزو بەسۆزو حەماسەوە.

خوالێخۆش بوو سەید ئەحمەدی خانەقا خەڵاتی مامۆستا مەلا (عەبدوڵڵا)ی کرد. بە جبەو مێزەرێك بۆ کاتی ئاهەنگی ئیجازە خوێندنەوەکەی.

دوای تەواوبوونی ئەم ئاهەنگە دانیشتووانی دێی عەمشە کە لەناوچەی ساڵەیی و سەر بەئاڵتوون کۆپرییە زۆر بەشانازییەوە مامۆستای بەرێزیان بردەوە بۆ ئەم دێیەی خۆیان. کردیان بەمەلای ئاواییەکەیان لەهەمان کاتدا ژن و ماڵ مەدرەسەو هەموو پێویستی بۆ جێبەجێکرا لەلایەن دانیشتوانی ئەم دێیەوە ئەویش دانیشت و تێدەکۆشا بۆ خزمەتی دینەکەی و دەرسی فەقێکان و ڕێنومایی گەلەکەی. مەدرەسەکەی هەردەم پڕ خۆشیی و کامەرانیی بوو ئومێد بوو بۆ هەموو خوێنکارانی ئایینی تا ساڵی (١٩٥٩)ی زایینی ئەو کاتە بەداخەوە باری وڵاتەکەمان سەرەو لێژ بوو: ژیانی تێدا تاڵ بوو ئەوجا ئەم مامۆستا بەرێزە بەناچاریی پەیوەندی

کرد بە (الدورة التربوية لرجال الدين).
لە ساڵی (١٩٦٠)دا لەگەڵ هەموو دەرچووەکانی دەورەکە دامەزرا بە مامۆستای زمانی عەرەبی و ئایینی لەوەزارەتی پەروەردەو فێرکردن.

**١٠. مەلا سەید حوسێنی سەید محەمەد ئەمینی قوڵتەپەیی:**
ناوی ئەم مامۆستایەمان مەلا سەید حوسێنەو کوڕی سەید محەمەد ئەمینی کوڕی سەید عومەری کوڕی سەید میکائیلی کوڕی سەید جوبرائیلەو لەدێی قوڵتەپەی ڕەشیدی حەوێز لەناوچەی دزەیی سەر بەپارێزگای هەولێر هاتووەتە دنیاوە، لەبنەماڵەکانی ساداتی بەرزنجەییە. مامۆستای ناوبراو پلەی (اخر مادە)ی لەلای باوکم خوێند لەکەرکوك لەحوجرەی فەقێکانی خانەقای عومەر گونبەدی هەروەك باسم کردووە لەناو باسەکەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای سێگردکانی دا کە وتوومە: ئەم دوو مامۆستایە هەردووکیان پێکەوە ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرت لەلای باوکم لەمزگەوتی (ئیمام قاسم) لە ساڵی (١٣٦٨)ی کۆچی داو ئاهەنگی ئیجازەکەیان لەوێ دا بەسترا: لە ڕۆژی هەینی پاش نوێژی عەسر لەناو حەوشەی (ئیمام قاسم) خوالێخۆش بوو (سەعید قەزاز) کە لەو کاتانەدا موتەسەریفی کەرکوك بوو جبەو مێزەرێکی کرد بەخەڵات بۆ ئەم مامۆستا بەرێزە تا لەکاتی خوێندنەوەی ئیجازەنامەکەدا بکرێتە بەری.
ئەو کاتە شێخانی عەشیرەتی ساڵەیی بەبرا گەورەیی خوالێخۆش بوو شێخ تاهیر قەرەدەرەیی لەگەڵ هەموو پیاو ماقووڵانی دێی قەرەدەرەدا مامۆستایان بە هەموو قەدرو ڕێزێکەوە بردەوە بۆ دێیەکەی خۆیان وەکو لە پێشدا هەر لەوێ مەلا بوو.
ئەوجا دانیشتووانی ئەم دێیە هەردەم مەدرەسەیان بۆی رادەگرتو ڕۆژ بەڕۆژ خوێندنخانەکەی گەشەی پتردەبوو لەناوچەکەدا فەقێکان ئاواتیان بوو بخوێنن لەمەدرەسەو لەخزمەتی بەڵام دوای ئەوەی باری زەمانە وای کرد: کە ئەو دێهاتانە کەڵکی ژیانیان نەما هەموو دانیشتووانی ناوچەکە بڵاوەیان لێ کردو نەمان لەو دێهاتانە ئەوجا مامۆستای بەرێزیان بردە دوبزو کردیان بەئیمامو خەتیبو مامۆستاو واعیز لە مزگەوتی کە دروستکراوە لەوێ لەسەر ئەرکی (مصلحة الكهرباء الوطنية). مامۆستا لەسەر ئەرکە ئایینییەکانی هەر بەردەوام بوو. ڕۆژ بەڕۆژ هەر گەش تر دەبوو بەڵام داخەکەی گرانم تەمەن بەدەمییەوە نەمابوو. لە ناحیەی دوبز ماڵ ئاوایی کرد لە هەموو ماڵو منداڵو خزمو دۆستو کەس.

**١١. حاجی مەلا ئیبراهیمی گردلانکەیی:**
ناوی تەواوی ئەم مامۆستا بەرێزەمان حاجی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی کوێخا فەتاحی کوڕی عەبدولرەحمانی کوڕی عوسمانەو لەعەشیرەتی گەردییەو لەدێی شێخان لەناوچەی دزەیی کە سەر بە پارێزگای هەولێرە.
لە ساڵی (١٩٢٣)ی زایینی هاتووەتە دنیاوە. مامۆستای بەرێز: لەکاتی خوێندنی لەپلەی (سوختەیی)دا لەکەرکوك دەیخوێند لە خانەقای عومەر گونبەدی پاش ماوەیەك ئەوجا چووە ناو مەدرەسەکانی مامۆستا بەنرخەکانی وڵاتەکەمان بۆ خوێندنی پلەی (مقدمات). پاش ماوەیەك گەڕایەوە بۆ خوێندن لەلای باوکم لەکەرکوك ئەو کاتە دانیشت لە حوجرەی فەقێکانی مزگەوتی مەلا ئەحمەد کوردە لەزێویەی ژووروو لەگەڕەکی ئیمام قاسمو دەرسەکانی ئەخوێند لەخانەقای عومەر گونبەدی لەلای باوکم تا لە ساڵی (١٩٤٩)دا. ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت لەلای باوکم.

*** ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنی:**
لەبارەی ئاهەنگی ئیجازەی ئەم مامۆستا بەرێزە هەر مەپرسە کە چیی کراوەو؟! چ بەزمێك بووە!
هەر چەند بەشێوەیەکی تایبەتی بایەخ درابوو بە ئاهەنگەکانی ئیجازەی مەلایەتی بۆ (مجاز)ەکانی باوکم لە هەموو کاتێکدا بەڵام وەك بایەخ بە ئاهەنگی ئەم ئیجازەیە هەر نەبووەو نەکراوە.
بە نموونە بۆ ئەم مەبەستە، ئەم پارچە هەڵپەرکێیەتان بۆ باس ئەکەم: ئەوجا بۆتان دەردەکەوێ. کە لەو کاتەدا چەند بایەخ دراوە بە ئیجازەی ئەم مامۆستا بەرێزە.
ئەی ڕۆڵەکانی ئەم گەلە لەکاتی بەستانی ئەم ئاهەنگەدا لەکاتەکانی هەر سێ ژەمەکانی نان خواردن. نان دەخورا لە خانەقای عومەر گونبەدی. ئەوجا لەژەمێکدا کە ژەمی ئێوارە بوو دوای نان خواردن هەموو مامۆستاکانو فەقێکانو داوەت کراوەکان دەسیان گرتو: دەستیان کرد بەشاییو هەڵپەرکێ لەناو حەوشەی خانەقای عومەر گونبەدی دا ئەوجا سەرچۆپی کێش وردە وردە دەچوو بەلای قاپی حەوشەوەو هەڵپەرکێ کەش هەروا وورده وورده بەدوایدا دەچوو بەلای قاپی حەوشەوە تا هەموو چوونە دەرەوەی مزگەوت. هەر بەم جۆرە سەرچۆپیی کێش هەڵپەرکێکەی دەکرد بەکێش تا گەیشتە تەختایی ئاشی شابەندەر لەوێش هەڵپەرکێکە هەر نەوەستایەوە بەڵکو سەرچۆپیی کێش شاییەکەی دەکرد بەکێش بۆ گۆڕەپانی چایخانەی عاشوور. تا هەڵپەرکێ گەیشت بەئەوێ بەڵام لەئەوێش شایکەرەکان هەر نەوەستاوەو دەستیان هەر بەرنەدا.
هەر وا وردە وردە سەرچۆپیی کێش هەڵپەرکێکەی دەکرد بەکێش. هەتا شاییەکەی کردە ناو مزگەوتی (ئیمام قاسم)ەوە. لەگەڵ ئەمەشدا کە لای دوایی ئەم شاییە هێشتا هەر لە گۆڕەپانی عاشوور بوو سەرچۆپیی کێشو شایی کەرەکان هەر بەردەوام بوون. شاییەکەش لە خۆشییەکەیدا بوو جا لەو کاتەدا کە پێشەکی شایی گەیشتە ناو حەوشەی (ئیمام قاسم) بانگ دەر بانگی عیشای دا. شاییکەرەکان ئەو کاتە بەناچاری دەستیان بەردا.
تا ئێستاکەش دانیشتووانی گەرەکی (ئیمام قاسم) هەر باسی ئەم شاییە دەگێڕنەوە بەشانازییەوەو هەناسەی حەسرەت دەکێشن بۆ ئەو ڕۆژانەی کە دیتوویانە بەچاوی خۆیان بۆ هاندانی پیاوانی ئایینی.
ئەم جۆرە شتانە کە کراون. هەمووی هەر لەخۆشی ئەوەبوو

کە مامۆستایەك ئیجازەی مەلایەتی وەرگردتووەو هاتووەتە ڕێزو کۆڵەگەیەکی دیکەش بۆ ئایینی ئیسلام دروست بووە.
ئەوجا ئەم مامۆستا بەڕێزە: لەدوای خوێندنەوەی ئیجازە نامەکەی کە باوکم خوێندییەوە لەحەوشی مزگەوتی ئیمام قاسم: پاش نوێژی (عەسر) لە ڕۆژی هەینی لەناو ئاهەنگەکەداو لەدوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە هەندێك لە ئاغاکانی دەشتی دزەیی لەگەڵ دانیشتووانی گوندی گردلانکەدا مامۆستای بەڕێزیان بردەوە گردلانکەو مەدرەسەیان بۆ ڕاگرت ئەویش بەهەموو توانای خۆی هەموو کاتی خۆی تەرخان کردبوو بۆ (تەدریس و ئیمامە)و هەموو ئەرکە ئایینییەکانی سەرشانی ئەوەندە ساڵە کە چارەنووسی لەئەوێ بوو ئەمجا شێخانی وولاتی ساڵەیی: لەناوچەی ئاڵتوون کۆپری: شێخ ئەحمەدو شێخ عەبدولقادری مامۆستایان برد بۆ گوندەکەی خۆیان، کە سەربیرە لەوێدا دامەزرا بە (واعظ)ی ئایینی بۆ هەموو ئەو ناوچەیە تا لە ساڵی (١٩٨٢)ی زایینی ئەوجا لەسەر داواکردنی خۆی خانەنشین کرا.

**١٢. مەلا حەسەنی مەنگوریی:**

ئەوەی بزانم لەبارەی ئەم مامۆستا بەڕێزەوە هەر ئەمەندەیە وەك باسی دەکەم.
ناوی مەلا حەسەنەو کوڕی خدرەو لەعەشیرەتی مەنگورەو خەلکی گوندی شرویتە ئەم مامۆستایە فەقێ بوو لە (مزگەوتی ئیمام قاسم) دەرسەکانی پلەی (اخر مادە)ی لەلای باوکم دەخوێند، لەساڵی (١٩٥٠)دا. ئیجازەی مەلایەتی لەخزمەتی وەرگرت، ئاهەنگی خوێندنەوەی ئیجازەنامەکەی لەحەوشی (مزگەوتی ئیمام قاسم) کرا. ئەوجا ئەم بەڕێزە ڕۆیشتەوە بۆ وولاتی خۆیان لەم ڕۆژە بەدواوە هیچ باس و سۆراخێکی نازانم.

**١٣. مەلا حەبیبی دوبزی:**

ناوی تەواوی ئەم مامۆستا بەڕێزەمان مەلا حەبیبی کوڕی محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەمەیەو لەعەشیرەتی ساڵەییەو لەدێی دوبزی سەر بە ئاڵتوون کۆپری لەپارێزگای کەرکوك. لە ساڵی (١٩٢٤)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە خوێندنی پلەی قوتابییەتی لەدێی دوبز تەواو کردووە. ئەمجا بۆ خوێندنی پلەی سوختەیی و (مقدمات) چووەتە ناو مەدرەسەکان بەفەقێیەتی گەڕاوەو. دەرسی خوێندووەو بەهرەی وەرگرتووە لەخاوەن بەهرەکان. لەکاتی پلەی (مستعد)یی لەکەرکوك بوو بەفەقێی مزگەوتی ئیمام قاسم. هەر لەوێ بوو هەتا پلەی (اخر مادە)شی تەواو کرد لەلای باوکم. ئەوجا ئیجازەی مەلایەتی لەخزمەتی وەرگرت پاش ئاهەنگێکی سێ ڕۆژو سێ شەویی و جۆراو جۆری شاییەکان. ئەوجا باوکم ئیجازە نامەکەی خوێندەوە لەناو حەوشەی ئیمام قاسم.
لە ساڵی (١٩٥١)دا. لە ڕۆژی هەینی پاش نوێژی عەسر لەکاتێکدا کە حەوشی مزگەوت هەمووی ڕازابووەوە، پڕ تەخت و قەنەفە کرابوو بەم هۆیەوە، هەموو مەلاو فەقێ و لێپرسراوانی میریی و داوەتکراوان و دانیشتووانی گەڕەکی ئیمام قاسم و ئاخوڕ حوسێن هەموو چاوەڕوانی خوێندنەوەی ئیجازەنامەکەیان بوو جا لەو کاتەدا باوکم بۆیانی خوێندەوە بەدەنگێکی بەرزو زۆر پڕ سۆزو حەماسەوە.
ئەوجا دانیشتووانی دێی مەرعی کە سەر بەناوچەی (دوبز)ە لەناوچەی گەرمیانی کەرکوك. بەئەو پەڕی خۆشی و سەربەرزییەوە مامۆستای بەڕێزیان برد بۆ مەلایەتی دێیەکەی خۆیان هەموو ئەرکەکانی ئایینی یان دابەدەسییەوەو فەقێیان بۆ ڕاگرت هەموو دەم خەریك بوو بە وانە وتنەوەو وەعزو ئامۆژگاری دانیشتووانی .ئەم دێیەو ناوچەکەی بەتوانای خۆی تا ئەو کاتەی: کە باری ژیان لەناوچەکەدا ئاڵۆزو تاڵ بوو. ئەوجا دانیشتووانی ئەم دێیەش وەك دانیشتووانی دێیەکانی دیکەی ئەم ناوچەیە هەموو بڵاوەیان لێکرد بۆ شارەکان و دێیە دوورەکان وەك کارگەیشت بەم ڕادەیە مامۆستای بەڕێز ناچاربوو پەیوەندی کرد بە (الدورة التربویة لرجال الدین) لە ساڵی (١٩٥٩)ی زایینی دا، دامەزرا لەوزارەتی پەروەردە وەك هەموو هاوڕێکانی لە ساڵی (١٩٦٠)دا لە قوتابخانەکانی سەرەتاییەکان بە مامۆستای زمانی عەرەبی و ئاینی.
مامۆستا سوپاس بۆ خوا هەر بەردەوامە لەسەر ئەو ئەرکە ئایینییانەی وەك هەردەم بەئەرکی سەر ئەستۆی خۆی دانابوو. ئێستا کە هەروا لەناحیەی (دوبز) دانیشتووەو هەر لەسەرڕێبرو باوەڕی خۆیەتی و چرایەکی گەشەو ڕێ ڕوون کەرەوەیەکی زۆر بەورەیە خوا بەردەوامی کات لەگەڵ هەموو پیاوباشانی ئەم گەلەی خۆمان.
ئەم مامۆستایە هەر بەم جۆرە مایەوە لە کارەکەیدا هەتا لە (٢)ی ئابی ساڵی (١٩٨٦)دا خۆی خانەنشین کرد.

**١٤. مەلا محەمەدی دەرماناوی گەورە:**

ناوی تەواوای ئەم مامۆستا خوالێخۆشبووەمان: مەلا محەمەدی کوڕی محەمەد ئەمینی کوڕی ئەحمەدە. کە ناسراوە بەئەحمەد قلێنج. لەعەشیرەتی لەکەو لەدێی دەرماناوی گەورە لە ناوچەی پردێ لە پارێزگای کەرکوك.
لە ساڵی (١٩٢٨)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە. مامۆستای خوالێخۆش بوو، لەگەڵ مامۆستا مەلا محەمەد عەلی کوڕی عومەر کە لەدانیشتووانی دێی مەرزیخەی ژوورو، لە عەشیرەتی شێخ بزێنی لەناحیەی شوان هەردووکیان پێکەوە پلەی (مستعد)یی و (اخر مادە)یان خوێند لە مزگەوتی ئیمام قاسم لەلای باوکم. لە ساڵی (١٩٥٣)دا. هەردووکیان بەیەك ئاهەنگ ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرت لەلای باوکم.
ئەوجا بۆ ئەم مەبەستە شایی فەقێیانەو شایی هەرپێداو پێداو. شایی ئایشۆکی و شایی سێ پێیی هەر بەردەوام بوو بۆ ماوەی سێ ڕۆژو سێ شەو هەموو مەلاو فەقێکانی ناو شارو دێهاتەکان داوەت کران و بەشدار بوون تێدا هەر وەك هەموو کەرەتێك نان خواردنی میوانەکان لە خانەقای عومەر گونبەدی دەبوو. ئەوجا بۆ ڕۆژی هەینی، کاتی پاش نوێژی عەسر ناو حەوشەی ئیمام قاسم ڕازایەوەو پڕ تەخت و قەنەفە کرا. هەموو مەلاو فەقێ و داوەتکراوانی ناو شارو لێپرسراوانی میریی و دانیشتووانی گەڕەکی ئیمام قاسم و

ئاخور حوسێن ئامادەی ئاهەنگەکە بوون. مزگەوت و سەربان و سەربانەکانی دەوروپشتی هەموو هەر پڕ بوون لەسەیرکەران بۆ سەیرکردنی ئەم ئاهەنگە پیرۆزە. دوای خوێندنەوەی چەند ئایەتێك لەقورئانی پیرۆزو پێشکەش کردنی چەند وتارێك لەبارەی دین و عیلم و عولەماوە ئەو کاتە باوکم دەستی کرد بەخوێندنەوەی ئیجازەنامەکەی هەردووکیان بۆ ئەو هەموو بەڕێزانەی وەك ماوەیەك بوو چاوەڕوانی بوون. بەڵام چۆن خوێندنەوەیەك؟! بەدەنگێکی بەرزو پڕ سۆزو زۆر بەحەماسەوە. ئەی برای ئازیزم بەخوێندنەوەی ئیجازەنامەکە: ئاهەنگەکەو هەموو کاروبارەکانی کۆتایی هات. دوای ئەمە مامۆستا دانیشت بۆ دەرس وتنەوەو ئیمامەت و ئەرکە ئاینییەکان لەدێی چەخماغە کە یەکێکە لە (دێیەکانی) گەرمیانی خوار شاری کەرکوك. بۆ ماوەیەك ئەوجا چووە دێی کارێزەی ناو شوان. لەوێ بەردەوام بوو لەسەر ئەو ئەرکە ئاینییانەی خستبوویە سەر ئەستۆی خۆی تا باری چەرخی زەمانە وای لێهات ژیان لەو ناوچەیەدا تاڵ بوو ئەوکاتە مامۆستا ناچار ما دامەزرا بەمامۆستای عەرەبی و ئاینی لە (وزارەتی پەروەردە) لە ساڵی (١٩٦٠)ی زایینی دا لەگەڵ هەموو هاوڕێکانی لە (الدورة التربوية لرجال الدين) هەر لەو ساڵەدا.

ئەم ئازدارە پیرۆزە بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئەم دینەو گەلەکەی و نیشتمانەکەی تا لە (١١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٣)ی زایینی دا لە شاری کەرکوکی خۆشەویست کۆچی دوایی و ماڵ ئاوایی تەواوی کرد. لە هەموو ماڵ و منداڵ و خزم و دۆست و جیران و نیشتەجێ بوو لەناو بەهەشتی خوای گەورەدا.

### ١٥. مەلا سەید عەبدولڕەحمانی قزقلعەیی:

ناوی تەواوی ئەم مامۆستا بەڕێزەمان مەلا (سەید عەبدولڕەحمان)ی کوڕی (سەید محێدین)ەو خەڵکی دێی قزقلعەی سەر بە شاری (سا بلاغ)ە. ئەم بەڕێزە فەقێ بوو لای باوکم لەکەرکوك لەمزگەوتی ئیمام قاسم. لێرەدا پلەی (اخر مادە)ی لەلای دەخوێند، ئیجازەی مەلایەتی لە ساڵی (١٩٥٥) دا لەخزمەتی وەرگرت.

ئاهەنگێکی سێ ڕۆژی بۆ گێڕدرا لە مزگەوتی (ئیمام قاسم)، هەموو جۆرە شایی و هەڵپەڕکێیەکی تێدا کرا بەشێوەی هەموو ئاهەنگی ئیجازەکانی دیکەی پێش ئەم. ئەوجا دوای تەواوبوونی ئاهەنگ و وەرگرتنی ئیجازەنامەکە ئەو کاتە ئەم مامۆستا بەڕێزە ڕۆیشتەوە بۆ وڵاتی خۆیان لەئەمەندە زیاتر هیچ سەرو سۆراخی نازانم.

### ١٦. مەلا شێخ تەهای حەساری گەورە:

ناوی تەواوی ئەم مامۆستا بەڕێزەمان: مەلا شێخ تەهای کوڕی شێخ قاسمی کوڕی خەلیفە ئەحمەدە. لەدێی حەساری گەورە لەناوچەی بیبانی گەورە لەپارێزگای کەرکوك لە ساڵی (١٩٣١)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە.

قورئانی پیرۆزی لە خزمەتی براکانی خوێندووە لەدێیەکەی خۆیان، دەرسەکانی پلەی: (سوختەیی) و (مقدمات) و (مستعد)یی خوێندووە لەدێی تۆپزاوەی خوار شاری کەرکوك لەخزمەت مامۆستا مەلا عەبدولمەجیدی گەڕاویی، لەدێی تلیان لەخزمەت خوالێخۆش بوو: مامۆستا مەلا (سەید ئیسماعیل) لەکەرکوك لەمزگەوتی ئیمام قاسم.

هەر وەك گەڕاوە بەناو خوێندنخانەکاندا و بەهرەی وەرگرتووە لەمامۆستا بەهرەدارەکانی چوارچێوەی وڵاتەکەمان. هەتا لەخوێندن گەیشت بەپلەی (اخر مادە). ئەوجا هاتەوە مزگەوتی (ئیمام قاسم) بۆ خوێندن تا وەکو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مامۆستا مەلا شەریفی قوڵتەپەی ڕەشیدی حەوێز هەردووکیان پێکەوە لەلای باوکم بەیەك ئاهەنگ.

لە ساڵی (١٩٥٦)دا. بەو هەموو شێوەو بەزم و ڕەزمەو شاییەوە کە باسم کردووە لەناو باسەکەی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا شەریف دا.

ئەوجا مامۆستا لەم ڕۆژەوە قۆڵ و باسکی لێ هەڵ کردووەو هەردەم تێدەکوشێ و هەڵ دەستێ بەو ئەرکە ئاینییانەی سەرشانی بەبێ دریغی کردن. لە ساڵی (١٩٦٥)ی زایینی دا لەئەوقافی کەرکوك دامەزرا بەئیمام و خەتیب.

ئەم بەڕێزە سوپاس بۆ یەزدان پایەی کۆمەڵایەتی گەلێك بەرزە لەناو گەلەکەماندا. جگە لەپایە بەرزیی باری ئاینی و زانستی و (تصوف)دا.

ئەوجا مامۆستای بەڕێز مایەوە لەژیانی ئاینیدا. تا لە ساڵی (١٩٨٨) ئەو کاتە خۆی خانەنشین کردوە، ماوەیەکیش ئیمام و خەتیبی مزگەوتی حاجی مستەفا ئال قەیرەداری خستووتە سەر ئەستۆی خۆی.

### ١٧. مەلا عەبدوڵڵای قوڵتەپەیی:

ناوی تەواوی ئەم خوالێخۆشبووە: مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا شەریفی کوڕی فەرەجەو لەعەشیرەتی دزەییەو لە دانیشتووانی گوندی قوڵتەپەی ڕەشیدی حەوێز بوو لەپارێزگای هەولێر. خوالێخۆش بوو: لە شاری کەرکوك: لە مزگەوتی ئیمام قاسم خوێندنی پلەی (مستعد)یی و (اخر مادە)ی لەلای باوکم تەواو کردووە، لەگەڵ مەلا (شێخ تەها) ی کوڕی شێخ قاسمی کوڕی خەلیفە ئەحمەدی حەساری گەورە. هەردووکیان پێکەوە ئیجازەی مەلایەتییان وەرگرت لەلای باوکم بەیەك ئاهەنگ. دوای شایی و زەماوەندێکی زۆر بەبایەخ و گرنگە، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ درێژە درا بەجۆراو جۆرەکانی شاییەکە لە مزگەوتی ئیمام قاسم و خانەقای عومەر گونبەدی بەوێنەو شێوەی ئیجازەی (مجاز)ەکانی دیکەی پێش ئەوان. ئەوجا باوکم ئیجازەنامەکەیانی خوێندەوە لە ساڵی (١٩٥٦)دا لەناو حەوشەی مزگەوتی ئیمام قاسم لە ڕۆژی هەینی لە پاش نوێژی عەسرو لەکاتێکدا کە هەموو حەوشەی مزگەوت ئارایشت و پڕ قەنەفە کرابوو بۆ ئەم مەبەستە. هەموو مەلاو فەقێ و داوەت کراوانی ناوشاری کەرکوك لەگەڵ مەلاو فەقێ و داوەت کراوەکانی دێهاتەکانیش، لەگەڵ دانیشتووانی گەڕەکی ئیمام قاسم و ئاخور حوسێن ئامادەی ئاهەنگەکە بوون. چاوەڕوانی ئەم کاتەیان دەکرد.

ئەوجا خوالێخۆش بوو بۆ یەکەم جار دانیشت بۆ ئیمامو تەدریسو ئیرشادو هەموو خزمەتەکانی ئاینو گەلو نیشتمان لەدێی یەحیاوە کە لە نزیکی شاری کەرکوکە.
پاش ماوەیەك گەڕایەوە دێیەکەی خۆیان کە قولتەپەیە لەوێ هەردەم خەریك بوو بۆ ئەرکە ئاینییەکانی سەرشانی بەهەموو توانایەوە. هەتا لە ساڵی (١٩٨٢)ی زایینی ماڵ ئاوایی یەك جارەکی کرد لە هەموو کەسو دۆستو جیرانو ماڵو منداڵ. چووە ڕەحمەتی خوای گەورەوە.

**١٨. مەلا ئەحمەد - شەریف ئەفەندی:**

ناوی تەواوی ئەم مامۆستا بەڕێزەمان حاجی مەلا ئەحمەدی کوری مەلا شەریفی کوری ئەحمەدی ناسراوە بە مەلا ئەحمەدە کوردەی کوری محەمەدی ناسراوە بەمەلا محەمەدی کوردیی کوری مەلا قادرە.
لە دانیشتوانی کەرکوکەو لە بنەماڵەکانی کۆنی کوردی گەرەکی زێویەی ژوورو کە ناسراوە لە کۆندا بەزێویەی سەروو لەکاتی دەوڵەتی عوسمانلیدا. لەم گەرەکەدا لەنزیك مزگەوتەکەی خۆیان لە ساڵی (١٩١٥)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە. بەپێی (دفتر نفوس)ەکەی بەڵام بەپێی فەرمایشتی خۆی کە فەرمووی تەمەنی لە ئەمەندە زیاترە.
ئەو مزگەوتەی کە ناسراوە بە مزگەوتی: مەلا ئەحمەدە گردە کە لەناو زێویەی ژوورەوە. لەکەلەپووری بنەماڵەکەیان ئەژمێردرێت هەردەم ئەوان سەرپەرشتی ئەم (مەقامە)یان کردووە لەکۆنەوە تاوەکو ئێستاکە مامۆستای بەڕێز لەپلەی (قوتابییەتی)دا (قورئان)ی پیرۆزی لەگەڵ چەند کتێبێك خوێندووە لە مزگەوتەکەی خۆیان لەلای باوکی.
دوای ئەوە ماوەیەکیش بەردەوام بوو لەسەر خوێندن لە مەدرەسەی شا غازی کە لەبان قەڵای کەرکوك بوو لەناو حەوشەی مزگەوتی (ئولو جامع). لە ساڵی (١٩٣٤)ی زایینی بەدواوە بەردەوام بوو لەسەر دەرس خوێندن لەلای باوکم لەخانەقای عومەر گونبەدی هەتا پلەکانی خوێندنی تەواو کرد: گەیشت بەپلەی (اخر مادە). لە ڕۆژی (١٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٦)ی زایینی چوومە خزمەتی بۆ پرسینی تەندروستی. لەکاتی پاش نوێژی عەسردا (ما شاء الله) هەر چەند کە لاوازو زەبوون بێ هێز بوو بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا بیروفکری هەر وەکو پێشدا هیچ نەگۆڕابوو: موی شەق دەکرد. هەموو فەرمایشتەکانی ئیمام غەزالی لەبەر بوو.
ئەم مامۆستا بەڕێزە هەموو تەمەنی خۆی بەخت کرد بوو بۆ خزمەتی ئەم مزگەوتەیانو دینو عیلم ئەوەندە کە توانای هەبوو. هەتا لە ساڵی (١٩٨٤)ی زایینی ئەوجا خۆی خانەنشین کرد لەبەر ئەوەی کەتەندروستییەکەی تەواو نەبووو توانای ئیمامەتی نەمابوو.

*** شێوەی وەرگرتنی ئیجازە نامەکەی:**

مامۆستا پیاوێکە (متصوف)ی دوورە لە هەموو جۆرەکانی (ریا)و خۆ هەڵکێشان. دڵ پاكو زمان شیرینو پڕ عەقڵو کەماڵ. ئەم بەڕێزە کاتێك کە ویستی ئیجازەی مەلایەتی وەربگرێت ئەو کاتە باوکم ئیجازەی داپێی.
هەروەك باوکم ئیجازە نامەکەی خوێندەوە لەناو دەستەیەکی بەڕێز لە مەلاکان بەدانیشتنێکی تایبەتی بەبێ ئەوەی کە بایەخێکی بۆ دنیا پێی بدرێت. ئەمن بە خۆم حازری ئەم دانیشتنە بووم بۆ خوێندنەوەی ئیجازەنامەکەی.
لە ساڵی (١٩٦٧)دا بوو هەر وەك لە ژێر هەیوانی خانەقای عومەر گونبەدی دا بوو. ئەم ئیجازەیە ئاخر ئیجازەیە کە باوکم داویە چونکە لەدوای ئەم مێژووەی سەرەوە زۆری پێ نەچوو باوکم کۆچی دوایی کرد. خوا هەموویان عەفووبکات.

**١٩. مەلا محەمەد عەلی مەرزیخەی ژووروو:**

ناوی تەواوی ئەم مامۆستا بەڕێزەمان (مەلا محەمەد عەلی کوری عومەری کوری عەلی)یەو. لەعەشیرەتی شێخ بزێنیەو لەدێی مەرزیخەی ژووروی ناحیەی شوان لەپارێزگای کەرکوك. لە ساڵی (١٩٢٦)ی زایینی دا هاتووەتە دنیاوە.
قورئانی پیرۆزو هەندێك لەکتێبەکانی پلەی (قوتابییەتی) لەدێیەکەی خۆیان خوێندووە. لەپلەی (سوختەیی) و (مقدمات)دا. گەڕاوە بەناو خوێندنخانەکانی ناوچەی کەرکوكو سوودو پیتو بەرەکەتی لەگەڵێ لەمامۆستا بەنرخەکان وەرگرتووە.
ئەوجا بۆ خوێندنی پلەی (مستعد)یی و (اخر مادە) هاتە مزگەوتی ئیمام قاسم لەگەڵ مەلا (محەمەد)ی دەرماناوی گەورە هەردووکیان پێکەوە دەیان خوێند لەلای باوکم. هەتا پێکەوە ئیجازەی مەلایەتی یان وەرگرت لەخزمەتی لە ساڵی (١٩٥٣)دا.
دوای ئاهەنگو شاییو زەماوەندێکی سێ شەوو سێ ڕۆژیو جۆراو جۆرەکانی هەڵپەرکێکانو ئامادەبوونی هەموو مەلاو فەقێکانی ناوچەی کەرکوك بەشێوەی وەك باسم کردووە. لەناو باسەکەی خوالێخۆش بوو: مەلا محەمەدی دەرماناوی گەورەدا.
ئەوجا بۆ ئاخر ڕۆژ: کە دەکات ڕۆژی هەینی بۆ کاتی پاش نوێژی عەسر هەموو حەوشەی مزگەوتی ئیمام قاسم ئامادەکرا: بەهەموو پێویستەکانی. بەپێی داوەت نامە. هەموو مەلاو فەقێو لێوەشاوەکانو لێپرسراوانی میرییو دانیشتووانی گەڕەکی ئیمام قاسمو ئاخور حوسێن ئامادەی ئاهەنگەکە بوون.
ئەوجا لەدوای نوێژی عەسر لەکاتێکدا کە هەموو ئەم جەماوەرە چاوەڕوان بوون. دوای خوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆزو چەند وتارێك بە بۆنەی ئەم ئاهەنگەوە. ئەوکاتە باوکم ئیجازەنامەکەی بۆ هەردووکیان خوێندەوە بەدەنگێکی بەرزو پڕ سۆزو حەماسەوە. ئەوجا بەخوێندنەوەی ئیجازەنامەکەیان ئاهەنگەکە گەیشتە لای کۆتاییەکەی. مامۆستای شۆخو بەڕێز کەوتە سەر ئیمامەو تەدریسو ئیرشاد ئایینی لەدێهاتەکانی ناوچەکەماندا. بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو ژیان لەو وڵاتەکەدا تاڵ بوو ئەو کاتە مامۆستا بەبێ چاری پەیوەندی کرد بە (الدورة التربوية لرجال الدين). لە کەرکوك کە بۆ ماوەی ساڵێك بوو. لە (٢٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٦٠)ی زایینی دا لەگەڵ هەموو دەورەکەدا دامەزرا بە مامۆستای زمانی عەرەبیو ئاینی

لەوەزارەتی پەروەردە. هەر لەم شوێنەدا مایەوە هەتا ساڵی (١٩٨٢)دا خۆی خانەنشین کرد. مامۆستای بەڕێز ئێستا وا لەماڵەوەیە. لەبەر ناساغیی دەرناچێتە دەرەوە.

**٢١. مەلا محەمەدی کوڕی سادقی عەبدالآنی:**

ناوی تەواوی ئەم مامۆستا خوالێخۆش بووەمان مەلا محەمەدی کوڕی سادقی کوڕی ڕەسوڵی کوڕی وەلییەو. خەڵکی دێی عەبدالآنە لەناوچەی سووورداش: لەپارێزگای سلێمانی. ئەم خوالێخۆشبووە تا پۆلی شەشەم هەر لەم دێیەدا خوێندوویە. ئەوجا بۆ خوێندن هاتە کەرکوك. پلەی (مستعديی)و (اخر مادە)دا. دانیشت لەحوجرەی فەقێکانی مزگەوتی دڵی باش وەك لەکۆندا ناسرابوو بە مزگەوتی مەلا ئەمینە گردە کە شوێنەکەی لەناو زێویەی ژووروەوە. دەرسی ئەخوێند لەلای باوکم واتە: حاجی مەلا عومەری کوڕی مەلاساڵحی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای عومەر گونبەدی. لە مزگەوتی ئیمام قاسم هەر بەم شێوەیە لە خوێندن بەردەوام بوو. هەتا لە (١٠)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٩)ی زایینی دا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت لەخزمەتی باوکم، ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنەکەی بەسترا لەناو حەوشەی خانەقای مەلا عومەری گونبەدی. بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە ڕۆژی سێیەم کە هەینی بوو لەپاش نوێژی: عەسر. باوکم ئیجازەنامەکەی خوێندەوە لەناو جەماوەری: مەلاو فەقێو ئەو هەموو بەڕێزانەی چیینەکانی گەلەکەمان وەك لەم خانەقایەدا بۆ ئەم مەبەستە چاوەڕوان بوون. ئەوجا پەیوەندی کرد بە (الدورة التربوية لرجال الدين). لە ساڵی (١٩٦٠) لەگەڵ هەموو (دەرچوو)ەکانی ئەم دەورەیە دامەزرا بەمامۆستای زمانی عەرەبیو ئاین لەوەزارەتی پەروەردەو فێرکردن. بەپێی دڵ خوازی خۆی نیشتەجێ بوو لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی مامۆستایان. تاوەکو خۆی خانەنشین کرد. بەڵام داخی گرانم لە (٥)ی ئابی ساڵی (١٩٨٨)دا ئەم بلیمەتە جەرگ سووتاوە کۆچی دوایی‌و ماڵ ئاوایی یەك جارەکی کرد.

**٢٢- حاجی مەلا عومەری گردلانکەیی:**

ناوی تەواوی حاجی مەلا (عومەر)ی کوڕی حاجی (قادر)ی کوڕی کوێخا فەتاحی کوڕی (عەبدولرەحمان)ەو لەعەشیرەتی گەردییەو لە ساڵی (١٩٣٣)ی زایینی دا لەدێی گردلانکەی دەشتی دزەیی سەر بە پارێزگای هەولێر هاتووەتە دنیاوە. خوێندنی لەپلەی (سوختەیی) هەتا (اخر مادە)ی هەمووی هەر لە کەرکوك لە خانەقای مەلا عومەری عومەر گونبەدی بووە، لەلای باوکم واتە (حاجی مەلا عومەری) کوڕی (مەلا ساڵح)ی کوڕی (مەلاعەبدوڵڵا) عومەر گونبەدی. لە خزمەتی ئەم لە ساڵی (١٩٥٨)ی زایینی دا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە: بەشێوەیەکی تایبەتی: بێ ئاهەنگو شایی کردن. بوو بە مەلا لەناوچەی دەشتی دزەیی. هەر لەخزمەتی (دینو علمو ئیمامەو ئیرشادی ئایینی دا بووە).



مزگەوتی نائیب لەکاتی وەرگرتنی ئیجازەی یەکێك لە مەلاکانی کەرکوك

*** خوێندن و فێرکردنی پەروەردە لە کەرکوك لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا:-**

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کە ماوەی دەسەلاتی عوسمانییەکان لەم شارە کاریگەری جۆراوجۆری خۆی بە جێهێشتووە لە هەموو بوارەکاندا بە تایبەتی بواری (ئابووری، رۆشنبیری، کۆمەلایەتی، تەلارسازی و پەروەردە)، هەر یەکە لەم بوارانە رۆڵ و پێگەی خۆی هەبووە لە خزمەتکردن بە ئەو رێگایانەی کە لەگەڵ بەرژەوەندی سیاسەت و ستراتیجیەتی عوسمانییەکاندا هاوگونجاو بووبێت یان بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەو توانایانەی خستبێتە روو تا ببێتە روانگەیەکی گرنگ لە خزمەت بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و ئمپراتۆرییەکە. بواری پەروەردە و خوێندن یەکێکە لەو بوارە گرنگانەی کە بە کۆڵەکەیەکی بەرچاو دادەنرێت لە خزمەت مەرامە سیاسییەکاندا کە لە هەندێك جاردا بنەماکانی دەوڵەت ئەو بایەخەی پێنادەن تا بۆ ئەوەی لەگەڵ رەوتی رووداوەکانی دەوروبەردا بگونجێت، چونکە لە هەندێك باردا کاریگەری بە خراپ دەکەوێتەوە کە لە بەرژەوەندی دەوڵەتەکدا نەبێت.

دەوڵەتی عوسمانی هەر لە سەرەتاوە لە شارێکی وەکو کەرکوکدا هەوڵی داوە بایەخییەکانی پەروەردە و خوێندن لە چوارچێوەیەی جارانی خۆی بێت تا بۆ ئەوەی لە سنووری ئایینییەکەی خۆی دەرنەچێت و نەبێتە رێچکەیەك بۆ گۆرانکاری خوێندن و پەروەردە لە وڵاتەکە.

هەر لە سەرەتاوە عوسمانییەکان بایەخی پەروەردەیان تەنها لە پایتەخت و شارە گەورەکاندا خۆی دەبینییەوە، سەرەتاکانی داگیرکاری عوسمانییەکان و قاڵبوونیان بە بەربەرەکانی لەگەڵ سەفەوییەکان لەلایەك و ململانێ لەسەر فراوانکردنی دەسەلاتە سیاسی و سەربازییەکان وای کرد کە خوێندن و پەروەردە لە کەرکوك خۆی ببینێتەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:

١. زۆری قوتابخانەکان لە بواری پەروەردەدا پرۆگرامێکی ئایینی سونی مەزهەب بووە و لەو چوارچێوەیەدا بە تایبەتیش لەنێو مزگەوتەکاندا زیاتر بایەخی پێدەدرا بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی ئایینزایەکی دیاریکراو نەچێتە دەرەوە.

٢. زۆربەی قوتابخانەکان لە سەرەتاکانی داگیرکاری عوسمانییەکاندا پاشماوەی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی لەوەو پێش بووە و خۆی بینیوەتەوە لە تێکەڵاوی بیروباوەرەکان.

٣. زۆربەی قوتابخانەکانی بێ بوونی پرۆگرامێکی پەروەردەیی بوونە و لە چوارچێوەی ئەو مەلاو مامۆستاو زانا ئایینیانەدا وانە وتراوەتەوە و هەر یەکە بەپێی رێبازی بیرکردنەوەی خۆی پرۆگرامەکانیان دارشتووە، کە بەشێکی زۆری بریتی بووە لە زمانەکانی (فارسی، تورکی، عەرەبی).

٤. زیاتر پرۆگرامەکانی خوێندن لە بوارە ئایینییەکاندا بووە و بەشێکی کەم لە ماتماتیك و مێژوو و جوگرافیا خوێندراوە، ئەویش بەپێی ئەو دەستووسانەی کە لەلایەن ئەو زانا ئایینیانەوە بۆمان بە جێماوە.

٥. بایەخدا بە شیعری فارسی و تورکی و عەرەبی بە تایبەتی ئەو جۆرە شیعرانەی کە لە بواری ئاییندا باڵادەست بووە.

"بەلام لە بواری پەروەردەی شارستانی نوێدا بایەخییەکانیان دەگەرێتەوە بۆ ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم، ئەویش بە تایبەتی بۆ سالی (١٨٤٧) کە هەستان بە دامەزراندنی هەندێك قوتابخانەی تازە بابەت بەناوی قوتابخانەی (الرشدیة)"[١]، بەلام ئەم بایەخدانەی لە چوارچێوەیەکی تەسکدا بووە و بە تایبەتی لە پارچەکانی ولایەتەکانی عێراقدا زۆر درەنگ ئەم چاکسازییە گەیشت، بە تایبەتی شارێکی وەکو کەرکوك لە ئاقاری ویلایەتی موسلدا.

لە هەمان کاتدا ئەوانەی لە بواری کارگێری و بەرێوبەریدا لە ولایەتەکانی عێراقدا کاریان کردووە هۆکاری رێگر بوونە لە بەردەم پرۆسەی پەروەردە و خوێندندا بە تایبەتیش شێوازی مەرکەزییەت لە بەرێوبردندا بووەتە هۆکارێکی گرنگ لە بەرامبەر ئەوانەی هەوڵیان داوە بۆ چاکسازی، لە پاڵ نەبوونی شارەزایی والییەکان لە بواری بەرێوەبەریدا هۆکارێکی گرنگ بووە لە دواکەوتنی خوێندن و پەروەردە لە شارێکی وەکو کەرکوك.

"بەلام لە ماوەی فەرمانرەوایی عوسمانییەکان لەنێوان سالانی (١٧٥٧-١٧٧٤) بە تایبەتی لە سەردەمی (سولتان مستەفای سێیەم) هەستان بە بایەخدان بە هەندێك لە بوارەکانی پەروەردەی سەربازی و هونەری سەربازی، لەم بوارەدا بایەخیاندا بە هێنانی بەشێکی زۆر لە شارەزایانی دەوڵەتە ئەوروپییەکان بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن چاکسازی لە سوپادا بکەن، لەبەر ئەوە بایەخەکەیان چرکردەوە لەو بوارەداو بەتایبەتیش لە پایتەختی ئیمپراتۆرییەکە و لە ژێر دەسەلاتی خۆیاندا بەرێوەدەچوو"[٢].

"لە سالی (١٨٦٩)دا یاسای خوێندنی گشتی (معارف عمومیة نظامنامسي) کە لە کرۆکی نامەکەدا هاتووە کە دامەزراندنی قوتابخانە و نۆژەنکردنەوەو پێویستی مامۆستاو قوتابخانە لەسەر ئەرکی خەڵکی ناوچەکەدایە بەتایبەتی ولایەتەکان نەك لەسەر دەوڵەت، ئەمیش خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی گرنگە بۆ ئەوەی کە زۆربەی دانیشتوانی ولایەتەکان ئەو توانایەیان نییە لە رووی ئابووری و کۆمەلایەتییەوە کە بەو ئەرکە هەلسن چونکە لەو کاتەدا باری ئابووری زۆر گران و ناخۆش بووە.

ئەو ئامانجە سنووردارەی کە دەوڵەت بەرامبەر خوێندنی رچاوی کردبوو لە ولایەتەکاندا هۆکارێکی سەرەکی بوو لە پشتگوێ خستنی لە بواری بنیاتنانی قوتابخانەدا، گرنگترین ئەو یاسایانە یاسای خوێندنی گشتی سالی (١٨٦٩)ی زاینییە کە دیاری هێلەکانی خوێندنی مەدەنی دەکات لەگەڵ پلەی قوتابخانەکانی بە هەموو جۆرە جیاوازەکانی"[٣].

لە ماوەی نێوان (١٨٣٩-١٨٦٩) گەلێك یاسای جۆربەجۆر لە بواری خوێندن و پەروەردەدا دەرچوو لە دەوڵەتی عوسمانی کە دوورو نزیك کاریگەرییەکانیان بەرچاو نەبوو، یان لەو ئاستەدا نەبوو بگاتە چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان، لەو

ماوەیدا یاساكانی خوێندنی لە قوتابخانە حكومییەكاندا كرابووە پێنج بەشەوە:
١. قوتابخانە سەرەتاییەكان.
٢. قوتابخانەی (ڕوشدییە).
٣. قوتابخانەی ئامادەیی.
٤. قوتابخانەی (سوڵتانییە).
٥. قوتابخانەی باڵا.
لە قوتابخانەی سەرەتاییدا ماوەی خوێندن چوار ساڵ بووە، خوێندنیش بۆ كوران لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بووەو بۆ كچانیش لە تەمەنی شەش ساڵیدا بووە، لە كاتێكیش باوكان و دایكان ئەگەر منداڵەكانیان نەناردایە ئەوە تووشی سزای دارایی دەبوون.
بەڵام لە قوتابخانەكانی (ڕوشدییە)دا كە بۆ كچان و كوران بوو دوو ماددەی (١٩)و (٢٣) باسی لە پابەندی دەوڵەت دەكرد لەم قوتابخانەیەو هەموو پێویستییەكی مامۆستا لەسەر بەڕێوەبردنی پەروەردەی ولایەتەكان بوو، ماوەی خوێندن لەم قوتابخانەیە بۆ چوار ساڵ بوو.
قوتابخانەی ئامادەییەكان هەروەكو لە ماددەی (٣٣، ٣٥، ٣٨) دا هاتبوو، ڕێگەی دەدا بە تێكەڵبوونی موسڵمانەكان لەگەڵ غەیرە موسڵمانەكان، ماوەی خوێندنی لەم قوتابخانەیە سێ ساڵ بوو.
لە قوتابخانە سوڵتانییەكان كە بە ناوبانگ بوو بە (ئەللیسییە)، كە دوو بەش بوو، بەشی بەرزی سێ ساڵ بوو ئەم قوتابخانەیە ئەو قوتابیانەی وەردەگرد كە دەرچووی قوتابخانە ڕوشدییەكان بوو كە بەشی ئەدەبی و زانستی هەبوو.
قوتابخانە باڵاكانیش بریتی بوو لە (دار المعلمین)و (دار الفنون).
"لە سەردەمی (میدحەت پاشا) هەر چەندە كە ماوەی فەرمانڕەواییەكەی كورت بوو لەنێوان ساڵانی (١٨٦٩-١٨٧٢) بەڵام توانی گەلێك چاكسازی و پێشكەوتن لە ولایەتەكانی عێراق بە دەست بێنێت بە تایبەتی لە بواری فێركردن و دامەزراندنی قوتابخانەی مۆدێرن، یەكەم كارێك كە (میدحەت پاشا) پێی هەڵسا، كردنەوەی قوتابخانەی (ڕوشدییە) بوو لە ولایەتەكانی عێراقدا، كە قوتابخانەی (ڕوشدییە)ش دوو جۆر بوو، جۆرێكیان سەربازی و ئەوی دیكە مەدەنی، بۆ نموونە لە شارێكی وەكو كەركوكدا (ڕوشدییە)ی مەدەنی كرایەوە بە باربووی دارایی خەڵكی شارەكە، هەر لەو كاتەشدا لە ڕۆژنامەی (الزوراء)دا هەواڵی ئەم قوتابخانەیەو وەرگرتنی هەشت قوتابی لە كۆی (٣٠٠) قوتابی كە لە ژمارە (٦١)ی ساڵی (١٨٧٠)ی زایینی بڵاوبووەتەوە، بەڵام لە ساڵی (١٨٧٥)ی زایینیدا باربووی دانیشتوان بۆ ئەم قوتابخانەیە ڕاگیرا بۆیە لە ژمارەكانی لەوەدوای ڕۆژنامەكەدا قوتابیانی قوتابخانەكە داوای باربوویان كردووە بۆ بەردەوامبوونی قوتابخانەكە لە خوێندن.
قوتابخانە (پیشەییەكان - الصنایع) گرنگییەكی تایبەتی هەبوو لەلایەن (میدحەت پاشا)وە بۆ بەرەپێشكەوتنی بوارەكانی خوێندنی پیشەیی و بایەخدان بە لایەنەكانی پیشەسازی، هەر بۆیە لە شارێكی وەكو كەركوك لەسەر ئەركی خەڵكەكەی قوتابخانەی (الصنایع) دامەزرا، دەبینین هەمان بابەتەی ئەم قوتابخانەیەش لەسەر لاپەڕەكانی ڕۆژنامەی (الزوراء) باس كراوە لەلایەن خەڵكی شاری موسڵەوە كە گوایە داوای كردنەوەی قوتابخانە دەكەن لە شارەكەیان لە خەڵكی دەست ڕۆیشتوو هەر وەكو ئەوەی كەركوك، بەڵام ئەوە بەدەردەكەوێت كە لە دوا ڕۆژدا ئەو قوتابخانەیە لە شارێكی وەك موسڵ نەكرایەوە، هەر چەندە شارێكی وەكو موسڵ لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و بوونی دەوڵەمەند لە شارەكە زۆرترە لە كەركوك"[٤].
لە ساڵی (١٨٧٥)ی زایینیدا یاسای سوڵتانی دەرچوو دەربارەی ئەوانەی كە موسڵمان نین لە بواری كردنەوەی قوتابخانەی تازە یان ئەو قوتابخانانەی كە لەو پێش هەیانبووە، یان ئەوانەی مژدەبەر بوونە لەلایەن دەوڵەتە ئەوروپییەكانەوە دەبێت لە هەموو بارێكدا دەوڵەتی عوسمانی سەرپەرشتی بكات و چاودێری كاروبارەكانی بكات، بەڵام لە دواییدا گەیشتە ئەوەی تەنانەت موسڵمانەكانیش كاتێك بیانەوێت قوتابخانەی تایبەتی بكەنەوە پێویستی بەوە دەكرد كەوا یاسای (الارادة السنیة) بە دەست بهێنن، هەروەكو ئەوەی كە لە ساڵی (١٨٩٣)ی زایینیدا كاری پێ دەكرا.
"دەزگاكانی فێركردنی نوێ لە دەوڵەتی عوسمانی و بە تایبەتی لە ویلایەتە عەرەبییەكانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتان (عەبدولحەمیدی دووەم) (١٨٧٦-١٩٠٩)ی زایینی، زۆربەی كارەكانیان لە پایتەختی ئیمپراتۆریەتییەكە چڕكرابۆوە، لە توانای حكومەتدا نەبوو خزمەتگوزارییەكانی پەروەردە بگوازێتەوە بۆ دەرەوەی ئەستەمبول، بەڵام لە ساڵی (١٨٧٨)دا توانی هەڵسێت بە بڵاوكردنەوەی فێركردن لە سەرتاپای ئاقاری ئیمپراتۆرییەتەكە، هەر چەندە لە توانای پێویستی دەزگاكانی فێركردن بووە لە ویلایەتەكان، بەڵام ئەم هەنگاوە خۆ لە خۆیدا كارێكی بەرەو پێشچوو بوو لەپێناو خوێندن و فێركردندا و فراوانكردنی هەنگاو بە هەنگاو.
ئەگەر بێت و سەیری ماوەی نێوان ساڵانی (١٨٧٧ - ١٩٠٩) ی زایینی بكەین دەبینین بیرو بۆچوونی چاكسازی ڕەگی داكوتابوو، بەشێك لە لێپرسراوان لە هەوڵی جێبەجێ كردنیدا بوون لە بواری پەروەردەدا"[٥].
"بەڵام هەر لە ساڵی (١٨٦٩)ی زایینییەوە هەستا بە دانانی پیرۆی پەروەردە، بۆیە لە پاڵ ئەمەشدا هەڵسان بە دانانی یان دروستكردنی ئەنجومەنی پەروەردە لە هەر یەكە لە بنكەی ویلایەتەكان و لقێك بووە لە ئەنجومەنی فێركردنی گەورە لە ئەستەمبول، دەزگایەكی بەڕێوەبەری بووە بۆ بەجێبەجێ كردنی كارەكان لە ویلایەتەكە، بەڕێوەبردنی ئەم ئەنجومەنە لەلایەن بەڕێوەبەری پەروەردەوە بەڕێوەبراوە بەپێی فەرمانێكی سوننی سوڵتانی كە دوو یاریدەدەری هەبوو یەكێكیان موسڵمان و ئەوی تریشیان نا موسڵمان، چوار لێكۆڵەری هەبوو دووان لە موسڵمان و دووان لە ناموسڵمان لە پاڵ بنووس و ژمێریار و ئەمین سەندوق.
قوتابخانە سەرەتاییەكان وەكو هەموو قوتابخانەكانی تری

ویلایەتەکان، لە ویلایەتی موسڵ بایەخی خۆی پێنەدراوە، ئەوەی بەرچاومان ئەکەوێت لە ویلایەتی موسڵ لە ساڵی (١٨٩٠)ی زاینییدا ڕێژەی قوتابییەکانیان لە قوتابخانەی سەرەتاییەکان بەم ڕێژەیە بووە:

- شاری موسڵ: (٢٥) قوتابخانە.
- قەزای ئەربیل: (٥) قوتابخانە.
- لیوای کەرکوک: (٥) قوتابخانە.
- تووزخورماتوو: (١) قوتابخانە.
- سەلاحییە (کفری): (٢) قوتابخانە"(٦).

"بەڵام بەپێی ئەو ئامارانەی کە تایبەتە بە قوتابخانە سەرەتاییەکان لە ویلایەتی موسڵ کۆنترینیان کە ئامادە کراوە دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵانی (١٨٩٥ - ١٨٩٦)ی زایینی کە لەلایەن وەزارەتی مەعارفەوە ئامادە کراوە، کە دابەش کراوە لە شێوە ئەو قوتابخانانەی کە لەسەر شێوازی کۆن بەڕێوەدەچن لەگەڵ ئەو قوتابخانانەی کە لەگەڵ هاتنە سەر تەختی سوڵتاندا ئامادە کراون:

| لیواکان | قوتابخانەکان لەسەر شێوازی کۆن | قوتابخانەکان لەسەر شێوازی تازە | کۆی گشتی | ژمارەی ئەو قوتابخانانەی لە کاتی هاتنەسەر تەختی سوڵتانەوە دروستکراوە |
|---|---|---|---|---|
| لیوای موسڵ | ٨٥ | - | ٨٥ | ٨٥ |
| لیوای کەرکوک | ١١٧ | - | ١١٧ | ١٠٩ |
| لیوای سلێمانی | ١٩٠ | - | ١٩٠ | ١٤٧ |
| کۆی گشتی | ٣٩٢ | - | ٣٩٢ | ٣٤١ |

**بەڵام ژمارەی قوتابییەکان لە قوتابخانە سەرەتاییەکان لەنێوان ساڵانی (١٨٩٥ - ١٨٩٦) بەم شێوەیە بووە:**

| لیواکان | ژمارەی قوتابییە کوڕەکان | ژمارەی قوتابییە کچەکان | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|
| لیوای موسڵ | ٩٣١ | ١٤٤ | ١٠٧٥ |
| لیوای کەرکوک | ٩٧٢ | ١١٧ | ١٠٨٩ |
| لیوای سلێمانی | ٨٣٤ | ١٣٢ | ٩٦٦ |
| کۆی گشتی | ٢٧٣٧ | ٣٩٣ | ٣١٣٠"(٧) |

"لە دوای کۆچی (میدحەت پاشا) و بڵاوکردنەوەی دەستووری عوسمانی لە ساڵی (١٩٠٨) هۆکارێکی گرنگ بوو لە پێشکەوتنی بوارەکانی فێرکردنی حکومیدا، هەر وەکو ئەوەی کە باسی هاتووە لە (ساڵنامات)ی ولایەتییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا، بۆیە لەنێوان ساڵانی (١٨٩٨-١٩٠٨) قوتابخانەی سەرەتایی لە شاری زاخۆو دهۆک و عەقرەو عەمادییەو هەولێرو پێنج قوتابخانە لە شاری موسڵ و سێ قوتابخانە لە شاری کەرکوک کرایەوە لەگەڵ قوتابخانەیەک لە شاری سلێمانی، قوتابخانەکانی شاری کەرکوک لە گەڕەکەکانی قۆرییەو قەڵاو سەر پردەکە بوون.

لە ساڵی (١٨٩٥) یەکەم قوتابخانەی ئامادەیی لە ویلایەتی موسڵ کرایەوە، بەڵام ئەمە تەنها قوتابخانە نەبوو بەڵکو هەر یەکە لە قوتابخانەکانی روشدییەی کەرکوک، سلێمانیش کران بە قوتابخانەی ئامادەیی ئەویش پاش وەرگرتنی قوتابییە سەرکەوتووەکانی قوتابخانەی روشدییە.

رووبەکی تری دامەزراندنی قوتابخانە لە ولایەتەکانی عێراقدا دواکەوتنی قوتابخانەی ئافرەتان بوو، ئەویش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک:

١. سروشتی پارێزگاری کۆمەڵگەی عێراق دەربارەی ئافرەت هۆکارێک بوو لەو هۆکارانەی کە پاڵی نەدەنا بە دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ کردنەوە ئەو جۆرە قوتابخانەیە.

٢. سروشتی پشتگوێ خستنی بەڕێوەبەردنی عوسمانییەکان لە عێراقدا بە تایبەتی لە کردنەوەی قوتابخانەی ئافرەتان لە ولایەتەکان.

٣. نەبوونی فێرکاری ئافرەت بۆ قوتابخانەکان هۆکارێك بوو لە دواکەوتنی کردنەوەی قوتابخانەی ئافرەتان.
٤. بەرچاوکەوتنی هەندێك لە قوتابخانەی ئایینییەکان کە لەلایەن مژدەبەرەکانەوە دەکرایەوە بە شێوەیەکی سنووردار بایەخی بە وەرگرتنی قوتابی ئافرەت دەدات لەگەڵ کوراندا"[٩].
ئەگەر لە شارێکی وەکو کەرکوکدا سەیر بکەین دەبینین لە دوای ساڵی (١٩٠٨) ئەو بایەخەی کردنەوەی قوتابخانە بەتایبەتی قوتابخانەی (رشدیيە)و (الصنایع) نەدراوە لەم شارەو خەڵکی باربوو کۆمەکیان بۆی کۆنەکردووەتەوەو چەند جارێك قوتابیانی ئەم قوتابخانانە لە ڕۆژنامەی (الزوراء)دا داوای کۆمەك و یارمەتییان لە خەڵکی کەرکوك کردووە.

*** ناوی ئەو قوتابخانە باوە ئیسلامییانەی کە لە ساڵی(١٩٠٣)دا لەلیوای کەرکوك هەبوون بە پێی ساڵنامەی( ولایه المعارف )[٨]:**

| ز | قەزا | ناوی قوتابخانە | شوێنی قوتابخانەکە | ناوی مامۆستا | ژمارە قوتابی | دروستکەری قوتابخانەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | کەرکوك | حاجی سلێمان | حەساری حەمام موسلم | مەلا محەمەد ئەفەندی | ١٢ | حاجی سلێمان |
| ٢ | کەرکوك | حاجی سلێمان | حەساری حەمام موسلم | مەلا محەمەد ئەفەندی | ١١ | حاجی سلێمان |
| ٣ | کەرکوك | حاجی سلێمان | چای | عەبدولڕەحمان ئەفەندی و محەمەد ئەفەندی | ١٢ | حاجی سلێمان |
| ٤ | کەرکوك | فەرهاد زادە | قەڵا – مەیدان | خدر ئەفەندی | ١١ | فەرهاد زادە |
| ٥ | کەرکوك | نائیب زادە | ئاخور حوسێن | محەمد ئەفەندی | ١٠ | نائیب زادە |
| ٦ | کەرکوك | بولاق | بولاق | حامید ئەفەندی | ٥ | (نەناسراو) |
| ٧ | کەرکوك | حاجی ئەحمەد ئاغا | ئاخور حوسێن | عەلی ئەفەندی | ١٥ | حاجی ئەحمەد ئاغا |
| ٨ | کەرکوك | سەیید غەنی | ئاخور حوسێن | سەیید محێددین | ١٠ | سەیید غەنی |
| ٩ | کەرکوك | ئیمام قاسم | ئیمام قاسم | شێخ محەمەد ئەفەندی | ١٠ | لەلایەن سوڵتانەوە |
| ١٠ | کەرکوك | شێخ باقی | شاترلوو | محەمەد ئەفەندی | ٦ | شێخ عەبدولباقی ئەفەندی |
| ١١ | کەرکوك | مەدرەسە | شاترلوو | زەینەل ئەفەندی | ٧ | عەبدولغەنی ئەفەندی |
| ١٢ | کەرکوك | موسلم | قۆرییە | محێددین ئەفەندی | ٧ | موسلم |
| ١٣ | کەرکوك | حاجی مستەفا | چای | تۆفیق ئەفەندی | ٤ | حاجی مستەفا ئەفەندی |
| ١٤ | کەرکوك | قوتب زادە | بولاق | محەمەد ئەفەندی | ٩ | قوتب زادە محەمەد ئەفەندی |
| ١٥ | کەرکوك | حاجی عەبدی | ساری کەهیە | بەکر ئەفەندی | ٧ | حاجی عەبودی |
| ١٦ | کەرکوك | مەعروف ئەفەندی | قۆرییە | ئەحمەد ئەفەندی | ١١ | (نەناسراو) |
| ١٧ | کەرکوك | عەبدولقادر | چای | نەجیب ئەفەندی | ٩ | عەبدولقادر |
| ١٨ | کەرکوك | مەدرەسە | قۆرییە | محەمەد ئەفەندی | ٦ | (نەناسراو) |
| ١٩ | سەلاحیە (کفری) | مەلا یوسف | مزگەوتی گەورە | عەبدولجەبار ئەفەندی | ١١ | مەلا یوسف |
| ٢٠ | سەلاحیە (کفری) | ئیبراهیم | قەڵا | قادر ئەفەندی | ٦ | ئیبراهیم |

*** قوتابخانە سەرەتاییەکان لە کەرکوک لە ساڵی (١٩١٢)دا:**

١. قوتابخانەی (فەیزی منداڵانی نموونەیی)، مامۆستای یەکەم (ڕەشید ئەفەنی)، یاریدەدەر (سەیید محەمەد جەواد ئەفەندی)، مامۆستای دووەم (سەیید مستەفا ئەفەندی)، مامۆستای سێیەم (مەلا مستەفا ئەفەندی)، ژمارەی قوتابییەکانی (١٧٠) قوتابی.

٢. قوتابخانەی (قۆریە)، مامۆستای یەکەم (محەمەد ئەفەندی)، یاریدەدەر (عەبدوڵڵا ئەفەندی)، ژمارە قوتابییەکانی (١١٠) قوتابی.

٣. قوتابخانەی (ئەغالیق) لە قەڵا، مامۆستای یەکەم (مەلا تۆفیق ئەفەندی)، یاریدەدەر (عەبدولمەجید ئەفەندی)، ژمارەی قوتابییەکانی (٩٨) قوتابی[١٠].

*** قوتابخانە سەرەتاییەکان لە قەزاو ناحییەکانی سەر بە لیوای کەرکوک لە ساڵی (١٩١٢)دا:**

١. قوتابخانەی سەرەتایی لە قەزای سەڵاحیە، مامۆستای یەکەم (بەهائەددین ئەفەندی)، مامۆستای دووەم (خەلیل ئەفەندی)، ژمارە قوتابییەکانی (١٤٦) قوتابی.

٢. قوتابخانەی سەرەتایی لە ناحیەی تووزخورماتوو، مامۆستای یەکەم (حەمودی ئەفەندی)، ژمارەی قوتابییەکانی (٢٢) قوتابی.

٣. قوتابخانەی سەرەتایی لە ناحیەی قەرەتەپە، مامۆستا (حوسێن ئەفەندی).

٤. قوتابخانەی سەرەتایی لە شاری ئەربیل، مامۆستای یەکەم (مولود ئەفەندی)، مامۆستا دووەم (عەبدولکەریم ئەفەندی)، ژمارە قوتابییەکانی (٨٦) قوتابی.

٥. قوتابخانەی (قەڵا)ی سەرەتایی لە ئەربیل، مامۆستای یەکەم (ڕەئوف ئەفەندی)، مامۆستای دووەم (مستەفا ئەفەندی)، ژمارە قوتابییەکانی (٦٩) قوتابی[١١].

*** قوتابخانەی ڕوشدیە:**

"لە سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجیدا(١٨٣٩-١٨٦١)ی زایینیی، زۆربوونی پێویستی لەسەر کارراییکردنی چاکسازییەکان لە قوتابخانەی هەرزەکاراندا گرنگی پێدەدرا بە تایبەتی لە دوای ئەوەی کە توانای هەبوو بۆ پێگەیاندنی قوتابیان لە قوتابخانەکانی ئامادەیی، ئەویش لەبەر ئەوەی بۆشاییەکی گەورە هەبوو لەنێوان ئەو ماددانەی کە لەنێوان هەردوو قوتابخانەکەدا دەخوێندرا، بۆیە بڕیاردرا بە دامەزراندنی قوتابخانەی تر بەرزتر لە ئاستی قوتابخانەی هەرزەکاران، لە ژێر ناونیشانی (مدارس الصفوف الثانیة)، هەر چەندە ئەم بڕیارە نزیك ببوەوە لە ڕەزامەندی سوڵتانی، بەڵام سوڵتان ناوەکەی گۆڕی بۆ (قوتابخانەی ڕوشدیە) لەبەر ئەوەی ئەوانەی لەو قوتابخانەیە دەخوێنن نەگەیشتوونەتە قۆناغی تەمەنی باڵەقبوون.

یەکەم قوتابخانەی ڕوشدیە لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی (١٨٤٦) کرایەوە، بەڵام لەبەر نەبوونی مامۆستا بۆ خوێندن لەم قوتابخانانە نەتوانرا لە ویلایەتەکان ئەم قوتابخانانە بکرێتەوە. لە ساڵی (١٨٤٦)دا لە ژێر ناوی (دار المعلمین) کرایەوە. پاش ئەوەی یەکەم کۆمەڵ لەم قوتابییانە دەرچوون بڕیاردرا بە کردنەوەی قوتابخانەی ڕوشدیە لە ویلایەتەکان. لە سەرەتادا ماوەی خوێندن بە چوار ساڵ دانرابوو، بەڵام لە دواییدا بوو بە شەش ساڵ، لە ساڵی (١٨٦٣)ی زایینیدا کەم کرایەوە بۆ پێنج ساڵ، ئەو بابەتانەی لەم قوتابخانانەدا دەخوێندرا بریتی بوو لە (قورئانی پیرۆز، زانستی ئایینی، زمانی عەرەبی، بیرکاری، نووسین)، لە ساڵی (١٨٤٨)ی زایینیدا (زمانی فارسی، جوگرافیا، ئەندازیاری) تێدا دەخوێندرا، لە سەرەتادا تەنها قوتابیانی موسڵمانیان وەردەگرت، بەڵام لە ساڵی (١٨٦٧)ی زایینییەوە ناموسڵمانەکانیشیان وەردەگرت.

لە دوای ساڵی (١٨٧٠)ی زایینییەوە بایەخدان بە زیادکردن و فراوانی قوتابخانەی ڕوشدیە لە هەموو ناوچەکانی ئیمبراتۆرییەتەکە گرنگی خۆی هەبوو، لەنێوان ساڵانی (١٨٧٤ – ١٨٧٥)ی زایینی نزیکەی (٤٠٠) قوتابخانە لە ویلایەتە جۆربەجۆرەکانی عوسمانیدا بڵاوببووەوە.

ئەم جۆرە قوتابخانانە لە سەردەمی سوڵتان (عەبدولحەمید) دا فراوانبوونێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، بە تایبەتی لە ویلایەتەکاندا، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ژمارەی قوتابخانەکان زۆر زۆر زیادی کردو ئارەزووی خەڵکی بۆ ناردنی منداڵەکانیان بۆ ئەم قوتابخانانەی بەردەوام بوو، تا کار گەیشتە ئەوەی ژمارەی قوتابخانەکان لە ئاست ئەو ژمارە زۆرەی قوتابییەکاندا نەبوو، بۆیە دەوڵەت هەستا بە دروستکردنی یان بە کرێگرتنی خانووی تایبەت بەم قوتابخانانە.

بۆ نموونە لە ساڵی (١٨٨٥)دا (٦٢) قوتابخانەی ڕوشدیە لە ویلایەتە عەرەبییەکاندا هەبوو کە لە ویلایەتی موسڵ نزیکەی حەوت قوتابخانە هەبوو کە دابەش ببوو بەسەر: (موسڵ، سلێمانی، کەرکوک، ڕەواندوز، ئەربیل، سەڵاحیە (کفری)، عەقرە).

لە ساڵی (١٨٨٩)ی زایینی دەوڵەت هەستا بە دووبارە ڕێکخستنەوەی ئەم قوتابخانانە لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئەم قوتابخانانە یەکبگرن لەگەڵ خوێندنی ئامادەییدا، بۆیە لە هەمان ساڵدا نزیکەی (٢٢) قوتابخانەی ڕوشدیە هەڵوەشێنرایەوە، هەر یەکە لە مامۆستا و کارمەندانییەوە گوازرانەوە بۆ قوتابخانەی ئامادەیی، قوتابخانەکانیشیان کرا بە قوتابخانەی سەرەتایی، بەڵام لەو شوێنانەی کە قوتابخانەی ئامادەییان نەبوو، قوتابخانە ڕوشدییەکان بەردەوام بوون لە خوێندن، لە ساڵی (١٨٩٢)ی زایینیدا ماوەی خوێندن لە قوتابخانەی ڕوشدیە کرا بە سێ ساڵ.

لەنێوان ساڵانی (١٨٨٣ – ١٨٨٤)ی زایینیدا کە ماوەی چوار ساڵ بووە لە خوێندن لەم قوتابخانانە پرۆگرامەکانیان بەپێی ساڵ بەم شێوەیە بووە:

١. ساڵی یەکەم: (زمانی عەرەبی، ڕێزمانی فارسی، کورتەی حیساب، ڕێنووس، زانستی ئایینی، ئەخلاق، خۆشنووسی (ثلث)).

٢. ساڵی دووەم: (زمانی عەرەبی، ڕێزمانی فارسی،

*** کۆی گشتی قوتابخانە سەرەتاییەکان و ژمارەی مامۆستاو قوتابییەکانی لەنێوان ساڵانی (١٩١٣ - ١٩١٤)[١٢]:**

**- لیوای کەرکوک:**

**١. شاری کەرکوک:**

| ژ | ناوی قوتابخانە | گەڕەك | ژمارە قوتابی |
|---|---|---|---|
| ١ | فەیز مندالآن | ئاوچی | ٦٥ |
| ٢ | قەڵا | حەمام | ٦٤ |
| ٣ | قۆرییە | بەگەکان | ٢٤ |
| ٤ | قیز مەکتەبی (قوتابخانەی کچان) | ئاوچی | ٤٧ کچ |
| ٥ | مەلا تاهیر سەیید عەلی | بولآق | ٢٤ |
| ٦ | سەیید عەلی | بولآق | ٢٠ |
| ٧ | مەلا حوسێن | پیریادی | ٣٠ |
| ٨ | مەلا ساڵح | پیریادی | ١٠ کوڕو ٢ کچ |
| ٩ | مەلا عەزیز | چقور | ٤٥ کوڕو ٥ کچ |
| ١٠ | فەقێ عەلاو | ئاوچی | ١٥ |
| ١١ | مەلا عەلاو | مەیدان | ١٧ کوڕو ٨ کچ |
| ١٢ | مەلا ئەحمەد | مەیدان | ٣٠ |
| ١٣ | مەلا قادر | ئیمام قاسم | ٢٢ کوڕو ٣ کچ |
| ١٤ | خەلیفە عەلی | بەگەکان | ٢٥ |
| ١٥ | مەلا سدیق | ساری کەهیە | ٤٠ |
| ١٦ | مەلا حوسامەددین | ساری کەهیە | ٢٤ |
| ١٧ | مەلا عوسمان | شاتڕلوو | ٢٠ |
| ١٨ | زەهیە خان (کچان) | بەگەکان | ٢٠ کچ |
| ١٩ | حەمدییە خان | ساری کەهیە | ١٢ کچ |
| ٢٠ | ڕەحیمە خان (کچان) | بولآق | ٣٨ کچ |
| ٢١ | فاتمە خان (کچان) | چقور | ٢٤ کچ |

**٢. ناحییەکانی کەرکوک:**

| ژ | ناوی قوتابخانە | شوێن | ژمارە قوتابی |
|---|---|---|---|
| ١ | قوتابخانە سەرەتایی لە ناحیەی داقوق | ناحیەی داقوق | ١٧ |
| ٢ | قوتابخانە سەرەتایی لە ناحیەی مەلحە | ناحیە مەلحە | - |
| ٣ | قوتابخانە سەرەتایی لە ناحیەی ئاڵتون کۆپری | ناحیەی ئاڵتون کۆپری | - |

٣. قەزای سەلاحییە (کفری):

| ژ | ناوی قوتابخانە | شوێن | ژمارە قوتابی |
|---|---|---|---|
| ١ | قوتابخانەی ناوەندی قەزاکە | گەڕەکی سەیدەکان لە قەزای سەلاحییە | ٦٤ |
| ٢ | قوتابخانەی تووزخورماتوو | ناحیەی تووزخورماتوو | ٣٦ |
| ٣ | قوتابخانەی قەرەتەپە | ناحیەی قەرەتەپە لە قەزای سەلاحیە | ٤١ |

کورتەی حیساب، جوگرافیای ئەورووپا، وەرگێڕان، دارشتن و خوێندنەوە، خۆشنووسی (رقعة، ثلث)).
٣. ساڵی سێیەم: (گوڵستان ئەدەبی فارسی، حیساب، جوگرافیا، نووسین و دارشتن، زمانی فەرەنسی، خۆشنووسی (رقعة)).
٤. ساڵی چوارەم: (الرسائل الاربعة، گوڵستان، جەبر، جوگرافیا، ئەندازیاری، ئوسووڵی دەفتەر، ڕێزمانی عوسمانی، دارشتن، فەرەنسی، مێژووی عوسمانی، خۆشنووسی (رقعة)"[١٣].

*** قوتابخانەی روشدییە لە کەرکوک:**

"ئەم قوتابخانەیە لە کەرکوکدا هەر وەکو ئەوەی هاتووە لە ساڵنامەی (المعارف) لە ساڵی (١٨٦٥)ی زاینیدا لەسەر پردەکە لە ناو شار دامەزراوە، ژمارەی قوتابییەکانی لە ساڵی (١٨٧٠)ی زاینییدا کە بنکەی ویلایەتەکە بووە سەر بە ویلایەتی بەغدا بووە (١٣٣) قوتابی بووە، بەڵام لە ساڵی (١٨٧٥)ی زاینییدا بووەتە (٣٥) قوتابی، لە دواییدا لە ساڵی (١٨٨٥)ی زاینییدا بووەتە (٤٢) قوتابی، لەنێوان ساڵانی (١٨٩٥ - ١٨٩٦)ی زاینیی هەمان ڕێژەی پێشووی هەبووە و زیادی نەکردووە، بەڵام لە ساڵی (١٨٩٩)ی زاینییدا بووەتە (٥٣) قوتابی و لە ساڵی (١٩٠٢)ی زاینییدا بووتە (٥٧) قوتابی، ژمارەی قوتابییەکانی هەر سێ پۆلەکە لە ساڵی (١٩٠٨) (٣٦) بووە بە شێوەی (٢٠ + ٩ + ٧) قوتابی.
لە ساڵی (١٨٧٥) ئەوانەی لە بواری خوێندندا لەم قوتابخانانە کاریان کردووە بریتی بوونە لە: (مامۆستا ڕەسووڵ مستی ئەفەندی، زەینەل ئەفەندی، مامۆستای خۆشنووسی سلێمان ئەفەندی)، هەر وەکو ئەوەی لە ساڵنامەی (المعارف)دا هاتووە لە ساڵی (١٩٠٢)دا مامۆستای یەکەم (عەبدولقادر ئەفەندی)ی بووە، مامۆستای دووەم و خۆشنووسی (ڕەئوف ئەفەندی) بووە، قوتابخانەی روشدییە لە کەرکوک تاوەکو ساڵی (١٩١٠) بەردەوام بووە، لە دواییدا لەگەڵ قوتابخانەی ئامادەییدا تێکەڵکراوە و لە هەمان ساڵدا ئەو قوتابخانەیە لە ناو شاری کەرکوکدا کراوەتەوە"[١٤].

*** قوتابخانەی روشدییە لە (سەلاحیە - کفری):**

"ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی (١٨٨١) لە گەڕەکی (سەییدەکان) کراوەتەوە کە ژمارە قوتابییەکانی لەنێوان ساڵانی (١٨٩٥ - ١٩٨٦) (٢٩) قوتابی بووە، لەنێوان ساڵانی (١٨٩٨ - ١٨٩٩) ژمارەی قوتابییەکانی (٣٠) قوتابی بووە، لە ساڵی (١٩٠٢) بەرز بووەتەوە بۆ (٤٠) قوتابی، بەڵام لە ساڵی (١٩٠٨)دا بووەتە (٣٤) قوتابی کە دابەش بوونە بەسەر هەر سێ پۆلەکەدا بەم شێوەیە (١٥ + ١٢ + ٧) قوتابی، لە ساڵی (١٩١٢)دا بووەتە (١٩) قوتابی.
بەڵام لە ساڵی (١٩٠٢)ی زاینییدا مامۆستای یەکەم (محەمەد ڕەفعەت ئەفەندی) بووە، مامۆستای خۆشنووسی (مستەفا ئەفەندی) بووە، بەڵام لە ساڵی (١٩١٢) وەکو ئەوەی کە لە ساڵنامەی موسڵدا هاتووە مامۆستای یەکەمی (محەمەد نافیع ئەفەندی) بووە، مامۆستای دووەم (محەمەد ئەفەندی) بووە"[١٥].

*** قوتابخانەی ئامادەیی لە ویلایەتی موسڵ:**

"بۆچوونی دامەزراندنی قوتابخانەی ئامادەیی لە ویلایەتی موسڵ دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵی (١٨٩١)ی زاینیی، کاتێ کە ئەنجومەنی ویلایەی موسڵ بە سەرپەرشتی والی کۆنووسێکی ئامادەکردبوو لە (١١)ی ئەیلولی هەمان ساڵ و بەرزیکردبووەوە بۆ وەزارەتی مەعاریف.
بەڵام لە ساڵی (١٩١٠) قوتابخانەی ئامادەیی لە کەرکوک دامەزراوە و لکێندراوە بە قوتابخانەی روشدییەوە بە هەر سێ پۆلەکەیەوە، بەڵام لە دوای نەمانی قوتابخانەی روشدییە لە دەوڵەتی عوسمانی بۆیە قوتابخانەکە کرایە دوو بەشەوە، بەشی سەرەتایی و بەشی ئامادەیی هەر وەکو ئەوەی کە هاتووە لە ڕێبەری ئاماری وەزارەتی مەعارف هاوپەیوەست بە خوێندنی ساڵانی (١٩١٣ - ١٩١٤)، ئەم قوتابخانەیە هیچ بەشێکی ناوخۆیی تێدا نەبوو بۆ قوتابیان، لە هەمان ساڵدا ژمارەی قوتابییەکانی (١٧٢) کەس بووە، کە (١٣٢) کەسی لە بەشی سەرەتایی و (٤٠) کەسی لە بەشی پێشکەوتوو ئامادەیی بووە، کە شەش قوتابی موسڵمان نەبوونە و (٢٩) قوتابی کرێی خوێندنیان داوە هەموو ساڵێك کە پێنجیان موسڵمان نەبوونە، لە هەمان ساڵدا (٨) مامۆستا و (٣) کارگێڕیان هەبووە لەنێوانیاندا بەڕێوەبەر و یاریدەدەر، ئاستی خوێندنیان بەم شێوەیە بووە: پێنجیان (دار الفنون - الجامعة)، دووانیان (قوتابخانەی سەربازی)، یەکێکیان (قوتابخانەی سوڵتانی و ئامادەیی)، یەکێکی تریان (قوتابخانەی تایبەتی)، ئەوی تریان قوتابخانەی تری تەواو کردووە.
ئاستی چینی کۆمەڵایەتی قوتابییەکان بەم شێوەیە بووە: چوار کەسیان لە منداڵانی زانایانی ئایینیی موسڵمان بوونە، (٢٢) کەسیان لە منداڵانی فەرمانبەران بوونە، یەکێکیان خاوەن پیشەی هونەری بووە، (٤١) کەسیان منداڵی بازرگان

بوونە، (١٢) کەسیان منداڵی پیشەوەر بوونە، (٧) کەسیان منداڵی جوتیار بوونە، (٨٥) کەسیان لە چینەکانی تر بوونە. ئەم قوتابخانەیە تاوەکو ساڵی (١٩١٤)ی زاینیی بەردەوام بووەو لە دوییدا گۆڕاوە بە قوتابخانەی سوڵتانییە"[١٦].

*** قوتابخانەی سوڵتانییە لە کەرکوك:**

"ئەم قوتابخانەیە بریتییە لەو قوتابخانانەی کە لە دوای قوتابخانەی ئامادەییەوە دێت، ئەم قوتابخانەیە وەکو ئامادەییەکە وایە بەڵام هەندێك فراوان کراوەو ئاستی بەرزترە.

لە ساڵی (١٨٦٨)ی زایینیدا لە ئەستەمبوڵ بۆ یەکەمی جار دامەزراوە، قۆناغێکی پێشکەوتوو بووە لە خوێندندا بۆ ئەوەی بچێتە قوتابخانە بەرزەکان (کۆلێژەکان)، دەرگای ئەم قوتابخانەیە واڵا بوو بۆ موسڵمان و ناموسڵمانەکان، بە شێوەیەکی ئەوتۆ نەخشی بۆ کێشرابوو کە لەسەر ئاستی قوتابخانەی ئامادەیی فەرەنسییەکان بوو، بۆیە کادیری پەروەردییان لە فەرەنساوە بۆی هێنابوو، خوێندیش بە زمانی فەرەنسی بوو"[١٧].

"قوتابخانەی سوڵتانییە لەسەر ئاستی ویلایەتەکانی عەرەبی دەوڵەتی عوسمانی (١١) قوتابخانەی دامەزراوە کە دابەش کراوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. قوتابخانەی سوڵتانییە یەکەم لە بەیروت.
٢. قوتابخانەی سوڵتانییە دووەم لە بەیروت.
٣. قوتابخانەی سوڵتانییە یەکەم لە دیمەشق.
٤. قوتابخانەی سوڵتانییە دووەم لە دیمەشق.
٥. قوتابخانەی سوڵتانییە لە حەلەب.
٦. قوتابخانەی سوڵتانییە لە تەرابلوسی شام.
٧. قوتابخانەی سوڵتانییە لە قودس.
٨. قوتابخانەی سوڵتانییە لە بەغدا.
٩. قوتابخانەی سوڵتانییە لە کەرکوك.
١٠. قوتابخانەی سوڵتانییە لە بەسرە.
١١. قوتابخانەی سوڵتانییە لە سەنعا"[١٨].

"قوتابخانەی سوڵتانییە لە کەرکوك یەکەم قوتابخانەیە لە ویلایەتی موسڵ و لە دەرەوەی مەرکەزی ویلایەتەکە، لە ساڵی (١٩١٤ – ١٩١٥)ی زاینیی ئەم قوتابخانەیە لە کەرکوك کراوەتەوە، کە هەر قوتابخانەی ئامادەیی بووەو کراوە بە قوتابخانەی سوڵتانییە، هەروەها واش بڕیار دراوە کە سەرفی پێویستییە داراییەکانی لە هاوسەنگی دارایی گشتی دەوڵەت بووە، بەشی ناوخۆیی قوتابیانی نەبووە.

هەروەکو ئەوەی لە ئاماری تایبەتی قوتابخانەکە هاتووە لە ساڵی خوێندنی (١٩١٥ – ١٩١٦) بریتی بووە لە چوار کەسی کارگێڕ لەنێوانیاندا بەڕێوەبەر، بەڵام ژمارە مامۆستاکانی (١٧) کەس بووە، ئاماری ئاستی خویندنیان بەم شێوەیە: بەڕێوەبەر (دار المعلمین العالیة) بەشی ئەدەبی خوێندوو، یەکێکیان لە (دار الفنون) بەشی سروشت، یەکێکی تریان (دار الفنون) زانستی ئەدەبی، دوو کەسیان (قوتابخانەی سەربازی)، یەکێکیان (قوتابخانەی پاشایەتی)، دوانیان (قوتابخانەی سوڵتانییە)، یەك کەسیان (قوتابخانەی ئامادەیی)، دوو کەسیان (فێرکردنی تایبەت)، یەکێکیان (قوتابخانەی غەیرە موسڵمان).

لە هەموو بەڵگەنامەکانی تر دەبارەی ئەم قوتابخانەیە هیچ ئاماژەیەك بە ناوی کادیرانی پەروەردەیی نەهاتووە تەنها ناوی بەڕێوەبەرەکەی نەبێت کە (ئیبراهیم حەقی ئەفەندی)یە کە دەرسی وتووەتەوە لە ئامادەیی موسڵ بۆ ماوەی شەش ساڵ بە بەردەوامی، لە ساڵی (١٩١٦)دا گواستراوەتەوە بۆ ئامادەیی کەرکوك بۆ بەڕێوەبەردنی قوتابخانەکە، بەڵام نەیتوانیووە لە ساڵێك زیاتر بەردەوام بێت لەم قوتابخانەیە لەبەر کەش و ئاو و هەوای پارێزگاکە، بۆیە داواکارییەکی لە (٣٠)ی تەموزی ساڵی (١٩١٧)ی زاینیی پێشکەش بە وەزارەتی مەعارف کردووە بۆ گواستنەوەی لە یەکێك لە ئامادەییەکانی سوریا یان حەلەب.

ئەم قوتابخانەیەش وەکو هەموو قوتابخانەکانی تری سوڵتانییە کە لە دوای ساڵی (١٩١٣)دا دامەزراوە بریتی بووە لە دوو بەش: بەشی یەکەم (سەرەتایی)، بەشی دووەم کە پێشکەوتوو بوو (سوڵتانییە)، لەم قوتابخانەیەدا بەشی زانستی لە بەشی پێشکەوتوو نەکراوەتەوە تەنها بەشی ئەدەبی هەبووە.

ژمارەی قوتابییەکانی لەنێوانی ساڵانی خوێندنی (١٩١٥ – ١٩١٦)ی زاینیی (٢١٩) قوتابی بووە، کە (٥١) قوتابییەکان کرێی خوێندنیان داوەو (١٦٨) کەسیان کرێیان نەداوە، لە هەمان ساڵدا ئەم قوتابخانەیە ژمارە قوتابییەکانی کەمی کردووە بە تایبەتی ژمارەی قوتابییەکانی قۆناغی سەرەتایی کە (٢٠) کەسیان وازیان هێناوەو (٧) قوتابییان لە قۆناغی ئامادەیی بوونەو دوو قوتابییان لە بەشی پێشکەوتووی ئەدەبی بووە، هەر وەکو ئەو خشتەییەی کە ئاماژەی پێ کراوە لە ساڵی (١٩١٦)دا کە بەم شێوەیە خوارەوەیە:

*** قوتابخانە پیشەییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە کەرکوك:**

"دامەزراندنی ئەم قوتابخانانە لە دەوڵەتی عوسمانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتانی (عەبدولمەجید)، هەستا بە دانانی هەندێك قوتابخانەی پیشەیی لە ئەستەمبوڵ وەکو (قوتابخانەی کشتوکاڵ) لە ساڵی (١٨٤٧)، (قوتابخانەی دارستان) لە ساڵی (١٨٥٨)، (قوتابخانەی فەرمانبەرانی تەلەگرام) لە ساڵی (١٨٦٠)، (قوتابخانەی کانزاکان) لە ساڵی (١٨٦٨)، بەڵام هەموو ئەم قوتابخانانە لە ئاستی پێویستدا نەبوونەو لە ڕووی ئاستی خوێندنەوە لاواز بوونە"[٢٠].

"بەڵام لە ساڵی (١٨٧٠)ی زاینییدا لە سەردەمی (میدحەت پاشا)دا ئەم قوتابخانەیە دامەزراوە لەلایەن خەڵکەوە بۆ منداڵانی هەژار، لە سەرەتادا ناوی (ئیسلاح خانە) بووە بە مانای (شوێنی چاککردن)، لە دوای دامەزراندنی هەر یەکە لە خەڵکی شارەکەو ئەندامانی فەرمانگەکان یارمەتی داراییان داوە بۆ بەردەوام بوونی.

هەر وەکو ئەوەی لە ساڵنامەی موسڵی ساڵی (١٩١٢)دا هاتووە ئاماژەی کردووە بە ئەندامان و کادیرانی کارگێڕی قوتابخانەکە، وەکو:

- بەڕێوەبەر (محەمەد بەهجەت بەگ).
- بنووس و ئەمین سەندوق (ئەحمەد تۆفیق ئەفەندی).
- مەئموری خەزنە (بەکر سدقی ئەفەندی).

بەشی زۆری باربووی قوتابخانەکە لەلایەن گەنجینەی ویلایەتی موسڵەوە دابین کراوە، لە ساڵی (١٩١٥)دا بەشی ناوخۆیی بۆ کراوەتەوە، (حوسێن بەگ) یەکێك بووە لە بەڕێوەبەرە بەناوبانگەکانی کە دەوڵەتی عوسمانی ڕێزی لێگرتووە بە مەدالیای (الصنائع) لە ساڵی (١٩١٦)دا، هەروەها لە دوای ئەویش (حوسێن جەمال ئەفەندی) بە هەمان شێوە ڕێزی لێ گیراوە"[٢١].

"ئەم قوتابخانەیە بایەخی دەدا بە پێگەیاندن و فێرکردنی پیشەسازی بۆ گرنگی ئابووری و بواری فێرکردن، هەروەها فێرکردنی هەندێك لە پیشە زیدووەکان تا بۆ ئەوەی کۆمەڵگە سوودی لێ ببینێ.

قوتابخانەی (ئەلسەنایع) بە پێنج قۆناغدا دەڕۆیی، کە لە هەر قۆناغێدا خوێندنی جۆربەجۆر دەخوێندرا بەم شێوەیەی خوارەوە:

- پۆلی یەکەم: (حیساب، هێڵی بەیانی، فێرکردنی هەندێك شێوەی ئەندازەیی و پیشەسازی).
- پۆلی دووەم: (خوێندن و نووسین و زمانی تورکی، حیساب، هونەر و وێنە کێشان، جوگرافیا، لێکۆڵینەوەی ئەندازیاری، پێناسەکردنی هەندێك ئیش و کارکردن، کارکردن لەو پلانەی کە کەسەکان دەیانەوێت).
- پۆلی سێیەم: (نووسین بە زمانی تورکی، چۆنییەتی گرتنی دەفتەر، پێکهاتە سرووشتییەکانی هەندێك لە کانزا و دارو وەسفکردنی. لێکۆڵینەوە لە هەندێك ئامرازی سادە وەکو بەکرە و بورغی و ڕووی لێژ، هونەر میکانیك).
- پۆلی چوارەم پێنجەم: (نووسین بە زمانی تورکی، خۆشنووسی. حیساب، تاقیکردنەوەی کیمیایی لە پیشەسازیدا، فێرکردن لە هونەری تەلارسازی و میکانیك).

بەڵام ئەو پیشەو پیشەسازییانەی کە لەو قوتابخانەیە فێر دەکران بریتیبوون لە: کاری کانزایی و داری و پتەوکاریدا لە پاڵ پیشەسازی ئامرازەکانی میکانیك و تەلارسازی وەکو خەیاتی و پێڵاودووری و لە بەرگگرتنەوەی کتێب لەگەڵ فێرکردنی هونەر و زانستی تایبەت بە پیشەکان، هەروەها فێردەکران لەسەر چنینی دەستی لەسەر حەریرو لۆکە.

مەرجەکانی وەرگرتن لەم قوتابخانانە:

١. نابێت تەمەنی لە (١٣) ساڵی زیاتر بێت.
٢. دەبێت هەتیوو بێت و نە دایکی هەبێت و نە باوك، یان ئەگەر یەکێکیانی هەبێت و بێ کار بێت و پێویستی پێبێت.
٣. نابێت کەسوکاری ئەم منداڵە یان کەسە نزیکەکانی لەم قوتابخانەیە دەریکەن تا تەواوکردنی ماوەی خوێندنەکەی

| پۆل | ئەیلولی ساڵی (١٩١٥) | | | ئاداری ساڵی (١٩١٦) | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کرێیان داوە | کرێیان نەداوە | کۆ | کرێیان داوە | کرێیان نەداوە | کۆ | |
| یەکەم | | ١٤ | ١٤ | ١٤ | | ١١ | ١١ |
| دووەم | | ٢٦ | ٢٦ | ٢٦ | | ٢٠ | ٢٠ |
| سێیەم | | ٣١ | ٣١ | ٣١ | | ٣١ | ٣١ |
| چوارەم | | ٣٠ | ٣٠ | ٣٠ | | ٢٩ | ٢٩ |
| پێنجەم | | ٤٧ | ٤٧ | ٤٧ | | ٣٧ | ٣٧ |
| کۆی بەشی یەکەم | | ١٤٨ | ١٤٨ | ١٤٨ | | ١٤٨ | ١٤٨ |
| شەشەم | ٢٢ | ٩ | ٣١ | ٣١ | ٢٢ | ١٠ | ٣٢ |
| حەوتەم | ١٢ | ٧ | ١٩ | ١٩ | ٩ | ٧ | ١٦ |
| هەشتەم | ١١ | ٢ | ١٣ | ١٣ | ٥ | ٣ | ٨ |
| نۆیەم | – | – | – | – | – | – | – |
| کۆی قۆناغی یەکەم | ٤٥ | ١٨ | ٦٣ | ٦٣ | ٣٦ | ٢١ | ٥٦ |
| ئەدەبی / دەیەم | ٤ | ٢ | ٦ | ٦ | ٤ | ١ | ٥ |
| ئەدەبی / یانزەیەم | – | – | – | – | ١ | – | ١ |
| ئەدەبی/ دوانزەیەم | ٢ | – | ٢ | ٢ | | | |
| کۆی قۆناغی دووەم / ئەدەبی | ٦ | ٢ | ٨ | ٨ | ٥ | ١ | ٦ |
| کۆی گشتی | ٥١ | ١٦٨ | ٢١٩ | ٢١٩ | ٤١ | ١٤٩ | ١٩٠"(١٩) |

كە پێنج ساڵە، ئەگەر هاتوو دەریانكردن دەبێت پارەی هەموو ئەو خەرجییە بدات كە دەوڵەت بۆی سەرف كردووە، ئەو خەرجییانە دەبڕێت لە كۆی ئەو پارەییەی كە قوتابییەكە دەستی كەوتووە لە كاری رۆژانەی.

٤. لەم قوتابخانەیەدا ئەو منداڵانەش وەردەگرێت كە هەتیوو نین كە لە یەكەی ناوخۆییدان كە هەموو سەرەتای ساڵێك (٥٠٠) قرش دەدات.

٥. بەپێی مادەی (١٦) لە پەیڕەوی قوتابخانەكانی (ئەلسەنایع) جیاوازی ناكات لەنێوان قوتابییەكی موسڵمان و نا موسڵماندا لە پرۆسەی وەرگرتن.

جلوبەرگی قوتابییەكانی ئەم قوتابخانەیە رەنگی خۆڵەمێشی بوو، هەر قوتابییەكیش قەمسەڵەیەكی دەدرێتێ لە ماوەی سێ ساڵدا، هەموو ساڵێكیش چاكەت و پانتۆڵ و پێڵاو و تەربوش و كراس و دەرپێ و فانیلەی دەدرێتێ، چاكەت و پانتۆڵەكەی تایبەتە بۆ لەبەر كردن كاتێك دەچنە دەرەوەی قوتابخانەكە، هەر قوتابییەكیش جلوبەرگی تایبەتی دەدرێتێ لە ماوەی ساڵێكدا دوو جار بۆ كاركردن.

دوای دامەزراندنی قوتابخانەی (ئەلسەنایع) لە بەغدا دەوڵەتی عوسمانی هەڵسا بە دروستكردنی دوو قوتابخانە لە هەر یەكە لە كەركوك و موسڵ لە ساڵی (١٨٧١)، ئەویش لەبەر ئەوەی كە پیشەسازییەكان لە هەر یەكە لە شارەكانی (بەغدا، موسڵ، كەركوك) لە ژمارەی دانیشتوان زیادی كرد، بۆیە پێویستی پیشەكاران لەم پارێزگایانە گرنگی خۆی هەبوو. بە قوتابخانەی سەنایەعی كەركوك دەوترا (ئیسلاح خانە).

بەڵام دوای ماوەیەك لە دامەزراندنی ئەم قوتابخانانە دەوڵەت هەستا بە بڕینی یارمەتی بۆ ئەم قوتابخانانە و ئەمە وای كرد پاڵ بە قوتابییانەوە بنێت كە هەستن بە نووسینی سكاڵانی خۆیان لەسەر لاپەرەكانی رۆژنامەی (الزوراء) ژمارە (٥٤٧) لە ساڵی (١٨٧٥) كە داوای یارمەتییان دەكرد لە دەوڵەت و خەڵكی و كەسوكاریان بۆ یارمەتیدانیان، بەڵام هەموو ئەم نووسینانە دەوری خۆی نەبینی لە رزگار كردنی یارمەتی قوتابییان، هەر بۆیە دەبینین ناوی ئەم قوتابخانانە لە كەركوك بەرچاو ناكەوێت لە ساڵنامەكانی ساڵانی (١٨٧٧، ١٨٩٢، ١٩٠٧)، بەڵام لە ساڵی (١٩٠٨) دووبارە ناوی دەكەوێتەوە ناوان و ناوی هەیە، ئەویش بە ئەرك و ماندووبوونی موتەسەریفی ئەو كاتە (عەونوڵڵا ئەلكازمی)، بەڵام هیچ سەرچاوەیەكی عوسمانی ئاماژە بە بوونی ئەم قوتابخانەیە ناكات لەنێوان ساڵانی (١٨٧٢ – ١٩٠٨).

لە رۆژنامەی (حوادث) گەلێك بە درێژی باسی گۆرانكاری ئەم قوتابخانەیە دەكات لە كەركوك كە لە ژمارەی (٨٤)یدا ئاماژەی پێ كردووە كە لە بەشی دووەمی ئەم قوتابخانەیە شوێنێك دیاری كراوە بۆ بەڕێوەبەرو دەستەی كارگێر، بەڵام لە ژمارە (٨٥)دا ئاماژە بە كردنەوەی بەشی ئاسنگەری دەكات، هەروەها لە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵدا كە لە ساڵی (١٩١٢) دەرچووە ئاماژە بە بوونی ئەم قوتابخانەیە دەكات لە كەركوك، لەگەڵ ئەوەی كە هەوڵدان بۆ كۆكردنەوەی ئەو كەم و كوڕیانە كە لە بینای قوتابخانەكەدا هەبووە.

لە (١٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩١٣)دا موتەسەریفی كەركوك (سلێمان سری بەگ) سەردانی ئەم قوتابخانەیەی كردووە لە كەركوك و لە ژمارەی (٩٢)ی رۆژنامەی (حوادث) ئاماژە بە رووداني كێشەی دارایی كراوە لە نێو قوتابخانەكە كە ئەمە بووە بەهۆی كە وەزارەتی مەعاریف هەستێت بە پێكهێنانی لیژنەیەك بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشە داراییە.

لە دوای ئەوەی كە دەوڵەتی عوسمانی چووە نێو شەڕی جیهانی یەكەمەوە هیچ قوتابخانەیەك لەم قوتابخانانە لە عێراقدا نەما تەنها لە بەغدا نەبێت كە ژمارەی قوتابییەكانی (٧٠) قوتابی بوون لە ساڵی (١٩١٥)دا[٢٢].

"ئەوەی روون و ئاشكرایە ئەم مەدرەسەیە چاپخانەیەكی بۆ هاتووە بە ناوی (چاپخانەی قوتابخانەی ئەلسەنایەع)، كە بەشێك لەو رۆژنامانەی بە چاپ گەیاندووە كە لە كەركوك دەرچووە، وەكو (نجمە) كە لە دوای داگیركردنی ئینگلیزەكان لە كەركوك لە ساڵی (١٩١٨) دەرچووە"[٢٣].

*** قوتابخانە ئیسلامییە باوەكانی دەوڵەتی عوسمانی لە كەركوك:**

"مەبەست لەم قوتابخانانە برێتییە لەو قوتابخانانە لە دەوڵەتە ئیسلامییە جیاجیاكان بڵاوبوونەتەوە لەلایەن دەوڵەت عوسمانییەوە، بە پلەی یەكەم لە ژێر كاریگەری فێركردنی زانستی ئایینیدایە.

ئەم قوتابخانانە تەنها لە سەردەمی عوسمانییەكاندا بڵاونەبووەتەوە، بەڵكو زۆربووە و فراوان بووەتەوە كە گەلێك لە سوڵتانەكان و پیاوەكانی دەوڵەت و دەستڕۆیشتووەكان دەوریان هەبووە لە بنیاتنانیداو (وەقف)كردنی پارە بۆی و پاراستنی لە بەردەوامی كارەكانیدا.

ئەوەی ویلایەتی موسڵ لە شوێنەكانی تر جیادەكاتەوە ئەوەیە كە ژمارەیەكی زۆر لەم قوتابخانانە بڵاوبووەتەوە، كە هەندێك لە قوتابخانەكانی ناوبانگی بەرچاوەی بە خۆیەوە بینیوە و گەلێك لە زانای ئایینیی وانەیان تێدا وتووەتەوە، بۆیە ئەگەر سەیری ویلایەتی موسڵ بكەین دەبینین رێژەی بەرچاوە لەم قوتابخانانەی تێدا بڵاوبووەتەوە، وەكو:

١. شاری موسڵ (٣١) قوتابخانە.
٢. دهۆك یەك قوتابخانە.
٣. عەمادییە (٧) قوتابخانە.
٤. زاخۆ یەك قوتابخانە.
٥. سلێمانی (٣٣) قوتابخانە.
٦. گولعەنبەر (٤) قوتابخانە.
٧. كەركوك (١٧) قوتابخانە.
٨. سەلاحیە (كفری) دوو قوتابخانە.
٩. هەولێر (٦) قوتابخانە.
١٠. رەواندووز یەك قوتابخانە.

زۆربەی ئەم قوتابخانانە وەكو لە ساڵنامەكاندا ئاماژەی پێكراوە لە ویلایەتی موسڵ وەكو هەموو ویلایەتەكانی تر لە نێو مزگەوتەكاندا بووە[٢٤].

*** چالاکی موژدەبەرەکانی مەسیحی لە عێراق:-**

"فێرکردنی خوێندن لە قوتابخانەی مەسیحییەکان لە ولایەتەکانی عێراقدا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیەو هاوشان بوو لەگەڵ خوێندن لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، مەسیحییەکان ڕێژەی (٢،٢٪)ی دانیشتوانی ولایەتەکانی عێراق پێکدێنن لە (٧٥،٣٪)ی لە ویلایەتی موسڵ بوونو ڕێژەکانی تریان لە ویلایەتی بەغداو ویلایەتی بەسرە بووە، ژمارەی دانیشتوانی سی هەزار کەس بووە لە ویلایەتی موسڵ"[٢٥].

"دەوڵەتی عوسمانی دەسەڵاتێکی فراوانی دابوو بە سەرۆکی پێکهاتە ئایینیو ڕوحانییەکانی مەسیحییەکان، هەر بۆیە مەسیحییەکان بۆ هەموو کاروبارێکیان دەگەڕانەوە بۆ لای پیاوە ئایینییەکانیان، بەتایبەتی لە بواری باری شارستانیو کاروبارەکانی دەوڵەتو وەقفی کڵێسەکانو کاروباری قوتابخانەو دەزگا خۆبەخشەکانی تایبەت لە مەسیحییەکان، لە پاڵ ئەمانەشدا دەنگۆی ئەوە بڵاودەبووەوە کە دەوڵەت کەمتەرخەم بووە بەوەی کە بەیەکسانی کاروباری موسڵمانو ناموسڵمانەکانی بەڕێوە نەبردووەو هەندێ جار دەوڵەتە ئەورووپییەکان دەستیان دەخستە کاروباری عوسمانییەکانەوە بە هانەی ئەوەی یارمەتی مەسیحییەکان دەدەن، هەر ئەمەش وای کرد پاڵی بە دەوڵەتی عوسمانییەوە نا کە مەرسوومی (گوڵخانە) دەربکات لە ساڵی (١٨٣٩) دا کە دەروازەی ئەو چاکسازییانە بوو لەلایەن سوڵتانی عوسمانییەوە، بۆ پاراستنی ماڵو موڵكو سەروەتیان، هەر ئەمەش وای کرد لە بواری یاسای فێرکردندا بایەخ بە کردنەوەی قوتابخانەی ڕوشدییەی کورانو کچان بدرێت تایبەت بە مەسیحییەکان بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە زۆرینەی دانیشتوان پێکدێنن، یان ئەو پێکهاتە ئایینییانەی تر کە لەو شوێنەدا دەژین، بەشێك لەم قوتابخانانە شێوازی فێرکردن لەسەر زانستی تازە بوو و بەشێکی دیکەیش تایبەت بوو بە پەروەردەی ئایینی بە تایبەتی لە بواری لێکۆڵینەوەی لاهوتیدا"[٢٦].

سیاسییەتی دەوڵەتی عوسمانی ڕێگەپێدراو بوو بۆ ئەوەی کەوا پیاوە ئایینییەکانی مەسیحییەکان هەستن بە دروستکردنی شوێنی پەرستنو دەزگای خۆبەخشو کردنەوەی قوتابخانە، هەروەها ڕێگەنەدانی منداڵانی مەسیحی لە قوتابخانەکانی موسڵمانانندا هۆکارێك بوو بۆ سەربەستی پێکهاتەی مەسیحییەکان بە کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتاییو ڕوشدییە تایبەت بە خۆیان، لە پاڵ یارمەتی موژدەبەرەکانی ئایینی مەسیحی بۆ پێکهاتەکانیان لەناو ولایەتەکانی عێراقدا بە تایبەتی لە ڕووی داراییەوە هۆکارێکی گرنگە بۆ پێشکەوتنی قوتابخانە بۆ پێکهاتەی ئایینی مەسیحی.

"بۆ نموونەی ساڵی (١٨٠٥)دا ژمارەیەك قوتابخانەیان هەبوو تایبەت لە کلدانەکان لە ویلایەتی موسڵ کە نزیکەی (١٧) قوتابخانەی بوو کە لە ساڵی (١٨٩٢)ی زایینیدا بوو بە (٢٠) قوتابخانە کە بەشی کەرکوكو سلێمانیو هەولێرو کۆیەی تێدا بوو، کە فێرکردنی بەشی زمانی تورکی بوو"[٢٧].

"پرۆسەی دامەزراندنی قوتابخانە یەکێك بووە لە بنەما گرنگو چالاکەکانی ئەم موژدەبەرە ئەورووپییانە لە ویلایەتییەکانی عێراقدا، بە تایبەتی لەسەر دەستی کاسۆلیکە فەرەنسییەکان لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەم کە بەردەوام بوو هەتاوەکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، کاریگەری ئەم چالاکییانە خۆی دەبینییەوە لە جۆری ئەو پەیوەندییانەی دەوڵەتە ئەورووپییەکان هەیانبوو لەگەڵ عوسمانییەکان لەلایەك، لە پاڵ چالاکی خۆیان لەو ناوچانەی کە دەسەڵاتو توانایان بەسەریدا دەڕۆیی، بۆیە هەردەم لە سیاسەتێکی بەرزبوونەوەو داکشاندا بوو لەپێناو بەرژەوەندی هەردوولا"[٢٨].

موژدەبەرەکانی مەسیحی، جۆراوجۆرو بە شێوازی جیاواز جیاواز هەوڵیانداوە ئەوەی کە لەپێناویدا تێکۆشاون هەوڵی بۆ بدەن لە هەمان کاتدا بتوانن ئەم هاوسەنگییە ڕابگرن لە خزمەت ئایینی مەسیحیداو چۆنییەتی پروپاگەندەکانی خۆیان لەپێناو بە دەستهێنانی ڕێژەیەکی زۆر لە خەڵکی دانیشتووان بۆ ئەوەی بتوانن خزمەت بە ئایینو بەرژەوەندی خۆیان بکەن لە بواری سیاسیو سەربازیدا، هەر وەکو ئەوەی کە دیمان لە داهاتووی ئەم پرۆسەیە لە بەربەرەکانی سیاسیو سەربازی دەوڵەتی عوسمانیو دەوڵەتە ئەورووپییەکان لە شەڕی جیهانی یەکەمدا لە ساڵی (١٩١٤-١٩١٨)ی زایینی کە کۆتایی هێنا بە دەسەڵاتی ڕەهای دەوڵەتی عوسمانی.

*** هۆکارەکانی سەرهەڵدانی مژدەبەخشەکان:-**

١. هاوکاری چالاکی ئەمانە هاوپەیوەست بووە بە ئامانجو چالاکییەکانی داگیرکارە ئەورووپییەکان، ئەویش بە هۆکارێکی سەرەکی دادەنرێت لە کردنەوەی قوتابخانە لە هەموو پارچەکانی دەوڵەتی عوسمانی، لە پاش ئەوەی توانایەکی چاکیان بە دەست هێنا لە بەدەستکەوتنی مافی کەمە نەتەوەییەکانو ئایینییەکان لە ولایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

٢. کردنەوەی دەروازەی دەوڵەتی عوسمانی بەرووی ڕۆژئاوادا هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ چالاکی مژدە بەخشەکان تا بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەناو دەوڵەتی عوسمانی جێبەجێ بکەن.

٣. بەربەرەکانی ئاینزایی لەنێوان کاسۆلیكو پرۆتستاندا دەورێکی گەورەی بینی لە بایەخدان بە کردنەوەی قوتابخانە لە ولایەتەکانی دەوڵەتی عوسمان.

٤. بەهۆی گەشەکردنی خوێندنی مەسیحی ڕۆژئاواییو دەوری گرنگی قوتابخانەکانی موژدەبەخشەکان بوو بە هۆکارێکی گرنگ لە پێشوازیکردنی کردنەوەی ئەو قوتابخانانەدا.

٥. بەهۆی پێشوازیکردنی ئەم قوتابخانانە لەلایەن موسڵمانو مەسیحییەکانەوە دەورێکی گرنگی بینی لە پێشوازی قوتابی لە ئاستی خوێندنی لەم قوتابخانانە.

"لە ساڵی (١٨٦٧)ی زایینیدا لەلایەن مژدەبەخشەکانی پرۆتستانتەوە قوتابخانەیەکی سەرەتایی بۆ کوران کرایەوە

لە کەرکوك.

لە ساڵی (١٩٠٢) بەپێی ئەو ئامارانەی کە لە بەڕێوەبەرایەتی ئاماری مەعاریفی موسڵەوە هاتووە ئاماژە بە کردنەوەی قوتابخانەی کلدانی سەرەتایی دەکات لە کەرکوك کە ڕێگەپێنەدراو بووە، ژمارەی قوتابییە کوڕەکانی (٣٠) کەس بووەو قوتابییە کچەکانی (٢٥) کەس بووە لە گەڕەکی لە حەمام لە کەرکوك کراوەتەوە، بەڵام لە ساڵی خوێندنی (١٩١٥ - ١٩١٦) ژمارە قوتابییەکانی (٢٣) قوتابی بووە"[٢٩].

*** مێژووی فێرکردنی خوێندن لەلایەن جولەکەکانی کەرکوکەوە:-**

"بزوتنەوەی بنیاتنانی قوتابخانەی تایبەت بە جولەکەکان لە ولایەتەکانی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم، ئەویش لەو کاتەی کە کۆمەڵێك قوتابخانەی سەرەتاییان دانا لە ولایەتی موسڵو بەغدا، زۆربەی ئەو قوتابخانانەی کە لەلایەن جولەکەکانەوە دامەزرا زیاتر ئەو قوتابخانانە بوون کە بایەخیان بە خوێندنو پەروەرکردنی ئایینی دەدا"[٣٠].

"ڕێژەی جولەکەکانی عێراق لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا دەگەیشتە (٣,٥٪)ی ژمارەی دانیشتوانی عێراق، کە زۆری ڕێژەیان لە ولایەتی بەغدا بوو"[٣١].

"بەپێی سەرچاوەکان لە دەوڵەتی عوسمانی سەربەستییەکی تەواویان دابوو بە کاروباری ئایینیو بەڕێوەبردنی دەزگا خێرخوازیو پەروەردەییەکان، جولەکەکان لە پێشرەوی ئەو پێکهاتە ئایینیانە بوونە کە ڕێگەیان دراوە بە شێوەیەکی فراوان کاروبارەکانیان ببنە ڕێوە.

لە ولایەتی موسڵ هەر لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە جولەکەکانی ئەم ولایەتە گەلێك قوتابخانەیان کردووەتەوە، کە لە سەدەی بیستەمدا نزیکەی حەوت قوتابخانە بووە کە کۆنترینی ئەم قوتابخانانە لە کەرکوك بووە بە ناوی قوتابخانەی (کەرکوك) کە لە ساڵی (١٨١٤ - ١٨١٥)دا دامەزراوە کە ژمارەی قوتابییەکانی لە ساڵی (١٩٠٣) (٦٠) قوتابی بووە"[٣٢]، بەڵام لە ساڵی خوێندنی (١٩١٥ - ١٩١٦) (١٨) قوتابی بووە"[٣٣].

"قوتابخانەی (موسەوی) یەکێك بووە لە قوتابخانەکانی تایبەت بە منداڵانی جولەکە لە کەرکوك کە زمانی خوێندن تێدا بە تورکی بووە، ژمارەی قوتابییەکانی (٦٠) قوتابی بووەو هەموویان کوڕ بوونە، لە ساڵی (١٨١٥)ی زایینیی دامەزراوە بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی لایەنی پەیوەندیدار، لە ساڵی (١٩١٣)دا قوتابخانەی (ئیلیانس) لە کەرکوك کرایەوە کە تایبەت بووە بە قوتابیانی جولەکە، ژمارە قوتابییەکانی (٢٥٠) قوتابی بووە، ئەم قوتابخانەیە دەورێکی گرنگی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری لە شارەکە"[٣٤].

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. (التعليم في العراق في العهد العثماني الاخير ١٨٦٩ - ١٩١٤م)، دکتۆر جەمیل موسا ئەلنەجار، (دار الشؤون الثقافية العامة)، ٢٠٠١، بەغدا، لاپەڕە (٤٣).

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٢).

٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٦ - ٤٧).

٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠٠ - ١٢٠) بە کورتکراوەیی

٥. (المؤسسات التعليمية في المشرق العربي العثماني، دراسة تأريخية احصائية في ضوء الوثائق العثمانية)، فازل بەیات، ئەستەمبوڵ، ٢٠١٣، لاپەڕە (٤٧).

٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٩٤ - ١٩٥).

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٩٥ - ١٩٦).

٨. (صفحات من تأريخ كركوك منذ فجر التأريخ الى ١٩٥٨)، نەجات کوسەر ئۆغلو، کەرکوك، ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٩١ - ١٩٢).

٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، کۆمەڵێك لاپەڕەی جۆراوجۆر.

١٠. (المؤسسات التعليمية في المشرق العربي العثماني)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠١).

١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠١).

١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠٩ - ٢١٠).

١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٣٣ - ٢٣٨).

١٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧٠ - ٢٧١).

١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧١ - ٢٧٢).

١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٣٢ - ٣٣٤).

١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٤٩).

١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٥٢).

١٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٧١ - ٣٧٢).

٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٧٥).

٢١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩٩).

٢٢. (كركوك في العهد العثماني ١٢٩٣ - ١٣٣٣ هـ / ١٨٧٦ - ١٩١٤ م، دراسة في اوضاعها الادارية والاقتصادية والثقافية)، مەهدی ساڵح سەعید ئەلعەباسی، نامەی ماستەر لە زانکۆی موسڵ، ٢٠٠٥، لاپەڕە (١٥٩ - ١٦٣).

٢٣. (المؤسسات التعليمية في المشرق العربي العثماني)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩٩).

٢٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٧٠).

٢٥. (التعليم في العراق في العهد العثماني الاخير ١٨٦٩ - ١٩١٤م)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٠).

٢٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٣ - ٢٢٤).

٢٧. (كركوك في العهد العثماني)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢٩).

٢٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٥٧).

٢٩. (المؤسسات التعليمية في المشرق العربي العثماني)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٧١).

٣٠. (التعليم في العراق في العهد العثماني الاخير ١٨٦٩ - ١٩١٤م)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨٥).

٣١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨٦).

٣٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٠٠ - ٣٠١).

٣٣. (المؤسسات التعليمية في المشرق العربي العثماني)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٧١).

٣٤. (صفحات من تأريخ كركوك منذ فجر التأريخ الى ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠٧ - ٢٠٨).

*** ڕەوشی خوێندن و پەروەردە لە کفریدا[*]:**

**حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ**

شاری کفری لە ڕۆژگارێکدا نزرگەو ڕووگەی زانایان و مەڵبەندی زانست و زانیاری بووە، لە هەموو شارەکانی کوردستانەوە بە کۆمەڵ (مەلاو فەقێ)[1] بۆ خوێندنی ئاینیی ڕوویان تێدەکرد[2]، چەندین کەسایەتی ئایینیی و کۆمەڵایەتی ڕۆڵیان لەبەرەو پێشچوونی ڕەوشی خوێندن لەم شارەدا بینییوە وەك: (حاجی کاك ئەحمەدی شێخ) (١٧٩٣ - ١٨٨٨) لە سەردەی نۆزەدا لە کفرییەوە بۆ حەج چووە لەلایەن خەڵکی شارەوە زۆر ڕێزی لێگیرابوو، چەند ڕۆژێك تێیدا مابووەوە، فەرمانی داوە مزگەوت و مەدرەسەیەك بۆ دەرسی ئایینیی لە کفریدا بکرێتەوە، لە کاتی گەڕانەوەی لە حەج مزگەوت و مەدرەسەکە پێکەوە تەواو بوو، بەمە زۆر دلخۆش ئەبێت و ڕەزامەندی لەسەر دانیشتوانی شار نیشان ئەدات، ئێستاش ئەو مزگەوتە لە شوێنەکەی خۆیدا پارێزراوەو فراوان و گەورەتر کراوە هەر بە (مەدرەسە) بەناوبانگە[3]، لە سەرەتادا (مەلا حەسەن قەرەداغی) بووە مەلای مزگەوتەکە[4]، هەر لە دروست بوونییەوە بەردەوام شوێنی خوێندن و فێرکردن بووە.

(شێخ زیائەددین - عومەری کوڕی شێخ عوسمانی نەقشبەندی) (١٨٤٠ - ١٨٩٩) لە ساڵی (١٨٨٨) بۆ حەجی ماڵی خوا لە کفرییەوە تێپەڕ بووە، فەرمان دەدات (خانەقایەك و مەدرەسە) دروست بکرێ، مەجید پاشا بابان ئەرزێکی ئەبێت ئەیبەخشێت، تاکو بە پیتاك و باربووی دانیشتوانی شار مزگەوت و خانوویەك بۆ مەلا دروست بکرێت[5]، لە ساڵی (١٨٨٩) کاتێك لە حەج گەڕاوەتەوە کەموکوڕیی لە دروستکردنی خانەقاکەدا هەبووە وڵاخەکەی ژێر خۆی فرۆشتووە تاکو خەرجی خانەقاو مەدرەسەکەی دابین کردووە، خەڵکی شار یارمەتییان لە دروستکردنیدا داوە، کە مزگەوتەکە تەواو بوو (نیزامەددین)ی کوڕی بۆ سەرپەرشتی کردنی دانا، دواتر خۆی (مەلا ئەحمەد)ی خەڵکی ناوچەی خورماڵی نارد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری مزگەوتەکە، لە دوای ئەو (حاجی مەلا ئیبراهیم) لەنەوەی (مەلا عوسمانی گەورە) سەرپەرشتی کردووە، ئێستا بە مزگەوتی (خانەقا) ناسراوە[6].

لە ساڵی (١٨٩٥) بە فەرمانی سوڵتانی عوسمانی مزگەوتێکی گەورە لە شاری کفریدا دروستکرا، بە (مزگەوتی گەورە) بەناوبانگە، (مەلا ئیسماعیل)و (مەلا مستەفا)و (مەلا سەعید سوەیلی ئیمام)و وتاربێژی ئەو مزگەوتە بوون[7]، خوێندنی ئایینیی لەو سێ مزگەوتەدا بەدەوام بوو.

جگە لەو سێ مزگەوتە مزگەوتی سەیدەکان کە لەلایەن بنەماڵەی سەیدەکانی کفرییەوە دروستکرا، هەروەها مزگەوتی (حاجی ڕەشید)کە لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دروستکرا، هەر یەك لەو مزگەوتانە ژمارەیەك موستەعیدو فەقێی هەبووە[8].

لە ساڵی (١٨٤٩) قوتابخانەی ئایینیی سەلاحیە (کفری) ژمارەیەك زانای تێدا بووە لەوانە (ئەبو بەکری سەلاحی)[9]، لە ساڵی (١٩١٩) لە کفری (٣) حوجرەو بە هەموویان (٦٠) فەقێیان هەبووە[10].

هەر چەندە ئەم جۆرە خوێندنە پێشینەیەکی مێژووی هەبوو، لە دوای سەدەی حەڤدەوە لە شاری کفری وانەی ئایینیی تێدا وتراوەتەوە. قوتابخانە ئایینییەکانی کفری ژمارەیەکی زۆر مامۆستاو زانا لەوانە (شێخ عەبدوڵڵا قەرەداغی) و (شێخ عومەر زیائەددین مەلا سەعید موفتی)و (شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ حەسەن قەرەداغی)و (مەلا سمایلی دەلۆ) بەشداری وانە وتنەوەیان لە کفریدا کردووە[11]، مەلا باشەکانی ناوشار بەشێکیان لە ناوچەی سلێمانییەوە هاتبوون وەك (مەلا ئەحمەد، مەلا ئیسماعیل، مەلا سەعید سوەیلی، حاجی سەید ئەحمەدو.. هتد)[12].

دکتۆر (موکەڕەم تاڵەبانی) باس لە خوێندنی ئایینیی لە سەردەمی خۆیدا دەکات کە لە کوردستان ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو بۆ پێگەیاندنی توێژێکی خوێندەوارو ڕۆشنبیر، (مەلا محێددین) خەڵکی سلێمانی لە کەلارەوە چووەتە زەرداو وانەی ئایینیی و زمانی فارسی فێرکردووە[13].

(مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) (١٩١٣ - ٢٠٠١) لە دوای ساڵی (١٩٣٤) لە شاری کفری لە قوتابخانەی ئایینیی لەلای (موفتی سەعید ئەفەندی سوەیلی) خوێندوویەتی[14]، مەلایەك وانەی ئایینیی بە (سەیید هاشم سەید ئەحمەد) وتووە ناوی (مەلا برایم) بووە، ئەوانەی کە خوێندنی ئایینییان تەواو بکردایە لە قوتابخانەی فەرمی (میر)ی لە پۆلی دوو وەردەگیران[15].

بە گوێرەی گێڕانەوەی مامۆستا (سەلاحەددین مەجید) لە ساڵی (١٩٤٠ - ١٩٤١)ی زایینیی یەکێك لە مەدرەسە ئایینییەکان نزیکەی (٤٠ - ٥٠) فێرخوازی هەبووە، (مەلا نەجمەددین) وانەی ئایینیی بە فەقێکان دەووت، زۆر کەس لەوێ فێری قورئان خوێندن بوون، بە پارەو یارمەتی کەم مەلا وانەی دەگووتەوە، لە پشووی هاویندا زۆربەی قوتابیانی قوتابخانەی فەرمی دەچوونە حوجرە تاکو شارەزایان لە زمانی عەرەبیدا هەبێت و فێری قورئان خوێندن بن، (مەلا سەید عەبدوڵڵا)، (مەلا موفتی محەمەد سەعید سوەیلی) ئەمانە پێشەنگ بوونە لە وانە وتنەوەدا[16].

لە سەردەمی عوسمانیدا لە قوتابخانە ئایینییەکاندا (مەدرەسە) خوێندن بۆ قوتابیان بە خۆڕایی بوو، باوکی قوتابییەکان برێك کۆمەکیان پێشکەش بە مامۆستا (مەلا)کان کردووە کە منداڵەکانیان فێری خوێندنی قورئان و نووسین و بیرکاری کردووە[17]، ئەو قوتابخانە ئایینییانە ڕۆڵی بەرچاویان لە ڕۆشنبیرکردنی خەڵکی ناوچەکەدا بینیوە.

*** قوتابخانە ئایینییەکانی دەرەوەی شار:**

قوتابخانەی (بەلرووت) لەلایەن زانای بە ناوبانگ (مەلا مەحمودی بەرلوتی) (١٨٦٨ - ١٩٣٤) خوێندەواری و ڕۆشنبیری تێدا بڵاوکردووەتەوە، قوتابخانەی (چیمەن) لە ناوچە کفری کە (مەلا حەیدەر) لە سەدەی هەژدەی زایینیی

بۆ وانە وتنەوەی ئایینیی دروستکردووە[١٨].

قوتابخانەی (قەرەبلاغ) ژمارەیەك مامۆستا وانەیان تێدا دەگووتەوە لەوانە (شێخ محەمەد نەجیب کوڕی شێخ وەهاب تاڵەبانی)و (سەید عەبدولحەکیم هۆرێنی)و چەندانی تر[١٩].

وێڕای ئەوەی لە کفری هەمیشە حوجرە هەبووە، تاکو سەرەتای سییەکان خوێندن لە گەرمیان زۆرتر لە حوجرەدا بووە، لە زۆر جێگای ناوچەکانی سنووری قەزای کفری حوجرەو شوێنی خوێندنی ئایینیی هەبووە، کەلاری کۆن بەردەوام حوجرەی تێدا بووە، لە گوندی شاکەل حوجرەو مەلاو فەقێ هەبووەو (شێخ ئەحمەد شاکەل) وانەی ئایینیی تێدا خوێندووە، ڕۆڵیان لە بواری ڕۆشنبیریدا هەبووە، (مەلا قادری سۆفی) باوکی (مەلا ئەحمەد بانیخێلانی) لە بانیخێلان حوجرەی هەبووە، (مەلا محێدین کوڕی مەلا سەعیدی زەلزەلە) لە کەلار وانەی دەووتەوەو دوای ئەویش (مەلا مستەفا) درێژەی بەو ڕاژەیەدا، (مەلا کاکە حەمە) ڕۆڵی هەبووە بۆ فێرکردن، لە باوەنور (مەلا قادری سۆفی) ڕۆڵی لە فێرکردنو وانە ووتنەوەدا هەبووە[٢٠].

لە شاری دووزخورماتوو مزگەوتی گەورەی شارەکە کە لە ساڵی (١٨٨٧) بنیان نراوە بۆ ئەو سەردەمە ببووە سەرچاوەیەکی باش بۆ پێگەیاندنی چەندین خوێندەوارو زانای ئایینیی[٢١]، کۆمەڵێك زاناو ئەدیب دەرسیان لە حوجرەدا گوتووە، لەوانە (عەبدولقادری کوڕی ئیسماعیلی کوڕی محەمەدی کوڕی فەقێ ئیبراهیم)و (مەلا تەها) ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لە فێرکردنی ڕۆڵەکانی ئەو شارە[٢٢].

لە ڕاپۆرتی کارگێڕی دەفەری کەرکوك لە ساڵی (١٩١٩) باس لەوە دەکات لە دوزخورماتو حوجرەیەك هەبووە لەبەر پیریو ناشارەزایی مەلاکەی داخراوە، هەروەها دوو حوجرەی بچووکی تر هەبووە کە سەرجەم (٤٥) فەقێی هەبووەو بەردەوام بوون لە خوێندن[٢٣]، هەر چەندە لەو ساڵەدا خەڵکی بەهۆی مەینەتییەکانی ژیانەوە لە کوڵەمەرگیدا دەژیان بەڵام دەستبەرداری خوێندنو زانست نەبوونە.

نابێت ڕۆڵی کەسانی وەك (مەلا کاکە حەمدی سەیفوڵڵا) (١٨٨٩ – ١٩٦١) لە بواری پەروەردەو فێرکردندا فەرامۆش بکرێت، لە ساڵی (١٩٢٦) دەستی داوەتە خزمەتکردنو لە چەندین شوێن قوتابخانەی ئایینیی ئاوەدان کردووەتەوە، لە سنووری قەزای کفری ڕۆڵی باشی هەبووە، لە گوندەکانی (فەقێ مستەفا)و (زینانە)و (چەوری)و (دوراجی) وانەی بە فێرخوازان ووتووەتەوە[٢٤]، (مەلا کاکە حەمە) لە بابەت خوێندەنگایەکەوە کە لەناو هۆزی (داودە)دا لە ساڵی (١٩٤٠)دا کردویەتییەوە بەم جۆرە هەستو بیرەباوەڕی خۆی دەربڕیوە: "لە (١)ی ئابی ساڵی (١٩٤٠)ەوە تا (١)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٤) چوار ساڵو سێ مانگ لە داودە دەرسەکانی بە (٢٤) قوتابی ووتووە، کە کوڕی ئاغاو مسکێن بوون"[٢٥].

لە هەر ناوچەیەك لە پێنج ساڵ زیاتر نەدەمایەوە بەو پێنج ساڵە لەنێوان (٢٠ – ٢٥) قوتابی دەگەیاندە ئاستی پێنجی ئامادەیی پرۆگرامەکانی خوێندن هەمەجۆر بوو وەك (سەرف، نەحو، زمانی کوردی، عەرەبی، ئاین، خورەوشت، جوگراف کوردستانو عێراقو جیهان، مێژووی کوردیو ئیسلامو جیهان، ژمارەو ئەندازە، کشتوکاڵ، وەرزش، تەجوید، قانوونی عقوبات، ئەرزایو تەسویە، .. هتد)، لەسەر شێوازێکی نوێ وانەی ئەووتەوە، داری بەکار نەدەهێنا، دڵی فراوان بوو هەرگیز لە قوتابی تووڕە نەدەبوو، کۆڵی نەئەداو ماندویەتی نەئەزانی[٢٦]، بە ڕای من لە گوندەکان بە هەمان شێوە شارەکان ئاوڕ لە خوێندو فێرکردن دراوەتەوە.

*** خوێندنو قوتابخانە، وەرزشو هونەر لە ساڵانی پەنجاکاندا:**

تا ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی پێشوو، خوێندن لە حوجرەی مزگەوتەکانی شاردا هێشتا باوی مابوو. بەڵام قوتابخانەی ڕەسمیو خوێندن بە شێوازی تازە، زیاتر برەوی هەبوو[٢٧]. لەو دەمەدا سێ قوتابخانەی سەرەتایی کوڕانو یەکێکی کچانو ناوەندییەكو پاشان ئامادەییش لە کفری دا هەبوون. جێگای باسە بینای ناوەندیی کفری بە کۆمەکی ماددی دانیشتوانی شار لە ساڵانی (١٩٥٢، ١٩٥٣) دا جێبەجێکرا. لەم ڕووەوە شاری کفریو دەوروبەرەکەی پێشینەیەکی باشیان هەیە لە کۆمەكو پشتیوانی کردنی پڕۆژەی خزمەتگوزارییەکانو کاری خێرخوازی. لە ساڵی (١٩٤٣) مەعرووف جیاووك بە سەرۆکایەتی وەفدێك بۆ باربووی پێکهێنانی یانەی سەرکەوتن لە بەغدا، هاتبووە کفریو دانشتوانی شار بڕێکی باش پارەیان پێشکەش بە وەفدەکە کردبوو هەروا لە ساڵی (١٩٥٧)یش دانیشتوانی شار درێغیان نەکرد لە ناردنی کۆمەكو هاوکاریی بۆ لێقەوماوانی لافاوەکەی سلێمانیو هەروا بۆ لێقەوماوانی لافاوەکەی چەمی (قوری چای) لە هەمان ساڵدا[٢٨].

خوێندنی ئەو کاتە بە زمانی عەرەبی بوو. لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا، مامۆستاکان بە دەستپێشخەری خۆیان هەندی جار وانەکانیان بە زمانی کوردیو تورکمانی دەگوتەوە. ناوەندیی کفری بەهۆی مامۆستاکانو هەندێ قوتابی بەهرەدارو بوونی هۆڵێکی لە بار، بوو بە ناوەندێکی ڕووناکبیریی بۆ شارەکەو چەندین چالاکی هونەریو وەرزشیو ئەدەبی لە گۆڕەپانو هۆڵی ئەو قوتابخانەیەدا ئەنجام دەدرا.

لە ساڵانی ١٩٥٤، ١٩٥٥ چەند شانۆگەرییەك لەسەر شانۆی هۆڵی ناوەندیی کفری پێشکەشکرانو خەڵکێکی زۆر ئامادەی بوون. قوتابییەکی عارەب بە ناوی سەلمان ئەلجبوری لە هونەری شانۆدا لێهاتوو و بەهرەدار بوو، بە هاوکاری چەند قوتابییەکی خەڵکی شار وەك کەمال خەلیل سەبریو کەسانی تر، یەکێك لە شانۆگەرییەکانی شەکسپیریان بە سەرکەوتوویی ئەنجام داو جێگای ڕەزامەندی تەماشاکەران بوو[٢٩].

مامۆستا عەبدولقادر سبیلچیو پاشان مامۆستا محەمەد خدر دەباغ دەوری شایستەیان لە ڕاهێنانو هاندەرانی گەنجان دەدا لە بواری وەرزش دا. چەند یاریزانێکی بە توانا لەو ماوەیەدا ناویان دەرکرد وەك ئەحمەد قیسور، ئەحمەد مەحموود عەتارو عومەر ئەحمەد لە بواری بۆکسێن دا. لە یاری تۆپی باڵەو تۆپی پێ دا کفری بەشدارییەکی

گەرمو گوڕی لە پێشبڕکێ وەرزشییەکاندا دەرکرد کە لەگەڵ تیپەکانی شارەکانی دەورو بەردا ساز دەکران و زۆرجاریش براوە دەبوون. لە یاریزانە ناسراوەکانی تۆپی پێی ئەو دەمە سەلاح میراخور، فاروق حەکیم، محەمەد مستەفا و ئەحمەد مەحموودو زۆری دیکە[٣٠].

لە بواری هونەری تەشکیلیدا مامۆستا عەبدوڵڵا کەریم، هەرچەندە دەرچووی هیچ کۆلێژو پەیمانگایەك نەبوو، بەڵام کەسێکی دڵسۆزو بەهرەدار بوو و چەندین قوتابی لەو بوارەدا پێ گەیاند. مامۆستاکانی شاری کفری جێگای ڕێزو خۆشەویستیی خەڵکی شارو قوتابییەکان بوون، چونکە دڵسۆزی پیشەو کارەکانیان بوون و زۆربەیان ئەزموون و شارەزایی باشیان هەبوو و ژمارەیەکی زۆر قوتابییانی پەروەردە کرد کە دواتر لە بواری جیا جیادا دەرکەوتن و خزمەتی شارو وڵاتیان کرد.

ناوی ژمارەیەك لە مامۆستا ناسراوەکانی شاری کفری و دەوروبەری، ئەوانەی کە لە ساڵانی پەنجاکاندا خزمەتیان کرد:

١. سەبیحە سابیر شاکر، یەکەم بەڕێوەبەری یەکەم قەتابخانەی کچان لە کفری.
٢. مەجید ئەفەندی عەبدولقادر.
٣. مستەفا سەید ئەحمەد (مامۆستا نەریمان).
٤. محەمەد ئەحمەد قەرەداغی، (لە سەرەتای ساڵانی پەنجاکاندا لەگەڵ مامۆستا نەریماندا گوێزرانەوە بۆ شاری کەرکوك).
٥. حەسەن عەباس ڕەزا.
٦. غەریب دەروێش.
٧. حەکیم قەدەو.
٨. عەزیز مەلا ڕاغب.
٩. خورشید محەمەد عەلی داوودی.
١٠. ئەحمەد محەمەد دەروێش.
١١. محەمەد ڕەشید سەحەر.
١٢. خالید موفتی ئەفەندی.
١٣. نەجمەدین مەمەد فلەییح.
١٤. حوسێن حەسەن فەتاح.
١٥. خالید مستەفا فەتاح.
١٦. موەفەق شەفیق، یەکەم بەڕێوەبەری ناوەندیی و دواتر ئامادەیی کفری.
١٧. بەهجەت عوسمان وەنداوی.
١٨. ڕەفعەت فەتاح.
١٩. ڕەشید حەیات.
٢٠. ڕەفعەت مەلا مەدحەت.
٢١. محەمەد بلە سوور.
٢٢. محەمەد خدر دەباغ.
٢٣. عەزیز خدر دەباغ.
٢٤. جەلال حوسێن قەرەداغی.
٢٥. سەلاح مەجید عەلی.
٢٦. عەبدوڵڵا عەبدولکەریم چایچی.
٢٧. محەمەد قادەو.
٢٨. نازم نیبراهیم.
٢٩. قەرمان سەعید چەلەبی.
٣٠. محەمەد سەعید ڕەشید.
٣١. نەجمەدین قەرەداغی.
٣٢. بەهجەت بەدری نەلبەیاتی.
٣٣. خورشید عەزیز عەبدولڕەحمان.
٣٤. حوسێن عەلی چایچی.
٣٥. برایم سەید گوڵ.
٣٦. حەسیب جەمیل وەنداوی.
٣٧. پاکیزە مستەفا ئەفەندی.
٣٨. عەبدولقادر محەمەد عەلی.
٣٩. مستەفا یامولکی.
٤٠. عەبدولقادر سبیلچی.
٤١. حوسەین مەلا عەلی.
٤٢. شەکیبە محەمەد فلەییح.
٤٣. کامیل شەفیق.

بە هیمەت و ماندوو بوونی ئەم مامۆستا بەڕێزانەو ئەوانەی پێشتریش، ژمارەیەك لە قوتابیانی قوتابخانەکانی شارو دەوروبەری، خوێندنیان بە سەرکەوتوویی تەواو کردو لە شارەکانی کەرکوك و بەغداو درێژەیان بە خوێندنی باڵادا و پاش تەواو کردنی، هەندێکیان گەڕانەوە شارەکەی خۆیان و هەندێکیشیان لە شارو جێگەی دیکە دامەزران و لەوێش بە چاکەو خزمەتکردن ناویان دەرکرد.

ناوی هەندێك لەوانە لە ساڵانی پەنجاکاندا یان پێشتر، بروانامەی باڵا و وەزیفەی بەرزیان بە دەست هێنابوو:

١. عومەر نەزمی، دەرچووی مەدرەسەی ڕوشدییەی کفری بوو لە سەرەتای سەدەی بیستەم، خوێندنی لە بەغدا تەواو کردووە و پاشان بووە بە وەزیری ناوخۆ لە حکومەتی عێراقدا.
٢. مەحمود بابان، قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لە کفری تەواو کردووە، دواتر ئەندامی پەرلەمانی عێراق و وەزیر بووە.
٣. دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی، قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لە کفری تەواو کردووە، سەرکردەیەکی حزبی شیوعی و نووسەرو وەزیر.
٤. دکتۆر بەهیجە وەهبی عەبدولقادر، خانەی باڵای مامۆستایان و پاشان بڕوانامەی دکتۆرای بەدەستهێناوە.
٥. دکتۆر سوعاد بەهجەت فەتاح، بڕوانامەی دکتۆرا لە بواری پزیشکی و سەرۆکی بەش لە زانستگەی بەغدا.
٦. دکتۆر ئیحسان شەفیق، بڕوانامەی دکتۆرا لە بواری کشتوکاڵ لە ئەمەریکا، سەرۆکی بەش لە زانستگەی بەغدا دواتر پلەی پرۆفیسۆر.
٧. دکتۆر سەعید عەبدولکەریم موبارەك، مامۆستای زانستگە، بەشی قانوون.
٨. ڕۆبیتان ئەمین جاف، پارێزەر قائیمقام و پلەی باڵای کارگێڕی.
٩. ڕۆستەم ئەمین جاف، پارێزەرو دادوەر.
١٠. تەلعەت حەکیم وەنداوی، پارێزەر، پلەی باڵای کارگێڕی.

١١. هیدایەت حاجی محەمەد یاسایی و پلەی باڵای کارگێری.
١٢. موەفەق شەفیق، بەڕێوەبەری پەروەردەیی .
١٣. سەلمان قادر میراخوڕ، وەرزشوان، ئەندامی تیپی باڵەی عێراق.
١٤. جەمال جەمیل ئیسماعیل، ئەفسەری فڕۆکەوان.
١٥. قادر ڕەزا بەگی جاف، جیۆلۆجی.
١٦. عەباس مەلا عوسمان، ئەفسەری پلە باڵای پۆلیس.
١٧. تالیب عەبدوڵڵا ئاغا، پارێزەرو دادوەر.
١٨. جەودەت حەکیم، پارێزەرو دادوەر.
١٩. دکتۆر خالیس ئیبراهیم ئەدهەم، مامۆستای زانستگە.
٢٠. جەلال حوسێن قەرەداغی، بەڕێوبەری پەروەردەیی.
٢١. نەجم حەمە فەرەج، پزیشك، ئەندامی پەرلەمانی کوردستان.
٢٢. نەجمەدین قەرەداغی، پەروەردەیی.
٢٣. سەلاح ڕەفیق ئەیوب ئاغا، ئەفسەری پلەی باڵای سوپای عێراق.
٢٤. ئیبراهیم کەریم، پەروەردەیی، قایمقام.
٢٥. یلدرم حەسەن، ئەفسەری فڕۆکەوان.
٢٦. کەنعان عومەر ئاغا، ئەفسەر.
٢٧. یەشار ڕەشاد، ئەفسەری پلەی باڵا.
٢٨. د. حەمە فەرەج، پزیشك.
٢٩. مەحموود سەید بەکر، ئەفسەری پلەی باڵا.
٣٠. فاروق حەکیم، پزیشك.
٣١. نەجیب بابان، پارێزەر.
٣٢. فاروق بابان، ئەندازیار.
٣٣. د. حەمە ساڵح حەمە فەرەج، پزیشك.
٣٤. د. عوسمان حەمە فەرەج پزیشك[٢٨].

دەکرێ بە ئەمانەتەوە بڵێم ئەوەی مێژووی کفری و بەسەرهاتەکان و بیرەوەرییەکانی بە وردی دەربارەی کفری و گەرمیان نووسیبێت خوالێخۆشبوو مامۆستا (مستەفا سەید ئەحمەد) ناسراوە بە (مامۆستا مستەفا نەریمان)، کە سامانێکی بە نرخی بۆ جێ هێشتووین.

زۆربەی ئەوانەی نووسین و ئەتروحەی ماستەرو دکتۆرا دەربارەی گەرمیان و کفری دەنووسن، پشت بە نووسینەکانی مامۆستا نەریمان دەبەستن، نووسینەکانی مامۆستا سەرچاوەیەکی متمانەو باوەڕ پێکراون، بە تایبەتی کتێبەکانی (بیرەوەرییەکانی ژیانم)و (شۆڕشی ئیبراهیم خان). جگە لە مامۆستا نەریمان:

١. محەمەد قەرەداغی.
٢. د. موکەرەم تاڵەبانی.
٣. سوهەیل خورشید.
٤. ساڵح هەللاج.
٥. عومەر شەریف.
٦. محەمەد شاکەلی.
٧. حوسێن ئیسماعیل خان.
٨. سەلاح عەبدولحەمید.
٩. شوکر محەمەد هەیەر.
١٠. سەلاحەدین عەبدولمەجید.
١١. ئەحمەد باوەر.
١٢. ڕەحیم ئەحمەد.
١٣. شاعیری گەورەو ناسراو لەتیف هەڵمەت، لە دایکبووی شاری کفرییەو بەشێك لە ژیانی منداڵی و لاوێتی لەم شارەدا بەسەر بردووە. لە شیعرو نووسینەکانیدا زۆر جار باسی کفری کردووە.

ئەمان بابەت و نووسینیان چ وەکو کتێب یان ووتار لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردووەتەوە. بەڵام ڕەحمەتی مامۆستا نەریمان لەو بوارەدا ڕەچەشکێن بوو.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

(*) (ناوچەی کفری لەنێوان ساڵانی ١٩١٤ – ١٩٤٥، لێکۆڵینەوەیەکە لە بارودۆخی رامیاری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی)، حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، کەرکوك، ٢٠١٠.

١. مەلا: وشەی مەلا لە (ملأ یملأ)ی عەرەبییەوە هاتووە کە بە کوردی واتای (پڕە) دەگەیەنێ، جا لەبەر ئەوەی کە مەلا مێشك و بیرو هۆش و ئەندێشەی پڕبووە لە زانینی و هەموو زانیارییە ئایینییەکان ئەخوێنێ و ئەیانزانی بە شێوەیەك پڕ بووە لە زانیارییە شەرعییەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و زانایە بە هەموو کارو فەرمانە شەرعییەکانی، بەم هۆیە پێی وتراوە مەلا.

سەبارەت بە وشەی فەقێ، وشەکە عەرەبییەو لە وشەی (فقیە، یفقە، فقیها)وە هاتووە، (فقیە) لەسەر وەزنی (فەعیلە و ئیسمی فاعیلەو بەمانای زانا و تێگەیشتوو دێ، لە رووی زاراوەییەوە فەقێ بەواتای زانا دێ بە شتە وردەکارییەکان کە لە ژێر هەستی بینینی چاودا نین، بەڵکو بە بیرو هۆش و زەین فەرمانە شەرعییەکان دەزانێ وەك خواپەرستی، نوێژ، رۆژو، زەکات،.. هتد، بڕوانە (ژیانی فەقێ و دەنگی فەقێ)، مەحمود عەزیز حەسەن، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٨، لاپەڕە (١٨).

٢. گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (٢١)، ساڵی شەشەم، ساڵی ٢٠٠٤، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (کفری شاری پڕ لە رازی مێژوویی)، نووسینی سامان کەریم.

٣. (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠)، مستەفا نەریمان، (دار الحریة للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٥، لاپەرە (٥٩).

٤. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، (دار الحریة للطباعة)، بەغدا، ١٩٩٤، لاپەڕە (١٣).

٥. بڕوانە:
– (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٠).
– (استذکارات عن تأریخ الکرد الحدیث)، عومەر عەلی شەریف، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، لاپەرە (١١٦).

٦. چاوپێکەوتن لە رۆژی (٢٣)ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٦) لەگەڵ (فەقێ محەمەد فارس)، لە دایکبووی ساڵی (١٩٣٣) دنیشتوی کفری.

٧. (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠)، سەرچاوەی

پێشوو، لاپەڕە (٦٠).

٨. (بیرەوەرییەکانی ژیانم) ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٣).

٩. بڕوانە:

- (مراكز ثقافية مغمورة في كردستان)، عیماد عەبدوسەلام ڕەئوف، دەزگای (موکریانی)، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕە (٦٦).

- (مێژووی گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوك)، سمکۆ بەهرۆز، چاپخانەی (شەهید ئازاد هەورامی)، کەرکوك، ٢٠٠٦، لاپەڕە (٢٦).

١٠. (ڕاپۆرتی کارگێڕی دەڤەری کەرکوك، ماوەی (١) ی کانوونی دووەم تا (٣١)ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩)، وەرگێڕان: سەربەست کەرکوکی، بنکەی (ژین)، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە (٩٦).

١١. بڕوانە:

- (مراكز ثقافية مغمورة في كردستان)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٣٤ - ١٣٥).

- (مێژووی گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوك)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧).

١٢. گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (٢)، ئایاری ساڵی ٢٠٠٣، لاپەڕە (٢٣)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی)، نووسینی: مستەفا نەریمان.

١٣. چاوپێکەوتن لە ڕۆژی (٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩) لەگەڵ دکتۆر مەکەرەم تاڵەبانی.

١٤. بڕوانە:

- (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٩).

- (دیداری ڕۆشنبیری)، ئازاد هیدایەت دەلۆ، چاپخانەی (چرا)، هەولێر، ٢٠٠٥، لاپەڕە (١٧٤).

١٥. چاوپێکەوتن لە ڕۆژی (٤)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨) لەگەڵ (سەید هاشم سەید ئەحمەد) لەدایکبووی ساڵی (١٩٣٤) لە شاری کفری، دانیشتووی چەمچەماڵ.

١٦. چاوپێکەوتن لە ڕۆژی (٣)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨) لەگەڵ مامۆستا (سەلاحەددین مەجید عەلی).

١٧. (تطور التعليم الوطني في العراق ١٨٦٩ - ١٩٣٢)، دکتۆر ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد، چاپخانەی زانکۆی بەسرە، بەسرە، ١٩٨٣، لاپەڕە (٢٦).

١٨. (مێژووی گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوك)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦).

١٩. بڕوانە:

- (مراكز ثقافية مغمورة في كردستان)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢٤).

- (مێژووی گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوك)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧).

٢٠. چاوپێکەوتن لە ڕۆژی (٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨) لەگەڵ (شێخ محەمەد شاکەلی)، لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٤) لە کفری.

٢١. (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی خورماتوو)، حەسەن بارام، چاپخانەی (ڕەهەند)، سلێمانی، ٢٠٠٧، لاپەڕە (١٥٧).

٢٢. بڕوانە:

- (مراكز ثقافية مغمورة في كردستان)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٦).

- (مێژووی گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوك)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦).

٢٣. (ڕاپۆرتی کارگێڕی دەڤەری کەرکوك، ماوەی (١) ی کانوونی دووەم تا (٣١)ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٩٦).

٢٤. بڕوانە:

- (مامۆستای نەمر)، مستەفا نەریمان، چاپخانەی (الامه)، بەغدا، ١٩٧١، لاپەڕە (٥٨ - ٥٩).

- (هوية كركوك الثقافية والادارية)، دەزگای (ئاراس)، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧)، لاپەڕە (١٤٦).

٢٥. (مەلا کاکە حەمە)، شاکر فەتاح، چاپخانەی (کامەرانی)، سلێمانی، ١٩٧٢، لاپەڕە (٢٣ - ٢٤).

٢٦. (مامۆستای نەمر)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦٤ - ٦٦).

٢٧. حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ، (ناوچەی کفری)، لاپەڕە (١٦٣، ١٦٤، ١٦٥).

٢٨. ئەحمەد باوەڕ، (یانەی سەرکەوتن)، چاپخانەی تیشك ٢٠٠٤، لاپەڕە (٧٥، ١٠٧).

٢٩. گفتوگۆ لەگەڵ (یوکسل محەمەد سەنعوڵڵا)، کفری، لە (٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠١٢).

- گفتوگۆ لەگەڵ (غالیب عەبدوڵڵا ئاغا)، کفری، لە (٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠١٢).

٣٠. سەلاحەدین عەبدولمەجید، (شاری کفری لە تەرازووی ڕەسەنایەتی و شارستانییەتدا)، لاپەڕە (١٣٦، ١٣٧).

### * تۆفیق ئەفەندیو یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی لە کەلار ١٩٣١- ١٩٥٨

ئەحمەد محەمەد ناسر (ئەحمەد باوەر)

*** کورتەیەك سەبارەت بە مێژووی نزیکی کەلارو ناوچەکە*:-**

بەپێی زۆرێك لە سەرچاوە مێژووییەکان، پێدەچێت هەر لە سالآنی سەدەی حەڤدەیەمینی زایینو بگرە پێشتریشەوە، بە تەواوی باری ئاوەدانیو نیشتەجێبوونی دانیشتوان کەوتبێتە ئەم ناوچەو تەوەرە گرنگەی باشووری کوردستانەوە. هاوکات دەکرێت شاری کەلاری ئەمڕۆ و دەورووبەری بە ناوجەرگەی ناوچەی گەرمیان دابنرێتو بەمە کۆی ئەو بەیەکگەیشتنە قسەو باسی لێوە بکرێت، کە زۆربەی زۆری گوندو دێهاتە ئاوەدانەکانی ناوچەکە پێکەوە ببەستێت و ڕۆژ بە ڕۆژو قۆناغ بە قۆناغ، هەنگاوگەلی تازەترو گەرمو گوڕی تازەتر لەخۆ بگرێت. هەرچەندە پێشتر باری ئاوەدانیو ناوجەرگەی ئاوەدانی بە حوکمی ڕۆژگارو پێداویستییەکانی خەڵك، لە ناوچەکەدا زیاتر لە شاری کفریو دەورووبەرییەوە سەرچاوەی گرتووەو ئەوێ ڕۆژێ خەلکی ناوچەکە هەموو سەوداو مامەڵەیەکیان لە شوێنێکی ئەوتۆوە دەستی پێکردبێو هەرچی شمەكو پێداویستی ڕۆژانەو کەلوپەلێکیان پێویست بووبێ، لە بازاری ئەو شارەدا ساغیان کردبێتەوەو هەر ئەوێش ڕێگای هاتوچۆکردنو حەوانەوەی ئەو هەموو کاروانو ڕێرەوە بازرگانییانە بووبێت، کە زۆربەی شارەکانی ئەو دەمەی باشووری کوردستانو عێراقی پێکەوە گرێداوە هەر ئەمەش وای لێکردووە، کە بۆ خۆی ببێتە جێی سەرنجی زۆرێك لە ڕۆژهەلآتناسو گەڕیدە بیانییەکان بەتایبەتی هەریەك لە: کلۆدیوس جەیمس ڕیچ (١٧٨٧- ١٨٢١)[1].

جیمس بیلی فرێزەر (١٧٨٣- ١٨٥٦) کە لە (١ی تشرینی دووەمی ١٨٣٤)دا، دەگاتە گوندی (ژاڵەی سەفەر)ی ناوچەی شێروانەو کەلارو لەوێشەوە بەرەو شاری کفریو گوندی ئیبراهیم خانچی دەبێتەوە[2].

جیمس بەکینگهامو نیبۆر... تاد جگە لەوانەش مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠- ١٩٤٨) کە لە سەردەمی لاویداو لە: (بیرەوەییەکانی ژیانم - حیات خاطراتي)دا، بە تایبەتی لەنێوان سالآنی (١٨٩٣- ١٩٠٢) دا کە لە شاری سلێمانی ئەوکاتەوە، بە مەبەستی خوێندن لە ڕێگای شاری کفرییەوە ڕووی کردووەتە شاری بەغدا، سەبارەت بە کفریو ناوچەکە دەنووسێت: شارۆچکەی سەلآحیە یەکێکە لە قەزاکانی سەنجەقی کەرکوکی سەر بە ویلایەتی مووسڵ، شارۆچکەیەکی ڕێکوپێكو ئاووهەوایەکی خۆشی هەیە، دوو حەمامو چوار یان پێنج مزگەوتو بازارێکی ڕێكو جوانیشی تیایە، سەرەرای چوار یان پێنج قاوەخانەو ژمارەیەك خانو ئوتێل (مسافرخانە) جگە لە باخو دارستانێکی زۆر بە چوار دەوری شارۆچکەکەدا[3].

لەگەڵ ئەوەشدا، ناوەندی ڕووناکبیریو سەرچاوەکانی خوێندن بە شێوازێکی زیاترو فراوانتر لەو شارەوە دەستی پێکردبێو خالی وەرچەرخان بە هەموو بەشەکانییەوە لەوێوە کەوتووەتە سەرسکەو راستەرێی شیاوی خۆی. بەلآم لەو دەمانەوە کە هۆزەکانی ناوچەکە بەتەواوی دەستیان لە ژیانی کۆچەرایەتی هەڵگرتو لە گوندو لادێکانی ناوچەکەدا نیشتەجێبوون، بەتایبەتی لە سەرەتادا هۆزەکانی: (ڕۆژبەیانی، زەند، گێژو پاڵانی) کە بە شێوازێکی زۆر کەمتر بە ژیانی کۆچەرییەوە سەرگەرم بوون، پاشان هۆزی گەورەو بەناوبانگی جاف کە لە دەورووبەری دەشتی شێروانەو کەلاری ئەمڕۆیان، لەسەر بنەمای نیشتەجێبوون، ئاوەدانکردەوە و هەر لەو دەمانەشەوە، سەرچاوەکانی ژیاریو شارستانییەت ڕۆژ بەڕۆژ ڕەوتی خۆیان بریو کۆمەڵانی خەڵكو دانیشتووانی ناوچەکەش، بۆ بژێویو ژیواری ڕۆژانەی خۆیان، وردە وردە کەوتنە بیرکردنەوەی تازەو داهێنانی تازەیان تارادەیەك دەستپێکرد. بۆ ئەوەی گۆڕانێکی زیاتر، هەلومەرجی ژیانیان بەرەو ئاقارێکی تۆکمەترو نوێتردا بەرێت، شانبەشانی هەموو ئەوانەش دەروازەی نوێترو تازەتریان لە ڕووی کۆمەڵایەتی، سیاسیو ڕووناکبیرییەوە بۆ بکاتەوە. هەر لە مزگەوت، تەکیێ، خانەقا، قوتابخانە، بنکەی تەندروستی، هێڵی تەلەفۆنو دواتر کارەباو سەرچاوەکانی تری بوونەشارو ئاوەدانی. بەجۆرێك، هەموو ئەمانەو هەر یەکەو بۆخۆیان ڕۆڵی گرنگو کاریگەرییان لەسەر ئەو ڕەوشو باروودۆخی ناوچەکەو بە تایبەتی شارەدێی کەلار هەبوو، کە لە ژیانی لادێ نیشینەوە بەرەو قۆناغێکی ئەوتۆی بەرێ، کە تارادەیەك، گۆڕانکارییەکی بەرچاو لەگەڵ خۆیدا، بهێنێتەکایەوەو دواتر داوکاریو پێداویستیو ئارەزووەکانی کۆمەڵانی خەڵك، بباتە قۆناغێکی ئەوتۆوە، کە بە دوای سەرچاوەی پێشکەوتوو ترو گونجاوتردا بگەڕێت، بۆ ئەوەی ئاسۆیەکی گەشترو ڕووناکتر لە ڕێگای خۆیو نەوەکانی دوای خۆیدا بکاتەوە شانبەشانی ئەوە هەوڵی ئەوەش بدات، کە لەو گۆشەگیریو دابڕانەی دووربخاتەوە، کە بەدرێژایی مێژوو لە سالآنی پێشووتردا بەدەستێوە ناڵاندبووی، لە حاڵێکدا دەکرێت ئەو ڕەوشو پێوەرە بۆ سەرجەم شوێنو ناوچە دوورە دەستەکانی باشووری کوردستان، قسەی لێوە بکرێو کۆمەڵانی خەڵكو دانیشتووان بخەیتە هەمان ئەو هاوکێشەو قاوغەوە، کە لەم دەڤەرەی گەرمیانو کەلاردا، دووبارەو چەند بارە بوو بووەوە. وەك دەبینیت پێش ئەوەی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی خوێندن لە سالی (١٩٣١)دا لە کەلاری ئەوکاتەدا بکرێتەوە. پێشتر یەکەمین ناوەندی خوێندنو بنکەی خوێندەواری لە کەلارداو لە ڕێگای مەلا محەمەدی جوانرۆیی (١٨٦٨- ١٩٣٨)ەوە[5]. لەسەروبەندی سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤- ١٩١٨)دا کراوەتەوەو تەنانەت دوای ئەویش کۆمەڵێك زاناو پیاوی ئاینی ناسراوی وەك: مەلا ئەحمەدی دەککە (١٨٨٧- ١٩٥٩)[6]. مەلا مستەفای کەلار (١٨٩٧- ١٩٦٩) جێگایان گرتووەتەوەو هەمان ڕەوتیان لە ڕووی خوێندنەوە گرتووەتەوە بەر. بەلآم لێرە بە دواوە ئەو چوارچێوەیە، تارادەیەك گۆڕانی بەسەردا هاتووەو زیاتر کۆمەڵانی خەڵك

ڕوویان لە قۆتابخانە کردووەو سەرەتا دەیان قوتابیو خوێندکار لەم شارە دێیەو دەورووبەرەیەوە ڕوویانکردووەتە ئەو قوتابخانەیەی کە بۆ یەکەم جار بە هەوڵی بەگزادەکانی جاف لە کەلار، بەتایبەتی پەرلەمانتاری ئەوکاتەی لیوای کەرکووك (شاری کفری)، کە حەمە بەگی فەتاح بەگ جاف (١٩٠٤- ١٩٣٤)[٧]بووە، کراوەتەوە تەنانەت یەکەم کچی خۆشی ئەختەرخان (١٩٢٦- ١٩٤٥)، خستووەتە بەرخوێندن، بۆ ئەوەی دانیشتووانو خەڵکانی تری کەلارو ناوچەکەش، چاو لەو هەنگاوەی ئەو بکەنو هەمان ڕەوت بگرنە بەر، بۆ شکاندنی ئەو قۆرتە کۆمەڵایەتییەو کچی خۆیان بخەنە قوتابخانەو بەر خوێندن، هەرچەندە ئەو کچەی ئەو دواترو بە گەنجی و لە تەمەنی (١٩) سالیدا، وەفاتی کردووە، بە جۆرێك لە هەمان ماوەدا ولە سالانی دواتریشدا، بە پالپشتی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف (١٨٨٥- ١/٧/ ١٩٤٩)، کە برا گەورەی حەمە بەگ بووە، بەپێی ناوەڕۆکی نووسینێك کە لە گۆڤاری گەلاوێژ (١٩٣٩- ١٩٤٩)ی بە ناوبانگدا، ئاماژەی بۆ کردووە ولەسەری نووسیوە:- (لە سالی ١٩٠٨) دا کاتێك فەتاح بەگی باوکی دنیای بەجێ هێشتووە، کەریم بەگی کوڕی کەوتە ئیدارەی ئەملاكو کاروباری عەشایەری تا (باوە نوور)و (ئیبراهیم خانچی) لەژێر ئیدارەی موباشەرەی خۆیدا بوو. لەپاش داگیرکردنی ئینگلیز بۆ وڵاتی عێراق و لە سالی (١٩١٩)دا، کە ڕەسمەن سەرۆکی هەموو عێلاتەکانی جاف پێ سپێردرابوو، بە ڕێکوپێکیو هەشت سالی تەواو، کاروفرمانی ئەو عەشیرەتەی هەلسووڕاند[٨].

کەچی لە سالی (١٩٢٧) بە دواوە کە بە تەواوی مەسەلەی سەرۆکایەتی خێلەکان هەلگیراو یاسای ژمارە (٥٨)ی عێراقی پاشایەتی، سەبارەت بە شێوازی بەڕێوەبردنی لیواو قەزاو ناحیەکان بلاوکرایەوە[٩]. ئیدی کەریم بەگی جاف بە یەکجاری لە ئاوایی کەلار دانیشتو کەسوکارو براکانی بەدەورییەوە دامەزران[١٠]. دیارە ئەمەشیان لەبەر ئەوە بووە، کە لەم سالە بەدواوە (ناحیەی قەلای شێروانە)[١١]. بەپێی ئیرادەیەکی شاهانە (الارادة الملکیة)، لە سەردەمی مەلیك فەیسەلی یەکەم (١٨٨٣- ١٩٣٣)دا و لە (١٦ئابی ١٩٢٧)دا کراوەتە مەرکەزی ناحیە[١٢].

هەر لێرەش بەدواوە بنکەی ناحیەی شێروانە لەبەر ئەوەی کەریم بەگی جاف ڕازی نەبووە لە کەلاردا بێت، بۆیە دەگوێزرێتەوەو دەبرێتە گوندی (سەر قەلا)ی ئەوکاتە[١٣].

بەلام هەندێك سەرچاوەی دی قسە لەسەر ئەوە دەکەن، کە حکومەتی عێراق لە سالی (١٩٣٥)دا ناوەندی ناحیەکەی گواستووەتەوە بۆ گوندی سەرقەلا، چونکە کەوتووەتە ناوەندی ناوچەکەوە ولەو دەمانەشدا بریتی بووە لە گوندێکی (١٠٠) مالیو ژمارەی دانیشتوانەکەی (٤٥٠) کەس بووە[١٤].

وەکتر هەر لە سەردەمی کەریم بەگی جافدا، ئاوایی کەلار ژمارەی خێزانەکانی گەیشتووەتە نزیکەی (٢٥٠) خانەوادەو، قوتابخانەو مەلبەندی تەندروستیو مزگەوتیشی تیا دروستکردووە. هەروەها زۆریشی کۆشش کردووە لە ڕێگەی قوتابخانەکەدا، ئیشێکی وای کردووە کوڕو کچ پێکەوە تیایدا، بخوێننو هاوکات لە دێهاتی تریشەوە بە زۆر منال بهێنرێت بۆ خوێندن تیایدا بەرادەیەك ژمارەی قوتابیانی تا ناوەندی چلەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوو گەیشتووەتە نزیکەی (٩٠) قوتابی بە کوڕو کچییەوە[١٥].

لە سالانی دواتریشدا، ئەو ژمارەیە بەشێوەیەك بەرزبووەوە. کە وەك قوتابخانەیەکی سەربەخۆ لە بینایەکی سەربەخۆی چوار پۆلیدا، کارەکانی بەڕێوەببرێتو دەرگای بۆ هەموو جگەرگۆشەیەکی ئەودەمی ئاوایی کەلارو دەورووبەری بکرێتەوە. بەجۆرێك خالی وەرچەرخانو ناوەندی خوێندن لە یەکەم هەنگاو و لەم تاقە قوتابخانەیەوە، لە شارەدێی کەلاری ئەوکاتەدا گەیاندە ئەو ئاستەی کە لە قۆناغەکانی دواتردا، دەیان قوتابخانەو ناوەندی زانستیو ڕووناکبیری تری بەدوادا بێت. هەرچەندە کەلار بۆ خۆی لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردووەوەو بەپێی مەرسومێکی کۆماریو بە بڕیارێکی سیاسی لەلایەن حکومەتی عێراقەوە لە (٢٨شوباتی ١٩٧٠)دا کرایە ناوەندی قەزاو جەلال بیلال پیرەبابی (١٩٢٣- ١٩٩٣) وەك یەکەمین قائیمقامی ئەم شارە دەستبەکار بووە[١٦].

سەرەڕای ئەو سیاسەتی بە بەعسکردنو بەعەرەبکردنەی کە زۆر بە چڕیو بەتایبەتی لەپاش نسکۆی شۆڕشی ئەیلولی(١٩٦١- ١٩٧٥)ەوە، کە باشووری کوردستانو ناوچە کوردنشینەکانی گرتەوە، بە تایبەتی لە شاری خانەقینو دێهاتەکانی ناوچەی (بنکورە)[١٧] و دەوروبەری، بە زۆری بووە مایەی ئەوەی کەلار ببێتە ئەو شارو قەزا گەورەیەی ناوچەی گەرمیانو هەرێمی کوردستان کە ڕۆژانەو لە ماوەیە بەدواوە گەلێك هەنگاوی گەورەو قۆناغی لەبارترو فراوانتر بنێت، لە ڕووی ئاوەدانیو کردنەوەی ناوەندە جۆر بەجۆرەکانی بواری خوێندنو ڕووناکبیریو فەرهەنگییەوە هەر لە زانکۆو پەیمانگای جۆر بەجۆرەوە، وەك ئەوەی دەکرێتو هەلدەگرێت زۆر بە تۆکمەیو وردی لە بارەیەوە بنووسرێتو لایەنە زیندووەکانی لە ڕووی سیاسی، ئابووری، کۆمەلایەتیو ڕووناکبیرییەوە لێکبدرێتەوەو بەوردی لە هەلکەوتەی جوگرافیو هۆکارەکانی پێکهێنانو دەرئەنجامەکانی بوونە شاری بدوێی.

*** سەربردەو ژیاننامەی یەکەم بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کەلار (١٨٨٦- ١٩٤٧):**

یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی خوێندن لە شاری کەلار، کە ئەمڕۆ دەکەوێتە گەڕەکی کەلاری کۆنەوە، بەپێی شوناسنامەو دەفتەری خزمەتی مەدەنی یەکەمین بەڕێوەبەری کە ناوی تەواوی: محەمەد تۆفیق ئەفەندی کوڕی وەستا عەلییە، سالی (١٢٠٣)ی کۆچی بەرانبەر بە سالی (١٨٨٦) زایینی لە ناوەندی شارۆچکەی (قەرەداغ) لەدایکبووەو دایکی ناوی (سەلمە) بووە.

هاوکات بەگوێرەی هەموو ئەو وێنانەی لای ئێمەنو تەنانەت قسەی بەشێك لە قوتابیو بنەمالەکەشی بە بەردەوامی چاکێتو پانتۆلی لە بەر کردووەو وەك هەر ئەفەندییەکی ئەو قۆناغە سیدارەی لە سەرناوە[١٨].

جگە لەوەش هەر بەپێی ناوەڕۆکی لاپەڕەی یەکەمی

دەفتەری خزمەتی مەدەنییەکەی کە ژیاننامەکەی واتە (ترجمة الحال)ی نووسراوەتەوە، بەم شێوەیەو بە وردی تۆمارکراوە، کە تیایدا بە زمانی عەرەبی هاتووە:-
١- اسم: محمد توفيق افندي
٢- اسم الأب: اوستا علي.
٣- اسم الأم: سلمة.
٤- الديانة: مسلم.
٥- محل وتأريخ الولادة: ١٣٠٣ هجري - ١٨٨٦ ميلادي.
٦- التحصيل: في دار المعلمين الإبتدائي/ بغداد.
٧- اللغات التي يحسنها: كوردي، عربي، توركي.
٨- توقيع الموظف.

بەپێی بەشێك لە سەربردەو بیرەوەرییەکانی خۆیو هەروەها رەفیق حیلمی کوریشی، کە لە دایکبووی ساڵی (١٩٣٠)یە و تا کاتی ئەم نووسینە (نیسانی ٢٠١٥)، کە لە ژیاندا ماوە، بنەماڵەکەی ئەوان، کە بەرەسەن خەڵکی ناوچەی قەرەداغنولە دوو قۆناغی جیاوازدا، بەرەو ناوچەی گەرمیانو شاری کفری بوونەتەوەو یەکەم وێستگەیان لە دەوروبەری ساڵی (١٩٠٠) زایینی داو بەتایبەتی لەسەردەمی فەرمانرەوایەتی دەوڵەتی عوسمانیدا بووەو، لە گوندی (بەلەگە)ی سەر بە شاری (سەلاحیە) واتە کفریی ئەمڕۆ، لەگەڵ بەشێك لە کەسوکارەکەیدا نیشتەجێبوونو بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو تیایدا ماونەتەوە، بەڵام لێرە بەدواوەو بۆ جارێکی دی بارودۆخی ژیانو مەسەلەی بێکاریو گرانی دووبارە تەنگی پێهەڵچنیونو بە یەکجاری هاتوونەتە ناو شاری کفری خۆیەوەو لە گەرەکی: (ئیسماعیل بەگی بابان)دا، نیشتەجێ بوون، هەر لەو دەمانەشدا بەشێکی تر لە خزمو کەسوکاریان هەر لە شاری کفریدا ژیاون لەوانە: وەستا ئەحمەد عەبدولرەحمان، کە مامی بووەو ئەبێتە باوکی مامۆستاو نووسەری ناسراوی قۆناغی (گۆڤاری گەلاوێژ)و (دەنگی گێتی تازە) محەمەد ئەحمەد قەرەداغی (١٩١٧- ١٩٧٣)، کە نازناوی لە بواری نووسینو تەنانەت لە رێکخستنەکانی حیزبی هیواشدا بە (پشکۆ) ناسراوە[١٩].

جگە لەوەش یەکێك لە خاڵەکانیشی هەر لە شاری کفری ئەو دەمانەدا سلێمان قەرەداغی باوکی محەمەد سلێمان قەرەداغییە، کە دەکاتە باپیری مامۆستا ئەحمەد قەرەداغیی بەڕێوەبەری: (قوتابخانەی سەرەتایی دووەمی کفری) لە چلەکانی سەدەی بیستەمی رابردوودا[٢٠]. وەك دەشگێڕێتەوە دوای ماوەیەك، بەگەیشتنیان بۆ شاری کفریی ئەوکاتە، هەر لەم شارەدا خراوەتە بەر خوێندنو دوای چەند ساڵێك توانیویەتی هەردوو قۆناغی سەرەتایی (صبیان مکتەبی)و ناوەندی (روشدیيە)[٢١]. کە لە دەوروبەری ساڵی (١٣١٨) کۆچی بەرانبەر بە ساڵی (١٩٠٠)ی زایینی، کە بۆ یەکەم جار لەم شارەدا کراوەتەوە[٢٢] بەسەرکەوتوویی تەواو بکات ولە ساڵی (١٣٢٤)ی کۆچی بەرانبەر بە ساڵی (١٩٠٦)ی زایینی، لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی ئەوکاتەی شاری بەغدا واتە (دار المعلمین الابتدائیە/ بغداد)[٢٣] کە چەند ساڵێك بوو کرابووەوە وەردەگیرێت. هەروەها بەپێی بڕوانامە (جداری) یەکەشی، کە بەزمانی تورکی عوسمانلییەو لەسەری نووسراوە: (دار المعلمین شهادتنامەسی) هاوکات هەر بە تورکی لەسەری نووسراوە: (دولت علیة عثمانیة معارف عمومیة نظارتي)، وەك ئەوەی دوای چوار ساڵی تەواوی خوێندن ئەم قۆناغەشی تەواوکردووەو بەروونی لەسەریشی نووسراوە بە پلەی: (علي الاعلي في العلوم)و (علي الاعلي في الاخلاق) دوابەدوای هەموو ئەوانەش لەلایەن فەرمانگەی مەعاریفی ئەوکاتەی بەغداوە، بەتەواوی پشتڕاست کراوەتەوەو بەزمانی تورکی لەسەریان نووسیوە: (اشبو شهادتنامە بغداد معارف تصديقنجە تصديق اولنور) کە بە زمانی عەرەبی دەبێتە: (تصديق هذه الشهادة (الوثيقة) لكونها مصدقه من قبل دائره معارف بغداد)، بەڵام لەلای سەرەوەی بڕوانامەکەوەو هەر بە زمانی تورکی و بەهەمان شێوە نووسیویانە: (اشبو شهادتنامە طرفمزدن دخی تصديق اولنور) واتە (وتصديق هذه الشهادة من قبلنا ايضاً). بەڵام مێژووی تەسدیقکردنی یاخود بڵێین پشتڕاستکردنەوەی بڕوانامە جیدارییەکەی وەك لە خوارەوە لەسەری نووسراوە، کەوتووەتە ساڵی (١٣٢٩) کۆچی بەرانبەر بە ساڵی (١٩١١) زایینەوە[٢٤].

شانبەشانی ئەوەش لە ناو دەفتەری خزمەتی سەربازییەکەشیدا، کە لە هەمان ساڵی (١٣٢٤)دا دەری کردووەو لەبەری نووسراوە (اوردوی همایونی ٦) واتە فەوجی شەشەمی هەمایۆنی عوسمانیو بەزمانی تورکی ئەم زانیارییانەی بەوردی لەسەر تۆمارکراوە:-
١- صلاحية طابوري قرعة دائرەسی (دائرة تجنيد صلاحية).
٢- صلاحية اهاليسندن... اوغلى توفيق بن اوستة علي نام كيمسنة نكدر.
٣- سلك نظامية... قسم.
٤- ترتيب: اول... صنف.
٥- قرعة نك صابت ابتديكي تاريخ مارت ١٣٢٤.
٦- نومرو ٤.
٧- حضور اوياغياباي اصابت ايلديكي / حضورا.
٨- سنجاقي: كركوك.
٩- قضاسي: صلاحية واتە قەزای سەلاحیە (کفری).
١٠ محلەسی: اسماعيل بك واتە گەرەکی ئیسماعیل بگ.
١١ - خانە نومرەسی واتە ژمارەی خانوو (١٠٣/٤).
١٢- تاريخ تولدى ١٣٠٣ واتە ساڵی لەدایکبوون ١٣٠٣ی کۆچی.
١٣- صنعتي: طلبە علوم واتە پيشە: قوتابی علوم.

هاوکات بەو هۆیەشەوە کە قوتابی خانەی مامۆستایانی بەغدای ئەوکاتە بووەو بەردەوام بووە لەسەر خوێندن، بۆ ماوەی چوار ساڵی تەواو لە خزمەتی سەربازی دواخراوە[٢٥].

بەڵام دوای تەواوکردنی خوێندنەکەیو لە ساڵی (١٩١٤)دا بۆ یەکەم جار لە ناحیەی (هب هب) سەر بە قەزای دێڵتاوە (خالص)ی لیوای دیالەی ئێستا وەك مامۆستای سەرەتایی دامەزراوە. کەچی بەهۆی بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤- ١٠١٩)وە، براوەتە خزمەتی سەربازیو کراوەتە (نامزید چابگی) واتە (ضابط احتياط) لە سوپای عوسمانیدا و هەر لەوێشەوە نێردراوەتە شاری (حەلەب)و پاشان بەهۆی

خزمەتی سەربازیو بوونی لە ڕیزەکانی سوپای عوسمانیدا، گەلێك ناوچەی تری لە چوار چێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا گەڕاوە، بۆ نموونە یەکێك لەو ئەفسەرانەی سوپاش، کە لە شاری حەلەب ناسیویەتیو بووەتە هاوەڵی نزیکی: (ئەحمەد جەمیل ساقی ئەفەندی عەقراوی) بووە. تا ئەوکاتەی لە کۆتاییەکانی جەنگداو بەتایبەتی لە ساڵی (١٩١٨)دا هاتووەتەوە وڵاتی عێراقیو دووبارە گەڕاوەتەوە بۆ سەر پیشەی مامۆستاییەکەی لە (هب هەب)، هەر لەو ساڵەشدا خزمەتی مامۆستایەکەی دەگوازرێتەوە، شارۆچکەی: (دووخورماتوو) وتا کۆتاییەکانی مانگی ئابی ساڵی (١٩٢٣) لە قوتابخانەی سەرەتایی ئەم شارۆچکەیەدا ماوەتەوە، هەر لەم ماوەیەشداو لەو کاتەوەی کە لە دووزخورماتوو ئەبێت، لەگەڵ خاتوو شەفیقە خانی کچی ساقی ئەفەندی عەلی ئاغا (١٩٠٧- ١٩٨٤)ی خەڵکی شاری ئاکرێ ژیانی هاوسەری پێکەوە ناوەو بەسەریەکەوە لەم خێزانەی تەنها یەك کوڕو سێ کچی لێ هەبووە. ئەمەش لە کاتێدا بووە، کە پێشتر تێکەڵاویو ناسراوی پێش وەختی لەگەڵ بنەماڵەکەیاندا هەبووە، بەوەی وەك پێشتر ئاماژەی بۆکرا لەگەڵ: ئەحمەد جەمیلی ساقی ئەفەندی برای خێزانیدا پێکەوە لە دەوروبەری شاری (حەلەب) ئەفسەر بوون، لە سوپای ئەو دەمانەی دەوڵەتی عوسمانیدا، بە جۆرێك ئەوانیش دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەمو دوای ئەوەی، کە ئەحمەد جەمیل ساقی ئەفەندی لە ڕیزەکانی سوپای عوسمانیدا بریندار ئەبێت، هەمان شێوە ئەوانیش گەڕاونەتەوە وڵاتی عێراقو هەر لە شارۆچکەی دووزخورماتوو بۆ ماوەیەك، کراوەتە لێپرسراوی فەرمانگەی پۆستە (مأمور برید)ی ئەم شارۆچکەیەو دوای ماوەیەك، گەڕاوەتەوە نێو ڕیزەکانی سوپای عێراقی لە سەردەمی پاشایەتیدا، وەك ئەفسەرێك لە ڕیزەکانی سوپای عێراق ولە تیپی دووەمی سوپادا بووە لە شاری کەرکوك. بەڵام دوای خانەنشین بوونی و لە ساڵی (١٩٤١)دا وەفاتی کردووە و هەر لە شاری کەرکوك ئەسپەردەی خاك کراوە. بەڵام برایەکی تریشی بەناوی (مەحموود خاوەر ساقی ئەفەندی)یەوە، کەمولازمی یەکەمی سەربازی دەبێت، لە یەکەم فەوجی سەربازی (ئیمام موسای کازم)ی عێراقدا درێژە بە خزمەتی سەربازی خۆی دەدات[٢٦].

مامۆستا محەمەد تۆفیق ئەفەندیش هەر لەو ماوەیەدا، کە لە شارۆچکەی دووزخورماتوو دەبێت، بەپێی ناوەڕۆکی دەفتەری خزمەتی مامۆستاییەکەی، کە بەسەر یەکەوە لە (٣٠) لاپەڕەی تەواوی مام ناوەندی پێکهاتووە، لە کۆتایی سییەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا، مووچەی مانگانەی مامۆستایەتی گەیستووەتە نزیکەی (٧،٥٠٠) حەوت دینارو نیوی ئەوکاتە، کەچی لە کۆتاییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیداو بە تایبەتی لە ساڵی (١٩١٨)دا مووچەی مانگانەی تەنها (٣٥٠٩ غروشی عوسمانلی بووە[٢٧].

بەڵام مووچەی مانگانەی مامۆستایەك لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا نزیکەی(١٨- ٢٠) دینار بووەو هەروەها هی فەراشێکیش لە (١٠) دینار زیاتر نەبووە[٢٨].

هاوکات یەکێك لەو مامۆستا دێرینانەی، کە هەر لە شارۆچکەی دووزخورماتوو لەگەڵ محەمەد تۆفیق ئەفەندیدا دەبێتو بەڕێوەبەری قوتابخانەکەشیان بووە، خورشید ئەفەندی داودی باوکی نووسەری ناسراو زوهدی داودیو زەکیو حلیمیو دکتۆر بارامی سەرۆکی زانکۆی کەرکوکی پێشوو بووە. تا ئەوکاتەی لە (١٩٢٣/٩/١)دا، خزمەتی مامۆستاییەکەی گواستراوەتەوە شاری کفریو تا (١٩٢٧/٨/٣١) وەکو خۆی دەنووسێت: لەم شارەدا درێژەی بە خزمەتی مامۆستایی خۆی داوەو لە (١٩٢٧/٩/١) ەوە، دیسانو بۆ جارێکی دی دەگوازرێتەوە شارۆچکەی دووزخورماتوو و لە قوتابخانەی (دووزخورماتوو)ی سەرەتایی دەستبەکار دەبێتەوە، تا (١٩٣١/٨/٣١)، بە جۆرێك هەموو ئەو زانیارییانەی، کە سوودیان لێ وەردەگیردرێت، بۆ یەکەم جارە بەو شێوەیە بڵاودەبنەوەو هەر هەمووشیان، لەناو دەستنووسو بەڵگەنامەو تۆمارە فەرمییەکانی خۆیدا بەوردی تۆمارکراون[٢٩] ئیدی لەم ماوەیە بەدواوە، لە قوتابخانەی دووزخورماتووەوە ڕاژەکەی گواستراوەتەوە کەلاری ئێستاو وەکو خۆی زۆر بە ڕوونی نووسیویەتی لە (١٩٣١/٩/١)دا، لە کەلار وەك مامۆستا دەستبەکار بووەو تا ساڵی (١٩٣٨) بەردەوام بووە، لێرە بەدواوەو لە ئەنجامی تەنگ پێهەڵچنینی خێزانو مناڵەکانی، بۆ جارێکی تر دەگەڕێتەوە کفریو تەنها یەك ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە، کەچی دووبارە لەسەر داواو ڕاسپاردەی زۆری کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، بۆ جارێکی تر لە ڕێگای مەعاریفی لیوای کەرکووکەوە، دەگەڕێتەوە کەلارو تائەوکاتەی لە ساڵی (١٩٤١)دا، بەیەکجاری لە وەزیفەو کاری مامۆستایی دوور دەکەوێتەوەو خانەنشین دەکرێت.

بەڵام وەك لە دەفتەری خزمەتەکەیدا هاتووە: بەدرێژایی کاری مامۆستاییو کاری وەزیفی سزا نەدراوە وەك دەنووسێت: بە درێژایی تەمەنم سزام نەبینیوە. هەروەها سەبارەت بە مۆڵەتو ئیجازە وەرگرتنیش بە هەمان شێوە لە لاپەڕە (١٦)ی هەمان دەفتەریدا نووسراوە: تا ئێستا مۆڵەتم وەرنەگرتووە[٣٠].

هاوکات دوای خانەنشین بوونو گەڕانەوەی بۆ شاری کفری لەگەڵ ئیبراهیمی حاجی فەتاحی ئامۆزایدا، واتە باوکی مامۆستا عەدنان ئیبراهیم، کە لە حەفتاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا هەر لە شاری کەلار مامۆستا بوو، بۆ بژێوی ژیان، ماوەیەك دەست دەداتە کاری بازرگانی ولە ساڵی (١٩٤٦)دا، بەماڵەوە دەچێتە شاری کەرکووكو تا ئەوکاتەی لە ناوڕاستی مانگی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٧)دا لە کەرکووك وەفات دەکات ولە گۆڕستانی (ئەحمەد ئاغا)ی شاری کەرکوك، لە گەڕەکی (قۆریە) بە تەنیشت ئەفسەری سەربازی: ئەحمەد جەمیل ساقی ئەفەندیی هاوڕێو برای خێزانەکەیەوە ئەسپەردەی خاك دەکرێت، بەڵام شەفیقە خانی خێزانی بۆ ماوەیەکی زیاتر لە ژیاندا دەمێنێتەوە، تا ئەوکاتەی لە شاری کفریو لە ڕێکەوتی (١٩٨٤/٨/٨) کۆچی دوایی دەکاتو لە گۆڕستانی قەرەداغییەکان، لە گردی (باوە شاسوار) ئەسپەردەی خاك دەکرێت[٣١].

*** کردنەوەی قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی لە ساڵی (١٩٣١) دا:**

دیارە کردنەوەی یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی لە کەلار و لە ساڵی (١٩٣١)دا، وەك پێشترو لە نووسینی تریشدا تارادەیەك باسمان لێوە کردووەو زۆر بەکورتی ئاماژەمان بۆ کردووە، ئەمەش زیاتر بە هەوڵ و کۆششی بەگزادەکانی جاف و بە تایبەتی حەمە بەگی فەتاح بەگی جاف بووە کە لەو دەمانەی سەردەمی پاشایەتی و بە تایبەتی لە خولی دووەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا (١٩/٥/١٩٢٨- ١/٧/١٩٣٠) نوێنەری شاری کفری بووە لە ئەنجومەندا[٣٢].

جگە لەوەش وەك لاوێکی وشیار لەو دەمانەیدا کە بۆ ماوەیەکی زۆر کورت نوێنەر بووەو کەچی هەر بەلاوی‌و بە نەخۆشی ریخۆڵە کۆچی دوایی کردووە[٣٣].

لە ژیانیدا زۆر خاڵی درەوشاوەو هەنگاوی دەستە جەمعی زیرەکانەو لێوە شاوانەی هەبووە لەناو پەرلەمان‌و بەرامبەر بەنوێنەری باڵای بەریتانیا لە عێراق‌و لەگەڵ مەعروف جیاوکی هاوکاری[٣٤].

کە بۆ ئەو دەمانە دەکرێت بەوردی لێکدانەوەی مێژوویی بۆ بکرێت، بەتایبەتی لەگەڵ هاوەڵانی تری وەك: (حازمی شەمدین ئاغای نوێنەری مووسڵ، جەمال بابانی نوێنەری هەولێر، محەمەد ساڵح محەمەد عەلی نوێنەری سلێمانی، ئیسماعیل رواندزی نوێنەری هەولێرو سەیفوڵلای خەندانی نوێنەری سلێمانی)[٣٥].

لە (١٩٢٩)دا سەبارەت بەمەسەلەی چاکسازی‌و ریفۆرمی گشتی لە ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستاندا، چەند داواکارییەکی رەوایان خستووەتە بەردەوام پەرلەمان‌و حکومەت لەوانە وەك: کردنەوەی لیوایەکی نوێ لە چوارچێوەی پارێزگای مووسڵ، کە ناوەندەکەی دهۆك بێت، پێکهێنانی (لیوای باجەلان) لە ناوچە کوردنشینەکانی دیالەو کوت پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتییەکی مەعاریفی گشتی بۆ لیوا کوردییەکان‌و بەڕێوەبەرێکی کوردی دابنرێت‌و ناوەندەکەی لە یەکێك لە لیوا کوردییەکاندا بێت، جگە لەوەش هەر چوار لیوا کوردییەکە واتە: سلێمانی کەرکوك، هەولێرو دهۆك لە ئیدارەیەکی سەربەخۆدا یەك بخرێتەوەو پشکنەرایەتییەکی گشتی بۆ پێکبهێنرێت‌و کەسایەتییەکی کوردی لێهاتوو بکرێتە سەرۆکی‌و ببەسترێتە بەغداوە، سەرەرای داواکاری‌و پێداگیرییان بۆ خەرجکردنی بودجەیەکی دیاریکراو بۆ ئەم مەبەستە[٣٦].

بەجۆرێك لە دوای ئەمەوە هەریەك لە حکومەتی عێراق‌و بەریتانیای گەورە کۆمەڵێك هەنگاوی تارادەیەك گرنگیان لەم بارەیەوە نا، لەوانە: ناردنی شاندێك بۆ شاری کەرکوك لە (٨ی ئابی ١٩٣٠)دا، کە پێکهاتبوون لە نوێنەری (مندوب) باڵای بەریتانیا (مێجەر یانگ)و بریکاری سەرۆك وەزیرانی عێراقی جەعفەر عەسکەری[٣٧].

هەروەها دەرکردنی یاسای زمانە خۆجێیەکان (اللغات المحلیة)، کردنەوەی چەند قوتابخانەیەکی تر لە کوردستان، کە (٣) دانەیان بۆ کچان بێت، هەروەها لە (ئەیلولی ١٩٣٠) دا مامۆستا نوری بەرزنجی وەك سەرپەرشتیارێکی گشتی بۆ قوتابخانە کوردییەکانی ناوچەکە دەستنیشان کراو لەگەڵ ئەوەشدا سەلاحییەتێکی تایبەت‌و فراوانتری درایە دەستەوە بەبەراورد لەگەڵ ئەوانی دیدا بۆ راپەراندن‌و راییکردنی کارەکانی[٣٨].

بەدووریشی نازانین لە دەرئەنجامی ئەزموونێکی ناو پەرلەمان‌و حکومەتەوە بووبێت کە وا لە حەمەبەگی فەتاح بەگی جاف بکات، بیر لە کردنەوەی ناوەندێکی زانیاری وەك قوتابخانە لە ناوچەی گەرمیان‌و گوندەکەی خۆیدا بکاتەوە، هەر بۆیە بۆ ئەو مەبەستەو بەپێی گێرانەوەی یەکەم بەڕێوەبەری قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی، حەمە بەگ دەچێتە لای بەڕێوەبەری مەعاریفی ئەوکاتەی شاری کەرکوك‌و داوای ئەوەی لێدەکات، کەلە کەلاری ئەوکاتەدا،قوتابخانەیەکی سەرەتایی بکرێتەوە، جگە لەوەش هەر بە راوێژ لەگەڵ بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك خۆیدا قسە لەسەر ئەوەش دەکەن، کە چۆن محەمەد تۆفیق ئەفەندی لە قوتابخانەی شاری (دووزخورماتوو)ەوە بگوێزنەوە کەلارو قوتابخانەکەی پێ بکەنەوەو ئەوانیش هەموو جۆرە هاوکارییەکی پێویستی بۆ دەستەبەر بکەن، وەك ئەوەی هەر بەپێی دەستنووسەکانی خۆی‌و تەنانەت رەفیق حیلمی کوریشی، بە تەواوی جەخت لەسەر ئەم بارودۆخە دەکاتەوەو محەمەد تۆفیق ئەفەندی بۆ یەکەم جارو وەك خۆشی دەنووسێت: لە (١/٩/١٩٣١)دا، لە قوتابخانەی کەلار، کە بۆیەکەم جارو بە ئاسانکاری حەمە بەگ خۆی لەناو خانووەکەی ماڵی (قالە دارکێش)ی کەلاردا دەگرێتەوەو دەستبەکار دەبێت[٣٩].

هەروەها بەپێی دەفتەری خزمەتی مەدەنییەکەی واتە (دفتر الخدمة المدنیة)و تا ئەوکاتەی خزمەتی مامۆستایەکەی لە خورماتووەوە دەگوازێتەوە کەلاری ئەوکاتە، وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، کەسێکی خێزاندار بووەو ئەم مناڵانەی هەبووە کە لە کۆتایی دەفتەرەکەدا بە روونی ناوو ساڵی لەدایکبوونیانی نووسیوە، سەرەرای بەخێوکردنی کچە برازایەکی هەتیوی خۆی، وەك کاك رەفیق حیلمی ئەڵێت: کچەکە ناوی (سەبریە غەریب وەستا عەلی)بوو، کچی مامێکم بوو بەتەمەن لە باوکم منداڵتربوو، پێش مردنی دووکانی ئیسکافی هەبوو، وەك لە لاپەرە (٣٠)دا هاتووە: (احوال الموظف الشخصیة):

١- متزوج ام لا: نعم متزوج.

٢- الاولاد مع تاریخ ولادة کل منهم ذکور (١) اناث (٣).

- تاریخ تولد وفیقە ١٩٢٤. (هێشتا لە ژیاندا ماوە و لە شاری کەرکووکە).

- تاریخ تولد نوریە ١٩٢٨. (لە ساڵی ١٩٩٩دا وەفاتی کردووە).

- تاریخ تولد رفیق حلمی ١٣ تموز ١٩٣٠. (هێشتا لە ژیاندا ماوە و لە شاری کەرکووکە).

- تاریخ تولد صدیقە ١٩٣٣. (لە ساڵی ٢٠٠٥دا وەفاتی کردووە).

- الافراد الاخرون المکلف باعاشتهم: مکلف باعاشە بنت یتیمە وهی بنت اخی[٤٠].

سەبارەت بەشێوازی کردنەوەی قوتابخانەکەش رەفیق

حیلمی کوڕی تۆفیق ئەفەندی وای دەگێڕێتەوە: ئەوکاتەی کە مەرحومی باوکم لە دووزخورماتوو مامۆستای سەرەتایی دەبێت، لەسەر ڕاسپاردەی بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکووك ڕۆژێك حەمە بەگی جاف دەچێتە شارۆچکەی دووزخورماتوو بەو مەبەستەی قەناعەتی پێبکات کە وەك مامۆستا ڕاژەکەی بگوازێتەوەو بچێتە کەلار بۆ ئەوەی لەوێش قوتابخانەیەك بکرێتەوە، وەك ئەوەی تۆفیق ئەفەندیش لەسەر داواکەی ڕازی دەبێتو بۆ ئەو مەبەستە سەردانی کەلار دەکاتو سەرەتا لەگەڵ بەگزادەکانی جافدا کۆدەبێتەوە، بەتایبەتی لەگەڵ هەریەك لە کەریم بەگی فەتاح بەگی جافو حەمە بەگی برایدا کە خاوەنی سەرەکی بیرۆکەی قوتابخانەکە بووە، سەرەتا وەك پێشتریش ئاماژەی بۆکرا خانووەکەی ماڵی قالە دارکێش کە لەودەمانەدا تەنها لە دوو ژوورو ژوورێکی ئاژەڵ واتە (گەوردانێك) پێکهاتووە، بۆ شوێنی قوتابخانەکە دەستنیشان دەکەن، وەك ژوورێکیان کراوەتە ماڵی مامۆستای قوتابخانەکە واتە محەمەد تۆفیق ئەفەندیو ژوورەکەی تریشیان کراوەتە ماڵی فەراشی قوتابخانەکە، کە لەو دەمانەدا خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵا ڕەمەزان ڕۆستەم زەنگەنە (١٩٠٩- ١٩٩٥)ی خەڵکی کفری بووە، وەك حلیمی تۆفیق ئەفەندیو مەحموودی فەقێ ڕەشید (لە دایکبووی ١٩٢٣) جەختی لەسەردەکەنەوە، تەنها یەك ساڵ لە کەلار ماوەتەوەو دواتر ڕاژەکەی گواستراوەتەوە شارەوانی کفریو پاش ئەویش هەریەك لە کەریمی وەستا ڕەشیدو ساڵحی برای دەبنە فەراشی قوتابخانەکە[٤١].

بەشێوازێك دوای پاککردنەوەو فەرشکردنی گەوردانی خانووەکە وەك پۆلی خوێندن بەکار هێنراوەو لەمەشیاندا ماڵی هەریەك لە کەریم بەگو حەمەبەگی جاف هاوکارییەکی زۆریان کردووە لە ئاوەدانکردنەوەیدا، هاوکات وەك ڕەفیق حیلمی باسی لێوە دەکات: دوای بەجێهێنانی ئەو کاروبارانەو بۆ ڕاییکردنی پرۆسەی خوێندن دووبارە تۆفیق ئەفەندی باوکی دەگەڕێتەوە کفریو بە شێوەیەکی کاتی هەندێك پێداویستی خوێندنی وەك: تەختەڕەشو کتێبی پێویستو پێداویستی دی) لە قوتابخانەی سەرەتایی کفریو ناوبازاڕی شاری کفری دەستەبەر دەکاتو هەر ئەو ساڵە پرۆسەی خوێندن دەستپێدەکات[٤٢].

بەزۆری بابەتەکانی خوێندنیش لە ساڵی یەکەمیدا ئەم بابەتانە بوون کە نمرەکانیان لە بەرانبەردا نووسراوە: (علم الدين، اللغة العربية، الحساب، الاشياء والصحة، الرسم، النشيد، الرياضة البدنية). بەڵام لە ساڵانی دواترو قۆناغەکانی تری خوێندندا، بەپێی میتۆدی ئەوکاتە بابەتی تریان بۆ زیادکراوە، کە دەکرێت بەسەریەکەوە لەم بابەتانەی خوارەوەدا دەستنیشانیان بکەین: (علم الدين، اللغة العربية، الخط العربي، اللغة الانكليزية، الخط الانكليزي، الحساب، الهندسة، الجغرافية، التاريخ، الاشياء والصحة، المعلومات المدنية، الاعمال اليدوية، الرسم، النشيد، الرياضة البدنية)[٤٣].

بۆ نموونە لە بابەتێکی وەك سروود (النشيد)دا خەلیفە مەحموودی وەستا ڕەشید کە قوتابی ساڵی یەکەمی قوتابخانەکەیەو لە دایکبووی ساڵی (١٩٢٣)یە، باس لەوە دەکات کە ئەوان لە بابەتی سروودا جگە لە زمانی عەرەبیو تورکی بە زمانی کوردیش ئەم شیعرەیان خوێندووە کە تا ئێستاش لەبەریەتیو زۆر بەڕوونی ئەیلێتەوە:-

ئەی منالینە بابچین بۆ مەکتەب
بۆ وەرگرتن ئەخلاقو ئەدەب
ئەمرۆ زەمانەی عیلمو عیرفانە
بۆدەردی جاهیل مەکتەب دەرمانە
هەڵسن بابچین هیچ ڕانەوەستین
لەناو مەکتەبا بەکۆمەڵ بوەستین
ئەوقاتی خۆمان بەزایە نەدەین
ناوی ناداری بەشایی نەکەین.. تاد[٤٤].

هەروەك دەشبینی لە ساڵی یەکەمی خوێندندا کە بە زمانی عەرەبی دەستی پێکردووە، کۆمەڵێك خوێندکار لە تەمەنی جیاوازدا وەرگیراون، کە بەپێی تۆماری گشتی یەکەمی قوتابخانەکە و لە ساڵی خوێندنی (١٩٣١- ١٩٣٢) دا، بە زۆری ئەم خوێنکارانە دەگرێتەوە کە لەم خشتەیەی لای خوارەوەدا ناویان، ساڵی لەدایکبوونیان، ساڵی چوونە قوتابخانەیانو هەروەها هۆکاری وازهێنان یان نەقل بوونیان بە ڕوونی لە تۆماری گشتی قوتابخانەکەدا هاتووە لەوانە[٤٥].

هەروەها قوتابییەکان بەسەریەکەوە هەر هەموویان کوڕن لە ساڵی یەکەمیاندا، تەنها کچێکیان لەگەڵدایە کە ئەویش: ئەختەر خانی کچی حەمە بەگی جاف (١٩٢٦- ١٩٦١) خۆی بووە، هەروەها بەپێی ئەمەش تا ساڵی کردنەوەی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی لە کەلار کەسایەتیو پیاوێکی ئایینی وەك مەلا محەمەدی جوانڕۆیی هێشتا لە کەلاردا ماوەتەوەو بەردەوام بووە، لە مەسەلەی تەدریسو وانەوتنەوە لە مزگەوتی ئەوکاتەی کەلاردا، چونکە وەك بەلیستی ناوی قوتابیانی ساڵی یەکەمیدا دەردەکەوێت، ئەوساڵەیان کوڕێکی ئەو بە ناوی (عەبدوڵڵا مەلا محەمەدی جوانڕۆیی) یەوە، بۆ یەکەم جار لە قوتابخانەی سەرەتایی کەلاری ئەوکاتە وەرگیراوەو ناوی لە تۆماری گشتی (قيد عام)، ژمارە (١)ی قوتابخانەکەدا هەیە، کەچی دواتر لە خانەی تێبینی (حقل الملاحظات)ی تۆمارەکەدا، بەرامبەر بەناوەکەی بە ڕوونی نووسراوە: باری کردووەتە شاری خانەقین (هاجر الى مدينة خانقين). بەڵام پێشتر بە ڕوونی نەماندەزانی، کە مەلا محەمەدی جوانڕۆیی تا ساڵی چەند لە کەلاردا ماوەتەوە[٤٦].

لە ساڵی دووەمی خوێندنی قوتابخانەی کەلار (١٩٣٢- ١٩٣٣)دا، ژمارەو ڕێژەی کچان تارادەیەك زیادی کردووەو بەسەریەکەوە بوون بە چوار کچ لەوانە: (وەفیقە محەمەد تۆفیق عەلی کچی بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کەلار، قەدری کچی وەستا حەمیدی ناڵبەندو ڕەعنای کچی حەیدەر سادەو ئەختەرخانی کچی حەمە بەگ). جا لەبەر ئەوەی قوتابخانەکە تەنها چوار پۆلی بووە، بۆیە هەر کە قوتابی گەیشتووەتە کۆتایی قۆناغی چوارەمی خوێندن یان ئەبوایە بە یەکجاری دەستی لە پرۆسەی خوێندن هەڵبگرتایە یان ئەبوایە بۆ درێژەدان بە خوێندن بچوایەتە شارە ئاوەدانەکانی تری ناوچەکە، بەتایبەتی شاری کفریو خانەقینی ئەوکاتە

*** خشتەی ژمارە (١).**

| ژ | ناوی قوتابی | لەدایکبوون | ساڵی چوونە قوتابخانە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەحمەد محەمەد فەتاح | ١٩١٨ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ١٩٣٥ نەقڵی کفری بووە |
| ٢ | خالید ڕەزا بەگی جاف | ١٩١٨ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ١٩٣٥ نەقڵی کفری بووە. |
| ٣ | عەبدوڵڵا محەمەد فەتاح | ١٩٢٥ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | بەهۆی ئیشی ماڵەوە وازی هێناوە. |
| ٤ | حەسەن حەیدەر سادە | ١٩٢٦ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | هەر لەسەرەتاوە وازی هێناوە. |
| ٥ | عەلی ڕەحیم تازە ئەورەحمان | ١٩٢٥ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لەبەر هەژاری وازی هێناوە. |
| ٦ | عەبدولباقی ئەکبەر خان | ١٩٢٦ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە سەرقەڵاوە هاتووەو وازی هێناوە. |
| ٧ | محەمەد سەعید بەگی حەمە بەگ | ١٩٢٥ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ساڵی ١٩٣٦وە نەقڵی کفری. |
| ٨ | حوسێن حاجی محێدین | ١٩٢٤ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | دوای چەند ساڵێك وازی هێناوە لە خوێندن |
| ٩ | ئیبراهیم شێخ حەسەن | ١٩٢٢ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | بەهۆی ئیشی ماڵەوە وازی هێناوە. |
| ١٠ | محەمەد عەلی شێخ حەسەن ئەحمەد | ١٩٢٣ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | نەقڵی قوتابخانەی خانەقین بووە. |
| ١١ | عەلی شامە | ١٩٢٣ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ساڵی ١٩٣٦ نەقڵی هەڵەبجە بووە. |
| ١٢ | مەحموود وەستا ڕەشید | ١٩٢٣ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | بەهۆی هەژارییەوە وازی هێناوە. |
| ١٣ | حەمە ئەمین نەریمان دەروێش | ١٩٢٢ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ١٩٣٤ لەبەر هەژاری وازی هێناوە. |
| ١٤ | نووری عەبدوڵڵا جۆڵا | ١٩٢٠ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ١٩٣٥ نەقڵی گوندێکی تر بووە. |
| ١٥ | قادر محەمەد ساڵح | ١٩٢٥ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ١٩٣٨ لەبەر هەژاری وازی هێناوە |
| ١٦ | محەمەد ئەمین عەبدوڵڵاسوور | | ١٩٣١- ١٩٣٢ | باریان کردووە بۆ گوندێکی دی |
| ١٧ | کەریم مەحموود قادر | ١٩٢٠ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ١٩٣٦ نەقڵی کفری بووە بۆ خوێندن. |
| ١٨ | موسا پیرۆەیس عیسا | ١٩٢٠ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | بووەتە شوانو وازی هێناوە لە خوێندن |
| ١٩ | قادر عەبدول محەمەد | ١٩٢٤ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لەسەر داخوازی باوکی وازی هێناوە. |
| ٢٠ | ئەحمەد عارف | ١٩٢٣ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | بەهۆی بارکردنیانەوە وازی هێناوە. |
| ٢١ | محەمەد ڕەشید محەمەد عەزیز | ١٩٢٣ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | بەهۆی هەژارییەوە وازی هێناوە. |
| ٢٢ | حوسێن سۆفی فەتاح | ١٩٢٥ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | نەقڵی قوتابخانەی قرزەبات بووە. |
| ٢٣ | کاکە عەبدوڵڵا سەمین | ١٩٢٠ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | بەهۆی هەژارییەوە وازی هێناوە. |
| ٢٤ | مەحموود ڕەزا بەگی جاف | ١٩٢٥ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ساڵی ١٩٣٦دا نەقڵی کفری بووە. |
| ٢٥ | عەبدوڵڵا مەلا محەمەدی جوانرۆیی | | ١٩٣١- ١٩٣٢ | باریان کردووە بۆ شاری خانەقین |
| ٢٦ | محەمەد فەقێ مەحموود | | ١٩٣١- ١٩٣٢ | بەهۆی هەژارییەوە وازی هێناوە. |
| ٢٧ | مەحموود محەمەد حاجی ئەڵماس | ١٩٢٢ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لە ١٩٣٧ چووتە پۆلی پێنجەم وازی هێناوە. |
| ٢٨ | ئەختەرمحەمەد بەگی جاف | ١٩٢٦ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | لەسەر داوای باوکی وازی لەخوێندن هێناوە |

کە زۆر لێیەوە نزیك بوون و زۆر لە مێژەوە قۆناغەکانی تری خوێندنیان تیا کرابووەوە، بۆ نموونە و لەم بارەیەوە مستەفا نەریمان (١٩٢٥- ١٩٩٤)[٤٧] لە یاداشتەکانی خۆیدا، باس لەوە دەکات کە گوایە ئەو کاتەی ئەو لە شاری کفری و لە (١٩٣١)دا چووتە پۆلی یەکەمی سەرەتایی، دوای چەند ساڵێك و لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندنیدا، کە دەکاتە ساڵی خوێندنی (١٩٣٥- ١٩٣٦) لەبەر ئەوەی قۆناغی پێنجەم و شەشەمی خوێندنی سەرەتایی لە کەلار نەبووە، بۆیە منداڵان و قوتابیانی کەلار بە تایبەتی بەگزادەکانی جاف منداڵی خۆیان لە کەلارەوە ناردووەتە شاری کفری ئەوکاتە، بۆ ئەوەی درێژە بەخوێندن بدەن، بەتایبەتی لەوکاتەیدا کە مامۆستا ڕەشید عاکف هورمزی بە ڕەگەز تورکمان، بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کفری بووە، هەروەها قوتابیان و منداڵانی ئەوکاتەی کەلار و بەگزادەکانی جاف بە زۆری ئەمانە بوون، کە ناوی بەشێکیان لە یاداشتەکانی خۆیدا دەستنیشانکردووە لەوانە: (مستەفا بەگی کەریم بەگی جاف، شەوکەت ئەحمەدبەگ،خالید ڕەزا بەگ، عەلی سەلیم بەگ و ئەحمەدی برا حەمە). تەنانەت لەو دەمانەشدا ناحیەیەکی وەك: (قەرەتەپە) هەرچەندە هەر لە زەمانی عوسمانی و فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەوە مەرکەزی ناحیە بووە، بەڵام لە بەر ئەوەی پۆلی پێنجەم و شەشەمی خوێندنی تیانەبووە، قوتابییەکانی ئەوێش هاتوونەتە کفری بۆ تەواوکردنی خوێندن بە جۆرێك ئەم پرۆسەیەش بەردەوام بووە تا ئەو کاتەی لە ساڵانی دواتردا و لە کەلاردا قۆناغی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی خوێندن کراوەتەوە[٤٨].

هەرچەندە لە کەلارداو دوای پێنج شەش ساڵێك لە کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی و بە مەبەستی زیاتر گەشەکردن و فراوانکردنی لەسەربڕیاری بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی کەرکووك و بە هەوڵی کەریم بەگی جاف و هەروەها هاوکاریکردنی دانیشتوانی کەلاری ئەوکاتە، قوتابخانەیەکی نوێتر لەگەڵ زۆرێك لە پێداویستییەکانیدا، کە هەر لە دارو گڵ دروست دەکرێت و ژمارەی خوێندکارەکانیشی بەرادەیەك زیادی کردووە کە لە توانای تەنها محەمەد تۆفیق ئەفەندیدا نەبێت، بۆ بەڕێوەبردنی وەك ئەوەی لەوە بەدواوە چەند مامۆستایەکی دی و لە شوێن و ناوچەی تری عێراق و کوردستانەوە ڕاژەی مامۆستاییان دەگواسترێتەوە کەلار لەوانە: ڕەوف بەگی جەلالی کە پێشتر ئەفسەر بووە لە سوپای دەوڵەتی عوسمانیداو هەروەها دواتریش یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی پشتیوان) کە لە (١٠ی تەمووزی ١٩٢٧) دامەزراوە[٤٩].

پاش یەك ساڵی تەواوی مامۆستایی لە کەلار دەکرێتە بەڕێوەبەری ناحیەی داقووق (تاوغ) لە لیوای کەرکووك، ئادەم ئەفەندی کە دیان واتە مەسیحی و خەڵکی شارۆچکەی ئامێدی بووە، خزوری ئەفەندی ئەمیش دیانێکی تری شاری مووسڵ بووە، ئەحمەد ئەفەندی خەڵکی شارەبانی سەر بە لیوای دیالە بووە، سەلیم بەگی دەفتەری کە لە تورکمانەکانی شارۆچکەی دووز خورماتوو بووە و لە هەموو تەمەنیدا بەرەبەنی ژیاوە و خێزانی نەبووە، هەروەها نەجاتی عومەر فەوزی چەمچەماڵی و هەر لە سییەکانی سەدەی ڕابردووشدا مامۆستا **محەمەد نەعیم عەسری** (١٩٠٠- ١٩٧٥)[٥٠]. ماوەیەك لە کەلار مامۆستا بووەو دوایی نەقڵی شاری کەرکووك کراوەتەوە[٥١].

دوایی مستەفا نەریمان، کە ئەمیش لە (١٩٤٤/١٠/١٨)دا، کە لەو دەمانەدا ئەندامی حیزبی هیواش بووە، وەك مامۆستاو کەسایەتییەکی خەڵکی ناوچەکە دەستبەکار بووە، تا ئەوکاتەش وەکو ئەو باسی لێوە دەکات تەنها دوومامۆستای تێدا بووە، بەناوەکانی (زەینەڵ حوسێن بەیاتی) بەڕەگەز عەرەبی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، لەگەڵ (عەزیز مەجید بەیاتی)، بە جۆرێك لەم ماوەیەدا کەلار نزیکەی (٢٥٠)ماڵ بووەو ژمارەی خوێندکارانی نزیکەی (٥٠- ٦٠) قوتابی بووە، هەروەها جگە لە موشتەمەلات، شەش پۆلی خوێندنیشی تێدا هەبووە، وێڕای هەموو ئەمانەش هۆکاری کەمی قوتابیان و لاسارییان لە خوێندن دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە گوایە مامۆستاکان لەو سەروبەندەدا بەباشی دەوامیان نەکردووەو ڕێگای نێوان کەلارو کفری جگە لە نەبوونی ئۆتۆمبیلی بەردەوام بۆ هاتووچۆ قیرتاو نەبووەو زۆریش دژوار بووە[٥٢].

جا لەبەر پێویستی زۆری قوتابخانەکەو لەبەر سوودی گشتی، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە لەو ڕۆژگارەدا بەناچارییەوە پێشنیاز دەکات، کە مەلا مستەفای تایشەیی کە مەلای مزگەوتی ئەوکاتەی کەلار بووە، بکرێتە مامۆستاو بۆ ئەو مەبەستەش لەلایەن: بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی ناوچەی باکوری ڕۆژهەڵات (مديرية معارف المنطقة الشمالية الشرقية)[٥٣]. کە فاخر عوبێدی بەڕێوەبەری بووەو وەك سەرپەرشتیاریش بۆ هەرسێ لیواکەی ئەوکاتە واتە کەرکووك، سلێمانی، هەولێر مامۆستا ڕەفیق حیلمی (١٨٩٨- ١٩٦٠)[٥٤]. کارەکانی ڕاپەڕاندووەو بنکەکەی لە شاری کەرکووك، بەرانبەر بە سەرای ئەوکاتەی شار بووەو وەك مامۆستا دایدەمەزرێنن، بە تایبەتی بۆ وتنەوەی بابەتەکانی: (علم الدين واللغة العربية) لە قوتابخانەی کەلاری ئەو کاتەدا[٥٥].

بەڵام ئەو سەرپەرشتیارانەی مەعاریف کە لە سەردەمی محەمەد تۆفیق ئەفەندیدا ڕوویان لە کەلار کردبێت زیاتر بریتی بوون لە سەرپەرشتیارانی وەك:- مەعرووف ئەفەندی ناوێك کە خەڵکی هەولێرو هەروەها مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەناوبانگ کە لە کەرکووکەوە سەردانی کەلاریان کردووەو بەزۆری بۆ شەوانیش لەبەر نەبوونی ئۆتۆمبیل و گەڕانەوە، ناچار بۆ ڕۆژی دوایی و بەزۆری هەر لە کەلارو لە ماڵی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەدا ماونەتەوە[٥٦].

کەچی لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا ئەم سەرپەرشتیارانەش بەمەبەستی بەدواداچوون و چاودێری سەردانیان کردووە لەوانە:- فاتح مستەفا لە شاری کەرکووکەوە و عوسمان قۆجە قەساب لە هەولێرەوە (٥٧).

بەم شێوەیەو هەر وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا تا ساڵی (١٩٣٨) محەمەد تۆفیق وەك مامۆستاو بەڕێوەبەری قوتابخانەی چوار پۆلی لە کەلاردا ئەمێنێتەوە[٥٨].

بەڵام لێرە بەدواوە دووبارە ڕاژەی مامۆستایەكەی دەگوازرێتەوە شاری كفریو وەكو خۆی ئەڵێت: لە قوتابخانەیەكدا ئەبێتە مامۆستا كە ناوی (مدرسة كفري الاولية) بووە، كە لەو دەمانەدا بەرامبەر بە (مزگەوتی خانەقا)ی شاری كفری بووە[٥٩].

جگە لەوەش قوتابخانەكە لەناو خانوویەكیماڵی كەسایەتی ناسراوی ئەو دەمانەی شاری كفری (مستەفا مال اللە- ڕێژی)دا[٦٠] بووە. لەپاش ئەویشەوە مامۆستایەكی بەرەسەن توركمانی خەڵكی كفری بە ناوی حەسەن عەباس ڕەزا مەهدییەوە (١٩١٣- ١٩٩٧/٩/٢٦)وە[٦١]، دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی كەلاری سەرەتایی، بە جۆرێك هەر ئەم مامۆستایە، لە ساڵانی چلەكانو ماوەیەكیش لە سەرەتای پەنجاكانو شەستەكانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا، ئەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی لە شارو شارۆچكەكانی وەك: كفری، قەرەتەپە، دووزو شوێنانی دی. كەچی دوای ئەو تەنها ساڵەو هەمیسان لەسەر داوای كەریم بەگی جافو لە ڕێگای بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی كەركووكەوە، تۆفیق ئەفەندی بۆ جارێكی دی دەگەڕێتەوە كەلارو بەسەریەكەوە دوو ساڵی دی ئەبێتەوە بەڕێوەبەری قوتابخانەی كەلاری سەرەتایی، واتە تا ئەوكاتەی لە ساڵی (١٩٤١)دا بە یەكجاری خانەنشین دەبێتو پاشان لە شوێنی ئەو سەلیم بەگی دەفتەری كە لە مامۆستا بەڕەگەز توركمانەكانی

حوسێن عەلی محەمەد بەیاتی، زەینولعابدین عەباس قەنبەر خەڵكی خورماتووە، محەمەد عەباس ئەلیاس خەڵكی قەرەتەپەیە، عەباس مەلا فازڵ، موسا یادگار موختار خەڵكی تاوە خورماتووە، عەباس ئیبراهیم محەمەد خەڵكی كفرییە، ڕەفعەت مەدحەت حەسەن محەمەد خەلیلو محەمەد عەلی حوسێن عەباس ئەڵەجە[٦٢].

هاوكات لێرە بەدواوەو تا كاتی بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) قوتابخانەی كەلاری سەرەتاییو لە سەردەمی پاشایەتیدا لە عێراق، ئەم مامۆستایانەش وەك لایەنی ئیداری بوون بە بەڕێوەبەرو كاروباری ئیداری قوتابخانەكەیان بەڕێوەبردووە، وەك لەم خشتەیەی خوارەوەدا ناوو ماوەی مانەوەیان دەستنیشان كراوە.

قوتابخانەی سەرەتایی كەلار لەگەڵ كردنەوەیدا، ساڵ بە ساڵ لە گەشەكردنی تارادەیەك بەردەوامدا بووەو ژمارەی مامۆستایانو قوتابیانی لە گەشەكردنو زیادبوونێكی بەردەوامدا بووە، بە هەردوو ڕەگەزی كوڕو كچییەوە، بەڵام ڕەگەزی مێینە بەرادەیەكی كەمتر، ئەمەش بۆ خۆی پەیوەندی بەو بارودۆخو ئاستی بیركردنەوەی كۆمەڵایەتی خەڵكەوە بووە لەو ماوەیەدا، سەرەڕای لایەنی هەژاریو دەستكورتی كۆمەڵانی خەڵك لە ناوچەكەدا. وەك ئەوەی لەنێوان ساڵانی خوێندنی (١٩٣١- ١٩٥٨)و بەپێی بەڵگەنامەو تۆمارەكانی قوتابخانەكە لەو ماوەیەدا تەنها (٤٦)كچ هاتوونەتە

**خشتەی ژمارە (٢)**

| ژ | ناوی بەڕێوەبەری قوتابخانە | مێژووی دەستبەكاربوون | مێژووی دەستلەكاركێشانەوە |
|---|---|---|---|
| ١ | محەمەد تۆفیق وەستا عەلی عەبدولڕەحمان | ١٩٣١/٩/١ | ١٩٣٨/٩/١ |
| ٢ | حەسەن عەباس ڕەزا مەهدی | ١٩٣٨/٩/١ | ١٩٣٩/٩/١ |
| ٣ | محەمەد تۆفیق وەستا عەلی عەبدولڕەحمان | ١٩٣٩/٩/١ | ١٩٤١/٩/١ (خانەنشین ئەبێت) |
| ٤ | سەلیم بەگی دەفتەری | ١٩٤١/٩/١ | ١٩٤٥/٩/١ |
| ٥ | ڕەشید محەمەد عەلی كۆیی | ١٩٤٥/٩/١ | ١٩٥٠/٩/١ |
| ٦ | محەمەد مستەفا مولكی | ١٩٥٠/٩/١ | ١٩٥١/٩/١٥ |
| ٧ | بەهجەت بەدری بەیاتی | ١٩٥١/٩/١٥ | ١٩٥٦/٩/٢٤ |
| ٨ | حوسێن عەلی محەمەد بەیاتی | ١٩٥٦/٩/٢٤ | ١٩٥٨/٩/١٥ |

دووزخورماتوو ئەبێت، دەكرێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەكە. جگە لە هەموو ئەوانەش لە قۆناغەكانی دواتردا كۆمەڵێك مامۆستای دی، ڕاژەی مامۆستاییان گواستراوەتەوە كەلار، كە دەكرێت لێرەداو بۆ مێژوو ناوی بەشێكیان دەستنیشان بكەین، بەتایبەتی لە سەرەتایی پەنجاكانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا لەوانە: خورشید عەزیز عەبدولڕەحمان (١٩٢٨- ٢٠١٢)[٦٣].

قوتابخانەو تەنانەت زۆریشیان هەر لەسەرتاوە یان لە نیوەی ساڵانی خوێندنیدا، بە هۆكاری جیاجیاو بە ناچارییەوە دەستیان لە خوێندن هەڵگرتووە بەكچانی بەگزادەكانی جافیشەوە، لەلایەكی تریشەوە هەندێكیان منالی ئەو مامۆستایانە بوونە كە بەهۆی كارو پیشەی مامۆستاییەوەو بەماڵەوە هاتوونەتە كەلارو دواتریش لەگەڵ نەقل بوونیاندا یان خانەنشین بوونیاندا منالەكانیشیان لە قوتابخانە

دوورکەوتوونەتەوە یان لەشارو شوێنانی دی درێژەیان بە خوێندن داوە، هەرچەندە ئاسۆی بیرکردنەوەو لێکدانەوەیان لەوکاتو هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەدا لە کۆمەڵانی خەڵك جیاوازتر بووە، تەنانەت هیچ کام لەوانەی وەك باسی لێوەکرا، بە هەر هۆکارێك بووبێت، نەیانتوانیوە کاروانی خوێندنو قوتابخانە بگەیەننە جێ و لە داهاتوودا کادرێرێکی خوێندەواریان لە یەکێك لە بوارەکاندا لێ پێکەیشتبێت، جگە لە چەند کەسێکی کەمیان نەبێت کە لە کۆتایی چلەکانو سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا وەرگیراونو هاوکات لە خانەوادەی دەوڵەمەندو جیاواز بوون، بۆ نموونە تەنها: (پەروین خانی کچی ڕەزا بەگی جافو خورشیدە خانی کچی داود بەگی جاف) توانیویانە لە داهاتوودا قۆناغی زانکۆیی تەواو بکەن[٦٤].

وێرای هەموو ئەوانەش یەکێکی دی لەو هۆکارانەی، کە بووەتە مایەی وازهێنانو دەست هەڵگرتنی قوتابی لە خوێندن، لە بەر ئەوەی خوێندن هەمووی بەزمانی عەرەبی بووەو شانبەشانی ئەوەش بە زۆری ئەو مامۆستایانەشی، کە هاتوونەتە کەلار بە مەبەستی وانە وتنەوە، بە زۆری لە ڕەگەزی تورکمان یان عەرەب یان مەسیحی بوونو بەرادەیەکی کەمتر کوردیان تیا بووە، تەنانەت زۆریشیان لە شارەکانی وەك: کەرکووك، بەغدا، مووسڵ، هەولێرو دواتر سلێمانیو خورماتووو کفریو قەرەتەپەوە هاتوون[٦٥].

جگە لەوەش لێرە بەدواوە. جگە لە قوتابخانەکە هەوڵدراوە شوێنی نیشتەجێبوونو حەوانەوەشیان بۆ دروست بکرێت بۆ نموونە: کەسایەتییەکی وەك حەمە سەعید بەگی جاف سەرەڕای تێکەڵیو بە تەنگەوە چوونی بەردەوامی بۆ قوتابخانەکەو بارودۆخی ژیانی مامۆستاکانی وەك مامۆستا خورشید عەزیز عەبدولڕەحمان باسی لێوە دەکات: لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا حەمە سەعید بەگو دوو خانووی سەربەخۆی بۆ مامۆستایانی قوتابخانەکە دروستکردووە، بە جۆرێك یەکێکان لەو دەمانەدا ماڵی مامۆستا بەهجەت بەدری بەیاتی (١٩٢٤- ٢٠١١) بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی تیا بووەو ئەوی کەشیان ماڵی خۆی واتە ماڵی خورشید عەزیز ئەفەندی[٦٦].

بەڵام ڕێژەو ژمارەی کچان لە قوتابخانەکەدا ولە ساڵانو ماوەی ناوبراودا (١٩٣١- ١٩٥٨) بەهۆی ئەو هەلومەرجەوە، کە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، دەکرێت لێرەداو وەك تۆمارێکی مێژوویی ناوی قوتابییە کچەکان، ساڵی لەدایکبوونیان، ساڵی چوونە قوتابخانەو هۆکاری وازهێنانیان لە ماوەی ناوبراودا دەستنیشان بکەین وەك لەم خشتەیەدا هاتووە:

خشتەی ژمارە (٣).

| ژ | ناوی قوتابی کچ | لە دایکبوون | س. چوونە قوتابخانە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەختەر حەمە بەگی جاف | ١٩٢٦ | ١٩٣١- ١٩٣٢ | ترکت على رغبه والده |
| ٢ | وەفیقەتۆفیق عەلی | ١٩٢٤ | ١٩٣٢- ١٩٣٣ | تا پۆلی چوارەمی لە کەلار خوێندووە |
| ٣ | قدریە اوستا حەمید | ١٩٢٤ | ١٩٣٢- ١٩٣٣ | تەنها دوو ساڵی خوێندووەو وازی هێناوە |
| ٤ | ڕەعنا حەیدەر سادە | | ١٩٣٢- ١٩٣٣ | ساڵی تەواو نەکردووەو وازی هێناوە |
| ٥ | عەفیفە ڕەزا بەگ | ١٩٢٥ | ١٩٣٣- ١٩٣٤ | تا پۆلی چوارەمی لە کەلار خوێندووە |
| ٦ | حەبیبە ڕەزا بەگ | ١٩٢٦ | ١٩٣٣- ١٩٣٤ | بە هۆی گەورەیی تەمەنەوە وازی هێناوە |
| ٧ | عەتیە سەعید اوستا سالح | ١٩٢٧ | ١٩٣٣- ١٩٣٤ | ساڵی تەواو نەکردووە |
| ٨ | نوریە تۆفیق عەلی | ١٩٢٥ | ١٩٣٣- ١٩٣٤ | نەقڵی قوتابخانەی کچانی کفری بووە |
| ٩ | ئامینە محەمەد حەسەن | ١٩٢٦ | ١٩٣٣- ١٩٣٤ | ساڵی تەواو نەکردووەو وازی هێناوە |
| ١٠ | عەتیە عەزیز محەمەد | ١٩٢٦ | ١٩٣٣- ١٩٣٤ | لە سەرەتاوەوازی هێناوە |
| ١١ | توبا ئەحمەد فەتاح | ١٩٢٦ | ١٩٣٣- ١٩٣٤ | ساڵی تەواو نەکردووە |
| ١٢ | مەلاحەت ڕەئوف بەگ | | ١٩٣٤- ١٩٣٥ | لە پۆلی (٣) هاتووەتە کەلارو باوکی مامۆستای قوتابخانەکە بووە |
| ١٣ | پاکیزە ڕەئوف بەگ | | ١٩٣٤- ١٩٣٥ | نەقڵی کچانی کەرکوك کراوەو باوکی مامۆستای قوتابخانەکە بووە |
| ١٤ | ڕەعنا ڕەزا بەگ | ١٩٢٦ | ١٩٣٤- ١٩٣٥ | دوای دوو ساڵ لەبەر گەورەیی وازی هێناوە |
| ١٥ | حەبیبە کەریم بەگ | ١٩٢٤ | ١٩٣٤- ١٩٣٥ | ساڵی ١٩٣٨ لەبەر گەورەیی وازی هێناوە |
| ١٦ | پەریخان محەمەد بەگ جاف | ١٩٢٧ | ١٩٣٤- ١٩٣٥ | ساڵی تەواو نەکردووەو وازی هێناوە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٧ | سەعادەت حاجی نوری بەگ | | ١٩٣٤ -١٩٣٥ | لە قوتابخانەی قۆریەی كچانی كەركووكەوە هاتووەتە كەلارو لە ١٩٣٥ نەقلی كەركووك بووەو باوكی مامۆستا بووە |
| ١٨ | مەدیحە موسا بەگ | ١٩٢٥ | ١٩٣٥ -١٩٣٦ | لە پۆلی دووەمەوە هاتووەتە كەلار |
| ١٩ | بەهیە محەمەد بەگ | ١٩٢٨ | ١٩٣٥ -١٩٣٦ | تەنها یەك ساڵ خوێندوویەتی |
| ٢٠ | عائیشە فەتاح | ١٩٢٨ | ١٩٣٩ -١٩٤٠ | ساڵی تەواو نەكردووەو وازی هێناوە |
| ٢١ | خەدیجە ڕەزا بەگ | ١٩٣١ | ١٩٤٠ -١٩٤١ | ساڵی تەواو نەكردووەو وازی هێناوە |
| ٢٢ | سەلمە ئەحمەد عەلی محەمەد | ١٩٣٢ | ١٩٤٠-١٩٤١ | ساڵی تەواو نەكردووەو وازی هێناوە |
| ٢٣ | ئامینە بایز مستەفا | ١٩٣٣ | ١٩٤٠ -١٩٤١ | ساڵی تەواو نەكردووەو وازی هێناوە |
| ٢٤ | جەواهیر تۆفیق شەریف | ١٩٣٢ | ١٩٤٠ -١٩٤١ | ساڵی تەواو نەكردووەو وازی هێناوە |
| ٢٥ | ئیقباڵ كەریم بەگ جاف | ١٩٣٩ | ١٩٤٥ -١٩٤٦ | پۆلی چوارەمی تەواوكردووەو چووتە خانەقین |
| ٢٦ | لەمیعە شێخ حەسەن | ١٩٣٩ | ١٩٤٥ -١٩٤٦ | بە هۆی گەورەیی تەمەنەوە وازی هێناوە |
| ٢٧ | ئافتاو سەید خەلیل | ١٩٣٧ | ١٩٤٥-١٩٤٦ | بەهۆی هەژارییەوە وازی هێناوە |
| ٢٨ | مریم ئەحمەد بەگ جاف | ١٩٣٩ | ١٩٤٦ -١٩٤٧ | دوو ساڵی خوێندووەو وازی هێناوە |
| ٢٩ | خورشیدە داود بەگ جاف | ١٩٣٩ | ١٩٤٦ -١٩٤٧ | پ. چوارەمی تەواوكردووە چووتە خانەقین |
| ٣٠ | پریا ڕەزا بەگ جاف | ١٩٣٨ | ١٩٤٦ -١٩٤٧ | دەرچووە بۆ پۆلی چوارەمو وازی هێناوە |
| ٣١ | پەروین ڕەزا بەگ جاف | ١٩٣٩ | ١٩٤٦ -١٩٤٧ | پ. چوارەمی تەواوكردووەۆ چووتە خانەقین |
| ٣٢ | گەلاوێژ داود بەگ جاف | ١٩٤٠ | ١٩٤٧ -١٩٤٨ | پ. چوارەمی تەواوكردووەو وازی هێناوە |
| ٣٣ | ئاسكە ئەحمەد فەتاح | ١٩٤١ | ١٩٤٧ -١٩٤٨ | لە ١٢/٢/ ١٩٥٢ وازی هێناوە |
| ٣٤ | ئاهو سەعید وەستا ساڵح | ١٩٤١ | ١٩٤٨ -١٩٤٩ | دوو ساڵی خوێندووەو وازی هێناوە |
| ٣٥ | شەونم عەبدولكەریم ئەفەندی | ١٩٤٢ | ١٩٤٩ -١٩٥٠ | دوو ساڵی خوێندووەو نەقڵی كفری كچان بووە |
| ٣٦ | گێلاس محەمەد ڕەشید | ١٩٥٠ | ١٩٥٤ -١٩٥٥ | سێ ساڵی خوێندووەو ئەوجا وازی هێناوە |
| ٣٧ | زەینەب مەلا ئەحمەد | ١٩٤٥ | | باوكیان مەلای مزگەوتی كەلار بووە لە ١٩٥١ لە سەعدییەی كچانەوە هاتوون |
| ٣٨ | خەدیجە مەلا ئەحمەد | ١٩٤٩ | | |
| ٣٩ | لەیلا مەحموود بەگ جاف | ١٩٥١ | ١٩٥٧ -١٩٥٨ | تا پۆلی چوارەمی خوێندووەو وازی هێناوە |
| ٤٠ | نازەنین عەبدوڵڵا | ١٩٥٠ | ١٩٥٧ -١٩٥٨ | لە پۆلی چوارەم دەرنەچووەو وازی هێناوە |
| ٤١ | فەوزیە مەحموود | ١٩٥١ | ١٩٥٧ -١٩٥٨ | لە پۆلی دووەم دەرنەچووەو وازی هێناوە |
| ٤٢ | نەزیرە محەمەد فەقێ مەحموود | ١٩٥٠ | ١٩٥٧ -١٩٥٨ | لە پۆلی سێیەم دەرنەچووەو وازی هێناوە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٤٣ | لەمیعە حوسێن ئەحمەد | ١٩٥١ | ١٩٥٧- ١٩٥٨ | لە پۆلی دووەم دەرنەچووەو وازی هێناوە |
| ٤٤ | نهایەت مەحموود محێدین | ١٩٥١ | ١٩٥٧- ١٩٥٨ | تەنها یەك ساڵی خوێندووەو وازی هێناوە |
| ٤٥ | نەجات عەزیز | ١٩٥١ | ١٩٤٧- ١٩٥٨ | نجحت الى الصف الثاني نتيجة قرار مجلس الوزراء |
| ٤٦ | سەبیحە محەمەد فەقێ مەحموود | ١٩٥١ | ١٩٥٧- ١٩٥٨ | پۆلی چوارەمی تەواوکردووەو وازی هێناوە |

سەبارەت بە خوێندنو داکۆکیکردن لە بارودۆخی خوێندن لە ناوچەی گەرمیانو قەزای کفریو هەروەها ناحیەی شێروانەو پێباز (باوە نوور)دا، بەتایبەتی لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردوو و لەکاتی حکومەتەکەی جەمیل مەدەفەعی (٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٥٣- ٥ی ئایاری ١٩٥٣)، لە بەردەم ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، کەسایەتییەکی وەك داود بەگی جاف (١٨٩٤- ١٩٦٦)، کە وەك نوێنەری لیوای کەرکووك (کفری) ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دەبێت، لە سەردەمی پاشایەتیدا، بە تایبەتی دوای حەمە بەگی برای تارادەیەکی باش، ئەمیش لەسەر هەمان ئەو رەوتو تەرزە بەردەوام دەبێت.

سەرەرای داواکاریو بایەخدانی بە گەشەکردنی بوارە جۆربەجۆرەکانی ئاوەدانی وەك: بایەخدان بەناوەندی تەندروستیو کردنەوەی خەستەخانەی پێویست لە ناوچەکانی شاری کفری[٦٧].

هەروەها بونیادنانی مزگەوت، هێڵی کارەبا، هێڵی پەیوەندیو رێگاوبان، چارەسەرکردنی کێشەی تەموین بۆ رۆڵەکانی عەشایەرو شارەکان لە رێگای دامو دەزگاکانی حکومەتو پەرلەمانەوە بۆ ناوچەی گەرمیانو قەزای کفری[٦٨].

هاوکات لە دانیشتنێکی تری ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، زۆر پێی لەسەر ئەوە داگرتووە، کە بواری خوێندنو پەروەردە لە چوار چێوەی شوێنو ناوچەکانی قەزای کفری فراوانتر بکرێتەوە، بەوەی کە ژمارەیەك قوتابخانەی نوێ لە دێهاتەکانی سەر بە هەردوو ناحیەی (پێوان)و (شێروانە) دا بکرێتەوەو هەروەها قوتابخانەی ناوەندی کفریش بکرێتە دواناوەندی بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زیاتری قوتابی لە خۆ بگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کار بۆ ئەوەش بکرێت، کە قوتابخانەیەکی ناوەندی بۆ کچان لە شاری کفری بکرێتەوە، سەرەرای ئامادەکردنو کردنەوەی قوتابخانەیەکی گەرۆك (مدرسە متجولە) بۆ فێرکردنی رۆڵەکانی عەشایەر لە ناوچە دوورە دەستەکاندا، بۆ ئەوەی فێری زانستو خوێندەواری بن[٦٩].

هەرچەندە لەم هەلومەرجەداو پێشتر لە مەرکەزی ناحیەی شێروانە لە سەر قەڵاو لە ساڵی (١٩٤٣)دا قوتابخانەی سەرەتایی کرایەوەو یەکەم بەرێوەبەریشی مامۆستا بەهجەت بەدری بەیاتی بووە[٧٠].

جگە لەوەش هەر ئەم مامۆستا بەهجەت بەیاتییە وەك پێشتریش بە خێرایی ناوبرا، دواتر لەنێوان ساڵانی (١٩٥١- ١٩٥٥)دا کراوەتە، بەرێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کەلار، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا (کۆتایی ٢٠١٠)، بە ماوەیەك پێش وەفاتکردنی مامۆستا بەهجەت بەدری بەیاتی، لە دانیشتنێکدا بۆی گێرامەوە لە ساڵی (١٩٥٤)دا، کاتێك مەلیك فەیسەڵی دووەمی عێراق (١٩٣٥- ١٩٥٨) لە سەردانێکیدا، بە یاوەری میر عەبدولئیلای وەسی پێشووو خاڵی (١٩١٣- ١٩٥٨) لەگەڵ شاندێك، بە مەبەستی راوکردنو گەرانێکی چەند رۆژە هاتوونەتە ناوچەی گەرمیان، لە نزیك (قەڵای شێروانە)ی کەلار ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتیو هاووڵاتیانو سەرۆکی خێڵو هۆزەکانی ناوچەکە لەوانە: داود بەگی جاف پێشوازییەکی گەورەو گەرمی لێکراوە، هەروەکو دەیگوت: ئێمەش وەك مامۆستایانو قوتابیانی قوتابخانەی سەرەتایی کەلاری ئەوکاتە، لەگەڵ دەستەیەك لە قوتابیان بە جلوبەرگی کەشافەوەو بە دروشمی جۆر بە جۆرەوە لە رێوەرەسمی پێشوازیکردنی مەلیك فەیسەڵی دووەمدا بە شداربووین، ئەوەبوو من پێش وەخت وتارێکم بە زمانی عەرەبیو بەناوی دانیشتوانی ناوچەکەو هۆزی گەورەی جافەوە نووسی، بەڵام دەقی وتارەکە حەمە سەعید بەگی جاف خوێندییەوە[٧١].

هەروەها بۆ پشت راستکردنەوەی ئەمەش شێخ محەمەدی کوری شێخ ئەحمەدی شاکەلی (لەدایکبووی ١٩٤٣) وەك قوتابییەکی هەڵکەوتووی ئەوکاتەی قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی باس لەوە دەکات: لەو دەمانەدا، کە مەلیك فەیسەڵی دووەم هاتووەتە ناوچەی گەرمیانو کەلار، ئەوان قوتابی قۆناغی شەشەمی سەرەتایی بوون، لە قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی، بەجلوبەرگی کەشافەوەو لەگەڵ هەموو مامۆستایانو هاوەڵانی قوتابخانەیاندا، بەشدارییان لەو رۆژەو لەو رێورەسمەی پێشوازیکردنی مەلیکدا کردووەو تەنانەت ئەو دەڵێت: لەو رێورەسمەدا ملوانکەیەکی لەگوڵ چنراو رێکخراو، کە لەو رۆژەداو هەر بۆ ئەو مەبەستەش ئامادەکرابوو، وەك قوتابییەك، منیان راسپارد بەوەی ملوانکە لەگوڵ چنراوەکە، بکەمە مل مەلیك فەیسەڵی دووەمو ئەوەبوو هەرواش دەرچوو[٧٢].

بەڵام لێرە بەدواوە مەلیك فەیسەڵی دووەمو شاندی یاوەری بێ ئەوەی لە کەلاری ئەو کاتە لابدەن، بەسێ ئۆتۆمبیلەوەو بە مەبەستی راوکردن لە: (توونی باباعەمرە)ی نزیك گوندی (پونگڵە) روویان لەم ناوچەیە کردووە، بەڵام لەم کاتەداو لەپڕ رەهێڵە بارانێکی بە خوری بەهاری گەرمیان، مەلیك فەیسەڵو هەموو ئەوانەشی کە لەگەڵیدا دەبن ناچار دەکات روو لە گوندی پونگڵە بکەنو هەر ئەوساش لەلایەن دانیشتوانی ئاوایی پونگڵەو بەتایبەتی کەسایەتی ناسراوی ناوچەی

گەرمیان حاجی مەحموودی هاروونی (١٨٩٢- ١٩٨٦)ەوە، پێشوازی‌و میوانداریی‌یەكی گەرم و گوڕی بۆ ساز دەكرێت[٧٣].

كەچی هەندێك بۆچوونیش پێیان وایە لانەدانی مەلیك فەیسەلی دووەم‌و وەسی خالی لە كەلار زیاتر لەبەر ئەوەیان بووە، كە گوایە نێوانی عەبدولئیلاو داود بەگی فەتاح بەگی جاف زۆر باش نەبووە، بەوەی ئەمەی دوایی لە ساڵی (١٩٤١) دا، پاڵپشتی لە بزووتنەوەی مایس‌و كەسایەتییەكی وەك شەریف شەرەف (١٨٨١- ١٩٥٥) كردووە، بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات‌و فەرمانڕەوایەتی لە عێراقدا[٧٤].

دوا بە دوای هەموو ئەوانە، بە چەند ساڵێك، لە ناحیەی پێواز واتە (باوەنوور)دا، كە لە (٢٧ كانوونی دووەمی ١٩٣٧) دا و، بەپێی ئیرادەیەكی فەرمی شاهانەو لەلایەن مەلیك غازی (١٩١٢- ١٩٣٩)، لە كاتی وەزارەت‌و حكومەتەكەی حیكمەت سولەیمان (١٨٨٩- ١٩٦٤)دا، كە لە هەمانكاتیشدا بۆ خۆی وەزیری ناوخۆی عێراق بووە كراوەتە مەركەزی ناحیە (٧٥).

جگە لەوەش یەكەمین بەڕێوەبەریشی كەسایەتی بەرەسەن توركمانی كەركووكی (ڕەشید عاكیف هورمزی) بووە، هەروەها بەچەند ساڵێكی دواتر ولە ساڵی خوێندنی (١٩٥٦- ١٩٥٧)دا، یەكەم قوتابخانەی سەرەتایی خوێندنیشی تیا كراوەتەوە، كەچی شان بە شانی هەموو ئەوانەش ساڵانە پرۆسەی خوێندن لە قوتابخانەی كەلاری سەرەتایی ئەوكاتەدا، بەردەوام لە برەوو گەشەكردنی زانستی خۆیدا بووەو بە زۆری ئەو قوتابیانەشی، كە ساڵانە ڕوویان لێكردووە، تەنها لە كەلارەوە نەبووە، بەڵكو بەشێكی زۆریشیان لەو دێهات‌و ناوچەكانی دەوروبەرو تەنانەت ڕۆژهەڵاتی كوردستانەوە ولەكاتی پەنا هەندەیی‌و ئاوارەییانەوە هاتوون، بەسەریەكیشەوە ژمارەی قوتابی لە كەلاردا، تا كاتی بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) گەیشتووەتە سەدان قوتابی، بە هەردوو ڕەگەزە كەیەوە، بۆ نموونە لە ساڵی خوێندنی (١٩٥٧- ١٩٥٨)دا، هەر بەهۆی بەرپابوونی شۆڕشی تەمووزو هاتنی عەبدولكەریم قاسم (١٩١٤- ١٩٦٣)وە بۆ سەر كاروباری دەسەڵات، بە بڕیارێكی سیاسی ئەنجومەنی وەزیرانی حكومەتی عێراق كە ئەوساڵە بە: (زحف) ناسراوە[٧٦].

هەموو قوتابییەكی دەرنەچووی ئەوساڵە عێراق دەرچێنراون‌و چوونەتە قۆناغی دواتر، وەك ئەوەی بەرامبەر بەناوی هەردوو كچە قوتابی وەك: (نەجات عەزیزو سەبیحە محەمەد فەقێ مەحموود)، لە قوتابخانەی كەلاری سەرەتایی نووسراوە: دەرچووە بۆ پۆلی دووەم بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران (نجحت الی الصف الثاني نتیجة بقرار مجلس الوزراء)[٧٧].

تەنانەت كەسیایەتییەكی ئایینی وەك مەلا عارف كوڕی مەلا یەحیای خانەقینی (١٩١٢- ١٩٩٨) لە یاداشتی ڕۆژانەی خۆیدا، سەبارەت بە بڕیاری ناوبراو لە ڕۆژی چوارشەممە، پێنجی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٥٨)دا نووسیویەتی: (ئیخبار عەفوكردنی هەموو منداڵ مەكتەب لە ڕاسبی‌و هەموو بە ناجیح دانران، زیادكردنی مەعاشی عەسكەری‌و موساعەدەی فەلاح)[٧٨].

جگە لەوەش هەر لەوساڵە بەدواوەو لە شاردەێی كەلاردا، بینایەكی گەورەو نوێ‌وبە دیزاینێكی تازەوە، بۆ قوتابخانەی كەلاری سەرەتایی دروستكراوە، كە بەسەریەكەوە، لە شەش پۆلی تەواوو گۆڕەپانی وەرزشی‌و هەموو موشتەمەلاتێكی قوتابخانەی پێویست پێكهاتووە.

* لیستی پەراوێزو سەرچاوەکان:-

- رەفیق حیلمی: کوڕی محەمەد تۆفیق عەلی عەبدولرەحمان ئاغایە لە (١٣ی تەمووزی ١٩٣٠)دا، لە خورماتوو لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتاییو ناوەندی لە کەلارو کفریو کەرکووک تەواو کردووە، بەڵام بەهۆی کۆچی دوایی باوکییەوە، لە (حوزەیرانی ١٩٤٧)دا ئەرکی خێزانو خوشکەکانی دەکەوێتە ئەستۆی، بۆیە بەناچارییەوە، بە مووچەی (١٠) دیناری مانگانە لە کۆمپانیای نەوتی کەرکووک دامەزراوەو نزیکەی (٣٢) ساڵ خزمەتی کردووەو دوایی لەسەر داوای خۆی ولە (١٩٧٧)دا خانەنشین کراوەو لە کەرکووک دەژی. دەستنووسی تایبەتی خۆی کە بۆ ئێمەی ناردووە.

١- کلاودیوس جەیمس ریچ، گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و محەمەد حەمەباقی، ب١، (سلێمانی: ٢٠١٢)، ل ٤٧- ٥٧.

٢- ينظر: جيمس بيلي فريزر، رحلة فريزر الى بغداد في ١٨٣٤، نقلها الى العربية: جعفر الخياط، الرافدين، ط٢ (بيروت: ٢٠١٤)، ص ٤١- ٤٩.

٣- محمد امين زكي بك، صفحات من دفتر ذكريات، ترجمها من التركية العثمانية: الدكتور خليل علي مراد، القسم العربي من مجلة (زين)، العدد (١) السليمانية: ٢٠٠٩)، ص٢٤١- ٢٤٢.

٤- عبدالكريم المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، عني بنشرة: محمد علي القرداغي، ط١، (بغداد: ١٩٨٣)، ص ٥٣١- ٥٣٢.

٥- محەمەد عەلی قەرەداغی، ئەلبوومی کەشکۆڵ، ب١، (هەولێر: ٢٠٠٨)، ل ١٧٨- ١٨٠.

٦- كريم بيگ فتاح بيگ جاف، تاريخ جاف، ترجمة وحواشي وتعليقات: دكتور محمد علي سلطاني، (اربيل: ٢٠١٢)، ص ١٠٩- ١١٦.

٧- بڕوانە: گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٧)، بەغدا، ساڵی ١٩٤٩، ل٥٨.

٨- ذنون الطائي، الاوضاع الادارية في الموصل خلال العهد الملكي ١٩٢١- ١٩٥٨، ط١، (الموصل: ٢٠٠٨)، ص١٨٩.

٩- بڕوانە: گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٧)، س.پ، ل٥٨.

١٠- بەزۆری ئەو کەسایەتییانەی، کە لە قۆناغی رابردوودا بەتایبەتی لە سەردەمی پاشایەتیدا بەرێوەبەری ناحیەی شێروانە بوون ئەمانەن:- عەبدولرەحمان خدر، ئیسماعیل حەقی خانەقینی، شەوکەت بەگی بابان، شەریف بەگ، جەلال بیلال مەلا هیدایەت پیرەبابی، کامیل محەمەد، تاهیر شاباز حەیدەری.. تاد.

١١- لە دەقی (ئیرادەی شاهانە)کەشدا، بەزمانی عەرەبی زۆر بە روونی ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت:

الارادة الملكية، رقم (١١٧٥):

بناء على السلطة التى خولني اياها جلالة الملك فيصل وبناء على ماعلاضه وزير الداخلية ووافق عليه مجلس الوزراء. قد صدرت هذه الارادة الملكية نيابة عن جلالته. باحداث ثلاث نواحي في شيبكة (ديبكة) واغجلرو قلعة شيروانة في لواء كركوك على وزير الداخلية تنفيذ هذه الارادة.

كتب ببغداد في اليوم الثامن عشر من شهر اب سنة ١٩٢٧ واليوم التاسع عشر من شهر صفر سنة ١٣٤٦.

فيصل

جعفر العسكري رئيس الوزراء

رشيد عالي وزير الداخلية. ينظر: عبدالله غفور، التشكيلات الادارية في جنوب كردستان، ط٣، مزيدةو منقحة، (اربيل: ٢٠١٤)، ص ١٢.

١٢- مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، (بەغدا: ١٩٩٤)، ل٧٧.

١٣- محەمەد هادی دەفتەری، عەبدوڵڵا حەسەن، عێراقی باکور، لیوای کەرکوک و دیالە ساڵی ١٩٥٥، وەرگێرانی: موعتەسەم محەمەد، (سلێمانی: ٢٠٠٣)، ١٥٨.

١٤- بڕوانە: گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٧) ساڵی (١٩٤٩)، ل٥٨.

١٥- ئەحمەد باوەر، جەلال بیلال مستەفا پیرەبابی ١٩٢٣- ١٩٩٣، یەکەمین قائمقامی قەزای کەلارو رۆڵی لە بواری کارگێریدا، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان، ژمارە (٣)، ٢٠١٤.

١٦- بنکورە: ناوچەیەکی کشتوکاڵی بەپیتە، لەسەردەمی عوسمانیدا (١٨٧٥) ناوەندی ناحیە بووەو بارەگاکەی هەرجارەو لە شوێنێکدا بووە، لە زۆر سەرچاوەو نووسراوی فەرمی چ عوسمانی و چ پاشایەتیدا بە روونی ناوی بە (بن قدرە) هاتووە. لە سەرەتای سییەکانی سەدەی رابردووەوە، کە (قۆرەتوو) کرایە ناوەندی ناحیەو جێگای (بنکورە)ی گرتووەتەوە وەك مەرکەزی ناحیە. بەڵام وەك هەڵکەوتەی جوگرافی لای باکوری گوندی (باریکە)و لای رۆژهەڵاتی (کلکەی کەنی زەرد)و لای باشووری (مەلەکونار)ە. هەروەها لای رۆژئاوای بریتی لە گوندی (کانی ماسی) سەر رووباری سیروان، تا ناوەراستی حەفتاکانی سەدەی بیستەمی رابردووو دەستپێکردنی پرۆسەی تەعریب لەم ناوچەیەدا، نزیکەی (٢٥) گوندی ئاوەدان بووە، کەچی تا ئێستا چەند گوندێکی نەبێ، بەباشی ئاوەدان نەکراوەتەوە. (لێکۆڵەر).

١٧- دیدەنی لەگەڵ خەلیفە مەحموودی وەستا رەشید (١٩٢٣)، کەلار، (٢٠١٥/٥/٧).

١٨- محەمەد ئەحمەد قەرەداغی: ساڵی (١٩١٧) لە کفری لەدایکبووە، قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و خانەی مامۆستایانی سەرەتایی بەغدای لەنێوان ساڵانی (١٩٢٥- ١٩٣٨) تەواوکردووە، لە شاری کەرکووک بووەتە مامۆستاو دواتر لە شارو شارۆچکەکانی تری وەك: حەویجە، ئاغجەلەر، چەمچەماڵ و کفری مامۆستایی کردووە، لەگەڵ دامەزراندنی حیزبی هیوادا ئەندامێکی چالاکی ئەو حیزبە بووەو لە هەمان کاتدا لە گۆڤارەکانی: گەلاوێژو دەنگی گێتی تازەدا نووسین و وەرگێرانی هەیەو نازناوی (پشکۆ) بووە، لە (١٩٥٩)دا واتە ئەوکاتەی کە بەرێوەبەری قوتابخانەی (غازی) دەبێت لەلایەن تۆرانچییەکانی کەرکووکەوە تێزاب دەکرێتە سەروچاویاو ئازارێکی زۆری دەدەن، جگە لە کوردی، زمانەکانی عەرەبی و

تورکی بەباشی زانیوەو لە (١٩٧٣/٦/١٧) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووەوولە کفری نێژراوە. مستەفا نەریمان، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی، (بەغدا: ٢٠٠٧)، ل١٣٠، دیدەنی لەگەڵ رەفیق حیلمی تۆفیق ئەفەندی، کەرکووک، ٢٠١٥/٤/٢٣، مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ١١٨.

١٩- مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، (بەغدا: ١٩٨٦)، ل١٩٧.

٢٠- سەبارەت بە (قوتابخانەی روشدییە) لە هەرسێ ویلاتەکەی عێراق لە ساڵی (١٩٠٠) بەدواوە بەم شێوەیە بووە، ویلایەتی بەغدا لە ساڵی ١٩٥٠دا تەنها (١٩) قوتابخانەی تیابووە. بروانە: ابراهیم خلیل احمد، تطور التعلیم الوطني في العراق ١٨٦٩- ١٩٣٢، ط١، (البصرة: ١٩٨٢)، ص ٤٥- ٤٦.

٢١- عبد الفتاح علي البوتاني، دراسات و مباحث في تاريخ الكوردو العراق المعاصر، ط١، (اربيل: ٢٠٠٧)، ص١١٤.

٢٢- لە دەوروبەری ساڵی (١٩٠٠)ی زایینی و ماوەی فەرمانرەوایەتی عوسمانیدا تەنها سێ خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە عێراقی ئەو دەمانەدا کراوەنەتەوە، یەکەمیان: لە بەغداو ئەوانی دی لە مووسڵ و بەسرە، بە جۆرێك خوێندن لەم سێ خانەیەداو بۆ یەکەم جار تەنها بۆ ماوەی سێ ساڵ بووە پاش تەواوکردنی قۆناغی روشدییە، دواتر کراوەتە چوار ساڵ و دیارترین ئەو وانانەشی کە خوێندکار لەم قۆناغەدا خوێندوونی بەسەریەکەوە بریتی بووە لە بابەتەکانی وەك: (بنەماکانی وانە وتنەوە، زمانی تورکی، بیرکاری، زانست و سروشت لەگەڵ مێژوو). بروانە: حنان عيسى الجبوري، مشكلات ادارة المدرسة الثانوية في العراق، (بغداد: ١٩٧٠)، ص ١٨٢.

٢٣- شهادتنامه، دولت عليه عثمانية معارف عموميه نظارتي، اسمي: محمد توفيق افندي، كنەسي، بن علي اغا شهادتنامه درجەسي، محل ولادتي: صلاحيه، تاريخ توليدي: ١٣٠٣، اشبو شهادتنامه بغداد معارف تصديقنجه تصديق اولنور ١٣٢٩.

٢٤- هەموو بەڵگەنامەیەکی پێویست سەبارەت مامۆستامحەمەد تۆفیق وەستا عەلی عەبدولرەحمان ئەفەندی قەرەداغی لەبەردەستدایەو هەموومان بە پێزانینێکی زۆرەوە لە ڕێگای کاك: (رەفیق حیلمی)کوڕییەوە پێ گەیشتووەو زۆر بە جوانی تا ئێستا ئەو گەنجینە گرنگەی باوکی پاراستووە. کە جێگای ڕێزلێنانێکی گەورەیە، چونکە بەراستی ئەو زانیارییە گرنگانەی ناو ئەرشیفەکەی ئەوان نەبوایە، ئێمە نەماندەتوانی بابەتێکی ئەوتۆ بنووسین و زۆرلایەنی شاراوەی مێژوویی سەرەتاکانی خوێندنمان لە کەلاردا بە نەزانراوی و شاراوەیی دەمایەوە.

٢٥- دیدەنی لەگەڵ رەفیق حلمی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، کەرکووك (١٥ ئەیلولی ٢٠١٤).

٢٦- الحكومة العراقية، وزارة الداخلية، دفتر الخدمة المدنية، نموذج عام (١٨)، ص٢.

٢٧- محمد شاكلي، صورة المجتمع والمدرسة في الخمسينيات من القرن الماضي، سرد توثيقي من الذاكرة لاحوال التربية والتعليم في قصاء كفري واطرافه، (كركوك: ٢٠١٥)، ص ٢٣، حسين كلاري، صفحات مطوية من تاريخ مدرسة كلار الابتدائية المختلطة في الخمسينيات، كركوك اليوم (مجلة بانەرۆژ)، مجلة فصلية علمية تصدر عن الجمعية الثقافية والاجتماعية في كركوك، العدد (١٩) ايلول ٢٠١٤، ٢٢.

٢٨- ئەم زانیاریيانەی کە تۆمارمان کردوون، بەپێی دەستنوسەکانی خۆیەتی.

٢٩- الحكومة العراقية، وزارة الداخلية، دفتر الخدمة المدنية، نموذج عام (١٨)، ص ١٦- ٢٨.

٣٠- دیدەنی لەگەڵ رەفیق حیلمی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، کەرکووك، ئەیلولی ٢٠١٤.

٣١- عبدالرزاق الحسني، (تاريخ الوزارات العراقية)، دار الشؤون الثقافية العامة، ط٧، ج١٠، (بغداد: ١٩٨٨)، ص ٦٦، ئەحمەد باوەر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی هاوچەرخی کورد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ ١، (سلێمانی: ٢٠٠٣)، ل ٨٢- ٨٨.

٣٢- ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی لە رۆژگاری پاشایەتیدا ١٩٢٥- ١٩٥٨، (هەولێر: ٢٠٠٧)، ل ٧٩.

٣٣- عبدالفتاح علي يحيي البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكردية التحررية، ملاحظات تاريخيةو دراسات اولية، (اربيل: ٢٠٠١)، ص ٥٥- ٥٦.

٣٤- احمد محمد امين قادر، موقف مجلس النواب العراقي من القضية الكردية في العراق ١٩٢٥- ١٩٤٥، (السليمانية: ٢٠٠٧)، ص١٩٩.

٣٥- عبد الرزاق الحسني، (تاريخ الوزارات العراقية)، دار الشؤون الثقافية العامة، ط٧، ج٣، (بغداد: ١٩٨٨)، ص ٦٦، ابراهيم خليل احمد، تطور التعليم الوطني في العراق ١٨٦٩- ١٩٣٢، ص ٢٩٢، نەبیل عەگید مەحموود ئەلموزەفەری، رۆڵی نوێنەرانی کەرکووك لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، سەردەمی پاشایەتی، ١٩٢٥- ١٩٥٨،و: دکتۆر حەسەن جاف، (هەولێر: ٢٠١٢)، ل٥.

٣٦- نەبیل عەگید مەحموود ئەلموزەفەری، رۆڵی نوێنەرانی کەرکووك لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، ل ٨.

٣٧- ابراهيم خليل احمد، المصدر السابق، ص ٢٩٣.

٣٨- دەستنوسەکانی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، هەروەها دیدەنی لەگەڵ رەفیق حیلمی کوری محەمەد تۆفیق ئەفەندی لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٠، کەرکووك، (١٥ ئەیلولی ٢٠١٤).

٣٩- الحكومة العراقية، وزارة الداخلية، دفتر الخدمة المدنية، نموذج عام (١٨)، ص٣٠.

٤٠- دیدەنی لەگەڵ خەلیفە مەحموودی وەستا رەشید (١٩٢٣) قوتابی دەورەی یەکەم (١٩٣١- ١٩٣٢)، قوتابخانەی سەرەتایی کەلار، کەلار (٢٠١٥/٥/٧).

٤١- دیدەنی لەگەڵ رفیق حیلمی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، کەرکووك، ئەیلولی ٢٠١٤.

٤٢- بروانە: یەکەمین تۆماری گشتی (قید عام) ژمارە (١)، ساڵی خوێندنی (١٩٣١- ١٩٣٢) قوتابخانەی کەلار.

٤٣- دیدەنی لەگەڵ خەلیفە مەحموودی وەستا رەشید (١٩٢٣)، کەلار، (٢٠١٥/٥/٧).

٤٤- بڕوانە: یەکەمین تۆماری گشتی (قید عام) ژمارە (١)، خوێندنی (١٩٣١- ١٩٣٢) قوتابخانەی کەلار.

٤٥- بڕوانە: یەکەمین تۆماری گشتی، ژمارە (١)، خوێندنی (١٩٣١- ١٩٣٢) قوتابخانەی کەلار.

٤٦- مستەفا نەریمان: ساڵی (١٩٢٥) لە کفری لەدایکبووە، بەرەچەڵەك لە بنەماڵەی پیرخدری شاهۆن، خوێندنی سەرەتایی، ناوەندیو دواناوەندی لە کفریو کەرکوك تەواو کردووە، دواتر خانەی مامۆستایانی لە بەغداو لەگەڵێك شوێنی وەك: کەلار، کفری، کوڵە جۆ، کەرکوكو بەغدا مامۆستاو سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بووە، جگە لە بڵاوکردنەوەی چەندین کتێب لە بوارەکانی: ئەدەب، مێژوو، رۆژنامەوانیو بیبلۆگرافیا، هاوکات ئەندامی (هیوا) بووە، دوای خانەنشین بوونی، لە دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا لە بواری رۆژنامەوانیدا کاری کردووەوله (١٩٩٥/٥/٢٧)دا هەر لە بەغدا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆرستانی (محەمەد سەکران) نێژراوە بڕوانە: جمال بابان، اعلام کرد العراق، (السلیمانیه: ٢٠٠٦)، ص ٨٠٤- ٨٠٥.

٤٧- مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ٢٥.

٤٨- ئەحمەد خواجە، چیم دی، شۆرشەکانی شێخ مەحموودی مەزن، چ٣، (هەولێر: ٢٠١٣)، ل٢٤٧.

٤٩- محەمەد ئەمین عەسری: ساڵی (١٩٠٠) لەدایکبووە، لە سییەکانی سەدەی رابردوودا لە کەلار مامۆستا بووە، ماوەیەکی زۆر سەرگەرمی گەران بووە بەدوای کتێبی کۆندا، بۆ ئەو مەبەستەش سەردانی شارەکانی: (ئەستەمبوولو قاهیرەو تاران)ی کردووەو لە ئەستەمبووڵەوە بەزۆری ئەوکتێبانەی هێناوەتەوە، کە بە زمانی تورکی عوسمانی بوونو دوای ساغکردنەوەو وەرگێرانیان، کە کۆمەڵێك نووسەرو وەرگێری کوردی ئەو دەمانە، وەریان دەگێرا لە چاپخانەکەی خۆی کە ناوی (تەرەقی)بووە لە گەرەکی (پیریادی) چاپی کردوون، لەوانە: لەیلاو مەجنون، شیرینو فەرهاد، شیرینو خەسرەو، چل تووتی، لە (١٩٧٥)دا وەفاتی کردووە. بڕوانە: مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ١٨٢- ١٨٣.

٥٠- مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل١٨٢.

٥١- مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل٧٥- ٧٦.

٥٢- ئەم بەرێوەبەرایەتییە لە (١٩٤٦)دا هەڵوەشاوەتەوەو پاشان بۆ هەر لیوایەك بەرێوەبەرایەتییەکی سەربەخۆ کراوەتەوە، بڕوانە: مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم ل ٧٥.

٥٣- رەفیق حیلمی: ساڵی (١٨٩٨) لە کەرکوك لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتاییو ناوەندی لە کەرکوكو سلێمانیو ئامادەیی لە کەرکوك تەواو کردووە. پەیمانگای ئەندازیاری لە ئەستەمبووڵ خوێندووە ولە (١٩٢٠)دا گەراوەتەوە باشووری کوردستان ولە دووەمین حکومداریەتی شێخ مەحموودا راوێژکاری سیاسی بووەو یەکێك بووە لە بەشداربووانی راپەرینی بەردەرکی سەرای سلێمانی (١٩٣٠). هاوکات بەشداری کردووە لە دروستکردنی کۆمەڵەو رێکخراوە کوردییەکانی وەك: کۆمەڵەی کوردستان ١٩٢٢، کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان ١٩٢٧، حیزبی هیوا ١٩٣٩، لە بەرهەمەکانی: یاداشت (٧) بەرگ، شیعرو ئەدەبیاتی کوردی (٢) بەرگ. خولاسەی مەسەلەی کوردستان وەرگێران لە فەرەنسییەوە. پاش تەموز: دیوانی شیعر ١٩٦٠ جگە لە زمانی کوردی، زمانی عەرەبی، تورکی، فارسیو فەرەنسی بە باشی زانیوە. بڕوانە: شکری محەمەد سەگبان، پرسی کورد کێشەگەلی کەمینە نەتەوەکان، لە فەرەنسییەوە: نەجاتی عەبدوڵڵا، (هەولێر: ٢٠١٣)، ل ٨٤- ٨٥، محەمەد فاتح، پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشوور، (هەولێر: ٢٠١٤)، ل ٣٧٤- ٣٧٥.

٥٤- مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ٧٥، دیدەنی لەگەڵ رەفیق حیلمی تۆفیق ئەفەندی، (١٥ ئەیلولی ٢٠١٤).

٥٥- کاك رەفیق حیلمی کوری تۆفیق ئەفەندی ئەڵێت: منداڵ بووم مامۆستا رەفیق حیلمی کە ئەوکاتە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بوو، شەوێك لە کەلار لە ماڵمان مایەوە، دایکم بەگەڵای تۆڵەکە دۆڵمەی لێ نابوو، بە باوکمی دەوت باشە تۆفیق ئەفەندی، هێشتا گەڵا مێو دەرنەچووە، ئەم دۆڵمەیەتان بە چی لێناوە، باوکیشم پێی وت: ئەوە گەڵا مێو نییە لە گەڵای تۆڵەکەی دەشتی کەلار لێنراوە.

٥٦- محمد شاكلي، صورة المجتمع والمدرسة في الخمسينيات من القرن الماضي، ص ٢٧.

٥٧- دیدەنی لەگەڵ رەفیق حیلمی کوری محەمەد تۆفیق ئەفەندی، کەرکوك، (١٥ ئەیلولی ٢٠١٤).

٥٨- مزگەوتی خانەقا: ئەم مزگەوتەی شاری کفری لەسەر راسپاردەی شێخ نیزامەدینی کوری شێخ عومەری کوری شێخ عوسمانی نەقشبەندی (١٨٣٩- ١٩٠٠) دروستکراوە، زەوییەکەی موڵکی مەجید پاشای بابان بووەو بەمەبەستی دروستکردنی مزگەوتەکە بەخشیوەتیو رووبەرەکەی ١٢٠٠م دووجایەو لە ساڵی ١٣٠٧ی کۆچی بەرانبەر بە ساڵی ١٨٨٩دا تەواو کراوە، بەهۆی رووپۆشکردنی دیوی دەرەوەیەوە، بە کاشی جۆراوجۆر لە ناو کوردەکانی کفریدا بە مزگەوتی (منارە نەخشینە)و لەناو تورکمانەکانیشدا بە (ناقشلی جامعی) باسی لێوە دەکرێت بۆ دواجارو لە ساڵی (٢٠٠٨)دا، لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە و لەسەر دیزاینێکی جوان، دوای دارمانی، جارێکی دی بونیادنراوەتەوە، بڕوانە: مستەفا نەریمان، شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، ل ٦٠، سەلاحەدین عەبدولحەمید عەبدوڵڵا، شاری کفری لە تەرازووی رەسەنایەتیو شارەستانیەتدا، چ٢، (سلێمانی: ٢٠١٢)، ل ١١٤.

٥٩- مستەفا رێژی: مستەفا ئەفەندی مال الله، لە شاری کفریدا بە (مستەفا رێژی) ناسراوەو ساڵی (١٩٦٠) وەفاتی کردووە، یەکێك بووە لەو کەسایەتییانەی لەم شارەدا لقێکی کۆمەڵەی (ئیتحادو تەرەقی) کردووەتەوەو هەرخۆشی سەرۆکی بووەو کۆمەڵێك لە خەڵکی ئەم شارە پەیوەندییان پێوەکردووەو زۆربەی بڵاوکراوەکانی ئەو رێکخراوە کە

لە ئەستەمبوولەوە هاتووە، گەیشتووەتە دەستیان و بەناو خەڵكدا بڵاویان كردووەتەوە، جگە لەوانە مستەفا ڕێژی ڕۆشنبیرێكی شارەزای بوارەكانی ئەدەب و مێژوو بووە و كتێبخانەیەكی دەوڵەمەندی هەبووە، مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەكانی ژیانم، ل ١٥، مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، ل٧٤.

٦٠- حەسەن عەباس ڕەزا مەهدی: ساڵی (١٩١٣) لە كفری لەدایكبووە، دایكی ناوی بەهیجە ئیبراهیمە، خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە بەغدا تەواوكردووە، لە ساڵی (١٩٣٨)دا لە كەلار دامەزراوە، دوایی كراوەتە بەڕێوەبەری (قوتابخانەی ئەمیرییەی سەرەتایی) لە قەرەتەپە، پاشان گواستراوەتەوە خورماتوو تا (١٩٥٤)، دواتر گەڕاوتەوە قەرەتەپە تا (١٩٥٦)، ئینجا بووەتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی (الاتحاد) لە كفری ولە (١٩٦٩)دا خانەنشین كراوە، لە (١٩٩٧/٩/٢٦)دا لە بەغدا كۆچی دوایی كردووە و لە سەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی (باوەشاسوار)ی شاری كفری نێژراوە. دیدەنی لەگەڵ مامۆستا گویلەر حەسەن عەباس ڕەزا (١٩٤١)، قەرەتەپە، ٢٠١٥/٤/٢٤.

٦١- خورشید عەزیز عەبدولڕەحمان، ساڵی (١٩٢٨) لە كفری لەدایكبووە، خوێندنی سەرەتایی هەر لەم شارە تەواو كردووە و پاشان خانەی مامۆستایانی ڕیفی لە (بەعقوبە) خوێندووە، لە (١٩٥١)دا لە كەلار دامەزراوە، لە (١٩٥٤)داو دوای گواستنەوەی دووبارە دێتەوە كەلارو تا ساڵی (١٩٦٠) تیایدا دەمێنێتەوە، لە (٢٠١٢)دا كۆچی دوایی كردووە. بروانە: حسین كلاری، صفحات مطویة من تاریخ مدرسة كلار الابتدائیة، ص٢٢.

٦٢- حسین كلاری، المصدر السابق، ص٢٢.

٦٣- دیدەنی لەگەڵ نووسەر خەسرەو جاف، هەولێر، (٢٠١٥/٥/١).

٦٤- انظر: محمد شاكلی، صورة المجتمع والمدرسة في الخمسینیات من القرن الماضي، ص ٢٢- ٤٧.

٦٥- حسین كلاري، المصدر السابق، ص٢٢.

٦٦- رشا هشام جمیل العاني، الاثار الاجتماعیة للحرب العالمیة الثانیة علي العراق ١٩٣٩- ١٩٤٥، وهي جزء من متطلبات درجة ماجستیر، في التاریخ الحدیث، الي مجلس كلیة التربیة (ابن رشد) جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٩٩)، ص ١٤٢.

٦٧- نبیل عكید محمود المظفري، دور نواب كركوك في مجلس النواي العراقي خلال العهد الملكي ١٩٢٥- ١٩٥٨، (كركوك: ٢٠٠٩)، ص ١٤٦، ١٦١، ١٧٢، ١٧٥، ١٨٤.

٦٨- نبیل عكید محمود المظفري، المصدر السابق، ص ١٦٧.

٦٩- دیدەنی لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیەی سەرقەڵا، دكتۆر ئیسماعیل نەجمەدین نامیق زەنگەنە، كەلار (٢٠١٥/٤/٢٧).

٧٠- دیدەنی لەگەڵ مامۆستا بەهجەت بەدری بەیاتی بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی كەلار لەنێوان ساڵانی (١٩٥١- ١٩٥٥)، كفری، (كۆتایی ٢٠١٠).

٧١- دیدەنی لەگەڵ شێخ محەمەدی شاكەلی قوتابی كۆتایی چلەكانی قوتابخانەی كەلار، كەلار (٢٠١٥/٤/٢٦).

٧٢- ساڵح هاروونی، هاروونی لە مێژوودا، چ١، (سلێمانی: ٢٠١١)، ل٧٧، حوسێن كلاری، صفحات مگویە، ص ٢٣.

٧٣- دیدەنی لەگەڵ دكتۆر حەسەن كەریم جاف، كەلار، (٢٠١٥/٥/٢).

٧٤- عبدالله غفور، التشكیلات الاداریه، ص١٦.

٧٥- دیدەنی لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد شاكەلی (١٩٤٨)، كەلار، (٢٠١٥/٥/٩).

٧٦- یەكەمین تۆماری گشتی (قید عام) ژمارە (٣)، قوتابخانەی كەلاری سەرەتایی.

٧٧- یاداشتەكانی مەلا عارف خانەقین ١٩١٢- ١٩٩٨، دەستنووس، لای نووسەری ئەم لێكۆڵینەوەیە پارێزراوە.

*** خوێندن و خوێندەواری لە ناوچەی چەمچەماڵ:**

**فەرهاد عەبدولعەزیز**

*** خوێندنی فەرمی لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵ:**

ئەوانەی کە سەبارەت بە خوێندنی فەرمی لە ناوچەی چەمچەماڵ نووسیویانە، لەنێوان خۆیاندا هاورا نین لەسەر دەستنیشانکردنی ئەو مێژووەی تیایدا خوێندنی فەرمی لە ناوچەکە دەستی پێکردووە. هەندێك لەوان ئەو مێژووەیان بە ساڵی (١٩٢٥) دەستنیشانکردووە، لەمەشدا پشتیان بە تۆمارێکی قوتابخانەکە بەستووە کە تیایدا لە (١٩٢٥)ەوە دەستکراوە بە تۆمارکردنی ناوی قوتابی[1]. بەڵام هەندێکی تریان ئەو رێکەوتەیان بە ساڵی (١٩٢٠) دیاریکردووە[2]. ئەمانیش نامەیەکی (شێخ مەحمود)یان کردووە بە پاڵپشتی بۆچوونەکەیان کە لە ساڵی (١٩٢٢) بۆ قائیمقامی ئەوسای چەمچەماڵی ناردووە، ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە پێش ئەو مێژووە لە چەمچەماڵ قوتابخانە هەبووە.

(بۆ جەناب قائیمقام چەمچەماڵ محەمەد ئەمین ئاغا
مەلا محەمەد[3] سابیقەن موعەللیم بووە لەمەودووا ئەیزەن موعەللیم قەیدی‌وە ئیشتغال بکا بە تەدریس وەکو ئەوەل.
(٢٥) تشرین ئەوەل ٩٢٢ – (٤) ربیع الاول ١٣٤١، حکمداری کردستان محمود)[4].

بەڵام لە راستیدا سەرەتای دەستپێکردنی خوێندنی فەرمی لە ناوچەی چەمچەماڵدا زۆر پێش هەر یەك لەو رێکەوتانە کەوتووەو بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. (محەمەد ئەمین زەکی بەگ) لە ساڵنامەی (نظارت معاریفی عمومی ساڵی (١٣٢١)ی رۆمی – (١٩٠٥ – ١٩٠٦)ی زاینیی) یەوە چەند زانیارییەکی لەسەر قوتابخانە فەرمییەکانی ناوچەی سلێمانی گواستووەتەوە، سەبارەت بە ناوچەی چەمچەماڵ تیایدا هاتووە کە لەو ساڵەدا لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵ و ناحیەی (ئاغجەلەر)یشدا سەرو یەك قوتابخانەی ئەوەلی بوونییان هەبووە، کە (ئەوەلی چەمچەماڵ) (٣٠) قوتابی و (١) مامۆستا، (ئەوەلی ئاغجەلریش) (١٧) قوتابی و (١) مامۆستا، دەوامیان تێدا کردووە[5].

ئەم قوتابخانانە وەنەبێت تەنها هەر لەو ساڵەدا دەوامیان تێدا کرابێت، بەڵکو لەو ساڵە بەدواوە بەردەوام دەوامیان تێدا کراوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵێك بەسەر ئەو مێژووەدا لە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی ساڵی (١٣٣٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٩١٢)ی زاینیی جارێکی تر ئاماژە بۆ بوونی ئەو قوتابخانانە کراوەتەوە، سەبارەت بە ئەوەلی چەمچەماڵ باس لەوە کراوە کە وانەبێژێك بە ناوی (عەبدول حەمید ئەفەندی) لەگەڵ مامۆستایەکی سەرەتایی وانەیان تێدا گووتووەتەوە[6]. رەنگە کردنەوەی قوتابخانە لەو ساڵانەدا لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵ و ناحیەی ئاغجەلەردا لە چوارچێوەی قوتابخانەکانی (عشائر مکتبلری)و ئەو هەوڵانەدا بوو بێت کە (سوڵتان عەبدولحەمید) داویەتی بۆ رازیکردنی هۆزەکان و راکێشانیان بە لای دەوڵەتی عوسمانیدا، تا ولیان لێبکات خۆیان لە ریزەکانی (سوارەی حەمیدی)دا ناونووس بکەن.

بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی زۆر ئاماژەیان تێدایە کە تیایاندا حکومەت بیری لە دامەزراندنی قوتابخانە کردووەتەوە لە ناوچەکەدا. وەك ئەوەی کە حکومەتی عوسمانی لەپێناو ئیسلاحکردنی هەمەوەندەکاندا لە ساڵی (١٣٠٣)ی رۆمی بەرامبەر بە (١٨٨٧)ی زاینیی پێشنیاری کردنەوەی قوتابخانەی کردووە لە ناوچەکانیاندا[7]. یا وەك ئەو داوایەی والی موسڵ کە لە ژێر ناونیشانی (رێوشوێنی پێویست بۆ پێشخستنی خوێندن لە موسڵ و شارەزوور (کەرکوك و سلێمانی)دا بۆ دەرباری سوڵتانی عوسمانی بەرزکردووەتەوەو تیادا داوای کردووە کە قوتابخانەی رۆشدییە (ناوەندی)و قوتابخانەی سەرەتایی لە شارەکانی موسڵ و شارەزوورو سلێمانی بکرێتەوە، لەگەڵ داوای کردنەوەی قوتابخانەی ئەوەلی بۆ قەزاو ناحیەو گوندەکان[8].

**١. خوێندنی فەرمی لە چەمچەماڵ لە سەردەمی داگیرکاری بەریتانیادا (١٩١٨ – ١٩٢١):**

لە سەردەمی حوکمی داگیرکاری بەریتانیدا (١٩١٨ – ١٩٢١)ی زاینیی بەسەر ناوچەکەدا، خوێندن تا رادەیەکی باش گەشەی بە خۆوە بینیوە. قوتابخانەی چەمچەماڵ کە بە (مکتب ئیبتیدائی چەمچەماڵ) ناوی هاتووە لەو سەردەمە گەشەی زۆری کردووەو ژمارەی قوتابییەکانی لە سەرووی (٤٩) قوتابییەوە بووە. هەروەها لە تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵی خوێندنی (١٩٢٠ – ١٩٢١)ی زاینییدا قوتابیانی ئەو قوتابخانەیە ئاستێکی بەرزیان نیشانداوە، بە جۆرێك سەرنجی کاربەدەستانی شارەکەیان بۆ خۆیان راکێشاوەو بەو بۆنەیەوە ئاهەنگێکی تایبەتیان بۆ قوتابییە سەرکەوتووەکان سازکردووە.

(عیزەت ئەفەندی) مودیری تەلەگرافی ئەو کاتەی چەمچەماڵ هەواڵی ئەو ئاهەنگەی لە ژێر ناونیشانی (بۆ دائیرەی پێشکەوتن) لە رۆژنامەی (پێشکەوتن)دا بڵاوکردووەتەوەو لە سەرەتای نووسینەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە (لە ئیمتحانی عمومی مەکتەب ئیبتیدائی چەمچەماڵدا لە هەموو دەرسەکاندا مومەیەز بوون قوتابی ئەم مەکتەبە بچووکە بە راستی پێم زۆر باش بوو لەبەر ئەوە کە لە زەرف شەش حەوت مانگدا تەحسیلێك ئیبتدائی مناسب دەیبوو بەعزێکیان یەجگار باش و زیرەك بوون لە پاش ئیمتیحان تەواو بوون بۆ ئەوەی شەوق و رەغبەت و خوێندن لە وڵاتەکەمان زۆر ببێت جەناب حاکم کەپیتان بۆند ساحیب دوو سەعات و بەعزێك دەفتەری خەڵات قوتابییە زیرەکەکان کرد ئەمالیش ئەو رۆژە هەموویان لە مەکتەب بانگ کرابوون چای و قەهوەو جگەرەیەکی زۆر بەم خەڵکە دراوە ئەو کەسانە ئەغلەبیان باوك و خزم قوتابییەکان بوون).

هەروەها باسی لەوە کردووە کە هەر لەو ئاهەنگەدا یەك لە قوتابییەکانی قوتابخانەکە بە ناوی (کەماڵ) نوتقێکی پێشکەش کردووەو بە ووتەکانی توانیویەتی کار لەو دایك و باوکانەو وابکات ئەوانەشیان کە تا ئەو کاتە منداڵەکانیان

نەناردبووە مەكتەب بەڵێنی ئەوە بدەن كە بیان نێرن. لە كۆتایی ووتارەكەشیدا (عیزەت ئەفەندی) ئاماژەی بۆ هەوڵی مامۆستاكانی قوتابخانەكە كردووەو نووسیویەتی: (زیرەكی ئەم قوتابیانە هەموو بە سەعیو موعەللیم مەلا محەمەد ئەفەندیو سەید حەسەن ئەفەندی و غیرەت مودیر مەكتەب پێكهاتووە ئەم دوو زاتە هەموو وەختێك خەریك تەشویقو تەرغیب خەڵكن كە تالب بە مەكتەبو عیلم بین، ئومێد ئەكەم كە لە مەولاش هەروا خەریك ئەم خزمەتە بین بەڵكو پێش بكەوین)[٩].

**٢. رەوشی خوێندنی فەرمی لە سەردەمی ئینتیداب (١٩٢١ - ١٩٣٢):**

لە سەردەمی ئینتیدابدا كە دەسەڵات كەوتووەتە دەس حكومەتی عێراقەوە، قوتابخانەكانی كوردستانو عێراق بە گشتیو قوتابخانەكانی ناوچەی چەمچەماڵ بە تایبەتی هیچ پێشكەوتنێكی ئەوتۆیان بە خۆیانەوە نەبینیوە، بەڵكو قوتابخانەكانی چەمچەماڵو ئاغجەلەر كە لە ریزی قوتابخانەكانی سەر بە وەزارەتی مەعاریفی عێراقیدا ناویان هاتووە، كە لەو ساڵەدا مامۆستا (سەید حەسەن) ناوێك بەڕێوەبەرو مامۆستا (مەلا محەمەد ئەفەندی) مەبەست (مەلا محەمەد مەلا سەعید - فەرهاد)ە مامۆستای قوتابخانەكەی چەمچەماڵ بووە[١٠]، تا ماوەیەكی زۆر پاش دروستبوونی حكومەتی عێراقیش هەردوو قوتابخانەكە هەر بە چوار پۆلی ماونەتەوە، هیچ پۆلێكی تریان بۆ زیاد نەكراوە، بەڵكو بە جۆرێك پشتگوێ خراون كە بە تەواوی كەوتوونەتە خانەی نەبوونەوە[١١].

(مستەفا سائیب) لە ووتارێكدا كە سەبارەت بە دواكەوتوویی خوێندن لە كوردستاندا لە ساڵی (١٩٢٦)دا نووسیویەتی سەبارەت بە قوتابخانەكانی چەمچەماڵو هەڵەبجەو قەرەحەسەن ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە كە هەموویان (موحتاجو وێرانە، بێ موعەللیمو بێ جێگاو بێ ئەساس)ن[١٢]. ئەم بارودۆخە تاكو ساڵی (١٩٢٨)ی زاینیی، واتا تا ئەو ساڵەی كە (ساڵح زەكی بەگی ساحیبقران)[١٣] تیایدا بە قائیمقامی قەزای چەمچەماڵ دەستنیشانكراوەو درێژەی كێشاوە. بەڵام لێرە بە دواوە بواری خوێندن لە ناوچەی چەمچەماڵدا وەك زۆربەی بوارەكانی تر گەشەی زۆری بە خۆوە بینیوە. قوتابخانەی چەمچەماڵ كە هەر لە یەكەم رۆژی دامەزراندنییەوە لە خانوویەكی كۆنی سێ ژووریدا بوو[١٤]، لەم سەردەمەدا خانوویەكی نوێی بۆ دروستكراوەو قوتابییەكانی لە ساڵی خوێندنی (١٩٢٨ - ١٩٢٩)ی زاینییدا لە خانووی نوێی قوتابخانەكەیاندا دەستیان بە خوێندن كردووە، هەر لە هەمان ساڵی خوێندندا بۆ یەكەمجار ژمارەی پۆلەكانی قوتابخانەكە لە (چوار) پۆلییەوە كراوە بە (پێنج)و ژمارەی مامۆستاكانیش لە (٢)ەوە بۆ (٣) مامۆستا زیادیان كردووە كە ئەوانیش ئەم بەڕێزانە بوون:

١. مامۆستا (قادر ئەفەندی)، بەڕێوەبەر، كوردەو خەڵكی شاری كەركوكە.

٢. مامۆستا (رەشید كەریم) مامۆستا، كوردەو خەڵكی شاری سلێمانی.

٣. مامۆستا (عەونی سەید كاكە)، مامۆستا، كوردەو خەڵكی شاری چەمچەماڵ[١٥].

هەر لەو ساڵانەدا بە تایبەت پاش گۆڕینی بەڕێوەبەر (قادر ئەفەندی)و هاتنی مامۆستا (رەفعەت بەكر) وەك بەڕێوەبەری نوێ، قوتابخانەكە زیاتر گەشەی كردووەو بەرەو پێشەوە چووە. مامۆستا (رەشید كەریم) كە ئەو سەردەمە مامۆستای قوتابخانەكە بووە، باسی گۆرانكارییەكانی قوتابخانەی چەمچەماڵمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە:

(كە ئەو هات (مەبەست هاتنی مامۆستا رەفعەت بەكرە) ئیشو كاری قوتابخانەكە رێكوپێك بوو بە خۆشی رامان بواردو كە شافەمان دامەزراند وەچەند كچێك جلی كەشافەیان لەبەر كرد. بە رێكەوت نزیكی تەعتیلی نیوەی ساڵ كۆمەڵێ كەشافەی قوتابانەی مامۆستایان لەگەڵ دكتۆر مەتی عەقراوی وە كەریم عیبران هاتنە مەكتەبەكەمان ئێمەش پێمان ووتن ئەم كەشافانە هی ئێمەیە پێنج شەش كچی تێدایە زۆریان لا خۆش بوو وەسەریان سورما دەستیان كرد بە نیگار گرتنی كچەكان بە جلی كەشافەوە بە جیا وە بە جلی كچانەوە. كە چوونەوە بۆ بەغدا لە رۆژنامەكان نووسیان (بەغداد پێشت كەوتوون))[١٦].

لە ساڵی (١٩٣٧)ی زاینییدا قوتابخانەی چەمچەماڵ هەنگاوێكی تری بەرەو پێشكەوتن هەڵهێناوەو پۆلی (شەش)ی تیادا كراوەتەوە، ئەویش كاتێك كە (ئیبراهیم ئەدهەم)ی قائیمقامی ئەو كاتەی چەمچەماڵ توانیویەتی رەزامەندی وەزارەتی مەعاریفی عێراقی بۆ وەربگرێت[١٧]. بەم شێوەیە قوتابخانەكە لە قوتابخانەی (ئەوەلی)یەوە گۆڕاوە بە قوتابخانەی سەرەتاییو بواریش لە بەردەم قوتابییەكاندا كراوەتەوە كە خوێندن تەواو بكەن. بەرهەمی ئەو قوتابخانەش دەرچوونی یەكەم دەستەی قوتابییانی قوتابخانەكە بووە لە ساڵی (١٩٣٩)ی زاینییدا، كە ژمارەیەكیان لە (دار المعلمین الریفیة) لە بەغدا وەرگیراون. یەك لە تۆمارەكانی دادنووس (كاتب عدل)ی چەمچەماڵ، ناوی هەندێك لەو قوتابییانەی تێدا تۆماركراوە كە بەهۆی وەرگیرانیان لە (دار المعلمین الریفیة)، لە بەردەم دادنووس ئامادەبوونو كەفالەتیان لێوەرگیراوە. (حەمید ئەحمەد یونس خەبات، فایق سەید محەمەد كاكە، عەبدولقادر ئەحمەد بابان) دیارترینی ئەو ناوانەن كە لە تۆمارەكەدا ناویان هاتووە[١٨].

**٣. قوتابخانەی كچانی سەرەتایی لە چەمچەماڵ:**

تا ناوەراستی سییەكانیش لە سەرانسەری ناوچەی چەمچەماڵدا (مەكتەبی كچان) بوونی نەبووە. ئەمەش یەك لە هۆكارەكانی بۆ كەمتەرخەمی حكومەتی ئەوسای عێراق گەراوەتەوە كە بە شێوەیەكی گشتی نەك لە كردنەوەی مەكتەبی كچاندا، بەڵكو بۆ كردنەوەی مەكتەبی كورانیش بە گوێرەی پێویست هەنگاوی نەناوە، بەڵام بە پیرەوە نەچوونی خەڵكی ناوچەكەش بۆ پرۆسەی خوێندن بە كچەكانیان هۆكارێك بووە كە زۆر لە هۆكاری پێشوو كاریگەرتر بووە لە رێگری كردن لە بەردەم سەرهەڵدانی خوێندنی كچان لە ناوچەكەدا.

ئەوەتا وەك لە باسەکانی پێشووماندا ئاماژەمان بۆ کردووە، هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵ و ناحیەی ئاغجەلەریشدا قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان کراونەتەوە. کە چی بە درێژایی ئەو ماوەیە تاکو کردنەوەی قوتابخانەی تایبەت بە کچان لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵدا، تەواوی خێزانەکانی ناوچەکە ئامادەیی ئەوەیان تێدا نەبووە کە کچەکانیان بنێرنە بەر خوێندن و لەو قوتابخانانەدا ناویان تۆمار بکەن. لە کاتێکدا لە ناو ئەو قوتابخانانەدا بوار بە کچانیش دراوە کە ناوی خۆیان تۆمار بکەن و بخوێنن، تەنانەت کچان بەشداری دەستەی کەشافەی قوتابخانەکەشیان کردووە(١٩).

گەر سەرنج لە خشتەی ژمارە (١) بدەین کە لە تۆماری ژمارە (یەك)ی هەمان قوتابخانەوە وەرمانگردووە، ناوی چەندین کچمان بەرچاو دەکەوێت کە لە قوتابخانەکەدا دەوامیان کردووە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە سەرجەم ئەو ناوانەی تۆمارکراون کچی ئەو فەرمانبەرانەی حکومەت بوون کە خەڵکی شارەکە نەبوون و تەنها یەك کچی خەڵکی شارەکە لە ناو ئەم ناوانەدا بە دی ناکرێت(٢٠).

بێگومان هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە کە لەو سەردەمەدا بەلای خەڵکی شارەکەوە ئەوە بەشوورەییەکی گەورە زانراوە کە کچان لە مەکتەبدا بخوێنن، چ جای ئەوەی لە ژوورێکدا لەگەڵ کوڕاندا دابنیشن. تەنانەت لە سەرەتای کردنەوەی (مەکتەبی کچان)دا لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵ خەڵکی شارەکە هێندە بە ساردی پێشوازییان لێکردووە بە جۆرێك کە ئیدارەی ئەوسای شار ناچار بوون کە شێوازی زۆرەملێ (الزامی) لەگەڵ خاوەنی کچەکاندا پەیڕەو بکەن، تا ناچاریان بکەن کە کچەکانیان بنێرنە مەکتەب(٢١).

بە درێژایی مێژووی بوونی قوتابخانەی فەرمی لە چەمچەماڵ تا ئەو کاتەی کە قوتابخانەی فەرمی تایبەت بە کچان کراوەتەوە، بە گوێرەی ئەوەی کە لە سەرچاوەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە، تەنها یەك کچی دانیشتووی شاری چەمچەماڵ چووەتە بەر خوێندن و لە قوتابخانەی چەمچەماڵی کوڕان خوێندوویەتی، ئەو کچەش (نەعیمە) ناوێك بووە، کە یەکێك بووە لە کچە هەمەوەندەکان. کە لە ساڵی (١٩٢٨)ی زایینیدا لە پاڵ (عالیە سالح زەکی بەگی ساحیبقڕان) و (ناهیدەی کچی شێخ سەلام)دا لەو قوتابخانەیە دەوامیان کردووە، کە ئەم دووانەی تریان خەڵکی سلێمانی بوون و باوکی یەکەمیان قائیمقامی چەمچەماڵ و باوکی دووەمیشیان لە کۆمپانیایەکی نەوت لە دۆڵەسووری ناوچەی چەمچەماڵ کاری کردووە(٢٢).

هەر کەسێك یاداشتەکانی (ناهیدە خانی کچی شێخ سەلام) بخوێنێتەوە، بە ئاشکرا هەست بەوە دەکات کە ئەو تەنها کچەی چەمچەماڵ چەند بە ترس و خۆپارێزییەوە دەوامی کردووە، بۆ نموونە وەك (ناهیدە خان) دەیگێڕێتەوە لە سییەکان، کاتێك کە قوتابیانی (حەربیە)ی بەغدا بە سەردان هاتوون بۆ سلێمانی (ئێمەش سێ دەستە جلی کەشافەیان لەبەر کردین بۆ ئەوەی پێشوازی لە قوتابیانی حەربیە بکەین، کە ژمارەیەك لە وێنەگر و ڕۆژنامەنووسیان لەگەڵ بوو. لە ڕێگە نەعیمە خۆی دزییەوە هەر من و عالیە ماینەوە)(٢٣). کەواتە ئەو کچە هەر چەندە لە تەمەن منداڵیدا بووە. بەڵام باری کۆمەڵایەتی شارەکەی ڕێگەی ئەوەیان پێ نەداوە کە لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەشداری بۆنەیەکی لەو جۆرە بکات و خۆی نیشانی چاوی کامیرای وێنەگران و ڕۆنامەنووسان بدات. لە کاتێکدا کە لەو ڕووداوە بۆنەیەکی پەروەردەیی بووە و جێگای سەرسوڕمانی میوانەکان بووە و ڕووی جوانی شارەکەی (نەعیمە)یان نیشانی ئەو میوانانە داوە، بە جۆرێك کە چوونەتەوە بەغدا وێنەی کەشافەکانی قوتابخانەی ئەوەڵی چەمچەماڵیان لە ڕۆژنامەکانی بەغدادا بڵاوکردووەتەوە و بە مانشێتی گەورە نووسیویانە (بەغدا پێشت کەوتوون – سبقوك یا بغداد)، هەروەها وێنەی ئەو کچانە بە بەرگی کەشافەوە لە گۆڤاری کەشافەی ئەو ساڵەدا بڵاوکردووەتەوە(٢٤).

هەر چەندە تاکو ئێستا هیچ بەڵگەیەکی ڕەسمی لەبەردەستدا نییە ئەوەمان بۆ بەیان بکات کە سەرەتای کردنەوەی قوتاخانەی کچان لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵدا لە کام ڕێکەوتدا بووە، بەڵام زۆربەی بۆچوونەکان ساڵی (١٩٣٥)یان بۆ ئەو مێژووە دەستنیشان کردووە(٢٥). بەڵام لە ڕاستیدا قوتابخانەی کچانی سەرەتایی لە چەمچەماڵ کە سەرەتای ناوی (مدرسة البنات الاولیة) بووە، لە ساڵی (١٩٣٧)ی زایینیدا دامەزراوە و نەك لە ساڵی (١٩٣٥)ی زایینی، بە بەڵگەی ئەوەی لە کتێبی (دلیل العراق)دا کە لە ساڵی (١٩٣٦)ی زایینیدا بڵاوکراوەتەوە ناوی ئەم قوتابخانانە تۆمارکراوە کە بۆ ساڵی خوێندنی (١٩٣٥ – ١٩٣٦)ی زایینی دامەزراون و دەوام تێیاندا دەستی پێکردووە، بەڵام ناوی قوتابخانەی چەمچەماڵی کچان لە ڕیزی ئەو قوتابخانانەدا نییە کە ناویان هاتووە(٢٦).

لەوەش زیاتر لە مانگی (کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٣٨)ی زایینیدا لیژنەیەك لە بەغداوەوە هاتوون بۆ پشکنینی قەزای چەمچەماڵ، ئەو لیژنەیە سەبارەت بە قوتابخانەی چەمچەماڵی کچان نووسیویانە: (قوتابخانەی ئەوەڵی کچانی چەمچەماڵ یەك پۆل لە خۆ دەگرێت و ژمارەی قوتابییەکانی (٢٠) قوتابییە، مامۆستاکەی (شەریفە ئەلقادری)یە، کە مووچەکەی (٥) دینارە و لەدایکبووی بەغدایە و خاوەنی بڕوانامەی سەرەتاییە)(٢٧). ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قوتابخانەکە لە ساڵی خوێندنی (١٩٣٧ – ١٩٣٨) یەکەم ساڵی خوێندن بووە تیایدا، تەنها پۆلی یەکەمی سەرەتایی دەوامیان تێدا کردووە، بەڵام لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٣٩)ی زایینیدا کە لیژنەیەکی تری پشکنین هاتوونەتە چەمچەماڵ، ئەوکاتە قوتابخانەی ئەوەڵی کچانی چەمچەماڵ سێ پۆلی لە خۆگرتووە و سێ قۆناغی دەوامیان تێدا کردووە بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

| پۆل | ژمارەی قوتابی |
|---|---|
| ١ | ١٢ |
| ٢ | ٧ |
| ٣ | ٥ |
| کۆی گشتی | ٢٤ |

لەمەوە تێدەگەین کە قوتابخانەکە لە ساڵی (١٩٣٧)ی زایینیی دامەزراوەو بۆ ساڵی خوێندنی (١٩٣٧ - ١٩٣٨)ی زایینیی تەنها پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە خۆگرتووەو لە ساڵی خوێندنی (١٩٣٨ - ١٩٣٩)ی زایینیی پۆلی دووەمیان بۆ زیاد بووەو لە ساڵی خوێندین (١٩٣٩ - ١٩٤٠)ی زایینیی پۆلی سێیەمیشی هاتووەتە سەرو ئەو کاتەی کە لیژنەی دووەم لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٣٩)ی زایینیی هاتوونەتە چەمچەماڵ تا پۆلی سێیەم لە قوتابخانەکەدا هەبووە. هەمان ئەو لیژنەیە سەبارەت بە قوتابخانەی ئەوەلی کچانی چەمچەماڵ (مدرسة البنات الاولية في چم چمال) نووسیویانە: (بینای قوتابخانەکە هی خەڵکەو کرێی ساڵانەکەی (١٣) دینارە، بەڵام لە هەموو روویەکەوە ناگونجێت بۆ ئەوەی کە قوتابخانە بێت، چونکە خانووەکە تەسکەو ژوورەکانی تاریكو لە شێوەی کوخ دان بە جۆرێك کە هەر سێ پۆلەکە لە یەك ژووردا پێیان دەخوێنرێت، بۆیە پێشنیار دەکەین یا بینایەکی هاوچەرخ بۆ قوتابخانەی ناوبراو دروست بکرێت یاخود بگوازرێتەوە بۆ خانوویەکی گەورتر لەم خانووەی ئێستایان هەروەها ئێمە بە پێویستی دەزانین کە قوتابخانەکە پر بکرێت لە تەختەو کورسیو پێداویستییەکانی تری خوێندن)، سەبارەت بە ستاق قوتابخانەکەش نووسیویانە: (ستافەکە پێکدێت لە مامۆستای خاتوو (ماریا دانیل) کە خەڵکی بەغدایەو دەرچووی هونەرە جوانەکانەو مووچەکەی (٨)ی دینارە، بەڵام کوردییەکی باش نییە، هەر چی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەشە خاتوو (حەمدییە مستەفا)یە کە خەڵکی کەرکوکەو دەرچووی قوتابخانەی سەرەتاییە لە موسڵو مووچەکەی (٦) دینارە)[٢٨].

ئەم قوتابخانەیە لە سەرەتادا لە خانووی یەکێك لەماڵەکانی گەرەکی (خان)ی چەمچەماڵدا دەست بە خوێندن کراوە تیایدا، تا ماوەیەکی زۆر دوای کردنەوەیشی (ئەوەلی) بووە واتا تاکو پۆلی چوارەمی تێدا بووەو ژمارەی قوتابییەکانیشی لە (٢٠ تا ٣٠) قوتابی تێپەریان نەکردووە، زۆربەشیان کە گەیشتوونەتە پۆلی پێنجەم خێزانەکانیان رێیان پێ نەداون بچنە مەکتەبی کوران بۆیە وازیان لە خوێندن هێناوە[٢٩].

### ٤. مەکتەبی ئوممی شەوان لە چەمچەماڵ:

تا ئێستا ئەوانەی کەوا سەبارەت بە سەرەتای کردنەوەی قوتابخانەی شەوان لە چەمچەاڵ نووسیویانە ئەو مەکتەبی شەوانەی کەوا خوالێخۆشبوو (شاکر فەتاح)ی نووسەرو رووناکبیرو قائیمقامی ئەو سەردەمی چەمچەماڵ لە ساڵی (١٩٤٦)ی زایینییدا کردوویەتییەوە، بە یەکەم مەکتەبی شەوانیان لە قەڵەم داوە کە لە ناوچەی چەمچەماڵدا کرابێتەوە[٣٠]. بەڵام لە راستیدا سەرەتای کردنەوەی مەکتەبی شەوان لە چەمچەماڵ، مێژوویەکی لەوە کۆنتری هەیەو بۆ ساڵی (١٩٣٠)ی زایینیی دەگەرێتەوە، ئەو دەمەی کە (سالح زەکی بەگی ساحیبقران) قائیمقامی چەمچەماڵو کەسانی منەوەرو زانست پەروەری وەکو (شێخ سەلامی شاعیرو قالەی ئایشەخان)، بە ئیشو کاری حکومی لەو شارەدا دەوامیان کردووە، رۆژنامەی (ژیان) هەواڵی کردنەوەی قوتابخانەکەی بڵاوکردووەتەوە لە بابەتێکدا لە ژێر ناونیشانی (مەکتەبی ئوممی لە چەمچەماڵ) نووسیویەتی: (بە سەبەب هەوڵو تەقەلای ئەولیای ئوموروو ئەشرافەکانی چەمچەماڵەوەو بە مەعاریف پەروەری موعەللیمەکانی ئەوێوە لە چەمچەماڵدا بۆ نەخوێندەوارەکان مەکتەبێ کراوەتەوەو هەموو شەوێك دوو سەعات موعەللیمەکان دەرس ئەڵێنەوە. ئەم مەکتەبە لە ئێستاوە دوو سینفییەو نزیکی شەست قوتابی هەیە، وەکو بیستومانە ئەهالی چەمچەماڵ، هەمەوەندەکان گەورەو بچووکیان بە گەرمییەوە دەوامی ئەو مەکتەبە ئەکەن)[٣١].

(شێخ سەلامی شاعیر)یش، هەوڵی کردنەوەی قوتابخانەکەی وەکو مژدەیەکی خۆشو گەش گەیاندووە بە دەستەی بەڕێوەبەری یانەی سەرکەوتنی کوردانو داوای لێکردوون دەستی یارمەتی بۆ ئەو مەکتەبە درێژ بکەنو بیخەنە ژێر باڵی خۆیانەوە، ئەو نووسینەی لە (رۆژنامەی کەرکوك)دا لە ژێر ناونیشانی (بۆ بەرچاوی هەیئەتی ئیدارەی یانەی سەرکەوتن کوردان لە بەغدا) بڵاوکراوەتەوەو تیایدا هاتووە: (.. هەموو ایزانن کە قضای چەمچەماڵ هر وەك قضایکی گەورەو بە قیمەتو خۆشەویستە دیسان دانیشتوانی قضاکە بە بێ تێ کەڵو پێکەڵ کوردو کورد نەژادنو بالخاصە جیگەی دانیشتی عشیرەتی ناوداری مشهور (هەمەوندی) غەیورە کە بە کافە جەوهەریکی روتی بێ غش کوردن بەڵام داخی بە جەرگم هتا ایستە ام جیگە نازارە بە اهمیتەمان لە نوری معارف بێ بەشو بلکە لە تاریکستانی جهلا خنکابون زۆر زۆر دواکەوتو تری برا کوردەکانی تریان).

پاشان رووی دەمی کردووەتە دەستەی کارگێری (یانەی سەرکەوتنی کوردان)و نووسیویەتی: (ایستە ای هیئەتی (گەورەو محترم) مژدەبێ کە قضای چەمچەماڵ لە نەتیجەی کۆششو سعی قائیمقام معارف پرورو مساعدەی بلدییەی لوا امری وزارتی معارف استحصال کرا کە لە قضای مژکورەدا بناوی (مکتب امی وە) مکتەبیکی (شەوی) دو صنفی دامەزراوەو بە کمالی شەوق لە طرف معلمەکانی قەزاوە گەرمی دراوە بە درزگوتنەوە همو شاگردەکان جارێ (٥٠) کەس ابێ.. لە چەمچەماڵەوە، سەلام)[٣٢].

کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە هێندە رووداوێکی دڵخۆشکەر بووە بەلای کەسێکی وەك (شێخ سەلام)ەوە، وایکردووە کە ببێتە بابەتی شیعرێکی ئەو شاعیرە کە لە ژێر ناونیشانی (مژدە بۆ وەتەن)دا لە چەمچەماڵ نووسیویەتیو تیایدا هاتووە:

ئەی وەتەن موژدەم بەرێ مەشغولی عیلمە میللەتت
رۆژو شەو تەحسیل ئەکەن وردو درشتی ئوممەتت
سەعد شکور تەئریخ ئەخوێنن باسی (ژاپۆن)ی تێئەکەن
هەوڵ ئەدەن ئەڵبەت بە جارێ بۆ تەرەقیو شەوکەتت[٣٣].

### * قوتابخانەی گوندی عەسکەر:

بۆ یەکەمجار قوتابخانە لە گوندی (عەسکەر)ی سەر بە ناحیەی (ئاغجەلەر) لە کۆتایی ساڵی (١٩٣٠)ی زایینییدا کراوەتەوە، بە کردنەوەی ئەم قوتابخانەیەش گوندی (عەسکەر) بووەتە یەکەم گوندی ناوچەی چەمچەماڵ کە قوتابخانەی تێدا

کرابێتەوە، کردنەوەی قوتابخانە لە گوندی عەسکەر، لە کات و ساتێکدا بووە کە هەر لە ناوچەی چەمچەماڵدا، لە تەواوی ناوچەکانی سەر بە ناحیەی (سەنگاو)دا بە ناوەندی ناحیەکەشەوە هیچ قوتابخانەیەکی فەرمی بوونی نەبووە، بۆیە کردنەوەی قوتابخانە لە (گوند)ێکی سەر بە ناوچەکەدا جێگەی هەڵوێستەکردن و تێرامانە، گومانی تێدا نییە گوندی (عەسکەر) زێدی دوو سەرکردەی گەورەی ناو سوپای عێراق و دام و دەزگاکانی حکومەتی عێراقی بووە کە ئەوانیش (بەکر سدقی) و (جەعفەر عەسکەری)ی بوون، بە تایبەت دەگوترێت (جەعفەر پاشا) کە لەو سەردەمەدا جێگری سەرۆك وەزیرانی حکومەتی عێراقی بووە، ڕۆڵی ئێجگار کاریگەری هەبووە لە کردنەوەی قوتابخانەکەدا، ئەویش کاتێك کە لە سەرەتای مانگی سالی (١٩٣٠)ی زاینییدا بە هاوڕێیەتی شاندێك بۆ لێکۆڵینەوە لەو دەنگی نارەزاییانەی کە لە شارە کوردییەکاندا دژ بە بەستنی پەیمانی سالی (١٩٣٠) نێوان عێراق و بەریتانیا لە ئارادا بووە، سەردانی کوردستانی کردووە، لە گەڕانەوەیدا لایداوەتە ناوچەی (قەڵاسێوکە)ی زێدی خۆی (بۆ ئەوەی زیارەتی وەتەنەکەی خۆی بکا)[٣٤].

دەگوترێت لەو سەردانەیدا سەرەتا سەری لە ناحیەی (ئاغجەلەر)و پاشتر سەری لە گوندی عەسکەر داوە و لەلایەن خەڵکی ناوچەکەو بە تایبەت (شێخ عەبدوڵڵای عەسکەر)ی سەرداری ناوچەکەوە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکراوە، لەو سەردانەدا جەعفەر پاشا لە کەم و کورتییەکانی خەڵکی ناوچەکەی پرسیوەتەوە، لە سەرداوای خەڵکی ناوچەکە بە تایبەت (شێخ عەبدوڵڵای عەسکەر)و (کاکە ڕەزای کاکە عەلی عەسکەر)[٣٥]، کە سەرداری گوندی (عەسکەر) بووە[٣٦].

داواکراوە قوتابخانە لە گوندەکانی (ئاغجەلەر، عەسکەر، گۆپتەپە) بکرێتەوە، (جەعفەر پاشا)یش لە ماوەیەکی کورتدا فەرمانی کردنەوەی قوتابخانەکانی وەرگرتووە و کەلوپەلی قوتابخانەکان لە تەختە و دار و کورسی گەیەنراوەتە قوتابخانەکان[٣٧]. سالی خوێندنی (١٩٣٠ – ١٩٣١) بووەتە یەکەم سالی دەستپێکردنی خوێندن لە قوتابخانەکانی ئەو دوو گوندەدا[٣٨]، لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ خاڵێکی گرنگی تریش بکەین، ئەویش ئەوەیە کە سەردانی کردنی (جەعفەر پاشا) لەو کات و ساتەدا بۆ گوندی عەسکەر و وەرگرتنی بڕیار بە کردنەوەی قوتابخانەیەکی سەرەتایی لەو گوندەدا، دوور نییە لەپێناو ڕاکێشانی مەیلی خەڵکی ناوچەکەدا نەبوو بێت بەلای حکومەتدا، تاکو وایان لێبکات تێکەڵ بەو دەنگی نارەزاییانە نەبن کە لە ناوچەکانی تری کوردستانی عێراقدا سەریان هەڵدابوو.

سەبارەت بە (بەکر سدقی عەسکەر)ی و قوتابخانەی گوندی عەسکەریش، لێرەدا جێی خۆیەتی کە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە کاتێك (بەکر سدقی) بۆ ئەنجامدانی ڕاهێنانی سەربازی لەسەر شەڕکردن لە ناوچە شاخاوییەکاندا، سەربازەکانی بردۆتە ناوچەی (قەڵاسێوکە)و سەربازگەی (ئاغجەلەر)، لەناو هەموو چین و توێژەکانی خەڵکی ناوچەکەدا هەمیشە داوەتی قوتابییەکانی قوتابخانەی (عەسکەر و ئاغجەلەر)ی کردووە تاکو بێن و ڕاهێنانەکانی سەربازەکان ببینن، لەو بارەیەوە لە کۆبوونەوەیەکی فراوانیشدا کە لەگەڵ خەڵکی گوندەکە قوتابییەکانی گوندەکەیدا سازیکردووە، بەشێکی زۆری ئەو وتارەی کە لەو کۆبوونەوەیەدا پێشکەشی کردووە، تەرخانی کردووە بۆ باسکردنی گرنگی زانست و ڕۆڵی لە پێشخستنی گەلاندا. هەروەها ئەوەی وەبیر ئامادەبووان هێناوەتەوە کە چۆن هەم خۆی و هەم جەعفەر عەسکەری کە لەم گوندەوە دەستیان پێکردووە بەهۆی خوێندنەوە گەیشتوونەتە ئەم پلەو پایە بەرزە لە ناو سوپا و حکومەتدا، لە کۆتایی کۆبوونەوەکەشدا بڕیاری داوە بڕێك پارە وەکو بەخشش بەسەر قوتابییەکان و بە خێوەکەرەکانیشیاندا دابەش بکرێت، فەرماندەکانی فەوجەکەش وەك نیشاندانی وەفایەك بۆ ئەو گوندەی کە کەسانی وەك (جەعفەر عەسکەر)ی و (بەکر سدقی)یان پێگەیاندووە بڕیاریان داوە بۆ هەر قوتابییەك لە قوتابییەکانی قوتابخانەی عەسکەر سێتێك جلی کەشافە و جووتێك پێڵاو بکڕن و بە سەریاندا دابەشیان بکەن[٣٩].

ماوەتەوە بڵێن کە قوتابخانەی (عەسکەر) قوتابخانەیەکی ئەوەلی چوار پۆلی بووە و تا ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەو شێوازە ماوەتەوە و گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە[٤٠]، قوتابیانی قوتابخانەکەش بۆ تەواوکردنی خوێندن بە ناچاری ڕوویان لە چەمچەماڵ و ناوچەکانی تری کوردستان کردووە، کە ئەمە هەمیشە بە تایبەت بۆ خەڵکی هەژاری گوندەکە کارێکی ئەستەم و ئەرکێکی قورس بووە کە نەیانتوانیوە بە ئەنجامی بگەیەنن، بۆیە زۆربەی قوتابییەکان بە تایبەت هەژارەکان پاش تەواوکردنی پۆلی چوارەم وازیان لە خوێندن هێناوە[٤١]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قوتابخانەکە کەم تا زۆر ڕۆڵی هەبووە لە دروستبوونی توێژێکی باشی خوێندەوار لە گوندەکە و گوندەکانی دەوروبەریشدا.

*** ڕۆڵی (مەلا کاکە حەمە) لە برەودان بە خوێندن لە ناوچەی چەمچەماڵ:**

لە ناوچەی چەمچەماڵدا، بە تایبەتی لە گوندەکانی سنووری (ناحیەی سەنگاو)دا مەلایەکی شارەزا و زانستخواز دەرکەوتووە بە ناوی (مەلا کاکە حەمە)وە، ئەو پیاوە بە درێژایی سالەکانی (١٩١٩ – ١٩٣١) خزمەتێکی ئێجگار گەورەی لە بواری پەروەردە و فێرکردندا پێشکەش بەو ناوچەیە کردووە، لە کاتێکدا کە لەو ساڵانەدا هیچ خوێندنگەیەك حکومی لە ناوچەکانی سەر بە (ناحیەی سەنگاو)دا بوونی نەبووە، ئەو توانیویەتی بە خزمەتە بێ وێنەکانی تا ڕادەیەکی زۆرباش ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە، ئەویش لە ڕێگەی پەیرەوکردنی شێوازێکی نیمچە فەرمییەوە بۆ فێرکردنی قوتابییەکان، کە دەڵێن نیمچە فەرمی مەبەستمان ئەوەیە کە (مامۆستا مەلا کاکە حەمە) فەرمانبەری فەرمی حکومەت نەبووە و لە قوتابخانەی حکومەتیشدا وانەی نەگوتووەتەوە، بەڵام ئەوەی کە ئەو مامۆستایەی لە سەرجەم مامۆستا ئایینییەکانی تر جیاکردووەتەوە کە لە حوجرەکادا وانەی ئایینییان گوتووەتەوە ئەوە بووە کە ئەو وانانەی (مەلا کاکە حەمە) بە قوتابییەکانی گووتوە هەموویان هی خوێندنی ناو حوجرە

نەبوون، بەڵکو وانەی قوتابخانە حکومییەکانیشیان لە خۆ گرتووە، واتا (مەلا کاکە حەمە) هەر قورئان‌و زانستە شەرعییەکانی بە قوتابییەکانی نەگوتووەتەوە، بەڵکو لە پاڵ ئەوانەدا زانستەکانی مێژوو، جوگرافیا، بیریکاری، ئەندازە، فیزیا، کیمیا، تەندروستی، تەنانەت وەرزش‌و سروودیشی فێری قوتابییەکانی کردووە[٤٢].

(مەلا کاکە حەمە) لە فێرکردندا پەیرەوی بەرنامەیەکی کردووە کە بتوانێت لەماوەی پێنج ساڵدا قوتابییەکانی بگەیەنێتە ئاستی پێنجی ئامادەیی‌و بە زمانی کوردی زۆربەی وانەکانیان بۆ شیبکاتەوە، ئەو هەمیشە هەوڵیداوە ئەوە لە مێشکی قوتابییەکانیدا بچەسپێنێت کە ئامانجیان لە خوێندن بۆ ئەوە نەبێت کە ببنە فەرمانبەری حکومی یاخود مەلای مزگەوت، بەڵکو پێویستە بۆ ئەوە بخوێنن کە خۆیان ڕۆشنبیر بکەن‌و ببنە هاونیشتیمانییەکی بە سوود بۆ گەلۆ نیشتمانەکەیان[٤٣]. لەو پێناوەشدا وانەیەکی تایبەتی خستووەتە ناو خشتەی وانەکانییەوە بەناوی (وانەی

**خشتەی ژمارە (١)**

**لیستی ناوی ئەو کچانەی کە لە تۆماری ژمارە (١)ی قوتابخانەی چەمچەماڵی سەرەتایی کوڕاندا تۆمار کراون**

| ز | ناوی قوتابی | پیشەی باوك | دانیشتوو | هاتن | پۆل | ڕۆیشتن | هۆی وازهێنان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٧٩ | نەجیبە عەبدولقادر | بەڕێوەبەری دارایی | سلێمانی | ١٩٣٢ | ١ | ١٩٣٣ | گواستنەوەی باوکی |
| ٨٠ | فائیزە شوکری ئەلنائیب | نووسەری تەحریر | کەرکوك | ١٩٣٢ | ١ | ١٩٣٣ | تەمەنی |
| ٨٥ | فەوزییە یونس ئەفەندی | سەیدەلی | موسڵ | ١٩٣٢ | ١ | ١٩٣٣ | گواستنەوەی باوکی |
| ١٠٠ | حەسیبە فەتاح ئەفەندی | خانەنشین | سلێمانی | ١٩٣٣ | ١ | ١٩٣٤ | خواستی باوکی |
| ١٠٩ | نەجیبە عەبدولەکریم | قائیمەقام | رانییە | ١٩٣٣ | ١ | ١٩٣٤ | مردنی باوکی |
| ١٤٢ | شوکرییە محەمەد | کرێکار | کەرکوك | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٤ | خواستی باوکی |
| ١٤٣ | جاهیدە سابیر ئەفەندی | بەڕێوەبەری دارایی | کەرکوك | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٤ | خواستی باوکی |
| ١٥٧ | سەبیحە نەشئەت | ئەمین سەندوق | کەرکوك | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٥ | گواستنەوەی باوکی |
| ١٥٨ | نەزیهە حەسیب | یاریدەدەری نووسەری تەحریر | کەرکوك | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٥ | گواستنەوەی باوکی |
| ١٦٠ | ئەنیسە حەسیب | یاریدەدەری نووسەری تەحریر | کەرکوك | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٥ | گواستنەوەی باوکی |
| ١٦١ | نەسیبە شوکر ئەفەندی | نووسەری ئیستیهلاك | کەرکوك | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٥ | خواستی باوکی |
| ١٦٢ | دیکنور ئەرشاك | سەرتاش | کەرکوك | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٥ | خواستی باوکی |
| ١٦٤ | ئەدیبە محەمەد حەسەن | پۆلیس | موسڵ | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٥ | گواستنەوەی باوکی |
| ١٦٥ | مەلیحە محەمەد حەسەن | پۆلیس | موسڵ | ١٩٣٤ | ١ | ١٩٣٥ | گواستنەوەی باوکی |
| ١٧٠ | خاوەر کەمال ئەفەندی | برینپێچ | مەیدان | ١٩٣٥ | ١ | ١٩٣٥ | خواستی باوکی |

گۆرانی)یەوە، کە تیایدا ئەو سروودانەی بە قوتابییەکانی لەبەرکردووە کە گیانی نیشتمانی و نەتەوەیی و زانستخوازی لە ناخیاندا بەهێزکردووە، کە ئەمانەی خوارەوە نموونەیەکن لەو سروودانە[٤٤].

تا حوری کوردان نەبینم بەچاو
تێر ناخۆم لە نان تێر ناخۆم لە ئاو
ئەی منالینە بابچینە مەکتەب
بەشکو فێرببین هەم دین هەم ئەدەب
ئەمرۆ زەمانەی عیلم و عیرفانە
بۆ دەردی کەری مەکتەب دەرمانە

(مەلا کاکە حەمە) سەرەتا لە گوندی (کریچنە)وە دەستی پێکردووەو لەلایە (شێخ حوسێنی کوری شێخ قادری کەسنەزان) گیرساوەتەوە[٤٥]، بە تایبەت چونکە ئەو زاتە زۆر حەزی بە خوێندن و فێرکردن کردووەو رۆڵێکی بالای گێراوە لە بلاوکردنەوەی خوێندن لە ناوچەکەی خۆیدا لە رێگەی کردنەوەی قوتابخانەو هێنانی مامۆستاوە، کە (مەلا کاکە حەمەی مەلا سەفوللا) یەکێك بووە لەو مامۆستا دلسۆزانەی کە بۆ وانە ووتنەوە هێناویەتییە کریچنە[٤٦].

ئەو مامۆستا دلسۆزە ماوەیەکی زۆر لە ناوچەی (سەنگاو) ماوەتەوەو ئەم گوندو ئەو گوندی کردووەو بە بێ ماندووبون خزمەتی مندالانی ئەو ناوچەیەی کردووە، (مەلا کاکە حەمە) لە سەردەمی حوکمی (شێخ مەحمود)دا چووەتە گوندی (گۆپتەپە)ی ناوەندی ناحیەی (سەنگاو)و بووە بە قازی ئەو ناحیەیەو کاروباری دادوەری ناحیەکەی بۆ (شێخ عەبدولقادری گوللەنەبر)ی بەرێوەبەری ناحیەی (سەنگاو) راپەراندووە، پاشان کە (شێخ عەبدولقادر) گواستراوەتەوە بۆ بەرێوەبەرایەتی ناحیەی (قەرەداغ) (مەلا کاکە حەمە)ش لەگەلیدا چووەتە ئەو ناحیەیەو تاکو دوورخستنەوەی شێخ لە سالی (١٩٢٥)ی زاینیی لە (قەرەداغ) ماوەتەوە. بەلام پاش ئەو مێژووە بە یەکجاری وازی لە کاری حکومی هێناوەو خۆی بۆ خزمەتکردن لە بواری پەروەردەو فێرکردندا تەرخان کردووە[٤٧]، سەرەتا گەراوەتەوە گوندی (کریچنە)، پاشان چووەتە گوندی (داربەروو) کە گوندێکی تری سەر بە (سەنگاوە)[٤٨]، ئەمجارە لەناو تیرەی (مکایلی) جافەوە دەستی پێکردووەو پێنج سالی تەواوی لە ناویاندا ماوەتەوە[٤٩]، وەك خۆی بۆ خاوەنی کتێبی (مامۆستای ئەمری) گێراوەتەوە، هەلبژاردنی تیرەی مکایلی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەو ئارەزووی ئەوەی هەبووە لەو شوێنانەدا خزمەت بکات کە دوورن لە شارو شارستانییەت و لە خزمەتی خوێندن بێ بەشن[٥٠]، (مەلا کاکە حەمە) تاکو سالی (١٩٣١) لە ناو تیرەی مکایلی ماوەتەوەو پاشان رووی کردووەتە ناو (زەنگەنە)و لەوێشەوە رووی لە گوندەکانی (هۆزی داودە) کردووە[٥١].

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:
١. (چەمچەماڵ لەیادەوەریمدا ١٩٦٠ - ١٩٨١)، هاشم سەید ئەحمەد سەید محەمەد، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، لاپەرە (٤٧).
٢. گۆڤاری (ئاران)، ژمارە (٩)، شوباتی ساڵی (١٩٩٩)، لاپەرە (٢٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (قوتابخانەکانی چەمچەماڵ ساڵانی ١٩٤٠ - ١٩٦٠)، نووسینی: محەمەد نوری تۆفیق.
٣. (مەلا محەمەد مەلا سەعید) (١٨٨٠ - ١٩٥٧)ی زاینیی، مەلایەکی شارەزای خەڵکی چەمچەماڵ بووەو ناسراو بووە بە مەلای گەورەی چەمچەماڵ، یەکەم مەلای یەکەم مزگەوت بووە لە شارەکە، دەستێکی باڵای هەبووە لە کردنەوەی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی لە چەمچەماڵ، هەر خۆیشی لە مامۆستا یەکەمینەکانی ئەو قوتابخانەیە بووە، مامۆستا (مەلا محەمەد) یەکێك بووە لەو کەسانەی کە هەمیشە هانی خەڵکی شاری داوە بۆ چوونە مەکتەب و ڕێزگرتنی مامۆستا و کەسانی خوێنەوار، هەروەها هانی لاوەکانی شاری داوە بۆ خۆشویستنی کتێب و خوێندنەوەی چاپەمەنییەکانی ئەو ڕۆژانەی کوردستان، بۆ زیاتر بڕوانە:
- گۆڤاری (ئاران)، ژمارە (٧)، ئابی ساڵی (١٩٩٨)، لاپەرە (٥٠ - ٥١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (ئەو گەورە کەسانەی کە خزمەتی شارەکەمیان کردووە)، نووسینی: محەمەد نوری تۆفیق.
٤. ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (١٦٦٧)، لە (٣)ی ئابی ساڵی (١٩٩٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (فەرمانێکی حوکمداری مەلیك مەحموود)، نووسینی: عەبدولڕەحمان مەلا محەمەد.
٥. (تاریخی سلێمانی وولاتی)، نووسینی: محەمەد ئەمین زەکی بەگ ئا: ڕەفیق ساڵح، ، بەرگی ٣، چاپی ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥، لاپەرە (١٥٣ - ١٥٤).
٦. بڕوانە:
- (موصل ولایتی سالنامەسی)، (١٣٣٠)ی کۆچی، لاپەرە (٣٢٥).
- (دراسات ومباحث في تأريخ الكورد والعراق المعاصر)، دکتۆر عەبدولفەتاح عەلی ئەلبۆتانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧، لاپەرە (٧٣).
٧. بڕوانە:
- (BOA، Y، E، nr 36/139-81، 3-4).
- (مختارات من كتاب الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية)، دکتۆر خەلیل عەلی موراد، سلێمانی، ٢٠٠٥، لاپەرە (٤٣).
٨. (مختارات من كتاب الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٤-٦٦).
٩. ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)، ژمارە (٦٤)، ساڵی دووەم، پێنجشەمە (١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٢١)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (بۆ دائیرەی پێشکەوتن)، نووسینی (عیزەت ئەفەندی).
١٠. (تأريخ التعليم في العراق في عهد الانتداب البريطاني ١٩٢١ ١٩٣٢) عەبدولڕزاق ئەلهیلای، چاپی یەکەم، (دار الشؤون الثقافية العامة)، بەغد، ٢٠٠٠، لاپەرە (٤٤٩).
١١. ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە (١٠٦)، ساڵی سێیەم، پێنجشەممە (١٥)ی ئاياری ساڵی (١٩٢٨).
١٢. مستەفا سائیب ئەستێرە گەشەی کورد)، کەمال ڕەئوف محەمەد، سلێمانی، ١٩٩٩، لاپەرە (١٦٤).
١٣. ساڵح زەکی بەگی ساحێبقڕان لە ساڵی (١٩٢٨)ی زاینیی بە قائیمقامی چەمچەماڵ دەستنیشان کراوە، بەڵام لە ساڵی (١٩٣٠) بە بیانووی دامەزراندن بە جێگری بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی ناوخۆ لە بەڕێوەبردنی کاروباری قەزای چەمچەماڵ دوور خراوەتەوە، بڕوانە:
- (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد)، دکتۆر کەماڵ مەزهەر، بەرهەڤکرنا عەبدوڵڵا زەنگەنە، بەرگی دووەمی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١، لاپەرە ١٨٣).
١٤. گۆڤاری (ئاران)، ژمارە (٤)، تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٧)، لاپەرە (١٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (چەمچەماڵ لە دەرگاکانی ئاستانەوە بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان)، نووسینی بەهجەت ڕەئوف.
١٥. (٣١ ساڵ لە ژیانی مامۆستایەك)، مامۆستا ڕەشید کەریم، سلێمانی، ١٩٦٠، لاپەرە (١٦ - ١٧).
١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٧ - ١٨).
١٧. چاوپێکەوتن لەگەڵ (دکتۆر کەریم ئەفەندی).
١٨. تۆمارەکانی بەڕێوەبەرایەتی دادەنووس لە چەمچەماڵ لە (١)ی شوباتی ساڵی (١٩٣٢) تا (٢٩)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٤٢)، لاپەرە (١١٥ - ١١٩).
١٩. بڕوانە:
- (ئەوەی لە بیرمە)، نووسینی: ناهیدە شێخ سەلام، ئامادەکردنی: چیمەن ساڵح، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان، هەولێر، ١٩٩٩، لاپەرە (١١).
- (٣١ ساڵ لە ژیانی مامۆستایەك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٨).
٢٠. تۆماری گشتی ژمارە (١)ی قوتابخانەی چەمچەماڵی سەرەتایی کوڕان، زنجیرەکانی (٧٩، ٨٠، ٨٥، ١٠٠، ١٠٩، ١٤٢، ١٤٣).
٢١. چاوپێکەوتن لەگەڵ (سەبرییە حەمە ڕەشید)، کە یەکێك بووە لەو کچانەی هەر لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانەی کچانی چەمچەماڵدا ناوی تۆمارکراوە، لەدایکبووە ساڵی (١٩٣٠)، چەمچەماڵ لە بواری (٦)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٦).
٢٢. (ئەوەی لە بیرمە)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠ - ١١).
٢٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١).
٢٤. بڕوانە:
- (ئەوەی لە بیرمە)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١).
- (٣١ ساڵ لە ژیانی مامۆستایەك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٨).
٢٥. بڕوانە:
- (چەمچەماڵ لەیادەوەریمدا ١٩٦٠ - ١٩٨١)، هەمان

سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٨).

– گۆڤاری (پەروەردەیی)، ژمارە (١٦)، شوباتی ساڵی (٢٠٠٢)، لاپەڕە (٨٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (مێژووی پەروەردەی چەمچەماڵ)، نووسینی: خالید عەبدل کاکەیی.

٢٦. (دليل العراق ١٩٣٦)، لاپەڕە (٥٨٣).

٢٧. دار الكتب والوثائق العراقية، ملفات وزارة الداخلية، رقم الملف (٩١٣٨)، التصنيف (٣٢٠٥٠)، العنوان (تفتيش مركز قضاء چەم چەمال).

٢٨. دار الكتب والوثائق العراقية، ملفات وزارة الداخلية، رقم الملف (٩٣٢٠)، التصنيف (٣٢٠٥٠)، العنوان (تفتيش مركز قضاء چەم چەمال)، (١٩٣٩/١١/٨ – ١٩٣٩/١٢/٢٧).

٢٩. گۆڤاری (ئاران)، ژمارە (٩)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧).

٣٠. بڕوانە:

– (چەمچەماڵ لەیادەوەریمدا ١٩٦٠ – ١٩٨١)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٦).

– گۆڤاری (پەروەردەیی)، ژمارە (١٦)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٩).

٣١. ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە (٢٤٢)، دووشەممە، (٢)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٠).

٣٢. ڕۆژنامەی (کەرکوک)، ژمارە (٣٠٨)، ساڵی پێنجەم، دووشەممە، (١٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٠)، لاپەڕە (٤)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (بۆ بەرچاوی هەیئەتی ئیداری یانەی سەرکەوتن کوردان لە بەغداد)، نووسینی: سەلام.

٣٣. ڕۆژنامەی (کەرکوک)، ژمارە (٣١٠)، ساڵی پێنجەم، دووشەممە، (٨)ی تەموز ساڵی (١٩٣٠)، لاپەڕە (٤)، بابەتێکە بە ناونیشانی: (موژدە بۆ وەتەن)، نووسینی: سەلام.

٣٤. ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە (٢٥٧)، ساڵی پێنجەم، پێنجشەممە، (١٤)ی ئابی ساڵی (١٩٣٠)، لاپەڕە (٩).

٣٥. سەبارەت بە کاکە ڕەزا ماموستا مەلا نوری ئاغجەلەری نووسیویەتی: (عەسکەر، دانیشتوانی (١٠٠) خێزان زیاتر دەبوو، سەرۆکێکی ژیرو داناو پیاوچاکی (کاکە ڕەزای کاکە عەلی ناو..)ی هەبوو، بڕوانە:

– (بیرەوەرییەکانم لەنێوان بینین‌و بیستندا)، مەلا نوری ئاغجەلەری، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٢٨).

٣٦. (ئاوڕدانەوەیەک لە بزووتنەوەی هەقە)، مستەفا عەسکەری، دارشتنەوەی محەممەدی مەلا کەریم، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕە (٧٨).

٣٧. (بیرەوەرییەکانم لەنێوان بینین‌و بیستندا)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦ – ٧).

٣٨. چاوپێکەوتن لەگەڵ (مستەفا عەسکەری) لە بنەماڵەی شێخانی عەسکەرو کوری کاکە ڕەزا، لە دایکبووی ساڵی (١٩٣٩)، لە بەرواری (٢٤)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٩).

٣٩. بڕوانە:

– (مذكرات فؤاد عارف)، فوئاد عارف، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩، لاپەڕە (١١٤ – ١١٥).

– (بیرەوەرییەکانم لەنێوان بینین‌و بیستندا)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠).

٤٠. (ماذا في كركوك)، فەهمی عەرەب ئاغا، فازڵ محەمەد مستەفا، کەرکوک، لاپەڕە (٢٦١).

٤١. (عەسکەر لە بیرەوەری پێشمەرگەیەکدا)، غەریب سەعید عەسکەری، چاپی دووەم، چاپخانەی (تیشک)، سلێمانی، ١٩٩٨، لاپەڕە (٦).

٤٢. بڕوانە:

– (مامۆستای نەمر)، مستەفا نەریمان، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧١، لاپەڕە (٧٨).

– (مەلا کاکە حەمە)، شاکر فەتاح، سلێمانی، ١٩٧٢، لاپەڕە (٢٦ – ٢٧).

٤٣. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، بەغدا، ١٩٩٤، لاپەڕە (١٠٥).

٤٤. چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا ڕەئوف سەنگاو)، کە قوتابی (مەلا کاکە حەمە) بووە، لەدایکبووی ساڵی (١٩٢٥)ی زاینییە، لە بەرواری (١)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٩).

٤٥. (مەلا کاکە حەمە)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١١).

٤٦. (مەحمود خانی دزڵی شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان)، عومەر مەعروف بەرزنجی، چاپی دووەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، لاپەڕە (٥٣).

٤٧. (مەلا کاکە حەمە)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١١).

٤٨. چاوپێکەوتن لەگەڵ (مەلا ڕەئوف سەنگاو).

٤٩. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠٥).

٥٠. (مامۆستای نەمر)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٩).

٥١. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠٥ – ١٠٦).

*** قوتابخانە ئایینییەکانی ناوچەی کەرکوك:**
لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، بڵاوبوونەوەی رۆشنبیری و پێگەی ئایینی لە مزگەوت و تەکییە و خانەقاکاندا رۆڵێکی بەرچاویان بینووە لە خزمەت بە کەلەپوری ئایینەکە، هەردەم لق و پۆی خۆی هاوشێوەی بۆ هەموو سووچێکی ئەم ناوچەیە و جێگە و رێگەی خۆی کردووەتەوە لەخزمەت بەو شارستانییە و گەلێك زانا و پیاوی ئایینیان تێدا هەڵکەوتووە کە رۆڵی بەر چاویان هەبووە لەخزمەت و راڤەکردنی ئایینەکەدا.
قوتابخانەی ئایینی و حوجرەی مزگەوت و تەکییە و خانەقاکان رۆڵێکی بەرچاویان بینووە و هەنگاوی گەورەیان ناوە لەخزمەت پێگەیاندنی زانا و مامۆستا و گەلێك قوتابی لەو حوجرانە بڕوانامەیان وەرگرتووە و لەدوا رۆژدا بوونەتە مامۆستای بەرچاو لەو بوارەدا.
قوتابخانە ئایینییەکان هەمووده‌م جێگەوپێگەی خۆیان هەبووە لە ناوچەکەدا لەلایەن خەڵکی گوندەکەوە رێزی لێگیراوە و هەردەم جێگەی کۆمەك و یارمەتی بووە و هەموو ساڵێك بەکۆمەك و هەرەوەزی خەڵکەکە خانووی قوتابخانەکە چاککراوە بەپاك و پووختەیی راگیراوە و بایەخی خۆی هەبووە و پێویستییەکانی زستانی بۆ دابین کراوە لەدارو خانوو رایەخ و خواردنی پێویستی زستانە، کە زۆر جار لەپێویستی خەڵکی گوندەکە کۆکراوەتەوە.

*** قوتابخانەی ئایینی (ئەیوبـیـیە):**
ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (ئەحمەد پاشا) موتەسەریفی کەرکوك لە ساڵی (١٧١٥)ی زایینی لە گەرەکی شاتەری دروستکراوە، ئەمە بە ناوبانگ بووە بە قوتابخانەی (سەهرانی)یە کە یەکێك بووە لە خێزانە کوردە بە ناوبانگەکانی ئەم شارە کە دەستیان هەبووە لە کارگێڕی و بەڕێوەبەری قوتابخانەکەدا تا کۆتایی ئیمارەتی بابانییەکان لە ساڵی (١٨٥٨)ی زایینییدا بەردەوام بووە لە فێرکردن و خوێندنی قوتابیدا.
شوێن و گرنگی ئەم قوتابخانەیە لەوەدا بووە کە لە مێژوویەکی زۆر کۆندا ئاوەدان بووە و شوێنی هەڵکەوتەی قوتابخانەکەش لە نێو مزگەوتی ئەو گەرەکەدا گرنگی لەوەدا سەرچاوە دەگرێت کە شوێنێکی ناوەند بووە لە پێگەیاندنی بەشێکی زۆری قوتابییەکانی دەوروبەری شارەکە و گەلێك زانا و مامۆستای ئایینی بە ناوبانگ دەرسیان تێدا وتووەتەوە.

*** قوتابخانەی ئایینی (غۆسیـیە - الغوثیة):**
لەلایەن (حاجی محەمەد غۆسی موفتی زادە)وە دروستکراوە لە ساڵی (١٧٥٩) لە سەرەتای بازاڕی (جووت قاوە) کە لە نێو مزگەوتی (قازی)دا بوو، لەم ساڵانەی دواییدا زانای ئایینی و مێژوونووسینی کورد (مەلا جەمیل رۆژبەیانی) دەرسی تێدا وتووەتەوە، لە یەکێك لە دەستنووسەکاندا کە لە هەمان قوتابخانەدا دۆزراوەتەوە و لە ساڵی (١٩٣٩) نووسراوە ئاماژە بە ناوی ئەو قوتابییانە دەکات کە لەم قوتابخانەیە خوێندویانە.
ئەم قوتابخانەیە لە نێو بازاڕی (جووت قاوە)داو لە نێو مزگەوتی (قازی) کە مزگەتی (غۆسییە) بە ناوبانگە گرنگی خۆی هەبووە لەو شوێنەدا لەبەر ئەوەی بەشێك زۆر لە زانایان و مامۆستایانی ئایینی وانەیان تێدا وتووەتەوە و لە سەردەمانێکدا جەمەی هاتووە لە خەڵکانی رۆشنبیر.
تاکو ئێستاش مزگەوتەکە لە خزمەتکردن بەردەوامە.

*** قوتابخانەی ئایینی (ئەلسیناعە - الصناعة):**
ئەم قوتابخانەیە لەلایەن کۆمەڵێك لە ناودارو پیاو ماقوڵانی شاری کەرکوك لە ساڵی (١٨٦٩)ی زایینی لە سەردەمی موتەسەریفی کەرکوك (سلێمان نافس پاشا) دروستکراوە، دەکەوێتە کۆتایی شەقامی (ئەتڵەس) لە دەروازەی شەقامەکە لە بەشی رۆژهەڵاتی، بەڵام کاتێك (عەونوڵڵای کازمی کوردی) کە بوو بە موتەسەریفی کەرکوك بایەخێکی زۆری بەم قوتابخانەیە داو لە پای ئەو هەڵوێستە نەتەوەییەی کە هەیبوو بەرامبەر ئەم شارەو بایەخدانی بەرامبەر ئەم قوتابخانەیەو سەرف کردنی پارە بۆ مامۆستاکانی، بۆیە دوورخرایەوەو لە ساڵی (١٩١٧)دا کرا بە بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك و لە ساڵی (١٩٦٠) بە تەواوەتی ئەم قوتابخانەیە رووخا.
گرنگی ئەم قوتابخانەیە لەوەدایە کە لە ماوەی نێوان دوو موتەسەریفی کەرکوکدا بەردەوام بووەو تا شەستەکانی سەدەی بیستەمدا خوێندنی تێدا بە گرنگی وەرگیراوە.

*** قوتابخانەی ئایینی (مەلا عومەری رەنجووری):**
لەلایەن شاعیر (مەلا عومەری رەنجووری کوری خالید بەگ کوری عومەر بەگی زەنگەنە) لە گەرەکی (عاشوور) دامەزراوە لە ساڵی (١٧٨٢)ی زایینی.
ئەم قوتابخانەیە لە ناو مزگەوتی (رەحمان)ی هەمان مزگەوتی (رەنجووری) جاراندا بنیات نراوە، گرنگی ئەم قوتابخانەیە لەوەدا بوو لەلایەن (رەنجووری) شاعیرەوە سەرپەرشتی کراوەو پرۆگرام و شێوازی خوێندنی بۆ دارشتووە، لەبەر ئەوەی خۆی یەکێك بووە لە زانا ئایینی و شاعیرە بە ناوبانگەکانی سەردەمی خۆی لە کەرکوکدا.
ماوەی خوێندن لەم قوتابخانەیە بەردەوام بووە تا کۆچی دوایی شاعیر لە ساڵی (١٨٠٩)ی زایینییدا، هەروەها شاعیر گەلێك کتێبی وەکو (تقویم رەنجووری، دیوانی رەنجووری، تسکین القلوب) بەرهەم هێناوە.
ئەم قوتابخانەیە لە پاڵ دەستنووە گرنگەکانی (رەنجووری) گەلێك دەستنووسی ئایینی جۆراوجۆری تێدا بووە کە بەشێکی پارێزراوە و بەشێکی فەوتاوە.

*** قوتابخانەی ئایینی (مەولانا حەمزەی سورچی سۆرانی):**
کۆنترین قوتابخانەیە کە وەختی خۆی لەلایەن زانای ئایینی (حەمزەی کوری عەلی ئەفەندی کوری محەمەد کوری ئیسماعیل ئەفەندی کوری عەلی کوری بیر ئەفەندی) لە ساڵی (١٧٢٢)ی زایینی دروستکراوە، هەر چەندە شوێنەکەی دیار نییە بەڵام بەپێی سەرچاوەکان لە سەردەمانێکی زوودا لە ناو

کەرکوکدا بووە لەو کاتەی کە کەرکوك زۆر شارێکی زۆر گەورە نەبووە، ئەم قوتابخانەیە کتێبخانەیەکی گەورەی تێدا بوو بە ناوی (مەولانا حەمزەی سۆرانی) کە گەلێك دەستنووس و کتێبی گرانبەهای نووسەران و خێزانی سۆرانییەکانی تێدا بووە کە پڕ بە پێز بوو لە ناونیشان و ژمارەو بابەت.

بەپێی هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ساڵی (١٦٦٣)ی زاینیی ئەوە دەخەنە ڕوو کە یەکێك لە زانا ئایینییەکانی سۆرچییەکان بە ناوبانگ بووە لە سەردەشتی کوردستانی ئێران، بەڵام نازانرێت لە چی ساڵێکدا هاتووەتە کەرکوك و تێیدا نیشتەجێ بووە.

*** قوتابخانەی ئایینیی (مەلا عومەری عەسکەری):**

لەلایەن (مەلا عومەر کوڕی مەلا حەیدەر کوڕی مەلا میرزا کوڕی مەلا عەلی کوڕی محەمەد عەسکەری) لە ساڵی (١٧٩٢)ی زایینی بنیات نراوە، کە کەوتبووە سەر قەڵای کەرکوك لەناو مزگەوت و مەرقەدی (دانیال پێغەمبەر)، لە دوای ساڵی (١٨٧١)ی زایینی کە مەلا عومەر کۆچی دوایی کرد بەڕێوەبردنی قوتابخانەکە کەوتە دەست (مەلا عەبدولرەحمان عەسکەری) کە لە بنەڕەتدا خەڵکی دێی (عەسکەر) بوو.

گرنگی ئەم قوتابخانەیە لەوەدا بوو کە گەلێك مامۆستا و زانایانی دێی (عەسکەر) لەم قوتابخانەیە دەرسیان وتووەتەوەو گەلێك قوتابی ئایینییان پێگەیاندووە لە بواری (شەریعەت، فیقهدا). بەشێکی زۆری زانایانی ئایینیی دێی (عەسکەر) خزمەتیان لەم مزگەوتەدا کردووە.

*** قوتابخانەی ئایینیی و تەکیەی (خانەقا):**

لەلایەن (عەبدولقادر سوورە کوڕی سەیید ئەحمەدی سەردار کوڕی بابە ڕەسول) لە ساڵی (١٨٣٤) لە گەڕەکی (شاتەری) دروستکراوە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجید، کە ڕووبەرەکی (٢٠٠٠) مەتری دووجا بووە، لە پێش شەڕی جیهانی یەکەمدا (مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی سیامەنسووری) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بووە.

(مەلا عەلی حیکمەت) یەکێك بووە لە زانا بەناوبانگەکانی بواری ئاین لە سەردەمی خۆی و گەلێك کتێبی وەك (شرح الطالع، شرح المواقف، شرح التجرید)ی نووسیوە، ئەم زانا ئایینییە لە ساڵی (١٩٢٩) کۆچی دوایی کردووەو گەلێك قوتابی لە بواری ئایندا سوودو گرنگیان لەم مامۆستا وەرگرتووە.

*** قوتابخانەی ئایینیی و تەکیەی (شێخ عەبدولباقی):**

لەلایەن (شێخ عەبدولباقی) لە گەڕەکی (شاتەری) لە ساڵی (١٨٨٢) دروستکراوە، لەسەر ڕێگای (هەولێر - کەرکوك)، هەریەکە لە (مەلا ئەحمەد باداوایی) و (شێخ محەمەد مەزناوی برای مەلا مەحمودی مەزناوی) و (شێخ مستەفای کوڕی) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بوونە.

ئەم قوتابخانەیە لە نێو تەکیەی (شێخ عەبدولباقی)دا بوونی هەبووەو تاوەکو ئێستاکە ئەم مزگەوتە بەردەوامە لە خزمەت ئاین و ئیسلامدا.

لە پاش خۆی ئەم قوتابخانەیە گەلێك دەستنووسی ئایینیی مامۆستایانی تێدا بەجێماوەو لە سەردەمی خۆیدا گرنگی بە پێزی هەبووە.

*** قوتابخانەی ئایینیی (ڕوشدیە):**

بەپێی سەرچاوەکان ئەم قوتابخانەیە زیاتر لە دوای ڕێکخستنە کارگێڕییەکانی عوسمانییەوە دامەزراوە لە دوای ساڵی (١٨٣٩)ی زایینیی، کە هەندێك سەرچاوە ساڵی دامەزراندنی دەگەڕێننەوە بۆ ساڵی (١٨٦٨)ی زایینیی، کە قوتابخانەیەکی نیزامی بووە، لەلایەن موتەسەڕیفی کەرکوك (هاشم پاشا)وە لە ساڵی (١٨٦٨) دامەزراوە کە شوێنی ئەم قوتابخانەیە کەوتبووە گەڕەکی (ئاخور حوسێن). پلەی ئەم قوتابخانەیە لە ئاستی خوێندنی ناوەندیدا بووەو لەسەر پرۆگرامی تازە خوێندنی تێدا خوێندراوە. بەڵام لە پاڵ پرۆگرامە ئایینییەکاندا پرۆگرامی خوێندیشی تێدا خوێندراوە.

*** قوتابخانەی ئایینیی و مزگەوتی (ئیبراهیم پاشای بابان):-**

لەلایەن (ئیبراهیم پاشای بابان)ەوە لە ساڵی (١٨٩١) لە گەڕەکی شاتەری لە نزیك تەلاری ئێستای شوکر نەجار دامەزراوە، لەنێو ئەم قوتابخانەیەدا زانستەکانی ئاین وەکو فیقەو شەریعەی ئیسلامی و زانستی نەحو و سەرف و بلاغە دەخوێندرا، زانای ئایینی (محەمەد کوڕی مەلا ساڵح کوڕی فەقێ عەبدولقادر کوڕی محەمەد) مامۆستا بووە لەم قوتابخانەیە.

*** قوتابخانەی ئایینیی (بوڵاخ):-**

دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە نەزانراوە، ئەم قوتابخانەیە کەوتووتە گەڕەکی (بوڵاخ) لەنزیك مزگەوت و تەکیەی (خادم سوجادە) کە هەموو زانستەکانی ئایینی ئیسلامی تێیدا دەخوێندرا، هەر یەکە لە مامۆستایانی ئایینی (مەلا حامید ئەفەندی، مەلا حوسێن کەرکوکی، مەلا عەبدولقادری کوڕی مەلا محەمەد ئەمین) کاروباری خوێندنیان لەم قوتابخانەیە بەڕێوەبردووە.

(مەلا حوسێن کوڕی زەکی کوڕی حەسەن کەرکوکی)یە، بەپێی هەندێك لە دەستنووسەکانی کەرکوك لە (دار المخطوطات)دا ناوی هاتووە، بەڵام زانیاریمان دەربارەی کەمە. لە پاش خۆی گەلێك دەستنووسی ئایینیی بەجێماوە، بەڵام بەشێکی زۆری بەر شاڵاوی تاڵان و فەوتان کەوتووە.

*** قوتابخانەی ئایینیی و مزگەوتی (سەیید غەنی):-**

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (سەیید عەبدولغەنی) ناوێکەوە لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن) دامەزراوە، کە (مەلا محێدین کوڕی سەیید عەبدولڕەحمان جەباری) بۆ ماوەی (٣٠) ساڵ لەم قوتابخانەیە دەرسی وتووەتەوەو ژمارەیەکی زۆر قوتابی لە بواری زانستە ئایینی ئیسلامییەکاندا بڕوانامەی ڕێزلێنانان وەرگرتووە وەکو (مەلا فەیزوڵڵای کوڕی خوداداد کوڕی حەیدەر).

ئەم قوتابخانەیە تاوەکو ئێستاکە پاشماوەی مزگەوتەکەی و

قوتابخانەکەی ماوەو بەڵام بە هەموو جۆرێك پشتگوێ خراوەو لە نزیك مزگەوتی ئێستای (نائیب)دایە، بەڵام لە سەردەمانی زوودا پێگەو شوێنی ئەم مزگەوتە زۆر گرنگ بووەو شوێنێکی بەرچاو بووە لە پێگەیاندنی قوتابیانی ئایینییداو (سەید عەبدولغەنی) خۆی یەکێك بووە لە کەسایەتییە ئایینییەکانی سەردەمی خۆی، توانیوویەتی بەپێی سەردەمەکەی گرنگی بە ئاین‌و قوتابخانەی ئایینیی بدات.

*** قوتابخانەی ئایینیی (دڵی باش):-**

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (مەلا مەحمود)ەوە لە ساڵی (١٦٣٣)ی زایینیی لە گەڕەکی (زێوێ) دامەزراوە، بەپێی بنەڕەتی قسەکانی (مەلا عەبدوڵڵا مەلا فەیزی)، هەر یەکە لە مامۆستایان (مەلا ئەمین کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان) لە ساڵی (١٧٧٥)ی زایینیی‌و (مەلا عەلی) وانەیان تێدا وتووەتەوە.

ئەم قوتابخانەیە لە سەرەتادا لە نێو مزگەوتەکەدا شوێنێکی بەرچاوی هەبووەو هەندێك لەو باوەڕەدا بوونە کە بیروباوەڕی تەسەوفیشی تێدا بڵاوبووەتەوە، بەڵام سەرچاوەکانمان ئاماژەی روون نییە بە راستی قسەکە، لە هەمان کاتدا لە شوێنی مزگەوتەکەدا لە گەڕەکی (زێوێ)دا ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم قوتابخانەیە لە کاتی خۆیدا گرنگی‌و سوودی خۆی هەبووە بۆ خەڵکی ناوچەکە، بە تایبەتی دێیەکانی دەوروبەری گەڕەکی (زێوێ).

*** قوتابخانەی ئایینیی‌و تەکیێ (تاڵەبانی):-**

لەلایەن (شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ مەحمودی زەنگەنە) لە ساڵی (١٨٨٢) دامەزراوە، هەر لە کاتی دامەزراندنییەوە تاوەکو ئێستاکە بنکەیەکی زانستی ئایینی گرنگ بووە کە هەموو زانستە ئایینی ئیسلامییەکانی تێدا خوێندراوە لە پاڵ خوێندنی مەقامە کوردی‌و تورکمانی‌و عەرەبییەکان، زانای ئایینی (مەلا مەحمودی مەزناوی)و (شێخ عەبدولڕەحمان تاڵەبانی)و (شێخ محەمەد جەمیل تاڵەبانی)و (شێخ عەلی کوڕی شێخ جەمیل تاڵەبانی) مامۆستای بوونە لە سەردەمە جیاجیاکاندا.

دەوڵەتی عوسمانی خۆی لە خۆیدا گرنگی بەم مزگەوت‌و قوتابخانەیە داوەو پێگەیەکی بەرچاوی هەبووە لەگەڵ تەکیێ (سەید ئەحمەدی خانەقا) لە پێگەیاندنی قوتابیانی ئایینیی‌و زانستەکانی ئایندا، چونکە بە یەکێك لەو مزگەوت‌و قوتابخانە گەورانەدا دادەنرێت کە تا ئەم سەردەمەی ئێستامان گرنگی‌و بایەخی خۆی لە دەست نەداوەو لە بواری هونەر بە تایبەتی هونەری مەقامات شوێنێکی گرنگی کۆکەرەوەی ئاین‌و خوێندنی مەقام بووە، بە تایبەتی کۆمەڵێك لەو زانا ئایینییانەی ئەوێ بایەخیان بە خوێندنی مەقام داوە لەم قوتابخانەیەو شوێنی کۆکەرەوەی خەڵکێکی زۆر بووە لەوانەی کە ئاوارە بوونە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە، بۆیە پێگە ئایینیی‌و هونەرییەکەی دەوری بینییوە لە کۆکردنەوەی کەسانی زۆرو جۆربە جۆر.

*** قوتابخانەی ئایینیی‌و خانەقای (مەلا عومەری گونبەدی):-**

لەلایەن زانای ئایینی (مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا ئیبراهیم کوڕی مەلا عومەر گونبەدی) لە ساڵی (١٨١٠)ی زایینیی دامەزراوە، کە کەوتووەتە سووچێکی سەرەتایی گەڕەکی (زێوێ)وە، لە سەرەتادا مەلای ئایینی (مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا ئیبراهیم) وانەی تێدا وتووەتەوە دوای ماوەیەك گواستراوەتەوە بۆ ئەستەمبوڵ لەسەر داواکاری سوڵتان (عەبدولمەجید)و لەوێ بووەتە دادوەر، دوای ماوەیەك کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی ئەوێ نێژراوەو لە پاڵ گۆڕی شاعیری گەورەی کورد (حاجی قادری کۆیی) لە ساڵی (١٨٨٠)، لە دوای ئەویش (مەلا سدیق گونبەدی) وانەی تێدا وتووەتەوە.

ئەم قوتابخانەیە بە تایبەتی زانا ئایینییەکانی گونبەدی یەك لە دوای یەك زانستی ئایینییان تێدا بڵاوکردوتەوەو گەلێك قوتابی لە ژێر دەستیان پێگەیشتووە، تاوەکو ئێستاکەش شوێنەواری قوتابخانەو خانەقاکە ماوەو پێگەی ئایینیی گرنگی خۆی لە دەست نەداوە.

*** قوتابخانەی ئایینیی لە مزگەوتی (ئیمام قاسم):-**

لەلایەن زانای ئایینی (مەلا عوسمان کوڕی مەلا قادر)ەوە لە ساڵی (١٨١٥) دامەزراوە، لە دوای کۆچی دوایی ناوبراو ئەم قوتابخانەیە کوڕەکەی (مەلا قادر کوڕی مەلا عوسمان کوڕی مەلا قادری یەکەم) وانەی تێدا وتووەتەوە تا کۆتایی ساڵی (١٩٢١) تێدا بەردەوام بووە.

گرنگی ئەم قوتابخانەیە لەوەدا بووە کە پێگەیەکی ئایینیی گرنگی هەبووەو گەلێك زانای گەورەی ئایینیی لەم قوتابخانەیەدا دەرسیان وتووەتەوەو زۆربەی مەراسیمەکانی ڕێزلێنان‌و ئیجازە وەرگرتنی قوتابیان لەم قوتابخانەیەدا دەوری خۆی هەبووە. لەلایەن دەوڵەتەوە بە تایبەتی عوسمانییەکان ڕێزی تایبەتی خۆی هەبووەو حیسابی ووردی بۆ کراوە.

*** قوتابخانەی ئایینیی‌و تەکیێ (شێخ خدری نەقشبەندی):-**

لەلایەن (شێخ جەواد کوڕی شێخ خدر کوڕی شێخ حەیدەری نەقشبەندی)یەوە لە ساڵی (١٨٦٥)ی زایینیی دامەزراوە لە ناو تەکیێکەی لە گەڕەکی (ئیمام قاسم)، مامۆستاو شاعیری کورد (مەلا تەهای کوڕی ڕەهبەر کوڕی شێخ سەعید کوڕی شێخ خدری نەقشبەندی) ماوەیەك مامۆستای ئایینیی ئەم قوتابخانەیە بووە. (ڕەهبەر)یش خۆی یەکێك بووە لە پیاوە ئایینیی‌و شاعیرە بە ناوبانگەکانی کەرکوك.

*** قوتابخانەی ئایینیی‌و تەکیێ (خادم سوجادە):-**

لەلایەن (مەلا محەمەد ڕەفیق کوڕی شێخ سەعدی کوڕی مەلا خدری خادم سوجادە)وە دروستکراوە، لە دوای خۆی کوڕەکەی (مەلا عەلی ئەفەندی) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بووە.

دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی (١٨٦٩)ی زایینیی لە (کۆیە) لەدایکبووەو لە ساڵی (١٩٣٦)ی زایینیی کۆچی

دوایی کردووە، دیوانێکی شیعری هەیە بە زمانی کوردیو تورکیو فارسی، لە بواری زانستەکانی ئایینیشدا دەستێکی باڵای هەبووەو زانای سەردەمی خۆی بووە.
ئەم قوتابخانەیە تا ئەم ساڵانەی دواییش پاشماوەی لە نێو تەکیی (خادم سوجادە)دا مابوو، ئەوەی جێگەی داخە ئەم قوتابخانەیە لەگەڵ مزگەوتەکە بەشێکی زۆر دەستنووسی تێدا بوو، بەڵام رژێمی بەعس هەستا بە تاڵان کردنی ئەم دەستنووسانەو لە ناودانی.

*** قوتابخانەی ئایینی (مەلا خدری هەورامی):-**
لەلایەن (مەلا خدر کوری مەلا حەسەن کوری مەلا حوسێن کوری مەلا حامید کوری مەلا مستەفا کوری مەلا خدری هەورامی)یەوە لە ساڵی (١٧٨٥)ی زایینی دروستکراوە.

*** قوتابخانەو مزگەوتی (شێخ محێددین کەرکوکی):-**
لەلایەن (شێخ محێددین کوری شێخ حەسەنی گڵەزەردە کوری شێخ محەمەد نۆدەهی کوری شێخ عەلی کوری شێخ بابە رەسولی بەرزنجی) لە ساڵی (١٧٦١)ی زایینی دامەزراوە لە گەرەکی (ئیمام قاسم).
(شێخ محێددین) یەکێك بووە لە زانا ئایینییەکانی کەرکوكو کوردستان، هەروەها گەلێك کتێبی بەنرخی بە جێماوە وەکو: (مجمع الجواهر)، (السيف القاطع في الدعوات)، (ابدال الاعمال)، (جلب الراحة للاقامة في دفن الفاقة)، (صنائع الاعمال)، (محسن اللال في معرفة حق الآل)، (الاوفاق والطب ودفع الشيطان)، (كشا الكروب الباعثة لتلين القلوب)، (اصلاح النفوس وآداب السلوك في الطريقة القادرية)، (جامع الفؤاد)، (برّ الأنام في الحكمة والطب)، (تسهيل الصعاب)و گەلێك نامەی دیکەی جۆراوجۆر، لەدوای خۆی هەر یەکە لە کورەکەی (شێخ عەزین)و (شێخ مەحمود کوری شێخ عەبدولعەزیز کوری شێخ محێددینی کەرکوکی) بوونەتە مامۆستای ئەم قوتابخانەیە.

*** قوتابخانەی ئایینیو مزگەوتی (حاجی مستەفا قیردار):-**
لەلایەن (حاج مستەفا قیردار) لە گەرەکی (چای) لە ساڵی (١٨٥٣)ی زایینی دامەزراوە، هەر یەکە لە مامۆستایان (مەلا عەبدولغەفور کوری مەلا مستەفا کوری مەلا عەبدوڵڵای واعین)و (مەلا حاجی تۆفیق)و (مەلا محەمەد ئەمین جەبار) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بوونە.

*** قوتابخانەی ئایینیو مزگەوتی (موسلم):-**
لەلایەن (ئەحمەد بەگی نەفتچی زەنگەنە) لە گەرەکی (بەگلەر) لە ساڵی (١٨٤٠)ی زایینی دامەزراوە، هەر یەکە لە مامۆستایان (مەلا محەمەد فەیزی زەهاوی)و (سەیید محەمەد ئەمین جەبار) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بوونە.

*** قوتابخانەی ئایینیو مزگەوتی (حاجی ئەحمەد ئاغا):-**
لەلایەن (حاجی ئەحمەد ئاغا) لە گەرەکی (ئاخور حوسێن) دامەزراوە، هەر یەکە لە زانای ئایینی (مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی سیامەنسووری)و (مەلا ئەحمەد ناویریکی) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بوونە.

*** قوتابخانەی ئایینیو مزگەوتی (فەرهاد زادە):-**
لەلایەن (حاجی مەحمود فەرهاد زادە)وە لە ساڵی (١٧٩٠) لە نزیك قەڵای کەرکوك دروستکراوە، هەر یەکە لە مامۆساتایان (مەلا وەیسی عەسکەری)و (شێخ محەمەد نەسیم مەردۆخی) و (عەبدولرەحمان کوری حوسێن بەگ رۆژبەیانی) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بوونە، لە هەمان کاتدا لەسەر قەڵای کەرکوك لە گەرەکی مەیدان قوتابخانەیەکی دیکە هەبووە بە هەمان ناو کە مامۆستاکەی (خدر ئەفەندی) بووە.
بنەماڵەی (فەرهاد زادە) یەکێکن لە بنەماڵە کۆنەکانی کەرکوك کە لە بنەرەتدا دەگەرێنەوە سەر کورد، لە بواری خوێندنو مزگەوت دروستکردندا دەستێکی باڵایان هەبووەو لەو بوارەدا گەلێك خزمەتیان بەم شارە گەیاندووە، بە تایبەتی قوتابخانەی (فەرهاد زادە) لە نێو مزگەتەکەدا بووە لە سەردەمی خۆیدا گەلێك قوتابی ئایینیو مامۆستای ئایینی دەرسو خوێندنیان لەم قوتابخانەیە کردووە، پێگەی قوتابخانەو مزگەوتە لە نزیك قەڵای کەرکوك خۆی لە خۆیدا گرنگی ئەو شوێنە دەردەخات لە پێگەیاندنی ئایینییدا.

*** قوتابخانەی ئایینیو مزگەوتی (حەسەن مەکی):-**
لەلایەن (حەسەن مەکی) لە گەرەکی ئاغاکانی قەڵا دروستکراوە، هەر یەکە لە مامۆستایان (مەلا سەعدی مەلا ئەحمەد)و (مەلا عەلی لەیلانی) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بوونە.
لە ساڵی (١٩٩٧)دا کاتێك رژێمی بەعس ئەم مزگەوتەی رووخاندووە گۆری (حەسەن مەکی) لە ناو مزگەوتەکەدا گوازراوەتەوە بۆ گۆرستانی موسەڵڵا.
ماوەیەك (مەلا سەیید یوسفی رۆژبەیانی)و (مەلا عەلی کوری شێخ مستەفا)و (مەلا ئەحمەد مەسعود شەقلاوەیی) ئیمامو خەتیب بوونە لەم مزگەوتەدا.
لە پاڵ گوێپێنەدان بەم مزگەوتە قوتابخانەی نێو مزگەوتەکەش تووشی لەناوچوونو فەوتاندن بووەو گەلێك دەستنووسو پاشماوەی بەڵگەنامەیی ئایینی لە نێو چووە، بە تایبەتی ئەو بەڵگەنامانەی تایبەتە بە مامۆستاو قوتابیو جۆری خوێندنی ئەم قوتابخانەیە.

*** قوتابخانەی ئایینیو مزگەوتی (منارە نەخشینە):-**
لەلایەن (مەلا ئەحمەد ئەفەندی زادە) لە ساڵی (١٨١٧)ی زایینی لە نزیك قەیسەری کەرکوك دامەزراوە، هەر یەکە لە مامۆستایان (مەلا عوسمان کوری مەلا خدر)و مەلا ئەحمەد کوری مەلا حەکیم)و (مەلا ناسیح کوری محەمەد) مامۆستای ئەم قوتابخانەیە بوونە.
گرنگی ئەم قوتابخانەو مزگەوتە لەوەدا بووە کە هەڵکەوتی شوێنێکی بازرگانی گرنگ بووە لە بازاری (جووت قاوە) و گەلێك قەیسەریو شوێنی بازرگانی لە دەوری بووە،

بۆیە ئاپۆرەی ئەو خەڵکانەی کە هاتووچۆی ئەو شوێنە بازرگانیانەیان کردووە گرنگییان داوە بە شوێنی ئەم قوتابخانەو مزگەوتە، بە شێوەیەکی ئەوتۆ بووەتە سەرنج و ناوبانگی بۆ گەلێك شوێن.

* قوتابخانەی ئایینی (ئاڵتون کۆپری):
ئەم قوتابخانە ئایینییە لەلایەن زاناو ئەدیب (ئەحمەد ڕۆژبەیانی فەرقانی)، لەنێوان ساڵانی (١٨٧٠ - ١٩٣٤)ی زاینی وانەی تێدا ووتراوە. بەڵام لەوەودوا ئەم قوتابخانەیە پشتگوێ خراوە.

* قوتابخانەی ئایینی (بەرلووت):
ئەم قوتابخانەیە لەناوچەی (باوە)ی سەر بە (کەلار) لەنێوان ساڵانی (١٨٦٨ - ١٩٣٤)ی زاینیی ڕۆشنبیری ئایینیی بڵاودەکردەوە، لەلایەن زانای بەناوبانگ (مەلا مەحمودی بەرلووت)ی سەرپەرشتی کراوەو وانەی تێدا وتراوەتەوە.

* قوتابخانەی ئایینی (چیمەن):
ئەم قوتابخانەیە دەکەوێتە یەکێك لە دێیەکانی کەرکوك لە ناوچەی (کفری) لە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی پارێزگاکە، ئەم گوندە بەوە بەناوبانگە بەردەوام سەوزاییو بە پیت بووە، سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم دێیە هەر لە کۆنەوە بنکەیەکی زانستی ئایینی گرنگ بووە بۆ خێزانە ناودارەکانی کوردستان، وەکو خێزانی (حەیدەرییەکان)، هەر چەندە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە (حەیدەرییەکان) لە گەلێك لە شوێنەکانی تری کوردستان ناوبانگیان هەبووە، بۆ نموونە لە ناوچەی (ماوران) حەوت قوتابخانەی گەورەیان هەبووە کە پڕ بووە لە قوتابیو ماموٚستا، بۆیە ڕێی تێدەچێت بەشێك لەو ماموٚستاو قوتابییانەی (حەیدەرییەکان) چیمەنیان ئاوەدان کردبێتەوە، کە یەکێك لە سەرچاوەکانی ئەم گوندە ئاماژە بە ناوی (حەیدەر کوڕی ئەحمەد حوسێن ئەبادی سەفەوی ماوران)ی دەکات.
هەروەها ئەوەش دەزانین کە بەشێك لە خێزانی (حەیدەرییەکان) لە سەردەمی هێرشی (تەهماسپ)دا کۆچیان کردووە لە دێی (ماوران) بۆ گوندی (وژنانە) لە ترسی هێرشی سوپا لەو کاتەدا، لەگەڵ خۆشیاندا قوتابیو ماموٚستاکانیان بردووە، دوای ئەوەی کە باردۆخ ئاسایی بووەتەوە گەڕاونەتە شوێنەکانی خۆیان.

* قوتابخانەی ئایینی (خورماتوو):
لە شارۆچکەی (خورماتوو) دامەزراوە کە کۆمەڵێك زانا وانەیان تێدا وتووەتەوە لەوانە: (عەبدولقادری کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەمەد کوڕی فەقێ ئیبراهیم)، لە ساڵی (١٩١٢)ی زاینیی.

* قوتابخانەی ئایینی (الصلاحیة):
ئەم قوتابخانەیە لەکفری بنیات نراوە لە قەزای (کفری) کەژمارەیەك زانای تێدا هەبووە، لەوانە (شێخ ئەبوبە بەکر سەلاحی).

* قوتابخانەی ئایینی (تاڵەبان):
ئەم قوتابخانەیە لە قەزای (چەمچەماڵ) دامەزراوە، کە لەلایەن (شێخ مەلا مەحمودی تاڵەبانەوە دروستکراوە، ئینجا کوڕەکەی (شێخ ئەحمەد) جێگەی گرتووەتەوە، ساڵی (١٢٥٧)ی کۆچی، (١٨٤١)ی زایینی.

* قوتابخانەی ئایینی (فەرقان):
یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی کەرکوك، ژمارەیەك زاناو ماموٚستا وانەیان تێدا ووتووەتەوە، لەوانە: (سەیفی بەگ کوڕی خدر بەگی ڕۆژبەیانی)و (مەلا مەحمودی کوڕی فەیزوڵڵای مەلا زادە)و (عوسمان کوڕی عەبدولوەهاب) و (مەلا مەحمود کوڕی دەروێش عومەر)و زاناو ئەدیب (عەبدولرەحمان کوڕی حوسێن بەگی ڕۆژبەیانی)، لە ساڵی (١٨٥٢)ی زایینی، ماموٚستای والی بەغدا (داود پاشا) بووە لە وەختی خۆیدا. گرنگی ئەم قوتابخانەیە لەم گوندە شوێنێکی پێکەوە بەستن بووە لەگەڵ ناوچەکانی تری کوردستانو دەورووبەری.

* قوتابخانەی ئایینی (قادر کەرەم):
ئەم قوتابخانەیە ناوبانگێکی زۆری دەرکردبوو، شوێنێکی باشی هەبوو، کە دەگەڕێتەوە بۆ (شێخ مەحمود زەنگەنەیی) (١٢١٥ کۆچی - ١٨٠٠ زایینی).

* قوتابخانەی ئایینی (قەرە بلاغ):
گەلێك ماموٚستا وانەی تێدا وتوتەوە لەوانە: (شێخ محەمەد نەجیب کوڕی شێخ عەبدولوەهابی تاڵەبانی)و سەید عەبدولحەکیم ئەلهویئیو ژمارەیەکی تر.

* قوتابخانەی ئایینی (کفری):
ژمارەیەکی زۆر ماموٚستاو زانا وانەیان تێدا وتووەتەوە لەوانە: (شێخ حەسەن کوڕی شێخ عەبدوڵڵا قەرەداغی) و (شێخ عومەر زیائەلدین کوڕی عوسمان نەقشبەندی)، (١٢٩٨ی کۆچی - ١٨٨٠ی زایینی)و (مەلا سەعید موفتی) (١٣٤٠)ی کۆچی. ١٩٢١ی زایینی).

* قوتابخانەی ئایینی (گەیسوومە):
ئەمەش ژمارەیەکی زۆر ماموٚستای چاکی لە خۆ گرتبوو لەوانە (ئەحمەد ڕۆژبەیانی).

* قوتابخانەی ئایینی (لەیلان):
ئەم قوتابخانەیە (مەلا ئەحمەد کوڕی بەکر ڕۆژبەیانی فەرقانی) دروستی کردبوو.

* قوتابخانەی ئایینی (هۆمەرمل):
ئەم قوتابخانەیە لە ناوچەی (کفری) بنیات نراوە، ئەوانەی وانەی تێدا وتووتەوە (محەمەد عزلەخان) بووە، لە ساڵی (١٣٦٥ی کۆچی - ١٩٤٥ی زاینی).

* قوتابخانەی ئایینی (یەحیاوە):
یەکێکە لە گوندەکانی (لەیلان)، قوتابخانەیەکی کۆنی تێدا هەبووە کە زانای پایە بەرز (عەبدولرەحمان کوڕی حوسێن بەگی ڕۆژبەیانی)، (١٢٧٠ی کۆچی - ١٨٥٤ی زایینی) وانەی تێدا وتووەتەوە.

* قوتابخانەی (مەولانا بەکر):-
- زانیاریمان دەربارەی هێندە کەمە وەکو نەبوو وایە.

* قوتابخانەی (مەلا عەبدولفەتاح کەرکوکی):-
بەوە دەچێت کە یەکێك لە مامۆستاکانی (مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا مەحمود) بێت، کە یەکێك لە حاشییەکانی بەجێماوە لە مێژووی (١٨٣٤)ی زاینیی.

* قوتابخانەی (مەلا ئەمین):-
لە یەکێك لە حاشییەکاندا ئاماژە بە ناوی (عەبدوڵڵا کوڕی دەروێش) کراوە لە هەمان قوتابخانە لە ساڵی (١٨٥٥)ی زاینیی.

* قوتابخانەی (مەلا عەلی زادە):-
لە یەکێك لە دەسنووسەکاندا ئاماژە بە ناوی (مستەفا کوڕی ئەحمەد گۆرانی) دەکات کە لە هەمان قوتابخانە نووسراوەتەوە، بابەتەکەش دەبارەی زانستی بیرکارییە.

* قوتابخانەی (کاریزە):-
هەر چەندە کە سەرچاوەکانمان کەمە بەڵام ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ساڵی (١٧٨٢) ئەم قوتابخانەیە ناوی هەبووە.

* قوتابخانەی (مۆرتکە):-
سەرچاوەکان ئاماژە دەکەن بە بوونی ئەم قوتابخانەیە، بەڵام بەڵگەمان بە دەستەوە نییە دەربارەی خوێندنو ئەو مامۆستایانی کە لەم قوتابخانەیە کاریان کردووە.

* قوتابخانەی (شا غازی):-
ئەم قوتابخانەیە لەناو مزگەوتی (ئۆڵو جامیع)دا بووەو لەلایەن (شا غازی بابان)ەوە بنیات نراوە، کە (شا غازی کوڕی ئەحمەد پاشای کوڕی سەلیم پاشای بابان) بووە.

* مزگەوتو قوتابخانەی (سلێمانییە):-
ئەم قوتابخانەیە لەناوی مزگەوت (سلێمانییە)دا بووە، لە دەسنووسێکدا ئاماژە بەوە دەکات بە (ڕۆژبەیانی) لە مزگەوتی (سلێمانییە) مامۆستا بووە، هەروەها ئاماژە بە ناوی هەر یەکە لە (عەبدولرەحمان ئەفەندی ڕۆژبەیانی) و (ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی نورەددین) دەکات. زیاتر زاناو پیاوە ئایینییە ڕۆژبەیانییەکان دەوریان هەبووە لەم مزگەوتەو خزمەتی ئایینییان کردووە.

* مزگەوتو قوتابخانەی (زیندان):-
هەر یەکە لە (محەمەد حەسەن ڕۆژبەیانی)و (ئەحمەد حەسەن ڕۆژبەیانی) ئیمام بوونە لەم قوتابخانەیە.

* قوتابخانەی (مەیدان):-
ئەم قوتابخانەیە لەناو مزگەوتی (حەسەن پاکین) لە ساڵی (١٧٠١)ی زایینی دامەزراوە، (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم قوتابخانەیە دووەم قوتابخانەی زانستی ئایینیە لە کەرکوك لەناو مزگەوتی (مەیدان)داو بنەماڵەی (فەرهاد زادە) دروستیان کردووە، (مەلا عەبدولرەحمان ڕۆژبەیانی) لەم قوتابخانەیەدا مامۆستا بووەو پاش ئەوەی کە قوتابخانەکە نۆژەن دەکرێتەوە بە ناوی قوتابخانەی (مەحمودی خاڵ) بەناوبانگ دەبێتو هەر یەکە لە (محەمەد فەیزی زەهاوی)و (مەلا عەلی حیکمەت سیامەنسووری)و (مەلا محەمەدی مەزناوی) لەوێ مامۆستا بوون.

* قوتابخانەی (حاجی سلێمان ئاغا):-
ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (حاجی سلێمان ئاغا) لە گەڕەکی (حەمام) لە ساڵی (١٩٠٣) دروستکراوە، (مەلا محەمەد ئەفەندی) مامۆستا بووە لەم قوتابخانەیە، بەڵام لەلایەن هەمان کەسەوە لە گەڕەکی (چای) هەمان قوتابخانە دامەزراوە کە مامۆستاکەی (عەبدولرەحمان ئەفەندی) بوو.

* قوتابخانەی (نائیب):-
لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لەناو مزگەوتی نائیب قوتابخانەیەکی تێدا بووە بە ناوی (نائیب) مامۆستاکەی (مەحمود ئەفەندی) بووە، کە لەوانەیە هەر (مەلا مەحمودی مەزناوی) بووبێت.

* قوتابخانەی (سەرای):-
ئەم قوتابخانەیە لەلایەن والی کەرکوکەوە لە ساڵی (١٦٤٠) ی زایینیی دامەزراوە، هەروەها لە تەك ئەم قوتابخانەیە مزگەوتێکیش بنیات نراوە.

* قوتابخانەی (شاترلو):-
ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (عەبدولغەنی ئەفەندی)یەوە دامەزراوە کە مامۆستاکەی (زەینەل ئەفەندی) بووە.

* قوتابخانەی (قوتب زادە):-
ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (محەمەد ئەفەندی قوتب زادە)وە لە گەڕەکی (بولاق) دامەزراوە.

* قوتابخانەی (حاجی عەبدی):-
ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (حاجی عەبد)ییەوە لە گەڕەکی (ساری کەهییە)وە دامەزراوە.

*** قوتابخانەی (مەعروف ئەفەندی):-**
ئەم قوتابخانەیە دامەزراوە لە گەڕەکی (قۆرییە)، لە ساڵی (١٩٠٣)ی زاینییەوە ناوی هەیەو مامۆستاکەی (ئەحمەد ئەفەندی) بووە.

*** قوتابخانەی (عەبدولقادر):-**
ئەم قوتابخانەیە لە گەڕەکی (چای) دامەزراوە کە مامۆستاکەی (نەجیب ئەفەندی) بووە.

*** قوتابخانەو مزگەوتی (سۆرانی):-**
ئەم قوتابخانەیە بەرامبەر بە خانەقای (سەیید ئەحمەد) بوو، کە لەلایەن یەکێکە لە میرەکانی سۆران بنیات نراوە، لە سەردەمی موتەسەریفی کەرکوك (ئەحمەد پاشای ئەیوبی زادە) لە ساڵی (١٧١٥) قوتابخانەی (ئەیوبی ئەحمەد پاشا)ی دامەزراندووە، بەڵام هەر ناوەکەی بە قوتابخانەی (سۆرانی) ناودەبرا، مامۆستاکەی ناوی (عەلی ئەفەندی) بوو لە بنەماڵەی میرانی سۆران بوو.
(مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) دەڵێت: "لە شەقامی ڕێی هەولێر، بە دەستی راستدا، مەدرەسەی (سۆرانی - سەهرانی) هەبوو، مامۆستاکەی گەنجێکی (عەلی ئەفەندی) ناو لە بنەماڵەی میری سۆران بوو، مەدرەسەکەش چەند هەزار مەتر بوو پاشان کرا بە مەیتەمی ئیسلامی و خانووی ئەشغال بەرامبەر بە خانەقا بوو".

*** قوتابخانەی (قۆرییە):-**
ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی (١٩٠٣)دا هەبوو لە گەڕەکی (قۆرییە)، مامۆستاکەی (محەمەد ئەفەندی) بووە.

*** قوتابخانەی (مەلا عەبدوڵڵای خدری):-**
لە گەڕەکی (قۆرییە)ی کەرکوك بووەو هەر بە ناوی ئەوەوە بە ناوبانگ بووە، کە ئەکاتە کوڕی (مەلا سلێمان).

*** قوتابخانەی (تۆقات):**
ئەم قوتابخانەیە لە ناو مزگەوتی (مەلا ڕەمزای واعین) بووەو لە ساڵی (١٨٨٢)ی زاینیی بنیاتی مزگەوت و قوتابخانەی (تۆقات) کراوەو لە دواییدا نۆژە کراوەتەوە.

*** قوتابخانەی (یارمجە):**
- ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (مەلا محەمەد جەریسی)یەوە بنیات نراوە لە گوندی (یارمجە).


*** سەرچاوەکان:**
- (هوية كركوك الثقافية والادارية)، محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧.
- (شاری کەرکووك - بەشێك لە مێژووی مزگەوت، تەکییە، خانەقا، زاناو پیاوە ئایینییە ناودارەکانی)، گۆران فەتحی، سلێمانی، ٢٠١٢.
- (كركوك وهويتها القومية والثقافية)، وەرگێڕان لە تورکییەوە حەبیب هورمزی، ئەستەمبوڵ، ٢٠٠٨.
- (المدارس الدينية في كركوك في القرنين الثامن والتاسع عشر وما بعدها)، بورهان عەبدولڕەحمان جاف، گۆڤاری (کەرکوك).
- (بهجة الناظرين في اخبار العلماء والصالحين، تراجم نخبة مباركة من علماء وصلحاء مدينة كركوك ١٧٠٠-٢٠١٠)، ساڵح حەسەن ئەلڕەیاشی، ٢٠١٠.

### * مزگەوتەکانی کەرکوک

*** مزگەوتی گەورە (ئۆلو جامیع):**
ئەم مزگەوتە لە بنەڕەتدا بە کلێسەی (مەریەم ئانا) ناوبراوە، هەر لە سەرەتای دروستکردنییەوە بە شێوازێکی بیناکاری گەورەو فراوان دروستکراوەو لە سەردەمەکانی لەوەودوادا مزگەوتی لەسەر دروستکراوە، ئەویش لەوەدا بەدەردەکەوێت کە تاوەکو ئێستاکە ژووری بچووک و ژێرزەمینەکە ماوە کە بە پلیکانە دەچیتە خوارەوەو لە هەندێک شوێندا ئەیقۆناتی مەرییەمانەی تێدا ماوە، بۆیە لە هەندێک سەردەمدا بە مزگەوتی مەرییەمانەش بە ناوبانگ بووە.
مێژووی بنیاتنانی ئەم مزگەوتە بە تەواوەتی نازانرێت، بەڵام هەموو سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوەی دەکەن لە سەدەی شانزەهەمدا ئاوەدان بووەو قوتابخانەیەکی ئایینیشی تێدا هەبووە.
مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی دەربارەی ئەم مزگەوتە دەڵێت: "بابای خانەدانی پێنجەم کە لە فەقێ ئەحمەدەوە دەست پێ دەکات، هەندێ لە ئەمیرەکانیان خزمەتی زۆری لە کەرکوک کردووە، یەکەمین قوتابخانەی ئایینی لە کەرکوک قوتابخانەی (شا غازی بابان) بووە کە لە قەڵادا لەناو مزگەوتی (ئۆلو جامیع) بوو، ئەوان دروستیان کردووە".
هەروەها لەناو ئەم مزگەوتەدا قوتابخانەیەکی گەورەی تێدا هەبووە کە جۆرەها کتێبی جۆر بە جۆری دەگمەنی تێدا بووە کە بابانەکان خزمەتی زۆری ئەم کتێبخانەیان کردووە.

*** مزگەوت و مەرقەدی (دانیال پێغەمبەر):**
ئەم مزگەوتە لەسەر قەڵای کەرکوکە لە گەڕەکی (حەمام)، مێژوویەکی زۆر کۆن و دوورودرێژی هەیە بەپێی سەرچاوەکان مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هاتنی جولەکەکان بۆ کەرکوک لەسەر قەڵا، بەڵام لە دوای هاتنی ئایینی ئیسلام کراوە بە مزگەوت و تێکەڵ بە کەلەپووری ئیسلام بووە.
سێ گۆڕی هەر یەکە لە (دانیال) و (حەنین) و (عوزەیر)ی تێدایە کە تایبەتە بە ئایینی جولەکەکان لە کەرکوک، هەروەها لە چینی سەرەوەی تەوراتگەکەدا کلێسەیەکی نەستوری بنیات نراوە، بەڵام لە سەردەمانێکی لەوەو دواتردا شوێنەواری نەماوە، لە پاڵ مزگەوتەکەدا لە سەردەمانی مەغۆلەکاندا یان هەندێک سەرچاوە ئاماژە بە سەردەمی ئەتابەگییەکان دەکەن کە گوایە مێژووی منارەکەی بۆ ئەو سەردەمانە دەگەڕێتەوە، لە سەردەمی (عوسمان جەعفەر پاشا) لە ساڵی (١٦٥٥)ی زایینیی نوێ کراوەتەوە.
بەپێی سەرچاوەکان گەلێک لە زانایانی ناوچەی (عەسکەر) مامۆستاو خەتیب بوونە لەو مزگەوتە، وەکو (مەلا وەیسی عەسکەری) و (مەلا عومەری عەسکەری) و (شێخ ئاوێز عەسکەری) و (عەبدوڵڵا کوڕی بارام کوڕی عەلی) و (مەلا عەبدولرەحمان عەسکەری) و (مەلا حەسون کۆڵەمەن) و گەلێکی تر.

*** مزگەوتی (دزدار):**
دەربارەی ئەم مزگەوتە (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) دەڵێت: "کۆڵانێکی بچووک هەبوو دەڕۆی بەرەو دەرگای (تەوتەم) لە کۆڵانە تەنگەکەدا گەڕەکی (دزدار) هەبوو، مزگەوتێکی بچووکی بە ناوی (دزدار) هەبوو، لە ساڵی (١٨٧٨)ی زایینیی (مەلا عەبدولرەحمانی عەسکەری) باپیری (جەعفەر عەسکەری) لەم مزگەوتەدا ئیمام و مودەڕیس بووە،ماڵی دزدار لە بنەڕەتدا لە خێڵی (کەلهوڕی) کرماشان بوونە".

*** مزگەوتی (سلێمانییە):**
بەپێی هەندێک لە بەڵگەو سەرچاوەکان ئاماژە بەم مزگەوتە دەکەن کە گوایە لەسەر قەڵا بووەو پاشماوەی نەماوە، بەڵام ماوەیەک (مەلا عەبدولرەحمانی ڕۆژبەیانی) مامۆستا بووە لەم مزگەوتە.

*** مزگەوتی (حەسەن مەکی):**
ئەم مزگەوتە لەسەر قەڵای کەرکوک لە گەڕەکی ئاغاکان بووە، بەڵگەکان ئەوە پشت ڕاست دەکەنەوە کە گۆڕی (حەسەن مەکی) لە ناو مزگەوتەدا بووەو قوتابخانەیەکیشی تێدا بووەو لە ساڵی (١٩٩٧)دا کاتێک ڕژێمی بەعس ئەم مزگەوتەی ڕووخاندووە گۆڕی (حەسەن مەکی) لە ناو مزگەوتەکەدا گوازراوەتەوە بۆ گۆڕستانی موسەڵڵا.
ماوەیەک (مەلا سەیید یوسفی ڕۆژبەیانی) و (مەلا عەلی کوڕی شێخ مستەفا) و (مەلا ئەحمەد مەسعود شەقلاوەیی) ئیمام و خەتیب بوونە لەم مزگەوتەدا.

*** مزگەوتی (زیندان):**
لە ئێستادا شوێنی مزگەوتە دیاری نییە، بەڵام کاتێک لە دەرگای سێیەمی قەڵاوە سەردەکەوتی هەر لەو کۆڵانەدا مزگەوتێکی بچووک هەبوو ناوی (زیندان) بوو، ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو گەڕەکە زیندانی تێدا هەبووەو هەر یەکە لە (محەمەد حەسەن ڕۆژبەیانی) و (ئەحمەد حەسەن ڕۆژبەیانی) ئیمام و مودەڕیس بوونە لەم مزگەوتە.

*** مزگەوتی (سەیید محەمەد نەجیب جەباری رفاعی):**
ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٨٩٧)ی زایینیی لەسەر قەڵا دروستکراوە، ئەم مزگەوتە دەچێتەوە سەر دەرگای جووت قاوەو لە سەردەمانێکدا گەلێک زاناو مامۆستای ئایینی کوردی ناوچەی جەباری خزمەتیان بەم مزگەوتە کردووەو لە ڕووی مەزهەبی ئایینیشەوە بەشێکیان رفاعی بوونە.
بنەماڵەی (سەیید نەجیب) دروستکەری مزگەوتەکە بوونە، کە خوودی بنەماڵەی دەگەڕێنەوە سەر (سەیید محەمەد جەباری) کە سێ کوڕی هەبووە بە ناوەکانی (سەیید ئەحمەد ڕەوشەنی) و (سەیید محەمەد نەجیب جەباری) و (سەیید مەحمود عورفی)، (سەیید محەمەد نەجیب جەباری)یش هەر یەکە لە (سەیید محەمەد رافیع) و (سەیید عەبدولخالق) و (سەیید محەمەد جەواد) و (سەیید محەمەد هادی) و (سەیید محەمەد حەسیب)ی هەبووە.

* مزگەوتی ( جەدید ):
ئەم مزگەوتە پاشماوەی نەماوە، بەلام لە دەرگای سێیەمی قەلا بوو، مزگەوتێکی زۆر بچووك بووە.

* مزگەوتی ( یەعقوبی ):
ئەم مزگەوتە پاشماوەی نەماوە، بەلام لە دەرگای سێیەمی قەلا بوو، مزگەوتێکی زۆر بچووك بووە.

* مزگەوتی ( فەزولی - فەقێ عەلاف ):
ئەم مزگەوتە بەرامبەر مزگەوتی (نوعمان)ە لە خوارەوەی قەلا، بەشێکی ئەم مزگەوتە رووخاوەو پاشماوەیەکی کەمی لێ بەجێ ماوە، لەوانەیە ماوەیەك باوکی (فەزولی) ئیمامو خەتیبی ئەم مزگەوتە بووبێت، هەروەها تاوەکو ئێستاکە نازانرێت مەبەست لە فەزولی شاعیرە یان فەزولییەکی ترە.

* مزگەوتی ( عەریان ):
ئەم مزگەوتە لە سالی (١٧٤٩)ی زایینیی دروستکراوە، بەلام هەندێك سەرچاوەی تر سالی بنیاتنانەکەی دەگەرێننەوە بۆ سالی (١٧٢٩)ی زایینی، سێ گۆری تێدایە کە کۆنترینیان بە ناوی (عەلی ئەفەندی خەتیب)ە کە لە سالی (١٧٧٣) مردووەوە، گۆری دووەم بە ناوی (عەبدولجەبار مەلا مەجیدی عەریان) کە لە سالی (١٩١٧)ی زایینی مردووە، گۆری سێیەم بە ناوی (نەعیمە کچی مەلا عەبدولرەحمان) کە لە سالی (١٩٢٠)ی زایینیی مردووە.

* مزگەوتی ( مەیدان - حەسەن پاکیز ):
ئەم مزگەوتە لەسەر قەلایە لە گەرەکی مەیدان، مەلا جەمیل رۆژبەیانی دەلێت: "لە گەرەکی مەیدان مزگەوتێکی منارەداری گەورەی تێدا کرابوو، لە حەوشی مزگەوتەکەدا قوتابخانەیەکی مەلایانەی زانستی هەبوو کتێبخانەیەکی پر لە کتێبی دەسنووسی تێدا بوو کە هەزاران کتێبی بە نرخ بوو، لە سەردەمی ئینگلیزدا کابرایەك هەبوو بە ناوی (مەلا سابیری حافیز) بەشێکی زۆری ئەو کتێبانەی دزیبوو، پاشان فروشتبوونی بە بەرێوەبەرایەتی شوێنەواری بەغدا.

* مزگەوتو خانەقای ( مەلا ئەحمەدی گەورە ):
ئەم مزگەوتە لەسەر قەلا بووە بەلام هیچ پاشماوەو شوێنەوارێکی نەماوە.

* مزگەوتی ( ئیمام قاسم ):
ئەم مزگەوتە دەکەوێتە نێوان گەرەکی (ئیمام قاسم)و گەرەکی (رێـوێ)وە، هەر چەندە مێژووی بنیاتنانی ئەم مزگەوتە دیار نییە، بەلام بەپێی هەلکۆلینی سەر بەشێك لە نەخشەکانی نێو مزگەوتەکە ئاماژە بە سالانی (١٦١٤-١٦٩١-١٨٩٤)ی زایینی دەکات کە گوایە نۆژەنو ئاوەدان کراوەتەوە، بەپێی ئەم بەلگانە بێت مێژووی بنیاتنانی بۆ (٤٠٠) سالێك دەگەرێتەوە. بە پال ئەمەشدا مەرقەدێك لە نێو مزگەوتەکەدا هەیە کە گوایە هی (ئیمام قاسمی کوری موسا کازم)ە، قوتابخانەو مەدرەسەی ئایینی تێدا بووە کە بە قەسری (ئیمام قاسم) ناودار بووە، هەندێکی تر دەلێن کە گوایە کۆشکی مەلا قادری ئیمام بووە کە کەوتووەتە بەرامبەر مزگەوتەکەوە، تاوەکو ئێستاکەش بەشێکی شوێنەواری ئەو کۆشکە ماوە.
مەلا جەمیل رۆژبەیانی دەنوسێت: "مزگەوتو مەدرەسەی (ئیمام قاسم) زۆر زل بوو، لەوێ گۆرێك هەبوو هی دەورانی (قەرەقۆینلو) بوو، ئەمانە لە هەموو جێگەیەك نەزرگەی چەند سەییدێکیان دائەمەزراند بە ناوی (ئال ئەلبەیت)، لە دەورانی دەولەتی عوسمانی (مەلا قادر) کە لەلای (مەلا رەزای واعین) ئیجازەی وەرگرتبوو ئیمامو مودەرس بوو، مەدرەسەکەی کردبوو بە دیوەخانەی خۆی، کە ئینگلیز کەرکوکی داگیر کردبوو ئەم پیاوە کرابوو بە بەرێوەبەری ئەوقاف".
شوێنی مزگەوتەکەو گەرەکەکە پێشتر قەبرسان بووەو ئەو مەرقەدەی (ئیمام قاسم) لە پێش مزگەوتەکەدا هەبووە، دواتر بنەمالەی (مەلا قادر) مزگەوتەکەیان لە هەمان جێگەیان دروستکردووە، بۆیە زۆر رێی پێدەچێت پاشماوەی ئەو مەرقەدەش لەو گۆرستانە دابرابێتو مابێتەوە، لەوانەیە ناوی (ئیمام قاسم) ناوێك بووبێت کە هیچ پەیوەندی بە (قاسمی کوری ئیمام موسای کازم)ەوە نەبێت بەلام شیعەکان لە سەردەمانێکی تردا کردبێتیان بە ئارامگە یان شوێنێك بۆ (قاسمی کوری موسا کازم).
هەروەها لە پشتی مزگەوتەکەش قەبری (تۆپال پاشا)ی لێیە کە فەرماندەیەکی عوسمانی بووەو لە شەری دەشتی لەیلان لەگەل فارسەکاندا کوژراوەو لە سالی (١٧٣٣)ی زایینیی هێناویانەتە گۆرستانی (ئیمام قاسم)و ناشتوویانە، چونکە دکتۆری فەرەنسی (ج. نیکلۆدیم) لە کەرکوك بووە بۆ چارەسەرکردنی (تۆپال پاشا) بۆیە رێی تێدەچێت ماوەیەك بە برینداری چارەسەر کراوەو لە دواییدا مردووە، بەلام خەلکی بە مەرقەدی (ئیمام عەباس) ناوی دەبەن کە هیچ پەیوەندی بەوەوە نییە.
سالی (١٦٩١) لەلایەن (حاجی حوسێن رەوشەن ئەفەندی) یەوە کە یەکێك بووە لە پیاوە ناودارەکانی کەرکوك ئاوەدانو نۆژەن کراوەتەوە، لە سالی (١٩٠٠)ی زایینییدا (باب ئەلعالی) ١٥,٨٠٠ قرشی بۆ نوێکردنەوەی مەرقەدی (ئیمام قاسم) تەرخان کردووەو لە سالی (١٩٠٣)دا مەدرەسەیەکی ئایینی لە نێو مزگەوتەی (ئیمام قاسم) هەبوو، شێخ (محەمەد ئەفەندی) مامۆستا بووە لە نێو ئەو مەدرەسەیەدا کە لەلایەن (سولتان عەبدولحەمیدی دووەم)ەوە دامەزراوە.
هەر یەکە لە (مەلا قادری ئیمام)و (مەلا جەمالی کوری مەلا قادر)و (مەلا عومەر گونبەدی)و (مەلا حەمەدەمین)و (حاجی مەلا سالح)و (مەلا نەوزاد) ئیمامو خەتیبی ئەم مزگەوتە بوونە.

* مزگەوتی ( دلی باش ):
ئەم مزگەوتە دەکەوێتە کۆلانێکی باریکی گەرەکی (رێوێ) وە بە پشتی بازاری عاشوردا، بەپێی ئەو سەرچاوانەی

لەسەر مزگەوتەکە نووسراوە لە ساڵی (١٦٣٣) دروستکراوە کە (شێخ مەلا مەحمودی جامی) بنیاتیناوە، دوای ئەویش (شێخ عەبدولرەحمان) کە بە (شێخ کەپەنگ) بە ناوبانگ بووە بەڕێوی بردووە، لە دوای ئەویش هەر یەکە لە (مەلا شێخ ئەمین)و (مەلا عەلی)و (مەلا رەفیق)و (مەلا عەبدوللا) ئیمام‌و خەتیبی مزگەوتەکە بوونە.

ئەم مزگەوتەکە لە کۆندا بە قوڕ دروستکراوە، رووبەرەکەی تەنیا (٥×١٠) مەتر بووە، دواتر حەرەمی مزگەوتەکە گەورە کراوەتەوە بۆ ئەوەی جێگەی نوێژکەرانی زیاتر بگرێتەوەو کراوە بە (٥×١٥) مەتر، مزگەوتەکە بیرێکی کۆنی تێدا هەبووە کە تاوەکو ئێستاکە ماوە، ماوەیەك مزگەوتەکە بە ناوی (مزگەوتی مەلا ئەمینە گردە)، ماوەیەکیش بە ناوی (مزگەوتی مەلا رەفیق)و (مزگەوتی شابەندەر)و (مزگەوتی سەر جۆگە) بە ناوبانگ بووە، هەروەها رێی پێدەچێت لەبەر بچووکی مزگەوتەکە شوێنی تەسەوف‌و تەریقەتێکی ئایینی بووبێت.

*** مزگەوتی (مەجیدییە)و تەکیەی (تاڵەبانی):**

ئەم مزگەوتە کەوتووە سەر رێگای (کەرکوك-سلێمانی) لەسەر گردێکی بەرز کە بەسەر بەشێکی سەروو خوارووی کەرکوکدا دەڕوانێت، نزیکەی (٣٠٠) ساڵێك دەبێت بنیات نراوە، ناونانی مزگەوتی (مەجیدییە) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (سوڵتان عەبدولمەجیدی دووەم) کە لە سەردەمی ئەودا فەرمانی فراوانکردنی داوەو گەورە کراوەتەوە.

تەکیەی (تاڵەبانی) لە کەرکوك سەرچاوەی هەموو تەکیەکانی تاڵەبانییە لە هەموو پارچەکانی کوردستان‌و بەشی زۆری وڵاتانی ئیسلامی، بە تایبەتی لە ناوچەکانی (جوانرۆ، هەورامان، زەهاو، سنە، مەریوان، سەردەشت، موکریان، بەغدا).

تەکیەی (تاڵەبانی) لە ساڵی (١٧٠٦)ی زایینیی لەلایەن (مەلا مەحمودی زەنگەنە)وە لە باپیرە گەورەی شێخانی تاڵەبانییە بنیات نراوە، دواتر لەلایەن شێخ عەبدولرەحمانی کوری گەورەی شێخ ئەحمەد)ەوە فراوان کراوەتەوە، تەکیەی (تاڵەبانی) مەڵبەندێکی گەورە بوو بۆ زیکرو خواپەرستی‌و مەڵبەندێکی رۆشنبیری‌و فیکری بووەو جێگەی رەسەنی مەقامەکانی کەرکوك بووە، چەندین مەقامزانی گەورەی تێدا هەڵکەوتووەو لە تەکیەدا فێری مەقام بوون.

*** مزگەوت‌و تەکیەی (شێخ محێدین):**

ئەم مزگەوتە دەکەوێتە نێو قەبرسانی (شێخ محێدین)ەوە لە گەرەکی کۆماری، کە لە ساڵی (١٧٦٩)ی زایینیی بنیات نراوە، ناوی مزگەوتەکەش بە ناوی (شێخ محێدین کەرکوکی کوری شێخ حەسەنی گڵەزەردە)یە، بۆیە ئەم مزگەوتە بە مزگەوت‌و تەکیەی (شێخ محێدین بەرزنجی) بە ناوبانگە.

*** مزگەوت‌و خانەقای (مەلا عومەری گونبەدی):**

ئەم مزگەوتە دەکەوێتە سوچێکی گەرەکی (زێوێ) بە لای خاسەی کەرکوکدا، لە سێڕیانی (خاسەو گەرەکی زێوێ‌و گەرەکی ئیمام قاسم). لەلایەن بنەماڵەی (عومەر گونبەدی) یەوە بنیات نراوە. هەر یەکە لە (مەلا نورەددین)و (مەلا ئەبو بەکر)ی کوری بنیاتنەری مزگەوتەکەن، ناونانی مزگەوتەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە بنەڕەتدا خەڵکی دێی (عومەر گونبەد) بوون. کە دەکەوێتە نێوان شارۆچکەی (تەق تەق)و (کۆیە)وەو نزیکەی یانزە پشتیان هاتوونەتە کەرکوك.

*** مزگەوتی (مەلا ئەحمەد گردە):**

ئەم مزگەوتە دەکەوێتە گەرەکی (زێوێ)وەو زۆر کۆنەو مێژووکەی دەگەڕێتەوە ساڵی (١٦٨٢)ی زایینیی، بنەماڵەی (مەلا ئەحمەد گردە) ئیمام‌و خەتیبی ئەم مزگەوتە بوون، لەناو مزگەوتەکەدا گۆڕێکی کۆن هەبوو کە تاکو ئێستاکە ساغ نەبووتەوە کێیە، بەڵام خەڵکی گەرەکەکە ئەوە دەڵێن کە گوایە کابرایەکی نەناس لەناو مزگەوتەکە دەژیا بە ناوی (مەحمود هیندی) خەڵکی وڵاتی هێندستان بوو مشکییەکی گەورەی سەوزی بەسەرەوە بوو، دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩١٢)دا کۆچی دوایی کرد لەناو مزگەوتە نێژراوە، بۆیە رێی تێدەچێت کە هەمان گۆڕی ئەو پیاوە بێت.

*** مزگەوت‌و خانەقای (شێخ جەواد شێخ خدر نەقشبەندی):**

لە ساڵی (١٨٦٥)ی زایینیی بنیات نراوە، لە نزیك مزگەوتی (ئیمام قاسم)ەوەیەو ماوەیەك بە مزگەوتی (مەلا تاها) بەناوبانگ بووە، لە بنەڕەتدا ئەمانە لە شێخانی عەودالان بوون.

*** مزگەوتی (رەنجووری - رەحمان):**

ئەم مزگەوتە دەکەوێتە کۆڵانی (یادگار) بە تەنیشت بازاری عاشوورەوە، لە سەرەتادا بە مزگەوتی (رەنجووری) بەناوبانگ بوو لەبەر ئەوەی (رەنجووری) شاعیر ماوەیەك زۆر ئیمام‌و مودەریسی ئەم مزگەوتە بووە، بەڵام لە دواییدا (مەلا جەبار)و (حاجی تۆفیق) تازەیان کردووەوتەوە ناسراوە بە مزگەوتی (مەلا جەبار)، لە ساڵانی نەوتەکاندا بە تەواوەتی رووخێراوە ناو نراوە مزگەوتی (رەحمان).

*** مزگەوت‌و تەکیەی (ترێ خۆر):**

ئەم مزگەوتە لە ناو کوڵبەیەکی بچووکدا بوو خاوەن ماڵەکەی خەڵکی (سورداش) بوون، لە دەورانی ئینگلیزدا (مەلا سەلام)و (مەلا حەمید)یان هەبوو، کە ماوەیەکیش ماڵی (مەلا سەلامی ترێ خۆ) بوو کە یەکێ بوو لە موریدەکانی کۆمەڵی (حەقە) لە کەرکوك، شوێنی مزگەوتەکەش لە تەنیشت مەرقەدی (ئیمام عەباس) لە پشت مزگەوتی (ئیمام قاسم) لە پشت ئامادەیی پیشەسازی کورانی ئێستادا بوو.

*** مزگەوت‌و تەکیەی (سەیید نورەددین رفاعی):**

بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە دەماودەم باسی دەکەن لە سەرەتادا لە نێو گۆڕستانەکەی تەنیشت قوتابخانەی (ئیمام قاسم)ی سەرەتایی نیشتەجێ بوونە لە دواییدا بەشێکی زۆری زەوی ئەو ناوچەییان کڕیوەو بەشێکیان دابڕیوە بۆ

مزگەوت و تەکیٚ، کە خۆی لە بنەڕەتدا کەسێکی عەرەب بووە لە ناوچەی حەویجەوە هاتوون و لە بازاڕی (عاشوور) نیشتەجیٚ بوونەو ڕەشماڵنشین بوونە.
لە ساڵی (١٩٤٠)دا ئەم مزگەوت و تەکێیە بنیات نراوە، ئێستا (سەیید سەدرەددین کوڕی سەیید نورەددین کوڕی سەیید محەمەد سالح کوڕی سەیید عەباسی گەنجی) بەڕێوەی دەبات.

*** مزگەوتی (نائیب):**

ئەم مزگەوتە دەکەوێتە گەرەکی (ئاخوڕ حوسێن)ەوە لە سەرەتای بازاڕی حەسیرەکە لە دووریانی بازاڕی جووت قاوە، بەپێی نووسینی سەر دەرگاکەی لە ساڵی (١٧٣١)ی بنیات نراوە، بنەڕەتی ناوی دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی (نائیب) کە ناوبانگیان هەبوو لە سەردەمە جیاجیاکان.
سەبارەت بە (ئەسعەد نائیب)ی بنیاتنەری مزگەوتەکە کە ناوی (محەمەد ئەسعەد کوڕی حاجی محەمەد ئەفەندی کوڕی نائیب)ەو ئەدیبێکی باڵا بوو لە عەرەبی و تورکی و فارسیدا، (حاجی ئەفەندی) یەکێك بووە لە مودەرسە ئاینییەکان و دواتر لە دەفتەری والی بووە بە (کوتخدا) کە پۆستێکی پایە بەرز بوو لە پێکهاتەی دەوڵەتی عوسمانیدا، (ئەسعەد نائیب) کوڕی (عەلی ئەفەندی نائیب) بووەو لە ساڵی (١٧٨٥) لە کەرکوك لەدایکبووە، بۆیە زۆر ڕێی تێدەچێت کە لە سەرەتادا لە پێش (نائیب)ەکانەوە یەکێك لە خەڵکی گەرەکەکە ئەم مزگەوتەی بنیات نابێت و لە دواییدا لەلایەن (نائیب)ەکانەوە بایەخی پێ دراوەو ئاوەدان کراوەتەوە، یان یەکێك بووە لە نەوەی (نائیب)ەکان، چونکە هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە (نائیب)ەکان دەگەڕێنەوە سەر هۆزی (میکایلی جاف) لە دێی گەراو، هەندێك لە خێزانەکانیان لە (حیلە)و (بەغدا) نیشتەجیٚ بوونەوە.
(مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) لە بارەی ئەم مزگەوتەوە دەنوسێت: "مزگەوتی گەورەی نائیب هەبوو، باپیرە گەورەی (نائیب) ەکان یەکەم کەس بوون لێرە مودەریس و ئیمام و خەتیب بوون، ناوی ئەوانی پێوەی نووسابوو، (سەعید ئەفەندی نائیب) مەلاو شێخی تەکێی (دەدە حەمدی) بوو، خانوو دیوەخانەکەی جێی مەلاو شاعیرو ئەدەب دۆستان بوو بە تەك دەرگای مزگەوتەکەوە بوو، لە سەردەمی عوسمانییەکاندا مودەریس و ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (نائیب)، (مەلا مەحمودی مەزناوی) بوو، ماڵی (نائیب)ەکانیش لە بنەڕەتدا شوان بوون، خۆیان کردبوو بە خزمی نائیبەکانی بەغدا".
لە سەردەمی عوسمانییەکاندا مزگەوتەکە مەدرەسەییەکی تێدا هەبوو بە ناوی (مەدرەسەی نائیب) مامۆستاکەی (مەحمود ئەفەندی) بوو کە دەکاتە (مەلا مەحمودی مەزناوی).

*** مزگەوت و تەکێی (شێخ عەبدولکەریمی قەرەچێوار):**

ئەم مزگەوتە دەکەوێتە گەرەکی (ئاخوڕ حوسێن)، لەسەر دەرگاکەی نووسراوە: (مزگەوت و تەکێی شێخ عەبدولکەریمی قوتب و شێخ حەسەنی قەرەچێوارو شێخ عەبدولکەریمی دووەم).
مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی دەڵێت: ".. ماڵی حەسەن ئەفەندی ڕۆژبەیانی هەبوو کە خەلیفەیەکی نەقشبەندی بوو، کوڕەکانی خانووەکەیان فرۆشت بە دەروێشەکانی شێخ حەسەنی قەرەچێوارو کرا بە تەکێ و مزگەوتی شێخ حەسەن، کە مەلایەکی باش بوو ئیجازەی لەلای مەلا عەلی حیکمەت وەرگرتبوو".

*** مزگەوتی (سەیید غەنی):**

دەکەوێتە نێو بازاڕی (حەسیرەکە)و گەرەکی (ئاخوڕ حوسێن)، لە ساڵ (١٩٧٩)ەوە داخراوەو دوو ماڵی تێدایە، ئەم مزگەوتە گومەزو منارەی تێدا نییە.
بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە لەلایەن خەڵکەکەوە باس دەکرێت هەر لە ساڵی (١٩٤٥)ەوە ئاوەدان بوو، ماوەیەکی زۆر لەوەو پێشتر هەبووە، مزگەوتەکە کۆمەڵێك قەبری تێدایە، لە کۆنەدا مەدرەسەیەکی بە ناوی (مەدرەسەی سەیید غەنی) تێدا هەبوو، کە (سەیید محێدین کوڕی عەبدولڕەحمان جەباری) دەرسی تێدا وتووەتەوە لە سەردەمی عوسمانییەکان، بنیاتنەرەکەی (سەیید غەنی ئەفەندی نەقیب زادە)یە.
(مەکتوبی زادە) لە نێو ئەو مزگەوتەدا نێژراوە کە (مەلا عەبدولغەنی ئەفەندی) باوکی لە گەرەکی (ئاخوڕ حوسێن) لە کەرکوك دروستی کردبوو، هەروەها بەپێی ئەو دەسنووسانەی کە لە (دار المخطوطات) لە بەغدا دۆزراوەتەوە ئاماژە بە ناوی (قازی عەبدولغەنی)یەوە دەکەن کە لەوانەیە ناوی مزگەوتەکەش (قازی عەبدولغەنی) بووبێت و لە دواییدا ناوی (سەیید غەنی) وەرگرتبێت.

*** مزگەوتی (خادم سوجادە):**

ئەم مزگەوتە لەلایەن بنەماڵەی (خادم سوجادە)ەوە بنیات نراوە، دەکەوێتە گەرەکی (بڵاغ) لە پشت قوتابخانەی (نەجاح – شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، لە تەنیشت گەراجی سلێمانی ئێستا، لە ساڵی (١٨٧٩)ی زاینییەوە ناوی لە سەرچاوەکاندا هاتووە، بەڵام بە شێوەیەکی دروست نازانرێت لە چ ساڵێك دروستکراوە، ئەم مزگەوتە لە سەردەمی بەعسدا بەشێکی زۆر لە دەسنووس و کتێبەکانی بەتاڵان برا بۆ بەغدا.
مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی دەڵێت: "لای باشووری تەکێی (تاڵەبانی)، لە گەرەکی (بڵاغ) کانی هەبوو، بارەگای (سوجادە) ش هەبوو، بنەماڵەی (سوجادە) لە بنەڕەتدا خەڵکی (کۆیە) بوون هاتبوونە کەرکوك، سوڵتان (عەبدولحەمید) ئەم بارەگایەی بۆ دروستکردبوون، (حاجی شێخ ئەمینی خادم سوجادە)و (ڕەفیق ئەفەندی کوڕی) مەلاو شاعیر بوون، (شێخ ڕەزا) جارجارە هەجووی دەکردن، گوایە سوڵتانێکی عوسمانی بەرماڵێکی دابوونێ کە گوایە لە گەنجینەی مەمالیکی میسرەوە کەوتبووە لای (سوڵتان سەلیم).

*** مزگەوت و تەکێی (بڵاغ – ئیمام حەمزە):**

مزگەوتێکی کۆنەو ڕێی پێدەچێت کە (حەمزە ئەفەندی) ناوێك لەو مزگەوتە ئیمام و خەتیب و مامۆستا بووە، بەپێی دەسنووسێك کە لە ساڵی (١٧٢٣)ی زاینییدایە ئاماژە

بە بوونی ئەم مزگەوتە دەکات لە کەرکوك، بەڵام لەسەر دەرگاکەی ساڵی (١٨٢٤) وەك ساڵی بنیاتنانی نووسراوە.
(سەباح بازرگان) دەسنووسێت: ".. ماڵی (مەلا سەعید) لە ساڵی (١٩٦٣)ی زاینییدا هاتوونەتە ئەو گەڕەکەو تەکێیەکیان دروستکردووە لەناو مزگەوتی (بلاغ) کە پێشتر بە (ئیمام حەمزە) ناودەبرا، دواتر بە ناوی مزگەوتو تەکێی (سەیید یاسین) ناسراوە، وا پێدەچێت باپیری (مەلا سەیید عەبدوڵلا) کە ناوی (سەیید جەعفەر)ە مەلای دێی شۆراو بووبێت، لە دوای خۆی (مەلا یاسین)ی کوڕی لە جێگەی بووە".

*** مزگەوتی (شێخ جگری - شێخ جیری -شاڵچی):**
دەکەوێتە نێو گەڕەکی (بلاخ)ەوە، ئەم مزگەوتە بە ناوی (سەیید هیدایەت شاڵچی)یەوە بەناوبانگە لە گەڕەکەکەش کۆمەڵێك ماڵی شاڵچی لێیە، ئەم مزگەوتە سەرەتا مەلایەکی کورد دروستی کردووە کە لە ناوچەی (شێخ جیری)یەوە هاتووە لە (قەرە حەسەن)و لەم گەڕەکەکەدا نیشتەجێ بووەو مزگەوتەکە بەناویەوە ناو نراوە.
(مەلا جەمیل رۆژبەیانی) دەڵێت: "لە گەڕەکی (پاڵ گڵچی) کە لەسەر (بلاخ) بوو مزگەوتی (شێخ جگری) هەبوو ئێنجا تەکێی (مەولەوی)".

*** مزگەوتی (محەمەد غەوس):**
لەنێوان بازاڕی حەلواچییەکانو بازاڕی جووت قاوەدایە، مزگەوتو مەدرەسەکەی لە ساڵی (١٧٨٠)ی زاینیی بنیات نراوە، مزگەوتەکە بە مزگەوتی (حەلواچی)و (سەی غەوس) ناو دەبرێت، (قازییە کوێرە) سەرکاری بوو کە ناوی (عەبدولقادر) بوو هەر ئەوە خۆی مزگەوتە قوڵەکەو مەدرەسەکەی بۆ خۆی دروستکردبوو.
(مەلا جەمیل) دەربارەی ئەم مزگەوتە رووداوێك دەگێڕێتەوە سەبارەت بەم (عەبدولقادر)ەی خاوەنی مزگەوتەکە: "(محەمەد ئەفەندی رۆژبەیانی کوری مەلا عەبدولرەحمان)، گوایە لە بەغداوە گەڕابووەوە بۆ کەرکوك لەوێ لەو مزگەوتە ئیمامو خەتیب بووە، سەر بە قازییە کوێرە بووە، کە ویستبووی بچێتە ئیمتیحانەوە دژی (محەمەد ئەفەندی نائیب) بۆ مامۆستایەتی لە مەدرەسەی (سۆرانی-صهرانی)، (محەمەد ئەفەندی) پیاوی ناردبوو لەناوی خاسە شەو کوشتبوویان. ئەم (قازی عەبدولقادر)ەش لە دادگا پشتیوانی کردبوو لە باتی خوێنی رۆژبەیانی، نائیب ئیعدام کرابوو، لە دەورانی ئینگلیزدا مەلا رەئوف تورشیچی ئیمامو خەتیبو مودەریسی ئەم مزگەوتە بوو".

*** مزگەوتی (مەلا مەردان):**
ئەم مزگەوتە دەکەوێتە گەڕەکی (بلاغ) لە کۆڵانێکی باریکدایە، ئەو ناوەی کە مزگەوتەکەی بە ناوەوە ناو نراوە باوکی (مەلا مەجیدی قوتب)ە.

*** مزگەوتی (ئەحمەد ئاغا):**
ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٨٠٨)ی زاینیی بنیات نراوە، دەکەوێتە تەنیشت (ناوەندی ئیمام قاسمی کوڕان) لە گەڕەکی (بلاغ). کابرایەکی پڕدەریی بازرگانی تووتنو خوری دروستی کردبوو. یەکەم مامۆستای (مەلا عەلی حیکمەت) بوو. ماوەیەکیش (مەلا ئەحمەدی جەباری) ئیمامو خەتیبی ئەم مزگەوتە بووە. بۆ ماوەیەکیش (مەلا عەبدولرەحمانی کوری عەلی حیکمەت سیامەنسووری) وەك ئیمامو خەتیبی مزگەوتەکە بووە.

*** مزگەوتی (خانەقای نەقشبەندی):**
بەرامبەر بە مزگەوتی (ئەحمەد ئاغا)یە لە گەڕەکی (بلاغ) لە ساڵی (١٨٨٨)ی زاینیی دروستکراوە، کە ئێستا ماڵی باوکی (ئەسیری) شاعیرە.

*** مزگەوتی (منارە نەخشینە - فەرهاد):**
لە ساڵی (١٨١٨)ی زاینیی دروستکراوە، ماوەیەکیش بە ناوی (مزگەوتی فەرهاد) بە ناوبانگ بووە، ئەم مزگەوتە دەکەوێتە کۆڵانی تەنیشت بازاڕی (قەیسەری گەورە)و بازاڕی (جووت قاوە).
(مەلا جەمیل رۆژبەیانی) دەنووسێت: "لەنێوان گەڕەکی (گڵچی)و (بلاغ)دا چەند باخچەیەکی زۆر گەورەی هەبوو کە گوایە هەموو هی ماڵی (فەرهاد) بوو کردبوویانە وەقفی مزگەوتی (منارە نەخشینە)و مزگەوتی (مەدرەسەی مەیدان)، ماوەیەك (مەلا ئەحمەد رۆژبەیانی) کراوە بە ئیمامو خوتبە خوێنی مزگەوتەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆمەتی یارمەتی (شێخ مەحمود)ی داوە لە مزگەوتەکە دەرکراوە".
ناوهێنانی مزگەوتەکە لە کۆندا بە (فەرهاد) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بنەماڵەی (فەرهاد) کە بنەماڵەیەکی دێرینی کوردن ئەم مزگەوتەیان بنیات ناوە، لە بنەڕەتدا خۆیان خەڵکی (عەودالان)ن.

*** مزگەوتی (پیریادی - مەلا سەیید عەزیز پیریادی):**
مزگەوتەکە دەکەوێتە گەڕەکی (پیریادی) خانمێ دروستی کردبوو، مودەرسو ئیمامو خەتیبی (مەلا رەزای واعین) بوو، پێدەچێت ئەم مزگەوتە هەمان مزگەوتی (مەلا سەیید عەزیز پیریادی) بێت کە لە کۆندا هەبووەو شوێنەواری نەماوە کە خەڵکی چەمچەماڵ بووە.
دکتۆر (زەنون پیریادی) دەڵێت: "(مەلا سەیید عەزین)ی باپیرم لە دێی پیریادییەوە کۆچی کردووە بۆ کەرکوك لە گەڕەکی (پیریادی) نیشتەجێ بووە، هەر لەوێ ژنی هێناوە، دوای هاتنی خەڵکی کۆڵانەکە لە ناوەراستی کۆڵانەکەدا مزگەوتێکیان بە ناوی مزگەوتی (مەلا سەیید عەزیز پیریادی) یەوە بنیات ناوە، ئەم مزگەوتە تا ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستیش مابوو".

*** مزگەوتی (مەلا ڕەزای واعیز - تۆقات):**
دەکەوێتە گەڕەکی (پیریادی)یەوە، لەسەرەتادا ناوی مزگەوتی (تۆقات) بوو بەڵام لە دواییدا بە ناوی مزگەوتی (مەلا ڕەزای واعیز) بەناوبانگ بووە، ناونانی مزگەوتەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەر یەکە لە (مەلا ڕەزای واعیز)و (نورەددین ڕەزای واعیز) ئیمامو خەتیبی مزگەوتەکە بوونە.

*** مزگەوتی (شێخ نوری - سەیید نوری):**
دەکەوێتە گەڕەکی (پیریادی)یەوە، خوودی (شێخ نوری) کە مزگەوتەکەی بەناوەوە ناو نراوە خەڵکی ناوچەی (دۆڵپەموو) بووە.

*** مزگەوتی (حاجی خدر):**
لە ساڵی (١٨٥٩)ی زایینیی لە گەڕەکی (پیریادی) لەلایەن حاجی (پیریادی) دروستکراوە.

*** مزگەوتی (مەلا عابد):**
ئەم مزگەوتە لەلایەن (حاجی عابد عەبدوڵڵا)وە دروستکراوە، لە ڕاستیدا (مەلا عابد) جولەکە بووەوە دوایی ئیسلام بووەو مزگەوتەکە بەناویەوە ناو نراوە.

*** مزگەوتی (حاجی قادر - عەلاو):**
ئەم مزگەوتە دەکەوێتەوە گەڕەکی (پیریادی)یەوە، لە ساڵی (١٩٠٥) بنیات نراوە، لە هەندێك شوێنیش ساڵی (١٩٠٢) نووسراوە، هەر یەکە لە (مەلا فاتیح مەلا ڕەزای قەساب)و (مەجید جەمیل سەعید هاشم) ئیمامو خەتیبی مزگەوتە بوونە.

*** مزگەوتی (نوعمان):**
لە ساڵی (١٩٦٠) ئەم مزگەوتە بنیات نراوە، (حاجی نوعمان) ناوێك ئەم مزگەوتەی بنیات ناوە، جاران لە شوێنی ئێستایدا نەبوو بەڵکو هەر لەو ڕیزەوە بەرەوە خوارتر بوو، دوای ئەوەی کە ڕووخاوە لە جێگەکە ئێستەی دروستکراوەتەوە.

*** مزگەوتی (مەلا عەزیزی شەل - شێخ جەرجیس):**
(مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) دەربارەی ئەم مزگەوتە دەڵێت: "مزگەوتێکی بچووك بوو، لەم دواییدا ناوی مزگەوتی (مەلا عەزیزە شەل) بوو، (مەلا عەبدولرەحمانی عەسکەری) لەم مزگەوتە لە ساڵی (١٨٧٨)ی زایینیی ئیمامو خەتیب بووەو ماڵیشی لە کۆتایی ئەم کۆڵانەدا بووە لە گەڕەکی (قایتەوەندی) کۆنە هەمەوەندەکان".

*** مزگەوتی (مستەفا قیردار):**
لە ساڵی (١٨٨٤)ی زایینیی لەلایەن بنەماڵەی (قیردار - کاردار) ەکانەوە دروستکراوە، ئەم مزگەوتە لە تەنیشت قەیسری بچووك (قاری بازار) لە بن قەڵاو لە ڕیزی قازانچییەکان دروستکراوە، (قیردار)ەکان خۆیان لە بنەڕەتدا خەڵکی (ڕەواندووز) بوونەو پاش ئەوەی لە کەرکوك نیشتەجێ بوونە دەستیان هەبووە لە دروستکردنی مزگەوتو خاندا.

*** مزگەوتی (ئەلیاس):**
ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٩٦٦) لە جێگەی پاشماوەی مزگەوتی (حاجی ئەحمەد ئاغا) بنیات نراوە، مزگەوتەکە دەکەوێتە پشت بازاڕی (خان خورما)وە بەرامبەر بە مەرقەدی (ئیمام ئەحمەد)ی کاکەییەکان، مزگەوتی (ئەلیاس)، هەندێك لە بەڵگەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە ماوەیەکیش ناوی مزگەوتی (حەیدەر پاشا) بووە.

*** مزگەوتی (شەهید زادە):**
دەکەوێتە کۆڵانی تەنیشت شەقامی سەلاحەددین بەرامبەر بە (خان خورما)، مزگەوتێکی کۆنە بەڵام بچووکەو بنەماڵەی (شەهید زادە) دروستیان کردووە، مزگەوتەکە ژوورێکی تێدایەو گۆڕی مردوانی بنەماڵەکەی تێدا نێژراوە، بەپێی سەرچاوەکان لە (١٨٠٠)ەکاندا دروستکراوە بەڵام نازانرێت بە شێوەیەکی دیاریکراو، (حاجی ئەبو بەکری کوڕی ئەحمەد) دامەزرێنەری مزگەوتەکەیە.

*** مزگەوتی (حاجی عوسمان زەینەل):**
لە ساڵی (١٩٤٩) دروستکراوەو لەوانەیە لە سەردەمێکی تردا ناوێکی دیکەی بووبێت.

*** مزگەوتی (مەلا عەزیز شیلەخانی):**
(مەلا جەمیل) لە بارەی ئەم مزگەوتەوە دەڵێت: "لە گەڕەکی عەرەبەکان مزگەوتێك هەبوو لە ناوی ئیمامەکەی (مەلا عەزیز شیلەخانی) بەناوبانگ بوو، مەولودو قورئان خوێنە دەنگ خۆشەکانی وەکو (مەلا سابیر)و (مەلا تاها) ماڵیان لەم گەڕەکە بوو".

*** مزگەوتی (موسەڵڵا):**
دەکەوێتە بەرامبەر گەڕەکی (پیریادی) نزیك باخچەی (موسەڵڵا).

*** مزگەوتی (حاجی تاهیر):**
مزگەوتەکە دەکەوێتە نێوان گەڕەکی (پیریادی)و (موسەڵڵا) ەوە.

*** مزگەوتی (مەلا مەجید):**
شوێنی ئەم مزگەوتە لە ئێستادا نازانرێت، بەڵام لە کۆتایی پەنجاکاندا (مەلا باقرە کوێری کوڕی مەلا ئەحمەدی لەیلانی) لێ بوو.

*** مزگەوتی (مەلا حەمە ئەمینی جەباری):**
بەرامبەر (خان خورما) بوو، بەڵام ئێستا شوێنەواری نەماوەو لە شەڕی عێراق و ئێراندا بۆردومان کراو خاپوور بوو.

*** مزگەوتی (دەدە شاقوولی):**
(مەلا جەمیل) دەڵێت: "لە بازاڕی گەورە شەقامێکی تێ دەچوو بەرەو (موسەڵلا) لە خوار قەیسەرییەوە، مزگەوتی دەدە شاقوولی هەبوو هی بەکتاشەکان بوو، مودەریس زادەکان سەرپەرشتی ئەم مزگەوتە بوون، (مەلا ناسیح) و (مەلا تاهیر) کە ئامۆزا بوون لەسەر ئەوقافی زۆری ئەو مزگەوتە بەپێیان ناخۆش بوو، بەدەستی ڕاستی مزگەوتەکە گەڕەکی سالەییەکان هەبوو، ئەمانە لە بنەڕەتدا لە کوردەکانی (لوڕستان) بوو، عێڵی سارایی بوون خۆیان کردبوو بە سالحی، عێڵەکە لەنێوان کەرکوك و زێدا بوو، سەرکردەکانیان خۆیان بە دۆستی (سەیید ئەحمەدی خانەقا) ئەدا لە قەڵەم، بەگەکانیان لە کەرکوك لەم گەڕەکە بە تورکی قسەیان دەکرد، لە ناوچەی (قەرە حەسەن)یش دوو گوندی سالەیی و مامشە هی ئەوان بوو".

*** مزگەوتی (حاجی سالح):**
(مەلا جەمیل) دەڵێت: "لە قەیسەری و بازاڕەوە شەقام ئەچوو بۆ سەر خاسە بە دەستی چەپا خانی خورما، مزگەوتی ئیلیاس، مزگەوتی حاجی سالح، زۆرخانە هەبوو لەگەڵ گەرماوێ ئینجا ئەگەیشتە گەدك، لە خوار مزگەوتەکانەوە گەڕەکی کاکەییەکان هەبوو".

*** مزگەوتی (سەیید نورەدین):**
ئەم مزگەوتە دەکەوێتە نێو بازاڕی کۆنی (شۆڕیجە)، لە ساڵی (١٩٤١) تا (١٩٤٣) دەست بە دروستکردنی کراوە، خاوەنی مزگەوتەکە (سەیید نورەدین سەیید عەبدولرەزاق) بووە لە بنەڕەتدا خەڵکی (بلبان) بووە، هەر یەکە لە (مەلا سەعدوڵلا، مەلا محەمەد شاتەر، ئیسماعیل پالاندوور، مەلا مەجید ئەحمەد باوایی، شێخ حوسێن عومەر بەرزنجی، مەلا عومەر جەباری) ئیمام و خەتیبی مزگەوتەکە بوونە.

*** مزگەوتی (شێخ مەحمودی شۆڕیجە):**
ئەم مزگەوتە بە ناوی (شێخ مەحمودی شۆڕیجە کوڕی شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی شێخ محێدینی کەرکوك)یە.

*** مزگەوتی (حاجی مەلا سەعید رۆژبەیانی):**
ئەم مزگەوتە لەلایەن (حاجی مەلا سەعید)ەو دروستکرا، دەکەوێتە پشت مزگەوتی (سەیید نورەدین) لە خوار تەکیەی شێخ (عەبدوڵلا).

*** مزگەوت و تەکیەی (شێخ ئیسماعیل بەرزنجی گۆڵباخی زەنگەنە):**
ئەم مزگەوتە لە گەڕەکی (شۆڕیجە) بووە و بەڵام شوێنەکەی نازانرێت.

*** مزگەوتی (سەیید عەبدوڵلا):**
ئەم مزگەوتە لە گەڕەکی (شۆڕیجە) بووە و بەڵام شوێنەکەی نازانرێت.

*** مزگەوتی (شێخ سوڵتان):**
ئەم مزگەوتە لە گەڕەکی (شۆڕیجە) بووە و بەڵام شوێنەکەی نازانرێت.

*** مزگەوتی (الاقصی):**
ئەم مزگەوتە دەکەوێتە سەر ڕێگای گەڕەکی (پیریادی – شۆڕیجە).

*** مزگەوتی (حاجی عەبدولرەزاق ئەلتوخەفی):**
ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٩٤٣–١٩٤٦) بنیات نراوە، لە خوار پردی دووەمەوەیە و لە نزیك ڕووباری (خاسە)یە کە دەڕوانێتە سەر شەقامی سەرەکی کە بەرەو پارێزگای کەرکوك و نەخۆشخانەی کەرکوك دەڕوات.

*** مزگەوتی (خەلیفە کەریم):**
دەکەوێتە ناو بازاڕ (حەمام عەلیل) لە ساڵانی چلەکان دروستکراوە، شێخ (عەبدولرەزاق حوسێن هورمزی) ماوەیەك وەك ئیمام و خەتیب لەم مزگەوتە بووە.

*** مزگەوتی (عەلی بەگ جەلالی):**
ئەم مزگەوتە لەلایەن جەلالییەکانی کەرکوکەوە بنیات نراوە، کە لە گەڕەکی (بەگەکاندا) نیشتەجێ بوونە، بەپێی ئەو مێژووەی کە لەسەر گۆڕستانی تەنیشت مزگەوتەکە و حەمامەکەییەوە نووسراوە ئاماژە بە ساڵی (١٦١٢)ی زایینی دەکات، بۆیە هەر یەکە لە مێژووی مزگەوتەکە حەمامەکەی لە نزیك ئەو مێژووەیە.
(جەلالی) یان (گەلالییەکان) یەکێکن لە هۆزە گەورەکانی کورد و بەهۆی جەنگەکانیان لەگەڵ سەفەوییەکان و سوڵتان سەلیمی عوسمانی پەراگەندەی ناوچەکانی کوردستان و ئێران دەبن، ئەوە لە هونەری تەلارسازی ئەم مزگەوتەدا بەرچاوە دەکەوێت ئەوە دەخاتە ڕوو کە مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە و تاوەکو ئێستاکە شوێنەواری کۆڵەکە و کەوانەی تێدا ماوە، گەواهی ڕاستی سەردەمەکەی دەخاتە ڕوو.

*** مزگەوتی (حەبیب ئاغای هورمزی):**
دەکەوێتە نێو گەڕەکی (حەمام عەلی)یەوە، مێژووی دروستکردنەکەی بە تەواوەی نازانرێت، بەڵام هەندێك سەرچاوە مێژووەکەی دەگەڕێننەوە بۆ سییەکانی سەدەی ڕابردوو، هەندێکیش بە ناوی مزگەوتی (حەبیب ئاغای بیبانی) ناوی دەبەن.

*** مزگەوتی (عەبدوڵلا کوڕی عومەر):**
ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٩٤٨)دا لە ناوچەی (سەیید عەلاوی) لەسەر نەفەقەی (مەلا زەینەل محەمەد) دروستکراوە.

*** مزگەوتی (مەلا قاوون):**
ئەم مزگەوتە دەکەوێتە گەڕەکی (بەگلەر) لە ساڵی (١٨٧٦)ی زایینیی لەلایەن (حاجی عەلی پاسەوان زادە)وە دروستکراوە کە مزگەوتی (قاوون) ناسراوە.

*** مزگەوتی (بەگلەر):**
ئەم مزگەوتە شوێنەوارەکەی نەماوە بەڵام هەر یەکە لە (مەلا ڕەحمەتوڵلا جەباری)و (مەلا ڕەحیم گلی) ئیمام و خەتیبی ئەم مزگەوتە بوونە هەر لە ساڵی (١٩١٨)ەوە.

*** مزگەوتی (موسلم نەفتچی):**
دەکەوێتە نێو گەڕەکی (شاتەری)یەوە، مزگەوتێکی گەورەیەو گومەزێکی گەورەی هەیە، ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٨٤٠)ی زایینیی لەلایەن (ئەحمەد بەگی نەوتچی زادە)وە دروستکراوە.
(مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) دەڵێت: "بنەماڵەی نەوتچی لە بنەڕەتدا لە عێلی زەنگەنەن و باپیرە گەورەکەیان موتەسلیمی کەرکوک بووە، مزگەوتێکی لە نزیک ماڵەکەی خۆی دروستکردووەو ئینجا مزگەوتی (سەرای) دروستکرد، ماوەیەک (محەمەد فەیزی زەهاوی موفتی) دەرسی لەم مزگەوتە وتووەتەوە پێش چوونی بۆ بەغدان هەروەها (سەیید محەمەد جەباری) بۆ ماوەی سی ساڵ مامۆستا بووە لەم مەدرەسەیە".

*** مزگەوتی و تەکیی (شێخ باقی):**
دەکەوێتە سەرەتای شەقامی (کۆماری)، بەپێی نووسینی سەر دەرگاکەی ساڵی (١٨٨٢)ی زایینیی دیاری کراوە بۆ بنیاتنانی مزگەوتەکە.
مزگەوتی (مەلا عەبدوڵلا) کابرایەکی کورد دروستی کردبوو، دواتر شێخ باقی لە جێگەی ئەو مزگەوت و تەکیی (شێخ باقی) دروستکردووە، خودی (شێخ باقی)ش خەڵکی مەزناوە بووە.
(شێخ باقی) بەرپرسی (حەرەملك) بوو لە ئەستەمبوڵ، لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لەوێ بە (شێخ بابا) بەناوبانگ بووە، بەڵام کێشەی بۆ دروستکراوە لەگەڵ (ئەبو هودای سەیادی) لە ئەستەمبول، بۆیە گەڕاوەتەوە بۆ کەرکوک لە شوێنی مزگەوتی (مەلا عەبدوڵلا) تەکیی (شێخ باقی) بنیات ناوە. دوو وەستا تەکیی (شێخ باقی)یان دروستکردووە کە مەسیحی بوون و ناویان (حەنا)و (قریاقۆس) بوو، بەڵام ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٩٧٦) تازەکراوەتەوە لەلایەن (شێخ عەبدولجەبار شێخ مستەفا)وە.
سەبارەت بە ئیمام و خەتیبەکانی مزگەوتەکە، هەر لە سەرەتاوە مەزناوییەکان مزگەوت و تەکیەکەیان بەڕێوەبردووە، (شێخ مەحمەد مەزناوی، شێخ مستەفا شێخ محەمەد، شێخ عەبدولجەبار شێخ مستەفا)و (شێخ عەبدولعەزیز) کە ئێستا سەرپەرشتی مزگەوتە دەکات.

لەسەر بنەڕەتی ئەم مەزناوییانە ئەوە دەگێڕنەوە کە (مەلا مەحمود)و (مەلا محەمەد)و (مەلا عەبدولقادر) سێ برا بوون لە ناوچەی مەزناوەیی لە ناوچەی پشدەرەوە هاتوون بۆ سلێمانی لەلای کاك ئەحمەدی شێخ دەبن، لە مزگەوتی گەورەو ئەو ڕێنماییان دەکات کە بچن بۆ کەرکوک بۆ خوێندنی ئایین و خزمەت کردنی ئایین لەو شارە، ئەوانیش هەرسێکیان ڕوو لە کەرکوک دەکەن و لە مزگەوتەکانی ئەم شارە خزمەتی ئایینی ئیسلام دەکەن، ئەو سێ برایە لەلای (شێخ عەلی تاڵەبانی گەورە) لە (تەکیی تاڵەبانی) دەخوێنن.
(شێخ مەحمودی مەزناوی) ماوەیەک سەرۆکی زانایانی ئایینی کەرکوک بوو، ماوەیەکیش ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (نائیب) لە گەڕەکی (ئاخور حوسێن).

*** مزگەوتی (ئیبراهیم پاشا):**
ئەم مزگەوتە دەکەوێتە نێوان گەڕەکی (حەمام عەلی)و (شاتەری)، لە ساڵی (١٦٣٥) بنیات نراوە، ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٩٨٠) دووبارە نۆژەنکراوەتەوە.

*** مزگەوتی (ئەرسەلان):**
دەکەوێتە گەڕەکی (شاتەری) پشت کۆڵانی شەقامی (جمهوری)، کە لەلایەن بنەماڵەی (ئەرسەلان)ەوە بنیات نراوە. بەپێی سەرچاوەکان و ئەوە لەسەر مزگەوتەکە هەڵکەنراوە ساڵی (١٧٨٠)ی زایینیی بنیات نراوە، ئەم مزگەوتە لەلایەن (عەبدولقادر ئەفەندی) دروستکراوەو لە ساڵی (١٩٨٦) نۆژەنکراوەتەوە، هەر یەکە لە (مەلا عەبدولرەحمان)و (مەلا محەمەد)و (مەلا سەیید ئەحمەد)و (مەلا عیزەت مەزناوەیی) و (مەلا ئەنوەر)و (مەلا سەیید تاهیر)و (مەلا ئەحمەد)و (مەلا شێخ تاها شێخ قاسم)و (مەلا ئەحمەد کچانی) مامۆستا و ئیمام و خەتیبی ئەم مزگەوتە بوونە.
ئەم مزگەوتە ئەگەر بەراوردی مێژوویی دامەزراندنی بکەین مزگەوتێکی زۆر کۆنە، بەڵام زۆر بەداخەوە لە ئێستادا هیچ پاشماوەو شوێنەوارێکی نەماوەو ئەوەی تەنها بەرچاوی دەکەوێت حەوشێکی پشتەوەیە، کە نزیکەی بیست گۆڕێکی تێدایە، گومەزیش بۆ سەر یەکێك لە گۆڕەکان دروستکراوە.

*** مزگەوت و خانەقای (سەیید ئەحمەد):**
یەکێکە لە شوێنە ئایینیە گرنگەکانی کەرکوک، کە پێگەیەکی ئایینی گەورەی هەبووە، جێگەیەکی سیاسی بەرچاوی خۆی هەبووە، لە خزمەتی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردا، لە هەموو قۆناغەکانی تێکۆشانی کوردا.
خانەقای (سەیید ئەحمەد) دەکەوێتە خوارەوەی قەڵا لە بەری قشڵەی کەرکوک، لە تەنیشت کتێبخانەی گشتی کەرکوک، کە لە سەرەتای بنیاتنانیدا ناوچەیەکی پانوپۆڕی داگیرکردبوو لە پانتایی مزگەوتەکەو دەورووبەریدا.
شوێنی خانەقاکە، لای خواری دیواری پشتی سەراو پشتی قشڵەی سەربازی بوو، کە ئینگلیزەکان کەرکوکیان داگیر کرد، لای سەر شەقامەکەی هەولێریان دابڕی و کردیانە (مەدرەسەی عیلمییە) ئینجا کتێبخانەی گشتی، لای باکوور خۆرئاوای

عەرەسەیەکی پان و پۆڕ هەبوو، بۆ گۆڕستان تەرخان کرابوو، دائیرەی سەربازی داگیریان کردو کردیان بە تەولی سەربازی، بەم جۆرە لەو پانتاییە گەورەیەی خانەقا دابڕا.
مزگەوتەکە کەوتبووە ناوەندی شوێنەکە، بە دەوریا پتر لە سی ژووری هەبوو، دیوەخانی هاوینی و زستانی جیابوو، ژوورەکانی تری بۆ میوانی ناسراو پیاوانی گەورە پڕفەرش بوون، چەند ژوورێکی بۆ سۆفی و هەژار هەبوون، چەند ژووری بۆ مەلا و فەقێکان هەبوو.
لە پاڵ گرنگی شوێنی ئەم خانەقایە، جێگەیەکی بەرچاوی سەر ڕێگای هەولێرو سلێمانی و بەغدای هەبوو.
ئەم خانەقایە لە ساڵی (١٨٥٨)ی زایینی لەلایەن سوڵتان (عەبدولمەجید)ی عوسمانییەوە بڕیاری بنیاتنانی دراوە بۆ بنەماڵەی (سەردار) کە دواتر بە بنەماڵەی (خانەقا) ناسراون، لە پێشدا مزگەوتی (عەلی پاشا)ی والی شارەزوور پێش چوار ساڵ لە دروستکردنی خانەقاکە لەوێ بنیاتنراوە.
لە سەرچاوەیەکی مێژووییدا باس لەوە کراوە کە گوایە (ئیسماعیل پاشای کوڕی محەمەد تەیاری کوڕی ئیسماعیل پاشای یەکەم) کە لە ساڵی (١٨٦٠-١٨٦١)ی زایینی والی شارەزوور بووە، بەپێی بەڵگەنامەی ئەو وەقفەی کە لە ساڵی (١٨٦٠)ی زایینیدا هاتووە، خانەقاو تەکیٚ بۆ (شێخ قادر کوڕی سەیید ئەحمەدی سەردار) دروستکردووە، تەکیٚ و خانووەکەشی کردووە بە وەقف بۆ (شێخ قادر)، لەگەڵ چەند عەقارێکی تردا.
(مەلا مەجیدی قوتب) وێنەیەکی ئەو وەقفەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لەسەر دەرگای خانەقاکە هەڵکۆڵرابوو، بەڵام لە هەشتاکاندا لەلایەن ڕژێمی بەعس سڕایەوەو لەناودرا.
یەکەم کەسی بنەماڵەکە کە هاتووەتە کەرکوک، (سەیید ئەحمەدی سەردار) بووە، لە دوای کۆچکردنی (سەیید عەبدولقادر) لە شوێنی دانیشتووە، هەر لە کەرکوک کۆچی دوایی کردووەو لە نێو خانەقاکەدا نێژراوە، دوای ئەویش (سەیید حوسێن) جێگەی گرتووەتەوە، دوای ئەویش کوڕی دووەمی کە (سەیید ئەحمەدی سەیید حوسێن)ە ناسراو بە (خانەقا) شوێنی گرتووەتەوە، بنەماڵەی (خانەقا) نزیکەی سەدو هەشتاو پێنج ساڵێك پێش ئێستا هاتوونەتە شاری کەرکوك.
(سەیید ئەحمەدی خانەقا) خەلیفەی مەولانا (خالیدی نەقشبەندی) بووە، لە دێی (سەرگەڵو)ی سەر بە ناحییەی (سوورداشی) سلێمانی، باپیرەی لەو شوێنەوە هاتووەتە کەرکوك.
دوو شوێن وەك پێشەنگی دێرینیی و ئیرشادی ئایینی هەیە، کە هەردووکیان دوو بنەماڵەی کوردی ئەو شارە دروستیان کردووەو بەڕێوەیان بردووە، یەکێکیان تەکیەی (تاڵەبانییە) کە بە تەکیٚی گەورە لە کەرکوك ناسراوە، ئەوی تریان خانەقای (سەیید ئەحمەد)ە کە هەردووکیان دوو شوێنی ناوداروو پیرۆزن و جێگەی شانازی خەڵکەی کەرکوکن بە هەموو نەتەوەو پێکهاتەکانی ئەم شارەوە.
(سەیید ئەحمەدی خانەقا) سەردەمانێك سەرۆکی ئەو بنەماڵەیە بووە. پیاوێکی ناوداری شاری کەرکوك بووە، چەندین جار گیراوەو لە کەرکوك و دوورخراوەتەوە، لە ساڵی (١٨٦٨)ی زایینی لە کەرکوك لەدایکبووە، ناوی (ئەحمەدی کوڕی حوسێن کوڕی عەبدولقادری کوڕی ئەحمەد سەرداری بەرزنجی)یە. لەسەر دەستی (مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی) خوێندنی خوێندووە بە تایەتی خوێندنە ئایینییەکان، لە ماوەی شەڕی جیهانی یەکەم لەگەڵ تورکەکاندا لە (شوعێبە) و (ناسرییە)دا لە ساڵی (١٩١٥)ی زایینی و لە کاتی کێشەی ویلایەتی موسڵ پشتگیری تورکەکانی کردووەو لە ساڵی (١٩٢٣)ی زایینی بۆ بەغدا دوورخراوەتەوە.
لە دوای کۆچی دوایی باوکی ئەرکی بەڕێوەبردنی خانەقاکەی خۆیانی گرتووەتە ئەستۆ، لە کەسایەتییە ناودارەکانی کەرکوکی سەردەمی خۆی بووە، یارمەتی زۆری هەژاران و نەدارانی دەدا لە تەکییەکەی، دەستێکی باڵای لە پرۆژەکانی خێرخوازی و خزمەتی نیشتمانیدا بووە، چەند جارێك تووشی ئازارو دەربەدەری و بەندێتی بووە، لە ساڵی (١٩٥٢)ی زایینی لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووە.
مودەریسەکانی ئەم مەدرەسەیە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بریتی بووە لە (مەلا عەلی حیکمەتی سیامەنسووری، شێخ حەسەنی قەرەچێوار، مەلا ئەحمەدی فورقانی رۆژبەیانی، باوکی مەلا جەمیلی رۆژبەیانی، مەلا ناسیحی مودەریس) و دەیان قوتابی لای ئەو مامۆستایانە ئیجازەیان لە خانەقا وەرگرتووە.

*** مزگەوتی (قشڵە):**

ئەم مزگەوتە کەوتبوە ناو قشڵەی کەرکوکەوە، بە باربووی خەڵکی لە ساڵی (١٩١٢) دروستکراوە، بەڵام لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم هیچ شوێنەوارێکی نەماوەو ڕووخێندراوە.

*** مزگەوتی (قایش محەمەد پاشا):**

ئەم مزگەوتە لە تەنیشت خانەقای (سەیید ئەحمەد) بووە.

*** مزگەوتی (سۆرانی):**

ئەم مزگەوتە بەرامبەر بە خانەقای (سەیید ئەحمەد) بووە لەلایەن میرەکانی سۆرانەوە بنیات نراوە، بەڵام لە پێش مێژووی دامەزراندنی مەدرەسەکەی لە ساڵی (١٧١٥)ی زایینی ئەم مزگەوتە بوونی هەبووە.
(مەلا جەمیل رۆژبەیانی) دەڵێت: "میرانی سۆران ناردیان لەبەری گەرەکی (شاتەری) مەدرەسەو مزگەوتێکیان دروستکرد، مەدرەسەکە تا ساڵی (١٩٣٠)دا هەبووەو دواتر ڕووخا، ئەوقاف کردی بە مەیتەم تەنیا بۆ ئەوەی ناوی سۆرانی پێوە نەمێنی".

*** مزگەوتی (ئیبراهیم بەگی تکریتی):**

یەکێکە لەو مزگەوتانەی کە کەوتووەتە ناوەراستی بازارو شەقامی (بابە گوڕگوڕ)، لە ساڵی (١٩٠٩) بنیات نراوەو لە ساڵانی (١٩٥٥)و ساڵانی هەشتاکان دووبارە نۆژەن

کراوەتەوە.
ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم مزگەوتە بە یەکێك لەو مزگەوتە کۆنانە دادەنرێت لە رووی بیناکارییەوە تاکو ئێستاکە پاشماوەی هونەری کۆڵەکەو نەخش و گومەت و کەوانەی تێدا ماوە، هەروەها دەرگا سەرەکییەکەی دەرگایەکی نەخشەداری هەیەو هەڵگری کۆمەڵێك هونەری جوانکاری نەخشە لە کەرکوکدا.
بەڵام بەهۆی قۆناغەکانی نۆژەنکردنەوە وورده.. وورده ئەو شوێنەوارە کۆنەی خۆی لە دەست داوەو گەلێك رووی جوانکاری شێواوەو جوانکاری تەرلاسازی تێدا نەماوە.
دەربارە بنەرەتی (تکریتی)و چۆنییەتی بنیاتنەری دامەزرێنەری مزگەوتەکە چەند راوبۆچوونێکی هەیە، دکتۆر (نوری تاڵەبانی) لەو باوەرەدایە کە تەنیا بنەماڵەیەك لەو سەردەمە عەرەب بن لە کەرکوك بنەماڵەی (تکریتی) بوو، بەڵام خۆیان بە توورکمان دەزانن ئاخافتنیان بە تورکمانی بوو لەناو ماڵدا، هەر چەندە لە بنچینەدا عەرەب بوون، باپیرە گەورەیان لە ناوچەی (حۆران)ی سوریاوە لەگەڵ سولتان (موردای عوسمانی) هاتبوون بۆ عێراق، ئەویش بەوەی بەشێکیان لەنێوان تکریت و کەرکوك نیشتەجێبوونە.
بەڵام ئەوەی یەکلاکەرەوەیە ئەوەیە ئەم مزگەوتە لەلایەن (ئیبراهیم بەگی تکریتی)یەوە دروستکراوە.

*** مزگەوت و خانەقا (کەوسەر - حوسامەدین):**
ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٨١٨)ی زایینی دروستکراوە، شوێنی ئەم مزگەوتە کەوتووەتە نێوان گەرەکی قۆرییەوە شەقامی کۆماری کە دەکەوێتە پشت ئۆرزدی جارانی کەرکوك.
ئەم مزگەوتە و تەکییەیە، ناوی مزگەوتی (حاجی کەوسەر)ەو تەکییەی (محەمەد حوسامەدینی قادری)یە، کە لە ئێستادا بە مزگەوتی (حوسامەدین) بەناوبانگ و ناسراوە.
(مەلا حوسامەدین) خەلیفەی (شێخ جەمیل تاڵەبانی) بوو، خۆی و هەموو کورەکانی لە رۆژانی هەینیدا دەهاتن بۆ تەکییە بۆ بەشداری کردن لە زیکری رۆژانی هەینی.
هەروەها (شێخ جەمیل تاڵەبانی) کە لە ساڵی (١٩٣٧)دا چووە بۆ حەج، حەڤدە کەسی لەگەڵ خۆیدا بردووە کە (شێخ حوسامەدین) یەکێك بووە لەو کەسانە.
هەموو شەوانی دووشەم لە تەکییەکەی (شێخ حوسامەدین) زیکر دەکرێت لەسەر رێبازی قادری - خالسی، کە رێبازی تەکێی (تاڵەبانی)یە، کە هەر یەکە لە تەکێی (شێخ حوسامەدین) لەگەڵ مزگەوتی (حاجی عابد) لە گەرەکی پیریادی، هەردووکیان لقی تەکێی (تاڵەبانی)ن و لەسەر رێبازی (قادری) بەرێوە دەچن، تاکو ئێستا ئەم مزگەوتە لەسەر رێبازی تایبەتی خۆی بەرێوە دەچێت و شوێنێکی دیاری هەیە لە بواری ئایینیدا.
(شێخ مەلا محەمەد حوسامەدین کوری مەلا عومەر کوری حاجی کەوسەر) لە ساڵی (١٨٩٨) لە گەرەکی (ساری کەهیە) لە کەرکوك لەدایکبووە، کاتێك تەمەنی نۆ ساڵان بووە باوکی (مەلا عومەر) ئیمام و خەتیبی مزگەوتەکە کۆچی دوایی کردووە، بۆیە باپیرەی حاجی کەوسەر هەستاوە بە پەروەردەکردنی، لە ساڵی (١٩٦٦) کۆچی دوایی کردووەو هەر لە مزگەوتەکەدا نێژراوە.
لە دوای خۆی ئەم بەرهەمانەی بە جێ هێشتووە:
١. (الانفاس الرحمانية في سلسلة القادرية الطالبانية)، ساڵی (١٩٧٣).
٢. (رسالة سيرة الائمة الاربعة)، دەسنووس.

*** مزگەوتی (مەلا ئەحمەد):**
یەکێکە لە مزگەوتە کۆنەکانی کەرکوك کە مێژووی دروست بوونی زۆر کۆنەو سەرچاوەیەکی پێویست لە بەردەستدا نییە بۆ بنیاتنانی، بەڵام لە ساڵی (١٩٦٣)ی زایینی نۆژەن کراوەتەوە.
هەندێك لە سەرچاوەکان ئەوە پشت راست دەکەنەوە کە ئەم مزگەوتە لەلایەن (حاجی مەحمود)ەوە دروستکراوە کە لە هۆزی (گەردی) بووە. بەڵام (مەلا ئەحمەد کوری مەلا حەکیم کوری مەلا ئیسماعیل) ئیمام و خەتیبی مزگەوتەکە بووەو ماوەیەکی چاکیش (مەلا حەکیم) ئیمام و خەتیبی مزگەوتەکە بووە.
ئەم مزگەوتەش یەکێکە لەو مزگەوتە کۆنانەی کەرکوك کە مێژوویەکی دوورو درێژی بیناکاری هەیەو خاوەنی کۆڵەکەو کەوانەو تەرزی نەخش و نیگاری جۆربەجۆری هەیە، بەڵام لە ئێستادا بەشێکی زۆری ئەو هونەری تەلارسازییەی لە دەست داوە.

*** مزگەوتی (مەلا خدر):**
دەکەوێتە گەرەکی (قۆرییە)و لەنێوان مزگەوتی (ئەحمەد) و مزگەوتی (لۆبیاچی)، لە مەلا کۆنەکانی مزگەوتەکە (مەلا سەمەد)و (مەلا غەفور)ە، کە بنەماڵەی ئەوان و (مەلا خدر) مزگەوتەکیان دورستکردووە یان ئیمام و خەتیب بوونە تێدا.

*** مزگەوتی (مەلا عەبدوڵڵای لۆبیاچی):**
ئەم مزگەوتە لە ناو بازاری سەوزە فرۆشەکانی بازاری (قۆرییە)دایە، لەبەر ئەوەی (مەلا عەبدوڵڵای لۆبیاچی) ماوەیەکی زۆر ئیمام و خەتیبی مزگەوتە بووە هەر بۆیە بە ناوی ئەم ناونراوە.

*** مزگەوتی (ئەڵماس):**
ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٩٣٥)ەوە لە گەرەکی (تەپەی مەلا عەبدوڵڵا) بنیات نراوە، کە بنەرەتی ناوە کۆنەی مزگەوتی (مەلا عەبدوڵڵا) بووە.

*** مزگەوتی (شێخ سەلمان):**
ئەم مزگەوتە کەوتووە گەرەکی (ئەڵماس)ەوە.

*** مزگەوتی (ئەنەس بن مالیك):**
ئەم مزگەوتە کەوتووە بازاری لەنگە فرۆشەکانی (قۆرییە)و مزگەوتێکی بچووك و کۆنە، لە ساڵی (١٨٦٩) بنیات نراوە، بەڵام بنەرەتی ناوە کۆنەکەی نازانرێت.

*** مزگەوتی (مەلا سەعید - حاجی عەبدی):**
ئەم مزگەوتە لە ساڵی (١٧٨٩) بنیات نراوە، لەلایەن (حاجی بەکری کوڕی محەمەد بەگ)ەوە دروستکراوە، بەڵام (حاجی عەبدی) ڕووخاندویەتی و دووبارە نۆژەنی کردووەتەوە.

*** مزگەوتی (مەلا داوودی جەباری - فەیسەڵییە):**
(مەلا جەمیل) دەربارەی ئەم مزگەوتە دەڵێت: "لای سەرای دەوڵەت شەقامێ هەبوو بەرەو خۆرئاوا، لە دەوری ئینگلیزدا ناونرا (شەقامی ئەوقاف)، لای دەستی ڕاستی هەندێ ماڵی جەباری هەبوو، مزگەوتی (مەلا داوود جەباری) لەسەر شەقامەکە بوو، لای خواری شەقامەکەش گەڕەکی (لوور)و گەڕەکی (کەڵهوڕ) هەبوو ئینجا دەگەیشتە گەڕەکی (شوان)". بەپێی هەندێك سەرچاوە لە ساڵی (١٩٣٩)ی زایینیی بنیات نراوەو لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا ڕووخێندراوە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە.

*** مزگەوتی (شوان):**
ئەم مزگەوتە (مەلا ئەحمەدی حەکیم) ئیمام بووەو لە بنەڕەتدا (شوانی کێشەك) بووە.

*** مزگەوتی (سوڵتان ساقی):**
مزگەوتو مەرقەدێکی کۆنەو گۆڕستانی (تسعین)یش لە تەنیشتیەوەیە.

*** مزگەوتی (حاجی ئەکبەر):**
(حاجی عەبدولهادی عەسافلی) ئیمامو خەتیبی مزگەوتەکەیە.

*** مزگەوتی (شێخلەر):**
دەکەوێتە کۆڵانی (شێخلەری) تسعینەوە.

*** راپۆرتی پەروەردەو خوێندن لە کۆتایی دەوڵەتی عوسمانیو هاتنی ئینگلیزەکان[1]:-**

**وەرگێرانی: سەربەست کەرکوکی**

ئەو گەشەسەندنەی لەم بەشەدا لەبەر چاوە، دەبێ تۆمار بکرێ. پشکنینی بارودۆخی قوتابخانەکان لە کۆتایی (١٩١٨)دا بەکورتی بەم شێوەیە:

ناوچەی کفری: قوتابخانەیەك بۆ (٣٠ - ٤٠) قوتابی لە کفری، بە هەمان شێوە دانەیەك لە (توون) هەیە. قوتابخانەکەی کفری بارودۆخێکی تاڵی هەیە بەدەست دەسەڵاتو بەرپرسیی چەند مامۆستاو مدیرەکەو کەمی مێزو کورسیو کەرەستەو ئامێرەکانی قوتابخانەوە. بەڵام ئەوەی (توون) لە ژێر چاودێری راستەوخۆی پارەتیدەری حاکمی سیاسیدایە بە چاك دەستی پێکردووە. قوتابخانەکە لەم دواییەدا، بەهۆی کەمی ژمارەی قوتابیو نزمی ئاستی دەستەی پەروەردەیەوە، بەرەوە نەمان بووەتەوە. کفری قوتابخانەیەکی بچووکی (جوو)ەکانی تێدا هەبووە. مزگەوتو حوجرەکان لە شوێنێکی تردا ئامادەیان پێ دەکرێ[2].

*** ناوچەی کەرکووك:**

کەرکووك قوتابخانەی سەرەتایی خۆی هەیە، کە نزیکەی (٨٠) قوتابی تێدا دەخوێنێ، لە بینایەکی زۆر باشدایە کە لە باشترین بینایە دەژمێردرێ لە وڵاتەکەدا. قوتابخانەیەکی ناوەندی، بە پرۆگرامی وانەگوتنەوەی زۆر چاکەوە هەیە. ئەم قوتابخانەیە بە گشتی لە ژێر چاودێری ئەوقافدایە، لەلایەن ئەوقافەوە خزمەت دەکرێ. قوتابخانەی دیانەکانو جووەکان نەکرابوونەوە.

چەندین دیاردەی پەروەردەیی لە ساڵەکدا هەروەك خۆیان مابوونەوە. پەرۆشییەکی زۆری فێربوونی زمانی ئینگلیزی بە ئاشکرا لە هەموو قوتابخانەکاندا هەیە. گومان لەوەدا نییە کە ژمارەی ئەوانەی ئارەزوومەندی فێربوونی زمانی ئینگلیزین، بەشێوەیەکی ئاشکرا بەرەو زیادبوون دەچێ. ئەمە کاتێك سەردەکەوێ کە مامۆستاکانی زمانی ئینگلیزی ئامادە بکرێن بۆ ئەم وانانە. ئەمەش کارێکە مامۆستاکان پێشوازیی لێ دەکەن، تا ئێستا هیچ مامۆستایەکی خراپ دەستنیشان نەکراوە، دەبێ دوو یا سێ مامۆستای دەستنیشانکراو لە ئاسایی گرنگییان پێ بدرێو، هەر بەو ئاستەش تەماشای مافو مووچەیان بکرێ هەندێ کەرەستەی گرنگی پەروەردە مسۆگەر کراوە. بەرێوەبەری پەروەردە لە دەڤەرەکەدا مانگی نیسان گۆراوە، بە ئەرکی چاودێریو پشکنین هەڵساوە. لە مانگی تشرینی دووەمو کانوونی یەکەمدا، دوو فەرمانبەری تری پەروەردە سەردانی ناوچەکەیان کردووە[3].

قوتابخانەی (توون) لە ماوەی ساڵێدا، بە بێ گۆران هەر بەردەوام بووە، گۆرینی فەرمانبەرانی تێدا نەبووە، بەڵام ژمارەی قوتابییانی هەر بەرەو کەمبوونەوە چوون، لە کفری بە هاتنی بەرێوەبەری تازە قوتابخانەی سەرەتایی، لە پایزدا، پەرەپێدانێکی بەرچاو لە رێکوپێکیو زیادبوونی ژمارەی قوتابیاندا رووی داوە، پاشان لەگەڵ قوتابخانەی (جوو)ەکاندا تێکەڵاو بووەو قوتابخانە تێکەڵەکە چووەتە بینایەکی گەورەوە. ئەمەیان لەوانەیە بە قوتابخانەیەکی شیاوتر و بەردەوامترو لە بەرێوەبردندا رێکوپێکترو لە سەرپەرشتیدا شارەزاتر بژمێردرێ.

لە (تاووق)، هەوڵی زۆر درا بۆ ئەوەی قوتابی بۆ قوتابخانەیەکی یەك پۆلیو یەك مامۆستایی، پەیدا بکرێ، بەڵام هەواڵەکان پووچ بوونو سەریان نەگرت، لە (ئاڵتوون کۆپری) سەرەتای بەهار قوتابخانەیەکی (٣٥) قوتابی سەر بە شارەوانی کرایەوە لەو ساتەوە ئەم قوتابخانەیە بە پارەی شارەوانی بەرێوەدەچێ. قوتابخانەکە لە باری بەرێوەبردنو چاودێریو پشکنینەوە هەژارە، بەڵام هەبوونی هەر جۆرە قوتابخانەیەك لە نەبوونی باشترە. لە کەرکوك، مانگی حوزەیران، قوتابخانە سەرەتاییەکە لە شوێنی خۆی لە خەستەخانە سەربازییەکە لابردراو، مانگی ئاب بە شێوەیەکی کاتیو بێ کرێ لە خانەقای سەید ئەحمەددا کرایەوە[4].

مەسەلەی کەمی ژمارەی قوتابیان بە گوێرەی قەوارەی کەرکووك، بووتە هۆی دروستبوونی هەندێ گلەییو نارەزایی هۆیەکانیشی ئەمانەن: ئایینی بەرێوەبەری قوتابخانەکە، کە دیانە هۆیەکی کاریگەرەو، دژایەتییەکانی مەلای حوجرەکان، لەگەڵ نەبوونی مەیلو ئارەزووی باوکاندا بەشێوەیەکی گشتی بۆ ناردنی کورەکانیان بۆ قوتابخانە، بەتایبەت ئەو باوکانەی کە مەبەستیانە کورەکانیان بۆ کاروباری کشتوکاڵیو بەردەستیی دوکانەکانیان گل بدەنەوە.

سێ ئامرازی کار، بۆ چارەسەری ئەم بارودۆخە پێشنیار کران: یەکەم، هەوڵ بدرێ هەندێ لە مەلای مزگەوتەکان لەلایەن ئەنجومەنی ئەوقافەوە تاقی بکرێنەوە، بۆ ئەوەی وەك مامۆستا لە قوتابخانەکەدا بەکاربهێنرێن، پاشان حوجرەکانیان دابخرێ. بەم شێوازە هەر هیچ نەبێ، ئەو لایەنە دژە سست دەکرێو لادەبردرێ کە دژایەتی قوتابخانەکە دەکات بۆ راکێشانی منداڵانی قوتابی. دووەم داوای باجێکی مانگانە لەو باوکانە بکرێ کە منداڵانیان تەمەنیان هەیەو نایانێرن بۆ قوتابخانە. سێ: دەست بکرێ بە پرۆژەی کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی لە چەندین گەرەکی شارەکەدا، بۆ ئەوەی قوتابخانەکان نزیکی ماڵانو منداڵان بن.

خاڵی یەکەم، ئێستاش هەر دەکرێ رەچاو بکرێ دووەمیان جێبەجێ نەکراوە، بەڵام بە بیستنی دەنگو هەواڵی لە ماوەیەکی کورتدا کاریگەریی هەبووەو بووەتە هۆی دووقات بوونی ژمارەی قوتابیان، بە شێوازێکی رێك پێشوازیی لێ کراوە.

سێیەمیان گرنگی پێدەدرێ هەر هیچ نەبێ بەڵکوو بەشێکی ئەم پرۆژەیە لە ساڵی (١٩٢٠)دا جێبەجێ بکرێ. قوتابخانەی ئێستا (١٥٠) قوتابیو (٧) مامۆستای هەیە.

"مەدرەسەی عیلمییە"ی کەرکووك، هەتا دوایین رۆژانی ساڵ بە شێوەیەکی کاتی لە بەشی رۆژهەڵاتی شارەکەدا بوو، درێژە بە بابەتو پرۆگرامو شێوازی بەرێوەبردنی کۆن دەدات. ئەمانە لە بارەی بابەتو پرۆگرامی وانەکانەوە بە

گشتی کۆمەك‌و یارمەتییان پێویستە. پاداشتی مانگانە دەدرێ بە مامۆستایان‌و قوتابیان، لە ڕاستیدا بە هەموو قوتابیان دەدرێ. لەمەدا مەبەست پشتیوانکردنی قوتابخانەکەیە، دژایەتیکردنی قوتابخانە حکوومی (گشتی) یەکمیە. هاوین نزیکەی (٦٠٠) ڕووپیێ بۆ ئەم کارە کۆکراوەتەوە. ئەوقاف‌و شارەوانی هاوبەشی کۆمەکیکردینان کردووە. ئەم پارەیە بۆ (مەدرەسە) کە بە گشتی‌و بۆ چاککردنەوەی بیناکە بەتایبەتی، خەرج کرا.

خشتەی داهاتوو، دەستنیشانی ژمارەو دەوامی قوتابخانەکان دەکات لە مانگانەکانی ساڵی (١٩١٩)دا. مانگانەکان لە (١)ەوە تا (١٢) ژمارە کراون(٧):

| مانگەکان | قوتابخانەکان | سەرەتایی کەرکوك | ناوەندی کەرکوك (مدرسه علمیه) | ناوەندی کەرکوك بۆ کچان | دیانەکانی کەرکوك | جوولەکانی کەرکوك | قوتابخانەی شارەوانی ئاڵتون کۆپری | قوتابخانەی توز | قوتابخانەی حکوومی لە کفری | قوتابخانەکانی جوولەکان لە کفری | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کانوونی | کوڕ | ٦١ | ٧٠ | ٠٠ | ٠٠ | ٠٠ | ٠٠ | ٥٠ | ٢٠ | ٠٠ | ٢٠١ |
| دووەم | مامۆستا | ٤ | ١١ | ٠٠ | ٠٠ | ٠٠ | ٠٠ | ٢ | ٣ | ٠٠ | ٢٠ |
| شوبات | کوڕ | ٧٤ | ٧٠ | ٣٤ | ٤٢ | ٠٠ | ٢٨ | ٥٠ | ٢٤ | ٠٠ | ٣٢٢ |
| | مامۆستا | ٥ | ١١ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٠٠ | ٢٨ |
| ئادار | کوڕ | ٨٠ | ٦٨ | ٤٢ | ٤٧ | ٠٠ | ٣٥ | ٤٨ | ٢٥ | ٠٠ | ٣٤٥ |
| | مامۆستا | ٥ | ١١ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٠٠ | ٢٨ |
| نیسان | کوڕ | ٨٦ | ٦٩ | ٤٦ | ٥٠ | ٠٠ | ٤٠ | ٤٢ | ٢٨ | ٠٠ | ٣٦١ |
| | مامۆستا | ٥ | ١١ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٢ | ٣ | ٠٠ | ٢٨ |
| ئایار | کوڕ | ٨٦ | ٦٧ | ٤٦ | ٥٣ | ٠٠ | ٣٣ | ٣١ | ٢٨ | ٣٨ | ٣٨٢ |
| | مامۆستا | ٥ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٢٨ |
| حوزەیران | کوڕ | ٨٦ | ٦٧ | ٣٨ | ٥٠ | ٠٠ | ٣٣ | ٠٠ | ٠٠ | ٣٢ | ٣٠٦ |
| | مامۆستا | ٥ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٠٠ | ٠٠ | ١ | ٢٣ |
| تەمووز | کوڕ | ٨٦ | ٦٧ | ٣٦ | ٤٤ | ٠٠ | ٣٣ | ٠٠ | ٠٠ | ٣٠ | ٣٩٦ |
| | مامۆستا | ٥ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٠٠ | ٠٠ | ١ | ٢٣ |
| ئاب | کوڕ | ٨٦ | ٦٧ | ٤١ | ٤٠ | ٠٠ | ٣٣ | ١٩ | ٥٠ | ٣١ | ٣٦٩ |
| | مامۆستا | ٧ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٣٠ |
| ئەیلول | کوڕ | ١٣٦ | ٤٩ | ٤٦ | ٤٧ | ٠٠ | ٣٤ | ١٩ | ٥٠ | ٢٨ | ٤٠٩ |
| | مامۆستا | ٧ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٣٠ |
| تشرینی یەکەم | کوڕ | ١٨٢ | ٤٩ | ٤٨ | ٥٠ | ٠٠ | ٣٤ | ٣٢ | ٥١ | ٣١ | ٤٧٧ |
| | مامۆستا | ٧ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٠٠ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٣٠ |
| تشرینی دووەم | کوڕ | ١٦٢ | ٤٤ | ٤٨ | ٥٠ | ١٠٠ | ٣٤ | ٣٦ | ٧٤ | ٠٠ | ٥٤٨ |
| | مامۆستا | ٧ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٤ | ١ | ٢ | ٤ | ٠٠ | ٣٤ |
| کانوونی یەکەم | کوڕ | ١٦١ | ٤١ | ٤٨ | ٥٠ | ١٣٠ | ٣٣ | ٣٧ | ٦٧ | ٠٠ | ٥٦٧ |
| | مامۆستا | ٨ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٤ | ١ | ٢ | ٤ | ٠٠ | ٣٥ |
| | تێکرا | ١٠٧ | ٦٠ | ٤٣ | ٤٨ | ١١٥ | ٤٣ | ٣٦ | ٤٢ | ٣٢ | ٥١٧ |
| | | ٦ | ١٠ | ٤ | ٢ | ٤ | ١ | ٢ | ٣ | ١ | ٣٣ |

ماوەیەك بۆ چاككردنەوە چۆڵ كراوە، مانگی تشرینی دووەم دەوامەكەی كرایەوە. لە مانگی ئابدا دەسەڵاتدارانی مەدرەسەكە رازی بوون بەوەی زانیاریو رێورەسم لە بەرێوەبەرێتی گشتی وەربگرنو، لێپرسراوێتی پشكنینی ئەوان قبوول بكەن. بۆ ئەوەی (مەدرەسە)كە رێك بخرێتەوە. مەدرەسەكە، ئێستا لە دوو بەش پێكهاتووە، بەشی ئایینیو بەشی هونەر. تەنیا ئەوانە وەردەگرێ كە قوتابخانەی سەرەتاییان بە سەركەوتوویی تەواو كردووە. قوتابیانی مەدرەسەكە ژمارەیان (٦٠) قوتابییە.

بێ شك پۆلەكان بچووكو ماموستاكانیش تا بڵێی زۆرن. ئەوقاف هێشتا هەر خزمەتو چاودێری بینای مەدرەسەكە دەكات، بەڵام كارمەندانی پەروەردە ئەمساڵ زۆربەی كاتو ماندوێتی خۆیان بۆ چاودێریو پشكنینو تاقیكردنەوەی ماموستاكان سەرف كردووە، ئەوەیان بۆ روون بووەتەوە كە زۆربەی ماموستاكان زیادنو پێویست نین.

قوتابخانەكە، وەك چاوەروان دەكرا، سەركەوتنو بەرەوپێشەوە چوونی نیە، چونكە زۆربەی وانەو پرۆگرامەكان ئێستاش كۆنن. ماموستای توركی، بەكارهێنانی زمانی توركیو سەرچاوەی وانەكانی كتێبی توركین، هەڵبەتە بۆ ئێستا ئەمانە هەڵگری هەندێ مەبەستی سیاسی خۆیانن[٥].

پەیوەندی فەرمانبەری پەروەردە لەگەڵ حكوومەتدا باشە، لەگەڵ قوتابخانە سەرەتاییەكەدا تا رادەیەك پێچەوانەوەیە.

قوتابخانەكانی دیانو جووەكان، لە بەهاردا دەستكاری كران. هەریەكە لەم قوتابخانانە نزیكەی (٤٠) قوتابییان هەیە. پەروەردەو فێركردنیان تێدا بەزۆری، نەك بە گشتی، هی ئایینین، تا ئێستا پارەیان نەدراوەتێ، بەڵام لەوانەیە لە ساڵی (١٩٢٠)دا خەرجییان بدرێتێ، چونكە لەو دەزگایانەن كە شیاوی یارمەتین[٦].

*** حوجرەكان (قوتابخانەی مزگەوت):**

لە كەركوك ژمارەیان (١٠) دانەو (٣)یان مەدرەسەی ئەوقافە، سێ لە ماموستاكان لە ئەوقاف مووچە وەردەگرن، سێ (مودەریس)یش هەریەكەو مووچەی خۆی لە پارەی زەویو زاری ئەوقاف دەردەهێنێ. حوجرەكان، لە راستیدا بێ قوتابی (فەقێ)نو حاڵەتی كارەكانیان بە شێوەیەكە ناكرێ بە قوتابخانە بژمێردرێن. لە هەموو مەدرەسەكاندا سەرجەم (١٢٠) فەقێ هەن. لە كفری (٣) حوجرە هەنو بە گشتی (٦٠) فەقێیان هەیە.

بەڵام لە تووز حوجرەیەك لەبەر پیریو ناشارەزایی مەلاكەی، داخراوە. بەڵام دوو حوجرەی بچووكی تر هەن كە سەرجەم (٤٥) فەقێیان هەیەو بەردەوامن لە كارەكانیان. تەنیا قورئانو زمانی توركی (مەولوودنامەی توركی) لەم حوجرانەدا دەخوێندرێن (مەولوود نامەی شاعیری توركی تۆفیق فیكرەت ئەفەندیو ئینشالەر، وەرگێر). حوجرەی مزگەوتەكان، هیچ كەرەستەو پرۆگرامێكی بابەتی خوێندنو فێركاریان تێدا نییە، بێ ئەندازەو بێ سەروبەرو ناشارەزان. دژایەتی خاوەندەكانی ئەم قوتابخانەو حوجرانە بەرامبەر بە قوتابخانەكانی فێربوونو پەروەردەكردنی راستەقینە، هۆیەكی سەرەكیو كاریگەرە بۆ مەترسی خەڵكەكە لە پێشوازیكردنو پەرۆشییان بۆ ناردنی منداڵان بۆ قوتابخانە حكوومییەكان.

ئێمە زانیومانە كە ئەم تێنەگەیشتووانە، تۆمەتی بێ بناغەو هەڵبەستراو و درۆ دژ بە حكوومەتو قوتابخانەكانی، لە ناو خەڵكەكەدا بڵاودەكەنەوەو، دەڵێن گوایە حكوومەت بە نیازە ئەو منداڵە بچووكانە هەڵبخەڵەتێنێو لە خەڵك جیایان بكاتەوەو بە سواری ئۆتۆمبیل رەوانەی لەندەن یا (بۆمبای) یان بكات، ئەم كەسانە لەلایەن دەسەڵاتی بەریتانییەوە بەشێنەییو بە سەبرەوە مامەڵە دەكرێنو بە تەواوەتی چاودێری كارەكانیان دەكرێ.

* سەرچاوەکان:-

١- سیستمی پەروەردەو خوێندن لە ویلایەتی مووسڵی عوسمانیدا، بە دوو شێوە بووە:-

- ئەو قوتابخانانەی کە سەر بە وەزارەتی مەعاریف بوون.
- ئەو قوتابخانانەی کە سەر بە دائیرەکانی ئەوقاف بوون، کە قوتابخانە یان مەدرەسە دینییەکان‌و حوجرەکانیان دەگرێتەوە. ئەو قوتابخانانەی کە سەر بە وەزارەتی مەعاریف بوون، پێك هاتبوون لە قوتابخانەکانی سەنایع‌و قوتابخانە سەرەتاییەکان. بەپێی زانیارییەکانی مسز بێل لە Review گەشتەکەیدا، (١٩٠٧)ی زاینیی لە سەرتاسەری ویلایەتی موسڵ، لەگەڵ ئەوەی هیچ قوتابخانەیەك نەبوو بۆ کچان، بە گشتی قوتابخانەکان (مەکتەبەکان) بەم شێوەیە بوون:

لە کەرکووك: یەك مەکتەب (قوتابخانە)ی روشدییە، یەك مەکتەبی سەرەتایی‌و پازدە مەکتەبی حوجرە هەبووە. لە سلێمانی: یەك مەکتەبی روشدییەی عەسکەری، یەك مەکتەبی روشدییەی مولکی، یەك مەکتەبی سەرەتایی‌و (٤٤) (مەکتەبی حوجرەی منداڵان) هەبووە، لە کفری (سەلاحیە) مەکتەبێکی روشدییەی یەك مەکتەبی سەرەتایی‌و دوو حوجرەی منداڵان هەبووە، لە هەولێر (ئەربیل): یەك مەکتەبی روشدییە، یازدە مەکتەبی سەرەتایی‌و شەش حوجرەی منداڵان هەبووە، لە قەزای رەواندووز: یەك مەکتەبی روشدییەو (٢٢) حوجرەی منداڵان هەبووە (بڕوانە: لاپەرە (١٤٠)ی (Review)ی مسز بێل).

شایەنی باسە، کاتی بەڕێوەبەرێتی (محەمەد عەونوڵڵا)ی موتەسەریفی لیوای کەرکووك (١٩١٠- ١٩١٣)، قوتابخانەیەکی پیشەسازی بەناوی مەکتەبی (سەنایعی سوڵتانییە)وە دروستکرا. وەك مامۆستا رەفیق حیلمی لە لاپەرە (١٤١)ی (یادداشت)کەیدا روونی دەکاتەوە، مەکتەبی سوڵتانییە هەمان مەکتەبی روشدییەیە، بەڵام ناوەکەی لە پێش شەری گەورەدا گۆڕاوەو هەر لە هەمان بینادا ماوەتەوە کە دەکەوێتە قەراخ رووباری (خاسە) بە بەری (سەرا) دەرگای دەرەوەی مەکتەبەکە دەیروانییە ئەو شەقامەی کە بەهۆی پردە کۆنەکەوە چووە ناو (قەڵا) (یادداشت، لاپەرە ١٤١).

٢. بەپێی بۆچوونی ستیڤن لۆنگریك، کۆمەڵەی یەکێتی ئیسرائیل ساڵی (١٩٠٧)، قوتابخانەی تایبەتی لە بەغدا، مووسڵ، حلله، بەسرەو خانەقین بۆ منداڵانی جوو کردووەتەوە، بەپێی ئەم راپۆرتە بێ، دەبێ جووەکان لە سەرەتای ساڵی (١٩١٨)ەوە قوتابخانەی تایبەتی خۆیان لە کفری‌و ساڵی (١٩١٩) لە شاری کەرکووك کردبێتەوە (بڕوانە: لاپەرە (٥٠)ی ١٩٠٠-١٩٥٠ Iraq).

٣. هەروەك بابەتەکانی تر، لە سەرەتاوە دەسەڵاتی بریتانی‌و ویستوویەتی کاروباری هەرسێ ویلایەتەکەی میسۆپۆتامیا لە بەغداوە بەڕێوەبەرێ. بۆیە یەکەم هەنگاوی دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریف (مودیرییە المعارف)بوو کە هاوینی (١٩١٨)دا بە سەرۆکایەتی مێجەر بۆورمان لە بەغدا دایمەزراند. بۆورمان، بەخۆی پێش هاتنی بۆ میسۆپۆتامیا سەرۆکی وەزارەتی مەعاریفی میسر بووە (بڕوانە: لاپەرە (١٠٣)ی مسز بێل Review)).

٤. سەبارەت بە قوتابخانە (مەکتەب)ە کانی کەرکووك، مامۆستا رەفیق حیلمی لە (یادداشت)ەکەیدا زانیارییەکی زۆرمان پێشکەش دەکات. ئەو سەربارەت بەو قوتابخانە سەرەتاییە کە لە راپۆرتەکەدا باسی هاتووە، دەڵێ: "بە یادی سەرکەوتنی ئینگلیز لە شەردا، ئەو قوتابخانەیە کرابووەوە". هەروەها دەڵێ: "مەکتەبی زەفەر بە واتای سەرکەوتن لە خانەقای سەید ئەحمەد کرابووەوە". هەرچی لەم راپۆرتەدا هاتووە ئەوەیە کە قوتابخانەکە پاشان لە مانگی ئابدا گواستراوەتەوە بۆ خانەقای سەید ئەحمەد. رەفیق حیلمی، ناوی بەڕێوەبەری‌و هەندێ مامۆستای ئەو قوتابخانەیە بەم شێوەیە دێنێ، جگە لە (شوکری عەبدولئەحەد)ی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، مامۆستاکان ئەمانە بوون: رەشید عاکف هورمزی، ساڵح قازی ناسراوە بە (ساڵح بۆلشەوێك) کوری قازییە رەشە، سەعدوڵڵای موفتی دەروێش ئەفەندی، ئەورەحمانی مەلا مەحموودی مەزناوەیی، شەوکەتی عەبدوڵڵا ئەفەندی کە (مامی رەفیق حیلمی بووە)و مامۆستا سەید هادی. هەروەها سەبارەت بە گواستنەوە یا بەکرێدانی خانەقای سەید ئەحمەد بە قوتابخانەی زەفەر، رەفیق حیلمی دەڵێ:- "خەڵك بەتایبەتی کوردەکان، ئەمەیان بەبێ حورمەتی زانی بۆ سەید ئەحمەدی خانەقا قبوولی بکات مەکتەبەکە لە خانەقامەدا بکرێتەوە، یادگاری سەرکەوتنی دەوڵەتێکی ناموسڵمانە". بەڵام شێخ رەئووف خانەقا لە لاپەرە (٢١)ی کتێبی (یادگاری خانەقا یادداشت‌و شیعر)دا وا پیشان دەدات کە ئینگلیز بۆ ئەوەی سەربخاتە سەر سەید ئەحمەد ئەم کارەی کردووە. مەلا قادری بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکووکی هان دا، لایەك لە حەوشەی مزگەوتی خانەقا دابڕێ‌و بیکات بە (مەدرەسەی دینی) ئەمڕۆکە جێگەی ئەو مەدرەسەیە کتێبخانەی گشتییە.

هەرچەندە ئینگلیز پاش چەند ساڵێك سەید ئەحمەدی دەستبەسەر رەوانەی خوارووی عێراق کرد، بەڵام راستییە مێژووییەکان ئەو دەردەخەن کە مەلا قادری ئەوقاف، هیچ پەیوەندی نەبووە بە قوتابخانەو مەکتەبە حکوومییەکانەوە. ئەو زیاتر لە سەرەتادا بەڕێوەبەری (مەدرەسەی عیلمییە)ی بابەتەکانی ئاینی بووە، لە دواییشدا کراوە بە بەڕێوەبەری ئەوقاف.

ئەوەتا رەفیق حیلمیش ئەم راستییە دەردەبڕێ‌و دەڵێ: "لەو دەمەدا جگە لە (زەفەر) قوتابخانەیەکی تریش هەبووە بەناوی (مەدرەسەی عیلمییە)وە مەلا قادری ئیمام مدیری بوو. ئەم مەلا قادرە لە دواییدا بووە بە بەڕێوەبەری ئەوقاف". دەبێ ئەویش بڵێن کە رەفیق حیلمی دوو سێ ساڵی پاش ئەم راپۆرتە، لەلایەن نازیری مەعاریفەوە دوای لێکرا بەبێ وەستان بێت لە مەکتەبی (زەفەر) دەرس بڵێتەوە. لە (١٦)ی ئاداری ساڵی (١٩٢١)دا کراوە بە مامۆستای ماتماتیك‌و زمانی تورکی لەو قوتابخانەیەدا (بڕوانە: لاپەرە (١٣٣) تا (١٤١)ی یادداشت).

٥. مسز بێل لە لاپەرە (١٠٥)ی ( Review)کەیدا، نەبوون‌و

دامەزراندنی قوتابخانەو مەکتەبی تایبەت بە منداڵانی کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ کاری تەکنیکیو نەبوونی کەرەستەو پێداویستییەکانی وتنەوەی زمانی کوردیو دەڵێ: "زمانی کوردی وەك زمانی یارمەتیدەر، لەبەر نەبوونی کتێبی خوێندنەوەو ڕێزمانی تایبەت، بە گشتی پەك خراوە". دکتۆر جەبار قادریش لە وتاری: "کەرکوك، قرنو نصف من التتریك و التعریب"دا، ئەمە بە بەهانە دەزانێو، پێی وایە ئەمانە ڕێگرتنو تاوێردانان بوون لە ڕێگەی کردنەوەی قوتابخانەی کوردییدا بۆ منداڵانی شارێك کە زۆربەی خەڵکەکەی کورد بوون. بێ گومان بۆ چوونەکەی دکتۆر جەبار ڕاستە، چونکە ئەگەر تەواو سەرنجی مەسەلەکە بدات، دەزانێ ڕستەی (بۆ ئێستا ئەمانە هەڵگری هەندێ مەبەستی سیاسی خۆیان) لەم ڕاپۆرتەدا، جگە لە ڕازیکردنی تورکی دۆڕاو پشتگوێخستنی ویستەکانی کورد شتێکی تر نین.

٦. بۆ تێگەیشتنی بارودۆخی گشتی پەروەردەو خوێندن لە سەرتاسەری هەر سێ ویلایەتەکەدا (مووسڵ، بەسرەو بەغدا) وەك لە لاپەرە (١٠٥)ی (Review)دا هاتووە، کۆتایی ساڵی (١٩١٩)، کە دەکاتە کاتو ساتی ئەم ڕاپۆرتە، (٧٥) قوتابخانەی حکوومی هەبووە، (٥٦)یان عەرەبیو (١١) بە تورکیو (٦)یان بە کوردی بوون، بە گوێرەی زانیارییەکانی (یادداشت)، لەو شەش قوتابخانە کوردییە، سێیانیان لە سلێمانی بوون، قوتابخانەکانی سلێمانی لەو ساڵانەدا دوویان (نموونەی سەعادەت)و (نموونەی عیرفان) بوون، ئەوەی سێیەم دوور نییە لە هەڵەبجە بووبێ، لەم قوتابخانانەدا بەگشتی (٨٠٠) قوتابی هەبووە (یادداشت، لاپەرە ٥٣٤). شایانی باسە، سەرەتای ساڵی (١٩٢٠)، لە میسۆپۆتامیا، لە هەزار منداڵ تەنیا (٦)یان لە قوتابخانەدا بوون (بڕوانە: لاپەرە (١٠٣)ی Review).

٧. بە تەماشاکردنی ئەم خشتەیەو بەراوردکردنی ژمارەکانی لەگەڵ ژمارەی گشتی دانیشتوانی شارەوانییەکانی کەرکوك، کفری، توزو پردێدا، دەکرێ ئەم خاڵانەی خوارەوە روون بکەینەوە:

- ڕێژەی ئەو کەسانەی کە قوتابی ئەو قوتابخانانە بوون بێ ئەندازە نزمەو تەنیا لە ١,٩٢٪، واتە لە هەر سەد کەسدا کەمتر لە دوو قوتابی بوون.
- بەپێی خشتەکە بێ دەبێ لەو ساڵەدا سیستەمی خوێندن دوانزدە مانگیش بووبێو پشووی هاوینەی نەبووبێ.
- ژمارەی قوتابیان لە مانگی یەکەمەوە تاکو مانگی دوانزە لە (٢٠١) قوتابییەوە بووەتە (٥٦٧)، واتە بە ڕێژەی (٢٨٢٪) زیادی کردووە، ڕێژەی مامۆستاکانیش (١٧٥٪) زیادی کردووەو ژمارەیان لە (٢٠)تەوە گەیشتووەتە (٣٥) مامۆستا.
- لەناو ژمارەی گشتی قوتابیانی قوتابخانەکاندا، تەنیا ٤٨ کچ هەبووە، واتە ڕێژەی ٣,٤٪ لە سەد قوتابی تەنیا (٤,٨) یان کچ بووە.
- ژمارەی قوتابیانی قوتابخانە تایبەتەکانی دیانو جووی دەڤەرەکە، (١٨٠) بوو، واتە بەڕێژەی (٣١,٧٪)ی ژمارەی گشتی قوتابییەکان.

قوتابخانەکانی مزگەوتەکان (حوجرەکان).

## * ڕەوشی خوێندن و فێرکردن:

د. دڵشاد عوسمان

سەبارەت بە ڕەوشی خوێندن و فێرکردنی شاری کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتیدا، پێویستە لە چەند ڕوانگەیەکەوە لێی بڕواندرێت. چونکە بە تەنها باسکردنی ڕەوشی خوێندن لە قوتابخانەکاندا، بە دروستی چوارچێوەی ڕۆشنبیریی دانیشتوانی شاری کەرکوك ناداتە دەست. بۆیە پێویست دەکات، لە پای شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی بارودۆخ و ڕوونکردنەوەی ئاست و ئاستەنگەکانی بەرێوەچوونی ڕەوتی خوێندەواری لە شارو ناوچەکە، باس لەم لایەن و چەشنە خوێندنانە بکرێت: خوێندنی فەرمی، خوێندنی ئایینی[1]، خوێندنی ئەهلی و ئێواران، دواجاریش کتێبخانەو چاپخانەو چاپەمەنییەکان.

### أ. خوێندنی فەرمی:

لە سەروەختی دروستکردنی دەوڵەتی عێراق ساڵی (١٩٢١)، مێژووی پەیدابوونی ئەم چەشنە خوێندنە لە ناوچەو شارەکەدا، کۆن و بەربڵاو نەبوو. ئەم چەشنە خوێندنە لەو ڕۆژگارە لەنێو دانیشتواندا باو نەبوو، خەڵکی بە چاکی پێی ئاشنا نەبوون. چونکە دەسەڵاتدارانی پێشوو بایەخ و گرنگیی جیدیان بە ڕەوشی خوێندن و فێرکردنی نوێ و فەرمی نەدابوو[2]. بۆیە بەشی گەورەی دانیشتوانی ناوچەکە نەخوێندەوار بوون. دەوڵەتی عوسمانی ئەو بایەخ و گرنگی پێدانەیشی بە ڕەوشی خوێندن و فێرکردن دابوو، لە تەواوی ویلایەتەکانی عێراق، بە زۆری لە چوارچێوەی خوێندنی سەرەتایی قەتیس مابوو[3].

درەنگتر، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، دەسەڵاتدارانی عوسمانی، چەند چەشنە خوێندنێکی دیکەیان داهێنا، وەك: قوتابخانەکانی ڕوشدییە، قوتابخانە ئامادەییەکانی موڵکی. ئەوەی تایبەت بێت بە شاری کەرکوك، قوتابخانەی ڕوشدییە ساڵی (١٨٧١)[4] و قوتابخانەی ئامادەیی موڵکی دوای ساڵی (١٩٠٨) لە شاری کەرکوك پەیدا بوون، کە ژمارەی قوتابیانی قوتابخانەی دواییان تەنها (١٣٥) قوتابی بووە[5]. سەبارەت بە ڕەوشی خوێندن و فێرکردنی مێینەو قوتابخانەی کچانیش، تا خوری دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچەکە ئاوابوو ئەم چەشنە خوێندنە نەهاتە ئارا[6].

سروشتی، زمانی خوێندن لەو خوێندنگایانەی ڕۆژگاری عوسمانی، زمانی نەتەوەیی سەردەستە (تورکی) بوو. لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق و نەمانی دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکان، زمانی عەرەبی لە عێراقدا کرایە زمانی خوێندن. بەڵام ئەم ڕەوشە بەسەر شاری کەرکوکدا کاریگەری نەبوو. چونکە زمانی تورکی، زمانی باوی دانیشتوانی شار بوو. بۆیە زمانی تورکی لە شاری کەرکوکدا، بە پلە یەك، بە زمانی خوێندن مایەوە. لە پاڵ خوێندن بەم زمانە، خوێندنی بە زمانەکانی دیکەش لە خوێندنگەکانی شاردا وردە وردە پەیدابوون، وەك: کوردی و عەرەبی، کە لە دواتردا باسیان دەکەین. لەو ڕۆژگارەدا لە ئاکامی نەبوونی قوتابخانەی ئامادەیی و دووری قوتابخانەکانی لەو جۆرە. هەموو قوتابییەك نەیدەتوانی خوێندن تەواو بکات و ببێتە کاربەدەست و کارمەندی میری. تەنها کورانی بنەماڵە پارەدارو دەستڕۆیشتووەکانی شار، بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن. دەیانتوانی ڕوو بکەنە ئەستەمبوڵی پایتەخت[7].

نوێنەرانی کەرکوك لە (ئەنجوومەنی مەبعووسانی عوسمانی) دا، بە مێژووی (١)ی ئاداری ساڵی (١٩٠٩)[8]، لەپێناو چاکترکردنی ڕەوشی خوێندن و فێرکردن و گەشەپێدان و کردنەوەی قوتابخانەی دیکەی ئامادەیی و ڕوشدییەو سەرەتایی لە شاری کەرکوکدا، یادداشتیان بەرزکردۆتەوەو نارازیبوونە سەبارەت بە ڕەوشی دواکەتووی خوێندن و فێرکردن لە شارو تەواوی سنجەقەکە[9]. بەڵام ئەم تێکۆشان و هەوڵانە لە ئەنجامی فەرامۆشکردن و پشتگوێخستنی دەسەڵاتدارانی عوسمانی بۆ داواکارییەکانی نوێنەرانی کەرکوك، بێ ئاکام بوو.

بە گوێرەی زانیارییە تۆمارکراوەکانی نێو ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ بۆ ساڵی (١٣٣٠)ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی (١٩١٢)ی زایینی، لە تێکرای (٣٠) دانە قوتابخانەی سەرەتایی لە سەرانسەری ویلایەتەکە، تەنها (٤) قوتابخانە بەر شاری کەرکوك کەوتووە، کە لە کۆی گشتیی ژمارەی قوتابیانی ویلایەتەکە (١٧٩٣) قوتابی، ژمارەی قوتابیانی شاری کەرکوك بریتیبووە لە (٣٧٨) قوتابی[10]. لە بارێکدا ئەگەر لێکدانەوەی وردو بابەتییانەی بۆ ئەم زانیارییە بکرێت و سروشت و واقیعی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیی دانیشتوانی شاری کەرکوك لەبەرچاو بگیرێت، دەردەکەوێت ڕەوشی خوێندن و فێرکردنی ئەو ڕۆژگارەی شارەکە لە بارێکی نالەبارو دواکەوتوودایە[11].

لە ئاکامی سیاسەتی فەرامۆشکردنی ڕەوتی خوێندن و فێرکردنی ناوچەکەو ویلایەتەکە لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە، لە سەروبەندی هاتنی بەریتانییەکان بۆ ناوچەکە لە ساڵی (١٩١٨)دا، ڕێژەی نەخوێندەواری زیاتر لە (٩٨٪) بووە[12]. ئەم ڕەوشە، تا دوای لەناوچوونی حوکمرانیی عوسمانی و هاتنی ئینگلیزەکان و داکەوتنی قۆناغی داگیرکاری (١٩١٨-١٩٢٠)، هەر بە دواکەوتوویی مایەوە. لەو قۆناغەدا، ساڵی (١٩١٩) یەك قوتابخانەی سەرەتایی کوران لە شاری کەرکوك بەناوی (ظفر)ەوە دامەزراوە. بەڵام لەگەڵ هاتنە ئاراو دەستپێکردنی قۆناغی ئینتیدابی بەریتانی (١٩٢٠-١٩٣٢)، گۆڕان و پەرەسەندنێکی بەرچاوی چەندێتی و چۆنییەتی، بەسەر ڕەوشی خوێندن و فێرکردنی شارەکەدا هات.

بەڵگەو نموونەی قەڵەمبازی بەرەوپێشچوونی ڕەوشی خوێندن و فێرکردن لە شاری کەرکوکدا، دەکارێت لەو فاکتەرەتەدا ڕوون ببێتەوە، کە ژمارەی قوتابخانە فەرمییەکانی کەرکوك بۆ ساڵی خوێندنی (١٩٢٠-١٩٢١) لە چوار قوتابخانە تێپەڕی نەکردبێ، بەڵام تەنها بە تێپەڕینی سێ ساڵ (١٩٢٤-١٩٢٥)، ژمارەیان بۆ حەڤدە قوتابخانە بەرز بوو بێتەوە[13].

رەوتی ئەم پەرەسەندنە خێرایە، (وەك لە خشتەی ژمارە (١) دا خراوەتەروو)، بۆ کۆمەڵێك هۆی تێکهەڵکێش دەگەڕایەوە، کە گرنگیدانی فەرمیو میللی (شعبی) لە دوای دامەزرانی حکومەتی نیشتمانیو ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی دواکەوتووی چەند ساڵەی عوسمانی، یەکێك لە هۆیە بەرچاوەکان بوو. بەو پێودانەی بایەخدان بە کاروباری خوێندنو فێرکردن کۆڵەگەی سەرەکیی سەربەخۆبوونی ڕاستەقینەیە[١٤].

خشتەی ژمارە (١)

ژمارەی قوتابخانە فەرمییەکانی شاری کەرکوك لە سەروبەندی کێشەی ویلایەتی موسڵ[١٥].

| ساڵی خوێندن | ژمارەی قوتابخانە | جیاوازیی زیادەبوون |
|---|---|---|
| ١٩٢٠ – ١٩٢١ | ٤ | ... |
| ١٩٢١ – ١٩٢٢ | ١١ | ٧ |
| ١٩٢٢ – ١٩٢٣ | ١٢ | ١ |
| ١٩٢٣ – ١٩٢٤ | ١٧ | ٥ |
| ١٩٢٤ – ١٩٢٥ | ١٨ | ١ |

وەك لە خشتەی سەرەوەدا دەردەکەوێت، لەنێوان ساڵانی خوێندنی (١٩٢٢ – ١٩٢٣)و (١٩٢٣ – ١٩٢٤)دا، پەرەسەندنێکی گەورە لە ژمارەی قوتابخانە فەرمییەکانی شاری کەرکوك هاتووەتە ئارا. هەرچەندە پاساوی ئەم پەرەسەندنە، لە گرنگیدانی دەسەڵاتدارانی ئینتیداب بە رەوشی خوێندنو فێرکردنی شارەکە لە سەروبەندی ئارادابوونی کێشەی ویلایەتی موسڵ دەدرێتەوە، بەڵام هێشتا لەگەڵ لۆژیکی مێژووییو واقیعی پەرەسەندنی رەوشی خوێندنو فێرکردنی شارەکانی دیکەی نێو ویلایەتی موسڵ وێك نایەتەوە. بۆیە ئەم زانیارییە بەلامانەوە گوماناوییە. پێدەچێت بنەرەتو سەرچاوەی دەستکەوتنی زانیارییەکە، دروست نەیتوانی بێت جیاوازی لەنێوان چەشنی قوتابخانە فەرمیو ئایینیو ئەهلییەکاندا (سیڤیل) بکات. لەو ئاکامەشدا تێکەڵاوبوونو درشت ڕوانینێك هاتبێتە ئارا. وەك توێژەرێکیش جەختی لەسەر کردووەتەوە، فەرمانبەران لە وەزارەتی مەعاریف (پەروەردە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا)، سەبارەت بە چەمکەکانی (مەکتەب) و (مەدرەسە)، سەرلێشێواوییان لە لا دروستبووە، کە ئەمەی دواییان بۆ قوتابخانە ئایینییەکان بەکار دەهات[١٦].

بە لێکدانەوەو سەرنجدانێکی ووردیش، ڕوونتر دەردەکەوێت ئەم گومان بردنە لە جێی خۆیدایە. چونکە بەپێی زانیارییەکی هەڵبواردراوی ڕاپۆرتێکی بەریتانی، ڕوون دەبێتەوە ژمارەی خوێندنگەکانی کەرکوك لە سەرەوەختی هاتنی ئینگلیزەکان بریتیبووە لە تاکە قوتابخانەیەکی ڕوشدییەو یەك قوتابخانەی سەرەتایی. کە چی خوێندن لە حوجرەی مزگەوتەکان گەیشتووەتە پانزە خوێندنگە[١٧]. لە کاتێکدا، ئەو ڕاستییەش بزانرێت، کە خوێندنی فەرمی لە دوای هاتنی ئینگلیزەکانو دروستبوونی دەسەڵاتی نیشتمانی، لانیکەم بە گوێرەی سەرچاوەکانی بەر دەست، گەشەکردنێکی وای بەخۆوە نەدی بێت، تەمی گومانی ئەم بابەتە بە یەکجاری دەرەوێتەوە.

بە هەر حاڵ، پەرەسەندنەکانی بواری خوێندنو فێرکردن لە سەردەمی ئینتیدابی بەریتانی، هەر بە تەنها بریتی نەبوو لە زۆربوونی ژمارەی قوتابخانە فەرمییەکان، بەڵکو گەشەکردنو پەرەسەندنی چۆنییەتیشی بەخۆوە گرت. نموونەی ئەم پەرەسەندنە چۆنییەتییە دەتوانرێت لە ڕۆچنەی کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی کچانی موسڵمان بۆ یەکەمجار بە نێوی (ئاوچی)یەوە، لە ساڵی خوێندنی (١٩٢١ – ١٩٢٢)دا، لە شاری کەرکوك تەماشا بکرێت[١٨]. شاری موسڵ، کە مەڵبەندی ویلایەت بوو، لە ڕۆژگاری حوکمڕانیی عوسمانییەوە دوو دانە لەم چەشنە قوتابخانەیەی تێدا دامەزرا بوو[١٩]، دەبوو پێشتر لە شاری کەرکوك قوتابخانەی لەم شێوەیە بکرێتەوە. چونکە دانیشتوانی شاری کەرکوك خاوەن کەسایەتیی کراوەو ئارەزووی خوێندنیان بەهێز بووە. سەرباریش خاوەنو مەڵبەندی بەرچاوی کادیری چاکی پرۆسەی خوێندنو فێرکردن بووە. بێ هۆ نەبوو لە کاتی دامەزراندنو هاتنە ئارای یەکەم حکومەتی نیشتمانی لە عێراق لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٠) بە سەرۆکایەتی (عەبدولرەحمان گەیلانی)، کەسایەتیی دیاری کەرکوك (عیزەت پاشای ساری کەهیە)(*) بە وەزیری مەعاریفو تەندروستیی گشتی دەستنیشان بکرێت، کە ئەو ڕۆژگارە لە یەك وەزارەتدا کۆکرابوونەوە[٢٠].

نموونەیەکی دیکەی پەرەسەندنە چۆنییەتییەکانی بواری خوێندنو فێرکردنی شاری کەرکوك لە سەردەمی ئینتیدابی بەریتانی، بریتییە لە کردنەوەی باخچەی ساوایان بە ماوەیەك بەر لە تەواوبوونی سەردەمی ئینتیدابی بەریتانی لە ساڵی (١٩٣٢)، بە مەبەستی بەهێزکردنی فێرکردنی بەراییو سەرەتاییەکان، کە ئەو ڕۆژگارە لە سەرتاسەری لیواکانی عێراقدا تەنها پێنج دانە هەبوو: دووانیان لە بەغداد، دانەیەك لە موسڵ، دانەیەك لە بەسرە[٢١]. ئەم باخچەیە خاوەنی تاکە پۆلێكو هۆبەیەك بووە[٢٢]. بەڵام لە ساڵانی دواتر (١٩٣٩ – ١٩٤٠)، واتە دوای تێپەڕینی نزیکەی دە ساڵ، بووە بە چوار پۆلو نۆ هۆبە[٢٣].

لە شاری کەرکوکدا، هەر لەگەڵ پەیدابوونی خوێندنی نیشتمانی، کۆمەڵێك گیروگرفتو ئاستەنگی گەورەی لەبەردەم پرۆسەی خوێندنی فەرمیدا قووتبۆوە. لەوانە: کەمی ژمارەی وانەبێژو کەم ئەزموونییان (ئەفسەرو زانای ئایینی)، نەشیاوی پرۆگرامی خوێندن کە بەریتانییەکان لە میسرەوە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان، وەرگرتنی برە پارەی مانگانە (یەك ڕووپیە) لە قوتابییان، کەمی قوتابخانەکانو خراپییان، هاوشێوە نەبوونی زمانی خوێندن لە سەرجەم قوتابخانە سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەییەکان، نەبوونی خانەی پێگەیاندنی مامۆستایان، نەبوونی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی تایبەت بە ناوچەکەو.. تادوایی[٢٤]. بەڵام دووان

لەو گرفتانە، لە هەمووان پترتر کاریگەرییان بەسەر ڕەوشی خوێندنو فێرکردنی شارەکەوە هەبوو: یەکەمیان، بریتیبوو لە گرفتی کەمیی قوتابخانەو پێویستییەکانی دیکەی خوێندن. دووەمیان، گرفتی زمانی خوێندن بوو.

ئاشکرایە قوتابخانە لە پرۆسەی خوێندنو فێرکردندا کۆڵەگەی سەرەکیو بنەڕەتییە، کەمیی ژمارەشیان دەبێتە مایەی سستبوونی پرۆسەی خوێندنو فێرکردن. وەك لە لاپەرەکانی پێشەوەدا ئاماژەمان بۆ کرد، لە دوای هاتنی ئینگلیزەکان، ساڵی (١٩٢٠)، تەنها یەك قوتابخانەی ڕوشدییەو یەك قوتابخانەی سەرەتایی لەنێو شاری کەرکوکدا هەبوو. ئەم بارە بە تێپەڕینی دە ساڵ (١٩٣٠)، گۆڕانێکی بنەڕەتیی ئەوتۆی بەسەردا نەهات. ژمارەی قوتابخانەکان بە بەراورد بە زۆربوونی سروشتیی ژمارەی دانیشتوان، ساڵ لە دوای ساڵ، لە کورتی داوە.

لە کۆتایی قۆناغی ئینتیداب (١٩٣٢ - ١٩٣٣)، ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکان لە هەموو لیواکانی عێراق خۆیدا لە (٣٩٠) قوتابخانە، لە کاتێکدا لەو ژمارەیە تەنها (٢٩) قوتابخانەی سەرەتایی لە هەر هەموو لیوای کەرکوکدا هەبووە[٢٥]. هۆی سەرەکیی ئەم گرفتەش بۆ سیاسەتی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدارانی ئینتیداب بەرانبەر بە ڕەوتی خوێندنو فێرکردن لە تەواوی عێراق دەگەڕایەوە. بێ سوود نابێت لەم بارەوە بوودجەی وەزارتی مەعاریف لەو ساڵانەدا بخرێتە ڕوو. (بڕوانە خشتەی ژمارە (٢) ڕێژەی خەرجییەکانی وەزارەتی مەعاریف لە بوودجەی گشتییدا).

**خشتەی ژمارە (٢)**

**بەشە بوودجەی وەزارەتی مەعاریف لە ساڵانی (١٩٢١-١٩٣٠)دا[٢٦].**

| ساڵ | خەرجیی فێرکردن* | خەرجییە گشتییەکان | ڕێژەی خەرجیی فێرکردن لە بوودجە |
|---|---|---|---|
| ١٩٢١ | ١٩,٣٦ | ٥٧٢,١٣ | ٪ ٣,٤ |
| ١٩٢٢ | ١٩,٩٤ | ٤٨٥,٨٢ | ٪ ٤,١ |
| ١٩٢٣ | ١٨,١٥ | ٤٢٤,٢٧ | ٪ ٤,٢ |
| ١٩٢٤ | ٢٢,١٣ | ٤٦٤,٨٥ | ٪ ٤,٨ |
| ١٩٢٥ | ٢٣,٤٨ | ٥١٣,٣٨ | ٪ ٤,٥ |
| ١٩٢٦ | ٢٦,٩٣ | ٥٣٦,٧٢ | ٪ ٥,٢ |
| ١٩٢٧ | ٢٧.٤٢ | ٥٦٩,٩٣ | ٪ ٤,٨ |
| ١٩٢٨ | ٣٢,٠١ | ٥٩٩,١١ | ٪ ٥,٤ |
| ١٩٢٩ | ٣٧,١٨ | ٥٧٦,٦٦ | ٪ ٦,٤ |
| ١٩٣٠ | ٤٠,٠٠ | ٥٣٢,٥٧ | ٪ ٧,٥ |

وەك لە خشتەکەدا دیارە ڕێژەی خەرجییەکانی خوێندنو فێرکردن لە بوودجەی گشتیی وڵاتدا هیچ ساڵێکی خوێندن لەو ماوەیەدا (١٩٢١-١٩٣٠)، ئاستێکی بەرزو لەباری بەخۆوە نەبینیوە. بەرزترین ئاستی تایبەتکردنو خەرجییەکانی وەزارەتی مەعاریف ساڵی (١٩٣٠) بووە، کە هێشتا دەست بە خەرجکردنی بڕە پارە تەرخانکراوەکە نەکراوە، ئەویش بریتیبووە لە (٧.٥٪)ی لە تێکڕای بوودجەی گشتی. سەرەڕای ئەوەش سیاسەتی دەسەڵاتدارانی ئینتیداب بەرانبەر بە پرۆسەی خوێندنو فێرکردن لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکەش جیاوازی هەبووە. بۆ نموونە ئەو ڕێژە پارەیەی لە داهاتی لیوا کوردییەکانی: (کەرکوك، هەولێر، سلێمانی) بۆ پرۆسەی خوێندنو فێرکردن خەرج دەکرا، زۆر کەمتر بوو بە بەراورد بە لیواکانی دیکەی عێراق، وەك: (بەغداد، کەربەلا، موسڵ، بەسرە).

بە گوێرەی سەرچاوەیەکی ئاگادار، ساڵی خوێندنی (١٩٢٦ - ١٩٢٧) ڕێژەی ئەو بڕە پارەیەی بۆ کاروباری خوێندنو فێرکردن لە لیوای کەرکوك خەرج کراوە بریتی بووە لە (١٠٪)ی تێکڕای داهاتی لیواکە. لە کاتێکدا لە هەمان ساڵ خەرجییەکانی وەزارەتی مەعاریف لە لیوای سلێمانی (١٪)و لیوای هەولێر (٢,٥٪) بووە. کەچی لە هەمانی ساڵی خوێندن ئەو پارەیەی بۆ کاروباری خوێندنو فێرکردن لە لیوای بەغداد خەرجکراوە بریتیبووە لە (٣٨٪) لە تێکڕای داهاتی لیواکەو کەربەلا (١٨٪)و موسڵ (٢٢,٨٪)و بەسرە (٢١٪). هەر ئەو سەرچاوەیە ئەوەش دەخاتە ڕوو، کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە کاروباری خەرجییەکانی لیواکاندا لەو ساڵەدا (١٩٢٧) نەبووە.

لە تێکڕای بەشە بوودجەی تەرخانکراوی وەزارەتی مەعاریف بۆ ساڵی (١٩٢٧)، کە بریتیبووە لە (٢٧٨٦) لەك ڕووپیە، تەنها (٤١) لەك ڕووپیە بەشی خەرجییەکانی کەرکوك بووە[٢٧]. بەردەوامبوونی ئەم سیاسەتە نالەبارەی ڕەوشی خوێندنو فێرکردن، نوێنەرانی لیواکانی کەرکوكو هەولێرو سلێمانی خرۆشاندووەو داواکاری لە دوای داواکاریان پێشکەش بە لایەنە بەرپرسەکان کردووە لەپێناو گرنگیدانی زیاتر بە پرۆسەی خوێندنو فێرکردن لە لیوا کوردییەکاندا. دیارترین ئەو داواکارییانەش، ڕەنگە ئەو داواکارییە بێت کە بە مێژووی (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٨)، سەبارەت بە پرۆسەی خوێندنو فێرکردن لە لیوا کوردییەکان، پێشکەش بە وەزارەتی مەعاریف کراوە. گرنگترین برگەکانی ئەو داواکارییانە بریتیبوون لە: (دامەزراندنی دەزگایەك بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری خوێندن، پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ دانانی کتێبەکانی پرۆگرامی خوێندن، کردنەوەی خانەی پێگەیاندنی مامۆستایان، کردنەوەی قوتابخانەی کچان، کردنەوەی قوتابخانە دواناوەندییەکان)[٢٨].

پاش لێشاوی داواکاریو نارەزایەتییەکانی لیواکان سەبارەت بە پرۆسەی خوێندنو فێرکردن، گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەرچاو ئەنجام نەدراو ڕەوشەکە وەکو خۆی مایەوە. ئەگەر ڕەوشی خوێندنو فێرکردنی شاری کەرکوك لە ڕوانگەی ژمارەی قوتابخانەو قوتابیانو مامۆستاییانییەوە

تەماشا بکرێت، دەردەکەوێت حکومەتەکانی ئەو ڕۆژگارەی عێراق چەند کەمتەرخەمو سیاسەتێکی چەند نایەکسانیان بەرانبەر بە شارو ناوچەکە پیادە کردووە. (بڕوانە خشتەی ژمارە (٣) کە ئەرکی ڕوونکردنەوەی ئەم باسەی لە ئەستۆ گرتووە).

**خشتەی ژمارە (٣)**

**ژمارەی قوتابخانەکانی لیوای کەرکوك بەرانبەر بە ژمارەی قوتابیو ماموستاکانی لە ساڵی خوێندنی (١٩٣٣ - ١٩٣٤) دا[٢٩].**

| چەشن و ڕەگەز | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی | ژمارەی مامۆستا |
|---|---|---|---|
| کوڕان | ٢٣ | ٢٣١٧ | ٧٥ |
| کچان | ٦ | ٦٤٨ | ٢٤ |
| کۆی گشتی | ٢٩ | ٢٩٦٥ | ٩٩ |

لە خشتەی سەرەوەدا بە ڕوونی نا هاوکووفی لە ژمارەی قوتابخانەکانی کەرکوك بەرانبەر بە ژمارەی قوتابیانو ژمارەی قوتابیانیش بەرانبەر بە ژمارەی مامۆستایان دەردەکەوێت، کە پێویستی بە لێکدانەوەو دابەشکردنی ڕێژەیی نییە. بە پێودانی ئەوەی لەو ڕۆژگارەدا بەشی هەرە زۆری قوتابیان لەنێو دانیشتوانی شار بوونە، خوێندن لە دەرەوەی سنوورەکانی شارو شارەدێیە گەورەکان ڕووتێکردنێکی زۆری نەبووە لەلایەن گوندنشینەکانەوە. جێی سەرنجە، ڕەوتی پەرەسەندنی خوێندنو فێرکردنی شاری کەرکوك زۆر سستو لەسەرخۆ بووە. بەپێی سەرچاوەیەکی تایبەت، ساڵی (١٩٤٠) ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکانی شاری کەرکوك گەیشتووەتە (٢١) قوتابخانە، کە لەو ژمارەیە تەنها (٥) دانەیان تایبەت بوونە بە کچان[٣٠].

هەرچی تایبەت بوو بە ڕەوتی فێرکردن لە قۆناغەکانی ناوەندیو دواناوەندی، ئەوا لە سەرەتای ماوە مێژووییەکەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، لە بارودۆخێکی نالەباردا بوون. بە تێپەڕینی زیاتر لە دە ساڵ ڕەوشی خوێندن لە کەرکوکدا هەر بەو شێوەیە بوو کە لە سەرەتای سەردەمی ئینتیدابدا لە ئارادا بوو. بەپێی ڕاپۆرتی ساڵانەی ڕەوتی مەعاریف لە عێراق، بۆ ساڵی خوێندنی (١٩٣٣ - ١٩٣٤)، تەنها یەك تاکە قوتابخانەی ناوەندیو یەك تاکە قوتابخانەی دواناوەندی لە هەر هەموو لیوای کەرکوکدا هەبووە، کە ئەوانیش تەنها تایبەت بوونە بە خوێندنی کوڕان[٣١].

**خشتەی ژمارە (٤)**

**خستنەڕووی ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییو ناوەندیو دواناوەندییەکانی شاری کەرکوك(٣٢).**

| سال | ژمارەی قوتابخانەی سەرەتایی | | ژمارەی قوتابخانەی ناوەندیو دواناوەتدی | |
|---|---|---|---|---|
| | کچان | کوڕان | کچان | کوڕان |
| ١٩٣٣ - ١٩٣٤ | ٦ | ٢٣ | ... | ١ |
| ١٩٤٠ - ١٩٤١ | ٦ | ٢٤ | ١ | ١ |
| ١٩٤٦ - ١٩٤٧ | ١١ | ٤٦ | ١ | ٢ |
| ١٩٤٨ - ١٩٤٩ | ١٢ | ٦١ | ١ | ٣ |
| ١٩٥١ - ١٩٥٢ | ١٣ | ٦٢ | ١ | ٥ |
| ١٩٥٤ - ١٩٥٥ | ١٤ | ٨٠ | ٢ | ٦ |
| ١٩٥٦ - ١٩٥٧ | ٩(*) | ٥٤ | ٢ | ٦ |

ئەم ڕەوشە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، وەك خۆیان مانەوە. ئەوەتا بەپێی ڕاپۆرتی ساڵانەی ڕەوتی مەعاریف، بۆ ساڵی خوێندنی (١٩٤٣-١٩٤٤)، واتە دوای تێپەڕینی دە ساڵ، لە کۆی (٤٥) قوتابخانەی ناوەندی لە تێکڕای عێراقدا، تەنها دوو قوتابخانە لە لیوای کەرکوکدا هەبووە، کە یەکێکیان تایبەت بووە بە خوێندنی کچان[٣٣].

لەگەڵ کەمی ژمارەی قوتابخانە ناوەندییەکانیشدا لە شاری کەرکوك، بەهۆی جۆراوجۆرەوە کە لە پێشەوەدا باسکران، بەردەوام ژمارەی قوتابیانی قۆناغی ناوەندی لە کەمبوونەوەدا بووە. بەپێی ڕاپۆرتە کارگێڕییەکانی بەریتانی لە عێراق، ژمارەی قوتابیانی ناوەندی کەرکوکی دوو پۆلی، ساڵی خوێندنی (١٩٢٧ - ١٩٢٨) بریتیبووە لە (٧٣) قوتابی کوڕ، ساڵی خوێندنی (١٩٢٨ - ١٩٢٩) ژمارەیان بووە بە (٧٠) قوتابی، ساڵی خوێندنی (١٩٢٩ - ١٩٣٠) ژمارەیان بووە بە (٦٤) قوتابی[٣٤].

نالەبارتر لە ڕەوشی خوێندنی ناوەندی لە شاری کەرکوك، ڕەوشی خوێندنی دواناوەندی بوو لە ڕۆژگاری ئینتیدابی بەریتانیو دواتردا. ساڵی خوێندنی (١٩٢١ - ١٩٢٢)، (دواناوەندیی کەرکوك) لەسەر داروپەردووی قوتابخانەی (عیلمییە) کرایەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەی قوتابیانی دەرچووی قۆناغی سەرەتایی کەم بوو[٣٥]، بۆیە ئەم

قوتابخانەیە لە چاوەڕوانی زۆربوونی ژمارەی قوتابییەکان، دووچـاری هـەڵوەشـاندنـەوەی دوو پـۆل هـات. هـەرچی قوتابیانی ئەو دوو پۆلەش بوو، بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندنە دواناوەندییـەکەیان، بە ناچاری ڕوویـان کردە دواناوەندیی بەغداد و خانەی مامۆستایان لە پایتەخت[٣٦].

پاش تێپەڕینی چەند ساڵێك جارێکی دیکە پۆلەکانی دواناوەندیی کەرکوك کرانەوە، بەڵام کێشەی گەورەی لە دوای کردنەوەی، بریتیبوو لە زۆری ژمارەی قوتابییەکان. چونکە قوتابخانەی دواناوەندی، تا ساڵانێکی زۆر، لە شارەکانی هەولێر و سلێمانی بوونی نەبوو. بۆیە قوتابیانی خێزانە دەستڕۆیشتووەکانی ئەو دەڤەرانە، بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن و تەواوکردنی قۆناغی دواناوەندی، ڕوویان لە شاری کەرکوك دەکرد[٣٧]. ئەمەش فشاری دەخستە سەر توانای وەرگرتنی قوتابخانەی دواناوەندیی کەرکوك و قەڵەبالغییەکی زۆری لەناو پۆلەکاندا دروستکردووە.

بە گوێرەی ئامارە فەرمییەکانی وزارەتی مەعاریف، ژمارەی قوتابیانی قۆناغی ناوەندی لە شاری کەرکوکدا ساڵی خوێندنی (١٩٣٣ – ١٩٣٤) تەنها بریتیبووە لە (١١٣) قوتابی، کەچی ژمارەی قوتابیانی هەمان قۆناغ لە ساڵی خوێندنی (١٩٣٨ – ١٩٣٩)، کە ساڵی بەر لە دەستپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانییە، گەیشتووەتە (٥٣٥) قـوتـابی[٣٨]. سـەرباری جەنجاڵی ناو پۆلەکانی دواناوەندیی کەرکوك، قوتابخانەکە لە ڕاستییدا کەم و کوڕییەکی زۆری لە پۆلەکانیدا هەبوو. بۆیە کێشەی گەورەی بۆ قوتابییەکان دروستکردبوو، هێشتا دەبوو بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەیان ڕوو بکەنە پایتەخت. بۆیە ئەم بارە جێی وتووێژێکی زۆری نوێنەرانی کەرکوك و لیوا کوردییەکانی دیکە بووە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق[٣٩].

بە گوێرەی زانیارییەکانی نێو ئامارە فەرمییەکان و چەند سەرچاوەیەکی تایبەت و ئاگادار لە ڕەوتی فێرکردنی لیوای کـەرکوك، بـە هـۆی سیاسەتی چـەوتـی حکومەتە یـەك لە دوای یەکەکانی ڕۆژگـاری پاشایەتی (قۆناغی ئینتیداب و سەربەخۆیی)، کەم و کوڕییەکی زۆر و بۆشاییەکی گـەورە لە ڕەوشـی خـوێـنـدن و فێرکردنـی شـاری کـەرکوك بەرچاو دەکەوێ. حکومەتەکانی عێراق، نەخشە ڕێگەیەکی چەوتیان لەبەر وەزارتـی مەعاریف نابوو، بە تایبەت سـەبارەت بە زمانی خوێندن لە شـاری کەرکوکدا. لـەم ڕووەوە، لەپای ڕوونکردنەوەی گرفتی زمانی خوێندندا، ڕەنگە خستنەڕووی ڕەهەندەکانی (قانوونی زمانە خۆجێییەکان)[٤٠]، چاکترین بەڵگەی ئـەم ڕاستییە بێـت، کە دووەم گرفتی گـەورەی باسەکەشمانە.

(قانوونی زمانە خۆجێییەکان) (قـانـون اللغات المحلیه)، هەنگاوی هـەرە چەوت و نادروستی حکومەتی عێـراق، لە ڕووی پەرەسەندنی ڕەوتـی فێرکردنی لیوای کـەرکوك بە تایبەتی و ناوچەکانی باکوور بە گشتی، پێکدەهێنێت. چونکە سیاسەتی گرنگیدان بە (تورکمان) و فەرامۆشکردنی (کـورد) بەشێکی دانیشتوان بەسەر بەشێکی دیـکـەدا، لە دروستکردنی بەربەست و کێشەی دەروونـی بۆ تـەواوی پـرۆسـەی خـوێـنـدن لـە نـاوچـە تـێـکـەڵاوە بنەچەییەکان و شکانەوەی. لە کۆتاییدا، لە بەرژەوەندی ناوەندی دەسەڵاتی عەرەبی شتێکی دیکەی لێ ناکەوێتەوە[٤١].

ئـەوەی لێرەدا گرنگە، لە برگەی شەشەمی ئەم قانوونەدا هاتووە: "لە هەموو قوتابخانە بەرایی و سەرەتاییەکاندا، لەو قەزایانەی پێشتر ناویان لەم قانوونەدا براوە (سەبارەت بە لیوای کەرکوك، قەزاکانی کەرکوك و کفری دەگرێتەوە- تـوێـژەر)، زمـانـی فێرکـردن زمـانـی نـاوخـێـزانی زۆرینـەی قوتابییەکانی ئەو قوتابخانانە دەبێت، چ جا عەرەبی یاخوود تورکی یاخوود کوردی بێت"[٤٢].

بەپێی ئـەو برگەیە دەبـوو، هەموو کۆمەڵە جیاوازەکانی دانیشتوانی شاری کەرکوك بە زمانی ناوخێزانیی خۆیان خوێندن وەرگـرن. لـەو ئەنجامەشدا کۆمەڵە جیاوازەکانی دانیشتوان، جگە لە بەشی دانیشتوانە کوردەکە نەبێت، بە زمانی دایکی خۆیان نێردرانە بەرخوێندن.

بەپێی سەرچاوەیەکی ئاگادار، لە کۆی (١٠) قوتابخانەی ناو شاری کەرکوك تاکە قوتابخانەیەك خوێندن تیایدا بە زمانی کـوردی نـەبـووە، کە دانیشتوانی کـورد گـەورە پێکهاتەی نێو شـاری کـەرکوك بـووە لـەو ڕۆژگـارە، زمـانـی خوێندن لـە قوتابخانەکانی شـاری کـەرکوکـدا بەمشێوەیە بـووە: تورکمانی (٤) قوتابخانە، سریانی (٢) قوتابخانە، عیبری (٢) قوتابخانە[٤٣].

(قانوونی زمـانـە خـۆجێیـەکان)، وەك زمـانـەوانـی شـارەزا (تۆفیق وەهبی بەگ)[٤٤] (١٨٩١ – ١٩٨٤)، لە یادداشتەکەیدا بۆ کۆمەڵەی گەلان ئاماژەی پێکردووە: "بە ئاشکرا ئاڵۆزیی لەنێوان زمانەکاندا دروست دەکـات"[٤٥]. چونکە قوتابی لە قۆناغی بەرایی و سەرەتاییدا، بە زمانی دایك (ناوخێزان) دەخوێنێت. بەڵام کاتێك دەگاتە قۆناغی سەرووتر، زمانەکە لە زۆر باردا، دەگۆڕێت بۆ زمانی عەرەبی. ئەمەش کێشە و گرفتی گەورە بۆ قوتابیان دروست دەکات. هیچ کات ناتوانن، بەبێ کۆششکردن و هەوڵدانێکی لێبڕاوانە، هاوشانی ئەو قوتابییانەی پێشتر زمانی عەرەبی زمانی خوێندنیان بووە، پۆلەکانی خۆیان ببڕن[٤٦].

(قانوونی زمانە خۆجێییەکان) سەرباری زۆر کەموکوڕی و کاڵ و کرچی دیکە[٤٧]، ناوچە کوردنشینەکانی کەرکوکی لێ بێبەشکرا و لەوێدا دەست بە جێبەجێکردنی نەکرا! بۆیە بە گوێرەی زانیاریی سەرچاوەیەك، ساڵی (١٩٣١)، لە هەموو عێراقدا بە شێوەی فەرمی، تەنها (٤١) قوتابخانەی کوردی لە بەرانبەر (١٣) قوتابخانەی تورکمانی هەبوو[٤٨].

ئـەم دۆخــەش تـاسـەر جێگیر نـەبـوو، سـاڵی (١٩٣٧)، کاربەدەستانی بەغدا، بە بیانووی پتەوکردنی ڕیزەکانی عێراق، بە یەکجارەکی خوێندنیان بە زمانی تورکمانی لە عێراقدا هەڵوەشاندەوە. ئەوەش کاریگەریی نێگەتیڤانەی لەسەر ڕەوشی پەرەسەندنی فێرکردن لە ناو شاری کەرکوك هێنایە ئارا، بـەوەی بەشێکی دیـاری قوتابیانی کەرکوکی دووچاری کۆمەڵێك کێشە و گرفتی ڕاستەقینە کرد[٤٩].

لە دوای تەواوبوونی قۆناغی ئینتیداب، ڕەوشی خوێندن و فێرکـردن هـەنـدێك پـەرەسـەنـدنـی بـەخـۆوە بینی. لـەوانـە

هەڵگرتنی ئەو برە پارەیەی لە قوتابیان مانگانە وەردەگیرا، هەروەها دەرکردنی (قانوونی خوێندنی بەزۆریی قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی) (التعليم الالزامي) لە ساڵی (١٩٤٠)دا، لە چوارچێوەی ئەو پەرەسەندنانەدا بوون[٥٠]. رەوشی خوێندن و فێرکردنی شاری کەرکوک، لە ئاکامی بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی و تێوەگلانی وڵاتی عێراق لەو جەنگەوە، هەنگاوی گەورەی بەرەو دواوە هەڵنا. چونکە جەنگ کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی دانیشتوانی زۆرتر کردو بووە هۆی تێکچوونی باری کۆمەڵایەتی و کەمبوونەوەی سەرچاوەکانی داهات و دروستبوونی قەیرانی ئابووری. لەو ئەنجامەدا بوودجەی دەوڵەت بە ملیۆنێک دیناری عێراقی کەمکرایەوە[٥١]. بێگومان بارودخی جەنگ کاریگەریی دیاری هەبوو لەسەر رەوتی پەرەسەندنی خوێندن و فێرکردن لە زۆر لایەنەوە، بە تایبەت قوتابیان. چونکە ئاساییە هەر کاتێك داهاتی تاکە کەس کەمی کردو ئاستی گوزەرانیی خێزان دابەزی، خواست لەسەر خوێندن کەم دەبێتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو موتەسەریفیەتی کەرکوک بڕیاریدا لە ڕێگەی سازدانی ئاهەنگی سینەماییەوە لە چوارچێوەی سنوورەکانی لیوای کەرکوک، پارە بۆ قوتابییە هەژارەکانی شار کۆبکاتەوە[٥٢].

خشتەی ژمارە (٥)

ژمارەی قوتابیانی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندییەکانی شاری کەرکوک[٥٣].

| ساڵ | ژمارەی قوتابیانی سەرەتایی | | ژمارەی قوتابیانی ناوەندی و دواناوەندی | |
|---|---|---|---|---|
| | کچان | کوڕان | کچان | کوڕان |
| ١٩٣٣ – ١٩٣٤ | ٦٤٨ | ٢٣١٧ | ... | ١١٣ |
| ١٩٤٠ – ١٩٤١ | ١٠٥٠ | ٣٩٢١ | ٦٦ | ٦٣٦ |
| ١٩٤٦ – ١٩٤٧ | ١٢٢٧ | ٤١٢٢ | ٩٧ | ٤٨٣ |
| ١٩٤٨ – ١٩٤٩ | ١٢٨٦ | ٥٦٨٥ | ١١٠ | ٥٨٣ |
| ١٩٥١ – ١٩٥٢ | ٢٣٨٠ | ٧٧٤٦ | ٢٦٧ | ٩٤٥ |
| ١٩٥٤ – ١٩٥٥ | ٣٥٢١ | ١١٤٦١ | ٤٩٧ | ١٦١٣ |
| ١٩٥٦ – ١٩٥٧ | ٤٦٠٠ | ١٤٠٠٣ | ٥٣٧ | ١٨٠٩ |

لە خشتەی ژمارە (٥)دا، بەرجەستانە (ملموس) هەست بە کەمیی زیادبوونی سروشتیی ژمارەی قوتابیان دەکرێت لە ساڵانی جەنگ و دوای جەنگیش. چونکە لە دوای بڕانەوەی جەنگیش بارودۆخی ناوچەکە نەگەڕایەوە دۆخی جارانی، ئەویش بەهۆی بێ بارانی و وشکەساڵی و مێرشی کوللە، کە بوونە مایەی داکەوتنی رەوشێکی ناڵەباری ئابووری لە تەواوی لیواکەدا. سیستەمی پیادەکراوی خوێندنی عێراق، تا ئەو رۆژەی حوکمڕانیی پاشایەتی کۆتایی پێهات، هەر بە کەموکورتی و بوونی ئاستەنگی گەورە گەورە مایەوە، وەك: کەمی بینای قوتابخانەو میلاکی فێرکردن و سستی لە جێبەجێکردنی پرۆگرامەکان و ناڵەباری باری پرۆگرامەکان بە هۆی تەرخانکردنی بەشێکی زۆر کەمی بوودجە بۆ کەرتی خوێندن و فێرکردن[٥٤].

رەوتی پەرەسەندنی فێرکردن، لەگەڵ ئەوەی داهاتی عێراق پاش مۆرکردنی پەیماننامەی هەموارکردنی جیاووگەکانی نەوت ساڵی (١٩٥٢)، بووژایەوەو گەشەی کرد، کەچی هێشتا بە گوێرەی پێویست، لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، هەنگاوی بۆ نەهاوێژراوە. بەپێی راپۆرتی ساڵانەی رەوتی مەعاریف، بۆ ساڵی خوێندنی (١٩٥٧ – ١٩٥٨)، لە کۆی (١٢٠) قوتابخانەی ناوەندی لە هەموو عێراقدا، تەنها پێنج قوتابخانەو لە کۆی (٤٩) قوتابخانەی دواناوەندییش، تەنها سێ قوتابخانە لە هەموو لیوای کەرکوك بوونیان هەبووە[٥٥]. بە هەمان پێودانکاری، سەبارەت بە ژمارەی قوتابیانی قۆناغەکانی ناوەندی و دواناوەندیی لیوای کەرکوک، لەو ماوە مێژووییەدا، بارودۆخەکە خراپترە[٥٦]. هەروەها لە رووی ژمارەی مامۆستاو چەشنی وانە وتنەوەیان، قوتابخانەکانی لیوای کەرکوک، بە هەموو قۆناغەکانییەوە، بە درێژایی ماوەی لێکۆڵینەوەکە، کەلێنی گەورەی گەورەی لێ بەدی دەکرێ[٥٧]. بڕوانە خشتەی ژمارە (٦).

خشتەی ژمارە (٦)

ژمارەی مامۆستایانی ناوەندی و دواناوەندییەکانی شاری کەرکوک[٥٨].

| ساڵ | ژ. مامۆستای سەرەتایی | | ژ. مامۆستای ناوەندی و دواناوەندی | |
|---|---|---|---|---|
| | مێ | نێر | مێ | نێر |
| ١٩٣٣ – ١٩٣٤ | ٢٤ | ٧٥ | ... | ٧ |
| ١٩٤٣ – ١٩٤٤ | ٥٢ | ١٠٨ | ٢ | ١٥ |
| ١٩٤٧ – ١٩٤٨ | ٨٦ | ٢٠٥ | ٥ | ٢٣ |
| ١٩٥١ – ١٩٥٢ | ١٢٧ | ٣٠١ | ١٦ | ٤٥ |
| ١٩٥٤ – ١٩٥٥ | ١٦٧ | ٣٩١ | ٢٣ | ٦٢ |
| ١٩٥٦ – ١٩٥٧ | ١٩١ | ٤٢٩ | ٢٩ | ٧٣ |

لە سایەی ئەم ڕەوشە خراپ و فەرامۆشکراوەی ڕەوتی فێرکردنەوە، هیچ جێی سەرسوڕمان نییە، کاتێك پاشەکشێیەکی ناقۆلا لە ڕێژەی خوێندەوارانی لیوای کەرکوك بەرچاو بکەوێ. بەپێی کۆمەڵە ئاماری ساڵانەی گشتیی فەرمانگەی سەرەکی سەرژمێرییەکان، بۆ ساڵی (١٩٥٢)، ڕێژەی نەخوێندەواریی لە تێکرای لیوای کەرکوکدا، گەیشتووەتە (٩١,٤٥٪). ئەمەش ئەگەر بێت و لەگەڵ ڕێژەی نەخوێندەوارانی تێکرای لیواکانی عێراق بەراورد بکرێ، ڕێژەیەکی بەرز داگیر دەکات، کە لەو ساڵەدا، ڕێژەی نەخوێندەواریی لە سەرتاسەری عێراقدا، بریتیبووە لە (٨٧,٧٣٪)(٥٩). لەم بارەوە، خشتەی ژمارە (٢٥) ئەرکی ڕوونکردنەوەی زێتری گرتووەتە ئەستۆ.

خشتەی ژمارە (٧)

پۆلێنکردنی دانیشتوانی شاری کەرکوك بە گوێرەی باری خوێندەواری لەنێوان ساڵانی(١٩٤٧-١٩٥٧)دا[٦٠].

| ساڵ | ڕەگەز | ژمارەی دانیشتوان | باری خوێندەواری | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | نەخوێندەوار | تەنها خوێندنەوە | خوێندنەوەو نووسین |
| ١٩٤٧ | نێر | ٤٧٩٤٧ | ٢٩٠٩٠ | ... | ١٢١١٢ |
| | مێ | ٤٣٦٣٥ | ٣٣٦٩٣ | ... | ٣٠٢٥ |
| | کۆی گشتی | ٩١٥٨٢(*) | ٦٢٧٨٣ | ... | ١٥١٣٧ |
| ١٩٥٧ | نێر | ٦٣٠٦٣ | ٢٦٥١٨ | ٨٣٨ | ١٩٣١٨ |
| | مێ | ٥٧٣٣٩ | ٣٧٢٧٢ | ٦٦٠ | ٦٨٥٥ |
| | کۆی گشتی | ١٢٠٤٠٢(**) | ٦٣٧٩٠ | ١٤٩٨ | ٢٦١٧٣ |

هەرچەندە لەنێوان ژمارەی خوێندەوارەکانی ئەو دوو ساڵەی شاری کەرکوك پێشکەوتن و پەرەسەندنێکی چاك بەرچاو دەکەوێت، بەڵام هێشتا نەخوێندەواری پشکی شێری بەرکەوتووە. بە گوێرەی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) تێکرای ڕێژەی نەخوێندەواری بریتیبووە لە (٨١,٤٧٪) بەرانبەر بە تەنها (١٩,٦٤٪) لە ڕێژەی خوێندەواری. کەچی لە ساڵی (١٩٥٧) ئەم ڕێژەیە دابەزیوەو بووە بە (٦٥,٥٠٪) لە تێکرای دانیشتوانی شاری کەرکوك، بەرانبەر بە (٢٨,٤١٪) لە ڕێژەی خوێندەواری. ئەمەش ئەوە ڕاشکاوانە دەخاتەڕوو، کە بەشی زۆری دانیشتوانی شاری کەرکوك لە کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتیدا، لە ئاکامی پشتگوێخستنەکانی حکومەتەکانی ئەو ڕۆژگارە لە بەرانبەر گەشەپێدانی بواری خوێندن و فێرکردن، نەخوێندەوار بوونەو ڕێژەی خوێندەواران نەیتوانیوە بەسەر ڕێژەی نەخوێندەواراندا نەك زاڵ بێت، بەڵکو تەنانەت لێشی نزیك کەوێتەوە. بێگومان لە ئارادابوونی ڕەوشێکی لەم جۆرە. لە هەر کات و شوێنێکدا، بارێکی گرانی کۆمەڵایەتی دەخولقێنێت و چاوەڕێی ڕەنگدانەوەی خراپی لێ دەکرێت.

**ب. خوێندنی ئایینی و ئەهلی:**

مەبەست لە خوێندنی ئایینی و ئەهلی، ئەو چەشنە خوێندنانەن کە لە ژێر چاودێریی ڕاستەوخۆی وەزارتی مەعاریفدا نەبوونە. خوێندن لە حوجرەی مزگەوتەکان و سوختەخانەو کڵێسەو کەنیشتەو ماڵە تایبەتییە تەرخانکراوەکان دەکەونە بازنەی ئەم چەشنە خوێندنەوە.

خوێندنی ئایینی مێژوویەکی دێرینی هەیەو پێشتر تاکە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی فێرکردن و خوێندەواری بووە، کە لەلایەن مامۆستایانی ئایینییەوە سەرپەرشتی دەکرا. مێژووی پەیدابوونی خوێندنی ئایینی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی پەیدابوون و بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و بە چەند قۆناغێکیشدا تێپەڕ بووە[٦١].

هۆی کاریگەر لە پەیدابوونی ئەم چەشنە خوێندنە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی گەورەی ئایەتە قورئانییەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر، لە هاندان و بە دەستخستنی زانست و زانیاری. وەك ئایەتەکانی: ((اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ))[٦٢]، ((وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا))[٦٣]، ((وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً))[٦٤]. فەرموودەکانی: (اطلب العلم من المهد الى اللحد)، (طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة) و زۆری دیکە.

سووچ و گۆشەی مزگەوتەکان گرنگترین شوێنی توێژینەوەی قورئان و فەرموودەو فیقەو زمان و زانستەکانی دیکەن. بۆیە زۆرێك لە مزگەوتەکان، بە درێژایی قۆناغەکانی مێژوو، بوونە مەڵبەندی پڕ بایەخی بزاڤی زانستی لە ناوچە جیاوازەکانی جیهانی ئیسلامی. خوێندن لە مزگەوتەکان سەرەتا بە شێوەی (کەتاتیب) (الكتاتيب)(*) بووەو یەکەم قۆناغی خوێندنی ئایینییە. قوتابخانە ئایینییەکانیش (سوختەخانە)(**)، قۆناغێکی دیکەی پەخشی ڕووناکبیریی ئایینی بووە.

ئەم قۆناغە، لە ڕۆژگاری عەبباسی و لەسەر دەستی وەزیری سەلجووقی (نظام الملك) پەیدا بووە، کاتێك قوتابخانەیەکی بەناوی (النظامية) لە بەغداد، ساڵی (٤٥٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٠٦٥)ی زایینیی بۆ خوێندن و فێرکردنی زانستە ئایینییەکان دامەزراندووە[٦٥].

هۆی گەشەو بەردەوامبوونی ئەم چەشنە خوێندنەش بە درێژایی سەردەمەکان، بریتیبووە لەلایەنی سۆزی ئایینی خەڵك و ڕۆڵ و پێگەی کۆمەڵایەتی دەرچووانی ئەم چەشنە خوێندنە لە نێو کۆمەڵگەدا، کە زۆر بەڕێزەوە ڕەفتاریان بەرانبەر دەکرا[٦٦].

خوێندنی ئایینی، بە هەردوو شێوەکەی (کەتاتیب و سوختەخانە)، لە کۆنەوە بە شار و ناوچەکانی کوردستاندا بڵاو بوونەتەوە. لە سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانییشدا، کوردستان لە ڕێگەی قوتابخانە ئایینییەکانەوە بە مەڵبەندێکی گرنگی پێگەیاندنی دەستەی ڕووناکبیری ئەو ڕۆژگارە هەژمار کراوە[٦٧].

شاری کەرکوکیش لەو چوارچێوەیەدا، خاکەڕاییانە ڕۆڵی هەبووە. بە تایبەت لە سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە، کاتێك

چەند قوتابخانەیەکی ئایینیی دیار، وەك: تەکییەی تاڵەبانیو خانەقای نەقشییەکان لەنێو شاری کەرکوکدا شۆرەتیان بڵاوبووەتەوە[٦٨].

دەوڵەتی عوسمانی سەرپەرشتیکردنو گەشەپێدانی قوتابخانە ئایینییەکانی بە بەشێك لە ئەرکی سەرشانی خۆی نەدەزانی، بۆیە تاكو بنەماڵە دەوڵەمەندەکان بەسەر ئەو کارەدا راگەیشتبوون. کێبرکێی دامەزراندنو کردنەوەی قوتابخانە ئایینییەکان، لەنێوان بنەماڵە دەوڵەمەندەکاندا، بەردەوام لە ئارادا بووە. بە دڵنیاییشەوە، پاڵنەری سەرەکی ئەو بنەماڵانە بریتیبووە لە دڵسۆزییان بۆ ئایینی ئیسلام، بۆیە پێداویستییەکانیان بۆ قوتابخانەکان دابین کردووەو ئاسانکارییشیان بۆ قوتابییەکان ئەنجامداوە[٦٩]. تەنانەت بنەماڵەی وا هەبووە موڵکی خۆی لە زەویو دوکانو باڵەخانەو شتی دیکەی بۆ ئەو قوتابخانە ئایینییانە وەقف کردووە(٧٠). بۆیە لە ئاکامی ئەو هەڵوێستانەو بە تەنگەوە هاتنی بنەماڵە ئایینییەکانی شاری کەرکوك بەرانبەر بە پەخشی زانستو مەعەریفەی ئایینی، شارەکە بە مەڵبەندێکی دیاری قوتابخانە ئایینییەکان دراوەتە قەڵەم[٧١].

خوێندنی ئایینی، لە رۆژگاری کۆتاییەکانی دەسەڵاتی عوسمانیدا، لە ئاکامی لە باردانەبوونی بەرانبەر بە هەنگاونان لەگەڵ رۆحییەتی رۆژگارو، داهێنانو پیادەکردنی سیستەمی نوێی خوێندنو کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتاییو رۆشدییەو موڵکیو ئەوانی دی، وردە وردە بەرەو کزبوونو کەمبوونەوە، هەنگاوی لەسەرخۆی هەڵگرت[٧٢].

بەپێی زانیارییە تۆمارکراوەکانی ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵ، شاری کەرکوك لە رۆژگاری کۆتایی حوکمرانیی عوسمانیدا، خاوەن (١٨) خوێندنگەی ئایینیی بووە[٧٣]. ئەم بارودۆخە بە نەمانی دەسەڵاتی عوسمانیو هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەکەو هاتنە ئارای قۆناغی داگیرکاری (١٩١٨ - ١٩٢٠)، گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە. بە گوێرەی راپۆرتە کارگێڕییەکانی بەریتانی لە ساڵی (١٩١٨)دا، رەوشی خوێندنو فێرکردنی شاری کەرکوك لە چوارچێوەو لە ژێر سایەی خوێندنی ئایینی دابووەو چەندان قوتابخانەی ئایینییش لە شارەکەدا خوێندنیان تێدا بەردەوام بووە. تەنانەت راپۆرتەکان ئاماژە بە حوجرەی مزگەوتە بچووکەکانیش دەدەنو دەربارەیان دواون. راپۆرتەکان ئەوەشیان فەرامۆش نەکردووە، کە ئەم چەشنە خوێندنە، خوێندنێکی رووکەشیو بەر هەیوانی بووە[٧٤].

هەر بەپێی راپۆرتە کارگێڕییەکانی بەریتانی لە ساڵی (١٩١٩) دا، ئامارێك بۆ ژمارەی سوختەخانەکانی شاری کەرکوك ئەنجامدراوە، کە تیایدا ئاماژە بە (١٠) قوتابخانەی ئایینی دراوە، لەوانەش (٣)یان سەر بە دەزگای ئەوقاف بووە. ئەو راپۆرتانە رەوشی خوێندنی ئایینیی شارەکەشی فەرامۆش نەکردووە، بەم شێوەیە دەربارەی دواوە: "حوجرەکان، لە راستییدا بێ قوتابیو باری کارەکانیان بە چەشنێکە ناکرێت بە قوتابخانە بژمێردرێن. لە هەموو قوتابخانەکاندا (مەبەستی ١٠ قوتابخانە ئایینییەکەی شاری کەرکوکە- توێژەر) تێکرا (١٢٠) قوتابی هەن"[٧٥]. بێگومان هۆی سەرەکی ئەو پاشەکشەیە لە ژمارەی قوتابخانە ئایینییەکان بە هۆی رووداوە کاریگەرەکانی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بوو. چونکە بەپێی راپۆرتێکی دیکەی بەریتانی، کە ساڵێك دواتر ئامادە کراوە، ئاماژە بە زۆربوونی قوتابخانە ئایینییەکانی شاری کەرکوك دەدات[٧٦].

خوێندنی ئایینیو قوتابخانە ئایینییەکان بە تێپەڕبوونی چەند ساڵێك، لە دوای پەرەسەندنەکانی رەوتی خوێندنی فەرمی، ئەو خواستە گەرمەی جارانیان لەسەر نەماو خەڵکی منداڵەکانیان لە قوتابخانە فەرمییەکانی دەوڵەت ناونووس کرد، ئەم بارەش وایکرد لە زۆربەی ناوچەکانی عێراق، بە تایبەت لە چەقی شارەکان، ژمارەی قوتابخانە ئایینییەکان بەرەو کەمبوونەوە بچێت[٧٧].

سەبارەت بە رەوشی خوێندنی ئایینیی شاری کەرکوك، هەرچەندە هەندێك لە قوتابخانە ئایینییەکانی دووچاری داخستنو نەمان هات، وەك: (قوتابخانەی میهرانی)[٧٨]، گۆڕانو پەرەسەندنێکی گەورەی ئەوتۆی بەسەردا نەهات. بەو پێودانەی لە رۆژگاری داگیرکارییو ئینتیدابی بەریتانی، لەنێو شاری کەرکوکدا قوتابخانە ئایینییەکان بەردەوام خواستیان لەسەر بووە. رەنگە هۆی سەرەکی ئەمەش بۆ چەند فاکتەرێك بگەڕێتەوە، لەوانە: پێگەی ئایینیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسییەکانی بنەماڵە دەوڵەمەندو ئایینییەکانی شار، کە لە هۆشی خواپەرستیو بە تەنگەوەبوونی مانەوەی نفووزو دەسەڵاتی ئایینییان بوونە بەسەر کۆمەڵەوەو لەو پێناوەشدا هانی ئەم چەشنە خوێندنەیان داوە. هەروەها سیاسەتی چەوتی دەسەڵاتدارانی ئینتیداب سەبارەت بە شارەکەو پشتگوێخستنی گەشەپێدانی خوێندنی فەرمیو خستنەوەی دووبەرەکی لەنێوان پێکهاتە جیاوازەکانی.

مەدرەسەو سوختەخانە ئایینییەکانی شاری کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتیدا زۆربوونە، لە بەناوبانگەکانیان ئەمانە بوونە: (مەدرەسەی سەیید ئەحمەدی خانەقا) لە گەڕەکی شاترلو، (تەکییەی تاڵەبانی) لە گەڕەکی بولاق، (مەدرەسەی دانیاڵ) لەسەر قەڵا، (مەدرەسەی قۆرییە) لە قۆرییە، (تەکییەی خادم سەجادە) لە گەڕەکی بولاق، (مەدرەسەی ئەحمەد ئاغا) لە گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن، (مەدرەسەی مەحموود خاڵ) لە گەڕەکی مەیدان لەسەر قەڵا، (مەدرەسەی موسلیم)، (مەدرەسەی زێویە)،(مەدرەسەی مولانا بەکر)، (مەدرەسەی مەلا عەبدولفەتاح کەرکوکی)،(مەدرەسەی مەلا ئەمین)، (مەدرەسەی موفتی ئەفەندی)، (مەدرەسەی عەلیزادە)، (مەدرەسەی غەوسی)، (مەدرەسەی سوڵتانییە)[٧٩]. ئەم قوتابخانە ئایینییانە وێڕای ئەوەی شوێنی پیرۆزی رێنماییو ئاراستەکردنی ئایینی بوون، ببوونە مەڵبەندێکی بەرزو گەشاوەی زانست بۆ مامۆستایانو قوتابیانی (فەقێ)ی کارامە.

لە سەردەمی پاشایەتیدا، وێڕای ئەوەی رێژەی قوتابخانە ئایینییەکانی کەرکوك بە بەرچاوی ماوەتەوە، کەچی لە رووی چۆنییەتیشەوە، بەرەوپێشچوونی نوێی بەخۆوە گرتووە. ساڵی (١٩٢٧) (کۆلێژی زانستی ئایینی)، لەسەر دەستی (سەیید ئەحمەدی خانەقا)و (مەلا قادری ئیمام)[٨٠]

(١٨٨٨-١٩٥٢) هاتە دامەزراندن. لەو کۆلێژەدا، مامۆستایانی وەك: (ڕەفیق حیلمی)[٨١] (١٨٩٨-١٩٦٠)و (عەلی ئەفەندیی خادم سوجادە)[٨٢](١٩٠١-١٩٧٩)، وانەیان تێدا دەوتەوەو قوتابیانی وەك: (مەلا مەجیدی قوتب)[٨٣] (١٩٠٩-١٩٨٦)و (مەلا عەبدولخالقی ئەسیری)یش[٨٤](١٨٩٠-١٩٦٢)، وانەیان تێدا دەخوێند[٨٥]. وەك ئاشکرایە، ئەو ڕۆژگارە خوێندنی ئایینی لە زۆرێك لە مزگەوتو تەکییەو خانەقاکانی کەرکوك هەبووەو حوجرەو سوختەخانەکانیشیان هەموو کات جەم بووە. بەپێی زانیاریی سەرچاوەیەکی فەرمیی هاوسەردەم، لە دوای تەواوبوونی قۆناغی ئینتیدابی بەریتانیو لە دەستپێکی قۆناغی سەربەخۆیی عێراق، ژمارەی ئەو شوێنە ئایینییانە لە شاری کەرکوکدا گەیشتووەتە نزیکەی (٦٦) مزگەوتو تەکییەو خانەقا[٨٦]. ڕەنگە ئەمە، لانیکەم، ئاستو ڕادەی پەرەگرتنی ئەم چەشنە خوێندنە لەنێو شاری کەرکوك بداتە دەست.

بەڵگە نەویستە، مەدرەسە ئایینییەکان، ببوونە شوێنێکی دیاری پەخشی زانستو زانیاریی لە ناوچەی کەرکوکدا. لە مودەڕیسە بە ناوودەنگەکانی ئەو ماوەیەی کەرکوك: (مەلا مەحموودی مەزناوایی) (١٨٥٨ - ١٩٣٤)، (مەلا ڕەزای واعین) (١٨٧٠ - ١٩٦٣)، (مەلا تاهیری مودەڕیس)، (مەلا ناسیحی مودەڕیس)، (مەلا عومەری ئۆمەرگونبەدی)، (مەلا سەیید یوسفی ڕۆژبەیانی)، (مەلا عەبدولمەجیدی قوتب) (١٩٠٩-١٩٨٦)، (مەلا ئەحمەدی مەلا حەکیم)، (مەلا سابیری حافین)، (مەلا عەزیزی شیلەخانی)، (مەلا عەلی فەتحوڵڵا)، (مەلا ئەحمەدی حەوتەغار) ناسراو بە (ئیفتیخاری)، (مەلا ئەحمەدی بادەوایی)و چەندانی تر بوون، کە لەسەر دەستیاندا سەدان کەس ئیجازەی مەلایەتیان پێ بەخشراوە[٨٧].

ناکرێ ئاماژە بەو فاکتەرەش نەدرێت، کە زۆرێك لە قوتابیانی خوێندنی ئایینی، لە گەلێك ناوچەی جیا جیای کوردستانەوە، بە مەبەستی زێتر کەڵەکەکردنی زانیارییەکانیان لەسەر دەستی گەورە زانایانی ناوچەکە، سەردانی مزگەوتو تەکییەکانی کەرکوکیانکردووە[٨٨]. لەوانە بۆ نموونە، زانای گەورەو بە ناوودەنگی هەولێر (مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی) (*)، کە لە سییەکاندا، هاونموونەی زۆر زانستخوازی دیکەی وەك (قانیع)ی شاعیر، چووەتە ئەو شارەو پەرەی بە زانستی خۆیداوە[٨٩].

بە گوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان دامودەزگا فێرکارییە ئایینییەکانی عێراق، تا نزیك ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی بیستەم بەردەوامبوونە لەسەر کاری خۆیان، بەڵام لەم ماوەیە بەدواوە، لەلایەن وەزارەتی مەعاریف بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی (کەتاتیب)ەکان دەرچوو، بەوەش قۆناغی یەکەمی خوێندنی ئایینی کەوتە کزیو خوێندنی ئایینی بەو هۆیەو گەلێك هۆی دی بەرەو پووکانەوە چوو(٩٠).

دوای نەمانی سەردەمی پاشایەتییش، حکومەت بڕیاریدا (موستەعیدە پێشکەوتووەکان)ی خوێندنی ئایینی لەسەر میلاکی وەزارەتی مەعاریف، وەك مامۆستای سەرەتایی، دابمەزرێنێت پاش ئەوەی خولێکی مەشقپێکردنو تاقیکردنەوەیەکی سەرپێیان پێ دەکات[٩١]. ئەوەش هەنگاوێکی گەورەتر بوو لە کەمبوونەوەی ئەم چەشنە خوێندنە لە دولتردا.

جێی سەرنجە. هەڵگرانی ئیجازەکانی فێرکردنی ئایینیی ناوەند بە گوێرەی دووەم سەرژمێریی فەرمی ساڵی (١٩٥٧)، لە نێو شاری کەرکوکدا بریتیبووە لە (١٧) کەس، کە لەم ژمارەیەدا (١٤) کەسیان لە ڕەگەزی نێرو (٣) کەسیان لە رەگەزی مێ بوونە. هەرچی هەڵگرانی ئیجازەکانی فێرکردنی ئایینیی بالاش بوو. گەیشتووەتە (١٢) کەس، کە لەم ژمارەیەدا (١٠) کەسیان لە ڕەگەزی نێرو (٢) کەسیان لە رەگەزی مێ بوونە[٩٢].

هەرچی تایبەت بێت بە چەشنە خوێندنەکانی دیکەی شاری کەرکوك لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، ئەوا خوێندنی کەمە ئایینییەکان لە سەرووی ئەوانی دیکەوە دەهات. لەنێو شاری کەرکوك چەند قوتابخانەیەکی تایبەت بە کەمە ئایینییەکانی وەك: مەسیحییەکانو جووەکان هەبوو. بەڵام بە ووردی ژمارەیان تۆمار نەکراوە. بەپێی یادداشتەکەی (محەمەد ئەمین زەکی بەگ)، ژمارەی قوتابخانە تایبەتەکانی کەمە ئایینییەکانی شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩٣٠)دا بریتیبووە لە چوار قوتابخانە، دوو قوتابخانەی مەسیحی (کلدانی)، دوو قوتابخانەی جوو[٩٣]. شوێنی ئەم قوتابخانانە لە کڵێساو کەنیشتەو ماڵە تایبەتو بەخشراوەکاندا بووە. زۆربەی مامۆستاکانیان بریتیبووە لە ڕەبەنو قەشەو شەمماسەکان[٩٤]. زۆریش پێدەچێت، بە شێوەی تێکەڵاوی کورانو کچان بوو بێت. بە بەڵگەی ئەوەی هیچ زانیارییەك لەنێو سەرچاوە مێژووییەکاندا بۆ بوونی قوتابخانەی تایبەت بە کچانی کەمە ئایینییەکان نییە، کەچی کچانی کەمە ئایینییەکان بۆ تەواوکردنی خوێندن ڕوویان لە قوتابخانەکانی بەغدادی پایتەخت کردووە. ئەوەی ئەم ڕاستییە سەرەوە پشتڕاست دەکاتەوە ئەوەیە، کە بە گوێرەی ساڵنامەی وەزارەتی مەعاریفی گشتیی (نظارت معارف عمومیة) عوسمانی، بەر لە جەنگو لە دوا ڕۆژەکانی سەردەمی عوسمانی، قوتابخانەیەکی سەرەتایی تێکەڵاوی کلدانی بە ناوی (شمعون الصفا) لە شاری کەرکوکدا بوونی هەبووە[٩٥].

دەبێت ئەوەش بوترێت، نێردە موژدەبەخشەکان، بە تایبەت (نێردە فەرەنسییە کاتۆلیکەکان)و (قوتابخانە موژدەبەخشە ئەمریکییەکان)، ڕۆڵی بەرچاویان لە هاندانو خوێندنو فێرکردنی تایفەی مەسیحییەکاندا هەبووە[٩٦]. لەنێو نێردە موژدەبەخشەکانیشدا، نێردەی (دومینیکانی)(*) ڕۆڵی دیاری لە پاڵپشتیکردنی خوێندنو فێرکردنی ئایینی مەسیحی لە شاری کەرکوکدا هەبووە. ئەم نێردەیە لە ساڵی (١٨٦٧) دا توانیبووی قوتابخانەیەکی سەرەتایی بۆ مەسیحییەکان بە ناوی (قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان لە کەرکوك) دابمەزرێنێت[٩٧]. لە ڕۆژگاری ئینتیدابی بەریتانیشدا، موژدەبەخشە ئەمریکییەکان قوتابخانەیان لە شاری کەرکوك دامەزراندووە بە ناوی (قوتابخانەی موژدەبەخشی ئەمریکی)[٩٨].

جووەکانیش بە هەمان شێوە، لەلایەن کۆمەڵەو دەزگا

جیهانییەکانی خۆیان هاوکاری کراون و قوتابخانەیان بۆ کراوەتەوە. بەر لە بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی، (Alliance Israil Universal) (یەکێتیی ئیسرائیلی جیهانی) هاوکارییەکی زۆری کردنەوەی قوتابخانەی (Alliance) (ئەلیانس)ی سەرەتایی کورانی کردووە لە کەرکوکدا، کە لە ساڵی (١٩١٣) ژمارەی قوتابیانی بریتیبووە لە (٢٥٠) قوتابیی و بەڕێوەبەرەکەشی (حسقیل ئەهامە ئەفەندی) بووە[٩٩].

مێژووی یەکەم قوتابخانەی جووەکانی شاری کەرکوك، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨١٤)، بە ناوی (قوتابخانەی کەرکوکی کوران). ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی (١٩٠٣)دا، ژمارەی قوتابیانی گەیشتبووە (٦٠) قوتابی[١٠٠].

سەرەتاکانی مێژووی پەیدابوونی ئەم چەشنە قوتابخانانە لە شاری کەرکوکدا زۆر کۆن نین و دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی عوسمانی و بە دووریش بوونە لە دەستێوەردانی حکومی. دەوڵەمەندەکانی کەمە ئایینییەکان باربووی قوتابخانەکانیان کردووە و پێداویستییە سەرەکییەکانی خوێندنیان دابینکردووە[١٠١]. بەڵام لە سەردەمی پاشایەتی، لە ساڵی (١٩٣٠) بە دواوەوە کەوتوونەتە ژێر سەرپەرشتی و چاودێری وەزارەتی مەعاریفەوە، بۆیە یارمەتییان لە وەزارەتی مەعاریفیش وەرگرتووە. بە گوێرەی راپۆرتی ساڵانەی بەڕێوەچوونی مەعاریف بۆ ساڵی خوێندنی (١٩٤٧ - ١٩٤٨)، قوتابخانەی جووەکانی کەرکوك (المدرسة الاسرائيلية في كركوك)، (٥٠) دیناری وەك هاوکاری پێشکەشکراوە[١٠٢].

ئاستی خوێندن و فێرکردنی لەم چەشنە قوتابخانەیەدا، بە بەراورد بە خوێندنە باوەکانی شاری کەرکوك و عێراق، بە هۆی خوێندنی زمانە بیانییە زیندووەکان (ئینگلیزی و فەرەنسی) و وانەکانی ژمێرە و زانستەکانی بازرگانی و فێرکردنی پیشە و پیشەگەرییەکان، بەرزتر بووە[١٠٣]. هەروەها لە رووی رێکخستن و دەوامەوە شێوەگونجاوتر بووە لە قوتابخانە سەرەتاییە فەرمییەکان[١٠٤].

چەشنە قوتابخانەکانی دی، مەبەست لە قوتابخانە ئەهلییەکانە، لە شاری کەرکوکدا، بە درێژایی ماوەی لێکۆڵینەوەکە، تەنیا یەك قوتابخانەی ناوەندیی هەبوو، کە ساڵی (١٩٤١) کرابۆوە[١٠٥]. (بڕوانە خشتەی ژمارە (٨) روونکردنەوەی زێتر سەبارەت بە قوتابخانە ئەهلییەکان دەخاتەڕوو).

خشتەی ژمارە (٨)

قوتابخانە ئەهلییەکانی شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩٤٦) دا[١٠٦].

| قوتابخانەکان | ژمارەیان | ژمارەی مامۆستا | ژمارەی وانەبێژ | ژمارەی قوتابیان |
|---|---|---|---|---|
| قوتابخانەی ناوەندیی ئەهلی | ١ | ٢ | ٤ | ٨٦ |
| قوتابخانەی ئەرمەنی ئەهلی | ١ | ٩ | ... | ٢٢٧ |
| قوتابخانەی ئاسووری ئەهلی | ١ | ٣ | ... | ١٧٥ |
| کۆی گشتی | ٣ | ١٤ | ٤ | ٤٨٨ |

بە گوێرەی خشتەی سەرەوە، ژمارەی قوتابخانە ئەهلییەکان لە سێ دانە تێپەڕی نەکردووە و یەك دانە قوتابخانەش تایبەت بووە بە قۆناغی ناوەندی. ئەوەی جێی سەرنجدانە لە زانیارییەکانی خشتەی سەرەوەدا، قوتابخانەی ئەرمەنی ئەهلییە، کە هەم ژمارەی مامۆستاکانی هەم ژمارەی قوتابییەکانی رێژەیەکی بەرز داگیر دەکات لە چوارچێوەی ئەم چەشنە خوێندنە. بەپێی راپۆرتە کارگێڕییەکانی بەریتانی، کۆمەڵی ئەرمەنی ئاسانکاری و هاندانێکی زۆریان بۆ کراوە تاوەکو لەم چەشنە خوێندنەدا بخوێنن، چونکە کۆششی لێبراوانەی قوتابخانەکانی خۆیان، سەبارەت بە فێربوونی زمانی عەرەبی، نەگەیشتووەتە ئەندازەی پێویست[١٠٧].

لە پاڵ ئەو چەشنە خوێندنانەی لە پێشەوەدا باسکران، چەشنی خوێندنی دیکەش لە شاری کەرکوك هەبوون، وەك: خوێندنی قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری (محو الامیيه) لە نێو پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگە. بەڵام سەرچاوەکانی بەردەست زانیارییەکی ئەوتۆیان نەدا بەدەستەوە. هەرچی خوێندنی ئێواران بوو لە شاری کەرکوك لە ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکەدا، دوو قوتابخانەی لەو چەشنە بوونیان هەبووە بە ناوەکانی (قوتابخانەی قەڵای ئێواران) و (قوتابخانەی غازیی ئێواران)، کە بە هەر دوو قوتابخانە (٣١٥) قوتابییان هەبووە[١٠٨].

ج. کتێبخانە و چاپخانە و چاپەمەنییەکان:

مێژووی یەکەم کتێبخانەی گشتی لە شاری کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٣٧)، کاتێك کتێبخانەیەك بە ناوی (کتێبخانەی گشتیی کەرکوك)، لە چەشنی کتێبخانەی شارە گەورەکانی عێراق: (بەغدا و موسڵ) لەلایەن حکومەتەوە هاتە دامەزراندن. ئەم کتێبخانەیە لە شوێنی (قوتابخانەی ئەهلیی

نێواران) لەسەر موڵکی پێشووی (سەیید ئەحمەدی خانەقا)، بە تەنیشت مزگەوت و خانەقاوە بنیاتنرا(١٠٩).

کتێبخانەی گشتیی کەرکوک، شوێنێکی ڕۆشنبیریی بەرچاوی شاری کەرکوکی لە ساڵانی چل و پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا داگیر کردووە. ئەوەش بە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆری کتێبی فەرهەنگ و فەرەزمانی تێدا بووە. بووەتە فاکتەرێکی گرنگ لە وەرچەرخانە کۆمەڵایەتییەکانی شارەکە. بە گوێرەی زانیاریی ئامارە فەرمییەکانی ڕۆژگاری پاشایەتی بە هەزاران کتێب و ڕۆژنامەو پەخشەی هەمەچەشن و بە زمانە جیاوازەکانی (کوردی، تورکی، عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەلمانی و.. هتد) تێدا بووە. ژمارەیەکی زۆر لە خوێنەرو ڕۆشنبیرو قوتابی و مامۆستایانی شارەکە بۆ خوێندنەوە ڕوویان لە کتێبخانەکە کردووە.

**خشتەی ژمارە (٩)**

**پۆلێنکردنی کتێبەکانی کتێبخانەی گشتیی کەرکوک لەنێوان ساڵانی (١٩٥٣ – ١٩٥٧)(١١٠).**

| ساڵی خوێندن | ژمارەی خوێنەران | ژمارەو جۆری کتێبەکان | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کۆی گشتی | زمانی دیکە | ئەلمانی | فەرەنسی | ئینگلیزی | فارسی | تورکی | کوردی | عەرەبی |
| ١٩٥٣ – ١٩٥٤ | ٢٤٧٤١ | ١٧٥٣٥ | ٣٩ | ١ | ١٤٩ | ٣٥٠٠ | ٢٣ | ٨٤٠ | ١٩٢ | ١٢٧٩١ |
| ١٩٥٦ – ١٩٥٧ | ١٩٥٥ | ٧٨٨٣ | ٥ | ٣ | ٦٣ | ٤٥١ | ٢٩ | ٤٨٨ | ٢٧٣ | ٦٥٧١ |

تەنها لەو دوو ئامارە فەرمییەی لە سەرەوەدا بە نموونە وەرگیراوە، ئاماژە بە کتێبخانەکە کراوە، لە ئامارە فەرمییەکانی پێشتر سەرژمێریی تایبەت بە کتێبخانەکەی تێدا نییە. وەك لە خشتەی ژمارە (٩)دا دەردەکەوێت، کۆی گشتیی ژمارەی کتێبەکانی کتێبخانەی گشتیی کەرکوك لە ساڵی خوێندنی (١٩٥٣ – ١٩٥٤)دا بریتیبووە لە (١٧٥٣٥) کتێب. لەم ژمارەیەدا، ڕێژەی (٧٢,٩٪) لە کۆی گشتیی کتێبەکان بەر کتێبە عەرەبییەکان کەوتووە. دوای ئەویش ڕێژەی (١٩,٩) لە کۆی گشتیی کتێبەکان بەر کتێبە ئینگلیزییەکان کەوتووە. هەرچی ڕێژەی کتێبە تورکییەکان بووە، ئەوا تەنها بریتیبووە لە (٤,٧٪) لە کۆی گشتیی کتێبەکان. کتێبە کوردییەکانیش تەنها (١,١٪) لە کۆی گشتیی کتێبەکانی کتێبخانەکەی بەرکەوتووە. ئەمە لە کاتێکدایە، کە زمانەکانی کوردی و تورکمانی زۆرینەی پێکهاتەی دانیشتوانی کەرکوکی پێکهێناوە.

جێی سەرنجە، بە هۆی سووتانی کتێبخانەی گشتی لە ساڵی (١٩٥٥)دا(١١١)، پێگەو ڕۆڵی کتێبخانەی گشتیی کەرکوك بەپێی کۆمەڵە ئاماری بەر لە کۆتایی سەردەمی پاشایەتی، بە شێوەیەکی کاریگەر بەرەو بچووك بوونەوە چوو. بە گوێرەی ئاماری ساڵی (١٩٥٦ – ١٩٥٧)، ژمارەی کتێبەکانی کتێبخانەکە نزیکەی دە هەزار کتێب لە ئاگرکەوتنەوەکەدا لەناوچوون. ئەوەی مایەی تێبینییە، بەرزبوونەوەی ژمارەی کتێبە کوردییەکانە! ئەوەش لە سایەی بەرزبوونەوەی چالاکیی ڕۆشنبیریی چاپەمەنییە کوردییەکانی ئەو ساڵانەی کۆتایی سەردەمی پاشایەتی بوو، وەك لە دواتردا باسی دەکەین.

سەبارەتیش بە ئەو کەسانەی سەردانی کتێبخانەکەیان کردووە. لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵە ئامارەی لە خشتەکەدا خراوەتەروو جیاوازییەکی گەورە بەرچاو دەکەوێت. ڕەنگە هۆی ئەمە بریتی بێت لە کەمبوونەوەی پێگەی کتێبخانەی گشتیی کەرکوك لە ئاکامی کەمبوونەوەی ژمارەی کتێبەکان و لەخۆ نەگرتنی کتێبی نوێ لە لایەك و لە لایەکی دیکەش زۆربوونی کتێبخانەکانی بازار (کتێب فرۆشەکان) کاریگەری دیاری بەسەر ئەم لایەنەوە هەبووە، کە ئەو کتێبفرۆشانە بەرهەمی تازەو خواست لەسەریان هێناوەتە بازار و بەر دیدی ڕووناکبیرو خوێندەوارانی کەرکوك(١١٢)، وەك لەمەودوا باسیان دەکەین. بێگومان ئەو کتێبانەی لە کتێبخانەی گشتییدا هەبوون لە ژێر چاودێرییەکی توندی دەزگا ئەمنییەکاندا بوو، بۆیە ئەمە تینوێتی خوێنەری کەرکوکی نەدەشکاند، کە بە شوێن کتێبە قەدەغەکراوەکان کەوتبوون(١١٣).

ئەوەی تا ئێستا زانراوە مێژووی پەیدابوونی کتێبخانەی بازار لە شاری کەرکوکدا، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٢٦)، کاتێك دوکانێك بەناوی کتێبخانەی ئەمەل (الامل) بۆ فرۆشتنی کتێب و بڵاوکراوەکان کراوەتەوە(١١٤). دوای کۆتایی هاتنی قۆناغی ئینتیدابی بەریتانییش بازاڕی کتێبخانەکان گەشەی کردووە. بە گوێرەی سەرچاوەکان، کۆمەڵێك کتێبخانەی ئەهلی لە ساڵانی سیی سەدەی بیستەم لە بازاڕەکانی شاری کەرکوکدا کراونەتەوە، ئەم کتێبخانانە ڕۆڵی کاریگەرو دیاریان لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری و زانیاری و هەواڵی ناوخۆو دەرەوەدا گێڕاوە، بەوەی بە تەك کتێب فرۆشییەکەیانەوە، شوێنی دابەشکردنی ڕۆژنامەو گۆڤارو هەندێکیان پەخشە سیاسییەکانیش بوونە. وەك: کتێبخانەی (فجر الجدید – کازیوەی نوێ)، کتێبخانەی (الثقافة الوطنیة – ڕۆشنبیریی نیشتمانی)، کتێبخانەی (الاخوة الإسلامیة – برایەتی ئیسلامیی) سەر بە کۆمەڵەی برایانی موسڵمان و زۆری دیکە. کتێبخانەی کازیوەی نوێ، کە خاوەنەکەی ڕۆشنبیرێکی عەرەبی بەغدایی بوو بە نێوی (عەبدولجەببار ئەلزوهەیری)، دەستی باڵای هەبوو لە بواری پەرەپێدانی هۆشیاری خوێندەوارانی کەرکوکی و فرۆشتنی پەرتووك و گۆڤارە پێشکەوتنخوازەکانی ئەو ڕۆژگارە. بەرپرسی یەکەمی لێژنەی ناوخۆیی کەرکوکی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی، بە حورمەت و بەرزەوە لە دووتوێی بیرەوەرییەکانیدا ئاماژەی بۆ کردووە(١١٥). هەر لەو کتێبخانەیشدا، ئۆرگانەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی، واتە (ئەلقاعیدە) و (هەمەك)(١١٦) و (ئازادی)، چنگ دەکەوتن و دابەش دەکران(١١٧).کتێبخانەی ڕۆشنبیریی نیشتمانی (الثقافة الوطنیة) بە خاوەندارێتی (ئەکرەم) ناوێك، ڕۆڵی گەورەی لە مانگرتنی گاوڕباغی و

بەردەوامبوونی دا هەبووە[١١٨].
بەپێی ووتەی چەند شایەتحاڵێك، كتێبخانەی ڕۆشنبیری نیشتمانی ببووە لانەیەكی چاكی پارتی كۆمۆنیستی عێراقی و لەوێ ڕۆژانەیان بەو كرێكارانە دەدا كە دەستكورت بوون و لە ئاكامی مانگرتندا دووچاری گرفتی دارایی هاتبوون[١١٩].
(جمعیه الاخوان المسلمین – كۆمەڵەی برایانی موسڵمان)، كە ساڵی (١٩٥٤) بە فەرمی لە عێراق ڕێگەی كاریان پێدرا، لە شاری كەركوكدا كتێبخانەیەكیان دروستكرد بە ناوی كتێبخانەی (الاخوه الإسلامییه)، ئەم كتێبخانەیە، لە (بازاری عەسری)دا بوو، ڕۆڵی كاریگەری لە بڵاوكردنەوەی ئەدەبیاتی ئەو كۆمەڵەیەو ئۆرگانەكەی ڕۆژنامەی (الحساب) دا هەبوو[١٢٠].

سەرباری ئەم كتێبخانانە چەندان كتێبخانەی دیكە لە شاری كەركوك لە سەردەمی پاشایەتی لە كاردا بوون، لە گرنگترینیان ئەمانە بوون: (كتێبخانەی ئەمریكی)، (كتێبخانەی عەسری)، (كتێبخانەی ئۆرزدی باك)، (كتێبخانەی یۆجین)، (كتێبخانەی عەباس حیلمی)، (كتێبخانەی محەمەد حوسێن)، (كتێبخانەی عومەر بێكەس)، (كتێبخانەی حەبیب)و زۆری دیكە. سەرەڕای ئەم دوكان و كتێبخانانە، كتێبفرۆشی سەر شۆستەكانیش بازاریان گەرم بووە لەو ڕۆژگارەدا[١٢١].
هەندێك لەو كتێبخانانە خاوەن مۆركی تایبەت بوونەو تایبەتمەندێتیو خاڵی جیاكەرەوەیان هەبووە. بۆ نموونە (كتێبخانەی ئەمریكی)، كە دەكەوتە ناوەڕاستی شارەوە لە بەرانبەر پردە نوێیەكە، كتێبخانەیەكی گەورەو پڕ لە كتێبی نوێی ئینگلیزی بووە، هۆڵێكی گەورەی هەبووە بۆ پیشانگای شێوەكاریش بەكارهێنراوە. هەروەها (كتێبخانەی یۆجین)، تایبەت بووە بە فرۆشتنی كتێبی ئینگلیزی بەكارهێنراو (Second Hand)[١٢٢].

مێژووی پەیدابوونی یەكەم چاپخانەش لە شاری كەركوك، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حوكمڕانیی عوسمانی، كاتێك والی (فەیزی پاشا) ساڵی (١٨٧٨)(*) چاپخانەی هێناوەتە شاری كەركوكو ناویان لێناوە (چاپخانەی ویلایەت). ئەم چاپخانەیە تایبەت بووە بە لەچاپدانی كاروبارە فەرمییەكانی ویلایەت[١٢٣].
پاش چاپخانەی ویلایەت، چاپخانەیەكی دیكە لە دەیەی یەكەمی سەدەی بیستەم بە هەوڵ و كۆششی والی (عەونوڵڵا كازمی) هێنرایە شاری كەركوك، ئەو چاپخانەیە بە (صنائع مكتبی مطبعه سی) ناسرا، كە تایبەت بوو بە قوتابخانەی (صنائع). لە ڕێگەی ئەم چاپخانەیەوە كۆمەڵێك بڵاوكراوەو كتێب لەچاپدران[١٢٤]. دوای ئەویش، هەر لە سەردەمی عوسمانی، چاپخانەیەكی ئەهلیو فەرمی هێنراوەتە شاری كەركوك كە یەكەمیان بە (چاپخانەی حوادث) ناوی ناسرا. چونكە ئەم چاپخانەیە ڕۆژنامەیەكی سیاسی دەردەكرد بەم ناوەوە. دواتر ئەم چاپخانەیە لەلایەن هێزەكانی داگیركەری ئینگلیزەوە ساڵی (١٩١٨) كرایەوەو ڕۆژنامەیەكی نوێیان پێ دەردەكرد بە ناوی (النجمه)[١٢٥]. دووەمیشیان چاپخانەیەكی تایبەت بوو بە مۆڵگە سەربازییە عوسمانییەكەی شاری كەركوك بە ناوی (فەیلەق)، كە ڕێنماییو نووسراوە سەربازییەكانی سوپای عوسمانی پێ چاپ كراوەو نەكەوتوونەتە بەر دەستی خەڵكی[١٢٦]. بۆیە زانیارییەكی ئەوتۆ دەربارەی ئەو چاپخانەیە لەبەر دەست نییە.
ئەوەی تێبینی گەورە هەڵدەگرێت سەبارەت بە چاپخانەكانی كەركوك لە سەردەمی پاشایەتی، ئەوەیە كە حكومەتە یەك لەدوای یەكەكانی عێراق، بە هۆی زانراو، گرنگییان بە چاپخانەو بزاوتی ڕۆشنبیریی خۆماڵیی ناوچەكە نەداوە. بواری كاری چاپخانە لە شاری كەركوكدا، لە پەنجاكانی سەدەی بیستەمدا، گۆڕان و پەرەسەندنێكی گەورەی بەخۆوە گرت، ئەویش بە كڕین و هێنانی چەند چاپخانەیەك لەلایەن چەند كەركوكییەكەوە، لەوانە: (چاپخانەی تەرەقی) (١٩٥٣)، (چاپخانەی تەتویج) (١٩٥٣)، (چاپخانەی نەینەوا) (١٩٥٤)، (چاپخانەی هیلال) (١٩٥٥)، (چاپخانەی شیمال) (١٩٥٦) [١٢٧].

چاپخانەكانی كەركوكی سەردەمی پاشایەتی، سەرباری لە چاپدان و بڵاوكردنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەكانی كەركوك، وەك: ڕۆژنامەی (كركوك)، ڕۆژنامەی (ایلری)، گۆڤاری (صدی الشباب)، ڕۆژنامەی (الوحدة)، گۆڤاری (الافاق)، گۆڤاری (الثقافة الحدیثة)، گۆڤاری (شەفەق)[١٢٨]، ڕۆڵی دیاریان لە بڵاوكردنەوەی بەرهەمی ئەدەبیو ئایینیو مێژوویی و ڕۆشنبیرییەكانی كەركوك، بە تایبەت كوردییەكان، و شارەكانی دیكەش هەبوو.
هەندێك لە بەرهەمە دیارەكانی چاپخانەكانی كەركوك لە ڕۆژگاری پاشایەتی ئەمانە بوون: (خورشید خاوەر) (چیرۆك) نووسینی (عەلی باپیر ئاغا) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٣)، (حیكایەتی مەلای مەشهور) (نوكتە) نووسینی (مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٣)، (نەصائیحی موفیدە بە كوردی) (ئامۆژگاریی ئایینی) نووسینی (عەبدولسەلام حەیدەری) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٢)، (غەزای بەدرو حونەین) (بەیت) نووسینی (مەلا شەریف خاڵەبازیانی) چاپخانەی (تەرەقی)، (فەتحی قەڵای خەیبەر) (بەیت) ناوی نووسەری لەسەر نییە چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٥)، (نورو نەجات) (بەیت) نووسینی (مەلا عەبدولكەریمی مودەڕس) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٦)، (سیرەتی حەزرەتی محەمەد) (بەیت) نووسینی (مەلا محەمەد) چاپخانەی (تەرەقی)، (ئەمیر ئەرسەلان) (بەیت) نووسینی (عەلی باپیر ئاغا) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٦)، (دیوانی تاهیر بەگی جاف) نووسینی (تاهیر بەگ وەسمان پاشای جاف) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٧)، (ڕۆستەم و جیهانگیر) (چیرۆك) نووسینی (عەلی باپیر ئاغا) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٧)، (گوڵستانی شێخ سەعدی) (بەیت) نووسینی (محەمەد فیدا) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٧)، (دیوانی جاهد) نووسینی (بورهان دۆغرەمچی جاهید) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٧)، (اساطیر خالدة) (شیعر) نووسینی (فاضل كلو العزاوي) چاپخانەی (التتویج) ساڵی (١٩٥٧)، (سادات البرزنجیه) (مێژووی ڕەچەڵەك) نووسینی (عبدالقادر البرزنجي) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٦)،

(ماذا في كركوك) (پرۆژە ئاوەدانکارییەکان) نووسینی (فهمي عرب آغا و فاضل محمد ملا مصطفى) چاپخانەی (التتويج) ساڵی (١٩٥٧)، (المجزرة الاولى) (شانۆگەری) نووسینی (الاب يوسف سعيد) چاپخانەی (الشمال) ساڵی (١٩٥٧)، (كركوك خوريات وماعنيلري) (قۆريات) سێ بەرگ نووسینی (عطا ترزي باشي) چاپخانەی (تەرەقی) ساڵی (١٩٥٦-١٩٥٧) وێڕای زۆری دیکەش[١٢٩].

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. سیستەمی خوێندن لە رۆژگاری عوسمانییدا بە دوو شێوە بوو: ئەو قوتابخانانەی (مەکتەب) سەر بە وەزارەتی مەعاریف بوون، وەك: قوتابخانەکانی (صنائع، سەرەتاییەکان). هەروەها ئەو قوتابخانانەی (مەدرەسە) سەر بە دامودەزگاکانی ئەوقاف بوون، وەك: (حوجرەی مزگەوتەکان و سوختەخانەکان).
بڕوانە: (راپۆرتی کارگێڕیی دەفەری کەرکوك)، لاپەڕە (١٨٨).
ئەم بارودۆخە بە هاتنی ئینگلیزەکان و دواتریش پەیدابوونی دەسەلاتی نیشتمانی، تا سالانێکی زۆر گۆرانێکی گەورەی ئەوتۆی بەخۆوە نەگرت. ئەم چەشنە سیستەمو خوێندنانە هەر مابوون، بە گۆرانکارییەکی رووکەشییەوە.

٢. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە خوێندنی نوێ لە دەولەتی عوسمانی پەیدا بوو. بەلام تەنها تایبەت بوو بە پایتەخت و ناوچەو هەرێمەکانی بۆ سالانێکی درەنگتر ئەو چەشنە خوێندنەیان تێدا بلاوبۆوە.
بروانە: جميل موسى النجار، (التعليم في العراق في العهد العثماني الاخير ١٨٦٩ - ١٩١٨)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ٢٠٠١، لاپەرە (٤٣-٤٤).

٣. البرت م. منتشاشفيلي، (العراق)، لاپەرە (١٩٥).

٤. عبدالرزاق الهلالي، (تأريخ التعليم في العراق في العهد العثماني ١٦٣٨ - ١٩١٧)، الاهلية للنشر والطبع، بغداد، ١٩٥٩، لاپەرە (١٨٢).

٥. بروانە: المصدر نفسه، لاپەرە (١٨٠-١٨١).

٦. (موصل ولايتى سالنامه رسميسيدر)، موصل ولايتى مطبعه سى، (١٣٣٠ هجرى - ١٩١٢ ميلادى)، لاپەرە (٢٣٧-٢٣٨).

٧. البرت م. منتشاشفيلي، (العراق)، لاپەرە (٨٠).

٨. نوێنەرەکانی کەرکوك لەو خوولەدا، کە خوولی دووەم بوو، بریتیبوون لە: (حاجی عەلی مستەفای قیردار) و (سالح پاشای ئەوتچی).
بـروانـە: شكـري محـمـود نـديـم، (احـوال العـراق في مرحلة المشروطية الثانية ١٩٠٨ - ١٩١٨) دراسة تأريخية، اطروحة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الآداب بجامعة بغداد، ١٩٨٥، لاپەرە (١٩٥).

٩. بروانە: رۆژنامەی (تقويم الوقائع)، الموصل، ١٩ صفر ١٣٢٧ (١٩٠٩). وەرگیراوە لە: ابراهيم خليل احمد، تطور التعليم الوطني في العراق (١٨٦٩-١٩٣٢)، مطبعة جامعة البصرة، البصرة، ١٩٨٢، لاپەرە (٥٠).

١٠. (موصل ولايتى سالنامه رسميسيدر)، موصل ولايتى مطبعه سى، (١٣٣٠ هجرى - ١٩١٢ ميلادى)، لاپەرە (٢٣٨).

١١. دەربـارەی قـوتـابخـانـەکـانی کـەرکـوك لـە سـەردەمـی عوسماني، بـروانـە: نجاه كوثر اوغلو، (مـدارس كركوك في الفترة العثمانية)، "ميزوبوتاميا" (مجله)، العددان (٥-٦)، بغداد، تموز٢٠٠٥، لاپەرە (٤٢٣-٤٢٦).

١٢. عبد الفتاح علي بوتاني، (مدرسة ١١ آذار اول مدرسة كوردیية في مدينة الموصل مع نبذة تأريخية من التعليم في كوردستان - العراق)، الطبعة الثانية، اربيل، ٢٠٠٢، لاپەرە (٣٤).

١٣. بروانە:
- عبـد الـرزاق الهلالـي، (تـأريخ التعليم في الـعـراق في عهد الانتداب البريطاني ١٩٢١ - ١٩٣٢)، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ٢٠٠٠، لاپەرە (٢٥٥).
(الدولة العراق)، وزارة المعارف، التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة (١٩٢٤ - ١٩٢٥)، بغداد، ١٩٢٦، لاپەرە (١).

١٤. نبيل احمد عامر صبيح، (التعليم الثانوي في البلاد العربية)، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٧١، لاپەرە (٣٧).

١٥. بروانە:
- (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٢٤ - ١٩٢٥)، لاپەرە (١).
- ساطع الحصري، (مذكراتي في العراق ١٩٢١ - ١٩٤١)، الجزء الاول، من منشورات دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٨، لاپەرە (٣٣٩-٣٤٠).

١٦. بـروانـە: محەمەد عەبدوللا کاکەسور، (گەشەکردنی خوێندنی فەرمی لە لیواکانی کوردستانی عێراق دا ١٩٢١ - ١٩٥٣) لێکۆلینەوەیەکی مێژوویە، زنجیرە بلاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، هەولێر، ٢٠٠٤، لاپەرە (٣٨).

١٧. Review of the Civil Administration of Mesopotamia، Prepared by: Miss Gertrude L. Bell، India Office، ٣rd December، ١٩٢٠، P.١٤٠.
وەرگیراوە لە: (راپۆرتی کارگێڕیی دەفەری کەرکوك)، لاپەرە (٨٨).

١٨. محمد كلدان، (تأسيس المدارس النظامية في كركوك)، "الثقافة الحديثة"(مجلة)، العدد (١)، كركوك، مايس١٩٥٤، لاپەرە (٤٥).

١٩. بروانە: عبدالرزاق الهلالي، (تأريخ التعليم في العراق في العهد العثماني)، لاپەرە (١٨١).

(*) عیزەت پاشای کوڕی حاجی زەینەل بەگی کوڕی عەلی بەگی ساری کەهیەیە، سالی (١٨٧٠) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە. دەرچووی قوتابخانەی سەربازیی ئەستەمبولە (١٨٨٨). زۆر پلەی سەربازی پێبەخشراوە، سالی (١٩٣٢) لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە.
بروانە: مير بصري، إعلام التركمان والادب التركي في العراق الحديث، دار الوراق للنشر، لندن، ١٩٩٧، لاپەرە (٥٠-٥١).

٢٠. ابراهيم خليل احمد، (تطور التعليم الوطني)، لاپەرە (١٢٠).

٢١. ابراهيم خليل احمد العلاف، (التعليم في العراق أبان عهد الانتـداب ١٩٢٠ - ١٩٣٢)، في: (المفصل في تأريخ العراق المعاصر)، لاپەرە (٧٧٩-٧٨٠).

٢٢. الحكومة العراقية، وزارة المعارف، (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٣٣ - ١٩٣٤)، بغداد، ١٩٣٥، لاپەرە (٨).

٢٣. الحكومة العراقية، وزارة المعارف، (التقرير السنوي عن

سیر المعارف لسنة ١٩٣٩ - ١٩٤٠)، بغداد، ١٩٤١، لاپەڕە (٩).

٢٤. بڕوانە:

- ساطع الحصري، المصدر السابق، الجزء الاول، لاپەڕە (٢١).

- عبد الرزاق الهلالي، (تأريخ التعليم في العراق في عهد الاحتلال البريطاني ١٩١٤ - ١٩٢١)، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٧٥، لاپەڕە (١٥٢).

- "ژیان" (ڕۆژنامە)، ژمارە (١١٨)، سلێمانی، (٢١ حوزەیرانی ١٩٢٨).

٢٥. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ڕەوشی خوێندن و فێرکردن، بڕوانە: ابراهیم خلیل احمد العلاف، (التعليم في العراق ابان عهد الانتداب)، لاپەڕە (٧١١-٧٨٧).

٢٦. Special Report، by: His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the Progress of Iraq during the Period (١٩٢٠-١٩٣١)، London، ١٩٣١، P.٢٣١.

وەرگیراوە لە: البرت م. منتشاشفيلي، العراق، لاپەڕە (١٩٨).

(*) خەرجییەکان بە (لەکی ڕووپیە) حسێب کراوە، کە هەر لەکێك بریتیبووە لە (١٠٠) هەزار ڕووپیە.

٢٧. محەمەد ئەمین زەکی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧٩).

٢٨. بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، (کوردستانی عێراق: سەردەمی قەڵەم و موراجەعات ١٩٢٨ - ١٩٣١)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، لاپەڕە (١٨-١٩).

٢٩. الحكومة العراقية، وزارة المعارف، التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٣٣-١٩٣٤، بغداد، ١٩٣٥، لاپەڕەی جۆراوجۆر.

٣٠. م.م.ن، (الدورة الانتخابية التاسعة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٤٠، تقرير لجنة الشؤون المالية عن لائحة قانون الميزانية العامة لسنة ١٩٤٠ المالية)، بغداد، ١٩٤١، لاپەڕە (٢١١).

٣١. (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٣٣ - ١٩٣٤)، لاپەڕە (٥-٦).

٣٢. بڕوانە:

- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١).

- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٤٩)، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥١، لاپەڕە (٦٨، ٧١).

- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٤)، لاپەڕە (٥٨-٥٩).

- الجمهورية العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٧)، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٨، لاپەڕە (٥٣-٥٤).

(*) پێدەچێت زۆرتر هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکان لەو ساڵەدا بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە باڵەخانەی قوتابخانەکان تەواو بوو بێت و ئەو بەناو قوتابخانانەی لە ماڵ و شوێنە تایبەتەکاندا هەبوون، لەو باڵەخانە نوێیەدا لێکدرا بن.

٣٣. الحكومة العراقية. وزارة المعارف، (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٤٣ - ١٩٤٤)، بغداد، ١٩٤٥، لاپەڕە (٣٣).

٣٤. Iraq Administration Reports (١٩١٤-١٩٣٢)، Vol: (٩)، ١٩٢٨-١٩٣٠، PP.٣١١، ٤٨٥.

٣٥. ئەو ساڵانە قوتابیان دوای تەواوکردنی سەرەتایی ڕاستەوخۆ دەچوونە دواناوەندی کە خوێندن تیایدا چوار ساڵ بوو. بەڵام لە ساڵی (١٩٢٩)ەوە خوێندنی دواناوەندی کرایە پێنج ساڵ، سێ ساڵی یەکەم تایبەت بوو بە خوێندنی ناوەندی و دوو ساڵەکەی کۆتاییش تایبەت بوو بە خوێندنی دواناوەندی. نجات كوثر اوغلو، (صفحات من تأريخ كركوك)، لاپەڕە (٢٥١).

٣٦. حنان عيسى الجبوري، (مشكلات ادارة المدرسة الثانوية في العراق)، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٧٠، لاپەڕە (١١٣).

٣٧. بۆ نموونە بڕوانە: اسماعيل شكر رسول، (اربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩ - ١٩٥٨)، الطبعة الثانية، السليمانية، ٢٠٠٥، لاپەڕە (٥١).

٣٨. بڕوانە: محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسوور، (گەشەکردنی خوێندنی فەرمی)، لاپەڕە (١١٢، ١٦٨). بەڵام ئەم ژمارەیە لە ساڵی خوێندنی (١٩٤٣ - ١٩٤٤)دا، ڕەنگە بە هۆی بارودۆخی جەنگەوە، لە کورتی داوە و بریتیبووە لە (٣١٩) قوتابی.

٣٩. بڕوانە: م.م.ن، (الدورة الانتخابية السابعة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٣٧)، محضر الجلسة (٦)، في (٢٥ آذار ١٩٣٧).

٤٠. ئەم قانوونە، (٢٣ ی مایسی ١٩٣١)، لەلایەن کابینەی حکومەتی (نووری سەعید)ەوە، پاش ڕەزامەندی مەلیکی عێراق (فەیسەڵی یەکەم) دەرچووە. بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: (نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧٧-١٧٨).

٤١. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی بڕوانە:

- جبار قادر، (السياسات الحكومية في كركوك، لاپەڕە (١٧٥-١٨٥).

- خليل مصطفى عثمان الاتروشي، (كوردستان الجنوبية -العراق، في سنوات الاحتلال والانتداب البريطانيين ١٩١٨ - ١٩٣٢)، رسالة ماجستير، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة دهوك، ٢٠٠٥، لاپەڕە (٢٨٨-٢٩٣).

٤٢. (قانون اللغات المحلية رقم (٧٤) لسنة ١٩٣١)، (الوقائع العراقية) (جريدة)، العدد (٩٨٩)، بغداد، (١ حزيران ١٩٣١).

٤٣. محەمەد ئەمین زەکی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧٩).

٤٤. دەربارەی، بڕوانە: هيوا حميد شريف، توفيق وهبي: (حياته و دوره السياسي والثقافي ١٨٩١ - ١٩٨٤)، رسالة ماجستير، مقدمة الى مجلس كلية التربية بجامعة الموصل، ٢٠٠٦.

٤٥. سەلمان عەلی، (کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا)، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥، لاپەڕە (٦٩).

٤٦. گرفتەکە لەگەڵ دەرچوونی قانوونی زمانە خۆجێیەکان پەیدا نەبووە، بەڵکو پێشترو لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی تازەی عێراقی عەرەبی و لکاندنی ویلایەتی موسڵ پێوەی، سەری هەڵدا. بەپێی راپۆرتە بریتانییەکان پێش دەرچوونی قانوونەکەش، قوتابییە کوردەکان کێشەی راستەقینەیان هەبووە لەو بارەوە. بروانە:
Iraq Administration Reports (١٩١٤-١٩٣٢)، Vol: (٨)، ١٩٢٥-١٩٢٧، P.١٣٩.

٤٧. Amir Hassanpour، Nationalism and Language in Kurdistan (١٩١٨-١٩٨٥)، Mellen Research University Press، San Francisco، ١٩٩٢، PP.١١٦-١١٧.

٤٨. H. A. Foster، the Making of Modern Iraq (A Product of World Forces)، Williams & Norgate Ltd.، London، ١٩٣٦، P.٢٥٨. (في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، ص٤٢٦)

٤٩. عبداللطيف بندر اوغلو، (التركمان في عراق الثورة، تاريخهم، لغتهم، آدابهم، تراثهم)، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٣، لاپەڕە (١٩).

٥٠. ستيفن همسلي لونكريك و فرانك ستوكس، المصدر السابق، لاپەڕە (١٨٥).

٥١. فب مار، (تاريخ نوين عراق)، ترجمة: محمد عباس ثور، مؤسسة چاپ آستان قدس رضوى، مشهد، ١٣٨٠، لاپەڕە (١٣٨).

٥٢. (العراق) (جريدە)، بغداد، (٥ كانون الثاني ١٩٤٠).

٥٣. بروانە:
- (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٣٣-١٩٣٤)، لاثقرة (٨).
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٤٩)، المصدر السابق، لاپەڕە (٦٩).
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٤)، لاپەڕە (٥٨، ٦٠).
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٧)، لاپەڕە (٥٣، ٥٥).

٥٤. S. H. Longrigg، Iraq، PP.٣٨٩-٣٩٠. (في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، لاپەڕە (٦٣٦).

٥٥. الجمهورية العراقية، وزارة التخطيط، (مديرية الاحصاء العامة، التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٥٧-١٩٥٨)، بغداد، ١٩٥٩، لاپەڕە (٤٢).

٥٦. بروانە:
- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنتي ١٩٤٤ - ١٩٤٥)، بغداد، ١٩٤٦، لاپەڕە (٢١).
- الحكومة العراقية، وزارة المعارف، (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٥٠ - ١٩٥١)، بغداد، ١٩٥٢، لاپەڕە (٤٢).

٥٧. بۆ زانیاریی زیاتر، بروانە: د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسوور، (گەشەکردنی خوێندنی فەرمی)، لاپەڕە (١١٨-١٢٤).

٥٨. بروانە:
- (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٣٣ - ١٩٣٤)، لاثقرة (٤).
- (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٤٣ - ١٩٤٤)، لاپەڕە (٩).
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٤٩)، لاپەڕە (٧٠).
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٤)، لاپەڕە (٥٩-٦٠).
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٧)، لاپەڕە (٥٤-٥٥).

٥٩. الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٢)، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٣.، جدول رقم (٦٢)، لاپەڕە (٤٧).

٦٠. بروانە:
- (احصاء السكان لسنة ١٩٤٧)، الجزء الثاني، لاپەڕە (١٠٣).
- (المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧)، لوائي السليمانية وكركوك، لاپەڕە (١٨٦).

(*) ژمارەی ئەو کەسانەی تەمەنیان لە خوار پێنج ساڵییەوەیە حسێب نەکراون، کە بریتیبوونە لە (١٤٥٢٤) کەس.
(**) ژمارەی ئەو کەسانەی تەمەنیان لە خوار پێنج ساڵییەوەیە حسێب نەکراون، کە بریتیبوونە لە (٢٣٠١٦) کەس.

٦١. جميل موسى النجار، المصدر السابق، لاپەڕە (٧١)، وما بعدها.

٦٢. سورة العلق، آية (١).

٦٣. سورة طه، آية (١١٤).

٦٤. سورة الإسراء، آية (٨٥).

(*) (الكتاتيب): کۆی (الكتاب)ە، ئەو شوێنەیە کە مامۆستا ئایینییەکان بۆ یەکەمجار منداڵانی موسڵمان فێری خوێندنەوەی قورئان دەکەن.
(**) سوختەخانە، بەو شوێنە وتراوە کە لە دەرەوەی مزگەوتدا بووە یان لە پاڵ مزگەوتدا بووەو شوێنی خوێندنی زانستە ئایینییە باڵاکان بووە.

٦٥. بروانە:
- جرجي زيدان، (تاريخ التمدن الإسلامي)، الجزء الثالث، مصر، ١٩٢٠، لاپەڕە (١٩٤).
- نخبة من المستشرقين، (تراث الإسلام)، الجزء الثاني، ترجمة: جرجيس فتح الله، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٠، لاپەڕە (٣٥٣).

٦٦. بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی پلەکانی خوێندنی ئایینی و ئەو زانست و کتێبانەی لە پلەکاندا دەبوو بخوێندرێن، بروانە: علاو الدين سجادى، (كوردەوارى)، چاپخانەی معارف، بغداد، ١٩٧٤، لاپەڕە (١٠٥).

- مەلا محەمەد عەلیاوەیی، (ژیانی فەقێیایەتی لە کوردستاندا لە سەدەی (١٣ - ١٤)ی کۆچی، سلێمانی، ٢٠٠٣، لاپەڕە (٢٥)، بەدواوە.
- محمد صالح، (یادنامەی مەلاو فەقێ و کەلەپوورەکانیان)، (کەرکوك) (گۆڤار)، ژمارە (٤٠)، کەرکوك، بەهاری ٢٠٠٩، لاپەڕە (١٤-١٦).

٦٧. بۆ زانیاری دەربارەی مێژووی خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا، بڕوانە:

حەمە کەریم هەورامی، (مێژووی پەروەردەو خوێندن لە حوجرەکانی کوردستاندا)، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٨.

- محەمەد عەلی قەرەداغی، (مێژووی زانایانی کورد)، بەرگی یەکەم، بەغداد، ١٩٩٨، لاپەڕەی جۆراجۆر.

٦٨. دەربارەیان بڕوانە: گۆران فەتحی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٤-٧١)و (١٥٥-١٥٧).

٦٩. بڕوانە: محمد عبدالله کاکەسوور و نیشتمان بشیر محمد، (التعلیم الدینی - الإسلامي في کوردستان العراق من ١٩٢١ - ١٩٥٨)، (زانکو) (مجلة)، العدد (٤٠)، اربیل، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٢٢٣).

٧٠. نموونە لەم بارەوە زۆرن، رەنگە دیارترین ئەو نموونانە لە هەڵوێستەکانی (سەیید ئەحمەدی خانەقا)و (شێخانی تاڵەبانی)و (بنەماڵەی خادم سەججادە)و زۆری دیکە، دەربارەی بووژانەوەی رەوتی زانستی لە شاری کەرکوك روون ببنەوە.

٧١. محمد علي قرداغي، (هوية كركوك الثقافية)، لاپەڕە (٤٥-٦٦).

٧٢. لەم بارەوە بڕوانە:

- سعيد الديوەجي، (التربية والتعليم في الإسلام)، مطبعة الجامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٢، لاپەڕە (٤١).
- محمد عبدالله کاکە سوور و نیشتمان بشیر محمد، المصدر السابق، لاپەڕە (٢٢٨).

٧٣. بڕوانە:

- (موصل ولايتی سالنامەسی، ١٣٠٨ هجری - ١٨٩٠ میلادی)، لاپەڕە (١٣٩).
- (موصل ولايتی ایجون ایکنجی دفعە، ١٣١٠ هجری -١٨٩٢ میلادی)، لاپەڕە (٢٠٥).

٧٤. Iraq Administration Reports (١٩١٤-١٩٣٢)، Vol: (٢)، ١٩١٨، Report of Administration for ١٩١٨ of Divisions & Districts of the Occupied Territories in Mesopotamia، PP.٤٣٤-٤٣٥.

٧٥. Iraq Administration Reports (١٩١٤-١٩٣٢)، Vol: (٤)، ١٩١٩، Administration Report of Kirkuk Division for Period (January ١st ١٩١٩، to December ٣١st، ١٩١٩)، P.٤٠٤. (لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، ل٩٦)

٧٦. Review of the Civil Administration of Mesopotamia، Prepared by: Miss Gertrude L. Bell، India Office، ٣rd December، ١٩٢٠، P.١٤٠.

وەرگیراوە لە: راپۆرتی کارگێڕیی دەڤەری کەرکوك، ل٨٨.

٧٧. Iraq Administration Reports (١٩١٤-١٩٣٢)، Vol: (٨)، ١٩٢٥-١٩٢٧، P.١٥٧.

٧٨. دەربارەی بڕوانە: محمد صالح، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٦).

٧٩. دەربارەی ئەم قوتابخانە ئایینییانە، بڕوانە:

- محمد علی قرداغی، (هوية كركوك الثقافية)، لاپەڕە (٤٥-٦١).
- مهدي صالح سعيد العباسي، المصدر السابق، لاپەڕە (١٣٥-١٣٦).
- محمد صالح، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٦-٣٧).
- گولەر سیامەنسووری، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩-٤٠).

٨٠. دەربارەی مەلا قادری ئیمام، بڕوانە: بورهان عبدالرحمن جاف، (مەلا قادری ئیمام)، (بانەرۆژ) (گۆڤار)، ژمارە (١٤)، کەرکوك، کانوونی دووەمی ٢٠٠٥، لاپەڕە (٢٨-٣٠).

٨١. دەربارەی بڕوانە: شاخوان عبدالله صابر، (رفيق حيلمي ١٨٩٨ - ١٩٦٠، دراسة تاريخية في نشاطه السياسي و الثقافي)، رسالة ماجستير، مقدمة الى مجلس كلية التربية بجامعة الموصل، ٢٠٠٦.

٨٢. دەربارەی محەمەد عەلیی خادم سەججادە، بڕوانە: عبد المجيد فهمي حسن، المصدر السابق، الجزء الثاني، لاپەڕە (٢٨٠).

٨٣. دەربارەی مەلا عەبدولمەجیدی قوتب، بڕوانە: عصمت رفيق صاري كهية، (العلامة عبدالمجيد القطب)، (المجلس) (جريدة)، العدد (صفر)، كركوك، آذار ٢٠٠٥.

٨٤. دەربارەی ئەسیری شاعیر، بڕوانە: (کەریم شارەزاو جەبار جەباری)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٥)، بە دواوە.

٨٥. بورهان عەبدولرەحمان جاف، (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی شاری کەرکوك)، (بانەرۆژ) (گۆڤار)، ژمارە (١٦)، ئازاری ٢٠٠٥، لاپەڕە (١٨).

٨٦. دنكور الياهو ودرويش محمود فهمي، المصدر السابق، لاپەڕە (١٥٧-١٦٠).

٨٧. بڕوانە:

- عبدالكريم محمد المدرس، (علماؤنا في خدمة العلم و الدين)، بغداد، ١٩٨٣، صفحات متعددة.
- مەلا جەمیلی رۆژبەیانی، (بۆ بەرێزان لە ناوەندی رۆشنبیریی کەرکوك)، (هاواری کەرکوك) (گۆڤار)، ژمارە (٥)، هەولێر، ئابی ٢٠٠١، لاپەڕە (٨ - ١٠).

٨٨. دیمانەیەك لەگەڵ شێخ محەمەد عەلی عوبێد خانەقا، بە مێژووی (٢٨ی مایسی ٢٠٠٥)، لە کەرکوك.

- دیمانەیەك لەگەڵ شێخ یوسف تاڵەبانی، بە مێژووی (٢٥ی مایسی ٢٠٠٥)، لە کەرکوك.
- دیمانەیەك لەگەڵ سوعاد خادم سەجادده، بە مێژووی (٢٨ی ئەیلوولی ٢٠٠٥)، لە کەرکوك.

(*) مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی ساڵی (١٩١٨) لە دەوروبەری هەولێر لەدایکبوە. بە مەبەستی خوێندن، بە زۆر شوێندا گەڕاوەو لە گەلێك شارو شارۆچکەش ماوەتەوە. خاوەنی

چەندان نووسین و کتێبە، بۆ ماوەیەکی زۆر ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی زانیاری بوو لە شاری هەولێر. بە مێژووی (٤)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٠) چووە بەر رەحمەتی خودا.

٨٩. دیمانەیەك لەگەڵ مەلا عەبدوڵلای فەرهادی، بە مێژووی (١٧ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥)، لە هەولێر.

- مصطفى صالح كريم، (الحياة الادبية والثقافية في كركوك)، لە کتێبی: (كركوك مدينة القوميات المتآخية)، لاپەرە (٦٠٤-٦٠٥).

٩٠. محمد عبدالله كاكەسوور و نیشتمان بشیر محمد، المصدر السابق، لاپەرە (٢٢٧، ٢٤٠).

٩١. عەزیزی مەلای رەش، (فەقێیاتی لە دەشتی هەولێر)، (رۆشنبیری نوێ) (گۆڤار)، ژمارە (١١٠)، بەغداد، ١٩٨٦، لاپەرە (١٤٠).

٩٢. (المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك)، لاپەرە (١٨٦-١٨٩).

٩٣. محەمەد ئەمین زەکی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧٩).

٩٤. بڕوانە:

- ابراهيم خليل احمد، (تطور التعليم الوطني)، لاپەرە (٢٧).

- میهرداد ئیزەدی، (ئایین و تایفە ئایینییەکان لە کوردستاندا)، وەرگێر: کامەران فەهمی، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٢، لاپەرە (٨٧).

٩٥. بڕوانە: (سالنامه ونظارت معارف عموميه ١٣١٧ - ١٨٩٩، سنه وهجريه سنه مخصوصدر)، اينكجي سنه، لاپەرە (١٤١٥).

٩٦. بڕوانە:

- عبد الرزاق الهلالي، (تأريخ التعليم في العراق)، لاپەرە (٢٥٣-٢٥٥).

- جميل موسى النجار، المصدر السابق، لاپەرە (٢٣٢).

(*) ناوی نێردەکە (دومینیکانی) لە ناوی موژدەدەرێکی ئیتاڵییەوە وەرگیراوە بە ناوی (دومنيكو كوديليو نتشيني). دەربارەی نێردەکە، بڕوانە: حيدر جاسم عبد عبيس رويعي، الاباء الدومينيكان في الموصل دراسة في نشاطاتهم الطبية والثقافية والاجتماعية (١٧٥٠-١٩٧٤)، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية التربية بجامعة الموصل، ٢٠٠١.

٩٧. جميل موسى النجار، المصدر السابق، لاپەرە (٢٨٠).

٩٨. ابراهيم خليل احمد العلاف، (التعليم في العراق ابان عهد الانتداب)، لاپەرە (٧٣٦).

٩٩. بڕوانە:

- جميل موسى النجار، المصدر السابق، لاپەرە (٢٩١).

- مهدي صالح سعيد العباسي، المصدر السابق، لاپەرە (١٣٨).

١٠٠. جميل موسى النجار، المصدر السابق، لاپەرە (٢٣٠).

١٠١. بڕوانە:

- المصدر نفسه، لاثةرة (٢٣٠).

- صادق حسن السوداني، (النشاط الصهيوني في العراق ١٩١٤ - ١٩٥٢)، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٠، لاپەرە (٢٧-٢٨).

١٠٢. الحكومة العراقية، وزارة المعارف، (التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٤٧ - ١٩٤٨)، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٠، لاپەرە (٧٦).

١٠٣. فاضل البراك، (المدارس اليهودية والايرانية في العراق، دراسة مقارنة)، مطبعة دار الرشيد، بغداد، ١٩٨٤، لاپەرە (١٧٨).

١٠٤. Iraq Administration Reports (١٩١٤-١٩٣٢)، Vol: (٨)، ١٩٢٥-١٩٢٧، P.١٥٧.

١٠٥. غانم سعيد العبيدي، (التعليم الاهلي في العراق بمرحلتيه الابتدائية والثانوية، تطوره و مشكلاته)، بغداد، ١٩٧٠، لاپەرە (٩٨).

١٠٦. عبد المجيد فهمى حسن، المصدر السابق، الجزو الپانى، لاپەرە (٧٨).

١٠٧. Iraq Administration Reports (١٩١٤-١٩٣٢)، Vol: (٩)، ١٩٢٨-١٩٣٠، P.٤٨٦.

١٠٨. عبد المجيد فهمي حسن، المصدر السابق، الجزء الثاني، لاپەرە (٧٨).

١٠٩. سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)، (مێژووی گۆڕانە رۆشنبیرییەکانی ناوچەی کەرکوک)، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوک، ٢٠٠٦، لاپەرە (١٥٩).

١١٠. بڕوانە:

- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٤)، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٥، لاپەرە (٦٤).

- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٧)، لاپەرە (٥٩).

١١١. فاضل محمد ملا مصطفى، (مجلس اللواء العام)، لاپەرە (٥٧).

١١٢. فاضل العزاوي، المصدر السابق، لاپەرە (٢٨٠).

١١٣. المصدر نفسه، لاپەرە (٢٨٥).

١١٤. ماهر النقيب، المصدر السابق، لاپەرە (٢٦٢).

١١٥. يوسف حنا يوسف، (مذكرات يوسف حنا يوسف - ابو حكمت)، مطبعة التعليم العالي، اربيل، دون سنة الطبع، لاپەرە (١٤).

١١٦. هەمك: واته (بنكه) (القاعده) پەخشەیەکی ئەرمەنی بوو، پارتی کۆمۆنیستی عێراقی- لقی ئەرمەنی دەری دەچوواند.

١١٧. الحكومة العراقية، الشرطة العامة، شعبة التحقيقات الجنائية ببغداد، (موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي السري)، الجزء الأول، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٤٩، لاپەرە (١٤٦).

١١٨. بڕوانە: جعفر عباس حميدي، (التطوارات السياسية في العراق ١٩٤١ - ١٩٥٣)، مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧٥، لاپەرە (٤٢٩).

١١٩. دیمانەیەك لەگەڵ یوسف حەننا یووسف، بە مێژووی (١٩)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٥) لە هەولێر.

- دیمانەیەك لەگەڵ نووری فەقێ، بە مێژووی (٥)ی نیسانی

ساڵی (٢٠٠٥)، لە کەرکوك، (نوری محەمەد عەبدوڵڵا) ساڵی (١٩٢٧) لە کەرکوك لە دایکبووە، ساڵی (١٩٤٦) تا ساڵی (١٩٥٠) کرێکاری کۆمپانیای نەوتی عێراقی بووە، ساڵی (١٩٤٩) چووەتە نێو ڕێکخستنەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی. خەڵکانی کەرکوك لەبەر بیرتیژی نێوی موختاری شاریان پێ بڕیبوو. ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کردووە.

١٢٠. دیمانەیەك لەگەڵ عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ (دکتۆر)، بە مێژووی (١)ی مارتی ساڵی (٢٠٠٥) لە سلێمانی. ناوبراو ساڵی (١٩٣٢) لە سلێمانی لە دایکبووە، لە پەنجاکاندا بۆ خوێندن چووەتە شاری کەرکوك‌و تیایدا ماوەتەوە.

– دیمانەیەك لەگەڵ بێستون عەلی کەریم عەزیز، بە مێژووی (٢٨ی شوباتی ٢٠٠٥)، سلێمانی. ناوبراو ساڵی( ١٩٥٦) بۆ خوێندن چووەتە کەرکوك‌و لەوێدا ماوەتەوە، ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی.

١٢١. بڕوانە:

– فاضل العزاوي، المصدر السابق، لاپەڕە (٢٨٠).

– سمكۆ بەهرۆز (ئەژی)، (مێژووی گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکان)، لاپەڕە (١٥٤–١٥٥).

– ماهر النقيب، المصدر السابق، لاپەڕە (٢٦٣).

١٢٢. فاضل العزاوي، المصدر السابق، لاپەڕە (٢٨٠، ٢٩٢).

(*) زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەکان، سەبارەت بە مێژووی هاتنی ئەم چاپخانەیە کەوتوونەتە هەڵەوە. هەڵەکەش ئەو کاتە دەستیپێکردووە، کە ساڵی زایینیی هاتنی چاپخانەکە (١٨٨١)ز بەرانبەر بە ساڵە کۆچییەکەی (١٢٩٦ك) دیاریکراوە. چونکە بەسەرهاتی هێنانی چاپخانەکە لەلایەن شاعیری ناسراوی کەرکوك (عەبدوڵڵا ساق) بە شیعر بە ساڵی (١٢٩٦ك) دەستنیشانکراوە کە بەرانبەر بە ساڵی (١٨٨١)ی زایینییە. بڕوانە:

– صلاح الدين ساقي ولي، (دليل المطبوعات الكركوكية)، تحقيق وتقديم: حسن كوثر رضا، مكتب عبدالوهاب آوضي للطباعة، كركوك، ٢٠٠٣، لاپەڕە (٢٠).

١٢٣. المصدر نفسه، لاپەڕە (١٩).

١٢٤. الباحثة زاهية النجفي، بغداد، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٧١–٧٢).

١٢٥. عطالله ترزي باشي، (تأريخ الصحافة في كركوك)، (الثقافة الحديثة) (مجلة)، العدد (١)، بغداد، مايس ١٩٥٤، لاپەڕە (٢٥).

١٢٦. هەڵۆ کاکەوەیس، (مێژووی چاپخانە لە کەرکوك‌و ڕۆڵی محەمەد ئەمین عەسری لە پێشکەوتنیدا)، بەڕێوەبەرایەتیی چاپ‌و بڵاوکردنەوە، سلێمانی، ٢٠١١، لاپەڕە (٢٤).

١٢٧. دەربارەیان بڕوانە:

– سمكۆ بەهرۆز (ئەژی)، (مێژووی گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکان)، لاپەڕە (٤٤–٤٥).

– وریا الجاف، المصدر السابق، لاپەڕە (٤١–٤٢).

– صلاح الدين ساقي ولي، المصدر السابق، صفحات متعدده.

١٢٨. بڕوانە:

– ڕەفیق ساڵح، (ڕۆژنامەوانیی کوردی لە کەرکوك)، (هەزارمێرد) (گۆڤار)، ژمارە (١٦)، سلێمانی، حوزەیرانی ٢٠٠١، لاپەڕە (٧–٩).

– صباح البازركان، (صحافة كركوك)، (كركوك) (مجلة)، العدد (٢٤)، كركوك، ربيع ٢٠٠٥، لاپەڕە (١٨٧–١٩٠).

١٢٩. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

– سمكۆ بەهرۆز (ئەژی)، (مێژووی گۆڕانە ڕۆشنبیرییەکان)، لاپەڕە (٤٧–٤٩).

– صلاح الدين ساقي ولي، المصدر السابق، صفحات متعدده.

*** مێژووی خوێندن‌و پەروەردە لە ساڵی (١٩١٤) تا ساڵی (١٩٨٠):**

هاتنی ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩١٤) بە داگیرکردنی بەسرەو کۆتایی دەسەڵات‌و داگیرکاریان بەسەر هەموو پارچەکانی عێراقدا تا ساڵی (١٩٢١)ی خایاند کە مەلیك (فەیسەڵی کوڕی حوسێن) وەك پاشای عێراق هەڵبژێردراو کەوتە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی بەریتانیاوە.

ئینگلیزەکان لەگەڵ هاتنیاندا بوونە هەڵگری کۆمەڵێك بنەمای کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیری‌و پەروەردەیی لە پاڵ کاری سەربازی‌و سیاسیدا، چونکە پێشکەوتنی ئیمبراتۆرییەتێکی وەکو بەریتانیا هەستا بە گواستنەوەی ئەو شارستانیانە بۆ ناوچەکانی بۆ ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی، یەکێك لەو بوارانەش بواری خوێندن‌و پەروەردە بووە، کە توانی ببێتە هەڵگری کۆمەڵێك ڕێساو یاسای خوێندن‌و هەموو بنەماکانی ماوەی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان هەڵتەکێنێت یان بەشێکی گەورەی بگۆڕێت کە لەگەڵ بنەماکانی پێشکەوتنی سەردەمدا بگونجێت.

ئینگلیزەکان ڕێگاو ڕێسایەکی تایبەتیان هەبووە لە بواری پەروەردەدا کە دەوری بینی لە گۆڕانکاری لە پرۆگرامەکانی خوێندن لە عێراقدا، ئەویش خۆی بینییەوە لەو چاکسازییەی کە بەسەر قوتابخانەو قوتابی‌و خوێندن‌و نووسیندا هات، تا کار گەیشتە ئەوەی بنەمایەکی پەروەردەیی تازە بابەت دابمەزرێت.

کاتێك (مێجەر بۆمەن) ماوەیەك بوو بە فەرمانڕەوای سیاسی لە عێراق کۆمەڵێك کەسی هەڵبژارد بۆ کاروباری عێراق کە یەکێك لەوانە (مستەر سمیس) بوو هەر بۆیە کردی بە راوێژکاری مەعارف، ماوەیەك لە عێراق مایەوەو ماوەیەکیش گەڕایەوە بە هیند، بەڵام لەو ماوەی کە لە عێراقدا بوو توانی لە بواری خوێندندا گەلێك پێشکەوتن بە دی بهێنێت ئەو بنەمایانەی پێشوو گۆڕانکاری بەسەردا بهێنێت، هەروەها هەر یەکە لە (کاپتن فارل)، (مستەر گلن)، (مستەر رایەلی)، (مستەر سمەر فیل) هەموو ئەمانە دەوریان بینی لە تۆمارکردنی کاروبارەکانی پەروەردەو خوێندن‌و لە بواری کارگێڕی‌و پەروەردەییدا گەلێك پێشکەوتنیان بە دەست هێنا.

لە ڕۆژی (٢)ی ئاداری ساڵی (١٩٢٢)دا (محەمەد عەلی هەبەتودین ئەلشەهرستانی) وەزیری مەعارف لە کۆبوونەوەی لەگەڵ کۆمەڵێك لە مامۆستایان بڕیاریاندا بە دامەزراندنی ئەنجومەنێك بۆ مەعارف‌و توانیان بە کۆمەڵێك بڕیارو یاسا یاداشتێك بەرز بکەنەوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران.

لە ساڵی (١٩٢١-١٩٢٢) ژمارەی قوتابخانەکانی کەرکوك بریتی بووە لە (١١) قوتابخانە کە ژمارەی قوتابییەکانی بریتی بووە (٨٧١) کەس، ئەم ڕێژەیەش ئەگەر بەراورد بکەین لەگەڵ عێراقدا دەبینین کەرکوك ڕێژەیەکی مامناوەند بووە لەنێوان ژمارەی قوتابخانەو ژمارەی قوتابی.

*** قوتابخانەکانی ناوەندی‌و دواناوەندی لە عێراق لەنێوان ساڵانی (١٩٣١ - ١٩٣٢)[٦]:**

| قوتابخانە | یەکەم | دووەم | سێیەم | سێیەم | | چوارەم | | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | زانستی | ئەدەبی | زانستی | ئەدەبی | |
| ئەلمەرکەزییە – بەغدا | – | – | – | ٥٢ | ٣٣ | ٨٩ | ٥٠ | ٢٣٣ |
| ئێواران – بەغدا | ٢٤ | ١١ | ١٣ | ٧ | – | ١٣ | – | ٦٨ |
| موسڵ | ٢٣٢ | ١٣٨ | ٧٢ | ١٩ | – | ٣٥ | ١٥ | ٥١١ |
| ناوەندی ئەلغەربیە | ١٧٣ | ١٣٣ | ٤٩ | – | – | – | – | ٣٥٥ |
| ناوەندی ئەلشەرقیە | ١٧٥ | ٨٤ | ٤٦ | – | – | – | – | ٣٠٥ |
| ناوەندی ئەلکەرخ | ١٥٦ | ٨٢ | ٤٤ | – | – | – | – | ٢٨٢ |
| ناوەندی بەسرە | ٩٩ | ٤٤ | ١٩ | ٨ | – | ١٤ | – | ١٨٤ |
| ناوەندی عیمارە | ٢٢ | ١٨ | – | – | – | – | – | ٤٠ |
| ناسریە | ٣٤ | ١٣ | ٨ | – | – | – | – | ٥٥ |
| کوت | ١٩ | ١٠ | – | – | – | – | – | ٢٩ |
| حیلە | ٥٢ | ٢١ | ٨ | – | – | – | – | ٨١ |
| کەربەلا | ١٣ | ٢٢ | – | – | – | – | – | ٣٥ |
| نەجەف | ٥١ | ٢٢ | ١٠ | – | – | – | – | ٨٣ |
| رومادی | ٣٥ | – | – | – | – | – | – | ٣٥ |
| بەعقوبە | ٣١ | – | – | – | – | – | – | ٣١ |
| هەولێر | ٢٩ | ١٧ | ١٠ | – | – | – | – | ٥٦ |
| کەرکوك | ٥٣ | ٣٠ | ١٢ | – | – | – | – | ٩٥ |
| سلێمانی | ٣١ | ٢٠ | – | – | – | – | – | ٥١ |
| دیوانیە | ١٢ | – | – | – | – | – | – | ١٢ |
| کۆی گشتی | ١٢٤١ | ٦٦٥ | ٢٩١ | ٨٦ | ٣٣ | ١٦٠ | ٦٥ | ٢٤٥١ |

**بەراوردی ڕێژەی قوتابخانەکانی کەرکوک لەسەر ئاستی عێراق (١٩٢١ - ١٩٢٢)[١]:**

| ز | پارێزگا | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی |
|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | ٦٣ | ٦٥٧٣ |
| ٢ | بەغدا | ١٨ | ١٩٢٥ |
| ٣ | بەسرە | ١٠ | ١٢٣٢ |
| ٤ | عمارە | ٩ | ٧٣٣ |
| ٥ | کەرکوک | ١١ | ٨٧١ |
| ٦ | دیالە | ٥ | ٦٧٥ |
| ٨ | مونتەفیک | ٥ | ٥٥٣ |
| ٩ | حیلە | ٥ | ٤٧٢ |
| ١٠ | دلێم | ٥ | - |
| ١١ | هەولێر | ٥ | ٥١٤ |
| ١٢ | کەربەلا | ٤ | ٣٤٨ |
| ١٣ | کوت | ٤ | ٤٣٠ |
| ١٤ | دیوانییە | ٤ | ٤٠١ |

*** ژمارەی قوتابخانەو قوتابییەکان لە ساڵانی (١٩٣١-١٩٣٢)[٢]:**

| ز | پارێزگا | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی |
|---|---|---|---|
| ١ | بەغدا | ٢٩ | ٥٦٦١ |
| ٢ | حیلە | ١٤ | ١٠٣٦ |
| ٣ | دلێم | ١١ | ١٢١٨ |
| ٤ | کەربەلا | ٧ | ٨٨٧ |
| ٥ | کوت | ١١ | ٧٩٧ |
| ٦ | دیالە | ٢١ | ١٧٨٦ |
| ٨ | کەرکوک | ٢٠ | ١٣٩٦ |
| ٩ | بەسرە | ٣٠ | ٣٠٤١ |
| ١٠ | عەمارە | ١٣ | ١٧٢٣ |
| ١١ | مونتەفیک | ١٧ | ١٥٢١ |
| ١٢ | دیوانییە | ١٧ | ١٤١٨ |
| ١٣ | هەولێر | ١٧ | ١٢٠٧ |
| ١٤ | سلێمانی | ١٤ | ٧٢٩ |
| ١٥ | موسڵ | ٦١ | ٦٣٦٧ |

بەڵام لە کاتی هاتنی مەلیك فەیسەڵ وەکو پاشای عێراق لە ساڵی (١٩٢١) قوتابخانەی کچان زیاتر نەبوو لە سێ قوتابخانەو ژمارەی قوتابییەکانی (٥٠٠) قوتابی بوو، بەڵام لەنێوان ساڵانی (١٩٢٥-١٩٢٦) ژمارەی قوتابخانەی کچان گەیشتە نزیکەی (٢٧) قوتابخانەو ژمارەی قوتابیانی کچ (٤٠٥١) قوتابی بوو.

**ژمارەی قوتابخانەی کچان لە کەرکوک لە چاو قوتابخانەکانی عێراق(٣):**

| ز | پارێزگا | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی | ژمارەی مامۆستا |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بەسرە | ٢ | ٣٦١ | ١٣ |
| ٢ | بەغدا | ٩ | ١٣٠٥ | ٥٩ |
| ٣ | دیالە | ١ | ١٣٧ | ٣ |
| ٤ | سلێمانی | ١ | ١١٩ | ٣ |
| ٥ | کەرکوک | ٢ | ١٢٠ | ٤ |
| ٦ | موسڵ | ١١ | ١٨١١ | ٦٣ |
| ٧ | عەمارە | ١ | ٢١٠ | ٧ |
| کۆی گشتی | | ٢٧ | ٤٠٥١ | ١٥٢ |

**بەڵام لە ساڵانی (١٩٣١-١٩٣٢) ژمارەی قوتابخانەی کچان (٤٩) قوتابخانە بووە، ژمارە قوتابییەکانی (٧٨٦٣) قوتابی بووە، بەم شێوەیە دابەش بووە[٤]:**

| ز | پارێزگا | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی قوتابی |
|---|---|---|---|
| ١ | بەغدا | ١٢ | ٢٦٣٧ |
| ٢ | حیلە | ١ | ١٣٦ |
| ٣ | دلێم | ١ | ٨٩ |
| ٤ | کەربەلا | ١ | ٥٦ |
| ٥ | کوت | ١ | ١٢٠ |
| ٦ | دیالە | ٢ | ٢٢٥ |
| ٨ | کەرکوک | ٤ | ٣٤٢ |
| ٩ | بەسرە | ٥ | ٧٤٧ |
| ١٠ | عەمارە | ٢ | ٥٢٩ |
| ١١ | مونتەفیك | ١ | ١٥٢ |
| ١٢ | دیوانییە | ٢ | ١٤٢ |
| ١٣ | هەولێر | ١ | ٩٣ |
| ١٤ | سلێمانی | ١ | ١٣١ |
| ١٥ | موسڵ | ١٥ | ٢٤٦٤ |

*** ژمارە قوتابیانی دواناوەندی قوتابخانەکانی کەرکوك لە چاو عێراقدا لەنێوان ساڵانی (١٩٢٦ - ١٩٢٧)[٥]:**

| ژ | قوتابخانە | قوتابیانی پۆلی یەکەم | قوتابیانی پۆلی دووەم | قوتابیانی پۆلی سێیەم | قوتابیانی پۆلی چوارەم |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دواناوەندی بەغدا | ١٦٩ | ٧٣ | ٥٥ | ٣٢ |
| ٢ | دواناوەندی بەغدای ئێواران | ٤٦ | ٢٢ | – | – |
| ٣ | دواناوەندی موسڵ | ٧٨ | ٢٨ | ١٤ | ٦ |
| ٤ | دواناوەندی بەسرە | ١٨ | ٤ | – | – |
| ٥ | دواناوەندی کەرکوك | ١٤ | ٩ | – | – |
| ٦ | دواناوەندی نەجەف | ١٥ | – | – | – |
| کۆی گشتی | | ٣٤٠ | ١٣٦ | ٦٩ | ٣٨ |

بەپێی مادەی سێ لە ڕێکەوتنامەی عێراق و بەریتانیا کە لە ساڵی (١٩٢٢)دا مۆر کراوە، لە یەکێك لە برگەکانیدا دەڵێت: "نابێت بە هیچ جۆرێك جیاوازی لەنێوان دانیشتوانی عێراقدا بکرێت بەهۆی نەتەوەو ئاین و زمان، پێویستە لەسەر هەموو پێکهاتەکانی عێراق کە ئەمە لە بیر نەکەن، یان خۆیانی لێنەدەن و پارێزگاری لە قوتابخانەکانیان بکەن بۆ فێرکردنی ئەندامەکانیان بە زمانە تایبەتییەکانیان"، کاتێك پەیڕەو و پرۆگرامی خوێندنی سەرەتایی داندرا ئەم چەند برگەیەشیان خستە سەر برگەکانی سەرەوە: "زمانی عەرەبی زمانی خوێندنە لە هەموو قوتابخانەکانی میری، بەڵام ئەو شوێنانەی کە زمانەکەیان زمانی عەرەبی نییە، بڕیار دەدرێت بە خوێندن لەو قوتابخانانە بە بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران"[٧].

بەڵام لە دواییدا ئەنجومەنی وەزیران بڕیاریدا کە زمانی کوردی زمانی فەرمی بێت لە گوندو شارە کوردییەکان، زمانی تورکیش زمانی فەرمی بێت لەو شوێنانەی کە زۆرینە قسەی پێ دەکەن، بەڵام خوێندن بە زمانی عەرەبی لە پۆلی پێنج و شەشی قوتابخانە سەرەتاییەکان دەبێت.

ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئاستەنگێکی گەورەیە لە بەرامبەر قوتابی بۆ بەشداری لە تاقیکردنەوەی بەکەلۆریا، کە هەموو بە زمانی عەرەبییەو ڕێژەی سەرکەوتن تێدا زۆر ئاستەنگە، بۆیە لە هەموو لایەکەوە سکاڵانامە بەرز کرایەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە[٨].

*** ڕاپۆرتی بەڕێوەبەری قوتابخانەی دواناوەندی لە کەرکوك دەربارەی کێشەی خوێندن بە زمانی عەرەبی و تورکی:**

دەتوانین بڵێین بەڕێوەبەری دواناوەندی کەرکوك یەکێك بووە لەوانەی کە بیری کردووەتەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، بۆیە لە بەرواری (١٠)ی ئابی ساڵی (١٩٢٧) ڕاپۆرتێکی ناردووە بۆ بەڕێوەبەری مەعارفی ناوچەی سەروو بەم شێوەیە:

"خوێندن لە قوتابخانەکانی کەرکوك ماوەیەکە بە زمانی تورکییە وەك ڕێزگرتنێك لە زمانی ناوخۆیی شوێنەکە، بەڵام قوتابیانەی دواناوەندی و قوتابیانی کۆتایی قوتابخانە سەرەتاییەکان، دوا دەکەون لەگەڵ هاوڕێکانیان و لە تاقیکردنەوە دەرناچن کە لە پایتەخت جێبەجێ دەکرێت بە تایبەتی بەکەلۆریا بۆ ئەوەی دەستکەوتی قوتابخانەی بەرزیان بەرکەوێت، هەر چەندە توانایەکی زۆر بەکار دەهێنن و چالاکییەکان زۆرن بەڵام بێ هوودە دەبن.

هۆکاری ئەم ئاستەنگەش کە لە ڕێگایانە دەگەڕێتەوە بۆ نەشارەزاییان لە زمانی عەرەبی، هەر چەندە جیاوازی نییە لەنێوان هەردوو پرۆگرامی عەرەبی و تورکی و توانای مامۆستاکان لە پاڵ ئەوەش نەبوونی کتێبی چاپکراو بە زمانی تورکی لە بوارەکانی زانست و هونەردا ئەمەش دەبێتە هۆکاری بێهێزی بەرامبەر قوتابی، هەر ئەمە وادەکات کە قوتابی لە پۆلی چواری سەرەتاییەوە قوتابخانە بەجێبهێڵێ"[٩].

*** ڕاپۆرتی حکومەتی بەریتانیا بۆ (کۆمەڵەی گەلان) دەربارەی قوتابخانە ناوەندییەکان لە ساڵی (١٩٢٩)[١٠]:**

| ژ | قوتابخانەی دواناوەندی | ساڵی ١٩٢٨ | ساڵی ١٩٢٩ | ژ. پۆلەکان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بەغدا | ٦٨١ | ٧٧٦ | چوار پۆل |
| ٢ | موسڵ | ٣١٧ | ٢٨١ | چوار پۆل |
| ٣ | کەرکوك | ٣٣ | ٧٠ | دوو پۆل |
| ٤ | بەسرە | ٩٢ | ٩٠ | دوو پۆل |
| ٥ | سلێمانی | ١٠ | – | یەك پۆل |
| ٦ | حلە | ٣٧ | ٣٥ | دوو پۆل |
| ٧ | نەجەف | ٥٣ | ٥٠ | دوو پۆل |
| ٨ | عمارە | ٣٤ | ٢٩ | دوو پۆل |
| ٩ | هەولێر | ١٩ | ١٧ | دوو پۆل |
| ١٠ | ناسرییە | ١٧ | ١٩ | دوو پۆل |

*** قوتابخانە پیشەسازییەکان:**

"لەنێوان ساڵانی (١٩٢٣ - ١٩٢٤) سێ قوتابخانەی پیشەسازی کرایەوە، یەکێکیان لە بەغداو دووەمیان لە بەسرەو سێیەمیان لە کەرکوك، ژمارەی قوتابییەکانی قوتابخانەی یەکەم (٩٦) قوتابی بوو، ژمارەی قوتابییەکانی

قوتابخانەی دووەم (١٣) قوتابی بوو، ژمارەی قوتابییەکانی قوتابخانەی سێیەم (٥٨) قوتابی بوو"[١١].

"هەموو قوتابییەکانی قوتابخانەی پیشەسازی کەرکوک هاوپەیوەست بوون بە گرێبەستێکەوە لەگەڵ حکومەتدا، بە شێوەیەی کە حکومەت دەرماڵەی تایبەتییان بداتێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، لە بەرامبەردا قوتابییان بەڵێنی ئەوە دەدەن کە خزمەتی حکومەت بکەن لە کاتێکی دیاریکراو و بە کرێیەکی دیاریکراو.
لە بەرامبەر ئەمەدا وەزارەتی ئابووری ڕەزامەند بوو بە پێدانی دەرماڵە بۆیان تا کاتی تەواو بوونی گرێبەستەکە، بۆیە (٥٧) قوتابی تا کۆتایی ساڵ بەردەوام بوون لە قوتابخانەی پیشەسازی کەرکوک"[١٢].

* دەستەی کارگێری بەشێك لە قوتابخانەکانی کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٢١ - ١٩٣٢):

١. قوتابخانەی ناوەندی (کرکوك)[١٣]:
- بەڕێوەبەر: زەکی ئەمین.
- مامۆستاکان:
- قاسم مستەفا.
- عەبدولفەتاح.
- ڕەزا محێدین.
- حیکمەت بەکر.

١. قوتابخانەی (زەفەر):
- "بەڕێوەبەر: شوکری ئەفەندی.
- مامۆستاکان:
- ڕەشید عاکف.
- محەمەد ساڵح.
- سەعدوڵلا سوبحی.
- محەمەد شەوکەت.
- محەمەد شەفیق.
- حیکمەت بەکر.
- تاهیر ئەمین.
- عەبدوڵلا ئەفەندی.
- مەلاحەمدی.

٢. قوتابخانەی (ئاوچی):
- بەڕێوەبەر: محەمەد ڕەفیق.
- مامۆستاکان:
- ئەحمەد ئەسعەد.
- ئەحمەد ڕەفعەت.
- مەلا عەزیز.

٣. قوتابخانەی (ئەلعیلمییە):
- بەڕێوەبەر: عەبدولقادر عوسمان.
- مامۆستاکان:
- محەمەد قاسم مستەفا.
ئەحمەد مەدحی عەبدوڵلا.
- محەمەد رامز.
- حەسەن فەهمی عەلی.
- عەبدول مەحمود.
- حیکمەت بەکر.
- عەبدولقادر سەلیم.
- سلێمان مستەفا.
- تاهیر ساڵح.
- ئەمین ئەحمەد.
- سەبری مەحمود.

٤. قوتابخانەی (قۆرییە):
- بەڕێوەبەر: سەید محەمەد هادی.
- مامۆستاکان:
- سەید حەسەن.
- مەلا خدر.

٥. قوتابخانەی (چەمچەماڵ):
- بەڕێوەبەر: سەید حەسەن.
- مامۆستا: مەلا محەمەد ئەفەندی.

٦. قوتابخانەی (ئاڵتون کۆپری):
- بەڕێوەبەر: محەمەد شوکری.

٧. قوتابخانەی (کفری):
- بەڕێوەبەر: (ئەحمەد حەمدی نادر).
- مامۆستاکان:
- حەسەن عەونی.
- خەلیل سەبری ئیبراهیم.
- عەبدولوەهاب دەروێش.
- عەبدوڵلا مستەفا.
- عەلی تۆفیق ڕەزا.
- ئیبراهیم عەزرا.

٨. قوتابخانەی (تووزخورماتوو):
- بەڕێوەبەر: محەمەد خورشید حاجی محەمەد.
- مامۆستاکان:
- محەمەد تۆفیق عەلی.
- محەمەد تەها محەمەد دەروێش.
- ئیسحاق سەیون.

٩. قوتابخانەی (تاووق):
- بەڕێوەبەر: ئەحمەد وەفیق.
- مامۆستا: سەید عەلی"[١٤].

* **پێکهاتە کارگێڕییەکانی وەزارەتی مەعارف[١٥]:**

لە (١٥)ی نیسانی ساڵی (١٩٢٩) یاسای ژمارە (٢٨)ی ساڵی (١٩٢٩) بڵاوکرایەوە لە سەردەمی وەزیری مەعارف (تۆفیق سویدی): بەپێی ئەم یاسایە بوو بەهۆی هەڵوەشانەوە مەعاریف گشتی عوسمانی، کە وەختی خۆی یاسای مەعاریفیان لە ساڵی (١٨٦٩)و (١٩١٢) دەرکردووە، لە هەمان کاتدا هەڵوەشانەوەی ئەو یاسایانەی کە لە سەردەمی حاکمی پاشایەتی گشتی لە عێراق دەرچووە.

بەپێی ئەم یاسایە ناوچەکانی عێراقی کردووەتە سێ ناوچەی مەعارفەوە:

١. ناوچەی مەعاریف بەغدا، بریتی لە (بەغدا، دیالە، کوت، حیلە، دلێم، کەربەلا، دیوانییە).

٢. ناوچەی مەعاریف سەرووی عێراق کە بنکەکەی لە موسڵ بوو بریتی بوو لە: (موسڵ، هەولێر، کەرکوک، سلێمانی).

٣. ناوچەی مەعاریف خواروو کە بنکەکەی لە بەسرە بوو، بریتی بوو لە (بەسرە، عیمارە، مونتەفیك).

بەڕێوەبەری ئەم معارفانە تا ساڵی (١٩٢٢) سەر بە ئینگلیزەکان بوو، بەڵام لە دوای ئەو ساڵەوە گۆڕان بە بەڕێوەبەری عێراقی، هەروەها تا ساڵی (١٩٣٣) هیچ بەڕێوەبەرێکی تایبەت بە لیواکان (پارێزگا) دانەنرا بەڵکو هەمووی لەلایەن بەڕێوەبەری ناوچەکانەوە بەڕێوەدەبرا.

لەنێوان ساڵانی (١٩٣٠-١٩٣١) پێکهاتە کارگێڕییەکانی مەعارف پێکهاتبوو لە سێ ناوچە وەکو (بەغدا، موسڵ، بەسرە)، بەڵام لە دواییدا بەشی چوارەمی بۆ زیاد کرا ئەویش ناوچە کوردییەکان بوو.

بەشی بەغدا بریتی بوو لە: (بەغدا، حیلە، کەربەلا، کوت، دلێم، دیالە، کەرکوك).

بەشی بەسرە بریتی بوو لە: (بەسرە، عیمارە، مونتەفیك، دیوانییە).

بەشی موسڵ بریتی بوو لە: (لە موسڵ بە تایبەتی).

بەشی کوردی بریتی بوو لە: (سلێمانی، هەولێر) لەگەڵ هەندێك شاری کوردی پارێزگای کەرکوك.

هەر یەکە لەم ناوچانە بەڕێوەبەری مەعارف بەڕێوەی دەبات تەنها ناوچەی کوردی نەبێت کە پشکێنەرێك بەڕێوەی دەبات کە هەندێك دەسەڵاتی کارگێڕی هەبوو.

"بەڵام لە ساڵی (١٩٣٠)یەوە بڕیاردرا کە قوتابخانە (مەکتەب)کانی لیواو ناوچە کوردییەکان، لەلایەن دائیرەیەکی (مەعاریف) ی تایبەت بە ناوی (مەعاریفی کوردستان) ەوە سەرپەشتی بکرێن. مەڵبەندی ئەو دائیرەیە لە کەرکوك دانرا. سەرەتا مامۆستا نوری بەرزنجی (بەڕێوەبەری مدرسە (الفضل)ی بەغدا) کرا بە مدیر عامی ئەو مەعاریفە. شایانی باسە کە مامۆستا ڕەفیق حلمیش ماوەیەك بەڕێوەبەری گشتی ئەو (مدیرییەت)ە بووە. هەر لە چوارچێوەی ئەم بڕیارەدا، کۆمەڵێ کتێبی قوتابخانەکان (لە بابەتەکانی دین و علوم و جوگرافیا و هەندەسە) تەرجەمەی کوردی کران. قوتابخانەیەکی دواناوەندی لە شاری کەرکوك بۆ هەموو لیوا کوردییەکان کرایەوە، لەگەڵ چەندین قوتابخانەی کچان لە شارە گەورەکاندا. ئینگلیزەکان و کەسانێکی وەکو ستیڤن همسلی تا لەعێراقیش دەرکران هەر پێیان گوناح دەهات کە ئەم بەڕێوەبەرایەتییە بە هی کوردستان بزانن بۆیە ناویان نابوو:
Kurdish General Inspector of Education for North –eastern Iraq".

* **قوتابخانەی ئەهلی و بیانی لە کەرکوك:**

ئەوەی روون و ئاشکرایە هەر لە سەرەتای خوێندن لە عێراقدا قوتابخانەکان لە سەرەتادا لە چوارچێوەی ئەرك و ماندوبوون و توانای تاکە کەسییەکان بووە، وردە وردە لایەنەکانی پەروەردەو خوێندن گۆڕانکارییان داوەو قۆناغ لە دوای قۆناغ پێشکەوتنی بە خۆیەوە دیوە، ئەویش لە چوارچێوەی ئەوەی قوتابخانەو خوێندن هەنگاو لە دوای هەنگاوی ناوە بەرەو ئەوەی کە گۆڕان یان پێشکەوتن بە جێبهێنێت بۆ زیاتر بایەخدان بە بوارەکانی خوێندن و پەروەردە.

ئەوەی کە لە سەرچاوەکان ئاماژەی پێ کراوە قوتابخانەی ئەهلی بەو شێوەیە دێت کە لە رووی زمان و زاراوەوە هەڵگری ئەو جۆرە خوێندنەیە کە ئەستۆی خوێندن و پەروەردەکەی دەکەوێتە سەر تاکە کەس یان لایەن یان کۆمەڵێك کەسی ئایینی یان نەتەوەیی یان لایەنێکی دیاریکراو لە دەوڵەتێك کە بەرژەوەندییەکانی تاکەکانی نەتەوەیی و ئایینی خۆی بپارێزێت.

دەوڵەتی عوسمانی وەکو ئیمبراتۆرییەتێکی گەورە خاوەنی کۆمەڵێك بنەماو هەنگاو بوو لە سەرهەڵدانی قوتابخانە ئەهلی و بیانییەکان، ئەمیش خۆی دەبینییەوە لە:

١. خۆرزگارکردنی دەوڵەت لەو ئەرکە گەورەیەی کە لە بواری خوێندن و پەروەردە لە ئەستۆی بوو.

٢. خۆرازیکردنی گەلێك لایەنی نەتەوەیی و ئایینی خۆی لە خۆیدا هەنگاوێك بوو بۆ جێبەجێ کردنی بنەما سیاسییەکانی دەوڵەتەکە لەگەڵ دەوڵەتەکانی چواردەوری.

٣. خوێندنی ئەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی زیاتر خوێندنێکی ئایینی بوو کە ئەویش خۆی دەبینییەوە لە مزگەوت و قوتابخانە ئایینییەکان.

٤. زیاتر بنەماکانی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر ڕێچکەی مەزهەبێکی دیاریکراوی ئایینی خۆی دەبینییەوە، ئەمەش هەنگاوێك بوو بۆ ئەوەی بتوانێت بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لە مزگەوت و قوتابخانە ئایینییەکاندا خۆی بەرجەستە بکات.

ئەوەی لێرەدا گرنگە بیڵێین بنەمای خوێندنی ئەهلی لە دەوڵەتی عوسمانیدا لە دوو شوێن خۆی دەبینییەوە ئەویش:

١. **حوجرەی خوێندن:**

حوجرەی خوێندن ئەو سووچە گرنگەی خوێندن بووە کە زیاتر لە سووچێکی مزگەوتەکان یان لە بەشێ لە ماڵە تایبەتەکان بەکار دەهێنرا، ئەویش زیاتر ئەو منداڵانە پەروەردە دەکرا کە لەنێوان تەمەنی سێ ساڵ و چوار ساڵ و پێنج ساڵدا فێری بنەماکانی ئایینی ئیسلام دەکرا لە فێرکردنی برگەکانی

## قوتابخانە ئەهلی و بیانییەکان

| ز | ساڵەکان | ژمارەی قوتابخانە | ژمارەی مامۆستا | ژمارەی قوتابی | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٩٣٣-١٩٣٤ | ١ | - | ١٢٠ | هەر یەکە لە کەرکوک و هەولێر |
| ٢ | ١٩٣٤-١٩٣٥ | ٢ | ٨ | ٢٤٣ | |
| ٣ | ١٩٣٥-١٩٣٦ | ٢ | ٨ | ٢٠٥ | |
| ٤ | ١٩٣٦-١٩٣٧ | ٤ | ١٥ | ٤٨٨ | |
| ٥ | ١٩٣٧-١٩٣٨ | ٤ | ١٧ | ٥٢٠ | |
| ٦ | ١٩٣٨-١٩٣٩ | ٤ | ١٥ | ٥٥٤ | |
| ٧ | ١٩٤٣-١٩٤٤ | ١ | ٤ | ٢٠٩ | |
| ٨ | ١٩٤٤-١٩٤٥ | ٢ | ٩ | ٣٣٧ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ١ | ٤ | ٥١ | قوتابخانەی ناوەندی |
| ٩ | ١٩٤٦-١٩٤٧ | ٢ | ١١ | ٤٠٠ | قوتابخانەی سەرەتایی تێکەڵاو |
| | | ١ | - | ١٠٢ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ١ | ٣ | ٩ | قوتابخانەی ناوەندی |
| | | ١ | ١٢ | ٢٠٤ | قوتابخانەی ئامادەیی |
| ١٠ | ١٩٤٧-١٩٤٨ | ١ | - | ٦٣٦ | قوتابخانەی سەرەتایی تێکەڵاو |
| | | ١ | - | ١٢٩ | قوتابخانەی ناوەندی |
| | | ١ | ١٤ | ٦٨ | قوتابخانەی ئامادەیی |
| ١١ | ١٩٤٨-١٩٤٩ | ٣ | ٢٠ | ٦٩٩ | قوتابخانەی سەرەتایی تێکەڵاو |
| | | ١ | - | ١٩٤ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| | | ١ | ١٣ | ٨٠ | قوتابخانەی ئامادەیی |
| ١٢ | ١٩٤٩-١٩٥٠ | ٧ | ٥٦ | ١٢٣١ | قوتابخانەی سەرەتایی و تێکەڵاو |
| | | ١ | - | ٦٩ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| | | ١ | - | ٨٠ | قوتابخانەی ئامادەیی |
| ١٣ | ١٩٥٠-١٩٥١ | ٨ | ٧٣ | ١١٩٨ | قوتابخانەی سەرەتایی و تێکەڵاو |
| | | ١ | - | ٧٦٨ | قوتابخانەی ناوەندی |
| | | ٢ | ١٤ | ٧٠ | قوتابخانەی ئامادەیی کوڕان و کچان |
| ١٤ | ١٩٥١-١٩٥٢ | ٩ | ٦١ | ١٢٦٤ | قوتابخانەی سەرەتایی و تێکەڵاو |
| | | ١ | ١٥ | ١٨٩ | قوتابخانەی ناوەندی |
| | | ١ | ١٥ | ٢٦٣ | قوتابخانەی دواناوەندی |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٥ | ١٩٥٢-١٩٥٣ | ٤ | ٢٠ | ٤٨٦ | قوتابخانەی تێکەڵاو و باخچەی منداڵان |
| | | ٦ | ٦١ | ٩٨٢ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ٢ | ٣٩ | ٦١٣ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| ١٦ | ١٩٥٣-١٩٥٤ | ٧ | ٣٤ | ٨٩٣ | قوتابخانەی تێکەڵاو و باخچەی منداڵان |
| | | ٣ | ٤٠ | ٦١١ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ٢ | ٢٩ | ٥٩٩ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| ١٧ | ١٩٥٤-١٩٥٥ | ٨ | ٣٥ | ١٠٩٤ | قوتابخانەی تێکەڵاو و باخچەی منداڵان |
| | | ٢ | ٣٤ | ٦٢٦ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| ١٨ | ١٩٥٩-١٩٦٠ | ٦ | – | ٢٥٤٦ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ٣ | – | ١٣٦٤ | قوتابخانەی ناوەندیو دواناوەندی |
| ١٩ | ١٩٦٣-١٩٦٤ | ٥ | ٧ | ٢٩٧ | باخچەی منداڵان |
| | | ٥ | ٣٦ | ٧١٧ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ٢ | – | ١١٦٢ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| ٢٠ | ١٩٦٥-١٩٦٦ | ٥ | ٢ | ٢٧٢ | باخچەی منداڵان |
| | | ٦ | ٤٠ | ٨٦٤ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ٣ | ٤ | ١٥٢٢ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| ٢١ | ١٩٦٧-١٩٦٨ | ٥ | ٣ | ٢٣٩ | باخچەی منداڵان |
| | | ٥ | ٣٩ | ٨٥٨ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ٦ | – | ١٥٢٣ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| ٢٢ | ١٩٦٨-١٩٦٩ | ٤ | – | ١٦٣ | باخچەی منداڵان |
| | | ٥ | ٤٢ | ٨٠٦ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ٦ | ٧ | ١١٣٦ | قوتابخانەی دواناوەندی |
| ٢٣ | ١٩٧٠-١٩٧١ | ٥ | ٧ | ٢٢١ | باخچەی منداڵان |
| | | ٥ | ٣٩ | ٧١٤ | قوتابخانەی سەرەتایی |
| | | ٣ | ٢ | ١١٩٧ | قوتابخانەی ناوەندی |
| | | ٣ | | | قوتابخانەی دواناوەندی |

قورئانی پیرۆزدا، لە هەمان کاتدا فێرکردنی بنەماکانی ئایین و ڕێگەو شوێنەکانی جێبەجێکردنی.

ئەم حوجرەی خوێندنانە بریتی بووە لە شوێنێکی بچووك و بەرتەسك و هەندێك جار لە ژێرزەمیندا بووە کە نە خۆری بینیوە شوێنەکە لە ڕووی تەندروستییەوە شیاو نەبووە، لە هەمان کاتدا کۆمەڵێکی کەم قوتابی گرتووە کە بەپێی بچووکی شوێنەکە جێگەی بووەتەوە، زۆرتریش ئەم حوجرەی خوێندنانە لەلایەن مەلایەکی ئایینییەوە بەڕێوە براوە، لە ڕووی کارگێڕییەوە زۆر سادەو ساکار بووە:

أ. خوێندن لەم جۆرە شوێنانەدا بەیانی و ئێوارە بووەو تەنها لە ڕۆژی هەینیدا نەبێت.

ب. هەر یەکێك لەگەڵ خۆیدا پێویست بووە حەسیر یان دۆشەکێك بێنێت بۆ دانیشتنی خۆی.

ج. هێنانی کتێبی (جز عمە) لەگەڵ قەڵەم و پێویستی نووسین.

د. هەموو ڕۆژێکی پێنجشەمە لە کۆتایی دەوامدا پێویست بووە لەسەری پارەیەکی دیاریکراو بۆ مامۆستا بێنێت.

هـ. لەسەر قوتابی پێویست بووە گوێڕایەڵی مامۆستا بێت و لە قسەکانی دەرنەچێت، هەر کەسێکیش سەرپێچی بکردایە ئەوە دارکاری دەکرا لەلایەن مەلاوە.

بەڵام دەربارەی قوتابی کچ ئەو جۆرە حوجرانە بۆ خوێندن زۆر کەم بووە یان لە هەندێك باردا نەبووە، بەڵام لە هەندێ لادێیەکاندا قوتابی کوڕو کچ تێکەڵ بووە.

ئەگەر سەیری شارێکی وەکو کەرکوك بکەین لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا بوونی ئەم جۆرە حوجرانە بۆ خوێندن و پەروەردە زۆر بووەو هەر یەکە بەپێی پێویستی خۆی بە تایبەتی لە مزگەوتەکان جێگەو ڕێگەی خۆی هەبووە، لە هەمان کاتدا گەلێك مەلای پیاو و ئافرەتی هەبووە کە منداڵانیان فێری (جز عمە) کردووە.

**٢. قوتابخانەی زانستییە ئایینی و ئەهلییەکان:**

جیاوازی ئەم قوتابخانانە لەوەدا بووە لە دەوڵەتی عوسمانی کە لە چوارچێوەرەکی ڕۆشنبیریدا دامەزراوە، جیاوازی هەبووە لەگەڵ خوێندنی مزگەوتەکان چونکە لە مزگەوتەکاندا زیاتر لە چوارچێوەیەکی ئایینیدا خۆی دەبینییەوە.

هەروەها ئەم جۆرە قوتابخانانە جۆرە گۆڕانکارییەکی تێدا بووە لە ڕووی خوێندن و ڕۆشنبیری و کتێبخانەو ژمارەی قوتابی و مامۆستا، بەشێك لەم قوتابخانانە بە باربووی خەڵکی دەستڕۆیشتوو بەڕێوە چووە یان پارەی بۆ کۆکراوەتەوە.

ئەم جۆرە قوتابخانانە لە شارێکی وەکو کەرکوکدا هەبووەو بەردەوام بووە هەر لە داگیرکردنی عوسمانییەکانەوە هەتا هاتنی ئینگلیزەکان لە ساڵی (١٩١٨)دا، بەشێك لەم قوتابخانانە شێوەیەك لە شێوەکان تا سەردەمانێکی تریش بەردەوام بووە.

**٣. قوتابخانەی پێکهاتەی مەسیحییەکان:**

ئەم جۆرە قوتابخانانە لەگەڵێك لە شارەکانی عێراقدا بوونیان هەبوو. بەتایبەتی لە شارێکی وەکو کەرکوك کە پێکهاتەی ئەرمەنی و کلدان و ئاشووری تێدا بوو بۆیە بوونی ئەم جۆرە قوتابخانانە برەوی هەبوو، بوونی قوتابخانەکانی تر خوێندن بە زمانی تورکی بوو کە تۆزێك نامۆو ناخۆش بوو. بەڵام ئەم جۆرە قوتابخانانە خوێندن بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی بووە کە گەلێك لە موسڵمانەکان سوودیان لێ بینیوە.

**٤. قوتابخانەی پێکهاتەی جوولەکەکان:**

جوولەکەکان هەر لە سەدەی نۆزدەهەمەوە چالاکییەکی بەرچاوەیان هەبووە بۆ کردنەوەی ئەم جۆرە قوتابخانانە، لە بەرچاوکردنی ئەوە کەرکوك لەبەر ئەوەی ڕێژەیەکی زۆر جوولەکەی تێدا بوو کە خۆی دەدا لە نزیکەی (٤٠٠٠) کەس بۆیە بایەخدان بە کردنەوەی ئەم جۆرە قوتابخانانە گرنگی خۆی هەبووە.

تایبەتمەندی ئەم جۆرە قوتابخانانە لەوەدا بووە کە لە پاڵ خوێندندا ڕێنماییە ئایینییەکانیان فێرکراوەو بە شێوەیەکی ئەوەتۆ گۆش کراوەن کە لەگەڵ بەرژەوەندی ئایینی و نەتەوەیی خۆیاندا بگونجێت.

**٥. قوتابخانە بیانییەکان:**

سەرەتاکانی ئەم جۆرە قوتابخانانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەهەم، هەندێکیشی بۆ سەدەی نۆزدەهەم دەگەڕێتەوە، لە کاتی هاتنی ڕێژەیەکی بەرچاو لە خێزانە بیانییەکان بۆ ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە بایەخدان بە کردنەوەی ئەم قوتابخانانە بەرژەوەندی ئایینی و نەتەوەیی و ڕۆشنبیری خۆی هەبووە.

لە ڕووی ئایینییەوە ئەم جۆرە قوتابخانانە هەڵگری مۆژدەبەخشی ئایینی مەسیحی و جوولەکە بوونەو گەلێك شێوەی جۆر بەجۆر لەم قوتابخانانە کراوەتەوە وەکو:

أ. (رسالة الاباء الكرمليين).
ب. (رسالة الاباء الكبوشيين).
ج. (رسالة الاباء الدومنيكان).
د. (مدرسة الاباء الدومنيكان).
هـ. (معهد مار يوحنا).
و. (مدرسة الراهبات).
ز. (الرسالة الاصلاحية البروتستانتية).
ح. ( مدرسة الارسالية البروتستانتية).
ت. (جمعية الاتحاد الاسرائيلي الفرنسي).
ی. (مدرسة الاخوة الارامية).

ئەمەو کۆمەڵێکی زۆری جۆراوجۆر.

*** قوتابخانە ئەهلییەکان:**

١. ناوەندی ئەهلی ئێوارانی کوڕان ١٩٤١.
٢. باخچەی منداڵانی (النهاريه) ١٩٤٩.
٣. قوتابخانەی سەرەتایی ئەهلی ئێوارانی کوڕان ١٩٤٩.

٤. قوتابخانەی (مار یوسف)ی سەرەتایی ئەهلی ١٩٤٩.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لە ماوەی ساڵانی (١٩٢٦ - ١٩٢٨) لەوەودوای ئەو مێژوویەش گەلێك لە نائیبەكانی كەركوك و كوردستان یاداشتنامەیان بۆ بەغدا بەرزكردبووەوە، یان راپۆرتەكانیان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو كە داوای چاكسازییان كردبوو لە بواری پەروەردە لە قوتابخانەكانی كوردستان، بەشێكی ئەو راپۆرتانەش لە كاتی خۆیدا نموونەی لە رۆژنامەكانی كوردستاندا بڵاوكرابووەوە:

"كار بە دەستانی عێراق بە بیانووی نا ئارامی و نەبوونی ئاسایشەوە، كوردستانیان لە هەموو روویەكەوە پشتگوێ خستبوو، یەكێك لە مەسەلانەی كە نائیبەكانی كورد گرنگییەكی زۆریان پێ داوە مەسەلەی پەرەپێدانی خوێندن و كردنی بە كوردی بووە.

لەم رووەوە (ئەمین زەكی بەگ) دوو راپۆرتی گرنگی ئامادەكردووە كە پشت ئەستوور بوون بە ژمارە و بیانووی بەجێ:

یەكەمیان:

(لە لیوای موسڵ، هەولێر، كەركوك و سلێمانی، لە حاڵی حازردا (سی و هەشت) مەكتەبی كوردی تێدا مەوجود بووە، لە مەكاتیبی ئیبتیدایی و سانەوی كوردەكانا، لەسەر مینهاجی رەسمی مەعاریف بۆ (٥٨) مەوزوع كە مەجبوورن تەدریسی بكەن تەنها بۆ دەرسێكیان كتێبی كوردی هەیە بۆ مەوزوعەكانی تر چونكە كتێب نییە تەلەبەكان مەجبوورن نۆت بگرن لەسەر ئەو نۆتانە مەحكومی سەعی كردنن، لاكین لە سینفە ئەولیەكانا چونكە تەلەبەكان بە تەواوی ناتوانن بنووسن مومكینیان نابێ، نۆتێكی سەحیح بگرن)"[١٦].

"دووەم:

(ئەگەر تەماشای واریداتی لیواكان بكەین و موقایەسەی بكەین لەگەڵ مەساریفێكا كە بۆ مەعاریفیان تەخسیس كراوە لە ساڵی (١٩٢٦ - ١٩٢٧)دا دەبینین ئەو مەبلەغەی كە بە غەیری مەكتەبە عومومییەكان، بۆ لیوای بەغدا سەرف كراوە عیبارەتە لە (٣٨٪)ی بە نەزەری واریداتەكەیەوە.

لە موسڵدا (١٩٪)، لە كەربەلادا هەتا (١٢,٥٪)ن لە دلێم هەتا (١٠٪)، لە كەركوكدا (٩٪)، لە دیالە و بەسرەدا (٨٪) لە مونتەفیك (٧٪)، لە كوت (٥,٤٪)، لە حیللە و عەمارەدا (٥,٣٪)، لە ئەربیلدا (٣,٢٪)، لە دیوانییەدا (٢,٥٪)، لە سلێمانی (١٪)"[١٧].

"لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٨)دا نائیبەكانی هەولێر (مەعروف جیاوك، ئیسماعیل رەواندوزی، جەمال بابان، عەبدوڵڵا موفتی)، نائیبەكانی كەركوك (محەمەد ساڵح، سەبری، سەیفوڵڵا خەندان).

بە كۆمەڵ یاداشتێكیان دا بە وەزارەتی مەعاریفی عێراق، لەم یاداشتەدا داوای چاككردن و گەشەپێدانی خوێندن و پەروەردەیان كردبوو لە (جەبهە شیمال)داو كۆمەڵێك پێشنیاری گرنگیان خستووەتە بەردەم كار بەدەستانی ئەو دەمی عێراق لەوانە:

١. دامەزراندنی دەزگایەكی تایبەتی بۆ سەرپەرشتی كاروباری خوێندن لەگەڵ لیوا كوردنشینەكاندا كە لە ناوەندەكەی لە یەكێ لەو شارانەدا بێ.

٢. پێكهێنانی لیژنەیەك بۆ دانانی كتێب و وەرگێرانی كتێبی قوتابخانەكان بۆ كوردی.

٣. كردنەوەی فێرگەیەك بۆ پێگەیاندنی مامۆستایان.

٤. كردنەوەی قوتابخانە بۆ كچان.

٥. كردنەوەی قوتابخانەی سەرەتایی لەو شوێنانەی پێویستن.

٦. كردنەوەی قوتابخانەی سانەوی"[١٨].

"لە كاتی وتووێژی نێوان بەریتانیا و عێراقدا سەبارەت بە پەیمانەكە (پەیماننامەی نێوان عێراق بەریتانیا)، لە نیسانی ساڵی (١٩٣١)دا هەر یەك لە پەرلەمانتاران (محەمەد جاف) نوێنەری كەركوك و (مەعروف جیاووك) نوێنەری هەولێر لە بەغدا یاداشتێكیان دایە های كۆمیشنەری بەریتانیا كە بەم رستەیە دەستی پێ كردبوو: (ئێمە نوێنەرانی گەلی كورد بە پێویستی دەزانین ئەو داوایانە بخەینە بەرچاوی هێژاتان كە لە دڵی هەموو كوردێكدایە..)، هەروەها یاداشتەكە ئاماژەی بۆ ئەوە كرد كە (مافەكانی كورد ئێجگار لاوازن)، واتە كورد لە عێراقدا مافێكی ئێجگار كەمی هەیە و كورد بە پشت بەستن بە (بەڵێنەكانی دەوڵەتی بەریتانیا) چوونە سەر (شانشینە تازەكەی عێراق) ئەویش ناسنامەیەكی دوولایەنەیانەوە واتە (ناسنامەیەكی عێراقییانە و ناسنامەیەكی نەتەوەیی كوردانە) و بەهۆی ئەمەوە كۆمەڵەی گەلان چەند مەرجێكی خستە بەردەم حكومەتی عێراقەوە كە دەبێ جێبەجێیان بكات و بریتین لەمانە:

١. دەبێ زمانی خوێندن زمانی كوردی بێ.

٢. دەبێ ئیدارەیەكی فراوان بۆ كورد لە ناوچەكانیاندا بسەلمێنرێ.

٣. كوردستان تا (١٥) ساڵ لە ژێر سەرپەرشتی حكومەتی بەریتانیادا دەبێ.

٤. ئەگەر هەر گۆڕانێك لە ئیدارەدا لە عێراق روویدا ئەوا ئۆتۆنۆمی دەدرێ بە كورد.

جگە لەوە یاداشتەكە باسی ئەوەشی كرد كە ئەم مەرجانە تەنها لە بواری بەڕێوەبردن و خوێندندا جێبەجێ كراون ئەویش بە شێوەیەكی ناتەواو، جگە لە فەرامۆش كردنی مەسەلەی بەكارهێنانی زمانی كوردی لە خوێندندا لەلایەن وەزارەتی مەعاریفەوە (واتە لەلایەن وەزارەتی پەروەردە و خوێندنەوە) و پشت گوێ خستنی پێكهێنانی ئیدارەیەكی مەعاریف بۆ كوردستانی عێراق. یاداشتەكە لە كۆتاییدا داوای لە های كۆمیشنەر كرد (چەسپاندنی مافەكانی كورد لە پەیمانە تازەكەدا)، لە بەرچاو بگرێ"[١٩].

"جگە لەمانە چەند پەرلەمانتارێكی تریش كە بریتی بوون لە (حازم شەمدین) نوێنەری موسڵ، جمال بابان (نوێنەری هەولێر)، محەمەد ساڵح (نوێنەری سلێمانی)، ئیسماعیل رواندزی (نوێنەری هەولێر)، سەیفوڵڵا خەندان (نوێنەری سلێمانی)، محەمەد جاف (نوێنەری كەركوك) یاداشتێكی تێرو تەسەلترو رۆشنتریان دایە سەرەك وەزیران كە ئامانجە

داواکراوەکانی بریتی بوو لە چەشنێکی سادەو ساکاری ئۆتۆنۆمی و لەم ڕووەوە سەرەك وەزیرانیش یاداشتەکەی بۆ های کۆمیشنەری بەریتانیا بەرز کردەوە.

داواکانی یاداشتەکە بریتی بوون لەمانە:

١. پێکهێنانی پارێزگایەك کە ناوەندەکەی دهۆك دەبێ و لە قەزاکانی ئاکری و زێبارو ئامێدی و زاخۆ پێکبێ و زمانی کوردی تێیدا زمانی ڕەسمی بێ.

٢. پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتییەکی مەعاریف (پەروەردەو خوێندن) بۆ پارێزگا کوردنیشنەکان بە ڕەچاوکردنی بایەخدان بە وەرگێڕان و دانانی کتێبی پێویست.

٣. یەکپارچەکردنی ئیدارەی هەر چوار پارێزگا کوردنیشنەکەی سلێمانی و کەرکوك و هەولێرو دهۆك و پێکهێنانی موفەتشیەیەکی گشتی کە کوردێکی کاراو بە توانا بکرێ بە سەرۆکی تاکو چاودێریی ئەو پارێزگایانە بکاو ببێ بە مەرجەعێك بۆ پارێزگارەکان و دەسەڵاتێکی تەواویشی هەبێ و ڕێکخەری پەیوەندی بێ لەگەڵ ناوەنداو نوێنەرایەتیی هەموو وەزارەتەکان لەو پارێزگایانەدا بکات و دەستەیەکی ڕاوێژکاریشی هەبێ بۆ یارمەتیدانی لە بواری بەڕێوەبردن و دارایی و ئابووری و دادو.. هتد، جگە لەمە، یاداشتەکە باسی هەندێ مەسەلەی تریشی کردبوو وەك تاپۆ، بودجەی دارایی و داهاتی گومرگ"[٢٠].

"بەڵام لەو هەموو داوایە تەنها بەشێکی کەمی لە بەرچاو گیراو پاش پەسەندکردن و بڵاوکردنەوەی پەیمانەکە کورد هیچ گرەنتییەکی بۆ پاراستنی مافەکانی تێدا نەبینی و لە ئاکامدا بێزارییەکی گشتی هەموو ڕیزەکانی کوردی گرتەوەو بەهۆی ئەمەوە کورد چەندەها یاداشت و بروسکەی نارەزاییان پێشکەش بە های کۆمیشنەرو شا فەیسەڵ کردو چەندەها مەزبەتەیان بۆ سکرتارییەتی کۆمەڵەی گەلان نارد. پاشان مەسەلەکە پەرەی سەندو لە بری داواکردنی ئۆتۆنۆمی داوای پێکهێنانی حکومەتێکی سەربەخۆ لە ژێر سەرپەرشتیی بەریتانیا یان کۆمەڵەی گەلان کرا، بۆیە ئەم داوا نەتەوەییەی کورد هەم حکومەتی عێراقی تاساند هەم حکومەتی بەریتانیا کە هەردووکیان بۆ پوچەڵ کردنەوەی کەوتنە گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی پێویست و لەم ڕووەوە نەرمی نوێنراو بەڵێنێکی زۆر دراو وەك هەموو جار مەسەلەکەی بە بەکارهێنانی هێزی سوپایی کۆتایی هات.."[٢١].

*** یاداشتی مامۆستایانی کورد بۆ وەزارەتی مەعارف دەربارەی بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری لە کوردستان:**

لە سەرەتادا کۆمەڵێك مامۆستای بوارە جیاجیاکانی خوێندن لە کوردستان لە ساڵی (١٩٥٨) یاداشتێکیان بەرزکردەوەی بۆ وەزارەتی مەعارف لە بەغدا دەربارەی ئاستی خوێندن لە کوردستان و ئەو کەموکورییانەی کە دێتە ڕێگای لە هەمان کاتدا داوای چارەسەرکردنی کێشەکانیان کرد لە هەموو لایەنەکانی پەروەردەو خوێندندا، کە خۆی دەبینێتەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:

**١. زمانی کوردی:**

هەوڵ بدرێت زمانی کوردی ببێتە زمانی فێرکردن لە هەموو ناوچە کوردییەکان کە زمانی خوێندن و ئەدەبی بێت لە هەموو قۆناغەکانیدا. ببێتە زمانی قوتابیانی (دار المعلمين العالية)و (دور المعلمين والمعلمات)، دانانی کورسی بۆ زمانی کوردی و ئەدەبی لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا کە بە نیازن دروستی بکەن لە پاشەڕۆژدا، کردنەوەی قوتابخانە بە زمانی کوردی لە ناوچە عەرەبییەکان کە کەمە نەتەوەیی کوردی تێدا نیشتەجێیە، بە تایبەتی ئەو ناوچە کوردییانەی کە کەوتونەتە خوارووی عێراقەوە بە تایبەتی کوردە فەیلییەکان لە بەغداو حەبانییەو ناوەندی لیوای موسڵ لەگەڵ جەماوەری خەڵکی کوردی کوت و عەمارە.

**٢. زمانی عەرەبی:**

پێویستی فێرکردنی زمانی عەرەبی بۆ قوتابیانی کوردی پێویستییەکی گرنگە، بەڵام ئەو ڕێگای فێرکردنەی کە لە ڕابردوودا فێردەکران زۆر بە قووڵی و بێ ئەنجام بوو، دانانی کتێبی تازە بە زمانی عەرەبی لەلایەن سەرپەرشتیارانی لیژنەی پەروەردکاران و زانایانی دەروون ناسی و زمان ناسی، خوێندنی زمانێکی تر لەگەڵ زمانی دایك لە ساڵەکانی سەرەتایی دەبێتە هۆکاری پەشێوی بۆ ئەو قوتابییەو نەتوانێت سوودی لێ بەدەست بێنێت، لە ساڵەکانی لەوەدوا پێشنیاری خوێندنی زمانی عەرەبی و ئینگلیزی دەکەین.

**٣. مێژوو:**

قوتابی کورد مێژووی میللەت و نەتەوەکانی تری کۆن دەخوێنێت تەنانەت ئەوانەی کە لە ناوچوونە، بەڵام مێژووی خۆی ناخوێنێت، پێشنیار دەکەین بە خوێندن مێژووی نەتەوەی کورد بە شێوەیەکی بەرفراوان لە هەموو قوتابخانەکانی کوردستان، هەروەها خوێندنی مێژووی کورد لە قوتابخانەکانی ناوەندی و دواناوەندی لەلایەن قوتابیانی عەرەبەوە، پێویستە مێژووی کورد ماددەیەکی گرنگ و سەپێندراو بێت بەسەر قوتابیانی خانەی مامۆستایان و پەیمانگاو کۆلێژەکاندا کە مادەیەکی مێژوویی گرنگ بێت، وازلێهێنانی شێوازی کۆن لە لێکۆڵینەوەی زانستی مێژوو و هەوڵدان و بۆ دانانی پرۆگرامێکی تازە لە ژێر دەستی زانایانی مێژوو.

**٤. جوگرافیای کوردستان:**

خوێندنی جوگرافیای کوردستان بە شێوەیەکی بەرفراوان لە قوتابخانەکانی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی و خوێندنی جوگرافیای کوردستانی عێراق بە شێوەیەکی تایبەتی، لەگەڵ خوێندنی کورتەیەك لە جوگرافیای کوردستان لە قوتابخانە عەرەبییەکان وەکو تەواوکەی جوگرافیای عێراق و وڵاتەکانی دەورووبەری، هەروەها ماددەیەکی سەپێندراو بێت لە هەموو خانەی پێگەیاندنی مامۆستا و پەیمانگا و زانکۆکان کە بایەخ بەم مادەیە دەدەن.

**٥. نێردراوەکان:**
پێویستە ناردنی نێردراوەکان بۆ دەرەوەی وڵات لەسەر بنەمای ژمارەی دانیشتوانی لیواکان بێت، کە پێویستە ڕێژەی قوتابیانی کورد کەمتر نەبێت لە چارەگی گشتی قوتابیانی نێردراو بۆ دەرەوە، ئەگەر هاتوو ئاستی خوێندنیشان بەو شێوەیە نەبێت، پێویستە نێردراوەکان بۆ هەموو وڵاتێکی جیهان بێت بەبێ جیاوازی، چونکە خوێندن ژینگەیەکی دیاریکراوی نییە، پێویستە نێردراوەکان بەپێی پێویستی گەلی عێراق بێت لە بواری زانایان و تایبەتمەندانی بوارەکان، بە تایبەتی بایەخدان بە بواری پیشەسازی، پێویستە ڕێژەی گشتی لەبەرچاو نەگیرێت و زیاتر ئەو مادانە بەهەند وەربگیرێت کە بە گرنگ دادەنرێت بۆ نێردراوەکان، کە پێویستە ئەم مەرجانە بۆ هەموو قوتابیانی نێردراوەکانی دەرچووی کۆلێژو پەیمانگاکان.

**٦. دابەشبوونی کۆلێژو پەیمانگاکان:**
دامەزراندنی کۆلێژەکان بە دیاریکراوی لە لیوای کەرکوك و چارەسەرکردنی بێ بەشبوونیان تا ڕادەیەکی گەورەو دابەشکردنی بە شێوەیەکی جوگرافی.

**٧. مەرجەکانی وەرگرتن لە کۆلێژەکان:**
چاودێری ڕێژەی دانیشتوان بکرێت و مادەی تایبەتمەند وەربگیرێت نەك ڕێژەی گشتی، سەیریساڵی دەرچوون و تەمەن نەکرێت.

**٨. کردنەوەی قوتابخانە:**
کردنەوەی کۆمەڵێك قوتابخانە بە تایبەتی ئەو قوتابخانانەی لە سەردەمی پاشایەتیدا داخرابوو وەکو قوتابخانەکانی کچان.

**٩. بەشەکانی ناوخۆ:**
بەشێکی زۆری قوتابیان بە تایبەتی قوتابیانی گوندو لادێکان بێبەشن لە خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لەبەر نەبوونی ئەم قوتابخانانە لە گوندەکانیان و نەتوانی گەش کردن بۆ شارەکان یان ئاستی بژێویان زۆر کەمە ناتوانن درێژە بە خوێندن بدەن لەو قۆناغانەدا، بۆیە پێشنیار دەکەین بە کردنەوەی بەشی ناوخۆیی بۆ ئەوەی هانیان بدەین بۆ خوێندن لەو قوتابخانانە بەردەوام بوونیان بە خوێندن.

**١٠. تەواوکردنی کەموکوری قوتابخانەکان:**
هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەی مامۆستایانی تایبەت بە وانەکان یا ئەوانەی وانەبێژی بە توانان، بایەخدان بە لایەنی زانستی و هۆکارەکانی ڕوونکردنەوە، ڕێنمایکردنی قوتابیان بەرەو چالاکییە جۆربەجۆرەکان، هاندانی قوتابیان بۆ گشتکردنی قوتابخانە لە ناو عێراق و دەرەوە، بایەخدان بە قوتابخانەی ئێواران، دەستدرێژکردنی یارمەتی بۆ قوتابخانە ئەهلییەکان وەکو هەموو قوتابخانە فەرمییەکان.

**١١. دارشتنەوەی دووبارەی دەزگاکانی فێرکردن:**
پاککردنەوەی دەزگاکانی فێرکردن لە خیانەتکاران و پاشماوەکانی ڕژێمی پێشوو کە هۆکاری گرنگ بوون بۆ ئاوارەکردنی قوتابیان و مامۆستایان، یان خستنیان لە نێو بەندیخانەو دەزگا سەرکوتەکان، هەروەها پاککردنەوەی دەزگاکانی فێرکردن لەوانەی کە توانایان نییە هەستن بە ئەرکەکانیان و گۆڕینیان بە کەسی بە توانا.

**١٢. لایەنەکانی گواستنەوەو لەبەرچاوگرتنی مافی ستافی پەروەردەیی:**
پێشنیارێکی تایبەتی دەکەین دەربارەی پاراستنی مافی مامۆستایانی سەرەتایی لە کاتی گواستنەوەیان لە لادێوە بۆ شارو بە پێچەوانەوە، خوێندنی سەرەتایی بکرێتە ژێر ڕکێف و سەرپەرشتی وەزارەتی مەعاریف و نەدرێت بە کەسانی ناوخۆیی لە یەکە کارگێڕییەکان، چونکە لە ڕژێمی پێشوودا چاودێری مامۆستایان دەکرا لە گوندو لادێکان وەکو چاودێرێکی پۆلیسی، هەروەها چاو بخشێنرێتەوە بەو مامۆستایانەی کە لە لیوایەکەوە بۆ لیوایەکی تر گواسترابوونەوە بەپێی بنەما کارگێڕییەکان بە بێ ئەوەی ڕەچاوی شەرعی ئەو کارە بکرێت، هەروەها چاو بخشێنرێتەوە بە کێشەی ئەو مامۆستایانەی کە تووشی دەربەدەری بوونە لە پای هەندێ ڕەوشتی موتەسەریفەکان و پیاوانی کارگێڕی لە سەردەمی پێشوودا، پێدانی دەرماڵەی تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە دەگوازرێنەوە بۆ گوندو لادێکان و شوێنی نیشتەجێبوونیان بۆ دابین بکرێت، ڕێنمایی مافەکانی ستافی پەروەردەیی بکرێت و ڕێگەیان بدرێت سەندیکای تایبەتی بە خۆیان هەبێت، کاتەکانی دەوامیش کەم بکرێتەوە.

*** دەوری ڕێککەوتنی کوردو بەغدا لە ساڵی (١٩٧٠) لەسەر پرۆسەی خوێندن:**
لە دوای دەرچوونی بەیاننامەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) لەنێوان بزوتنەوەی کوردو حکومەتی بەغدا ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەو کاتەی بەعس کۆمەڵێك بڕیاری گرنگی دەرکرد دەربارەی خوێندن و پەروەردەو ڕۆشنبیری لە کوردستاندا کە خۆی دەبینییەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:

١. زمانی کوردی زمانی فەرمی دەبێت لەگەڵ زمانی عەرەبی لەو ناوچانەی کە زۆربەی دانیشتوانی کوردن.
٢. زمانی خوێندن لە ناوچەکانی کوردستان بە زمانی کوردی دەبێت.
٣. زمانی عەرەبی دەخوێندرێت لەو قوتابخانانەی کە بە زمانی کوردی دەخوێنن.
٤. خوێندنی زمانی کوردی وەکو زمانی دووەم لە هەموو ناوچەکانی عێراق وەکو ئەوەی کە لە یاسادا ئاماژەی پێ کراوە.
٥. کردنەوەی زانکۆی سلێمانی و دامەزراندنی (کۆڕی زانیاری کورد).
٦. بڕیاردان لەسەر هەموو مافە ڕۆشنبیری و زمانەوانییەکانی نەتەوەی کورد.

٧. پێویستی خوێندن بە زمانی کوردی لە هەموو قوتابخانەو پەیمانگاو زانکۆو خانەی مامۆستایان و کۆلێژە سەربازییەکان و کۆلێژی پۆلیس.

٨. هەوڵدان بۆ چاپکردنی هەموو کتێبە زانستی و ئەدەبی و سیاسییەکان بە زمانی کورد کە بگونجێت لەگەڵ خواستی نەتەوەی کورددا.

٩. ئەدیب و شاعیران بۆیان هەیە یەکێتی تایبەتی بە خۆیان بکەنەوەو چاپی بەرهەمەکانیان بکەن، هەنگاوەکانی پێشکەوتنیان لە بەردەمدا بێت بۆ ئەوەی توانا هونەری و زانستییەکانیان بخەنە روو.

١٠. دامەزراندنی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە بە زمانی کوردی.

١١. دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری گشتی کوردی.

١٢. بڵاوکردنەوەی رۆژنامەیەکی هەفتانەو گۆڤارێکی مانگانە بە زمانی کوردی.

١٣. زیاد کردنی بەرنامەی کوردی لە تەلەفزیۆنی کەرکوك، دامەزراندنی تەلەفزیۆنێکی تایبەت بە زمانی کوردی.

لەو ماوەیەدا لە دوای دەرچوونی بەیاننامەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) کەرکوکیش کەوتە دۆخێکی جیاوازەوەو بواری خوێندن و پەروەردەش بە زمانی کوردی کەرکوکی گرتەوە.

"لە مانگی ئاداری ساڵی (١٩٧٣)دا لیژنەیەك لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەرکوك پێکهێنرا لە هەر یەکە لە بەڕێوەبەری گشتی پەروەردە (عیزەددین سەردار) و سەرپەرشتیاری پەروەردەیی یەکەم (شیت سالح) لەگەڵ یاریدەدەری کاروباری خوێندنی کوردی (فاتیح محەمەد ئەمین) و یاریدەدەری کاروباری خوێندنی تورکمانی (محەمەد محێدین) هەستان بە ئەنجامدانی راپرسی لە نێو قوتابیانی قوتابخانەکانی شاری کەرکوك دەربارەی خوێندنی کوردی و تورکمانی تا بۆ ئەوەی قوتابخانەی کوردی و تورکمانیان بۆ بکرێتەوە، لە ئەنجامدا (٣٨) قوتابخانەی کوردی بۆ کوڕان و کچان و (١٧) قوتابخانە بۆ خوێندنی تورکمانی و (٢٩) قوتابخانە بۆ خوێندنی عەرەبی کرایەوە.

بەڵام دەستێکی رەش لە ژێرەوە لە هەوڵدابوو بۆ پەشیمانکردنەوەی بەشێکی زۆری قوتابیانی کوردو تورکمان لە خوێندنی کوردی و تورکمانی بۆ ئەوەی ئەو پرۆژەیە سەرنەگرێت، بۆ نموونە لە یەکێك لە قوتابخانەکان لە سەرەتادا (٣١٠) قوتابی ناوی خۆی نووسی، بەڵام لە دواییدا بوو بە (٢٦٣) قوتابی کە (٤٧) قوتابی گەڕانەوە سەر خوێندنی عەرەبی.

بە هەمان جۆر لە قوتابخانەکانی خوێندنی تورکمانیش ئەم رووداوە دووبارە بووەوە، هەر وەکو ئەوەی روویدا لە قوتابخانەی (المثنى بن حارث الشيباني)ی و قوتابخانەی (کرکوك)ی کچان و (وثبة)ی کوڕان و قوتابخانەی (عرفة).

بەڵام لە دوای هەرەس هێنانی بزوتنەوەی کوردی لە ساڵی (١٩٧٦) حکومەتی بەعس هەستا بە هەڵوەشانەوەی خوێندن بە زمانی کوردی و تورکمانی و گۆڕینی بەڕێوەبەرو ناوی قوتابخانەکان و هێنانی مامۆستایەکی زۆر لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق بۆ کەرکوك.

*** قوتابخانە سەرەتاییەکانی نێوان ساڵانی (١٩٧٢ - ١٩٧٣) کە خوێندن بە زمانی کوردی بوو تێیدا:**

١. گۆران.
٢. مەشخەڵ.
٣. کوردستان.
٤. پێشرەو.
٥. رەحیماوا.
٦. ئازادی.
٧. پیرەمێرد.
٨. رزگاری.
٩. مەولەوی.
١٠. سەلاحەددین.
١١. هەڵمەت.
١٢. هەڵگورد.
١٣. گەل.
١٤. شۆرش.
١٥. خەبات.
١٦. بێکەس.
١٧. نالی.
١٨. شیرین.
١٩. نازەنین.
٢٠. قەندیل.
٢١. مەهاباد.
٢٢. پێشکەوتن.
٢٣. ئەسیری.
٢٤. هیوا.
٢٥. ئاشتی.
٢٦. خانزاد.
٢٧. بارزن.
٢٨. ئازادی کچان.
٢٩. گزنگ.
٣٠. ئەیوبی.
٣١. ئاسۆس.
٣٢. شۆڕیجەی کوڕان.
٣٣. شۆڕیجەی کچان.
٣٤. ئیمام قاسمی ئێوارانی کوڕان.
٣٥. شۆڕیجەی ئێوارانی کوڕان.
٣٦. ئیمام قاسمی کوڕان.
٣٧. ئیمام قاسمی کچان.
٣٨. سەربەستی ئێوارانی کچان.

*** قوتابخانە سەرەتاییەکانی نێوان ساڵانی (١٩٧٢ - ١٩٧٣) کە خوێندن بە زمانی عەرەبی بوو تێیدا:**

١. الطاهرة.
٢. غزة (تطبيقات دار المعلمات).

٣. الزهراء.
٤. مصلى.
٥. الفسائية.
٦. الثورة.
٧. الجمهورية.
٨. معهد رعاية البنات.
٩. المحطة.
١٠. اسامة بن زيد.
١١. مثنى بن حارث الشيباني.
١٢. الطليعة.
١٣. الجاحظ.
١٤. الحرية.
١٥. القحطانية.
١٦. الفتوة.
١٧. الفارابي.
١٨. عرفة.
١٩. التهذيب.
٢٠. اليرموك.
٢١. الوثبة.
٢٢. الخالدية.
٢٣. كركوك.
٢٤. تسعين للبنين.
٢٥. تسعين للبنات.
٢٦. الرسالة المسائية.
٢٧. تسعين المسائية.
٢٨. البعث المسائية.
٢٩. رابعة العدوية.

*** قوتابخانە سەرەتاييەكانی نێوان ساڵانی (١٩٧٢ - ١٩٧٣) كە خوێندن بە زمانی توركمانی بوو تێيدا:**

١. يدلك.
٢. تعليم تبة.
٣. امد طاش.
٤. اوچی.
٥. هيجيري دەدە.
٦. گاورباغی.
٧. قرداشلق.
٨. خاصة صو.
٩. صاري كهية.
١٠. توب قابو.
١١. چالشقان.
١٢. اوغوز.
١٣. يلدز.
١٤. كوك اي.
١٥. بارش.
١٦. اغالق.
١٧. يدي قزلر.

*** قوتابخانە ناوەندیو ئامادەييەكانی نێوان ساڵانی (١٩٧٢ - ١٩٧٣) كە خوێندن بە زمانی عەرەبی بوو تێيدا:**

١. ثانوية المصلى للبنين.
٢. اعدادية كركوك للبنين
٣. ثانوية نقابة المعلمين المسائية.
٤. اعدادية صناعة كركوك.
٥. ثانوية القدس للبنات.
٦. اعدادية كركوك للبنات.
٧. متوسطة الشرقية للبنين.
٨. متوسطة الغربية للبنين.
٩. متوسطة تسعين للبنين.
١٠. متوسطة الحكمة للبنين.
١١. متوسط القلعة للبنات.
١٢. متوسط فلسطين للبنات.

*** قوتابخانە ناوەندیو ئامادەييەكانی نێوان ساڵانی (١٩٧٢ - ١٩٧٣) كە خوێندن بە زمانی كوردی بوو تێيدا:**

١. دواناوەندی زێوەری كوڕان.
٢. ئامادەيی كوردستانی كوڕان.
٣. دواناوەندی سەنديكای مامۆستايانی كوردستانی ئێواران.
٤. دواناوەندی ئيمام قاسمی كوڕان.
٥. ناوەندی بابا گوڕ گوڕ.
٦. ناوەندی شۆڕش.
٧. ناوەندی كاوە.
٨. ناوەندی شۆڕيجە.
٩. ئامادەيی چەمی ڕێزانی كچان.
١٠. ناوەندی خانزادی كچان.
١١. ناوەندی ئيمام قاسمی كچان.
١٢. دواناوەندی ١١ی ئاداری كچان.





بنکەی ڕاهێنانی پیشەسازی





*** زانکۆی گەرمیان:-**

**ئەم زانکۆیە بەردی بناغەی لە ١٤ی نیسانی ٢٠١٠ دانراو لە ٢٠١١ بە فەرمی وەك ناوەندێکی ئەکادیمی کرایەوە، سەرەتا بناغەی ئەم زانکۆیە بە کۆلێژی پەروەردە دەستپێکرد لە ساڵی ٢٠٠٤ لە کەلار کرایەوە و لە ٢٠٠٥ کۆلێژی ئادابی خانەقین کرایەوە. هەردوو کۆلێژ سەر بە زانکۆی سلێمانی بوون.**

**لە ساڵانی (٢٠٠٧-٢٠٠٨) کۆلێژی پەروەردەی بنەرەتی کەلار و لە (٢٠٠٨-٢٠٠٩) کۆلێژی وەرزش لە خانەقین کرانەوە، هەر لە (٢٠١١)ەوە سەرجەم ئەم کۆلێژانە خرانە سەر بە زانکۆی گەرمیان لە ئێستادا زانکۆی گەرمیان (٩) کۆلێژ لە خۆ دەگرێت:-**

**پەورەردە، پەروەردەی بنەرەتی، زانست، ئەندازیاری، یاسا، زمان، زانستە مرۆڤایەتییەکان، وەرزش، کشتوکاڵ.**

## * یەکێتی قوتابیانی کوردستان ۱۹۵۳ - ۱۹۷۵:-

**سامان کەریم مەحموود**

ساڵی ۱۹۳۳ کۆمەڵێك لە خوێندکارانی کورد کە ئەو کات لە پەیمانگە و زانکۆکانی بەغدا دەیانخوێند، کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری، کۆمەڵایەتی و (تا ڕادەیەك سیاسی)یان بەناوی (کۆمەڵی لاوان)ەوە دروست کرد، (محەمە ئەمین زەکی) ئاراستەی دەکرد و سەرپەرشتی کۆمەڵەکەی دەکرد، ئەندامانی لەنێوان (۶۰-۷۰) خوێندکار دەبوون هەر لە یەکەم ساڵی دروستبوونی (کۆمەڵی لاوان)دا ساڵی ۱۹۳۳، یەکەم ژمارەی نامیلکەی (یادگاری لاوان) یان بە چاپ گەیاندو بڵاوکردەوە، لە ساڵی ۱۹۳٤دا ئەم کۆمەڵەیە نامیلکەی دووەمی خۆی بەناوی (دیاری لاوان)ەوە بە قەبارەی (۹۸) لاپەڕە بڵاوکردەوە.

بەو شێوەیەش کۆمەڵەی لاوان لە ۱۹۳۳ - ۱۹۳٤ بڕی کرد و دواتر هەر ئەو بیرۆکەیە بوو بە هەوێنی دامەزراندنی پارتی (هیوا) کە خوێندکاران ڕۆڵی سەرەکی و کاریگەرییان لە دروستبوونیدا گێڕا. هەر (هیوا) بوو ڕۆڵی بینی لە کەرکوك و گەشەی کرد.

ساڵی خوێندنی (۱۹٤٦-۱۹٤۷) لە شاری کۆیە کۆمەڵەیەکی خوێندکاری و خوێندەواری لەلایەن چەند خوێندکارێکی کوردەوە بەناوی (کۆمەڵی) پێشکەوتنی خوێندەواری) دادەمەزرێت، مام جەلال کە یەکێك بووە لەو خوێندکارانەی ئەو کۆمەڵەیە، ئەم کۆمەڵەیە تێدەکۆشا لەپێناو برەودانی زیاتر بە پێشکەوتنی خوێندەواری لە ناوچەکەدا، بە ئەزموونێکی گرنگی بزاڤی خوێندکارانی کوردستان و هەنگاوێکی بوێرانە بوو بۆ دروستبوونی ڕێکخستنێکی قوتابیانە، کۆمەڵەیەکی نهێنی بوو، بەرنامە و پەیڕەوی نەبوو، بەڵام شانەیەکیان هەبوو لە سێ کەس پێکهاتبوو، هەفتەی جارێك کۆ دەبوونەوە، لە کۆبوونەوەکاندا بیری مارکسیزم و بڵاوکراوەکانی مارکسییەتیان دەخوێندەوە و خۆیان بە مارکسی نەتەوەی لە قەڵەم دەدا و خەباتە نەتەوەییەکەشیان ئاوێتە بە بیری مارکسیزم دەکرد.

ئەو ڕێکخراوە لەناو جەماوەردا دەنگی نەدایەوە، چونکە نهێنی بوو، بڵاکراوە و زمانحاڵی نەبوو تا لە ناو جەماوەردا بڵاوی بکاتەوە.

خۆیان دەپاراست بۆ ئەوەی خەڵك نەیانناسێ، کۆمەڵەیەکی سەرەتایی خوێندکاران بوو، تەنها خوێندکاری ئامادە دەکرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ پارتیدا خۆی بدۆزێتەوە، چالاکییەکانیان سنووردار بوو، ئەزموونەکەی ئەم کۆمەڵەیە هەوێنی لەدایکبوونی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) بوو لە ساڵی ۱۹۵۳دا.

دوای بەستنی سێیەمین کۆنگرەی (پارتی دیموکراتی کوردستان - عێراق) لە ۲٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۵۳دا بە نهێنی لە شاری کەرکوك، تیایدا بڕیاری پێکهێنانی ڕێکخراوە جەماوەرییەکانی کوردستان بەشێوەیەکی گشتی و (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)یش بەتایبەتی درا لە ۱۸ی شوباتی ۱۹۵۳ لە ماڵی کوردێکی فەیلی لە شاری بەغدا و بە ئامادەبوونی ۵۰ خوێندکاری زانکۆی بەغدا نوێنەرانی پارێزگاکانی کەرکوك و سلێمانی و هەولێر و موسڵ، بە نهێنی کۆبوونەوە و یەکەم کۆنگرەی دامەزراندنی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) بەسترا.

هەر لەو کۆنگرەیەدا (جەلال تاڵەبانی) بە سکرتێری (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) هەڵبژێردراو (ئەحمەد عەبدوڵڵا)ش بوو بە سەرۆکی یەکەم ڕێکخراوی خوێندکارانی کوردستان.

بە گشتی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) لە پێناو کۆمەڵێك ئامانجی پێشەیی، جەماوەری خوێندکاراندا لەدایکبوو، کە گرنگترینیان بریتییە لە:-

۱- پاراستنی ماڤی خوێدکارانی کوردستان، و چارەسەرکردنی گیروگرفتی سیاسی و ڕۆشنبیری و پیشەییەکانیان.
۲- کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ڕیزی خوێندکاران و دەربازکردنیان لە پەرتەوازەیی.
۳- ئامادەکردنی خوێندکاران بۆ خەبات، خەبات لەپێناو گەل و جۆشدانەوەی هەست و هۆشی نەتەوایەتیان.

(یەکێتی قوتابیانی کوردستان) یەکەم ڕێکخراوی خوێندکارانی کوردستان بوو خواست و داواکارییەکانی خوێندکارانی کوردستانی هەلگرتبوو و خاوەنی دەنگ و بانگی بزووتنەوەی خوێندکارانی کوردبوو لە گشت ساتە مێژووییەکاندا، لەگەڵ ئەو گیرو گرفتە نایاساییانەی دەسەڵاتدارێتی عێراق لەو ڕۆژگارانەدا ڕێکخراوە عێراقییەکان بۆی دەنایەوە.

دوای دامەزراندنی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) لە ساڵی ۱۹۵۳ بۆ یەکەم جار پەیوەندی یەکێتی بە (یەکێتی قوتابیانی گشتی) عێراقەوە لە ۱۹۵۵ لە کۆنگرەی (وارشۆی) (یەکێتی قوتابیانی جیهانیدا) بوو.

دوای چەند دانیشتنێك هەردوو لا لەسەر چەند خاڵێك ڕێکدەکەون:-
۱- هەبوونی یەك ڕێکخراوی خوێنداری لە کوردستاندا کە چالاکییەکانی لە چوارچێوەی ناوچە کوردییەکاندا پراکتیزە بکات.
۲- هەبوونی یەك ڕێکخراوی خوێندکاری لەژێر ناوی (یەکێتی گشتی قوتابیانی عێراق)دا کە لە هەموو عێراقدا کار دەکات جگە لەو ناوچە کوردییانەی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) کاری تێدەکات.
۳- (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) دەبێتە ئەندام لە یەکێتی گشتی قوتابیانی عێراقدا.

دوای گەڕانەوەی هەردوو یەکێتییەکە لە (وارشۆ)، لیژنەی باڵای هەردوو لا یەکەم کۆبوونەوەی خۆی لە ساڵی ۱۹۵٦ لە شاری کەرکوك ئەنجامداو کۆبوونەوەی دووەمی لە ساڵی ۱۹۵۷ لە سلێمانی سازدا، بڕیارپش بوو کۆبوونەوەی سێیەم لە هەولێر ببەسترێت بەڵام بە هەڵگیرساندنی شۆڕشی تەمووزی ۱۹۵۸ ئەو کۆبوونەوەیە نەبەستراو، پەیوەندییەکانی هەردوو لا گرژی تێکەوت.

لە ماوەی نێوان (۱٦--۲۰)ی شوباتی ساڵی ۱۹۵۹ دووەم کۆنگرەی خوێندکارانی عێراق بەسترا، نوێنەرانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)یش بەشدارییان لەو کۆنگرەیەدا کرد، بەناوی (یەکێتی قوتابیانی گشتی لە کۆماری عێراق).

لە ۲ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹٦۰دا (یەکێتی قوتابیانی گشتی لە کۆماری عێراق) دووەم کۆنگرەی خۆی و سێیەم کۆنگرەی خوێندکارانی عێراقی گرێدا، وەفدێکی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) تیایدا بەشداری کرد. لەو کۆنگرەیەدا نوێنەرانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) ڕەشنووسی چەند داوا و ماڤێکی خوێندکارانی کوردستانیان خستە بەردەم بەشداربووانی کۆنگرەکە و کۆنگرەش چەند بڕیارێکی گرنگی لەو ڕووەوە دەرکرد.

لقەکانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)یش دوایی بە ئازادیی بوونی کارو چالاکییەکانیان توانیان ئەو هەلە بقۆزنەوە بۆ دەربڕینی شوناسی ڕێکخراوەکەیان لەلایەکەوە و بەشداری کردن لە بنیادنانی کەسێتییەکی کوردانە و نەتەوەییانەی خوێندکاری کورد لەلایەکی ترەوە، لایەنی ڕۆژنامەوانییان وەکو پێویستییەك بۆ ئەو مەبەستە، برەوپێدان و زۆرینەی لقەکانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) لە قۆناغی کاردا بوون بە خاوەنی بڵاوکراوە و ڕۆژنامە و گۆڤار:-

لقی کەرکوکی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) گۆڤارێکی بە زمانی کوردی و لەژێر ناوی (بابە گوڕگوڕ)دا دەردەکرد.

ئەو گۆڤارەی تەنها دوو ژمارەی لێدەرچووە، کە هەردوو ژمارەکەش

**لە ساڵی ١٩٧٣دا دەرچووە و لەدواییدا ڕاگیرا.**

**ئەوەی جێگەی ئاماژەیە کە (یەکێتی قوتابیانی عێراق) لقی کەرکوك ڕۆژنامەی هەفتانەی قوتابیانەیان بڵاودەکردەوە بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و تورکمانی لە ساڵی ١٩٥٩ کە تەنها دوو ژمارەی لێدەرچوو کە ژمارە یەکی لە ١٣ی ئابی ١٩٠٩ و ژمارە (٢)ی لە ٢٠ی ئابی ١٩٥٩ دەرچوو، بە قەبارەی نیو (A4) و بە ڕەش و سپی.**

**وەکو دەردەکەوێت لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٠–١٩٧٤) کە دەروازەی کارو چالاکی ئازادانە و ئاشکرا لەبەردەم (یەکێتی قوتابیاندا واڵابووە، ئەم ڕێکخراوە توانیویەتی مەڵۆیەکی گەورە بخاتە سەر خەرمانی ڕۆژنامەوانی کوردی بە گشتی و ڕۆژنامەگەری خوێندکاران بە تایبەتی لەو قۆناغە مێژووییەدا، تا هەڵگیرسانەوەی جارێکی تری شۆڕشی کورد لە دژی حکومەتی عێراقی.**

**لە ماوەی بیست و دوو ساڵدا توانیویەتی (١٩٥٣–١٩٥٧)، حەوت کۆنگرە ببەستێت بەم شێوەیە:–**

**١– کۆنگرەی یەکەم لە (١٨)ی شوباتی ١٩٥٣**
**٢– کۆنگرەی دووەم لە هاوینی ١٩٥٥**
**٣– کۆنگرەی سێیەم لە ئایاری ١٩٦١**
**٤– کۆنگرەی چوارەم لە ١٤ شوباتی ١٩٦٤**
**٥– کۆنگرەی پێنجەم لە نیسانی ١٩٦٧**
**٦– کۆنگرەی شەشەم لە ١١ی ئاداری ١٩٧٠**
**٧– کۆنگرەی حەوتەم لە ٣٠ی نیسانی ١٩٧٢**
**٨– لەپاڵ ئەمانەشدا سێ کۆنفرانسی گەورەی بەستووە بۆ تاوتوێکردنی بارودخی سیاسی و قوتابیان.**







پەیمانگای پارێزگاری منداڵ لە کەرکوك

*** پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوک:**

**ئارەزوو نوری حەکیم**

*** دوو پەیمانگای هونەرە جوانەکان (کەرکوك) و (باباگوڕگوڕ):**

لە ماوەی دوو ساڵدا لە شاری کەرکوك دوو پەیمانگای هونەرە جوانەکان دادەمەزرێت.

یەکەمیان: بەناوی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك[1]، کە لە (٥)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٤) دامەزراوە لەلایەن دەستەی دامەزرێنەر، کە بریتی بوون لە سێ بۆ چوار هونەرمەندی شاری کەرکوك لەژێر ناوی پەیمانگایەکی ئەهلی. مۆڵەتی کردنەوەیان لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی عێراقییەوە وەرگرت. لە بەشەکانی دیکەی توێژینەوەکە ووردەکاری زیاتر سەبارەت بە پەیمانگاکە دەخەینە ڕوو.

دووەمیان: پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگوڕگوڕ[2]، کە لە (٢٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥) بە فەرمانی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئیدارەی سلێمانی دامەزراوە. بەڕێوەبەری بۆ دەستنیشان کرابوو لەگەڵ ستافی ئیدارە. ئەم دوو پەیمانگایە لەسەردەمی دوو ئیدارەیی سلێمانی و هەولێر دامەزران. هەر بۆیە بە شێوەیەك لە شێوەکان، یاخود ڕاستەوخۆ بارگاوی بوون بە حیزبیبوون. ئەمەش لەو سەردەمەدا بە ڕوونی درکی پێ دەکرا. تەنانەت هەندێ جار لەناو خەڵکیدا ناوەکانیان دەگۆڕدران بە پەیمانگا (پارتی)[3] یەکەو پەیمانگا (یەکێتی) یەکە![4]

جیاوازی نێوان ئەم دوو پەیمانگایە لەوەدابوو کە پەیمانگای کەرکوك لەگەڵ ئەوەی مۆڵەتی کارکردنی پەیمانگایەکی ئەهلی لە بەغدا وەرگرتبوو، بەڵام لەڕاستیدا مامۆستاکان و ستافی کارگێڕی لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی هەولێر بۆ دامەزرێنرابوون و مووچەیان بۆ تەرخان کرابوو. هەروەها لەڕووی هەیکەلەوە جیاوازیان هەبوو کە پەیمانگای کەرکوك پێکهاتبوو لە بەشەکانی (شێوەکاری، شانۆ، موزیك، بیستن و بینین). بەڵام پەیمانگای باباگوڕگوڕ پێکهاتبوو تەنها لە بەشەکانی (شێوەکاری و مۆسیقا). جیاوازییەکانی دیکە لە بەشەکانی داهاتوو دەخەینە ڕوو.

گەرچی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، مێژوویەکی دوورو درێژی نییە. بەڵام دەکرێت وەکو یەکێك لە بەرهەمە جوانەکانی نەمانی دیکتاتۆرییەتی حوکمی ڕژێمی بەعس دابنرێت. چونکە بەدرێژایی مێژووی شاری کەرکوك، پەیمانگای هونەرە جوانەکان بوونی نەبووە لەو شارەدا. هۆکاری نەبوونی ڕوون نییە بەهۆی نەبوونی بەڵگەی تەواو لەسەری. بەڵام دەتوانین گریمانەی ئەوە بکەین کە دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس خواستی ئەوەی نەبووە لاوانی خەڵکی ئەم شارە سوودمەند بن لە بەهرەکانیان بە ئاسانی. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین شاری کەرکوك بە لانکەی داهێنانی هونەریی و ئەدەبی و میوزیك دابنێین. چونکە ناوی زۆر گەورەو پرشنگدار هەیە لە بوارە جیاوازەکاندا. دەتوانین وەکو ئاماژەیەکی خێرا (عەلی مەردان، حوسێن عەلی، سەلاح داوده، جیهاد دڵپاك، عەلی کەریم)و زۆری دیکە لە بواری هونەرو میوزیك بە یاد بهێنینەوە.

لە پاش پرۆسەی ئازادی عێراقەوە[5] دەرگایەکی فراوان، بەڵام پڕ کێشمەکێش دەکرێتەوە لەبەردەم دڵسۆزانی هونەرو میوزیك لەو شارەدا. بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوونی کۆمەڵێك دڵسۆزی شارەکە بەرئەنجامی هەبوو. دامەزراندنی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك بوو. لە دواییدا تیشك دەخەینە سەر ناوی هەموو ئەوانەی جێدەستیان دیارە لە بوونیادنانی پەیمانگای هونەرە جوانەکان و هەوڵ و تەقەللاو ماندووبوونیان لەبەر چاو دەگرین بەپێی توانا.

هۆی ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك. یەکەم، ئەوەیە کە من دەرچووی ئەو پەیمانگەیەم و ئەزموونی ساڵانێك خوێندن و خەم و ئازارەکانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوکم هەیە. دووەم، چیرۆکی دامەزراندن و ململانێکان بەشی خۆی سەرنجراکێشەو بە پێویستم زانی لە کارێکی وەهادا بەسەری بکەمەوەو بمێنێتەوە بۆ مێژوو. لەگەڵ ئەوەی بیرۆکەو هەوڵدان بۆ دامەزراندنی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوك بۆ خۆی جێی دڵخۆشی و دەستخۆشییە. هاوکات ئەو پرۆژەیە هێندە بە سانایی نەهاتووەتە بەرهەم. بەڵکو ساڵانێکی بەسەر بردووە لەنێوان بەرداشی دوو ئیدارەیی هەرێمی کوردستان لەلایەك و بیانووەکانی حکومەتی ناوەندی لە بەغداوە لەلایەکی دیکەوە. لە ناوەڕۆك و بەشەکانی ئەم باسەدا هەوڵ دەدەین وەکو پێویست ئاماژە بەزۆر ووردەکاریی نەبیستراو بدەین.

**پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك لەڕووی جوگرافیاو هەیکەلی بینادا**

پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، دەکەوێتە شەقامی مەحاکم بەرامبەر قشلەی[6] کەرکوك. نزیك بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی کەرکوك. لە بینایەکدایە کە پێشتر لەسەردەمی ڕژێمی بەعسدا (دار الضباط)[7] بووە.

پێکهاتووە لە سێ بەش شانۆ، شێوەکار، مۆسیقا. (٤١) مامۆستا لەخۆ دەگرێت، بەشی شانۆ (١٠) مامۆستا. شێوەکار (٢٠) مامۆستا. مۆسیقا (١١) مامۆستا. (٣٧) فەرمانبەر لەخۆ دەگرێت بە هەموو بەشەکانییەوە. بۆ خوێندنی ئەمساڵ (٢٧٣) فێرخواز لەخۆ دەگرێت بە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ، کە (١٩١) کوڕو (٨٢) کچ. قۆناغی یەکەم (٦٦) فێرخواز، قۆناغی دووەم (٤٩) فێرخواز، قۆناغی سێیەم ٤٤ فێرخواز، قۆناغی چوارەم (٥٣) فێرخواز، قۆناغی پێنجەم ٦١ فێرخواز.

لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، فێرخوازی هەموو نەتەوەکانی شارەکە دەبینرێن لە کوردو تورکمان و عەرەب و کلدو ئاشوور. بە تێکڕا لە مامۆستاو خوێندکارو لە ئاینەکانی موسوڵمان، مەسیح، کاکەیی، سابئی. ئەمەش بەهۆی ئەوەی شارەکە فرە نەتەوەو فرە ئاینە. فرە نەتەوەیی و ئاینی لەناو پەیمانگەکە گرفتێکی دروست نەکردووە، بەڵام لە شەقامی شاری کەرکوکدا ئەو چیرۆکە

مەرگهێنەیە کە ڕۆژانە قوربانی لێدەکەوێتەوە بە تەقینەوەو ڕفاندنو تیرۆرکردن. چونکە لە ئێستادا کەرکوك لە دۆخێکی نا ئارامی سیاسیو ئەمنیدایەو پێدەچێ هەروا بە ئاسانی دۆخی شارەکە سەقامگیر نەبێ. لەگەڵ ئەوەی جیاوازی نەتەوەییو ئاینی لە شارەکەدا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە. تەنها نەتەوەی عەرەب نەبێت کە لە دەیەی سێیەمی سەدەی بیستەمەوە لە دەورووبەری کەرکوكو ناوشاری کەرکوکدا دەرئەکەونو وەکو دەزانرێتیش بە پلانی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقەوە، بە مەبەستی گۆڕینی دیمۆگرافیای شارو ناوچەکە دەهێنرێن. ئێستا ئەوانیش ڕێژەیەکی بەرچاونو دیفاکتۆیەکن بۆ ڕاگرتنو لاسەنگکردنی هاوکێشەی سیاسیو ئەمنی شارەکە.

*** پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك:**

ئەم پەیمانگایە، یەکەم (پەیمانگای هونەرە جوانەکان) ە لە مێژووی شاری کەرکوك. هەر بۆیە قسەکردن لەسەر چۆنێتی دامەزراندنی دەکەینە چەند بەشێكو هەر بەشەو باس لەچۆنێتی بەڕێوەبردنی وەك دامەزراندنی پەیمانگا. نەسرییەی پەیمانگا. بینای پەیمانگا. دەستنیشانکردنی دەستەی بەڕێوەبەر. دەست پێکردنی پەیمانگا بە خوێندن. ساختەبوونی بڕوانامە. هەڵوەشاندنەوەی پەیمانگا.

*** دامەزراندنی پەیمانگاو وەرگرتنی مۆڵەت:**

بیرۆکەی دامەزراندنی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوك، لەلایەن کۆمەڵێك هونەرمەندی شارەکە وەك (عارف مەعروف، مان ئەحمەد، نیهاد خالید، حوسێن ئەحمەد)[8]. هاتووەتە کایەوە. (ئەم بیرۆکەیە، سەرەتا بۆ د. عەبدولعەزیز تەیب[9] پێشنیار کرا. ئەویش سەرجەم بیرۆکەی پەیمانگاکەی پەسەند کردو بەڵێنی دامەزراندنی سەرجەم مامۆستاو فەرمانبەری پەیمانگای دا بە مەرجێك دەستەی دامەزرێنەر بتوانن ئیجازەی پەیمانگاکە لە وەزارەتی پەروەردەی بەغدا بەدەست بهێنن)[10]. چونکە پەیمانگایەکی سەر بەهەرێم قەدەغە بوو لەناو شاری کەرکوك بکرێتەوە بەو پێیەی شاری کەرکوك لەڕووی ئیدارییەوە سەر بە بەغدایە. بیرۆکەی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بۆ وەزارەتی پەروەردەی بەغدا پێشنیار دەکرێتو دوای چەندین هەوڵدانو بەربەست. بڕیار لە سەر دامەزراندنی پەیمانگایەکی ئەهلی ئێوارانی هونەرە جوانەکان لە کەرکوك درا. بەپێی مادەی (٣٧) لە یاسای فێرکردنی ئەهلیو بیانی ژمارە (١) بۆ ساڵی (٢٠٠٤). بەپێی ئەو مەرجو ڕێنماییانەی وەزارەت. لەسەر داوای بەڕێز عارف مەعروف عەباس بۆ کردنەوەی پەیمانگایەکی ئەهلی هونەرە جوانەکان لە شاری کەرکوك. لەلایەن وەزارەتی پەروەردە بەڕێوەبەرایەتی گشتی بۆ خوێندنی گشتی. بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی ئەهلیو بیانی بە فەرمانی وەزاری ژمارە (٤٥٦٤) بەرواری (٥)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٤). بڕیاردرا بە پێدانی مۆڵەت بۆ کردنەوەی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بە ناوی (پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك). هاوپێچ نووسراوی ژمارە (١).

هەر بەپێی ماددەی (٣) لە یاسای فێرکردنی ئەهلیو بیانی ژمارە (١) بۆ ساڵی (٢٠٠٤) بەپێی مەرجو ڕێنمایییەکانی وەزارەت بڕیار بە پێدانی مۆڵەت بە عارف مەعروف عباس درا بۆ دامەزراندنی پەیمانگایەکی ئەهلی بە ناوی (پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك) بۆ ماوەی ساڵێكو لە بەرواری دەرچوونی ئەگەری تازەکردنەوەی هەیە. ژمارەی مۆڵەت (٥). بەرواری (٢)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٤). هاوپێچ نووسراوی ژمارە٢.

*** نەسرییەی پەیمانگا:**

وەك مۆڵەت، پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، مۆڵەتی وەزارەتی پەروەردەی بەغدای پێ درابوو. هەر لەبەر ئەوەی وەك پەیمانگایەکی ئەهلی مۆڵەتی پێدرابوو. بری (١٥٠,٠٠٠) سەدو پەنجا هەزار دینار لەسەر هەر فێرخوازێك بوو ساڵانە بە دوو بەش بیدات. بۆ کڕینی پێداویستییەکانی فێرخوازان. لە هەمان کات وەزارەتی پەروەردەی عێراق بێ ئاگا بوو لەوەی کە لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە ساڵانە بودجەی بۆ دابین کراوە. نەسرییەی پەیمانگاو مووچەی سەرجەم فەرمانبەران لەسەر وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی هەولێر بوو. کە لەسەر میلاکی پەیمانگا (١١٨) مامۆستاو فەرمانبەر لەسەر ئیدارەی هەولێرو (٩) مامۆستاو فەرمانبەر لەسەر ئیدارەی سلێمانی دامەزرێنران. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو برە مامۆستاو فەرمانبەرە بۆ پەیمانگا زۆر بوو تەنها (٤٩) مامۆستاو (٣٤) فەرمانبەر لەسەر ئیدارەی هەولێرو (٨) مامۆستاو (١) فەرمانبەر لەسەر ئیدارەی سلێمانی بە فەرمی بۆ پەیمانگاکە دابین کراو ئەوانی دیکە لەلایەن بەشی زمانی کوردی لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەرکوکەوە دابەش کران بە سەر خوێندنگەکانی کەرکوك.

*** بینای پەیمانگا:**

بۆ دابین کردنی بینای پەیمانگا لەلایەن دەستەی دامەزرێنەر، سەردانی نێچیرڤان بارزانی[11] دەکرێ بۆ تەرخانکردنی یەك لەو بینایانەی کە کرابوو بە بارەگایەکی پارتی دیموکراتی کوردستان، وەك شیاوترین بینا لەو کاتەدا بۆ هونەرە جوانەکان. بە بڕیاری نێچیرڤان بارزانی بەشێك لەو بینایە بۆ هونەرە جوانەکان تەرخان دەکرێتو عارف مەعروف ئەو جێگەیە بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی کەرکوك. بەشی هێلکاری پەروەردەیی، بینای قوتابخانەکان پێشنیار دەکاتو پەروەردەی کەرکوك بە نوسراوی ژمارە (١٢٩٢٥) بەرواری (١)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٤) پێشنیاری وەزارەتی پەروەردەی عێراق. بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی گشتی. بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی ئەهلیو بیانی پێشنیار دەکەن. دوای ناردنی (کشف) لە پەروەردەی کەرکوك بۆ سەر بینای دەستنیشانکراو لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی بەغدا. وەك جێگەیەکی شیاو پەسەند کرا. بۆیە بە نوسراوی ژمارە (٣٦٤٢) بەرواری (٧)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٤) وەڵامی نووسراوەکەی پەروەردەی کەرکوك دەدرێتەوە بەوەی کە

لاریان لەوە نیە ئەو بینایە بۆ پەیمانگای هونەرە جوانەکان دابین بکرێت. هاوپێچ نووسراوی ژمارە (٣).

*** دەستنیشانکردنی بەڕێوەبەر:**

لەبەر ئەوەی فەرمان و بڕیارەکان لەسەر پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە دەهات. بە فەرمانی وەزاری وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق. ئەنجومەنی وەزیران. نووسراوی ژمارە (١٤٩٧٨) بەرواری (٣٠)ی کانوونی یەکەمی سالی (٢٠٠٤) بڕیاردرا بە هەڵسانی ئەم بەڕێزانەی ناویان لە خوارەوە دیاری کراوە بە ناونیشانی مامۆستای دواناوەندی، بە بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی پارێزگای کەرکوك. بەم شێوەیەیش دەستنیشان کراوە لە رۆژی دەست بەکاربوونیانەوە. (عارف موعروف عەباس) وەك بەڕێوەبەری پەیمانگا. (مان ئەحمەد حەمید) وەك بەڕێوەبەری کارگێری. (نیهاد خالید ئەدهەم) وەك جێگری بەڕێوەبەری کارگێری. هاوپێچ نووسراوی ژمارە (٤).

*** دەست پێکردنی پەیمانگا بە خوێندن:**

سەرەتای کردنەوەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك بۆ وەرگرتنی فێرخواز ئاگاداری لەڕێی پۆستەرو کەناڵە راگەیاندنەکان و سەندیکای هونەرمەندانی کوردستان بڵاوکرایەوە و مەرجەکانی وەرگرتنی قوتابیش بۆ یەکەم ساڵ ئەستەم نەبوو. کردنەوەی پەیمانگاش بە دوو دەوام (شفت) بوو بەیانیان و ئێواران. فێرخوازانی بەیانیان تەمەنەکانیان جیاواز بوو لەگەڵ ئێواران. "سەرەتای دروست بوونی پەیمانگا بەتایبەتی بەشی موزیك، زۆر ساوابوو لەڕووی کەلوپەل و پێداویستییەکانی بەش، چ لە ئامێرو هۆڵ و چ لە کادری بەشەکان. بێجگە لەوەی دوو دەواممان هەبوو، دەوامی بەیانیان و ئێواران. کە دەوامی ئێواران تایبەت بوو بەو کەسانەی حەزیان هەبوو لە هونەری موزیك یا لەبەشەکانی ترو هونەری شێوەکاری و شانۆ. بەهرەمەند بوون و دەیانویست پەرە بدەن بە بەهرەکەیان، ئینجا زۆریان بە تەمەن بوون یا فەرمانبەر بوون"[١٢]. یەکەم ساڵ (١٠٥) فێرخواز وەرگیرا (٥٥) فێرخواز لە دەوامی بەیانیان بە هەر سێ بەشەکانییەوە. (٥٠) فێرخواز لە دەوامی ئێواران بە هەر سێ بەشەکانی شانۆو شێوەکارو مۆسیقا. دوای ئەوەی لە بەرواری (١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٤) لەلایەن هونەرمەند ئەحمەد سالارو بە ئامادەبوونی پارێزگاری کەرکوك[١٣] و نوێنەرانی چەند حیزب و لایەنێك کرایەوەو خوێندنی خۆی دەست پێدەکات. لەسەر سیستمی خوێندنی هەرێمی کوردستان. "دوای وەرگرتنی فێرخواز، هەڵبژاردنی ئامێر بەپێی ویستی فێرخواز بوو بەڵام بەپێی ئەو ئامێرانەی کە لە بەشی موزیك لەبەردەست بوون و دابین کرابوون کە تەنها یەك پیانۆو حەوت ئامێری کەمانچەو پێنج ئامێری عودو دوو چەلۆ بوو. هەندێ لە فێرخوازان گوێی مۆسیقیان باش بوو، بەڵام لەگەڵ ئەو فێرخوازانەی کە بەهرەمەند نەبوون زۆر ماندوو دەبووین"[١٤].

هەر لە سەرەتای دامەزراندنەوە دەست بەکارو چالاکی دەکەن و فێستیڤاڵێکی ساڵانە ئەنجام دەدەن. هەر بەشەو چالاکی خۆی نمایش دەکات. بڕیاردان لەسەر فێستیڤاڵێکی ساڵانە لە دووەم ساڵی دامەزراندنی پەیمانگاکەوە دراو بوو بە نەریتێکی ساڵانە. لە بەشی راگەیاندنیش کە دواتر ناوی گۆڕا بۆ بیستن و بینین. رۆژنامەیەکی گشتی مانگانەیان دەردەکرد بەناوی شێواز، سەرەتا تەنها بە زمانی کوردی بوو. پاشان بە هەردوو زمانی کوری و عەرەبی دەردەچوو. کە تەنها چوار ژمارەی لێ دەرچوو. ژمارەی (سفر)ی رۆژنامەکە لە کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥) دەرچوو. دەستەی بەڕێوەبردنی رۆژنامەکەش پێکهاتبوون لە خاوەنی ئیمتیاز دەستەی دامەزرێنەر. سەرنووسەر (عارف مەعروف)، جێگری سەرنووسەر (حەبیب ماڵەڵڵا)، بەڕێوەبەری نووسین (سعود ئەحمەد)، (سەردار رەشید زەنگەنە)، دەستەی نووسەران (جەلال قادر، عەدنان فازل، محەمەد عەدنان).

دەستەی بەڕێوەبردنی ژمارە (١)ی رۆژنامەکە کە لە شوباتی ساڵی (٢٠٠٦) دەرچوو بریتی بوون لە خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەر (عارف مەعرووف داوودی)، جێگری سەرنووسەر (حەبیب ماڵەڵڵا)، بەڕێوەبەری نووسین (سعود ئەحمەد)، (سەردار رەشید زەنگەنە)، دەستەی نووسەران (جەلال قادر، محەمەد عەدنان، سۆران مامە حەمە).

دەستەی بەڕێوەبردنی ژمارە (٢)ی رۆژنامەکە کە لە ئاداری ساڵی (٢٠٠٦) دەرچوو بریتی بوو لە خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەر (عارف مەعرووف داوودی)، جێگری سەرنووسەر (سعود ئەحمەد)، بەڕێوەبەری نووسین (عەبدولرەزاق محەمەد)، دەستەی نووسەران (رائید حازم، سۆران مامە حەمە).

دەستەی بەڕێوەبردنی ژمارەی (٣)ی رۆژنامەکە کە لە نیسانی ساڵی (٢٠٠٦) دەرچوو بریتی بوون لە خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەر (عارف مەعرووف داوودی)، جێگری سەرنووسەر (سعود ئەحمەد)، بەڕێوەبەری نووسین (عەبدولرەزاق محەمەد)، دەستەی نووسەران (رائید حازم، سۆران مامە حەمە).

*** ساختە بوونی بڕوانامە:**

لەگەڵ کردنەوەی پەیمانگا و وەرگرتنی فێرخوازی دەرچووی پۆلی سێی ناوەندی و شەشی دوا ناوەندی. (٤٥) بڕوانامەی ساختەی فێرخوازان ئاشکرا کرا.

بۆ وەرگرتنی فێرخوازی سێی ناوەندی و شەشی دواناوەندی جیاوازییەك هەبوو. کە دەرچووی سێی ناوەندی پێنج ساڵ لە پەیمانگا دەیخوێند و دەرچووی شەشی دواناوەندی تەنها دوو ساڵ دەیانخوێند. دوای دەستپێکردنی خوێندن و بەدواداچوون بۆ بڕوانامەکان. ٤٥ بڕوانامە لە فێرخوازانی قۆناغی یەکەم و دووەمی سەرەتای دامەزراندنی پەیمانگا ئاشکرا کرا. لە ساڵی یەکەم و قۆناغی یەکەم ١٨ بڕوانامەی ساختە ئاشکرا کرا. بۆ ساڵی دووەم (١٧) بڕوانامەی ساختە ئاشکرا کراو بەپێی یاساو رێسای پەیمانگا، بڕیاری

دەرکردن و بێبەشبوونی ئەو فێرخوازانە درا لە خوێندن.

*** لێسەندنەوەی مۆڵەت (الغاء وسحب الأجازة):**

سەرەتای پێدانی مۆڵەتی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، لەلایەن د. (سامی عەبدولمەهدی ئەلموزەفەر)[١٥] بەپێی ماددەی (٣٧) لەیاسای فێرکردنی ئەهلی و بیانی ژمارە (١) بۆ ساڵی (٢٠٠٤) لە بەرواری (٥)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٤)و سێ ساڵ بەردەوام بوون لەسەر خوێندن. لە ساڵی (٢٠٠٦) لەگەڵ تەواو بوونی کاتی پلەی وەزیری پەروەردەو نوێبوونەوەی وەزارەت لە بەغدا. بۆ تازەکردنەوەی مۆڵەتی ساڵانەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك. (د. خزەیر خوزاعی)[١٦] بە فەرمانێکی وزاری ژمارە (٢٧٥١) بەرواری (٢٧)ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٤). بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی کەرکوك. بریاری لێسەندنەوەی مۆڵەتی (پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك)ی دا. لە نووسراوەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێ بە گۆڕینی پەیمانگای ناوبراو بۆ پەیمانگایەکی فەرمی ئێواران لە بەرواری دەستپێکی خوێندنی ساڵانی (٢٠٠٦ - ٢٠٠٧)، دابینکردنی ئیدارە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتییەکەتان. ئەویش بەهۆی ئەوەی مۆڵەتی دامەزراندنی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك بە هەڵە درابوو. چونکە پەیمانگای هونەرە جوانەکان، بە پەیمانگایەکی پەروەردەیی مامۆستایان دادەنرێ، نەك پەیمانگایەکی ئەهلی. بەپێی یاسای ئامادەکردنی مامۆستایان (نظام اعداد المعلمين) ژمارە (٣٧) بۆ ساڵی (١٩٧٧)/ هاوپێچ نوسراوی (٥).

دوای ئاگادارکردنەوەی پەروەردەی کەرکوك بۆ لێسەندنەوەی مۆڵەتی پەیمانگاو بەڕێوەبردنی پەیمانگاکە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەرکوکەوە وەك پەیمانگایەکی پێگەیاندنی مامۆستایان. پەروەردەی کەرکوك بە نووسراوی ژمارە (١٢٠١٨) بەرواری (٩)ی تەموزی ساڵی (٢٠٠٨) ئاراستەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوکیان کرد. لەو بەروارەوە پەیمانگای هونەرە جوانەکان مۆڵەتی لێسەندرایەوە. بەڵام دەستەی دامەزرێنەر لەسەر ئەو بریارە کۆك نەبوون و بەردەوام بوون لەسەر خوێندن بەبێ مۆڵەت بۆ ماوەی دوو ساڵ لە بەرواری لێسەندنەوەی مۆڵەت. ئەمەش سەرجەم فێرخوازان و مامۆستایانی لە بەردەوامی و پەرەدان بەخوێندن تووشی ساردو سڕیەك کردبوو. لەگەڵ ئەوەش کۆڵیان نەداو هەر بەردەوام بوون.

*** پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بابا گورگور:**

بە فەرمانی وەزاری ژمارە (١٤١٨)، لە بەرواری (٢٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥)، لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پەروەردە. بریاردرا پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە کەرکوك، بەناوی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگور، بکرێتەوە.

بیرۆکەی دامەزراندنی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگور، دەگەرێتەوە بۆ:

لە سەردەمی رژێمی بەعس، فێرخوازی کورد لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا وەرنەدەگیرا. هەر لەبەر ئەوە لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراق. من وەك شانۆکارێك، لەگەڵ کۆمەڵێك هونەرمەندی شاری کەرکوك بیرۆکەی ئەوە بەخەیاڵماندا هات کە پەیمانگایەکی هونەرە جوانەکان لەکەرکوك بکەینەوە. راستە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك هەبوو؛ بەڵام ئەوان پەیمانگایەکی ئەهلی سەر بە بەغدا بوون. هەر بۆیە بیرۆکەی پەیمانگامان بۆ ناوەندی رێکخراوە دیموکراتییەکانی کەرکوك[١٧] پێشنیار کرد. ئەوانیش پێیان باش بووو بیرۆکەکەیان پێشنیاری ئەنجومەنی وەزیران ئیدارەی سلێمانی کرد. بیرۆکەکە پەسەند کراو منیان کرد بە بەڕێوەبەری ئەو پەیمانگایە[١٨].

پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگور، سەرەتا وا بریاردرا کە لە ناحیەی قەرەهەنجیر[١٩] دابمەزرێن. بەڵام دواتر لە بەر نەبوونی بیناو بە رەزامەندی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان، پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگور لە ئامادەیی ئازادی کوران دەستیان بە دەوامی فەرمی خۆیان کرد. کە دەوامی ئامادەیی ئازادی کوران سەر لەبەیانیان دەوامیان دەکردو هونەرە جوانەکانی باباگورگور سەر لە ئێواران.

دوای دابین کردنی بینا بۆ پەیمانگاکەو بڵاوکردنەوەی ئاگاداری لە ناو شاری کەرکوك کە پەیمانگایەکی هونەرەجوانەکانی حکومی سەر بە هەرێمی کوردستان لە کەرکوك کراوەتەوەو فێرخوازی بەهرەمەند پێدەگەیەنێت. دەستیان کرد بە وەرگرتنی فێرخوازانی پۆلی سێی ناوەندی لە شاری کەرکوك. کە یەکەم ساڵ (٣٤) فێرخوازیان بۆ هەردوو بەشی شێوەکاری و موزیك وەرگرت. لە (١٦)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٦) پەیمانگا دەستی بە خوێندنی خۆی کردو مانگانەش بۆ هەر فێرخوازێك بڕی (٣٠) هەزار دیناری عێراقی پێ دەدرا وەك یارمەتی (دەرماڵە).

لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگور زۆربەی زۆری ئامێرو کەرەستەو کەلوپەلی فێرخوازانی هەردوو بەش دابین کرابوو. "لە پەیمانگا تەنها کەموکوری جێگا هەبوو، بێجگە لە کەمی مامۆستاو مامۆستای شارەزا. هەروەها لیژنەی پەرەپێدان لە کەرکوك، وەك هاوکارییەك بۆ سەرەتای دامەزراندنی پەیمانگای باباگورگور. بە بڕی (١٥) ملیۆن کەلوپەل و کەرەستەی بۆ پەیمانگا کری"[٢٠].

بەڵام کێشەی هەرە گەورەی ئەم پەیمانگایە، نەبوونی جێ و رێی شیاو بوو بۆ فێرخوازان و مامۆستایان. هەروەها لەگەڵ چوونی فێرخوازان بۆ دەوام تێکەڵ بە قوتابیانی دەوامی ئامادەییەکە دەبوون تا دەوامی ئامادەییەکە کۆتایی دەهات. هەر بۆیە فێرخوازان بەردەوام دەستیان بە مانگرتن دەکرد بۆ دابینکردنی بینایەکی تایبەت بە پەیمانگای هونەرە جوانەکان. بەڵام سەرەرای نەبوونی جێگەی تایبەت سەرجەم فێرخوازان لە پرۆڤەو خوێندنی خۆیان کەمتەرخەم نەبوون و بەردەوام هەوڵی زیاتریان دەدا لە بواری هونەرەکەیان. بێجگە لەوەی بەردەوام هەوڵیان دەدا کە لەگەڵ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك یەك بگرنەوەو ببێت بە یەك پەیمانگای هونەرە جوانەکان و بۆ یەك ئامانج هەوڵ بدەن و پەرە بە

بەهرەکانیان بدەن دوور لە هەموو ئامانجێکی سیاسیو حیزبی.

*** بەشی چوارەم: یەکگرتنەوەی هەردوو پەیمانگا (کەرکوك)، (باباگورگور):**

دوای ئەوەی ماوەی سێ ساڵ، دوو پەیمانگای هونەرە جوانەکان لەشاری کەرکوك لە یەك کاتدا بوونی هەبوو. لەگەڵ لێسەندنەوەی مۆڵەتی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، پشێویەکی زۆر دروست بوو، کە فێرخوازانی پەیمانگاکە نارەزاییان دەربڕیو روویان لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگور دەکرد. لەهەمان کات هەبوونی دوو پەیمانگا لەنێو دانیشتوانی شاری کەرکوك جێی سەرسورمان بوو. لەگەڵ ئەوەی سەنگی بوونی پەیمانگا نەمابوو. چونکە کاتێ فێرخواز دەیویست لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان بخوێنێت، دەبوو بپرسێت ئاخۆ پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك یاخود باباگورگور باشترە!. هەر بۆیە بە مانگرتنی فێرخوازانی هەردوو پەیمانگا بەوەی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، مۆڵەتی نیەو پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگور بینای تایبەت بەخۆی نیە. بێجگە لە نارەزایی دەربڕینی مامۆستاو قوتابی پەیمانگا لە هەبوونی دوو پەیمانگا، دوای کۆمەڵێك گرفتو بەربەست توانرا هەردوو پەیمانگا یەك بگرنەوەو ببێت بە یەك پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە شاری کەرکوك. ئەویش بە فەرمانی وەزاری ژمارە (٢٧٨) لە بەرواری (١٢)ی ئابی ساڵی (٢٠٠٧) لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پەروەردە، بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەیمانگاکانو مەشق کردن. لەبەر بەرژەوەندی گشتی بڕیاردرا بە یەکگرتنەوەی هەردوو پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك. هەردوو پەیمانگا بکرێت بە یەك پەیمانگا، بەناوی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك. بەڕێز مامۆستا مستەفا حەمید عومەر زەنگەنە بە بەڕێوەبەری پەیمانگا بە تەکلیف بمێنێتەوە بە شێوەیەکی کاتی. بەڕێز چالاك سدیق حەسەن کە ئێستا یاریدەدەری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگورە دەکرێت بە جێگری بەڕێوەبەری پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوك. دوای تەواوبوونی ماوەکاتییەکە بەڕێز بەڕێوەبەر مامۆستا مستەفا حەمید، مامۆستا چالاك سدیق کەجێگری بەڕێوەبەرە دەکرێت بە بەڕێوەبەری پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك.

لەگەڵ یەکبوونی هەردوو ئیدارەی هەرێم، هەولێرو سلێمانی. بە فەرمانی وەزاری ژمارە (٥٥٢٨) لە بەرواری (١٩)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٩) لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان. وەزارەتی دارایی بۆ کاروباری داراییو ئابووری، هاتووە: ئاماژە بە نووسراوی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سەرۆکایەتی دیوان ژمارە (١٨٥٦) لە (١)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٩). دوا بەدوای نوسراومان ژمارە (١٣٣٤) لە (٢٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩)، بڕیارماندا بە یەکخستنی بودجەی هەردوو پەیمانگای هونەرە جوانەکانی باباگورگورو کەرکوکو دابین کردنی پارە لەیەك سەرچاوە بۆیانو لەو بودجەیەدا گشت خەرجیەکانیان بۆ دەکرێت.

لەگەڵ یەکبوونی هەردوو پەیمانگا، فێرخوازان توانیان زیاتر پەرە بە هونەرو بەهرە کانیان بدەنو تەنانەت مامۆستاکانیش لەو بێ ئومێدییەی نەبوونی مۆڵەت، ئومێدی هەوڵدان بۆ پێشکەوتنی هونەر لە پەیمانگا بدەنو فێرخوازی سەرکەوتوو پێ بگەیەنن. هەر بۆیە ساڵانە لەسەر فێستیڤاڵی خۆیانو چالاکی جۆراو جۆر بەردەوام دەبوون. فێرخوازەکانیش حەزی پێشکەوتنیان زیاتر بوو.

*** ژمارەی فێرخوازانی دەرچووی پە یمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك، بە پێی ساڵەکانی خوێندن:**

| ساڵی دەرچوو | خوێندنی بەیانیان | خوێندنی ئێواران | کۆ |
| --- | --- | --- | --- |
| ٢٠٠٧-٢٠٠٦ | ١ | ٣٨ | ٣٩ |
| ٢٠٠٨-٢٠٠٧ | - | - | - |
| ٢٠٠٩-٢٠٠٨ | ٤١ | ١٥ | ٥٦ |
| ٢٠١٠-٢٠٠٩ | ٥٩ | ١٣ | ٧٢ |
| ٢٠١١-٢٠١٠ | ٩١ | ٢٢ | ١١٣ |
| ٢٠١٢-٢٠١١ | ١١٧ | - | ١١٧ |
| ٢٠١٣-٢٠١٢ | ٧٠ | - | ٧٠ |


هەیکەلی ڕێکخستنی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوك
بەڕێوەبەر
شکر خلیفە محمد
بەشی کارگێری
کاوزان عدنان حسن/ ل. بەش
بەشی وەرزیش
سامال رفیق قادر
بەشی چالاکی هونەری
علی حسین اسماعیل
بەشی کاروباری قوتابیان
١ رۆناك عبد المجید محمد / ل. بەش
٢ صلاح الدین عبد الکریم رشید/ف. تۆمار
٣ نوزاد محمد رحیم/ف. بڕوانامەی دەرچوون
٤ نیگار حسن خورشید/ف. تۆمار
خەزێنە
١ حمید محمد رشید
٢ نرمین شمسی پاوخان
٣ قدریە اسماعیل رفیق
ژمێریاری
١ ئامانج عدنان محمود/ل. بەش
٢ بەهار ئازاد احمد/ ژمێریار موچە
٣ احمد معروف عبد/ خەزنەدار
٤ هاوکار محسن عبدالغنی/ ف. چاپ
گەنجینە/ کۆگا
١ احمد عبد الوهاب عبدالکریم
٢ پشکو کریم رحیم
کۆمپیوتەر
بینا
١ یوسف محمد زیاد
٢ نوزاد غیب الله اسماعیل
٣ عبدالواحد محمود محمد امین
٤ بارزان احمد حمید
بیناکان
١ احمد رفیق حسن
٢ اخلاص ناطق عزیز
بەشی شێوەکاری
١ علی احمد حمید /سەرۆك بەش
٢ پشتیوان عسکر محمد / بڕیاردەری بەش
بەشی شانۆ
١ طارق ناصح رحیم /سەرۆك بەش
٢ مریوان عبد الرحیم کریم / بڕیاردەری بەش
بەشی مۆزیك
١ فلاح هاشم جاسم /سەرۆك بەش
٢ عبد الرحمن فائق جلال / بڕیاردەری بەش

* سەرچاوە:-

چاوپێکەوتن لەگەڵ:

(نینۆس بینیامین ئیشایا)، لە بەرواری (١٠)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٤)، لە شاری کەرکوك.

(عارف مەعروف داوودی)، لە بەرواری (١٢ - ١٣)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٤)، لە شاری کەرکوك.

(شکور خەلیفە ساڵەیی)، بەرواری (٩)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٤)، لە شاری کەرکوك.

(چالاك سدیق)، لە بەرواری (٢٢)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٤)، لەرێی پەیوەندی تەلەفۆنی لە شاری کەرکوك.

١- یەکەم پەیمانگا بوو لە مێژووی شاری کەرکوك لە ساڵی ٢٠٠٤ دامەزرا.

٢- دووەم پەیمانگا لە مێژووی شاری کەرکوك لە ساڵی ٢٠٠٥ لەسەر ئیدارەی سلێمانی دامەزرا.

٣- بزووتنەوەیەکی سیاسی کوردییە لەباشووری کوردستان، ساڵی ١٩٤٦ دامەزراوە.

٤- پارتێکی سیاسی کوردییە لە باشووری کوردستان، ساڵی ١٩٤٦ دامەزراوە.

٥- ئازادکردنی عێراق لەدەستی رژێمی بەعس لەلایەن سوپای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هێزە هاوپەیمانەکانییەوە لە ٩/٤/٢٠٠٣.

٦- شوێنەوارێکی مێژوویی کۆنی شاری کەرکوکە.

٧- بارەگایەکی عەسکەری و زیندانی حیزبی بەعسی بووە، پێش پرۆسەی ئازادی عێراق ٢٠٠٣.

٨- کۆمەڵێك هونەرمەندی هونەرە جوانەکانی شاری کەرکوکن.

٩- وەزیری پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی هەولێر. ٢٠٠٤.

١٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ داوودی، (٢٠١٤).

١١- سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان. ٢٠٠٤.

١٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ (عەلی)، (٢٠١٤).

١٣- عەبدولرەحمان مستەفا پارێزگاری کەرکوك بوو، ٢٠٠٤.

١٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ (ئیشایا)، (٢٠١٤)

١٥- وەزیری پەروەردەی عێراق، ٢٠٠٤.

١٦- وەزیری پەروەردەی عێراق، ٢٠٠٦.

١٧- ئۆرگانێکی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە، سەرپەرشتی رێکخراوە چین و توێژەکانی ناو یەکێتی دەکات.

١٨- چاوپێکەوتن (ساڵەیی، ٢٠١٤)

١٩- ناحیەیەکی کورنشینە، دەکەوێتە خۆرهەڵاتی کەرکوك بە دووری ٢٠کم و ناوچەیەکی گەشتو گوزاریشە.

٢٠- چاوپێکەوتن (سدیق، ٢٠١٤).




**مامۆستایانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوک**



**پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوک**



پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوك





یەکێك لە ئاهەنگەکانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوك





قوتابیان و مامۆستایانی پەیمانگە



پرۆڤەی قوتابیان لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان



قوتابیانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوک



ئاهەنگی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوک





**نمایشەکانی شانۆ**



**ئاهەنگی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی کەرکوک**

## * کۆمەڵگە و قوتابخانە لە پە نجاکانی سەدەی ڕابردوودا لە کفری:-

شێخ محەمەد شاکەلی
وەرگێڕان:- توانا حەمەنووری

لە پاییزی ساڵی ١٩٤٩ لە خوێندنگە وەکو قوتابییەکی پۆلی یەکی سەرەتایی دایانام ، ماڵمان لە گوندی کەلار بوو (کە دواتر بوو بە قەزایەکی گەورە و لەم دوایەدا بووە ناوەندی ناوچەی گەرمیان) هەر لەوێش لەدایك بووم، لەو کاتەدا گوندێکی گەورە بوو و دەکەوتە دیوی ڕۆژهەڵاتی دەشتی شێروانە کە دەکەوێتە کەنارەکان و لە دووری سێ کیلۆمەتر بوو لە ڕووباری سیروان.

گوندەکە لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە ناحییەی (سەرقەڵا) ی سەر بە قەزای کفری بوو لە لیوای کەرکوك، ژمارەی



قوتابخانەی سەرەتایی کفری دەستەی مامۆستایانی سەرەتایی کفری لە ساڵی ١٩٣٧
دانیشتووەکان: بەهجەت فەتاح، حاجی حوسێن، ئیسماعیل حەقی
ڕاوەستاوەکان: مەجید نەدیم حەسەن عەباس خالید مستەفا

خانووەکانی زیاتر لە ١٠٠ ماڵ بوو و زۆربەی بە قوڕ دروستکرابوو و بنمیچەکەشی بە ڕەوڕەوی دار و قامیش بوو و بەچینێکی قوڕ داپۆشرابوو.

ئەم گوندە بەوە ناسرابوو کە دانیشتوانەکەی زۆر بوون و مزگەوت و خوێندنگەیەك و بنکەیەکی تەندروستی و بەداڵەی تەلەفۆن و بیرێکی قوڵ لەگەڵ مەزەخەیەك بۆ دەرهێنانی ئاوی خواردنەوەی تێدا بوو، هەروەك تایبەتمەندی ئەوەشی هەبوو کە باری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری پێشکەوتووبوو و جیاواز بوو لە گوندەکانی ناوچەکە پێشم وایە گرنگیدان بە گوندەکە و دابینکردنی خزمەتگوزاری لەلایەن حکومەتەوە بەهۆی هەوڵەکانی خوالێخۆشبوو داود جاف بوو، کە ئەندامی پەرلەمانی عێراق بوو بۆ چەند ساڵێك.

بینای خوێندنگەکە دەکەوتە لایەنی باکووری ڕۆژهەڵاتی گوندەکە و بەهەمان شێوەش بە قوڕ دروستکرابوو، بەڵام بە شێوەیەکی ئەندازەیی ڕێکوپێك بوو، پانتاییەکەی زیاتر لە هەزار مەتر چوارگۆشە بوو و گۆڕەپانێکی ناوخۆیی و ژووری ئیدارە و سەرئاوی لەخۆ گرتبوو، هۆڵی وەرزشەکەشی بە درێژی دە مەتر و پانییەکەشی پێنج مەتر بوو و دەرگای چوار پۆلیشی لەسەر دەکرایەوە.

لە سەرووی دەرگاکەی دەرەوە کە ڕووی لە قیبلە کردبوو، تابلۆیەکی ئاسنی تەختە سەوز هەبوو بە ڕەنگی سپی و بەخەتێکی جوان لەسەری نووسرابوو (مدرسە کلار الابتدائیە للبنین). بەڵام لە ڕاستیدا ئەو خوێندنگەیە تایبەت نەبوو بە کوڕان، بەڵکو نزیکەی پانزە کچی بەشداری خوێندنیان دەکرد لەگەڵماندا.

بە ڕێکی بیرم نایەت ژمارەی پۆلەکان چەند بوو، دڵنیاش نیم لەوەی کە پۆلی پێنج و شەشی هەبووبێت لەو کاتەدا، بەڵام چوار پۆلم دەبینی کە پڕبوون لە قوتابی و دواتریش دوو پۆلی دیکەی تێدا دروستکرا لەنێو بیناکە، بۆ ئەوەی قوتابیە تازەکان لەخۆبگرێت، هەمیشەش کاری بوژاندنەوە و بوونیاتنانەکان لە کاتی پشووی هاویندا ئەنجامدەدران.

خوێندنگەکە نزیکەی نیو کیلۆ مەتر یاخود نەختێك کەمتر دوور بوو لە ماڵمان، لەساڵی یەکەممدا نارەحەتیم دەکێشا بۆ گەیشتن پێی بە تایبەتی لە ڕۆژانی ساردی زستاندا و باران و قوڕاودا، لەو کاتانەدا هەمیشە کەسێك لە خانەوادەکەم یاخود یەکێك لە دراوسێکان هاوڕێیتیان دەکردم بۆ قوتابخانە، ئەگەر واش ڕێکبکەوتبا لە بەرهەر هۆکارێك پێشوەخت بگەیشتبام بە خوێندنگەکە و دەرگای خوێندنگە هێشتا نەکرابایەوە، ئەوە لەگەڵ هاوتەمەنەکانم یاریمان دەکرد، ئەمە ئەگەر کەشوهەوا باش بوایە، بەڵام لە ڕۆژانی سارد و باراندا، ڕوومدەکردە ماڵی خوالێخۆشبوو (حەمە عەلی کاك ئەحمەد) هاوڕێی باوکم بوو و ماڵیان بەرانبەر دەرگای خوێندنگەکەم بوو و چەند مەترێك لێوەی دوور بوو، لەبەردەم ئاگری چیلکەو چەواڵی نێو چاڵی ژوورەکەیاندا بە چوارمشقی دادەنیشتم و گوێم لە گفتوگۆی نێوان مام حەمەعەلی و پەریزاد خانی هاوسەری دەگرت، کە لەسەر چەند شتگەلێك دەدوان، لە هەمان کاتیشدا بەئاگابووم بۆ زەنگی خوێندنگەکەم کە مام ئەحمەد کارگوزاری خوێندنگەکەمان بوو لێدەدا و کاتی دەستپێکردنی دەوامی ڕادەگەیاند و بەراوەستان لە گۆڕەپانی خوێندنگەکە و ڕێوشوێنی پشکنینی خوێندنەوەی سروود دەستمان پێدەکرد، هەر کە گوێم لە زەنگی خوێندنگەکە بوایە بە پەلە دڕۆیشتم، تاکو نەکەومە بەر لێپرسینەوەی دواکەوتن، لە ڕۆژانی کەشوهەوای سامالدا وەستانی بەیانیان لە گۆڕەپانی ناوەوەی خوێندنگەکە دەستی پێدەکرد، لە ڕۆژانی سەرما و بارانیشدا لەهۆڵی سەرەکی دەوەستاین.

مامۆستای چاودێر فیکەیەکی ئاسنی بیرقداری هەبوو، هەندێکجاریش ڕادەستی کارگوزارەکەی دەکرد بۆ ئەوەی بۆ

دەستپێکردنی دەوامی بەیانیان بەکاری بێنێت، لەوکاتەدا شتێکی سەیر بوو بۆ ئێمە، خەونمان بەوەوە دەبینی کە ئێمەش دانەیەکی وامان هەبێت، یاخود هەر هیچ نەبێت دەستمان بەری بکەوێت یان ئێمەش فویەکی تێدا بکەین، ئەوەش ئامرازێك بوو بۆ ئاگادارکردنەوە و دیاریکردنی کاتی چوونە نێو پۆلەکان و دەرچوون لێی یاخود بانگهێشتکردنی بوو بۆ کۆبوونەوەی گشتی لە گۆرەپانەکە، دواتر ئەو فیکە ئاسنینە ئەفسانەیە گۆردرا بە پارچە ئاسنێك کە لەسەر دیواری بەرانبەر ژووری بەرێوەبردن هەڵواسرا، کارگوزارەکەش بەهەموو هێزێکییەوە لێی دەدا و لە ناوچەیەکی زۆر دوورەوە گوێبیستی دەنگی دەبووین.

لەماڵەوە گوێم لێیان بوو دەیانگووت کاتی چوونە خوێندنەگەم نزیکبووەتەوە، وەکو جۆرێك لە ترس و رارایی دایپۆشیبووم، چونکە بەردەوام دەمبیست کە خوێندنگە سیستمێکی سەختی هەیە و مامۆستاکان توندوتیژن، بەڵام ئەمرۆ وادەکەی هات و یەکێك لە کەسوکارەکەم لەگەڵ خۆی بردمی بۆ قوتابخانە و بەر لەوەی بچمە نێو پۆلەکەمەوە دڵراوکێ بە توندی گرتمی، بەڵام بەهەر حاڵ چوومە نێو پۆلەکەوە و دەنگی هاوار و هەراوهوریایەکی بەرز پۆلەکەی پرکردبوو، یەکێك لە بەردەم تەختەکە وەستابوو هاواری دەکرد و دەیگووت بێ دەنگ بن، چونکە ئێستا (ئەفەنی) واتا مامۆستا دێت، لە گۆشەکەدا وەستام و مامۆستا هات و قوتابیان هەستان و بەبێ دەنگی لە شوێنی خۆیان دانیشتنەوە.

مامۆستاکە ئاوڕی لێ دامەوە و خەندەیەکی کرد و وتی: وێدەچێت تۆ قوتابییە تازەکەی، بچۆ لەسەر ئەو تەختەیە دانیشە، بە زمانی کوردی قسەیکرد، کوردییەکی خراپ و خوارو خێچی دەزانی، بەڵام بەخۆرسك و بە بێ شەرم قسەی دەکرد و ئێمەش لێی تێدەگەیشتین. شێوەی گشتی و جلپۆشین و گوزارشتی رووخسارە هێمن و خەندەکەی و مامەڵەکردنی لەگەڵ ئێمەی منداڵدا زۆر خۆش بوو، هەموو ترس و دڵراوکێکەی لام رەواندەوە و ئارامی بۆ گەراندمەوە، پرسیاری ناو و تەمەنمانی کرد و جوڵەکردنی وەکو سەماکردن بوو، بەلەسەر خۆ گۆرانییەك یاخود سرودێکی بۆ وتین، دەنگێکی خۆش و شیرین بوو، ئاماژەی بۆ سەرەوە و خوارەوە دەکرد بەدەستی و لاقەکانی بە گونجاوی دەجوڵاند و داوای لێکردین بەدوای ئەوەوە گۆرانییەکە بڵێینەوە، دوای کۆتایی هاتن بە گۆرانییەکە و چەپڵەی قوتابییەکان، داوای لێکردین گۆرانییەك یان سروودێك یان هەرشتێك بێت بە دەنگێکی بەرز و روونەوە بڵێین، هەرگیز هەستمان بە بێ تاقەتی نەکرد، بەڵکو هەموومان هەستمان بە دڵخۆشی کرد و هەرچی ترس هەیە لەدڵمان دەرچوو، ئەوەش بەهۆی ئەو مامۆستا لێهاتووەوە بوو، دواتر زانیم ناوی (فیلیپ) بوو، ئێمەش بە (فیلیپ ئەفەنی) بانگمان دەکرد، کەسێکی مەسیحی خەڵکی کەرکوك بوو.

ژووری پۆلەکە بەدرێژی شەش مەتر و پانی پێنج مەتر بوو، دوو پەنجەرەی هەبوو لە دار دروستکرابوو، لەو دەلاقەیەوە کۆڵان و خانووەکانمان لێوە دیار بوو کە تاکو خواروی کۆڵانەکە دریژەیان کێشابوو. کەسانی راگوزەری خەڵکی گوند و ژنان و کچانمان دەبینی دەرۆشتن بۆ بەرزاییەکان بۆ کانی ئاوەکە. لە باکووری گوندەکە، بۆ ئەوەی ئاوی خواردنەوە بێنن. دەیانکردە نێو مەنجڵی تایبەتەوە، تەماشاکردنی ئەو راگوزەرانە لە شتە قەدەغەکراوەکان بوو لە کاتی خوێندندا. لە رێگەی چاودێری پۆلەکەوە دەلاقەکان دادەخران. تەنیا لەپێناو پاراستنی شووشەکەی چونکە لەو سەردەمەدا شتێکی گران و کەم بوو.

تەختەیەکی رەشیش لەبەردەممان هەڵواسرابوو، هەروەك لەو سەردەمەدا عادەتی دانانی وێنەی پادشا یاخود هەر بەرپرسێك نەبوو. دواتر لە دوای شۆرشی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ دانانی وێنەی سەرۆك و سەرکردەکان لە خوێندنگەکاندا دەستی پێکرد.

تەختەکەش لەساڵی جارێك یاخود دووجار بە بۆیەکی رەشی تایبەت بۆیە دەکرا و پارچەیەکی لباد بەکاردەهێنرا بۆ سرینەوە، لەگەڵ کۆمەڵێك تەباشیر کە مامۆستا لەکاتی هاتنی بۆ پۆل لەگەڵ خۆی دەیهێنا، تەباشیری رەنگاورەنگیش



کۆمەڵێك مامۆستای کفری و کەلار لە ساڵی ١٩٥٥ لە دێی کەلار
فەتاح جاف، خەسرەو جاف، وەهبی ئاقسو، د.حەسەن جاف

شتێکی دەگمەن بوو، هەندێك لە مامۆستاکان لەشارەوە دەیانهێنا و بۆ هاندان قوتابیان لەسەر رەفتار و گرنگی و زیرەکی پارچەیەکی پێ دەدرا، قوتابییەکەش هەڵیدەگرت و نیشانی هاورێ و کەسوکارەکەی دەدا و شانازی پێوە دەکرد، ژووری پۆلەکان هەمیشە دوو بۆ سێ ریز رەحلەی تێدا بوو، لەبنەرەتدا بۆ دانیشتنی دوو خوێندکار تەرخانکرابوو، بەڵام بەهۆی زۆری ژمارەی خوێندکارانەوە سێ خوێندکار لەسەری دادەنیشت، هەربەهۆی زۆری جوڵەکردنمان و بازدان بەسەریانەوە، ئەو رەحلانە بەین و بەین پێویستی بەچاککردنەوە دەبوو، زۆرجاریش دارتاشێکیان دەهێنا و رەحلە تێکشکاوەکانی دەردەهێنایە گۆرەپانەکە و بۆچەند کاتژمێرێك بەردەوام دەبوو لەچاککردنیان و دواتر دەیگەراندەوە بۆ پۆلەکان، هەردوا بەدوای ئەوەش بەرێوەبەر و کارگوزاری خوێندنگەکە دەستیان بە هەرەشە و بەڵێندان بە سزای قورسی ئەو کەسانەی کە بەسەر رەحلەکانەوە خۆیان

هەڵدەدەن یاخود زیان بە ڕەحلەکان دەگەیەنن.

هەندێك جاریش بەهۆی ژمارەی قوتابییەکانەوە شوێنی دانیشتن دەستنەدەکەوت و قوتابی وا هەبوو لەسەر زەوییەکە دادەنیشت، لەباشترین حاڵەتەکانیشدا لبادێکیان دەهێنا و لەسەری دادەنیشت یاخود هەر ڕاخەرێك بوایە، هەرگیز هەستمان بە شەرم و بێتاقەتیش نەدەکرد لەوەی لەسەر زەوییەکە دابنیشین، تاکو بەڕێوەبەرەکە کورسییەك یاخود ڕەحلەیەکی پەیدا دەکرد، یاخود هەرشتێك بێت بە کورسی بچێت، ئەوکات قوتابییەکە لەسەر زەوییەکە بەجێ دەهێشت و لەسەر کورسییەکە یاخود ڕەحلەکە دادەنیشت. زەوی پۆل و هۆڵەکە و گۆڕەپانی پێشەوە هەموو گڵ بوو، زۆر جاریش لەدوای دووەم وانەوە تەپوتۆزی لێوە بەرزدەبووەوە، بەتایبەتی لەکاتی گەرمای هاوین، مام ئەحمەدی کارگوزاریش هاوسەرەکەی یاریدەیدەدا لەپاککردنەوەی خوێندنگەگە و ئەو شوێنانەشیان ئاوەڕشێن دەکرد بۆ ئەوەی کەشەکە شێدار بکەن و تەپوتۆزەکە دامرکێنن.

وەکو ڕێزێك بە (ئەفەنی) بانگهێشتی مامۆستاکانمان دەکرد، ئەم وشەی (ئەفەنی)یەش، ڕێك بەدوای ناوەکەیەوە دەهات وەکو (قاسم ئەفەنی و بەشیر ئەفەنی و خورشید ئەفەنی)، ئەو وشەیەش وشەیەکی تورکییە، واتای (بەڕێز) دەبەخشێت. پێم وایە لەوکاتەدا هەرکەسێك چاکەت و پانتۆڵێکی لەبەربکردایە، بە ئەفەنیمان لەقەڵەم دەدا.

مامۆستاکان هەمیشە بەرگی ڕەسمییان لەبەردەکرد لەکاتی دەوامدا، جلوبەرگەکانیشیان بریتی بوو لە چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباغ و پێڵاو و گۆرەوی گونجاو لەگەڵ جلەکانیان، هەمیشەش گرنگی بە دیمەن و ڕێکپۆشییان دەدا، لە بنەڕەتدا خەڵکی شارە گەورەکان بوون هاوشێوەی شاری کەرکوك و موسڵ و بەغدا و هەندێك جاریش هەولێر و سلێمانی، هەر وەك لە پێکهاتەکانی کورد و عەرەب و تورکمان و مەسیحی بوون، دواتر چەند مامۆستایەکمان بۆ هات لە ناوەندی قەزای کفری و ناحییەی قەرەتەپە و خوورماتوو.

(مدیریه المعاریف) واتا بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە، بارەگاکەی لەناوەندی لیوای کەرکوك بوو، مەرجەعی سەرەکی هەموو پرسی پەروەردیی و فێرکاری لیواکە بوو لە پارێزگاکە، هەر لەوێوە سەرپەرشتی کاروباری ئیداری و دابینکردنی دامەزراندن و پێداویستییەکانی خوێندن و بینای قوتابخانەکان و موچەی مامۆستایان و کارمەندانی دەکرد، کۆی گشتی موچەی مامۆستای تازە دامەزراو لە سەرەتای پەنجاکان لە بیست دینار زیاتر نەبوو و موچەی کارمەندانیش (کارگوزار و پاسەوانی قوتابخانە) لە دە دینار زیاتر نەبوو.

جاروباریش مامۆستایەکی تازە دامەزراو دەردەکەوت، یاخود بەهەر هۆکارێك بوایە دەگوازرایەوە، دەرکەوتنی ئەو مامۆستایەش دەبووە ڕووداوێکی گرنگ و لەنێوان خۆماندا باسمان دەکرد و باسی سیفات و زمان و جلوبەرگ و شێوازی مامەڵەکردنەکەیمان دەکرد، دواتر بابەتەکەمان لەبیردەکرد و قسەمان لەشتگەلێك دەکرد کە لەو گرنگتر بوو.

لەماوەی شەش ساڵی خوێندنم لە قوتابخانەی



دەستەی فێرکاری قوتابخانەی (گوز)ی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٤٧-١٩٤٨ ڕاوەستاوەکە لە چەپەوە: بەهجەت فەتاح وەندی

سەرەتایی، زۆربەی مامۆستاکان کەسانی بە وەفا و جدیی بوون، بەشێوەیەکی مرۆییانە و دادپەروەرانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین، هەرچەندە سزای جەستەی لەو کاتەدا کاری پێدەکرا، زۆر لە داری بەڕێوەبەرەکە و لەشەپازلەی مامۆستا دەترساین.

بەشێکی کەمی مامۆستا و بەڕێوەبەرەکان توندوتیژ بوون لە سزادانی قوتابیان، لە هەندێك حاڵەتی دیاریکراویشدا کاریگەری خراپی لەسەر قوتابی بەجێدەهێشت، قوتابی هەبوو بەهۆیەوە دەستبەرداری خوێندن دەبوو، هەندێکیش هەبوون بێ باك بوون لە سزا و بەردەوام بوون لە هاری هاریکردن، بەڵام بەشێك لە مامۆستاکان بە سۆزەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین، و چاوپۆشیان لە هەڵەکانمان دەکرد و بەیەکسانی مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین، کوڕی هەژار و دەوڵەمەند و شەڕانگێز و لاواز وەکو یەك بوون لەلایان، قوتابی زیرەك و پابەند بە دەوامەوە پاداشت دەکرا، خوێندکاری لاوازیش سزا دەدرا. هەرگیز نەمبیست و نەمبینی کەسوکاری خوێندکارێك یاخود کەسێك دەستوەربداتە کاروباری قوتابخانەوە یان سکاڵا بکات لەسەر سزادانی منداڵەکانیان کە لەبەر تێکدانی سیستم و کەمتەرخەمی لە بەجێهێنانی ئەرکەکانیان سزادەدران. هەندێکجاریش کەسوکارەکانمان سەردانی قوتابخانەیان دەکرد و لەبەرچاوی ئێمەدا بەمامۆستاکانیان دەگووت لە قوتابخانەدا منداڵەکانمان منداڵی ئێوەن و ئێمەش قایلین بەوەی پەروەردەیان بکەن و بەپێی سیستمی خوێندن فێریان بکەن، زۆرێك لە مامۆستاکانیش بەپێی بۆچوونی کەسوکارەکانمان بوون و ڕێزی یەکدیان دەگرت.

هەندێك قوتابی هەبوون لەدەوام هەڵدەهاتن، لەبەر چەند هۆکارێکی جیاواز، کاتێك ئەو کارە دووبارە دەبووەوە بە بێ ئاگاداری ئیدارە و دوای خوێندنەوەی ناوی ئامادەبووان و ئامادەنەبووان لەسەرەتای دەوامدا مام ئەحمەدی کارگوزار دەچوو لە کۆڵانەکان و لەماڵەکاندا بەدوای هەڵهاتواندا دەگەڕا و بە تاکو و بەکۆ دەیانگەڕاندەوە، هەندێکیشان لەگەڵ باوکی

یان لەگەڵ دراوسێیکیان دەهاتەوە تاکو لەلای بەڕێوەبەرەکە شەفاعەتیان بۆ بخوازن، لەدوای ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەسەر هەڵهاتنی قوتابییەکە، کارگوزارەکە قوتابییە هەڵهاتووەکە پاڵدەنایە نێو پۆلەکەوە و قوتابییەکانیش دەیانکرد بە پێکەنین لەسەری. دەنگی مامۆستاکەش بەرز دەبووەوە بۆ ئەوەی بێدەنگیان بکات و بەردەوام دەبوو لە وانەوتنەوەکەی، ئەم دیمەنە چەندجارێك لەهەفتەیەکدا دووبارە دەبووەوە، زۆرێك لەو قوتابیانەی کە هەڵدەهاتن گرنگیان بەخوێندن نەدەدا و خوێندنەکەیان فەرامۆش دەکرد، لەکۆتاییشدا دەستبەرداری خوێندن دەبوون.

مامۆستاکانیش لەیەکێك لە ژووره چۆڵەکانی نێو بنکە تەندروستییەکەدا نیشتەجێ دەبوون کە لە قایە و گەج دروستکرابوو، چونکە ژمارەیەك ژووری تێدابوو، یاخود لەیەکێك لە ژوورەکانی ئیدارەی قوتابخانەکە بەشێوەیەکی کاتی تێدا نیشتەجێ دەبوون، بەڵام کاتێك هەندێك مامۆستا بەخێزانەوە هاتن، دوو خانوویان بۆ دروستکرا، یەکێکیان بەڕێوەبەرەکەی تێدا نیشتەجێ بوو، ئەوەی دیکەشیان مامۆستایەك بوو کە هاوسەرگیری کردبوو، دوای ماوەیەکیش خانووەیەکی دیکەش دروستکرا بۆ ئەو مامۆستا سەڵتەکان، پێشم وایە دروستکردنی ئەو خانوانە و چاککردنەوە و دروستکردنی ژووری دیکە بۆ قوتابخانەکە لەلایەن ئیدارەی ناوخۆی قەزاکەوە بە هەماهەنگی لەگەڵ (مديرية مەعاریف) لە کەرکوك دەکرا، لەگەڵ بەشداریکردنێکی چالاکی پیاوماقوڵان و کەسە خاوەن دەرامەتەکانی گوندەکە.

سەرەڕای ئەوەی ئێمە پێشبینی زیاد لە پێویستمان بۆ توانا بێ سنوورەکانی بەڕێوەبەر و مامۆستا هەبوو و لێیان دەترساین، بەڵام ئەوانیش لە کەسێکی تر دەترسان، کە ئەویش (موفەتیش) پشکێنەر بوو، ئەم ناوە بەر لە گەیشتنی بۆ لامان و دوای ڕۆشتنیشی ناوی زۆر دەوترایەوە، ئەو خاوەن دەسەڵات و توانایەکی ناسراو بوو لامان، چونکە لە بەڕێوەبەری قوتابخانە و مامۆستاکان و مام ئەحمەدی کارگوزار گەورەتر بوو، لە ساڵێکدا جارێك بۆ دووجار دەردەکەوت، بە ئۆتۆمبێلێکی کرێگیراوەوە دەهات، زۆرجاریش ئۆتۆمبێلە ڕەشەکەی (وەستا ئەحمەد) بوو، جۆری (ئۆستن).

دیمەنی ئەم شۆفێرەش جێی سەرنج بوو، ئەویش (ئەفەنی) بوو، چونکە چاکەت و پانتۆڵی لەبەردەکرد و (سیدار) کڵاوێکی لەسەر دەکرد و بە زمانی تورکمانی لەگەڵ مامۆستاکان قسەی دەکرد، بەر لە هاتن و لەکاتی گەیشتنی پشکێنەر کەشێکی ئاڵۆز و چاودێر قوتابخانەکەی دادەپۆشی و ئامادەکاری خێرا بۆ پاککردنەوەی پۆلەکان و هۆڵەکەو گۆڕەپانەکە و سڕینەوەی دەلاقەکان و ئاگادارکردنەوەی قوتابیان بەوەی بە جلێکی ڕێکپۆش و پاکەوە بێن بۆ قوتابخانە و پابەندی بێ دەنگی و سیستم بن لەکاتی وانەکاندا.

ئامادەبوونی پشکێنەرەکە و چوونە نێو پۆلکان و قسەکرنی لەگەڵ خوێندکارە زیرەکەکان بۆ دەرخستنی زیرەکییەکەیان هەلێك بوو بۆیان، تاوەکو دواتر لەلایەن مامۆستاکانەوە ستایش بکرێن و بەڕێوەبەرەکەش پاداشتی دەکرد و لە ڕۆژی دواتردا خوێندکاران چەپڵەیان بۆ لێدەدا. لەگەڵ ئەو دلخۆشییە گەورەیەی کە هەستیان پێدەکرد کاتێك دەگەڕانەوە بۆ ماڵ و ڕووداوەکانیان دەگێڕایەوە و هەندێك زیادڕەویشیان تێدا دەکرد. لەپشکێنەرەکان کە تاکو ئەمڕۆش شێوە و ناوەکانیانم بیر دێت:

١- فاتح مستەفا، خەڵکی کەرکوك بوو

٢- عوسمان قوجە قەساب، خەڵکی هەولێر بوو.

هەندێك لە قوتابییەکانی پێش من باسی ئەوەیان بۆ کردم کە سیاسەتمەداری ناسراوی کورد (ڕەفیق حلمی) سەردانی قوتابخانەکەمانی کردووە، وەکو پشکێنەرێك یاخود وەکو بەڕێوەبەری (مەعاریف اللواء) لە ساڵانی پێش ئەوەی من بچمە قوتابخانە.

هەموو قوتابییەکان توانای بەردەوامبوونیان نەبوو لە درێژەدان بە خوێندنەکەیان، لەبەر چەند هۆکارێکی جیاواز، چونکە کەسوکاری ئەو قوتابیانە پێیان باشتر بوو کوڕەکانیان کار بکەن لە کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ، هەروەك باری خراپی داراییش بەشێوەیەکی گشتی بۆ ئەو سەردەمە قورس بوو بۆ دابینکردنی جلوبەرگ و پێداویستییەکانی تر،



یانەی فەرمانبەران لە کفری لە سەرەتای پەنجاکاندا کۆمەڵێك مامۆستای قەزاکە لەگەڵ کەسایەتییە کۆمەڵایەتییەکان



دانیشتووەکان لە ڕاستەوە حەسەن عەباس ڕەزا، مستەفا ئیبراهیم، وەستاوەکان لە ڕاستەوە: زەینەولعابدین قەدۆ، محەمەد حەسەن کوس، خالید سەعید فەقێ، بەهجەت بەدری، دەستەی مامۆستایانی قوتابخانەی کفری سەرەتایی لە ساڵی ١٩٤٩-١٩٥٠

هاوکات خەڵکیش بەپێی پێویست هوشیار نەبوون لەوەی بە پێویستی بزانن منداڵەکانیان فێرە خوێندن بکەن، مەسەلەی مانەوەی منداڵ بە شێوەیەکی (ئوممی) نەخوێندەوار گرنگ نەبوو لەلای هەندێك کەس، هەندێکجاریش کە نامەی یەکێك لە سەربازەکانی خەڵکی گوندەکەوە دەهات، لەلایەن کەسێکی ترەوە بۆیان دەنووسرا کە خوێندەواری و نووسینی باشی هەبێت، ئەو نامەیەش لەدەستێکەوە بۆ دەستێکی دەڕۆشت تاکو دەگەیشتە دەست کەسێکی خوێندەوار لە گوندە و بۆیان دەخوێندەوە، لەو کاتەشدا خوێندەوار کەم بوو.

لەکاتی دەوامی قوتابخانەدا ئێمە هەمان ئەو جلانەمان لەبەردەکرد کە لەدەرەوەی قوتابخانە لەبەرمان دەکرد، تەنیا لە هەندێك حاڵەتی دەگمەن نەبێت کە دزداشە و چاکەتێکمان لەبەردەکرد، سەبارەت بە پێڵاویش بەهەمان شێوە دەگمەن بوو و بەختەوەر ئەو کەسە بوو کە جووتێکی دەستکەوتبایە و بۆ ماوەی یەك ساڵی تەواو لە پێی دەکرد، هەروەك ئەوەی دەست دەکەوت بەپێی پێوانە و جۆری پێویست نەبوو وەکو ئەوەی لەمڕۆدا هەیە، چەند کەسێکی کەم پێڵاویان دروستدەکرد ئەوانیش لەناوەندی قەزا و لیواکە بوون و دروستکردنی پێڵاوێکیش بەپێی داواکاری بوو، کات و سەفەرێکی دەویست و نرخەکانیشی زۆر گران بوو.

بە بیرم دێت سەردانی ئەو تەنیا پینەدۆزەم دەکرد کە پێڵاوی چاکدەکرد و دەکەوتە باشووری گوندەکە و چاوەڕێی نۆرەی خۆم دەکرد تاکو پێڵاوە شڕودڕەکەم بۆ چاك بکاتەوە و هیوای ئەوەم هەبوو لە کۆتایی ساڵدا دەربچم و جووتێك پێڵاوی تازەم بۆ بکرن بەپێی بەڵێنی کەسوکارەکەم، زۆربەمان بەبێ گۆرەوی پێڵاوی دەستکردی ناوخۆییمان لەپێدەکرد، تەنیا ئەو کاتانە نەبێت کە زستان بوو و کەشوهەوا سارد دەبوو.

پاکوتەمیسی جلوبەرك و جەستەمان جێی بایەخ و گرنگی دان بوو لە قوتابخانە و لە ڕاوەستانی بەیانیانی قوتابخانە، مامۆستای چاودێر پشکنینی ووردی بۆ دەست و پێ و نینۆك و پرچمان دەکرد، دەبوایە هەر قوتابییەکیش دەستەسرێکی پێی بێت و نیشانی مامۆستاکەی دەدا کە دەستەسرەکەی پاکە، ئەوانەشی کە پێشێلکارییان دەکرد، لەسەرەتادا ئامۆژگاری دەکران و دواتر لەپۆل دەردەکران و لۆمەدەکران لەبەردەم هەمووان و بەڵێننامەیەکی زارەکیشیان لێ وەردەگیرا بەوەی پابەندی ڕێنماییەکان بن، بەڵام ئەگەر کارەکە دووبارە ببوایەوە ئەوە سزای جەستەیی دەدران لەلایەن مامۆستا و چاودێر و بەڕێوەبەرەوە.

جیاوازی لەنێوان ئەو منداڵانە بەدی دەکرا کە لە قوتابخانە دەیانخوێند بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی نەیاندەتوانی بخوێنن، قوتابیانی قوتابخانەکە پاکوخاوێن بوون و جلوبەرگیان پاك و نینۆك کورت و پرچیان کورت، بە پێچەوانەی منداڵانی دەرەوەی قوتابخانە کە دیمەنیان جیاواز بوو.

جاروباریش لەسەر داواکاری بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکەوە سەرەتاشێك لە ناوەندی قەزاوە دەهێنرا، لەدەرەوەی دیواری خوێندنگەکە شوێنی بۆ تەرخان دەکرا و خوێندکارانیش سەرەیەکی درێژیان دەگرت بۆ ئەوەی سەریان سفرتاش بکەن.

قوتابییەکانیش هەمیشە لەسەر کورسی یاخود تەنەکەیەك یان کۆمەڵە خشتێك یان هەر شتێك بێت کە بەرزی بکاتەوە دادەنیشت، بۆ ئەوەی دەستی سەرەتاشەکە بگاتە سەری، بەمەش سەرەتاشەکە دەستی دەکرد بە کارەکەی و هەموو قوتابییەکانی بە ئامێرێك تەراش دەکرد، پێیان دەگووت مەکینە، هەروەك لەماوەی چەند چرکەیەکدا کۆتایی لەسەرچاککردنی قوتابییەك دەهێنا و پارەیەکی کەمیشی وەردەگرت و بانگی قوتابییەکی دیکەی دەکرد، بۆ بەیانییەکەی کە دەگەڕاینەوە بۆ قوتابخانە بەیەکدی پێدەکەنین چونکە شێوەمان گۆڕابوو لەدوای ئەو سەرچاککردنە زۆرملێیە،

هەموومان ڕقمان لەو سەرچاککردنە بوو، هەندێکیشمان لەو ڕۆژەدا نەدەهاتن بۆ قوتابخانە، کە ئەگەر پێش وەخت بەوەمان بزانیبایە کە سەرەتاشەکە دێت، هەرچەندە ئەوەش دادی ئێمە نەدەدا، چونکە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکەوە ناچار دەکراین سەرمان چاك بکەین، بۆیە ناچار بەدوای کەسێکدا بگەڕێن و دەپاڕاینەوە بۆ ئەوەی هەندێك سەرمان چاك بکات، بەتایبەتی لەو کەسانەی کە هەندێك زانیارییان لەبارەی سەرچاککردنەوە هەبوو، چونکە سەرەتاشەکە دەگەڕایەوە بۆ شار و چاوەڕێی هەڵهاتوانی نەدەکرد، بۆیە ناچاربووین دەستبەرداری ئەو هەڵهاتنە ببین لە ڕۆژانی هاتنی سەرەتاشەکە.

سەرجەم قوتابییەکان تاکو کۆتایی قۆناغی سەرەتای بەردەوام نەدەبوون لە خوێندن، دەتوانم بڵێین تەنیا ٥٪یان دەمانەوە و دەچوونە تاقیکردنەوەکانی شەشی سەرەتاییەوە و بەردەوام دەبوون بۆ قۆناغی ناوەندی، زۆربەشیان لەبەر چەند هۆکارێکی جیاواز وازیان لە خوێندن دەهێنا، سەرەڕای ئەوەی هەندێك بەهۆی سزادانەوە دەستبەرداری خوێندن دەبوون، بەڵام هەندێکیان هەبوون ئارەزووی خوێندنیان هەبوو و بەهۆی خراپی باری دارایی و پێویستی کارکردن بۆ هاوکاری کەسوکاریان ناچار دەبوون واز لە خوێندن بێنن، هەروەك کەمی هۆشیاری و درککردن بە پێویستی خوێندن لای خەڵکیش هۆکارێکی دیکە بوو کە خەلك بەردەوام نەبێت لە خوێندن.

لەڕاستیدا ئەگەر کەسێك لەو سەردەمەدا خوێندەواری و نووسینی بزانیبایە، زۆر گرنگ نەبوو، ڕاستە کەسی خوێندنەوار هەستی بە تایبەتمەندێتی خۆی دەکرد، بەڵام چەندین گەنج هەبوو بەشێوەیەکی ئاسایی ژیانیان دەگوزەراند و خوێندەواریشیان نەبوو و هەستیشیان بە کەموکوڕی نەدەکرد، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کات هۆشیاری لای خەڵك زیادی کرد و وای لێهات کەسی نەخوێندەوار بەهۆی پێشکەوتنی سروشتی ژیان هەستی بە تاڵی دەکرد و لۆمەی کەسوکاری دەکرد کە لەکاتی خۆیدا ڕێگەیان پێنەداوە بخوێنێت.

لێرەدا پێویستە باسی ئەوە بکەم کە زۆربەی ئەو خوێندکارانەی کە گەیشتنە پۆلی چوار و پێنج و شەشی سەرەتایی، لەدوای ئەوەوە درێژەیان بە خوێندنەکەیان نەدا، هەروەك سوودی باشیشیان لەو ماوەیە وەرگرت کە لە قوتابخانە بوون چونکە فێری خوێندەواری و نووسین بوون، ئەوانیش جیاوازبوون لەو کەسانەی کە هەرگیز نەیانخوێندبوو، ئەوەش لە ڕووی مامەڵەکردن و بەجێهێنانی کارەکانیان لە شار و فەرمانگە حکومییەکان، زۆرێك لەوانەش لە قوتابخانەی شەوان درێژەیان بەخوێندن دا، یاخود لە هەندێك دامەزراوەی حکومەت دامەزران، تەنانەت ئەوانەی خزمەتی سەربازیشیان کرد، سوودیان لەو خوێندەوارییە وەرگرت. هەر وەك لیستێك لەکۆتایی ئەم توێژینەوەدایە، ناوی ئەو بەڕێزانەی تێدایە کە لەقۆناغیی سەرەتایی خوێندوویانە و بەهۆکاری جیاوازەوە نەیانتوانیوە درێژە بە خوێندنیان بدەن، بەڵام بە باشی فێری خوێندنەوە و نووسین بوون و ڕۆڵیان بینیوە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە ناوچەکە.

خوێندن لە قۆناغی ناوەندی، قورس بوو بەتایبەتی بۆ دانیشتووانی گوندە دوورەکان، چونکە خوێندنگەی ناوەندی تێدا نەبوو تەنیا لە ناوەندی قەزا و لیوا نەبێت، لەو کاتەشدا بەشە ناوخۆییەکان نەبوو لە قەزاکان، بۆیە سەرپەرشتیاری خوێندکار ئەگەر بیویستبایە، کوڕەکەی درێژە بە خوێندن بدات، دەبوایە کاری بۆ دابینکردنی شوێنی نیشتەجێ بوون و جلوبەرگ و پێداویستییەکانی تر بکردایە و خەرجیەکیشی بۆ هاتوچۆی نێوان گوند و شار تەرخان بکردایە.

هەندێك لە خوێندکاران دەچوونە لای خزم و کەسوکارەکانیان لەشار ئەگەر هەیانبوایە، هەندێکیشیان ژوورێکیان لەیەکێك لە ماڵەکان بەکرێ دەگرت، زۆرجاریش بەدوو کەس یان زیاتر



تیپی تۆپی پێی ناوەندی کفری لە ساڵی ١٩٥٢ لە ڕاستەوە: سەلاح حەسەن قەرەداغی، عەبدولقادر سبیلچی، فایەق ئەحمەد، غالیب عەبدوڵڵا، فایەق عەزیز، جەلال سالح، ئەحمەد مەحموود عەتار، عومەر ئەحمەد، فاروق حەکیم،سەلمان قادر براخۆر، سەلاح عەلی میرئاخور.



جێگری پەرلەمانی عێراق لە ساڵی ١٩٥٣ لە ناوەڕاستەوە داود جاف لە ڕاستەوە مۆفەق شەفیق بەڕێوەبەری ناوەندی كفری لە چەپەوە مستەفا ئیبراهیم عەبدولقادر سبیلچی، محەمەد قەدۆ، بەهجەت فەتاح

بەشدارییان لە ژوورێك دەكرد.

ئەو خێزانانەی كە كوڕەكانیان بۆ خوێندن دەنارد، دەبوایە دەستی بەخەرجییەكانی ترەوە بگرتایە تاكو بتوانن پارە بۆ خوێندنی كوڕەكەیان دابین بكەن و بەردەوام بن لە خوێندن، هەندێك لەو خێزانانەش سەختیان دەكێشا لە ڕووی دارایەوە، بەڵام هۆشیاری و دركردن و ئیرادەی بەرزیان هەبوو، بەشێوەیەك دەبووە هاندەر بۆیان تاكو قوربانی بدەن، هەندێك خێزانیش هەبوو باری داراییان باش بوو، بەڵام هۆشیارییان نەبوو و قەناعەتیشیان بەو خوێندنە نەبوو.

دواتر بە شێوەیەكی پلەبەندی دۆخەكە گۆڕا لە كۆتایی پەنجاكاندا، كاتێك حكومەتی دەستیكرد بەگرنگی دان بە چارەسەركردنی دۆخی قوتابیانی گوندەكان، هەروەك بەشە ناوخۆییەكان لە قەزاكان كرایەوە و سیستمی خواردن لە قوتابخانە سەرەتاییەكان تازەكرایەوە و دەست بە دابەشكردنی قەڵەم و دەفتەر كرا و هەندێكجاریش جلوبەرگ و پێڵاویان بەبێ بەرانبەر دابەشدەكرد، لەگەڵ هەندێك هاوكاری دارایی كەم.

هەندێك لە قوتابیانی گوندەكان بەتایبەتی ئەوانەی خوێندنیان لە قوتابخانەی كەلار تەواوكرد، درێژەیان بە خوێندنیان دا لە قۆناغی ناوەندی و دواناوەندی لە شارە نزیكەكان، هەندێكیشیان توانیان بچنە كۆلێژەكانی زانكۆی بەغدا یاخود پەیمانگا سەربازییەكان هەندێكیشیان لەدەرەوەی وڵات بوون بە پزیشك و ئەندازیار و مامۆستا و ئەفسەر، لێرەشدا ناوی هەندێكیان بیر دەهێنینەوە:

١- سەردار داوود جاف، سەرەتایی لە كەلار خوێندوە لە چلەكان، دواتر ڕووی كردە شار و خوێندنی باڵای لە حقوق تەواوكرد.

٢- عەلی عەبدولرەحمان جاف، خوێندنی زانكۆی لە كۆلیژی پزیشكی بەغداد تەواوكرد.

٣- عوسمان مەلا مستەفا، دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانە لە كۆتایی پەنجاكان لە كەركوك.

٤- قادر ڕەزا جاف، خوێندنی زانكۆی لە كۆلێژی زانست بە پلەی نایاب تەواوكرد.

٥- حەسەن عەلی بەگ، دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانە لە كەركوك لە كۆتایی پەنجاكان.

٦- بەڕێزان، دارا داوود جاف، پەروین ڕەزا، حەسەن مەحمود عەلی كەلاری، ئەمجەد محەمەد شاكەلی، فەرهاد شاكەلی، خەسرەو محەمەد سەعید جاف، خورشید داود جاف، سەرتیپ شەوكەت جاف، مەعرووف محەمەد غەریب، جەمال عەبدولقادر محەمەد، عەبدوڵا شێخ ئەنوەر، سرووت داوود جاف، د. حەسەن كەریم جاف، نەبەرد محەمەد سەعید جاف، هەموویان لەسەرەتادا لە كەلار خوێندویانە و دواتر چوونە شوێنی تر بۆ تەواوكردنی خوێندنیان، بێگومان ناوی دیكەش هەن، لێرەدا تۆمارنەكرا، بەهۆی ئەوەی زانیارییان لەبارەوە دەستەبەر نەبووە.

بەڵام سەبارەت بەو خوێندكارانەی كە نیشتەجێی ناوەندی قەزا و لیوا بوون، كێشەی نیشتەجێبوون و گواستنەوە لە خوێندنی سەرەتاییەوە بۆ ناوەندییان نەبوو، ئەو خوێندكارانەشی كە دەرچوون و چوونە پەیمانگا و زانكۆكان ژمارەیان زیاتر بوو لە خوێندكارانی گوند، كێشەی خوێندكارانی شار لەدوای دەرچوونیان لە ئامادەیی دەستی پێدەكرد، كاتێك دەچوونە پەیمانگا و زانكۆكانی بەغدا و كەركوك و لیوا كانی تر.

ئەوەی تێبینی دەكەین هەندێك لە مامۆستا و كارمەندانی دەوڵەت بە گشتی لەو ماوەیەدا دانیشتوانی شار بوون، چونكە خوێندن تێدا ئاسانتر و بەردەوام بوو، بە بەراورد لەگەڵ خوێندكارانی گوند كە كەمتر بوو، گرنگیدانی دەوڵەتیش بە پلەی یەكەم بۆ شارەكان بوو و گوندەكانیش

لە پلەی دووەمدا بوون، بۆیە جیاوازییەکی گەورە هەبوو لەنێوان ئاستی ژیانی شار و گوند لە هەموو رووەکانەوە.

*** خولەکانی (نەهێشتنی نەخوێندەواری) لە پەنجاکان:-**

لە چوارچێوەی بەرنامەکانی (مەعاریف) پەروەردە، کارکردن بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی خوێندەواری لەنێوان خەڵکدا، بۆ منداڵ لەدوای تەمەنی شەش بۆ حەوت ساڵان، چارەسەرەکەش لەوەدا بوو، کردنەوەی قوتابخانەکان زیاد بکات و هانی خەڵك بدات بۆ ئەوەی منداڵەکانیان بنێرن بۆ قوتابخانە، ئەم بەرنامانە بوونیان هەبوو، لەساڵانی سییەکانەوە جێبەجێدەکرا، بەڵام ژمارەیەك لە خەڵك ئەوانەی تەمەنیان گەورە بوو، بەهیچ شێوەیەك خوێندەواریان نەبوو و ژمارەی نەخوێندەوار لەم وڵاتەدا زۆر بەرز بوو.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەش، بڕیاردرا خولی ئێوارن بکرێتەوە بۆ فێرکردنی نەخوێندەوارەکان لە گوند و قەزا و شارە گەورەکاندا. ئەم خولانەش ناونرا خولی (نەهێشتنی نەخوێندەوار) سەبارەت بە نەخوێندەوارەکانی گوندەکانی گەرمیان و شارەکانی، ئەم خولانەش لەهەمان بینایانە دەکرا کە بەرۆژ خوێندنگەی منداڵان بوو لە گوند و ناحییەکان، دەوامەکانیش بە زۆر نەبوو، بەڵکو بەپێی ئارەزوو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا پێشوازی کردن لێی لەسەرەتادا لەسەرووی مامناوەندەوە بوو، چونکە خەڵك ئارەزووی خوێندنیان هەبوو و پێویستیشیان پێی بوو بۆ ئاسانکاریکردن لە ژیانی رۆژانەیاندا.

دەوام بە شەوان بوو و زۆربەی قوتابخانەکانیش بێ رووناکی و کارەبا بوو، بۆیە مامۆستاکان فانۆسی نەوتیان بەدەستەوە دەگرت و دەچوونە نێو پۆلەکانەوە، ئێمەی خوێندکارانی رۆژیش دەچووین سەیری چۆنییەتی خوێندنی ئەو پیاوە گەورانەمان دەکرد کە لە پۆلەکانی ئێمەدا و لەسەر رەحلەی ئێمە دادەنیشتن، تاکو بزانین چۆن فێردەکرێن و مامۆستاکان چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن و هەمیشە شتێکی تایبەتمان دەستدەکەوت تاکو لەگەڵ هاوپۆلەکانماندا باسی بکەین.

دەوامی ئێواران لەدوای رۆژئاوابوون دەستی پێدەکرد، بەشداربووانیش لە تەمەنی جیاوازبوون، لە تەمەنی پانزە ساڵییەوە دەستی پێدەکرد تاکو پەنجا ساڵی، ئەو فێرخوازانەش تاکو وەرگرتنی بڕوانامەی سەرەتایی بەردەوام دەبوون، هەندێکیشیان دوای ماوەیەك وازیان دەهێنا، بەشێکیشیان تاکو فێربوونی هەندێك خوێندەواری بەردەوام دەبوون.

مامۆستایانی قوتابخانەی رۆژ هەمان ئەو مامۆستایانە بوون کە لە خولەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری وانەیان دەگووتەوە، لەبەرانبەریشدا پارەیەکی دیاریکراویان لە بەڕێوەبەرایەتی (مەعاریف) وەردەگرت، بۆ ماندووبوونیان.

پۆلەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری کاریگەری هەبوو لەسەر کەمکردنەوەی نەخوێندەوارەکان، هەرچەندە کاریگەرییەکەشی سنووردار بوو.

دواتر شێوازەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری پەرەی پێدرا و بوو بە (خوێندنی ئەهلی ئێواران)، بە تایبەتی لە شارە گەورەکان، کە قوتابخانەی ئێواران کرایەوە بۆ سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی، هەروەك لەلایەن وەزارەتی (مەعاریف) ەوە دانی پێدا دەنرا، ئەوانەی کە هەلی خوێندنی رۆژیان بۆ نەڕەخسابوو لە سەرەتای تەمەنیان بەهۆی کارکردن و سەرقاڵبوونیان بە ئەرکی دیکەوە و پێشکەوتنی تەمەنیان، لەوێ دەوامیان دەکرد.

ئەم خوێندنە ئەهلی ئێوارانە، بڕوانامەی دەبەخشی بە دەرچووانی، بەشێوەیەك ژمارەیەکی زۆریان سوودیان لە بڕوانامەکانیان وەرگرت و لە فەرمانگەکانی دەوڵەت دامەزران و هەلیشیان بۆ رەخسا کە خوێندنی باڵایان تەواو بکەن.



قوتابخانەی سەرەتایی کفری سەرەتای پەنجاکان دووەم لەلای چەپەوە: مەجید نەجم عەبدولقادر

*خوێندنی ئایینیی:-

مزگەوتێکی کۆن لە گوندی کەلار دروستکرا لە سەرەتایی سەدەی رابردوو، هەندێك لە بە تەمەنەکانی خەڵکی گوندەکە دەڵێن، مزگەوتێکی دی هەبوو بەر لەم مزگەوتە ئەوە یەکەم مزگەوت بوو.

مزگەوتەکەش دەکەوتە ناوەراستی گوندەکە و هۆڵێکی گەورەی لەخۆ گرتبوو بۆ نوێژکردنی، نزیکەی جێی سەد کەسی تێدا دەبووەوە، میحرابێکیشی هەبوو بە ئاراستەی قیبلە، وەکو چاڵێك بوو لە دیوی باشووری، بەدرێژایی هۆڵەکە بەرەو رۆژئاوا، ژوورێکیشی تێدا دروستکرا پێی دەوترا (حوجرە) تایبەت بوو بە خوێندکارە ئایینییەکان، لەبەردەم هۆڵەکەش شوێنێکی کراوە هەبوو لەسەر دیوی باکوور لای گۆرەپانی ناوەوەی مزگەوتەکە، گۆرەپانەکەش شوێنێکی تایبەت بوو بۆ ئەنجامدانی نوێژی مەغریب لە رۆژانی هاویندا، بە حەسیر فەرشکرابوو، هەروەك حەوزێکیشی هەبوو بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن و خۆششتن، ئاو لە کانییەکەوە دەچووە نێویەوە کە لە باکووری گوندەکەوە دەهات و دەچووە نێو مزگەوتەوە و لێوە دەردەچوو بۆ باشووری گوندەکە، لەوێشدا هەندێك داری توو هەبوو لەگەڵ هەندێك گوڵەباخ، لە رێگەی جۆگەکەوە ئاودەدران، دواتر بیرێکی قوڵ هەڵکەندرا بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگیرێت لەکاتی برانی ئاودا کە بەهەر هۆکارێك بێت بڕێت.



مەلا محەمەد سەعید موفتی ١٨٥٨-١٩٤١



مەلا مستەفا عەلی محەمەد ١٨٩٧-١٩٦٩

بینای مزگەوتەکە هاوشێوەی بینای خانووەکانی گوندەکە بە قوڕ دروستکرابوو، بەڵام تایبەتمەندی ئەوەی هەبوو کە داری رەورەوەکەی بە داری پتەو دروستکرابوو لە بنمیچ و پیلیکانەکە کە لێوە بانگواز دەچووە سەرەوە و بانگی دەدا.

بە خوێندکارانی زانستی ئایینی دەوترا (فەقێ) ئەوەی لە وشەیەکی عەرەبیەوە هاتوە کە پێی دەڵێن (فقیە)، هەمیشە ژمارەیان پانزە یان هەندێك زیاتر دەبوو، تەمەنیشیان لە دە ساڵیەوە تاکو بیست ساڵ دەبوون، هەروەك پلە و پایەیان هەبوو لە بواری خوێندنی ئایینی، ئەوەی سەرەتابوو پێی دەوترا (سوختە) ئەوەشی دەگەیشتە قۆناغی ناوەند پێی دەوترا (فەقێ) ئەوەشی دەگەیشتە قۆناغەکانی کۆتایی پێی دەوترا (ئامادە) ئەمەیان دوایینیان وانەی لە نەحو و سەرف و نویخوازی و حەدیس و شیکاری و لۆژیك و رەوشتکردن وەردەگرت، هەمووانیش لای مەلا وانەیان وەردەگرت، کە کەسێکی خاوەن پلەیەکی باڵایە لە زانستەکانی ئایینی و خۆی و هاوشێوەکانی پێیان دەگووت (دوانزە عیلم)، هەمیشەش مەلا ئیمام و وتارخوێنی مزگەوت دەبوو و چەندین ساڵ ئەزموونی وتنەوەی وانە و ئیمامی هەبوو.

خوێندکارەکانیش گەرۆك بوون، هەمیشە لە شوێنێکدا جێگیر نەدەبوون، لە مزگەوتێکدا یاخود گوندێکی دیاریکراو، بەڵکو یەکەمجار دەگەران بەدوای مامۆستای باش، دووەمیش بەدوای شوێن و پێویستییەکی باش بۆ ژیان دەگەڕان.

لە شوێنگەلێکی جیاوازەوە دەهاتن و بەهیچ شێوەیەك هاوکاریان نەدەکران لەلایەن حکومەتەوە یاخود هەر دەزگایەکی ڕەسمی یان نیمچە ڕەسمی، بەڵکو بەتەواوەتی پشتیان بەخۆیان و قەناعەتەکەیان دەبەست، لەگەڵ هەندێك هاوکاری کەسانی تر، وەکو ئەوەی خەڵکی گوندەکان خواردنیان پێدەدا، یاخود دووان یان سیان لە منداڵەکان (سوختە) ئەرکی (ڕاتبە)یان دەگرتە ئەستۆ، کە بریتییە لە کۆکردنەوەی خواردن لە ماڵەکانی گوندەکە لە هەموو ئێوارەیەکدا، خەڵکیش بە سینگێکی فراوانەوە وەکو ئەرکێکی ئایینی و کلتورێکی کۆمەڵایەتی خواردنیان پێ دەدان.

لە وەرزی بەهاریشدا خاوەن مەڕوماڵاتەکان، هەندێك کەرە و ڕۆنی ساغیان دەدا بەو خوێندکارانە، بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرن بۆ چێشتلێنان، یاخود دەیانفرۆشت بە خاوەن دوکانەکان و بە پارەکەی، پێداویستییەکانی خۆیانیان دەکری.

سەرەڕای قورسی ژیان و ململانێی خوێندکارانی زانستە ئایینییەکان، بەڵام ئەوان ناسرابوون بە بەشوشی و ڕێکی جلوبەرگ و پاکوخاوێنی و ڕەوشت بەرزی و جوانی مامەڵەکردنیان لەگەڵ کەسانی تر و نێوان خۆیان، هەمیشە جێی ڕێز و خۆشەویستی و چاودێری خەڵك بوون، هەروەها بە هەڵگری قورئان لەقەڵەم دەدران، ئەمەش تایبەتمەندییەکی



مەلا حەمە نەجیب ١٩٣٢ - ١٩٩٦

مەعنەوی تایبەتی پێیان بەخشیبوو.

زۆربەیان ئەوانە گرنگیان بە نووسین دەدا و خاوەن خەت و نووسینی جوان بوون و قامیشیان بەکاردەهێنا لەگەڵ مەرەکەبی کۆن بۆ نووسینی ئایەتە قورئانییەکان و دێڕی شیعر، ڕەکابەریشیان دەکرد بۆ بردنەوە لە جواننووسی، تەنانەت ئەگەر (نەسخ بوایە یان ڕوقعە یان کووفی، یان شکستە-فارسی)، هەبوو تێیاندا لێهاتوو دەبوون لەم بوارەدا.

زۆربەیان خوێندەواری و نووسینیان هەبوو بە زمانی کوردی، هەبوون دەیان دێرە شیعری شاعیرە ناسراوەکانیان لەبەرکردبوو، هاشێوەی نالی و مەولەوی و مەحوی و وەفایی و ئەوانی تریش، هەندێکیشیان شیعریان دەنووسی و چەندین شاعیر و ئەدیبی ناسراویان لێ هەڵکەوت.

منیش لەدوای دەرچوونم لە پۆلی سێ بۆ چوار لە پشووی هاویندا بەشداری لە بازنەیەکی خوێندنی ئایینی کرد، هەر بەپێی شێوازە باوەکە، خوێندکارەکان بە کۆمەڵ دادەنیشتن لە سەر حەسیرێکی ڕاخراو لە هۆڵی پێشەوەی هۆڵە سەرەکییەکە، خوێندکارەکان بە خری دادەنیشتن، مەلاکەش یاخود یاریدەدەرەکەی لەسەر فەرشێك یاخود لبادێك دادەنیشت، و دەستی بە بیسمیلا دەکرد و دواتر دێر و ووشەکانی دەگووتەوە کە لە قورئاندا هەیە و لەبەردەستماندایە، کە (جزو عمە)یە و ئێمەش بەبێ پەنابردن بە سەبورە و تەباشیر لەدوای دەمانگووتەوە، سەرەتاش بە وتنەوەی پیتەکان دەستمان پێدەکرد و چۆنییەتی پێکهێنانی



مەلا سەید عەبدوڵڵا سەید محەمەد ١٩١٧ -١٩٨٦

دێر و وشەکان، پەنجەمان دەخستە سەر ئەو ئایەتەی کە دەبێت لەبەر بکرێت، مەلاکەش بەردەوام دەبوو لە وتنەوە و ڕێکخستنی، لەدوای ئەوەی دڵنیا دەبوو لەوەی کە فێربووینە، ئەو ڕۆژە کۆتایی بە وانەکان دەهێنا و ئیزنی پێ دەداین تاکو بڕۆین.

خوالێخۆشبوو (مەلا مستەفا عەلی) ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتەکە وانەی بە خوێندکارە پێشکەوتوەکان دەگووتەوە، بەڵام ئێمە فێری بنەماکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزی دەکردین، مەلا نەجیب-یش یاریدەدەری بوو، کە لەوەدا بوو خوێندنە ئایینییەکەی تەواو بکات و ببێتە مەلا، گەنجێکی ڕۆح سووك بوو، سەرسام بووین بە شێوازە خۆشەکەی لە وتنەوەی وانەکاندا.

لەکاتی پشوودا شتی بۆ دەخوێندینەوە و تەنانەت لەکاتی وتنەوەی وانەکانیشدا بە دەنگە خۆشەکەی شیعری بۆ دەخوێندینەوە، لەو شیعرانەش (هۆنراوەی بەردییە و سیاچەمانە و هەوارمی)، ئەم مەلایە فێری خۆشەویستی شیعر و ئەدەبی کوردی ڕەسەنی کردین. لەژمارەیەك هاوڕێی سەرەتاییمەوە فێری خوێندنەوەی بەشەکانی (عەمە) و (تەبارەك) و (قد سمع الله من القران الكريم) بوم لەو ساڵەدا و چیتر بەشداریم لەو بازنە خوێندنە نەکرد، بەڵام بەشداریکردنم لەو ماوە کورتە و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خوێندکاران و ئەو شێوازە تایبەتەی خوێندن، کاریگەری ئیجابی لەسەرم بەجێهێشت لە پێکهێنانی ڕۆشنبیرێتی و پەیوەندی باشم لەگەڵ ئەدەب و شیعردا، پێشم وایە خوێندنی ئایینی لە (حوجرە) بەردی بناغەی پێکهێنان و باشترکردنی کلتوور و ڕۆشنبیری بوو لە کوردستان لە سەردەمە کۆنەکانیشەوە.

لەوانەیە زۆرێك لە خوێندەوارانی ئەمرۆ بەوە نەزانن کە زۆربەی ئەدیب و نووسەر و شاعیرە ناسراوەکانی کورد، لە دەرچووانی خوێندنگە ئایینییەکانن، لێرەشدا ناوی بەشێکیان دەهێنم:

هەژاری موکریانی، عەلائەدین سەجادی، هێمن موکریانی، عەبدولکەریم مودەڕیس، گۆران، پیرەمێرد، حەسەن قزلجی، مامۆستا قانع، جەمیل ڕۆژبەیانی، شکور مستەفا، و چەندانی تریش.

هەروەك شاعیرە کلاسیکییە کوردە ناسراوەکان بە هەمان شێوە دەرچووی خوێندنگە ئایینییەکانن (حوجرە) و لێرەشدا ناوی بەشێکیان دەهێنینەوە:

ئەحمەدی خانی، مەلای جزیری، حاجی قادری کۆیی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، مەولەویی، نالی، بێسارانی، مەحوی، سالم، کوردی، و چەندانی تریش.

لە ڕاستیدا دەرچووانی خوێندنگە ئایینییەکان کەسانی بڕوادار بوون و هەندێکیان ناسراون بەوەی لەخوا ترس بوونە، بەڵام بە گشتی دوور بوون لە توندڕەوی و بڕوایان بە لێبوردەیی هەبووە و دژایەتی توندوتیژیان دەکرد لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا، ئەوان هەمیشە هەڵگری پەیامی ئاشتی و تەبایی و ئاشتەوایی بوون لە چارەسەرکردنی کێشەکان، مەجلیسەکانیان پڕ بوو لە قسەی خۆش و هەمیشە خاوەن دەنگخۆشەکان ئامادەی دەبوون و کراوەش بوون بۆ ژیانێکی میانڕەو، بەبێ توندوتیژی.

*** خوێندنی تێکەڵاو ـ زمان، ژیانی کۆمەڵایەتی:-**

خوێندنی سەرەتایی لە گوندی کەلار تێکەڵ بوو، چەندین کچ بەشدارییان لەگەڵ کردین لە خوێندن تاکو کۆتایی قۆناغی سەرەتایی، یەکێکیشیان ناوی (پەروین ڕەزا جاف) لە سەرەتایی شەستەکان زانکۆی تەواوکرد.

ئامادەبوونی کچان لە قوتابخانە و خوێندن و چالاکییەکانی قوتابخانە کارێکی ئاسایی بوو، دەکرا کچێك و کوڕێك لەسەر یەك ڕەحلە دابنیشن، ڕەکابەری یەکدیان دەکرد لە وێنەکێشان و وەرزش و وانەکانی دی، هەروەك شەڕکردنی دەستەویەخە لەگەڵ کوڕاندا کارێکی ئاسایی بوو. هەرچەندە ئەم کرانەوەیە تەنیا لە چوارچێوەی قوتابخانەی کەلاردا بوو، لە قۆناغەکانی ناوەندی قەزای کفری یاخود لە قۆناغی ئامادەیی ئەوەم بەدی نەکرد.

پێویستە لێرەشدا باسی هەندێك لەسەرۆکی جافەکان بکەم کە لە گوندی کەلار بوون لەو سەردەمەدا ڕۆڵیان هەبوو لە ناردنی کچەکانیان بۆ خوێندن و کەسانی دیاربوون لەو بوارەدا.

خوێندنی سەرەتایی بە زمانی عەرەبی بوو، زۆربەی مامۆستاکانیش زمانی کوردیان نەدەزانی، هەرچەندە هەوڵیشیان دەدا و هەموو ڕێوشوێنێکیان دەگرتە ئەستۆ بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی مادەکانمان فێربکەن، وانەکانیش بریتی بوو لە (ئەلف و بێ، بیرکار و قورئان و ئاین، ئینشا و تەندروستی و جوگرافیا و مێژوو و وەرزش و سروود)، هەروەك لەپۆلی پێنجی سەرەتایی دەستمان بە خوێندنی ئینگلیزی دەکرد.

مەسەلەی زمان کێشەی بۆ ئێمەی خوێندکار و مامۆستایان دروستدەکرد، ئەوەش یەکێك بوو لە هۆکارەکانی دوورکەوتنەوەی بەشێك لە خوێندکاران لە خوێندن بەر لەوەی قۆناغی سەرەتایی تەواو بکەن.

بە تێپەڕبوونی کات مامۆستایان شتێك فێری کوردی بوون و ئێمەش شتێك فێری عەرەبی بووین، هەر بەپێی پێویستیمان کە بتوانین کێشەی زمانەکەی پێ تێپەڕێنین، مامۆستاکانیش کەسانێك بوون هەستیان بە بەرپرسیارێتی دەکرد و لێهاتوو بوون لە ئەدای کارەکانیان و لە تێدەگەیشتن لەو سەختییەی کە دەمانکێشا و هەموو هەوڵێکیان دەدا بۆ سەرکەوتن بەسەر کێشەکاندا، دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵە بە ڕێز و پێزانینێکی زۆرەوە بە هەوڵ و ماندوبوونیان دەزانم کە فێربوونمان دەیاندا.

خوێندی سەرەتاییم لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٤ تەواوکرد و قۆناغێکی تایبەتی منداڵیم بە بەختەوەری تێپەڕاند. هێشتا زۆر شتی ئەوکاتم بە وردی بیردێت لە بارەی خوێندن و دەوروبەری گوند و ماڵەکەمان، هەروەها سەیرانەکانی قوتابخانە لە وەرزی بەهار و یاریکردن و گۆرانی وتن و هاتنی مەلیك فەیسەلی دووەم بۆ ناوچەکەمان، لەگەڵ مامۆستاکانمان چووین بۆ پێشوازیکردن لە مەلیکی عێراق لە نزیك قەڵای شێروانە و کەژاوە سادەکەی مەلیك فەیسەل لەگەڵ عەبدوئیلاهی خاڵۆی کە سێ ئۆتۆمبێلیان پێی بوو لەناوەڕاستی قەرەباڵغییەکەدا دابەزی، ئەو هەموو خەڵکە چەندین چەکداریان تێدا بوو ئەویش بە بێ هیچ ترس و دوو دڵی و پاسەوانێکەوە بوو.

هەروەك چرکەساتە خۆشەکانم وەرگرتنی نمرەکانم بیر دێت کە دەردەچووم بۆ پۆلێکی بەرزتر دەچووم، هەروەها ڕاکردنی خێرا بۆ گەیاندنی هەواڵی خۆش بە ماڵەوە، هەموو ئەو وردە کێشە بێ بەهایانەم بیردێت لە ناو و دەرەوەی پۆل و سکاڵاکردن لەلای مامۆستا و ئاشتبوونەوەمان، لەنێو ئەو هەموو خۆشەویستی و ڕاستگۆیە گەورەیەی نێو خەڵك لە مامەڵەکردن، دانیشتن بە بێ دەنگی لە نزیك دەرگاکە لەکاتی هاتنی میوان و گوێگرتن لەقسەی گەورەکان چیرۆکە خۆشەکانی دایکم کە شەوانە بۆی دەگووتین و دانیشتنی دەورووبەری زۆپاکە لە زستاندا، ڕۆیشتن لەگەڵ باوکم بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیری و یاری ئەسپسواری و نیشان شکاندن بە چەك و سەیرانەکان لەگەڵ دایکوباوکم و ئامادەبوونم لە مەجلیسی کەسانی بەناوبانگ وەکو بەڕێز حوسێن خانەقا و مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس لە تەکییەی تاڵەبانی.

هەروەها یەکەمجارم بوو چووم بۆ سلێمانی و دواتر هەورامان و پێشوازیکردنمان لەلایەن حەزرەتی شێخ عوسمان نەقشبەندی و ژمارەیەکی گەورەی مەلاکان و خوێندکارانی زانستی ئایینی لە (خانەقای بیارە) هەروەها یەکەم گەشتم بە شەمەندەفەر لە وێستگەی ئاسکی کفری بۆ بەغدا بە شەوان و گەیشتنمان بە بەیانییەکەیدا بۆ پایتەختە قەرەباڵغەکە، هەموو شتێکم لەبەرچاو تازە بوو و چووینە ماڵی عەلائەدین سەجادی لە مزگەوتێکی بچووك لە حەیدەر خانە و سەردانیکردنم بۆ مەرقەدی شێخ عەبدولقادر گەیلانی و ئیمام موسا کازم و سەرسامبوونم بە پردەکانی سەر ڕووباری دیجلە و باڵندەکانی نەورەس و بازاڕی شۆڕیجە و کۆڵانە بچووکەکانی و شتومەکە جۆراوجۆرەکان، پرسیارەکانیشم هەرگیز کۆتایی نەدەهات لەبارەی شتە تازەکانەوە کە یەکەم جار بوو لە ژیانمدا دەمبینین لە بەغدا.

*** ژیان لە شار- قۆناغی ناوەندی لە خوێندنگە:-**

گواستنەوە لە قۆناغێکی خوێندن بۆ قۆناغێکی تر و لە جۆرێکی دیاریکراو لە ژیان بۆ جۆرێکی دی جیاواز و نوێ کارێکی ئاسان نەبوو، کە گواستنەوەیەك بوو لە ناوەراستی ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەکی دی جیاواز، بەراوردکاری و جیاوازییەکان لەنێوان گوند و شاری ئەو سەردەمە زۆر گەورە و فراوان بوو، گونجاندن و ژیان سەبارەت بەوانەی کە تازە لە گوندەوە دەهاتن بۆ شار ئەگەر بۆ خوێندن بوایە یاخود غەیرە خوێندن قورس بوو.

ناوەندی قەزای (شاری کفری) شارێك بە واتای وشە و بەپێی پێوەری ئەو سەردەمە، هەندێك لە شەقامەکانی قیرتاوکرابوون و ستوونی کارەبای هەبوو و شەوانە شەقام و کۆڵان و چایخانەکان و قەیسەرییەکە رووناك بوون و پڕی لە خەڵك بوو، دووکان و جوڵەی خەڵك و دەنگی بەرزی فرۆشیارەکان و پیاوانی پۆلیس و کرێکارانی شارەوانی و ئەفەنی و بارهەڵگرەکان و کەسانی سەرقاڵ و نا سەرقاڵ هەمووی لە دەرەوە بوون بە شەوان، خەڵکانێکی زۆر لە بازاڕ و مزگەوت و گۆرەپانەکان بوون، خانوو و بیناکان بە بەرد و گەچ دروستکرابوون، پەنجەرەی گەورە و پەردەی رەنگاورەنگیان هەبوون، دەنگی فرۆشیارە دەستگێڕەکان و مەعمیلی چایخانەکان لەو ناوە بوون، بۆ چەندین سەعات دادەنیشتن، بە بێ کار خەریکی قسە و چایخواردنەوە و کێشانی نێرگەلە



عەبدولقادر محەمەد عەلی ١٩٢٠-١٩٥٩



خالید محەمەد سەعید موفتی ١٩١٩-١٩٧٦

و یاری دۆمینە و تاوڵە بوون، زمانی قسەکردن و جلوبەرگ و شێوازی مامەڵەکردنی جوانیان هەبوو، خوێندکارانی خوێندنگەکان جلوبەرگی پاکوخاوێنیان لەبەردەکرد.

ژنانی شار بەعەبای رەش و پێچەوە لەسەر رووخساریان بوو، هەرگیز لەو دیمەنەم لە گوند نەدەبینی، دەنگی گۆرانی لەباخچەکانی دەورووبەرەوە بەرز دەبووەوە، مەقامی کوردییان لێ دەدا وەکو (قەتار و ئەڵا وەیسی و قۆریاتی تورکمانی) هەروەك لاسایی مەقامی عێراقییان دەکردەوە هاوشێوەی محەمەد گوبانچی و یوسف عومەر و غەزالی و دەنگیان خۆش بوو، دوو قوتابخانەی سەرەتایی بۆ کوران و دانەیەك بۆ کچان، لەگەڵ ناوەندییەکی تێکەڵاو، جیهانێکی تازە و سەیر بوو، بەم شێوەیە شاری کفریم بینی لە سەرەتای پەنجاکان کە کەوتبووە سەر چیای باباشاسوار.

بینای خوێندنگە ناوەندییەکە دەکەوتە باشووری رۆژئاوای شارەکە لەسەر رێگەی کەرکوك، بینایەکی نوێ بوو لە بەرد و گەچ و چیمەنتۆ دروستکرابوو، نزیکەی زیاتر لە هەزار مەتری گرتبووەوە، ژووری ئیدارە و پاشکۆکانی لەخۆ گرتبوو، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە پۆلەکانی خوێندن و هۆڵێکی گەورە بۆ وانەکانی فیزیا و کیمیا، لەبەردەمیشیدا هۆڵکی کراوە دروستکرابوو لەسەر گۆرەپانە ناوخۆییەکەی خوێندنگەکە، چەندین ستوونیشی لەخۆگرتبوو بۆ یاری باسکە و سەبەتە و یارییە وەرزشییەکانی تر، هەروەك هۆڵێکی



محەمەد ڕەشید سەحەر١٩١٧-٢٠١٤

گەورە و فراوانیشی لە نزیك بەشی ئیدارە دروستکرابوو، شانۆیەکی بەرز و فراوانی تێدا بوو لەگەڵ پەردەیەکی سووری گەورە، هەروەك هەموو پێداویستییەکانیشی لەخۆ گرتبوو بۆ شانۆگەری و ئەنجامدانی کۆبووەنەوە.

ژووری پۆلەکان گەورە و فراوان بوو، دیوار و بنمیچەکەی سپی و پاك و خاوێن بوو، زەوییەکەشی چیمەنتۆ کرابوو، پەنجەرەی ئاسن هەبوو دەکەوتە سەر ڕێگەی گشتی بەرەو ڕۆژئاوا، پەنکەی بنمیچ و ڕووناکی باشیشی هەبوو، هاوڕێ و ڕووخساری نوێ، لە هەموو شوێنە جیاوازەکانەوە هاتبوون، مامۆستاکان لە بەغدا و کەرکوك و هەولێر و میسرەوە بوون، سیستەم و شێوازی جیاواز لە خوێندن و مامەڵەیەکی نوێ و توند، زیاتر لەوەی کە لەسەری ڕاهاتبووین لە قوتابخانەی سەرەتایی.

لە سەرەتادا هەست بە غەریبی و بێکەسی دەکەی لەدەست ئەو کەشە، بەڵام بەخێرایی ئەوە هەستە دەرەوایەوە، بەهۆی سەرقاڵبوون بە خوێندن و تێکەڵاوی لەگەڵ هاوڕێ تازەکان.

ماددەکانی میتۆد و ئەرکی خوێندن، زیاتر و قورستر بوون لێرە، ئەمە جگە لەوەی کێشمەکێشمان بوو بەهۆی دوورکەوتنەوە لە دۆخی ئاسایی خۆمان، کێشە و سەختیمان لە هەفتەکانی سەرەتادا کێشا، دواتر لەگەڵ دۆخە نوێیەکە گونجاین.

ڕێگەکان بە گشتی خراپ بوو، تەنانەت ڕێگەی دەرەکی کە قەزای بە ناوەندی لیوا دەبەستەوە، هەندێك جار بەهۆی بارانەوەوە ڕێگە دەبڕا لە زستاندا، تەنیا هێڵی ئاسنین نەبێت کە لە هەموو دۆخەکاندا بەردەوام هەر هەبوو.

هێڵی ئاسنین لە کەرکوکەوە بۆ بەغدا هەبوو، لەدووری پانزە کیلۆمەتر لە باشووری شارەکەوە بوو، هەر کەسێکی ئارەزووی بکردایە بگات بە وێستگەی ئاسکی کفری دەبوایە سواری پاسێکی کۆن بوایە کە لە دار درووستکرابوو، هەروەك کاتگەلێکی دیاریکراویشی هەبوو بە نیوەڕوان یاخود بە نیوە شەوان، بلیتێکی لە فەرمانبەری وێستگەکەوە بەدەست دەکەوت و ئامادەدەبوو بۆ ئەوەی سواری شەمەندەفەرەکە ببێت چونکە تەنیا بۆ چەند خولەکێك دەوەستا لە وێستگەکە، ئەمەش وایدەکرد، کە گەشتیار هەندێك جار ڕابکات بۆ ئەوەی بگات بە شەمەندەفەرەکە، تاکو کورسییەك لە پلەی سێ بەدەست بێنێت کە پڕبوو لە گەشتیار.

بەڵام ڕێگەی ئۆتۆمبێل لەنێو قەزاکەوە بۆ ناحییە و گوندەکان بەرەو بەغدا و جەلەولا قیرتاو نەکرابوون و هەر گڵ بوو، ئامرازەکانی گواستنەوەی بە پاس بوو کە لە دار دروستکرابوون، یاخود جێبی بچووك بوون، بەڵام ئۆتۆمبێلە تایبەتەکان زۆر دەگمەن بوو، کەم کەس لە پیاوماقوڵان و کەسە دیارەکان ئۆتۆمبێلیان هەبوو، هەر وەك دەوڵەمەندەکانی گوندیش ئەسپیان بەکار دەهێنا بۆ گواستنەوە، بەڵام خەڵك بەگشتی قاتر و گوێدرێژیان بەکار دەهێنا، سوودیشیان لێ وەردەگرت بۆ هەڵگرتنی باری قورس و کەلوپەل و کاری کشتوکاڵ لە شارەوە بۆ گوندەکان، ڕێکردنیش بەپێ بۆ شوێنی دوور تاکو بگەن بە شوێنێکی دیاریکراو، لەو کاتەدا کارێکی ئاسایی بوو.

هەر بەهۆی خراپی ڕێگاوبانەکان و کەمی ئامرازەکانی گواستنەوە و دووری ڕێگەکان بۆ خوێندکارانی گوند ناچاری بوو کە گەشتێکی درێژ بکات تاکو دەگاتە کەسوکاری، لە



ڕەشید مەجید محەمەد ١٩٢١-١٩٧٤



خورشید عەزیز عەبدولڕەحمان ١٩٢١-٢٠١٢

باشترین حاڵەتەکانیشدا ماوەی یەك مانگێك جارێك سەردانیان دەکرد، هەروەك گەڕانەوە بۆ زیدی خۆمان بۆ جوانی سروشت و گوند، جێی خۆشحاڵی بوو بۆ ئێمە و کەسوکار و هاوڕێکانمان، باسی خوێندنگە و ژینگە تازەکە و شارمان بەهەموو وردەکارییەکانییەوە دەکرد. هەندێك جاریش ئۆتۆمبێل بەردەست نەدەکەوت و هیچ ئامرازێکی گواستنەوەش بەردەست نەدەبوو، ناچاربووین پشت بە خۆمان ببەستین و بیست کیلۆمەتر ڕێمان دەکرد، هەروەك ڕێگەیەکی کورتمان دەگرتە بەر و کاریشمان بۆ ئەوە دەکرد کە لەو ڕێگەیە تەنیا نەبین بەڵکو لەگەڵ کەسێکدا دەڕۆیشتین.

بەڵام خوێندکارانی شار کێشەی گواستنەوە و نیشتەجێبوونیان نەبوو، هەندێکیان بە لەخۆباییبوونەوە دەیانڕوانییە خوێندکارانی گوندەکان، بێگومان ئەمەش جۆرێك لە ڕکابەری دروستدەکرد لە پۆل و خوێندنگەکە بۆ ئەوەی پێشەنگ ببین لە یارییە وەرزشەکان و وانەکاندا، ئەمەش لە بەرژەوەندی پرۆسەی پەروەردەییدا بوو، لەپێناو گەیشتن بە باشترین دەرئەنجام، لەڕاستیدا سەرەڕای سەختییەکان، ڕێژەی دەرچوونی خوێندکارانی گوند باش بوو.

لەسەرەتای قۆناغی ناوەندی سیاسەت و قسەوباس لەبارەی سیاسەتەوە شوێنی نەبوو لە مێشکماندا، هەرگیزیش گرنگیمان پێ نەدەدا، دۆخی گشتی کۆمەڵگە هاندەر نەبوو بۆ ئەوەی خوێندکار سەرقاڵی کاروباری سیاسی ببێت، تەنانەت خەڵکی ئاساییش گرنگیان بە سیاسەت نەدەدا و نوخبەیەکی سنوردار هەندێکجار باسیان لە پادشا و ڕاسپێردراوەکەی و ئەنجومەنی نوێنەران و کەسایەتییە دیارەکانیان دەکرد، بە تایبەت لە کاتی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەران، هەمیشە ئەم وشانەمان لێیان دەبیست: (دیموکراتییەت، فاشیستی، نازی) ئەم دەستەواژانە نامۆ بوون، سەرنجی ڕانەدەکێشاین.

دۆخەکە گۆڕانکاری بەسەردا هات، کاتێك گەیشتینە سێ ناوەندی، هۆشیاریمان زیاتر بوو ئارەزووی ئەوەمان لەلا دروست بوو کە بزانین لە دەورووبەرمان چی ڕوودەدات. لەکاتی هێرشی سیانی لەلایەن فەرەنسا و ئینگلتەرا و ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٥٦ بۆ سەر میسر، لەسەردەمی سەرۆك عەبدولناسر و ڕەنگدانەوەی بۆ پشتیوانیکردنی میسر لە جیهانی ئیسلامی و عەرەبی و سەربازگەی ڕۆژهەڵات بە سەرکردایەتی یەکێتی سۆڤیات لەو کاتەدا، لەگەڵ هەڵمەتەکانی ئێزگەی (صوت العرب)ی میسری لە قاهیرە و بێژەرە ناسراوەکەی (ئەحمەد سەعید) بە دەنگە تایبەتەکەی و هاوارەکانی، کە جنێوی بە داگیرکاران دەدات و نەفرەتی لە سیستمی پادشایەتی دەکرد لە ئوردن و عێراق و داوای دەکرد جووەکان فڕێبدەنە دەریاوە و یەکگرتنەوە جێبەجێ بکەن لەنێوان عەرەب لە زەریاوە بۆ کەنداو، هەموو ئەمانە و ڕۆڵی پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان کاریگەریان لەسەرمان جێهێشت و بووە هۆی دروستبوونی گرنگی دان لەلامان بۆ ئەوەی بزانین لەدەورووبەرمان چی ڕوودەدات، بەتایبەتی کاتێك لێرە و لەوێ لەبارەی پاڵەوانێتی زیندانییە سیاسییەکانی نێو گرتوخانەکانی حکومەتمان دەبیست، هەرچەندە بەشێکیان



مستەفا سەید ئەحمەد نەریمان ١٩٢٥-١٩٩٦



محەمەد غەریب دەروێش ١٩٢١-٢٠٠٣

هەروەك تیپێکی تۆپی باسکەش پێکهێنرا و تیپێکی دیکەی تۆپی پێ پێکهێنرا کە ئاستێکی باشیان هەبوو، ناوبانگی تیپی تۆپی پێکە ناوبانگی باشیان بەدەستهێنا لە قەزاکە و دەورووبەری و چوونە ڕکابەرییەوە لەگەڵ تیمەکانی تر لە خوورماتوو و کەرکوك و لە زۆربەی یارییەکانیان سەرکەوتنیان بەدەستدەهێنا.

تۆپی پێ هەوادارێکی زۆری هەبوو لە کفری، هەرکاتێك یارییەك هەبوایە بە سەدان کەس ئامادەی دەبوون لە خەڵکی قەزاکە و بە پیاو و ژنەوە هانی تیپی شارۆچکەکەیان دەدا و بەناوی یاریزانەکانەوە هاواریان دەکرد، هاوشێوەی فاروق حەکیم و سەلاح عەلی و ئەحمەد عەتار و عومەر ئەحمەد و سەلاح حەسەن و غالب عەبدولا و چەندانی تریش. لەساڵی خوێندنی ١٩٥٤ . ١٩٥٥ بۆ یەکەمجار پۆلی چواری ئامادەیی کرایەوە بەشی وێژەیی، هەر لە هەمان بینای ناوەندی کفری بوو، ناوی خوێندنگەکە بوو بە ئامادەیی کفری، لەو کاتەشدا ئامادەیی دوو ساڵ بوو لەدوای ناوەندی واتا پۆلی چوار و پێنج، دواتر تاقیکردنەوەکانی وەزاری ئەنجامدەدا و ئەوەی دەرچوایە دەرگاکانی وەرگرتنی لە زانکۆ و پەیمانگاکان بۆ دەکرایەوە، لە خوێندکارەکانی ساڵی یەکەم چواری ئامادەیی (تاڵب عەبدولا، عوسمان مستەفا، حەسەن عەلی بەگ، حەقی عەبدولا، جەودەت حەکیم، فاروق جەمیل بابان، جەلال قەرەداغی و چەند خوێندکارێکی تر)، لە خوێندکارە سەرکەوتووەکانی چواری ئامادەیی ناوی (سەلمان ئەحمەد ئەلجبوری) باوکی فەرمانبەری یەکێك لە فەرمانگەکانی قەزاکە بوو، بە گواستنەوە لە شارێکی ترەوە هاتبوون، سەلمان خاوەن بەهەرەیەکی باش بوو لە نواندن و خوێندنەوە و زیادرەوی لەسەر دەکرا و چیرۆکەکانیان گەورەتر دەکردەوە.

بەڵام کەشی ئارام و جێگیر و ڕۆتین لە پرۆسەی خوێندن بەردەوام بوو لە خوێندنگەکاندا، کەسیش باسی هیچ مەسەلەیەکیان نەدەکرد کە تایبەت بێت لەسەر ئەو گۆڕانکاری و ڕووداوە سیاسیانە.

لە ڕاستیدا گەنجان و خوێندکاران هیچ پەیوەندییەك بە ڕێکخراوە سیاسییەکان و گەنجانەوە نەبوو، تەنانەت ئەگەر هەشبن، ئەوە چالاك نەبوون، ئەو گرنگی تەنیا بە خوێندن و دلخۆشکردنی کەسوکار دەدرا، گرنگی بە دەرچوون لە پۆلێکەوە بۆ پۆلێکی تر، خەڵك وابەستی وەرزش و هونەرەکانی شانۆ و شێوەکار و تیپەکانی سروود و موسیقا بوون.

مامۆستای وێنە خواڵێخۆشبوو، عەبدولا کەریم چایەچی، لە قوتابخانەیەکی سەرەتاییەوە بە تەنسیب لە ناوەندی وانەی دەگووتەوە ئەوەش بەهۆی لێهاتووی و ئەزموونی لە شێوەکاری، هەوڵەکانیشی کاریگەری باشی لەسەرمان دروستکرد، بەو هۆیەوە گرنگیمان بە شێوەکار دەدا. چوار مامۆستای وەرزش هەبوون بە تەنسیب لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە هاتبوون بۆ ناوەندی، ئەوەش بەهۆی ئەزموونی وەرزشیان کە ئەوانیش بەڕێزان عەبدولقادر سبیلچی و محەمەد خزر و نەجمەدین محەمەد فلەییح و سەلمان قادر بوون، ئەمەی دواینیان لە یەکەمە براوەکانی پاڵەوانێتی باسکە بوو لەسەر ئاستی عێراق، زۆر بە دڵسۆزی کاریان دەکرد بۆ فێرکردنمان و ڕاهێنانمان لە پۆلە جیاوازەکانی وەرزش، هەروەك پێداویستییەکان ڕاهێنان و فێرکردن لەبەردەست بوون لە یاریگا و گۆڕەپانی تۆپی پێ و باسکە و سەبەتە و ڕێکت و کەرەستە وەرزشییەکانی تر.



فەرمان سەعید چەلەبی ١٩٢٦-٢٠١٢

دەرهێنانی شانۆیی، بەڵکو هونەرمەند بوو بەڕاستی، لەسەر شانۆی ئامادەییەکە لە ساڵی ١٩٥٥ و ١٩٥٦ چەندین شانۆی نمایشکرد و سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێنا و هاوکاری خوێندکارە بەهرەمەندەکانیش بوو لە نواندن لە ناوەندی و ئامادەیی.

شانۆگەرییەکانیش لەدوای تەواوبوونی دەوامی ئێواران نمایش دەکرا، زۆرجاریش لەگەڵ خۆرئاوابوون نمایشدەکرا و خەڵکێکی زۆری قەزاکە و دەورووبەری شارۆچکەکە ئامادەی دەبوون، لەگەڵ چین و توێژەکان و کاسبکاران و خوێندکاران و پیاوماقوڵان و تەنانەت ژنان و ژنە مامۆستاکان و فەرمانبەرەکان، بەشێوەیەك هۆڵەکە پڕدەبوو و بۆ چەند ڕۆژێك بە سەرسامییەوە باسیان دەکرد و ڕاوبۆچوونیان لەسەر شانۆکە و ئەدای ئەکتەرەکانیش دەدا.

لەوانەیە شتێکی سەیر بێت، لەدوای ئەم هەموو ساڵە درێژانە باسی پێشوازیکردنی خەڵك بکەین لە قەزاکە، کە بە یەکێك لە قەزا هەژارەکان بوو لە ڕووی شانۆگەرییەوە کە بەم شێوەیە پێشوازی لێی دەکرد، لەوانەیە مرۆڤ پرسیاری ئەوەی لا دروست بێت لەبارەی ئەم ئاستە بەرزەی هۆشیاری و ڕۆشنبیری لەلایان، بۆ ئەوەی درك بەم جۆرە هونەرە باڵایە بدەن، کە خەڵکەکەی دەستبەرداری کار و کاتەکانی پشوودانیان بن و لە هۆڵێکدا دابنیشن کە پێداویستی تێدا کەمبێت و بۆ چەند کاتژمێرێك تەماشای ڕووداوەکانی نێو شانۆکە بکەن!!

ئەو شانۆگەریانەی کە سەلمان جبوری پێشکەشی دەکرد، جۆراوجۆر بوون، بریتی بوو لە کاروباری سۆزداری و کۆمەڵایەتی و کۆمیدی، شانۆکان گوزارشت بوو لە واقعی



مستەفا محەمەد مولکی ١٩٢٨-٢٠٠٣

کۆمەڵگەی عێراقی ئەو سەردەمە و هەندێکیشیان لە ئەدەب و کلتووری بیانییەوە وەرگێڕدرا بوون، وێنای ئەوەی بکە کە لە شارێکی بچووکدا و بەر لە پەنجا ساڵ شانۆگەرییەکی ویلیام شکسپیری ئینگلیزی نمایشکرا بێت لەلایەن کۆمەڵێك خوێندکاری لێهاتووەوە، هەروەك بە گەرمی پێشوازی لێوە کراوە و هۆڵەکەش جێی بینەری تێدا نەماوەتەوە بەهۆی قەرەباڵغییەوە، لەکاتێکدا لە ڕۆژانی ئێستاماندا تەنیا چەند دە کەسێك کۆدەبنەوە بۆ ئامادەبوونی شانۆیەك کە لە هۆڵێکی ئامادەکراو بە هەموو پێداویستییەکانی پشوودان.

جێگیربوون و باشبوونی دۆخی ئابووری بە شێوەیەکی پلە بەندیی لەدوای ساڵانی پەنجاکان لە عێراقدا، لەگەڵ هاندانی حکومەت بۆ خەڵك کە سەرقاڵی جۆرە کارێك بن، کە دووریان بخانەوە لە سیاسییەت و ئۆپۆزسیۆنی، کارلێکەرییەك بوو بۆ ئەوەی هاووڵاتیان پێشوازی لە جۆرەها وەرزش بکەن و هانی خەڵك بدەن بۆ ئەنجامدانی و گرنگی بە هونەر و شانۆ و سینەما و گۆرانی و خوێندنەوەی کتێب و سەردانی کتێبخانەکان بکەن، هەروەك پێشکەوتنێکی بەرچاویش هەبوو لە بوارەکانی ڕۆشنبیری بەگشتی، چەندین نووسەر و ئەکتەر و مۆسیقار و گۆرانیبێژی بەناوبانگ دەرکەوتن، بەردەوام بوون لە بەرهەمهێنان و و داهێنان بۆ ماوەیەك تا ڕادەیەك زۆر، بەڵام لە دەیەکانی دواییدا ئەو لێهاتوویە کەمبووەوە، چونکە عێراق کەوتە زنجیرەیەك ئاڵۆزی سیاسی و شەڕ و کودەتاوە و ئاسایشی تێدا تێکچوو و توندوتیژی و زەبری کۆنترۆڵی دۆخەکەی کرد لەنێوان خەڵکدا.

بێگومان ئەو کەشەش کاریگەریی کردە سەر دۆخی ڕۆشنبیری، بە تایبەتی لە قۆناغی کۆتایی ناوەندیدا و



حوسێن حەسەن فەتاح ١٩٣٢-٢٠١٣



نەجیب مووسا وەنداوی ١٩٣٢-٢٠١٢

گرنگیمان زیاتر بە خوێندنەوەی دەرەکی و بەدواداچوون بۆ پێشکەوتنی گۆرانی و مۆسیقا و گوێگرتن بۆ دەنگە عەرەبی و کوردییە نوێیەکان لە ڕادیۆ یاخود لە ئامێری تۆمارکردن کە لەدوای دەرکەوتنییەوە لە چایخانە و ماڵەکان بڵاوەی کرد.

زیاتر لە یەك لەسەر چواری خوێندکارانی ناوەندی و ئامادەیی خەڵکی گوند بوون، بەڵام هەندێکیان گوندەکانیان نزیك ناوەندی شار بوو، بۆیە بە بەیانیان دەهاتن و لەدوای کۆتایی دەوام بە پێ یاخود بە پاسکیل دەگەڕانەوە بۆ ماڵ، ئەوانەشی کە ماڵیان دوور بووناچار بوون لە شار نیشتەجێ بن و لەکاتی پشوو و بۆنەکاندا دەگەڕانەوە.

زۆربەی گوندییەکانیش تەنیا زمانی کوردییان دەزانی، بە پێچەوانی خەڵکی شار کە کوردی و تورکمانی و هەندێك عەرەبییان دەزانی، هەر بەهۆی ئەوەی بۆ سێ ساڵ بەردەوام بوون لە خوێندن و مامەڵەیان لەگەڵ خوێندکاران و مامۆستاکان دەکرد، هەندێك تورکمانی و هەندێك عەرەبی فێربوون، ئەوەش بەهۆی ئەوەی میتۆد عەرەبی بوو و لەگەڵ هەندێك هاوڕێی تورکمانیشدا هاوڕێتیان دەکرد، هاوکات خوێندکارە تورکمان و عەرەبەکانیش بە باشی فێری کوردی بوون، بۆ ئێمەی خوێندکاریش زمان کێشەیەك نەبوو بۆمان لە مامەڵەکردنی نێوانمان، بەڵکو قورسییەکە لەنێو پۆلەوە دەستی پێدەکرد کاتێك مامەڵەمان لەگەڵ وانەکان دەکرد، مامۆستاکانیش زۆربەیان کوردییان نەدەزانی، جارێکیشیان لەکاتی وانەی ئەدەبی عەرەبی پۆلی سێی ناوەندی، کاتێك خوێندکارێك هەڵەی کرد لە وتنەوەی دێرێك لە ڕووی ڕێزمانییەوە، مامۆستا هەڵەکەی بۆ چاککردنەوە و داوای لێکرد جارێکی دی هەڵە نەکات، خوێندکارەکەش زۆر بە ڕەوشتەوە وتی:

مامۆستا ئەمە زمانی ڕەسەنی من نییە، کارێکی نامۆش نییە ئەگەر هەڵە بکەم لە وتنەوەی وشەیەك یاخود لە فۆنتیکدا هەڵە بکەم، سەبارەت بە بەڕێزتان چونکە زمانی ڕەسەنی خۆتانە کارێکی سروشتییە ئەگەر هەڵە نەکەن، ئەگەر هەڵەش بکەن ئەو کات دەبێتە کارێکی نامۆ، خۆزگە ئەم بابەتە بە شێوەیەکی مرۆیی و دادپەروەروانە چارەسەر بکرایە!!!

مامۆستای وانەکەش خەڵکی میسر بوو، زۆر زیرەك و لێهاتوو بوو لە زمانی عەرەبیدا، لەلای ئێمەش زۆر بەڕێز بوو، ئەو مامۆستایە هەندێك بێ دەنگ بوو و وتی "وەڵاهی ڕاستدەکەیت ئەوەی دەیڵێی زۆر ڕاستە، ئەگەر جارێکی دیکەش هەڵە بکەی ئەوە من گلەییت لێ ناکەم، بەڵام با بگەڕێینەوە سەر وانەکەمان.

لەگەڵ ئەوەشدا خوێندکارە کورد و تورکمانەکان لێهاتووبوون لە دەربڕینی لەفزی ڕاست، هەبوون چەندین لاپەڕەیان لە بابەتی ئەدەبی نووسیوە و یەك هەڵەی ڕێزمانیان نەکردووە و هەبوونە چەندین ستوونی بڵاوکراوەی سەر دیواریان نووسیوە و خەڵات و ڕێزلێنانیان وەرگرتوە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی و دەستەی خوێندنەوە.

مامۆستایانی زمانی عەرەبی هەندێکیان لە دەرچووانی جامیعەی ئەزهەر بوون لە کورد و عەرەب و میسرییەکانیش، بە ئەزموون و لێهاتوو بوون لە زانستەکانی زمان و چۆنییەتی وتنەوەی وانەکە، شتگەلێکی زۆریان فێرکردین، وایان لێکردین مەیل و خۆشەویستیمان بۆ ئەدەب و شیعری عەرەبی لە قۆناغە جیاوازەکانی.. بە شاعیرانی (موعەلەقات) ئاشنایان کردین هەروەها شاعیرانی چەرخی



محەمەد خزر دەباغ ١٩٣٢-٢٠١٤



شەکیبە محەمەد قللەییچ ١٩٤٠-٢٠٠٠

نوێ، شیعرەکانی (ئیمرولقەیس و جەمیل و بوسەینە و ئەحمەد شەوقی و سیاب و جەواهریان بۆ خوێندینەوە بۆیان شیکردینەوە، باسی شتی زۆری نووسەرەکانی میسر و لوبنان و عێراقیان بۆ کردین، هاوشێوەی (تەها حوسێن و ئەلعەقاد و مەحمود تەیمور و نەجیب مەحفووز و میخائیل نیعمە و عەبدولحەق فازڵ و غائیب توعمە فەرمان عەبودلمەجید لوتفی). کتێبەکانیانی خۆیانیان پێ داین بۆ ئەوەی بیانخوێنینەوە.

پێشم وایە من لەو خوێندکارانە بوون کە مەیلمان بۆ ئەدەب و شیعری عەرەبی و کوردی هەبوو، چونکە نووسین و خوێندنەوە کارێکی نامۆ نەبوو لەلای من، لەسەرەتای پێگەیشتنمەوە دۆلابێکی گەورە لە ژووری میوانەکەمان هەبوو پێیمان دەگوت (مەکتەبە) رەفەکانی دیوانی چەندین شاعیری کوردی ناسراوی تێدا بوو، لەگەڵ کۆمەڵێك لە گۆڤاری گەلاوێژ و کتێبەکانی سیرەی نەبەوی و فیقە و شیکردنەوە، لەگەڵ چەند کتێبێکی کوردی دیکە، هاوشێوەی شیرین و فەرهاد و ئیقبال نامە و خەسرەو و زۆراب و فەرهەنگی ئەحمەدی (کوردی . عەرەبی) لە پۆلی پێنجی سەرەتاییەوە و بەهۆی هاندان و هاوکاری باوکمەوە بۆ خوێندنەوەی کوردی دەستم پێکرد، دواتر لە پۆلی شەشەوە دەستم بە خوێندنەوەی عەرەبی کرد، لە قۆناغی ناوەندی رۆمانەکانی ئەلهیلالی جرجی زێدانم خوێندوە، لەگەڵ چاپکراوەکانی (کتابی، حلمی موراد) یاداشتی کۆچەرەکان و دیوانەکانی شیعری، تەنانەت چیرۆکەکانی شارلۆك هۆلمز و وارسین لوبینیشم خوێندەوە.

ئامادەکردنی بلاوکراوەی سەردیوار لەسەر چەندین بابەتی جیاواز بوو، کاتێ زۆری خوێندکارانی دەبرد، گفتوگۆ و رکابەرییەکی زۆریش هەبوو بۆ ئەوەی باشترین کار بکەن و رەزامەندی هاورێ خوێنەرەکان و ئیدارەی خوێندنگە بەدەست بێنن، ئامادەکردنی ئەو بلاوکراوەیە بووە هۆی ئەوەی خوێندکاران بەدوای سەرچاوە و کتێبدا بگەرێن و تێگەیشتن و زمانیان فراوان ببێتەوە، ماوەی خوێندنیشمان بێبەش نەبوو لە مامۆستای باش و سەرکردەی پەروەردەیی و لەسەر ئاستی بالا لە رۆشنبیرێتی، کاریگەری ئیجابیان لەسەرمان دروستکرد لە پێکهاتەی رۆشنبیری و کەسایەتیشمان.

جێگیربوون و ئارامی لەو سالانەدا بەرپا بوو، هەروەك بەرهەمهێنانی نەوت و هەناردەکردنیشی کاریگەری هەبوو لەسەر باشترکردنی دۆخی ئابووری، زۆر بە دەگمەن ئالۆزی دروست دەبوو، خەون و ئاواتی گەنجانی ئەو سەردەمەش جیاواز بوو لەگەڵ ئەوانەی ئەم سەردەمە.

خوێندنی تێکەلاو لە قۆناغی ناوەندی جیاواز بوو لە شێوەی خوێندنی تێکەلاو لە قۆناغی سەرەتایی، دواتر دێمە سەر وردەکارییەکانی.

هەر کە چووینە پۆلی یەکی ناوەندی پێنج کچە خوێندکارمان لەگەڵ بوون، هەر لە هەمان پۆل لەگەلمان دەیانخوێند، تاکو کۆتایی قۆناغەکە بەردەوام بوون، بەلام بەپێی سیستمێکی توندی ئیدارەی ناوەندییەکە، لەگەڵ لێدانی زەنگی دەست پێکردنی وانەکان یەکەمجار خوێندکارە



نازم ئیبراهیم عەباس ١٩٣٠-



حەسەن حوسێن عەزیز ١٩٣٠-

کوڕەکان دەچووینە پۆلەوە و دواتر مامۆستاکان، دواتریش کچە خوێندکارەکان دەهاتن، ژوورێکی تایبەتیشیان بۆ کرابوو، لە نزیك ئیدارە و لەکاتی پشووەکانی نێوان وانەکان دەچوونە ئەو شوێنە هەر کەسە و لە شوێنی خۆی دادەنیشت، هەمیشەش بەر لە کۆتایی هاتنی وانەکان بە ماوەیەکی کەم ئەوان دەردەچوون و دەچوونە شوێنی خۆیان بۆ پشوودان، بە بێ ئەوەی تێکەڵاوی خوێندکاران و خوێندنگەکە بن لە هۆڵ و گۆڕەپانەکان.

ئەو کچانە لەکاتی هاتنی بۆ خوێندنگە عەبایەکی ڕەشی لەسەر دەکرد، بەبێ پەچە، بەڵام لەکاتی وانەکان عەباکەیان لادەبرد و سەرپۆشیان دەکرد لەگەڵ جلوبەرگی ڕەسمی خوێندنگەکە.

کچەکان بەشدارییان لە چالاکییەکانی نێو پۆل دەکرد و لەکاتی خوێندنەوە و گفتوگۆکانیشدا بەدەنگی ڕوون قسەیان دەکرد و بەشدارییان دەکرد، وەکو ئەو کاتانەی کە هەڵدەستان بۆ سەر تەختەکە بۆ نووسینی دەرئەنجامی هاوکێشەیەکی کیمیایی یان فیزیایی و بیرکاریدا، زۆر بە دەگمەنیش قسەیان لەگەڵ دەکردین، ئەم شێوازە پەیڕەو کرابوو لە خوێندنی تێکەڵاو، ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی هەندێك لە خوێندکارەکان دەست بکەن بە چاودێریکردنیان وەکو ئەوەی لە هەسارەیەکی دیکەوە هاتبن، ئەمەش پێچەوانەی تێکەڵاوی کاتی سەرەتایی بوو کە زۆر بە شەفافانە تر مامەڵەمان لەگەڵیان دەکرد.

کچانی هاوپۆلمان لەماوەی سێ ساڵی خوێندندا، نموونەی پەروەردەی باش و ڕەوشتی بەرزبوون، لەدوای کۆتایی قۆناغی ناوەندی چوونە (دارولموعەلیمات) و بوون به مامۆستای سەرکەوتوو.

گومان لەوەدا نییە کە ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری زۆربەی مامۆستاکان باش بوو، هەروەك گرنگیدانیان بە بابەت و وانەکان و بەدواداچوون بۆ ئاستی خوێندکارەکان زۆر جدی بوو. مامۆستا پابەندی کار و ئەرکی ڕەسمی خۆی دەبوو و لەدەرەوەی پیشەکی لە هیچ کارێکی بازرگانی یاخود قەڵەمی یاخود هەر کارێکی تری نەدەکردەوە، بە تەنیا مووچەکەی خۆی دەژیا، ناشزانم ئاخۆ یاسا ڕێگر بوو لە کارکردن لە دەرەوەی پیشەکەیان، یاخود موچەکەیان بەشیانی دەکرد، یاخود دابوونەریتی کۆمەڵایەتی وای لێکردبوون، یاخود فەرمانبەرانی ئەو سەردەمە بڕوایان بە وتەیەك هەبوو و کاریان لەسەر دەکرد کە دەڵێت (قەناعەت سەری هەموو شتێکە)، ئەو وتەیەمان لە زۆربەی شوێن و دوکانەکان دەبینی بە خەتێکی جوان نووسرابوو، لەکاتێکدا کەسیان بەهیچ شێوەیەك جێبەجێیان نەدەکرد.

بە پێویستی دەزانم ناوی چەند مامۆستایەك بێنم کە کاریگەری باشی لەسەرمان هەبوو لە کاتی خوێندن و سوودی باشمان لە ئەزموون و ڕۆشنبیرێتییەکەیان وەرگرت:

١- مامۆستا فازڵ عەباس ئەڵلامی، مامۆستای کیمیا و فیزیا بوو و تازە دەرچووی کۆلێژی پەروەردە بوو، ئەو کات کۆلێژەکە ناوی ((کۆلیژی شازادە عالیە) بوو لەکاتی دامەزراندنی، یاخود بە (دار المعلمین العالیە) ناوی دەبرد، لە شاری بەغدا بوو و گرنگی زۆری بە بابەتی وانەکان دەدا و جدی بوو، بەدواداچوونی بۆ ئاستی ئامادەیی خوێندکارەکان دەکرد لەسەر بەجێی هێنانی ئەرکەکانیان



زەینەولعابدین عەباس قەمبەر ١٩٣٢

بە ووردی، لەدەرەوەی پۆلیش هاوڕێی خوێندکاران بوو، گرنگی بە وەرزش دەدا، لەگەڵ خوێندکارەکان تۆپی پێ و مشتەکۆڵەی دەکرد.

٢- مامۆستا عەبدولکەریم عەلی، دەرچووی ئەزهەر بوو و خەڵکی هەولێر بوو، تەمەنی لە چلەکان بوو، لە رووی ئیدارییەوە گواسترابووەوە، دواتر زانیمان کە بەشداری لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی ئەو سەردەمە کردبوو، لە هەولێر دوورخرابووەوە، ئێمە پێمان دەگووت مامە، چونکە زۆر خۆشەویست بوو، پسپۆڕێتی لە زمانی عەرەبی هەبوو، باسی شاعیرە کوردەکانیشی بۆ دەکردین، هاوشێوەی ئەحمەدی خانی و مەولەوی و مەلای جزیری و حاجی قادری کۆیی.

٣- مامۆستا عەبدولرەزاق عەبدولواحد، لە رووی ئیدارەوە گواسترابووەوە، واتا ئەویش گومانلێکراوبوو بەوەی بەکاری سیاسییەوە تێوەگلابێت، بۆ ماوەیەکی کەم مایەوە، وانەی ئەدەبی عەرەبی پێی دەوتینەوە، تایبەت بوو لە قسەکردن و بە لێهاتووی شیعری دەخوێندەوە و خۆشی شیعری دەنووسی، دواتر وەکو شاعیرێکی بەناوبانگ لە دەزگاکانی راگەیاندن دەرکەوت.

٤- مامۆستا وەهبی ئەحمەد ئاق سو، دەرچووی بەشی ئینگلیزی کۆلێژی پەروەردە بوو، وانەی ئینگلیزی پێ دەوتینەوە، زۆر لێهاتوو بوو، خەڵکی خورماتوو بوو، بەجوانی رەوشتی و رێکپۆشی ناسرابوو، رێزی زۆری لە خەڵك دەگرت.



ئیبراهیم کەریم عەزیز ١٩٣٦

٥- مامۆستا سامی شاکر، مامۆستای کۆمەڵایەتی بوو، خەڵکی شاری کەرکوك بوو، کەسێکی خۆشەویست و هەستیار بوو، زوو تووڕە دەبوو، بە پەلەش تووڕەییەکەی دەڕەوایەوە و داوای لێبووردنی دەکرد، قسەخۆش بوو باسی ژیانی دەکرد لەکاتی زانکۆ، ئێمەش ئەوەمان دەقۆستەوە بۆ ئەوەی لە بێزاری وانەکان رزگارمان ببێت، کاتێکیش هەستی بە تێپەڕبوونی کات بکردبایە رووخساری سوور دەبووەوە و هاواری دەکردە سەرمان، بەڵام دوای تێپەڕبوونی چەند خولەکێك دەگەڕایەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆی و بەردەوام دەبوو لە باسکردنی ژیانی زانکۆی.

٦- مامۆستا عەبدولرەزاق ئەلمسری، کەسێکی لێهاتووبوو لە ئەدەب و زمان و نەحو و سەرف و فەقێ بوو لە زانستە ئاینییەکان، سوودمان زۆر وەرگرت لە ئەزموونە زۆرەکەی، هەرچەندە ئێمەش کەسایەتییە باشەکەیمان دەقۆستەوە بەوەی هەندێك لە هۆنراوە و ئایەتەکانی قورئان و حەدیس و تەکانمان لەبەرنەدەکرد، خاوەن شێوازێکی جوان بوو لە شیکردنەوە و وانەوتنەوە و شیکردنەوەی واتای وشە و دێر و هۆنراوە و ئایەتەکان، هەرکاتێك مەزاجی باش بوایە، بەدەنگێ خۆشەوە شیعری بۆ دەخوێندینەوە، وەکو هۆنراوەی (الجندول)ی عەلی مەحمود تەها بە لێهاتووی لاسایی دەنگی هونەرمەندی ناسراو محەمەد عەبدولوەهابی دەکردەوە.

٧- مامۆستا موفەق شەفیق ئەلوەنداوی، بەڕێوەبەری ناوەندییەکە بوو، خەڵکی ناوەندی قەزاکە بوو، لە خانەوادەیەکی ناسراو بوو، کەسێکی ئیداری بوو، زۆر جدی و دادپەروەر بوو، لەگەڵ هەموانیشدا هاوسەنگ



عەبدولقادر محەمەد بایز ١٩٤٢



حەسەن عەباس ڕەزا

سەردانیکردنەکان و وردەکاری ڕێوشوێنەکان و شێوەی ئامادەبووان و جلوبەرگ و قسەکانیان، بۆ چەند ڕۆژێك دەبووە جێی گرنگیدا و قسەوباسمان، لەسەردانیکەرە تایبەتەکان، کە لە پۆلەکان چاویان پێمان دەکەوت و قسەیان لەگەڵ دەکردین. پشکێنەرە پسپۆڕەکان بوون، کە لە بەغدای پایتەختەوە دەهاتن و بەڕێوەبەرایەتییەکی تایبەتیان لە وەزارەتی مەعاریف هەبوو بە ناوی بەڕێوەبەرایەتی پشکێنەرە تایبەت مەندەکان، ئەوانیش مامۆستای پسپۆڕ بوون لە بابەتی دیاریکراو، وەکو زمانی ئینگلیزی و بیرکاری و عەرەبی، ئیدارەش و ئەوانی تر، بەدواداچوونیان بۆ ئاستی خوێندکاران دەکرد لە مادەکان ئەو کێشانەی کە پێویستی بە چارەسەر بوو، ڕاپۆرتەکانیشیان ڕۆڵی هەبوو لە پێشکەوتنی پیشەیی مامۆستا و ئەو پشکێنەرانەش بۆ ڕۆژێك یاخود زیاتر دەمانەوە، هەندێکیان دەهێنمەوە یاد:

١- مامۆستا محەمەد بەهجە ئەلئەسەری، پشکێنەری تایبەت بوو لە مێژوو و وابزانم لە زمانیش بوو، پیاوێکی باڵا بەرز بوو و جوبە (تەربوش) و چاویلکەی پزیشکی سپی دەکرد، لە وانەی مێژوو هاتە سەرمان و لەبارەی شەریعەتی حەمورابی قسەی بۆ کردین لەسەر گرنگی یاساکانی بۆ ڕێکخستنی ژیان و دابینکردنی دادپەروەری، جێی پێزانین و پێشوازی و قبولکردنمان بوو، زۆریش سەرسامبووین بە دیمەن و ڕێکپۆشییەکەی.

٢- مامۆستا عەلامە مستەفا جەواد، لە پۆلی یەك بووم کاتێك لە وانەی زمانی عەرەبی هاتە سەرمان، کە تێیدا پسپۆڕ بوو، بوو، بۆ ماوەیەکی کەم وانەی بیرکاری پێی وتینەوە، دواتر خۆی بۆ کاروباری بەڕێوەبردنی خوێندنگەکە تەرخان کرد، لەماوەی سێ ساڵی خوێندمان لە ناوەندی بەڕێوەبەر بوو. هەروەك چەندین مامۆستای دیکەش هەبوون، بەشداربوون لە وتنەوەی وانەکان پێمان، وەکو محەمەد سەعید کانی مارانی، بەڕێوەبەری یەکلاییکردنەوەی ماڤ زەوییەکان بوو لە قەزاکە، بۆ ماوەیەك وەکو وانەبێژ وانەی پێ داین، مامۆستا ئیبراهیمیش خەڵکی کۆیە بوو، مامۆستا نەجیب دامیرچی مامۆستای کۆمەڵایەتی و خەڵکی کەرکوك بوو، مامۆستا فەتاح داغرەمەچی، مامۆستای ئینگلیزی و خەڵکی هەولێر بوو، لەگەڵ چەندین مامۆستای دیکە. ئامادەیی کفری لەلایەن بەرپرسە فەرمییەکانەوە سەردانی دەکرا، لە وەزارەتی مەعاریف و کەسانی تر، بۆ ئەوەی لەدۆخی خوێندکاران بەئاگابن، هەروەك قایمقام و موتەسەڕفی لیوا و هەندێك جاریش وەزیر، یاخود بریکاری وەزیر سەردانی دەکرد، ئامادەییەکە لە چوارچێوەی شوێنە فەرمییە گرنگەکان بوو، زۆر سەردانی دەکرا.

لەکاتی سەردانیکردنی هەندێك لێپرسراوی باڵا وەکو موتەسەڕیف و بەرزتر، بەڕێوەبەرەکە داوای کۆبوونەوەیەکی گشتی دەکرد لە گۆڕەپانی گشتی پێشەوە، ئێمەش ڕیز دەبووین بەپێی پلەبەندییەکی دیاریکراوو، بەڕێوەبەرەکەش وتەی پێشوازی و خێراتنی میوانەکانی دەوت و لە هەندێك جاریشدا یەکێك لە خوێندکارەکان وتەیەکی کورت یاخود شیعرێکی دەخوێندەوە، ڕووداوەکان لەکاتی



مستەفا ئیبراهیم

کەسێکی ناسراوبوو، بەرنامییەکیشی هەبوو لە رادیۆی بەغدا بە ناونیشانی (بلێ یان مەلێ) دوای گوێگرتنی لە خوێندکاران بە خوێندنەوە چەند دەقێکی وانەکان، کۆمەڵێك رێنمایی و ئامۆژگاری بەنرخی کردین و ستایشی ئاست باشیمان کرد و بە راشکاوی وتی، سەرەرای ئەوەی ئێوە بە زمانێکی غەیرە زمانی خۆتان دەخوێنن، بەلام بە ئازایەتی خۆتان توانیتان بەسەر ئەو کێشەیە سەربکەون، پیاوێکی بچووك و رێکپۆش بوو، کەمێك قەڵەو بوو چاویلکەیەکی پزیشکیشی لەچاو کردبوو.

سەرجەم خوێندکاران و مامۆستایان لە باشوور و باکوور و رۆژهەلات و رۆژئاوا، بەپێی دەهاتن بۆ خوێندنگەکە، تەنانەت ئەگەر کەشوهەوا خۆشبوایە یاخود باران، بەیانیان رێز دەوەستاین و پشکنین لەسەر جلوبەرگ و دەستەسر و نینۆك بووە شتێکی رابردوو و بووە بەشێك لە بیرەوەرییەکان، گرنگیدان بە رێکپۆشی کارێکی خۆرسك بوو، کۆبوونەوەکانی گشتی لە گۆرەپانەکە هەندێك جار بەهۆی هاتنی میوانێکی گرنگەوە دەکرا، یاخود بۆ پێدانی رێنمایی گرنگ بوو لە بارەی کاروباری ئیداری لەلایەن بەرێوەبەرەوە، لەو کۆبوونەوانەشدا هیچ هاوار و بشێوی و پاڵپەستۆیەك روویندەدا کە کەسێك بیەوێت چەند وشەیەکی حەماسی بلێت و کەسانێك بورووژێنێت.

لەباشووری ئامادەییەکەش بەدووری چەند مەترێك و لەسەر هەمان لایەنی چەپی شەقامە قیرتاوەکە، بینای قوتابخانەی کفری یەکەمی سەرەتایی هەبوو، بینایەکی گەورە



سەلاحەدین مەجید زەنگەنە ١٩٣٨



ئەحمەد محەمەد قەرەداغی

بوو، بە بەرد و گەچ و چیمەنتۆ دروستکرابوو، گۆرەپانەکەی دیوارکرابوو، ژوور و پاشکۆی زۆربوو، بەرێوەبەرەکەی ناوی (مامۆستا مەجید ئەفەنی عەبدولقادر) بوو، ناسرابوو بە رێکپۆشی و توندی لە ئیدارەکەی و درێژی خزمەتەکەی لە بورای پەروەردەدا، زۆرێك لە مامۆستایانی قەزاکە و فەرمانبەرانی، لە خوێندکارەکانی خۆی بوون، مامۆستا مەجید سیداری عێراقي لەسەر دەکرد، هەمیشە رەنگی لەگەل رەنگی جاکەت و پانتۆلەکەی یەك رەنگ بوو، هەموو رێگە و شەقامەکانی قەزاکە قیرتاو نەکرابوون، لە رۆژانەشدا هەمیشە گۆلاوی ئاو و قورە لیتە لەدوای باران کۆدە بووەوە، مالی مامۆستا مەجیدیش لە گەرەکی (ئیسماعیل بەگ) بوو کە گەرەکێکی دوور بوو و کۆلانەکانیشی هەموو قور بوو، لەگەل ئەوەشدا مامۆستا مەجید ئەفەنی کە دەگەیشتە شوێنی کارەکەی، بە تەواوی رێکپۆشی و بریقەی پێلاوەکەیەوە بوو، ئێمەش بەراوردمان دەکرد بە بەرێوەبەرەکەی پێشوومانەوە (مامۆستا موفەق شەفیق) کاتێك دەگەیشتە دەوام، نیوەی پانتۆلەکەی لە قوردا بوو.

لە قۆناغی ناوەندی لە کارگوزاری خوێندنگەکە نەدەترساین، بەڵکو وەکو هاورێمان بوو، گاڵتەمان لەگەل دەکرد و هەندێکجاریش پەندمان پێی دەکرد، هەندێکجاریش قەرزمان لێی دەکرد و دواتر پارەکەمان پێ دەدایەوە.

ئەرکەکانی (مام عەلی) کارگوزار ئەوە بوو لەکاتی دیاریکراودا زەنگ لێبدات، پشتی بە کاتژمێرەکەی گیرفانی دەبەست، هەرگیز بروای بە کاتژمێرەکەی ئێمە نەدەکرد، وەکو خۆی دەیگووت "ئێوە فێل دەکەن"، تاکو کاتێکی زیاتر لە دەرەوەی پۆل ببین، هەروەك خزمەتی میوانی بەرێوەبەر

و مامۆستاکانی دەکرد و زانیاری دەگەیاند بە مامۆستاکان لەنێو پۆلەکەدا، یاخود بانگهێشتی خوێندکارێکی دەکرد بۆ دیداری بەڕێوەبەری ئەگەر بە هەر هۆکارێك بوایە، مام عەلی وەکو گەورەی کارگوزارەکان بوو، چونکە ئەو پێش هەموویان بوو، دوو کەسی دیکەشی لەگەڵ بوون، یەکێکیان بە ڕۆژ هاوکاری دەکرد و ئەوەی دیکەشیان پاسەوانی شەوان بوو.

پێشم وایە لەسەرەتای پەنجاکان بینای خوێندنگەکە دروستکرابوو، خەڵکی قەزاکە و ناوچەکانی دەوروبەری بەشدارییان کرد لە پێدانی پارە و لەگەڵ بودجەی تەرخان بۆکراوی خۆی لەلایەن حکومەتەوە توانرا دروست بکرێت.

خەڵکی قەزاکەش ناسراوبوون بەوەی کەسانی سەخیین لە بەشداریکردن و پێدانی پارە بۆ پرۆژەی خزمەتگوزاری و گشتی، هەروەك پارەشیان بەخشی بۆ دروستکردنی یانەی پەرەپێدانی کوردی لە بەغدا، بەشداریشیان کرد بۆ هاوکاریکردنی قوربانیانی لافاوی ساڵی ١٩٥٧ لە شاری سلێمانی و هاوکاری قوربانیانی لافاوی (ڕووباری قۆری چای)یشیان کرد لەنێوان خورماتوو و کفری لە هەمان ساڵدا.



عومەر محەمەد قادر ١٩٤٢



عەبدولڕەحیم عەبدولکەریم عەلاوی ١٩٤٢



حەسەن عەلی بەگی جاف ١٩٣٨

*** فێرکردن و تەندروستی و پێشکەوتنی پلەبەندی بەرەو باشتر:-**

لە بەرزاییەکانی دەوروبەری شارەکەش کانی دەکردنی بەردێکی تایبەت هەبوو کە بۆ بینا بەکاردەهێنرا و پێیان دەگووت (قایە)، ئەو بەردانەش لە فرنی تایبەت دەسووتێنرا و دەکرا بە گەچی سپی و لە دروستکردنی بینا بەکاردەهێنرا لەو سەردەمەدا، زۆربەی خانووەکانیش لەو کاتە بە بەرد و گەچی نێوخۆی دروستکرابوون و لەسەر دەستی وەستای ناسراو هاوشێوەی (وەستا نوری و وەستا عەلووش و وەستا کەریم و چەندانی تریش). شێوازی بیناکان لەو کاتەدا جیاوازبوون بە بەراورد لەگەڵ شێوازی بینای ئێستا، ئەو کات گومەت و گرێ و هەیوان هەبوو، تاکو ئێستاش بەشێك لەو بینایانە ماون، لە سەرەتای پەنجاکانیشەوە خەڵك و فەرمانگە حکومییەکان دەستیان کرد بە گۆڕینی شێوازی بینا بۆ شێوازی نوێ، لە ڕێگەی بەکارهێنانی بەرد یاخود مەرمەڕ و چیمەنتۆ و شیشی هاوردەکراو، ژمارەی بینا و خانووەکان زیادی کرد، بێگومان بیناکانیش بەپێی نەخشەی نوێ دروستدەکران، بریتی بوون لە ژوور و هۆڵی فراوان و پەنجەرەی زۆر و بنمیچی چیمەنتۆ لەبری گوومەت، هێدی هێدی شێوازی بینای کۆن پاشەکشەی دەکرد، بۆ ئەوەی بوار بە شێوازی نوێی بینا بدات، هەروەك لەگەڵ ڕەوتی نوێگەرێتیدا زۆرێك لە دابوونەریت و شێوازەکانی ژیانی کۆن لەناوچوون.

لە سەرەتای ناوەراستی سەدەی پێشوو، قوتابخانە سەرەتاییەکان ژمارەیان کەمبوو، تەنیا لە قەزا و هەندێك ناحییە و گوندەکان هەبوون و تەنیا قوتابخانەی سەرەتاییشی لێبوو، تەنانەت هەندێك ناحییە هەبوون، وەکو ناحییەی (پێبان) کە ناوەندی گوندی (باوەنوورە) قوتابخانەی لێ نەکرایەوە تا کۆتایی ساڵانی پەنجاکان، هەرچەندە ناحییەیەکی کۆن بوو لە قەزاکە، هەروەك لە بەشی هەرمەزنی ناوچەی گەرمیان کە بریتی بوو لە قەزای کفری و خورماتوو و ناحییەکانی سەنگاو و قادر کەرەم و داقوق و قەرەتەپە، ژمارەی قوتابخانەکان تێدا لەباشترین حاڵەتەکاندا نەدەگەیشتە سی قوتابخانە، کردنەوەی هەر قوتابخانەیەك لە گوندەکان بە پرۆسەیەکی رۆتینی دوور و درێژدا تێدەپەڕی و خەڵك و حکومەت بەشدارییان لە دروستکردنی دەکرد، پرۆسەکەش بەم شێوەیەی بوو:

خەڵکی گوندێك کە دانیشتوانەکەی تا ڕادەیەك گەورەیە، ڕێك دەکەون، لە سەر پێویستی بوونی قوتابخانەیەك لە گوندەکەیان تاکو منداڵەکانیان فێری خوێندن و نووسین بن، ئەم ڕێکەوتنەش پێویستی بە هۆشیارییەکی و درکێکی زۆری خەڵکی گوندەکە بوو، دواتر گەورەی گوندەکە یاخود موختار یان کەسێکی خوێندەوار تا ڕادەیەك، ژوورێك دەبەخشێت، زۆرجاریش ژووری میوان دەبوو لەماڵەکەی خۆی، هەروەك بیناکردنی ژوورێك یان دوو ژوور دەگرێتە ئەستۆی خۆی ئەوەش یان بە پارەی خۆی یان بە هاوبەشی ژمارەیەك لە خەڵکی گوندە دروستیان دەکرد بۆ ئەوەی ببێتە ناوکی ئەو قوتابخانەیەی کە بڕیارە دروستی بکەن لە ئاییندەدا.

دواتر ئامارێك دەخرا، یاخود دەخەمڵێندرا لەبارەی ژمارەی ئەو منداڵانەی کە لە گوندەکە دەبێت بخوێنن، هەروەك ڕەزامەندییان لە کەسوکاری منداڵەکان وەردەگرت، دواتر کۆمەڵێك باوکی منداڵ یادداشتنووسێك (عەریزە) یەکیان دەنووسی بۆ بەڕێوەبەری ناحییە یاخود قایمقام، یان هەر بەرپرسێکی ئیداری ناوچەکە، یانیش بۆ پشکێنەری مەعاریف لە ناوەندی لیوا، تێدا داوای ڕەزامەندیی دەکەن بۆ کردنەوەی خوێندنگەیەك لە گوندەکەیان لەگەڵ بیانکردنی ئامادەییان بۆ دابینکردنی ژوورێك کە بکرێتە پۆل و ژوورێکیش بۆ مامۆستا و ژمارەی پێویستی قوتابی.

دوای ماوەیەك لە پێشکەشکردنی یاداشتنووسەکە، زۆرجاریش لەکاتی پشووی هاوین پێشکەش دەکرا یاخود پێشتری، پشکێنەری مەعاریف دەگەیشت لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحییە و بەرپرسی پۆلیس سەردانی گوندەکەیان دەکرد، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی مەیدانی دڵنیا بێت لە بوونی بینا و ژمارەی قوتابی و ئارەزووی خەڵکەکەی بۆ هاوکاریکردن و ئامادەییان بۆ پێشکەشکردنی پێداویستییەکان بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەك، پشکێنەریش ڕاپۆرتی خۆی دەنووسێت لەسەر بابەتەکە و لە سەر تیشکی ڕای پشکێنەر، نووسراوێك لە بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی لیواوە دەردەچێت تێدا ڕەزامەندی لەسەرکردنەوەی قوتابخانەیەکی نوێ بۆ فلانە گوند دەردەبڕێت، نووسراوەکەش گشتاندن دەکرێت بۆ قەزا و ناحییەکانی لیواکە، ڕەزامەندییەکەش لە سەرەتای مانگی ئەیلولەوە دەردەچوو، دواتر دەگەیشتە یەکێك لە مامۆستا تازە دامەزراوەکان، یاخود لە قوتابخانەیەکی دیکەوە دەگوازرایەوە بۆ گوندەکە، بۆ چەند ڕۆژێکیش دەبووە میوانی موختار یان شێخ و لەو کاتەشدا ناوی قوتابییەکان و پێداویستییەکانی قوتابخانەکەی دەنووسی و دەگەڕایەوە بۆ ناوەندی لیوا تاوەکو کار بۆ دابینکردنی پێداویستییە تایبەتەکانی قوتابخانەکە بکات و پێداویستییەکانی خۆشی ڕێك دەخست.

دوای ماوەیەکی کورت مامۆستا لە شارەوە بە ئۆتۆمبێلێکی کرێوە دەهاتەوە بە تەنیا یان لەگەڵ خێزانەکەی و هەندێك کەرەستەی ناوماڵی سادە و پێداویستی خوێندن و تەختەرەشێك و چەند قتویەك تەباشیر و ژمارەیەك ڕەحلە و کتێبی میتۆدی یەکی سەرەتایی و هەندێك قەڵەم و دەفتەر، تاکو دەست بەکار و دەوامی ڕەسمی بکات، یەکێك لە خەڵکی گوندەکەش هاوکاری دەکرد، دواتریش پێشنیار دەکرا بۆ ئەوەی ببێتە کارگوزار یاخود پاسەوانی قوتابخانەکە.

لەوانەشە بەخت خزمەتی هەندێك گوند بکات لە بابەتی کردنەوەی قوتابخانە، کاتێك پیاوماقوڵێك یاخود کەسێك لە دانیشتوانی گوندەکە چاوی بە بەرپرسێك یاخود کاربەدەستێك بکەوێت لە بەغدا یان کەرکوك، و داواکارییەکەی بەناوی گوندەکەوە پێ بدات و داوای هاوکاریی بکات بۆ ئاسانکاری کردنەوەی قوتابخانەکە، ئەو کات پێویستی بە پرۆسەی ڕەزامەندی و رۆتینیات ناکات، بەڵکو ڕەزامەندییەکە بەخێرایی دەدرێت و مامۆستا و



جەلال قەرەداغی ١٩٣٨

پێداویستییەکانیش بە زووترین کات دابین دەکرێت.

زۆربەی مامۆستاکانی ئەو سەردەمە لە دانیشتووی شار بوون و فێرە ژیانی گوند نەبوون، ئەو ژینگەیەی بۆی دەهاتن تازە بوو بۆیان، پێویستیان بە کات بوو تاکو لەسەری رابێن، ئەوان جیاواز بوون لە رووی جلوبەرگ و خواردن و پاکوخاوێنیان، هەروەك تەباخی ئەوتیی (پەرەمێز)یان بەکار دەهێنا لەبری زۆپای دار بۆ دروستکردنی چای و خواردن، هەروەك حەزیان بە خەوتنی سەر سیسەم بوو ئەگەر دەستیان بکەوتبا، ئەم جیاوازییەش سرنجی خەڵکی گوندی رادەکێشا و شەرمیان نەدەکرد لە پرسیارکردن لەکاروباری تایبەتی مامۆستا و چاوەڕێی وەڵامێکی دروست بوون، بە تێپەڕبوونی کات، مامۆستاکان سەرکەوتوو دەبوون لە دروستکردنی پەیوەندیی توند لەگەڵ خەڵکی گوندەکە، هەندێکیشیان خۆیان دوور دەگرت و تێکەڵ نەدەبوون و پەلەیان دەکرد بۆ گەرانەوە بۆ ژیانی شار.

بە تێپەڕبوونی کات و زیادبوونی ژمارەی قوتابیان و پۆلەکان، قوتابخانەکان فراوانتربوونەوە و بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفیش بەپێی پێداویستی مامۆستا کەرەستەی رەوانە دەکرد، هەندێك جاریش ژوورێکی دیکە دروستدەکرا، یاخود حکومەت قوتابخانەیەکی نوێی دروستدەکرد، لە هەندێك حاڵەتیشدا هەبوو ژمارەی قوتابیان کەمی دەکرد ئەوەش بەهۆکاری جیاواز بوو، دەرئەنجام قوتابخانەکە دادەخرا، یاخود دەگوازرایەوە بۆ گوندێکی نزیکتر.

دۆخی تەندروستی گشتی لەو کاتەدا بەپێی پێویست نەبوو، بەڵکو دەکرێت بڵێین دۆخی تەندروستی خراپ بوو، ژمارەی نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی و پزیشکان بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی هاووڵاتیان و پێداویستییە پزیشکییەکانیان نەبوو. بۆ نموونە: لە قەزای کفری لەو ماوەیەی کە باسمان کرد، تەنیا یەك دکتۆری موقیمی تێدا بوو، لەگەڵ چەند یاریدەدەر و پەرستارێك، بنکەیەکی تەندروستی لەسەرەتای پەنجاکان دروستکرا، بەڵام لە حاڵەتی چارەسەرکردنی نەخۆشییە مەترسیدارەکان و ئەنجامدانی نەشتەرگەری تەنیا لە ناوەندی قەزا و بەغدای پایتەخت ئەنجامدەدرا.

سەبارەت بە پزیشکی ددانیش، لە قەزاکاندا بوونیان نەبوو، یەکێك لە پەرستارەکان یاخود کەسێکی بە ئەزموون ددانی دەکێشا بەبێ پەنابردن بۆ کەرەستەی پێشکەوتووی پزیشکی وەکو ئێستا.

پزیشکی ژنانیش بوونیان نەبوو لە قەزا و ناحییەکان، هەندێك ژن هەبوون، ئەزموونیان هەبوو لە منداڵبوون پێیان دەوترا (مامان) هاوکاری دایکەکەیان دەکرد لەکاتی منداڵبووندا.

هەندێك گوندی گەورە و ناحییە هەبوو بنکەی تەندروستی تێدا بوو، تەنیا پەرستارێك یاخود یاردەدەرێکی پزیشکی تێدا بوو ئەوەش تەنیا فریاکەوتنی سەرەتایی و هەندێك دەرمانی پێشکەشی دەرکرد، زۆرجاریش نەخۆش رەوانەی قەزا دەکرا، بەڵام خەڵکێکی زۆر بۆ چارەسەرکردنی هەندێك نەخۆشی و برین پەنای دەبردە بەر پزیشکی گژوگیا و چەند دەرمانێکی عەشایەری دەروێش و شێخەکان.

پەتا و نەخۆشییەکانی مەلاریا و تیفۆ و سورێژە و کولێرا لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوو بەربڵاو بوو لە گوندەکان و ژیانی خەڵکی لەناودەبرد بە تایبەتی منداڵان، بەڵام هەڵمەتەکانی بەرەنگاربوونەوەی مەلاریا و پرژاندنی ماددەی ژەهراوی و کوتان لە دژی نەخۆشییەکان لەلایەن وەزارەتی تەندروستییەوە و بە هاوکاری رێکخراوی یونسێفی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجامدەدرا، ئەوەش رۆڵی گەورەی هەبوو لە کەمکردنەوەی مەترسییەکانی ئەو نەخۆشی و پەتاییانە، تا رادەیەکیش بە تەواوەتی ئەو نەخۆشییانە لەناوچوون.

لە قۆناغی سەرەتاییدا دەترساین لە تیمەکانی کوتان کە دەهاتن بۆ قوتابخانەکان، هیچ رێگایەکیشمان نەبوو بۆ هەڵهاتن لە دەرزی و کەرەستەکانی کوتاندن کە بەدەست پەرستارەکانەوە بوو، بە ترس و لەرزەوە ریز دەوەستاین و مامۆستاش سەرپەرشتی دەکردین، پەرستارەکانیش دەرزیان لێدەداین، ئەو هەڵمەتانەش رۆڵی هەبوو لە کەمکردنەوەی تووشبوون بەو نەخۆشیانەی کە لەساڵانی رابردوو خەڵکێکی زۆری کوشت.

لەکاتی خوێندنی ناوەندی بەپێی رەزامەندی چاودێر سەردانی بنکە تەندروستییەکەمان نەدەکرد وەکو سەردەمی سەرەتایی، بەڵکو هەر خوێندکارێ ئەگەر ئازاری هەبوایە یاخود نەخۆش بوایە سەردانی ئیدارەی دەکرد و نووسراوێکی رەسمی پێدەدرا بۆ ئەوەی لە نەخۆشخانە چارەسەر بکرێت، هەروەك ئۆتۆمبێلی ئەمبولانس و بەشی فریاکەوتن لەو رۆژانەدا بوونیان نەبوو، بەڵام لەدوای

ناوەراستی پەنجاکان باری تەندروستی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی بە گشتی لە ڕێگەی (دروستکردنی ژمارەیەك بنکەی تەندروستی و کردنەوەی بەشی نوێ، لەوانە بەشی فریاکەوتن و هاوردەکردنی ئەمبولانس و زیادکردنی ژمارەی پزیشکان لە قەزا و ڕەوانەکردنی ژمارەیەکیشیان بۆ ناحییە قەرەباڵغەکان.

سەرەڕای کەمی خزمەتگوزاری تەندروستی و خراپی ئاستی خۆراك بە گشتی و کەمی ئەو مێوەیەی کە ئێستا دەیخوێنن، یاخود هەندێکیان هەر بوونیان نەبوو، بەڵام دۆخی تەندروستی گشتی خوێندکاران بە تایبەتی لە ناوەندی و ئامادەیی لەسەرووی مامناوەندەوە بوو، بەدەگمەن خوێندکار تووشی نەخۆشییەکانی ئەم سەردەمە دەبوو وەکو (خەمۆکی) و نزمبوونەوەی گوشاری خوێن و نەخۆشییەکانی دڵ و بڕبڕەی پشت، شێوازی ژیان سادە بوو دوور بوو لە ئاڵۆزی، خەڵك سەرقاڵی کارکردن و خوێندن بوو، دەورووبەرەکەش دوور بوو لە پیسی و خواردنی قتووکراو و مادەی پارێزگاری خواردن، بەڵکو خەڵك قەناعەتیان هەبوو بەوەی هەیە لە خواردنی ناوخۆی تەر و تازە و کەس بەدوای شتی تەواوکاری نەدەگەڕان، هەموو ئەوانە کاریگەری ئیجابی هەبوو لەسەر باشترکردنی دۆخی تەندروستی خوێندکاران و گەنجانی ئەو سەردەمە.

سەبارەت بە جلوبەرگ و گرنگی دان بە مۆدێل، ئەوە خوێندکارانی ناوەندی و ئامادەی هێندە جلوبەرگیان هەبوو کە پێویستیان پێ بوو لە خۆپارێزی لە گەرمای هاوین و سەرمای زستان، بەبێ ئەوەی زیادەڕەوی بکەن و بگەڕێن بەدوای شتی نوێ و تازە، وەکو پێلاویش بۆ هەر وەرزێکی خوێندن یەك جووتیان هەبوو، هەندێك جاریش بۆ یەك ساڵی تەواو بەکاریان دەهێنا، خواردنیش زۆر سادە بوو، خەمی خوێندکار لەکاتی خوێندیدا تەنیا گرنگی دانی جددی بوو بە وانەکانی و هەوڵی سەرکەوتن و دەرچوونی دەدا بۆ پۆلێکی بەرزتر و کەمکردنەوەی ئەرکی کەسوکارەکەی، بەشێوەیەك کە داواکارییەکی نەدەکرد کە لەتوانای ئەواندا نەبێت.

ژمارەیەکی کەم هەبوون زیادەڕەویان دەکرد و بەدوای شتی گران و جلی تازە و نامۆ دەگەڕان و پرچەکانیان درێژدەکرد و لاسایی گۆرانیبێژ و ئەکتەرەکانیان دەکردەوە لە تەسریحەی پرچ و جلوبەرگ و جلەکانیان، ئەوان لەگەڵ ئەوەی لەلایەن ئیدارەوە لۆمە دەکران، بەڵام لەلایەن خوێندکارانیشەوە جێی گاڵتەجاری بوون بۆ خوێندکارانی پۆل، بەڵام ئەوان گرنگیان نەدەدا و پێیان وابوو کە ئەوە دەستوەردانە بە کاروباری تایبەتی مرۆڤ و ئەوان ئازادن لەوەی چی لەبەردەکەن.

بەڕێز مستەفا سەید ئەحمەد کە بە (نەریمان) ناسراوە، یەکێك بوو لە مامۆستا دیارەکان، خەڵکی ناوەندی قەزای کفری بوو و لەوانە بوو کە ڕۆڵیان هەبوو لە فێرکردنی ژمارەیەکی زۆری خوێندکارانی گوند و ناحییەکانی گەرمیان لە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی ڕابردوو، لە چەندین کتێبی بەنرخدا ئەزموون و کێشەکانی پەروەردەی خستە ڕوو و بۆ چەندین جاریش کتێبەکانی چاپکرانەوە، مامۆستا مستەفا ئەزموونەکانی و هەڵسەنگاندنەکانی بۆ شێوازی ژیان بەگشتی لەو سەردەمە خستە ڕوو لەبارەی پەروەردە و فێرکردن بە تایبەتی لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو و ئەو کتێبانەش وەکو سەرەداوێکی دۆکیۆمینتاری بوو بۆ توێژەران لەبارەی ئەو کاتانە.

چەندین خوێندکاری گوند و ناحییە و قەزاکانی سەر بە لیوای کەرکوك توانیان بچنە دارولموعەلمینی سەرەتایی لە سەرەتای چلەکاندا و لێوە دەرچوون و دابەشبوون بەسەر گوند و قەزاکانی گەرمیاندا و بۆ یەکمجار قوتابخانەیان تێدا کردەوە، بەر لەوەی داروموعەلمینی گوندەکان هەبوو دەرچووی خوێندکاری سەرەتایی وەردەگرت و دوای چوار ساڵ لە خوێندن، ئامادە دەبوو بۆ ئەوەی ببێتە مامۆستای سەرەتایی.

یەکەم قۆناغی دەرچووی مامۆستا کۆنەکانیش لە کۆتایی سییەکان و سەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابردوو بوو، دەرچووی دارولموعەلمیی گوندەکان بوو، بەڕاستی مامۆستای لێهاتووبوون و سەرکردەی پەروەردەیی بوون، خزمەتی باشی بواری فێرکردن بوون و زۆر بە دڵسۆزانە و بەجدییەوە کاریان کرد و لەسەر دەستی ئەوان نەوەیەکی خوێندەوار دەرچوون، هەندێکیان ڕوویان کردە کاری ئازاد و هەندێکیشیان پێیان باش بوو لە وەزیفەی حکومەتی ڕەسمی کار بکەن، هەندێکیشیان ڕۆڵی گەورەیان بینی لە پێشکەوتنی پەروەردە و فێرکردن لە ناوچەکە، هەندێکیشیان بەردەوام بوون لە خوێندن بۆ خوێندنی باڵا و پلەی زانستی بەرزیان بەدەستهێنا، هەندێکیان پۆستی ڕەسمی باڵایان وەرگرت، وەکو سەرۆکایەتی وەزیران و وەزارەتی ناوخۆ و ئەندام پەرلەمان، هاوشێوەی ئەحمەد موختار بابان و عومەر نەزمی و مەحمود بابان و موکەرەم تاڵەبانی و سوعاد ئەلوەنداوی و محەمەد فەتاح ئەلجاف و محەمەد ئەلحاج عوران و چەندینی تریش..

لێرەشدا ناوی هەندێك لەو مامۆستایانە بیردەهێنمەوە کە سەرکردە و دیاری بوون لە بڵاوکردنەوە و فێرکردن لە ناوچەی گەرمیان و لە بارودۆخی قورسدا کاریان کرد و لە ڕۆژانێك بوون جیاواز لە ڕۆژانی ئێمە و زۆر دڵسۆز و جددی بوون لە کارەکانیان:

مامۆستا سوبحییە سابیر شاکر، خالد موفتی ئەفەندی، غەریب دەروێش مستەفا سەید ئەحمەد محەمەد، ئەحمەد قەرەداغی، نازم ئیبراهیم قەدۆ، ئیبراهیم سەید گوڵ، بەهجەت وەنداوی، محەمەد قەدۆ، مەجید ئەفەندی عەبدولقادر، حەسەن عەباس ڕەزا، فەرمان سەعید چەلەبی، عەبدولقادر محەمەد عەلی، عەزیز مەلا ڕاغب، محەمەد ڕەشید سەحەر، ئەحمەد محەمەد دەروێش، حەکیم قەدۆ، نەجمەدین محەمەد فلەیح، عەبدولقادر سبیلچی، ڕەشید حەیات، محەمەد بلە سوور، ڕەفعەت فەتاح، حوسێن حەسەن فەتاح، مۆفەق شەفیق، جەلال حوسێن قەرەداغی، سەلاحەدین مەجید عەلی، باقی ئەلحاج سەمین، عومەر ئەلحاج فەتاح، نەجیب موسا وەنداوی، ئیبراهیم کەریم، عەبدوڵا کەریم چایەچی، محەمەد خدر دەباغ، سەلمان قادر، کامل سەید محەمەد، بەهجەت

بەدری، خورشید عەزیز، مستەفا یا مولکی، نەجمەدین حەسەن قەرەداغی، حوسێن عەلی چایەچی، حەسیبە جەمیل وەنداوی، عەبدولقادر بەهجەت، شەکیبە محەمەد، کامیل شەفیق و چەندینی تریش.

بێ گومان ناوی دیکەش هەن، لێرەدا بۆم نەکرا باسی بکەم، لەگەڵ ئەوپەڕی داخم.

لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان ژمارەیەکی زۆریش لە خوێندکارانی پەیمانگا و دووروولموعەلیمین و کۆلێژی پەروەردە، بە تایبەتی لەدانیشتوانی گوند و ناحییەکانی گەرمیان، هەروەك لەناوچە ڕەسەنەکانی خۆیان کاریان کرد، یاخود لە قەزاو ناحییەکاندا بوون بە مامۆستا و ڕۆڵیان گێڕا لە پێشخستنی پرۆسەی پەروەردەیی، لەنموونەی ئەوانەش:

عوسمان مەلا مستەفا، حەسەن عەلی بەگ، حوسێن مەحمود کەلاری، ئەفراسیاب و مەحمود ئەحمەد خزر، عومەر کوێخا، محەمەد گلی، قادر محەمەد باییز، محەمەد شێخ ئەحمەد، فائیق عەزیز ئەلوەنداوی، کەمال و جەمال حەمەشێت، دەمیر محەمەد عەلی، سلێمان حەسەن، سابیر قادر، سابیر عەزیز، عەبدولقادر لەتیف، سلێمان سەعید، سەلاح عەلی، ئەحمەد عەلی نادر، کەمال حوسێن قەرەداغی، ڕەحیم عەبدولکەریم، چەندینی تریش.

ئێستاش دوای تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ بەسەر ئەوەی باسمان کرد لە ڕووداو بارودۆخە جیاوازەکان، ئەوەی گێڕامانەوە لەبارەی واقعی پەروەردە و فێرکردن لەو سەردەمەدا و هەروەها ژیانی خەڵك بە گشتی و خوێندکاران و مامۆستایان بە تایبەتی، جیاوازییەکی فراوان بەدی دەکەم کە بۆ بەراوردکردنی سادە و ئاسان ناشێت، ئەمەش کارێکی سروشتییە و دەبێت وا بێت چونکە ژیان لە پێشکەوتندایە و ئەم پێشکەوتنە هەنگاوەکانی خێراتر کردووە لەماوەی چەند دەیەی دواییدا، تا ئەو ئاستەی کە مرۆڤ هەست بە ماندوویی و شەکەت دەکات بۆ ئەوەی بگاتە کاروانی پێشکەوتنی خێرا.

ئامانجم لە نووسینی ئەم بابەتە، لەگەڵ ئەوەی هەستم بە جۆرێك لە دڵخۆشی کرد بەگەڕانەوەم بۆ ڕابردوو، کێشانی وێنەیەکی واقعییە لەبارەی دۆخی پەروەردە و خوێندن لەو ڕۆژانەدا و خستنە ڕووی بۆ بەردەم نەوەی ئێستا، بۆ ئەوەی وێنایەك لەبەردەمیان بێت لەسەر چۆنییەتی ژیانی باو وباپیرانیان، کە چۆن فێربوون و پەروەردەکران لە بارودۆخێکی جیاواز لە ئێستادا.

**ناوی مامۆستا پێشەنگەکان لە مامۆستایانی قوتابخانەی کفری یەکەمی سەرەتایی**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ | هارون ئەحمەد | ١٩٢٠/٩/١ تاکو ١٩٢٦/٩/٢٦ | لە جووەکانی عێراق بوو |
| ٢ | ئەحمەد حەمدی نادر | ١٩٢١/٩/٢٧ تاکو ١٩٢٣/٩/٣٠ | |
| ٣ | جەمیل سالح مەدقەعی | ١٩٢٣/١٠/١ تاکو ١٩٢٣/٩/١٠ | |
| ٤ | ڕەشید زەکی کابان | ١٩٢٤/٩/١١ تاکو ١٩٢٧/٩/١٥ | |
| ٥ | ئەحمەد فایق | ١٩٢٥/٩/١٦ تاکو ١٩٢٧ /٩/١٢ | |
| ٦ | سەعید بەسیم | ١٩٢٥/٩/١٣ تاکو ١٩٢٦/٩/١٢ | |
| ٧ | ڕەشید عاکف هورمز | ١٩٢٧/٩/٢٢ تاکو ١٩٣٥/٩/٨ | |
| ٨ | فاتیح مستەفا | ١٩٣٥/٩/٩ تاکو ١٩٣٦/٩/١٤ | |
| ٩ | سەعید بەسیم | ١٩٢٨/٩/١٥ تاکو ١٩٣٧/١٠/٨ | جارێکی تر خزمەتی کردووە |
| ١٠ | عەبدولحەکیم مستەفا | ١٩٣٧/١٠/٩ تاکو ١٩٣٩/١٠/١٧ | |
| ١١ | محەمەد نەجم عەبدولا | ١٩٣٩/٩/٢٨ تاکو ١٩٥٩/٩/٢٥ | |
| ١٢ | خالد سەعید ئەلموفتی | ١٩٥٩/٩/٢٦ تاکو ١٩٦٣/٨/٣١ | |

**ناوی مامۆستا ژنە دیارەکانی پێشەنگ لە قەزای کفری**

| | | |
|---|---|---|
| ١ | سەبیحە سابیر عەبدولمەجید | ١٩٣٥/١٢/٣ تاکو ١٩٤١/١١/١ |
| ٢ | فاتمە حەسەن عەبدولا | ١٩٤١/١١/١ تاکو ١٩٥٠/١٠/٨ |
| ٣ | حەسیبە جەمیل ئیسماعیل | ١٩٥٠/١٠/١ تاکو ١٩٦٠/١٠/١ |
| ٤ | شەکیبە محەمەد فلەیح | ١٩٦٠/١٠/١ تاکو ١٩٧٥/١٠/٢ |
| ٥ | د. سوعاد بەهجەت ئەلوەنداوی | خوێندنی سەرەتایی لە کفری و خوێندنی زانکۆی لە بەغداو خوێندنی باڵای لە دەرەوەی عێراق تەواو کردووە |

| ناوی قۆناغی یەكەمی كچە خوێندكارەكانی خوێندنگەی كفری تێكەڵاو ساڵی ١٩٥٤ ، ١٩٥٥ | |
|---|---|
| ١ | نەسرین عەبدولقادر بابان |
| ٢ | موعەزەز خزر دەباغ |
| ٣ | رابیعە مەجید |
| ٤ | گەزیدە مستەفا |
| ٥ | مەعسومە عەزیز |

**لیستی ناوی كەسایەتییە دیارەكان كە بۆیان نەكرا خوێندن تەواو بكەن**
**ناوی ژمارەیەك خوێندكاری قوتابخانە و خوێندنگای كەلار و كفری سەرەتایی كە بە هۆكاری جیاواز نەیانتوانی خوێندن تەواو بكەن و سوودیان لەو خوێندنە وەرگرت كە بۆ ماوەیەك فێری بوون و رۆڵی گرنگیان بینی لە ژیانی كۆمەڵایەتی و سیاسی ناوچەكە**

**١- محەمەد سەعید جاف . كەلار**
**٢- عەلی سەلیم بەگ . كەلار**
**٣- مستەفا كەریم جاف . كەلار**
**٤- ئەحمەد برا حەمە . كەلار**
**٥- خالد رەزا بەگ . كەلار**
**٦- حوسێن حاجی محێدین . كەلار**
**٧- مەحمود رەزا بەگ . كەلار**
**٨- سابیر عەزیز فارس . كەلار**
**٩- فەتاح عەزیز . كەلار**
**١٠- ئەحمەد فەتاح رۆستەم . كەلار**
**١١- شێخ كەریم شێخ محەمەد . كەلار**
**١٢- ئەحمەد مەحمود كەلاری . كەلار**
**١٣- محەمەد شێخ سلێمان . كەلار**
**١٤- فایەق حاج محەمەد . كەلار**
**١٥- ئەكرام شێخ حەسەن . كەلار**
**١٦- محەمەد عیسا . كەلار**
**١٧- حوسێن ئەلحاج سەمین . كفری**
**١٨- حیكمەت حەكیم وەنداوی . كفری**
**١٩- حوسێن حاجی ئەمین . كفری**
**٢٠- عەلی قەدۆ . كفری**
**٢١- سەعید جەعفەر . كفری**
**٢٢- ئەحمەد حاجی سەمین . كفری**
**٢٣- عەدنان مستەفا . كفری**
**٢٤- ئاسۆ مەحمود رەزا ئەلجاف . كەلار**
**٢٥- شێخ عەتا تاڵەبانی . كفری**
**٢٦- حوسێن سەید محەمەد. كەلار**
**٢٧- سالار كەمال بەگ . كەلار**
**٢٨- مەحمود حاجی محەمەد ئەڵماس . كەلار**
**٢٩- رەشید كازم . كفری**
**٣٠- ئیحسان حاجی محەمەد . كفری**
**٣١- عەزیز كاكە حەمە . كفری**

*** خوێندنی کوردی کەرکوکی کوردانی نەوت**

**غازی حەسەن**

کەرکوك بەهۆی ئەوەی نەوتی تێدایەو شارێکی گرنگە، یەکێکە لەو شارانەی بەردەوام تەعریب دەکرێتەوەو حکومەتەکانی ناوەند دان بەوەدا نانێن کە ئەم شارە کوردییەو زمانی خوێندنی بە کوردی تێدا قەدەغەیە، زوڵمێکی زۆر لە هاووڵاتییانی کورد دەکرێ تا دەگاتە بە زۆر (راستکردنەوەی نەتەوە)و گۆڕینی نەتەوە لە کورد بۆ عەرەب، ئەگەر نا جێهێشتنی شارەکەو دەرکردنیان بۆ ناوچەکانی (حوکمی زاتی!!) کە تەنیا (هەولێرو سلێمانیو دهۆك) دەگرێتەوە، کەرکوكو هەندێك شارو ناوچەکانی تر دابڕێنراون لە کوردستان.

مەسەلەی خوێندن بە زمانی کوردیش هەروایە، مەگەر دوای رێککەوتنی ئازادی (١٩٧٠) دەرفەتێکی بۆ خوێندنی کوردی رەخساندبێت، ئەگەر نا ئەم شارە رۆژ بەرۆژ مەترسیدارو ئاشکراتر کەوتووەتە بەر چەپۆکی چەوسانەوەو سڕینەوەی ئاسەواری کورد[1].

لە چوار ساڵی رێککەوتنامەی (١٩٧٠- ١٩٧٤) ژمارەیەکی باش لە قوتابخانەی کوردی لە کەرکوكو دەوروپشتی کرایەوە.

راستە بەناوی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری ژمارە (٣١) لە (١٩٧٤/٣/٢٦) لەمەڕ خوێندنی زمانی کوردی لە ناوچەکانی دەرەوەی بەناوی سنووری حوکمی زاتیدا، لە ناوەراستو خوارو دەرسی زمانی کوردی دەخوێندرا، بەڵام کەرکوك لەم رووەوە زۆر چەوساوەتەوە.

دوای نسکۆی (١٩٧٥) ئابلۆقەیەکی توند لەسەر خوێندنو رۆشنبیری کوردی لە کەرکوك لە ئارادا بوو. هەموو قوتابخانە کوردییەکان ناوی بۆ عەرەبی گۆڕا، یا نەمان کە ئەمانە چەند نموونەیەکییەتی.

قوتابخانەی سەرەتایی:-

قوتابخانەی (پیرەمێرد) لە گەڕەکی ئیسکان کرایە (بەکر)، قوتابخانەی (مەولەوی) بۆ (ئیدریسی)و (هەڵمەت) بۆ (ئەلعراقیە)و (بەرزانی) بۆ (ئوم ئەیمەن)و (بێکەس) بۆ (ئەلحەسەن ئیبن ئەلهەیسەم) گۆڕدران.

قوتابخانەی ئامادەیی:-

ناوی (ئامادەیی ١١ی ئازار) یان بۆ (میسلون) گۆڕیو (کاوە) بۆ (معاذ بن جبل)و (رێزان) بۆ (ئەلرافیدەین)و (ئامادەیی کوردستان) بۆ (عبد الملك بن مروان)و (زێوەر) بۆ (ئەندەلوس) گۆڕدران. ئەم قوتابخانانەش نەهێڵدران، ناوەندی باباگوڕگوڕو شۆڕشو ئامادەیی کوردستان[2].

لە درێژەی باسی خوێندن لە شاری زۆر لێکراوی کەرکوك، مامۆستا مستەفا نەریمان وەها باسی خوێندەواریو خوێندن لەنێو شاری کەرکوك لە سییەکان دەگێڕێتەوە لە سییەکاندا قوتابخانەیەکی ناوەندیو دواناوەندیو ئامادەیی لە پارێزگای کەرکوکدا هەبوو، لەو ناوچانەی سەر بە کەرکوك بوون قوتابخانەی سەرەتایی هەبوو لە پارێزگاکانی (هەولێرو سلێمانی) سەرو قوتابخانەیەکی ناوەندی هەبوو، دەرچووانیان دەهاتن لە کەرکوك دواناوەندییان تەواو دەکرد لەبەر ئەمە قوتابخانەی ئامادەیییەکەی کەرکوك بوو بە مەڵبەندی یەکترناسینی قوتابییانی ئەو سێ پارێزگایە.

ئێمە بیست قوتابی بووین چووینە تاقیکردنەوەی بەکالۆریا شانزدەمان سەرکەوتین لەم شانزدە قوتابییانە دوانیان لەبەر دەستکورتی قوتابخانەیان تەرك کردو چواریشیان چوونە (دار المعلمین ریفی) لە رۆستەمیەی بەغدا. ئەوەی دوایمان لە قوتابخانە ناوەندییەکانی (بەعقوبە، سلێمانی، کەرکوك) چوونە بەر خوێندن لەوانەی چووینە قوتابخانەی ناوەندی کەرکوك ئەم قوتابییانە بووین (حوسێن حاجی سەمین، جەلال رەشید، محەمەد ئیسماعیل، وەهاب قەمەر، مەدحەت ئیبراهیم، پێش ئێمەش ئەو قوتابییانەی کفری لە ناوەندی کەرکوك دەیانخوێند (خورشید کازم، برایم حاجی حوسێن، جەلال مستەفا رێژی، عەبدولقادر محەمەد عەلی زەنگەنە، ئەحمەد قەرەداغی).

ئەوسا بودجەی عێراق کەم پارە بوو، قوتابی لە پلەی ناوەندی ساڵانە دوو دیناری دەدا، قوتابیی هەژار لەم پارەیە دەبەخشران. لە کەرکوك ئاسیاو سەریان لێدەداین، مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانی مەلای مزگەوتی قەردارەکان بوو، دەچووینە زیارەتی و رێزی دەگرتینو ئامادەی یارمەتیدانمان بوو. لەو ساڵانەدا لە عێراق مامۆستا بۆ قوتابخانەکانی ناوەندیو ئامادەیی ئەوەندە نەبوو، لە سوریاو لوبنانو فەلەستینەوە مامۆستامان بۆ دەهات. لە باسی چلەکاندا کاتی شۆڕشی مارسی (١٩٤١)، لە بارەی خوێندنەوە دەڵێ: حکوومەتی نوێی بەریتانیا دژی قوتابی وەستاو بەکەلۆریا دواخرا لە سەرەوەش پێش هەفتەیەك لە ئەیلوول تاقیکردنەوەی بەکەلۆریا جاردرا پرسیارەکانیش زۆر قورس بوون، ئیکمال لە ئارادا نەما، یان دەرچوون یان دواکەوتن. لە پۆلی سێیەم (١٥٠) قوتابی چوونە تاقیکردنەوە (١٦) مان سەرکەوتینو ناچار ئەوانەی دیکەمان ماینەوە بۆ ساڵی داهاتوو لە پۆلی سێیەم دەوامیان دەکردەوە[3].

بەپێی سەرژمێرییەکی تر ژمارەی قوتابخانەکانی کەرکوك لە سەردەمی دەسەڵاتی عەبدولسەلام عارف لە خوار ژمارەی قوتابخانەکانی شارەکانی تر بوو، بەتایبەتیش لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا.

**ژمارەی قوتابخانەکانی ناوەندیو سەرەتایی ڕەسمی (بێ قوتابخانەی تایبەتیو ئەهلیو بیانی شەوانە) لە ساڵی خوێندنی (١٩٦١- ١٩٦٢) لە کوردستاندا.**

| ناوی لیوا | ژمارەی قوتابخانەی ناوەندی | ژمارەی قوتابخانەی سەرەتایی | خانەی مامۆستایانی کوڕو کچ | ژمارەی دانیشتووانی لیواکە |
|---|---|---|---|---|
| مووسڵ | ٣٦ | ٤٧١ | ٢ | ٧٦٣٨٦٠ |
| هەولێر | ١٧ | ٢٣٦ | ٢ | ٢٨٢٤٨٧ |
| سلێمانی | ١٩ | ٢٢٩ | ٢ | ٣١٦٨٣٣ |
| کەرکوک | ١٥ | ٣٣٢ | ٢ | ٤٢٢٥٠٨ [٤] |

وەکو دەزانین بەهۆی سیاسەتی نەژاد پەرستانەی نەتەوەییو هەوڵدان بۆ گۆڕینی سیمای کوردیی ئەم شارە، بەتوندی کەوتوونەتە نانەوەی جیاوازیی نەتەوایەتیو نەهێشتنو ڕێگەگرتن لە بڵاوبوونەوەی خوێندن بە زمانی کوردی. لەم بارەوە کەرکوک بەزەقیو ڕاستەوخۆ کەوتووەتە ژێر فشاری دوژمنانەوە، ئەم سیاسەتەش لە کۆنەوە هەبووەو ئەمڕۆش لە جاران پتر بووەو پەرەی سەندووە. لە سییەکانەوەو جیاوازی نایەکسانی لەنێوان نەتەوەکانی ناو کەرکوک پیادە کراوە، (٢٤٪)ی مووچە خۆرەکانی کورد دانراونو لە کۆی (٢٤) قوتابخانەش لە هەموو لیواکە تەنیا (١٣) قوتابخانەی کوردی هەبووە[٥].

ئەم حاڵەتە تا ڕێککەوتنی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) درێژەی کێشا، لەو چوار ساڵەشدا (خوێندنی کوردی) دوای هەوڵێکی زۆر ئینجا جێبەجێکراوە. یەکێتیی قوتابییانی کوردستان. بەخورتی کەوتوونەتە کارکردنی بۆ جێبەجێ بوونی خوێندن بە زمانی کوردی لەم شارەدا.

بڕیار وا بوو لە ساڵی خوێندنی (١٩٧١- ١٩٧٢) لە ناوچە کوردنشینەکانی کەرکوکدا خوێندن بکرێتە کوردی، بەڵام کاربەدەستان کۆسپیان دروست دەکرد. دەیانگوت دەبێ پێ بەپێو وردە وردە پۆل بە پۆل بکرێتەوە، ئەمەش بیانو بوو، یەکێتی قوتابییانی کوردستان - لقی کەرکوک ئەوکات بۆ فشار خستنە سەر دەسەڵاتداران بۆ خێرا ڕێگەدان بە خوێندنی کوردی ڕاپرسییان لە کفریو کەلار تا پردێو ئاغجەلەرو سەنگاو تا ڕێبازو حەویجەش ئەنجام داوە، ئاکام لە قازانجی خوێندنی کوردی کار بەرەو پێشەوە چووە، بەڵام بەرپرسانی پەروەردەی کەرکوک بەبیانووی ئەوەی هەموو قوتابییانی کەرکوک کوردنین هەڵسان لەناو قوتابییانی ناوەندیو دواناوەندی ڕاپرسییان کرد، ئەویش لە قازانجی خوێندنی کوردی تەواو بوو، بۆ جارێکی تر بەبێ ئاگاداری یەکێتی قوتابیانی کوردستان ڕاپرسییەکی تازەیان کردو ئەویش لە قازانجی خوێندنی کوردی تەواو بووە ئەگەرچی هەرەشەو چارەسەرکردنەوەشی لەگەڵ دابوو. لەم پێناوە یەکێتی ناوبراو خۆپیشاندانی سازداو لە ئاکامدا پرۆسەی خوێندن پەکی کەوت. (لجنة شؤون الشمال) هاتو جارێکی تریش هات، لە جاری دووەم خۆپیشاندان لە ئامادەیی کەرکوکی کوڕانو ئامادەیی کەرکوکی کچان ڕەحلەکانیان هێنایە سەر شەقام[٦].

مەسەلەی خوێندن بەزمانی کوردی لە شاری کەرکوکی ئەوتدا پێویست بە پێداچوونەوەو بیرەوەریی نووسینەوە هەیە. شارێکی کۆن، دەیان زاناو شاعیرو نووسەرو ناوداری گەورەی کوردی لێ هەڵکەوتووە. لە سییەکانو شەستەکان بەم جۆرە، سیاسەتی نەژاد پەرستیو جودا خوازییان دژی بەکارهێناوەو لە (١٩٧٠- ١٩٧٤)یش مەسەلەکە توندتر کەوتووەتە ناو باسانەوە. دوای ناونانی ئامادەیی کوڕانی (کوردستان)و (ئامادەیی کچان بە چەمی ڕێزان) ناحەزانی کورد پتر کەوتوونەتە گومانو فشارهێنان، ئەم جارەیە بە بیانووی نەبوونی مامۆستا ویستوویانە پەکی خوێندنی کوردی بخەن، بۆیە کەوتوونەتە خۆ ومامۆستای (متطوع) کەوتوونەتە دەرس گوتنەوە بۆ ئەوەی خوێندن بە زمانی کوردی بەردەوام بێ، لەناو شاردا مامۆستای کوردیو ئاشووری لەخۆ بردووانە بێ پارە دەستیان بە دەرس گوتنەوە کردووە، مامۆستاکانیش هەندێکیان ئەمانە بوون. (محەمەد مەجید ژەنگاری بەڕێوەبەری ئامادەیی کوردستانی کوڕانو سەمیرە موفتی بەڕێوەبەری ئامادەیی چەمی ڕێزانی کچان. ئەم مامۆستایانەش ناویان تۆمارکراوە. محەمەد پیرۆز، سوبحی داودی، محەمەد ڕەشید مەلا عومەر، ئەحمەد مەلا کەریم، سەرمەد زەکۆ (ئاشووری بوو)، جوان نامیق، نەوزاد محەمەد سالح، ست سامیە (ئاشووری بوو)، یووسف سەعید، نەجمەدین کەریم حاجی، شێرزاد عەبدولواحیدو دەیانی تر. بەم جۆرە خوێندنی کوردی بووە واقیعو لە پۆلی یەکی سەرەتاییەوە تا شەشی ئامادەیی قوتابییان دەرسەکانیان تێکڕا بە کوردی دەخوێند[٧].

خوێندن بە زمانی کوردی لەم شارە دێرین و مەزنەدا، گەلێك بەسستی و کزی بەڕێوەچووە. هەرچەندە گیانی کوردایەتی و نیشتیمان پەروەری بەهێز بووە، بەڵام ئابلوقەیەی توند خراوەتە سەر کوردەکانی ئەم شارە لە باری ڕۆشنبیری و بەکارهێنانی زمانی کوردی. تا دەگاتە ئەوەی جارێکی لە چوارچێوەی ڕاگواستن و بەعەرەبکردنی دەسەڵاتدارانی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٠) ڕایانگەیاند کە بە ڕەسمی زمانی کوردی لە قوتابخانە کوردییەکان قەدەغەیەو هەرچی سەرپێچی ئەم بڕیارەش بکات، بەتوندی سزا دەدرێ.

***کفری و قوتابخانەی کچان**

ساڵی (١٩٣٣- ١٩٣٤) یەکەم قوتابخانەی کچان لە کفری کراوەتەوە. بەهەر حاڵێك دە پانزە کچ پەیدا کرا، خانووەکەی عوسمان ئەفەندییان بۆ گرت کە لەناو کۆڵانێکدا بوو، مامۆستایەکی ئافرەت ناوی (ئەماستیك) بوو لە کەرکوکەوە نەقڵ کرا، ئەویش هەر عەبای بەشانەوە بوو، بەڵام پێچەی بەڕووەوە نەبوو. بووە سەیرکەری خەڵکەکە، ڕۆژێکیان شاگرد خەیاتێك خۆی سەرخۆش کردو ولە پێچی کۆڵانەکەدا پری بردە سەر (ئەماستیك) و ماچی کرد، ئەو ئافرەتە بەستەزمانە ڕۆژی دووەم گەڕایەوە کەرکوك و ئەو ساڵە قوتابخانەکە داخراو کورە خەیاتەکەش شەش مانگ حەپس کرا[8].

لەمەر خوێندن لە شاری کفریی سەر بە کەرکوك، مامۆستا مستەفا نەریمان لە یادداشتەکانیدا بەم جۆرە باس لە وەزعی پەروەردەی کفری و ناوچەکانی دەوروپشتی دەکاو دەڵێ:

ساڵی (١٩٣١) چوومە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی سەرەتایی و لە پۆلی پێنجەم (٥) کورە. بەگزادەش لە کەلار هاتنە قوتابخانەی کفری، لە قەرەتەپەش دوو قوتابیی تر هاتبوونە هەمان قوتابخانەو لە هەمان پۆل، چونکە لەم دوو شوێنە هەتا پۆلی چوارەم قوتابخانەیەکی ئەوەلی هەبووە. بەڕێوەبەری قوتابخانەمان ڕەحمەتی (ڕەشید عاکف هورمزی) بوو، لە پۆلی شەشەم (سەعید بەسیم) لە کەرکوکەوە هات و بووە بەڕێوەبەر. ئەم زاتانەش مامۆستا بوون (خلووس بەگ، ئامیق ئەفەندی کەرکوکی، جەلال ئەحمەد کەرکوکی، حاجی مەلا حوسێن، حەکیمی مستەفا ڕێژی، مستەفا ئیبراهیم، بەهجەت فەتاح، وەناوی، مەجید نەجم). سەرجەم مامۆستاکانمان تورکمان بوون، هەندێکیان تورکچێتیشیان دەکردو کتێبی تورکییان بەسەرماندا دابەشدەکرد. ئەو کتێبانەی کە لە تورکیا لە سەردەمی مستەفا کەمال دەخوێندرا بەهۆی بڵاوبوونەوەی پیتی لاتینی لە ساڵی (١٩٢٨) لەغو کرابوون، من لە پێشدا تورکمانیم نەدەزانی، ناچار نیشتمە سەری و فێری بووم، هەندێك لەو مامۆستایانەمان ڕقیان لە قوتابییە کوردەکان دەبووەوە بە زۆری زۆردار تەنگیان پێهەڵدەچنین. باوکی ڕەحمەتیم لە سییەکانەوە تا پەنجاکان لەچاو ئەو ڕۆژگارە لە ڕیزی ناودارو ڕۆشنبیرو دەوڵەمەندەکانی ناو شار بوو، ئەندامی شارەوانی بوو، پوولی مالیەو کتێبی کوردیی دەفرۆشت.

ئێمە لە پلەی سەرەتایی وەك مامۆستایانمان تورکمان بوون، کتێبەکانیشمان بە تورکی بوو، سروودیشمان هەر بەو زمانە بوو وەك (قیرلرندە گینرندگن بو گوپراغ). (اوزندە والغالانان ئالی بایراغ) واتە دەشت و دەری ئەم خاکە بگەڕێی دەبینی بەیداخی سووری لەسەر ئەشەکێتەوە. ساڵی (١٩٣٣) کە مەلیك فەیسەلی یەکەم کۆچی دوایی کرد، یەك دوو مامۆستای عەرەبیان بۆ فێرکردنی سروودی عەرەبی نەقلی ئێرە کرد (کفری) لەوانە (یاسین و محەمەد سەدیق) بوون. دوایی چوونە کۆلیجی سەربازییەوە بوون بە ئەفسەر (محەمەد سەدیق) هونەرمەند بوو[9].

*** یەکەم سروودی کوردی.**

لە درێژەی باسی خوێندن، بەسەرهاتی یەکەم سروودی کوردی لە خوێندن بەڵگەیەکی پتەوە کە چەند لە ناوچەکانی کەرکوك دژی زمان و خوێندنی کوردی بوون بەرادەیەك کە سادەترین سروودی پەروەردەیی منداڵانیشیان پێ هەزم نەکراوەو پێ تەنگەتاو بوون.

یەکەم مامۆستا کە سروودی کوردیی بە قوتابیانی کفری وتبێت ئەوەبوو. (محەمەد خورشید داودی) ساڵی (١٩٤٠) سروودی (ئەی تۆپەکە فتبۆڵەکە)ی فایق بێکەسی بە قوتابییەکان گوتووەتەوەو لەسەر ئەوە کەوتووەتە ژێر پرس و لێکۆڵینەوە[10].

ناوهێنانی خوێندن بە کورتی بڤە بووە، تەنیا خوێندنی سروودی کوردی و فێرکردنی منداڵان بە زمانی کوردی، لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوەو سزای بەدواوە بووە. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە خوێندن بە کوردی لە کفری و ناوچەکانی دەوروپشتی زۆر دواکەوتووەو خوێندن بە زمانی تورکی بووە.

*** ڕۆشنبیرانی سییەکان.**

دەبێت لەمەڕ خوێندەواری و وشیاری لە کفری باس لە ڕۆڵی ڕۆشنبیریی ئەو سەردەم و ڕۆشنبیرانی کفری بکەین. لەو ڕۆشنبیرانەی کە شوێن پەنجەمان لەم شارەدا ماوەتەوە شاعیر (خەلیل منەوەرە ١٨٦٣- ١٩٢٣) کە دژی چەوسێنەر وەستاوە، ئەو چەوسێنەرە هەرکێیەك و هەرچییەك بووبێ. لەم ناوچەیە (حەمە بەگی فەتاح بەگی جاف) کە ئەندامی پەرلەمان بوو، لەگەڵ حەوت نوێنەری پەرلەمان کە دوانیان خەڵکی ناوچەکە بوون یادداشتێکیان دایە میری، داوای مافی ڕۆشنبیری و زانستییان کرد، هەر حەمە بەگ خۆی ساڵی (١٩٢٩) لە شاری کەرکوك بەرامبەر سەرۆك وەزیران (جەعفەر عەسکەر) لە یانەی فەرمانبەران ڕاوەستاو داوای ئەو مافانەی کردووە. (سەید محەمەد جەباری و سەید ئەحمەد خانەقا) پشتیانگرت، ئەوەش دەبێ لەبیرمان نەچێ کە (حەمە بەگ) یەکەم کەسە کە لە ئاوایی (کەلار) قوتابخانەی کردبووەوە لە شەری ئاو باریك لە تەك عەشیرەتی جاف، شاعیر محەمەد ئەمین بەگ (مینە) بەشداریی شەڕی لە تەك شێخ مەحموود کرد[11].

هەروەها لە سییەکان و چلەکاندا ئەم ئەدیب و شاعیرانە لە ناوچەی کفری و دەوروپشتی هەبوون. (حەقی داودی ١٨٩٦- ١٩٧٩)، (محەمەد شوکری قەرەداغی ١٨٩٢-

١٩٦٧)، (مەلا سمایلی ناو جاف ١٨٧٦ -١٩٤٨)، (مەلا ئەحمەدی زەنگەنە ١٨٨٤- ١٩٥٨)، (جمۆ بێ ناو ١٩١٠- ١٩٨٢)، (محەمەد قەرەداغی ١٩١٥- ١٩٧٣)، (قادر میراخور ١٩٠٥- ١٩٧٤)، (قەمەر بەگلەر ١٨٩٦- ١٩٧٨)، (محەمەد سەعید جاف ١٩٢٩)، (د. موکەرەم جەمال تاڵەبانی ١٩٢٣)، (سامی عەلی دەلۆ ١٩٢٤)، (مستەفا نەریمان)، هتد..[١٢].

* بەسەرهاتی قوتابخانەی دێ:-

خوێندەواریی لە گوندو لادێیەکاندا، بەسەرهاتو چیرۆکی خۆی هەیە، رووبەڕووبوونەوەی خوێندەواریو زەمینە سازدانو هاندانی خوێندن دوو ئاراستەی پێچەوانەی یەکترن و گەلێك رووداوی بەدواوە هاتووە. کوێرەوەریو دەسەڵاتی ئاغاو کوێخای گوندو هەژاریو دواکەوتوویی و زاڵیی دەسەڵاتی رۆحی دینی، گەلێك جاران راوی ئەو کۆششانەیان کردووە، کە پرۆژەی خوێندەواریو فێرکردنی لە گوندەکان بڵاوکردووەتەوە. بۆ ئەو کاتانە خوێندن لە مەکتەب (فەرمەسۆنی)بووە بەرەیەکی فراوانو دژوار لە ئارا بووە، رووبەڕووبوونەوەی سەختو هەناسەی درێژی گەرەك بووە. لە پارێزگاری کەرکوکدا. لە گوندە دواکەوتووو هەژارەکاندا کە نموونەی زۆربەی هەرە زۆری کوردستانە، بەم جۆرە خوێندەواری بڵاوکراوەتەوە.

ئەو ناوچانە هەژارو پڕ لە کوێرەوەری بوون، گەرماو نەبوونیو برسییەتیو نەخوێندەواری تاوی لێ هەستاندبوون.. خەڵکێکی برسیو هەژار، ناوچەیەکی دواکەوتوو، پڕ لە نەخۆشی.. پاشماوەکانی شەرو پێکدادان یەکجاری ناوچەکەی وێران کردبوو. شاعیری ئەم دەڤەرە شێخ ئەحمەدی شاکەلی (١٩٠٣- ١٩٨٢) لەمەڕ مەینەتییەکانی ئەم ناوچەیە وەها دەبێژێت:-

وەرە (نازی) تەماشاکە کەلاوەی کاکی کولیایی
نیاز و نازی چی شێخم مەنارە چەرخی مینایی
گەلێ شێخی بە شاخا دا بناغەی ئاغاشی دەکرد.
ئەمیری زۆری زۆرداری لەبن هێنا بە ئەسپایی
ئینجا دەڵێت:-
هەموو فەننی ئەفەندی بوو هەژاری فەوتی نانێ کرد.
کە کاتێ شاری جێ هێنا خزایە ژووری ئاوایی
بەسە حەرفێ لەبۆ کەس، کاکە: نۆبەی خاڵۆ (حاجی)یە
ئەویشم لێ بووەتە ئاغایێ بە زۆری قاوەچایی.

مستەفا نەریمان لە باسی ساڵی (١٩٤٧)دا وەها لەمەڕ قوتابخانەی گوندەکان دەدوێت وەك مامۆستایەك چوومە (کوڵەجۆ) کە کەوتبووە ناوچەی (زەند ئاباد- زەنگابات)ەوە بە شوێنێکی پڕ لە نەخۆشیو دوور لە قەڵەم درابوو. چونکە رێگەی نێوان جەلەولاو سلێمانی هێشتا قیرتاو نەکرابوو. جارێ خۆم بە تەنیا چووم روانیم دەرگای قوتابخانە داخراوە. ناردم فەراشەکەی هات ناوی (ئەمین عێراقی) بوو دەرگای کردەوەو خۆم پێ ناساندو وتم من مامۆستای نوێم هاتووم دەرس بڵێمەوە، زەردەخەنەیەك گرتی، وتی مامۆستا پێش تۆ هەر مامۆستایەك هاتبێ وایان وتووەو نەیانبردووەتە سەر، وتم بێ ئێوارێ یەك بەیەك برۆ قوتابییەکانم بۆ بانگ بکە (مەلا حەمە سەعید)ی پێش نوێژی مزگەوتەکەشم بینی، بەویشم راسپارد هەروەها ئامر مەخفەر (ئەحمەد بەگی دەلۆ)، بۆ رۆژی دووەم، ژوورەکانمان ئامادەکردو (٢٠) منداڵمان بۆ حازرکراو یەك یەك پرسیارم لێکردن کە لە چی پۆلێکدا بوون، هەندێکیان پۆلی خۆیان لەبیر چووبووەوە، تەماشای تۆمارگەکانم ناوی (١٠) کەسیانمان دۆزییەوە هەندێکیان لە پۆلی یەکەمو هەندێکیان لە دووەمو سێیەمدا بوون، ئەو هەفتەی لەوێ بووم توانیمان (٥) منداڵی کەش بێنین بەمە ژمارەیان گەیشتە (٢٥) منداڵو دابەشم کردنە سەر دوو پۆل (یەکەمو دووەم)و ناوی خوام لێ هێنا لە بەیانی زووەوە تا عەسر خەریکی دەرس وتنەوە بووم.

لەدوا رۆژەکانی نیسانی (١٩٧٤) پشکنێر (فاتح مستەفا) هاتە قوتابخانەی (کوڵەجۆ) ئەمە یەکەم جار بوو پشکنێر ئەم ناوچەیە ببینێ، بە تاقی تەنیا بە دوو پۆل دەرس دەڵێمەوە زۆری پێخۆش بوو.

زەنگەبات بریتی بوو لە (٤٠-٥٠) ئاوایی، ماڵم لە (بانسندووق) بوو، لەگەڵ پشکنێر دوو بە دوو بە پیاسە لە (کوڵەجۆ) گەیشتینە بانسندووق گەلێك نزیکن، عەلی بەگ خاوەنی دێ هاتە پێشوازییەوە بردینییە دیوەخانەکەی، زۆری خزمەت موفەتیش کرد ئەویش بە تورکی لە من هەندێك پرسیاری کرد دەربارەی قوتابخانەی ئەم ناوچەیەو عەلی بەگ لە تورکمانی دەگەیشت پێی وت من بۆ ساڵی داهاتوو قوتابخانەیەك دروست دەکەم، ئێوەش مامۆستام بۆ بنێرن ئەویش وتی لەم ناوچەیە هەر لە کوڵەجۆ قوتابخانە هەیە، لەبەر ناخۆشیو ناسازیی شوێنەکە هیچ مامۆستایەك رووی تێناکات، خانوویەکیش بۆ مامۆستا نییەو قوتابخانەکەشتان دارزاوە، فاتح بەگ لێی پرسیم چی دەڵێت قوتابخانەکەی (کوڵەجۆ) بگوێزینەوە ئێرە (عەلی بەگ) هەڵیدایەو وتی زۆر باشە، منیش ئێرەم لەوێ پێ خوشتر بوو، مامۆستاش لێرە زیاتر ئەحەسێتەوە. ئێوارە بۆ پیاسە چووینە دەرەوە، فاتح بەگ بە عەلی بەگی گوت، تۆ ئەگەر لەسەر ئەم گردە خانوویەکی سێ ژووری لەم هاوینە دروست بکەیو حەوشو خانوویەکیش بۆ مامۆستاو (٣٠) قوتابی پەیدا بکەی، ئەمر دەدەم قوتابخانەکەی کوڵەجۆ بهێنێتە ئێرە، ئەویش دەستی دا، بە سنگییەوە بەمنی وت مامۆستا ئەم هاوینە لێرە سەرپەرشتی ئەمە بکە، وتم بە مەرجێ ساڵی داهاتوو نەقڵی کەرکوك بکرێم.

دوای گەرانەوەی موفەتیش لە مایسی ئەو ساڵەدا هاتنی ئەو زاتەو بڕیارەکانیم لە دانیشتووانی ئاوایی (کوڵەجۆ) گەیاندو ئەوانیش بڕیارەکەیان لا گران بوو، منیش پێم وتن ئەمە (٢٠) ساڵێکە قوتابخانەتان هەیە، نەتانتوانیوە بینایەکی چاك دروست بکەنو مامۆستا بەخێو بکەنو (٤٠- ٥٠) قوتابی پەیدا بکەن. ئەمە سەرەنجامی هەڵسوکەوتی ئێوەیە بەرامبەر زانستو مامۆستاو قوتابخانە[١٣].

لە درێژەی چیرۆکی خوێندەواری لە دێهاتەکانی ئەم دەڤەرە مستەفا نەریمان درێژەی پێدەداو دەڵێ: لە دووەم هەفتەی ئەیلوول قوتابخانەکەی بانسندووقمان کردەوە لەم قوتابخانەیە (٢٠) منداڵ لە خودی ئاواییەکە بە کورو کچەوە

بۆ پۆلی یەکەم ئامادەکراو (١٥) قوتابی لە قوتابخانەی کۆنی کولەجۆوە هەموو ڕۆژێ دەهاتن تا دوایی ساڵ دە کەسیان بەردەوام بوو کە لە پۆلی دووەمو سێیەم بوونو لە ئاواییەکانی دەوروپشتەوە نزیکەی (١٠) قوتابی تر هاتن کە خۆم یەك بە یەك چوومە ئەم ئاواییانە بۆ منداڵ خڕ کردنەوە (قەرەبلاغ، سێ تەپان، تازە شار، حاجیلەر) بە ڕادەیەك ساڵی نوێی داهاتوو(١٩٤٧- ١٩٤٨) ژمارەی قوتابیانمان نێوانی (٤٠- ٤٥) قوتابی بوون. بۆ فێرکردنیان مەنهەج جەدوەلێکی تایبەتیم دانا هەر لە بەیانییەوە تا سەعات دوو بە دوو وەجبە فێرم دەکردن لە سەعات (٨)بۆ (١١) بۆ پۆلی یەکەمو (١١)ەوە بۆ لە (٢) بۆ دووەمو سێیەم.

ئەو ساڵە چوومە ئاواییەکانی دەوروپشت بۆ ئەوەی گەورەکانیان هاندەم چاو لە عەلی بەگ ببڕنو قوتابخانە بکەنەوە، وەك قەرەبلاغی گەورە، کە هی شێخ حەمە نەجیبی شێخ وەهابی تاڵەبانی بوو، ئەوەندەی پێنەچوو ئەو ساڵی دووەم قوتابخانەی کردەوە، (سێ تەپان)ی (حەکیم ئەفەنیی وەناوی) لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانە نەبوو، (حاجیلەر) بەموڵکایەتیی عائیدی بەهجەت بەگی مەجید پاشای بابان بوو، برایم حەمە خانی گێژ کویخاو وەکیل بوو، ئەویش وەعدی کردنەوەی قوتابخانە دا (کۆکن) مولکی حمە ڕەشید بەگی جاف بوو، کە باسی کردنەوەی قوتابخانەم لەلا کردەوە پێی ناخۆش بوو وتی (کاك سەید بێ قەزا بێ دەتەوێ منداڵە جووتیارەکان ببن بە مەحامی) لەسەر ئەمە مشتومڕمان بوو ئیتر نەچووم بەلایداو ئەویش حەزی لە چارەم نەدەکرد[١٤].

ئەمە واقیع حاڵی ئەم گوند و دەڤەرانە بووە، کە نەخوێندەواریی و نەخۆشیی و کوێرەوەری بەشی ژمارەیەکی یەکجار زۆری گوندەکانی کوردستان بووە. بۆیە مەسەلەی خوێندەواری ڕووبەڕووی گەلێك کێشە بووە، بێگومان (٥٠) ساڵی بەر لەویش وەزعەکە سەختر بووە، پاشکەوتنو دواکەوتوویی و زاڵبوونی عەشایریی و خێڵەکیی و دەسەڵاتی دەرەبەگیی و فیکری دواکەوتوویی و زاڵیی ڕۆشنبیریی و پەروەردەی ڕۆحی دینی، کاریگەریی فرە فرەی لەسەر کۆمەڵگا هەبووەو ئەم کاریگەرییە تا ئەمرۆش لە شێوازی تر خۆی دەردەخاتەوە.

بەهۆی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمانە ناوچەکە بە جوولە کەوتبوو، ڕۆشنبیرو خوێندەوارانی کورد، ئەوانەی گیانی کوردایەتییان تێدا بوو، هەوڵیان دەدا لە تەك بڵاوکردنەوەی خوێندەواریی و ڕۆشنبیری جموجۆڵی کۆمەڵایەتی، باسی سیاسیی و مەینەتییەکانی کوردیش بیخەنە نێو باسانەوە، دروست بوونی ڕێکخراوی نهێنیی سیاسیی و بوونی کاریگەریی جووڵانەوەی شێخ مەحموودی نەمر لەسەر ناوچەکەو کۆماری کوردستان لە مەهابادو بڵاوکردنەوەی دەنگوباس لەنێو خەڵك، بوونی حزبی هیوا لە ناوچەکەو بڵاوبوونەوەی ئەندامو هەولەکانی لەو ناوچەدایە کاریگەریی زۆری لەسەر ڕەوشی ڕۆشنبیریی و خوێندەواری بەجێهێشت، لە چلەکاندا بووژانەوەی کوردایەتیی و خوێندەواری هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان بە تایبەتی (ژینو گەلاوێژو دەنگی گێتی تازە) دەهاتنە کفری. ڕۆشنبیرانو هەندێك لە دانیشتووانی شارو دەوروپشتی دەیانخوێندنەوە لە ناوچەکەدا نزیکەی (٥٠) ئابوونەیان هەبوو لە گۆڤاری گەلاوێژدا. سابیری خاڵی مستەفا نەریمان باوەڕپێکراوی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانە بووە[١٥].

بەم جۆرە خوێندنو کرانەوەی قوتابخانە لە ناوچەکانی کەرکوکی بەنەوت داخکراو، پەرەی گرتووەو ڕووبەڕووی دژواریش بووەتەوە. کەرکوك نەك هەر لە ڕووی گۆڕینی ناسنامەکەی. بەڵکە بەتوندیش کەوتووەتە ژێر فشاری نەهێشتنی خوێندن بە زمانی کوردی. ئەگەر کەرکوك ستراتیژی نەگۆڕی مەسەلەی سیاسیی کورد بێ بەهەمان شێوەش لە ڕووی زمانو خوێندنو ئەدەبیاتیش هەر وا دەمێنێتەوە. بەشێکی زۆری خوێنەرو ئەدیبو مامۆستاو دەرچووانی زانکۆو قوتابخانە باڵاکان لەم شارە چوونەتە بەر خوێندنو یەکتریان ناسیوەو گیانی تەبابیی و هاوکاری تێکەڵبوونی کوردایەتی تێیاندا دروست بووە.

بەداخەوە بەهۆی ئەو زوڵمەی لە کەرکوك کراوە، ئێمەش دەستکورت ماینەوە نەمانتوانی وەکو پێویست ئامارو ژمارەو سەرژمێری پێویست بۆ خستنە ڕووی پتری واقیعی خوێندنو خوێندن بەزمانی کوردی لەم شارە کوردییە نەوتاوییە بخەینە ڕوو.

***سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**

١- قوتابخانە مێژووی لەم شارەدا زۆر کۆنە، چۆن ویستیان مووسڵ لەبیر کورد بچێتەوە ئەوهاش هەوڵدەدرێ کەرکوکی نەوت بکرێتە قوربانی و لەبیر بچێتەوە.. کەرکوك خاڵی ستراتیژی خەباتی کوردەو ناکرێ وازی لێ بهێندرێ. پاش شۆرشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨)، لە ساڵی خوێندنی (١٩٥٩-١٩٦٠) بۆ یەکەم جار خوێندن لە قوتابخانەکانی کەرکوکدا بە رەسمی بوو بە کوردی، بەڵام زۆری نەبرد ناحەزانی کوردو خوێندنی کوردی لە رێگەی بەردەوام بوونیدا بوونە کۆسپ، بەبیانووی ئەوەی کەرکوك قوتابیی تورکمان و قلە قلە عەرەب و ئاشووریشی لێرەو لەوێ هەن. بۆ ساڵی ئایندە خوێندنی کوردی هەڵگیراو ئەو هەموو منداڵە کوردی ساڵی رابردوو بە کوردییان خوێندبوو، هەموویان لە ماف خوێندن و فێربوون بە زمانی زکماکی بێبەش بوون.

بروانە رۆژنامەی برایەتی، زاهیر رۆژبەیانی، خوێندن لە کەرکوك بە زمانی زکماکی پۆل بە پۆل یا... ژ (٢٧٧٩) چوار شەمە (١٧/ ٢/ ١٩٩٩)ك.

٢- وريا جاف، كركوك دراسة سياسة واجتماعية، مطبعة وزارة الثقافة، ١٩٩٨ اربيل. ص ٣٩.

٣- مستەفا نەریمان بیرەوەرییەکانی ژیانم، بەغدا ل٢٧، بەپێی قسەکانی مێژوونووس ئەمین زەکی بەگ لە سییەکاندا لە کۆی (٢٤) قوتابخانەی لە لیوای کەرکوکدا تەنیا قوتابخانەیەکی کوردی هەبووە، یانی دەریدەخات خوێندن لە کەرکوك لە سییەکانەوە دەستی پێکردووە نەك لە پەنجاکان بروانە ا. پ. عن التعليم في كردستان و د. عبدالفتاح علي بوتاني. مدرسة ١١ اذار .

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو ا. پ التعليم في كردستان العراق، ل٤٨.

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو عن التعليم في كوردستان العراق. ص١١.

٦- رۆژنامەی برایەتی، زاهیر رۆژبەیانی، خوێندن لە کەرکوك بە زمانی زگماکی پۆل بە پۆل ژ (٢٧٧٩) چوارشەممە (١٧/ ٢/ ١٩٩٩). ل٦.

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەپێی زانیارییەکانی کاك تاریق جامباز کە لە (٢١/ ١/ ٢٠٠٠) لەدیدارێك بۆی باسکردم گوتی: لە سەرەتای حەفتاکان لێژنەیەك هات لە هەولێر تەنیا (٧)کەس داوایان کرد بە زمانی تورکمانی بخوێنن. بەڵام جێبەجێ نەکرا، چونکە دەبووایە (٢٠)کەس داوایکەن، بەڵام لە کەرکوك کرایەوە.

٨- مستەفا نەریمان، بیرەوەییەکانی ژیانم، ل٢٧ ساڵی ١٩٤٩ش قوتابخانە لە سەنگاو کراوەتەوە غازی حەسەن (١٣).

٩- مستەفا نەریمان بیرەوەرییەکانی ژیانم، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٩٤، لاپەرە ٣٠.

١٠- هەمان سەرچاوە. ل ٣١.

١١- هەمان سەرچاوە. ل٣٨.

١٢- هەمان سەرچاوە لە ١١٠.

١٣- هەمان سەرچاوە ل ١٠٣.

١٤- هەمان سەرچاوە، ل١٠٧.

١٥- هەمان سەرچاوە ل ١٠٩.

*** بەڕێوەبەرەکانی پەروەردەی گشتی کەرکوك**

١- ساڵی ١٩٣٥ یەکەم بەڕێوەبەر داندرا بۆ مەعاریفی کەرکوك کە هەر بەڕێوەبەرێك جێگرێکی بۆ دانرا.

٢- ساڵی ١٩٣٨ عەزیز سامی بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

٣- ساڵی ١٩٤٣ فەخری عوبێدی بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

٤- ٤ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٥ شاکیر بەگ بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

٥- ١٣ی تەمووزی ساڵی ١٩٤٥ رەفیق حیلمی بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

٦- ٥ی تەمووزی ساڵی ١٩٤٨ عەلی شاکیر بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

٧- ساڵی ١٩٥٤ نوعمان بەکر تکریتی بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

٨- لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٥ عەزیز جاسم بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

٩- ساڵی ١٩٥٦ عەبدولعەزیز جاسم بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

١٠- ساڵی ١٩٥٩ ئەنوەر عەبدوڵڵا بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

١١- ساڵی ١٩٦٥ موحسین توحلە بووەتە بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك.

١٢- پاشان محەمەد ساڵح بووە کە ساڵەکەی دیار نییە.

١٣- ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٩عیزەدین محەمەد عەلی سەردار.

١٤- ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٢ سەبری مەندیل ساڵح، بووەتە بەڕێوەبەری پەروەدەی کەرکوك.

١٥- ساڵانی ١٩٨٢-١٩٨٧ عامل هەزاع عەلی، بووەتە بەڕێوەبەری پەروەدەی کەرکوك.

١٦- ساڵانی ١٩٨٧-١٩٩١ جەبر تاهیر هاشم، بووەتە بەڕێوەبەری پەروەدەی کەرکوك.

١٧- ساڵانی ١٩٩١-١٩٩٢ محەمەد رەجا شەلاح، بووەتە بەڕێوەبەری پەروەدەی کەرکوك.

١٨- ساڵانی ١٩٩٢-١٩٩٧ دەروێش لەفتە زەیون، بووەتە بەڕێوەبەری پەروەدەی کەرکوك.

١٩- ساڵانی ١٩٩٧-٢٠٠١ ئەحمەد حەموود زێدان، بووەتە بەڕێوەبەری پەروەدەی کەرکوك.

٢٠- ساڵانی ٢٠٠١-٢٠٠٣ عەبدولماجید ئەحمەد سەلمان، بووەتە بەڕێوەبەری پەروەدەی کەرکوك.

٢١- ساڵانی ٢٠٠٣-٢٠٠٤ ئیبراهیم ئیسماعیل تۆفیق، بووەتە بەڕێوەبەری پەروەدەی کەرکوك.

٢٢- ساڵانی ٢٠٠٤-٢٠١٢ شەن عومەر موبارەك.

٢٣- ساڵانی ٢٠١٣ -٢٠١٧ فەرحان حوسێن ساڵح.

٢٤- ساڵانی ٢٠١٧-٢٠١٨ فازڵ ئەسوەد.

٢٥-لەنیسانی٢٠١٨تاوەکو ئێستا عەبد عەلی حوسێن توعمە

## بەشی دووەم

# ئەدەب و ڕۆشنبیری لە کەرکوك

د. مارف خەزنەدار
د. محەمەد کەساس (محەمەد ئەحمەد سەعید)
سەربەست کەرکوکی

*** مێژووی ئەدەب لە کەرکوك:**

کەرکوك وەکو هەموو ئەو شارستانییەتیانەی جیهان خاوەنی کەلەپوورو داهێنان و شاکاری خۆیەتی، قۆناغ لە دوای قۆناغ هەنگاوی ناوە لەگەڵ پێشکەوتنەکانی مێژوودا، بەشێکی گەورەی ئەم شاکارانە خاوەنی ئەو داهێنانە گرنگانەن کە مرۆڤەکانی هەنگاو بە هەنگاو کۆیکردووەتەوەو بایەخی پێی داوەو بەشێك بووەتە مێژووی تایبەتمەندی ئەم شارە.
داهێنانەکانی دەکرێتە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ پێش مێژوو دەگەڕێتەوە، بەشەکەی تریشی هاوپەیوەستی ڕووداوەکانی دوای مێـژووە، بەو مانایەی لەنێوان فێربوونی زمان و نووسیندا داهێنانە ئەدەبییەکانیش دەکرێنە دوو بەشەوە:

**١. داهێنانەکانی پێش مێژوو:**

بەو داهێنانە دەوترێت کە هەر لە چاخە بەردینەکانەوە مرۆڤی ئەم ناوچەیە بایەخیان پێ داوە، بەرهەمەکانی ئەم کەسانەش لەم بوارەدا خۆی دەبینێتەوە لە وێنەی بەردییەکان، دەستڕەنگینی، پەرستن، ئاخاوتن و ئەو زمانە نەدۆزراوەی کە بەکاریان هێناوە، هەموویان دەبنە بەرهەمی ئەو ماوەیەو تایبەتمەندی ناوچەکانی: چەرموو، پاڵەگەورە، مەتارە، کەریم شایەر، قادیش، نموونەی ئەو جۆرە شاکارانەن کە تاوەکو ئێستاکە مرۆڤایەتی شانازییان پێوە دەکات.
ئەگەر سەیری ئەم ماوەیە بکەین دەبینین کەڵچەری داهێنانیان خۆی بینیوەتەوە لە تێگەیشتن بۆ دەوروبەرەکەیان لە ژینگەو ئاژەڵ و ئەستێرەو ئاسمان و خۆرو مانگ، هەموو ئەمانە بنەمایەکی گرنگ بوونە بۆ پێگەیشتنی ئاوەزی مرۆڤ لەو کاتە، هەر ئەم فراوانەی تێگەیشتنە بووە وای کردووە کە بیری لە پێشکەوتنی ماوەی نێوان (کەریم شایەر)و (چەرموو)دا بەدەر بکەوێت، چونکە بایەخدان لە بیرکردنەوە بۆ پێشکەوتن ئەو جوانکارییە بووە کە توانیویەتی هەنگاوی گەورە بنێت بۆ چاکردنی دەوروبەرەکەی، هەر ئەمانەش وای کردووە کە بیر لە داهێنان و شاکاری گەورە گەورە بکاتەوە.
ئەگەر سەیری داهێنانەکانیان بکەین لەو ماوەیەدا ئەوە یەکلا دەبێتەوە کە تێگەیشتنیان بۆ داهێنان زۆر فراوان بووە، لە هەمان کاتدا توانیویانە بەسەر کۆسپەکانی ژینگەدا زاڵ بن، بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بگونجێت لەگەڵ تێگەیشتن و تێفیکرینی ژیان بەو شێوەیەی کە مێشك توانای داهێنانی هەبێت.
هەرچەند زمانی ئەو سەردەمەمان تا ئێستاکە ڕوون نییە، بەڵام ئەوە یەکلا ئەبێتەوە بۆمان کە ئاماژەو زمانێك هەبووە تێگەیشتنیان هەبووە لە داهێنانەکان، ئایە ئەو زمانە لاساییکردنەوەی سروشت بووە؟ یان تێگەیشتنی دەوروبەرەکەیان بە ئاماژەی شتەکان؟ چونکە ڕێگای تێناچێت ئەو داهێنانە گەورانەیان بەجێهێشتبێت نەیانتوانیبێت بگەنە ئەو ئاستەی ئاخاوتنی شتەکانیان بەرجەستە کردبێت، بۆیە زمانیان بەکار هێناوە بەڵام داهێنانی نووسینیان نەبووە، بۆیە پاشماوەی ئەو شاکارانەیان لەسەر بەردو کۆتەڵ و ناو ئەشکەوت گەواهی ئەو ڕاستییە ئەخەنە ڕوو.

**٢. داهێنانەکانی پاش مێژوو:**

ئەم داهێنانە گرنگی لەوەدایە کە زمان بوو بە پێوەرێکی گرنگ لەپێناو تۆمارکردنی شاکارو ئەدەبەکانی ئەو سەردەمە، بۆیە ئەدەبی کۆنی ئەو ماوە مێژووییە هاوگونجاوی سەردەمە مێژووییەکانی دوای چاخە بەردینەکانە کە مرۆڤ خۆی دەبینییەوە لە داهێنانی زمانی وێنەیی و بزماری و زمانەکانی لەوەو دوای تری شارستانییەکان.
ئەدەب و شاکاری ئەم ماوەیە بە گەلێك زمان و زاراوەی جۆر بە جۆر تۆمار کراوە کە خۆی دەبینێتەوە لە گەلێك بواری جیا جیای بیرکردنەوەی مرۆڤ لەو سەردەمانەدا، ئەویش لە پای تێگەیشتن بۆ شتەکان و فراوانی بیرکردنەوەکان، بە شێوەیەکی ئەوتۆ تا بگونجێت لەگەڵ سەردەم و مەودای شارستانییەکان، بۆیە بەشێکی ئەمانە تاوەکو ئێستاکە لەسەر ئاستێکی فراوانن لە توانای ئەو کاتەی مرۆڤایەتی و شارستانییەتەکەی.
گرنگی داهێنانەکانی کەرکوك لەو ماوەیەدا هاوپەیوەستی ئەو شارستانییەتیانە بووە کە کەرکوك و دەروبەرەکەی لە

قۆناغە مێژووییەكاندا گرنگ و پێویستی خۆی هەبووە.
شارستانییەتی (گۆتی، هوری – میتانی، میدی، ساسانی) و گەلێكی تر جێپەنجەیان دیارە لەم شارەداو سەرەتاكانی داهێنان و دۆزینەوەی رەقیمە قورییەكان گرنگ و بایەخی خۆی هەیە بۆ مێژوو و نووسینەوەی داهێنان و شاكار لەم شارەدا.

* **رەقیمە قورییەكانی (هوری - میتانییەكان):**

لەو داهێنانە بەرچاوانەی كە بۆمان بە جێ ماوەو بەشێكی گرنگی شارستانییەتی هوری – میتانییەكان بووە لە كەركوك، ئەو راستییە دەخەنە روو كە مرۆڤی ئەم شارە داهێنانی خۆی هەبووە لە هەموو بوارەكاندا، هەر چەندە تەنها رەقیمە قورییەكانی بواری ئابووری و خێزان و كۆمەڵگەی ئەو كاتەو بازرگانی تێدا بە جێماوە، بەڵام لە كنەو پشكنینی دوارۆژ گەلێك بەرهەم و داهێنانی بوارەكانی تریش دەدۆزرێتەوە، چونكە ئیمپراتۆرییەتێكی وا گەورە رێی تێناچێت كە داهێنان و شارستانییەتیان لە هەموو بوارەكاندا نەبێت.

ئەو رەقیمە قورییانەی كە لە (نوزی) و (كورو خانی) بۆمان بە جێ ماوە گەواهی توانای نووسین و داهێنان و ئەو زاراوەییەی كە پێی نووسراوە دەخەنە روو، چونكە دۆزینەوەی ئەو رەقیمە زۆرەی قورین بەڵگەی توانایی كەسەكانی ئەو ناوچەیە بووە لە توانی سەردەمە زمانەوانییەكانی ئەو كاتە، دۆزینەوەی ئەو رێژە زۆرە توانای گەورەیی شارستانییەتییەكە دەخاتە روو كە چەندێك بایەخیان داوە بە تێگەیشتن و دامەزراندنی دەزگا كارگێرییەكانیان.

لە سەردەمەكانی لەوەو دوای (هوری – میتانی)یەكانیش گەلێك رەقیمی قوری دۆزراونەتەوە ئەوە دەخەنە روو كە هەر یەكەو بەپێی شارستانییەتییەكەی خۆی گرنگ بووە لە تێگەیشتن و داهێنانی شاكارەكان كە زمانیش لە پاڵیدا لە گۆرانكاریدا بووە.

ئەگەر هەڵسەنگاندنێك بكەین لە هەموو پاشماوەی ئەو رەقیمە قورییانەی ئەو ماوەیە دەگەینە ئەوەی كە ماوەی سەردەمە مێژووییەكانی پێش هاتنی ئیسلام یان پێش سەرهەڵدانی ئایینەكانی تر ئەوە یەكلا دەبێتەوە كە توانا و گرنگی ئەو شارستانییەتییانە هەردەم لە بەرچاو بووە بۆ پێشكەوتن و جوانكاری لە بوارەكاندا كە بە تایبەتی ئەو داهێنانە رەنگیان داوەتــەوە لــە بــوارەكــانــی تــەلارســازی یــان هاوپەیوەستی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان بە شێوەیەكی ئەوتۆ كە بگونجێت لەپێناو جوانكاری و یەكە كارگێرییەكان.

كەڵچەری ئەو شارستانییەتییانەی پێش هاتنی ئیسلام خۆی دەبینییەوە لە فرەیی نەتەوەكان و زمان و زارو پەیوەندییە كۆمەڵایەتی و ئابوورییەكان بە شێوەیەكی ئەوتۆ كە خزمەت و داهێنانی هەر نەتەوەیەك رەنگدانەوەی خۆی هەبووە لە شارستانییەتی كەركوكدا، بە تایبەتی گەلێك ماوەی پرشنگداری لێ بەرچاو دەكەوێت لە قۆناغە جیاجیاكان.

* **ئەدەب و شارستانییەتی لە سەردەمی هاتنی ئیسلامدا:**

بڵاوبوونەوەی رۆشنبیری شارستانییەتی نەتەوەكانی ژێر ركێفی ئیسلام تێكەڵ بە كەلەپوورو شارستانییەتی ئیسلام بوون، هەر یەكەیان كاریگەری و دەوری خۆی بینی لە پێگەیاندنی ئەو تێگەیشتنە تازەیە بۆ گرنگی ئەدەب و داهێنان و شاكارە ئەدەبییەكانی، بەشێوەیەكی ئەوتۆ كە هەر هەموویان تێكهەڵكێشی یەكتری بوون، ئەویش خۆی دەبینێتەوە لە سەرهەڵدانی خۆشنووسی، قوتابخانەی ئایین، مزگەوت، سەرهەڵدانی گەلێك زانای ئایینی، كە هەر هەموویان دەوریان بینی لە تێگەیشتن بۆ شتەكان و فراوانی داهێنانەكان.

ئەگەر سەیری ئەو ماوە مێژووییە بكەین دەبینین كورد گەلێك زانا و پیاوی ئایینی و نووسەری گەورە گەورەی تێدا هەڵكەوت، هەولیان داوە خزمەت بكەن لە بوارە جیاجیاكاندا، كە نموونەمان وەكو (ئیبن ئەلئەسیر ئەلجەزری، ئیبن خەلەكان، ئیسماعیل پاشا ئەلبابانی، عەبدولقادار ئەلخەتیبی)، بۆ نموونە ئەوەی كۆتاییان لە كتێبی (تذكرة الشعراء)دا باسی گەلێك لە شاعیرو ئەدیبانی كردووە بەڵام لە بواری نەتەوەییدا خۆیان بە دوور گرتووە، هەر بە هەمان شێوە لە كەركوكیش گەلێك زانا و نووسەرو شاعیری تێدا هەڵكەوتووە بەڵام ئاماژە بە كورد بوون و نەتەوەیی خۆیان نەكردووە.

بۆ نموونە یەكێكی وەكو (رەسول ئەلحاوی) كە داهێنەری كتێبی (دوحة الوزراء)یە دەبینین لە بواری نەتەوەییدا هیچ ئاماژەیەك ناكات بەڵام دەبینین پێش ئەوەی فێری زمانی توركی بێت لە ناوچەیەكی كوردی گەشەی كردووەو ژیاوە، بەرهەمەكانی گەواهی راستی بە توانایی ئەو كەسە دەخەنە روو.

"ئەگەر بێت و لە شارۆچكەیەكی وەكو داقوق لە ماوەی فرمانرەوایی سەردەمی ئەمەوی و عەباسییەكاندا سەرنج بدەین دەبینین گەلێك نووسەری ئەو شارە دەستیان هەبووە لە بواری ئەدەبداو ناوبانگیان بە ناوچەكەدا بڵاوبووەتەوە، وەكو:

١. (عەلی كوری عەممار كوری جەمیل كوری سالح كوری عوسمان كوری عەلی كوری محەمەد كوری عومەر ئەبو ئەلحەسەن ئەلكەرخینی)، ئەم نووسەرە دەستێكی باڵای هەبوو لە بواری خۆشنووسیداو نزیكەی سەد ساڵ ژیاوەو لە ساڵی (١٢٠٤)ی زایینی كۆچی دوایی كردووە.

٢. (ئیبراهیم كوری عومەر كوری سەعد كوری محەمەد ئەبو ئیسحان ئەلشەهر ئەلكوردی) كە بەناوبانگ بووە بە (ئیبن ئەلبوریانی ئەلخەتیب) لە گوندی (شەهەر كرد) لەنێوان داقوق و كەرخینی، نووسەرێكی بەتوانا بوو لە بواری ووتاربێژی و دەنگێكی بە توانای هەبوو لە خوێندنی شیعردا.

٣. (یەعقوب كوری عەبدولموحسن، ئەبو یوسف ئەلتەغلوبی)، نازناوی (عەكارش) بوو، خەڵكی داقوق بووە دەورێكی بە توانای هەبووە لە بواری ئەدەبدا، لە ساڵی (١٢٢٩)ی زایینی كوژراوە.

٤. (عەلی كوری مەكی كوری ئەبی ئەلمەعالی، ئەبو ئەلحەسەن ئەلشەهەركردی)، شاعیرو قورئان خوێنێكی بە توانا بووە.

٥. (ئەلشەرەف عەبدولرەحمان كوری ئەبی ئەلحەسەن كوری عیسا كوری عەلی كوری ئەعروب ئەلبەوازیجی)، سەردانی

هەولێری کردووە لە ساڵی (٦٢٨)ی کۆچی، نووسەرێکی بە توانا بووە لە بواری شیعردا"[١].

"لە سەردەمی مەمالیکەکاندا گەلێك لە ئەدیبو شاعیرو نووسەران لە دەزگاکانی حکومەتدا کاریان کردووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کارکردنیان لە بواری زمانی تورکیداو لە بنەرەتدا ئەدەبی تورکییان خوێندووە، کە بنەرەتی بەشێکیان بۆ سەردەمی مەغۆلو پێشان دەگەڕێتەوە، هەروەها فارسیش چووبووە نێوە ئەدەبی تورکییەوەو بەناوبانگ بووە، کە بەشێکیان وەکو ئەوەی لە کتێبی (تذکرة الشعراء) ئاماژەی پێ کراوە بنەرەتیان دەگەڕێتەوە کەرکوك، وەکو:

١. محەمەد ساڵح ئالئاسف.
٢. بەدری مستەفا ئەفەندی کوڕی عەلی ئەفەندی کەرکوکی.
٣. ساقب خدر ئەفەندی کوڕی مەلا یەعقوب ئەلماهۆنی.
٤. رەسوڵ حاوی ئەفەندی کوڕی مەلا یەعقوب ئەلماهۆنی.
٥. عەلی ئەفەندی زەڵمی کوڕی حاجی حەسەن ئەفەندی کەرکوکی.
٦. محەمەد ئەمین فەوزی کوڕی عەلی ئەفەندی ئەلعەرزوحالاتی.
٧. لوتفی ئەفەندی ئەلمەکتوبی کوڕی ئەبی بەکر ئەفەندی ئەلنائیب کەرکوکی.
٨. ئەبو بەکر ئەفەندی ئەلموفتی کوڕی ئیسماعیل ئەفەندی کەرکوکی.
٩. لوتفئەڵڵا ئەفەندی کوڕی وەلی ئەفەندی، کاتیبولئەلدیوان کەرکوکی.
١٠. عومەر ئەفەندی کوڕی قاسم ئەفەندی کەرکوکی.
١١. ساڵح ئەفەندی ئەلکوردی کوڕی رۆستەم ئاغا.
١٢. ئەعقوب ئەفەندی ئەلسەبانی (زاهیرو ئەلزیا) کوڕی رەسوڵ حاوی.
١٣. فەزلولڵا ئەفەندی کاتیبولئەلدیوان کوڕی وەلی ئەفەندی"[٢].

* **بیبلیۆگرافیای ئەو شاعیرانەی کەرکوك لەنێوان سەدەی حەڤدەهەمی زاینیی تا سەدەی بیست:**

* **لەنێوان (١٦٠٠) بۆ (١٧٠٠):**
- (ئەحمەد بەگی زەنگەنە، ١٦٨٠ – ١٧٥٠) .
- (شێخ حەمزە–مەولانا حەمزە).
- (خەمناکی، ١٦٩٠ – ١٧٨٢).
- (نۆرسی کەرکوك، – ١٧٦١).

* **لەنێوان (١٧٠٠) بۆ (١٨٠٠):**
- (بەدری–مستەفا، ١٧٤٢ – ١٨٢١).
- (زەبوونی، ١٧٤٨ – ١٨٠٤).
- (رەنجووری، ١٧٥٠ – ١٨٠٩).
- (نۆری کەرکوکی، ١٧٥٠ – ١٨١٠).
- (محەمەد ساڵح–ئاسف زادە، ١٧٥٣ – ١٨٢١).
- (عومەر قاسم کەرکوکی، ١٧٥٨ – ١٨١١).
- (ئەبو بەکر موفتی کەرکوکی، ١٧٦٠ – ١٨٣٠).
- (فەزلولڵای کوڕی وەلی ئەفەندی، ١٧٦٢ – ١٨٣٠).
- (میرزا شەفیعی جامەرێزی، ١٧٧٦ – ١٨٣٦).
- (قاسمی–سەیید قاسم، ١٧٨٠ – ١٨٤٥).
- (مەلا نەوشای زەنگەنە، ١٧٨٥ – ١٨٣٤).
- (محەمەد ئەسعەد نائیب، ١٧٨٥ – ١٨٣٢).
- (مەلا نووشا، ١٧٨٥ – ١٨٣٥).
- (محەمەد ئەمین فەوزی، ١٧٨٦ – ١٨٤٨).
- (مام نەزەری گەرمیانی، ١٧٨٦ – ١٨٧٥).
- (ثاقب–ساقب، ١٧٩٣ – ١٨١٨).
- (شێخ عەبدولقادر سوورە خانەقا، ١٧٩٥ – ١٨٦٠).
- (شێخ عەبدولرەحمان خالسی تاڵەبانی، ١٧٩٧ – ١٨٥٨).
- (کارێزی، – ١٧٨١).
- (میر سەبری رۆژبەیانی).

* **لەنێوان (١٨٠٠) بۆ (١٩٠٠):**
- (رازی ئیبراهیم، ١٨٠٤ – ١٨٧٦).
- (یەعقوب زیائی، ١٨٠٤ – ١٨٣٠).
- (مەلا ئەحمەد شەریف، ١٨٠٦ – ١٨٧٦).
- (مەلای جەباری، ١٨٠٦ – ١٨٧٦).
- (مەلا فەتاح جەباری، ١٨١٠ – ١٨٧٨).
- (عەبدولرەحمان عەسکەری کەرکوکی، ١٨١٠ – ١٨٨٠).
- (شەهناز خانم، ١٨١٠ – ١٩٣٠).
- (مام پیرەویس کاکەیی، ١٨١٧ – ١٨٤٧).
- (عەبدولڵا فاتکە، ١٨١٩ – ١٨٨٧).
- (عەبدولڵا ساقی کەرکوکی – ساقی، ١٨٢٨ – ١٨٩٨).
- (یەسو ساوك، ١٨٣١ – ١٩٠٩).
- (عورفی–سەیید مەحمود، ١٨٣٢ – ١٨٩٠).
- (قابیل محێدین، ١٨٣٣ – ١٩٠٩).
- (شێخ جەواد خانەقا، ١٨٣٤ – ).
- (فائیز عەبدولقادر، (١٨٣٤ یان ١٨٣٥) – (١٨٩٧ یان ١٨٩٨)).
- (عەبدولقادر–فائیز، ١٨٣٤ – ١٨٩٨).
- (شێخ مەحمودی قوتب، ١٨٣٦ – ١٨٩٧).
- (تەیب ئۆغلی–مەلا عەبدولڵا، ١٨٣٦ – ١٩٠٦).
- (عەبدولڵا تەیب ئۆغلو، ١٨٣٦ – ١٩٠٦).
- (مەلا رەحمەتولڵای گلی، ١٨٣٨ – ١٩١٨).
- (حەسەن کەنووش دەلۆیی، ١٨٤٠ – ١٨٩٤).
- (سەعید شێخ خدر نەقشبەندی، ١٨٤٠ – ١٩٠٤).
- (سەیید عەبدولستار عەبدەلانی، ١٨٤٠ – ١٩٢٩).
- (شێخ رەزای تاڵەبانی، ١٨٣٧ – ١٩١٠).
- (حەمە لووتەی جەباری، ١٨٤٥ – ١٩١٥).
- (محەمەد مەهدی کەرکوکی، ١٨٤٩ – ١٩١٨).
- (مەلا قادر جاف، ١٨٥٠ – ١٩٠٨).
- (مەلا ئەحمەد مەلا شەریف، ١٨٥١ – ١٩١٥).
- (ئەحمەد شەریف جەباری، ١٨٥١ – ١٩١٥).
- (عەلی مەلا فەتاح، ١٨٥٣ – ١٨٨٣).
- (عەبدولقادر غولامی، ١٨٥٤ – ١٨٨٥).
- (مەلا مەحمودی مەزناوە – مەزناوی، ١٨٥٨ – ١٩٢١).

- (مەلا عەبدولستار عەبدی، ١٨٥٨ – ١٩٣٢).
- (سلێمان کاکەیی، ١٨٥٨ – ١٩٣٥).
- (عەبدوڵلا قودسی زادە، ١٨٥٩ – ١٩٠٧).
- (چۆبان یەسو ساوك، ١٨٥٩ – ١٩١١).
- (کوپر– پروت، ١٨٦٢ – ).
- (کەوسەر زەینەل حوسێن، ١٨٦٢ – ١٩٢٦).
- (بەهجەت ساکت، ١٨٦٣ – ١٩١٥).
- (مەلا فەتۆش، ١٨٦٣ – ١٩١٩).
- (فەقێ رەشید کوڕی جاسم ئاغا، ١٨٦٣ – ١٩٦٦).
- (بەهائەددین سالح – بەها، ١٨٦٤ – ١٩٤٨).
- (رەشید سالح، ١٨٦٦ – ١٨٩٥).
- (کامیل وەهبی ئەرسەلان، ١٨٦٧ – ١٩١٦).
- (مەلا خەلیل داودە، ١٨٦٨ – ١٨٩٩).
- (محەمەد رەفیق خادم سوجادە، ١٨٦٩ – ١٩٣٦).
- (مەلا رەزای واعیز، ١٨٧٠ – ١٩٦٣).
- (شێخ موڕادی زەنگەنە، ١٨٧٠ – ١٩٧٥).
- (عەبدولفەتاح وەهبی–کاتب زادە، ١٨٧٢ – ١٩٤٠).
- (برایم خانی دەلۆ، ١٨٧٤ – ).
- (شێخ عەبدولکەریم قادر کەرەم – خادم، ١٨٧٤ – ١٩٥٤).
- (غەمناکی بچووك، ١٨٧٥ – ١٨٩٦).
- (محەمەد خالسی تاڵەبانی، ١٨٧٥ – ١٩٢٢).
- (واق، ١٨٧٥ – ١٩٤٦).
- (خەتا پۆش، ١٨٧٦ – ١٩٢٥).
- (هیجری دەدەی کاکەیی، ١٨٧٧ – ١٩٥٢).
- (خەلیل منەوەر، ١٨٧٨ – ١٩٢٣).
- (سەیید محەمەد سەیید فەتاح سەیید عەلی، ١٨٧٨ – ١٩٥٨).
- (بەها – محەمەد بەهائەددین عەبدولکەریم، ١٨٨٠ – ١٩١٨).
- (خەلیل فەقێ رەمەزان–عەبداڵ داودە، ١٨٨٠ – ١٩٢٩).
- (خدر لوتفی ئەفەندی، ١٨٨٠ – ١٩٥٩).
- (ئەحمەد سەبری، ١٨٨١– ).
- (مەلا سلێمان–سالم، ١٨٨١– ).
- (شێخ نەجمەددین عەبدولرەحمان بەرزنجی، ١٨٨١ – ١٩٤٤).
- (محەمەد رەئوف – فەردی، ١٨٨٢ – ).
- (مستەفا – سالم – سۆمەر، ١٨٨٣ – ).
- (محەمەد نور ئەحمەد، ١٨٨٣ – ١٩٤٨).
- (عەبدولکەریم زەینوعابیدین کەریمی، ١٨٨٣ – ١٩٦٣).
- (عەبدولقادر خەلوسی، ١٨٨٤ – ١٩٤٩).
- (مەلا ئەحمەدی سپی سەری زەنگەنە، ١٨٨٤ – ١٩٥٨).
- (راسخ، ١٨٨٧ – ١٩٣٦).
- (میرزا عبدولقادر باوەیی، ١٨٨٧ – ١٩٤٩).
- (عومەر ئاغای تەرجیلی، ١٨٨٨ – ١٩٥٤).
- (محەمەد کەساس – محەمەد چۆبان، ١٨٩٠ – ).
- (محەمەد رامز یەعقوبی زادە، ١٨٩٠ – ١٩٣٩).
- (ئەحمەد مەدەنی، ١٨٩٠ – ١٩٤٠).
- (ئەمین فەیزە، ١٨٩٠ – ١٩٥٥).
- (ئەسیری، ١٨٩٠ – ١٩٦٢).
- (عەلی زالیاوەیی، ١٨٩٠ – ١٩٧٠).
- (محێدین داوودی، ١٨٩٠ – ١٩٨٢).
- (محەمەد سادق کەرکوکی، ١٨٩١ – ١٩٦٧).
- (تاهیر فوئاد، ١٨٩٢ – (١٩٢٥ یان ١٩٢٧)).
- (عەبدولرەحمان قەرەحەسەنی، ١٨٩٢ – ١٩٤١).
- (محەمەد ئەمین محەمەد خورشید داودی – حەققی، ١٨٩٢ – ١٩٥٩).
- (محەمەد شوکری قەرەداغی، ١٨٩٢ – ١٩٦٧).
- (مەلا سابیر کەرکوکی، ١٨٩٣ – ١٩٦١).
- (عەزیز سامی وەنداوی، ١٨٩٣ – ١٩٨٤).
- (بێدار، ١٨٩٤ – ١٩٤٩).
- (مەلا عەبدوڵلا لۆبیاچی، ١٨٩٤ – ١٩٧٤).
- (مامەند کەرکوکی، ١٨٩٥ – ١٩٦٦).
- (حەقی، ١٨٩٦ – ١٩٥٩).
- (قەمەر بەگلەر ئەلماس، ١٨٩٦ – ١٩٧٨).
- (رەفیق حیلمی، ١٨٩٨ – ١٩٦٠).
- (محەمەد حوسامەددین عومەر قادری، ١٨٩٨ – ١٩٦٦).
- (عەبدولقادر قرگەیی، ١٨٩٨ – ١٩٧٥).
- (مەلا قاسمی خەلوسی، – ١٩١٤).
- (شێخ مەحمودی شۆریجە، – ١٨٩٧).
- (محەمەد سالح – سەیید، – ١٨٦٣).
- (مستەفا واق، – ١٨٩١).
- (مەلا سمایلی ناوجاف–جەفایی، فەقێ، – ١٩٥٠).
- (خاکی – محەمەد حوسێن ئەحمەد، – ١٨٥٨).
- (شاکی، – ١٨٦٣).
- (هەژار).
- (مەکتوبی زادە عومەر–فەوزی).
- (شێخ مەحمود – گەرمیانی).
- (کریانی).
- (حاجی قادری میکائیلی).
- (فاتیمە حەسەن کەنووش).
- ( عەبدولقادر نەقشی).
- (عەبدولقادر قەدری ئەرسەلان).
- (شەوقی).
- (مەلا سەیید فاتح).
- (سەیید قودرەت مەلا عەباس).
- (سەرکیس عیوان).
- (دەدە هوشیار).
- (دەردوونی).
- (خەلیل موخلس).
- (خاچیك گرابیت ئایدنجیان).
- (حاکم).
- (حوسێن بابا جانی).
- (تفلی ئەحمەد ئەفەندی).
- (تۆفیق ئاغای گەلاڵی).
- (پیر ئەحمەد کەرکوکی).
- (ئەربا ئەمین زادە ساقی).

- (ئەمینە خان سەردار).
- (ئەمین شەوقی).
- (ئەحمەد کەنووش).
- (ئەحمەد مەلا ڕەسوڵ – فائز).

* لەنێوان (۱۹۰۰) بۆ (۲۰۰۰):

- (ئەسعەد سەعید نائیب، ۱۹۰۰ – ۱۹۹۲).
- (حەسەن ئەمین، ۱۹۰۲ – ).
- (سەعید بەسیم دەمیرچی، ۱۹۰۲ – ۱۹٦٥).
- (مەلا حەسەنی نوحی، ۱۹۰۲ – ۱۹٦٦).
- (شێخ ڕەئوف خانەقا – ڕەئوف خانەقا، ۱۹۰۲ – ۱۹۷٤).
- (ڕازی مەلا حەکیم، ۱۹۰۲ – ۱۹۸٦).
- (عەبدولواحیدی نوری–ع. و. نوری، (۱۹۰۳ یان ۱۹۰٤) – ۱۹٤٤).
- (ڕەهبەر، ۱۹۰٤ – ۱۹۷۳).
- (جەلال ڕەزا ئەفەندی، ۱۹۰٤ – ۱۹۸۱).
- (شێخ ئەحمەد محەمەد شاکەل، ۱۹۰٤ – ۱۹۸۲).
- (قادر میرئاخور–موخلیس، ۱۹۰٥ – ۱۹۷٤).
- (تۆفیق جەلال ئۆرخان، ۱۹۰٥ – ۱۹۸۱).
- (مەلا حەسەنی پەڵکانە–زەنگەنە، ۱۹۰٥ – ۱۹۸٥).
- (لوتفی بەرزنجی، ۱۹۰٥ – ۱۹۸۹).
- (شێخ مەحمودی کەسنەزان، ۱۹۰٥ – ۱۹۹۰).
- (شێخ سەدرەدین درۆزنە، (۱۹۰٥ یان ۱۹۰۷) – ۱۹۹٥).
- (عەبدولحەمید قەرەحەسەنی، ۱۹۰٦ – ).
- (سابیر کاکی، ۱۹۰۷ – ۱۹۸۸).
- (شێخ عەلی شاکەل – غالب، ۱۹۰۸ – ۱۹٤۸).
- (دەروێش وەلی قۆجە کاکەیی، ۱۹۰۸ – ۱۹۷٥).
- (مەلا جەماڵ مەلا تاها، ۱۹۰۹ – ۱۹۷۹).
- (بەرزۆی پەری کەرکوکی، ۱۹۰۹ – ۱۹۹۰).
- (ئەبو بەکر شێخ محێدین – سەقمی، ۱۹۱۰ – ۱۹۹۷).
- (پیرۆز حەسەن کەنووش، ۱۹۱۱ – ).
- (مینە جاف، ۱۹۱۱ – ۱۹٦٥).
- (بورهان کاکی، ۱۹۱۱ – ۱۹۷٦).
- (مەلا خالید ڕەباتی، ۱۹۱۲ – ۱۹۸٦).
- (بورهان جەلال مەعروف بەگ، ۱۹۱۲ – ۱۹۹۲).
- (عەبدوڵڵای تۆم تەن، ۱۹۱۲ – ۱۹۹٦).
- (شێخ عومەر عەسری، ۱۹۱۳ – ۱۹٦۷).
- (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، ۱۹۱۳ – ۲۰۰۱).
- (ڕەشید کازم بەیاتلی، ۱۹۱٤ – ۱۹۸۳).
- (مەلا خورشید سیامەنسووری، ۱۹۱٤ – ۱۹۹۱).
- (بێبەش – نەجمەددین بەرزنجی، ۱۹۱٥ – ۱۹۹۰).
- (محەمەد ئەحمەد قەرەداغی، ۱۹۱۷ – ۱۹۷۳).
- (ئەحمەد فەخری، ۱۹۱۷ – ۱۹۷۹).
- (مەلا سەیید عەبدوڵڵا محەمەد، ۱۹۱۷ – ۱۹۸٦).
- (مەلا عەلی سنجەر، ۱۹۱۷ – ۱۹۸۷).
- (حاجی برایمی شاتەری، ۱۹۱۷ – ۲۰۰۰).
- (فاتح سەعاتچی، ۱۹۱۸ – ).
- (ڕەشید عەلی داقوقلی، ۱۹۱۸ – ۱۹۷٥).
- (ئیبراهیم سەید عەلی، ۱۹۱۸ – ۱۹۸٥).
- (مەلا یاسین کوری مەلا مەحمود – ماهر، ۱۹۱۹ – ۱۹۷٥).
- (شێخە زەرد، ۱۹۱۹ – ۱۹۸۲).
- (سەیفەددین خەتیب، ۱۹۲۰ – ۱۹۷۲).
- (بێدەنگ گەرمیانی، ۱۹۲۰ – ۲۰۰٦).
- (سەی سایەقە شێت، ۱۹۲۱ – ).
- (شێخ محەمەد شێخ جەبار جەباری، ۱۹۲۱ – ۱۹۸٤).
- (حەسەن گورەم، ۱۹۲۲ – ).
- (سدیق قولەبەرزی، ۱۹۲۲ – ۱۹۸٤).
- (عوسمان مەزلوم، ۱۹۲۲ – ۱۹۹٥).
- (مەلا عومەر کەریم، ۱۹۲۲ – ۱۹۹۸).
- (عیزەدین عەبدی بەیاتی، ۱۹۲۲ – ۲۰۰۱).
- (سامی عەلی دەلۆ، ۱۹۲٤ – ).
- (محەمەد تاهیر تۆفیق، ۱۹۲٤ – ۱۹۸۱).
- (عەتا تاڵەبانی، ۱۹۲٥ – ۲۰۰۰).
- (عەزەدین فارس، ۱۹۲٦ – ۱۹۸٤).
- (مەلا غەریب چوار شاخی، ۱۹۲٦ – ۱۹۸٥).
- (محەمەد نەسرەو، ۱۹۲٦ – ۱۹۹۲).
- (حەسەن فەتاح حوسێن، ۱۹۲٦ – ۱۹۹٥).
- (حاجی محەمەدی ڕۆستەم جاف، ۱۹۲۷ – ۱۹۸۸).
- (ناسیح بازرگان، ۱۹۲۷ – ۱۹۹۰).
- (مەلا تەیفور، ۱۹۲۷ – ۱۹۹۳).
- (حەبێ خان، ۱۹۲۷ – ۱۹۹۷).
- (سەیید وەهابی کاکەیی، ۱۹۲۸ – ۱۹۳٥).
- (خەیروڵڵا کازم داقوقلو، ۱۹۲۸ – ۱۹۸۱).
- (پاکیزە ئەمین خاکی، ۱۹۲۹ – ۲۰۰۳).
- (حەمید جاف، ۱۹۳۰ – ).
- (عوسمان خۆشناو، ۱۹۳۰ – ).
- (شێخ ئەحمەد کوری شێخ نەجمەددین – سابری، ۱۹۳۱ – ۲۰۰۷).
- (مەلا حەمە نەجیبی بەرلوت، ۱۹۳۲ – ۱۹۹٦).
- (کامیل ڕەشید فەتاح جەباری، ۱۹۳۲ – ۲۰۰۰).
- (محەمەد سابیر مەحمود، ۱۹۳۲ – ).
- (ئەحمەد وەهبی قوتب، ۱۹۳٤ – ۲۰۰۱).
- (ئەنوەر مەحمود سامی، ۱۹۳٥ – ۲۰۰۹).
- (قەحتان نەجات هورمزی، ۱۹۳٦ – ).
- (موئەیەد ئەلراوی، ۱۹۳٦ – ).
- (سەلاحەددین سدیق هورمزی، ۱۹۳۷ – ۲۰۰۳).
- (عەبدولعەزیز سەمین بەیاتی، ۱۹۳۸ – ).
- (عەلی شوکر بەیاتی، ۱۹۳۸ – ).
- ( جاوید موفتی، ۱۹۳۹ – ۲۰۰۱).
- (عەباس عەسکەر، ۱۹۳۹ – ۲۰۰۷).
- (ئیبراهیم کەبابچی، ۱۹٤۰ – ).
- (شێخ عەبدوڵڵای کوری نەجمەددین صابری، ۱۹٤۰ – ).
- (فازل عەزاوی، ۱۹٤۰ – ).
- (سەلاح فایق، ۱۹٤۰– ).
- (ئەکرەم سابیر کەرکوکی، ۱۹٤۰ – ۱۹۸٥).

- (شەکیبە وەنداوی، ١٩٤٠ – ٢٠٠٠).
- (سەلاح نەورەس، ١٩٤١ – ).
- (سابیر رەئوف دەمیرچی، ١٩٤١ – ).
- (مەولود تاها قاياچی، ١٩٤١ – ٢٠١١).
- (ئەنوەر بابا ئۆغلو، ١٩٤٢ – ).
- (حەسەن کەوسەر، ١٩٤٢ – ).
- (هاشم رەشاد ئاق سو، ١٩٤٢ – ١٩٩٤).
- (ئیسماعیل رۆژبەیانی، ١٩٤٢ – ٢٠٠٢).
- (جان دەمۆ، ١٩٤٢ – ٢٠٠٣).
- (ئیبراهیم ناشاد، ١٩٤٢ – ٢٠٠٩).
- (فایق سابیری حەمامچی، ١٩٤٢ – ٢٠١٠).
- (تالیب وەنداوی، ١٩٤٢ – ٢٠١٢).
- (ئیسماعیل رەیاشی، ١٩٤٣ – ).
- (رەمەزان زامدار، ١٩٤٣ – ).
- (ئەحمەد سەلمان ئەحمەد – ئەحمەد تاقانە، ١٩٤٤ – ).
- (هاشم جەباری–هاشم عەبدوڵڵا جەباری، ١٩٤٤ – ).
- (شێرزاد جەباری، ١٩٤٤ – ١٩٨٧).
- (سەرگۆن پۆلس، ١٩٤٤ – ٢٠٠٧).
- (حەمزە سالح حەمامچی ئۆغلو، ١٩٤٥ – ).
- (خەسرەو جاف، ١٩٤٥ – ).
- (ئەحمەد قوشچی ئۆغلو، ١٩٤٦ – ).
- (ئەشرەف داغلی، ١٩٤٦ – ).
- (فاروق مستەفا، ١٩٤٦ – ).
- (عیسمەت ئوزجان، ١٩٤٦ – ١٩٩٤).
- (برایم جاف، ١٩٤٧ – ).
- (حەمید خالید کەریم، ١٩٤٧ – ).
- (سەلاح شوان، ١٩٤٧ – ).
- (لەتیف هەڵمەت، ١٩٤٧ – ).
- (دکتۆر مستەفا زەنگەنە، ١٩٤٧ – ).
- (نەبەرد جاف، ١٩٤٧ – ١٩٩٣).
- (بێبەش گوبانی، ١٩٤٧ – ٢٠٠٠).
- (دکتۆر ئەکرەم پاموتچی، ١٩٤٧ – ٢٠٠٥).
- (حەمەد داماو، ١٩٤٧ – ٢٠٠٥).
- (چۆبان ئۆڵوخان–چۆبان خدر حەیدەر، ١٩٤٨ – ).
- (نەسرەت مەردان، ١٩٤٨ – ).
- (مەلا مەجید پەرێشان، ١٩٤٨ – ٢٠١٣).
- (نەجات شوکر کەوسەر ئۆغلوا، ١٩٤٩ – ).
- (دکتۆر سەرتیب، ١٩٤٩ – ٢٠٠٠).
- (قەدرییە زیائی، ١٩٥٠ – ).
- (شەونم عەزیز بەرزنجی، ١٩٥٠ – ٢٠٠٤).
- (ئەنوەر محەمەد شاکەلی – فەرهاد شاکەلی، ١٩٥١ – ).
- (حەمە کەریم عارف، ١٩٥١ – ).
- (عەلی ناسر، ١٩٥١ – ).
- (عادل تۆفیق، ١٩٥١ – ).
- (ئەنوەر ئەحمەد شاکەلی، ١٩٥١ – ١٩٧٥).
- (شەمسەددین تورکمان ئۆغلۆ، ١٩٥٢ – ).
- (سەیید محەمەد دارتاش، ١٩٥٢ – ).
- (محەمەد مەهدی بەیات ئۆغلو، ١٩٥٢ – ٢٠١٣).
- (دکتۆر رەفیق شوانی، ١٩٥٣ – ).
- (فاروق فایق کۆپرلو، ١٩٥٣ – ).
- (مەلا شاخی، ١٩٥٣ – ).
- (د. محەمەد کەساس جەباری–کەساس جەباری، ١٩٥٣ – ).
- (منەوەر مەلا حەسون، ١٩٥٣ – ).
- (نەجیبە ئەحمەد، ١٩٥٣ – ).
- (لەیلا مەردان، ١٩٥٣ – ٢٠٠٤).
- (شێخ حوسێنی پەڵکانە، ١٩٥٤ – ).
- (جەلال پۆلات–جەلال فەتاح رەفعەت، ١٩٥٤ – ).
- (تەیب جەبار، ١٩٥٤ – ).
- (سەربەست کەرکوکی–عوسمان خەتاب، ١٩٥٤ – ).
- (سەلام محەمەد، ١٩٥٤ – ).
- دکتۆر (عەبدولکەریم حاجی محەمەد عەلی، ١٩٥٤ – ).
- (محەمەد پەژار، ١٩٥٤ – ١٩٩١).
- (فەریق ئەمین، ١٩٥٥ – ١٩٧٩).
- (هانی ساحیب حەسەن، ١٩٥٥ – ٢٠٠٩).
- (سەلام جاسم، ١٩٥٦ – ).
- (عەبدوڵڵا جوندی، ١٩٥٦ – ).
- (عەبدوڵڵا دارتاش، ١٩٥٦ – ).
- (دکتۆر مارف عومەر گوڵ، ١٩٥٦ – ).
- (سەباح قەرەئاڵتون، ١٩٥٦ – ٢٠٠٥).
- (د. سەباح عەبدوڵڵا کەرکوکی، ١٩٥٧ – ).
- (سامی توتنچی، ١٩٥٧ – ٢٠١١).
- ( سەردار جاف، ١٩٥٧ – ).
- (عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی، ١٩٥٧ – ).
- (فوئاد ئەلکنجی، ١٩٥٧ – ).
- (بورهان ئەحمەد، ١٩٥٨– ).
- (دانا عەسکەر، ١٩٥٨ – ).
- (سەلاح حەمە ئەمین، ١٩٥٨ – ).
- (تەلعەت نیعمەت بەیاتی، ١٩٥٨ – ).
- (مستەفا زیائی، ١٩٥٨ – ).
- (تاریق کارێزی، ١٩٥٩ – ).
- (قاسم عەزیز ئاق بایراق، ١٩٥٩ – ).
- (ئازاد ئەحمەد ئەسوەد، ١٩٦٠ – ).
- (بورهان بەرزنجی، ١٩٦٠ – ).
- (خالید مەجید فەتحوڵڵا شوانی، ١٩٦٠ – ).
- (دڵپاك تاهیر دەروێش، ١٩٦٠ – ).
- (رەئوف جەباری، ١٩٦٠ – ).
- (سۆلاڤ سالەیی، ١٩٦٠ – ).
- (فەوزی ئەکرەم تەرزی، ١٩٦٠ – ).
- (یالچین خەیروڵڵا بەللو، ١٩٦٠ – ٢٠٠٧).
- (مستەفا گەرمیانی، ١٩٦١ – ٢٠٠٧).
- (سەیران محەمەد ئەمین شوانی، ١٩٦٢ – ).
- (ستار ئەحمەد عەبدولرەحمان، ١٩٦٢ – ).
- (خەبات بزێنی، ١٩٦٣ – ).
- (عەبدولرەحیم سەرەرۆ، ١٩٦٣ – ).
- (مەلا ئاوارە، ١٩٦٣ – ٢٠٠١).

- (رەعد موتەشەر، ١٩٦٣ – ٢٠٠٧).
- (سەلاح بەهلول عەلی، ١٩٦٥ – ).
- (مەهاباد قەرەداغی، ١٩٦٦ – ).
- (نەسرین شاکەلی، ١٩٦٦ – ).
- (محەمەد خدر –خضر– مەحمود، ١٩٦٦ – ).
- (مەهدی زریان، ١٩٦٧ – ).
- (د. فاروق عەلی عومەر، ١٩٦٧ – ٢٠٠٥).
- (لەتیف فاتیح فەرەج، ١٩٧٠ – ).
- (ئامینە مەحمود، ١٩٧٤ – ).
- (ئاوێزان نوری، ١٩٨١ – ).
- (کاروان عوسمان عەلی–کاروان خەیات، ١٩٨٦ – ).
- (سۆران مامە حەمە، ١٩٨٦ – ٢٠٠٨).
- (خەدیجە میرزا مەحمود، – ١٩٠٦).
- (ئینجە ئاغا گەلالی، – ١٩١٤).
- (تاقی بەگ–مەستی، – ١٩٣٦).
- (عیزەددین کاتب زادە، – ١٩٤٨).
- (باقی عەبدولخالق، – ١٩٩٦).
- (تەحسین نورەددین قائیلی، – ٢٠٠٥).
- (ئەحمەد عارف – ئەحمەد زامدار).
- (ئیبراهیم مەجید تالەبانی).
- (ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید).
- (بەرزانە).
- (چنار نامیق).
- (چنوور نامیق).
- (خالید باشبلاخی).
- (رووزار ئەحمەد).
- (سەباح محەمەد ئەمین).
- (سەراب–رێبوار زەنگەنە).
- (سالەح هەلاج).
- (سالح رەفعەت کەرکوکی).
- (سۆران نەدار).
- (عەباس جەمیل جێماو).
- (عەبدوڵلا سلێمان مەشخەڵ).
- (عەلی بەرزنجی).
- (عومەر سەیدە).
- (فریاد شوانی).
- (مەحمود فەهمی هەمەوەندی).
- (محەمەد ئەسعەد سالەیی).
- (محەمەد بەکر محەمەد).
- (محەمەد کوردۆ).
- (هەیاس مەحمود سەعە کاکەیی).
- (هیشام تاهیر بەرزنجی).
- (هێرۆ کوردە).
- (وافی).
- (یاسینی مەلا ئەحمەدی دەککە).
- (یوسف گەرمیانی).

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. (داقوق، دراسة في تأريخها السياسي والحضاري، ١٦ – ٦٥٦ هـ / ٦٣٨ – ١٢٥٨م)، نامەی ماستەر لە بواری مێژوو، ئاریان جەمال ئیسماعیل هەرزانی، ٢٠٠٩، لاپەرە (٩٠ – ٩١).

٢. (هویة کرکوك الثقافیة والاداریة)، محەمەد عەلی قەرەداغی، دەزگای (ئاراس) بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٤، لاپەرە (٨٨ – ٨٩).

*** سەرەتای ئەدەبی نووسراو لە كەركوك بە دیالەكتی گۆران:**

**د. مارف خەزنەدار**

ئەگەر سەیری دەستنووسە جۆراوجۆرەكانی كوردیو سەرچاوە توركیو فارسییەكان بكەین دەگەینە ئەو راستییە كە گەلێك زاناو نووسەرو شاعیر هەر لە سەردەمی ئەمەوییەكانو عەباسییەكاندا ناوبانگیان هەبووە، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە تاوەكو ئێستاكە ژیاننامەو بەرهەمەكانیان بە شێوەیەكی رێكوپێك نەگەیشتووە پێمان یان دەستنووسێكی ناتەواوی هەموو ژیانیان لە بەردەستماندایە، بۆیە لێكۆڵینەوەو لێكدانەوە لەو ماوانە زۆر بە زەحمەت دەكەوێتو پێویستی بە شرۆڤەكردنی جۆراوجۆر هەیە كە لە داهاتوودا سوودی لێ ببینرێت.

بەڵام ئەگەر سەیری ئەدەبی تۆماركراوو نووسراومان بكەین لە كەركوك سەرەتاكانی بە زمانی كوردی بە زاراوەی (گۆران)ی بووە، بەڵام لەمێو لەوێ بەرهەم بە زمانی توركیو فارسی بەرچاو دەكەون كە زانایانو نووسەرانی كەركوك نووسیویانە.

"گۆران هۆزو تیرەو كۆمەڵێكی ئەتنۆگرافییە لە خەڵك لەگەڵ كرمانجو لوڕ نەتەوەی كورد پێكدێنن، زانیاری لەم بابەتەوە لە سەردەی شازدەمدا لەلایەن مێژوونووسی یەكەمی كورد (شەرەفخانی بەدلیسی)یەوە كەوتووەتە ناوەوە. گۆران وەك زاراوە بۆ كۆمەڵێك عەشرەتو یەكێتی عەشرەت بەكاردەهێنرێ.

ئەم خەڵكە لە دامەنەكانی شاخی زاگرۆس دەژین لەو شیوانەی لە چیاكانی لای باكووری رێگەی بەغداو كرماشان دەبنەوە. هەروەها لەم ناوچانەش ژیانی كۆچەریو نیشتەجێی دەبەنە سەر، لەسەر رووباری سیروانو ناوچە جیاوازەكانی هەردوو هەورامان، هەورامانی لهۆن لە رۆژئاوای ئەو زنجیرە شاخەو هەورامانی تەخت لە رۆژهەڵاتی ئەو زنجیرە شاخە.

جگە لەوە گۆرانەكان لە هەندێ ناوچەی جوگرافی دیكەدا زیندەگانی دەكەن:

١. هێڵی سنە - كرماشان بەرەو رۆژئاوا ئەو ناوچانەی كەوتوونەتە نزیك سنووری عێراقو ئێران.

٢. ناوچەی پاوە، كەوتووەتە شیوێك لە شیوەكانی زێی سیروان.

٣. ناوچەی كەندووڵە (كەنووڵە) كەوتووەتە لای سەرچاوەی زێی بانیان بەرامبەر بە خرابەو پاشماوەی شوێنەواری شاری دینەوەری مێژوویی بەناوبانگ.

٤. لەسەر رووباری خازر (غازر) لە باكووری شاری موسڵ لەو ئاقارانەی دەرژێتە ناو زێی گەورە (زێی بادینان)، لەم ناوە عەشرەتەكە (باجەڵان)ی پێدەڵێن، بەڵام لەناو خۆیانو هاوسێكانیان بە (سارەلوو) یا (سارەلی) ناویان دەبەن.

٥. باجەڵانەكان لە ناوچەی زەهاوی باكووری لورستانیش دەژین.

٦. لە كوردستانی توركیا گۆرانەكان بە زازا ناویان دەبرێ، چونكە لە رووی نەژادی عەشرەتیو زمانەوە گۆرانو زازا یەكتر دەگرنەوە. ئەمانە لەوێ لە ناوچەی دەرسیم لەنێوان مووشو ئەرزنجاندا دەژین، هەروەها لە ویلایەتەكانی ئەرزەرۆمو هەرپووتو بەدلیسو دیاربەكر دەبینرێن"[1].

"سەرەتای ئەدەبی كوردی نووسراو واتە شیعری كلاسیكی بە دیالێكتی گۆرانی بوو. بێگومان هۆی هەرە گەورەی پێشكەوتنی ئەم دیالێكتە لە رۆژگارانی مێژوودا ئەوەبوو كە (بابا ئەردەڵان) میرنشینی لە سەدەی چواردەمی زایینیدا دروستكرد بایەخێكی زۆری بەلایەنی زانستیو ئەدەبو هونەر دەدا، زمانی ئەو میرنشینە دیالێكتی گۆرانی بوو، جگە لەمە دیالێكتی گۆرانی زمانی رەسمی ئایینو ئایینزاو عەقیدە شاراوەكان بوو لەو ناوچانەی هۆزەكانی گۆران كردبوویان بە مەڵبەندی ژیانیان.

ئەستێرەی بەختی دیالێكتی گۆرانی بەرەو كزبوونو رژان دەرۆیشت لەوكاتەی كە بزووتنەوەی شیعری نوێ لە نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەم لەسەر دەستی (نالی) لە ناوچەی سلێمانی سەری هەڵدا. لەو سەردەمەدا (عەبدولرەحیمی مەولەوی) (١٨٠٦ - ١٨٨٢) لووتكەی شیعری كلاسیكی دیالێكتی گۆرانی بوو، ئیتر بەرەو كزبوون كەوتە رێ شاعیرێكی وەكو (مەولەوی) لە دوارۆژدا پێشكێش نەكرد، لەگەڵ ئەوەی تا ئێستاش دیالێكتی گۆرانی هەر ماوەو كۆتایی نەهاتووە"[2].

لە ماوەی نێوان سەدەی چواردەهەم تا سەدەی هەژدەهەم ئەدەبی دیالێكتی گۆرانی دەوری باڵای هەبوو لە شیعری شاعیرانی كەركوكدا كە ئەویش خۆی دەبینییەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:

١. فراوانی ئیمارەتی (ئەردەڵان)ی‌و دەوری لە پێگەیاندنو گەشەكردنی ئەو زاراوەیەدا دەوری باڵای بینی لە فراوانی بڵاوبوونەوەی ئەو زاراوەیە كە كەركوكیش بەشێكی گرنگی ئەو بەركەوتەیە بووە لە ناوچەكە.

٢. سەرهەڵدانی ئیمارەتی (زەنگەنە) لە ناوچەیەكی فراوانی كەركوك لە كوردستانی باشوورو كوردستانی رۆژهەڵاتدا دەورێكی باڵای بینی لە پێگەیاندنو گەشەكردنی ئەو دیالێكتە كە تا خوارەوەی كوردستانی باشووری تەنیبووەوەو سنووری خۆی دەدا لە چیای حەمرین.

٣. بایەخدانی ئیمارەتی (زەنگەنە)و (ئەردەڵان) بە شاعیرو نووسەران دەوری باڵای بینی لە پێگەیاندنی ئەدەبی ئەو دیالێكتەو بەردەوامبوونی بۆ كاتێكی زۆر دوورو درێژ كە تا ئێستاكەش وەكو زاراوە بەشێكی زۆر لە عەشرەتی (زەنگەنە) و (كاكەیی)و (رۆژبەیانی)و (شێخانی) قسەی پێ دەكەن، هەر چەندە وردە جیاوازییەكی هەیە.

٤. دەوری سیاسی ئەم ئیمارەتانە گرنگی خۆی هەبوو لە پێگەیاندنی ئەو زەمینە گونجاوە بۆ گەشەكردنی ئەدەبو شیعرو مێژوو لەو ناوچەیە.

٥. ئارامی ناوچەی كەركوك لەو ماوەیەدا ئەگەر بەراورد بكرێت بە ناوچەكانی تر دەوری باڵای بینی لە پێگەیاندنی ئەو دیالێكتەو شاكارەكانی كە لەو ماوەیەدا نووسراوەتەوە.

## * دیالێکتی گۆران و شاعیرانی کەرکوك:

د. محەمەد ئەحمەد سەعید (کەساس جەباری)

### * پێشەکی:-

کەرکوك وەك ناوچەیەکی گرنگ و ستراتیژی، وەك شارێکی دێرین و کوردەواری، بەو پێیەی کەخاکێکی بەپیت و بەرەکەتە و خاوەن سامانێکی نەوتی زۆرە، هەر لە کۆنەوە تاوەکو ئەمڕۆ، لە هەموو قۆناغە جیاجیاکانی مێژوویدا، مەیدانی ململانێ و ناکۆکی نێوان دەسەڵات و حوکمڕانەکانی ناوچەکەو دەرەوە بووە، بەتایبەتی لە مێژووی نوێ و هاوچەرخدا.

بێگومان ئەم بارودۆخەی وای کردووە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پاشەکشێ و دوواکەوتن و ململانێ ببێتە بەشێکی ژیانی شارەکەو ناوچەکە.

وێڕای ئەو دۆخە ئاڵۆزو ناهەموارە، لەباری ڕۆشنبیری و ئەدەبییەوە تیشك و تروسکاییەکی بەرچاو ئەبینرێ، بەتایبەتی لەبواری شیعردا بووەتە بەشێکی کلتوری ئەم ناوچەیە.

ئەوەی لەم باسەماندا گەرەکمانە تیشك بخەینە سەری ئەوەیە کە ئاماژە بەکورتەیەکی مێژووی گۆران و دیالێکتی گۆران و کاریگەری بۆسەر شاعیرانی کەرکوك بدەین و پاشان کورتەیەکی بزاڤی شیعری کوردی لەهەردوو سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم و ئاورێکی خێرا لەشاعیران مەلا عومەری ڕەنجووری و چەند ئاوەڕۆکێکی شیعری و مەلای جەباری و فەقێ قادری هەمەوەندو شێخ ڕەزای تاڵەبانی وەك سێ کەڵە شاعیری سەدەی نۆزدەهەممان بەسەرکردووەتەوەو لەهەندێ ناوەڕۆکە شیعرییەکانیان دوواوین.

### * دیالێکتی گۆران و شاعیرانی کەرکوك:

دەربارەی گۆران کۆمەڵێك لەزاناو پسپۆران لەنووسین و لێکۆڵینەوەکانی خۆیاندا گەلێ باسیان نووسیوە، بۆ یەکەم جار میر شەرەفخانی بەدلیسی لە کتێبەکەیدا باسی هۆزە سەرەکییەکانی کوردی کردووە، گۆرانی بەبەشێك لەکورد لەقەڵەم داوە، بێگومان ئەم دابەشکردنەش بۆ کات و دەوری خۆی جێی سەرنج و تێرامانە، چونکە بەڕاسترین دابەشکردنی زانستی کۆمەڵی عەشیرەت و تیرەو ئەتنۆگرافیاییەکانی کورد ئەژمێردرێ[٣].

شەرەفخان نووسیوێتی: "نەتەوەی کورد لە چوار لقی گەورە پێکهاتووە، کە جیاوازی لەنێوان زمان و قسەکردن و خوو ڕەوشت و ئاخاوتنیاندا هەیە، لەکرمانج و لوڕو کەڵهوڕو گۆران پێکهاتووە"[٤].

هەر سەبارەت بەوشەو دیالێکتی گۆران ئەم ڕایانە هەن وشەی گۆران چەند مانایەك ئەگەیەنێ، گۆران یان هەورامان واتا کوردی شارستانی یان نیشتەجێ، لەناو کوردا بەرامبەرەکەی کۆچەرییە لەکۆندا کوردو کۆچەر هەبووە، گۆران واتە ئەو کوردانەی کە کۆچ ناکەن و نیشتەجێن[٥]، لەنیوەی سەدەی نۆزدەهەمدا بەم جۆرە باسی گۆران کراوە (کوردە گۆرانەکان لەو کۆمەڵە ئەژمێررێن کە تارادەیەك نیشانەکانی زمانی کۆنی گەبرانیان پێوە دیارە)[٦].

مینۆرسکی وای بۆچووە، کە ئەشێ لەم دوو ناوەوە هاتبێ گابراڵ لایەنگرانی زەردەشت پاشان گۆرانی بەسەردا هاتووەو بووە بەگۆوران- گۆران، یان لەناوی تیرەیەکەوە کەوبەرکان ئەمیش گۆڕاوە بەکەورەکان- کورکان- کوران- گۆران[٧].

گۆران کۆمەڵە هۆزو تیرەو ئەتنۆگرافیایە لەخەڵك لەگەڵ چەند کۆمەڵێکی تردا نەتەوەی کوردیان پێکهێناوە، لەم چەرخەی ئێستاماندا زاراوەی گۆران بەکۆمەڵێك هۆزو عەشیرەت و یەکێتی عەشیرەت بەکارئەهێنرێ کە لەسنوورێکی بەرفراوانی کوردستاندا ئەژین[٨].

هەر لە باسی گۆراندا جەمال نەبەز بەشێوەیەکی لاتەنیشتی دائەنێ[٩]، د. کەمال فوئادیش لەوتارێکیدا گۆرانی و زازایی هەردوو پێکەوە باس کردووە، لەباسی دیالێکتی گۆراندا نووسیوێتی: "دیالێکتی گۆران بەو کۆمەڵە زاراوانە ئەوترێ کە لە ڕیزە شاخەکانی هەورامانەوە بەرەو ڕۆژهەڵات و بەرەو باشوور تا ناوچەی کرماشان و خانەقین لە کوردستانی ئێران و عێراق قسەی پێ ئەکەن بەشە دیالێکتەکانی هەورامی و کەنوولەیی و باجەڵانی و گەهوارەیی و زەنگەنەو کاکەیی و زازان ئەمەی دوواییان ئەگەرچی لە سنووری جوگرافیایی ناوچەی گۆرانەوە دوورەو لەوپەری سەرووی ڕۆژئاوای کوردستانە بەڵام لەباری فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی و ئاخاوتنەوە لەگەڵ گۆراندا ڕەگیان یەکە"[١٠].

دەربارەی دابەشبوونی بەشە دیالێکتەکانی گۆران تۆفیق وەهبی هەورامی و زەنگەنەو کاکەیی و باجەڵانی دیاری کردووەو سنووری ناوچەکانی دەستنیشان کردووە[١١].

لەناو بەشە دیالێکتەکانی گۆراندا هەورامی بووە بەزمانی ئەدەبی و کۆنترین بەڵگەی شیعریشی لەمۆنراوەو دوو بەیتییەکانی مەلا پەرێشاندا دەرکەوتوون، کە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی چواردەهەمی زایینی ئەگەڕێتەوە لەزۆری بەرهەمدا کۆنترین شاعیری گۆرانە[١٢].

ئەم دیالێکتە هەتا سەدەی نۆزدەهەم بری کردووەو بووە بەزمانی شیعر لە هەموو ئەم ناوچانەی کە ئەکەونە باشوورو ڕۆژهەڵاتی زێی بچووکەوە لە کوردستانی عێراق تاسنەو کرماشان لەکوردستانی ئێران. بەڵام خوێندەوارەکانی ئێستا بەکرمانجی خوارووو ئەنووسن.

دیالێکتی گۆران بەهۆی کۆمەڵە هەل و مەرج و فاکتەرەوە، لەنیوەی دووەمی سەدەی (١٤)ی زایینی بووە بەزمانی شیعری ناوچەیەکی فراوانی کوردستان[١٣]، کۆمەڵە شاعیری وەك بێسارانی و سەیدی هەورامی و خانای قوبادی و مەولەوی و چەندانی تر شیعریان پێ ووتووە، لەسەدەی نۆزدەهەم بەدوواوە بەرەو کزی چووەو دیالێکتی کرمانجی شوێنی گرتووەتەوە، نالی و سالم و کوردی و مەحوی و شێخ ڕەزاو حاجی قادری کۆیی و حەمدی و چەندانی تر لەسنووری جوگرافیایی ئەو دیالێکتە شیعر نووسینیان پێکردە باوو پەرەیان پێدا.

دیالێکتی گۆران بەشێکی زۆری کلتورو ئەدەبیاتی کوردی پێ ووتراوەو نووسراوەتەوە هەر لەو کۆمەڵە دەقە شیعرییانەی شاعیرانمان کەبەشی زۆریـان ئایینیی‌و ئاینزایی کۆمەڵی کـوردەواریمـانـن، تاپەندو ئـامـۆژگـاری‌و قسەی نەستەق‌و بەرهەمە میللییەکان کە سەراپای زاراوەی پیری کۆمەڵگای کوردەواریمانن.

ئەوەی راستی بێت پێش ئەو مێژووەی کە ئاماژەی پێدراوە کۆمەڵە دەقی شیعری دیالێکتی گۆران هەبووە، کە زۆرینەیان نوێنەرەوەی باوەری ئاینی‌و ئاینزایین‌و سەردەمەکانیان بۆ سەدەکانی سێیەم‌و چوارەمی کۆچی ئەگەرێتەوە[١٤].

هەر ئەم دەقە شیعرییانە بوون بەبناغە بۆ شیعری ئاینی ئەو دیالێکتە، جگە لەوانەش کۆمەڵە بەرهەمی میللی وەك پەندو ئامۆژگاری تر (کە تایبەت بوون بەباوەرو کلتوری کۆنی کـورد) هـەبوون‌و بـوون بەبناغە بـۆ سـەرهـەڵدان‌و گـەشـەی شیـعری گـۆران بـەتـایبـەتـی‌و شیـعری کـوردی بەگشتی کە ئەکرێ ئاماژەیەکیان بۆ بکەین، لەوانە پەندو ئامۆژگارییەکانی پیرشالیاری زەردەشتـی، کە بریتییە لە کۆمەڵە دەقی شیعری‌و لە شێوەی پەندان لە رووی کۆنی‌و مێژوویی‌و ئایینییەوە بەشێکی گرنگی ئەدەبیاتی گۆرانە.

سەرچاوەیەکی تری شیعری ئەم دیالێکتە کتێبی (سەرەنجام)ە[١٥] کە رەواڵەت‌و ناوەرۆکێکی ئاینی هەیە، بریتییە لەکۆمەڵە سروودی ئاینی لەلایەن سروود خوانەکانەوە وتراونەتەوە، لەکۆندا بەفەهلەویات ناوی هاتووە لەزمانەکانی ئاوێستایی‌و فارسـی کـۆن‌و سانسکریتی‌و پـەهـلـەوی‌و فـارسـی نوێدا هاوئاوازیان هەیە، ئەم سەرچاوەیە گرنگترین‌و پیرۆزترین نوسراوی یارسانەکانەو (ئەهلی حەق) کەلامی گەنجینەشی پێ ئەڵێن واتە قسەی خوا.

خەزانەی غەیبەن یاران ئەی کوچە
گرد ئامادەبان پەرێ ئەو رۆچە
مەنبەع فەیزەن کەلام یاری
نەلای خاوەندکار ئامادە دیاری[١٦]

یارسانەکان گەلێ موریدو رێبەری زاناو هەڵکەوتوویان هـەبووە لـەوانـە سوڵتان سوهـاك کـە توانیوێتی سنووری جوگرافیایی ئاینەکە فراوان بکات بەتایبەتی لە ناوچەکانی گـۆران‌و گەرمیان‌و رۆژهـەڵاتـی شـارەزوورو هـەورامـان ئەم باوەرە ئایینییە بەشێوەیەکی ئەوتۆ بڵاوبووەتەوە تەنانەت ناوچەکانی کەرکوکیشی گرتووەتەوە، پێش سوڵتان سوهاك پیرو موریدی تێدا هەبووە، باوەرەکەیان بڵاوکردوەتەوە لەوانە پیر ئـەحمـەدی کەرکوکی کە لـەسـەدەی شەشەمی کۆچیدا ژیاوەو شیعرو پەندەکانی لەدانش نامەی نام ئاوران یارسان هاتوون[١٧]، پیاوێك بووە لە مەعنەویات‌و کەمالات‌و فەزیلەتدا هاوتای کەم بووە، پێرەوی ئەهلی حەقی بڵاوکردووەتەوە، بۆ ئەو مەبەستە زۆری ناوچەکانی کوردستان گەراوە پاشان هـاتووەتـەوە کـەرکـوك‌و لـەوێ کۆچی دووایـی کـردووە، لە گەرەکی موسەڵادا نێژراوە لەو شیعرانەی کەلەدانش نامەی (نام اوران) یارسان بڵاوکراوەتەوە ئەفەرموێ:

ئەز ئەحمەدی زێرین بەرم
ئەز ئاو دورەی گەوهەرم
ئەرزو سەمایە لەنگەرم
لەرۆژ حەساو ئەز لەدەرم
ئەز ئەحمەدم باز مەم گەیلان
تاوانم داوە بەخەیلان[١٨]

هـۆکـاری ئـایـنـی‌و دەسـەڵاتـی میرنشینی ئـەردەڵان دوو فاکتـەری سـەرەکـی بـڵاوبـوونـەوەو گـەشـەی ئـەم دیالێکتە بوون، ئەو ناوچانەی کە کاتی خۆی ئەردەڵانییەکانی تێدا باڵا دەست بوون. کەرکوکیشی گرتووەتەوە کە عەشیرەت‌و هـۆزەکـانـی دەوری کـەرکـوك‌و کـفـری‌و خـانـەقین‌و قـەراغ رووباری سیروان وەك زەنگەنەو جەباری‌و شوان‌و بیبانی‌و تاڵەبانی سەر بەعەشیرەتەکانی گۆران بوون، ئەمانە ئەدەبی میللی‌و فۆلکلۆری‌و کلاسی‌و نـووسراوی خۆیان هەبووە کەبەدیالێکتی گۆران بووە[١٩].

لەبەر ئەوەی هەر لە کۆنەوە بەرهەمی شیعری بناغەکەی ئەم دیالێکتە بوو بەتایبەتی لەناوچەی کەرکوك ئەبینین هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئەدەبیاتی دیالێکتی کرمانجی خـواروو و کزبوونی دیالێکتی گۆرانـەوە، هەر لەو دەڤـەرە کۆمەڵە شاعیری هەڵکەوتوو شیعرەکانیان بەدیالێکتی گـۆران وتـووە، لەوانە رەنجـووری‌و مـەلای جـەباری‌و فەقێ قادری هەمەوەندو سەرپاکی شاعیرە کاکەییەکان‌و چەندان شاعیری تر تەنانەت شێخ رەزای تاڵەبانیش بەو دیالێکتە شیعریان وتووە کە رۆڵی کاریگەریان لەپەرەسەندن‌و گەشەی شیعری کوردی بەتایبەتی دیالێکتی گۆران هەبووە لەزۆری بەرهەمدا سەرەتاکەی بۆ سەدەی هەژدەم ئەگەرێتەوە ئەویش شیعرە ناسك‌و دڵرفێنەکانی رەنجـووری (١٧٥٠-١٨٠٩) پایە بڵندن ناوەرۆکی شیعرەکانی کە چەندین بابەتی وەك کۆمەڵایەتی‌و مێژوویی‌و دڵداری‌و نیشتمانی‌و نەتەوایەتی وەسفی سروشت‌و ئاینی‌و سۆفیگەری‌و شین‌و لاواندنەوەو چەندین، نامەی شیعری لەخۆ ئەگرن. ئێمە لێرەدا تەنها ئاماژە بەهەندێ دەقی شیعری ئەدەین کە ناوەرۆکی بیری نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و کۆمەڵایەتی لەخۆ ئەگرن.

رەنجـووری لەبابەتی مێژوودا چامەیەکی دوورو درێـژی بۆ ئەو کارەساتە مەینەت بارەی کەرکوك وتووە لایەنێکی دیاری باری ناهەمواری سروشت زەدەی کەرکوك ئەهێنێتەوە یاد، مێژووەکەیمان بۆ دیاری ئەکات دەربارەی شاری کەرکوك‌و دانیشتوانەکەی کە پـرە لـەسـۆزو خۆشەویستییەکی بێ سنوور بۆ ئەو شارە لەسەرەتادا بەستایشی خواو پاشان سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ کەرکوك‌و باسکردنی ئاوو هەوا سازگارەکەی ئەوجار دێتە سەر مەینەتی‌و باری ناهەمواری کە بەهۆی ئەو کارەساتەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعون لە کەرکوك دا، بووەتە هـۆی بـێـزاری خەڵك‌و ماڵوێرانی‌و پەرتەوازەیی‌و تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتی دانیشتوان.

چامەکەی بەم جۆرە دەست پێ ئەکات:

قەییووم قەههار قەییووم قەهار
قادر بەقودرەت قەییووم قەهار
عەزیمیت عەزیم حیکمەت بێ شومار[٢٠]

ئەو کارەساتەی کەرکوك نزیکەی دوو سەد ساڵێك بەر لەئێستایە واتە ساڵی (١٧٩٩)ی زاینی هەر بەتۆمارکردنی ساڵی کارەساتەکە بەم دێرە کۆتایی بەچامەکەی هێناوەو ئەڵێ.

سەنەی تەئریخیش غەریبابێ نەقش
هەزارو دووسەدو یەك هەشت و یەك شەش[٢١]

بیری نیشتمانیش لە هەندێ لە شیعرەکانی ڕەنجووری تەواو دیارو ئاشکرایە بەپێی ئەو دەقە شیعرییانەی شاعیرانی گۆران و ئەو لێکۆڵینەوانەکە لەبەر دەست دا هەن دەرکەوتووە کە لەئەدەبیاتی گۆراندا بابەتی نیشتمانی و نەتەوەیی کەم و دەگمەنەو شاعیران کەمتر ئاماژەیان پێکردووە.

چونکە ئەو سەردەمەو ئەو ناوچەیە کەمتر لەژێر فشاری چەوسانەوەو ململانێدا بووە، ناوچەکەش خۆی دەسەڵاتی خۆی بەڕێوەبردووە.

مەسەلەی نیشتمانی و نەتەوەیی وەك هەڵوێست و بیر ئەگەر لەشیعری کرمانجی خوارووودا هەردوو چامەکەی نالی و سالم بکرێنە پێوەر بۆ بیری نەتەوەیی و نیشتمانی لای هەردووکیان ئەوا پێش ئەمان لەشیعری گۆراندا ئەو نامەیەی ڕەنجووریی شاعیر کەبەبای شەماڵدا بۆ عەبدولڕەحمان پاشای بابانی ناردووە کە ئەوکاتە زیندانی دەستی عوسمانیان بووە لە شاری حیللە تووندکراوە، ئەکرێتە پێوەر بۆ بوونی بیری نیشتمانی و نەتەوەیی لە شیعری گۆراندا، کە هەڵوێستێکی کوردانەیە بەرامبەر بەکوردو پاشای کوردستان کە هەر هێمای دەسەڵاتی کوردی بووە، ڕەوایی پاشایەتی کوردستان بەئەو ئەبینێ، ئەوەتا فەرمویەتی کە پاشای گشت ویلایەتی کوردستانە، جگە لەوەش باسی دۆخی ئەو دەمەی کوردستانمان بۆ ئەکات کە بێ بوونی عەبدولڕەحمان ناهەموارو ئاڵۆز:

شەماڵ شنیار شەماڵ شنیار
شەماڵ شەوگەرد شەممیم شنیار
شەن کەروەی شکەنج گیسووی لوولیار
شاناو تاتاکەرو بەرەزای سوغار
هەتا:
دەوربەدەر نەموڵك بابل بێ ئەندێش
بشۆ وەجایێ حیللەماچان پێش
شەهزاوێ جەنەسل بەگزادەی بابان
جەنەوەی ئۆجاغ مالیك ریتابان
والی ویلایەت گشت کوردستانەن
ئیسم شەریفش عەبدولڕەحمانەن[٢٢]

چامەکە دووروودرێژە، بەخوێندنەوەی چامەکە دەرئەکەوێ کەسەرپاکی بەڵگەی ئەوەن کە ڕەنجووری خاوەن هەستێکی نەتەوایەتی و نیشتمانی بەرزبووە بەرامبەر بەپاشای کوردستان عەبدولڕەحمان پاشای بابان کەرۆڵی کاریگەری هەبووە، لەفراوان و بەرقەراربوونی دەسەڵاتی کوردی و مایەی سڵەمینەوەو نیگەرانی حوکمرانی عوسمانی.

لەم چامەیەوەو لەوەی پێشوودا دەرئەکەوێ کە ڕەنجووری مۆرکی بیرێکی قووڵی نیشتمانی و سۆزێکی مرۆڤایەتی لە ڕادەبەدەری هەیە، کە ئەمەش هەڵوێستێکی تری مەزنی ڕەنجووری بەرامبەر بە کوردستان و شوێنەزاکەی کەرکوك کە خۆی لەخۆیدا وەك بەشێکی بزاڤی شیعری دەڤەری کەرکوك لەقەڵەم ئەدرێ.

لەسەدەی نۆزدەهەمداو هاوکات لەگەڵ گەشەی دیالێکتی کرمانجی خوارووودا هەر لەو سنوورو جوگرافیایەدا کۆمەڵە شاعیر بەبنەچە هەورامی نەبوون، کەچی بەشێکی زۆری شیعرەکانیان بەدیالێکتی گۆران بوون، بۆ ماوەیەکی زۆر لە سنووری کەرکوکدا، دیالێکتی گۆران بەردەوامییەکەی خۆی لەدەست نەدا، چونکە پێشتر ڕەگوریشەی خۆی داکوتابوو و زەمینەشی بۆ لەبار بووە، وەك چۆن لەسلێمانیدا مەولەوی بەشیعرە تەرو پاراوەکانی بەردەوامی بەو دیالێکتە دا بەهەمان شێوە شاعیرانی کەرکوك گورو تەوژمیان بەشیعری کوردی دا بزاڤێکی شیعری فراوان و مەزنیان بەرپا کردو پەیامە شیعرییەکەی ڕەنجوورییان تەواو کرد.

شاعیرانی کەرکوك بەشیعرەکانیان توانیان بەردەوامی بەبزاڤی شیعری کوردی بدەن و گەشەی پێ بدەن، بوون بەسەرامەدی ئەو بزاڤە بەهەردوو دیالێکتەکە، گۆران و کرمانجی خواروو، بۆ دیالێکتی گۆران مەلای جەباری و خەمناکی بچووك و فەقێ قادری هەمەوەندو چەندانی تر، بۆ کرمانجی خوارووش شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کە هەموویان لەسەردەمی خۆیان و دوای خۆشیان ڕۆڵ و کاریگەرییان هەبوو لەسەر ئەوەکانی دوای خۆیان، زۆربەیان پەیڕەوییان کردووە.

ئێمە لەم باسەماندا بۆ دیالێکتی گۆران تەنها ئاماژە بە مەلای جەباری و فەقێ قادری هەمەوەندو هەندێ لەشیعرەکانیان ئەکەین بۆ کرمانجی خوارووش دیسان شێخ ڕەزا.

مەلای جەباری بەشیعرە سروشتی و دڵداری و کۆمەڵایەتی و فەقێ قادری هەمەوەندیش لەبواری کۆمەڵایەتی و سۆفیگەریی بابەتە جۆراو جۆرەکانی شیعرداو شێخ ڕەزای تاڵەبانی بەداشۆرین و شەرە جنێوەکانی، دەنگ و سەدای شیعری کوردی سەدەی نۆزدەهەم بوون بەدیالێکتی گۆران.

*** مەلای جەباری (١٨٠٦-١٨٧٦ز):**

مەلای جەباری بەحوکمی شارەزابوونی لەشیعری شاعیرانی پێش خۆی و هاوچەرخی و کاریگەری دیمەنی سروشت و ژینگەکەی خۆی (گەرمیان) و باری ناهەمواری و ژیانی پڕ مەینەتی و خەم و کەسەری ئەو ژیانەو باری ناڵەباری ئابووری و چەوسانەوە، ئەمانەو چەندین هۆی تر وایان کردووە کەبەشێکی ژیانی خۆی بۆ شیعر تەرخان بکات و نازناوی مەلا بۆ تەخەلوسی شیعری هەڵبژێرێ، سۆزو هەستی دەروونی بەفەزایەکی شیعری بۆ دەربڕین ڕەنگدانەوەی باری ژیانی خۆی و دەوروبەرەکەی، بەشیعری جوان و ناسك تینوێتی خۆی شکان و کەوتە بەهارستانی شیعرەوە.

بەدیالێکتی گۆران بەشە هەورامییەکەی کۆمەڵە دەقی لەفەوتان ڕزگار بوون لەدوو توێی دیوانێکی قەبارە مام ناوەندیدا لەلایەن جەبار جەبارییەوە کۆکراوەتەوەو چاپ کراوە[٢٣].

*** مەلای جەباری‌و دیالێکتی گۆران:**

مەلا خەڵکی جەبارییەو سەربەشاری کەرکوکە، دانیشتوانی ئەم ناوچەیەش بەکرمانجی خواروو ئەدوێن، لەباری جوگرافیاییشەوە لە ناوچەی گۆرانەکانەوە لەیەکەوە دوورن، لەو سەردەمەشدا هاتوچۆو پێوەندی لە هەموو ڕووەکانی ئابووری‌و ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتییەوە لە سلێمانییەوە نزیك



تر بووە لەوەی لەناوچەکانی گۆران‌و ئەردەڵان، سلێمانیش کەناوەندێکی گەورەی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە بووە بە تایبەتی لەدەورو چەرخی شاعیرانی وەك مەولەوی‌و مەلای جەباریدا، هەروەها لە سەردەمی بابانەکاندا لەسەردەمی ئەورەحمان پاشادا زمانی ئەدەب‌و شیعری ناوچەی بابان‌و سلێمانی دەروبەری بەشە دیالێکتی سلێمانی بووە، بەدەرکەوتنی شاعیران نالی‌و سالم‌و کوردی پەرەی سەند، ئەدەبیاتی گۆرانیش پێچەوانەی ئەو هەل‌و مەرجە بۆ ڕەخساوەی کرمانجی خواروو بەرەو کزی‌و لاوازی ڕۆیشت.
هەر لە سەردەمی ئەم کزبوونەی ئەدەبیاتی گۆرانی‌و گەشەی کرمانجی خواروودا چەندین شاعیری کورد کەبەبنەچەو شێوەی ئاخاوتنیان گۆران نەبوون، کەچی شیعریان بەو دیالێکتە وتووە، لەوانە مەولەوی کەخەڵکی تاوەگۆزی‌و مەلای جەباری‌و فەقێ قادر خەڵکی جەباری‌و هەمەوەند بوون.
مەلای جەباری وەك شاعیرێك‌و خاوەن چەندین چامەی شیعری بەدیالێکتی گۆران شیعری وتووە هۆی وتنەکەشی لەم خاڵانەدا دەستنیشان ئەکرێن.
١. دیالێکتی گۆران لەوناوچەیەی گەرمیاندا بۆ شیعر باوبووە کاریگەری کرمانجی خوارووش هێشتا نەگەیشتبووە ئەوێ‌و بەردەوامی گۆران هەرمابووەوە، کاریگەری لەسەرمەلاو هاودەورو شاعیرانی پێش خۆشی هەرمابوو.
٢. مەلا هاوچەرخی مەولەوی‌و ئەحمەدبەگی کۆماسی بووە بەتایبەتی مەولەوی کەدۆستایەتی یان لەنێواندا هەبووە.
٣. دایکی مەلا (نەنە دوستاغ) لەبنەماڵەی زەنگەنە بووەو زەنگەنەش بەشە دیالێکتی گۆرانە ئەم وای کردووە کەشارەزایی لەو بوارەدا هەبێت.
٤. پێش مەلاو لەو ناوچەیەدا شاعیری تری نزیك خۆی هەبووە، کەکاریگەری دیالێکتی گۆرانیان لەسەربووە لەوانە سەیید ئەحمەدی مامی مەلای جەباری کەدەستێکی باڵاو شارەزاییەکی تەواوی لەدانانی شیعرو تێگەیشتن لەدیالێکتی گۆراندا هەبووە، و چەندین چامەو غەزەلی شیعری هەبووە.

*** بابەتەکانی شیعر لای مەلای جەباری:**

گەرچاوێك بەشیعرەکانیدا بخشێنین لەدوو توێیاندا کۆمەڵە دەقی شیعری بەرچاوو دیاری تێدا بەدیی ئەکەین کەچەندین ناوەڕۆکی جیاجیای بەخۆوەگرتووە وەك.
وەسف‌و دلداری‌و داشۆرین‌و ئاینی‌و کۆمەڵایەتی.. تاد، ئێمە لەم باسەمان تەنها تیشك ئەخەینە سەر دوو بابەتی سەرەکی وەك وەسف بەتایبەتی وەسفی سروشت‌و خۆشەویستەکەی‌و دلداری کەپانتاییەکی زۆری شیعرەکانی داگیرکردووە.

*** وەسف:**

زۆرینەی شیعرەکانی تایبەتن بەوەسف مەلای جەباری لەدوو لایەنەوە لەدەرگای ئەم بابەتەی داوە وەسفی سروشت بەتایبەتی وەسفی بەهارو وەسفی جوانی خۆشەویستەکەی بوونەتە تەواوکەری یەکتری.
ژینگەی مەلا دیمەنی هەردەو هەڵەت‌و دەشت‌و کۆسار سروشتی وڵاتەکەی باخ‌و لالەزارو دیاردەو دەنگە سروشتییەکان دیمەنە ڕەنگینەکانی، کە تێکرایان پێکهاتەی سروشتن، ئەمانە لەبەردیدو سەرنجی مەلادا دیمەن‌و تابلۆی هەمیشەین‌و ون نابن، وایان لەمەکردووە، لەناخ‌و هەناوو دەروونیدا لەبیرو هۆشیدا ئەو وێنانە بگیرسێن‌و چەکەرە بکەن‌و ببن بەوێنەی شیعری.
مەلای جەباری بەهەستی ناسکی خۆیەوە، بەسروشت‌و تەبیعەتەکەیەوە بەخەیاڵێکی فراوانەوە ئەو سروشتەی کردووە بەجێگاو سەیرانگاو گەشتی چاوکاڵان‌و لەرەی لەرزانەیان، لەنجەولار نیگای کارمامزان دەنگ‌و چریکەی مەلانی ناوگوڵان‌و گوڵزار، ئاوازو مۆسیقای سروشت لەژیانی گۆشەی ڕەشماڵاندا، دەنگ‌و سەدا ئەداتەوە دەم‌و کازیوەی بەرەبەیان، خشەو جیکەو جوکەی مەلان، شنەو سروەی بەیانیان، خشەو گڤەی گەڵای داران، لەو بەهارە پڕجوانییەی ژینگەکەیدا هەموویانی تێکەڵ بەدەنگی مۆسیقاو بەزمی خوسرەوی کردووەو ژوانێکی سەرمەستانە لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا ئەسازێنێ لەبەهار نامەکەیدا بەم جۆرە ئەدوێ.

میرزام یە وەعدەی نەو وەهارانەن
سەرەتای تەلمیت خاتر دارانەن
فەسڵ وەسڵ دۆست سەیر هەردانەن
لەرەی لەرزانەی زەنەخ دارانەن

زەمزەمەی بولبول دەبدەبەی گوڵەن
نەزارەی هوزار دەروون پڕچڵەن
نەپرشەی شەونم نەرووی پەردەوە
نەرگز مەست چەم وەڵاو کەردەوە[٢٤]

هەر لەم چامە بەهارییەدا دیمەن و تابلۆکانی سروشتی کردووەتە کەرەسەی رازاندنەوە، ناسکی و سۆزێکی ئەوتۆی پێ بەخشیوە کەلەناخ و مێشکی مرۆڤدا ئەمێننەوە.

نەقارەی مینقار تەیران سوب خیز
بیزەتان نەغمەی نەکیسای پەروێز
چریکەی چەکاوس چون حەنجەرەی عود
مەر دەنگ چل چەنگ پەنجەی بارەبوو
هوهوی بایەقوش شەو وەهەردەوە
زام دەردنیان تازە کەردەوە
دەنگ قیرەی قاز سوب نەسەحرای سوس
مەرمۆزیقەی مەشق شەهەنشای عەروس
تیپ تیپ قولینگان قەتارەی قازان
قیبلەم تاوەرۆ ئاوات مەوازان[٢٥]

ئەمانەی هەمووی لەپێناو رازاندنەوەی سروشتدا کردوونی بەکەرەسەی دەربڕین و تێکەڵ بەبیرێکی ئایدیایی کردوون، ئەم وەسف و رازاندنەوەیەی سروشت لای شاعیرانی تر وەك مەولەوی بەشێوەیەکی تر دەرکەوتووە جوانی بەهارو سروشت تێکەڵ بەگوڵە سۆسەنەکان و چنوورو بەرەزاو تاشەبەردەکان و نەرگز کردوون بوونە کەرەسەی رازاندنەوە کەبەم جۆرەیە.

وەهارەن تەشریف خالخاسان پەی هەرد
کەم کەم جوانیش ئاوەرد پیریش بەرد
جەم جەم سۆسەنان جەتاق تەوق وەردان
سەردان نەهەردان پەرێ هام فەردان
وەرووی زاخاندا چنوور لوول وەردەن
پەی پای گییان تۆردام ئامادە کەردەن
بەرەزا بەو چین توغرای تاتاوە
شەماڵ مشانۆش یانی وەی لاوە
نەرگز وەمەس مەس مدیۆ کێن ئەو کەس
گۆشەی چاك دڵ وەرنە دۆ جەدەس[٢]

مەلا لەباسی سروشتدا، لەباسی بەهاردا، وێنەو دیمەنەکانی سروشت بەهەندێ رووداوی ناو کوردەواری و رۆژهەڵاتی و داستانە دلدارییەکانی رۆژهەڵات ئەبەستێتەوە، وەك شیرین و خوسرەو شیرین و فەرهادو لەیلاو مەجنون، ئەو دیمەنە رەنگاو رەنگانەی بەهارو ئەو فەزا پڕلەخۆشی و کامەرانییە بۆ دلدارەکەی ئەبێ بەشەوی دەیجورو تاریك. دەستەو ئەژنۆ لێی دائەنیشێ.

مەر مەلایش نیشۆ شەونە دەیجورا
ئەو تیرەی تاریك سیای بێ نورا[٢٧]

لایەنی دووەم وەسفی جوانی خۆشەویست و دڵبەرەکەی:

شیرین سەرزەمین شیرین سەرزەمین
خێز پایەی سەیران سەحراو سەرزەمین
دەس بەرد پەی زولف و ماشیەی جەمین
وەڵاو کەرد لەروو مای دوو هەفتەمین[٢٨]

* بابەتی دڵداری:

لەم بوارەدا مەلا دەستێکی باڵای هەبووە، بەشێکی شیعرەکانی لەم چەشنەن کەلەدڵدارییەکی پاك و بێگەرد ئەدوێن، سۆزو ئەندێشەیەکی تێدا بەدیی ئەکرێ مرۆڤ ئەخاتە ناو سەدای عەشق و خۆشەویستییەکی بێ ئامانەوە، هەست و سۆزی دەروون ئەخرۆشێنێ بەم جۆرە ستایشی دڵبەرەکەی کردووە:

شیرین تا تاکەرد شیرین تاتاکەرد
تای توغرای تۆمار زێرش تاتاکەرد
کۆکۆ کۆی کەلاف عەنبەر وەلا کەرد
خەرمەن خەرمەن میسك خۆتەن وەباکەرد
غەز پەنجەی پای حومرەی حەناکەرد
یان وەهون سورخ جەرگ مەلا کەرد[٢٩]

سەرەپای رازەکان باس لەپەیوەندییەکی خۆشەویستانەی نێوان خۆی و دڵبەرەکەی ئەکات، هەرلەو باسانەوە دەست بۆ چمکی سروشت درێژ ئەکات و دیسان رووداوەکان دووبارە ئەبنەوەو ئاماژەیان بۆ ئەکات

یان وەعەسای دەس کەلیم وڵلا کەرد
یان وەتەلسم کۆی گەنج کجا کەرد[٣٠]

سەبارەت بەدڵداری چەندین چامەو غەزەلی شیعری تری هەیە وەك. باد لەیلا خان، شیرین سەرزەمین، شیرین جەلاتەن. دیمەنی دڵدار، نازار، شیرین بەستەوە کە تایبەتن بەوەسف و ستایشی خۆشەویستەکەی، دەربڕینی رازو هەستی خۆشەویستییەکی بێ وێنەی نێوان خۆی و دڵبەرەکەی.

* کاریگەری مەلای جەباری لەشیعرو ئەدەبدا:

گەر بەووردی بەشیعرەکانی مەلادا بچینەوە دەرئەکەوێ کە چەند کاریگەرن. بوونەتە مایەی چێژوەرگرتنی خەڵکی شارەزاو شیعر دۆستەکانداو بەناخی دا چوونەتەوە بەبیستن و خوێندنەوەیان مێشکی خۆیان زاخاو داوە.

ئەوەش وای کردووە ببنە هەوێنی گەلێ هەڵبەست و گۆرانی لەناوچەکەو تەنانەت لە دەرەوەشی زۆرترینیان تێ هەڵکێشی گۆرانی و چەندین ئاوازی کوردی بوون بەتایبەتی قەتارو ئەللاوەیسی و خاوکەر، ئەم ئاوازانەو مەلای جەباری و شیعرەکانی بوونەتە تەواوکەری یەکتری.

لەلایەکی ترەوە مەلا لەبنەماڵەیەکی خوێندەوارو خاوەن دەسەڵات بووە. ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەدەب و شیعردا هەبووە، ماڵەکەیان شوێن کۆبوونەوەی شاعیران و پیاوماقوڵان و شارەزایان بووە، لەزۆر شوێنی ترەوە هاتوچۆی ئەو شوێن و مەقامەیان کردووە. بەو چەشنە بووەتە شوێن و مەڵبەندی گەشەی رۆشنبیری و شیعرو ئەدەب، کۆمەڵە شاعیرو ئەدەب دۆست رووی تێکردووە کۆڕی شیعری تێدا سازکراوە.

ئەو هەوڵ و کۆششانە ئەو بزاڤە هەمیشە شوێن پەنجەو کاریگەری مەلای جەباری بەشێوەیەکی راستەوخۆ پێوە دیاربووە، چ لەسەردەمی خۆیداو چ دوای خۆی، کۆمەڵە شاعیر پەیڕەوی رێبازەکەیان کردووە، ئەو پەیڕەوی کردنەش

سەرچاوەکەی لە قوتابخانە شیعرییەکەی مەلاوە سەری هەلدا، واتە مەلای جەباری رێنمایی کەریان بووە، ئەوانیش بە مامۆستاو قوتابخانەی خۆیان ئەزانی. وەك شاعیران (حەمە لووتەو سەیید محەمەد سەیید فەتاح و سەیید عەلی و سەیید ئەحمەدو مەلا شەریف و حەمە عەلی محێدین و سەیید حوسێن سەیید رەشید) کە هەموویان خاوەنی چەندین دەقی شیعرین و خۆیان بەخوێندکاری ئەو قوتابخانەیە زانیوە، چێژگەی شیعرییان لە هەلبەستەکانی مەلای جەبارییەوە وەرگرتووە.

*** فەقێ قادری هەمەوەند (١٨٣١-١٨٩٠):**

فەقێ قادری هەمەوەند شاعیرێکی ناوچەی کەرکوکە شیعرەکانی بەدیالێکتی گۆرانە. ئەم بەرهەمانەی هەیە دروودنامە، میعراج نامە، فەزیلەتی بەنی ئادەم، چەند وتارە شیعرێکی دەربارەی ئەسفەرییەکان، پەندی حەکیمان، عەقیدەی ئیسلام لەدوو توێی دیوانێکدا بلاوکراونەتەوە [٣١].

کەهەموویان ئەم ناوەرۆکانە ئەگرنە خۆ:

١. شیعری ئایینی و فێرکردن.

٢. بابەتی نەتەوایەتی و هەلوێستی بەرامبەر دەزگاکانی عوسمانی.

٣. وەسف. وەسفی سروشت، جوانی دلبەرو خۆشەویست.

٤. پەندو ئامۆژگاری.

٥. سکالاو لالاندنەوە.

٦. ستایش و پیاهەلدان.

٧. شین و لاواندنە...

ئێمە لێرەدا تەنها تیشك ئەخەینە سەر هەندێ لایەن و بابەتی رەخنەگرتن لەدەزگاکانی عوسمانی و بیری نەتەوەیی فەقێ قادرو هەندێ لەژیانی لەزیندان و دەرووبەری خۆیدا، بەهێنانەوەی هەندێ نموونەو دەقی شیعری.

*** بابەتی رەخنە ئامێزو بیری نەتەوایەتی:**

لەبەر ئەوەی فەقێ قادر خۆی و هۆزەکەی بەهۆی باری ئالۆزی ناوچەکەو ناکۆکی نێوان هۆزەکەی و دەولەتی عوسمانییەکانەوە فشاریان لەسەربووە، شەروشۆری هۆزەکەی و زیندانی کردنی خۆی لەلایەن دەسەلاتی عوسمانییەوە ئەم دۆخە کارێکی وای کردووەتە سەر ناخ و دەروونی فەقێ قادر رقێکی زۆری لەدلدا چەسپی و لەدژی عوسمانییەکان و داموو دەزگاکانی چەکەرەی کرد، ئەمەش لەزۆری شیعرەکانیدا رەنگی داوەتەوە، لە یەکێ لەپارانەوەکانیدا لەبەرهەمی میعراج نامەکەیدا لەیەزدان داوا ئەکات کەلەبەندو کۆتی عوسمانیان رزگاری بکات.

عەفوم کەر جەزەنب زەلیل و ماتم
هەم جەقەیدو بەند بدەر نەجاتم

یان:

هەم غوفران زەین هەم عەتای ئیمان
هەم رەهایی بەندنەی چاەو زیندان

یان:

ئازاد بام جەنار شەرارەی سەقەر
رەهابام جەی بەند زیندان خەتەر

یان

هەم جەی بەند تورك من بدەر نەجات
نەمەندەن تاقەت جای سەیرو پەبات [٣٢]

لە شوێنێکی تردا رق و کینەکە ئەگاتە سنوورێکی ئەوتۆ کەرەخنەو تانەو تەشەر ئاراستەی عوسمانیان و داموو دەزگاکانی ئەکات و گلەیی و سکالاو بەندیی خۆی کردووە، هەروەها فرو فێلەکانی عوسمانی دەرخستووەو ئەخوازێ کەکەس باوەری پێیان نەبێ.

فەقێ شەو دراز مەسۆزو لەمپا
نەحوجرەی بێ دەرنیشتەنی تەنها
جەئەحوال وێت شەممێ کەربەیان
یەلێ دوعای خێر کەن پەرێت سامیعان
بەدام تەزویر بەحیلەو بەفەن
هاکەفتی نەدام تورکی ئەهرەمەن
هەر کەس بەتورکان بکەرۆ باوەر
ئەحمەق ئەوکەسەن جەمن ئەحمەق تەر
هەم خانە تاراج هەم عەیال بەند
هەم وێم نەزنجیر هەم فەوت فەرزەند

دیسان رقەکەی دەرئەبرێ و ئەلێ:

یونس وار جەقەدم وێم کەردم فیرار
بیم بەقووت حوت تورك دەریابار
فیراربیم جەقەوم چون بەرە جەگورگ
نەزانام جەگورگ بەدتەر مەبۆ تورك [٣٣]

لە شوێنێکی تردا کوردو تورکی بەدوو بالندەی کەو باز لێکچواندووە، باسێکی هەردووی کردووە، فێل و تەلەکەبازی بازو دۆستی و دل سافی کەو. تورکی بەبازو کوردی بەکەو لێکچواندووە.

چون کەبك و بازەن ئونسی کوردو تورك
مەرکێ نەسایەی تورکان بی بزورگ
مەعلومەن جەلای عاریفان کار
دۆستی کوردو تورك نییەن پایەدار
مەرتۆ جەو سەبەب مەبیت گورفتار
نەداری بەیاد ئومور ئەفکار [٣٤]

هەمەوەندەکان ماوەیەکی زۆر لەگەل عوسمانییەکاندا لەململانێدا بوون گەلێ گرفت و پەرتەوازەیی و ئاوارەییان تووش بووە، عوسمانییەکان بە مەبەستی سەقامگیر بوونی دەسەلاتیان لەناوبردنی کوردیان مەبەستی سەرەکیان بووە چ جای ئەوەی ململانێیان لەگەلدا بکرێ، هەمەوەندەکانیش هەمیشە پالپشتی بابانەکان بوون، ئەمەش هەلوێستێکی نەتەوەیی دیارو ئاشکرایانە، فەقێش وەك کەسێتییەکی ئەو هۆزە وەك خوێندەوارێکی کورد لەو مەیدانەدا خاوەن هەلوێست بووە، کۆمەلە دەقی شیعری هەیە کەهێماو نیشانەی ئەو هەلوێستە جوامێرانەیەتی.

هەرئەو رەخنەو دابەزینانە بۆ سەرتورکە عوسمانییەکان ئەخرێنە خانەی بابەتی نەتەوەیی و هەلوێستی کوردپەروەرانەوە سەرەرای ئەوەش لەوەرگێرانی ئەو بەرهەمە

فارسیانەیدا بۆ زاراوەی گۆران بەتایبەتی پەندی حەکیمان‌و میعراج نامەکەی ئەڵێ:

هەم مووەفەق بام من جەی هەنگامە
نەی تەنزیم ئەزم میعراج نامە
هەرچەن بێ حەددەن سییەرنەبی
هەم بەفارسی هەم بەعەرەبی
جاهیلان کورد بێ حەدو حیساب
نمەکەن تەفهیم فارسی کیتاب
وحەیفم زانازو مرەی جاهیلان
قەدەر نەبیشان تەمام نەزانان
کێشانم تەصدیع پەرێ هام دەمان
کەردم تەرجومە بە لەفظ گۆران[٣٥]

فەقێ قادر چونکە ماوەیەکی زۆر زیندانی دەستی عوسمانییەکان بووە ئەم دۆخە نالەبارەی‌و ژیانی دوورکەوتنەوەی لەهۆزو کەس‌وکار وای کردووە کەلەبەشێکی زۆری شیعرەکانیدا رەنگدانەوەی باری بێزاری‌و دژ وەستان بەرامبەر عوسمانییەکانی پێوە دیار بن وەك ئەو دەق‌و نموونانەی لەپێش دا هاتوون، هەروەها بەشێکی تریشیان رەنگ‌و بۆی ئایینی پێوە دیارە کەزیاتر رازی موسڵمانەتی‌و لەخواترسانی خۆی تیادا دەربڕیوە کۆمەڵە ستایشی ئایینی‌و خواو پێغەمبەرو پیاو چاکانی دەربڕیوە زۆربەیان بەرهەمی زیندانن.

*** شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٧-١٩١٠):**

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەو نووسینانەی کەلەسەر شێخ رەزا نووسراون‌و ئەو چەندجار چاپ‌و بڵاوکردنەوەی دیوانە شیعرییەکەی لەسەردەمە جیاجیاکاندا، بەپێی ئەو بابەت‌و ناوەرۆکە شیعرییانەی دەرکەوتووە کەشاعیرێکە باڵاو مەقامێکی بەرزی لەئەدەبیاتی کوردی‌و بەتایبەتی‌و ئەدەبیاتی رۆژهەڵات بەگشتی هەیە بەچوار زمانی زیندوو ناوەرۆکی جیاجیای شیعری هەیە وای کردووە لەجیهانی ئەدەبیاتدا ناوو شۆرەتی بەرزو باڵای هەبێ بەتایبەتی ئەو بابەتانەی کەداشۆرینن، یان جنێون کە ناخ‌و دەروونی دەوربەری هەژاندووە، کاریگەرییەکەشی لەفەزای کۆمەڵگای کوردەواری چووەتە دەرەوەو لە ئەدەبیاتی کوردیشدا پانتاییەکی گەورەی داگیرکردووە.

شێخ رەزای سەدەی نۆزدەهەم‌و بەشێکی ژیانی لە سەدەی بیستەمدایە بەهەموو بابەتە شیعرییەکان رۆچووە، بەشیعرە ناسك‌و تەڕو پاراوەکانی هاتووەتە مەیدانەوە، یەکێ لەو تایبەتیانەی کە لە شاعیرانی تری کەرکوك جیای ئەکاتەوە ئەوەیە بەهەردوو دیالێکتی گۆران‌و کرمانجی خواروو شیعری وتووە، لاپەرەکانی ئەدەبی کوردی پێ رەنگین کردووە، بە گۆرانییەکە شیعری کەمتری هەیە لەچاو کرمانجییە خوارووەکە ناوەرۆکی شیعرەکانی هەر لەبابەتی نیشتمانی‌و وەسف‌و ستایشەوە تاداشۆرین کەبابەتێکی نوێ بووە لەو سەردەمەو لەدیالێکتی گۆراندا، ئەم ناوەرۆکە کەلێنێکی ئەدەبی کوردی پڕکردووەتەوە چونکە ئەو سەردەم‌و چەرخەی کەرکوك گەوهەری شیعری گۆران، هەورامی زیاتر ناوەرۆکی ئاینی‌و وەسفی تیادا باڵا بووە. شێخ رەزاو هەندێ لە شاعیرە هاوچەرخەکانی ئەم بابەتەیان هێنایە ئاراوە، واتە شیعری شەرە جنێو لەناویاندا شێخ رەزا بەهەردوو دیالێکتەکە کە بەهۆی زۆری بەرهەم‌و بڵاوبوونەوەی شیعرەکانییەوە لەم بارەیەوە سەرامەدو باڵا بووە. لە دیوانەکەیدا نموونەی زۆرمان بەرچاو ئەکەوێ.

سەدەی نۆزدەهەم قۆناغی گەشەو نەشونمای شیعری دیالێکتی گۆران بوو کەشاعیرانی ئەو دیالێکتەو بەتایبەتی هەر سێ شاعیر مەلای جەباری‌و فەقێ قادرو شێخ رەزاو شاعیرە کاکەییەکان لەو بزاڤە شیعرییەی کەرکوك رۆڵی دیارو بەرچاو یان هەبوو میرات‌و کلتورێکی ئەدەبی بەرزیان بەهەردوو دیالێکتی گۆران‌و کرمانجی خواروو بۆ نەوەکانی دوای خۆیان بەجێ هێشت، ئەگەر چیش رەنجوری پێش ئەمان بەدیالێکتی گۆران شێوەی موکری شیعری هەبووە، بەڵام ئەمان لەبەر نزیکیان‌و ئاگاداربوونی نەوەکان لێیان، رۆڵەکەیان دیارو بەرچاوو بوو.

**"* رەنجووری، ١٧٥٠ - ١٨٠٩:**

*** ژیانی شاعیر:**

هەرچەندە زانیاری لە بارەی رەنجوورییەوە وەکو زۆربەی شاعیرانی کۆنی کورد کەمە، بەڵام شیعرە کۆمەڵایەتییەکانی دەولەمەندن‌و رەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی گشتی‌و بەتایبەتی ژیانی شاعیر خۆی، دەکارین بەهۆی شیعرەکانییەوە تا پلەیەك بیناسین.

رەنجووری شاعیر (مەلا عومەری زەنگەنە کوری خالید بەگی کوری عومەر بەگی زەنگەنە)یە، لە ساڵی (١٧٥٠) لە ئاوایی (گەراوێ)ی ناوچەی کەرکوك لەدایکبووە، بەڵام زۆربەی ژیانی لە کەرکوك بردۆتە سەر. بێگومان ئەم شاعیرەشمان لە رووی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و پەروەدەیی زانستی‌و زانیارییەوە هەروەکو شاعیرانی دیکەی کورد بووە. دەسگای بنچینەیی خوێندنی حوجرەی مزگەوت بووە، قۆناغەکانی خوێندنی لەوێ تەواوکردووەو بووە بە مەلا، بەڵام ئەگەر مەلایەتی کردبێ یا نەیکردبێ هەندێ لە مەلاکانی دیکە جیاواز بووە، چونکە لە دیوانەکەیدا هەست بەوەدەکرێ لە گەڵ ئەوەی سیفەتی مەلایی تێیدا ئاشکرا بووە بەڵام وەکو خوێندەوارێکی دەرەوەی حوجرەش کەوتووەتە روو، وەکو ئەوەی میرزا یا قەڵەمبێن یا بەسەوادی پێ بڵێین، واتە زانستی‌و زانیارییەکانی تەنیا رەنگدانەوەی زانستییەکانی پرۆگرامی حوجرەی مزگەوت نین.

بێگومان وەك لە ناوی باب‌و باپیرانی دەردەکەوێ دەبێ لە چینی دەوڵەمەندی سەرەوە بووبێ، ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی لەلایەك بتوانێ بە ئاسانی خوێندن تەواو بکا لە هەر کوێیەك بێ، لە لایەکی ترەوە توانیویەتی لە نێوەندی خوێندەواری دیوەخانی دەولەمەندان نزیك بێ ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی شارەزاییەکی تەواو لە مێژووی رۆشنبیری کوردی کۆن‌و سەردەمی خۆی پەیدا بکا.

لەو کاتەی حاجی قادر پێگەیشتووەو بووە بە شاعیر

شاعیر لە دەردو نەخۆشییەکانی دەدوێ، دەرمان بۆ تیماری برینەکان و گەربوونی دەدۆزێتەوە. ئەوە دەزانێ ئەم ئێسترە بەم وەزعەی بەکەڵک نایە، لەبەر ئەوە باشتر ئەوەیە دیارییەکە بۆ خاوەنی بنێرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ بیر لەوە بکرێتەوە ئێسترێکی باشی پێشکێش کرابێ، بەڵام ئەو بۆ گاڵتەوگەپ ئەم شیعرەی دانابێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا وەسفی ماینەکەی کوێخا عەلی دەکا:

کێ دەزانێ کووچەڵەی سمتی شکاوە یا ملی
وا لە حالی حەلوەلادا ماینەکەی کـوێخا عەلی
چووم بزانم ماوە یاخۆ مردووە وەختێ کە دیم
شادەماری سستە نابزوێ ڕەگی قاچ و قولی
دام بەسەر خۆمدا گوتم وا حەسرەتا بۆ ماینەکوێت
دەك بەمیراتم کەوێ دەسبەندو هەوسارو جلی
نەبزو قاروورەی ئەگەر سەد جار تەماشا کە حەکیم
دەردی نازانێ چییە تاکو نەکا بێنی سلی
گەر ئیمامی عەسکەری نوێژی لەسەر کا لایقە
چونکە موشتاقە بەوەسڵی ناڵەکانی چوارپەلی
کەسری ئەنفی دوژمنان و جەبری کەسری دۆستان
هەر بمێنێ چاکە بەخوا شێخ ڕەزاو کێری زلی

بۆ ئەوەی ئەدگاری ئێسترەکەی میر دووبارە نەبێتەوە. شێخ ڕەزا بەجۆرێکی دیکە ماینەکەی وەستا عەلی وەسف دەکا. کەس نازانێ سمتی یا ملی شکاوە، گرنگ ئەوەیە قاچ و قولی لە بزووتنەوە کەوتووە، کۆمیدییانە بۆ مەسەلەکە دەچێ، وا دەردەخا حاڵ پەرێشانە لەبەر ئەم ماینە، کەچی هەر لەوکاتدا حەز بەمردنی دەکا بۆ ئەوەی زین و هەوسارو پێوەندی ماینەکە بە میرات بۆی بمێنێتەوە، بۆ پێکەنین ئیمام تابووریش دەستنیشان دەکا بۆ ئەوەی ئەگەر مرد نوێژی لەسەر بکا، دیارە ئەویش بە میرات ناڵەکانی پێی بەردەکەوێ شاعیر هەوڵیداوە کۆتایی شیعرەکەشی بەرەمزێکی کۆمیدی بێ، دەڵێ یاخودا شێخ ڕەزا هەر بمێنێ بۆ ئەو قسە خۆشانەی.

شێخ ڕەزا داوا لە سەید بەرزنجی نەقیبی سلێمانی دەکا کەڵەشێرێکی بۆ بنێرێ لەوانەی شەڕرانین و بۆ شەڕە کەڵەشێر دەست دەدەن. کەڵەشێر گەیشتووەتە لای شاعیر یا نەگەیشتووە، ئەمەیان نەزانراوە، بەڵام شێخ ڕەزا بەم جۆرە وەسفی ئەو کەڵەشێر دەکا کە پێویستە بۆی بنێرێ:

کەڵەشێرێ بەرەزا لازمە کرماشانی
زیرەك و چابوك و دەم گەرم و درو شەڕانی
کەڵەشێرێ کە قەپی گرت لە بناگوێی کەڵەشێر
پڕ بەدەم بێ پچڕێ وەك سەگی هەورامانی
کەڵەشێرێ کە ئەگەر شێری نەری بێتە مەساف
رایرفێنێ بەشەقێ میسلی کەری تاڵانی
بۆ حەواڵەی دوبری ئەو کەسە خۆم ئەیزانم
دوو گونی پێوە هەبێ وەك دوو جەڕڕەی لەیلانی
بەدرێژی وەکو مەولان بەگەکەی میری بەیات
بەجەسامەت وەکو کوێخا زلەکەی بیبانی
جنسی خۆی جووتە مریشکێ بەری حەملەی بگرێ

نەوەکو سوێی بێتەوە بێچارە لەبەر بێ گانی
ئەی نەقیب زادە بنێرە کەڵەشێکی وەها
بۆ (ڕەزا)کەی سەگەکەی قاپییەکەی گەیلانی

شێخ بەپێچەوانەی ئێسترو ماینەکەی پێشوو وەسفی کەڵەشێرێك دەکا ئەوەندە بەهێز بێ بتوانێ بۆ شێرێك بچێتە مەیدان. ئەمە وەکو ئێسترەکە نییە، ئەویان بۆی نێررا بوو، ئەمەیان داوای دەکا، هاتووە یا نەهاتووە کەس نایزانێ. شاعیر داوا لە نەقیب زادە دەکا کەڵەشێرێکی وای بۆ بنێرێکە لە شیعرەکەدا وەسفی کراوە.

لە تاکێکیدا شێخ ڕەزا دەڵێ:

قامەتی بێ شك نەمامی عەرعەرە یا سەوسەنە
دەك فیدای نازو گریشمەت بم پەریزادەی سنە

شاعیر ئەم شیعرەی لە وەسفی بەژن و باڵای عادیلە خانمی عوسمانی پاشای جاف داناوە. لە کۆمەڵی کوردەواریدا ئەم جۆرە وەسفە کارێکی شەرم بووە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە خانم و عوسمان پاشای مێردیشی بەستایشیان داناوەو سوپاسی شێخ ڕەزایان کردووە. ئەگەر هەموو کەسێك بەم جۆرە تەماشای ئەو شیعرە بکا مانای ئەوەیە کۆمەڵی ئێمە پێشکەوتووە.

شێخ ڕەزا کۆمەڵێك چوارین و تاکی هەیە لە وەسفی هینەکەی ژن، زیاتری وەسفێکی مەتریالی و فۆتۆگرافییە بۆ ئەو ئەندامەی سەرچاوەی دڵداریی زەمینییە لەگەڵ هینەکەی پیاو خۆشی دەگەیەننە مرۆڤو نەژادی ئادەمیزاد بەزاوزێ دەپارێزن.

لە چوارینێکدا شێخ ڕەزا دەڵێ:

قوزی گازێ ئەگەزێ کێر وەکو گاز
بەری عەرەسەی پانە وەك دەشتی حیجاز
قیتکەیەکی هەیە وەك گردی دەماوەندی ئەعلا
پڕ لە هێلانەی کەوو قشقرەوەو کۆترو باز

لە وێنەکێشانی ئەو ئەندامە شێخ ڕەزا موبالغەی کردووە، لە شیعردا جێی خۆیەتی، بۆیە ئەگەر وێنەی ئەم ئەندامە بەزەرەبین گەورە بکەین دەبێ بەناوچەیەکی دەشت و شاخاوی بۆ ئەوە دەست دەدا باڵندەی هەمە جۆرهێلانەی لێ دروست بکەن. هەچی خاوەنی ئەندامەکەشە ناوی گازی ناوێك هاتووە، لە چاپی دیکەی دیوانی شێخ ڕەزا ناوی ژنەکە بوو بە (لەعلی) قسەی وا لە ناوەوە هەیە وەسفەکە بۆ هینەکەی فەیرووزی (پیرۆزی) خێزانی موفتی زەهاوی واتە دایکی جەمیل سدقی زەهاوییە.

لە چوارینێکی دیکەیدا دەڵێ:

هەر وەکو ئەشکم بەرەنگی سووری خۆی خوێنینە کوز
داستانی شاهنامەی خوسرەوەو شیرینە کوز
ئینشیقاقی هەر وەکو کاڵەك لەبەر شیرینییە
هەر کەسێ ئەی چێشتبێ نازانێ چەند شیرینە کوز

شێخ ڕەزا ئەم ئەندامە لە ڕەنگدا بەفرمێسکی سووری خۆی

دەچوێنێ، بەناوەرۆك داستانی خوسرەوەو شیرین لەبەر ئەو هۆنراوەتەوە، ئینجا قەڵشانی لەبەر شیرینییە وەکو کاڵەك.

لە چوارینێکی دیکەیدا شاعیر دەڵێ:
چوومە خزمەت یاری مومتازم، وتی لاچۆ دزی
پێم نیشان دا ئەسڵی مەقسەد، نایە بەدەسم کوزی
چەندە هاوارم لە کێرم کرد نەکەی فیلە نەکەی
گوێی نەدامێ، خۆی هەوادا کەوتە ناو قەعری کوزی
لەم چوارینەدا شێخ ڕەزا داوا لە یاری مومتازی دەکا ئەوەی دەیەوێ بیداتێ ژنەکە بەقسەی دەکا، بەڵام شاعیر بۆچ خۆی لە هینەکەی جیا دەکاتەوەو هاواری لێ هەڵدەستیو دەڵێ، نەکەی! کەچی بەزۆر خۆی هەڵدەکوتیو دەچێتە ناویەوە.

لە تاکێکیدا شاعیر دەڵێ:
موددەتێکە نێربازیو ئێستا مەیلی مێ دەکەم
ئارەزووی گانی کچێکی کوز پڕی دەرپێ دەکەم
دەبێ لێرەدا شاعیر مەبەسی دەرپێی مۆدەی ژنە ئەوروپاییيان بێ کە بەلەشیانەوە دەنووسێ، ئەگینا ئەگەر دەرپێی میللی کۆنی شەرواڵ ئامێزی ژنانی ئێمە بێ، ئەو ئەندامە شێوەی چۆن دەبێ!

لە تاکێکی دیکەیدا شاعیر دەڵێ:
سلێمانی هەتانە ناوی نابەم وەك کونی بێچوو
وەکو داینێن لەسەر بەرقی شەقاییق جێ سمی ئاهوو
لەم شیعرەدا وێنەیەکی جوان دروست دەکا کە ئەندامی کیژانی سلێمانی بەنەخشی یا شوێنی جێی سمی مامز دەچوێنێ لەسەر بەرگی گوڵاڵە.

لە سلێمانییەوە شێخ ڕەزا دەچێ بۆ ئەستەمبوڵ بۆ لای کچو ژنە جوانەکانی ئەو شارە، لە بارەی هینەکەیانەوە دەڵێ:
بۆ نیشانەی قوز بچووکی دەم ئەگەر نیشانە بێ
سا ئەبێ قوزیان ژنی ئێرە کونی زەنگیانە بێ
چاووی مەهمووزم کزە و لە سررە ناگاو عاجزە
بێتو گەر وا بێ نەسیبی ئەم خرەی سەرپانە بێ
شاعیر ئەو لەیەکچوونەی دوو ئەندامی ژنانی لە قسەی ئەستەقو پەندی پێشینان وەرگرتووە، ئاوردانە هونەرییەکەی لەوەدایە چاوی کزەو شت بەچاکی نابینێو ناتوانێ لێکیان بکاتەوە، لەو حاڵەتەدا دەڵێ ئەگەر وا بێ با نەسیبی هینەکەی خۆی بێ.

*** ستایش:**

لە دیوانی شێخ ڕەزادا ستایش بەرچاو دەکەوەێ، برێکیان لەگەڵ وەسفو شانازی (فەخر) تێکەڵ بەیەکتری دەبن. کەم کەس هەیە شاعیر تەنیا ستایشی کردبێ، بەشێکی زۆر لەوانەی لە سەردەمێکدا ستایشی کردوون، لە ڕۆژگارێکی دیکەدا دایشۆرییوون.

لە شیعرێکیدا ستایشی کاك ئەحمەدی شێخ دەکا:
مەربووتە حەیاتم بە سلێمانیو خاکی
خۆزگەم بە سەگی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی
ئەو مەرقەدی والایە کە وەك عەرشی مەعەللا
مەحفووفە بەزوواری مەلەك دەوری شوباکی
بۆ دەستو عەسا نازکەکەی داغە دەروونم
قوربانی عەسای دەستی دەبم سۆلو سیواکی
دنیا لە دوای حەزرەتی شێخ زێرو زەبەر بێ
وەك تاجی کەی وجامی جەمو بەختی زوحاکی
دەرحەق بەحەفیدانی ئەدەب لازمە زینهار
قوربانی حەفیدانی دەبم بابیو داکی
بەم حاڵە پەرێشانەوە باز ئەشهەدو بیللا
شیعرت تەرەب ئەنگێزە (ڕەزا) شاعیری چاکی
کاك ئەحمەدی شێخ مەقامێکی تایبەتی بووە لە لای شێخ ڕەزا وەکو شێخێکی گەورەی تەریقەتی قادری کە باوکی ئەو زاتە شێخ مارفی نۆدێ ئەو تەریقەتەی لە ناوچەی سلێمانی بڵاوکردەوە، بۆ شێخ ڕەزا پلەی ڕێز لێ گرتنی لە دوای دامەزرێنەری تەریقەتەکە شێخ عەبدولقادری گەیلانییەوەیە.
هەندێ جار وەکو لە شیعریدا دەردەکەوێ شاعیر خۆی دەکا بەسەگی قاپییەکەی شێخ عەبدولقادرو کاك ئەحمەدی شێخ.
ئەگەر هەندێ جار گێروگرفتی عەشایەری بنەماڵەیی لەنێوان تاڵەبانییانو بەرزنجییان لەسەر زەویوزار بووبێ، کاری نەکردووەتە سەر ئەو خۆشەویستییە گیانییەی تەریقەتی قادری کە شێخ ڕەزاو بنەماڵەی بەرزنجییانی کۆ کردووەتەوە.

شێخ ڕەزا ئاورێکی زۆری لە میرەکانی بابانو خەڵکی ئەو کۆمەڵە کوردەوارییە داوەتەوە، لە شیعرێکیدا دەڵێ:
لەبیرم دێ سلێمانی کە دارولمولکی بابان بوو
نەمەحکوومی عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو
لەبەرقاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخو مەلا و زاهید
مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو
لەبەر تابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا
سەدای مۆسیقاو نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو
درێغ بوو ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەسرە، ئەو ڕۆژە
کە مەیدانی جریدبازی لە دەوری کانی ئاسکان بوو
بەزەربی حەملەیێ بەغدایی تەسخیر کردو تێی هەڵدا
سلێمانی زەمان راستت ئەوێ باوکی سلێمان بوو
عەرەب ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم ئەفزەڵن ئەمما
سەڵاحەددین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو
عومومی شەهریارانو سەلاتینو ڕمنگستان
لە ڕوعبو سەتوەتی ئەو شێرەدا گشتی هەراسان بوو
قوبووری پڕ لە نووری ئالی بابان، پڕ لە ڕەحمەت بێ
کە بارانی کەفی ئیحسانیان وەك هەوری نیسان بوو
کە عەبدوڵلاپاشا لەشکری والی سنەی شڕ کرد
(ڕەزا) ئەو وەختە عومری پێنجو شەش تیفلی دەبستان بوو
لەم شیعرەدا شێخ ڕەزا باس لە چەند لایەنێکی ژیانی میرنیشینی بابان دەکا لە سلێمانی، ئەو دیاردانەی شاعیر باسیان لێوە دەکا ئەوە دەگەیەنن فەرمانڕەوایی بابان شێوەی

دەوڵەتی بووە، ئەو دەوڵەتە مێژووی کۆنی بووە پێش بینای سلێمانی. پەنجە بۆ سەلاحەدین درێژ دەکاو بەکوردی بابان حسێبی دەکا. لێرەدا مەبەس لە بابان هەموو کوردە چونکە سەلاحەدین لە مێژوودا وەك سوڵتانێکی گەورە ڕەمزی دەسەلاتی کورد بووە، ئیتر بۆ گەورەکردنی بنەماڵەی بابان شاعیر سەلاحەدینی کردووە بەیەکێك لە بابانەکان. شێخ ڕەزا ئاخ هەڵدەکێشێ بۆ ئەو ڕۆژەی مەیدانی جریدبازیو مەشقی سوپایی لە دەوری گەرەکی کانی ئاسکان بوو.

لە شیعرێکی دیکەیدا لە ستایشی بابانەکان شاعیر دەڵێ:

سائیل بەغینا نائیل ئەکا بەخششی کەمتان
ئالی بەبە یاخوا نەرزێ دەستی کەرەمتان
هەرچەندە بەمەسەڵ خەنجەری ئەڵماسە زمانم
نابڕێ قەد سەری موویێ لە ئەدای شوکری نیعەمتان
گیرفانی گەدای کردووەتە کانی جەواهیر
ئیکسیری نیساری زەرە شاباشی درەمتان
ئێوەن بەحەقیقەت مەلیکی میللەتی کوردان
شایانە زیارەت بکرێ خاکی قەدەمتان
ئینکاری حوقووقیان لەسەر ئەو میللەتە ناکرێ
ئابای فەرەیدوون فەرو جەمشیدی حەشەمتان

لەم شیعرەدا شێخ ڕەزا زیاتر لە شیعرەکەی پێشوو مەقامی دەسەلاتی بابان بەرز دەکاتەوە. ئەم جارە بەراستی بەمەلیکی کوردانیان دەزانێو میللەت بەقەرزار دادەنێ بەرامبەر ئەو خزمەتەی بۆ میللەتیان کردووە.

لە شیعرێکی دیکەیدا شاعیر ڕووداوێکی دروستکردووەو کردوویەتی بەگێرانەوەیەك لە قەسیدەیەکی (٣١) دێرە شیعریدا. لە چیرۆکەکەدا ئەوە دەڵێ گۆیا لە ئەستەمبوڵ تووشی کوڕێکی بولغار بووە، حەزی لێ کردووەو شەو لەگەڵی ڕابواردووە. بۆ بەیانی هەتیوەکە چەندوچوونی لە گەڵ شاعیردا بووە لەسەر کرێی ئەو شەوەی لەگەڵی بووە خەڵکی گەرەك هەموویان بەمەسەلەکە دەزانن، شاعیر چاری نامێنێ ئەوە نەبێ هانا بەرێتە بەر ئەحمەد پاشای بابان بەڵکو لەم تەنگوچەڵەمەیە ڕزگاری بەکا.

شیعرەکە لە ڕووی هونەرییەوە بەرزە، ڕووداوەکە بووبێ یا نەبووبێ لە ئەدەبدا مەسەلەیەکی گرنگ نییە، بەخەیاڵیش بێ شاعیر توانیویەتی بەرهەمێکی جوانی ئەدەبی لێ دروست بکا. قەسیدەکە بەزمانی کوردی نووسراوە، تەنیا ئەوە هەیە لە دیالۆجی شیعرەکەدا کە شاعیر لەگەڵ کوڕەکە قسە دەکا زمانی دیالۆجەکە دەبێ بەتورکی، واتە قەسیدەکوردییەکە بەرستەو تەعبیری تورکی ئاواخن کراوە. جگە لەوە هەندێ دێری بەزمانی فارسیش وتووە، بەم ڕەنگە قەسیدەکە دەبێ بەجۆرە مولەممەعێك.

قەسیدەکە بەم دێرانە دەست پێدەکا:

ڕۆژی یەکشەممە کە مەشهوورە بە ڕۆژی بازار
من بەغار کەوتمە دومبالی کوڕێکی بولغار
کوڕ چ کوڕ لێوی وەکو لالەیی حەمرا ڕەنگین
کوڕ چ کوڕ چاوی وەکو نێرگسی شەهلا بێدار

لێرەدا تەنیا دێرەکانی دوایی شیعرەکە بڵاودەکرێتەوە کە پێوەندی بەستایشی ئەحمەد پاشای بابانەوە هەیە:

ئەمە دوو ڕۆژە کە حەیرانو پەرێشان دەگەرێم
کێم هەیە غەیری وەلی نیعمەتی فەرخوندە شیعار
یەعنی هەمنامی نەبی حەزرەتی ئەحمەد پاشا
فەخری دین، کانی حەیا، بەحری کەرەم کۆهی ویقار
مەدحی ئیحسانی بکەم، عەدلی بکەم، فەزلی بکەم
بەخودا خاریجە ئەوسافی حەمیدەی لە شومار
کەفی زەربەخشی کەوا مەنبەعی دوڕو گوهەرە
میسلی بەحرێ کە نە ساحیلی هەبێت نە کەنار
تەبعی جەوادو کەریم هەر وەکو قائانی دەڵێ
(زر بە قنطار همی بخشد واشتر بە قطار)
تا وەکو دەورە بکاتو بگەرێ چەرخی فەلەك
تا فەلەك دێتو دەچێ، بێتو بچێ لەیلو نەهار
بەموڕادی بگەرێ شەمسو قەمەر چەرخو فەلەك
زەفەرو فەتحی قەرین، بەختی موعین، تالعی یار
ڕەئیی تۆ باعیسی تەنزیمی ئومووراتە بەلێ
بۆ کوڕەی عالەمی ئیمکان بووەتە قوتبی مەدار

لەو شیعرانەدا شێخ ڕەزا بەگیانێکی پڕ لە سۆزەوە ستایشی ئەحمەد پاشا دەکا، جا ئەمە ئەگەر بەراستی بێ یا بەراستی نەبێ، تا ئەگەر بەمەراییش بژمێرێ بۆ ئەحمەد پاشا، شیعرەکە خۆی لە خۆیدا بەرهەمێکی بەرزە لە ڕووی هونەرییەوەو ئەدگاری جوانکاری لێ دەتکێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا شێخ ڕەزا ستایشی ئەسعەد ئاغای حەوێزی دەکاو دەڵێ:

تۆ کەم نەزەری دەرحەقی من ئێستەکە ئاغا
من ماوە هەوای سوحبەتی تۆم هەر لە دەماغا
تا ڕۆژی قیامەت بەخودا زیندووە نامرێ
بابێ کە بمێنێ کوڕی وەك تۆی لە وەجاغا
بۆ تووتنەکەیی بێشەمەیی (شاروو)و (شێتنە)
شێت بووم نەهات وەختە دڵم دەرچێ لە داغا
جاران چ بەجاغو چ بەبار بۆ دەهەناردم
ناێری ئەمێستا نە بەبارو نە بەجاغا
ڕێی ئەوتەکە باجگیری ئەگەر زۆرە دەفەرمووی
ڕێی خاسە بەشەو خاڵییە بابێ بەبلاغا
ئەمزانی فەلەك گۆبەنی هەر بۆ منە یاخۆ
سەد دەستی وەکو دەستی منی کردووە بەزاغا
یارەب گوزەران کا بەسەفا وەختی عەزیزت
پەیوەستە لە دەوری چەمەنو گەردشی باغا
بۆ چوونە تەواف حەرەمی شاهیدی مەقسوود
عالەم هەموو مەئزوونە (ڕەزا) هەر لە یەساغا

لە شیعرەکەدا ئەوە دەردەکەوێ ئەسعەد ئاغا هەموو ساڵی تووتنی بۆنداری بێشەمەی بەناوبانگی ناوچەی شاوورو شێتنەی بەدیاری بۆ شاعیر ناردووە، ڕەنگە ساڵێکیان دیارییەکە دوا کەوتبێ، ئیتر شێخ ڕەزا ئەم ستایشەی بۆ نووسیوە. پێویستە ئەوەش بزانرێ لەو سەردەمەدا نەدەبوو تووتن لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی دیکە بروا بەبێ ئاگاداری میری. لەم لایەنەوە هەندێ جار تووتن بەقاچاغ لە جێگەیەك بۆ جێگەیەك دەگوێزرایەوە. شێخ ڕەزا خۆشی لەم شیعرەدا

ئاماژە بەمە دەکاو دەڵێ ئەگەر لە ڕێی نەوتەکەی شاری کەرکووك باجگیر هەبێ. با تووتنەکە بەرێی بەستی خاسە لە گەرەکی بلاغەوە بنێرێ بۆ کۆیە، بەشەو ئەو ڕێگەیە چۆڵە.

لە شیعرێکی لە ستایشی سمایلی مەلا خالیددا دەڵێ:

هاتەوە ئاشووبی دەوران مەردی مەیدان هاتەوە
شێری یەزدان لەندەهووری ئینی سەعدان هاتەوە
بۆ قرانی لەشکری ئەعدا لە ناکاو میسلی بەرق
ئاسەفی ساحێبقران لەعلی بەدەخشان هاتەوە
هەوری میحنەت، بارەشی غەم، سەیلی ماتەم بوو تەمام
بەرقی تابان، میهری ڕەخشان ڕەعدی غوڕران هاتەوە
پاڵەوانی پایی تەختی سەفدەری شێرزاد خان
تاج بەخشی کیشوەری مەغریب ئەلب خان هاتەوە
سەعدی سەفدەر، مالیکی ئەژدەر، هوزەبری پڕ هونەر
بیژەن و کیو، تووس و نەوزەر، پووری دەستان هاتەوە
حەمدو لیللا باز لە بۆ قەتلی سەری تووڕانیان
ڕۆستەمی مازەندەران، سامی نەریمان هاتەوە
ژێر دەستی ئەسعەد ئاغا بووین وەکو مووری زەغیف
بۆ خەلاسلیمان سمایل وەك سلێمان هاتەوە
دۆستان لەب تەشنەبوون ناگاه لە فەیزی لوتفی حەق
جۆیی نیل، دەریایی قولزوم، بەحری عوممان هاتەوە
پێی ئەکا ئەتك و سیاسەت هەر کەسێ خۆی حەز بکا
قاتیلی ڕووحی حەمەو جەللادی وەسمان هاتەوە
(لامیع)ی شاعیر بەهەر مەجلیس بچێ خەڵکی دەڵێن
بولبولی دەستان سەرا، مورغی غەزەلخوان هاتەوە

شێخ ڕەزا وێنەی سمایلی مەلا خالید وەکو پاڵەوانێکی بەتوانا دەخاتە ڕوو، بەراووردی دەکا لە گەڵ هەندێ لە قارەمان و پاڵەوانانی داستانەکانی ئەفسانەی میللی ڕۆژهەڵات.

لە ستایشی فەیزی ئەفەندی زەهاوی مفتی بەغدا لە چوارینێکی دا شێخ ڕەزا دەڵێ:

ئەی مادەری گێتی تۆ هەتا ئێستە نەزاوی
زاتێکی وەکو فەیزی ئەفەندیی زەهاوی
مومکین نییە ئیدراکی حەقائیق بەتەواوی
مومکین نییە ئیدارکی نەکا زیهنی زەهاوی

ئەم شیعرە یەکێکە لە لوتکەکانی ستایش لە ئەدەبی کوردیدا، شێخ ڕەزا کە ئەمەی بۆ زەهاوی وتووە لەسەر کێش و قافییەی ئەم شیعرە شیعرێکی دیکەی هۆنیوەتەوە بەڵام زەهاوی داشۆریوە، ئەویش بووە بەلوتکەی هونەری داشۆرین. لە جێیێکی دیکەی ئەم کتێبە باس لەو داشۆرینەش دەکرێ.

شێخ ڕەزا بۆ وەسف و ستایشی بەغدا لە پارچە شیعرێکیدا دەڵێ:

گەر بڵێم بەغدا لە جەننەت خۆشترە هێشتا کەمە
چونکە سوکنای غەوس و کەرخی و ئیمامی ئەعزەمە
ئەی برادەر شاری بەغدا، بێ حەسادەت بێ هەمە
زۆر ئەمین بە لەم حیسابە پێت بڵێم کورتەو کەمە
لەم وڵاتە هیچ وڵاتی هەر وەکو بەغدا نییە
حاکمی عەدل و عەدالەت زۆر ئەمین و بێ غەمە

لە بنجدا شێخ ڕەزا ئەم پارچە شیعرەی بۆ ستایشی شاری بەغدا دانەناوە، مەبەستی بنچینەیی ستایشی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و ئینجا شێخ مەعرووفی کەرخی و ئیمامی ئەبوحەنیفەیە. ئەمانە هەموویان لە کاتی خۆیدا لە بەغدا ژیاون و ئارامگایان لەوێیە، لەبەر ئەوە بەلای شێخ ڕەزاوە بەغدا شارێکی پیرۆزە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار کە تووڕە بووە، بەغداشی نەپاراستووە و جنێوی پێ داوە، بەڵام بەبێ ناوهێنانی ئەم زاتە پیرۆزانە!

*** لاواندنەوەو ماتەمنامە:**

شێخ ڕەزا لەم مەبەسەی شیعری کلاسیکی کوردی بەرهەمی زۆر نییە، ئەوەی هەیەتی لە ڕووی هونەرییەوە لە پلەی شیعرەکانی دیکەیەتی. لە ماتەمنامەیێك بۆ دۆستی خۆشەویستی قادری وەستا خدر دەنووسێ، لەو شیعرەدا دەڵێ:

بۆ نەسووتێ جیگەرو بۆچی نەبێ دڵ بەکەباب
بۆچی نەڕوا لە تەنم ڕووحی ڕەوان میسلی شەهاب
بۆ لە سەرچاوەیی چاو هەڵنەقوڵێ ڕەشمەیی خوێن
بۆ لە فەووارەیی موژگان نەچکێ قەترەیی ئاب
بۆ لەبەر ناڵەی نەبێ حەلقەیی حەلقم بەسروود
بۆچ لەبەر گرییە نەبێ چەشمەیی چەشمم بەسەراب
موئنیس ڕۆژو شەوم باعیسی ئارامی دڵم
ڕۆیی و منێ لە غەمی کەوتمە نێو بەحری عەزاب
بەوقووعی سەفەری قادری وەستا خدرم
خانەیی عەیشمی تاڵ کرد فەلەکی خانە خەراب
چەنگ و نەی لێ مەدە موتریب کە لەبەر فیرقەتی ئەو
ڕەنەکی ڕووحە لە گوێم نەغمەو ئاوازی ڕەباب
ساغەری مەی مەدە ساقی! کە لەبەر دووریی ئەو
تاڵە وەك ژەهری هەلاهیل لە مەزاقم مەیی ناب
کاری کردن نەبوو ئەم کارە کە گەردوونی دەنی
کردی، ڕووی ڕەش بێ وەکو بەختی من و پەڕی غوراب
ئەی (ڕەزا) ڕەنگە لەبەر فیرقەتی ئەو موئنیسە تۆ
قەت نەبێ خاڵی وەکو کوورە لە سۆزی تەب و تاب

لەم شیعرەدا پیاو هەست بەسۆزێکی بەکوڵ و بۆشاییەکی گەورە دەکا لە دڵ و دەروون و ویژدانی شێخ ڕەزا. ئەم شاعیرە ئەو برادەرەی ئەوەندە خۆشویستووە گەیشتووەتە پلەی ئەو ڕق و کینە بێ سنوورەی بۆ ئەو کەسانەی هەڵیرشتووە کە خۆشی نەویستوون. لێرە لە ڕق و کین گەیشتووەتە لوتکەو لەوێ لە سۆزو خۆشەویستی گەیشتووەتە پۆپە.

*** داشۆرین و کراوە (ئیرۆتیك):**

ڕاستە شیعری داشۆرین و کراوە، دوو مەبەسی جیاوازن لە ئەدەبی کوردیدا، بەڵام لای شێخ ڕەزا لە هەندێ بەرهەمیدا دەتوانرێ ئەم دوو مەبەستە شیعرییە لە یەکتری جیا بکرێنەوە، بەڵام بەزۆری لای ئەو تێکەڵ بەیەکتری کراون، هەر یەکێکیانی بۆ بەهێزکردنی ئەوی دیکە بەکارهێناوە.

لە شیعرێکی داشۆرین و کراوە ئامێز بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ

مامە غەفووری دەگێڕێتەوە لەو سەردەمەی لە کۆیە لە لای بوو، لە شیعرەکەدا دەڵێ:

لەو ڕۆژ کە تۆرام و لە کەرکووك سەفەرم کرد
مانەندی عەقاریب لە ئەقاریب حەزەرم کرد
گەردوون سنگی کردم و هێنامییە کۆیە
میوانی لە کن مامە غەفووری لە جەرم کرد
ویستم کە بڕۆم بۆ سەفەری ڕۆم بە سیاحەت
ئەیهێشت و دوو سەد ئەهلی عەمامەی لەسەرم کرد
دانیشێ، ئەچێ من کچی خۆم مارە دەکەم لێی
ئەو تالیبی دونیایە ئەوا موعتەبەرم کرد
چورسا لەبەرم جوببەو فیسا لەسەرم فێس
نەنێ فێسی لەسەر نام و نە جوببەی لەبەرم کرد
شەش مانگێ بەئەفسانە گلی دامەوە لای خۆی
نەمزانی ملم بشکێ تیا چووم، زەرەرم کرد
وەڵڵاهی دەکەم دەرحەقی ئەو بەڵکو زیاتر
ئەو کارەکە دەرباری ڕەشیدی پسەرم کرد
کارم تەر ئەبێ ئەموت ئەگەر لوتفی ببێ مام
ئەی لاییقی ڕیشی بەخودا کاری تەرم کرد
بۆ موجتەهیدان گەرچی مورەخخەس نییە تەقلید
من موجتەهیدم، هاتم و تەقلیدی کەرم کرد
ئەی گووی خلە بەو لوتفە کە ئەو کردی لە گەڵ من
لەم مەرحەمەت و لوتفە ئەوا من گوزەرم کرد
سەد دەفعە گوتم وەختێ کە دیم نەخوەتی قەلبی
یارەب کە لە گەڵ شێخ عەلی بۆچی شەرم کرد
هەر دەچمەوە لای گەرچی بڵێ هاتەوە دیسان
ئەو خوێرییە بێ کارە کە من لێرە دەرم کرد
هەرچەندە (ڕەزا) باعیسی بەدنامییە عەودەت
لەم سووکی و بەدنامییە سەرق نەزەرم کرد

شێخ ڕەزا بەووردی لەم شیعرەدا بەسەرهاتی لەگەڵ مامە غەفووری دەگێڕێتەوە. ئەوە دەردەخا چۆن هەڵیخەڵەتاندووە و بەڵێنی داوەتێ دەستی بگرێ و کچی خۆشی لێ مارە بکا، بەڵام هیچی بۆ نەکردووە.

ڕەنگە مامە غەفووریش هەق بداتە خۆی بەوەی شێخ ڕەزا بزێو لە هیچ جێیەك ئۆقرەی نەگرتووە و جنێوفرۆش بووە، گەلێ کەسی لە بنەماڵەی خۆی و لە بێگانە تۆراندووە.

شەرە شیعر لەنێوان شێخ ڕەزا و شوکری فەزلی لاپەرەیەکی زۆری لە ئەدەبی کوردیدا داگیر کردووە. هەردوو شاعیر لە شیعری داشۆرین و کراوەدا ئاوزەی یەکتری بوون، بۆیە شیعریان جێگەیەکی دیاری هەیە لەناودڵ و دەروونی خەڵکی. ئەو شیعرانە هەندێکیان چێژی جوانکارییان هەیە و خەیاڵی خوێنەر دەبزوێنن، بەشێکی دیکەیان دەبنە مایەی پێکەنین و دڵخۆشی و گوشادی.

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

پووره شوکری بەسییە با نەتگێم و سمتت لەق نەکەم
دایکە کێرخۆرت هەوالەی سووری سەر ئەبڵەق نەکەم
نییەتم بوو دەفعەیێ خۆمت پیا دەم باز وتم
نەقسە بۆ ئەمسالی من با گوێ لە هەر ئەحمەق نەکەم
من کە شەهبازی شکارەندازی شاهیم پێ دەڵێن
حەیفە با ئاهەنگی جەنگی سەرگەرو لەقلەق نەکەم
تۆ بەجارێ وەك ژنی فاحیشە پێت لێ هەڵبڕی
نەء، وتم خەیری نییە، چاوێکی گەر لێ زەق نەکەم
حیزە سا خۆت بگرە تا بۆت بێمە مەیدانی مەساف
شەرتە هیچت پێ نەڵێم تا بن گونت نەستەق نەکەم.
کۆنە حیزی شاری بەغدا لێم حەرام بێ شاعیری
گەر کوزی خوشکت وەکو ئەیوانی کیسرا شەق نەکەم
هەر وەکو مەستیم بەفەردێ گا خوا ڕووحم بەرێ
مولحیدی کافر مەزەب گەر تۆش بەئەو مولحەق نەکەم
من دەزانم کێ لە خشتەی بردوویی ئەمما چ سوود
سەییدە، سەیید قسەی سووکی دەبێ دەرحەق نەکەم
پێی بڵێ با مونتەبیە بێ، تۆش گەن و گوو بەس بخۆ
با سلێمانی بەجارێ کافری موتڵەق نەکەم
عەهدە کردوومە لە خزمەت (شێخ ڕەزا)دا وچەکوێر
نەیخەمە ناو لنگی دایکت، تا لە تۆی ئێرەق نەکەم

جنێوەکانی شێخ ڕەزا لەم شیعرەدا ئەگەر لە ڕستەری جوانکاری دەریان بهێنین دەبنە قسەیێکی هەرزانی بازاری جنێوفرۆشەکان بەکاری دێنن، بەڵام شێخ ڕەزا وەستایانە توانیویەتی ئەو جنێوانە لە قاڵبی چێژی جوانکاریدا بڕێژێ.

لە شیعرێکی دیکەی لەم بابەتەیەوە دیسانەوە شاعیر بۆ داشۆرینی شوکری فەزلی نووسیویەتی دەڵێ:

شوکری لە داخت ئەمە ساڵێکە وە یا دووە
کێرم نەخۆشە، حاڵ پەرێشانە، کەوتووە
جارێ بپرسە موخلیسەکەت چۆنە، چۆن نییە!
مەحسوویە کۆنەکەت، عەجەبا ماوە، مردووە!
کوشتەی فیراقی تۆیە، عیلاجی ئەگەر نەکەی
ئۆباڵی ئەو ملەت کە دەڵێی نێرکە کاردووە
عەمدەن ئەڵێم نەخۆشە، موراعاتی تۆ دەکەم
وەرنە دەمێکە ڕووحی بە جەننەت سپاردووە
گەر من درۆ ئەکەم ئەو دایکت بپرسە لێی
یایە بەدەستی خۆی کفن و دەفنی کردووە
شانەو خەنەو حەممامی حەرام کردووە لە خۆی
پاش ڕەحمەتی، حەرامە لە من، سوێندی خواردووە
ئێستەش کراسی چڵکنە، ناولنگی کوڵکنە
وەك دێوەڵووکە تووکی بەری بستێ هاتووە
یایە ئەگەر سەرگرمە بەژێر کورەکەیا بچێ
هەر وا دەزانی لاقە مەلێکی پیا چووە
یایە کە مەعبەری دوبری و دیهلیزی کوزی
یاتاغی ئەشقیایە، گوزەر گاهێ ئۆردووە
شیعرێ کە تۆ بە چاکی دەزانی شیاکەیە
نەزمێ کە تۆ بەیانی دەفەرمووی گەن و گووە
هەروەك تسێ کە جەوهەری خۆی دەربخا بەبا
نامووسی خۆت بە شیعری سەفیهانە بردووە
بەم شیعرە بێ فەرانە نابییتە (شێخ ڕەزا)
زەحمەت مەکێشە ئا ئینەکاریی ئەرەستووە

شاعیر لەم شیعرانەدا سوورە لەسەر ئەوەی شاعیرییەتی شوکری فەزلی ناگاتە شاعیرییەتی خۆی، کە شێخ ڕەزا لەو

شاعیر تر بێ پێویستە شیعرەکانیشی لە شیعری ئەو جوانتر بن. ئەگەر ئەم بیرورایەی شێخ ڕەزا بەگشتی ڕاست بێ وەك دوو شاعیر، بەڵام لە بابەت شیعرە داشۆرین و کراوەکانیان کە دژی یەکتری گوتوویانە هەردوو شاعیر لە پلەیەکی بەرزدان و لە یەکتری دەکەن. ئەوە هەیە شیعری شوکری فەزلی بەقەوارە لەوەی شێخ ڕەزا کەمترە، کەچی ئەو شیعرە کەمەی شوکری فەزلی بەڵگە بەدەستەوە دەدەن وەك شاعیرێکی گەورەو بەدیمەن جێگەی لە مێژووی ئەدەبی کوردی بپێتەوە.

لە پارچە شیعرێکی دیکەیدا لە دژی شوکری فەزلی شاعیر دەڵێ:

حیزێك کە ئەگەر قسە ببەستێ بەرەمزاوە
بێ شك بە حەلالی لە کوزی دایکێ نەزاوە
بێ حیکمەت و بێ قیمەت و بێ جێ نییە شیعری
عومری لە هەوەل تا ئاخری تێدا رزاوە
شوکری گەن و گووخۆری سلێمانییە ئەمووت
هەرچەندە کە ئەمدی وەکو لۆتی دەگەڕاوە

لەم شیعرەدا شێخ ڕەزا هەوڵ دەدا زیاتر لە نرخی شاعیرییەتی شوکری فەزلی کەم بکاتەوەو بەشاعیری نەزانێ، ئەگەر مەسەلەکە وا بێ بۆ شوکری فەزلی نییە، بەپێی بۆچوونی شێخ ڕەزا بەشیعر وەڵامی جنێوەکانی بداتەوە چونکە ئەو شاعیر نییە.

شوکری فەزلی وەرامی ئەم هەموو شیعرانەی شێخ ڕەزای داوەتەوە، ئەو شیعرانە لە بەشێکی ئەم کتێبەدا تۆمار دەکرێن کە بۆ ژیان و بەرهەمی شوکری فەزلی تەرخان کراون.

شیعری شێخ ڕەزا لە داشۆرینی شێخ غەفووری مامی گەیشتووەتە پلەی ئەو شیعرانەی لە دژی شوکری فەزلی وتوویەتی، لەم لایەنەوە دەڵێ:

مامەکەم قەحبەژنە دەولەتی شەددادی هەیە
تالعی ڕەهبەرو بەختێکی خودا دادی هەیە
دوو سێ دێی داوەتێ سولتان بە ئیتعامی تەعام
هەر یەکێکی بەقەدەر خەزنەیێ ئیرادی هەیە
چ فرووش و چ زرووف و چ زەیاع چ عەقار
لە هەموو جینسە مەتاعێ سەدو هەشتادی هەیە
ئەم هەموو کەنج و خەزێنەی هەیە هێشتاکو تەرەس
نە هەوای جوودو نە مەیلی کەرەم و دادی هەیە
ڕەسمی ئابائی کیرامی بووە ئاساری سەخا
نە لە ئابائی حەیا و نە لە ئەدادی هەیە
گەر سەرو ڕیشی پیاوانەیە باوەر مەکە پێی
باتینی جووڵەکەو زاهیری زوههادی هەیە
خۆی بەهەر سوورەت ئومێدی کەرەمم پێی هەیە لێك
رقی زۆرم لە ڕەشیدی کوری گەووادی هەیە
ڕەنگی کەر، دەنگی بەقەر، هەیئەتی سەگ، خوویی چەقەل
چاوی کوێر، مەخزەنی کێر، مەقعەدێ پڕ بادی هەیە
زیکرو ئەورادی لەسەر کێرو زەکەر مونحەسیرە
سەیری ئەو حیزە قورمساغە چ ئەورادی هەیە
تف لە کوز داکی لە لای خۆی کوری هێناوەتە دەر
گوو بەڕیش بابی کن خۆی ئەمیش ئەولادی هەیە
ئەمە گشت باوکی سەرمەشقی لە بۆ داداوە
سەربەخۆ سالیکی ڕەهرەو نییە ئوستادی هەیە
لە گرووهی حەرەما کارەکەرو دایك و خوشك
فاتم و عاسم و ئامان و بەریزادی هەیە
شەوو ڕۆژ چەپڵە بەکوز لێدەدەن و هەڵدەپەڕن
فەرجیان تاب و تەبی کوورەیی حەددادی هەیە
بێ حەیان جوملە خوسووسەن ژنە سووزانییەکەی
ڕەووشی دێڵە سەگ و قەحبەیی بەغدادی هەیە
من لە کەرکووکەوە دێنێتە کن ئەم قەحبەژنە
لە گەڵم خەسمە فەلەك نییەتی بێ دادی هەیە
کوونی و حیز بووە مانەندی ڕەشید تەبعی (ڕەزا)
هێند لەبەر جەوری فەلەك خاتری ناشادی هەیە

شێخ ڕەزا ئەم شیعرەی تەنیا بۆ داشۆرینی شێخ غەفووری مامێ دانەناوە، بەڵکو زیاتر ڕق و کینی بەرامبەر بەرەشیدی کوری شێخ غەفوور دەربڕیوە، وەستایانە سیفەتی ناشیرینی هەڵبژاردووە بۆ ڕەشید تا لە گەڵ ئەو سیفەتانە بگونجێ کە شاعیر بۆ شێخ غەفووری مامی دروستی کردووە.

ئەمە بەلای شاعیرەوە بەس نەبووەو بەمە وازی لە ڕەشیدی ئامۆزای نەهێناوە لە چوارینێکیدا دەڵێ:

ڕەشە ڕشقاشی کەری ڕەش بەرەشت
تا ڕەشت ماوە ڕەش و سوور بەرەشت
چڵ و چێوی چەمی ڕەشنەش بەرەشت
بەلەشت، هەم بەبەشت، هەم بەرەشت

لەم شیعرەدا شێخ ڕەزا هەوڵیدا وشەی (ڕەش) وهەندێ وشەی دیکە کە دەنگی (ش) تێدایە بەکار بێنێ بەمەبەسی خۆشکردنی ڕیتم و ئاوازی مۆسیقا لە رووی ڕەوانبێژییەوە.

ڕەسووڵ مەستی زانایەکی گەورەی خەڵکی سلێمانی بوو، لە ئەستەموول زانستی بەپراکتیکییەکانی وەکو فیزیا و ئەسترۆنۆمی (ئەستێرەناسی). خوێندبوو، لە کەرکووك و مووسڵ و بەسرەو جێگەی دیکە مامۆستا بووە. ئەو زانایە وەکو زۆربەی ئەوانەی بەر هێرشی شێخ ڕەزا کەوتوون پلەیێکی بەرزی زانستی و کۆمەڵایەتی بووە لە سەردەمی فەرمانرەوایی عوسمانیدا. شێخ ڕەزا بەم جۆرە وەسفی دەکا:

دەستێکی هەیە مەستی ئەفەندی لە کەرەمدا
میوانی عەزیزی هەیە دایم لە حەرەمدا
ئەلحەق ژنەکەی موشفیقە دەرحەق بەغەریبان
سەد گانی بەڕۆم داوە، هەزاری بەعەجەم دا
هێند کێری هەتیوانی بە کوزدا چووە داکی
دەستێکی شکا بوو بە منالی لە شکەمدا
بەر زەربەیی کام کێری قەوی کەوتووە ئاخۆ
بەو دەردە چووە ساعیدی مەستی لە ڕەحەمدا
حەتتا کە مەجیدی کوری زۆر تەبعی جەوادە
سەد گانی بەیەك لە حزە بەبێ پوول و درەم دا
گەوواد و تەرەس، مولحید و بێ دین و موناف‌یق
مورتەددە، نییە میسلی لە موسقۆف عەجەم دا
بۆ سەددی ڕەهی مەستی وەکو تەپڵی سکەندەر
ئاوازی دەهۆڵی کوزی داکی لە حەرەمدا

ئەو کێرە زلەی کێ بوو لە کێلانی فەتاح بەگ
مشتێکی کوتایە کوزی، مشتێکی لە دەم دا
شێخ رەزا شاعیرێکی بەتوانایە لە موبالەغە دروستکردن، ئەگەر زیادوەرۆیی و ناماقوولی لە شیعردا نەبێ بەهونەری بەرز ناژمێرێ و دەبێتە قسەی رووت.
شاعیر تەنیا بەداشۆرینی مەستی نەوەستاوە، بەڵکو ژنیشی خستووەتە ژێر بارێکی گەلێ قورسەوە:
لێرە گایان ژنەکەی مەستی ئەفەندی بەسرە
ئێستە بۆ بەسرە دەچێ بەعدە خەرابولبەسرە
هێندە گەووادە گەر ئەولادی لە پێش چاوی بگێی
ریشی رادەگرێ کە ها کێرو گونی پێ بسرە
عەینی بەغدایە بە خۆی، چونکە لەبەر ئاوی مەنی
مەقعەدی بەحرە، گونی قایەغە، کێری جسرە
لەم شیعرەدا شاعیر بەجارێ پەردەی حەیای دریوە، بەڵام شیعرەکە بووەتە داهێنانێکی جوانکاری، ئەگینا لە کۆمەڵی کوردەواری ئێمەدا هیچ ژنێك یا پیاوێك ئەو رەوشتەی شاعیر دەداتە پاڵیان لێیان نابینرێ، لەبەر ئەوەیە ئەو کەسانە لە شاعیر تووڕە نابن، چونکە ئەم کردەوانە لێیان ناوەشێتەوە، بۆ بەڵگە مامۆستای گەورەمان تۆفیق وەهبی کە مەستی ئەفەندی دەکاتە باپیری (لە دایکەوە) شێخ رەزای بە گەورەترین شاعیری کوردی دادەنا، لە جنێوەکانی تووڕە نەدەبوو. گەلێ جار داوای لێ دەکردم شیعری شێخ رەزای بۆ بخوێنمەوە. هەروەها ئەو وتارەی سی. جەی. ئەدمۆندس لەسەر شێخ رەزای نووسیبوو بەزمانی ئینگلیزی تۆفیق وەهبی وەریگێڕایە سەر زمانی کوردی ولە کۆواری (دەنگی گێتی تازە)ی بەغدا بڵاوی کردووە (١٩٤٣)
شێخ عەلی برا گەورەی شێخ رەزاو جێگری شێخ عەبدولرەحمان خالیسی باوکی رزگاری لە هێرشی نەبووە، ئەگەر ڕاستەوخۆ جنێوی پێ نەدابێ لەباتی ئەو هێرشی بردۆتە سەر پیاوو بەرێوەبەری کاروباری و ماڵ تەکییەی کە ناوی حەمەی وەستا فەتاح بوو، شێخ رەزا لە چوارینێکدا دەڵێ:
شێخ عەلی خۆ تۆ منت ئاوارە کردو دەربەدەر
جا کە هەجوێکت بکەم، ئەمما موفیدو موختەسەر
بۆ حەمەی وەستا فەتاح ئێمەت هەموو ئاوارە کرد
ئەی حەمەی وەستا فەتاح دایك بە کێری نێرەکەر

*** مولەممەع:**
شیعری مولەممەع لە دیوانی شێخ رەزادا بەرچاو دەکەوێ، لە شیعری کوردی خۆیدا شاعیر زمانەکانی تورکی و فارسی و عەرەبی بەکارهێناوە، لەم ماوەیەدا ئاماژە بە پارچەیەکی دەکرێ، بە چوار زمان وتوویەتی:
گرز دوائر اقلامی ارقەسندە دوات
مدار اهل قلمدر مدیر تحریرات
نگفتمت کە حذرکن تیغ ناطقە ام
فاءن ناطقتی آفة من الآفات
لەبەر عەباکە جەبەم کردی ئەی فەقیری خودا
ئەوە عەباکەتە کێرم بە قنگی خۆت و عەبات

ئەم پارچەیە سێ دێرە شیعرە، واتە شەش نیوە دێر شیعر، نیوە دێرەکانی یەکەم و دووەم بە زمانی تورکین، نیوە دێری سێیەم فارسییە، نیوە دێری چوارەم عەرەبییە، نیوە دێری پێنجەم و شەشەم کوردین، لە دوای وەرگێڕانی نیوە دێرە کوردییەکان پارچە شیعرەکە بەم جۆرە خۆی دەنوێنێ:
قوتووی مەرەکەب لە دەوری جغرەکان دەسوورێتەوە
باشکاتبێ موتەسەریف سورگەی خاوەن قەڵەمە
پێم نەوتی وریا بە لە تیغی زمانم بترسە
زمانی من بەڵایەکە لە بەڵایان
لەبەر عەباکە جەبەم کردی ئەی فەقیری خودا
ئەوە عەباکەتە کێرم بە قنگی خۆت و عەبات

*** پێنج خشتەکی:**
هونەری پێنج خشتەکی لە دیوانی شێخ رەزادا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام بایەخێکی زۆری پێ نەداوەو ژمارەیان کەمە"[٧].

*** هەجوەکانی شێخ ڕەزاو وەڵامێکی زەهاوی:**

**سەربەست کەرکوکی**

ئەوەندەی من بزانم، زۆربەی ئەدەبدۆستانی کورد، ئاگادارییەکیان هەیە سەبارەت بە شیعرەکانی شاعیری پێشەنگی هەجو؛ شێخ ڕەزای تاڵەبانی، دژ بە شاعیرو بیرمەند جەمیل سدقی زەهاوی. بەڵام تا وەکو ئێستا هیچ وەڵامێکی زەهاوی لەبەر دەستا نەبووەو نەزانراوەو نەبینراوە. عەقڵیش بڕوا ناکات کە شێخ ڕەزا ئەو هەمووەی پێکردبێت و ئەویش قڕوقەپ دانیشتبێت و هیچی نەگوتبێت!

ئەگەر بەپێی شیعرەکانی خودی شێخ ڕەزاش بێت، دەبێت زەهاوی چەند جارێك شێخی قەڵساندبێت. جا ئایا ئەو قەڵساندنە بەهۆی قسەو شیعر یا بەهۆی هەڵسوکەوت و مامەڵەی زەهاوی بووە بەرامبەر بە شێخ؟ چونکە وەکو دەزانین شێخ ڕەزا ئەگەر دیارییەکیشی بۆ هاتبێت و دیارییەکەی بە دڵ نەبووبێت، بە هەجوێك وەڵامی خاوەنی دیارییەکەی داوەتەوە. لە هەموو ژیانی شاعیریشیدا لەوە دەچێت شێخ ڕەزا بە ئاشکرا تورە بوونی توندی خۆی بەرامبەر بە دوو کەس دەربڕیبێت؛ کە ئەوانیش زەهاوی و شوکری فەزلین:

پێم مەڵێن ئەو دوو ژنەت بۆچییە تۆ شێخ ڕەزا

شوکری بۆ تەسك و تورسکی و جەمیل بۆ زگ و زا!

ئاشکرایە کە خوێنەرانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی ئاشنای سەرجەمی هەجوەکانی شێخ ڕەزاو وەڵامەکانی شوکری فەزلین، بەڵام کوان، لە کوێن وەڵامەکانی زەهاوی؟ ئایا دەشێت زەهاوی هیچ وەڵامێکی شێخ ڕەزای نەدابووبێتەوە؟ ئەگەر وەڵامی دابێتەوە، ئەی کوان ئەو وەڵامانە، بۆ نەنوسراون و لەبەر دەستا نین؟ تۆ بڵێی هەڵوێستی ئەو دوو شاعیرە، ڕەنگدانەوەی دژە هەڵوێستی دووخانەوادەی ئایینی ناوداری کوردەواریمان بووبێت؟ واتە تۆ بڵێی لەو زەمانەدا، دژایەتییەکی ئەوتۆ لەنێوان گەورە پیاوانی خانەوادەی شێخ و خانەوادەی موفتی هەبووبێت و ئەمەی ئەمانیش پاشکۆو بەردەوامی دژایەتی ئەوانی تر بووبێت؟ مێژوو لە هیچ قورنەو چاخێکی لاپەرەکانیدا ئەوە ناسەلمێنێت، بەڵکو هەتا خودی شێخ ڕەزا لە چەندین شیعریدا بەشان و باڵی گەورە پیاوانی خانەوادەی موفتی زەهاوی هەڵدەدات و دەڵێت:

ئەی مادەری گێتی تۆ هەتا ئێستە نەزاوی

زاتێکی وەکو فەیزی ئەفەندی زەهاوی

مومکین نییە ئیدارەکی حەقایق بە تەواوی

مومکین نییە دەرکی نەکا زیهنی زەهاوی!

کەواتە گریمانەی تر خۆی دێنێتە پێشەوە، بڵێی خەڵکانێکی گێرەشێوێنی ناو مەجلیس و دیوانەکانی بەغدای کۆتا ساڵانی دەسەڵاتی عوسمانلی و سەرەتای سەدەی بیستەم، پەیتا پەیتا هەوڵیان دابێت نێوانی ئەو دوو شاعیرە کوردو بە ڕەچەڵەك کوردە تا بکرێت ئاڵۆزو ناتەبا بکەن؟ تۆ بڵێی شەڕە هەڵوێستی دینی و سیاسی و ڕووناکبیریی ئەو دوو کەڵە شاعیرو بیرمەندە هۆی سەرەکی ئەو دژایەتییە نەبووبێت؟ مەبەست هەڵوێستیانە سەبارەت بە خەلیفەی عوسمانلی و مانەوەو نەمانەوەی خیلافەت، سەبارەت بە ململانێی ڕۆشنبیریی ئەو سەردەمە، لەنێوان حوڕ ئەندێشان و پەیڕەوانی شێخولئیسلامی سەردەمەکە.

بۆ وەڵامی ئەم هەموو پرسیارو گریمانە، من خۆم چ بەڵگەیەکی سەلمێنەرم بە دەستەوە نییە، جگە لە پێداچوونەوەی شیعرەکانی شێخ و تاقە وەڵامێکی شیعریی زەهاوی نەبێت، کە بە ماوەی چەند ساڵێك دوای کۆچی دوایی شێخ ڕەزا، لە ژمارە (١٨٣)ی مێژووی (١)ی تەمموزی ساڵی (١٩٢٥)ی گۆڤاری (اجتهاد)ی عوسمانلی دا بڵاوکراوەتەوە. ئەو شیعرە کە زەهاوی بە زمانی فارسی نوسیوویەتی، جگە لەوەی دەبێت دەقەکەی بخرێتە بەردەستی خوێنەرانەوە، لەهەمان کاتیشدا هەڵگری کۆڵێ لێکۆڵینەوەیە، دەرئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەوەیە ژمارەی ئەو گریمانەی پێشوومان کەم بکاتەوەو تا ڕادەیەك بمانگەیێنێت بە ڕاستە ڕێگەیەك بۆ دۆزینەوەی هۆکارە شاراوەکانی دژە هەڵوێستی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بەرامبەر بە جەمیل سدقی زەهاوی. بەڵام پێش ئەوەی بچینە بنج و بنەوانی ئەو بابەتەوە، پێم باشە کە زیهنی کراوەی خوێنەرانی ئێستامان بەم چەند خاڵە روون بکەمەوە:

– شێخ ڕەزا هەر وەکو چۆن لە شیعرە ساتیرەکانی دا، دژایەتی بێ حەدو حسێبی لەگەڵ (شوکری فەزلی)دا نواندووەو خوا هەڵناگرێت (شوکری)ش تەقسیری نەکردووە، بەڵام لە واقیعی هەڵوێست و ژیاندا، تا ڕادەیەکی زۆر دۆستی شوکری بووەو هەڵوێستی پیاوانەشی بەرامبەر نواندووە؛ هەر هیچ نەبێت (شوکری فەزلی) لە سێدارەی والی عوسمانلی ڕزگارکردووە.

– شێخ ڕەزا هەرچەندە پێشەنگی شیعری هەجو (ساتیر) ی ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی بووە، هەرچەندە هەجوەکانی بێ حەد ڕووت و بێ پەردە بوون، بەڵام ئەو کەسانەی گەیشتبوون بە دوا ساڵەکانی ژیانی شێخ و لە نزیکەوە هایداری کەسایەتی شێخ ڕەزا بوون، بێ دوودڵی باس لە پیاو چاکی و بە دینی و ڕەوشت بەرزی شێخ دەکەن. ئەوەتا شێخ هەرخۆی دەفەرمووێ:

زوبدەی مەتاعی حیکمەتە ئەم شیعری کوردییە

هەرزانە بێ موبالەغە حەرفێ بە گەوهەرێ

جامەی حەیاتی عارییەت کورتە، زینهار

ئالوودە دامەنی مەکە بۆ پێچی مێزەرێ

– هەروەها ئەوە شێخ ڕەزایە کە کۆمەڵێ شیعری هەرە بەرزی کوردپەروەرانەی وەکو (مەربوتە حەیاتم بە سلێمانی و خاکی...) هەیەو لە (لە بیرم دێ...)دا، مامە شێخی مەزنمان هەستی کوردانەی نواندووە، کاتێ دەڵێت:

لە بیرم دێ سولەیمانی کە داروموڵکی بابان بوو

نە مەحکومی عەجەم، نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو

لەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلاو زاهید

مەتاف کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت، گردی سەیوان بوو.... هتد

سەرەتا با بچینە ناو هەڵویستی سیاسییەوە، هەڵبەتە هەڵوێستی سیاسی بە گوێرەی ئەو زەمانەی کۆتایی

دەوڵەتی عوسمانلی و هەڵپەهەڵپی پەروەردەو رووناکبیریی و پیشەسازی بەرەو نموونە سەرکەوتووەکانی وڵاتانی رۆژئاوا.
واش بفکرین کە جیاوازی بیری سیاسی ئەو دوو شاعیرەی هەڵشاخاندووەتە بەرۆکی یەکتری. رووداوەکانی مێژوو دەپسەلمێنن کە جەمیل سدیقی زەهاوی وەکو بیرمەندێکی نویخواز لە پەیرەوانی ئینقلابی مەشروتەی (١٩٠٨) بووە.
بەپێی ئەم ژمارەیەی گۆڤاری (اجتهاد) بێت، لەوە دەچێت زەهاوی ئاشنایەتی و نزیکایەتی هەبووبێت لەگەڵ د. عەبدوڵلا جەودەتی خاوەنی گۆڤارەکە. لەو ژمارەیەی گۆڤارەکەدا، لە دوو شوێن وێنەو شیعری زەهاوی بڵاوکراوەتەوە؛ لەسەر بەرگی یەکەمی گۆڤارەکە د. عەبدوڵلا جەودەت وێنەیەکی زەهاوی بڵاوکردووەتەوەو لە ژێر وێنەکەدا نوسیوویەتی (اجتهاد عائلەو فکرییەسندن شاعیرو متفکر جمیل صدقی زهاوی افندی) کەسێکی یا ئەندامێکی گروپ، خێزانی فیکری ئیجتهاد شاعیرو بیرمەند جەمیل سدقی زەهاوی ئەفەندی.
هەروەها لە لاپەرەی ناوەراستی گۆڤارەکەدا، شیعرەکەی تێدا بڵاوکراوەتەوە، وێنەیەکی نوێی زەهاوی تیایە کە بە قەڵەمی خۆی ئەم رستەیەی تێدا نوسراوە (حکیم شهیر برادرم عبد الله جەودت بگ افندی حضرتلرینە یادگارمدر). ئەم دوو کەڵە بیرمەندە؛ جەمیل سدقی زەهاوی و د. عەبدوڵلا جەودەت، کە دوو جەمسەری (حورئەندێشی) بیرئازادی دەوڵەتی عوسمانی بوون، بێ شك هاوفیکری سیاسی بوون. ئەوەی لە مێژووشدا ئاشکرایە، د. عەبدوڵلا جەودەت بە خۆی یەکێ بووە لە دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی (جەمعیەتی ئیتحادو تەرەقی عوسمانلی)، ئەو رێکخراوەی کە پێشەنگی ئۆپۆزسیۆنی (بابی عالی)و سوڵتان عەبدولحەمید بوو، پاشان هەندێ لە تورکخواهانی وەك (جەمال و ئەنوەرو تەلەعەت پاشا) لە ساڵی (١٩٠٨) ئینقلابی مەشروتەیان پێکردو دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمیان بێ برەوکردو رێچکەی (ئیتحادو تەرەقی) شیان لە بیری عوسمانلییەوە گۆڕی بەرەو تورکچییەتی.
باشە، ئەگەر زەهاوی لە پەیرەوانی ئەو تێزە سیاسییە بووبێت، تۆ بڵێی شێخ رەزا، تەنیا لەبەر ئەوەی شێخزادە بووە، دژی ئەوان بووبێت؟
شێخ رەزا، لەسەرجەمی شیعرەکانیدا (بە تایبەتی لە شیعرە تورکییەکانیدا) هیچ بوارێکی نەهێشتووەتەوە کە تانەو تەشەری لە دەسەڵاتدارانی رەشوەتخۆرو دزو جەردەو بێ توانای دەوڵەتی عوسمانلی نەدابێت. لەوەش زیاتر شێخ لە شیعرێکیدا پەیامی دژایەتی خۆی بە جۆرێك گەیاندۆتە چڵەپۆپەی تانەو تەشەر، بروا ناکرێت گەر کەسێك خاوەنی هەڵوێستی روون و جەسوورانە نەبێت، بتوانێت خۆی بدات لە قەرەی ئەو جۆرە دەربرینە. واتە دەکرێت بڵێین هۆکاری شیعرەکانی شێخ لەگەڵ زەهاویدا، نابێت پەیوەندییەکی ئەوتۆی هەبێت بە جیاوازی هەڵوێستی سیاسی هەردووکیان دژ بە سوڵتان و خیلافەت.
شێخ لە شیعرێکی فارسی تێکەڵ بە عەرەبی، روو لە سوڵتان عەبدولحەمید دەکات و دەڵێت:

اسمانش آن چنانست و زمین انچنین
چشم عبرت برگشا و قدرت حق را ببین
گرچه از روی زمین من مالك چیزی نیستم
از زمین تا اسمان "حمدا لرب العالمین"
کاش یك روز بدرگاه همایون ره دهند
تا "حمید خان" را بگویم "ای حمیر المؤمنین"
بعثت تو بر خلافت بعثت پیغەمبەراست
"انت ما ارسلت الا رحمة للعالمین"

شێخەکەی ئێمە، لە چەندین شیعری وەك ئەمانەی خوارەوەی، زەهاوی هەجواندووە:

یەکتری دەعوەت ئەکەن ئەهلی دیانەت بە قۆزی
کوڕی موفتی بە قنگی، خانمی دایکی بە قوزی

یاخود لەوەش زیاتر رۆدەچێت و دەڵێت:

حەیزی کوزی حیزو دزی فەیرووزە گوواوی
مەعجونی خەنەو وەسمەیە بۆ ریشی زەهاوی

یا بە تورکییەکی خەست بە جەمیل زەهاوی دەڵێت:

سورمەدان، مادرك، سیکدن یمش ملیونجە میل
کیم بلیورسك، هانگی کلبك یاوروسی سك ای جمیل
(بە بێ پرس، دایکتان خواردوویە کێر بە ملیون میل
کێ دەزانێت، توتکی کام سەگی تۆ، ئەی جەمیل)

بەپێی ئاگاداریی منی هەژاری سەرچاوە، بیرمەندی عێراقی جەمیل سدقی زەهاوی، لەوە ناچێت وەڵامی هیچ یەکێ لەو شیعرانەی دابووبێتەوە، ئەوە نەبێت کە شێخ رەزا بە عەرەبی پێی ئێژێ:

جمیل ولدته امه من ورا
علی وجهه اثار الخرا

ئەم شیعرەی کە لە (اجتهاد)دا بڵاوکراوەتەوەو هەوێنی ئەم وتارەیە، دەشێت وەڵامێکی نا راستەوخۆی ئەو پلارەی شێخ بووبێت. هەرچەندە شیعرەکە زیاتر لەوە دەرواتو خۆی دەدات لە جەدەل و گفتوگۆی حورئەندێشێکی ئەو زەمانە، دژ بە عەقڵییەتی ووشکی مەلاو شێخانی ریش و تەسبیح و دەستار لە سەران. شیعرەکەی زەهاوی کە بە ناونیشانی (زمزمەو عقل سلیم)ە لە لاپەرە (٣٦٤٥)ی ئەو ژمارەیەی (اجتهاد) ی د. عەبدوڵلا جەودەت، لە ئەستنبول بڵاوکراوەتەوەو ئەمە دەقەکەیەتی:

بخدا نیست اعتقاد مرا
مادر از کون خر نزاد مرا
من بحکم طبیعتم جنبان
میبرد پیش گرباد مرا
من فدای حکیم عقل شوم
که عجب مشکلی گشاد مرا
یا خرد گفت راست، ایزد نیست
یا که ایزد خرد نداد مرا
گر نمی تافت مهر علم ز غرب
زود می کشت انجماد مرا
جهل اگر راحتست دلهارا

این چنین راحتی مباد مرا
عشق فهم تو ای جمال حیات
آتش افکند در نهاد مرا
قوتی هست در بنای جماد
که برآورد از جماد مرا
با نجیبان نوع بوزینه
اشترکست در نژاد مرا
بردو آورد از جهان بجهان
بارها کون پر فساد مرا
دست قوت که حاکم کونست
گاه برداشت، که نهاد مرا
بعد مرگم چو عصرها گذرد
که دگر آورد بیاد مرا
کم کن ای شیخ پند خویش که نیست
طاقت سمع زین زیاد مرا،
تو باین ریش و سبحەو دستار
نتوانی فریب داد مرا
آتش دوزخ و نعیم بهشت
نه هراسان کند، نه شاد مرا
من نه آن جاهلم که بیم جحیم
افکند دور از مراد مرا
احمقم گر کند گهی خرم
وعدەء حور در معاد مرا
نیست جز عقل خود دراین ظلمات
بر چراغ کس اعتماد مرا
ای حقیقت زبهر تسخیرت
هست با جاهلان جهاد مرا
گفته بودی بکلبه آت آیم
گر بکوی تو رەفتاد مرا
این قدر سالها گذشت و هنوز
تو نیاورده بیاد مرا

زەهاوی، هەر لە یەکەم بەیتەوە زۆر بە هێمنی بە دوو واتا وەڵامی شێخ دەداتەوە، هەڵبەتە دەبێ لە شێخ رەزا تێگەیشتبێت کە الـ(خرا) کەی بە دوو مەعنا بەکارهێناوە؛ بە عەرەبییەکەی واتا (پیسایی مرۆڤ)و بە فارسییەکەی واتا (گوێدرێژ). بۆیە وەڵامەکەی ئەوەیە کە هەر لەیەکەم عەجزەوە بە شێخ دەڵێت ببوورە بۆچوونەکەت هەڵەیەو لە هەمان کاتدا بەوانی تریش دەڵێت؛ خۆ من لە کەر نەبووم تا بروا بەو قسەو بۆچوونانە بکەم. ئیتر چ لە (سەدر)ی یەکەم بەیت و چ لە بەیتییەکانی تردا دەکەوێتە ناو دەربڕینی حور ئەندێشی خۆی و ئاشکراکردنی هۆکارەکانی دواکەوتەیی رۆژهەڵات و دەوڵەتی عوسمانلی و پێشرەفتی عەقڵ و هۆشی رۆژئاوا. زەهاوی هەموو ئەو بۆچوونانەی کە لە شیعرەکەیدا دەربڕیووە، لە واقیعی ژیانی خۆشیدا وا بووەو وا فیکرو وا رەفتاری کردووە. ئەم جەدەلەی زەهاوی لەم شیعرەدا بێ ترس دەربڕیووە، سەرتۆپی گفتوگۆو ململانێی فیکری و رووناکبیریی ئەو کۆتا ساڵانەی دەوڵەتی عوسمانی و بارودۆخی فیکری و کۆمەڵایەتی پاش نەمانی دەوڵەتی عوسمانلی بووە.

بەڵام گەر بێت و ئەم هۆکارە، هۆکاری حور ئەندێشی لە لایەك و خۆلکاندن بە ووشکە ئایینیی لە لایەکی ترەوە، بکەینە خاڵی دژایەتی ئەم دوو کەڵە بیرمەندو شاعیرە، بێ شك ناتوانین هیچ گومانێك بکەین لە ئازادبیریی زەهاوی، خۆ ئەگەر بۆ ئەم شیعرەش حیسابێ نەکەین، ناتوانین ئەوە نەسەلمێنین کە کارێکی ئاسان نەبووە بۆ موفتی زادەیەکی وەکو زەهاوی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هاوار بکات و بە ژنان بڵێت:

اسفری فالسفور للناس....صبح و الحجاب لیل بهیم!

لێرەدا پرسیار لەوەدایە کە ئایا شێخ رەزا ئەو ووشکە مەلا یا شێخە بووە کە خوانەخواستە زەهاوی حیسابی دژە لایەنی حور ئەندێشیی بۆ کردبێت؟ بەڵێ شێخ رەزا شێخی تاڵەبانی و رۆڵەی شێخ عەبدولرەحمانی خاڵسی تەریقەتی قادری بووە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك نە بیستراوە کە رێگری کردبێت لە بیری ئازاد و حور ئەندێشی. ئەو خۆی سەرزەنشتی شێخانی کردووە، کاتێ دەڵێت؛ ئێوە خاپترن لە چەتەو رێگرەکان، ئەوان رێگری رێن و ماڵ تاڵان دەکەن، بەڵان ئێوە قوتاعی تەریقەتن و، رێگری دەکەن لە بیرو بۆچوون و فیکری موسڵمانان).

لەوەش زیاتر کەسێکی ووشکە فیکرو بیرنائازاد ناتوانێت و بوار بە خۆی نادات کە جۆرە شیعرێکی وەك ئەم شیعرەی (شکایەت از زمانە) ی پاشێخ بنووسێت:

از دست تطاول زمانه
کس نیست نخورده تازیانه
بیهده گیر مردم ازار
ناهی ز گناه و خود گنهکار
خود مجرم و فاعل گناهی
وز بی گنهان جریمه خواهی
آدم به دسیسه تو اغوا
نه حییه سبب شد و نه حوا
من سنگ زدم به فرق هابیل؟
ای راهنمای صد چو قابیل
خود ظالم و از منت شکایت
دانی به چه ماند این حیکایت

ئەم گفتوگۆییە توندەی شێخ رەزا لەم شیعرەدا، گفتوگۆی (جەبرییە)یکەو سەرزەنشتی زەمانە (کردگار) دەکات، لەوەی تۆ خۆت کردە بە من دەکەیت و لەپای چی بە گوناهکارم دەزانیت. ئەگەر ئەمە ئازادفیکری نەبێت، هەرگیز ناشێت قسەی کەسێکی ووشکە شێخ بێت.

لە بەرئەنجامی ئەم نووسینەدا، کە زیاتر پیشاندانی ئەو دەقە وەڵامدەرەی زەهاوییە بۆ ساتیرەکانی شێخ رەزا، گەرانیش بۆ دۆزینەوەی هۆکارەکانی دژە هەڵوێستیان، دەردەکەوێت هەموو ئەو گریمانانەی ئێمە لە سەرەتادا ئاماژەمان پێدان، ئەو گریمانانە نین کە بووبن بە هۆکاری هەڵوێستەکانی ئەو دوو کەسایەتییە ناسراوانەی ئەدەبیاتی کوردی و عێراقی.

بەڵام لەوە دەچێت هۆکاری سەرەکی ئەم شەرە شیعرییەی کە شێخ ڕەزا دەستی پێکردووە، زیاتر بگەڕێتەوە بۆ هۆکاری قەدر نەزانی و پشت گوێ خستنی شێخ ڕەزا لەلایەن زەهاوی و خانەوادەی زەهاوییەوە، بە تایبەتی لە دوا ساڵانی ژیانیدا لە شاری بەغدا. شێخ ڕەزا هەرچەندە پیاوێکی نەداربووە، بەڵام خاوەن پایەی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و شێخ و شێخزادەی خانەوادەی گەورەی تاڵەبانی بووە، بۆیە هەر پشتگوێ خستن و هەڵسوکەوتێکی نەرێن لەگەڵیا، بووەتە هۆی هەڵچوونی و هەڵرشتنی ساتیرەکانی. زەهاویش لەوە دەچێت هەتا لەو شیعرەش‌دا زۆر یاشێخی پشتگوێ خستبێت، ئەوەتا بە ئاشکرا دەڵێت: (ئەم هەموو ساڵانە هاتن و چوون، تۆ نەهاتیتە یادو بیری ئێمە (من))!

این قدر سالها گـذشت و هنوز

تو نیاوردەو بیاد مرا

ساڵهایە لەسەر زاری کەرکوکییەکان، چەندین ڕوایەتی لەم جۆرە شەرەی شێخ ڕەزا هەیە، دەڵێن، موفتی شار لە ماڵەکەی خۆیدا کە لەسەر قەڵای بەر بە ڕۆخانەی خاسە دەبێت، لە مەولودێکا، دەسەڵاتداران و ئەشراف شار بۆ نانخواردن دەعوەت دەکات و بەڵام شێخ ڕەزای لە بیر دەچێت و لە ناوەڕاستی بۆنەکەدا دەزانێت چ هەڵەیەکی گەورەی کردووەو شێخی لەبیرچووەو خۆی تووشی چ قسەو پلارێکی چاوەڕوانکراوی شێخ ڕەزا کردووە. بۆیە هەر پاش چەند ڕۆژێك بۆ دڵدانەوەی شێخ، موفتی بەپەلە بۆنەیەکی تر دروست دەکات و شێخ دەکاتە سەردەستەی میوانەکانی. لە بۆنەکەدا کە لە هەمان ماڵ بووەو لە بانێژی ماڵەکەوە، لە سەر تەپۆلکەیەکی دەستی ڕاستی ئەوبەری (خاسە)ش ماڵی قازی دیار بووە – ئەو ماڵەی قازی یا جێگای ئەو ماڵە ئێستا بارەگای حیزبی شیوعییە – گوایە شێخ ڕەزا لەوێدا هەر پلاری خۆی هاویشتووەو بە موفتی و جەماعەتی حازرەی بۆنەکە گوتووە:

ماڵی موفتی لەمبەرە، ماڵی قازی لەوبەرە

من فەقیرم، نازانم لەم بەرم یا لەو بەرم!

لە کۆتاییدا، هەر چەندە هەموو ئەمانەی گووتران، ڕوویانداوەو گەڕانەوەیان بۆ نییەو لە هەگبەی مێژووودان، هۆکارەکانی ئەو شەرە شیعرییانە گەر جدی بووبن و یاخود ناجدی، ئێمە دەسەڵات و دەخلێکمان پێیانەوە نییەو هەر ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە سوپاسیان بکەین بۆ ئەو هەموو بەرهەمە بەرزانەیان کە بۆ ئەدەبیاتی ئێمەیان بەجێهێشتووە، یادیان بەخێر ئەو دوو بیرمەندانەمان؛ شێخ ڕەزای تاڵەبانی و جەمیل سدقی زەهاوی.

*** سابیری، (١٨٨٢ - ١٩٤٤):**

(سابیری) یەعقووب ئەگەرچی هیجری یووسف کوێری کرد
حەمدو سەبری کرد بە عادەت یووسفی بۆ هاتەوە

*** ژیانی:**

(نەجمەدین کوری شێخ عەبدولرەحمان کوری شێخ مەحموودی قوتبی شۆڕیجە)یە، لە نەوەی (شێخ محێدینی قووله)یە کە ئارامگای لە گۆڕستانی (ئیمام قاسم)ە لە شاری کەرکوك. لە ساڵی (١٨٨٢)ی زاینیی لە گوندی شۆڕیجەی ناوچەی قەرەحەسەن لەدایکبووە. خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی مزگەوت بووە، لەبەر هەر هۆیەك بووبێ تەواوی نەکردووە، بۆیە نەبووەبەمەلا. لە کۆمەڵی کوردەواریدا ناوی شێخ لە مەلا گەورەتر بووە، ئیتر بەمیرات شێخێتی بۆ ماوەتەوەو بووە بەجێنشینی باب و باپیرانی و تەکییەی تەریقەتی قادری بەرێوە بردووە.

ئەوەی زیاتریش بووە بەهۆی رێزلێنانی لەناوکۆمەڵدا ئەوەیە لە بنەماڵەی سەیدانی بەرزنجی بوو. بە (شێخ نەجمەدین) ناوی دەرکردووە، لە شیعردا نازناوی (سابیری - صابری) بۆ خۆی هەڵبژاردووە. بەهۆی ئەوەی خوێندنی حوجرەی تەواو نەکردووە، زوو ژنی هێناوەو بووە بە خاوەن ماڵ لە گوندی شۆڕیجە. بەزۆری لە ژیانیدا خەریکی شێخایەتی و بەرێوەبردنی تەکییەو دەروێش و مریدەکانی بووە، کەمتر پەرژاوەتە سەر ماڵداری و خۆ خەریك کردن بەکاروباری کشتوکاڵی. سابیری وەك شێخی تەریقەتی دەروێشی لە گوندەکەی خۆیدا ژیاوەو گەورە بووە، ئاگای لە خەڵکەکەی خۆی بووەو ئیشوکاریانی جیبەجێ کردووە.

تەکییەو دیوەخانی سابیری هەمیشە ئاوەدان بووە، بێ میوان نەبووە. پێوەندیی کۆمەڵایەتی بەهێز بووە لەگەڵ زاناو پیاوماقووڵانی ئەو سەردەمە. میوانداریيانی کردووە، خۆشی بووە بەمیوانیان. لەوانە شێخ مەحموود، مەلا ئەحمەدی فورقانی رۆژبەیانی، سەید ئەحمەدی خاناقا، رەفیق ئەفەندی خادیمولسوججادە، سەید محەمەدی جەباری، شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەم، شێخ سەعید کۆیتەپە، شێخ قادری گوڵلەنەبرو هی دیکە.

لە ماوەی گرانی گەورە پێش کۆتایی جەنگی یەکەمی گێتی لە ساڵی (١٩١٧) لەبەر سەختیی ژیانی دارایی و کزی ئابووری ناچار بووە باربکا بۆ گوندی دێلێژە، لەوێ خزم و کەسوکاری هەبووە، لە پاش ساڵێك بەهۆی کۆتایی جەنگەوە گەراوەتەوە شۆڕیجەو لەم ماوەیەدا هەوەسی شیعر زۆر کاری لێ کردووە لە بەر ئەوە ژیانی خۆی بۆ ئەم مەبەسە تەرخان کردووە. لە بابەت ئەو دیاردە سایکۆلۆجییەی ناوەوەی خۆیدا دەڵێ:

شێواوم وێنەی قەیسی عامیری
ناوم نەجمەدین لە قەب سابیری
ئومێدم وایە سەتتارولعویووب
بداتە سابیر سەبرەکەی ئەیووب
یا دڵی غەمگین بە وێنەی یەعقووب
عاقیبەت رۆژی بکاتە مەتلووب

لە سەردەمی بەساڵاچوونی تەمەنیدا سابیری تووشی نەخۆشی لەرزۆکی بووە، هەر ئەو نەخۆشییەش کۆتایی بەژیانی هێناوە، لە رۆژی (٩)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٤٤) کۆچی دوایی کردووە ولە گوندی شۆڕیجە نێژراوە.

*** شیعری:**

**- شیعری سابیری لە رووی رووخسارەوە:**

سابیری لەو شاعیرە کلاسیکییانەیە بەشێکی زۆری و کەمییان ئەمانەن: رەمەل، هەزەج، رەجەز، سەریع، موزاریع، موتەقاریب، موجتەس، لە بارەی قافییەوە سابیری یەکێکە لە شاعیرە هەرە دەگمەنەکانی کورد کە هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی کردووە بەقافییە تەنیا تیپی (ظ) نەبێ. لە دەنگەکانی ئەلفەبێی زمانی کوردیدا کە لە عەرەبی بەرچاو ناکەون تەنیا تیپی (ژ)یی بەکار هێناوە.

سابیری بایەخی بەوشەی پاش قافییە داوە، ئەگەرچی بەپێی قەوارەی شیعری زۆر نییە لەگەڵ ئەوەشدا پاش قافییەی جوان بەرچاو دەکەن، وەکو ئەمانە: دەکا، خودایا، نەما، ئەلغیاس، (الغیاث). رووح، لەزیز (لذیذ)، نەخۆش، درێغ، فیراق، بم، نادەم، چبکەم، تۆ، ئەمشەو، رۆژو شەو، نییە، کەی دەبێ، تاکەی، نەبێ.

بەچاوێکی رەخنەگرانە ئەگەر سەرنجی تەرکیبی ناوەوەی رووخساری شیعری سابیری بدرێ، هەندێ تێبینی گەڵاڵە دەبێ وەکو ئەوەی زمانی ئاسانە، وشەی قورسی بێگانە کەم بەکار دێنێ، کەچی وشەو رستەی عەرەبی ساکاری ناو زمانی ستانداردی رۆژانە لە شیعریدا هەیە. شیعری بەگشتی لەگەڵ ئەوەی لە رووی کێشەوە رەوانن، لە بارەی ریتم و مۆسیقاوە گرێیان تێدا هەیە، بەگشتی شاعیر ئاگاداری قافییەی شیعرییەتی لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار ساتمەی تێدا دەکا. دووبارەکردنەوەی وشەی قافییە لە شیعرێکدا بەرچاو دەکەوێ. ئەمە بەخەوش دادەنرێ و لە نرخی هونەری شیعرەکە کەم دەکاتەوە. بایەخی ئەوتۆی بەرەوانبیژی کلاسیکی نەداوە.

**- شیعری لە رووی بابەتەکانەوە (ژانرەکانەوە):**

بە گشتی ئەگەر تەماشای بابەتەکانی (ژانرەکانی) شیعری سابیری بکرێ، ئەم جۆرە لیریکانە بەرچاو دەکەون:

١. بەشی هەرە زۆری شیعری لە جۆری پارچەیە، لە حەوت دێر کەمتر، هەروەها غەزەل، لە حەوت دێر زیاتر، ئینجا قەسیدە لە دوازدە دێر بەرەو ژوور، بەم پێیە دەکرێ هەموو شیعری دیوانی سابیری بەلیریك بژمێردرێ.

٢. هەندێ پێنجین لە دیوانیدا بەرچاو دەکەون، هەموویان لە رووی قافییەوە ئاسایین (ا ا ا ا ب ....)

٣. کۆمەڵێك چوارین لە دیوانیدا دەبینرێن، ئەمانە هەموویان لە رووی قافییەوە ئاسایین و هەردوو جۆری چوارینیان تێدایە (ا ا ا ا) و (ا ا ب ا).

٤. دیوانی شیعری سابیری تەنیا لیریکێك جووت قافییە (مەسنەوی) دەور دەکاتەوە (ا ا، ب ب، ج ج..) لە بابەت

کێشەوە خۆماڵی سیلابی دە کەرتییە.

٥. سابیری وەك هاووڵاتییەکی دانیشتووی ناوچەی کەرکووك یادی دیالێکتی گۆرانی زمانی کوردی کردووەتەوە، شیعرێکی لەم بابەتەوە هەیە. لە ڕووی کێشەوە خۆماڵی سیلابی دە کەرتییە. لە ڕووی قافییەشەوە جووت قافییە (مەسنەوی)یە.

٦. هەندێ شاعیری کورد شیعری سابیرییان کردووە بە پێنج خشتەکی، لەوانە جاهید شیعرێکی کردووە بە پێنج خشتەکی بریتییە لە پێنج بەند، شیعرێکی دیکەی لە دە بەند پێکهاتووە، هەروەها جەمیل ڕۆژبەیانی شیعرێکی دیکەی سابیری کردووە بە پێنج خشتەکی لە دە بەند پێکهاتووە.

- **شیعری سابیری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە:**

هەرچەندە لایەنی ئایینی بەسەر زۆربەی بەرهەمی سابیریدا زاڵە، لە گەڵ ئەوەشدا هەموو شیعری بەگشتی دەچنە خانەی وەسف و دڵدارییەوە. ئەگەر هەر ئاماژەیەك بۆ ناوەڕۆکی دیکەی وەکو ستایش و کۆمەڵایەتی و ئاوردانەوەی سۆفیزم لە شیعریدا دەبینرێ مەبەستی سەرەکی نەبووە. ئەگەر پێویست بێ سیفەتی پسپۆری بدرێ بەم شاعیرە دەبێ بە شاعیری وەسفی دڵداری دابنرێ. وێنەو مانای شیعری سابیری بەهێمنی و سادەیی و بێ زیادەڕۆیی لە دەورووبەری شیعری شاعیرانی نەوەی دووەم وسێیەمی قوتابخانەی نالی کوردستانی باشوور دەسووڕێنەوە.

* **نموونەی شیعری:**

لە لیریکێکی وەسفیدا دەڵێ:

مەرحەبا ئارامی گیان ڕۆشنایی چاوەکەم
شۆخی کەو ڕەفتارەکەم عەییار و ئاهوو چاوەکەم
ئەی برۆ شمشێر و لێو مەرجان و پەرچەم خاوەکەم
قەد نەمامی عەرعەرو رووت ترێ کاژاوەکەم
دڵبەری گوڵ ڕەنگەکەم تەن ناسك دڵ سەنگەکەم
نازەنین و شەنگەکەم مەست و خودا پێداوەکەم
یاخودا زوو بێتەوە ڕووحی ڕەوان و نووری چاو
یەعنی کەو ڕەفتارەکەم دڵ ناسك و تۆراوەکەم
مەستەکەی مەی نۆشەکەم سەربەست و مەشرەب خۆشەکەم
جان و عەقڵ و هۆشەکەم مەستوورو ڕوو پۆشراوەکەم
گفتوگۆ شیرینەکەی مایەی حەیات و ژینەکەم
جوێن و بوغزو قینەکەی چای و جغارەو قاوەکەم
هاتن و دەرکەوتنی دەرمانی دەرد و زامەکەم
خاکی ڕێگەی سورمەیە بۆ نووری هەردوو چاوەکەم
تابەکەی چاوم بەسەر شار ڕێوە بێ هەیهات هات
ئاگری نەکوژایەوە کوورەی دڵی سووتاوەکەم
یووسفی میسری تەماشایە کە حاڵی (سابیری)
پیرە دڵسووتاوەکەی کەنعانم وبێ چاوەکەم

سابیری لەم شیعرەدا گفتوگۆ لەگەڵ دلبەردا دەکا، دەمێکە نەیدیوە، لەناودڵتەنگی و پەژارەی دووری دەتلێتەوە، لە هۆش خۆی چووە نازانێ چی دەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا هوشیارە دەزانێ چۆن وەسفی ئەندامە جوانەکانی دلبەر بکا. دیارە شاعیر دەیەوێ ئەوە دەربڕێ جوانی دلبەر لە پلەیێك دایە ئەوە دەهێنێ بۆی شێت ببێ و بەراستی بێ ئەگەر خۆی لەگەڵ یەعقووبی کوێری پیری کەنعان بەراوورد بکا و یارەکەشی وەکو یووسف وەك ڕەمزی جوانی و دڵداریی بەراستی.

وەکو شیعرەکەی پێشوو دیسانەوە شاعیر خەریکی موناجاتە لە گەڵ دلبەر:

موددەتێکە شەو ئەناڵێنم لە ژێر پاسارەکەت
خۆت نەکردە خاوەنی خەستەی لە گیان بێزارەکەت
واڵە چاوم جارییە فرمێسکی خوێن باوەڕ بکە
ڕێ نەما خێڵی خەیاڵت بێتە لای بیمارەکەت
تا خەیاڵەت پادشاهی شاری دڵ بێ موشکیلە
قاسیدی خەو ڕوو بکاتە چاوی خزمەت کارەکەت
هاژە هاژی سەیلی چاوم پڕ بە عالەم مەوج ئەدا
قەترەیێ نایێتە بەرچاوت لە سەختی قارەکەت
تا نەهاتم بۆ نەهاتی تا تەبەییون بێ بەهات
تازە هاتی هاتنت هەیهاتە بۆ غەمبارەکەت
حەسرەتا ڕۆژی نەهاتیتە سەرینم پێم بڵێی
ئەی غەریبی شارەکەم چۆنی لە گەڵ ئازارەکەت
سەبرە چارەی دەردی دووری زیکرە دەرمانی گوناه
زوو دەگاتێ حاسلاتی سەبر و ئیستیغفارەکەت
(سابیری) ووریا بە خۆ ئەو شۆخە وەعدەی دا بەتۆ
نەك هەمیسان ڕەنجەڕۆی دەردی ساڵی پارەکەت

هەر چەندە شاعیر زیاتر بێ ئارام و دەردەدار بێ لە بەر دووری لە یار ئەو زیاتر گیرۆدەی دەبێ. سابیری ئاواتەخوازی هاتنی خۆشەویستە بۆ ئەوەی دڵی بداتەوە، ئەو ئازارەی لە دووری ئەودا دەیچێژێ ئەوەندە دژوارە هیچ شتێك چارەی ناکا هاتنی ئەو نەبێ. وشەکانی هات و نەهات وهاتە هات جۆرە وێنەیەکی ڕەوانبێژییان دروستکردووە لە لیریکەکەدا.

لە وەسفێکی گشتیی (یاری) سابیری دەڵێ:

وادیارە چاوی یارم مەیلی بیماری دەکا
دڵ کە بێ سەبر و قەرارە شیوەن و زاری دەکا
باقلم بادی سەبا زێی کەوتە نێو گوڵزاری ڕووی
وا کە ئیستیهزا بەعەتر و میسك وتاتاری دەکا
هەر کەسێ جارێ ببینێ سوورەتی یارم لە خەو
تا بمێنێ زیکرو شوکری نیعمەتی باری دەکا
هەر کەسێ هوشیارە مەیلی یارو دڵداری دەکا
بێتە سەیری چاوی یارم مەیلی بیماری دەکا
خۆشە شەو ناڵین و جەوری یارو زامی نادیار
خاسسە بۆ ئەو کەسانەی زیکری جەبباری دەکا
گفتوگۆیی سابیری بۆیە هەموو مەستانەیە
چاوی یاری کاروباری خەمری خەللاری دەکا
موددعی لۆمەم ئەکەن سەد کاشکی تۆیان ئەدی
تا بزانن (سابیری) هاواری ناچاری دەکا

لەم برە شیعرەدا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ یاری ئەوەندە جوانە هەر کەسێ چاوی پێی بکەوێ گرفتاری دەبێ. ئەگەر لە

ڕووی سایکۆلۆجییەوە لەمە بکۆڵرێتەوە پێویستە شاعیر پێی ناخۆش بێ ئەگەر یەکێکی دیکە یارەکەی خۆش بووێ، کەچی لەوانەیە ئەمەی بۆ شانازی خۆی بێ بەو مانایەی ئەوەندە جوانە هەموو کەس حەزی لێ کردووە.

لە وەسفێکی دیکەیدا یار بەهاری هەمیشەیییە:

نەسیمی سوبحدەم موژدەی بەهاری حوسنی یاری دا
نیشانەی جەژنی نەورۆزی لە شاری دڵ دیاری دا
کە داخیل بوو بە شاری دڵ سوپاهی حاکمی عادل
دزو جەردەی غەمو غوسسە لە ترسی ڕووحی غاری دا
بیحەمدیللاسەفینەی دڵ لە گێژاوی بەڵا دەرچوو
ئیتر ئاسوودەیە بێ غەم لە بەحری لوتفی باری دا
ئەما ئاساری غەیری حەق لە نێو شاری دڵم موتلەق
کە هەر کەس لێم قوبوول ناکا خودا تەوفیقو یاری دا
ئەما دەردو غەمو میحنەت لەولا شادییەو عیشرەت
لە نێو بازارو شاری دڵ موبەششیر هاتو جاری دا
وەرە (سابیر) دڵو جانت نیساری پایی دلبەر کە
ئەوا بمرم بڵێن ئەو شێتە نەیزانی خەساری دا

لەم پارچە شیعرەدا سابیری لە وەسفی جوانی یاریدا شنەبایەکی ئاسك وتەنکی سۆفیزم دەپژێنێتە ناو دڵو دەروونی خوێنەر کەس باس لە هەستی ناو دڵی خۆی دەکا. جوانی یارە بەهاری هێناوەو موژدەی نەورۆزی بە خەڵکی گەیاندووە. هەرچی خراپە هەیە لەو ڕۆژە پیرۆزانەدا لەناودڵ دەچنە دەرەوە، چونکە دڵ لە ڕاستی (حەقیقەت) بەولاوە هیچ شتێکی دیکەی گەرەك نییە، بەم ڕێگەیە نەبێ ناگاتە (موتلەق).

لە پارچە شیعرێکی دیکەیدا سابیری لە عیشق دەدوێ:

نیشانەی عاشقی وایە کە ساتێ یاری لێ وون بێ
دەبێ دەر لە حزە ئەحواڵی بەسەد گۆنە مولەووەن بێ
دڵێ پڕ دەردو ڕەنگی زەردو لێوی ووشكو چاوی تەڕ
سیاپۆشو جەفانۆشو سەراپا غەرقی ئاوخوون بێ
جەفا وو لوتفو هیجرو وەسڵی یاروشیوەنو شادی
لە لای یەکسانو دڵ وەك خانەی زەنبوور کون کون بێ
کە دلبەر هاتو ڕووحم چوو کە ڕۆیشت و دڵ بردم
ئیتر جان و دڵی بێچارە چۆن ئیسکانو ساکین بێ
ئەتیببا عاجزن بێ شك لە دەرمانی دڵی (سابیر)
ئەگەر لوقمانو جالینۆس ئەرەستۆ یا فلاتوون بێ

لەم شیعرەدا شاعیر هەندێ لە هەوای ناو ماڵی سۆفیزمی بێ پایان هەناسە دەکێشێ. بەونبوونی یار دلدار شپرزە دەبێ، چونکە گیانی لە گەڵ خۆیدا دەبا. دەرمانی ئەم دەردە نەدۆزراوەتەوە، تەنانەت فەیلەسووفە گەورەکانی ڕۆژگاری وەکو لوقمانو جالینۆسو ئەریستۆو ئەفلاتوونیش ڕێی پێ نابەن.

لەم پارچەیەدا سابیری بەراوود لەنێوان عاشقو عاقلدا دەکا:

عاشقان دڵیان بەدائیم پڕ خەیاڵو پڕ مەلال
بۆیە ڕۆژو شەو دەکەن بەحسی جەماڵو زولفو حاڵ
عاشقو عاقل ئەگەرچی ڕەنگو سوورەتیان یەکە
هەرییەکێ تامێکی تێدایە تورنجو پورتەقال
عاشقان ناڵانو بێ سەبرو قەرارو گفتوگۆ
عاقلان دڵشادو خوررەم نیکتەدانو خۆش مەقال
عاشقان مەجنوونی دووری لەیلو بیمارو زەعیف
عاقڵان ساغو سەلیمو شادو مەستی خەتتو خال
عاشقان پەروانە ئاسا سەرف ئەکەن جان و ووجود
عاقلان (سابی) گەلێ کۆشش ئەکەن بۆ جەمعی ماڵ

ئەم بۆ چوونەی سابیری بەراستی بەراووردێکە لەنێوان (عاشق)و(عاقل) وەك زاراوەیەکی سۆفیزم هەر لەو کاتەدا پێوەندیی نێوان (تەریقەت)و (شەریعەت) واتە (سۆفیو واعین) دەخاتە ڕوو، ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەو زۆرانبازیو دژایەتییەیە لەنێوان (بزووتنەوەو نەبزووتنەوە) بۆ ئەمە سابیری بەڵگەی جوان دێنێتەوە، بەلای ئەوەوە عاشق هەمیشە بیر دەکاتەوە، دەناڵێنیو ئۆقرەی نییە، لەرو لاوازە، شێتی لەبیلایە، عاشقان پەروانەن ئەنجامیان سووتانە، کەچی عاقڵان دڵیان شادە، قسەیان خۆشە، لەش ساغو جوانی ڕووکەشیان پێ باشە، پارە پەرستن. ئەمە ئاوردانەوەی ژیرانەیە لە وەسفی گیانیی گێتی سۆفیزم.

بەشێوازی شیعرەکەی پێشوو سابیری دەڵێ:

نەوبەهارە مەوسیمی پشکووتنی گوڵ هاتەوە
ئیعتیباری شیوەنو هاواری بولبول هاتەوە
خوێنی چاوی عاشقانە ڕووی زەوی نەخشاندووە
زەحمەتە سەیلی بەهاری نەقشەکەی بشواتەوە
حەزرەتی لوقمان فەرەزنا ئێستە زیندوو بێتەوە
باوەرم نایە برینی عاشقان چاکاتەوە
کەی ئەبێ یارەب سبەینانی نەسیمی ئاه ئاه
سا لە باغی جەننەتی حوسنی گوڵی گەشکاتەوە
ئەو بەتیری غەمزەکەی جەرگی بریمو تیری من
هەر هەناسەی سەر دەهاوێتم ئەویش بۆم هاتەوە
ئەهلی دونیا بۆ پلاوە جۆ بلاوی لێ ئەکەن
دابنیشە نانە ڕەق بوو ناتە ناو شۆرباتەوە
ڕاحەتی ئینسان لە بێ دەنگی ئەبێ سابیر خەمۆش
تۆ کە عەبدی حەیفە ڕوو ناکەی بەلای مەولاتەوە
(سابیری) یەعقووب ئەگەرچی هیجری یووسف کوێری کرد
حەمدو سەبری کرد بە عادەت یووسفی بۆ هاتەوە

شاعیر دوو دیاردەی پێچەوانە کۆ دەکاتەوە، لە لایەك بەهارو خۆشی پێشکەش بە ئادەمیزاد دەکا، لە لایەکی دیکەوە شیوەنو ڕۆ ڕۆ بۆ بلبل دەبا. گوڵو گوڵزاری بەهار خوێنی چاوی عاشقانە، سەیلی بەهار نایشواتەوە. یار بەتیری غەمزەی جەرگی عاشق کون دەکا، لە هەناسەی ساردو ئێشو ئازار بەولاوە عاشق چی پێ دەبڕێ! دانایی لەوە دایە پیاو ئارامی ببێ ئەمە بووە هۆی ئەوەی یووسف بێتەوەو یەعقووب چاوی بکرێتەوە.

کڵاوی سەر خۆم بەتاجی پادشا نادەم
کەلاوەی دووکەڵاوی خۆم بەقەسرو گەنجی شا نادەم

پلاوی سەر بەکشمیشی فەقیری یەعنی ئاسایش
خودا بێدا لە مەولا روو بەترشی شۆربا نادەم
کەلاوەی خۆم بەدەستی خۆی گولاوم لێ بپرژێنی
ئیتر حاشا وەکەللا دەس لە داوێنی سەبا نادەم
بە خوێنی جیفە بەرگی زاهیدی ئالوودەکەم شێتم
بەتەوفیقی خودا دینم بەدوو نان و عەبا نادەم
کلیلی (سابیری) قاپی هەموو مەقسوودێ هەڵدەگرێ
بیحەمدیللا بەدەس گرتوومە رەنجی خۆم بەبا نادەم

ئەم شیعرە وەسفێکی دانایینانەیە، شاعیر لە رەوشتی خۆی دەدوێ، ئامۆژگارییەکە پێویستە هەموو کەسێك گوێی لێ بگرێ و پێڕەوی بکا. هەموو ئادەمیزادێك دەبێ سەری بۆ کەس شۆڕ نەکاو زەمینە نەخولقێنی خەڵکی سەری بۆ شۆڕ بکەن. ئەم قسەیەی سابیری لە رووی جوانکارییەوە هەرچەندە شاعیرانەیە بەڵام لە رووی واقیعییەوە زمانی حاڵی خۆیەتی، واتە ئەوەی دەیڵێ تەنیا بەقسە نییە. وەکو لە مێژووی ژیانی دەردەکەوێ هەمیشە پێڕەوی کردووەو لە سەری رۆیشتووە.

***

نەجمەدین کوڕی شێخ عەبدولرەحمانی بەرزنجیی ناسراو بەسابیری نموونەیەکی دیکەی شاعیرە کلاسیکییەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمە. شیعری بەقەوارە کەم نییە، لە رووی هونەرییەوە بەرزە. لەو کاتەی بایەخی زۆری بەکێش و قافییەو زمانی شیعرو وێنەی هونەری داوە، لە بابەت و ناوەرۆکەوە سنوور کێشراوە. لە هەموو بابەت و ژانرەکانی شیعری کلاسیکی نەوتووە، لە گەڵ ئەوەشدا ئەوەی وتوویەتی بەزۆری مەبەسەکانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. ئەگەر هەموو بەرهەمی شیعری یەکالا بکرێتەوە بێ گومان لەناومەبەسی وەسف و دڵداریدا کۆ دەبێتەوە. شوێنەواری جوانکاری کلاسیکی قوتابخانەی کوردستانی باشوور لە شیعری سابیریدا روون و ئاشکرایە، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە شاعیر وەك کەسێکی دیار لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا خۆی دەنوێنی"[٨].

"* **فوئاد، ١٨٩٢ - ١٩٢٥:**

گەر دەڕۆی ئەی با بە لای خاکی مەزاری (نالی)یا
دوای سەلام ناوونیشانی من بلێ بەم ئادرەسە

*** ژیانی شاعیر:**

تاهیر کوڕی شێخ عەبدوللەتیف بێدەری بەبنەچە دەچێتەوە سەر بنەماڵەی شێخانی بەرزنجی. لەو کاتەی خۆی بە شاعیر زانیوە وشەی (فوئاد)ی هەڵبژاردووە وەك نازناوێك بۆ شیعری.

فوئاد لە ساڵی ١٨٩٢ لە شاری کەرکووك لەدایکبووە، سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت گەیاندۆتە سەر. لە پاشانا لای مەلا شێخ محەمەدی بێدەری و عەلی حیکمەت ئەفەندی سیامەنسووری هەندێ لە زانستییە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی وەرگرتووە. پێش ئەوەی کۆتایی بە خوێندنی بێنێ و نزیك بووە لە قۆناغی دوایی بەهۆی جەنگی یەکەمی گێتییەوە دەستی لە خوێندن بەردەبێ و دەکەوێتە داوی عەسکەرییەوە، بەناوی جەنگەوە لە رەشبگیرییەکەدا دەگیرێ و رەوانەی هەرێمەکانی موکریانی کوردستان و ئازربێجانی ئێران دەکرێ. لە دوای ساڵێك ئاوارەیی و دەربەدەری لە ریزی سەربازیدا رادەکا و بەهەر دەردی سەرییەك بێ دەگەڕێتەوە کەرکوك و خۆی لە گوندەکانی دەوروبەری شار دەشارێتەوە تا کۆتای جەنگ. لە ساڵی (١٩٢٢)دا فوئاد ژنی هێناوە. ماڵی لە گەرەکی بلاغی شاری کەرکووك بووە، ژیانی دارایی ماڵەوەی ئاسان نەبووە، هەندێ دەست کورت بووە. بەمووچەی خانەنیشینی دایکی ژیاوە کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییان بۆ بنەماڵەیان بڕیبوووەوە، لە گەڵ ئەوەشدا نامەخانەی لە ماڵەوە هەبووە، لە دیوەخانیدا پێشوازیی میوانانی کردووە، لە خوێندەوارو رۆشبیرو ئەدەب دۆستانی ئەو سەردەمە نزیك بووە. فوئاد زۆر نەژیاوە، لە تەمەنی لاویەتیدا سەری ناوەتەوە. لە شێخ رەئووف خاناقا بیستراوە لە ساڵی (١٩٢٥) کۆچی دوایی کردووە، هۆی مردنی ئاشکرا نییە.

*** شیعری فوئاد:**

**- شیعری لە رووی رووخسارەوە:**

شیعری فوئاد سادەو رەوانە، لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە هەندێ دوورە، برێکیش لە وشەی کوردی پەتییەوە نزیکە، یەکێکە لەو شاعیرانەی بەشدارییان لە بەپەتی کردنی زمانی کوردی کردووە لە شیعرو نووسیندا. هەموو شیعری فوئاد لە سەر بەحری عەرووزی کلاسیکییە، لە شیعریدا زۆرتر بەحری رەمەل و هەزەجی بەکار هێناوە، لەویش کەمتر بەحری موزاریع، ئینجا خەفیف و رەجەز.

زۆربەی هەرە زۆری شیعری سەر بە یەکێتیی قافییەیە. لە بەکارهێنانی دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی دەوڵەمەند نییە، ئەو دەنگانەی بەکاری هێناون ئەمانەن: ا، ت، ر، ك، م، ن، (ە- ـە)، وو، ۆ، ی، ێ. پاش قافییەی کەمە. لە شیعریدا ئەم پاش قافیانە بەرچاو دەکەون: دەکا، کورد، نییە، تۆ، لە هەموو دیوانی شیعریدا یەك دوو شیعری جووت قافییە (مەسنەوی) هەیە.

*** شیعری لە رووی ناوەرۆکەوە:**

ناوەڕۆکی شیعری فوئاد رەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردەواری پڕ لە تەنگوچەڵەمەی سەرەتای سەدەی بیستەم و دەوروبەری جەنگی یەکەمی گێتییە. شاعیر جگە لە مەبەس و بابەتە کلاسیکییەکانی کۆنی شیعری کوردی دەستێکی باڵای هەبووە لە دیاریکردنی هەندێ کردارو رەوشت و نەریتی کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی. جگە لەمە لە وەسفدا داهێنانی هەیە، تەنیا وەسفی یارو نەورۆزو بەهارو سروشتی نەکردووە، بەڵکو وەسفی گەلێ دیاردەی مەتریالی و مەعنەویش لە شیعریدا بەرچاو دەکەون.

لە کوردایەتیدا هەناسەی شیعری سوارە، شارەزایی لە

مێژووی شیعری کوردیدا هەیە. یادی نالی کردووەتەوە. بەهەڵوێستو بۆچوونی ڕای گشتیی کۆمەڵایەتی ناو کوردەواری بەرەنگاری هەتیوبازی بووە. دیارە لە شاعیرێکی کەرکووکی چاوەنۆڕی ئەوە دەکرێ بەرهەڵستی ئەم جۆرە کردەوەیە بکا لە وێنەی شیعری داشۆڕینو کراوە (ئیرۆتیك) دا دیوانی شیعری کوردی پێ بەرز بکاتەوە.

*** نموونەی شیعری فوئاد:**

**- دلداری:**

لە پارچە غەزەلێکی ئاساییدا فوئاد دەڵێ:

دڵ ئەگەر حەرفێ لە بەحسی دەردی خۆی ئیفشا دەکا
جونبوشو شۆری سەریری عالەمی شەیدا دەکا
کەس لە حاڵی غەیری خۆی نازانێ گەر ڕاستت دەوێ
ووشکە لاڤی خەڵقی دەرمانی برینت کوا دەکا
هەر لە تەعلیم خانەیی ئەتفال ئەچێ دونیایی دوون
ئەو کەسەی بێ نادیمە ئاخر لە جەوری ڕادەکا
موقتەزای فەقرە دینداری لە دونیادا بەڵێ
زاهیدی مسکین لەبەر ناچاری ڕوو لە خوا دەکا
حوسنی ئەشعارم لە حوسنی تەبعە ئەی (فوئاد)
نۆکەری شایستە کەسبی سیرەتی ئاغا دەکا

شاعیر هەواییێکی دانایانەو پەندو ئامۆژگاری داوەتە ئەم لیریکە، زۆربەی وێنەکانی شیکردنەوەی داهێنانی شاعیرە کلاسیکییەکانی پێش خۆیەتی.

لە چوارینێکیدا فوئاد دەڵێ:

سەبا شەرحی دڵی زارم بەرە بۆ حەزرەتی یارم
کە بێ فیردەوسی دیدارت لە ناری دووری دیدارم
لە گەڵ ڕۆژی جودایی تۆ دڵو جان بوو جودا هەردوو
ئەگەر جەمعی نەبێ وا زوو ئیتر کوژراوەکەی یارم

لەم شیعرەدا خوێنەر کە هەواڵی فوئادی کوژراوی یاری دەکەوێتە بەرگوێ، نالییەکەی کوژراوی پێراری دێتەوە یاد. نالی لە لیریکێکیدا دەڵێ:

هەموو ڕۆژی لە تاو هیجرانی ئەم ساڵ
تەمەننای مردنی پێرارە بێ تۆ

فوئاد بە خەیاڵ زۆر لە گەڵ نالیدا ژیاوە. ئەگەر ئیلهامی (یاری) خۆی بەشێوەیێکی ناڕاستەوخۆ لە (پێرار)ە کەی نالی وەرگرتبێ لە شیعرێکی دیکەیدا ڕاستەوخۆ یادی نالی دەکاتەوە:

ئەو کەسەی وا بێکەسە مادام خودا بۆ ئەو کەسە
بۆ دەڵێن بێکەس بە بێکەس خۆ هەر ئەو ساحیب کەسە
هەر زماندارن لە دەس ئەهلی زەمان فەریاد ئەکەن
بێ هەراو ئاسوودە ڕاستی گەر کەسێ بێ ئەخرەسە
سەد هەزار پەندو نەسیحەت بۆ نەزان سوودی نییە
ئەو کەسەی ساحیب شوعوورە یەك ئیشارەی بۆ بەسە
حاڵی دڵ مەکشووفی دەرکی کۆتەهی هەر کەس نییە
گەوهەری دەریا لە کوێ هەر مەسهودی خارو خەسە
بێ ئەمەل بێگانەیەکی تۆی دەوێ داینێ بەکەس
گەر برات بێگانە مەشرەب بێ لە گەڵتا ناکەسە
گەر دەڕۆی ئەی با بەلای خاکی مەزاری (نالی)یا

دوای سەلام ئاوونیشانی من بڵێ بەم ئادرەسە
وا (فوئاد) ناوێ لە کەرکووکا وەکیلی ئەزمتە
دا ئەڵێی موڵکی ئەدەب ئێستا لە کوردا بێ کەسە

فوئاد لەم شیعرەدا سەرکەوتووانە لە ئاسمانی گێتیی خەیاڵی نالی باڵەفرێ دەکا. دەڵێی وێنەی هەندێ لە شیعرەکانی دەکێشێ، یا برێ ماناکانی ئەو لێك دەداتەوە. لە دواییدا دڵسۆزانە مووچڕکی خۆشی لە ناخی دەروونی خوێنەردا دێتە جۆش کە فوئاد با دەکا بەتەتەرو دەینێرێ بۆ لای نالی بۆ ئەستەموول تا پێی بڵێ فوئاد ناوێك لە کەرکووك وەکیلی شیعری تۆیە بۆ ئەوەی خەڵکی نەڵێن مەملەکەتی ئەدەبی کوردی ئێستە بێکەسە.

**- وەسف:**

لە وەسف نەورۆزو بەهارو سروشتی کوردستانو هەندێ دیاردەی مەتریالی کۆمەڵایەتی فوئاد سەرپشکەو توانیویەتی بەرهەمی بەرز دابهێنێ. لە قەسیدەی وەسفی نەورۆزو بەهاردا دەڵێ:

موددەتێ بوو دوژمنی کافر وەکو فەسڵی شیتا
ئیستیلایی موڵکی شادی کردبوو هەروەك بەلا
ڕەعدو بەرقو تەرزە تا بوون موتتەفیق وەك باڵقان
دەوڵەتی بەزمو سەفا مەغدوور بوو میسلی تورکیا
هات شوکور هەروەك عەرەب جەیشی دلێری ئیعتیدال
لەشکری سەرمای شکاند وەك عەسکەری ئیتالیا
قووەتی بوو هاتە ناو بەحری فەزا جەیشی بەهار
دای بەسەر کەشتی نەو هەروا (درید نۆت)ی سەبا
بۆ بەشارەت دانێ نەورۆزێ مورەخخەس بوو نەسیم
شاهی عوسمانی بەهار ئیعلانی شایی سوڵحی دا
میحنەتی زستان موبەددەل بوو بە سەیرانی ڕەبیع
فەرشی ڕەنگاوڕەنگ لە دەشتو کێوو سەحرا ڕاخرا
خەلعەتی دیبایی سەوزیان کردە بەر جوملەی درەخت
باغ بەسەد زینەت هەموو لایەکی ئارایش درا
حوللەیی ئەلوانیان پۆشی عەرووسانی چەمەن
عەندەلیبان دەستیان کردە تەغەننیو نەوا
پاڵی داوە شاهیدی گوڵ وا لەسەر تەختی تەرەب
زولفی دادێنێ بەشانەی نەشئە بەربووکی هەوا
هەر دەڵێ زاوایە ڕاوەستاوە عەرعەر مونتەزیر
شۆرەبیش وەك بووکی عەییارە لە بەریا ناز ئەکا
هەر حەدیقەی مەجلیسی بەزمێکی جانانە مەگەر
بۆیە سیسەمبەر لە تەرقی جۆگە هاتووەتە سەما
نێرگس هەروەك بادەخۆرێ تازە هەڵسا بێ لە خەو
لالە ساقی جام بەدەستەوا مەیی بۆ تێدەکا
بۆنی ڕەیحانو گوڵو میسكو عەبیرو زەعفەران
هۆش لە کەللەی هوشیارو دڵ لە ئەهلی دڵ دەبا
سەوتی قومریو زەمزەمەی سازو سروودی عەندەلیب
هۆش بەمەستو خەو بەبێدارو بەنوستوو یەقز ئەدا
ڕۆژی نەورۆزە زەمانی ماتەمو ئەندۆه نییە
وەختی یاریو کەوشەکە ئەییامی سەیرانەو سەفا
فرسەتە گەشتو تەفەڕڕوج مفتە عیشرەت بۆ کەسێ

یارو ئەحباب و رەفیقێکی هەبێ لەم رۆژەدا
چاوەڕێی تەشریفی یارانێتی دەشتی چوارباغ
حازرە بۆ بەزمی سەحرا تاقم و ئەربابی چا
بالە دەست خۆمان نەدەین رۆژێکی وا خۆش و عەزیز
وا موهەییاین ئێمە تۆش تەشریف بفەرموو میرزا

لە سەرەتای ئەم شیعرەدا ئاماژە هەیە بۆ شەڕی بەلقان و دەوڵەتی عوسمانی. بێ گومان شاعیر لایەنگری عوسمانی بووە، ئەم کردەوەیە هەر چۆنی بێ ئاسایی بووە و لە سۆزی ئایینییەوە هەڵقوڵاوە. هەروەها باس لە جەنگی ئیتالییەکان دەکا لە دژی عەرەبی لیبیا و دەوری کەشتییەکی سوپایی تورك بەناوی (درید نۆت)ەوە لەو جەنگەدا دەخاتە ڕوو. شاعیر هەوڵ دەدا هەورەتریشقە و تۆفی زستان بەتەق و هۆری چەکی ئەو بچوێنێ. لە پاشانا هەموو ناخۆشیی زستان دەبێتە مایەی جوانی و رەنگینی بەهار. ئیتر شاعیر دەکەوێتە وەسفی گوڵ و گوڵاڵە و درەخت و دەوەن، ئاوازی پڕ نەوازی باڵندە، وێنەی لووتکەی خۆشی و بەزم و رەزم و سەیران لە رۆژی نەورۆزی پیرۆزدا دەکێشن.

لە لیریکێکیدا فوئاد دیمەنی زستان بەگرژو ناشیرین لە قەڵەم دەدا:

ئۆف لە دەس فەسلی زەمستان و قوڕو چڵپاوەکەی
ئۆف لە دەس هەورو بلێسە و گرمە و ناڵانەکەی
ئۆف لە دەس سەرما وددان لێکدانەوەو لە رزینەوەی
ئۆف لە خۆهەڵکردن و پیس بوون و قوڕ شێلانەکەی
ئۆف لە دەس جەوری قوڕو چڵپاوو جلق و فلقەکەی
ئۆف لە پرشنگ لێ پەڕین و کەوتن و هەڵسانەکەی
ئۆف لە مل پێچان و کۆکین و هەلاّمەت گرتنی
ئۆف لە پژمین و چڵم لووشین و لووت گێرانەکەی
تالیی سەرمایی رۆژی ناهێڵێ بەزمی شەوێ
تف لە شەو دانیشتنی بێ عیشرەت و سەیرانەکەی

لەم لیریکەدا فوئاد هەموو نیوە دێرەکانی جگە لە دێری دوایی (دوو نیوە دێری دوایی). بەوشەی (ئۆف) دەست پێ دەکا، ئەم دیاردەیە وەکو ئەوەیە یەکێتیی قافییەیەك، یا پاش قافییەیەك، لەم شیعرەدا هەبێ، نەك لە سەرەتای دێر بەڵکو لە کۆتایی. لە مێژووی ئەدەبی نەتەوەکانی گێتی ئەوە هاتووە گۆیا لە ئەدەبی یابانیدا جۆرە لیریکێك هەیە قافییەی لە سەرەتای دێری شیعر دایە. دیارە ئەم شیعرەی ئێمە هیچ پێوەندییەکی بەوەوە نییە.

لەم شیعرەدا فوئاد لە کەژی زستاندا دیمەنی سەخت و ناشیرین دەبینێ وەکو سەرما و قوڕو چڵپاو کۆکین و هەلاّمەت و پژمین و دیاردەی دیکە، ئەمە ئاوڕدانەوەیێکی کۆمەڵایەتییە و لە جوانکاری بەدوور نییە، ئەگەر نا ئەدگارە سروشتییەکانی زستان سەرچاوەیەکی دیکەن بۆ وێنەکێشانی دیمەنی زستانی پڕ لە خۆشی و گەشبینی.

لە قەسیدەیێکیدا بەناوی (شایی حەمەشینی شەحەڵی) وەسفی شایی و زەماوەندی ژنهێنانێك دەکا:

واز لە ئەوزاعی زەمان بێنە بەس ئەو دەردی سەرە
خۆڵی میحنەت رادە گەر مەردی بەگەسکی مەسخەرە
تیغی غەم جەرگی بڕیم ئەی تیری غەمزەی چاوی یار
بۆ خودا ساقی نەجاتم دە لە دەس ئەم کافرە
ئەی خەیاڵی هیچ و پووچ ئاخر دەمێ لێم دوورکەوە
تۆش بەرۆکم بەردە ئیتر ئەی غەمەی دڵ کونکەرە
سەر لە پەردە بێنە دەر ئەی دڵ بڕۆنە دێی شەحەڵ
ئارەزوویی جەننەت ئەمرۆکە لە یادی خۆت بەرە
وەك بەهەشت هەر لا تەماشاکەی هەموو ژوور و دەری
چون بە جون غیلمانە سەف سەف حۆریی مەهپەیکەرە
هەڵپەڕینە و رەشبەڵەك تێکەڵ بەیەك بوون پیاو ژن
عالەمی ئازادی ئیحیا کردووە ئەم مەنزەرە
ساحیبانی ئەمرۆ نەهێن ئەمرۆ زورنا و دەهۆڵ
ئەم دەڵێ ئەی غەم نەیەی ها ئەو دەڵێ شایی وەرە
تەرف و بەزمێکە کوڕو کچ دەس لەناودەستی یەکا
ئەم بەسیفەت هەر دەڵێ لاولاوە ئەو وەك عەرعەرە
سوورەتی باغی سەفایە هەیئەتی ئەم شاییە
پەنجە بۆ دیواری قەسری عەیشی بووەتە پەنجەرە
هازی جەنناتون ئەگەر بێرە بووتریێ لایقە
هەر کوڕە ئەم شان و ئەو شانی کچی تازەو تەڕە
کچ چ کچ هەر دیتنێکیان خەرجی سەد فەرخاری چین
بۆسەیەکیان قیمەتی وەسڵی بوتانی خاوەرە
قەترە قەترە لوئلوئە دەتکێ لە روویی مەهوەشان
یا لە بۆ گەرمای عەرەق دەرژێنێ وەردی ئەحمەرە
سمت و سینە قەدد و خەدد و جیسمی ساف و زولفیان
زیوو شیشەو سەر وو لالە یاسەمینەو عەنبەرە
هۆش لە کەللەو دڵ لە سینە دین لە دڵ دێنێتە رەقس
هارەیی لوولەو خرە خرخاڵ و زرەی کەمبەرە
گەر خەزێمە کرمەکە گەر گوارە وو لاگیرەیە
بۆبرینی جەرگ و دڵ کامەی بڕۆنی خەنجەرە
خامەك و خارا وو ئەتلەس مەخمەرو تاقەو قەنەوز
هەر وەکو تاووس لە بەریانا ئەڵێی باڵ و پەرە
گەرچی بێ میسلن هەموو ئەمما وەکو یارم (فوئاد)
کێ وەها چاو مامزە ئیمان دزەو غارەتگەرە
سینە بوستان غونچە پوستان نازەنینەو ناسکە
دڵ فریب و دڵ شکێن و دڵ نەوازو دلبەرە

فوئاد ئەم قەسیدەیەی لە ساڵی (١٩٢٢) نووسیوەتەوە. تێیدا وەسفی ئەو شایی و زەماوەندە دەکا بۆ کەسێکی گوندەی شەحەڵ لە دەشتی هەولێر گێراویانە بەهۆی ژنهێنانییەوە ناوی حەمەشین بووە. فوئاد سەرنجی ئەو کوڕو کچانەی داوە دەستیان خستووەتە ناو دەستی یەکەوە لەناوشایی رەشبەڵەکدا لە دەشتی هەولێر، ئەو حۆری و غیلمانانە مەستی هەوەسی دڵدارین و شاعیریش وێنەی جوانی ئەندامی لە شیان و رەوت و نازو نووزی پڕ لە خۆشەویستییان دەکێشێ.

سەماوەر خەیاڵی شیعری فوئادی بزواندووە:

ئەنیسی قەلبی غەمبارە سەماوەر
رەفیقی ساحیب ئەسرارە سەماوەر
نەدیمە چاپەزو مەی چایی گوڵرەنگ
پیاڵە ساقییە یارە سەماوەر
وەزیرە چاپەزو عەسکەر پیاڵە
بەئەمری چا حوکمدارە سەماوەر

ئەو ئامێرەی بەناوو ناوەرۆك رووسەو لە رووسیاوە گەیشتووەتە لای ئێمەو بەدرێژایی رۆژگار بووە بەکورد، دەورێکی گرنگی بووە لە ژیانی کۆمەلایەتی خێزان و بنەمالەی کورد لە شارو گونددا. شاعیر هونەروەرانە چاپچی دەکا بەنەدیمو پیالە دەکا بەمەیگێرو سەماوەریش دەبێ بەیاری نازدار، یا چاپچی دەبێ بەوەزیرو سەرلەشکرو پیالەش بەسەرباز.

* شیعری گراوە (ئێرۆتیك):

لە شیعرێکیدا فوئاد بەم جۆرە لە شەوی ناوپەردەو بەزاوابوون دەدوێ:

بەربووك لە سەری واجبە گەر باکیرە بێ بووك

بەو نەوعە بەگوێیدا کە وەکو قەل بقرێنێ

بەرخم شەوی وەسلت مەدە رێکەی خەوی غەفلەت

رێوی مەبە زاوا کە وەکو شێر دەنەرێنێ

ئەوساکە هەلیدایەوە پەردە بکەوە خۆت

ووریا بە کە زوو پەردەیی عیفەت نەدرێنێ

ئەوە سوورەیی یەك چاو کە حەمدان لەقەبیێتی

مارێکە گەزەندە سەدی وەك تۆ ئەترێنێ

چاری بکە پێش دیتنی کون چونکە کە دیتی

سەد داوی لە رێ داینرێ دەیپچرێنێ

زوو جوورەیی خۆتی مەخە بەردەست و بترسێ

لەو بازەکە بۆ گرتنی جوورەی دەقرێنێ

ئەبرۆتە کەمان لنگە کەمێن زولفە کەمەندت

جادوێکە چاوت کە دووسەد دل دەفرێنێ

ئەو نێزە وو گورزەی هەیە تۆش شیرو خەدەنگت

ئازابە دەماری تۆ مەبادا کە دەرێنێ

مەیدانی نەبەردە ئەمە بازی نییە زینهار

دۆستت ئەوەیە رۆلە کەوا تۆ دەگریینێ

شاعیر بە بۆنەی شایی و ئاهەنگی بووك گواستنەوەی شێخ عوبێوللای کوری سەید عومەری خانەقا ئەم شیعرەی وتووە. رووداوەکە لە گوندی شەحەل لە دەشتی هەولێر بووە. ئەو پەندو ئامۆژگارییەی شاعیر بەدەمی بەربووکەوە بە گوێی بووکدا دەچرپێنێ دیمەنێك دروست دەکا شەوی ناو پەردەی بووك و زاوا دەبێتە گۆرەپانی شیربازی لەنێوان زاوا کە دەیکا بەیەکێك لە سوار چاك و چەکمە رەقەکانی سەدەکانی ناوەراست و بووك دەبێ بەیەکێ لە ئەمازۆنەکان، ژنە قارەمانەکان ئەفسانەی ئەورووپاییان. بەلای شاعیرەوە زاوا لە بووك بە هێزترە، لەبەر ئەوە ئامۆگاریی بووك دەکا لەو زۆرانبازییەدا بە گوێی بەربووك بکا بۆ ئەوەی لەم جەنگەیدا سەربکەوێ. لە رووی جوانکاری شیعرییەوە فوئاد دیمەنێکی هۆنراوی رەنگینی دروستکردووە. بەشێوازێکی کۆمیدییانە لە هەلوێستێکی باوی ناو کۆمەلی کوردەواری دەدوێ.

لە لیریکێکدا فوئاد هێرش دەباتە سەر هەتیوبازان و بەم جۆرە دایاندەشۆرێنێ:

چەند کەسێ هەن کە تالیبی لووسن

لووسن و بێبەش لە عەرزو ناموسن

رەندو قەللاش و قەلتەبان مەشرەب

حیزو نامەردو پیس و چەپلووسن

جوملە بێ دین و فاسق و غەددار

خەرقە پۆشانی بەرگی سالووسن

گاهێ مەحزوونن بە خوێندنی قورئان

گاهێ مەفتوونی سەوقی ناقووسن

زەن سروشت و عەجووزە کردارن

پیشە دەللالن و زمان لووسن

دەرحەق رۆلەیی موسولمانان

بێ ئیمانتر لە کافری رووسن

بۆ لوغاتی زمانی شەیتانی

هەریەکە یەك سیحاح و قامووسن

تف لە ئەتوارو خیلقەت و خوویان

لەو کەسانەش بەوان کە مەئنووسن

ئەی (فوئاد) ئەهلی غیرەت ئەم هەجوە

گەر ببینن دەم و دەس ئەینووسن

ئەم شیعرە لە هەندێ رووەوە وەکو شیعری شێخ رەزایانەیە. شێخ ئابرووبردنی خەلکی لە داشۆرینەکانیدا ناوی دەهێنان. شاعیری ئەم ماوەیە لە رووی ئایین و رەوشت و نەریتی کۆمەلایەتییەوە تەماشای مەسەلەکە دەکا و هەتیوباز بەبێ شەرم و ئابروو دەژمێرێ.

لە شیعرێکیدا فوئاد بەتەواوی شێوازی شێخ رەزا بەکار دێنێ:

ئەوی رۆمی بێ ئیسمی گەورە چووك

هەموو ژن قەحبەن و گەووادو مەنیووك

لیواتە مەزهەب و دینیان لیواتە

رەسوولیان مێ کیتابیان قینگی بێ تووك

ئەو سیفەتەی فوئاد دەیداتە پال رۆمییان (تورکان) جنێوێکی بازارییە، لەناوکۆمەلی کوردەواری و کۆمەلانی دیکە باوە، وەکو پەندێکی پێشینان کەوتووەتە ناوەوەو بەهیچ جۆرێ کوردی پێ تاوانبار ناکرێ. وتەکە کۆمیدیانەیە وەکو قسەیەکی قۆشمە بۆ پێکەنین بەکار دەهێنرێ. ئەوەی شایانی باسە لەم ماوەیەدا ئەوەیە هەموو نەتەوەکانی هاوسێی کورد لە عەرەب و تورك و عەجەم و ئەرمەن و ئازەری ئەوانیش وتەی لەم بابەتانەو خراپتریشیان هەیە بەرامبەر بەیەکتری و بەرامبەر بە کوردیش.

* کوردایەتی:

بیروباوەری کوردایەتی لەنێوان هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەم لە دیوانی شیعری فوئاددا جێگەی دیاری هەیە.

بەهۆی سەرنەکەوتنی خەبات و راپەرینەکانی کورد بەسەرۆکایەتی شێخ مەحموود شاعیر دەلێ:

خودا غەزەبتان لێ گرێ ئەی کوردەکان

جامی مەقسەد هاتە دەست و رشتتان

قفلی دەرگاهی ئومێدتان کردەوە

بۆچ بەدەستی کینە داتانخستەوە

لازمی دەوری تەجەددود بوو مەگەر
وەحشەتی کۆن تازەکەن بۆ یەك دیگەر
خاکی داگرتوون وەها درکی نیفاق
جێی نییە بڕوێ گوڵێکی ئیتتیفاق
ئێوە وا پەروەردەکەن بوغزو غەرەز
کێیە غەم خۆرتان ببێ غەیری مەرەز
وا پڕی دڵتانە میقرۆبی حەسەد
رەحمەتە بۆ ئێوە چاکی تا ئەبەد
گەرچی دەشزانم قسەم فایدەی نییە
کوردمو شین کردنم نا چارییە
گەر دەزانم قیسسە تەئسیری دەبێ
هەر بڵێم شەرت بێ وەکو نالەی حەبێ

فوئاد ئەم شیعرەی لەسەر بەحری رەمەلی عەرووزی داناوە، لەسەر بنچینەی جووت قافییە (مەسنەوی). لە لیریکەکەدا شاعیر هەڵسوکەوتی خراپی کورد خۆی دەکاتە هۆی سەرنەکەوتنی کۆششی شێخ مەحموود بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی. راستییەکەی ئەوە نییە، بەڵکو سیاسەتی ئەمپریالیستی بەریتانیا لەپێناوی بەرژەوەندی خۆی پاڵپشت بوو لە گەڵ بەرژەوەندی کاربەدەستانی عێراقو چینەکانی سەرەوەی سلێمانی لە دەوڵەمەندانو دەرەبەگەکان، ئەمانە هەموویان یەکیان گرتبوو، ئەوەی گرنگە ئەمانە لە کەموکورییەکانی بەڕێوەبەرایەتی شێخ مەحمود دەگەڕان دیارە ئەمانەش کەم نەبوون، ئیتر ئەم هەموو کردەوەو کردارنە بەسەرییەکەوە بوون بەهۆی ئەوەی کورد نەگاتە ئامانجی. ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ ئەم هەموو هۆیانە تەنیا بزووتنەوەی شێخ مەحموودیان نەگەیاندە قۆناغی بەزین، بەڵکو هەموو هەڵسانەکانی دیکەی کوردیش بەم دەردە لە ناوچوون. لەگەڵ ئەوەشدا گازاندەی ئەم شاعیرە لە خەڵکی کورد لە دڵێکی پڕ سۆزو خۆشەویستییەوە هەڵقوڵاوە، هەر چۆنی بێ دەبوو شاعیر هۆیەك بۆ سەرنەکەوتن بدۆزێتەوە، ئیتر میللەتی بەرکەوت، لەناوئەمانەشدا مەبەس دەوڵەمەندو دەرەبەگەکانە.

لە شیعرێکیدا فوئاد بەهۆی دەرچوونی کۆواری (هەتاوی کورد) لە ئەستەموول دەڵێ:

شەوی غەفلەت بەسەرچوو خوابی ئاڵۆز تابەکەی ئاخر
هەتاو هەڵهاتو شوعلەی ئینتیباهی دایە چاوی کورد
لە شوومیی و کەسالەت گەرچی بەسرابوو شوکور وا بوو
بە میفتاحی سەعی دەرگەی ئومێدی داخراوی کورد
لە سایەی حەزرەتی سوڵتان محەمەد خانەوە ئیمرۆ
بیحەمدیللا لە ئەوجی ئیفتیخارایە کڵاوی کورد
ئەگەرچی مەزهەری ئیلتاف لا یوحسان ئەمێستاکەش
رجا وایە بەجارێ غەرقی مینئەت بن تەواوی کورد
شەهەنشاها جیهاندارا ئەیا سوڵتانی بەحرو بەر
بەمۆمیایەکی لوتفت بەستەیە قەلبی شکاوی کورد
مەتابیع وا لە دونیا عالەمی ئاساری ئیحیا کرد
نەما ئاساری خەتتی غەیری ئاساری نەماوی کورد
هەمم کاروانی ئەربابی قەڵەم گەر حەز کەن ئەینووسن
لەناو ئەوراقی ئیقبالا وەکو ناوی سراوی کورد
لە مەیدانی سەحائیفدا ئەبەد ساحیب سەبق نابین
هەتا یەك مەتبەعە لێرە گوشاد نەکرێ بەناوی کورد

شاعیر زۆر گوشادو خەندانە بەوەی چاپەمەنی بەناوی کوردەوە پەیدا بووە. باش دەزانێ کۆوار نیشانەی پێشکەوتنە سوپاسی سوڵتانی عوسمانی دەکا کە رێگەی بەبڵاوکردنەوەی ئەم کۆوارە داوە. بەلای شاعیرەوە دەرچوونی کۆوارەکە دان نانێکە بەمافی کورد. ئەم بۆچوونەی شاعیر تا پلەیەك راستی تێدایە، چونکە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بیروڕایان لە بابەت کوردو هەموو خەڵکانی ناتورك لە دەوڵەتی عوسمانیدا وەکو بیروڕای کاربەدەستە شۆڤێنییەکانی تورك نەبووە بەسەرۆکایەتی مستەفا کەمال. نویشکی بیروڕای شاعیر لەم لیریکەدا ئەوەیە ئەگەر کورد کۆواری نەبێ پێش ناکەوێ.

تاهیر فوئاد شاعیرێکی رەندو خاوەن شیعری داهێنراوی نەوەی دووەم یا سێیەمی قوتابخانەی نالییە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا شیعری رەنگدانەوەی ژیانو هیواو ئامانجی سەردەمی خۆی بووە. بابەتەکانی کەم نەبوون. لە زۆربەی مەبەسو هونەرەکانی شیعری کلاسیکی بەرهەمی هەبووە. ناوەرۆکە کۆنو تازەکانی هەیە، هەندێ جار تێکەڵی یەکتری کردوون. کێشی پڕ ئاوازو ریتمی ناسكو وشەی کوردی پەتی هارمۆنیایەکی نەرمو رەنگینیان داوەتە شیعری. وێنەی راستەقینەی کۆمەڵایەتی کوردو جەوهەری رەسەنی خەڵکەی کەرکووكو هەموو گەرمیان بەگشتی لە دیوانی تاهیر فوئاد رەنگیان داوەتەوە"[٩].

"* **ئەسیری (اثیری) (١٨٩٥ - ١٩٦٢):**



لاوی کوردی من لەبەرکە شاڵی زاخۆو ئامێدی
گەر تو سەد چاتر لە ڕەنگی شاڵی کرمانت دەوێ
هەڵسە گەشتی چیمەنو گوڵزاری کوردستان بکە
گەر لە بۆ دەردی دەروونت داوو دەرمانت دەوێ

*** ژیانی:**

عەبدولخالق کوڕی سەید حوسێن ئەفەندی مورشیدی تەریقەتی نەقشبەندی، لە ساڵی (١٨٩٥) لە کەرکوك لەدایکبووە، سەرەتای خوێندنی لە مزگەوتی (حاجی ئەحمەد ئاغای مستەفا ئاغا) لای (مەلا محەمەدی وەستا فەتاح) بووە. بۆ تەواوکردنی پرۆگرامەکانی خوێندنی ئایینی لە ساڵی (١٩١٣) ڕووی کردووەتە هەڵەبجەو ناوچەی جوانڕۆو بانەو سەقزو سنەو چوڕ، لە دواییدا گەڕاوەتەوە کەرکوك‌و لای (مەلا عەلی حیکمەت)و دوا قۆناغی خوێندنی تەواو کردووەو ئیجازەی دوانزدە زانستییەکەی ئایینی ئیسلامی وەرگرتووە. لە پاشانا چووە بۆ ئەستەمبوڵو لەم گەشتەیدا بەیرووت‌و ئیزمیری دیوە. ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو شارانە کاری گەورەی کردووەتە سەر بیری‌و کەتووەتە بەراوردکردن لەنێوان پێشکەوتوویی ئەوانو دواکەوتوویی کورد. ئیتر بڕیاری داوە هەر شیعرێکی دڵداری تا ئەو کاتە نووسیبێتی هەمووی بسووتێنێ‌و تەنیا شیعری نیشتمانپەروەری‌و بیری کوردایەتی بنووسێ، لە ساڵی (١٩٢١) لە گەشتی ئەستەمبوڵ (شێخ عەبدولقادری شێخ عوبێدوڵڵای نەهری) دیوە.

(ئەسیری) لە ساڵی (١٩٣٥) بە مووچەخۆر لە دادگای شەرعیی کەرکوك دامەزراوە، لە پاشانا لە ساڵی (١٩٤٣) بووە بە باشکاتبی کارگێڕی ماڵی قاسیرین لە کەرکوك تا ساڵی (١٩٥١)، لەو ساڵەوە بۆ جاری دووەم گەڕاوەتەوە دادگای شەرعی، لەم کارەدا ماوەتەوە تا ساڵی (١٩٥٨) خانەنشین کراوە. (ئەسیری) ژنی نەهێناوە، ماڵی لەناوخانەقا بچووکەکەی بووە لە گەڕەکی (ئاخوڕ حوسێن) لە کەرکوك. ژیانێکی ساکاری قەلەندەرانەی بردۆتە سەر، لەو کاتەی مووچەخۆری میری بووە کاری کشتوکاڵیشیی کردووە، لە ساڵی (١٩٦٠) تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بووە لە قوڕگی تا لە ڕۆژی (١٨)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوك کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (شێخ محێدین) نێژراوە.

*** شیعری:**

وا باوە لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا (ئەسیری) لە سەرەتای ماوەی شیعری وتنی خەریك دڵداری‌و بابەتەکانی دیکەی شیعری کلاسیکی بووە، کە لە ئەستەمبوڵ گەڕاوەتەوە ئەم بەرهەمانەی هەموو سووتاندووەو لە ساڵی (١٩٢١) بەم لاوە بڕیاری داوە شیعری تەنیا بۆ نیشتمانپەروەری‌و کوردایەتی تەرخان بکا.

لە شیعریدا هەست بە هەندێ خەوشی تەکنیکی و کەموکووڕی مەرجەکانی شیعر دەکرێت، وەکو لەنگی لە کێش‌و هەڵە لە قافییە، ئەمە پێوەندی بە گوێی مۆسیقی شاعیرەوە هەیە. لەم لایەنەوە (ڕەفیق حیلمی) لەسەر ئەو باوەڕەیە عەشقی نیشتمان (ئەسیری) کردووە بە شاعیر، واتە خۆڕسك نییە، بەڵکو ئەوەی لە مێشکی دایە هانی داوە بە شیعر بیڵێ، ڕەخنەگرە کۆنەکان (کەسبی) پێ دەڵێن، واتە پێویست کردوویەتی بە شاعیر نەك ئیلهام‌و خەیاڵ ئەوەی ڕەخنەگرە کۆنەکان (وەهبی) پێ دەڵێن.

*** شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە:**

(ئەسیری) لە هەردوو بابەتە شیعری عەرووزی‌و خۆماڵی هەیە لە ڕووی کێش‌و قافییەوە، زۆربەی شیعری لە یەکەمیانەو کەمتری لە دووەمیانە، لە شیعری عەرووزیدا ئەم بەحرانەی بەکارهێناوە: ڕەمەل، هەزەج، ڕەجەز، موزاریع، موتەقاریب، خەفیف، سەریع، بەسیت، موجتەس.

(ئەسیری) یەکێکە لەو شاعیرانەی زۆرترین بەحری عەرووزیان لە شیعری کوردیدا بەکارهێناوە، بە گشتی ئەو شیعرانە لەسەر سیستەمی یەکێتیی قافییە ڕێکخراون، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ جار جووت قافییە (مەسنەوی)شی بەکارهێناوە، دەنگەکانی قافییە لە شیعریدا زۆر نین، ئەم دەنگانە دەکەونە بەرچاو: ا ت د ر ش ل م ن و وو ۆ (ە – ـە) ی ێ، ئەم پاش قافیانەش لە شیعریدا دەبینرێن: دەوێ، بوو، تۆ، بڵێ، کرد، بێ، من، نییە، ئەبێ، هەیە، کورد، گورد.

لە شیعری خۆماڵییدا بە زۆری کێشی دە بڕگەیی بەکارهێناوە لەگەڵ جووت قافییە، بڕێکیش لەو شیعرانە لەسەر یەکێتیی قافییە دانراون، بە گشتی شیعری لە ڕووی ژمارەی دێرەوە کورتن، لە دوازدە دێر کەمترن، بۆیە دەچنە ناو بابەتی لیریکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ قەسیدەی بابەتی پۆیەمی هەیە، چەند قەسیدەیەکی بەندی چوارینیشی هەیە لەسەر

قافییەكانی (ا ا ا ا)، (ا ا ب ا)، (ا ب ج ب) هەروەها قەسیدەی بەندی شەشی لەسەر قافییەی (ا ا ا ا ب ب)، زمانی شیعری ئاسانە، زمانەكەی تا رادەیەك كوردی پەتییە، وێنەی داهێنراوی ڕەوانبێژی لە شیعریدا زۆر نییە.

*** شیعری لە رووی ناوەرۆكەوە:**

زۆربەی شیعری (ئەسیری) لە نیشتمانپەروەری و بیری نەتەوەیی دەدوێ، بایەخی زۆری بە شیعری ئایینی داوە (موناجات و نعت)، شیعری ستایش و دانایی و شیوەن و ماتەمنامەی هەیە، لە وەسفدا شیعری پێداهەڵدانی سروشتی كوردستانی زۆرە، بەڵام شیعری دڵداری نییە، بووكی شیعری نەبووە تا وەسفی بكا، شاعیر ستایشی هەندێ كەسی دیاری ناو كۆمەڵی كردووە، لەوانە (سەید تەهای نەهری، ئەمین زەكی، بێكەس، مەلا محەمەدی كۆیی، بابا، عەلی بەرزنجی، عەبدولرەحمان بەگی تاپۆ، رەشید عالی گەیلانی، جگەر خوێن)، هەروها ماتەمنامەی بۆ باوكی خۆی و (سالح زەكی ساحێبقران) و (پیرەمێرد) و (شێخ محەمەد كەرەدان) هەیە.

*** نموونەی شیعری:**

نموونەی بە پێزی شیعری ئەسیری بە زۆری لە شیعرە نیشتمانپەروەری و كوردایەتییەكانیدا دەدۆزرێنەوە.

لە سرووودێكی نیشمانیدا ئەسیری دەڵێ:

بێرە كوردستان عەزیزم گەر تو سەیرانت دەوێ
بتبەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری كوێستانت دەوێ
سەیری ئەو خێڵانە كە نیشتوونە داوێنی چیا
بابچین بۆ ماڵی كوردێ گەر تو خوێشانت دەوێ
بتبەمە پای تاقی لای سەپیل و سەرمیل و كرند
پێت پیشاندەم سەد هەزار ئاساری ساسانت دەوێ
ئاوی ساف و رۆشنی داوێنی چەشمانی چیا
لێی بنۆشە دەم بە دەم گەر ئاوی حەیوانت دەوێ
لاوی كوردی من لەبەركە شاڵی زاخۆ و ئامێدی
گەر تو سەد چاتر لە رەنگی شاڵی كرمانت دەوێ
هەڵسە گەشتی چیمەن و گوڵزاری كوردستان بكە
گەر لەبۆ دەردی دەروونت داوودەرمانت دەوێ
رووح و ماڵت سەرفی رێگەی میللەتت كە رووحەكەم
گەر لە خوا لوتفی عەمیم و جوود و ئیحسانت دەوێ
ئەی (ئەسیری) هێندە عیشقی میللەتی كوردت هەیە
بشمری لام وایە قەبری گردی سەیوانت دەوێ

ئەم شیعرە نموونەیەكە لە شیعرە جوانەكانی (ئەسیری) لە بابەت وەسفی سروشتی كوردستانەوە، لەم شیعرەو لە بەشێكی زۆری بەرهەمیدا یادی ناوی جوگرافی و تیرەو هۆزو عەشرەتەكانی كورد دەكاتەوە.

لە سییەكان و چلەكانی سەردەی بیستەم لە رێكخراوی بەچەكەشێرانی پارتی هیوا ئەم سروودەیان بە ئەندامە منداڵەكان لەبەر دەكرد بۆ بەهێزكردنی گیانی نەتەوەیی و پاراوی زمانی زگماك، لە دوای دەرچوونی كتێبی (شیعرو ئەدەبیاتی كوردی) رەفیق حیلمی لە ساڵی (١٩٤١) دەرچووە لە قوتابخانە كوردییەكاندا هەندێ لە مامۆستایان بۆ وانەی زمانی كوردی ئەم سروودەیان كردبووە سەرچاوە.

(ئەسیری) لە دژی شیعری دڵدارییە:

گەر ئەدیبی و ئارەزووی سەركەوتنی كوردت هەیە
تەركی ئەشعاری عیشقبازی كە گەر بیرت هەیە
شیعری تەئریخی بلێ بۆ ئینتیباهی میللەتت
مورشیدی عیلم و مەعاریف بە گەر عەقلت هەیە
ناوی هۆمیر چەند هەزار ساڵە لە یۆنان باقییە
شیعری تەئریخی ئەگوت وەك ئەوبە گەر زەوقت هەیە

ئەم پارچە شیعرەی (ئەسیری) بەڵگەی ئەوەیە راستە بڕیاری داوە شیعری دڵداری نەنوسێ، بەلای ئەوەوە كورد لە قۆناغێكدا دەژی پێویستی بە شیعری نیشتمانی و سیاسی هەیە، ئاماژە بە ئەلیادەی هۆمیرۆسی گریگ دەكا كە زیاتر لە دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا شیعری مێژوویی وتووە، لەبەر ئەوە ناو و بەرهەمی ماونەتەوە، بەپێی ئەم بیرورایەی (ئەسیری) لەوانەیە ئەو هەواڵە راست بێ، شیعری دڵداری بووبێ و سووتاندبێتی.

(ئەسیری) قەسیدەیەكی هەیە لە حەوت بەندی شەشین پێكهاتووە بە ناوی (مێژووی كەركوك)ەوە، لە بەندی یەكەمدا دەڵێ:

قەڵاتی كەركوك لە جێی جەرمەنە
نیشتەنی كۆنی خێڵی كرمەنە
لە پشت و نەوەی كوردی گەورەنە
زوانی ئێستەی فەیلی و لورەنە
كەركوك ئەلزاسە كفری لۆرەنە
دڵسووتاویانە هەرچی كورد هەنە

لە بەندی دواییدا دەڵێ:

لەسەر زوانا هەڵبەستی سووكە
رۆژهەڵاتییە لاوی كەركوكە
بۆ لە چاپدانی (ئەسیری) زووكە
ئەمە زەبووری گەورە و بچووكە
كەركوك ئەلزاسە كفری لۆرەنە
دڵسووتاویانە هەرچی كورد هەنە

لەم شیعرەدا (ئەسیری) كەركوك بە ئەڵمانیا دەچوێنێ، لێرە میللەتی جەرمەن دەژی، جەرمەن لە نەژادی گەلێ هۆز دروست بووە، كەركوكیش كوردە و گەلێ هۆزی كۆكردووەتەوە وەكو فەیلی و لور، قسەی كوردی كەركوك لەسەر زماندا سووكە، ئەو شیعرەی (ئەسیری) دەیهۆنێتەوە وەك كتێبی زەبوور پیرۆزە.

شاعیر دوو نیوە دێرە شیعر لە هەموو بەندەكاندا دووبارە دەكاتەوە، تیایاندا كەركوك و كفری لەگەڵ ئەلزاس و لۆرێن

بەراوورد دەکا، ئەوەی پێویستە لێرەدا روون بکرێتەوە ئەوەیە ئەلزاس و لۆرێن دوو ناوچەی جوگرافی بوون کەوتبوونە سەر سنووری ئەلمانیا و فەرەنسا. بووبوونە مایەی شەڕوشۆڕ لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتە. هەریەکەیان بە هی خۆی دەزانی، لە کاتی خۆیدا شاعیر ئەم مەسەلەیەی بە جوانی هێناوەتەوە، کێشەکەی تا ئێستاش لە ناوەوەیەو کۆتایی نەهاتووە، بەڵام کەرکوك هەر کوردستانەو زۆربەی دانیشتوانیشی کوردن.

(ئەسیری) لە شیعرێکیدا بەناوی (جلخواریو ملخواری)یەوە دەڵێ:

چەندە پێم گوت ئەی کورە واز بێنە لەم جلخوارییە
ئاخرو ئەنجامی جلخواری وەها ملخوارییە
ئەو نەخۆشەی دائیما دەتگوت زەریفە سیحەتی
رۆژی ئەووەل پێم گوتی باوەڕکە دەردی کارییە
دەستو پێی خۆت بەستەوە تا بووی پەرێشانو رەزیل
فائیدەت چی بوو بڵێ توخوا ئا لەم ئینکارییە
دۆتەکەت وا لێبراوە بۆیە هێندە موفریتە
کابراش دەیەوێتو نایدەن بۆیە وا هاوارییە
دەردی لوقمەی چەورە عالەم گوبەو شێتو هار ئەکا
کەس نییە بۆ دینی بێ ئەم قالو قیلەو زارییە
ئەو کەسەی مەیلی دەکەی گوایا بەناوی دینەوە
وا لەسەر شەپقە لە بەیتی میللەتت کوشتارییە
خۆتش ئەیزانی حەقیقەت وایە ئەمما پێوە بووی
لات وەهایە تازە عەیبە تەرکی ئەم بێعارییە
سەیری کوردی میللەتت کە چەندە جاهیل مایەوە
سەنعەتو کەسبی کە هەیبێ شوانییەو جووتیارییە
ئەی (ئەسیری) لێبگەڕێ جلخوارە دەردی خۆی بەسە
ئەم غەمو دەردەی کە هەشیە ڕاستی سەربارییە

لە دوای جەنگی یەکەمی گێتیی سەدەی بیستەمو رووخانی دەوڵەتی عوسمانیو دروستبوونی کۆماری تورکیا، لەناوکۆمەڵی کوردەواریدا هەندێ کورد خۆیان بە تورك دەزانی، لەناو خەڵك دوو زاراوەیان بۆ ئەو کەسانە بەکار دەهێنا، یەکەمیان (جلخوار)و دوومیان (زۆڵەکورد)، لێرەدا (ئەسیری) قسە لەگەڵ ئەم جلخوارانە دەکا، ئەوانەی نەك تەنیا خۆیان بە تورك حسێب دەکەن، بەڵکو تورکچێتی دەکەن، بیروباوەری پان تورکیزم (تۆرانیزم) بڵاودەکەنەوە. شاعیر لە گفتوگۆیدا ناراستەوخۆ شێوازی سیمبۆلی بەکار دێنێ، مەبەستی شاعیر لە نەخۆشەکە دەوڵەتی عوسمانییە، لە پاش جەنگ مرد، واتە دەوڵەتی عوسمانی رووخا، ئینجا ئەم جلخوارانە روویان کردە کۆماری تورکیا ئەوەی ئایینی ئیسلامی بە شەبەقی گاوورانی ئەورووپا گۆڕییەوە، لە دوو لاوە شاعیر ئەمانە ریسوا دەکا لایەك لە رووی نەتەوەییەوە، لە لایەکی دیکە لە رووی ئایینییەوە، ئیتر کورد لەبەر چی تورکچییەتی دەکا، لەو کاتەی عوسمانی تورك بوو پێش ئەوەی ئیسلام بێ، تورکەکەی تازەش هەر تورکەو وازی لە موسوڵمانەتی هێناوە.

عەبدولخالق کوڕی سەید حوسێن ناسراو بە (ئەسیری) لە سەرەتای ژیانی خوێندەوارییدا شیعری دڵداری نووسیوە، کە بیری لە دواکەوتوویی میللەتی خۆیو پێشکەوتنی هاوسێیانی کردووەتەوە گرێی سایکۆلۆجی لا دروست بووەو شیعرە دڵدارییەکانی سووتاندووە، بڕیاری داوە تەنیا شیعری نیشتمانپەروەریو کوردایەتی بڵێ، بەم پێیە بیری کوردایەتی کردوویەتی بە شاعیر، لە رووی رۆخسارەوە لە زۆربەی هونەرە کلاسیکییەکانی شیعری وتووە، عەرووزیو خۆماڵی، هەروەها لە ناوەرۆکیشدا جگە لە شیعری دڵداری لە بابەتەکان دیکەی هەیە، بەڵام هەرە زۆری نیشتمانپەروەرییە، شیعری ئایینی زۆرە بابەتەکانی دیکەی کەمە، نموونە نیشتمانپەروەرییەکانی دەیکا بە (شاعیری کوردایەتی)"(١٠).

"* رەفیق حیلمی ١٨٩٨ - ١٩٦٠:



نووری عیلمو مەعریفەت شەرقو غەربی گرتەوە
قەومی ئێمە تازە تەعلیمی خەتو ئیملا دەکا
ئەورووپا کەشفی لیسانی هێسترو بارگیری کرد
تازە کوردستانی ئێمە باسی ئەلفوبا دەکا

* ژیانی:

(رەفیق کوڕی سالح کوڕی عەبدوڵڵا)، لە ساڵی (١٨٩٨) لە کەرکوك لەدایکبووە، لەسەر دەستووری کۆمەڵی عوسمانی لەقەبی (حیلمی) بۆ خۆی داناوەو بە (رەفیق حیلمی) لەناوخەڵکیدا ناوبانگی دەرکردووە، باوکی لە ئەفسەرانی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی بووەو بە بنەماڵە خەڵکی سلێمانین، سەرەتای خوێندنی قوتابخانەی لە کفری بووە، لە ساڵی (١٩٠٩) چووەتەوە سلێمانیو لە پۆلی دووەمی قوتابخانەی روشدییەی سوپایی وەرگیراوە، کە لە پۆلی سێیەم دەرچووە پۆلی چوارەم لەوێ نەبووە ناچار بۆ ئەم مەبەستە رووی کردووەتە بەغداو پۆلی چوارەمو پێنجەمی

تێدا تەواو کردووە بە هیوای ئەوەی خوێندنی باڵای لە قوتابخانەی جەنگیی ئەستەمبوڵ تەواو بکا، لەو کاتەی خەریك بووە کۆتایی بە خوێندنی ئەم قوتابخانەیە بێنێ لەگەڵ مامۆستایەکی تێکچووەو لە قوتابخانە دوورخراوەتەوە، ئیتر لە ساڵی (١٩١٣) گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی خوێندنی قوتابخانەی ئامادەیی تەواو بکا، لەم ماوەیەدا بیروڕای خۆی گۆڕیوەو هەوەسی کەوتووەتە سەر خوێندنی (قوتابخانەی باڵای ئەندازیاریی ئەستەمبوڵ)، وا بوو لە سەرەتای جەنگی یەکەمی گێتی لە ساڵی (١٩١٤) بوو بە قوتابی ئەو دەسگا زانستییە، بەهۆی داگیرسانی جەنگ تا دوو ساڵ لەو قوتابخانەیە خوێندوویەتی و لە ساڵی (١٩١٦) گەڕاوەتەوە سلێمانی.

لە یەکەم دەسەڵاتی (شێخ مەحمود) لە ساڵی (١٩١٨) لە سلێمانی (ڕەفیق حیلمی) مامۆستای ئەفسەرە گەورەکانی ئینگلیز بووە فێری زمانی فارسی و کوردی کردوون، لە ساڵی (١٩١٩) بە فەرمانی (شێخ مەحمود) بووە بە یاوەری ئەو ئەفسەرانە لە کۆیەو ڕەواندوز، بەڵام زوو لەگەڵیاندا تێکچووە تا گەیشتووەتە ئەوەی ئازار بچێژێ‌و ماوەیەك بخرێتە بەندیخانەوە، لە دوای ئازدبوونی دوکانی وردەفرۆشی لە سلێمانی داناوە، زۆری پێ نەچووە لە ساڵی (١٩٢٠) چووەتە بەغدا، لێرەش ئۆقرەی گرتووەو زوو گەڕاوەتەوە سلێمانی و خەریکی ئالوێری بووەتەوە، ئینجا لە ساڵی (١٩٢١) تا ساڵی (١٩٢٣) لە کەرکوك کارگێڕی قوتابخانەی سەرەتایی (زەفەر) بووە، لە سلێمانی کارگێڕی قوتابخانەی نموونەیی سەعادەت‌و قوتابخانەی ئامادەیی مەحمودییە بووە، لە ساڵی (١٩٢٣) بووە بە یاوەرو سەردەستەی نوێنەرانی (شێخ مەحمود)، گەشتی ئەنقەرەی بووە، وەك نوێنەری شێخ بەڵام وا دەردەکەوێ هیچی لێ نەکەوتووەتەوە.

لەو ساڵانەی دەسەڵاتی عێراق دامەزراوە (ڕەفیق حیلمی) مامۆستا بووە لە کەرکوك لە ساڵی (١٩٢٤)، لە ساڵی (١٩٢٦) گواستراوەتەوە بۆ ئاوایی (مەجەر ئەلکەبیر) لە لیوای عەمارە لە باشووری عێراق، لە ساڵی (١٩٢٧) گەڕاوەتەوە کەرکوك‌و بووە بە مامۆستای قوتابخانەی ئامادەیی، لە ساڵی (١٩٣٠) گواستراوەتەوە بۆ سلێمانی.

لە ڕووداوەکانی ئەو ساڵە بەتایبەتی ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی لە (٦)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٣٠) (ڕەفیق حیلمی) ناوی نییە، لەو ماوەیەدا گواستراوەتەوە موسڵ‌و مامۆستای قوتابخانەی ئامادەیی بووە، تا ساڵی (١٩٣٦) لە موسڵ ماوەتەوە ئینجا گەڕاوەتەوە سلێمانی و زۆری نەبردووە گواستراوەتەوە بۆ قوتابخانەی ناوەندی ناسرییە لە باشووری عێراق.

(ڕەفیق حیلمی) لە ساڵانی (١٩٣٨ - ١٩٤٣) پشکێنەری دەسگای زانیاری (مەعاریف)ی قوتابخانە سەرەتاییەکان بووە لە بەغداو بەعقووبەو سلێمانی، لە پاشانا بووە بە کارگێڕی زانیاری کەرکوك‌و بەعقووبە، ئەوجا کارگێڕی قوتابخانەی ئامادەیی کەرخ لە بەغدا، لە ساڵی (١٩٥٢) کراوە بە کارگێڕیی مەعاریفی شاری عەمارە، ئەوجا گوێزراوەتەوەو بووە بە جێگری ئەمینداری پایتەختی بەغدا (شارەوانی پایتەخت)، لە ساڵی (١٩٥٦) کراوە بە جێگری کارگێڕیی قوتابخانەی ناوەندی ئامادەیی بەغدا تا ساڵی (١٩٥٨) گوێزراوەتەوە بۆ کارگێڕی قوتابخانەی ئامادەیی شەرقییە لە بەغدا، لە دوای کوودەتا سوپاییەکەی (١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٨)ی بەغدا ماوەیەك بووە بە پاشکۆی ڕۆشنبیری لە باڵیۆزخانەی عێراق لە ئەنقەرە، بەپێی پلەی دڵخۆشی (ڕەفیق حیلمی)بەو گۆڕانەی لە عێراق ڕووی دا ئەو کارەی لە ئەنقەرە زۆر بچووك بوو نەدەبوو قبووڵی بکا، بەڵام لەسەر ئەو کارە بەردەوام نەبووە و زوو گەڕایەوە بەغداو دوا کاری سەرپەرشتی پشکێنەری پەروەردە بوو لە کارگێڕی زانیاریی بەغدا تا لە ڕۆژی (٤)ی ئابی ساڵی (١٩٦٠) بە نەخۆشی هەرەسی ناو مێشك کۆچی دوایی کردو تەرمی برایەوە سلێمانی و لە قەبرسانی گردی سەیوان نێژرا.

*** ڕەفیق حیلمی ڕۆشنبیری:**

(ڕەفیق حیلمی) وەك مامۆستایەیك قوتابخانەی سەرەتایی و ئامادەیی مامۆستای وانە زانستییەکانی ماتماتیك‌و فیزیا‌و ئەندازە‌و ئەوانی دیکە بووە، لەو کاتەی پسپۆڕ بوو لە فێرکردنی قوتابییان، لە گۆڕەپانی دیکەی ڕۆشنبیری یەکێ بوو لە زانا دیارو بەدیمەنەکانی کوردانی سەدەی بیستەم.

لە مێژووی کورد بە تایبەتی سەردەم ئاشنایەتی هەبوو، لەو کاتەی لە موسڵ بوو لە ساڵی (١٩٣٤) بە زمانی عەرەبی لە بابەت مێژووی کوردەوە (کورد لە بەرەبەیانی مێژووە تا ساڵانی ١٩٢٠ - ١٩٣٢)ی نووسیوەو بڵاوکردووەتەوە، لە وەرگێڕانا دەستی هەبوو، هەر لەو ساڵەدا لە موسڵ (خولاسەی مەسەلەی کوردی)ی لە زمانی فەرەنسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی، جگە لەوە (نامیلکەی کۆمەڵایەتی)ی زیاگۆگ ئەلپی نووسەری تورکی بە نەژاد کورد لە تورکییەوە گۆڕیویەتییە سەر زمانی کوردی، ئەمەو جگە لە (یادداشت)ی هەشت بەرگی لە ساڵانی (١٩٥٦ - ١٩٩٢) بڵاوکراونەتەوە. ئەمە توحفەیەکی ڕۆشنبیری کوردییە، لە مێژوو و بەسەرهاتی کورد دەدوێ لە کوردستانی عێراق لە ماوەی نیوەی یەکەم‌و ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، ئەم بەرهەمە بە نرخە بە یادگارێکی ئەدەبی دەژمێرێ، بەڵگەی شێوازی بەرزی نووسینی پەخشانی کوردییە.

لە گۆڕەپانی ڕۆژنامەگەری لە سەرەتادا (ڕەفیق حیلمی) پەیوەندی بە ڕۆژنامەگەریی تورکییەوە بووە، زۆربەی نووسینی لەو کاتەدا بەو زمانە بووە تا دەگاتە هۆنینەوەی شیعری بە زمانی تورکی و دیوانێکی لەم بابەتەوە پێکەوە ناوە، لە ساڵی (١٩٢٢) لە ڕۆژنامەگەریی کوردی نزیك بووەتەوە، لە ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی نووسیوە، ئینجا لە ساڵی (١٩٢٣) ماوەیەك لە ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال) سەرنووسەر بووە، لە سییەکانی سەدەی بیستەم پاش ئەوەی دەسەڵاتی عێراق جێگیر بوو (ڕەفیق حیلمی) لە ڕۆژنامەکانی (ژیان) لە سلێمانی لە ساڵی (١٩٣٥)و (گەلاوێژ) لە بەغدا لە ساڵانی (١٩٣٩ - ١٩٤٩)و (شەفەق) لە کەرکوك لە ساڵی (١٩٥٨)و (پێشکەوتن - التقدم) لە بەغدا لە ساڵی (١٩٥٨)و ڕۆژنامەی عەرەبی (الایام) لە بەغدا لە ساڵانی

(١٩٥٤ – ١٩٥٧) نووسینی زۆری هەیە، هەر چەندە لە دەستەی نووسەرانی ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا نەبووە، بەڵام ئەوەندە لێیانەوە نزیك بووەو زۆری بۆ نووسیون خەڵکی وایانزانیوە لە بەڕێوەبەرانی ئەم چاپکراوانە بووە.

*** ڕەفیق حیلمی سیاسی:**

(ڕەفیق حیلمی) نووسەرو شاعیرو ڕۆشنبیر بوو، مامۆستای قوتابخانە بوو، هەندێ مەرجی بوونی بە سیاسی لە هەڵسوکەوتیدا بەدی دەکرا، چوار زمانی ڕۆژهەڵاتی کوردیو تورکیو عەرەبیو فارسی دەزانی، جگە لە زمانی فەرەنسی، لە زمانی ئەڵمانیو ئینگلیزیش سەری دەردەچووە.

(ڕەفیق حیلمی) کوردێکی بێ گەرد بوو، هەوەسی کوردایەتی گەیشتبووە پلەی پەرستن، گرنگترین خەسڵەتی ئەوە بوو سەری شۆڕ نەدەکرد بۆ ئەو گەورەیەی بە حسێب لەو گەورەتر بوو لە ئەنجامی بیرۆکەی دواکەوتوویی کۆمەڵی دەرەبەگیو باوکسالاریو ژیانی سایەی ئەمپریالیستی ئەورووپا، ئەم ڕەوشتەی (ڕەفیق حیلمی) بوو بەهۆی ئەم هەموو گواستنەوەیە لە جێیەك بۆ جێیەکی دیکە لە ژیانی مووچەخۆرییدا، کە چی بە پێچەوانەوە هەڵوێستی لەگەڵ ئەوانەی پلەی کۆمەڵایەتییان لە خوار ئەوەوە بوو زۆر نەرمو نیانودیمۆکراتیانە بوو، لەبەر ئەوە لای چینەکانی سەرەوە پەسەند نەبوو، لای ڕۆشنبیرو خوێندەوارو لاوانو قوتابیان جێگەی تایبەتی هەبوو لەناودڵیاندا.

قوتابیانی (ڕەفیق حیلمی) ڕاست بوون کە بیریان لەوە دەکردەوە سۆزی بەرامبەر بە (شێخ مەحمود) بێ پایانە، ئەمە لە شیعرێکیدا دەردەکەوێ بۆ کامەرانی نووسی بوو، وەك وەڵامێك بۆ ئەو شیعرەی کامەران بۆ کۆچی دوایی هۆنیبوویەوە بۆ (شێخ مەحمود)، لەو شیعرەدا دەردەکەوێ پەیوەندی (ڕەفیق حیلمی) لەگەڵ (شێخ مەحمود) گیانی بوو، یەکسانییەك لە سۆزی هەردوولایان هەبوو بەرامبەر بە ئەوی دیکە، کە شێخ لە مەلیکی کەوتو هیچی بەدەستەوە نەما لە شیعرێکدا زیاتر هۆگری بوو، ئەو کاتە لاوێکی تازەپێگەیشتوو بوو خەریك بوو دەم لە حیزبایەتی بدا، لە ساڵی (١٩٢٠) هەوڵی داوە لەگەڵ لاوان (کۆمەڵەی سەربەخۆی کوردی) لە سلێمانی دابنێ، لەو سەردەمەدا هەرچەند لاوێك کۆششیان دەکرد بۆ دانانی ڕێکخراوی سیاسی، لە هەڵبژاردنی ڕێکخراوی (کۆمەڵەی کوردستان) لە ساڵی (١٩٢٢) لە سلێمانی (ڕەفیق حیلمی) زۆرترین دەنگی بەدەست هێنا، ئەمە ڕێکخراوێکی ئاشکرای کۆمەڵایەتی بوو.

لە ساڵی (١٩٣٠) لە هەولێر ڕێکخراوێکی بچووکیان دانا بوو بە ناوی (کۆمەڵەی پشتیوان) (ڕەفیق حیلمی)یان بە سەرۆك هەڵبژاردبوو، لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەوە بوو قوتابییانی قوتابخانەی ئامادەیی کەرکوك کۆمەڵەییەکیان بە ناوی (دارکەر) ڕێکخست، ئەم کارەیان لاساییکردنەوەی ڕێکخراوێکی میللی ئیتالیایی بوو بەناوی (کاربۆناری) ناوی کۆمەڵەکەشیان لەو وشە ئیتالییە وەرگرت کە (دارکەر یا دارفرۆش) دەگەیەنێ، ئەم قوتابییە دڵسۆزانە بە تاقیکردنەوەو تەمەن نەگەیشتبوونە ئەو پلەیەی بتوانن ڕێکخراوی سیاسی بەڕێوە ببەن، کە هەندێ لە ڕۆشنبیریو سیاسی کوردی ئەو سەردەمە برد، هەندێکیان ڕازیبوون، هەرچۆنی بێ باڵندەکە لەسەر (ڕەفیق حیلمی)نیشتەوە، کرا بە سەرۆکی پارتی (هیوا)، ئەو ڕێکخراوەی پرۆگرامێکی نووسراوی ئاشکراو ئۆرگانو بڵاوکراوەی چاپکراوی نەبوو، بەڵام پارتێکی فراوان بوو لە هەموو چین توێژەکانی میللەتی کوردی کۆکردبووەوەو دروشمی سەرەکی (بژی کوردو کوردستان) بوو.

گەورەترین جموجۆڵی (هیوا) کەوتە ڕۆژگارانی جەنگی دووەمی گێتی (١٩٣٩ – ١٩٤٥) زۆرینەی سیاسەتمەدارانی کورد لە دوای جەنگی دووەم پێگەیشتووی پارتی (هیوا) بوون، (ڕەفیق حیلمی) وەك سەرۆکێکی لێهاتوو و تێگەیشتوو هەڵسەوکەوتی لەگەڵ کادیرو ئەندامانی (هیوا) دەکرد.

جموجۆڵی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو ئەدەبی (ڕەفیق حیلمی) لە بەرچاو بوو، لە ساڵی (١٩٥٧) کە (کۆمەڵەی دانانو وەرگێڕانو بڵاوکردنەوەی عێراق) لە بەغدا دامەزرا ئەندامێکی بەرچاو و دیار بوو لەو کۆمەڵەیەدا، بێ گومان زیاتریش لەبەر ئەوە بوو (تۆفیق وەهبی) سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە بوو، لە دوای کودەتای (١٤)ی تەمموزی ساڵی (١٩٥٨)ی بەغدا جموجۆڵی زیاتر بوو چونکە ناسراویی لەگەڵ (عەبدولکەریم قاسم) هەبوو و هەندێ لێیەوە نزیك بوو، لەم ماوەیەدا بوو بە جێگری سەرۆکی سەندیکای مامۆستایانو ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانو جێگری سەرۆکی یەکێتی نووسەران عێراق لە بەغدا، لەم ڕۆژگارەدا (ڕەفیق حیلمی) لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد نزیك نەبوو، کە قانوونی دانانی حیزب لە دوای (١٤)ی تەمووز جاڕ درا لەگەڵ لایەنە کوردییەکاندا نەبوو، بەڵکو لەگەڵ ئەو کوردانە بوو کە پشگیرییان لە دامەزراندنی (پارتی کۆماری عێراقی) دەکرد.

*** ڕەفیق حیلمی شاعیرو نووسەر:**

(ڕەفیق حیلمی) لە هەردوو چمکی ئەدەبی کوردی کلاسیکی لە ڕوو و دیار بوو:

١. مێژوونووسی ئەدەبو ڕەخنەگر بوو، نووسینی لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە سەرچاوەییەکی گرنگن بۆ ناسینی ئەو ئەدەبە، لە ساڵی (١٩٤١) لە بەغدا بەرگی یەکەمی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی) بڵاوکردەوە، بەرگی دووەمی دواکەوت لە ساڵی (١٩٥٦) لە بەغدا بڵاوکرایەوە، جگە لەوە کتێبێکی بە ناوی (لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی سەردەم) لە ساڵی (١٩٣٦) بڵاوکردەوە، ئەم کتێبە لە فەرەنسییەوە گۆڕیویەتییە سەر زمانی عەرەبی لەلایەن (لووسی پوول مارگریت)و (کامیران بەردخان)ەوە بە زمانی فەرەنسی لە ساڵی (١٩٣٠) لە پاریس بڵاوکرابووەوە.

٢. (ڕەفیق حیلمی) شاعیرو نووسەر، لە منداڵییەوە هەوەسی شیعر دانانی بووە، لەو دەورەدا وەکو خۆی دەڵێ شیعر وتن بە زمانی تورکی عوسمانی باو بوو، دیوانێکی شیعری بەم زمانە پێکهێناوە، لە قۆناغی دووەمی شیعر وتنیدا خووی داوەتە زمانی کوردی، وەکو شاعیرانی دیکەی ئەو ڕۆژگارە

غەزەلی لاسایی شیعری عەرووزی وتووە، لەناوقالبی ئەو شیعرەدا کوردایەتی کردووە، زمانی شیعری ئاسان و ساکارە، کاری شیعری رۆمانتیکی عوسمانی نوێ بەسەر شیعریدا روون و ئاشکرایە، هەروەها بەوە راگەیشت بەشداری لە شیعری نوێدا بکا، لەگەڵ ئەوەی شیعری کەمە، بەڵام جێی خۆی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا دەکاتەوە، ئەگەر (رەفیق حیلمی) بەشێکی ژیانی بۆ شیعر تەرخان بکردایە بەرهەمی زیاتر دەبوو لەوەی کە هەیە.

* **نموونەی شیعری رەفیق حیلمی:**

- **وەسف و دلداری:**

(رەفیق حیلمی) لە لیریکێکیدا بەناوی (بەتەرزی قەدیم) دەڵێ:

ماری زولفت نۆبەچی خەزنەی عەقیقی ئاڵ نەبێ
تیری موژگان پاسەوانی دەوری چاوی کاڵ نەبێ
من کە سەرمەستی سەفای ئەو نێرگسی مەستانە بم
ئاگەداریم کەی لە دوای زولف و دانەی خاڵ نەبێ
دەستی ئیعجازی تەبیعەت چوکە خەتمە مەقسەدی
دەفتەری حوسنت بەخەتتی سەوزی لیو ئیکمال نەبێ
دامەنی توورەی پەرێشانت لەسەر سەفحەی روخت
عوقدە بو حەللی تەلیسمت باعیسی ئیشکال نەبێ
حوسنی تۆ مەستوورە یەکسرە خۆ بە زولف و خەتت و خاڵ
موڵکی ئیسلامە بە ئۆردوویی فرەنگ ئیشغال نەبێ
خاڵەکەی سەر گۆنەکەت بەم رەشیە هیندستانییە
یاخۆ شازادەی عەجەم مایل بە خەرقەی شال نەبێ

بە کۆکردنەوەی وشە و وێنەی شیعری کلاسیکی لە وەسف و دلداریدا شاعیر توانیویەتی تابلۆیەکی رەنگین دروست بکا لە وەسفی ئەندامی مەتریالی دلبەری خۆشەویست و رەوشتی مەعنەوی ئەو کەسە.

- **کوردایەتی:**

لە شیعرێکیدا بەناوی (بۆ کوردان) دەڵێ:

هیممەتی ئەربابی غیرەت بێستوون ئیمحا دەکا
ئەو کەسەی ساحیب حەمییەت بێ وەتەن ئیحیا دەکا
یەعنی ئەولادی وەتەن موحتاجی عیلم و سەنعەتە
گەر وەتەنپەروەر بێ شەخسێ مەکتەبێ ئینشا دەکا
نووری عیلم و مەعەریفەت وا شەرق و غەربی گرتەوە
قەومی ئێمە تازە تەعلیمی خەت و ئیملا دەکا
ئێستە خۆ نەوعی بەنی ئادەم لە سایەی فەننەوە
بێ موحابا کەشفی ئەسراری یە باڵا دەکا
بەسییە فیکری بێ سەمەر ئەمرۆکە عەسری غیرەتە
مەڵکی کوردستان لە ئێمە هیممەتی داوا دەکا
چونکە هەر ئەربابی عیلمە گەر بکا چارەی مەرەز
کورد ئەگەر عەقڵی ببی جێگەی عولووم ئاوا دەکا
ئێستە بێ عیلم و هونەر ژینی بەشەر قابیل نییە
چۆن لە فەننی عەسری حازیر کوردی ئیستیغنا دەکا
ئەوروپا کەشفی لیسانی هێسترو بارگیری کرد
تازە کوردستانی ئێمە باسی ئەلفوبا دەکا

لەم شیعرەدا (رەفیق حیلمی) روو دەکاتە لاوانی کورد و ئامۆژگارییان دەکا، ئەم شیعرەی لە کاتێك وتووە کورد دەسەڵاتی سیاسی گرتووەتە دەستی خۆی، بەڵام لە رووی خوێندەواری و رۆشنبیرییەوە لەو پلەیەدا نەبووە بتوانێ پارێزگاری ئەو دەسکەوتە بکا، لەبەر ئەوەی شاعیر هانی لاوان دەدا لەو کاتەی ئەوروپا کەشفی زمانی ئاژەڵی کردووە، لای ئێمە تازە هەوڵی نووسینەوەی ئەلفوبێی زمانی کوردی دەدرێ.

لە شیعرێکیدا شاعیر دەڵێ:

فیدای ئەو عەشقە بم بۆ موڵك و میللەت
دەسووتێنێ فیداکارانی ئوممەت
ئەگەر بێتو نەبێ حورریەتی تام
وەتەن زیندانە گەر بشبێ بە جەننەت
خودایە کەی هەڵێ رۆژی سەعادەت
لەسەرمان لائەچێ دەیجووری نەکبەت
عەجەب لەو میللەتانەی موستەقیللن
چلۆن جاری دەبێ خوێنی حەمییەت
لە کام عەسرا لە کوێی دنیا وەکو کورد
کەسێ هەڵسا بکا ئیبرازی هیممەت
لە عەسری بیستەما مەستی فیداکار
جهانی بەم سەباتە خستە حیرەت
ئیتر حەقمانە حورییەت وە یاخود
بەم ئەحواڵەش دەڵێن ئاساری وەحشەت
ئلاهی خۆت دەسا لوتف و کەرەم کە
ببێ ئەم میللەتە نائیل بە رەفعەت
سەباتی ئێمە مەعلوومی جیهانە
رەقیبان فیتنە ئەنگێزن حەقیقەت

ئاوردانەوەیەکی سەرنج راکێشەوە لە شاعیر، بە گشتی شاعیر باس لە هەڵسوکەوتی ئەو سەردەمەی کورد دەکا، مەسەلەی نیشتمانی و نەتەوەیی بەلایەوە ئەوەندە گرنگە ئەگەر بەرێگەی سیاسییەوە جێبەجێ نەبێ پێویستە بە رێگەی خەیاڵی سۆفیزم بگاتە ئەنجام.

(رەفیق حیلمی) پارچە شیعرێکی (نووری سالح)ی کردووە بە چوار خشتەکی:

لە دونیادا چ قەومێکە بکا میللییەتی ئیهمال
جیهانی پڕ جیدالە ئێستە بۆ تەئمینی ئیستیقلال
(خودایا بەسییەس ئیتر لابرێ دەیجووری ئیزمیحلال)
(تولووعی پێ بکەی خورشیدی زۆر پاکی ئیستیقبال)
لە رێ حورریەتا شەرت بێ بگاتە ئاسمان شینم
هەر ئیستیقلالە مەقسوودم هەتاکو باقییە ژینم
(لەگەڵ خولیایی هیجرەتدا بەسەرچوو عومری شیرینم)
(دەسا نۆبەی ویستاڵە ئاه ئەی ئومێدی ئیستیقلال)
شەوی دەیجووری نەگبەت دوورکەوی یا رەب لە کوردستان
سەفایی باغی جەننەت دەرکەوێ یا رەب لە کوردستان
(ئیتر سنجاقی میللەت سەرکەوێ یا رەب لە کوردستان)

(ئەوا نۆبەی ویسالە لە ئاه ئومێدی ئیستیقلال)
مەعاریف ئێستە ئەتفالانی میللەتمان ئەکا تەنویر
مەلیك مەحمودی ئەووەل خۆی بە عەزمو هیممەتو تەدبیر
(ئومووری مولكو میللەت تا نیهایەت گەر بکا تەدویر)
ئیتر نۆبەی ویسالە ئاه ئەی ئومێدی ئیستیقلال)

ئەم شیعرە بۆ پیرۆزبایی دەرچوونی ڕۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال) لە سالی (١٩٢٣) لەلایەن (نووری شێخ سالح)ەوە نووسراوەو (ڕەفیق حیلمی) کردوویەتی بە چوار خشتەکی، هەردوو شاعیر لە خۆشییانا وەختە باڵ بگرن، لە زەماوەندی دەست خستنی سەربەخۆیی نازانن چی بکەن، نووری دەڵێ کاروبار بۆ چاکەی میللەت رێك بخەن، (ڕەفیق حیلمی) ڕوو دەکاتە (مەلیك مەحمود)و داوای لێ دەکا دڵسۆزانە کۆشش بکا بۆ ئاسانکردنی باری ژیانو گوزەرانی خەڵکی.

**- بۆ شێخ مەحمود:**

لە کاتی خۆیدا بەهۆی کۆچی دوایی (شێخ مەحمود)ەوە (کامەران موکری) شیعرێکی ماتەمی بۆ هۆنیوەتەوە، ئەو شیعرە بووە سەرچاوەی ئیلهام بۆ (ڕەفیق حیلمی) بۆ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، لەم ماوەیەدا لیریکەکەی (ڕەفیق حیلمی) بەناوی (بۆ گیانی پاکی شێخ مەحمودی نەمر) گوڵبژێر دەکرێ، شاعیر دەڵێ:

کامەران گیان کامەران بی
بۆ ئەو شینە زۆر بە سۆزەت
رابەری گەلی کوردان بی
بەو پێنووسە زۆر پیرۆزەت
بەڵام گیانە باش بزانە
بە هەڵەچووی بەو شیعرانە
شێخ مەحمودی گەورەی کوردان
هەر زیندووە لە کوردستان
ئەڵێن مردووە نەمردووە
ئاخو بۆ کوێیان بردووە
* * *
کەوا بوو ئەو شینەت لە چی
نەکەی تۆ بەهەڵە نەچی
شێخ مەحمود گەر بێتو بمرێ
تۆڵەی کوردان چۆن ئەسەنرێ

لەم شیعرەدا (ڕەفیق حیلمی) ئەوە دەردەبڕێ (شێخ مەحمود) گیانێکە لەلایەن کردگارەوە لە پەیکەرێکی لە خۆڵ دروستکراوە پارێزراوە، زیندوو و هەمیشەییەو هەرگیز لەناوناچێ، لێرەدا شاعیر مەبەستی بیروباوەڕو کردەوەیە نەك لەش ئەوەی لە خۆڵ دروستکراوەو دەبێتەوە بە خۆڵ.
ئینجا لەسەر شیعرەکەی دەڕواو دەڵێ:

ئەو قارەمانە ئەو شێرە
قەت خوا نەکا کەم بێ لێرە
چەن جار گلا چەن جاریان کوشت
کەچی نەمرد نەمری کورد
جاری وا بوو ووردو درشت
پشتی تێ کەن ئەو لێ ئەبورد

لەم دێرانەدا (ڕەفیق حیلمی) وێنەی (شێخ مەحمود) لە گەلی کورددا دەبینێ، راستە هەموو تاکێك کۆتایی دێ، (شێخ مەحمود)یش بەلەش نامێنێ، بەڵام میللەتی کورد دەمێنێ، لەبەر ئەوەی بەلای شاعیرەوە (شێخ مەحمود) میللەتی کوردە بۆیە نامرێ.

شاعیر بەم دێرانە کۆتایی بەلیریکەکەی دێنێ:

کاتێ گەیشتن بە ئامانج
لە جێی دیاری لە باتی تاج
ئاڵای کورد بەرنە سەر قەبری
بەو جۆرە سا بگرن قەدری
* * *
ئەوسا ئیتر خوا هەڵناگرێ
فرمێسك رژاندن جێ ئەگرێ
چونکە ئەو قەبرە پیرۆزە
زیارەت ئەکرێت هەر بەم تەرزە

لەم دێرانەدا شاعیر ئەوە دەخاتە ڕوو لە کاتێکدا کورد سەربەخۆیی تەواوی وەدەست بێنێ ئەو کاتە دەکرێ باوەڕ بە مردنی (شێخ مەحمود) بکرێ، چونکە لەو ڕۆژەدا ئاهەنگ دەگێردرێ بەهۆی ئەوەی ئاڵای کوردو تاجی مەلیکی دەبرێتە سەر گۆڕی.

**- بۆ (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨):**

(ڕەفیق حیلمی) دڵی زۆر خۆش بوو بە هەڵگیرسانی کوودەتا سوپاییەکییە (١٤)ی تەمووزو فەرمانڕەوایی (عەبدولکەریم قاسم)، بۆ ئەم مەبەستە ریزێك شیعری نووسیوەتەوە، دەمێك بوو لە شیعر نووسین کەوتبوو، یا کەم دەینووسییەوە.

لە یەکێ لە شیعرەکانیدا بۆ پیرۆزبایی ئەو ڕووداوە دەڵێ:

کوردەکان هەستن بە جارێ ئیمرۆ ڕۆژی خزمەتە
مل لە کۆتەو دەس لە زنجیرا نەماون فرسەتە
ڕۆژی ئازادی هەڵاتو وا بەسەرچوو ڕۆژی ڕەش
بێتو ووریا بین لە دەس ناچێ ئیتر ئەم نیعمەتە
ساڵەها بوو گەل لە ژێر پێوەندو کۆتەی دیلیا
بیری رزگاری نەما راهات بوو بەم زیللەتە
ئەو کەسانەی ناوی خۆیان نابوو دەستەی حاکمان
قەت نەیانزانی کە قەمێ کوشتنی زۆر زەحمەتە

ئەو قسە راستو بە جێیانەی شاعیر لە دڵسۆزییەوە هەڵقوڵاون، زۆربەی خەڵکی عێراق لەسەر ئەم بیروباوەڕە بوون، تا (ڕەفیق حیلمی) خۆشی دەڵێ ووریا بن، ئەم هەلە لە دەست مەدەن، کە چی لە پاشانا هەلەکە لە دەست چوو، شاعیر لە دواییدا دەڵێ:

نایەوێ ئیتر بڵێم زوڵمێ نەما نەیکەن خەڵك
تۆڵەیەکی هەر ئەسەن خوا چونکە کاتی رەحمەتە
ئەو کەسەی وا بێ بەدڵیا زاڵمانی دەوری کۆن
ئیکە بەسیانە سزا خۆی موستەحەققی لەعنەتە

شاعیر راست بۆ مەسەلەکە چووە، ئەوەی نەفامانە زۆرداری دەکا چۆن بیر لەوە ناکاتەوە کردەوەی خراپ هەمیشە سەرناگرێ، دەبێ ئەوەش لە بیر نەچێتەوە ئەوەی دەڵێ هەڵگیرساندنی شۆرش لە پارێزگاری کردنی ئاساتترە راست دەکا، لەبەر ئەوەیە زۆربەی ئەو شۆرشانە خۆیان دەخۆنەوە.

لە شیعرێکی دیکەیدا (رەفیق حیلمی) لە بابەت ئەو رووداوەوە دەڵێ:
تۆخ چەن شیرین بو ئەو دەنگە
دەنگی ئێسگەی چواردەی تەمووز
ئەڵێم ساڵ دوازدە مانگ خۆزگە
تەمووز ئەبوو بەڵێ تەمووز
جومهووریيەت کە گەل هەموو
بۆ ئەم ئامانجە بەرزە بوو
ساڵەهای ساڵ ووردو درشت
خوێنی گەرمو گەشی ئەرشت
قوتابی مامۆستا ئەفسەر
گەلی عێراق پاکی یەکسەر
بەشەو و بە رۆژ بە بێ ووچان
تۆوی شۆرشیان بۆ ئەچان

ئەو شیعرانەی رەنگدانەوەی هەست و نەستی زۆربەی خەڵکی عێراق بوون، شاعیر لە بابەت گەورەیی ئەو رووداوە دەڵێ خۆزگە ناوی هەموو مانگەکانی دیکەی ساڵی ون دەبوون و تەنیا تەمووز دەمایەوە، چونکە ئەم بەسەرهاتە گەورەیەی لێ رووی داوە.
شیعرەکە بەم دێرانە کۆتایی پێ دێنێ:
جومهووریيەت دیمۆکراسی
رێگەی راستی بە گەل ناسی
ئیتر بە سەگی جرتاوە
پاس ناکرێ کونەماسی
کوردو عەرەب سا بە بێ غەم
بچریکێنن پر بەیەك دەم
بلێن عەبدولکەریم بژی
بژی بژی بژی

شاعیر قسەی نەستەقی کوردی (سەگی کونە ماسی پاسی جرتاوە دەکا)ی ئاخنیوەتە ناو ئەم شیعرەوە، کونەماسی و جرتاوە ناوی دوو ئاوایین لە ناوچەی سلێمانی، سەگی یەکێکیان سۆزی بۆ گوندەکەی خۆی نییە پاسی گوندەکەی دیکە دەکا، لە ناوەرۆکی شیعرەکە ئەو راستییە دەردەکەوێ مەبەستی شاعیر ئەو وڵاتانەیە لەو رۆژگارەدا لەگەڵ دەوڵەتە ئەمپریالیستەکانی ئەوروپا و ئەمریکا بوون لە دژی عێراق، بە تایبەتی (جەمال عەبدولناسر)ی میسر هەوڵی بێ وچانی دەدا بۆ بەستنی یەکێتی لەنێوان میسرو سوریا و عێراق لەپێناوی دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبی یەکگرتوو.
لێرەدا (رەفیق حیلمی) خاوەن هەڵوێست بوو وەك کوردێك، سێ ساڵ لەمەوبەر (١٩٥٦) لە ماوەی دەستدرێژییە سێ قۆڵییەکەی بەریتانیا، فەرەنسا، ئیسرائیل، بۆ سەر میسر (جەمال عەبدولناسر) بەلای (رەفیق حیلمی)یەوە قارەمانی گەورەی رۆژهەڵات بوو، کە چی لە مەسەلەی دژایەتی بەرامبەر بە عێراقی پاش (١٤)ی تەمووز (رەفیق حیلمی) لە دژی (عەبدولناسر)و سیاسەتی میسر وەستا، ئەو کابرا عەرەبە شۆڤینییە هەر لە بنەرەتدا دانی بە ماف تەواوی میللەتی کورد نەهێناوە.
(رەفیق حیلمی) رۆشنبیرو سیاسی و نووسەرو شاعیری گەورەی کورد بوو لە نیوەی یەکەم و ناوەراستی سەدەی بیستەمدا، کارە زانستی و داهێنراوە ئەدەبییەکانی لە مەیدانی مێژوو و ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسەت نامەخانەی کوردییان ئاوەدان کردووەتەوە، (رەفیق حیلمی) کەسێکی ئاشتیخواز بوو، دەیویست دیمۆکراتییانە هەموو کێشەیەك چارەسەر بکرێ، لە پەروەردە دەوری گرنگی هەبوو، زۆربەی ژیانی وەك مامۆستای قوتابخانە بەسەر بردووە، کەسێتیی تایبەتی خۆی پاراست بوو، سەری بۆ ئەوانەی بەناو لە خۆی گەورتر بوون دانەدەنواند، دۆستی لە خۆی بچووکتر بوو، بە بێ قوتابی هەڵنەدەکەوت.
لە ئەدەبی کوردیدا جێ پەنجەی دیارە وەك مێژوونووس و رەخنەگرێکی ئەدەبی کوردی، هەروەها وەکو شاعیرو نووسەرێك بەرهەمی بە پێزی هەیە لە شیعرو وتاری پەخشانی هونەری"[١١].

### * شێخ ئەحمەدی شاکەلی:



لە ساڵی (١٩٠٢) زاینی لە دەشتی گەرمیان و لە گوندی (شاکەل) لە خێزانێکی ئایین پەروەرو خانەدانی بەرزنجە (شێخ ئەحمەد) دێتە دنیاوە، (شێخ سەعید)ی باپیری و (شێخ محەمەد)ی بەهۆی خواپەرستییان ناوو شۆرەتیان لە ناوچەکەدا بڵاو دەبێتەوەو خاوەن تەکییەو مزگەوت و دیوەخان بوونە. لە کاتی یەکەم جەنگی جیهانیدا (شێخ محەمەد)ی باوکی شاعیر لە دەستی زوڵم و زۆرداری عوسمانیانی تورك (شاکەل) بە جێ دێڵێ و دەچێتە ئێران، پاش کۆتایی جەنگەکەو داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەوە دێتەوە ناوچەی شاکەل و لە ساڵی (١٩١٩) کۆچی دوایی دەکات. ناوچەو دەشتی (شاکەل) دەکەوێتە نێوان ناحیەی (سەرقەڵا)و شارۆچکەی (کەلار)وە، دێهاتەکانی بریتین لە (شاکەل، سەیدە، کارێزە، کەوا چەرموو، عەولاقوت، دێ بنە).

(شێخ ئەحمەد) هەر بە منداڵی دەخرێتە بەر خوێندنی مەلایانەو فێری وانە ئایینییە سەرەتاییەکان و (بۆستان)و (گولستان)ی (سەعدی شیرازی) دەبێت لای مامۆستایانی کەلار وەك (مەلا ئەحمەد کەلار)و (مەلا قادری سۆفی)، پاشان بۆ زانست وەرگرتن دەچێتە سلێمانی و لای مامۆستا (مەلا محێدین)ی خەڵکی سلێمانی دەبێتە شاگردو زیاتر لای ئەم دەمێنێتەوە.

ژیانی لاوێتی شاعیر وەك خۆی دەڵێ: "گەنجێکی بە شەوق بووم هەوای هەڵبەست نووسین و ئەدەبیاتم زۆرتر بوو لە خوێندنی مەلایانەو هەوەسی تێکەڵاوی ئەهلی دونیاشم بوو، لەگەڵ گەنجی بەگزادەی کەلارا بۆ سواری و ڕاو کاتم زۆر خەسار ئەکردو هەتا لە بیرمە کە حەمەی کەریم بەگ فەتاح بەگ پێی ئەوتم ئەگەر ئەوەندە خەریکی خۆتی خەریکی ئوموراتی دینی بی ئەبووی بە کوڕی شێخ عومەر، ڕاستیشی ئەکرد".

(شێخ ئەحمەدی شاکەلی) ئەو شاعیرو خواناسە بەناوبانگەی دەشتی گەرمیانە کە دەمێکە ناوبانگی بە ناوچەکەدا بڵاو بوەتەوە، خەڵکانێکی زۆر ئەویان ناسیوە چ لە ڕێگای ئەدەبیاتەوە بێ یان لە ڕێگای خواناسی و هاموشۆی تەکییە و مزگەوتی شاکەلەوە بێت، چونکە ئەم پیاوە بەدینە ئاشقی (شێخ عوسمان)ی دووەم و ڕێرەوو ڕچەی نەقشبەندیان بوو چەشنی شاعیری گەورە (عەبدولڕەحیمی مەولەوی) تاوەگۆزی.

ئەم مرۆڤە توانیویەتی لە کولە مەرگی و دەربەدەری و ئێش و ئازارەکانی ڕۆژە سەختەکانی خۆی دەرباز بکات و بتوانێ گوندە کاوڵ بووەکەی (شاکەل) ببوژێنێتەوە، ئاوەدانی بکاتەوەو دووبارە سەوزی بکاتەوە. واتە توانیویە ڕێگای بژێوی ئەم دونیا و ئەو دونیای خۆی بدۆزێتەوە توێشەی سەفەری ڕێی ڕێبواری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێت، تا بانەڕۆژ لە لوتف و کەرەمی پەروەردگار بەهرەمەند بێت.

شاعیر (شاکەلی) سەرەتای شیعرەکانی چەشنی هەر مرۆیەك خۆی لە عەشق و دڵتەڕی دەدات و بۆنی گوڵاوی عەترو عەشقی عاشقان لە هۆنراوەکانی دەتکێ، لە بۆنی گەردن بەندی یاری دەیان پارچە غەزەلی بەسەر دەشت و دیاری گەرمیان لە کەلارو شاکەل و گوندە جوانەکانی ئەو دەڤەرە پەخش و بڵاو کردوەتەوە، ئەو کات نازناوی (حەمدی) بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ، شاعیر گیرۆدەی باڵای شۆخێك دەبێت بە نێوی (ڕەعنا)و لە چەند هۆنراوەیەکدا بە تەواوی دان بەم دڵدارییەدا دەنێت و ناوی یەکێك لە کچانی بنەماڵەی لەبەر ئەو خۆشەویستییە بە نێوی (ڕەعنا)وە دەنێت.

(شێخ ئەحمەد) (نازدار خان)ی کچی (ئیبراهیم ڕەمەزان ئاغای پالانی) دەبێتە هاوسەری و پاش ئەو (مریەم خان) ی کچی (حەکیم قادر بەرزنجی) دەخوازێت و چوار کوڕو سێ کچی لێدەبێت و ناوی کوڕەکانی (محەمەد، ئەنوەر، عوسمان، سەعید)و کچەکانیش (ڕابیعە، ڕەعنا، نەسرین).

یەکەمجار کە دیوانی شیعرەکانی چاپ دەکرێ ئەو لە ژیاندا بووە، بۆیە ڕێگا نادات ئەو شیعرانەی لە نێو دیوانەکەیدا هەبێت، چونکە ئەو دەستی لە هەموو خۆشییەکانی ژیان هەڵگرتبوو، تەنیا مەستی بادەی جامی دەستی ساقی و پیرانی خواناس بوو، ئەو ببووە پەروانەی باڵ سووتاوی شەم و گڕو بڵێسە گرتووی تاوی کورەی سۆفیزم، ئەو تاقە یارێکی هەبوو، ئەویش (شێخ عوسمانی بیارە) بوو، شەوو ڕۆژ لە یادی ئەو پیاوە مەزنە خواناسەدا بوو تا ئەو ڕۆژەی (١٤)ی شوباتی ساڵی (١٩٨٢) لە تەمەنی (٨٠) ساڵیدا بۆ ئەو پیرە خۆشەویستەی پارچە هۆنراوێکی دەخوێندەوە کۆچی دوایی کرد.

دوایی کە چاو دەخشێنینە شیعرە ئایینییەکانی کە زۆربەیان سۆفیزمین، دەبینین لە شیعرەکانی ئەم پیاوە مەزنە بۆن و بەرامەو هەڵاوی گڕی گەرمی خواناسین بەرز دەبێتەوەو پۆشاکی دەروێشان لەبەر دەکەن و خۆیانی پێدا دەپۆشن.

(شاکەلی)لە تەمەنی لاوێتیدا هەستی نیشتیمان پەروەری

لە کەللەی دەدات و بەبالای نیشتمانی هەلبەست دادەرێژێ، بۆنی کوردایەتی لە زۆربەی شیعرەکانیدا دێت، دیارە حەزو هیوای ئەوە بووە رۆژێك بێ گەلەکەی ببێتە خاوەن دەولەت و سەروەری بەو مەبەستەش پێکرا لەگەل رۆشنبیرانی ئەو دەمە دەبێتە ئەندامی رێکخراوی (هیوا) و شان بە شانی هاورێیانی لە چالاکیدا دەبێت. بەلام پاش تێکچوونی ئەو رێکخراوەیە شاعیر (شاکەلی) واز لە هەموو کارێکی پارتایەتی دێنێ، بەلام هەستی کوردایەتی لە جۆش و خرۆشان راناوەستێت و پشتگیری لە مافە رەواکانی میللەتەکەی دەکات بە شایەتی خەلکی ناوچەکە و هاورێکانی.

(شێخ ئەحمەد)ی شاعیر لە تاف لاویدا بەرهەمو نووسینی خۆی لە گۆڤاری (گەلاوێژ) و (هەتاو)دا بلاو دەکاتەوە، مامۆستا (نەریمان) لە کتێبی (ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی) لەمەر (شێخ ئەحمەد) نووسیویە دەلێ: "سالانی (١٩٤٤ - ١٩٤٦) کە مامۆستای قوتابخانەی کەلار بووم، ئاشنایەتیم لەگەل ئەم زاتە پەیدا کردبوو، کە پیاوێکی راست و دروست بوو بۆیە کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف کردبوویە وەکیلی هەموو ئاواییەکانی، شاعیرمان پیاوێکی کوردپەروەر بوو لە ریزی (هیوا)دا ئەندامێکی چالاك بوو هەروەها رێبازی ئایینیشی بە دوو دەست گرتبوو، باپیرەی ئەم بنەمالەیەی شێخانی شاکەل کە (شێخ سەعید) بوو، ناوبانگی لەو ناوچەیە دەرکردبوو لەناوهۆزی جافدا پایەو پلەیەکی بەرزیان هەبوو، شێخ ئەحمەدی کوری شێخ محەمەدیش هەر لەو بنەمالەیەیە بەلکو تا لە ژیاندا بوو بە گەورەی خۆیانیان دادەنا".

* **نموونەیەك لە شیعرەکانی:**

یا رسول الله دەخیلە رەهبەری دنیا و دین
پادشاهی لەشکری دل شافعی رۆژی یەقین
پاسەوانی ئاستانت ساکینانی ئاسمان
سایەبانی تۆئەکا بەو شاپەرەی روح الامین
کاتی رەحمەو شەفقەتە موحتاجی لوتفی دەستی تۆن
دەست و بابەستەی کەمەندی مەکری شەیتانی لەعین
دەستی زامارم کەسی سالە ئەسیری بەستنە
تازە داخوازی لە ئەعجازت دەوایە بۆ برین
تو خودا هیچم نییە تاعات و ئەعمالی قبول
هیمەتێ بەلکە لەمەولا ببمە بەندەی موخلسین
هەر لە رۆژاوا وە بەندەی غەفلەت و بەندی خەوم
بێ بەشی نیوەی شەوو بێ شۆری فەخری سالحین
ئەی شەفیعی زومرەی ئالوودە دامانی وەکو من بێ حەیا
بەر لە مردن تۆو خودا رووم کە لە رێگەی سادقین
شەرمنەی رۆژی جەزام و سەرئەفگندەی بارەگا
بۆ جەنابی فەخری عالەم چونکە مایەی رەحمەتین
(شاکەلی) شێواوە شێوەی بەندەگی ئازادەگیت
کاتی مەرگە، رووکەرە دەرگاهی فخر المرسلین

* * *

موددەتێکە دل ئەسیرە مەیلی گریانی هەیە
ئارەزووی گولستان و کۆیی جانانی هەیە
سالە وقتیکە غەریبی مەینەت ئاوا ماوەتۆ
ئێستە بۆ دەرچوونی مەینەت عەزمی سەیرانی هەیە
ئیشتیاقی دەشتی شاکەل گاه گاهێ کانی چال
گەه هەوای شیروانە گاهێ مەیلی سیروانی هەیە
تاکە پابەندو ئەسیری مەینەت ئاوا بێ دلم
دایما بۆ شاکەل و شیروانە گریانی هەیە
مەنعی ئەم چوونانە ناکەم حەقییە هەر لایە بچێ
چونکە ئەم گول گوشتەیە عەجیزی فراوانی هەیە
گاه مەیلی دیتنی (رەعنا) و لێوی چەم ئەکا
وا لەبەر هیجرانی ئەو تەبعی غەزەلخوانی هەیە
ئارەزووی وەسلی ئەو بالا میانەی کردوە
چونکە بەینێکی نەخۆشە و دەردی هیجرانی هەیە
دلبەری، قەد عەرعەری بێ شوبهە جێ هەر ماوە لەوێ
بۆیە وەك قومری ئەنالێ شین و گریانی هەیە
ئەو دللارامەی چە زیبایەکی چی ماوە لەوێ
چاو مەست و زولفی لوول و لێوی خەندانی هەیە
تا کەی لێی دوورە خەتی شەوەزەنگی سوبحی عاریز
نالی نیوە شەوو ئاهی بەیانیانی هەیە
دل لە حەسرەت فیرقەتی کولمی گەشی گول رەنگی یارا
دەم بە دەم بولبول سیفەت، نالانە، ئەفغانی هەیە
خۆ لەبەر دەردی جیایی چاوی خوێن ئەفشانی من
هەر وەکو هەوری بەهاران تاوی بارانی هەیە
چۆن نەسووتێ دل بە شەوقی دلبەری ئاهو نیگا
ئەم وەکو پەراوانەیە و ئەو شەمعی درەفشانی هەیە
هێندە ئێشی زۆرە (حەمدی) دووریی دلداری تۆ
وەك لەسەرخۆ چوون و شەیدا بوونە سووتانی هەیە

* **تۆ شاکەلی:**

دەرەودۆلەکەت جێگەی گەنم و جۆ
لە شان و شیوتا هوهویە و کوکو
ئەو پەچەو پالەت کە جێی ئاژال بوو
لە پێی ئاژەلا ژینی لێ تال بوو
ئێستا لەو جێگە گەنك ئەچێنرێ
لەو زەوی و زارەت رەسم ئەسێنرێ
(الحمد لله) بەرچاوت تێرە
زراعەت کردن ئەسبابی خێرە

* **ئامۆژگاری و هۆشیاری:**

ئەم شیعرەی خوارەوە پەندو ئامۆژگاری (شاکەلی)یە بۆ (ئەنوەر) و (محەمەد)ی کوری و نەوەی شاکەلی و هەموو شاکەلییەکان لە (٢٤)ی کانوونی دووەمی سالی (١٩٧٣):

نوری چاوانم نەوەی شیرینم
سەرمایەی ژینی دنیا و دینم
بۆژینی دنیا جێ ئیسراحەت بە
بۆ رێی ئاخیرەت هۆی فەراغەت بە

ئیسراحەت نەبێ ئیتاعەت نییە
ئیتاعەت نەبێ حەقیقەت نییە
فەراغەت مایەی زکرۆ ئەفکارە
هۆی سەرکەوتنە لەم کارزارە
زۆرم زەحمەت دی لە ڕێی دنیادا
سەراوی بێ ئاو هەر لە بینادا
بەسییە بۆ دنیا ئەم تێکۆشانە
بۆ دنیای دووەم کاتی جۆشانە
تو (الم یأن) ئەگەر بخوێنی
زۆر بە ئاسانی وازی لێ دێنی
بە شەرتێ خودا هیدایەت بدا
جیا نەبی لە ڕێی خاسانی خودا
سیراجی وەهاج لە ڕێگە ما بێ
یەکێ وەکو تۆ لە جێگە مابێ
ئەگەر بەراسی ئیسلامە کێشم
حەیفە بۆ دنیا دەس رابکێشم
دنیام تەواو کرد بە ناتەواوی
دامە دەس ئێوە نەکەونە داوی
پەلخ مالۆس و یەکانەو واوی
زۆری تێدایە وەك توولەی ڕاوی
هەموو بەتاڵەو داوی دنیایە
ڕێگەی سەرکەوتن لەلای مەولایە
سلیم و عەدالەت هەموو ئیسلامە
ئەگەر بەراسی بخوێنن نامە
فەرموودەی حەزرەت پیاوی دوودنیا
خۆشەویست ئەبن لە هەردوو سەرا
بەلام زەحمەت بەکەم کەس ئەکرێ
پەم پایە بەرزە بە (ذو الحظ) ئەدرێ
ڕێگاکەم دوورە بێ کۆش و کالەك
زەحمەت هەڵگرێ دەسێ دوو کالەك
ئاخر باسمە هیچم لێ نایێ
مەگەر هەر زوبان ئەویش نزایێ
خۆم هیلاك ناکەم ئیتر بۆ دنیا
ئەخنکێم ڕۆژێ لە بێخ و بنیا
بەقایەی دنیاو مایەی ژیانم
بۆ هەدەر بچن نووری چاوانم
ئێوەش بەراسی و بە دۆسی و چاکی
دەسی یەکبگرن زۆر بە چالاکی
ڕەمزی سەربەرزی و جێگەی کەرامەت
چاودێری بکەن بە بێ نەدامەت
ئاساری بەرزی پایە بەرزەکان
نیشانەی جوانی شیرین تەرزەکان
لە یادی نەکەن ئامان سەد ئامان
نەتان ترسێنێ گۆرانی زەمان
ئاداب و ڕەسمی اکرم السلف
چۆنی ئەگۆرێ احسن الخلف
بەسییە ئازیزم تاقەتم نەما
لە تۆ خۆشترێ دڵ ها بە تەما
کەوتە خەیاڵم سیرەتی عوسمانی
دنیای لێ کردم و سوورەتی بێ گیان
بە لوتفی خوداو هیمەتی ئەوان
حەمەو ئەنوەرو سەعیدو عوسمان
دەس لە گەردنن هەتاکو مردن
بێ تاقەت نابن لە چاکە کردن
چاکە بۆ مەردم چاکتر تاعەتە
(من ینفع الناس) قسەی حەزرەتە
لێمی وەربگرن بە گیان و بە دڵ
من لەمە زیاتر خۆم ناکەم خجڵ
پەندی پیرانم زۆرە لەم ڕەنگە
ها لە دەفتەرا بۆیە بێ دەنگە
بژی بەشادی لەگەڵ براتا
بە دۆسی و ڕاسی لەگەڵ هاوپاتا
سەلامی گەرمم بۆ گشتی شاکەلی
زۆرو بەرێز بێ کۆمەڵ و گەلی
ئێوە وەك ئەوان ئەوان وەك ئێوە
لای من یەکێکن بێ فەرق و شێوە
لە بیرم نەکەن بە ڕۆژو بە شەو
چون من کاتمە لەم خەو بۆ ئەو خەو
منیش دوعای خێری وتن و کردن
بێ فەرق، بێ وەچان، هەتاکو مردن
جارجار شاکەلیت بێت بە خەیاڵا
لە کۆری گەرمی خۆشی ئەحواڵا
لە گۆڕیش دوعای خێرم تەمایە
وەك من بێ خەبەر مەبن رجایە"[١٢].

**"* عەبدولواحید نووری، ١٩٠٤- ١٩٤٤:**



عەبدولواحید کوڕی مەجید کوڕی ئەسعەد لە ساڵی (١٩٠٤) لە چەمچەماڵ لەدایکبووە. لەو کاتەتدا باوکی مووچەخۆری میریی دەوڵەتی عوسمانی بووە لەوێ. لە سەرەتای ژیانی خوێندەواری بەناوی خۆی عەبدولواحید مەجید نووسینی لە ڕۆژنامەو کۆوارەکاندا بڵاوکردووەتەوە. لە پاشانا ناوی هونەری وەك ڕۆشنبیرێك کردووە بە عەبدولواحیدی نووری. ئەم لەقەبەی لە ناوی خاڵی خۆی نووری عەلی ئەجزاچی وەرگرتووە، یا لەبەر هەر هۆیەکی دیکەی تا ئێستا ئاشکرا نییە. هەندێ جاریش بەناوی (ع.و.نووری) بەرهەمی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بڵاوکردووەتەوە.

عەبدولواحید یەکێکە لەو نەوەیەی بەرێگەی خوێندنی نوێ بابەتی قوتابخانەی میرییەوە بووە بە خوێندەوار. سەرەتا لە قوتابخانەی ئەو سەردەمەی عوسمانی خوێندوویەتی، لە پاشانا ماوەیەکی دیکەی خوێندنی لە کەرکووك بردۆتە سەر. ئەوجا خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە ساڵی (١٩٢٧) لە بەغدا تەواوکردووە، لە پاشانا گەڕاوەتەوە سلێمانی بە مامۆستا لە قوتابخانەی فەیسەلییەی سەرەتایی دامەزراوە. ژیانی مووچە خۆری میری بۆ عەبدولواحید ئاسان نەبووە، لە گەڵ کاربەدەستانی زانیاری (مەعاریفی) ئەوسا گیروگرفتی هەبووە، ناخۆشی کەوتووەتە ناوەوە لە ئەنجامی بیروباوەڕ، هەندێ جار بووەتە هۆی گوێزانەوەی بۆ قوتابخانەکانی دەرەوەی سلێمانی، وەکو هەڵەبجە، چوارتا (شارباژێر)، شەقڵاوە، لەیلان، ماوەیەکیش جێگری سەرۆکی شارەوانی سلێمانی بووە.

لە ناوەڕاستی بیستەکانو سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەم عەبدولواحید فریای ئەوە کەوت لەگەڵ مامۆستایانی پێش خۆی ببێتە یەکەمین مامۆستای قوتابخانە نوێکانی کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئینگلیزو شێخ مەحموود لە سلێمانی پەیدابوون، لەمانە عەبدوڵڵا زێوەر، ڕەفیق حیلمی، سالح قەفتان، مەلاسەعید سدقی، ئەحمەد بەهجەت قەرەداغی. لە ناوەڕاستی سییەکاندا مامۆستای دیکە هەڵکەوتن وەك مەجید عەلی، مستەفا خۆشناو (ئەفسەری شەهید)، حامید فەرەج، ئەحمەدی عەزیز ئاغا. کەسایەتی خوێندەواری نووسەری ئەم ماوەیەمان عەبدولواحید نووری کەوتە سەردەمی ئەم بەچکە شێرانەی زانستو زانیاری.

جموجۆڵیی ڕۆشنبیری عەبدولواحید تەنیا وانە وتنەوەو بەڕێوەبردنی ئەو قوتابخانانە نەبووە کە تیایاندا مووچەخۆر بووە، بەڵکو بایەخی بەلایەنەکانی دیکەی کۆمەڵی کوردی داوە لە ڕووی خوێندەوارییەوە. لەوانە ڕەنجی زۆری داوە بۆ پێشخستنی شانۆگەری لە قوتابخانەکاندا. لە سەرەتادا وەکو قوتابیو لە دواییدا وەك مامۆستا تا گەیشتووەتە ئەوەی ساڵانی (١٩٣٤ – ١٩٣٥)دا بەشداری لە نواندنی شانۆی (سەربازی ئازا) (الجندي الباسل) بکا وەك ئەکتەرو دەرهێنەرێك.

جگە لەوە ئەو ڕۆژنامەو کۆوارانەی لەسەردەمی ژیانی ئەودا لە بەغداو سلێمانی دەردەچوون وەك (گەلاوێژ) و (ژیانەوە) و (ژیان) و(ژین) لاپەڕەکانیان شایەتی دەدەن بۆ کۆششو تەقەلای عەبدولواحید لەپێناوی پێشکەوتنی ڕۆژنامەگەرییەوە. هەروەها نووسەر لە هەندێ جموجۆڵی سیاسی کوردی لە ڕووی تیۆرییەوە دوور نەبوو. وەك دەردەکەوێ لە ڕێکخراوە سیاسیو قەومییەکانی کوردی وەکو (هیوا) و (ژ. ك) ئەندام نەبووبێ زۆریش لێیانەوە نزیك نەبووبێ لە گەڵ ئەوەشدا ئاگاداری جموجۆڵیی ڕۆشنبیری (ژ.ك). بووە کۆواری (نیشتمان)ی بەدەست گەیشتووە بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی ڕێکخراوی لە گەڵیانا هەبووبێ.

عەبدولواحید بەرهەمی ئەدەبی (پەخشانو شیعر)ی کەم بوو، چونکە تەمەنی درێژ نەبوو، لە گەڵ ئەوەشدا ئەگەر قەوارەی بەرهەمی لەگەڵ تەمەنی کورتی بەراورد بکرێ ئەو بەرهەمە وەك شتێکی زۆر خۆی دەنوێنێ. هۆی هەرە گرنگ بۆ ئەم ئەگبەتییە ڕۆشنبیرییەی ئەوەیە عەبدولواحید نەخۆش بوو. نەخۆشی سیلی بێ ئامان کارەساتێك بوو لە کۆمەڵ بەتایبەتی لەو ڕۆژگارەدا کە زانستیی پزیشکی نەگەیشتبووە ئەو پلەیەی نەخۆش لە مردن ڕزگار بکا یا هیچ نەبێ هەندێ دوای بخا. ئەو نەخۆشییە کوشندەیە هێزی لە عەبدولواحید بڕیو داغی بەجگەری قوتابیو خوێنەرو ڕۆشنبیری کوردەوە نا. وا بوو لە ڕۆژی (٥)ی تەمووزی ساڵی (١٩٤٤) لە سلێمانی کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژرا.

وەك ڕووداوێکی گرنگ لە نێوەندی ڕۆشنبیری کوردی لە پاش کۆچی دوایی عەبدولواحید نووری بەناوی چلەیەوە کۆبوونەوەیەکی ماتەمینی لە ڕۆژی (١٤)ی ئابی ساڵی (١٩٤٤) لە قوتابخانەی گۆیژە کرا. لە کۆبوونەوەکەدا وەزیری ئابووری عێراق تۆفیق وەهبیو موتەسەڕیفی سلێمانیی ئەو سەردەمە مارف جیاووك بەشدارییان لە کۆبوونەوەکەدا کرد. هەندێ شیعرو وتاری ماتەمی لەلایەن مامۆستایانو

دروست و هاوڕێیان عەبدولواحید لە قوتابی و نووسەرو شاعیرو کەسوکاری خوالێخۆشبوو خوێندرایەوە.

* عەبدولواحید نووری ڕۆشنبیر:

عەبدولواحید ڕۆشنبیرێکی هوشیار بوو، خۆی دوور گرتبوو لە جموجۆڵی سیاسی و ڕۆژانە و حیزبایەتی. لەسەر ئەو باوەڕە بوو دەتوانێ بەچاکی کاروباری ڕۆشنبیری بباتە سەر لەبەر ئەوە بەلایەوە لە خەباتی سیاسیی سەرپێی ڕۆژانە گرنگتر بوو. لە سەردەمی ژیانی عەبدولواحید دوو بیروڕاو ئیدیۆلۆجی سەرەکی ڕۆژئاوایی لە ئاوەوە بوو. نازیزمی ئەلمانیا و ئەمپریالیزمی بەریتانیا. یەکەمیانی ڕەت کردبووەوە، لە دووەمیان بێ دەنگ بوو، چونکە بەزۆری خەڵکی خۆشیان نەدەویست. بیروباوەڕی سۆسیالیزمی هێشتا کز بوو. نووسەر ئەم بیروڕایەی بەوشکی و سیاسییانە و دیپلۆماسییانە وەرنەگرتبوو، بەڵکو تێکەڵی کردبوو بەدروشمەکانی شۆڕشی فەرەنسا و بیروڕای نوێخوازو پێشکەوتنخوازەکانی کە لە دوا ڕۆژانی دەسەڵاتی عوسمانی پەیدا بووبون. بەمە کەوتبووە ژێر کاریگەری تیۆرییەکانی نیشتمانپەروەری و مرۆڤپەروەری نەك جموجۆڵی پراکتیکی ڕێکخراوی سیاسی و سوپایی و چەکداری. بەم جۆرە عەبدولواحید قەڵەمی بەدەستەوە بوو نەك چەك.

مەیدانی خەباتی ڕۆشنبیری عەبدولواحید فراوان بوو، دەتوانرێ لەم بەڵگانەدا سنووری بۆ بکێشرێ:

١. وەك مامۆستایێکی قوتابخانە دەوری باڵای بووە لە پێگەیاندنی منداڵ و مێردمنداڵی کورد، پەروەردەکردنیان لە سەر بنچینەیێکی زانستی و چەسپاندنی گیانی نیشتمانپەروەری و کوردپەروەری و ئادەمیزادپەروەری لەناودڵ دەروونیاندا.

٢. نووسەر دەستێکی باڵای هەبوو لە فێرکردنی خەڵکی بەهۆی ئەو نامیلکانەی بڵاوی دەکردنەوە، لەوانە کتێبی (پیرۆزیی منال) (سلێمانی ١٩٤٠)، (بەرەو ڕووناکی) (بەغدا ١٩٤٢)، (لە ڕێگەی سەرکەوتنی ئینسانا) (بەغدا ١٩٤٣). ئەم کتێبانە لە بنجدا بریتین لە کۆمەڵە وتارێك لە بارەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئەدەبی، بەشێوازێکی ئاسان بۆ قوتابیان و خوێنەرانی کورد ئامادەی کردووە، هانیان دەدا ڕوو لە زانست و زانیاریی سەردەم بکەن. هەوڵ دەدا لە چوارچێوەی بیری بنەماڵەیی و عەشیرەتگەری و ناوچەیی دەریانبێنێ بەرەو گێتییەکی ئاسۆ فراوانی ئەوتۆیان ببا کە هەموو ئادەمیزادی سەر ڕووی زەوی تێیدا بە ئاسوودەیی و برایەتی بژین.

٣. عەبدولواحید چەند کتێبێکی بۆ قوتابیانی خوێندنی سەرەتایی داناوە، هەندێکیانی لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی.

٤. نووسەر لە زمانی بێگانەوە هەندێ کتێبی وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی، لەوانە کتێبی (لە وڵاتی ئادەمیزادە سەربەستەکان)ی ئاغا ئۆغلوو ئەحمەد (بەغدا ١٩٣٩) و کتێبی (دوانێك لە بابەت پێرەوەی میللییەوە)ی عەبدولفەتاح ئیبراهیم (بەغدا ١٩٢٤).

کتێبی یەکەم لە زمانی ئازربێجانی یا تورکییەوە عەبدولواحید وەریگێراوەتە سەر زمانی کوردی. ئەم کتێبە بریتییە لە کۆمەڵێك وتار لە بارەی ژیانی ئادەمیزادو فراوانکردنی ئاسۆی بیروباوەڕی. کتێبەکە بە هەناسەیەکی پێشکەوتنخوازی و مرۆڤپەروەری نووسراوەتەوە، بەڵام خاوەنەکەی هەرچەندە بەنەژاد ئازربێجانییە کەچی لە دواییدا بووە بە (پان تۆرانیست) و لە ئازربێجانی سۆڤیەتی کۆن ڕای کردوە لە ئەستەمووڵ نیشتووەتەوە.

کتێبی دووەم لە زمانی عەرەبییەوە عەبدولواحید وەریگێراوەتە سەر زمانی کوردی. ئەمیش بریتییە لە باسێکی بە نرخ لە بابەت دواکەوتووی ئەو سەردەمی عێراق بەهەموو ئەو خەڵکانەی تێیدا دەژین. دانەر ڕێگەی چاکەیان پێ پیشان دەدا، چۆن کۆمەڵێکی پێشکەوتوو دروست بکەن بۆ ئەوەی هەموو دانیشتوانی وەك یەك بژین.

٥. عەبدولواحید زیرەکانە بەشداری لە ڕۆژنامەگەری سەردەمی خۆیدا کردووە لە گەڵ ئەوەی ڕاستەوخۆ وەك کارگەرێك لە ڕۆژنامەگەریدا کاری نەکردووە بەڵام نووسینی کەم نەبووە و گەیشتووەتە پلەیەك پیاو وا هەست دەکا کادیرێکی ڕۆژنامەگەری بووە.

* عەبدولواحید نووری نووسەر:

نووسەر کوردی زانێکی باش بوو، قەوارەی زانینی زمانی کوردی لە گەڵ قەوارەی زانیاریی گشتی لە پلەیەکدا بوون. لە بەرئەوەیە هەموو ڕستەیەکی لە مانادا قووڵە ولە زماندا ڕەوانە، بۆیە هەموو نووسینەکانی ئەدگارێکی هونەری و ئەدەبییان پێوەیە. جگە لەمە ئەو وتارانەی لە ڕۆژنامەو گۆوارەکانی ژیانەوە ژیان و ژین و گەلاوێژ بڵاوی دەکردنەوە لە بیست وتار زیاترن. بە ناوەرۆك ڕەنگاوڕەنگن، هەندێکیان خاوەنەکەیان وەك نووسەرێکی چاك دەخەنە ڕوو لەوانە لە وتاری (چۆن پێشکەوین؟) ئازایانە داوا دەکا لە قەپێکی ناوچەیی بچینە دەرەوە بۆ سەر هەموو ڕووی زەویی بێ پایان و بەرین. لە وتاری (فرمێسکی خوێناویم بۆ گیانی پاکی بەرزی مستەفا پاشا) عەبدولواحید بەفرمێسکێکی گەرم کۆمەڵێك وێنەی ڕۆمانتیکییانەی دروستکردووە. لە گیانێکی پڕ لە سۆزەوە بە پارچە پەخشان و شیعرو پەخشانە شیعر تابلۆیەکی دروستکردووە فرمێسك دەرێژێتە سەر گۆڕی مستەفا پاشای یامولکی. لە وتاری (زەهاوی نەما) فرمێسکێکی دیکە بۆ شاعیری بەنەژاد کورد جەمیل سدقی زەهاوی کورد بوو بەڵام بە عەرەبی دەینووسی. عەبدولواحید گلەیی لێ ناکا، چونکە نابێ کەس گلەیی لێ بکا. فرمێسکی عەبدولواحید گەرمە لە سەرانسەری ئەو پارچە پەخشانەدا. لە وتاری (دەوڵەمەندو هەژارەکانمان) هەر لە ناونیشانیدا دیارە نووسەر لەچی دەدوێ یەکسانی هەبێ و هەژاری نەمێنی. ئیتر دەچێتە ناو گێروگرفتەکەوە ئەوەی لە سەرەتای ژیانی ئادامیزادەوە دروست بووەو تا ئێستا بەردەوامە، خودا خۆی دەیزانێ کەی دوایی دێ، هەندێ لەسەر ئەو باوەڕەن دوایی نایە. نووسەر دڵسۆزانە لەم کێشەیە دەدوێ، لەوە دڵنیایە دەبێ وا نەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەرمانی بۆ نەدۆزیوەتەوە، نەك

تەنیا ئەو بەڵکو تا ئێستاکەش دەرمانی بۆ نەدۆزراوەتەوە، هەرچی هەیە هەر قسەیە. لە لایەکی دیکەوە گریمان ئەگەر دەرمانیش بدۆزرێتەوە دوور نییە وەکو رووەکەکەی گلگامیشی لێ بێ ولە گوێی کانییەکەدا مارەکە بێ وبیدزێ. ئەگەر عەبدولواحید تا ئێستا بمایە بە چاوی خۆی دەیدی! لە وتاری (ئەدەبیاتی تازەو ئینسانییەت) عەبدولواحید هاوار دەکاو دەڵێ: ئەدەب پێویستە بۆ مرۆڤایەتی بێ، ئامانجی ئەو ئەدەبە بەلایەوە ئەوەیە خەڵکی فێری کردەوەی چاك بکا، ئەو ئامانجە بەسێ جۆرە کردەوەی ئەدەبی دێتە دی یەکەمیان بلاوکردنەوەی بیروباوەری دیموکراتی و دووەمیان هەستو سۆزی ئاشتیخوازیو سێیەمیان بۆ منداڵو پەروەردەکردنیان.

*** نموونەی پەخشانی عەبدولواحید:**

لە نامەیەکیدا ئامۆژگاری نەسرینی کچی دەکا:

(کچم نەسرین
تۆ دەستەخوشکەکانت
هەموو کوردێ، براکانت
پێویستە بۆ بەرزی بروانن
هەمیشە روو لە بەرزی بن
چونکە کورد بەهیچ نابێ
ئەگەر چاو لە نزمی بکا
هەموو میللەتانی گێتی
بەنەفس بەرزی گەیشتوونەتە ئومێد)

لە وتاری (بۆچی ئادەمیزاد ئەچن بەگژ یەکدا؟) دەڵێ: (سەرلەشکرەکان، خاوەن فابریقەکان، تەماعکارەکان، گەلێ جاربۆ ناوونیشانی خۆیان ماڵی ئینسانەکان ئەگرن بە قوڕو هەزاران منال بێ باوكو هەزاران ئافرەت بێوەژنو لە خۆتوخۆڕایی نەدیوو نەناسیو ئینسان ئەدەن بە کوشت. کەوابوو بۆچی لە تەربییەی منالەکانمانا بەم رووحی سەلامەتیو ئاشتییە تۆو نەکەن؟ و ئەو عەشقی سەلامەتییە نەکەین بەهەوێنی ژیانیان تا تووشی شەڕ نەبن).

لە وتاری (شەکسپیر)دا عەبدولواحید دەنووسێ: (ئەم زاتە وەجاغزادەو دەولەمەند بەچە نییە، کوری گۆشفرۆش بووە، خوا جەوهەرێکی وای تیا خەلق کردووە تەلیفاتو ئاساری لە ماڵی هەموو ئینگلیزێکدا هەیە، تەرجەمەی کردووە بەزمانی خۆی چ فائید لە حالی زیندەگانیی خۆیدا ئەم قەدرو حورمەتەی ئێستای خۆی نەدی لە کوێیە ببینێ کە لە هەموو گوزەرگاهێکی لۆندرەدا هەیکەلی دەبینرێ. ئاخ دنیا وایە ئینسانی بەقیمەت لە پاش مردن قەدری دەزانن).

لە وتاری (زەهاویش نەما) نووسەر دەڵێ:
(دنیا عەنیتکەیە!
جەمیل ئەدزێ بەلام زەهاو چۆن بەزەمیلەی خورماوە دەچێز عەنتیکەیەکی وا کە ئەمەندە بەکەڵکە هەزاران گەوهەری وەکو تۆ کە لە خوێنو ئێسقانی ئێمە خولقاون لە تەئریخا لەسەر حیسابی ئەقوام وا قەید ئەکرێن.

زەهای باوکت لە مزگەوتی هەمزە ئاغاوە پەروازەی کرد بۆ بەغدا، هیچ دڵ تەنگ مەبە. خۆ تۆ لە باقی شاعیری کۆنو زیاگۆگ ئالپ زیاتر نیت. ئەی فەیلەسووف وولاتەکەمان نەمردوو! لە دلمانا زیندووی، چونکی هێلانەی ئەسلیت زەهاوە، ماوەو شیعرەکانت ئیسپاتی بەرزی تۆ دەکا). چێژی هونەریو توانای ئەدەبیو بیری رووناك بەزمانێکی لوسو بێگەردی کوردی لەم نموونە پەخشانانەی عەبدولواحید خۆیان دەنوێنن.

*** عەبدولواحید نووری شاعیر:**

عەبدولواحید نووری بابەتی شیعری نەکردووە بەپیشە لە نووسیندا. بەهۆی ئەوەی مامۆستای قوتابخانە بووە، پیشەکە هانیداوە سروود بۆ قوتابیان دابنێ. هەر چۆنی بێ ئەو پێویستییە خەیالی شیعری لای عەبدولواحید دۆزیوەتەوە، ئیتر ئەو نموونانەی لەم بابەتەوە لە بەردەست دان لە ریزی ئەو هەموو سروودانە دەوەستن کە لە کوردستانی باشوور دانرابوون لە دوای دامەزراندنی دەولەتی عێراقو پراکتیك کردنی خوێندنی کوردی لە هەندێ لە قوتابخانەکانی شارانی کوردستانی عێراق وەکو سلێمانیو کەرکوكو هەولێر.

*** نموونەی شیعری عەبدولواحید:**

هەموو شیعری عەبدولواحید بریتییە لەو لیریکانەی بەتایبەتی دایناون وەك سروودێکی قوتابخانەیی بە ئاوازەوە دەبێژرێن.

سروودی یەکەم
ئەی فەجری جوان
فەجری ئەمەلمان
ئاسمان رووناك کە
رەوشەن کە وولاتمان
لابە تاریکی لابە تاریکی
لەسەر باغو چیامان
بلێ بەسییە نوستن
بەسییە سستی
بەسییە پەستی
ئیتر ئینتیباه

سروودی دووەم:
راچلەکێنو وریا بووین
راپەرینو هوشیار بووین
قەفەزی دیلیمان شکان
تا لە عالەمدا بژین
ئەژین ئەژین
ئێمەش وەك بەشەر ئەژین
ژیانێکی شێرانە
ئێرە ئەکەین بەلانە
ئەیپارێزین لە میکرۆب

لە میکرۆبی بێگانە
نەژی نەژی
دەوری خەرافات نەژی

سروودی سێیەم:
ئێمە کە لاوین تازە پێ ئەگەین
بۆ دواڕۆژی کورد دایم هەوڵ ئەدەین
بەئەخلاقی جوان بەعیلم و عیرفان
تەجەددود نەشر ئەکەین لەناوکوردستان
نوستبووین سەردەمێك بێ هۆش و بێ گۆش
لە ززەتی ژیانمان کردبوو فەرامۆش
بەڵام سەد شوکور هاتینەوە هۆش
بژی ئەی قەومی کورد بژی هەزار جار
بەسەتی لاوی کورد لە خەو ڕاپەڕین
وەختی تێکوشینە وعیلم وەرگرین

سروودی چوارەم:
کوڕگەل وەرن زوو با بڕۆین بۆ لادێ
لادێکان پێش خەن تا بن بەشادێ
لادێیی هەژار برسی و بەسەزمان
ئەڵێ ڕزگارم کەن لە نەخۆشییەکان
لادێیی هەژار برسی وبێ تاوان
ئەڵێ ڕزگارم کەن لە زۆردارەکان

لەم سروودا لە ڕووی ڕووخساری شیعرییەوە بەتایبەتی لایەنی قافییە، شاعیر بەزۆری جووت قافییە (مەسنەوی) بەکار هێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو مەرجەکانی پراکتیك نەکردووە، چونکە سروودەکانی بۆ مەبەسی چڕین هۆنیوەتەوە، واتە وتنیان بەو ئاوازەی بۆیان دانراوە یا شاعیر خۆی شیعرەکەی بۆ ئاوازێکی دیاریکراو داناوە. لەم حاڵەتەدا ئەگەر کێش و قافییە کەموکووڕییان تێدا بێ ئاواز بەسەریان زاڵ دەبێ و گۆی هەست بەلەنگییەکان ناکا. لەبەرئەوەیە هەموو سروودێك ئەگەر ئاسایی بخوێنرێتەوە جۆرە چێژێك بەخوێنەر دەگەیەنی، بەڵام ئەگەر بەئاوازەوە وەك گۆرانی بۆی بوترێ لە ڕێگەی گوێوە پیاو جۆرە چێژێکی دیکەی لێ وەردەگرێ.
عەبدولواحید نووری یەکەمین نووسەری کورد نییە لە سەدەی بیستەمدا لە هەرەتی لاویەتیدا ماڵئاوایی کردبێ و زیانی بەئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی گەیاندبێ. لەم جوانەمەرگانە شاعیرو نووسەری گەورەی دیکەشمان هەیە.
عەبدولواحید نووری مامۆستای قوتابخانەو ڕۆشنبیرو نووسەرو شاعیر بوو، دەورێکی گرنگ و باڵای نواند بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردنی قوتابیان. کتێبی بۆ ئامادە دەکردن، شیعرو سروودی بۆ دەهۆنینەوە، ئەمە تەنیا بۆ لاوان نەبوو بەڵکو بۆ هەموو خوێنەرو خوێندەواری کورد بوو، قەڵەمە بەبڕشتەکەی گەلێ مەسەلەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو کۆوار جێبەجێ دەکرد.
سۆزی کوردایەتی لە دەروونی عەبدولواحید نووریدا بەهێز بوو، نەتەوەپەرستێکی بێ خەوش بوو، هەرگیز سۆزی مرۆڤایەتی لەناودڵیدا برز نەبووە. خەڵکی سلێمانی و هەموو کوردو میللەتانی هاوسێ و هەموو مرۆڤایەتی خۆشویستووە. داخی گران نەخۆشی دەرفەتی نەدا زۆر بژی. کردەوەی لەم ژیانە کورتەدا بەرهەمێکی بەنرخە لە مێژووی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا"[١٣].

*** لوتفی (١٩٠٥ - ١٩٨٩):**

پەیڕەوی قەیسی بێچارە لازمە بۆ من ئیتر
هەر ڕەفیق وەحشی دەشتیو دووری دایكو باوەكەم
سەد وەكو لوقمان كە بێتو كوا ئەكا دەرمانی دڵ
دیدەنی ئەوكافییە بۆ زامی جەرگوناوەكەم

*** ژیانی:**



(لوتفی كوڕی شێخ ڕەزا شێتەی كوڕی مارف قوولە)یە، لە نەوەی (شێخ حەسەنی گڵەزەردەی بەرزنجی)یە، لە ساڵی (١٩٠٥) لە گوندی پەڵكانەی ناوچەی قەرەحەسەنی كەركوك لەدایكبووە. (لوتفی) كردووە بە نازناوی شیعری، لە تەمەنی شەش ساڵیدا لە حوجرەی مزگەوتی گوندی (قۆین پەلك) لە ناوچەی (خورماتوو) خوێندوویەتی، لە پاشانا چووە بۆ كەركوكو لە مزگەوتی نائیب ماوەییەك بووە بە فەقێ، ئینجا (شێخ عەبدولكەریمی دارەخورما)ی خاڵی ناردوویەتی بۆ گوندی (دیبەگە)ی ناوچەی مەخموور، دوو ساڵ لەوێ خوێندوویەتیو گەڕاوەتەوە ئاوایی لەیلان لە كەركوك، ماوەیەك لەوێ خوێندوویەتیو ئەوجا ڕووی كردووەتە گوندی (خاڵۆبازیانی)، لێرەدا زۆر نەماوەتەوە گەڕاوەتەوە كەركوكو لە مزگەوتی (ئیمام قاسم) نیشتووەتەوە. دوا قۆناغی خوێندنی حوجرەی لە خانەقای (سەید ئەحمەد) بووە، لای مەلایانی گەورەی ئەو سەردەمە خوێندوویەتی. لە كاتێكدا ئامادە بووە خوێندنی تەواو بكا ئیجازەی مەلایەتی وەرنەگرتووە. زۆربەی ژیانی لە ناوچەكانی (ساڵەیی)و (شوان) بردۆتە سەر، خەریكی كشتوكاڵ بووە، بە زۆری بۆی نەهاتووەو دەست كورت بووە.

لە ساڵی (١٩٣٩) لە كاتی كردنەوەی ڕێگەی ئۆتۆمبیل لەنێوان هەولێرو ڕەواندوز بووە بە چاودێری كرێكارانی كارگێری ڕێگەوبان، بۆ دابینكردنی گوزەرانی لە كاركردن نەوەستاوە، هەندێ جار كاری میری پێ سپێراوە بۆ ماوەی دوو ساڵ لە (١٩٥٩) مووچەخۆر بووە لە شارەوانی كەركوك، هەندێ جاریش لە گوندەكانی ناوچەی (ساڵەیی) مەلایی كردووە. لە سەرەتای هەشتاكانی سەدەی بیستەمەوە كە دوا قۆناغی سەردەمی پیربوونی بوو لە گەڕەكی ڕەحیماوە لە كەركوك نیشتەجێ بووە. لە ڕۆژی (٢٣)ی ئایاری ساڵی (١٩٨٩) لە كەركوك كۆچی دوایی كردووە.

*** شیعری:**

لوتفی وەك شاعیرێكی ئاسایی و لاسایی شیعری كلاسیكیو میللیی كوردی دەكەوێتە ڕوو. بەرهەمی شیعری لەم لایەنەوە لە بەرچاوە. بایەخی بەهەردوو بابەت داوە بە قەوارە شیعری عەرووزیو كێشی میللی هێندەی یەكترین. لە شیعری عەرووزیدا تەنیا بەحرەكانی (ڕەمل، هەزەج، مەدیدی) بەكارهێناوە. لە یەكێتیی قافییەدا دەنگەكانی ئەلفوبێی كوردیو عەرەبی: (ا ب د ر غ م ن (ە - ـە) ی ێ)ی بەكارهێناوە، لە پاش قافییە ئەم وشانە لە شیعریدا بەرچاو دەكەون: ئەكا، كرد، منم، خۆم، ئەكەم، نییە، هەیە، ئەبێ، ئەوی، بم (ببم).

شیعرە خۆمالییەكانی لە ڕووی كێشەوە زۆرن، لەمانەدا كێشی دە بڕگەییو كەمتریش حەوت بڕگەیی بەكارهێناوە، قافییەی ئەم جۆرە شیعرەی مەسنەوییە، كەچی لوتفی یەكێتیی قافییەی بۆ ئەم جۆرە شیعرە بەكارهێناوە. ئەمە دیاردەیەكی دەگمەنەو كەم شاعیری كورد ئەم دەستوورەیان بەكاهێناوە. قەسیدەی بەندی چواریتی هەیە (١١١ ب). زمانی شیعری ئاسانە، وێنەی ڕەوانبێژی زۆر نییە. لە ناوەڕۆكدا مەبەسەكانی ئایینیو دڵداریو وەسفو نیشتمانپەروەریو كوردایەتیو ستایشو ماتەمنامەی هەیە. جار جارە دەم لە كۆمەلایەتیو سیاسەتیش دەدا. لە سەرانسەری دیوانیدا هەست بەرەشبینییەك دەكرێ لە بیری شاعیردا. ئەمە لە پێشانا لە ئەنجامی هەڵسوكەوتی پەرێشانیو هەژاری خۆیو لە پاشانا لە هەڵسوكەوتی نالەباری كۆمەلایەتیو مەسەلەی نەتەوەیی كورد هەڵقوڵاوە.

*** نموونەی شیعری:**

**- دڵداری:**

لە شیعرێكیدا لوتفی دەڵێ:

چاوەكانت بووەتە باعیس ئەشكی ڕوونی چاوەكەم
تیغی ئەبرۆت باعیسە بۆ مەنعی خوردو خاوەكەم
غەمزەكانت هەروەكو تیرە لە دڵ تەئسیری كرد
بووەتە مەنعی خواردنو خەوزینو نانو ئاوەكەم
دڵ وەكو ڕاوچی ئەویش وا بووەتە كار ئاسكی خەتا
من خەتاكارم لە بۆیە بووەتە مانیع ڕاوەكەم
بێ خەبەر وەك وەحشی وا بووم هەر ئەسووڕام دەشتو دەر
هەروەكو تەیرێ لە ناكاو تووشی دانو داوەكەم
پەیڕەوی قەیسی بێچارە لازمە بۆ من ئیتر

هەر رەفیقی وەحشی دەشتی و دووری دایك و باوەکەم
سەد وەك لوقمان کە بێت و کوا ئەکا دەرمانی دڵ
دیدەنی ئەو کافییە بۆ زامی جەرگوناوەکەم
بەس تەمەع (لوتفی) بکە دونیایی دوون باقی نییە
غەم بخۆ بۆ مردنی خۆت کوانێ تۆپی جاوەکەم

ئەم گێتییە دڵدارییە شاعیر خۆی دروستی کردووە بۆ وەسفی برۆو غەمزی دلبەر، راوکردنی دەشت خەتاوخوتەنی ئەفسانەی چین و باسکردنی قەیسی بێ چارە. لەناوهەموو ئەو گێتییە دڵدارییەدا شاعیر شپرزەیی ژیانی خۆی لە بیر نەچووەتەوە، راستە وێڵ و سەرگەردانە لە دەشت و چۆڵ لەیلا دەگەرێ، بەڵام لە باوك و دایکیشی دوورە، شیعری ئەو لە هەر بابەتێك بێ لە واقیعی ژیان تاڵی خۆی و رەشبینی دووری ناخاتەوە.

**- کوردایەتی:**

مەسەلەی نەتەوەیی کورد هەمیشە لە هەڵبەزین و دابەزیندا بووە، ئەمڕۆ لە خۆشی و سبەینێ لە ناخۆشیدا بووە، لوتفیش وەك شاعیرانی دیکە ئاوڕی لەم دیاردەیە داوەتەوە.

لە شیعرێکیدا لوتفی دڵشادەو دەڵێ:

کوردستان مژدە بەیانی داوە!
خۆر لەسەر شاخت گوێچکەی کێشاوە
سەیری دنیاکە لە خوارو لە ژوور
هەمووی بە یەکجار لە خەو هەڵساوە
هەر کەس لەم رۆژە سست بێ بزانە
ئەو لە کاروانی میللەت جێماوە
رۆژ رووناك شەوقی دا لە کوردستان
دووکەڵی غەم و غەدری پێچاوە
چەن ساڵە کە تۆ وا خەبات ئەکەی
بە جەورو خەفەت دەردو سزاوە
داری بەختەکەت وا هاتووەتە بەر
شنە شنێتی بەدەم سەباوە
زۆر ئاگادار بە دوژمنی ناکەس
تێکی بشکێنی و بیخاتە لاوە
پشتی یەك بگرن ئەی میللەتی کورد
لە هەر کوێیێ هەن لە رووی دنیاوە
لە بیرتان نەچێ دەستم بەدامان
لەو غەدرەی کەوا لە کورد کراوە
خزمەت بێگانە زۆر بێ بەقایە
مەعلووم خزمەتکار هەر دەرکراوە
(لوتفی) بێنە یاد کردەوەی پێشوو
دەرحەق بە کوردان کە چی کراوە

ئەم شیعرە بۆ پێشوازی بەیانە گرنگەکەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) دانراوە، لە ئەنجامی راپەرینی کوردی عێراق لە شەستەکانی سەدەی بیستەدا ئۆتۆنۆمی بەناوی هەرێمی کوردستانی عێراق دامەزرا، کەچی فێڵ و فەنەری کاربەدەستانی بەغدا لە بنەڕەتدا بەراستیان نەبوو، تەکتیکێك بوو بەکاریان هێنا بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد لە داهاتوویەکی نزیکدا. هەڵەی کورد خۆی و رێگەدان بەوەی جڵەوی ئەسپەکەی بکەوێتە دەست هاوسێی بێگانەی دوژمن بووە هۆی تێکشکانی شۆرشی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١)ی کوردستانی عێراق و ئۆتۆنۆمی سەر ئەگرێ و کورد بکەوێتەوە دابەزین و ناخۆشییەوە.

لوتفی ئەم تێکشکانەی شۆرشی ئەیلولی ساڵی (١٩٦١) بەم جۆرە وەسف دەکا:

کوردە نازانی کە چی رووی داوە!
دنیا بەجارێ چۆن شڵەژاوە
گەورە تا بچووك گشت دەردەدارە
هەر یەك بە جۆرێ بە غەم دووچارە
عەقڵ و شوعوورت داخوا چۆن ماوە
فرمێسکی چاوتت وەك خوێناوە
لە هەندێ جێگە خوێن وەك لافاوە
چەند نەوجەوانان بە بێ گیان ماوە
ئەوەی هەژارە یەکجار خوراوە
بنیادی بێ رووح بە پاوە ماوە
چەپۆکی دوژمن وەك تەزرەی بەهار
لە هەموو لاوە بۆ کوردی هەژار
دەخیل بەدەرگات ئەی خودای گەورە
پەنامان بدەی لەم چەرخ و دەورە
بە شەو عەزابی گورگی ئادیار
بە رۆژ گیرۆدەی جەنگی سەگی هار
رێگەی رزگاری لە هیچ لا نییە
ئەی خودا هاوار چارەمان چییە!
خۆت رەحمێ بکەی تەنیای فەریاد رەس
چۆن بۆ بێکەسان هەر تۆمان هەی کەس
رەببی بۆ خاتر فەخری ئەنبیا
رزگارمان بکەی لە شوومی سیا
(لوتفی) با بەس بێ گریانی بێ سوود
رازی بە تەقدیر خالیقی مەعبوود

ئەمە وەسفێکی میللییانەو شاعیرانەی کوردە لە دوای تێکشکانی بەیانی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٠) لە (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧٥). لێرەدا لوتفی مێژوونووس نییە رووداوەکان تۆمار بکا، بەڵکو بە گشتی وێنەی هەست و ئەستی ئاوەوەی کەسی کورد دەکێشی. فرمێسکیان بۆ دەرێژێ و لە کردگار دەپارێتەوە لە کارەساتی دیکە بیانپارێزێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا لوتفی دەڵێ:

دڵ لە دووریت وا دیارە مەیلی گریانی هەیە
هەورەکەی میحنەت ئەهات و تاوی بارانی هەیە
وا لە شاخ و چۆڵا خەوتوو چاو بە ئەشك و دڵ بە غەم
ئیمڕۆ رۆژی شادی کوردە کەیفی شارانی هەیە

زۆر لە مێژە تێئەکۆشێ کاکە بۆ تۆ خاکەکەت
دڵ ئومێددارە کە ئەمجار فیکری جارانی هەیە
ڕووم نەبوو من دابنیشم تێکەڵی وەجبەی ڕەفیق
وا ئەزانم ئیمرۆکە دڵ مەیلی خەندانی هەیە
داری بەختم روو لە وشکی ڕۆژ بە ڕۆژ هەر کز ئەبوو
ئیمرۆکە چوزرەی دیارە ڕۆژی نیسانی هەیە
خادیمو جاگیر مەبە ئەی کاکی خۆم بۆ هیچ کەسێ
عالەمیش وەك تۆ بۆ ئەمرۆ گشت گریبانی هەیە
(لوتفی) باغی ئەمەلی تۆ هاتە بەر چاو هەڵبرە
هەر لە سایەی حەمدی خواوە تەیری خۆشخوانی هەیە

لە سەرەتادا ئەم شیعرە ئەوەی دەگەیەنێ شاعیر لەبەر دووری لە یار هەمیشە شینو شەپۆرو واوەیلایەتی، لە پاشانا دڵشادو گوشاد دەبێ کە بە دیداری ئەو یارە شاد دەبێ، وەك لیریکێکی دڵداری دەکەوێتە بەرچاو، راستییەکەی ئەوەیە ئەم شیعرە لە ساڵی (١٩٤٦) هۆنراوەتەوە لەو کاتەی کۆماری کوردستان لە مەهاباد دامەزرا بوو، پێش ئەوە شاعیر پەشۆکا بوو بۆ کورد، لە دواییدا کە لە کوردستانی ئێران سەربەستی دەست خست، بوو بە ڕۆژی شادی بۆ شاعیر، چونکە سەربەستی کورد ڕەمزی دڵبەرەکەی شاعیر بوو. لە خوێندنەوەی ئەم لیریکە لە رووی کێشو قافییەو پاش قافییەو وشەو دامەزراندنی ڕستەوە شێوازی نالی دێتەوە یادی خوێنەر.

**- ستایشی عەشرەتی شوان:**

لە ستایشی عەشرەتی شواندا لوتفی دەڵێ:

ئەوەندە گەرام لەسەر رووی جیهان
داوودەو بەیات چوار کۆمەی شێخان
زەنگەنەو جەبباری هەمەوەند تەواو
جاف گەڵباغی گەلاڵی گۆران
پشدەرو مەنگوڕ هەم دەشتی بیتوێن
شارەزوور هەموو هەتا بازیان
نەمدی خاکێکی وەك خاکی شوان
هەوای دڵگیر لێ بۆ دانیشتوان
دەك ئاوەدان بی بەهەشتی کوردان
ئەرازی بێ عەیب جێگەی دەغڵو دان
شوبهە بە بەهەشت سەرچاوەی باغی
مێرگو وەنەوشەو نێرگسو ڕەیحان
زۆربەی دێهاتی هەمووی چەماوە
زەرعاتو میوە دارو دارستان
مەرعای یەکتایە بۆ مەرومالات
چەمو ئاوی زۆر وەك باغی جینان
لەگەڵ سەگرمە عەداوەت ئەکەن
بەرامبەرییەتی چیای خاڵخاڵان
من ڕجام وایە لە خزمەت باری
دایم مەحفووز بن لە بەلای جیهان
دوور بن لە غەمو دەردو موسیبەت
بژین بەختەوەر شادو کامەران
(لوتفی) گەر راستە قسەکانی تۆ
بۆچی بەجێت هێشت ڕات کرد لەناویان

لەم شیعرەدا (لوتفی) لە عەشرەتی (شوان)و ناوچەی (شوان) دەدوێ لە کەرکوك. لە شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) دەکا بۆ قوتابیان هۆنرابێتەوە لە بارەی جێگەو شوێنو جوگرافیای ئەو خاکەی عەشرەتی شوانی لێ دەژی. یادی داوودەو بەیاتو زەنگەنەو جەباریو هەمەوەندو جاف گەڵباغیو گەلاڵیو پشدەرو مەنگوڕ دەکاتەوە. باسی هەرێمو ناوچەکانی شێخانو بیتوێنو شارەزوورو بازیان دەکات، هەموو ئەمانەی بۆ ئەوەیە بڵێ ناوچەی شوان لەمانە جوانترو ڕەنگینترە. هەروەها یادی چیای سەگرمەی ناوچەی سەنگاو دەکاتەوە، چیای خاڵخاڵانیشی لە یاد نەکردووە چونکە بەڵگەی جوانی ناوچەی شوانە. شاعیر بە وتەیەکی کۆمیدی جوان کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ کە بە خۆی دەڵێ بۆ چی ئەم جوانییەت بە جێهێشتو لەناو ئەم خەڵکە چوویتە دەرەوە!

(لەتیفی کوڕی شێخ ڕەزا شێتەی بەرزنجی) ناسراو بە (لوتفی) لە ئەدەبی کوردیدا شاعیرێکی ئاساییو دیارە. بە ڕووخسارو ناوەڕۆك زۆربەی بابەتەکانی شیعری عەرووزی کلاسیکیو خۆماڵی میللی هەیە، بەشی زۆری بەرهەمی لە نیشتمانپەروەریو کوردایەتیو کەموکووڕی کۆمەڵایەتیو ئایینی دەدوێ. ناوەڕۆکی شیعری ڕەنگدانەوەی دەست کورتیو هەژاری ژیانی تایبەتی خۆیو بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوەکەیەتی، ئەمە هەموو بووەتە هۆی ئەوەی ڕەشبینی دڵو دەروونی داگیر بکا"[١٤].

**"* شاعیر (بەرزۆی پەری) کەرکوکی:**



شاعیر بەرزۆی پەری ناوی (رەفعەت ئەحمەد عەلی جانی بووە، نازناوی بەرزنجی)یە لە (١٠) تەموزی ساڵی (١٩٠٩) لە گەڕەکی موسەڵلای کەرکوك هاوشێوەی (خەلیل منەوەر) و (هێجری دەدە)ی شاعیرو مێژوونووس (رەسول حاوی) لە گەڕەکی تایبەتی کاکەییەکانی موسەڵلای کەرکوك لەدایکبووە، لە دایکێك بە ناوی خاتوو (فاتیمە)ی کچی باقی.
ئەگەرچی شاعیر نازناوی بەرزۆی پەری بۆ خۆی هەڵبژاردوە. کە خەڵکی پەری بە دایکی ئەو دەزانن. لە ساڵی (١٩١٣) باوکی دەچێتە دۆنو شاعیر خۆیو دوو برای بەناوەکانی (ئیسماعیل)و (شکور) لە ساڵی (١٩١٦) دەچێنە گوندی (فەیسەڵییە)ی عارەبکۆیی کاکەییانی قەزای (داقوق)ی کەرکوك.
وەك هەر منداڵێکی سەردەمی عوسمانی دەخرێتە بەر خوێندن لە قوتابخانەیەکی تورکی زمانی ئەو رۆژگارە، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٠ لە گەڵ برا گەورەکەی دەچنە شاری بەغداو دیسان خراوەتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی فەزڵی سەرەتایی لە پۆلی پێنجی دادەنێن و بەهەردوو زمانی تورکیو عەرەبی دەخوێنێ.
دوای دەرچوونی لە پۆلی شەشی سەرەتایی لە پەیمانگەی زانستی وەردەگیرێت لە ساڵی (١٩٢٢) لە (باب موعەزەم) وەك خۆی نووسیویە (اما بعد ان مؤلف هذا الكتاب بديوان المعشر) هو رفعت احمد من اصل ونسب عراقي ولد في ١٩٠٩/٧/١٠ بمدينة كركوك محلة المصلى وفي سنة ١٩١٦ هاجر ابيه الى ناحية داقوق مع كافة اسرته وادخله في مدرسة ابتدائية تركيية، وبعد وفاة ابيه هاجر الى بغداد في سنة ١٩٢٠ وانتمى الى مدرسة الفضل الابتدائية بالصف الخامس الابتدائي ودرس باللغتي العربية والتركيية، ولما اكمل دراسته من الصف السادس الابتدائي انتمى الى مدرسة المعهد العلمي ببغداد في سنة ١٩٢٢ بباب المعظم مقابل جامع سليمان باشا). لە چەند دێڕێکدا نووسیویە:
(ئاخر سەرەنجام پەی علمو ئاداب
پەناش بەرد وەزات دەهندەی وەهاب
شەو چە مەدرەسە رۆژ وە قورکاری
دەوامش مەکەرد چار ناچاری
چە فەزل ئیحسان فەرد تەنهای تاك
خالق شەوو رۆ جەهاندار پاك
تا سەف سەهەم متەوەستەش
سەرانسەر وانا علوم بێغەش
(معهد العلمی) عاسیمەی بەغداد
(تەوفیق و مەعروف هەردۆ مام ئوستاد)
ئەمجا دوای چەند ساڵێك دێتەوە بۆ ناوچەی (کاکەیی)و خاتوو (عەزیمە)ی کچی (شکور دەروێش ئیسماعیل) دەبێتە هاوسەری، دوو کورو کچێکی هەیە بەناوەکانی فاخیرو کاوەو نەجیبە. لە ساڵی (١٩٢٥) چووەتە ریزی سوپای تازە دامەزراوی سەردەمی پادشایی لە عێراق لە وەزارەتی بەرگری پلەی عەریف بووە، چەند وڵاتێکی وەك بەحرێنو پاکستانو هندستانی دیتووە.
(بەرزۆ) بەهۆی ئەوەی خوێندەوارێکی چاکی سەردەمی خۆی بووە شارەزایی تەواوی پەیدا کردووە لە زمانەکانی عەرەبیو تورکیو فارسی، هەندێ زمانی ئینگلیزیشی زانیوە، سەرەرای ئەمانە زۆر شارەزای شێوازو شێوەزاری ماچۆی گۆرانی زمانی کوردیو شێوازەکانی گەرمیانو لەکییو کرماشانیو خانەقینی دەبێ.
مامۆستا (بەرزۆی پەری) لە ساڵی (١٩٣٥) کتێبێکی دەستکەوتوە گوایە بە زمانی عەرەبی نووسراوە بە ناوی (زەبوور)و لە ماڵی یەکێك لە کەسایەتییە گەورەکانی کاکەیی لە کەرکوك، هەر وەکو پارساڵ رۆژنامەکانی کوردستان بڵاویانکردەوە دەسنووسێکی نایاب بە نێوی (زەبور حەقیقەت) لە وڵاتی نەرویژ لای کەسێکی یارسانی پارێزرا بووە ولە جانتایەکی زۆر کۆندایە، بەندە وەك خەڵکانی تر چاوم بە یەك دوو وێنەی کۆپی لاپەڕەکانی کەوت بەڵام خۆزیا بمزانیبا بە تەواوی چی تێدا نووسراوە تا لەگەڵ ئەو دەسنووسەی لە کوردستانی ئێران. ئەگەرچی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە فەرمووودەکانی سەردەمی سەیدبراکە لە خۆدەگرێت! جگە لەوە نووسەر(عەباس عەزاوی) لە کتێبی (الكاكائية في التأريخ) دەگێرێتەوە گوایە کاکەییان کتێبێکیان هەس دەدرێتە پاڵ (داود) کە زاتێکی گەورەیانە بەنێوی (زەبور داود)و نوسخەیەکی لا پارێزراو بووە بەزمانی عەرەبی نووسراوە دەسخەتەی بەرزۆی پەری بۆم دەرکەوت لە هەموو باخێك گوڵێکی هێناوەتە نێو ئەم کتێبە لە تەفسیرو چیرۆکی ئاییینیو رازو سەرگورشتەی باوی ناوخەڵکان کە ئەو سوودی لەو دەقانەی ژێردەستی بینیوە، چونکە هەر خۆی ئاماژە دەداتو دەڵێ: (نەقڵ کەردیم)، هاتوە بە زمانی ماچۆیی گۆرانی کوردیو کرمانجی باشوورو شەبەکیو کاکەییانی موسڵ نووسیویەتییەوە، ئەو وشەو موفرەداتە زمانەوانییەی بەکارهێناوە کە تەنیا ئەم تێهەڵکێش کردنە زمانەوانییە لە ئەدەبی پیرۆزی یاراندا هەیە، واتە کاری ئەو تەنیا وەرگێران نەبووە بەڵکو دارشتنی بیروباوەری خۆیشی هێناوەتە ناو بابەتەکانو تێهەڵکێشی کردوون، چونکە ئەو مامۆستای

ئەدەبی یارسان بووە بۆیە ئەم كارەی بە شاكارێكی ئەدەبی و ئایینی دێتە ئەژمار.

لەبەر ئەوە دەبینین ناونیشانی كتێبەكەی بەمجۆرە نووسیوەتەوە: (كتاب حەقیقەت ثنائي موعجەم گولستان یاری ئەحكام زەبور ئایات ئەنوەری سولتان سەرجەم ئەسرار باتن پەروەردگاری، مەجمەعەی پردێوەری نەقلەن بە قەلەم خادم الفقراء والمساكين رفعت احمد علي جاني درقريه وعربكويى)، كە یەكێكە لە گوندەكانی كاكەیی داقوق. دەبینین زۆر جار گوێی بە كێشی شیعر نەداوەو قالبی شكاندوە، لە كێشی خۆماڵییەوە دەچێتەسەر كێشی سەبكی شیعری عەرەبی، یان هەندێ جار دەچێتە خانەی پەخشانەوە. برێجاریش هەست دەكەی تاكی دێرێ شیعر دیاری نییە، بەڵام لەراستیدا خۆی وایە بەهۆی كاری وەرگێرانەوە. بەرزۆ بەهۆی زیرەكی و ئاگاداری لە رۆژنامەو گۆڤارەكانی بەغداد ساڵانی سی تا پەنجاكانی سەدەی رابردوو، هەروەها كتێبە ئایینییەكانی تەورات و ئنجیل وقورئان و بیروباوەری سۆفیزم و عەلەوی بەكتاشی و كاكەیی زانیارییەكی زۆری پێ دەبێ، چونكە كتێب خوانێكی كەم وێنە بووە، زۆر رووداو بەسەرهاتی نێو كتێبەكانی بۆ خەڵكی گێراوەتەوە كە بروا پێكراوە بن یان نە بەڵام وادیارە هەندێ كەس قسەی ئەویان داوەتە دواوەو بە پەسەند نەزانیوەو گاڵتەیان پێكردوە بە تایبەتی كاتێك لە تەمەنی (٦٧) ساڵی دا دەبێ وبۆ زاتێكی كاكەیی نامەیەك دەنووسێ وتێدا هاتووە:

چونكە چي دونیا رەفعەت بێ هەوان
واتەی حەقیقەت دائیم نارەوان
هەنی ویدەستور هەم چەیانەی وێش
نەدارۆحورمەت چەلای قەوموخوێش
مەوانۆ علوم ئەرزو ئاسمانی
بی وە قەشمەر جار ئی دونیای فانی
چونكە مەوانی قورئان و زەبور
چە لای ئەهل حەق مەندازام وە دور
كتاب ئافەلین؟ تەورات موسا
مەزموور داود ئنجیل عیسا
موعجەم ئادەم قەول ئدریسا
مەنبەع حكمەت شای ئیسقلیوسا
صوحف قارونی هاروت و ماروت
بەلاغ دەستوور یونس بطن حوت
چەنی سەرەنجام یوسف صدیق
یەعقوب و ئیسحاق كیتاب تەوفیق
صوحف ئیبراهیم ئەو ذو المنجنیق
طلیعت قەدیم سولتان رشید
شەرت بو خائیل وە عالم تەحقیق
شای صاحب طوفان ئەركان وفیق
باقی سەرەنجام سلطان سەروەر
كەلام قدیم كوشك و پردیوەر
ئیمجار وە تەحقیق ئی بەندەی كەمتەر
چە حاڵات وێش نە دارۆ خەبەر
هەفتادو دودین چەوسەر مەبۆجەم
وە قەول و قەوار شای صاحب كەرەم
هەركە وەراستی دینش پەرەستەن
چەوسەر چە شەراب الطهور مەستەن
هەركە وەراستی چەفتۆ بی چە دین
عەزابش مەدا چەنی ئافەلین
هەركە طعنــەش داوە دینێ دیگەر
وەقتێ بەرمەشۆ وەراگەی مەحشەر.
قەبوڵ نمەبۆ كردارش چەوسەر
ئانە مەگۆراش وە حەیوان و هەر

یانیش دەڵێ:

هەم وێنەی (ئنجیل) ئایات (قورئان)
ئەوەڵ و ئاخر كلامم وانان
ئیختیارێكم شەست و هەفت ساڵی
چە ئەسرار غەیب هیچ نەویم حاڵی
بێ هەوای حەیات ئی دنیای فانی
رەنج هیچ و پووچ قەباڵەی خاڵی
چە قاڵ قەدیم حەتا وە ئارۆ
قەباڵەی خاڵی قیمەت نەدارۆ
قیمەتش چێشەن پركەندەی دەهری
پیرو كەمەر كۆم چەفتو چەمەری
شەوكۆرو كوترم نادان عەصری
ویەردەی ئەوقات بەزم و قەشمەری
یەعنی وێنەی وێم بەحسس مەكەری
فتورفانی كۆچ و سەفەری
پەرێ شەوق دین زەرەی زاتم بی
راگەی دوور مەنزڵ كەس نەهاتم دی
شوعلەی پر چەنور مەودای سەبەبساز
دەهەندەی ئاچال راهیو جائەنداز
ئی كەراماتە چە خەیر تا وە شەر
ئیرادەی وێتەن ماریمان وەسەر
ئێدەن شەرح حاڵ كەمینەی كەمتەر
باقی والسلام وەرحمەتو الله اكبر
١٩٧٦/٤/٣٠

مام عەزیز بۆی گێرامەوە كە بەرزۆی پەری چۆن ئەم نوسخەیەی بۆ نووسیوەتەوە، وتی داوام لێكرد نوسخەیەكم بۆ نەقل بكات، ئەویش پێی وتم باشە، چووم دەفتەرێكەم بۆ كری بە (٨) پەنجایی و قەلەمێ پاركەر، دوو شوشەی حبر كە رەنگیان رەش و شین بوو، بەرزۆی پەری بە یەكساڵ و دوومانگ بۆی نەقل كردم واتە لە ساڵی (١٩٨٥)، هەتاكو كۆچی دوایی كرد پەیوەندیمان هەبوو. شاعیر لە (٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٠) لە كەركوك كۆچی دوایی كرد.

*** (عێراق و دەوڵەتی عوسمانی):**

شوکرانەم بە تو رب العالمین
خالق شەوو رۆژ ئاسمان و زەمین
ئیلاهی بە حەق تاکو تەنهائیت
پەنا وە حورمەت دەوام باقیت
بوگزەر چە تەقصیر تاوان کەردەم
چە باس و ئیخبار ئەولادەی ئادەم
ببەخشی بە ویت سەرپاك عالەم
داوای دەنگوباس دیوان مەعشەر
پەی موتالەعەیی دانای پڕ هونەر
چە ساڵ دەهەم هەزارو نۆصەد
مەردان عێراق ئیدیعاشان کەرد
شەرح و مەتالیب حقوق ئینسان
شەرت و عەدالەت تەحریر ئەوتان
ئەوراق تەحریر مساوات جەم
تەقدیمش کەردەن پەی صدر الاعظم
فیعل واقیعی تاریخ ئەسبەق
کەوکەبەی ئەشراف ئیعتیماد حەق
شروت مەتلەب سەرانسەر تەمام
ئیزهاربی نە پێش دیدەی خاسوعام
تەصفییەی حقوق ئەوتان عەرەب
ئیجرا بۆ تەنفیز شروت مەتلەب
(محمود شوکت)و (نوری نیازی)
وزەرای دەستوور سوڵتان غازی
چە قوتر عێراق حەتا ئەستانبوڵ
وە رایوو تەدبیر کەردشان قەبوڵ
پەی (عبد الحمید)، خاقان ئەعزەم
کەردشان تەعەریف مەتالیب جەم
عبد الحمید خان نەکەردش قەبوڵ
حەتا وە گفتار ئەهل ئەستانبوڵ
وەعەکس مەجلیس ئەرکان دەوڵەت
وە تەعبیرشان نەکەرد قەناعەت
واتش وەمەودای میصری خەتەرناك
وەنێزەو کەمەند سەرحەلقەی فتراك
دەوڵەت عولیای عوسمانی دیار
حوکمش ڕەوابی چەعەرصەی پەیکار
وە حوکم عولیای فەردی جەبەرووت
ماواش وستە تەوە یانەی عەنکەبووت
ئاخر سەرەنجام چە ئەرجای مەغمور
عالەم وریزا وێنەی نەفخ صوور
چەرێی حورییەت مەکەردن هاوار
هەم پەی مساوات حقوق ئەقتار
جەندرمەی نیزام شار ئاستانە
مەکەردن تەفتیش یانە وە یانە
وەلاکن عالەم دەس وە چەپ و گورز
نە چەننە قەلعە تا قەصر یولدوز
ئەوەندە مەردم مدرا وە پاوە
رای مووری ئەمەند بشۆ وە راوە
پەی وەعدون پەیمان مەجلیس داقەرار
سوڵتانش چە عەرش ئاوردەن بە وار
هە چە ئەستانبول حەتا وە بەغداد
دەستوودان وە دەست (محەمەد رەشاد)
محەمەد رەشاد نیشت نە تەخت زەڕ
تاج خاقانیش نیا نە فەرق سەر
(سکەی رەشادی) بەر ئاما وەبەین
(عبدالحمید خان) شیا وە (بەحرەین)
عەدل و حورییەت چەنی مساوات
قەراردا چە بەین گرد ئەرجای وڵات
وەیحاڵە دوو ساڵ چە حوکمش ویەرد
ئاخر سەرەنجام ئینتحارش کەرد
(وحید الدین)ش چەوسەر ئاوردەن
وە تاج باوەش تەتەویجش کەردەن
ساڵ چوارده بی هەزارو نۆصەد
(حەرب عالەمی) جەهان وەپا کەرد
بەردەهار جەنگ ئەسلیحەی ناری
پەراشەی پرشنگ ئاورش واری
بی وە مەغلوبەی جەنگی شەب و ڕۆژ
دەبانچەو تفەنگ تۆپ و مەترەلۆز
ئۆردوگای دەوڵەت عەلییەی عوسمانی
داخل بی وەحەرب عوزەمای جەهانی
چە قوتر عێراق مەکتبش نەوی
زەربەش دا نە جەرگ ئاسمان و زەوی
سوڵتانی بەغیز وەك (عبد الحمید)
خەڵکش چەوەتەن وێشکەرد نائومید
نە خۆندەواری نە خەستەخانە
نە عیلم و ئاداب کۆنە زەمانە
هەرکە وانا بی جوزئێ ئەلیف با
مەواتن وەنەش (مەلا)و (مامۆستا)
ئەو رۆژە مەلا ئەولیاشان بی
عاهات و سەقام مرتداشان بی
سەبەتەی ترێ وە هەنجیرو توو
لەگەڵ مێشولە وەهەم تێکەڵ بوو
تۆکڵە کاڵە کوو شامی و شەمامە
پەی زەردەواڵە کۆ بی چانامە
زبیل وەك خەرمان چە بازار عام
پەی سووتەمەنی کولخان حەمام
شارعان عام وە بێ تەنزیفات
قوسماخ سەرشدا چە ئەنحای وڵات
بی حیلم و بێ عیلم مروور زەمان
رشکن و چلکن تەن لوخت و عوریان
چیلاوە ئیعلان دا وە (نەفیر عام)
وە بێ موراعات قانون و نیزام
وە کوللی کەسێ موعاریز بیشان
پەی مزاوەلەی حقوق ئینسان
شەرعەن چەخزمەت بیمارەن مەعزوور

ئەجاتش نەوێ چەدەست مەئموور
مەئموور دەوڵەت چەندرمەی نیزام
چەمکەردن چەخەڵك مەوجوود تەعام
وەك حاجی ئامیق قۆماندار چاك
عەشائر چەخۆف حوکمش بی هیلاك
هێسترسواران صەف صەف جوداکەرد
عەنبارو دیپو دەوڵەت وەپاکەرد
تفاق و تەرتیب مەفرەزەکانیش
ئەرزاق لەشکر وە توربەو دانش
تەشریفش ئاوەرد پەی شار کەرکوك
پەی تالآنی یەو گەندمو چەڵتووك
ئەتراف کەرکوك عەشرەت وەعەشرەت
دەغڵو دانشان کێشا پەی دەوڵەت
چە کولل مەکان ئەی کارە کەردن
ئەسعار تەعام هورێزا وە بان
بەرشی چەتەمکین ئەغڵەبەی ئینسان
یاوا وە (داقوق) مەفرەزەکانش
پەی گەندمو یەو وە توربەو دانش
ئاخر سەرەنجام نە چەم رۆخانە
بی وە سەرکۆنەش واتەی زەمانە
وە حیلەی گەندم کەسێ بەردەبیش
بی عیلمو شاهید چانا کوشتەبیش
کاتێ زانامان چە وەعدەی شروق
جەنازەی حاجی یاوا وە داقوق
منارەی جامع هارون الرشید
ئاسارش تێدا مەیۆتان وە دید
وە سای منارە تابوتش یاوا
دەردەم وەو شۆنە عەیالش ئاما
فوغانو فریاد زایەڵەی زەبوون
چەسەر جەنازەش وە چەنگو ناخوون
حەڵاڵش سەرەی وێش ئیتیلاکەرد
خالآن نە جەبین جامەش جوداکەرد
جەهلو نەفامی ئەهل زەمانە
عاریفەی کەلام کەرد وە دێوانە
هەرکە بەرمەشی وەنام بازار
دیدەش پڕ مەبی چە تۆزو غوبار
حالآتێ هەنی پەیدابی چە خەلك
ژەن مەدا وە مێرد وە زەرب کوتەك
بێ پرسی شاهید بێدەنگ قازی
خیلافەن وە شەرع ژەن وە نارازی
وەقتێ بوکشان ماوەرد وە یانە
زاوا بەرمەشی وە باڵای خانە
قانون قەدیم دەستوور ئەوشانیش
قامیشێ وە دەست زاوا مەدانیش
وە دەستو قامیش زاوا مەمدرۆ
چەبان خانەش مونتەزر مەبۆ
مەردم وە تەحقیق زاوا بوینۆ
قامیش وە سەرەی ژەنەش بکۆڕۆ

کەسێ چە مەردم کۆە زەمانە
ڕاستەن یا درۆ مەعلومەن ئانە
مواچا کەسێ کارێ گەردەبی
وەنام فرزەند ژەن ئاوەردەبی
وەقتێ وەویشان ئاوەردە یانە
باوەش چە دەستش قامیشش سانا
خەڵکان پەی تەحقیق گەردەن تەماشا
چەتر زولماتی ڕۆشنایی پۆشا
مەشروع حیلەی قەبیلەشان دی
خیلاف قانون خەصیلەشان بی
وە بێ مەعلومات شەرعو مەلاشان
غاشاش و بێغەش یەکەن چەلاشان
هەم پەی یەکتەرەك بیر هەڵکەندەین
وەخیلاف شەرع مەلاو مورشدین
زاڵمو سالم یەکەن چەلاشان
بێباوەر وە حوکم شێخو مەلاشان
ئەسباب مەجرای نەخۆندەواری
شادیشان گێلا وە عەزاداری
ئینسان قەدیم زەمانەی کۆنە
لبادو پینەی پیلانت چۆنە
نوممی چە وڵات ئەگەر نەمانۆ
گشت کەسێ حقوق کەردەش مەزانۆ
کەسێ چە تأریخ نۆصەدو هەفدە
چە گرانی دا ئەی باسە کەردە
زابتێ وە ناو (خدر حەلواچی)
سەرو ڕیش خەڵکی وەزۆر ئەقاچی
چل نەفەرش بی (دائم المدام)
کەلاکشان ماوەرد چە باتی تەعام
ئاماشان وەسەر دەردێ فراوان
قەلاتەی دەکەس ڕۆژێ وە دوو نان
یەکی لەپێ نان قوصعەشان کەلاك
تینیو تامەزرۆ تەن لەختو هیلاك
خدر حەلواچی دەردێ زۆرش دی
چەنام خەیمەش صەگێ بۆرش بی
وەقتێ موخالف ماوەردن وە چۆر
حەواڵەش مەکەرد بەرێی گەماڵ بۆر
کوڵکنو کەڵبەش وەك تێخ نوشتەر
مەردەیش چە ئەلحەد بەرماوەرد وەدەر

* ( حەرب عالەمی دووهەم ):
بە نام بێچوون بەنای بێزەواڵ
شای ساحێب کەرەم حەی زوالجەلال
پەی زیکر تەوحید ئەسناف جەهان
جەنگ محوەری مەعرەکەی مەیدان
واقیعەی نەبەرد مەردان مەهەم
چە حەرب عوزەمای عالەمی دووهەم
کەسێ وەك ڕەفعەت بەرزنجی لەقەب
تاڵب خزمەتەن نەك بەڵاو کەرەب

عاصیمەی بەغداد وەزارەی دیفاع
جای نیشتمانی شێران شوجاع
(سجل المرکزی)، هەم چە (ئیدارە)
خزمەتش مەکەرد صوبح و ئێوارە
چەنی ئامیران جەهدو جەختش بی
(کاتب ئیعلامات) ڕۆژ سەختش دی
تەنزیم تەرتیب کارو ئیزبارات
پەی حیفز ئەوراق وەزع ئیشارات
ئەوەلیاتش بەرماوەرد وەبەر
تەحویلش مەکەرد وەقەید دەفتەر
تأریخ نۆصەد ساڵ چل و یەك
واقیعەی حەربی جەهان موشتەرەك
عەرسەگای ئاشوب مەردان کاری
تۆپ و تەیارەو سیلاح ناری
خوتەی ماجینوی فەرەنسا و ئەڵمان
مەغلوبەی نەبەرد عەرسەگای جەهان
بی بە رستاخێز جەنگ میحوەری
عالەم وەپا کەرد چەنی یەکتری
(ڕەشید عالی) بی سەردار عێراق
چەنی هامسەراش کەردەبی تفاق
ئەر پەی ئینتیفاز یا دەفع بەلا
ئیعلان حەربش وە ئینگلیزدا
قادات لەشکر شێرانە دەستوور
صەفئارا کەردن مەردان پڕ زوور
دارای مەخازن ئەسلیحەی نەبەرد
تەجهیزات جەنگ تەمام بەرئاوەرد
ڕەشاش فیکەرس لویس و برێن
قونبلەی مەهداد تۆپی شەرابنیل
کەتیبەی لەشکر سنف ئالییات
هەرچی لازم بی پەی مودەرەعات
چەنی سواران ئەژدەهای نەهەنگ
مەردان چاپك گشت دەست وەتفەنگ
حشمەت پەناهان چەنی سەیارات
قافڵەی قەتار ئەرتال مەشات
چەولا (شیخ مەحمود) لەشکر کیانا
پەی جەنگ دوشمن بەلاغش وانا
سوپای عێراقی چون شێرو پەڵەنگ
چە سن الذبان داخل بی وە جەنگ
وە تۆپ و تفەنگ داشان وە هەمدا
هەوا تاریك بی چە تۆزو تەمدا
عەرسەگای نەبەرد چە کولل دەرە
قرقوشن وێنەی باران و تەزرە
صەلییات ڕەشاش تۆپ و قەنابل
ئاتەش فروزان قافڵەی قاتل
دوو دەریای لەشکر بودەن بەرانبەر
بی وەڕستاخێز داوای گیان و سەر
چە هەردۆ لاوە غارات جەووی
چە قەصف مەخلوق فەراغش نەوی

تەن وەبێ سەرە، سەرە وەبێ لار
کەسێ موعتەقەل کەسێ بریندار
فیغان و فریاد چە عەردو تەرەف
ئاوازەی خەتەر صەف وەبان صەف
بڵندبی چە جەو ئەفلاك ئەخزەر
موئزن واناش ئەڵڵاهو ئەکبەر
کوشتەی تەرەفەین بەرشی چەحیساب
کەفتەبی نەوجا عدوان و ئەحباب
چە هەردو لاوە مەکەردن کوشتار
دەست و پا شکاو شێران خونخار
یەك مانگ و پەنج ڕۆژ دەوام نەبەرد
وەبێ ئینقتاع مەعرەکەشان کەرد
ئاخر سەرەنجام جودا بین چە هەم
خوون ئاما وەجۆش چە ئەنحای عالەم
ئەسعار بازاڕ ئیرتفاعش کەرد
حەرب عالەمی گرانیش ئاوەرد
وەزیفەی شاعر یەکجاری کەم بی
حەیات کەسانێ وەك جەهەنەم بی
(١٩٤٥/٣/١٥)

* (**بولبول چە قەفەس**):
بولبول چەقەفەس نەغمەی خۆشئاواز
قوشان نەدەورش مەکەران پەرواز
چە باس ئەحواڵ ڕۆژ زەبوونش
ولاو مەکەرۆ داخ دەرونش
بەیدێ وە سەران باڵداران جەو
ئازیز چەقەفەس هیچ نەداروم خەو
هێمان نەزانام گوناهم چێشەن
ئیستە وەیجۆرە زەبوونیم لێشەن
حەبس بێتاوان هەم وەبێ مودەت
بەیدێ وەسەیران هاوارەن عەشرەت
ئارۆ وە تاقیق ئەز بەرێشانم
کەس نمەزان و چێشەن تاوانم
خەبەر بکیاندێ پەرێی باوانم
چێشەن چارەسەر حەتا بزانم
کێ بۆ وە ڕاستی ئی کارە کەرۆ
ئەخبارم پەرێی باوانم بەرۆ
یەك سینە زەردێ شانا پەڕو باڵ
دخڵبی وە نام چەند تەیرو تواڵ
واتش هامسەران بولبولێ بێکەس
بێ سوچ و تاوان بەندەن چەقەفەس
داخ گرانم پەی تەیرێ غەیور
ڕەهاکەرۆ بەند کەسی بێ قسور
بولبول هوزاری دەقنەشدا چەدڵ
بەزەیش ئاما وە حاڵ بولبول
واتش سینەزەرد بگێڵە وە پەس
باچە وەبولبول هانچە سۆی قەفەس
وەلەوکن ئیجرام هیچ نەکەردەنی

ماواتەن قەفەس حەتا زیندەنی
ئێدەن چارەسەر ئەگەر عەقڵت بۆ
مەرگ فوجائی نەجاتت مەدۆ
وەرگێلا وە پەس تەیر سینەزەرد
سەرانسەر تەمام خەبەردارش کەرد
ساکە ئێدشنەفت بولبول چە قەفەس
وێشکەرد وەمەردە چەنی نیمنەفەس
خاوەندش دیا بولبولش مەردەن
چەنام قەفەس روحش سپەردەن
بولبول چە قەفەس بەرئاوەرد وەبەر
وە مەردە زاناش هەواشدا وەدەر
بولبول چە سەماه شانا پەروباڵ
وانا شوکرانەی ئەڵلاهو ئەکبەر
خاوەندش واتش بولبول وە حورمەت
مارزەم بمانی پەی تو وە حەسرەت
بولبول داجواب بزانە ئارۆ
هەر کەسێ ئەلبەت عەشرەتێ دارۆ
هەر کە نەکەردەن پرسیار عەشرەت
دەردش گرانمۆ چە داخ و حەسەرەت
تەنگاوەی شددەت ئەز چەقەفەس دیم
وە پرس عەشرەت عیلاجش کەردیم
رەحمەت چەباوەی تەیر سینە زەرد
پەی بولبول هوزار هاوار من بەرد
ئەویش دەر لەحزە خەبەر کیانا
وە دەستوور مەرگ یاوام وە هانا
ئەگەر دۆستەنی داری مەعەریفەت
وە کارت مەیۆ پرسیار عەشرەت
سەربەرزی ئینسان وەعەزم تاقیق
مەیاوۆش وەکای ئیسلاح رەفیق
(١٩٥٨/٩/١)

* ( لە سەفەردا وە قیتار کەرکوك ):
چەلای مەحەتتەی سکەی قیتاردا
باوانی ئەتفاڵ با خەبەردار با
ئایل چە وازی مەشغول وێشەن
نمەزانۆ خێرو ئەزرارش چێشەن
کەسانێ هەنی وەك مام شەوەندەر
وێش لانمەدو چە راگەی خەتەر
حەمە حەلواچی ئیشی خەراوە
تاکێ کەوشەکەی لە قیتار ماوە
قیتار کەفتە سەر توندی حەرەکەت
ویتەی کچەکەی کوانێ سترەکەت
دوو لە سترەکەت لە بان رەف بێ؟
لە دوهەم رحلە لە ئاخر سەف بێ
پیرە ژەنی وت عەلاقەکانم
لە قیتاردا چوو داخی گرانم
بوکەکەی وتی هیزەی رۆنەکەم
ئەویش ماوەجێ ها لە شۆنەکەم
نابەڵەد وەقتێ قتار کەفتە رێ
وتی باوکە رۆ منیش مایمەجێ
ئیمجار دانیشە حەتا ئێوارە
ئێربە لە دوکەڵ پەنجا سیگارە
وتی (مام رەفعەت) تەدبیرت چییە
ئەویش جوابیدا من حەقم نییە
سەیارە لە لای مەحەتەی قیتار
لەبەر عبرییە دەکا ئینتیزار
کەسێ هاتە ناو سەیارە دانشت
تۆکڵە لیمۆکەی هەوادا وە پشت
دای لە سیدارەی ئەفەندی کۆنە
بی وە شەرەشەق هەردو لەو شۆنە
ئاغەی ئاشەوان کەیفی نەماوە
هەگبەکەی لە رێی(مەحەتە) ماوە
حاجی هەداوی وردەی پێ نەوی
منیش پام هەڵکەفت لە بەردێ قەوی
کیسە پارەکەم رشیا وە کۆڵان
ئیمجار شۆرتی کرد کارەباکەمان
(١٩٢٧/٨/١٥)

* ( **قەیس عاشق وە ئاهو گۆیەد** ):
ئاهوی سەرقەتار ئامانی وەلام
وەختێ سەیاد بیم چەبادییەی شام
ئاهوی قەتاران مەکردن گورێز
ئیستە نە دەورم مەگیلی وە هێز
چونکە دیدەی تو چەنی عەین لەیل
مەنمانا وەکییەك وەنەش دادی مەیل
چەند وەختەن لەیلام نەدیدەن وەچەم
وە عەشق لەیلێ ئازادت کەردەم
(١٩٣٩/٦/٥)"[١٥].

*** مارف بەرزنجی (١٩٢١ - ١٩٦٣):**

شاخی بەرزو جوان وولاتی کوردان
قەلاو سەنگەرو پشتو پەنامان
چەن هەزار سالە ژینمان تێکەلە
بووی بە نیشانەی کوردو کوردستان

*** ژیانی:**



(مارف کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ حوسێن بەرزنجی)یە، لە (١٠)ی شوباتی سالی (١٩٢١) لە ئاوایی (قادر کەرەم) لەدایکبووە، باوکی وەکو شێخێکی تەریقەتی قادری تەکییەو دامودەسگای دەروێشی بووە، بەلام لە رووی داراییەوە دەولەمەند نەبووە. خوێندنی لە قوتابخانەی سەرەتایی قادر کەرەم دەست پێ کردووە، لەو سەردەمەدا خوێندنی ئەو قوتابخانەیە تا پۆلی چوارەم بووە، ئیتر لەبەر ئەوەی باوکی نەیتوانیوە بینێرێ بۆ کەرکوك بەهۆی دەست کورتییەوە دوو سالی ماوەتەوە، ئینجا لەگەل (شێخ حوسێن)ی برای چوونەتە کەرکوك‌و لە تەکییەی کۆنەیەکی خۆیان ژیاون.
گوزەرانیان زیاتر لە کولەمەرگییەوە نزیك بووە. لە پۆلی یەکەمی قوتابخانەی ناوەندی لە کەرکوك پێوەندی لەگەل (پارتی هیوا) کردووە، لە سالی (١٩٤٣) قوتابخانەی ئامادەیی تەواو کردووە، لەو کاتەدا باوکی خوازبێنی کچێکی بۆ کردووە بە بێ ئەوەی چاوی پێی بکەوێ، لە دوای ژن هێنان بۆ ماوەی سالێك کارێکی مووچەخۆری بچووکی دەست کەوتووە، لە سالی (١٩٤٤) ڕووی کردووەتە بەغداو لە کۆلێژی ماف (حقوق) بووە بە قوتابی، لەبەر دەست کورتی ماوەیەك لە کارگێڕی تووتن لە بەغدا دامەزراوە بۆ ئەوەی خوێندنی کۆلێژی ماف بباتە سەر.
لە بەغدا پەیوەندی ئاسیاوی لەگەل ئازادیخوازو نیشتمانپەروەران کردووە، لە خۆپیشاندانەکانی ئەو سەردەمانەی بەغدا بەشدار بووە، لە کانوونی یەکەمی سالی (١٩٤٧) فەرمانی گرتنی لەلایەن دەسەلاتی میرییەوە دەرچووە، ماوەیەك خۆی شاردۆتەوە، لە هاوینی سالی (١٩٤٨) کۆلێژی ماف تەواو کردووەو لە پاییزی ئەو سالەدا فەرمانی ئەوقاتی بۆ دەرچووەو بوو بە پارێزەر، لە کاروباری ئەوقاتیدا شتێکی وای دەست نەکەوتووە پێی بژی، بۆیە کارێکی لە کۆمپانیای نەوت چنگ کەوتووە، بەلام زۆری پێ نەچووە وازی لێ هێناوە چونکە کاربەدەستە ئینگلیزەکان بە چاوێکی سووك تەماشایان کردووە، بەوەی لە بن دەستی کابرایەکی ئاسووری نەخوێندەواریان داناوە وەك یاریدەدەرێکی.
لە ئاداری سالی (١٩٥٠) بەهۆی جموجولی سیاسییەوە ناچار بوو چوار مانگ خۆی بشارێتەوە، بە دەربەدەری لە (سەنگاو) و (قەرەداغ)و (شارباژێر)و ماوەیەکی بردە سەر، وەك خۆی دەیگێڕێتەوە لە سالانی (١٩٥١ - ١٩٥٢) تووشی گرێیەکی سایکۆلۆجی بوو، واتە حاشاکردن لەو بیرو ئیدیۆلۆجییەتی باوەری پێی هەبوو، بەلام زوو خۆی دۆزییەوە، ئەم دان پێدانانەی (مارف بەرزنجی) لە مرۆڤێکی ژیرو زیرەك‌و دلسۆز هاتووەتە دەرەوە، دوور لە بیری عەشایەری رۆژهەلاتییانەی دواکەوتوو، ئەم جۆرە کردەوانە دەشاررێنەوە بۆ ئەوەی لەسەری برۆن، بەلام (مارف) ئاشکرای دەکا بۆ ئەوەی لە سەری نەڕوا.
لە سالی (١٩٥٦) لەبەر ئەوەی پشتی میسری گرتبوو لە دەست درێژییەکەی مەسەلەی سوێس خرایە بەندیخانەوە. لە دواییدا ئازاد کرا. لە سالانی پێش کوودەتا سوپاییەکەی (١٤)ی تەموزی سالی (١٩٥٨) لە کەرکوك خەریکی کاری ئەوقاتی بوو، لە پاییزی سالی (١٩٥٧)ەوە یەکێك بوو لە ئەندامە بەکارەکانی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (شەفەق) تا هاوینی سالی (١٩٥٩).
لە دوای کوودەتاکەی تەموزی سالی (١٩٥٨) بە سکرتێری ڕێکخراوی ئاشتیخوازانی کەرکوك هەلبژێررا، لە پاشانا کرا بە سەرۆکی شارەوانی کەرکوك، بەلام ئەمە زۆری نەخایاندو لە دوای مانگ‌و نیوێك پاش ئاهەنگی یرەوەری یەکەمی (١٤)ی تەمووز لە سالی (١٩٥٩) لەگەل (١٨) کەس لە نیشتمانپەروەران گیراو هەموویانیان ڕەوانەی گرتووخانەی بەغدا کرد.
ئاژاوەی تەموزی سالی (١٩٥٩) لە شاری کەرکوك پیلانێك بوو کۆمپانیای نەوتی کەرکوکی سەر بە ئینگلیز داینا بوو لە دژی بزووتنەوەی نەتەوەی کوردو دەسکەوتەکانی (١٤) ی تەموزی سالی (١٩٥٨) لە سەرانسەری عێراق، ئەم پیلانە بەهۆی کۆنەپەرستانی عێراق‌و بەشێك لەو تورکمانانەی سەر بە دەولەتی تورکیا بوون‌و تا پلەیەك دەست تێوەردانی ئێران‌و سوریاو میسر گەیشتە ئەنجام، کارەساتێك بوو کورد

لە هەموو کەسێك زیاتر زیانی لێ کەوت.
(مارف بەرزنجی) لە هاوینی ساڵی (١٩٥٩)ەوە لە گرتووخانەی بەغدا مایەوە تا ڕۆژی (١٥)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٢) فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو لە دادگای بەغدا، لە دوای کوودەتا فاشستییەکەی (٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣) گوێزرایەوە بەندیخانەی کەرکوك‌و لە (٢٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) لە کەرکوك لە سێدارەدرا.

*** شیعری:**
(مارف بەرزنجی) لە ساڵی (١٩٣٦) کە لە پۆلی چوارەمی قوتابخانەی سەرەتایی بووە یەکەم شیعری هۆنیوەتەوە، بڵاوکردنەوەی شیعری دواکەوتووە، لە ساڵی (١٩٥٣) لە ڕۆژنامەی (ژین)ی سلێمانی دوو پارچە شیعری بڵاوکراوەتەوە، بەرهەمی شیعری دەوروبەری (٣٠) پارچە شیعری لیریکییە.
(مارف بەرزنجی) شاعیرێکی خۆرسکی ڕەسەنە، لە کۆمەڵی دەوروبەری بە تایبەتی باوکی چێژی شیعری بە هێز بووەو خەیاڵی لە مەشق‌و تاقیکردنەوە بووە لە هەموو بابەتەکانی شیعری کوردی، بەحری عەرووزی بەکارهێناوە، کێشی میللیی سیلابی خۆماڵی بەشی زۆری شیعری گرتووەتەوە، لە شیعری نوێدا کێشی زۆرو قافییەی ڕەنگاوڕەنگی لە لیریکێکدا بەکارهێناوە، گەمەی لە قافییەدا کردووە. یەکێتیی قافییەو مەسنەوی‌و هەمەرەنگی هەیە، بە زۆری شیعری وێنەی لیریکی ئەوروپاییان وەرگرتووە، زمانی ئاسان‌و مانای لە ڕووە، هەندێ لە ڕۆمانتیکییەت نزیکە، بەڵام لە سیمبۆلیزم دوورە، لیریکی سەر بە قوتابخانەی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتین، هەندێ جار وەکو شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی) دەکەوتە بەرچاو.

لە شیعرێکیدا دڵداری دەکا بەهەوای غەزەلی کلاسیکی:
لە چاوی تۆوەیە تاریکی دڵ ئێستاکە چراخانە
لە جێی پەیمانەو جەژنانە قوربان نێو نیگاتانە
بە ئێمەی گەر ڕەوا بێنن غەریبین دڵ بریندارین
ڕەهەندەی دەستی جەورین سایەتان ئەمرۆکە جێمانە
ئەزانم کەی منت دیوە لەبەر وەی وا پەسەندم لات
لە پۆلی پێشرەوی گەل داو لە جەنگی سەر شەقامانا
منیش لەوساوە تۆم دڵ خست کە غونچەت کردبوو ئیکلیل
بە بیست‌و حەوت کانوونا لە پێش تەرمی شەهیدانا
دەمێکی دیش لە خۆ دەرخستنێکا چوویتە سەر مینبەر
بە دەنگ‌و ڕەنگ‌و کردار چووی بە دڵما قارەمانانە
ئەوا زانیم بناغەی خۆشەویستمانە ئازادی
وەکو سەرچاوەیی هەست‌و دروست‌و بەرزی گیانمانە

(مارف بەرزنجی) لە کاتێکدا لە گوندی (داریکەلی) لە ساڵی (١٩٤٩) خۆی لە چاوی جاسوساندا دوور خستووەتەوە یادی خۆپیشاندان‌و ڕێڕەوەکانی سەر گۆڕی شەهیدانی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨)ی کردووەتەوە، لە گۆڕەپانی ئەو خەباتەدا چاوی بە کچە قوتابییەکی جوان کەوتووە، چووەتە دڵییەوە نەك تەنیا لەبەر ئەوەی جوان بووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی هاوبیرو بە جەرگ‌و نەترسیش بووە، ئەو خۆشەویستییەی لە کۆڕی خەباتدا لەپێناوی ئازادی دروست بووە، ئەڤینی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتییە.

لە چوارینێکیدا (مارف بەرزنجی) دەڵێ:
شاخی بەرزو جوان وڵاتی کوردان
قەڵا و سەنگەرو پشت‌و پەنامان
چەن هەزار ساڵە ژینمان تێکەڵە
بووی بەنیشانەی کوردو کوردستان

ئەم چوارینە لە ساڵی (١٩٦٠) لە گرتووخانەی بەغدا هۆنراوەتەوە، شاعیر ڕاستییەکی ژیانی کوردی خستووەتە بەرچاو، بەوەی بە درێژایی مێژوو شاخ کوردی لە توانەوەو لەناوچوون پاراستووە، بۆیە شاخ بووە بە بەشێك لە کوردو نیشانەو دروشمی ئەو میللەتەیە.

بۆ گەشتە ئاسمانییەکەی (یووری گاگارین)ی ڕووس، شاعیر دەڵێ:
ئێمەی دەستبەستەی ناو زیندان
وا باڵ ئەگرین
ئەفرین لە خۆشیانا ئەفرین
چونکە هاورێیەکی شیرین
وەك گاگارین
کوری جووتیارێکی زەمین
مژدەی سەرکەوتنی لینین
وەك فریشتە
ئەبا بۆ ئاسمانی بەرین

لە ڕۆژی (١٢)ی نیسانی ساڵی (١٩٦١) هاووڵاتی ڕووس فرۆکەوان (یووری گاگارین) بە گەشتییەکی ئاسمانی‌و بە (١٠٨) دەقیقە بۆ یەکەم جار لە ڕاکێشانی زەوی چووە دەرەوەو لەناو(کۆزمۆس) بە دەوری زەویدا سووڕایەوە، ئەم شیعرە جوانەی (مارف بەرزنجی) ئاماژەیەك بۆ دەست ڕەنگینی ئادەمیزاد لە پێشکەوتنی زانستی‌و تەکنیکدا، ئەوەی شیاوی باسە لەو ڕۆژگارەدا یەکێتی سۆڤیەتی کۆن‌و ئەمریکا تەنیا لە سیاسەتدا بەرامبەر بە یەکتری نەچووبوونە مەیدانەوە، بەڵکو لە گۆڕەپانی دۆزینەوەی نهێنییەکانی ئەودیوی سروشت خەباتیان لە دژی یەکتری تیژتر بوو، لەبەر ئەوەی شاعیری کوردی ئێمە دەڵێ: گاگارین مژدەی سەرکەوتنی سیاسەتی لینین دەبا بۆ ئاسمانی بەرین. لە ڕووی بیروباوەڕەوە ئەم وێنە شیعرییە قسە هەڵدەگرێ، بەڵام هەرچۆنێ بێ داهێنانی تێدایەو جوانە.

(مارف بەرزنجی) لە شیعرێکیدا بەناوی (پرتەوی لۆمۆمبا)، بەهۆی کوشتنی ئەم نیشتمانپەروەرە ئەفریقییە دەڵێ:
ئەستێرە نییە کە نەکوژێتەوە
ژیانێك نییە کە نەبڕێتەوە

کوژانەوەی پاتریس لۆمۆمبا
پرتەوێکی دا ناکوژێتەوە
***
شەو چرایەك بوون بۆ شەوی کۆنگۆ
دەرخشان تابان وەك مانگی ئاسمان
نموونەیەك بوون لە بەرزی ئینسان
مەسیحی سەردەم بۆ ئەفریقای تۆ
***
بناغەی هێزو سەرچاوەی پرتەو
خواستی گەلەکەت هەموو ئەفریقا
بۆیە چەشنی کێو هەرگیز نەلەقا
کۆی مەردایەتیت بردەوە بە گرەو
***
چونکە بە راستی ئازادیتان ویست
بۆیە ئیستیعمار ئێوەی نەئەویست
دەستەمۆ ئەکرێن کورسی پەرستان
ئێوە گەلخواز بوون نەك کورسی پەرست
***
کۆنگۆ وەك دڵی ئەفریقیایە
ئەو دڵەش دڵی کاك لۆمۆمبایە
نە کۆنگۆ ئەمرێ نە ئەفریقیا
تۆیش بۆیە ئەژیت هەتا هەتایە
***
دڵ پر لە کوڵەو دیدە پر گریان
لە هەموو لایەك سەراسەر جیهان
دەستی کرێکار جووتیار خوێندەوار
بۆ تۆڵەسەندن بەرزە تا ئاسمان

(پاتریس لۆمۆمبا) یەکێك بوو لە نیشتمان پەروەرەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەفریقا لە کۆنگۆ، لە رۆژی (١٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٦١) بەهۆی پیلانێکی ئەمپریالیستی ئەمریکی لۆمۆمبا کوژرا، ئەو کاتە (مارف بەرزنجی) لە گرتووخانەی بەغدا بوو ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە، سۆزی بە کوڵی شاعیر بەرامبەر بەم نیشتمان پەروەرە لەوەوە هاتووە مەسەلەی نیشتمانی کۆنگۆو رەشەکانی ئەفەریقا هەندێ لە مەسەلەی نیشتمانی کورد دەکا، لەبەر ئەوەی رووداوەکە شاعیری کوردی وررووژاندووەو نەفرەت لەو دوژمنە دەکا کە خراپەی بۆ ئەفەریقییەکان هەیە، چونکە هەر ئەویشە دوژمنایەتی کوردیش دەکا.

(مارف بەرزنجی) لەگەڵ هەموو بایەخێکی بە دوارۆژی ئادەمیزاد دڵداری لە ناخی دەروونیدا بووە چونکە دڵداری ماك و هەوێنی ئازادیی و بەختیارییە:

لە خەوما یارەکەی جاران لە تاڤ جوانییا ماوین
وەکو دوو کۆتری نەخشین بە تەنیا وا لە گوێی ئاوین
وەکو ئەم دەهری هیجرانە
وە یا ئەم لێك بەجێمانە
نە بووبێت و نە رووی دابێ
وەکو ئەم دەست لە یەکتر شوشتنە
ئەم بێ و لە دڵ رابێ
لە گوێی ئاوێ بە جووتە بێ خەفەت رازو نیازمانە
نە ترسی چاوی بەدکارو نە ئازاری ژیانمانە
چ خۆشە دڵ وەها سادە
وەها پر خۆشەویستی بێ
لە روخساری نیگارێکا هەموو ئاوات و هەستی بێ

شاعیر خەونی دیبێ یا نەیدیبێ کێشەیەك نییە پێویستی بە جێبەجێکردن بێ، شاعیر وزەی ئەوەندە بە هێزە لەناوئەم چوار دیوارە تاریکەدا بە تاوانی گەورەی وا تاوانبار کراوە سەری لەسەر دادەنێ کە چی یادی دڵداری دەکاتەوە، ئەوەی بەشێکە لە بوونی ئادەمیزاد لەگەڵ ئازادی بوون بەو هیوایەی مرۆڤایەتی بە دوایانا وێڵە.

* چیرۆکی:

(مارف بەرزنجی) لە تەمەنی هەژدە ساڵی دەستی بە نووسین کردووە، ماوەیەکی زۆر تەنیا خۆی زانیویەتی توانای نووسینی شیعرو پەخشانی هەیە، تا ساڵی (١٩٥٧) بایەخێکی ئەوتۆی بە چیرۆك نەداوە، هۆی بنچینەیی بۆ مەبەستی چیرۆك نووسین لە پاییزی ساڵی (١٩٥٧) لە لای دەرکەوتووە، لەو کاتەی ئەفسەری خانەنشین (عەبدولقادر بەرزنجی) بەهۆی کۆمەڵێك رۆشنبیرەوە خەریکی بڵاوکردنەوەی گۆڤاری (شەفەق) بوو لە کەرکوك، (مارف بەرزنجی) خۆی یەکێك بوو لە دەستەی نووسەرانی، ماوەی دوو ساڵ بەشێکی زۆر لە بەرهەمی ئەدەبی لەو گۆڤارەدا بڵاوکرایەوە، بە تایبەتی چیرۆکەکانی، سەردەمی بڵاوکردنەوەی یەکەمین چیرۆکی دەکەوێتە ساڵی (١٩٥٨).

چیرۆکی (مارف بەرزنجی) دەچێتە ناو رێبازی ریالیزمی کۆمەڵایەتی، مەسەلەی سەرەکی لای ئەو بیری کوردایەتی و رزگاری مرۆڤە لە چەوساندنەوە. لە هەندێ لە نووسینەکانیدا ئەم دوو مەبەستەی تێکەڵ بە یەکتری کردووە، پیلانی هێزە ئەمپریالیستییەکانی ئەورووپاو فێڵ و فەنەری دەرەبەگ و کاربەدەستانی دەوڵەت و هەڵخەڵەتاندنی هەژارو رەش و رووتی ناو کۆمەڵ لەلایەن پیاوانی ئایینی و شێخی تەریقەتەکانی دەروێشی دەخاتە بەرچاو، سوودی لە چیرۆکی ئەورووپایی و میسری وەرگرتووە، شێوازی ئەوانی هێناوەتە ناو چیرۆکی کوردییەوە، بەمە پێشکەوتووەو دەوڵەمەند بووە، هەندێ لە چیرۆکەکانی ئەمانەی لای خوارەوەن:

* ئاوازو کەباب:

نووسەر ئیلهامی ئەم چیرۆکەی لە هێرشە سێ قۆڵییەکی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیسرائیل وەرگرتووە لە ساڵی (١٩٥٦) بۆ سەر میسر، لە دواییدا بە هەرای کەناڵی سوێس ناوی دەرکرد، لە چیرۆکەکەدا (فەلامورن) رەمزی هێزی ئاشتییە، (میرزاش) رەمزی هێزی جەنگە، لە ئەنجامی خەباتی ئەم دوو هێزە، ئاشتی سەردەکەوێ، دیارە (جەمۆلی چاپچی) کە رەمزی میللەتە بچووك و ژێردەستەکانە ئەویش رزگاری

دەبێ، ئیتر ئاسنی هەموو چەکەکان دەتوێنرێنەوەو دەکرێن بە شیشی کەباب و چەقۆی مەتبەق و ئامێری مۆسیقا.

- گای پیرۆز:
تابلۆیەکی زیندووە لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی کوردستان، دووبەرەکایەتی کۆن و تازە لە ناوەوە بوو، مامۆستای قوتابخانەو حەمە ڕەشید نموونەی هێزی تازەی کوردستان بوون، شێخ و کوێخاو پۆلیس نموونەی هێزی کۆن بوون، کەسایەتی شێخی تەریقەتی دەروێشیش بە گای پیرۆزی هیندستان دەچوێنێ.

- شەتڵ:
موعادەلەیەکی سیمبۆلییە باس لە کۆمارە ساواکەی عێراق دەکا لە ئەنجامی کوودەتا سوپاییەکەی (١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٨)ی بەغدا، کۆمەڵە ڕێکخراوە دیموکراتییەکان ئەمام بوون تازە سەریان دەرهێنا بوو، قوتابیانی گوندەکان وەك شەتڵ وا بوون، جووتیارانیش لەوە دەترسان دیوەخانەکان وەکو جارانی لێ بێتەوە، ئەمە پێشبینییەکی هونەروەرانە بوو (مارف بەرزنجی) لەم چیرۆکەدا خستییە ڕوو، بەڵام لە دواییدا کۆماری تازە ئەمام وا وێران کرا لە مێژووی میللەتانا کەم کارەساتی وا ڕووی داوە یەکێ لەوان (مارف بەرزنجی)و (شێخ حوسێن بەرزنجی) برای لە سێدارە دران.

- چەژنێکی شادی:
نووسەر ئیلهامی ئەم چیرۆکەی لە بەسەرهاتی ژیانی گرتووخانەی بەغدای وەرگرتوو، وێنەی داهێنراوی لە واقیع وەرگرتووەو خەیاڵبازی تێدا کردووەو لەوەوە ڕووداوێکی تازەی دروستکردووە، ئەم بیرورایە دەتوانرێ لە ڕستەی (هەزاران زوو نامرن.. نامرن..) بە مانای ئەوەی هەزاران میرو شا بەرێ دەکەن کە چی خۆیان نامرن.

- سەر لە بەیانی نەورۆزێك:
ئەم چیرۆکە بیری باوکێکە بەراووردی ژیانی سادەو ساکاری سەردەمی ڕابردوو دەکا کە نە کارەبا هەبوو نە ئۆتۆمبیل، کە چی لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی شادو دۆست بوون، بەڵام کە کارەبا و ڕادیۆو سینەما پەیدابوون هەموو کەسێك دڵ تەنگ و شپرزەیە.
دنیا چڕوپڕو هەڵلایە، ئەوسا باغەکان تەنیا بۆ خواردن بوون، ناوی فرۆشتن نەبوو، ئێستا هەرچ میوەی باشە بۆ فرۆشتنەو ڕەزای میوان گران بووە کە جاران زۆر ڕەزا سووك بوو، دنیای ئێستای چاولێکەری و چاوچنۆکی و خەفەتە، بێجگە لەمانەش سەرباز یاساغ و قەدەغەو ناو نووسین و گرتن و خەفیە وا زۆربوون ژیانیان تاڵ کردووە، کورە لاوەکە تێی دەگەیەنێ مەسەلە کارەبا نییە، هیچ وەختێك قوتیلەی نەوت لە کارەبا خۆشتر نییە، بەڵام مەسەلە ئیستیعمارو دەست و پێوەندییەتی کە نایەڵن خۆشی لە شتی خۆش وەربگرین، بە ئازارو گرتن و یاساغ و ڕاونان و خەفیە ژیانیان تاڵ کردووین.

* شانۆگەری:
بەرهەمی ئەدەبی (مارف بەرزنجی) دوو کورتە چیرۆکی شانۆگەری دەور دەکاتەوە (زەوی زەوی خۆمانە)و (کۆمیدیا ئادەم و هارووت).

- زەوی زەوی خۆمانە:
چیرۆکێکی شانۆگەرییە لە چوار پەردە پێکهاتووە، ناوەڕۆکی بریتییە لە خەباتی ڕەنجبەرێك لە دژی بەگزادەیەکی دەسەڵاتداری سەر بە حکومەت، کابرایەکی درۆزن و تەڵاق خۆرو دەردەدارە، نەخۆشیی دڵ و گورچیلەی هەیە.

- کۆمیدیای ئادەم و هارووت:
ئەم شانۆگەرییە لە یەك پەردە پێکهاتووە، بریتییە لە دیالۆجێکی فەلسەفی لەنێوان خودا (کردگار)و هارووت، لە ئەفسانەی ئایینە کۆنەکانی میللەتانی سامی ناوی دوو فریشتە (هارووت و ماروت) هاتووە، لە کاتێکدا کردگار فەرمانی دەرکردووە ئادەم و حەوا لە بەهەشت دەربکرێن بۆ سەر زەوی، دوو فریشتەی هارووت و ماروتیش بنێرێتە ئەوێ، ئەمانە تکا لە کردگار دەکەن ئەم کارە نەکا، چونکە ئەوان لە ڕووناکی (نوور) دروستکراون، کە چی ئادەم و حەوا لە قوڕ، بەڵام بۆیان ناکرێ بە قسەی کردگار نەکەن، ناچار دێنە سەر ئەرزو لە فەرمانی خودا دەرناچن، ناکۆکی و ئاژاوە دەنێنەوە، کردگار ناچار دەبێ لە بیرێکدا لە وڵاتی بابل هەرەسیات پێ بێنێ و لە ناویان ببا.
(مارف بەرزنجی) دیالۆجێکی فەلسەفی دروستکردووە لەنێوان خوداو هارووت، شێوازی سیمبۆلی بەکارهێناوە، پەردەیەکی ڕۆمانتیکی بەسەردا گرتووە، نووسەر ئادەم و حەوا، واتە مرۆڤایەتی کردووە بە هێزی چاکەو هارووت و ماروتی کردووە بە هێزی خراپە، ئەم دوو هێزە لە ڕۆژی دروستبوونیانەوە بەرامبەر بە یەکتری چوونەتە مەیدان و تا ئێستا کێشەکەیان نەگەیشتووەتە ئەنجام.

* (ئەلف)و (یێ):
(ئەلف)و (یێ) پرۆژەیەکی ئەدەبی گرنگ بوو (مارف بەرزنجی) بە تەما بوو لەسەر لاپەرەکانی گۆڤاری (شەفەق) بیگەیەنێتە ئەنجام، لەم بابەتەوە خۆی دەڵێ: "لە ئەلفەوە تا یێ هەموو شتێکی لێ پێك دێ، نامانەوێ هەر بەووتن بێ، بەڵکو کردارمان ئەوێ، لەم دەرگایەوە لە گیروگرفتی ژیانمان ئەدوێین"، پرۆژەکە ئەوە بوو لە هەر تیپێکی ئەلفوبێی کوردی چەند ووشەیەك هەڵبژێرێ و بیکا بە ووتارێکی کورت و ناوەڕۆکی هەموو ووتارەکان خەریکی هەموو لایەنێکی ژیان بێ و بە شێوازیکی ئەدەبی و هونەری دەریان ببڕێ، ئەم جۆرە داهێنانە ئەدەبییە بابەتێکی تازەو تایبەتی بوو لە ئەدەبی کوردیدا.
نووسەر لە ژمارە یەکەمی (شەفەق)ەوە خەریکی ئەم گۆشەیە بوو تا ژمارە حەوتەم، بەرپابوونی کوودەتا سوپاییەکەی (١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٨)ی بەغدا بووە هۆی ئەوەی بۆی تەواو نەکرێ، لە نووسینەکەیدا لە تیپی ئەلفەوە دەستی پێ

کرد تاکو تیپی ژێ. ئەو وشانەی بوون بە بەڵگەی تیپەکانی (ئە، تا، ژ) ئەمانە بوون: ئاو، ئاگر، بابە گورگور، برادەر، پێ، پیاو، ترس، جیاوازی. جەژن، چەرمکە (چاڵکەی رۆمی) حکومەت، خەبات، دەرد. دەرمان، دەستی بێگانە، رێگا، زەوی، ژن.

*** نامەکانی:**

(مارف بەرزنجی) دەستێکی باڵای هەبوو لە نووسینی نامەی ئەدەبی، ئەو بەهرەیەی لەو کاتەدا دۆزرایەوە لە ساڵانی (١٩٦٠ - ١٩٦١) لە گرتووخانەی بەغداوە پێنج نامەی بۆ نووسەر ئەم کتێبە ناردووە لەودەمەی کە قوتابی خوێندنی باڵا بوو بە لە مۆسکۆو سانت پیترسبورگ (لینینگرادی ئەوسا) نامەکان لەوە دەرچوون تەنیا رەنگدانەوەی سۆزی قووڵی دوو هاورێی خۆشەویست بن، بەڵکو بوون بە بەرهەمێکی ئەدەبی داهێنراو لە ئەدەبی نەتەوەکانی گێتیدا بە چاوێکی بەرز تەماشا دەکرێن و بە بەرهەمێکی بە کەڵك لە قەڵەم دەدرێن.

*** رەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی:**

جگە لە داهێنانی ئەدەبی بە شیعرو پەخشان (مارف بەرزنجی) لە سەرەتای ژیای ئەدەبییەوە بایەخی بە رەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی داوە، لەم لایەنەوە بە توانا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی وابوو لەو سەردەمەدا، لە ناوەراستی سەدەی بیستەم کورد پێویستی بە داهێنان بوو لە مەیدانی پەخشاندا، واتە چیرۆك و رۆمان، بۆ ئەم مەبەستە پرۆژەی نووسینەوەی رۆمانی دانابوو هەندێکی لێ نووسیبووەوە بەڵام تەواوی نەکردبوو، ئەوەی نووسرابووەوە ئەم دەست و ئەو دەستی کردو لە ئەنجامدا ون بوو.

(مارف بەرزنجی) لە رەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا نوسینی هەیە، بەڵام زۆر نییە، هەندێکیان لە گۆڤارەکاندا بەم ناوانە بڵاوکراونەتەوە: (کامەران و دیارییەکەی)، (بووکی پەردە)، (شانۆی کوردستان)، (دوو شانۆگەری عەبدولرەزاق بیمار)، وتاری (کۆنۆ تازەیی لە شیعرا)، وتاری (گۆرانی دووبارە نەمر)، (ئەرکی سەرشانی ئەمرۆی ئەدەبەکەمان) و هی دیکە.

(مارف بەرزنجی) لە دوو لاوە دیاردەیەکی گرنگی بووە لە کۆمەڵی کوردەواریدا، یەکەمیان وەك مرۆڤ و دووەمیان وەك نووسەر، مرۆڤێك بوو لە واقیعی خۆی وەك ئادەمیزاد گەیشتبوو، وەك نووسەرێکی ئەوەندە بێ فیز بوو، هەمیشە دەیووت من هیچی لێ دەزانم! لە کەسێتی خۆیەوە دەستی بە شۆرشی کردبوو، کوری شێخێکی خاوەن تەریقەتی دەروێشی و خاوەن جێگەو رێگەی کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام پێی خۆش نەبوو شێخی پێ بڵێن، لە (مارف بەرزنجی) بەولاوە خۆی بە هیچ شتێکی دیکە حسێب نەدەکرد، لەناو رۆشنبیری کوردو هەموو خەڵکی رۆژهەڵات، ئەگەر کەسێك هەڵەیەکی کردبێ کەس گوێی لەوە نەبووە بێ دان بەو هەڵەیەدا بنێ، (مارف بەرزنجی) دەڵێ: "ساڵێکیان لە خوو و رەوشتی خۆم وەرگەرام، بیرم لەوە دەکردەوە چۆن خەریکی خۆم بم چۆن دەوڵەمەند بم، بەڵام زوو هوشیار بوومەوە"، ئەگەر مارف بەرزنجی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ کوردو لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتی راستگۆ نەبوایە پاڵەوانانە پێشوازی مەرگی نەدەکرد.

(مارف بەرزنجی) نووسەرو شاعیر نموونەی رۆشنبیری هاوچەرخی کۆمەڵی کوردەواری بوو، کولتووری رۆژهەڵات و رۆژئاوای کۆ کردبووەوەو تێکەڵی بە کولتووری نەتەوەیی کورد کردبوو و کولتوورێکی تازەی لێ دروستکردبوو، لەگەڵ هیواو ئامانجی سەردەمی کورد بگونجێ.

بەرهەمی ئەدەبی لە رووی روخسارو ناوەرۆکەوە دەوڵەمەندە، نموونەی شیعری کلاسیکی رەندە، ئەوەی خۆماڵی و شیعری نوێی بەرزە، چیرۆکی باڵایە، ئەلف و بێ و نامەکانی دیاردەی تازەن لە ئەدەبی کوردیدا"[١٦].

**"* پیر ئەحمەد کەرکوکی:**

هۆنەری ئەم شوێنەمان ناوی (ئەحمەد)و کوری نەسەی کەرکوکییە کە بەپێی پەراوی سەرئەنجام لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا پێی ناوەتە کۆری ژیانەوە، هەر بە مندالی وریاو زیرەك بووەو لە تەمەنی هەشت ساڵیدا لەلای باوکی خەریکی خوێندن بووەو لە دەمە دەمی جوانیدا هۆنراوەی باشیشی هەڵبەستووە. لەبەر ئەوەی کە روومەتێکی جوان و دەنگێکی خۆشی بووە، هۆنراوەکانی خۆی بەدەم هەواو ئاهەنگی تەنبوورەوە خوێندووەتەوە، کەم کەم وای لێ هاتووە کە خەڵك لە دوورەوە هاتوون و گوێیان بۆ هۆنراوەکانی شل کردووە، بەرهەمی مرخی خوایی (پیر ئەحمەدی کەرکوکی) زۆر بووە، دەربارەی دەروونی پر بووە لە گەوهەری هێژای هۆنراوی جوان، لەم هۆنەرە پایەبەرزە، هەندێ هۆنراو لە پەراوی سەرئەنجامدا ماونەتەوە کە گەلێ رەوان و دڵگرو سادەن، ئەم هۆنراوانە نموونەیەکن لە بەرهەمەکانی ئەو:

ئەز ئەحمەدی زێرین بەرم
ئەز ئەو دورەی ناو گەوهەرم
ئەرزو سەمایە لەنگەرم
لە رۆژ حەساو ئەز لە دەرم
ئەز ئەحمەدم بارم گێلان
تاونم داوە بە خێلان
جەژنم داناوە لە کەیان
لە رۆژ حەساو ئەدەم بەیان
ئەز ئەحمەدی ناو بچووکم
هەم نەوزاواو هەم نەوبووکم
زەرینەڵەی دەستە لووکم
رۆژی حەساو ئەز دەکووکم
ئەز ئەحمەدی بێ منداڵم
هەم نەوزاواو هەم نەوماڵم
زەرینەڵەی ناو دەستماڵم
رۆژی حەساو ئەز دەناڵم
ئەز ئەحمەدی دەریای جەیحوون
چەندێ گەران بەدووناى دوون
لە گشت لاوە هەڵساوە هوون
لە سیاوەخشۆ کرام گوڵگوون

ئەز ئەحمەدی ئاو تەشارم
لە ناوی دور گەوهەر بارم
لە هەفتەمین ناوی یارم
ڕۆژی حەسا و ئەز دیارم

واتە: من ئەو پارێزگارەم کە نوقمی دەریای خواناسی بووم‌و پلەو پایەی خواناسیی من گەیشتووەتە جێگایەك کە زەوی‌و ئاسمان بەلەنگەرگای خۆم ئەزانم‌و لە ڕۆژی پەسلاَندا خۆم دەنوێنم، من ئەو کەسەم کە نە ماڵم هەیەو نە منداڵ، بە هێزی خواناسی هەموو جێگایەك پڕ لە شادی‌و خۆشی دەکەم‌و شادی‌و خۆشی هەموو کەسێك بە شادی‌و خۆشیی خۆم دەزانم‌و دەردو پەژارەی ئەوانیش بە دەردو پەژارەی خۆم دادەنێم، چونکە مرۆ لە بناغەدا لە یەك سەرچاوەوە بەدی هاتووەو منی کە بنیادەمم دیارە لەو سەرچاوەوە بەدی هاتووم، بەڵام من نوقمی خواناسی بووم‌و پەلەو پایەی خواناسیی من گەیشتە دەریای جەیحوون. لەوێدا لە هەموو لایەکەوە خوێن هەڵسابوو و خوێنی سیاوەخشی دەهێنایە بیر، من بەناوایاندا گەرام‌و بە هێزی خواناسی ئەوانم لە ڕێگەی چەوت‌و چەوڵێ لاداو هێنایانمە سەر ڕێگەی خواناسی‌و ڕزگاریانم کرد"[١٧].

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. (مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی سێیەم، نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم، ١٨٠١ - ١٨٥٠)، دکتۆر مارف خەزنەدار، چاپی دووەم، دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠١٠، لاپەڕە (٤٧).
٢. (مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی چوارەم، نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەم ١٨٥١ - ١٩١٤)، دکتۆر مارف خەزنەدار، چاپی دووەم، دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠١٠، لاپەڕە (١٤).
٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤ - ١٥).
٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٠).
٥. (مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی چوارەم، نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەم، ١٨٥٠ - ١٩١٤)، دکتۆر مارف خەزنەدار، دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠١٠، لاپەڕە (٥٢٣ - ٥٧٨).
٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٩٧ - ٣٠٨).
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٠٩ - ٣٦١).
٨. (مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، نێوان هەردوو جەنگی یەکەم‌و دووەمی سەدەی بیستەم، ١٩١٤ - ١٩٤٥)، دکتۆر مارف خەزنەدار، چاپی دووەم، دەزگای چاپ‌و بلاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠١٠، لاپەڕە (٤٠٨ - ٤١٨).
٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٤٣ - ٤٥٧).
١٠. (مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم، ١٩٤٥ - ١٩٧٥)، دکتۆر مارف خەزنەدار، چاپی دووەم، دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠١٠، لاپەڕە (٣١٢ - ٣٢٨).
١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٤٣ - ٤٥٨).
١٢. (دیوان‌و یاداشتی شێخ ئەحمەدی شاکەلی، شاعیرو خواناسی دەشتی گەرمیان)، هاشم عاسی کاکەیی، چاپی پێنجەم، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠١٣.
١٣. (مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، نێوان هەردوو جەنگی یەکەم‌و دووەمی سەدەی بیستەم، ١٩١٤ - ١٩٤٥)، دکتۆر مارف خەزنەدار، چاپی دووەم، دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠١٠، لاپەڕە (٥٠١ - ٥١١).
١٤. (مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، ١٩٤٥ - ١٩٧٥)، دکتۆر مارف خەزنەدار، دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، چاپی دووەم، ٢٠١٠، لاپەڕە (٢٣ - ٣١).
١٥. (دیوانی بەرزۆی پەری)، هاشم عاسی کاکەیی، چاپخانەی (شەهید ئازاد هەورامی)، کەرکوك، ٢٠١٣.
١٦. (مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی حەوتەم، ١٩٤٥ - ١٩٧٥)، دکتۆر مارف خەزنەدار، دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، چاپی دووەم، ٢٠١٠، لاپەڕە (٤٣٧ - ٤٤٩).
١٧. (مێژووی وێژەی کوردی)، سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە)، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕە (١٢٩ - ١٣٠)، بۆ زیاتر بڕوانە:
- (مشاهیر اهل الحق).
- سەرئەنجام (دەستنووس).
- دەورەی پردیوەر (دەستنووس).
- کورتەی نامەی سەرئەنجام (دەستنووس).
- دەورەی پیر عالی (دەستنووس).
- یادداشتی کاکەڕدایی (دەستنووس).

## * مامەند کەرکوکی و نوێ کەرەوەی شیعری کوردیی دەڤەری کەرکوك:

د. محەمەد کەساس
لەتیف فاتیح فەرەج



"نـاوی (ڕەمـزی ڕەحیـم جـاو فـرۆش)ە، لـە دەوروبـەری سالـی (١٨٩٥)ی زاینیی لـە شاری کـەرکوك لـە گـەڕەکی ئاخوڕ حوسێن لەدایکبووە، خوێندنی لە سوختەخانەی مەلاو لە قوتابخانەکانی کەرکوك تـەواو کـردووە، بووە بە خوێندەوارێکی باش‌و زمانی تورکی بە قسەو نووسین‌و خوێندنەوەو چاکی زانیوە، ئاگادارییەکی باشی لە ئەدەبی نوێی تورکیدا بووە، ڕۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی بووە، لەگەڵ شاعیران (شێخ نوری شێخ سالح)و (گۆران)دا بەردی بناغەی نوێکردنەوەی شیعری کوردییان داناوە.

هەڵبەستەکانی وەك (بۆ کاك م، نوری)و (بۆ کاکی کەرکوکی) و (بـۆ لاوانـی ئێستا)و (واوەیـلای کـورد)و (بـۆ مێـژووی وەتەن)و (بەدبەختیمان) کە لە ژمارەکانی زاری کرمانجیدا بڵاویکردوونەتەوە، کە دیارترینیان بەناوی (ڕێگای ڕاست پیشاندان بە گومراهێك) کە لە ژمارە (١٠) ساڵی دووەمی لە ڕۆژی (٣)ی تەموزی سالی (١٩٢٧) بڵاوکراوەتەوە.

نووسین‌و بەرهەمەکانی بەناو و نازناوی (مامەند کەرکوکی) و (م.. کـەرکوکـی)یـەوە بـڵاوکـردووەتـەوە، واتـە بـەنـاوی ڕاستەقینەی خۆی نەبووە حەزیشی نەکردووە کەس پێی بزانێ گیانێکی کوردایەتی پاکی هەبووە شیعری نیشتمانی زۆری هەیە.

(مامەند کەرکوکی) لە ساڵی (١٩٢١) چووەتە کۆیە لەوێ بە مامۆستا دامـەزراوە، پاشان گوێـزراوەتـەوە بۆ دائیرەی ئیستهلاك لە پردێ‌و کفری وەك فەرمانبەر.

(مامەند کەرکوکی) پلەو مەقامێکی بەرزو ڕێزێکی زۆری لای مەلای کۆیە هەبووەو دۆست‌و هاوەڵێکی دڵسۆزی ئەسیری شاعیر بووە.

گیوی موکریانیش دەڵـێ: "مامەند کەرکوکی کوردێکی نیشتمان پـەروەر بـووە خەڵکی شـاری کـەرکوك بـووە لە چلەکاندا لە دائیرەی ئیستهلاك فەرمانبەربووە، کاتی خۆی چەند پارچە شیعرێکی نایابی‌و پڕ جۆشی نەتەوەیی بۆ ناردینە ڕەوانـدوز لەسەر خواستی خۆی بۆمان لە زاری کرمانجی بڵاوکردووەتەوە، کاکم دەیناسی، لە ساڵی (١٩٤٣ – ١٩٤٤) خۆی پێناساندم".

دەرچـووی (دار المعلمین) بـووە لـەگـەڵ مامـۆستـای (عەبدولخالق قوتب) بە یەکەوە بوون لەگەڵ مامۆستاکاندا موناقەشەی کردووە، ئەمەش وایکردووە لەسەری بنووسرێ لە مامۆستایەتی دوور بخرێتەوە.

شاعیر لە ڕیـزی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی (هیوا)دا کاری کردووە، بە تایبەتی لەنێوان ساڵەکانی (١٩٤٢ – ١٩٤٧)دا لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا ئابوونە بووە.

مامەند دووا ساتەکانی ژیانی لە کەرکوك بە سەربردووە لە ساڵی (١٩٦٧)ی زاینیی هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

ئـەم شـاعیرەمـان هـاوچـەرخـی (شێـخ نـوری شێخ سـالح)و (گـۆران) بـووە، وەکـو هـەردووکیـان ئـاگـاداری بزوتنەوەی ئەدەبی‌و تازەکردنەوەی ئەدەبیاتی تورکی بووە.

هەموویان پـەیـڕەوی (تۆفیق فیکرەت) شاعیری نیشتمان پـەروەری تورکیـان کـردووەو کـەیـەکێ لـەو کەسایەتییە ئەدەبیانەی سەردەمی وریاکردنەوەی تورك بووە، (مامەند کەرکوکی) هاوشان لەگەڵ شێخ نوریدا لە دەستەی یەکەمی شاعیرانی نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردین، وەك چۆن (ڕەفیق حیلمی) ئاماژەی بە (شێخ نوری) کردووە، کە سەرکردەی شـاعـیرە لاوەکـانـی کـورد بـووە لـە سلێـمـانـی، (مـامـەند کەرکوك)یش لە نوێ کردنەوەی شیعری کوردیدا لە ڕیزی پێشەوەی شاعیرە لاوەکانی مەڵبەندی کەرکوك‌و هەولێر بـووە، شانبەشانی شێخ نـوری ملیداوەتە تازەکردنـەوەی ئەدەبی کوردی لەگەڵ هەبوونی جیاوازییەك لەنێوانیاندا واتە ئەمیش پتر لە بەکارهێنانی ووشە کوردی پەتیدایە کە هەردووکیان کۆت‌و زنجیری قاڵبی کۆنی کلاسیکیان بچڕاند‌و چوونە سەر بابەتێکی نوێ کە تازەکردنەوە بوو لە ئەدەب‌و شیعری کوردیدا.

شاعیر بە شیعرە نیشتمانی‌و نەتەوەییەکانی بەشدارییەکی بـەرچـاوی کـردووە، ئـەم بـەشـداریـیـەش مـاوەیـەکی کەمی خایاندووە هەر لە ساڵی (١٩٢٥) هەتاکو ساڵی (١٩٣٥)، لە گۆڤارەکانی ئەو سەردەمدا بە تایبەتی (زاری کرمانجی) شیعرەکانی دەرکەوتوون ڕۆڵـی دیاریان بینیوە لە گەشەو پێشخستنی بزاڤی شیعری کوردی کەرکوکدا، لـەو ساڵە بە دواوە شوێن‌و شوێـنـەواری شیعری نـەمـاوە تەنانەت بەخۆشی ئەوەندە لە کۆڕو موناقەشە ئەدەبیەکاندا خۆی

دەرنەخستووە، بەم پێیە (مامەندی كەركوكی) لە ساڵی (١٩٣٥) وازی لە شیعر نووسین هێناوە.
شاعیر لە سەرەتای بیستەكانەوە تا ساڵی (١٩٣٢)و (١٩٣٣) وەك شاعیرێكی شۆڕشگێڕ لە مەیداندا بووە، ئیتر لەوە بە دوواوە وەك ئەسیریی هاوبیرو هاودەردی خۆی لەو مەیدانە



كشاوەتەوە، ئەسیری جاروبار ماتەم نامەیەك یان سۆزێكی دەروونی خۆی بۆ میللەتەكەی دەربڕیوە، بەڵام مامەند هەر بە جارێ دەستبەرداری شاعیریی و شیعردانان بووەو حەزی نەكردووە باسیشی لێوەبكات.
ئاشكرایە كە ئەو وەرچەرخان و گۆڕانكارییە نوێیە كە لە شیعری كوردیدا بە تایبەتی لەنێوان هەردوو جەنگ و دوواتر هاتە گۆڕێ لەسەر دەستی شاعیران (شێخ نوری) و (عەبدوڵڵا گۆران)و هاوڕێكانیدا بوو كە كاریگەر بوون بە بزووتنەوەی تازەی ئەدەبی توركی، ئەمان تەكانێكیان بە شیعری كوردیدا چ لە باری ناوەڕۆك و چ لە باری رووخسارەوە. وەك خۆڕزگاركردن لە كۆت و پێوەندو بنەماكانی كلاسیكی كۆن، سەرەتای ئەم گۆڕان و وەرچەرخانەش لە سنووری سلێمانی و لای شاعیرانیدا لە ساڵی (١٩٢٥) بە دوواوە دەركەوت.
لە هەمان كاتدا لە خوارتر لە ناوچەكانی كەركوك بە هەمان مەبەست و هەمان رێـرەوی نوێ (مامەند كەركوكی) ئەو تەكانەی بە شیعری كوردیدا لەو قاوغ و قاڵبە كلاسیكییە هێنایە دەرەوە گۆڕانێكی بنەرەتی بەسەر شیعری كوردیدا هێنا هەم لە باری ناوەڕۆك و هەم رووخسارەوە، بە ناوەڕۆك نیشتمان پەروەرانە و نەتەوەییانەی موتوربەكراو بە بیرو ئایدیایەكی سیاسی جۆش خواردوو بە بیری نەتەوەیی كە زۆربەی ئەو شیعرانەش تایبەت بوون بە رووداوەكانی كوردستانی باكوورو بابەتی میللی و نیشتمانی هەروەك (ئەسیری) هاوبیری توانی بچێتە ناخی ئەو رووداو و كارەساتانەوەو بەرگێكی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرانەی بە باڵادا دابڕین.
شیعرەكانی هاوارو بانگهێشتن بۆ خەبات و هەوڵدان و تێكۆشان لەپێناو بەرگری و بەرخوردان بۆ گەلی كوردی ستەمدیدە بوو.
ئەگەر چی هاوارو بانگەوازەكەی لای شاعیرانی تر لە چوارچێوەی ماتەم و لاواندنەوەدا بوو، بەڵام لای (مامەند كەركوكی) ئەو كارەسات و نوچدانە بوونە مایەی خەبات و تێكۆشان، بوونە هەوێنی قوربانی و بەرخوردان لەپێناو سەركەوتندا، ئەو هەرەس و دارمانەی كوردی باكووری كردووەتە هێمای قارەمانێتی و بە پەندو حیكمەت و هاندەر بۆ زیاتر پێداگرتن لە خەبات و نزیكبوونەوە لە ئاسۆی رزگاری و سەرفرازی كورد"[١].

* بۆ خاوەنی هاوار:

"ئەمیری موحتەرەم ئەی فەخری میللەت میر جەلادەت بەگ
نەوەی شێری جزیرەو قارەمانی مولكی بۆتانی
بەراستی خانەدانتان لایقی تەعزیم و تەبجیلە
لەسەر كورد لازمە دایك بكا عەرزی پەنا خوانی
لەناو قەلبی هەموو لاوێكی كورد ئەم شیعرە نووسراوە
كە شایستەی سوپاس و شوكرە فامیلیلی بەدرخانی
لەناو تەئریخی میللەت قارەمانی جەدی ئەعلاتان
ئەوەندە مەشهوورو مەعلوومە نییە حاجەت بە ئیعلانی
هەر ئێوەن گەه بەشێرو گەه بە خامە بۆ نەجاتی كورد
سەرو ماڵتان فیداكەن هەر لە بۆتان تاكو بابانی
لە خەوابی دڵ بەد ناویی لە ژێر زوڵمی ئەجانبدا
نەمابوو زەرە ویژدان و شعوورێك وەتەن دانی
لە ئاغا تاكو نۆكەرمان لە تاجیر تاكو رەنجبەرمان
هەموو مەستی خەرابات بوون بە بادەی جەهل و نادانی
غووری قەومی و حوبی وەتەن وەك كوفرو ئیلحاد بوو
شەرەف تەنها عیبادەت بوو لە حوبی خێڵی توورانی
هەتا بەو نەعرەتەی شێرانە گێتی گشت لە خەو هەستان
چ كرمانج و چ زازا تا دەگاتە لورو گۆرانی
لە سایەی بەزم و رەزمی ئێوە میللەت زۆر ئومێدەوارە
نەجاتی بێ لە پەنجەی دوژمنی بێ دین و ئیمانی
بە شاكاری بلندتان رووحیان شادان و خەندانە
سەلاحەددین و حاجی قادرو شێخ ئەحمەدی خانی
ئەمینم ئاخیری ئەم عەزمەتان رۆژێ ئەخولقێنێ
چ رۆژێ؟ جەژنەكەی خۆشتر لە سەد نەورۆزی سوڵتانی
بە تەئریخ و بە عیلم تەجروبە مەعلووم و مەشهوورە
كە حەق ژێر ناكەوێ ناحەق زەعیفەو سستە بونیانی
لە قەلبی میللەتی كوردی مەوقعی ئێوە گەلێ بەرزە
بڵندتر سەد هەزار دەفعە لە نەوشیران و ئەیوانی
بەری سەعیی وەفاكاری گەلێ شیرینە وەك شەككەر
وەتەن پەروەر عەزیزو گەورەیە زۆر بەرزە عینوانی

نەتیجە زوڵم و خوێن ڕێژیش نیشانەی مەحوی خوێن ڕێژە
دوا ڕۆژی ستەمگەر هەر نەمانی و هەر پەرێشانی
کوشندە حەقی کوژرانە سەگی هار عومەری چل ڕۆژە
نەصیبی زاڵمیش مەحووو فەنایەو خانەوێرانی
لە ئاخردا ئەبێ لەت لەت کرێ زووحاکی ئینسان خۆر
بە دەستی کاوەی ئاسنگەرو ئەتباعو خوێشانی
ئەفەرمووێ حەزرەتی زەردەشت لە ئاوێستا کە وەختی خۆی
کتێبی دین و دنیا بوو لە لای ماگۆش و ئاترانی
نیهایەت (ئەهریمەن) هەڵدێ لە ترسی (هورمز)ی خێر خواه
بە دۆزەخ شاد ئەبێ رووحی خەبیس و جوملە دیوانی
لە پاش مەدح و سەنا بۆ کۆمەڵەی عالی وەها چاکە
بکەم بۆ عیززەت و ئیقبالیان تۆزێ دووعا خوانی
خودایە کامەران و سەرفرازو پایەداریان کەی
نەوەی شێرانی کوردان یەعنی خێزانی بەدرخانی

* مژدە:

مژدەبێ ئەی قەوم کەوا ئەستێرەیە بۆ کورد هەڵات
فەیزی پەخشی قەومی کوردە ئاوەدانی بۆ وڵات
ئاونرا بە زاری کرمانجی بە عەونی زوو ئەلجەلال
پێشەوای میللەت دەبێ ئەو بۆ بلندی پەرو باڵ
عەرزی تەقدیسات ئەکەین بۆ دانەری مجدەت خەساڵ
لە خودایا تۆ داوام عومرو ئیقبالیان بدەی
قارەمانانی وەتەن پڕ عیزو پڕ ئیجلال بکەی
بەڵکو ڕزگارمان ئەکەن لەم وازیی پڕ زوڵمەت
(ئەم دێڕەم بۆ نەخوێنرایەوە، هەر چەندە لە ووشەکانی سەرەوەش لە هەندێکیان بە گومانم)
با ئیتر نۆرەی سەعادەت بێ بەسییە ئەم نەگبەتە
ئەی چرای ڕووناکی کوردان ئەی هیوا قەوم و وڵات
سەد دەخیل سوتاین لە جەهلا زوو پیشاندە ڕێی نەجات
بانگو هاوار کە هەموو نووستوین لە خوابی غەفلەتا
حەقی ملیمان خوار ئەمجار کە مردین
تا نیهایەت زندو نابین حەسرەتا وا حەسرەتا

* واوەیلای کورد:

کەس نییە هاوارە هاوارێ بکا ئەی کورد لە بۆت
هەڵدرا وەرگیان وخنکان و سووتان وەك بزوت
گەورەو گچکە پیاوو کورو کیژ شێخ و مەلا
خوێنی کورد ڕێژرا بە غەدر عەینی دەشتی کەربەلا
کەس نییە هاوار بپرسێ بۆچ دەکوژرێن کوردەکان
ماتەم و شینە لە بەتلیس وا لە خەرپوت وا لە وان
دەشت و سەحرایی موش ئەردیش و دیار بەکر ئەرزەڕۆم
وەك جەهەنەم ئاگرستانە لە دەستی غەدری ڕۆم
خانمان کوژراوە تەکییەو خانەقاو مزگەوت نەمان
بونەتە جێگای مەیکەدەو چنگو ڕەباب و وەحشیان
زوڵم و غەدری تورکەکان کردیان هیلاکو نیدە کرد
حاشا حەجاج زوڵم و غەدرێکی وەهای پێ ڕێ نەبرد
مەلیك و ئەنگسیون و شەدادو ئایەتولاش قەد نەکا
شەرتی ئینسافە ئەمە ئیسلام بە ئیسلامی بکا
ئەی بەشەر ئەی ئەهلی ئیسلام قەومی عەسری پێشە مین
موزتەرەب نابن لەمانە قەد نەما ویژدان و دین
کەس نییە دەستی تەرەحوم بۆی درێژکا (الامان)
قەومی کورد ڕزگار بکا گشتیان کوژران هەر نەمان
کەوان بە حس و کوان بە ئینساف کوان بە ویژدان کێن بە دین
قابیلە ڕەحمی نەبزوێ بۆی نەکا گریان و شین
بۆچی کەس نابێ ئەنین و ئاهی مەزلوم هەر نەبێ
تاکو ئێستاکە بەشەر مانای (حەقی) نەزانی بێ
ئەی منال و پیری مەعسوم ئەی شەهیدانی وەتەن
ئەی ژنانی عیفەت ئاسا هەمووتان خوێنین کفن
هەڵسن و بچنە حزوری کبریایی لا یەزال
عەرزو حالی قەومی کورد کەن هەر بڵێن ئەی بێ زەوال

* بۆ بیژوی وەتەن:

لە کن خۆت زۆر منەوەر بووی هیوای زۆرمان بە تۆ بوو هەر
ئەوە زانرا لە پێستی شێردا کەر بووی ئەگەر بەد تەر
بە سورەت وادیاربووی چوست و چالاکی وەکو ئەژدەر
لە ئەفعالا وەکو مشك بووی لە بن چنگیدا بێ حەیدەر
ئەتۆ بیژوی وەتەن داخوا لە ڕووی تأریخی میللەتدا
لە ڕۆ ڕۆو شیوەن زیاتر چ سزایە هەر لە حیسەتدا
هەموو ئەفعال و ئەتورات وەك (هێستر) براوێژە
دیارە دایك (بارگیر) بابی (کەر) ئەفعالی کاوێژە
بە ویژدانت کە چڵکاوە دەپرسم لێت چی غاینی
لە غایەنی وەتەن جانی ترە دەرکەوت کە لادینی
لە ئینساندا دوو قوەت عاملە بۆ چاکی و بەدی
ئەویش ئیمان و ویژدانە کە نیتە چۆنە چاك دەبی
پیاوێ گەر لەتێ نانی بداتە (سەگ) لە پاش سەد ساڵ
کە دیتی کلکێك ئەبزوێنێ وەفای دێنێتە جێ ف لحال
لە سەگ کەمتر نەبی هەقە وەفاکەت بێتە جێ هەر کەر
ئەتوو بابانی گەورەت لەم وڵاتە پێگەیشتون گەر
ئەگەر (بیسمارك) بی بۆ غەیرە دیسان بێگانە دەتناسن
هەموو ئیقبالی مللیی خۆت بفەوتێنی هەر ئەو باسن
ئەگەر جاهیل نەبی نەختێ تەئەمول کەی کە مێشك سەخت
لەگەڵ غاین بوونی قەومییەتت تێفکرە ئەی بەد بەخت
کە چۆن ئێستا بیژی و نەدانی و ئەحمەقی خۆت کرد
نەوەکو هەر لەناو قەومت لەناو عالەم حەیای خۆت برد
ئەگەر نەختێ شەرەف ویژدان لە تۆ ببوایە ئەی ئەحمەق
بە تێکۆشین لە بۆ قەومت (گریباڵدی) ئەبوی موتڵەق

*** بەدبەختیمان، بۆ هەموو کوردان:**

رۆژێ تەسادوف بوو تووشی فەقیرێ هاتم
لەگەڵیا کورو کیژێ ناویان بوو (کوردو فاتم)
هەرسێك رەنگو زەردو عاج گەلێ لاوازو بێ تاب
جلیان پرزۆڵ پرزۆڵ بوو، بەڵام هەروەکو مەهتاب
زۆر جوانو ناسك بوون لە چارەیان دیار بوو
عیفەت ناموس حیسییەت گەورەیەتی ئاشکار بوو
گووتی برا کوردەکەم ئێرە وڵاتی کوردە
حەیفێ ئەوهام بیستبوو کوردان بە دەستو بردە
کوردان ئازاو چاو تێن
بە کردەوە وەك شێرن
بە غیرەتو دلێرن
بۆ خۆیەتی زۆر نێرن
گوتم خوشکم ئەنگۆ کێن بۆچی ئاواها لاوازن
جلتان پرزۆڵ پرزۆڵ وا مەلولو بێ نازن
فرمێسکی چاوی رژاند بە حەسرەتێکی پر سۆز
قابیل نەبوو بۆی نەبی لەو حەلە جگەر کوز کوز
گوتی ئەمن کوردێکی لە کوردانی شیمالی
مێردو چوار کوری دیم خنکان بە دەس کەمالی
ماڵو سەروەت، گوند خانوو خشڵم هەموو هەر فەوتان
بریا هەردوك ئەمانەش بوویان بە فیدای کوردان
ئەوجا ئەبووم بەختیار
لە نێوی یارو ئەغیار
بە عیزەتو پر ویقار
ئەم کرد گەلێ ئیفتیخار
کە هاتینە ناو ئەنگو بە هیوای یارمەتیتان
حەیفێ نەمدی مەرحەمەت حسسی قەومایەتیتان
وەختە بڵێم سەد بریا ئەمن کورد نەبومایە
ئینسانییەت، یارمەتی، خۆیایەتی، ئاوهایە
تەعاوەنو بیلبری بە جارێ لە نێو کوردان
نەبیستراوە هەی هاوار، نییە مەرحەمەت ویژدان
هەم ئیسلامو هەم کوردین
پەرێشانو پر دەردین
لەبەر بێ قوت رەنگ زەردین
زۆر چاك بلێن قەومی کورد ئەی ئەشرافو ئەی توجار
ئەی گەورانی کاربەدەست ئەی رونەسای سەروەتدار
لە کوێن ئەی منەوەران بۆچ نابزوێ رەحمتان
بەو فەقیرەو هەژارەی کوردان دەمرن لە برسان
بۆچ هەر لە بۆ قەومی خۆ نییە رەحمو شەفەقتان
نە حسسی یارمەتیتان نە ئینسافو رەئەفتان
گەر هەر وابێ سەختیمان
بۆ براو خۆیەتیمان
لاناچێ بەد بەختیمان

*** ساڵی (١٩٢٦)، بۆ کاك م. نووری:**

ئەم ساڵە کە تۆ لێی ئەدوێی پر گلەیی لێی
ساڵێکی گەلێ خۆشو گەلێ روونو عەزیزە
ساڵێکی بە مزگێنیو پر فەخرە ئەگەر بێی
راوەستی لە پاشان تێدەگەی چەندە لەزیزە
ئەم ساڵە گەلێ قوودسیو پیرۆزو تەمیزە
ئەم ساڵەیە ساڵی فەرەحو شادیو خەندان
ئەمساڵەیە دەشکێنێ هەموو بەندو کەلەپچان
ئەوکەللە بە نرخو بە دڵەی لاوو شەهیدان
تۆوێکە کە چێنراوە لە بۆ ژینو نەجاتە
ئەو خوێنە رژاوانەو فرمێسکی هەتیوان
یارا لە بۆ شین بوونی وەکو ئاوی حەیاتە
ئەمساڵ وەكو رۆژە بەڵام رۆژ هەڵاتە
ئەمساڵەیە ساڵی فەرەحو شادیو خەندان
ئەمساڵەیە دەشکێنێ هەموو بەندو کەلەپچان
قەومێ بیەوێ شانو شەرەف ژین بە راستی
ناترسێ لە نەفیو لە کوشتنو خنکان
ئاوارەو حەپسی لە بۆ قەوم پەرستی
وەك جەژنە پەرێشانی بۆ تاریکی زیندان
بۆ ساندنی ئیستقلالو بۆ حورییەتی ویژدان
ئەم ساڵەیە ساڵی فەرەحو شادیو خەندان
ئەمساڵەیە دەشکێنێ هەموو بەندو کەلەپچان
ئاڵایەکی میلی نەرازانرابێ کە بە خوێن
کەم حورمەت دەبێ ئەو دەکەوێ زۆر زوو لە قیمەت
شانو شەرەفی قەومێ بە خوناوی ببێ شین
زی حیشمەتو بۆ سەتوەتە ئەو تا بە قیامەت
مردن شەرەفە بۆ رێی رزگاری میللەت
ئەم ساڵەیە ساڵی فەرەحو شادیو خەندان
ئەمساڵەیە دەشکێنێ هەموو بەندو کەلەپچان

*** بۆ کاکەی کەرکوکی:**

دەخیلە کاکی کەرکوکی هەموو یەکسەر کەرو لاڵین
وەتەن بێچارە میللەت نووستوە هاوارە بەد حاڵین
تەمو تاریکە ئافاقمان لەناو بوتلانا پاماڵین
چرای عیرفانت هەڵکە باڵشکاو وبێ پەرو باڵین
ببە رەهبەر لە بۆ قەومت پیشانە حاڵی قەومی کورد
چ تاریکە سبەینێمان چ هەڵدێرێك لە پێشمانە
ئەوا هاوارە هاوارە گەلێ پێویستە دەستو برد
ئەگەر نا تا قیامەت مەینەت زوخاوو بەشمانە
وەکو (نیشتەو شکسپیر) بۆ نەجاتی قەومی مەعسومت
لە کۆشینو فیداکاری مەکە سڵ تۆ بکوژرێ گەر
ئەچێتە لاپەرەی تاریخ موحەقەق ناوی مەعلومت
ئەبیتە تاجی سەر کوردان وەکو تاجێکی زەرین فەر

* دەردی دەروون. بۆ هەموو کوردان:

برا کوردانی خۆشەویست
تکام وایە چاك گوێ بگرین
لەسەر هەمووومانە پێویست
بۆ کوردایەتیمان بمرین
ئەگەر هاتو کیژێکی جوان
یا پیرە مێردێکی فەقیر
دەرۆزەی کرد بۆ لەتێ نان
یا منالێ یا ژنێ پیر
دەریان نەکەین دەریان نەکییەن
گەر هەمانبێ نەختێ ویژدان
وایان لێهات لەسەر وەتەن
بۆ سەربەخۆیی کوردستان
ئەوانیش هەموو لە جێی خۆ
خێوی دراو و مالات بوون
هەر لەبەر خۆشی ئێمە چوو
سەرو مالیان ئێستا بێشوون
ماونەتەوە بێ دەرەتان
ئاوارەو بێ ڕوو قەدرن
حەیف و مەخابن وا فەوتان
لە بێنانیو سەرما دەمرن
بە بێگانان هەزار هەزار
ئەدەین لەتێ نانیش بەوان
بدەین بدەین قورمان بەسەر
هەر ئەمانن ڕۆژی تەنگان
بە فریامان بگەن بگەن
لە ژێر دەستی خورتی دوژمن
بە خوێن خۆمان ڕزگار بکەین
مالو عەرزمان هەتا دەژین
بەسە لە گوێی گادا نووستن
هاوارە وریا بن وریا
با دڵ بە یەکتر ببەستین
بەسە پەردەی دلمان دریا
لەبەر شەق و تفی خەلکی
جۆن و ڕەزیلی بەس نییە
بە هاوار هەندە بێکەلکی
ئەوەندە خوێری لەبەر چییە
لەبەر ئەوە بوو خوێنمان
بێ ڕێزو بێکەلك و پوچین
غولامی خەلکی پێمان
خۆشە، بۆ یەکی وەك پوشین
هاوار فریاد بەسە ئیتر
هەلسن لەم خەوە مردنە
بە منال و بە گەورەو پیر
تەبایین یەکدی گرتنە
ئەوە دەوای نەخۆشیمان
بۆ خۆیەتیمان تێکۆشین
بلندی کوردی بێ خۆشیمان
بۆ ناخۆشی ڕەش بپۆشین
گیچکەیەکی کوردەواری
خۆشەویست و بە حورمەت بێ
لە هەموو گەورەو دەسداری
بێگانان زۆر بە قیمەت بێ
پێویست بێ یارمەتی یەکتر
بە گیان و مال ئەکەین لاری
ئەگەر نەبین تا دێ بەد تر
ڕەزیل ئەبین لە ژێر باری

* گلەیی:

ئەی کوردی ستەمدیدە مەزلوم و سیاچار
وەی میللەتی مەعسومەی بەدبەختی گرفتار
تاکەی لە خەوان ئێوەو دوژمن بێدار
تا چەن ئەبێ هەرمەست بن و خەلقی وشیار
خۆتان ئەکەنە مەزحەکەی مەحرەم و ئەغیار
* * *
عالەم هەموو مەشغول و تەلاش و دەس و بردە
هەر میلەتێ بۆ خۆی خەریکی زەدو خوردە
هەر کەس لە بۆ خۆی حاکمیم خۆیە وەکو مەردە
مەحرومی هەموو حەق و حقوقێمیلەتی کوردە
ماتەم زەردەو سوك و پەرێشان و گرفتار
* * *
ئەو میللەت و قەومانە لەمەو پێش زەبون بوون
ئەو تایفەیەو تاقمە ئەوساکە کەدوون بوون
ئەو خەلکە لەبەر جەهل و نیفاق غەرقە خون بوون
هەلسان لە خەوی غەفلەت و دارای فنون بوون
ئێستاکە هەموو بەگلەك و شاهو حوکمدار
* * *
کوردیش ئەبێ هەر عەبدو غولامی ئەم و ئەو بن
بێهۆش و سەراسیمە لە دوی خەلکی بەدەو بن
ڕۆژ نۆکەرو ئەغیارو شەویش حەس حەسی شەو بن
چاویان لەم و لەو بێت نە بەم بن نە بەئەو بن
بێ عیلم و چەك و پارەو مەخزون و خەفتیار
* * *
بەس تالبی الآن بە یەك و کوشتنی یەك بن
بەس جاهدی بی دەستی و دەست بەستنی یەك بن
بەس مائیلی فەوتانی یەك و مردنی یەك بن
مەشغولی برایی یەك و یەکخستنی یەك بن
تا کۆمەك و یەك دەستەو یەك بن وەکو ئەغیار
ئەم جەهل و نیفاق و سیفەو زیللەتە تا کەی
ئەم بێشەرەفی و خۆخۆری و غەفلەتە تا کەی
ئەم بوغزو شیقاق و حسدو عوزلەتە تا کەی
بێ فکری و سەرمەستی ئەم میللەتە تا کەی
تا کەی ئەبنە مەستەرەیی عالەمی هوشیار
* * *

هەڵسن لە خەوێ خزمە دەمو چاوێ بشۆرن
چاوێکی هەڵێنن لە چەپو راستێ بنۆرن
پرسێکی لە یەك کەن لە چە ئەحواڵو چ شۆرن
ئەم عالەمە بۆ چ عاجزو بێ کەیفو سرورن
بۆچی ئەکەن ئەم کوردە فەقیرە هەموو هاوار
* * *
ئەم دەنگو هەراو ناڵەو شینە لە چەلایە
ئەم ئاهی جگەر سۆزو گرینە لە چەلایە
ئەم گشت جەزعو کوشتو برینە لە چەلایە
سەرچاوەیی ئەم چەشمە خوێنە لە چەلایە
چی بێ ئەبێ ئەم شۆرشو غەوغایە لە ئەقتار
* * *
ئەم دەنگە هەموو ناڵەی کوردانە لە دەست غەیر
ئەم شۆرە سەدای شیوەنی کوردانە لە دەست غەیر
ئەم نرکە هەموو سوزش کوردانە لە دەست غەیر
ئەم خوێنە گەشە خوێنی شەهیدانە لە دەست غەیر
ئەم نەعرە هەموو نەعرەی کوردانە لەسەردار
* * *
وا چاکە هەموو موتەحیدو یەك دڵو چابین
بۆ یەك وەکو یەك دەستە عەینی برا بین
مەردانە لە بۆ مەقسەدی یەك پشتو پەنا بین
بەو شەرتە هەموو تابعی ئەحکامی خودا بین
تا جوملە رەها بین لە دەست دوژمنی خون خوار
* * *
دوژمن لە هەموو لا چ چەپدا چ بە راسا
بۆ میللەتی کورد شەوو رۆژ وان لە مەلاسا
دایم ئەوەیان وا لە سەرو فیکر حەواسا
ریشەی رەگی کورد بېرنەوە هەر لە ئەساسا
تا کونەمێنێ نەفەرێ کورد لە ئەقتار
* * *
هەر کەسێ کە ووتی ئەمەنە بە چەن ئەبنە غولامی
تەسلیمی ئەکەن ماڵو سەرو جان کرامی
بۆی ئەبنە سەنا خوانو دوعا گۆی دەوامی
ئەی میللەتی بێچارە عەجیب جاهیلو خامی
قەومێکی تەواو بێ سەرو پێو پێمو نەزانکار
* * *
شەهدی ئەمو ئەو پریە لە دەرمانی کوشندە
بەس تەفرە بخۆن هەر بە قسەی خۆشو بە خەندە
ئەی بێ خەبەران بەس ببنە چاکرو بەندە
مەشهورە کە کەمتر نەبوە شەندە لە مەندە
رۆژێ ئەبێ بەم شەهدە ئەبن ئێوە گرفتار
* * *
ئێوە بنو خوا وەرنەوە گشت گەورەو گچکان
دەرکەن لە دڵا جوملە هەیالاتو پەرێشان
چەن شتێ هەیە واسیتە بۆ نەگبەتی کوردان
وەك کیبرۆ حسدو بوغزی یەكو قیلەتی عیرفان
ئیسلاحی بکەین تاکو بکۆشین بە هاوار"[٢]

* سەرچاوە:-

١. (کەرکوكو بزاڤی شیعری کوردی، لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن)، دکتۆر محەمەد ئەحمەد سەعید (کەساس جەباری)، دەزگای چاپو پەخشی (سەردەم)، سلێمانی، ٢٠٠٨، لاپەرە (٣١٨ - ٣٢١).

٢. (مامەند کەرکوکی، شاعیرێکی لەبیر کراو)، لەتیف فاتیح فەرەج، چاپخانەی (کارۆ)، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەرەی جۆراوجۆر.

## * جەماعەتەکەی کەرکوك:

فرە کەلتووری، فرە نەتەوەیی، فرە زمانی، لەو ڕەگەزانەن کە ڕۆڵێکی گرنگیان لە پێکەیاندنی ئەدەبیانی (گرووپی کەرکوك)دا بینی. لە ناو ئەو گروپەدا کورد هەبوو، یوسف حەیدەری، زوهدی داودی، محێدین زەنگەنە، سەلاح فایق.. کلدو ئاشوور، سەرگۆن پۆلس، جان دەمۆ، قەشە یوسف سەعید. عەرەب، فازل ئەلعەزاوی، جەلیل قەیسی، ئەنوەر غەسانی، موئەیەد ڕاوی. تورکمان، قەحتان هورمزی.
بەلام ئەم جۆرە دابەشکردنە لەسەر بنەمای نەتەوەیی بۆ کەسانێك لە شارێکی کۆزمۆپۆلیتیی وەکو کەرکوك دا پەروەردە بووبن، کارێکی هێندە ئاسان نییە. گەر پێستی هەر کامێك لەو گروپە هەلدەیتەوە چەندین نەتەوەو ڕەگەزو کەلتووری جۆراو جۆر ئەدۆزیتەوە. بۆ نموونە، جەلیل قەیسی، باوکی عەرەبو دایکی کوردو ژنەکەی ئەرمەنی بوو و لە گەڕەکێکی تورکمان دا ئەژیان جەلیل هەموو زمانەکانی کەرکوکی ئەزانی. موئەیەد ڕاوی، باوکی عەرەبو دایکی ئاشووری بوو و ژنەکەی کوردە، هەموو زمانەکانی کەرکوك بە نووسینو خوێندنەوەو ئاخاوتن بە پاراوی ئەزانێ، لەبەر ئەوەی لە قوتابخانە کوردییەکانی دەورووبەری کەرکوك مامۆستا بووە. ئەنوەر غەسانی، دایکی عەرەبو باوکی بە ڕەگەز تورك بووە، ئەویش بە هەمان شێوە هەموو زمانەکانی ئەزانی. لە ئیمەیلێکدا بۆی نووسیم : "ئەکرێ ناسنامەی نەتەوەیی خۆم بە عەرەبو کوردو تورکمانو شتی دیش بناسێنم". ئەنوەر گەلێ شیعری بۆ کورد نووسیوە، شێخ مەحمودو شەقلاوەو.. فازل ئەلعەزاوی، عەرەبیو تورکمانی. ئەدیبە کوردەکانی ناو گروپەکەش، بە هەمان شێوە، هەموو زمانەکانیان ئەزانی.

ئەوەی جێی پرسیار بوو لەلامو هەمیشە بیرم لێ ئەکردەوە ئەوە بوو، ئاخۆ ئەدەبیانی گرووپی کەرکوك، ڕۆژانە کە بە یەك ئەگەیشتن زمانی ئاخاوتنیان چی بوو؟. ئەم پرسیارەم لە زوهدی داودی کرد، وتی: بە هەموو زمانێك ئەدواین. لە عەرەبیەوە ئەمانگۆڕییە کوردی، ئینجا ئەمانکرد بە تورکمانی، بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین. بێگومان، لەدوا سەردانمان بۆ ئەلمانیا، ئەمەم بەچاوی خۆم بینی، کاتی نورەدین سالحیو زوهدی داودی، کە هەردووکیان کوردن بە تورکمانی ئەدوان، کە بابەتێکی دی هاتە پێشەوە، کردیان بە کوردی، پاشان کردیانەوە بە تورکمانی. کاتێ لەگەل فازل ئەلعەزاوی دا یەکیان گرتەوە چاکو چۆنییان بە تورکمانی کرد، پاشان کە باسی ئەدەبیات هاتە پێشەوە کردیان بە عەرەبی. جگە لەم زمانانە، بەهۆی نزیك بوونیان لە کۆمپانیای نەوتەوە، هەموو خۆیان فێری زمانی ئینگلیزی کرد، کە ڕۆلێکی سەرەکیی هەبوو لە گەشە پێدانی ئەدەبەکەیانو ئەو نویخوازییەی لە شیعرو چیرۆكو شانۆی عێراقیدا هێنایانە ئاراوە. هەندێکیان ڕاستەوخۆ لەو کۆمپانیایەدا کاریان ئەکردو لەگەل ئینگلیزەکان تێکەل بوون، جەلیلو ئەنوەر، هەندێکیشیان کەسوکاریان لەو کۆمپانیایەدا کاریان ئەکرد، برایەکی سەرگۆنو باوکی موئەیەدو کەسوکاری جان. سەرگۆن بەو ڕۆمانەنەی (کتێبی گیرفان Pocket Book) خۆی فێری ئینگلیزی کرد کە کرێکارە ئینگلیزەکانی کۆمپانیای نەوت پاش خوێندنەوەیان فڕێیان ئەدان، ئەنوەر پۆلسی برای سەرگۆنیش ئەیانهێنانەوە مال. سەرگۆنو هاوڕییەکانی، وەك ئاشکرایە، بەهۆی خوێندنەوەی ئەدەبی جیهانی بە زمانی ئینگلیزیو، بەهۆی کاریگەرییان بە (گرووپی بیتنیکس Beat Generation)و (ئالن گینسبێرگ)و (جاك کیرواك)و (لۆرەنس فیرلەنگێتی)و ئەوان، کە توانییان لە شەستەکان دا ڕووی ئەدەبی عێراقی بگۆڕن لە کلاسیکەوە بۆ مۆدێرن. جۆرێکی نوێیان لە پەخشانە شیعر داهێنا جیاواز بوو لەوەی گۆڤاری (شعر)ی ئەدۆنیسو یوسف ئەلخالو ئۆنسی ئەلحاجو ئەوان. گرووپی کەرکوك لە ڕاستیدا چەمکی ناسنامەی نەتەوەیان گۆڕیو چەمکێکی نوێو ئەفسوناوییان داهێنا کە ئالتەرنەتیڤی ئەو چەمکە کۆنە نییە، بەلکو چەمکێکی ئینسانییە.
فازل ئەلعەزاوی لە کتێبی (الروح الحية- جيل الستينات في العراق)دا خالێکی دیمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە لەبارەی ئەو بیروباوەڕە ئینسانییەی گرووپی کەرکوکی تیادا گۆش کرا، ئەلێ: "لەبەر ئەوەی لە منالییەوە بە گیانی برایەتی پەروەردە بووینو فێر کراین تەنیا باوەڕ بە تاکی مرۆڤ بهێنین بێ گوێدانە پاشینەی نەتەوەیی یان ئایینی یاخود چینایەتی کە پێمان وابوو ئەو ڕەگەزانە تەنیا ڕێکەوتنو هیچ ناگەیەنن، وای بۆ ئەچووین کە حیزبی بەعس حیزبی عەرەبە، پارتی حیزبی کوردانە تۆرانی حیزبی تورکمانە، ئێمەش ئەمەمان بە هیچ جۆرێك بۆ قبوول نەئەکرا، بەلام حیزبی شیوعی بە بۆچوونی ئێمە تەمسیلی یەکێتی عێراقی ئەکرد، جیاوازی نییە لەنێوان موسلمانو کرستیان، یان عەرەبو کوردو تورکمان لەلایەك، لەلایەکی دیش لەسەر ئاستی عەرەبیو جیهانیدا جیاوازی نییە لەنێوان گەلێكو گەلێکی دیو نەتەوەیەكو نەتەوەیەکی دیدا"، بۆیە پەیوەندییان بە حیزبی شیوعی عێراقییەوە کرد[1].

لە دوادوایی سالانی پەنجاکانداو دواتر گەرمو گوڕتروبەجۆشترو کاملتر لە سالانی (١٩٦٤)ەوە کۆمەلێك لاوی خوێن گەرمو عاشق بە ئەدەب، لەڕێگەی ئەدەبەوەو هەر بۆ ئەو مەبەستەش یەك بەیەکتر ئاشنا بوونو دواییش هەموویان بوونە دۆستو هاوەلو هاوڕێی یەك. لە سالی (١٩٥٩)دا ڕاپەڕینی گاورباغی لە شاری کەرکوکدا لەلایەن کرێکارانی کۆمپانیای نەوتەوە ئاگاداربوونەوەو ڕاچەنینێکی شۆکئامێز بوو بۆ دانیشتووانی ناوچەکەو بە تایبەت ئەوانی چەقی ناو شاری کەرکوك. بوونی کۆمپانیایەکی گەورەی وەکو کۆمپانیای نەوتی کەرکوك لە شارەکەدا بۆ خۆی ڕۆلێکی گەورەی هەبوو لە فێربوونی زمانی ئینگلیزیدا. هەر لەو کاتەشدا بوونی ڕۆلی چالاکی حیزبی شیوعی لە شارەکەداو گەشە سەندنی بیری مارکسیزمو بیری بوونگەرایی لە ڕێگەی بلاوبوونەوەی کتێبەکانی ژان پۆل سارتەرەوەو هاندانو پەرەدان بە کەلتووری خوێندنەوە،

هەموو ئەمانە بەسەر یەکەوە، وایان کرد رۆشنبیران و نووسەرانی شارەکە نەك هەر ئاگاداری ئەدەبی عەرەبی بن، بەڵکو وای لێ کردن ئاگاداری زمانەکانی تری وەکو ئینگلیزی و لەرێی نووسەرە تورکمانەکانەوە ئاگاداری تورکییش بن. بۆ نموونە کەسێکی وەکو فازڵ ئەلعەزاوی هەندێك رۆمانی بە زمانی تورکی دەخوێندەوە. هەموو ئەم تازە نووسەرانە، کە خولیای تازەگەری دایگرتبوون و دەیانویست بە نووکی تیژی خامەکانیان دنیا ئاگادار بکەنەوەو ئینجا بیگۆرن و ولاتی شیعر، یا بە گشتی ولاتی ئەدەب لەسەر کەلاوەی ئەدەبی باو بنیات بنێن، تا لە رێگەیەوە گۆرانکاریی گەورە بەرپا بکەن.

بەشێکیان لە گازینۆ نەسری شەقامی کۆماری و هەندێکیشیان لە گازینۆ مەجیدییەی تەنیشت کتێبخانەی گشتییەوە دادەنیشتن. گازینۆکان لە هەر شوێنێك بووبن لە شێوەی سالۆنەکانی میسرو فەرەنسا رۆڵی کۆمەلایەتی و سیاسیان بینیوە. ئەمە وایکرد ئەو نووسەرانەی هەردوو گازینۆکە یەك بگرن و سەبارەت بە ئەدەب لە مشتومرو گفتوگۆیەکی بەردەوامدا بن، تاکو لە رێگەی ئەم دانیشتنانەوە بۆیان دەرکەوت رایەکانیان لێك نزیکن و خەمەکانیشیان هەمان خەمن، ئەویش خەمی نوێکردنەوەیە بێ ئەوەی شتێك هەبێت بەناوی زمان یان نەتەوەوە لێکیان بخاتەوە.

ئەمانە پێکهاتەیەك بوون لە عەرەب و تورکمان و کوردو سریانی و ئەرمەنی. تێیاندا هەبوو جگە لە عەرەبی زمانی خۆی، کوردی و تورکمانی و سریانیشی دەزانی. بۆیە کە قسانیان دەکرد تەنیا بە عەرەبی نەدەدوان، بەڵکو بە کوردی، یا بە تورکمانییش دەدوان.

هەڵبەت ئەم جیاوازی نەکردنە لەو کاتەدا سیمای شاری کەرکوك و خاڵی یەکگرتن و تۆکمەکردنی پێوەندیی نێوانیان بوو، ئینجاش نهێنیی مانەوەیان ئەگەرچی بەداخەوە لەو کاتەدا، لە ساڵی (١٩٥٩)دا رووداوێکی دڵتەزێن و شۆفێنییانە، کە بەهەراکەی کەرکوك بەناوبانگە روودەدات، بە مەبەستی ئاژاوەنانەوە لەنێوان پێکهاتەکانی شارەکەداو هەندێك دەبنە قوربانی و هەندەشی نامێنێ لەلایەن قەحتان هورمزییەوە درزێك بکەوێتە ناو گروپەکەوە، لەبەر ئەوەی بە قەولی هورمزی ئەوان لە کوشتوبری تورکمانەکاندا هاوخەمییان دەرنەبریوە، بەلام ئەمە درێژە ناکێشێ و خۆشبەختانە زوو دادەمرکێتەوەو لە سنووری زویربوونێك تێپەر ناکات.

ئەم کۆمەڵەیە، یا ئەم گرووپە، یا ئەم دەستەیە، یاخود ئەم بزوتنەوەیە (ناتوانین ناوێکی پر بەپێستی خۆیانیان لێ بنێن، چونکە مانیفێستی، یا رۆژنامەیەك، یا گۆڤارێکی تایبەت بە خۆیان نەبووە، ئەو ناوەیشی لێیان، نراوە لەلایەن نووسەرانی بەغداوە بووە) پێکهاتبوو لە:

موئەیەد ئەلراوی (١٩٣٩)و فازڵ ئەلعەزاوی (١٩٤٠)و جەلیل قەیسی (١٩٣٧- ٢٠٠٦)و یوسف حەیدەری (١٩٣٤- ١٩٩٣)و ئەنوەر غەسانی (١٩٣٧- ٢٠٠٩)و قەحتان هورمزی (١٩٣٦- ٢٠١٢)و زوهدی داودی (١٩٤٠) جان دەمۆ (١٩٤٣- ٢٠٠٣)و سەرگۆن پۆڵس (١٩٤٤- ٢٠٠٧)و سەلاح فایەق (١٩٤٠)و قەشە یوسف سەعید (١٩٣٢- ٢٠١٢) و فایەق مستەفا (١٩٤٦).

ئیدی بە هەموویان پێکهاتەیەکی ئەدەبییان لە شێوەی تەسبیح چێ کردبوو لە دەنکی هۆنراوەو چیرۆك و تارو شانۆنامەو رۆمان و رەخنەو وەرگێران و هونەری شێوەکاری و خۆشنووسی هۆنرابووەوە.

تا ئێستا لێکۆڵەران لەسەر ژمارەی ئەندامانی گرووپی کەرکوك کۆك نین، بۆ نموونە زوهدی داودی و فازڵ ئەلعەزاوی، عەبدوللەتیف بەندەر ئۆغلو (١٩٣٧- ٢٠٠٨) و محێدین زەنگەنە (١٩٤٠- ٢٠١٠) بە ئەندامی گرووپەکە دادەنێن و تێیشیاندا هەیە نووسەرێکی وەك زوهدی داودی لە دەرەوەی گرووپەکە دادەنێت و دەڵێت ئەو تەنیا لێیانەوە نزیك بووەو لەناو گرووپەکەدا نەبووە. زوهدی داودی لە وتارێکیدا بۆ مەرگی قەحتان هورمزی دەڵێت:

"بەم شێوەیە خۆم لە ئەڵقەیەکی ئەدەبی- سیاسیدا بینییەوە، کە دژ بە سەردەمی پاشایەتی بوو، پاشان لەسەر ئاستی عێراقدا بە (گرووپی کەرکوك) ناسرا"[٢].

لەم قسانەی داودییەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی گرووپەکە نەك هەر ئەدەبی بوو بەڵکو سیاسییش بووە. بۆ پاڵپشتیی ئەمەش فاروق مستەفا دەڵێت هەموو ئەندامانی گرووپەکە شیوعی بوون، مەیلی مارکسییانەیان هەبووە[٣].

بۆیە مایەی سەیر نییە زۆریان میوانی بەندیخانەکان بوونەو چەند ساڵێکیان تێدا چەشتووە. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە هەمیشە لە ئێش و ئازارەکانی میللەتەوە نزیك بوونەو لە بەرامبەر رژێمە دیکتاتۆرەکاندا دۆش دانەماون و بێدەنگ نەوەستاون، بەڵکو بەردەوام قسەی خۆیان هەبووە.

رەنگە لە سۆنگەی ئەمەشەوە بووبێت ئەندامانی گرووپەکە تەرتەو وەرتە بوون و هەر یەکەو لە ولاتێکدا گیرساوەتەوەو چۆن ئەرستۆ بەدانایی شاری جێهێشت و لەترسی ئەوەی نەوەکو بە دەردی سۆقراتی فەیلەسوف بچێت، گوتی: "ئەو فرسەتە ناداتە ئەسینا، کە گوناهێکی دی دژ بە فەلسەفە بکات. هیچ ترسنۆکییەکیش لەم کارەیدا نییە"[٤]. ئەمانیش بەهێمنی نەکو بە دەردی کرێکارانی مانگرتووی گاورباغی بچن، بۆ یەکجاری شارەکەیان جێهێشت.

لەنێوانیاندا تەنیا جەلیل قەیسی نەبێت، تا سەری نایەوە کەرکوکی جێنەهێشت و لە کەرکوکدا مایەوەو هەر لە ئارانجا، یا ئارابخا (ناوی کۆنی کەرکوك)یشدا سەری نایەوە.

کەچی ئینجاش ئەدەبی جەلیل قەیسی ئەو پیاوەی هەمیشە خۆی گرمۆڵە کردبوو لە گۆشەنشینییەکەیدا جیهانێکی دەگمەن و ئاوازەی خۆڵقاندبوو و سروودی خۆی بۆ بەدیهێنانی کامەرانی و بەختەوەریی مرۆڤەکان دەگوتەوە، زوو سنووری ناوچەیی و پاشان عێراقی بەزاندو لەو دەمەی تەمەنیی (٣٠) ساڵ بوو، ساڵی (١٩٦٨) کۆمەڵە چیرۆکێکی (صهیل المارة حول العالم - حیلکەی رێبواران بەدەوری جیهاندا)ی لە بەیروت بە چاپ گەیاند.

جەلیل قەیسی سەبارەت بە دووره پەرێزییەکەی دەڵێت:
"ئەوا پتر لە سی ساڵە من لە قوژاخەی تەنیاییدام.. بەشێوەیەکی درامیی تێکەڵ بە سادی بەدەوری خۆمدا لێم

داوە. گومانم لەوە هەیە هەر هێزێك بتوانێت لێی دەرمهێنێ، چونکە بووەتە بەهەشتی من.. گۆشەنیشینی پیرۆزییەکی تایبەتی هەیە، ئەگەر مرۆڤ بزانێت چۆن لەسەر خاچی کۆژانەکانی راکێشێت.. (تا ئەگاتە) کەسێکی باشی وەکو من تا رادەی لاوازیو پێویستییەکی شێتانەی بەجیهانی ئەفسووناوی هەیە، ناتوانێت بە ئارامی لەگەڵ ئەوانی تردا هەڵکات.. تەنیاییەکەی من دەروونیو فەلسەفییە، لەبەر هەندێ پەنای بۆ ئەبەم، چونکە تێیدا دەگەشێمەوە.. هەرچی ناوبانگە ئەوا بەلای منەوە مایەی پێکەنینە.. من لە دوورەپەرێزی هەست بەخۆم ئەکەم.. ناوبانگ وشەیەکی پێکەنین هێنەرە!!.."[٥].

مخابن ئەگەر ئەم گرووپە کاریان بۆ خۆیان بکردایاو بڵاوکراوەیەکی تایبەت بە خۆیان هەبوایاو باڵی بەرینی رەخنە بەسەریاندا بشەکایەتەوەو بەرهەمەکانی یەکتریان بۆ زمانەکانی تر وەربگێڕایاو ئاراستەیەکی دروستیان هەبووایا، دوور نەبوو پتر بناسرانایاو بەرهەمەکانیان سنووری عێراقیان ببڕایاو بگەیشتایەتە وڵاتانی عەرەبو لەوێوە ڤیزەی پەرینەوەیان بۆ وڵاتانی جیهان بەدەست بهێنایا.

زەلامەکە لەناوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا کەوت
کابرا کەوتە سەرچۆکان
ئاخۆ تا ئەم رادەیە شەکەت بوو
تاکو توانای وەستانی لەدەست دابێت؟
داخۆ گەیشتە ئەو بەنداوەی
شەپۆلی رێکاری تەمەن تێیدا دەشکێت؟
داخۆ چەکووشی غەم بەسەریدا زاڵ بووە؟
ئایا زریانی ئازار بوو؟
رەنگە کارەساتێك بووبێت
کەس بەرگەی نەگرتبێت..[٦].

شوێن لای نووسەرانی گرووپەکە مانا جوگرافییەکەی تێپەڕاندبوو و مانای تری دەبەخشی، بۆیە هەمیشە وێڕای دوورکەوتنەوەیان لە کەرکوکەوە لە دووری هەزاران میلەوە وەك باڵندەیەك لە زێدی خۆی دابڕابێت گۆرانییان بۆی دەچڕیو هەمیشە کەرکوك ئیلهامبەخشی نووسینو داهێنانەکانیان بووەو لە هەر کوێیەك هەڵخلیسکابن خۆیان بەکەرکوکەوە گرتووە.

سەلاح فایەق کاتێك لە وڵاتێکی دەرەوە و دوو لە کەرکوك شیعر دەهۆنێتەوە، دەنووسێت:

گەر ئێستا لە کەرکوك دەبووم
سەردانی گۆڕی پیاوچاکێکم دەکردو
پەڕۆیەکی رەنگاورەنگم بەدیواری
گۆڕە لە مێژینەکەیەوە هەڵدەواسی.

قەشە یوسف سەعید کە بەر لە هەموو ئەندامانی گرووپەکە کەوتبوو و شانۆنامەیەکی بەناوی (یەکەمین کوشتارگە)ەوە لە ساڵی (١٩٥٨)دا بڵاوکردەوە، لە دیمانەیەکیدا لە ساڵی (٢٠١٢)دا لەگەڵ ئازاد ئەحمەد ئەسوەددا، کاتێکدا بیری تیژی کول بوو بوو و پیری پەکی خستبوو، دەڵێت:

"ئەستەمە رۆژگارەکانی خۆم لە کەرکوك لەیاد بچێتەوە"[٧].

ئەو هێند شەیدای کەرکوكو کەرکوکییان بوو، تەنانەت لەسەر گەشەکردنی گۆرانیی کوردیو وتارێکی لە گۆڤاری (التراث الشعبي)دا بڵاوکردەوە. جا دەبێت چ کوردییەکی رەوانی زانیبێت!

هەرچی جان دەمۆی بوو هێمنیو هەمیشە پەرپووتە، ئەو وەك ئەوەی هەر بۆ شیعر خولقابێت هۆنراوەی دەهۆنییەوە:

لەژێر ئاسمانێکی وەنەوشەییدا جێ بۆ منالەکانمان جێدێڵین؟
لە سەدەی داهاتوودا چییان بۆ دەهێڵینەوە؟
داخۆ گەرمەژاریان بۆ جێدێڵین؟
ئایا مەرگێکی ئامادەیان بۆ هەڵدەگرین؟
یا تەرمیان بۆ جێدێڵین؟

سەرگۆن پۆلس شاعیرو وەرگێڕ لە دیمانەیەکی لەگەڵ سەلاح عەوادا دەڵێت:

"بەلای منەوە کەرکوك سەرەتای نووسینو ئەو چاوگەو شوێنەیە، کە تێیدا چاوم لەسەر هەڵوێستەکانی شیعردا هەڵێنا.. لە هەموو کتێبەکانمدا لەسەر کەرکوکم نووسیوە، بەتایبەتیش لە کتێبی (یەکەمو دوامین)، تێیدا چامەیەکی تێدایە بەناوی (رۆژانێك لە کەرکوکدا) چامەیەکە بە تەواوی گوزارشت لە وێنەی کەرکوك دەکات، کە تا ئێستا لەگەڵمدایە، ئەو چامەیەك لە ئەمەریکا سان فراسیسکۆ نووسی"[٨].

زوهدی داودیش لە چەشنی ئەوانی تر و رەنگە بوێری بکەینو بڵێین لەوانیش پتر هەمیشە کەرکوكو دەورووبەری شانۆی رووداوەکانی چیرۆكو رۆمانەکانی، دەڵێت: "ئەو لەبەراییدا بەچیرۆك دەستی پێ کردو پاشان لەسەر رۆمان گیرسایەوە. دیارترین رۆمانیشی سێینەی دۆڵی کفرانە (درێژترین ساڵ، سەردەمی هەڵاتن، وەچەرخانەکان). نووسەر لەم سێیینەیەیدا باس لە دەڤەری گەرمیان بەتایبەتیو چەقی شاری کەرکوك بەگشتی دەکات. دەکرێت بڵێین رۆمانێکی مێژووییەو جارجاریش بەفەنتازیا ماکیزییەکەی لە رووداوە مێژووییەکان دوور دەکەوێتەوە، تا زیاتر بەواقعیەکەمان ئاشنا بکات، رۆماننووس هەوڵی داوە مێژوو بکات بە کەرەستەی رۆمانەکەی، نەك رۆمانەکەی بکات بە کەرەستە بۆ مێژوو، واتا لەپێناوی ئایندەدا مامەڵە لەگەڵ رابردوودا دەکات"[٩].

گرووپی کەرکوك هەڵدەگرێت چەندین کتێبی لەسەر بنووسرێتو بەرهەمی یەك بەیەك ئەندامەکانی هەڵبسەنگێنرێت، لێ مخابن ئەوی تا ئێستا کراوە زیاتر گێڕانەوەی مێژووی گرووپەکەو بەشدارەکانییەتی، نەك قسەکردن لەسەر ئەوەی چییان نووسیوە. بەهەر حاڵ گرووپی کەرکوك خۆری ئاوانەبووەو بەرهەمی نووسەرانی بوونە هەوێن بۆ گەلێك نووسەری دوای خۆیان، تا ئەو رادەیەی توێژەرێکی وەکو دکتۆر عەبدوڵڵا ئیبراهیم قسە لەسەر گرووپی دووی کەرکوك بکاتو مێژوویان بنووسێتەوە[١٠]. نووسەرانی تریش هەن، باس لە گرووپی سێی کەرکوك دەکەن[١١].

"* لەناو نەوەی شەستەکانی عێراقی سەدەی رابردوودا، ئەدەبی گرووپی کەرکوك پێگەیەکی شایستەی هەیە، ئەگەرچی هەر بە (نەوەی شەستەکان) دادەنرێتو لە شیعرا

بە (نەوەی دووەم) حسێب دەكرێ پاش (نەوەی یەكەم)ی پێشەنگەكانی هۆنراوەی ئازاد: سەییاب، نازك، بەیاتی، بلند.

* نووسەرانی گرووپەكە رەگەزی نێرن‌و ئافرەتێكیان تیا نییە.

* ئەگەرچی لە سەردەمی هەڵپەداری عرووبە ژیاون، و شۆڤێنییەت بە كردەوە مۆركێكی باوی دەسەڵاتی بەغدا بوو، بەڵام ئەوان لایەنگرو دۆستی ئەو ئاراستەیە نەبوون.

* جگە لە زمانی عەرەبی هەر یەكە لەوانە كەم تا زۆرێك، زمانی ئینگلیزی‌و كوردی‌و توركمانی‌و سریانییان زانیوە، لە ئەورووپاش ئەوانەی چوونە ئەڵمانیا لەوێ فێری زمانەكە بوون. سەرباری ئەمە ئەنوەر ئیسپانی فێربووە.

* دووری لە نیشتیمان تووشی نۆستالیجیای كردوون‌و لەلای هەریەكەیان خۆی بە شێوەیەك دەنواندو لەگەڵ بابەتی نەفرەت كردن لە رژێم ئاوێتە دەبوو. سەرگۆن پۆڵس لە ساڵانی بەرایی لە عێراق‌و دوای دەرچوون و تا دەگاتە سان فرانسیسكۆ بە ئاسانی‌و بێ هەستكردن بە نامۆیی باسی كۆنە هەوار دەكات. پاش جێگیربوونی، سۆزی غوربەت زیاتر كاری لێدەكات.

*** سەرگۆن پۆڵس (١٩٤٤- ٢٠٠٧):**
شاعیرو چیرۆكنووس‌و وەرگێڕە، بە رەگەز ئاشوورییەو



گەلێك جار لە دەقەكانی پاش بەرایی‌و تا دەگاتە دوادیوانی، ئیلهامی لە ئەفسانەو مێژووی ئاشووری‌و سۆمەری‌و گریكی‌و تەوراتی‌و ئینجیلی‌و شاعیرانی كلاسیكی عەرەبی وەرگرتووە، گشت ئەمانەی ئاوێتەی ژیانی رۆژانەی خۆی دەكردو دیمەن‌و وێنەی دەگمەنی لێدەگرت، سەرگۆن هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە خولیای سەفەر دەكات، هەر بە خوێندنەوە كۆچ‌و گەڕان بەناو دەقەكانی ئەدەبی جیهانی دەكات‌و بە گەرانی سەر زەمین دەگاتە بەیرووت، شاری گۆڤاری شیعرو ئاداب‌و نویخوازی‌و سێكس‌و دەریا و بەندەر، بۆ داهێنان‌و بژێوی لە نووسینی خۆی بەردەوام دەبێ، پاشان ڕوو لە شاری سان فراسیسكۆ دەكات‌و لەوێ نیشتەجێ دەبێ، ماوەیەكیش لە یۆنان دەگوزەرێنێ. سەرگۆن بە شێوازێكی نوێ لە خۆچوو دەقەكانی نووسیوە، هۆنراوەكانی لە پەخشانەشیعری لوبنانی نزیكن تا عێراقی، ئاونیشانی هۆنراوەكانی سادەن‌و بە ئاونیشانی چیرۆك دەچن، بەڵام هەناویان پڕ جووڵەو وێنەی دەگمەنن‌و لە گەلێ جێ سریالیانە دارێژراون. خوێندنەوە بە زمانی ئینگلیزی دەیخاتە بەر كاریگەری هۆنراوەی رۆژئاواوەو بەتایبەت هۆنراوەی شاعیرانی ئەمەریكی وەك: واڵت وتمان‌و رۆبەرت فرۆست‌و ئی، شاعیرانی نەوەی (بیتنكس) (Beatniks) وەك: ئەلین گینسبێرگ خاوەنی هۆنراوەی بەناوبانگی (وەڕین).

*** فازڵ ئەلعەزاوی:**
شاعیرو چیرۆك‌و رۆماننوس‌و وەرگێر، ساڵی (١٩٤٠) لە



كەركوك لەدایكبووە، ساڵی (١٩٦٦) بەشی ئینگلیزی زانكۆی بەغدا تەواو دەكات. ساڵی (١٩٧٣) لە بەرلین دبلۆمی رۆژنامەگەری وەردەگرێت. ساڵی (١٩٦٩) بە بەشداری گۆڤاری (شیعر ٦٩) دەردەكات‌و لە هەمان ساڵ رۆمانی (مخلوقات فاضل العزاوي الجميلة – ئافەریدە جوانەكانی فازڵ ئەلعەزاوی) بڵاودەكاتەوە، ئەمەیان هەم رۆمانەو هەم چامەیە، شێوازە هەرە نوێ‌و جیاكارانەی ئەم رۆمانە، هەرایەكی رەخنەیی بەرپا دەكات. هەر لە قۆناغی خوێندنی ئاوەندییەوە بەهرەی ئەدەبیی دەگەشێتەوەو لە ساڵی (١٩٥٦) قەشەی شاعیر یوسف سەعید دەناسێت. ساڵی (١٩٥٩) جەلیل قەیسی دەناسێت‌و پاشتر بە گشتیان دەگات. فازڵ دوور لە دۆگمایی بە هەناسەیەكی ماركسیانەی فرە سەرچاوە هۆنراوەی خۆی نووسیوە. كاریگەری مایاكۆڤسكی‌و شاعیرانی چەپی فەرەنسی‌و ئەڵمانی‌و

ئەمەریکی لەسەره. لە ساڵانی دوایی چیرۆك و هۆنراوەکانی لەناو فانتازیا و کۆمیدیای رەش دەخولێنەوەو بەشی هەرە زۆریان دژ بە جەنگ و دیکتاتۆرییەت دەوەستن.

*** ئەنوەر ئەلغەسسانی (١٩٣٧- ٢٠٠٩):**
شاعیرو رەخنەگرو چیرۆکنووس و وەرگێڕو نیگارکێشە، لەبەر باری سیاسی و نەبوونی ئازادی رووی لە ئەڵمانیای دیموکراتی کردو ساڵی (١٩٦٨) لەبەشی رۆژنامەگەریی زانکۆی لایبزگ خوێندوویەتی. پاش ساڵی (٢٠٠٠) دەچێتە کۆستاریکا و دەبێتە مامۆستای زانکۆ و دواتر رەگەزنامەی ئەو وڵاتە وەردەگرێت، لێرەو لەوێ وەك دەنگێکی پێشکەوتنخواز، بەرگری لە مافەکانی گەلی عێراقی دەکرد. لە ژمارە (٢٦٠)ی گۆڤاری (الثقافة الجديدة) ساڵی (١٩٩٤) دا بە ناونیشانی (اكراد رحل) هۆنراوەیێکی بڵاوکردووەتەوە پێشکەشی زوهدی داودی کردووە.

*** جلیل ئەلقەیسی (١٩٣٧- ٢٠٠٦):**
نووسەرێکی داهێنەری کورتە چیرۆك و کورتە شانۆنامەیە،



باوکی عەرەبە و دایکی کوردە، هاوسەرەکەشی ئەرمەنییە، تا تەمەنی هەشت ساڵی هەر بە زمانی کوردی دواوە، لە ژمارەی زستانی ساڵی (١٩٦٨)دا لە گۆڤاری (شعر) کورتە چیرۆکی (صهيل المارة حول العالم) بڵاودەکاتەوە، دواتر دەبێتە ناونیشانی یەکەمین کۆکراوەی چیرۆکەکانێتی. شانۆی کوردستانی چەند بەرهەمێکی بەرجەستە کردوە.
فانتازیا و واقع و کەسانی لەبیرکراو لێك دەسازێنێ، تام و بۆیێکی شۆڕشگێڕانەو سێکسانە بە ئافریدەکانی دەبەخشێت، بۆ دۆزینەوەی بابەت و ناو لە مێژووی گریك و میزۆپۆتامیا دەکۆڵێتەوە.

*** مونەیەد ئەلڕاوی:**
شاعیرێکی کەمنووس و کەمبەخشە، لە زووەوە هۆنراوەی ئازاد (الشعر الحر)ی نووسیوەو بە قسەی نووسەری کورد زوهدی داودی هانی سەرگۆن و سەلاح و کەسانی تری داوە تا هۆنراوەی ئازاد بنووسن، کەسایەتییەکی چەپە و لەپێناو گەلانی ژێردەستەو دیموکراتییەت و نان خەباتی کردووە، گیراوەو ئەشکەنجە دراوە، ساڵی (١٩٧٠) عێراقی جێهێشت،



پاش ماوەیەك دیوانی (ممالك) چاپ دەکات، ئەمە دووەم دیوانێتی.

*** باوە یوسف سەعید (١٩٣٢- ٢٠١٢):**
شاعیرێکە بە هەناسەیێکی مێژوویی و ئەفسانەیی و ئایینی و



بەتام و بۆیەکی سەردەمیانە هۆنراوە دەنووسێ، تا ساڵی (١٩٦٣) بەرەو بەیروت عێراق جێدێڵێ و تا ساڵی (١٩٧٠) لەوێ دەمێنێتەوە، ئینجا روو لە وڵاتی سوید دەکات نیشتەجێ دەبێ و لە تەمەنی هەشتا ساڵی کۆچی دوایی دەکات. من دوو تێبینیم لەسەر یوسف سەعید هەیە، یەکەمیان: لەماوەیەکی کەم و لە سەرەتای پێگەیشتنیان شاعیرانی گرووپەکە دەناسێت و خۆی ساڵی (١٩٦٣) کەرکوك جێدێڵێت، لە کاتێکا دەرکەوتنی راستەقینەی ئەوانە دوای ئەو ساڵە بوو، بۆیە پێموایە ناکرێ بڵێن یوسف سەعید یەکێك بوو لە کەسانی گرووپەکە. من پێش ناسینی ناسنامەکەی و لەبەر رۆشنایی هۆنراوەکانییەوە وام دەزانی شاعیرێکی لوبنانییە. دووەمیان: زۆر پێم ناخۆش بوو کە

چاوم بە کتێبەکەی کەوت، کە ناونیشانی (حضر الابداع- تجربة حميد سعيد الشعرية) چاپی یەکەم ساڵی (١٩٨٩)، حەمید سەعید شاعیرو ڕۆژنامەنووس و بەرپرسێکی حیزبی بەعسە، لەچاو شاعیرانی نەوەی شەستەکان و دواتر ناوێکە لە ڕیزی پێشەوە نییەو بەهرەکەی مام ناوەندییەو خودی یووسف سەعید بەتەمەن و بەهرە زۆر گەورەترە. ڕەوایە بڵێین: لەجیاتی ئەوەی حەمید سەعید کتێبی لە بارەی یوسف سەعیدەوە دابنێت، لە سەردەمی بەد ئەنجامەکە پێچەوانە دەبێت.

* **جان دەمۆ (١٩٤٩ هەندێك ساڵی ١٩٤٣ دەنووسن- ٢٠٠٣):**
ناوی تەواوی (یۆخننا دەمۆ یووسف) دواتر ناوێکی شیعری



بۆ خۆی هەڵبژاردو بە جان دەمۆ ناسرا، شاعیرو وەرگێڕە، مەیخۆرێکی لات و بۆهیمییەکی بەرەڵڵاو بەردەوام نیشتەی مەیخانەکانە، لەخواردنەوەدا هاودەمی شاعیران و نووسەران بووە بەتایبەت شاعیرانی گەنج دەورەیان لێدەداو گەلێ جار پارەیان لەباتی دەدا، لەژیانی سەرگەردانی ناو چایخانەو مەیخانەو سەر شەقام، ئەویش وەك دوو شاعیری کۆچکردوو (حوسێن مەردان و عەبدولئەمیر حوسەیری) دێتە باس کردن. جان دەمۆ ببوە دیاردەیەك و لەمەدا لە شیعرەکانی خۆی بەناوبانگتر بوو. ساڵی (١٩٩٣) بە هاوکاری چەند شاعیرێکی عێراقی (اسمال)ی بۆ چاپکرا"[١٢].

"گرووپی کەرکوك وەکو شاعیرو ڕۆماننووس و ڕۆشنبیرو دیارترین کەسایەتی ناو گرووپەکەو ناودارترینیان فازل ئەلعەزاوی لە لاپەڕەی (٢٧٩)ی کتێبێکدا بەناونیشانی (الروح الحية) ئاماژەی بۆ دەکات لە ساڵی (١٩٥٥) دانەمەزراوەو لە ساڵی (١٩٦٤) کۆتایی هاتووەو ئەندامانی گرووپەکە بەهۆی بارودۆخی نالەباری سیاسی و ئابوورییەوە پەرت و بڵاوبوونەتەوەو هەریەکەو ڕوویان لە شوێنێك کردووە. ڕەنگە مشتومڕو سێ و دوویەکی کەم هەبێ لەسەر ژمارەی ئەندامانی گرووپەکەو بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ئەم شاعیرو نووسەرانە ئەندامە بنەڕەتی و سەرەکیی و ناودارەکانی گرووپەکە بوون:

١. فازل ئەلعەزاوی، عەرەب.
٢. موئەید ڕاوی، عەرەب.
٣. ئەنوەر غەسانی، عەرەب.
٤. جەلیل قەیسی، عەرەب.
٥. قەحتان هورمزی، تورکمان.
٦. زوهدی داودی، کورد.
٧. یوسف حەیدەری، کورد.
٨. سەلاح فایەق، کورد.
٩. جان دەمۆ، ئاشووری.
١٠. سەرگۆن پۆڵس، ئاشووری.
١١. قەشە، باوکە یوسف سەعید، ئاشووری و قەشەی کڵێسا.
١٢. محێدین زەنگەنە، کورد.

بەڵام ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم نووسەری ناسراوی کەرکوك فاروق مستەفا لە نووسینێکیدا ئاماژە بە ئەندامبوونی خۆی لە گرووپەکەدا دەکات. بەڵام ناوی ئەم کتێبی (الروح الحية)ی فازل ئەلعەزاوی و کتێبی (جماعە کەرکوك)ی هیشام قەیسی دا نەهاتووە. بەڵام چەند کەسێکی دی بە شێوەیەکی لابەلا ئەندامی گرووپەکە بوون و دوایی باسیان دەکەم. شایانی باسە فازل ئەلعەزاوی لە کتێبی ناوبراویدا بەروونی باسی ئەوە دەکات کە ئەم پێکهاتە تێکەڵەیەی شاری کەرکوك چوست و چالاکییەکی زۆری ڕۆشنبیریی بە شارەکە بەخشیبوو. ئەمە جگە لەوەی کە کتێبخانەی ئەمەریکایی لە ناوەڕاستی شارەکە دا بوو پڕاوپڕ بوو لە کتێبی ئینگلیزی و کتێبخانەیەکی سەربەئیخوانی موسلمینیش هەبوو پڕاوپڕ لە کتێبی کلتووری هەمەجۆرو جگە لەمانەش لە کەرکوکدا هەندێ کتێبخانەی دیکە هەبوون لەوانە کتێبخانەی عەسری و کتێبخانەی ئۆرزدیباك کە کتێبی ئینگلیزی و قەوانی گۆرانی دەفرۆشێت. هەروەها کتێبخانەی یۆجین کە کتێبی بەکارهێنراوی ئینگلیزی دەفرۆشێت.

شایانی باسە هەموو کتێبخانەیەکی کەرکوك لەو دەمەدا کتێبخانەیەکی بچکۆلەی تیابوو بۆ خوازتن و خوێندنەوەی کتێب لەلایەن قوتابیانەوە. ئەمە جگە لە کتێبخانەو کتێبفرۆشەکانی سەر جادەو شەقامەکان. و هەرچی کتێبی لە بەغداو بەیروت و قاهیرەو دیمەشق و ئەستەمبول و ئەنقەرە دەردەچوون دەگەیشتنە کەرکوك. هەروەها لە کەرکوك لەودەمەدا ڕۆژنامەی (افاق) بە شێوەی هەفتانە بە زمانی عەرەبی و تورکی و گۆڤاری (شەفەق)یش مانگانە بە زمانی عەرەبی و کوردی دەردەچوون.

شانبەشانی ئەمانە وەکو فازل ئەلعەزاوی لە لاپەرە (٢٨٠) کتێبی (الروح الحية)دا باسی دەکات لەو ساڵانەدا بە شێوەیەکی ڕێك و پێك گۆڤاری (الاديب) و (الاداب) و (مجله)

و هتد.. دەگەیشتنە کەرکوک. ئەم هۆکارانەو هۆکاری دی کە لە وتارێکمدا لە گەلاوێژی نوێدا بڵاوم کردەوە ڕێخۆشکەر بوون بۆ پەیدا بوونی گرووپی نوێخوازی کەرکوک لە ساڵی (١٩٥٥)دا.

هەروەها فـازڵ ئـەلـعـەزاوی کـە بـەلای مـنـەوە بـزوێـنـەری راستەقینەی گـرووپـەکـەو دامـەزرێـنـەری بـووە لـە لاپـەرە (٢٨٠- ٢٨١)و (٢٨٦- ٢٨٧)ی کتێبی (الـروح الحیة) دا باسی ئەوە دەکات کە بە جۆرێك لە جۆرەکان حەزی لە خوێندنەوەی نووسینەکانی شاعیرو نووسەری بوونگەری‌و ناوداری عێراقی حوسێن مەردان بووە لە رۆژنامەی (الاخبار) داو دواتریش کە لە ساڵی (١٩٥٣ یا ١٩٥٤)دا لەگەڵ باوکیدا چووە بۆ بەغدا دیوانی (قصائد عاریة)و (اللحن الاسود)ی لە بازاری سەرای بەغدا کڕیوەو لە ساڵی (١٩٥٦) کەوتووەتە خوێندنەوەی شیعرەکانی (ت. س. الیوت) کە گەورەترین شاعیری ئینگلستانە لە سەدەی بیستەمداو گەلێ شیعری شاکاری هەیە وەك (وێرانە خاك، چوارشەمەی خۆڵەمێش، گۆرانییەکی دڵداری)و هتد. هەر لە هەمان سەرچاوەدا فازڵ ئـەلـعـەزاوی دەڵـێ: "لـە رێـگـای گـۆڤـاری (الادب)ەوە کە لە بەیرووت دەردەچوو جان پۆڵ سارترەو ئەلبێرکامۆ و سیمۆن دی بۆفوارو کیرکگاردمان ناسی‌و کەوتینە خوێندنەوەی بەرهەمەکانیان".

فـازڵ ئـەلـعـەزاوی بـەسـەرگـەرمـی‌و بـایـەخـپـێـدانـەوە باسی کتێبەکانی (دار الیقظة)ی دیمەشق‌و وەرگـێـردراوەکـانـی سامی ئەلدرووبی‌و زنجیرە کتێبی (هەزار کتێب) لە قاهیرەو (دار الادب)ی لوبنانی‌و ئەو کتێبانە دەکـات کـە یوسف ئیدریس‌و عائیدە مەتەرچی لە بارەی ئەدەبی بوونگەرییەوە لـەو دەمـەدا وەریـان دەگـێڕایـە سـەر زمانی عـەرەبـی. سەیر ئەوەیە فازڵ ئەلعەزاوی لە لاپەرە (٢٩٠)ی کتێبی ناوبراویدا زۆر بە خراپ باسی چیرۆکەکانی (ئیحسان عەبدولقەدوس) و (یـوسـف سباعی) دەکـات‌و دەڵـێ: "ئـەو سـاڵانـە کچان سەرگەرمی خوێندنەوەی ئیحسان عەبدولقودووس بوون‌و کورانیش سەرقاڵی خوێندنەوەی یوسف سباعی بـوون.. بەڵام من نەمتوانی چەند لاپەرەیەك زیاتریان لێبخوێنمەوەو خۆ ئەگەر چی هەندێ جار چێژم لە نووسینی پروپووچیش وەردەگرت بەڵام هەرگیز نەمتوانی تاکو ئێستاش نووسینی ئـەو دوو نووسـەرە بخوێنمەوە". ئاشکرایە لـەو ساڵانەدا کۆمپانیای نەوتی عێراق لە کەرکوك لە دەستی ئینگلیزەوە بـوو و دەیـان خـێـزان‌و کـچ‌و ژنـی ئینگلیزی کـارمـەنـدی کۆمپانیاکە نیشتەجێی کەرکوك بوون‌و لەکاتی پێویستدا لە بازارەکانی کەرکوکداو ئێوارانیش بۆ پیاسە بە تەنوورەی کورت‌و پانتۆڵی شۆرتەوە دەبینران‌و ئەمەش بۆ ئەو دەمەو وەختە لـە کـەرکـوکـدا شتێکی تـازەو سـەرسـوڕهـێـن بـووەو کاریگەری لەسەر گرووپەکە بووەو هەوڵیان داوە ئەوانیش لە هەڵسوکەوت‌و نووسینەکانیاندا نوێخوازی دەربڕن‌و لاسایی بابەتە کۆنەکان نەکەنەوە. شایانی باسە جگە لە ژن‌و کچ‌و کچۆڵە ئینگلیزەکان ژن‌و کچ‌و کیژە سریانی‌و ئەرمەنی‌و مەسیحییەکانیش لـەو دەمـەدا هەمان جـۆرە جلیان لەبەر دەکردو پیاسەی ئێوارانیان دەکرد.

ئەم گرووپە بایەخیان بە هەموو بەشەکانی هونەرو وێژە دەداو لەو بارەیەوە فازڵ ئەلعەزاوی لە نووسینێکیدا دەڵێ: "شان بە شانی شیعرو ئەدەب‌و رەسـم‌و مۆسیقا. هونەری سینەماش رۆڵێکی گرنگی لە ژیانی ئێمەدا بینی‌و ئێمە بە هەڵپەوە چاوەڕوانی هەموو فلیمێکی نوێمان دەکرد. بە تایبەتی فلیمی سەر شێوازی (ریالیزمی نوێی ئیتالی)".

لەبارەی هـونـەری شانۆشەوە فـازڵ ئـەلـعـەزاوی‌و موئەیەد راوی‌و هەندێ کەسی دیکە یەکەمی تیپی شانۆیی خۆیان لە کەرکوکدا دامەزراندو بڕیاریاندا یەکەمین بەرهەمی شانۆییان (شانۆیی جیان) بێت لە نووسینی (یەحیا بابان) کە دەربارەی جەزائیر بووەو خەڵاتی گۆڤاری ئادابی بەیرووتی دەراوەتێ. بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێ شانۆییەکە پێشکەش نەکراوە. بەڵام دیارە یەحیا بابان کە ئێستا کەس نایناسێ کوردێکی کەرکوك بووەو ئەندامی گرووپەکە بووە. خۆزگە شانۆکارانی کورد بەدواداچوونێکیان بۆ ژیاننامەو بەرهەمەکانی ئەم کوردە عەرەبی نووسە دەکرد.. سوپاس بۆ فازڵ ئەلعەزاوی کە لە کتێبی ئامارە بۆ کراویدا ناوی هێناوە.. هەروەها ناوی شانۆکارێکی دیکەشی بردووە (عەلی حوسێن ئەلسعەیدی) و دەڵێ ئەم شانۆکارەمان کەوا دیارە ئەمیش بە شێوەیەکی لابەلا ئەندامی گرووپی کەرکوك بووە، ساڵی (١٩٥٩) وازی لە کارەکەی هێنا لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك چوو بۆ ئەڵمانیاو نەمساو چەند شەهادەیەکی لە بواری نواندندا هێنایەوە لە عێراقدا رەواجیان نەبوو.. بەڵام هەر سەرقاڵی کاری شانۆ بـوو.. جارێکیان لە میهرەجانی شانۆکارانی عـەرەبدا لە دیمەشق شێتگیر دەبێ‌و هێرش دەکاتە سەر بەڕێوەبەری ئاهەنگەکەو میکرۆفۆنەکەی لێ دەستێنی‌و هـاوار دەکاو جەماوەری شانۆکە گەمژەن‌و من گەورەترین‌و گرنگترین دەرهێنەرو ئەکتەری جیهانم‌و ئینجا لەسەر شانۆکە خۆی رووت دەکاتەوەو هاورێکانی بە زۆر پەلەکێشی دەکەنە پشت پەردەی شانۆکەوە. سەیر ئەوەیە قەشەیەکی کڵێسا لەگەڵ ئەم گرووپە نوێخوازەدا بووەو شاعیر بووەو گەلێ شیعری جوانیشی بڵاوکردووەتەوەو زۆر جار لە کڵێساکەی خۆیدا لەگەڵ ئەندامانی گرووپەکەدا کۆ بووەتـەوەو شیعریان بۆ یەکدی خوێندۆتەوەو لە کتێبی (الروح الحیة)دا نووسەری کتێبەکە ئامارە بەوە دەکات کە قەشە یوسف سەعید شیعری بەرێگایەك دەزانی بۆ رۆیشتن بۆ لای خوا. دەبێ ئەوەشمان بیر نەچی ئەم گرووپە وەکو نووسەری کتێبی دەستنیشان کـراو ئـامـارەی بۆ دەکـات بەرهەمەکانی (یوسف ئەلخال) و (ئینسی ئەلحاج)و (محەمەد مـاغووت)و (شەوقی ئەبی شەقرا)و (ئەدۆنیسیان) دەخوێندەوە.. و ئەگەرچی لە زمانی شیعریی وشك‌و ئالۆزی ئەدۆنیس بێزار بوون‌و چێژیان لێ وەرنەدەگرت بەڵام بەلای هەندێ لە ئەندامەکانی گرووپەکەوە ئەدۆنیس مایەی سەرسامی‌و راچەنین‌و گرنگی دان بوو بە شیعرەکانی‌و هەر لە رێگای وەرگێڕانەکەی ئەدۆنیسەوە توانیان چێژ لە چامە بەناوبانگەکەی شاعیری ناوداری فەرەنسا (سان جۆن پێرس) وەربگرن.. چامەی (ضیقة هی المراکب) (کەژاوەکان تەنگەبەرن) ئەگەرچی هەندێ هەڵەشی لە کاری وەرگێڕانەکەیدا کردبوو.

یەکێکی تر لە ئەندامە لابەلاکانی گرووپەکە (عیسمەت هورمزی) بووە کە بۆ خوێندنی هونەری شانۆ چووە بۆ تورکیا و خۆ ئەگەرچی ئەندامی ناسراوی گرووپەکە ئەنوەر غەسانی هەرگیز لە خەیاڵیدا نەبووە ببێ بە ئەکتەر بەڵام کاتێ قوتابی بوو لە (لایبزگ) لە دوو فلیمی ئەڵەمانیدا دەوری بینی.. ئەم گرووپەی کەرکوك زۆر دوور بوون لە دەمارگیریی نەتەوەیی و ئایینی و حیزبی و لەو لایەنەوە فازڵ ئەلعەزاوی دەڵێ: "لە ساڵی (١٩٧٥)دا کە عەبدولسەمەد خانەقا مۆڵەتی دەرکردنی گۆڤاری (شەفەق)ی وەرگرت. ئێمە (خۆی و ئەنوەر غەسانی و زوهدی داودی) لە بەشە عەرەبییەکەیدا (لەسەر داوای خۆی) دەس بەکار بووین و کاتێ لەو ساڵەدا تەرمی سەرکردەی ناسراوی کورد شێخ مەحمود کە دەورێکی باڵای لە مێژووی عێراق و دۆزی کوردا بینیوە خەریك بوو لە بەغداوە دەگەیشتە کەرکوك (عەبدولسەمەد خانەقا) بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بردی بۆ پێشوازیکردنی تەرمی شێخ کە بۆ سلێمانییان دەبردەوە".

هەروەها وادێتە خەیاڵم کە شاعیری کەرکوکی عەباس عەسکەری کە کورد بوو بە عەرەبی دەینووسی و ڕۆشنبیرێکی گەورە بوو دیوانێکی چاپکراوی گەورەی هەیە بە عەرەبی باسی ئەوەی دەکرد کە بە جۆرێك لە جۆرەکان هاوڕێی ئەندامانی گرووپەکە بووە.

لە هەندێ لاپەڕەی کتێبی (الروح الحیة)دا بەڕوونی ئەوە ڕوومالکراوە کە ئاگاداری گرووپی دادایی و سوریالیزمی بوون و بەرهەمی هەندێ لە ئەندامانی ئەو دوو گرووپەیان خوێندۆتەوە.

بەڕای من گرووپی کەرکوك زادەی ئەم بارودۆخ و دیاردانەیە و هەموو ئەو هۆکارانە یەکیان گرتووە و گرووپی کەرکوکی لێ هاتە کایەوە پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئەندامانی گرووپەکە لەیەك ڕۆژو کات و ساتدا یەکدییان نەناسی و سەرەتا فازڵ ئەلعەزاوی و موئەیەد ڕاوی لە قوتابخانەی (المتوسطة الغربیة) یەکدی دەناسن و ئەو دەمە واتا ساڵی (١٩٥٥) فازڵ ئەلعەزاوی لە پۆلی یەکی ناوەندی بووە و موئەیەد ئەلراوی لە پۆلی دووی ناوەندی و بە یارمەتی مامۆستا سینان سەعید لە وێنەگای قوتابخانەکەدا خۆیان بە ئامادەکردنی ڕۆژنامەی دیوار بەندەوە خەریك دەکرد و ئەم دیوار بەندانەش بوونە هۆی ئەوەی کە هەندێ لە قوتابیانی تاقی ئێوارەی قوتابخانەکە تووڕکن و ئەوانیش (قەحتان هورمزی و ئەنوەر غەسانی و یوسف حەیدەری) بە دژە دیواربەندێکی خۆیان بەرامبەریان وەستان و دواتر ناکۆکییەکە بوو بەهۆی ئەوەی ببن بە هاوڕێ و بنەمای دروستکەن و هەر ئەو ساڵە جەلیل قەیسی بوو بە یەکێك لە هاوڕێ و ئەندامی گرووپەکە و دواتریش زوهدی داودی و قەشە یوسف سەعید بوون بە ئەندام و هاوڕێی گرووپەکە. شایانی باسە کە لە لاپەڕە (٢٨٤)ی سەرچاوەی ناوبراودا فازڵ ئەلعەزاوی باسی شاعیری گەورەو چەپڕەوی تورکمانی عەبدولەتیف بەندەر ئەغلۆ دەکات و دەکرێ لەم حاڵەتەدا ئەم شاعیرە و مامۆستا سینان سەعیدیش کە هونەرمەندێکی سەر بە ڕێبازی سوریالیزم بووە بە ئەندامی گرووپەکە بژمێرین. دواتریش نووسەران و شاعیرانی تری وەك سەرگۆن پۆڵس و جان دەمۆش بوون بە ئەندامی گرووپەکە.

دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ ئەم گرووپە هیچ بەیاننامەیەکیان لەبارەی چەمك و بۆچوونی خۆیانەوە دەربارەی هونەر و ئەدەب دەرنەکردوە.. بەڵکو کردار و بەرهەماکانیان خۆی لە خۆیدا دەیان بەیاننامە بوون لە بواری ڕۆشنبیریدا و ئەم گرووپە تاکو ساڵی (١٩٦٤) کەم و زۆر لێکدادەبڕان و لێك نزیکدەبوونەوە و هەر لە بەهاری (١٩٥٨)دا قەحتان هورمزی لە گرووپەکە کشایەوە و لە ساڵی (١٩٦٢)دا ئەنوەر غەسانی چوو بۆ بەغدا و لە ساڵی (١٩٦٣)دا کە کودەتای ڕەشی (٨)ی شوبات ڕوویدا فازڵ ئەلعەزاوی و ئەنوەر غەسانی و قەشە یوسف سەعید و جەلیل قەیسی و موئەید ڕاوی گیران و زوهدی داوودی و سەلاح فایەق ڕوویان لە شاخ کرد و سەرگۆن پۆڵس و جان دەمۆ و قەشە یوسف سەعیدیش دوای بەربوونی ڕوویان لە دەرەوەی وڵات کرد. بەڵام هەر ئاگاداری هەواڵی یەکدی بوون تا لە ساڵی (١٩٦٤)دا گرووپەکە نەما و کۆتایی هات و دواتر لە ساڵی (١٩٦٥)دا زۆربەی ئەندامانی گرووپەکە لە بەغدا یەکیان گرت و تێکرا وەچەکانیان دروستکرد ناونرا (وەچەی شەستەکان) و بەم جۆرە گرووپی کەرکوك کۆتایی هات و لە ورگی گرووپەکەوە (وەچەی شەستەکان) هاتە کایەوە جوانترین بەرهەمی شاکاری لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا بەخشی بە ئەدەبی عێراقی و عەرەبی و مرۆڤایەتی.

و من بەبێ سێ و دوو دەڵێم هاتنە کایەی گرووپی (کفری – کەرکوك) و هەوڵ و کارە ئەدەبییە دژە باوەکانیان لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەمدا هاتە کایەی (گرووپی ڕوانگە) کە لە ساڵی (١٩٧٠)ی سەدەی ڕابردوودا دروستبوو بەیاننامەکەیان و دروستبوونەکەیان کاریگەری گرووپەکەی کەرکوك و گۆڤاری (شیعر ٦٩)ی بەغدادیی و بەیاننامە شیعرییەکانی لە سەدە، کە لە ساڵی (١٩٦٩)دا لە یەکەم ژمارەی گۆڤارەکەدا بە واژۆکردنی فازڵ ئەلعەزاوی و سامی مەهدی و فەوزی کەریم و خالید عەلی مستەفا لە بەغدا بڵاوکرایەوە.. لەو بارەیەوە براو شاعیر عەبدوڵڵا عەباس لە نامەیەکی دا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو دەمە ئەو لەگەڵ کاك جەلالی میرزا کەریمی جوانەمەرگدا لە هاوکاری بوون و ئەو هەندێ لە ئەندامانی ڕوانگەی بە فازڵ ئەلعەزاوی ناساندووە و پێی وتوون ئێوەش بۆچی وەکو ئێمە بەیاننامەیەك بڵاوناکەنەوە و ئیتر ئەم قسەیەی فازڵ ئەلعەزاوی بوو بە پرۆژە و برادەرانی ڕوانگە بەیاننامەی ڕوانگەیان نووسی و لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا بڵاویانکردەوە.. ماوەتەوە بڵێم بە ڕای من داهێنەرترین ئەندامانی گرووپەکە فازڵ ئەلعەزاوییە و هیچ یەکێك لە گرووپەکە هاوتای فازڵ ئەلعەزاوی نین و ئەم قسەیەش مانای ئەوە نییە ئەوانی دیکە فت و قت بکەم.. بەڵکو مەعنای ئەوەیە تاك گرووپ دروست دەکات و داهێنان دەکات و گرووپ هیچ کاتێك ناتوانێ کەسێکی ناو کۆمەڵگا یا کەسێکی بواری ڕۆشنبیری بکات بە داهێنەر.. بەڵێ هەموو یاخود زۆربەی ئەندامانی گرووپەکە ڕۆشنبیر و نووسەر و شاعیری نوێخواز بوون.. بەڵام داهێنەر نەبوون و نین، بەڵام فازڵ ئەلعەزاوی سەرجەمی شیعر و ڕۆمان و کورتە چیرۆك و

نووسینەکانی گەواهی ئەوە دەدەن کە تاکە داهێنەری ناو گرووپەکەیە. ئیتر ئەم قسەیەی من دەرهاویشتەی ئەزموونی خوێندنەوەی سالانی تەمەنو چەشتی ئەدەبیمەو نووسەرانو شاعیرانو خوێنەرانی دیکەش بۆیان هەیە لەم بارەیەوە بە ئازادی بدوێنو ئەگەر پێویست بکات بەرپەرچی بیروڕاکانم بدەنەوە.

ماوەتەوە بڵێم بارودۆخو هەلو مەرجی جوگرافیو مێژوویی و سیاسیو کۆمەلایەتیو رۆشنبیریو بەهرەمەندی خودی ئەم شاعیرو نووسەرانە خۆیان بوو بە هۆکاری دەرکەوتنو گەشانەوەی ئەم ناوانە لە رووبەری ئەدەبی عێراقیو عەرەبی ئەگینا هیچ کەنالو رۆژنامەو گۆڤارێك ریکلامو پروپاگەندەی بۆ نەکردن وەکو ئەوەی هەندێ رۆژنامەو کەنالی دیارو ناسراو بۆ هەندێ بەهرەمەندی لاوی هاورێو دۆستو هاوبیری خۆیانی دەکەنو دەیان لاوی لەوان بەهرەمەنترو بەتواناترو رۆشنبیرترو تەنانەت دەیان ناوی رووبەری شیعرو ئەدەبی کوردی پشتگوێ دەخەنو ئەگەر شتێکیشی بۆ بلاوبکەنەوە بە فۆنتێکی وا ناشرینو وەها چەپەدا بلاوی دەکەنەوە سەرنجی کەس رانەکێشێو ئەم جۆرە ریکلامو پروپاگەندانەی کە هەندێ رۆژنامەنووس لەو رۆژنامە دیارانەدا بەخۆرایی بۆ برادەرانی خۆیانی دەکەن لە وولاتی عەرەبیو ئەورووپیدا ئەگەر شتێکی وا بکرێ وەکو ریکلامێکی بازرگانی بە پارەیەکی دیاریکراو بلاودەکرێتەوە. با ئێمە فێری ئەوە ببینو ئەوە بزانین نووسەرانی بەهرەمەندو داهێنەر لە هیچ شوێنو کاتێکدا پێویستیان بە ریکلامو پروپاگەندە نییەو من هاوچەرخی هەندێ لاوی داهێنەرمو بیرم نایات کەسێك ریکلامی بۆ کردبێتن هەر بۆ نموونە: عەباس عەبدوللا یوسف بە کۆمەلە شیعری (ئاو)و (لم نیازمە) ناوی دەرکردو سەباح رەنجدەر بەزیوانو محەمەد باوەکر بە دارستانی خەمباباو هاشم سەراج بە (دووکەڵ) و ئەنوەر مەسیفی بە (خۆر باران)و... هتد کەس لە هیچ شوێنێ ریکلامو بانگەشەی بۆ نەکردوونو خۆیان بەهرەمەندو داهێنەر بوونو توانییان ناوی خۆیان لە لیستی بەهرەمەندانو داهێنەراندا تۆمار بکەن.

سلاو لە گرووپی (١٩٥٥– ١٩٦٤)ی کەرکوك کە رێخۆشکەر بوون بۆ هاتنە کایەی گرووپی کفری لە شەستەکانی سەدەی رابردوواو دروستبوونی گرووپی روانگە لە سەرەتای حەفتاکانی هەمان سەدەدا لە سلێمانیو دامەزراندنی گرووپی پێشرەو لە هەولێر لەهەمان سەدەی ناوبراودا.

خانەی سینەماکانی شار بە ریکلامی رەنگاورەنگ دەرازێنرایەوەو رۆژ لەدوای رۆژو لێرەو لەوێ بینای سینەماکان زیاتر دەبوونەوە، تاکو مومارەسەی سرووتی خۆیان بکەنو هەرەیەکەیان لەسەر رایەخی ئەندێشەو بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێکی کەم جەماوەرێکیان لە رۆلەکانی شارەکەیان دەگرتە خۆیانو دواتر هەلیان دەدایە سەر شەقامەکان.

گەشتێك بوو هەموو بینەرانی لە هۆلێکداو لەژێر چەتری تاریکیدا یەك دەخست، تاکو لەگەل نمایشی فلیمەکاندا لەگەل گاوانو گاگەلەکانیانداو لەگەل ئەکتەرەکان وەکو (کلارك کیبل، ئالان لاد، کاری کۆپەر، جۆ واین، دووانەی (کیریك دۆغلاسو بیرت لانکستەر)...) بخزێنە نێو خەونەکانیانەوە یان لەگەل فیلمێك لەبارەی پیاوە مەیموونەکە (تەرەزان) یان فلیمێك لەبارەی چەتەکان یان جەنگ (حربي) یاخود فلیمێکی مەزنی وەکو (رۆیشت لەگەل با دا) کۆتایی رێگاکام هەرچەندە دوور بوون وەلێ رۆلەکانی شارەکەی کۆدەکردنەوە.

ئیدی لەو رۆژانەداو لەسەرەتای سالانی پەنجاکانو بەتەواوی لە سالی (١٩٥٢) لەلایەن هونەرمەندان (عیسمەت نەجاتی هورمزی)و (عەلی حوسێن سەعید) تیپی شانۆی میللی دامەزرا. شانبەشانی دامەزرێنەرانیش ئەم کەسانەیشی لەخۆ گرتبوو وەکو (خەلیل ئەحمەد ئەلحەسەنی، قەحتان هورمزی، محەمەد فاتیح جۆمەرد، سوعاد عیزەت ئەرسەلان، ئەنوەر محەمەد رەمەزان، سەلاحەدین شێخلەر زادە، نەوزاد گدك، ئایدن شاکر ئەلعێراقی، قاسم خورشید ئەلتەرجومان، غازی عەبدوللا بەزان) دواتر کەسانی تریش بوونە ئەندام لەوانە (جەلیل قەیسی، نائیلە جەزراوی، جزنێد عومەر، توسرەت مەنسوور، محەمەد میرزا عەلی سایغ، ئەندریۆس گۆرگیس، سامی ئەلبەسری، مستەفا ئەحمەد رۆستەمو عەبدوللەتیف بەندەر ئۆغلو) کە رۆلی زێدانی شوفێری بینی لە شانۆیی (ئەمرەکەی بەگم).

لە سالانی یەکەمی دامەزراندنی تیپەکە زۆر پێویستیان بە دەقی نوێو تێگەیشتن لە چۆنییەتی دەرهێنان هەبوو، بۆیە رایان وابوو کەسێکیان رەوانەی شاری بەغدا بکەن تاکو دەقیان بۆ بهێنێتو فێری نهێنییەکانی دەرهێنانی شانۆیی بێت.

دامەزراندنی ئەم تیپەو ئەم گردبوونەوەیەی هونەرمەندانو رۆشنبیرانی شارەکە کاریگەری مەزنی هەبوو، کەڵەکەبوونی بیرۆکەی دروست بوونی کۆمەلەو گرووپی هونەریو ئەدەبی لەوانە گرووپی کەرکوك، کە لە ناوەراستی سالانی شەستەکانی سەدەی رابردوو وەدەرکەوت، نووسەر زوهدی داودی، لەم بارەیەوە دەلێ: "گەر دامەزرێنەرێکی راستو دروست هەبێت بۆ گرووپی کەرکوك، ئەوە قەحتان هورمزییە، کە بەداخەوە زۆربەی ئەوانەی لەسەر گرووپەکە نووسیویانە ئەمیان لەبیرکردووە، ئیدی بەدەستی ئەنقەست بێت! یاخود لەبیر کردنت بێت؟ خوازیارم ئەمەی دواییان بێت"، خۆشم دەیان جار گوێم لەم قسەیە بووە لەلایەن کۆچکردوو قەحتان هورمزی، جارێکیان خۆی دووپاتی کردەوەو لە بەردەم جەلیل قەیسی، کە هیچ کۆمێنتێکی لەسەر قسەکانی نەبوو و سەری رەزامەندی بۆ قسەکانی هورمزی لەقاند ئەمەش نیشانی راستیو دروستی قسەکانییەتی.

لەسەرەتای سالانی نەوەتەکانی سەدەی رابردوودا و لەدانیشتنێکدا لەیانەی هونەرمەندان، کە شاعیری تورکمانی (مستەفا کەمال دەندەنەو دکتۆر تەلعەت سۆنمز) ئامادەبوون. قەحتان هورمزی دووپاتی کردەوە کە هەموو ئەندامانی گرووپەکە لەمن کۆبوونەوە، کە بریتین لە فازل عەزاویو عەبدوللەتیف بەندەر ئۆغلۆو عەلی شکور ئەلبەیاتیو جەلیل قەیسیو یوسف حەیدەرو ئەنوەر ئەلغەسانیو موئەید ئەلراوی زوهدی داودیو بەهادین سالحی.. و کەسانی تر.

کەواتە دەتوانین بڵێین: گرووپی کەرکوك لەژێر پاڵتۆی گردبوونەوەی شانۆکارانەوە دەرچووە.. کە دواتر گەشەی کردو ئەم شاعیرو نووسەرانەش هاتنە نێو گرووپەکەوە.. (سەلاح فایەق و سەرگۆن پۆلس و جان دەمۆ).

نووسەری کۆچکردوو قەحتان هورمزی زانیارییەکی تریشی دامێ و چەندین جار دووپاتیشی کردەوە بۆم کە یەکەم شانۆیی جەلیل قەیسی بەزمانی ئینگلیزی نووسیویەتییەوە بەناوی (شاعیر) بوو، ئەوەبوو خۆی و هونەرمەند (عیسمەت نەجاتی هورمزی) ڕۆڵیان تیابینی و لەماڵی جەلیل قەیسی و بە ئامادەبوونی زۆربەی هونەرمەندان و ڕۆشنبیری شارەکە نمایش کرا"[١٣].



سەلاح فایەق



زوهدی داودی





له ڕاستەوە:- نورەدین سالْحی، فازڵ عەزاوی، زوهدی داوودی، قاوەخانەیەك لە بەرلین



له ڕاستەوە:- سەرگۆن پۆڵس، سەلاح فایەق




*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. (گرووپی کەرکوک و گۆڕینی چەمکی ناسنامەی نەتەوەیی)، ئازاد ئەحمەد، پاشکۆی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٥٨٧٩)، ڕۆژی (١٤)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٢)، پاشکۆیەکە بە ناونیشانی (جەماعەتەکەی کەرکوک)، لاپەڕە (٢).

٢. زهدي الداوودي، وداعا قحطان الهرمزي، موقع الحوار المتمدن.

٣. لە دانیشتنێکدا لە ڕۆژی (١٠/ ٧/ ٢٠١٢)دا لە یانەی ئەندازیارانی کەرکووک، بە ئامادەبوونی فاروق مستەفاو د. عەبدوڵا ئیبراهیمو بورهان ئەحمەدو هیشام قەیسی، سەبارەت بە گفتوگۆ کردنمان لەبارەی گروپەکەوە، مامۆستا فاروق وایگوت. هەر لەو دانیشتنەشدا باسی لە ناوی فازڵ ئەلعەزاوی کردو گوتی: بەگاڵتەوە پێمان دەگوت فازڵ گەللەو، واتا کڵاو، ئیدی لەناو گروپەکەدا ئەو ناوەی بەسەردا بڕاو بەفازڵ گەللۆیان گاز دەکرد.

٤. ویل دیورانت، سەربردەی فەلسەفە (بەرگی یەکەم)، و: تاریق کارێزی، دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریان، هەولێر، ٢٠٠٧، لاپەڕە ٩٨.

٥. جليل سرمك القيسي.. عراب العزله المقديه. سلسله الموسوعه الصغيره. دار الشؤون الثقافية. بغداد.

٦. سركون بولص: قصائد غير منشورة، الحوار المتمدن، ع (٢٠٨٢)، ٢٠٠٧.

٧. گۆڤاری گزنگ، ژمارە (٩٥)ی ٢٠١٢. وەرگێڕانی بورهان ئەحمەد.

٨. توفيق التونجي: جماعة كركوك الادبية، موقع الحوار المتمدن.

٩. زوهدی داودی، درێژترین ساڵ، وەرگێڕانی: سەباح ئیسماعیل، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٥.

١٠. بڕوانە نەوشەفەق، ژمارە (٨٤)ی (٢٠١١)و ژمارە (٨٨)ی (٢٠١٢)، د. عەبدوڵا ئیبراهیم، گرووپی دووی کەرکووک. وەرگێڕ: بورهان ئەحمەد.

١١. (گرووپی کەرکوک، خۆری ئاوانەبوو)، سەباح ئیسماعیل، پاشکۆی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٥٨٧٩)، ڕۆژی (١٤)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٢)، پاشکۆیەکە بە ناونیشانی (جەماعەتەکەی کەرکوک)، لاپەڕە (٢ – ٣).

١٢. (گرووپی کەرکوک، چەند ئاماژەیەکی چڕ)، عەباس عەبدوڵلا یوسف، پاشکۆی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٥٨٧٩)، ڕۆژی (١٤)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٢)، پاشکۆیەکە بە ناونیشانی (جەماعەتەکەی کەرکوک)، لاپەڕە (٤ – ٥).

١٣. (گرووپی کەرکوک، لە کەرکوکەوە بۆ بەغدا)، لەتیف هەڵمەت، پاشکۆی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (٥٨٧٩)، ڕۆژی (١٤)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٢)، پاشکۆیەکە بە ناونیشانی (جەماعەتەکەی کەرکوک)، لاپەڕە (١٢ – ١٣).

*** گرووپی (کفری- کەرکوك) پێش سەرهەڵدانی ڕوانگە:**

**لەتیف هەڵمەت**

گرووپی کفری کەرکوك کە لەدایك بوو لە ساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩)دا سەرەتا ئەندامەکانی ئەم گرووپە (٣) کەس بووین، (ئەنوەر محەمەد شاکەلی) کە ئێستا بەناوی (فەرهاد شاکەلی)یەوە شت دەنووسێ، (ئەحمەد شاکەلی) کە ئێستا وازی هێناوە لە نووسین، ئەوەی تریشیان خۆم بووم، (لەتیف هەڵمەت) لە ئێستگەی کوردیو گۆڤاری ڕزگاریو دواتریش (خواو شارە بچکۆلەکە)م بڵاوکردەوەو لە ساڵی (١٩٧٠)دا، ئێمە سەرەتا ئەم سیانە بووین، دوایی کەسانی وەك شاعیری زۆر لێهاتوو سەلام محەمەد (داماو) هاتە ناو گروپەکەوە بەداخەوە ئێستا لە سویدە. بەدەمەستی وای لێ کرد کە لە شیعر دووربکەوێتەوە، بەڵام ئێستا کە شیعر دەنوسێت لە زۆربەی شیعرەکانی، لە شیعری ئەو شاعیرانەش جوانترە کە لافی ئەوە لێدەدەن شیعریان جوانە، ڕەنگە کەم کەس بیناسێت، دیوانێکی هەیە کە ڕەنگە سەد بۆ سەدو پەنجا لاپەرە بێتو بەناوی (دەمەو ئێواران ئەتبینم بەسوخمەیەکی زەردەوە). دیوانێکە، یەکێکە لە شاکارە شیعرەکانی نەخشەی شیعری کوردی، من ئەگەر (١٠) دیوانی شیعری کوردی بەباش بزانم یەکێکیان ئەو دیوانەی سەلام داماوە، (دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە) ئەمە لە زۆرو بۆرەکان نییە، ئەمە دیوانەو خوێنەری تایبەتی خۆی ئەوێ، ئەو دیوانە کە زۆربەی شیعرەکانی لە ڕۆژنامەی هاوکاریو گۆڤاری بەیانو هەندێ شوێنی تردا بڵاوبووەتەوە کاریگەری هەبووە لەسەر زۆربەی ئەوانەی کە لەدوای ئەو شیعریان نووسیوەو لاف نوێ گەرییو لاف مامۆستایی لێ دەدەن لە بواری شیعردا، هەرچەندە هەندێ کەسیشی پێ زوویر ئەبێ، بەڵام لەبواری ڕۆشنبیریدا حەق هەیە، زوویربوون نییە، دەست پێشکەری هەیە.

دەتوانم بڵێم: دواتریش (لەتیف حامید) ئەو ماوەیە لە قوتابخانەی (زازا) لە هەولێر دەرسی دەوتەوە، هەروەها لە ئامادەیی (هەولێر)یش، دەتوانین بڵێین پێنجەم ئەندامی گرووپەکەمان بوو، لە دەورووبەری گرووپەکەدا خەڵکی تر هەبوون کە دەوری یەکەمیان نەبوو، دەوری شانۆییان هەبوو، بەڵام هەر بەشێك بوون لە گرووپەکە، لەوانە (محەمەد بێ کراس) کە لەم ماوەیەدا بەداخەوە کۆچی دوایی کرد، هەروەها (عەلی عەبدوڵڵا)، کە ئەندامی پەرلەمانی پێشووی لیستی سەوز بوو، (ئەمجەد شاکەلی) کە ئێستا لە سوید دەژیو دوور کەوتووەتەوە، هەروەها برادەرێکی تریش بە داخەوە بەجوانەمەرگی سەری نایەوە، ناوی (ئەنوەر) بوو (ئەنوەر شێخ ئەحمەد شاکەلی) کوری (شێخ ئەحمەد)ی شاعیری سۆفی گەرمیان بوو ئەویش شتی جوانی هەبوو لە نووسیندا شتی جوانی دەنووسی ئەگەرچی ئەمە ئەندامە شانۆییەکانی ناو گرووپی ڕوانگە بوونو هەمیشە یەکیان دەبینی، بەڵام ڕوانگە بێژی نەك ڕوانگە گرووپی (کفری- کەرکوك) ئەمە ئەندامە شانۆییەکانی ناو گرووپی (کفری کەرکوك) بوون، گرووپی (کفری- کەرکوك) سەرەتا سێ کەس بوون وەکو ووتم (فەرهاد شاکەلی)، (ئەحمەد شاکەلی)، (لەتیف هەڵمەت) بوون، دوای ئەمانیش خەڵکی کە هەبوون، یەکێك لەوانە (کەنعان مدحەت) کە ئێستا لە سوید دەژیو کەنعانیش دەتوانم بڵێم: بۆ ئەو سەردەمانە ئەندامێکی شانۆی نەوەی دووی گرووپی کفری کەرکوکە.

ئێمە پێکەوە بەتایبەتی نەوەی یەكو ئەوانیش وەکو گوێگر یان وەك ئەوەی مناقەشەمان دەکرد لەگەڵیان، بەپێچەوانەوە مناقەشەیان دەکرد لەگەڵمان، ئێمە توانیمان گرووپی (کفری - کەرکوك) وەکو دەنگ لە کفرییەوە بگوێزینەوە بۆ کەرکوكو بیگوێزینەوە ئاستی هەموو کوردستان، ڕاستییەکی مێژوویی هەیە حەز دەکەم بەرەهایی بڵێم، ئێمە لە کەرکوك بووین، (شێرکۆ بێکەس)و (حوسێن عارف) ئەم دووانەو کاکە (مەم)یش کە یەکێکە لە ئەندامانی گرووپی ڕوانگە ئەم سیانەم بە تەواوەتی لەبیرە، گومانم نییە، کە هاتن بەس وا دەزانم (جەلالی میرزا کەریم)یشیان لەگەڵ بوو، (عەبدوڵڵا پەشێو)یشیان وەکو میوان هێنابوو لەگەڵ خۆیاندا بۆ لای گرووپی کفری، ئێمە (منو لەتیف حامیدو سەلام داماو)و چەند کەسێکی تر کە وەکو (سەدرەدین عارف) کە یەکێکە لە چیرۆك نووسە نوێ خوازەکانی کەرکوك، لەسەر ئاستی هەموو کوردستان کە دەستپێشکەری هەیە ئەویش ئەگەرچی لە گرووپەکەمان نەبوو، بەچیرۆکی گەشتێك توانیویەتی دەست پێشکەری خۆی لەبواری چیرۆکی نوێی کوردیدا تۆمار بکات، ئێمە ئەمانە بووین لەماڵی (عەبدولعەزیز خانەقا) دانیشتین لەگەڵ (شێرکۆ بێکەس)و ئەواندا، وەکو ووتم (شێرکۆ بێکەس)و ئەوان ویستیان گرووپی ڕوانگە لەگەڵ گرووپی کفری کەرکوکدا بەیانی ڕوانگە دەربکات، بەڵام کە دانیشتینو گفتوگۆمان کرد ئێمە زۆر بیروڕای جیاوازمان هەبوو، ئێمە وەکو کەرکوك، زۆر بیروڕای جیاوازمان هەبوو. کە ئەو برادەرانەمان بینی (برادەرانی ڕوانگە) ئەوان ویستیان بەیانی ڕوانگە پێکەوە لەگەڵ گرووپی (کفری- کەرکوك) دا دەربکەن، بەڵام بارودۆخی کەرکوك لەگەڵ هەڵچوونی ڕۆشنبیری ئەواندا جیابوو، ئێمە لە کەرکوك زیاتر سەرکوت کرابووین، ئێمە نەمانتوانی بگونجێین لەگەڵ ئەواندا، ئەوان بەیاننامەکەیان بەجیا دەرکرد، بەیاننامەی ڕوانگە، کە لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا بڵاویان کردەوە لە ئامیلکەی ڕوانگەشدا بڵاویان کردەوە، کە چوار ژمارەی لێ دەرچوو، نامیلکە بوو، بەڵام ناونرابوو گۆڤار، دەتوانم شتێك کە بیڵێم: کە ئەوان ئەو سەردەمە نزیك بوون لە حیزبەوە، نزیك بوون لە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولەوە، نزیك بوون لە باڵی چەپی مەکتەبی سیاسییەوە، کە جیابوونەوە لە پارتیو توانیبوویان کەناڵە ڕاگەیاندنەکان داگیربکەن بۆ خۆیان، لەبەر ئەوە دەنگی کەرکوك، دواکەوت.

(١٤)ی تەمووزی (١٩٧١) لە کەرکوك لە کۆنگرەی نووسەرانی کورددا، بەسەد نوسخە بەیاننامەکەی خۆمانمان بڵاوکردەوە بەسەر ئەوانەی کە هاتبوون بۆ کۆنگرەکە. بەهەر حاڵ، یەکێتی نووسەرانی کەرکوك، تەنها یەکێتی بوو، ئەوسا ئەبرایانی

عەرەب یەكێتی نووسەرانیان هەبوو، نە برایانی توركمان یەكێتی نووسەرانیان هەبوو، تاكو بێنە ناو یەكێتییەكەوە، چونكە ئەوەندە عەرەبی لێ نەبوو كەركوك شایانی باس بێت و نووسەرانیان هەبووبێت. بەسەرگەرمییەكی نەتەوە پەرستییەوە نایڵێم هەموو نەتەوەكانم خۆشدەوێت، برادەری عەرەبیشم هەن و برادەری توركمانم هەن، من ئەوەندەی خوێنەری كوردم هەیە، خوێنەری عەرەبیشم هەن خۆشم دەوێن و رێزیان دەگرم، دەمارگیریی نەتەوەیی لای من نییە، بەڵام ئەمەی دەیڵێم راستییە. لە كەركوكدا بە هەزاران كورد لەمسەری شەقامی كۆماری تاكو ئەوسەری شەقامی كۆماری خوێنەرانی كورد ئەوەستان بۆ كتێبی كوردی و رۆژنامەی كوردی و گۆڤاری كوردییان دەكڕی، كە (برایەتی) بوو بەرۆژانە، بەرنەدەكەوت. ئەو شەقامە هەمووی هەر كورد بوو، نە برایانی عەرەب، نە برایانی توركمان، ئاستی رۆشنبیری و رەگی رۆشنبیریان لە كەركوك وەكو پێوست نەبوو، ئێستاش دەتوانم بڵێم، هەندێ لەو نووسەرە گەورانەی كە برا توركمانەكان بە توركمان لە قەڵەمیان داون، وەكو (هیجری دەدە) كوردە، كاكەییە، لە چلەی پیرەمێرد لە سلێمانی شیعری بە كوردی خوێندووەتەوە، هاتووە بۆ سلێمانی، خۆی لە خۆیدا هەستێكی كوردایەتییە.

یەكەم فیستیڤاڵی شیعری كوردی لە كەركوك سازكرا لە ساڵی (۱۹۷۲)، لەو ڤیستیڤاڵەدا، گەورە نووسەران و شاعیرانی كوردو عەرەب و توركمان بەشداریان كرد، لەوانە (جەواهیری). یەك كەس ئەوسا نەیدەوت كەركوك كوردستان نییە، ئەم بەندوباوە كاتێك هاتە مەیدانەوە كە كەركوك كوردستان نییە، كە حیزبی بەعسی فاشستی شۆڤێنی، خۆی بگرێ و چەكی قورس و ترسناك پەیدا بكات، ئینجا توانی ئەم بەندوباوە لەناو خەڵكدا بڵاوبكاتەوە، كە كەركوك كوردستان نییە. لە حەفتاكاندا بەهەر لایەكدا بڕۆشتیتایە ماڵە كوردو رانگ و چۆغەو گۆرانی كوردی بوو، من دەتوانم بڵێم: ئەوبەری شۆڕیجە لەدوای بانگی عەسر، حكومەتی عێراقی نەیدەتوانی بپەڕێتەوە ئەوبەری پردەكەوە، ئەگەر چی مفەوزاتیش بوو، سنووریان بۆ حكومەتی فاشی بەعسی دانابوو.

لەسەردەمی گفتوگۆدا چالاكی كورد زۆربوو، هەموو هەفتەیەك، هەموو رۆژێك، ڤیستیڤاڵی شیعرو چیرۆك و ئاهەنگی جیاواز جیاواز بوو. ئەگەر عەرەب هەبووبێت لەو كاتەدا وەكو میوان ئەوا ئێمە دەعوەتمان كردون. لە هەموو تەمەنی كەركوكدا ڤیستیڤاڵێكی ئەدەبی ساز نەدراوە بۆ عەرەب، جگە لەوەش لە كەركوك (بەدیع باباجانی) هەبوو یەكەم نەخشەی پارەی عێراقی كێشا، گەرمیانی بوو لە ئەسڵدا، بەڵام لە كەركوك لەدایك بووەو گەورەبووە. یەكەم وتاری كورد لەسەر هونەری شێوەكاری (عەبدوڵڵا سەراج) نووسیویەتی كەركوكییە لە گۆڤاری (گزنگ)دا.

* سەرچاوە: چاوپێكەوتن لەگەڵ (لەتیف هەڵمەت)، لە كتێبی (كەركوك بۆ مێژوو دەدوێت).

* روانگە:

روانگە ئەو بزوتنەوەیەیە كە لە سەردەمی خۆیدا هەڵڵای دروستكرد، بانگەوازی روانگەخوازەكان سەرەتای دروستبوونی هەڵڵایەك بوو لەنێوان رۆشنبیران و هەریەكە بە ئاراستەیەكدا لەبارەی روانگەوە قسەی خۆیان دەكرد. روانگە هیچی نەكردبێت گۆمی مەنگی شڵەقاند. بەشێكی زۆری ئەدەب و رۆشنبیران لێی هاتنە دەنگ و هەندێك لە رۆشنبیران شاگەشكەبوون بەو بزوتنەوەیەو ئومێدی زۆریان پێی هەبوو. بەشێكیش لە رۆشنبیران نائومێدبوون و لەبارەی روانگەوە رەشبینانە گوتیان هێلكەیەكی پوچبوو.

بزوتنەوەی روانگە لەبەهاری (۱۹۷۰) دروستبووە. دروشمی روانگە (وتەی نوێ، بیری نوێ، كرداری نوێ)بوو تەمەنی بزووتنەوەی روانگە لە (۱۹۷۰- ۱۹۷۲) بووەو لەو ماوەیەدا سێ ژمارەیان لە گۆڤاری روانگە پێشكەشی خوێنەران كرد. روانگە بزوتنەوەیەكی رەخنەیی ئەدەبی بوو رۆشنبیران شێركۆ بێكەس و كاكە مەم بۆتانی و جەلالی میرزا كەریم و حوسێن عارف و جەمال شارباژێڕی و كەمال رەئوف محەمەد دایانمەزراند، ئەم بزوتنەوەیە لەسەر وەختی خۆیدا قسەی زۆری لەبارەوە كراو زۆری لەسەر نووسرا، هەندێكی بە بزوتنەوەیەكی رەخنەیی و ئەدەبی وەسفیان دەكردو هەندێكیان رەخنەیان لێ گرت بەوەی كە ئەم بزوتنەوەیە هیچی نەكرد، نە نوێخوازی كردووەو نەداهێنانی كردووە. لەو سەردەمەدا روانگە بووە باس و خواستی نووسەران و رۆشنبیران و كەوتە نێوان یارو نەیارانییەوە.

دامەزرێنەرانی روانگە لە بانگەوازەكەیاندا باس لە نوێخوازی و تازەگەری و بەگژداچوونەوەی كۆنەخوازی دەكەن. ئەوان پێیانوابوو یاخین و دژی ئازارو راپەڕینی ئەدەبی بەرپا دەكەن لەبەرانبەریدا دەنگێك هەبوو رەخنەی لە روانگە دەگرت و پێیان وابوو ئەوان یاخی نین ونەیانتوانیوە یاخین و لە كۆنەخوازی دەربازبن. ئەوانەی لەسەرەتای حەفتاكانی سەدەی رابردوودا لەم كێبركێیەدابوون كۆمەڵێك رۆشنبیرو ئەدیب بوون لەوانە هەڵمەت و عەزیز خانەقاو لەتیف حامیدو محەرەم محەمەد ئەمین و محەمەد مەولود مەم و عەزیز گەردی و عەبدوڵڵا عەباس و تەلعەت سامان و فوئاد قەرەداغی و ئەحمەد تاقانەو كەمال میراودەلی و مومتاز حەیدەری و سامی شۆڕش و محەمەدی مەلا كەریم و.. هتد. ئەمانەو چەندین رۆشنبیری دیكە لەو سەردەمەدا لەبارەی روانگەوە نووسیویانەو بڵاوەكانی ئەو سەردەمە بەتایبەت رۆژنامەی هاوكاری یان كردبە مینبەرێك بۆ ئەو ململانێیەو لەرێگای نووسینە دژ بە یەكەكانەوە كێبركێیان كردووەو روانگە لەنێوان دوو بۆچووندا بووە.

* سەرچاوە:-

پاشكۆی رۆژنامەی (كوردستانی نوێ)، ژمارە (۵۹٤۹)، یەكشەممە (۹)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (۲۰۱۲).

## * پەخشانێکی تەمەن سەد ساڵی کەرکوك و دەقە هۆنراوەیەکی ئایینی:

هاشم عاسی کاکەیی

لەگەڵ دروست بوونی ئیمارەتی بابان و پەیدا بوونی هەستی نەتەوەیی لای کوردان، دەرکەوتنی شاعیرانی وەك نالی و



سالم و چەندانی دی، بوونە هۆی ژیانەوەی ئەدەب و زمانی کوردی. هەروەها پەیدابوونی ڕێبازی نەقشبەندی بەدەستی مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزووری و بڵاوبوونەوەی بە شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا، بووە هۆی دروست بوونی سەدان تەکییەی نەقشبەندی و پەیدابوونی لایەنگرو موریدان بۆ ئەم ڕێبازە.
دەوڵەتی عوسمانی بە ڕێبازێکی کوردی دەهاتە پێشچاو، بە هەر پیلانێك بوو، فشاریان دەخستە سەربۆ تەشەنە نەکردن و بڵاوبوونەوەی، چونکە بۆیان دەرکەوتبوو زۆربەی لایەنگرانی ڕێبازەکە هەستی کوردانەیان هەبووە، نەك دەوڵەتێکی کوردی پێکەوەبنێن، لەبەر ئەمە ڕاودونانی مەولاناو موریدانی تا ڕووخانی عوسمانییان بەردەوام دەبێت.
مەبەست لەم چەند دێرە ئەوەیە زاناو مەلاو موریدانی ڕێبازی نەقشی گرنگییان داوە بەزمانی کوردی خۆیان بۆ پەروەردەکردنی موریدانیان، بەتایبەتی مەولانا (خالید) خۆی کاتێك کتێبی (عەقیدەنامەی کوردی) کە یەکێکە لە دانراوەکانی بەزمانی کوردی دەنووسێت، کە بەشێکە لە بناغەدانانی پەخشانی کوردی کە هونەرەکەی زۆر باڵایە.
ئەم دەستنووسەی ژێردەستی منیش، لەو بابەتە شیعرو پەخشانانە بەدەر نیە. ئەم دەستنوسە بریتییە لە مەولودنامەیەك وچۆنییەتی سازاندنی باوکە ئادەم و هاتنە دونیای حەزرەتی پێغەمبەرە (د.خ)، بەڵام سەرەتای دراوە بە دوو خەتیش نوسراوەتەوە، یەکەمیان بە شیعری ئایینی دەست پێدەکات بە دەسخەتی (سەیید حوسێن) ناوێك لە ساڵی (١٣٠٠)ی کۆچی کە ئەمڕۆ دەکاتە سەدەیەك (تمت شد في سنة ١٣٣٠ هـ فی خانقاه شیخ خضر بد ست سید حسین، اللهم اغفر لکاتبه).
دووەمیان ناوەکەی دیار نیەو نوسیویە (تمت بعون الله وحسن توفیقه) و ئەم چواردێرەشی وتووە:

(اینه نوشتم تا بماند یادگار
من نمانم خط بماند در روزگار
اینه نوشتم بخط غریب
نصر من الله وفتح قریب).

ئەم دەستنووسە هەنگاوێکە بۆ فێربوون و شارەزابوونی زمانی کوردی و بابەتی ئایینی بە کوردی دەخاتە ڕوو، بۆ دیاریکردنی باری ئەو ڕۆژەی نووسینی کوردی سەدەیەك لەمەوبەری کەرکوکی تێدا دەبینین. وشەکانی (گ) بە (ك) دەنووسرێ و سەروبۆریشی دەکرێن کەلەم سەردەمەدا ئێمە پیت لە بریتی سەرو ژێرو بۆرکردن دادەنێین. چەند وشەیەکی ڕەسەن و پەتی و هەندی جاریش وشەی ئەو سەردەمەی تێدایە بۆ نموونە (نەبواو : عدم) (دەبیە : بیستن)، (پاکیان : هەمویان)، (وەکو : کە) (بەبە : ببە)، (چە بنویسم : چی بنوسم)، (ئەمری کردنێ : ئەمری پێکردن)، (کوتی : گوتی)، (سە صەد سال : سێسەد ساڵ)، (هەمدەم : هاودەم)، (لەحینا : کاتێك)، ((ئا : بۆ (ئا فیکرو ئا خەوف)، (ئا خەلوەتخانە))، (پەنج : پێنج)، (هەفصەد : حەوصەد).
خوێنەر دەتوانێ تەماشای ئەم جوانکاری ووشەئارایییەی ناو ئەم چەند دێرە پەخشانە بکات کە هیچی لە (کەلیلەو دیمنە)و (مەنتیقولتەیر)ی فەریدەدینی عەتار، کەمتر نیە ((کەیفی زۆر زۆر بوو خۆش، کورەی تەماعی هاتە جۆش، ڕووی کردە تاوس، کوتی : تو تایرێ ساحێب فەری، ڕەنگین پەری، نەقشین باڵی، سەوزو شین و ئاڵی، سورەت پاکی، سیرەت چاکی، موبارەك پەیکەری، خەجوستە سێبەری، خۆش ئەندامی شیرین خەرامی، هوما سایەی، فەرەح مایەی تو چی تاوس... تەمی غەم ڕۆژی لێکردنە شەوی تاریك، هەوری ئەلەم و غەمیان بەسەردا باری ، بڵێسەی غەمیان لە دڵ هەڵگرا ، قەرارو ئارامیان لێبرا..)).
مایەوە بڵێم دەسنوسەکە لە شاری کەرکوك لە تەکییەی

(شێخ خدر کوری حەیدەر نەقشبەندی) نوسراوەتەوە، کە لە مێژووی (۱۲۸۲) کۆچی دروستکراوە، دەکەوێتە گەڕەکی ئیمام قاسم – لە عاشور، ڕێی سلێمانی جاران.

(شێخ خدر) دوو کوری هەبووە بەناوەکانی (شێخ جواد)و (شێخ سەعید)، ئەم (شێخ سەعید)ە کوڕێکی هەبووە ناوی شێخ تەهایەو نازناوی شیعری (ڕەهبەر) بووە، شارەزاییەکی باشی لە شیعرەکانی (نالی)دا هەبووە، توانای لێکدانەوەو شرۆڤەکاری جوانی بۆ شیعرەکانی هەبووە بەڵام شیعرەکانی خۆیم دەس نەکەوت داخەکەم. شێخ تەها پاش باوباپیرانی مورشیدی تەکییەکەیان دەگرێتە ئەستۆ.

دکتۆر مارف خەزنەدار دەڵێ: "ئەمە تەکییەیەکی بچووك بوو، خاوەن و مورشیدی ناوی شێخ تەها بوو، کابرایەکی چەندە بلێی باش بوو، مەلاو خوێندەواری سەردەمی خۆی بوو، ماوەیەکیش مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو، بەڵام زوو وازی لێ هێنا بوو، بۆ ئەوەی تەکییەکەی بێخاوەن نەمێنێتەوە، گوێیەکی مۆسیقی بەهێزی هەبوو، شیعری کلاسیکی تەقلیدی دەنووسییەوە، نازناوی ڕەهبەر بوو"[1].

لە کۆتاییدا سوپاس و پێزانینم بۆ کاك (بورهان جاف) تۆمار دەکەم کە دەسنوسەکانی خستە ژێردەستم. ئەمەیش دەقێکە لە دەسنووسەکە:

"(لەحینا : لەکاتێدا) کە ئیرادەی کرد (رب العزة جل جلاله) خەلق بکا نوری سەیدی ئێمە (وەکو : کە) (محمد المصطفى صلى الله عليه وسلم)، ئەخزی کرد قەبزەێ لە نوری خۆی، فەرموی (بەبە : ببە) بە حەبیبی من، بە ڕەسولی من لە سەر هەموو خەلق، ئەو نورە بوو بە گولولە یە نور، تەسبیح و زیکری خودای دەکرد لە پێش دروستکردنی دوروو عەرش و کورسی و عالەمدا بە دوو هەزار ساڵ. ئیمامی علي ابن ابی طالب، کرم الله وجهه ورضي الله عنه، فەرمویە: خەلق بووە نوری سەیدی ئێمە لە پێش ئاسمان و ئەرزو کورسی و حوجب و بەهەشت و دونیا ئاخیرەت، ئادەم و شیت و نوح و ئیبراهیم، سولەیمان و موسا و عیسا، بە شەشصەت و بیستو چوار هەزار ساڵ لە پاش پێغەمبەری ئێمە. دوازدە حیجابی خەلق کرد، حیجابی قودرەتی، حیجابی عەزەمەت، حیجابی مینەت، حیجابی ڕەحمەت، حیجابی سەعادەت، حیجابی کەرامەت، حیجابی مەنزیلەت، حیجابی هیدایەت، حیجابی شەفاعەت، لە پاشان هێنایان نوری پێغەمبەریان صلى الله عليه وسلم، بردیانە نێو ئەم حیجابانە، یەك بە یەك نوری پێغەمبەری، صلى الله عليه وسلم، دوازدە هەزار ساڵ لە حیجابی قودرەتی دا بوو، دەیفەرمو سبحان ربی الاعلى لە حیجابی عەزەمەتیدا یازدە هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان عالم سر واخفى لە حیجابی مینەتیدا دە هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان رفيع الاعلى لە حیجابی ڕەحمەتی نۆ هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان الرؤف الرحيم لە حیجابی سەعادەتی هەشت هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان العلى الحكيم لە حیجابی مەنزیلەتی هەفت هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان من دائم لايزال، لە حیجابی کەرامەتی شەش هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان رب العرش العظيم لە حیجابی نەبووەتی چوار هەزار ساڵ بوو دەیفەرموو سبحان الله و بحمده سبحان الله العظيم لە حیجابی ڕەفعەتی (سە : سێ) هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان الملك القدوس لە حیجابی تاعەتی دوو هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان الله الملك القديم الازلى لە حیجابی شەفاعەتی یەك هەزار ساڵ بوو، دەیفەرموو سبحان الله الملك المعبود. لە پاش ئەم دوازدە حیجابانە خودا بردی ابحر نەصرەتی ابحر ڕەحمەتی ابحر مەحەبەتی ابحر قودرەتی ابحر کەرامەتی ابحر سەخاوەتی ابحر هیدایەتی ابحر شەفاعەتی ابحر حیکمەتی ابحر مەعەریفەتی (لەحینا : کاتێ) لە بەحری مەعەریفەتی هاتە دەرەوە، خودا ئەمری کرد (جاری : ڕەوان) ببە، جاری بوو، لەوێ صەدو بیست و چوار هەزار قەترە، هەر قەترەیەك پێغەمبەرێك لێی خەلق بوو، لە پاشان خودا خەلقی کرد لە نوری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، جەوهەرێك، خودا ئەمری کردە جەوهەرەکە، بوو بە دوو لەت، نەزەری کردە یەکێکیان بە چاوی هەیبەتی لە ترسان توایەوە، بوو بە ئاوی جاری، ئێستایش ئارام و سکون نییە لە ترسی خودا. خودای تەعالا نەزەری کردە نیوەی دووەم بە چاوی ڕەحمەتی چوار ئەشیای لێ خەلق بوو: عەرش و کورسی و لەوح و قەڵەم. خودا نەزەری کردە قەڵەمی بە چاوی هەیبەتی، قەڵەم بە دوو لەت بوو، فەرمووی بنویسە، قەڵەم عەرزی کرد چە بنویسم یارەبی. فەرمووی بنویسە هیچ مەعبودێ خودانییە ئیلا من نەبم، هیچ شەریکم بۆ نیە لە مۆلکمداو محمد صلى الله عليه و سلم عەبدی منەو ڕەسولی منە. قەڵەم کەئەم خیتابەی بیست بە سەجدەدا کەوت تا صەد ساڵ، لە پاشان سەری بلند کردەوە، گوتی دەزانم تۆ بێ شەریکی، ئەمما نازانم ئەو موحەمەدە کێیە کە ناوت بەرابەری ناوی خۆت نویسیوە. خودا فەرمووی ئەی قەڵەم: بە عیزەت و جەلالی خۆم قەسەم ئەگەر لەبەر ئەو موحەمەدە نەبوایە، نە عەرش و نە کورسی و نەقەڵەم و نەئاسمان، نە ئەرزو نە بەهەشت و نە جەهەننەم و نەرۆژو نەشەو، خەلقم نە دەکرد، هەموو لە بەر خاتری ئەوی خەلقم کردووە. خودا ئەمری کردە قەڵەمی بلێ (السلام عليك يا محمد)، قەڵەم سەلامی لێکرد، حەزرەتی (رب العزة) لە باتی حبیبی خۆی فەرمووی (وعليك السلام ايها القلم ورحمتى وبركاتى). لەو وەقتەوە سەلام کردن سونەتە، جواب دانی واجبە. لە پاشان خودا ئەمری کرد بنویسە لە ڕۆژی خەلقی عالەم تا ڕۆژی قیامەتێ، ئەحوالی ئوممەتی هەموو پێغەمبەران. قەڵەم نویسی هەرچە گوناکارە جێی ئەویی نارە، هەرچە ساحێب تاعەتە، جێی ئەویی جەننەتە، تەماعی بوو ئوممەتی پێغەمبەری ئێمەیش وا بنویسێ، خودا فەرمووی بنویسە ئومەتێکی گوناکارە، خودایەکە غەفوورو ڕەحیمە، یەعنی ساحیبی عەفوە ئینشائەڵڵا گوناهی ئوممەتی پێغەمبەری ئێمە هەموویان مەغفوور دەبن. لە پاش خەلقی ئەمانە بەهەشتی خەلق کرد، مانگ و ڕۆژو ئەستێرەی خەلق کردن، مەلایکەتانی هەموو خەلق کردن، ئەمری کردنێ بە سەڵەوات دانی پێغەمبەر، لە پاشان ئاسمان و ئەرزی خەلق کردن، دونیا و ئاخیرەتی تەمام خەلق کردن. لە پاشان ئیرادەی کرد حەزرەتی (رب العزه جل جلاله) خەلقی باوکی ئێمە بکا (وەکو: کە) ئادەم پێغەمبەرە (على نبينا و عليه الصلوة والسلام)، تا لە نەسلی ئەویی کە حەزرەتی فەخری عالەم (محمد المصطفى

صلی الله علیه‌و سلم) زاهیر ببێ. ئەمری کردە جبرائیل لەگەڵ جەماعەتێ لە مەلائیکەتان. نازل ببنە سەر ئەرزێ، ئەخزیان کرد مشتێ گڵ لە جێگای قەبری حەزرەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه‌و سلم)، بردیان بە ئاوی نەسیم کە جۆگەیەکە لە بە هەشتێدا، شێلایان هەتا بوو بە (دورێکی سپی) لە پاشان لە هەموو ئاوی بەهەشتیان هەڵکێشا، ئەو دورەیـان گێڕا بە ئاسمان‌و زەمیندا تا مەلائیکە حەزرەتی پێغەمبەر بناسن لە پێش خەلقی ئادەم دا بە هەزار ساڵ. لە پاشان (حەزرەتی رب العزه جل جلاله)، جەسەدی ئادەم پێغەمبەری خەلق کرد بە دەستی قودرەتی خۆی، روحی کرد بەبەردا، نوری پێغەمبەری ئێمەی نایە نێو (زەهری : پشتی) وەکو ئەستێرە بە رووی بەیانەوە دەدرەوشـاوە، خـودا ئـەمری کـردە مەلائیکەتان سوجدە بەرنە بەر ئادەمی، هەموویان سوجدەیان بردە بەر ئادەمی، شەیتان نەبێت، کوتی : ئەمن لە ئاگری خەلق کراوم، ئەگەر جەوهەرێکی پاکو نوورانییە ئـەو، لـە خـاك خەلق (کـراوە)، خاك عونصورێکی تاریك‌و زوڵمانییە، تەکەبوری کرد، سوجدەی نەبردە بەر ئادەمی، بە سەبەبی ئەو تەکەبورەوە تەوقی لەعنەتی کرایە گەردەنی لە قاپیی رەحمەتی دەرکرا، لە نازو نیعمەتی بەهەشت برا. ئادەم لە بەهەشتێدا ساکین بوو، مەلائیکە پۆل پۆل لە پشتی ئادەمەوە رادەوێستان، ئادەم عەرزی بارەگای ئەقدەسی کرد ئـەم مەلائیکەتانە بـۆچ لە پشتمەوە رادەوێـستن، خـودا فـەرمووی دەروانـنـە نـووری حەبیبی من کە (من بعد : لە پاشان) لە پشتی تۆ زاهیر دەبێ. لە پاشان ئادەم عەرزی کرد یارەبی ئەو نوورە نەقل بکەیە نێو چاوانم تا مەلائیکە لە پێشمەوە راوەستن. خودا ئەمری کردە نوور کە نەقل بەرە نێوچاوانی ئادەمی، نوورەکە نەقل بوو، مەلائیکە سەف سەف روو بە رووی ئادەم دەوەستان نەزەریان دەکردە ئەو نوورە، ئادەم دووبارە عەرزی کرد کوتی: یا رەبی حەز دەکەم ئەو نوورە نەقل بکەیە مەکانێك بە دیداری ئەویی شادبم، خودا نوورەکەی نەقل کردە ئەنگوشتی شەهادەتی ئادەمی، تەسبیح‌و زیکری خـودای دەکـرد لە ئەنگوشتی ئادەمدا تا ئادەم واقیع بووە مەعسییەتی ئەهلی مەعسییەتی ئادەم. ئەمەتە کە ئادەم لە بەهەشتی عەنبەر سروشت ساکین بـوو، مەشغوڵ بـوو بەکەیف‌و سـرور نیشاتی بـە فـەرەح‌و عەیش‌و ئینبیساتی. شەیتانی لەعین لە قاپیی رەحمەتی دەرکرا، لەنازو نیعمەتی بەهەشتی برا، ئاگری حەسەدی لە دەروونی دوونی مەلعوونی هەڵگرا، ئارام‌و سەبری لێ برا، هەمیشە تەسەوروو ئەندێشەی ئەو بەد پیشە ، ئەمەبوو کە ئادەم لە بەهەشتێ دەربکا، بە دەردی دووری موبتەلا بکا، وەقتێ ئەو لەعینە لە ئەرزێ فری بۆ ئاسمانێ، تا حاڵی ئادەم بزانێ، سەصەد ساڵ لە قاپی بەهەشت دانیشت، مونتەزیر بوو یەکێك لە بەهەشت بێتە دەرەوە، قەزای رەبانی (تاوس) کە یەکێك بوو لە خەزینەداری جەنەتی لە بەهەشتێ هاتە دەرەوە، شەیتان کە چاوی بە تاوس کەوت کەیفی زۆر زۆر بووخۆش، کورەی تەماعی هاتە جۆش، رووی کردە تاووس کوتی: ئەی تاوس تو تایری ساحێب فەری، رەنگین پەری ، نەقشین باڵی، سەوز شین ئاڵی، سورەت پاکی، سیرەت چاکی، موبارەك پەیکەری، خەجوستە سییەری، خۆش ئەندامی،





شیرین خەرامی، هوما سایەی، فەرەح مایەی، تو چی؟ تاوس کوتی: من تاوسم یەکێکم لە خەزینەداری بەهەشتێ، ئەمما تو چی؟ چە کەسی؟ بە سەرو سورەت دەڵێی کەرگەسی، شەیتان کوتی ئەی تاوس من مەلەکێکی موقەرەبم، شەوو رۆژ لەعیبادەت غافڵ نیم، حەز دەکەم بچمە بەهەشتی، تێدا بکەم سەیران و گەشتی، تا جەننەت و حورو قەسرو قسور (بەبینم : ببینم)، دڵم بە بەهەشتێ تاڵب ببی، شەوقی عیبادەتم غاڵب ببی، تاوس کوتی ئەی مەلەك من ئەم کارە ناتوانم ئەمما رەفیقێکم هەیە لە بەهەشتێ ، کارت بەوی سەهل دەبی، مۆشکیلت بەوی حەل دەبی، تاوس چو بەلای مارەوە، کوتی ئەی رەفیق مەلەکێکی موقەرەب لە دەرکی بەهەشت وەستاوە، لە تۆ دەکا سەڵاوە، مونتەزیری قدومی خەباسەت لزومی بە تۆیە، ماری بە دکرداری زوشت دەر ساعەت چو بەلای قاپیی بەهەشت (لە حینا : لە کاتێکدا) کە شەیتانی لەعین ماری بەد شکڵ و ئەزواری دی، کەوتە خاك و پای دەستی کرد بە حەمدو سەنای، ماری کونی ئەی مەلەك بە چەرەنگ بدبەمە بەهەشتی، بێ ئیزنی دەرکەوانی بەهەشتی، مەلعون کوتی مارە دێمە ناو دەمتەوە، شەیتان چووە دەمییەوە وەك بەڵای ناگەهان چووە بەهەشتی، دەرکەوانی بەهەشت بەفەراسەت زانییان ئەمما خیتاب لە تەرەفی (رەب العزە) هات فەرمووی ئەی ریزوان عەلاقەی شەیتان مەکەن من لە زمنی ئەم کارە هەزار ئەسرارم هەیە. لەعینی پڕ حیلەو کین، خۆی کرد بە شەخسێکی نورانی، دەستی کرد بە گریانی، بە زاری و شین و ئەفغانی، تەیری بەهەشتی هێنایە خرۆش، ئادەم و حەوای هێنایە جۆش، ئادەم کوتی: پیری موحاسین سفید لە بەهەشتا هیچ غەم و موسیبەت نیە، تو ئەم گریان و شیوەنەت لە چییە ؟ ئیبلیسی خەبیس رووی کردە ئادەمی، کوتی : ئەی پادشاهی مەلائیك سوپاهی، جەننەت تەختگاهی ، عیزەت پەناهی، قەدرێکی ئەرجومەندت هەیە، پایەیەکی بوڵندت هەیە، لەگەڵ موقەرەبان هەمدەمی، گەورەی هەموو عالەمی، مەسجوودی مەلەکانی، مەحمودی موقەرەبانی، مەحبوبی رەحمانی، دەوڵەتێکی زۆرت هەیە پادشاهیەکی بیشەرو شورت هەیە، ئەمما دەترسم ئەم دەوڵەتە بەرقەرار نەبێ، ئەم شەوکەوت و سەڵتەنەتە پایەدار نەبێ، کە ئادەم و حەوا ئەم قسەیان بیست، تەمی غەم رۆژی لێکرنە شەوی تاریك، هەوری ئەلەم و غەمیان بە سەردا باری، بڵێسەی غەمیان لە دڵ هەڵکرا، ئیقرارو ئارامیان لێ برا. ئادەم و حەوا کوتیان: ئەی پیر هەر وەکو خستیتنە ترس و هەراس، (ئا : بۆ) فیکرو (ئا:بۆ)خەوف و وەسواس، بە مەفادی عیلاجی واقیعە پیش ئەز وقوع بایەد کرد دەبی عیلاج، دەرمانی ئەم دەردە بکەی، دەردمان دەرمان بکەی، لەم غەمە خەڵاسمان بکەی، شەیتان لەعین کوتی : ئەی ئادەم ئەمن پیری ساحیب دینم، ئەمن ناسحێکی ئەمینم، تەبیبی دەرمانی برینم، (هەرگا : هەرکات) بە قسەم بکەن عیلاجتان ئاسانە دەردتان دەرمانە، ئادەم و حەوا کوتیان، ئەی پیری ساحێب تەدبیر هەرچی تو بڵێی وەها دەکەین، شەیتان ئیشارەی کردە درەختی گەنمی، کوتی ئەمە شەجەرەی خولدی پێ دەڵێن، هەرکەس بخوا لە بەری ئەم درەختە، هەرگیز نابێ بەد بەختە، هەرگیز لە بەهەشتی ناچێتە

دەری، زەحمەتی نایەتە بەری، راوی دەفەرموی : ئەو مەلعونی دوونە هەفتاد بار سوێندی بە درۆ بۆ خواردن، نەیاندەزانی کەسێك هەیە کە بتوانێ سوێندی بە درۆ بخوا، خوڵاسە حەوا فریبی، خوارد چوو بەلای درەختی گەنمەوە جووت هێشووی لێکردەوە، یەکێکی خوارد ، یەکێکی هەڵگرت، پەنجی لە بۆ ئادەمی هێنا، ئادەم ئیبای دەکرد، حەوا ئیلحاحی لێدەکرد، تەعەریفی لەزەتی دەکرد، ئادەم دەیفەرموو : ئەی حەوا بۆچ لە خودا ناترسی کە سفرەی رەحمەتی بۆ راخستووین ئەنواعی تەعامی بەهەشتی بۆ حەڵاڵ کردووین، تەنها مەنعی لە خواردنی گەنم کردووین، حەوا کوتی : ئەی ئادەم خودا رەحیمە، ستتارو کەریمە، گوناهمان دەبەخشی، لە بەهەشتمان نابری بەشی. ئادەم فەرمووی : راستە خودا غەفورو رەحیمە، ئەمما شدید العقابە، شدید العذابە، قەههارە، جەببارە مونتەقیم و موذیلەء موضلە. حەوا کوتی : ئەی ئادەم خودایەکی کەریمە، حەلیمە، رەحمەتی پێش غەزەبی کەوتووە، عیقابی ئەویی عەفووی لە دووە، بارانی رەحمەتی فراوانە، دەریای مەغفیرەتی بێ پایانە، یەك لوقمەی ئاراستەی دەمی ئادەم کرد، کە مەزاقی ئادەم چەشتی زۆر بە لەزەت بوو، ئەمما لەعینی ثە مە رە تاڵی موذیلە ت بوو. راوی دەفەرمووی : ئەو لوقمەی پڕ نیقمەتە لە مەعیدەیدا تەواو قەراری نەگرت کە ریب و زیوەرو زینەتی بەهەشتی لە بەدەن هەڵوەری، تەختی سەڵتەنەتی کوبری لە دەست چوو، تاجی شەوکەت و جەلالی لە سەری وەکو تەیر پەرواز کرد. جبرەئیلی ئەمین بە خەشم و کین نازڵ بوو، تاجی سەری لێ ساندن، لیباسی بەهەشتی لەبەر دادرنین، ئادەم و حەوا کە خۆیان بە رووتی دی سەری شەرمەندەگییان پێش دەخستەوە وەك ژانداران دەهاتن و دەچوون، غەرقی عەرەقی خەجاڵەت بوون دەستیان کرد بەگریانی، بەشیوەن و ئەفغانی، تەیرو تیور، غیلمان و حور لە هەموو تەرەفی گرد بوونەوە، ئادەم لە شەرمی رووتی خۆی، خۆی دەدایە پاڵ درەختان، هەر درەختێکی کە دەچوو بەلایەوە، دەگریا و دەپارایەوە، دەیکوت : دوورشۆ دوور شۆ، چوو بەلای درەختی عەنابەوە، عەناب بە غەزەبو عیتاب نێشی پڕ نێشی خاری پڕ ئازاری لە مووی سەری گیراند وەك ئەسیران هەڵی واسی، ئادەم کوتی ئەی عەناب پڕ خەشم و عیتاب، شەرمم لێناکەی تا دوێنێ بوو سەرکردەتان بووم شەرمتان لێدەکردم، ئێستا هەتکم دەکەن، عەزایم دەدەن عەناب کوتی : ئەی ئادەم موقەرەبی دەرگا بووی ئیستە مەهجووری بارەگاهی، لەو وەقتەدا خیتابی پر عیتاب لە تەرەفی (رب الارباب) هات، فەرمووی ئەی ئادەم هەمدەمی ئەلەم و غەمی، لە کوێی، ئادەم بە دڵێکی غەمگینەوە بە ناڵەیەکی حەزینەوە، عەرزی بارەگای ئەقدەسی کرد، کوتی (یارب العزە) ئەمەمە کە دەمبینی، رووت و قووت و حەزین و غەمگین، دوورو مەهجوورو خوارو غەمبارو زەلیل و عەلیل و دڵرێش و غەمکێش و بەدحاڵ، بێ ئیقبال و بێکەس و دوور لە هەم نەفەس و نعوذ بالله (شمع بکرنە داکە ببیند شب تارمرا)، خیتاب لە تەرەفی حەزرەتی باری هات ئەی ئادەم ئەو عیزەتەت بەمنەوە بوو، ئەو شەوکەت و سەڵتەنەتەت لە منەوە بوو صەدر نشین عیزەت جاه بووی، موقەرەبی دەرگاه بووی، خەلعەتی ئیستیفات

لەبەر بوو، تاجی سەلتەنەتت لە سەر بوو، مەسجوودی مەلەك بووی، قوتبی دائیرەی فەلەك بووی. بەدەستی خۆم تەخمیرم کردی، بە قەلەمی خۆم تەصویرم کردی، صورەتم ڕەنگین کـردی، جـەمـالم نمەکین کـردی. کە ئـادەم ئـەو خیتابە پڕ عیتابەی بیست، ئاهی سەردی لە دڵی پڕ دەردی هەڵکێشا، بەندی جگەری لەگەل ئێشا. بەزوبانی حاڵ کوتی : دەردوزەخم بیەفگەن نام کنجە کاتش بکرمی عرقی انفعال نیست، دەردی لە سەر دەردی زیاد بوو، تەواو عومری بەرباد بوو، دۆستی پێ غەمگین بوو، دوژمنی پێ شاد بوو. دەینالآن دەیکوت : (کس بدین روژ کەفتار مبادا کەمنم). حەزرەتی جبرائیل علیە السلام مووی سەری ئادەمی لە چنگی چنگاڵی عەناب خەلآس کرد، بە کەشان کەشان بردی بۆ قاپی بەهەشتی لەو وەقتەدا نیدا لە تەرەفی (رب العزە) هات : ئەی جبرائیل ئەوی کە ئەم فیتنەو فەسادانەی کرد جێیان لە حەریمی نەعیمی مندا نەماوە، بەشیان لە قوربی بارەگاهی من براوە، جبرائیل باڵی تاوسی بە سەد هەزار حەسرەتو ئەفسوس ڕاکێشا بردی بۆ قاپیی بەهەشتی ئەو وەقتە تـاوس هەفسەد بـاڵی بـوو، هەر وەکـوو ڕۆژ شوعلەی دەدا، پێی لە زمروتی سەوز بوو، بە شوومی ئەم کارە کە کردی هەموو باڵیان بڕی، ئیلا دوو باڵی نـەبێ. پێی کە لـە زمـروتـی سـەوز بـوو ڕەش بـوو. مـاری بەدکرداری بە هاوار رای کێشا، ئەو وەقت مار سەری لە یاقوت بوو، گەردەنی زەبەرجەدی سەوز بوو، دندانی وەك مرواری بوو، بەدەنی سەرتاپا ڕەنگاوڕەنگ بوو وەك ڕۆژ شوعلەی دەدا، لە پاشان خیتابێ هات فەرمووی : ئەی حەوا حاڵت چییە، ئەویش بە نالەی حەزینەوە کوتی : یارب العزە بەدحاڵم بێ ماڵم، ماڵ شێواوم خانە سوتاوم، خانە خرابم، دڵ کەبابم، غەمبارم، تەعزییەدارم ، دەربەدەرم، خاك بەسەرم، خۆشیم نەماوە، کارم تەواوە. (باز : دوبارە) خیتاب هات ئەی حەوا ئەمەت بۆچ بەخۆت کرد، ئادەمت بەم دەردە بۆچ برد ؟حەوا عەرزی بارگاهی ئەقدەسی کرد یارەب نەمزانی کەسێ هەیە کە بتوانی سوێندی بەزاتی موقەدەسی تۆ بە درۆ بخوا، ئەو مەلعونی دوونە نە شەرمی لە تۆ کرد، نەڕەحمی بە ئێمە کرد، هەفتاد (بار : جار) سوێندی بە درۆ خوارد، ئێمەی بەم دەردە برد. باز خیتابی پڕ عیتاب هات کە ڕایانکێشن بە کەشان کەشان، ڕایانکێشان، ئادەم دەستی لە درەختیکی وەرهانی، عەرزی کرد یارەب من خاکێك بووم بێ کارە ، غوبارێك بووم زەعیفو بێچارە، بە دەستی خۆت قورت شێلاوم، سورەتت کێشاوم ، ناوت لێناوم ، خەلعەتی ئیستیفات کردمە بەر، تاجی سەلتەنەتت کردمە سەر، لە نێو عالەمدا ئەرجومەندو سەر بۆڵەند، بۆڵەند پایە، ساحیب سایە، ساحیب سەدرو بوڵەند قەدرو سوڵتانی حوکمڕانو ساحیب قەرانت کردم ، بە گوناهێك کە لەم بەندەی زەعیفە بە سەهوو نە بە عەمد سادیر بوو، بمبەخشە، لێم ببوورە، لە دەرگای خۆتم مەکە دوورە، مەمکە بە کۆی توورە. باز خیتاب هات کە (اذهبوا بعبدی) هەم دیسان بە کەشان کەشان، ڕایان کێشان، باز ئادەم علیە السلام دەستی لە درەختێك وەرهانی گریاو کوتی (یا رب الامان الامان) خۆت فەرمووتە کە لە نەسڵی تو ئەنبییاو ڕەسولان پەیدا دەکەم، یەکێك لەوان ئدریسە، ساحیبی تەقواو تەسبیحو تەقدیسە، یەکێك لەوان نووحە، ساحیبی ئەسرارو فتوحە، یارەبی کەشتی سەبرم شکاوە، جگەرم براوە، تاقەتی دووری تۆم نەماوە، یارەبی بە حورمەتی جاهی ئەوانە لێم خۆشببە، لە خۆتم دوور مەکە، لە لام دووری لە تۆو مردن هەرییەکێکە. باز خیتاب هات (اذهبوا بعبدی)، باز ڕایانکێشان، هەم دیسان ئادەم دەستی لە درەختێکی وەرهانی، کوتی یارەبی خۆت فەرمووتە کە لە ئەولادی تۆ ڕەسولێك دەبێ ناوی ئیبراهیم خەلیلە، زۆر گـەورەو جەلیلە. یەکێ دەبـێ نـاوی موسایە، ساحیب تەقواو ساحیبی تەوراتە، ساحیبی عیزو کەراماتە، کەلیمە حەلیمە، لەپاش ئەوان یەکێك دەبێت ناوی عیسایە، روحو ئەڵلآیە، جەلیلو جەمیلە، ساحیبی ئینجیلە. یارەبی بە حورمەتی ئەوان ڕەسولانە : دوورم مەکە لەم ئاستانە، باز خیتابێ بە شـدەتو عیتاب هـات (اذهـبوا بعبدی)، بـاز بە شیدەتو سەتوەت مەلائیکە ڕایانکێشان، باز ئادەم دەستی لە درەختێك وەرهانی، بە درەختیدا هەڵی دووانـی، قەزای ڕەبانی، خەیاڵی فەخری کائیناتی بەرچاوانی هانی. کوتی یارەب یارەب خۆت موژدەت داومێ کە لە نەسڵی تو، ڕەسولێك پەیدا دەکەم لە نووری خۆم خەلقم کردوە (ئا : بۆ) خەڵوەتخانە قاب قوسینم بردوە، دورة الناجە، ساحیب میعراجە، فەخری عالەمە گەورەی بەنی ئادەمە، سەییدی کائیناتە، ساحیبی موعجیزاتە، سەرداری ئەنبییایە، سالاری ئەسفیایە، نوورە بە سوورەتی ئینسانە، ساحیبی موعجیزەی قورئانە، ئامینە مەکینە رەئووفە، مەعروفە، ڕەفیعە شەفیعە، ئومەتی ئەوی خیر الامە، ئەم هەموو مەدحە بۆ ئەوی کەمە، یلرەب بە حەققی ئەو حەبیبە بەجاهی ئەو بوزورگوارە، یارەبی بە حورمەتی ئەو مەحبووبە یارەبی بە گەورەیی ئەو مە جذوبە، لێم خۆش ببە، ئازادم بکە بە مەغفیرەتی خۆت دڵشادم بکە. کە ئەم موناجاتە گەیشتە بەر قاپیی عەزەمەتی ناوی مەحبووبی ڕەبانی، کە گەیشتە بەر قاپیی سوبحانی، دەریای ڕەحمەتی هاتە جۆش، بارانی مەغفیرەتی کەوتە خرۆش، نیدا هات: ئەی مەلائیکە لە گەل عەبدم موعامەلە چا بکەن، عەفووم کردوە لێی خۆش بووم، حەزرەتی باری جل جەلالە فەرمووی ئەی ئادەم لە گەل جووتی خۆت بەزەریفی بچۆرە سەر زەمینی، تەعمیری زەمین بکە، زۆر ئەسراری گـەورە هەیە بچوونی تو (ئا : بۆ) سەر زەمینی، زاهـیر دەبـی. ئـادەم قەدەمی لە بەهەشتی عەنبەر سروشت هێنایە دەرەوە، هات بۆ سەر زەمینی، ئینجا لەو وەقتەدا لە خۆشیان ئەم شیعرانەیان دەخوندەوە :

یاحسنا من لیلة جلیت بها للوجل محمد سید الاکوان
قیموا للمنة علی کرسي الرضی حتی رای الحورو الغلمان

تمت بعون اللهو حسن توفیقه اینه نوشتم تا بماند یادگار من نمانم خط بماند روزگار اینه نوشتم بخط غریب نصر من الله وفتح قریب

ئەمەش دەقی هۆنراوە ئایینیەکەیە:

بسم الله الرحمن الرحیم وبه نستعین

ئەووڵ ئیبتدا بە ئیسمی ئەڵلآ
پەس حەمدو سەنا ئەلحەمدو لیللا

ئەوجا سەڵەوات لەسەر موستەفا
هەم ئالو ئەسحاب ئەربابی سەفا
گوێدێرن بە عام چی موسلمانان
ئەگەر بەراستی ساحێب ئیمانن
هەرچی واجب بێ دەبێ بیزانن
گەر شەیتان بێڵێ زۆر زۆر ئاسانن
ئەووەڵ هەموان ناسینی خودایە
هەرچەند لە تاقەت عەقڵی تۆدایە
ئێمەی خولقاندوە تاکە بیناسین
ئیتاعەی بکەین لێشی بترسین
پێنج روکنی ئیسلام بابزانین چییە
باوەڕی پێبکەین ئەمری ڕەبییە
ئەووەڵ کەلیمەی شەهادەتو ئیمان
دووەم پێنج فەرزە، باشەرتو ئەرکان
سێیەم، سی ڕۆژەی مانگی ڕەمەزان
مەحفوز لە موفتیر هەم لەغوبەتڵان
چارەم : زەکاتە لەگەڵ سەر فیترە
پەنجەمین حەجە ئەو لەگەڵ عومرە
ئەم پێنج روکنانە بە فەرزیان زانین
قەد تەرکیان نەکەین گەرموسڵمانین
هەرکەس تەرکی کرد یەك لەم پەنجانە
بێشك روکنێکی دینی نوقسانە
ئەوجا با مەعنای شەهادەت جێ بکەین
مەعنای بزانین باوەری پێ بکەین
اشهد ان لا اله الا الله
هیچ مەعبود بەحەق نیە ئیلازات خوا
چی بتو سەنەم ، ئەستێرەو ئاگر
کە دەیپەرستن تایفەی کافر
غەیر ئەز بێ شەریك پاکیان بەتاڵن
عابدی هەموان ئەهلی زەڵاڵن
حەقە (موحەممەد) ڕەسولی خودا
ناردی بە ڕەحمەت بۆ ڕێی ئیهتیدا
بۆ سەر ئینسوجن مەلایك یەکسەر
چی ئەو فەرمویە تا بدا خەبەر
بێشك ئینسانە ئەو مەلەك نیە
فەرمان بەرداری ئەمری ڕەبییە
بێینە سەر بەحسی سیفاتی خودا
هەفتیان قەدیمن لەوی نین جودا
چی ئەو نەیخولقینێ هیچ مەوجود نابێ
هەموو چشتێك دەبێ خەلقی خودابێ
لە زەڕرە خاکێك تا چلو گیایەك
لە جوزئیاتێ تا پەلکە گەلایەك
قودرەتی خودای گەر لەگەڵ نەبێ
بە یەك نیم قەترەی پاك عەدەم دەبێ
پاکیان دەزانێ دەبیەو دەبینێ
چی تو خەیاڵکەی لەسەر زەمینێ
هەر بوەو بزانن کە بێ مەکانە
جێی نە لە ئەرزە نە لە ئاسمانە

هیچ مەکانی نەبوە، ئەو قەدیم بووە
ئیحتیاجی بە هیچ مەکان نەبووە
ئەلئان (کما کان) ئیحتیاج نیە
ئەگەر موحتاج بێ بۆ وی نەقسییە
گەر هەموو زی روح هەموو بەجارێ
لێی تەڵەب بکەن هەرییەك سوئاڵێ
بەجارێك پاکیان جێ بەجێ دەکا
هیچ پاشو پێشێ تاخیریان ناکا
پاکیان دەزانێ لێی غەڵەت نابێ
ئەگەر وا نەبێ، نابێ خودا بێ
حەییو زیندوە، هەرگز نامرێ
عالم بە ئەشیا هەرچە بگەرێ
سەمیعو بەسیر دەبیەو دەبینێ
لە دوورو نەزدیك لە ژێر زەمینێ
قادرو مورید، لە زۆرو لە کەم
چە حەزکا دەیکا لە خولقو عەدەم
ساحیب کەلامە نەك بەحەرفو دەنگ
یەك زاتێ لەتیف بی جیم بێ ڕەنگ
لە ژێر هەفت ئەرزان جێی جەهەنەمە
لەویش بەرەو ژێر، فەزای عەدەمە
وەك فەزای عەدەم، ئینتیهای نیە
زاتو سیفاتی، هەروەکو وییە
لە پێشی ئەودا هیچ مەوجود نەبوە
سەر پاك لە نەبوا وخەڵقی کردوە
هەرچی زی روحێ نەفەس هەڵێنێ
ئەو نەفەسە هەر ئەو دەیخولقێنێ
هەر لە بزوتنیان تا ساکن بوونیان
ختوراتی دڵ تا هاتوو چوونیان
خالقی خەیرە خالقی شەرە
خالقی نەفعە، خالقی زەرە
ئەو بێ شەریکە هەم بێ نەزیرە
بێ میسلو شیبهە هەم بێ وەزیرە
قەدیم هەر بووە ئەو ئەزەلییە
باقی هەر دەبێ ئەو ئەبەدییە
هیچ نەقسو تەغیر گۆران نابێ
هەر وەك بێ عەیبە هەردەبێ وابێ
ئێمەی خولقاندوە بۆ تاعەت کردن
نەك وەك حەیوانات بۆ خەوو خواردن
ناردی پێغەمبەر بۆ ڕێگەی ڕەحمەت
تەعلیممان بکا بۆ ڕێی هیدایەت
ناوی موحەممەد ئیبن عەبدوڵڵا
(اشرف الوری) ئەو (حبیب الله)
عەبدولموتەلیب باپیری وییە
باوکی ویش هاشم ئەو قورەیشییە
دایکی ئامینە بنتی وەهەبە
لە گەورە گەورەی نەسڵی عەرەبە
ئاباو ئەجدادی هەتا سەر ئادەم
گەورەی عەسربوون (اکرم فی اکرم)

لە مەککەی شەریف بە وەلەد بووە
هیجرەتی بۆ لای مەدینە کردووە
رەوزەی شەریفی لە مەدینەیە
دائیم ئاگای لە دونیا هەیە
سەدوبیستوچوار هەزار پێغەمبەر
خودا ناردوونی بۆ رێی خێرو شەر
باوەڕیان پێ بکەین هەموویان حەقن
ئەو گەورەترین جەمیعی خەلقن
پاکیان مەعصومن هەموویان پاکن
لە شەڕی عوسیان هەموو بێ باکن
سێسەدو شازدە لەوان ئەفزەلن
زیاتر لەوان و چەندیان مورسەلن
لەوانیش پەنجیان ئەفزەلترینن
ئەو (اولو العزم) ە (اغلام)ی دینن
نوح و ئیبراهیم، حەزرەتی موسی
عیسی روح الله، ئەحمەد موستەفا
سەرداری هەمویان (سید البشر)ە
یەعنی موحەمەد، شافیع مەحشەرە
لە پێش هەمواندا خەلقی کردوە
لە دوای هەمواندا ئەوی ناردوە
دینی ئەو ناسخ جەمعی ئەدیانە
مەعلوم ئەفزەلتر جەمعی دینانە
لەسەر وی خەتمە روتبەی ریسالەت
دین دینی ویە تا رۆی قیامەت
گەورەتری خەلق لە رووی دونیا
چوار یاری نەبی، یەعنی خولەفا
ئەبوبەکرو عومەر، عوسمان و عەلی
لە پاش وان جەمعی ئەسحابەی نەبی
قوران و ئینجیل، تەورات و زەبوور
سوحوف هەرچی هەن گەرکەم گەرزوور
مەجموعیان بێشك کەلامی خودان
ئەمما هەموویان نەسخن بە قوران
باوەڕیان پی بکەین مەلەکی رەحمان
دائیم مەوجوودن لە ئەرزو ئاسمان
بێ خەوو خواردن بێ کەسبو غەفلەت
دائیم مەشغوولن بە زیکرو تاعەت
هەر یەك بە نەوعێك هەر یەك بەکارێ
بێ ئەمری ناکەن بە هیچ قەرارێ
هەرچە پێغەمبەر خەبەری داوە
لە بابەت ئەمری دونیا و عوقباوە
هەرچە فەرمویە وەحی خودایە
هەر وەك فەرموویە بێشك هەر وایە
تا ئێرە فەرزە گشت کەس بیزانێ
باقی زۆر خەیرە هەرکەس بتوانێ
سوئالی قەبر عەزاب و نیعمەت
لە نالیو خۆشی دۆزەخ و جەننەت
قەبر بۆ سالحان رەوزەی جینانە
ئەمما بۆ فاسقان حوفرەی نیرانە
با خۆشی و رەحمەت یا دەردو میحنەت
هەرکەس نەبێ (عیك) تا رۆژی قیامەت
جەمعی زی روحان هەر وەك ئەووەل جار
زیندوویان دەکا، (واحد القهار)
ئینسان و مەلەك، جن و حەیوانات
پاك جەمع دەبن لە روی عەرەسات
ئەوسا سێسەد سال جێگەی هەیبەتە
گریان و زاری خۆف و دەهشەتە
جەمعی مەخلوقات حەتتا ئەنبییا
غەیر ئەز حەزرەت پاکی موستەفا
کەس یاری نوتق و دانیشتن نیە
ئەو رۆژە رۆژی نەفسی نەفسییە
مندال مەعصومە بێ دەردو میحنەت
سەریان سپی دەبێ لە خۆف دەهشەت
جەهەنەم حەلقەی لە مەخلوق داوە
رێی سەدسال دوورە لەهەرچوار لاوە
ئەمما کە حەملە بۆ مەخلوق دێنێ
بەعزێ هەلدەگرێ زۆردەیسووتێنێ
ئەوسا ئومێدی نەجاتمان دەبرێ
بە گرییەو هاوار عیلاجمان ناکرێ
هیچ نەفع نادا ئەولادو مالمان
مەگەر ئەو رەحم بکا بە حالمان
عارەق دێتە خواردوکەل هەلدەگرێ
بە قەدەر گوناه ئەعزا دا دەگرێ
هەتا شەفاعەت دەکا پێغەمبەر
رەحمەت دەرژێنێ خالیقی ئەکبەر
لە جێگای هەیبەت نەجاتمان دەدا
لە پێشدا حەشری حەیوانات دەکا
ئەوجا کاغەدی ئەعمالمان بۆ دێنێ
نوقتە بە نوقتە پێمان دەخوێنێ
هەرکەس چا بێ شوکری خوا دەکا
ئەگەر خراب بێ لێی حاشا دەکا
ئەوسا لال دەبێ مۆر دەکرێ زوبانی
لێی دەبنە شاهید پاك ئەعزای گیانی
وەی وەی واوەیلا لەو خەجالەتە
لەو خۆف و دەهشەت لەو نەدامەتە
هەرکەس زولمێکی لە کەس کردبێ
لوقمە نانێکی بێ ئیزن خواردبێ
گەر ئیحسان بێ بۆی لێی دەستێنن
گەر نە لە جیاتی دەیسووتێنن
میسقالە زەررە لە خەیرو لە شەر
هیچ بزر نابێ پاك دێتە دەفتەر
بە میزانی حەق موقابیل دەکرێ
چی چاك چە خراب پاداشتیان دەدرێ
هەرکەس کافر بێ بەو حال مرد بێ
یا شەیتان سەلبی ئیمانی کرد بێ
ئەوان حیساب و پرسیاریان نیە
جێی وان جەهەنەمە بە ئەبەدییە

باقی موسڵمان چی گونا کاران
لە گوناهیان خەجاڵەت بارن
پێغەمبەر بۆیان شەفاعەت دەکا
بەعزێ بێ شەریك رەحمیان پێ دەکا
لە پردی سیرات بە سەد دەردوغەم
دەرۆن دەکەون لە ناو جەهەننەم
نعوز باللە لەو بەد بەختییە
لەو دەردی میحنەت تەنگو سەختییە
ئەووەل بە قوولاب ئاگرین دا دەگرێ
وەك گۆشتی قەساب پێی هەڵدەواسرێ
حەتتا دەسووتێ قەلب دا دەرزێ
ئێسقان و پۆستی هەموو هەڵدەکزێ
سەرپاك دەسووتن دەکەونە خواری
دوبارە دەیکەن وەك ئەووەڵ جاری
لە ئەووەڵ دەفعە خەیلێ زیابێ
عەزابیان دەدرێ مردنیان نابێ
مارو دوپشکی لە گشت خراپتر
خەلقی کردوون سەرپاك لە ئاگر
هەریەکە بەحرێك زەهری تێدایە
هەرکەس پێوە دەن بۆی واوەیلایە
هەفتا هەزار ساڵ دەسوتێو ژان دەکا
لەو دوا دەرزێ لێی سەیلان دەکا
تەوق زنجیریان لە گەردەن دەکرێ
هە رۆژ بە نەوعێك عەزابیان دەدرێ
ساعەت بە ساعەت لێی زیاد دەکرێ
مردن زۆر خۆشە هەرگز نامرێ
هەرهاوار هاوار هەر واوەیلایە
هیچ کەس بەزەیی بە کەسدا نایە
خواردنیان زەریع، قورسی زەقومە
تێیدا دەمێنێ لە تەنگ حەلقومە
نە دەچێتە خوار نە بۆی دێتە دەر
هەر هاوارییە ئاوم بێتە سەر
فەورەن زوبانی ئاوی بۆ دێنێ
دەیخۆن ناوزگیان دادەرزێنێ
بە حسی عەزابیان نایەتە تەقریر
بۆ خۆی فەرموویە وە (بئس المصیر)
هەرکەس ئەزییەتی خەلقی زۆر دابێ
بۆ زوڵمی مەخلوق زۆر تێکۆشابێ
زۆر زۆر زەلیلە خەیلێ بەد بەختە
زیاتر لە هەمووان عەزابی سەختە
ئەوجار زۆر دەگرین زۆر شکور دەکەن
تا هەفتا هەزار ساڵ واوەیلا دەکەن
هەزار ساڵ دەڵێن (یا الله)و (رحمن)
رەحمیان پێ دەکا (خالق منان)
تا جبرائیل دی بزانە ئەو ئەحواڵە
دەپرسن کێیە ئەو نورو جەماڵە
دەڵێن جبرائیل ئەمینی داوەر
کە خودا ناردویە بۆ لای پێغەمبەر

ئەوسا کە ناوی پێغەمبەر دەبەن
بە جارێك پاکیان هاواری دەکەن
بە خودا خرابە تەنگی ئەحواڵمان
یارسول الله بێ لە هاوارمان
جەمع ئەنبیا لە گەل پێغەمبەر
شەفاعەت دەکەن دەیانهێننە دەر
هەرکەس شادەتی بە حەق هێنابێ
بەو حاڵە مردبێ ئەبەدی نابێ
پاکیان دێننە دەر نەجاتیان دەدەن
ئەوجا داخلی جەننەتیان دەکەن
مەدحی بەهەشتی نایەتە گوفتار
(جنات تجري تحتها الانهار)
هەرکەس تەڵەب کا مەقسود لەم دونیا
لەو دونیا روتبەی تەنەزول دەکا
هەرکەس لەم دونیا عەمەلی چابێ
لەو دونیا دەبێ جێگای باڵا بێ
بەعزێ یاقووتە یا مرواریيە
بەعزێ غێر ئەز خوا نازانن چییە
سافە دیواری وەك بلوور پاکە
لە هەموو قەسراندا تەختی گەوهەرە
هەرییەك هەفتاد حور یەکسەر حازرە
شاخی درەختیان درو یاقووتە
پەلکیان پیرۆزە عەینی زمرووتە
نە وشکی پایز، نە ساردی زستان
نە خزمەت کردن رەنجی باغەبان
هەموویان خۆش و عەینی لە زێڕن
خۆشرەنگ و خۆش بۆ تازەو تەمیزن
ئەنواعی میوە جەمع مەتعومات
حەلواو گۆشت و رۆن هەم نوقڵ و نەبات
تا لێیان بخۆی کەم نابێ لێیان
فەورەن یەکێکی تر دێتەوە جێیان
چوار جۆگەی تێدا یەکیان هەنگوینە
یەك شیری سافە عەجەب شیرینە
یەکیان (شرابا طهور)، یەك ئاوی خۆشە
ئەترافیان سونبول لالەو وەنوشە
لە سەر درەختیان تەیران دەخوێنێ
گۆشتی هەر تەیرێ تومەیلت دێنێ
بە پوختە کراوی بۆت دێ تێر دەخۆی
لە پاشان دەفرێ دەچێتە جێی خۆی
لە هەر تەعامێ وەقتێ تێر دەخۆی؟
جامێك شەرابی لەسەر نۆش دەکەی
بە عارەقی خۆش بۆ وەکو عەنبەر
لە پاك بە دەنت بۆ خۆی دێتە دەر
گشت موسلمانێ بەقەد روی دونیا
ئەو موڵك و ماڵە خودا پێی دەدا
هەموویان جوانن پاك چواردە ساڵن
بێ ریش و سمیل شیرین جە ماڵن
هەرییەك هەفتا حوری هەیە بۆ لەزەت



پێنج سەد غولامیان هەیە بۆ خزمەت
دائیم هەر کچن جەمعی حوورییان
( لم یطمثهن انس ولا جان )
گەر ئاوی دەمیان بێتە بەحری تاڵ
پاك شیرین دەبێ وەك ئاوی زولاڵ
گەر یەك لەوان دەست لە دونیا زاهیر بکا
شەوقی مانگ و ڕۆژ چەنگ بەتاڵ دەکا
هەریەك هەفتاد نەوع لیباس لە بەردا
ئەنواعی خشڵ و زیوی لە سەردا
چاو ڕەش و بۆن خۆش گەردن فیرازن
خۆش خولق خۆش ڕەو شیرین ئاوازن
چەند نازەنینن عەجەب جوان چاکن
لە حەیز و نیفاس هەموویان پاکن
ساحیب عیشوە و ناز نازك ئەندامن
قامەت عەرعەرن شیرین کەلامن
ئەندامیان سافە وەك شیشە و بلوور
مەغزی لولاکیان دەبینی لە دوور
هیچ بوغز و کینە تەشویش نازانن
مەجموعیان عاشق مێردی خۆیانن
لەگەل مێردیان ئیستیمتاع دەکەن
لە ساعە تێکدا صەد جیماع دەکەن
پیری و نەخۆشی، مردن نامێنێ
ئەو موڵك و ماڵە کەس لێی ناسێنێ
هەر ڕۆژی جومعە زیافەت خودایە
خەلعەتی ڕەزا فەیزی لیقایە
مەدحی بەهەشتی قەت تەواو نابێ
مەسڵەحەت وایە ئەمجار کوتا بێ

**تمت شد في سنة (١٣٣٠) هـ في خانقاه شيخ خضر بد ست سيد حسين، اللهم اغفر لكاتبه.**

**سەرچاوە:**

**(١) گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٧٥)، ساڵی (١٩٧٩)، لاپەڕە (٢٥).**

## * لەتیف هەڵمەت وەکو شاعیرێکی نوێخواز:-

شاعیرێکی وەکو لەتیف هەڵمەت، پێویست بە ناساندنی ناکات، چونکە، ئەو لە تەك شێرکۆ بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێودا یەکێ لە پایەکانی شیعری نوێی کوردی داگیر کردووە.



بۆیە لەتیف هەڵمەت لە گێرانەوەی یاداشتەکانی خۆیدا ئاوها لە ئەزموونی شیعری دەدوێت:-

– منداڵێکی هاروهاج و لاسار بووم... هەمیشە خەریکی شەڕەبەرد بووم، جارێکیان سەری هاورێیەکی منداڵی هاوتەمەنی خۆم شکاند، ناوی نوری خەلیفە مەجید بوو... برادەرێکم کە ناوی بەهزاد قادر بوو پێی وتم: نورییان بردووە بۆ خەستەخانە، سەتڵێك خوێن لەسەری هاتووە... بەڕاستی زۆر ترسام... بەڵام هەرگیز ئەو ترسە وای لێنەکردم کە ئیتر شەڕ نەکەم... بەڵکو لاسارتر بووم و بەردەوام بووم لەسەر یارییەکی بەردهاوێشتن کە پێیان دەوت " تیل بەرانبەرکێ"، لەو یارییەدا سەرو چاوی زۆر برادەرم خوێناوی کردووەو زۆر جاریش سەری لووت و چەناگەی و دەم و چاومیان خوێناوی دەکرد... جگە لەوەش هەر نزیکی گەڕەکەکەمان شارە زەردەواڵەیەك ببوایە من قامیشم تێ دەئاخنی، زەردەواڵەکانم دەورووژاندو بە تەختەیەکی پانی دەسکدار کە خۆم دروستم دەکرد زەردەواڵەکانم دەکوشت... هەروەها بە شیشی ئاسن و لاستیکی توندو تۆڵ تیرو کەوانم دەکردو لەگەڵ منداڵانی گەڕەکدا بەو جۆرە تیروکەوانە بەرامبەرمان لێکدی دەگرت و شەڕە تیرمان دەکردو زۆرجاریش لاسایی ڕۆستەم و زۆرابم دەکردەوە و قوتویەکی بەتاڵی دۆشاوی تەماتەم کون دەکردو سەری گوریسێکم پێوە دەبەست و لەگەڵ منداڵانی گەڕەکدا شەڕە گورزمان دەکرد. بیرمە جارێکیان لەگەڵ سمایلی عەزیز ئاغای زەنگەنەدا کە منداڵێکی هاوتەمەنی خۆم بوو، بە شەڕە گورز چووینە دەرەوەی شارو کەسمان کۆڵمان نەداو خەریك بوو بەو سەرە قووتوانە مێشکی یەکدی بپرژێنین، باش بوو هەندێ پیاوی ڕیشسپی سەرزەنشتیان کردین و یارییەکەیان پێ تەواو کردین.. هەروەها زۆرجار شمشێری تەختەم دروست دەکردو لەگەڵ هەندێ لە منداڵانی گەڕەکدا شەڕە شمشێرم دەکردو زۆر جاریش کۆلارەم هەڵدەدایە ئاسمان و فەنەرم پێوە دەکرد جارێکیان چۆلەکەیەکم لە منداڵێك کڕی و بەستم بە داری ناوەڕاستی کۆلارەکەوەو هەڵمدا بۆ ئاسمان و ڕەشەبا دەزووی کۆلارەکەمی پچڕاندو کۆلارەکەم با بردی و ئیتر نەمزانی و نازانم چۆلەکەکە چی بەسەر هات! ئێستاش هەر بەداخەم بۆی.

زۆر جار لە ماڵەوە خوێ و دەنکە شقارتەم دەکردە ئەو جگەرانەوە کە بۆ میوان دادەنران و ئیتر دەنکە شقارتەکەو خوێیەکە دەتەقییەوەو دایکم دەیگوت بەخوا ئەمە ئیشی سەگە هارەکەیە... ئیشی لەتیفە... ئیتر ڕامدەکردو کاتێك دەهاتمەوە توورەیی هەموویان سارد ببۆوەو ئینجا ڕوداوەکەیان وەکو نوکتە دەگێڕایەوەو دەیانگوت باشە تۆ چۆن ئەم کارە دەکەیت و ناترسێت چاوی یەکێك کوێر بێ یا دەموچاوی بسووتێ...

جارجاریش تەپاڵەو پشقلم بە دەسك و هاوان ورد دەکردو زۆر بەجوانی وەکو توورتنی لێ ئەهات لەگەڵ هەندێ توتندا دەمکردە قامیشی جگەرەوەو دەمخستە ناو ئەو جگەرانەوە کە دایکم بۆ میوانە ژنەکانی دادەناو کە دایان دەگیرساند ڕوویان دەکردە دایکم و دەیانگوت: شێخ ژن یاخود دەیانگوت: خاتوون سەعدییە وەڵا ئەم جگەرەیە زۆر ناخۆشە... ئەویش دەیگوت: بەخوا سەگەکە، لەتیفی کوڕم، دەستکاری کردەوە شتێکی پیسی هەر تێکردووە.. هەروەها هەندێ جار خوێم دەکردە ناو قوتوی شەکرەکەمانەوەو ئیتر کەس نەیدەتوانی چایەکە بخواتەوەو دەیانزانی منم و سەرزەنشتیان دەکردم..

شتی دیکەشماوە لە هاروهاجێتی و لاساری و چەتوونی سەردەمی منداڵێتیم با بمێنێ بۆ چاوپێکەوتنێکی دی... بە کوێرایی چاوی ناحەزەکانم لە هەشتا ساڵ کەمتر ناژیم کات زۆرە بۆ باسکردنیان.

کە منداڵ بووم... فەرهاد شاکەلی لە لادێیەکی نزیکی کفری بوو.. جگە لەوەش من نزیکەی چوار ساڵێك لەو گەورەترم... من لە ناوەندی شەستەکاندا لە قوتابخانەی ناوەندی کفری فەرهادم ناسی و لەوێوە هاورێتیمان دەستی پێکردو شایانی لەبیر نەچوونە ئێمە شیعرو خۆشەویستی وشەو وێژە، کردینی بە هاورێ و ئیتر هەر لەو دەمەوە بیرمان لەوە کردەوە کودەتایەك لە شیعری کوردیدا بکەین و گەلێ یادگاری خۆش و ناخۆشم لەگەڵ فەرهاددا هەیە، خۆشترینیان ئەو نان و شەربەتەیە کە بە دەفلس لە لای "حاجی زباله" شەقامی ڕەشید لە بەغدا دەمانخواردەوە. بەڵام لەتیف حامید خەڵکی چەمچەماڵ بوو.. دایکمان خوشك بوو، باوکمان برا... واتا ئامۆزاو پورزا بووین... لەتیف حامید نزیکەی دە ساڵێك بگرە دوازدە ساڵێك لە من گەورەتربوو. لە بیرمە من زۆر منداڵ بووم لە ناوەندی ساڵانی پەنجای سەدەی بیستەمدا لەگەڵ مام و پورمدا هاتن بۆ کفری و لەبەرئەوەی لە چەمچەماڵ ئامادەیی نەبوو، لەتیف حامید لە ماڵی ئێمەدا

ژوورێکی بۆ ساز کراو قوتابخانەی ئامادەیی تەواو کردو لە زانکۆی بەغدا وەگیرا... ئەو دەمە شەشی ئامادەیی نەبوو. قوتابی لە دوای پێنجی ئامادەیی لە زانکۆ وەردەگیرا...

خۆشترین یادگاری مندالیم لەگەڵ لەتیف حامیددا ئەوە بوو ژوورەکەی خۆی بە جۆرە کاغەزێکی گەورەی ڕەنگ خەنەیی دەرازاندەوەو منیش کە ئەو لە ماڵ نەبووایە دەچووم کاغەزەکانم لە دیوارەکانی ژوورەکەی دەکردەوەو دەمکرد بە "کۆلارە"و "مێش گرە" و کەشتیو بەلەمی شمشێردارو بەرگە کتێب.

لە ساڵی (١٩٦١ - ١٩٦٢) زانکۆی بەغدای تەواوکردو لە بەسرا لە ناحیەی المعقل - ئەلمەعقەل- بە مامۆستا دامەزراو ئەو دەمەی زانکۆ لەتیف حامید لەگەڵ مامۆستا کەمال غەمباری نووسەرو شاعیردا هاوڕێیەتی خۆش بوو.. هەروەها لەگەڵ هاوڕێیەکی دی زانکۆی دا کە خەڵکی کفری بوو. ناوی مامۆستا جەلال حوسێن قەرەداغی بوو، کە ئێستا لە هەولێر دەژی...

لەتیف حامید لەو سەردەمانەدا لەگەڵ ئەو برادەرانەیدا خەریکی کاری سیاسیو کوردایەتی بوون... لەتیف حامید لەسەر کوردایەتی ... فەرمانی گرتنی بۆ دەرچووبوو لەلایەن دەزگای پۆلیسی ئەوسای چەمچەماڵەوەو حەزی دەکرد ماوەیەك لە کفری خۆی بشارێتەوەو کاری سیاسی بکات.. بەڵام لەوێش ناسراو بەرلەوەی بگیرێ پۆلیسێکی دەروێشی باوکم بە باوکمی گوت: ئەو خزمەت کە لە ماڵتاندایە قاچاغەو ئەگەر نەڕوا دەیگرنو ئیتر لەتیف حامید چوو بۆ شاخ. وابزانم هەتاوەکو ساڵی دووبەرەکییەکە نەهاتەوە... من لە بیرم بێ لە ساڵی ١٩٦٧دا هات بۆ ماڵمان ئیتر لە سیاسەت بێزار ببوو... لە هەولێر وابزانم لە (ناوەندی زازا) وەکو مامۆستا دامەزرابوو... ئیتر هەندێ جار کاتی پشووی هاوین یا پشووی سەری ساڵ، لەگەڵ شوکرییەی خێزانیدا کە خوشکم بوو چەند ڕۆژێك یا چەند هەفتەیەك لە ماڵی ئێمە لە کفری دەمانەوە.

هەر لەو میواندارییانەوە بەهۆی منەوە لە کفری ناسیاوی و دۆستایەتی لەگەڵ ئەحمەد شاکەلیو فەرهاد شاکەلیدا پەیدا کردو ئیتر بە یەکجارەکی جیهانی سیاسەتی تەڵاق داو ژیانی خۆی بۆ ئەدەبو ژیرۆك تەرخان کردو وەکو تیۆریستێکی شارەزای بواری نوێگەری لەو سەردەمەدا کەوتە نووسینی چیرۆكو لە پێشدا بە عەرەبی دەینووسی، چونکە خۆی مامۆستای عەرەبی بوو..لە هەولێر مەحمود زامدارو د.عەبدوڵڵا حەداد قوتابی ئەو بوون، بەڵام نازانم لە چ قوتابخانەیەكو مامۆستایەکی هەولێریش هەبوو زۆر برادەری بوو زۆر باسی دڵپاکی ئەو مامۆستایەی دەکرد ناوی حەیدەر هەمزە بوو... لەبیرمە کە لەتیف حامید لە پێشدا بە عەرەبی دەینووسی تازە گوڤاری "الف باء" ی عێراقی پەیدا ببوو لە دەورووبەری کۆتایی ساڵی (١٩٦٨) بوو بابەتو چیرۆکی خۆی دەنارد بۆ ئەو گۆڤارە، بەڵام بڵاویان نەدەکردەوە...

وابزانم پۆستە نامەو بەرهەمەکانی نەدەگەیاندە جێگای خۆیو ئیتر لەتیف حامید چەند ساڵێك دوای ئەوە کەوتە بە کوردی نووسینو بەرهەمەکانی لە ڕۆژنامەی هاوکاریو گۆڤاری بەیاندا بڵاودەکرایەوەو لەو سەردەمەدا پێشەنگایەتی نوێگەرێتی لە بواری چیرۆکدا بۆخۆی تۆمار کرد.

لە ساڵی پەنجاو هەشتەوە ئەگەرچی منداڵ بووم کەوتمە خوێندنەوەو هەر خۆم بووم بە مامۆستای خۆم بە زۆر خۆمم فێری خوێندنەوەو نووسینی کوردی کردو لە (٢٤ئابی ساڵی ١٩٦٣) یەکەم هۆنراوەم بۆ پۆلێ پێشمەرگەی قارەمان نووسی کە لە شەڕێکی دەستەویەخەو سوونی تاقدا بەدەستی عەفلەقییە فاشستو گومراکان شەهید کرانو ببون بە ئەستێرەی پرشنگدار بە چیاکانی کفرییەوە... بێگومان شیعرەکەم لاواز بوو... بەڵام کەفو کوڵو جۆشو خرۆشی لاوێتیم بوو دەربارەی ئازایەتی گیانفیدایانی نەتەوەکەمو لاوانی جوامێری کوردستانەکەم، لە چەند جێیەکدا هەندێ کۆپلەی ئەو شیعرەم بڵاوکردووەتەوەو ئەو شیعرەم زۆر خۆش دەوێو لە بواری ژیانی وێژەییدا خۆم بە قەرزاری ئەو نۆبەرە شیعرییەم دەزانمو دەشێ ئەگەر ئەو ڕۆژە ئەو شیعرەم نەنووسیایە نەبوومایە بەم شاعیرەی ئێستا.

با ئەوەش بڵێم شاعیرێتی زۆر زەرەرو زیانی ماددی لێدام... هەر بۆ نموونە ... لە زەمانی بەڕێوەبەرێتی بەڕێز مامۆستا جەمال باباندا هەتا لە دەزگای ڕۆشنبیریو چاپو بڵاوکردنەوە بە هەوڵو کۆششی مامۆستایانی خوالێخۆشبوو موحەرەم موحەمەد ئەمینومستەفا نەریمان بە هەڵەچن لە هاوکاریو بەیان دامەزرام قیر سپی بوو.. لە پڕ بەڕێوەبەر گۆڕاو عوسمان فایەق هاتو بووە بەڕێوەبەری دەزگاکەو لەبەر ئەوەی بە خواستی ئەو نەمدەنووسی، باسی ئەو کودەتا ڕەشانەم نەدەکرد کە ئەو عاشقیان بوو، لەبەر ئەوە لە دەزگاکە فەسڵی کردمو پارەی ئوتێل "کاسب"م نەبوو بیدەمو قەرزاری بوومو برای بەڕێزم شاعیری نویخوازی گەورە نەژاد عەزیز سورمێ پێی وتم بێ پارەیی گەورەییە بۆتۆ لەم زروفەداو حەزدەکەم من پارەکەت بۆ بدەم... بەڵام باش بوو دوایی بە یارمەتی شاعیرو نووسەرو ڕۆژنامەنووس برای بەڕێزم کاك عەباس بەدری.. لە ڕۆژنامەی عێراق لە بەغدا بە موحەریر دامەزرامو سەرنووسەری ڕۆژنامەکە بەڕێز مامۆستا سالح حەیدەری زۆر ڕێزی گرتمو مرۆڤێکی کوردپەروەرو دیموکراسی بوو جۆری نووسینی بەسەردا فەرز نەدەکردین...

بەداخەوە دوای ئەو سەلاحەدین سەعید ناوێك بوو بە سەرنووسەرو پێی گوتم تۆ خائینی دژی حکومەتی عێراقیتو ئەگەر هەتاکو دوو ڕۆژی دی ستایشی ئەم باردودۆخی عێراقو حکومەتو چیو چی نەکەی تەسلیمی دەزگاکانی ئەمنت دەکەم منیش زۆر زۆر ترسامو ئیستیقالەم داو ڕامکرد بۆ سلێمانیو بەبێ ئیشو کار مامەوە.. تا دوای ماوەیەك بە هەوڵی هەندێ لە نووسەران جارێکی دی لە گۆڤاری بەیانو هاوکاری دامەزرامەوە ئەو کاتە خوالێخۆشبوو ئیسماعیل ڕەسوڵ بەڕێوەبەری دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی بوو... ئەویش مرۆڤێك بوو دڵپاكو بێ ڕقو کینەو بابەتی نووسینی بەسەر کەسدا فەرز نەدەکردو ئیتر لەوێ مامەوە تا ڕاپەڕینو ئیتر دوای سەرنەگرتنی وت ویژی سەرکردایەتی سیاسی کوردو سەرانی عەفلەقی گەڕامەوە بۆ

سلێمانیو لەگەڵ گەلێ لایەندا وەکو ڕۆژنامەنوسی بێلایەن کارم کرد.

هەر بۆ نموونە لە ڕۆژنامەیەکدا کە پاسۆك دەری دەکرد هەروەها لە ڕادیۆی "حسك" و تەلەفزیۆنی گەلی کوردستانو هەفتەنامەی هەرێمی کوردستانو هتد، کاتێکیش بنکەی گەلاوێژ دامەزرا من یەکێك بووم لە دەستەی دامەزرێنەر کە بنکە گۆڤاری گەلاوێژی نوێی دامەزراند من یەکێك بووم لە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکەو کاتێکیش برای بەرێز کاك شێرکۆ بێکەس لە سوید گەڕایەوە... دەزگای چاپو پەخشی سەردەمی دامەزراند پێی ڕاگەیاندم کە من ئیتر لای ئەو دەوام ئەکەمو منیش هەفتەیەك لە دەزگای سەردەم دەوامم کردو دوای هەفتەیەك، شێرکۆ بێکەس لە ڕێگەی ئازاد بەرزنجییەوە پێی ڕاگەیاندم کە ئیتر دەوام نەکەمو لە دەزگای سەردەم دەری کردمو ئیتر بەبێ ئیشو کار مامەوە... بەڵام باش بوو بۆ مێژوو دەیلێمو ڕێبابازیو ڕووپاییو ماستاوم بۆ کەس نەکردووە ناشیکەم، بۆ مێژوو دەیلێم: مەلا بەختیار کەینو بەینی زانیو ناردی بە دوای منو عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجیداو وتی لەناو خۆتاندا ڕێککەون یەکێکیتان سەرنووسەر بنو ئەوی دیتان بەڕێوەبەری نووسینو ئیتر ئەوە بوو بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری گەلاوێژ بووم تاوەکو پرۆسەی ئازادی.
کاتێ کەرکووك ئازاد کرا برای بەڕێزم مامۆستا شێخ موحەمەد شاکەلی متمانەی ئەوەی پێ بەخشیم کە لە کەرکوکی پایتەختی کوردستاندا پۆستی سەرنوسەرێتی گۆڤاری (بانە ڕۆژ)م پێ ببەخشێ کە کۆمەڵەی ڕووناکبیریو کۆمەڵایەتی کورد لە کەرکوك دەریدەکاتو بەم شێوەیە منی شاعیر سێ جار لەسەر شیعر نان براو بووم...

ئەی شیعر کچۆڵە جوانەکە.

ئەی ئەو کچۆلە نازدارەی کە هەرگیز پیر نابی...

دڵنیابە من گەورەترین عاشقی تۆمو هەرگیز دەسبەردارت نابم.

تەریقەتی قادری خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە نوێکاری ژیانی ڕۆحیو شیعریش زۆر پەیوەندی بە بارودۆخی ڕۆحو دەروونەوە هەیەو لە تەریقەتی قادریدا گەلێ جۆری دوعاو دابو ڕەسمی نەخۆش چاککردنەوە هەیە بە تایبەتی ئەو نەخۆشییانەی کە پەیوەندییان بە دەروونی مرۆڤەوە هەیە، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیشەوە زانستە دەروونییەکان ئەویان سەلماندوە کە لە تواناادا هەیە بە خوێندنەوەی شیعر گەلێ نەخۆشی دەروونیو نەخۆشی دی ترسناك چاك بکرێنەوە.. بەڕاستیش هەندێ دابو نەریتو ڕەسمی ڕۆحی لە ئەفسانە دەچێو من توانیومە هەندێ لەو بارودۆخی ڕۆحە بە شێوەیەکی نوێ لە شیعرەکانمدا بچێنمو خوێنەری پێ سەرسام بکەم... پاش ئەوەش ئەم باسە کتێبێکی دەوێ باشتر وایە خۆت شیعرەکانم بخوێنێتەوە.

ئەوەی شارەزای تەواوی کەلەپووری ئیسلامی نەبێ، ناتوانێ کاریگەری قورئانی پیرۆز لە شیعرەکانمدا دەستنیشان بکات... من بە جۆری پۆزەتیڤ و نەگەتیڤ لەگەڵ گەلێ ئایەتی پیرۆزی قورئاندا دەقانگیریم دروستکردووەو توانیومە لە سایەی بازنەی ئەو دەقە پیرۆزانەدا جۆرە دەقێکی شیعری بنووسم... جۆرە دەقێکی نوێو ئەم کارەم هەر لە" خواو شارە بچکۆلەکەمان "ەوە تاوەکو دوا بەرهەم بە جۆرێك لە جۆرەکان ڕەنگی داوەتەوەو بەرجەستە بووەو بووەتە شێوازو دەنگی تایبەتی خۆم...

من ڕوانگەیی نیمو پەیوەندیم بە ڕوانگەوە نییەو من یەکێکم لە سێ کوچکە نویخوازەکەی گرووپی کفری کە بریتی بوو لە "ئەحمەد شاکەلیو فەرهاد شاکەلیو خۆم" ئێمە جوگرافیاو بایەلۆژیاو ئەنتۆلۆژیاو قسەلۆژیاو گاڵتەلۆژیای شیعری کوردیمان گۆڕی.

نازانم بۆ ... من لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوویدا توولەك بوومو لەناو دەنگی گوللەو تۆپو فڕۆکەدا باڵق بوومو کەوتمە دڵداری لەگەڵ شیعرو لەگەڵ کچی جوانیشدا، ئیتر نازانم بۆ زۆربەی شیعرە دڵدارییەکانیشم تووڕەنو بۆنی ئاگریان لێ دێ...

* سەبارەت بە خاتوونی خانەقینی (ا – ح) کە کارێکی زۆری کردە سەر ئەزموونی نووسینی شیعری من.

ڕاستە ئەو لە ناوەندی حەفتاکاندا بوو... بەڵێ دەورێکی باڵای بینی لە شیعرمداو ئەشقی ئەوسای ئەو وای کرد ناوی ئەلوەن بچێتە شیعرەکانمەوە... هەروەها ناوی دیجلە، چونکە هەندێ جار ئێواران لەسەر کۆڕنیشی دیجلە پێکەوە دادەنیشتین یا پیاسەمان دەکرد.

بەڵێ دیوانی " پرچی ئەو کچە"م پێشکەش بەو کردووە... ئەو ئافرەتێکی داهێنەرو ستەمدیدەیەو کەس بەر لەو باسی سەربەستی ئافرەتی نەکردووە...

عەشقو خۆشەویستی شاعیرانە برینی نییە، بەڵکو داهێنانی هەیە.. ئەو کچە ئەوسا سەرچاوەی داهێنانم بوو.. با شتێکی دیشت پێ بڵێم هەر ئەو ساڵانە کچێکی دی خانەقینی بەناو (ح – ر) کاریگەری زۆری لەسەر شیعرەکانم هەبوو گەلێ نامەی جوانی لە لامە.. کاریگەری زیاتر لە دیوانی" سروودی هەژاران"و" ئەم ڕووبارە وشك ناکات" دا ڕەنگی داوەتەوە... ئەم عاشقەم کچێکی خانەقینی بوو لە زانکۆی سلێمانی دەیخوێند، هەندێ لە برادەرانم ئاگادار بوونو لەوانە براو شاعیر کاك هەڤاڵ کوێستانیو د. تاریق جافو هتد... سوپاس بۆ خانەقینو ڕووباری ئەلوەند کە شیعری نەمرو عەشقی نەمریان پێ بەخشیوم.

سێ کوچکەو چوار کوچکە لە شیعردا نییەو لە ساڵانی حەفتادا دوو گرووپی نویخواز هاتنە ئاراوە گرووپی کفریو گرووپی ڕوانگەو لەناو ئەم دوو گرووپەو دەرەوەی گرووپەکاندا کۆمەڵێ شاعیری ڕێچکەشکێن جڵەوی شیعری نوێیان گرتە دەستەوەو گەلێ شاعیری دیش هەن دەوری باڵایان لەو بوارەدا دیوە.. بەڵام من لاف ئەوە لێدەدەم کە لە دوای قۆناغی"گۆران" کەسی پێش من بیری لەوە نەکردووەتەوە ڕچەی شیعری کوردی بشکێنێو کەس پێش من بانگەشەی نویخوازی نەکردووەو شیعری ڕچەشکێنی نەنوسیوەو چی دەڵێن بڵێن، یەکەم پاچ من دام لە دیواری کۆنو یەکەم بەردی بناغەی نوێگەری من دامناوە..

چۆن ئێمە کۆمەڵی مەدەنیمان هەیە.. هەتا مەسئولێك بە حیمایەوە لە ماڵ بنوێو لە ماڵ بێتە دەرێ، باسکردنی

کۆمەڵگای مەدەنی ورێنەیەو هێلکەی کەڵەشێرو نۆمای هێستره.. کۆمەڵگای مەدەنی چی! ئێمە کۆمەڵگای چەکەمەنی و درۆمەنی و کوشتنەمەنی و هەرەشەمەنی و تەقەمەنین.. هەر عەیبە داوای شیعرێکم لێ دەکەی لە ئاستی کۆمەڵگای مەدەنیدا بێ. بۆچی من دارتاشم جۆلانێ و دەرگا و پەنجەرەو پەیژەت بە خواستی خۆت بۆ بتاشم! من شاعیرم... شیعر هەر بە قسەی خۆی دەکات... شیعر دیکتاتۆره... مەبەستم شیعری رەسەنە" گوێ لە قسەی کەس ناگرێ...و سەر بە هیچ کۆمەڵگایەك نییەو سەر بە سیستمی جوانی و داهێنانەو هاووڵاتییەکی بێ ناسنامەو بێ نیشتمانەو هەمیشە حەزی لە سەفرە.

خۆر بۆ کێ هەڵدێ و باران بۆ کێ دەبارێ و گوڵ بۆ کێ دەڕوێ منیش شیعر بۆ ئەو دەڵێم.

سۆفیگەرێتی هی من نییەو ئەگەر نازانی یەکەم شیعر... شیعری سۆفیگەری بووە... چونکە مرۆڤ کە لە زەویدا لە دیاردەکانی سروشت ترساوە لە ناخی خۆیداو لە ناخی گەردووندا بۆ ئەفرێنەری گەردوون گەراوەو لەو گەرانەدا یەکەم شیعری سۆفیگەری لەدایکبووەو ئەگەر ئێمە ئێستا ئەو دەقەمان لە دەستدا نەبێ دەتوانین بڵێن داستانی گەلگامیش شیعرێکی شاکاری سۆفیگەرییەو هەموو خەسڵەتەکانی سۆفیگەرێتی لەو داستانەدا هەیەو زمانی سۆفیگەری ئەمرۆ سبەینێش هەر نوێ یە!

لە کۆتایی شەستەکاندا پێشمەرگەی جەلالی بووم... ئامر هێزەکەمان شەهیدی سەرکردە عەلی عەسکەری بوو.. ئامر بەتالیۆنەکەشمان عەلی سەلیم بەگ بوو.. ئیدارەش برای بەرێزم کاك عەلی بچکۆل دەیبرد بەرێوەو دەتوانن لێی بپرسن چەند چاونەترس و بزێوو دلسۆزو شاعیر بووم...

دووەمیش: وەکو مام جەلال خۆی بە ئامادەبوونی برایانی بەرێز جیهاد دلپاك و جەلیل زەنگەنەو کێ و کێ باسی کرد، سیاسەتمەدارو ڕووناکبیری گەورەی کورد ئیبراهیم ئەحمەد بە مام جەلالی گوتبوو شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت لە شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس شیعرترو قوڵترو ماناداترن... ئەمەش دەوری هەبوو لەوەدا کە مام جەلال بانگم بکات و ڕێزم لێ بنێ، ئەوە بوو بەرگی یەکەمی دیوانەکەی بۆ چاپ کردمو کاك حەمید ئەبوبەکر سەرپەرشتی لە چاپدانی دیوانەکەمی کردو بە جوانی و قەشەنگی لە چاپی دا. مام جەلال وەعدی دی دامێ، بەڵام نەیهێنایە دی... وەڵا وە بیلاهی وەعدی سەفەری وڵاتانی عەرەبیم بۆ ساز کات بەڵام وابزانم شاعیرە بەکرۆکەکان نەیانهێشت.

هەر لەسەرەتاوە شاعیرو ڕۆژنامەنووس بووم، لە حەفتاو چواردا لە ڕۆژنامەی برایەتی دامەزرام و دوای پیلانی ئەلجەزائیر لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا دامەزرام و لە ساڵی (١٩٧٥)دا ناسنامەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقیم وەکو ڕۆژنامەنووسێك وەرگرت و ئەو دەمە لە ڕۆژنامەی "العراق" کارم دەکرد کە کەسایەتی ناودارو ناسراوی کورد بەرێز ساڵح حەیدەری سەرنووسەری بوو. لە بارەی بانە ڕۆژەوە دەڵێم: سوپاسی سەرۆکی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك کاك شێخ موحەمەد شاکەلی دەکەم کە متمانەی ئەوەی پێم بوو ناوی گۆڤارەکە بنێم بانەڕۆژو پۆستی سەرنووسەرێتیشی بە من بسپێرێ. بانەڕۆژ گۆڤارێکە وەکو هەموو گۆڤارەکانی دی و بایەخ بە کلتووری کوردیی کەرکوك و ناوچەکانی گەرمیان دەدات و لە بارەی کوردێتی و کوردستانێتی کەرکوکەوە ئەوەی نکۆڵی لێبکات وەکو ئەوە وایە بڵێی کەرکوك نەوتی تیا نییە...

ئێمە لەگەڵ دکتاتۆرییەت و پێشێلکردنی ماڤی مرۆڤو عەسکەرتارییەتیدا ڕاهاتووین.. ئێمە جگە لەوەی کە دوژمنان بەوپەڕی درندایەتییەوە هەڵسوکەوت و ڕەفتاریان لەگەڵماندا کردووە.. خۆشمان فێرین یەکدی بکوژین و یەکدی تاڵان کەین و ناوو ناتۆرەی جۆرەبەجۆر لە یەکدی بنێین... ئێمە کۆمەڵگایەکی خێڵەکی شەڕانی و ناتەباین... ئەگەر وا نییە بۆچی خەڵك لە نیشتمانی خۆی بێزارەو ڕۆژانە دەیان گەنج بەرەو هەندەران کۆچ دەکەن!

من مرۆڤم.. پەپولە نیم.. و شیعرەکانیشم ئەو ڕووبارەیە کە هەرگیز وشك ناکاو نەوە لە دوای نەوە شاعیران لێی دەدزن. ئاخر کەی من پەپولەم ڕۆژی هەزاران پەپوولەی وشەی ڕاودەکەم.. من ڕاوچی وشەم... پەپوولە نیم.

وا هەستدەکەم شاعیرانی دی کورد لەسەر شیعرە کۆنەکانی من دەژین و لێی دەدزن و گەزافی نوێگەری لێ دەدەن... من لەناو شاعیرو فەریکە شاعیرو کۆلکە نووسەرانی کورددا دوژمنم زۆرە... من بەختەوەرم کە ڕەخنەی فارسی و عەرەبی و هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپاش شیعرەکانم بەرز هەڵدەسەنگێنن بەتایبەتی ڕەخنەی عەرەبی و فارسی... با یەك شتت پێبڵێم: ئەگەر بە کوردی نەمنوسیایە ئێستا سەدان خەڵاتی زێڕینی شیعرم وەرگرتبوو، بەڵام شانازی دەکەم بە کوردی دەنووسم... با کۆلکە شاعیرەکان شەق بەرن... من بە عەرەبی و فارسی و فەرەنسی و سوێدی و ئەڵمانی و هۆڵەندی و ئینگلیزی... دەیان بابەتم بڵاو بووەتەوەو لەسەرم نووسراوە! چیم داوە لە داخ لە دڵێکی خۆمان شیعری منی بە دڵ بێ یانا.

لە هەموو دیوانەکانم ڕازیم.. هەموویان بەشێکن لە ژیانی من شیعرەکانم نیشتمانی منن.. جێی پشوودانی منن.. هەموویانم خۆش دەوێ و من ناتوانم بڵێم فلان ڕووباری نیشتمانم خۆش دەوێ فیسارە لوتکەی نیشتمانم خۆش ناوێ.

چیرۆکی پۆلیسیم دەنووسی و لاسایی چیرۆکە پۆلیسییەکانی" شارلوك هۆلمز"م دەکردەوە. سەرەتای گەنجیم بوو کچێکم خۆش دەویست نامەی دڵداریم بۆ دەنووسی و دەمدڕی... چونکە نەمدەتوانی نامەکانی بۆ بنێرم... حەزم دەکرد ئەو حاڵەتە بکەم بە چیرۆکێکی پۆلیسی و نامەکانی بۆ بنێرم و بە خەتێك بینووسم تەنها من و کچەکە بتوانین بخوێنینەوە.. ئێستاش دەمەوێ ئەو چیرۆکە بنووسم.

زۆرجار دەبێ پابەندی ئەو گوتە کوردییە بین کە دەڵێ: شەق دەزانێ قۆناغ لە کوێیە...لەبەرئەوەی زۆردار هەموو جۆرە چەکێکی کوشندەی کەڵکە کردووە بۆ تەنگانە، مەحاڵە زللەیەك بخوات دوایی شەق نەهاوێ.

دەمەوێ دەرمانێ بدۆزمەوە بە کاری بێنم و پیر نەبم...و بە لای کەمەوە (٢٠٠) یاخود سێسەد ساڵ بژیم و ئەو مەبەستەش دەمەوێ برۆم لە کیسەڵێکی دەریای سپی ناوەراست نهێنی تەمەن درێژی بدزم.. بەڵام ئاخ ناوێرم سواری فرۆکەی سەگباب بم.!

کەرکوك هەر کوردستانەو من نەخۆشم و بەرگەی زللەیەك ناگرم و دەڵێم حاشا لە حازری لە (ق..) دایکی ئەو کەسە بەم کە دەڵێ کەرکوك کوردستان نییە...

* ناونیشان
نە من مردووم
نە کوردستان گۆرستانە
من هەر زیندووم
تا سەر زیندووم
وەکو ووشە
وەکو ئاسمان
بەستە ئەڵێم
بۆ رووناکی
بۆ جوانی
فراوانی
ئەم ژیانە
بۆ هەتاوێك کە لە ئاسۆی
بەهارەوە ئەرژێ پشکوێ
ئەفرین ئەکەم
لە زنجیر و بەندیخانە
لە ستەمکار
لە داگیرکەر
لە وانەی وا وەك جانەوەر
دەست ئەنێتە بینی هەژار
لەوانەی وا برسیانە
برسی خوێن و یەسقانن
برسی کێوی سامانن
کام دار بەرووم زۆر بتەوە
هەڵئەکێشرێ لە بێخ و بنج
کام دارستانم جێی خەوە
ئەسووتێ وەك زەلی زنج
بەسەر یەکا کە روو ئەکا
دار و بەردی زۆر کۆشکی قنج
لەوانەیە
هەموو ساتێکی ئەم ژینە
لێم راپەرێ وەکو کینە
وەکو دیوار
دڵ بسمێ وەکو بزمار
بەڵام هەرگیز هێزی زۆردار
ئەم وڵاتەم پێ چۆڵ ناکات
جگە لە خۆم
کەس ئەم خاکەم ناکێڵێ
تامی بەرووی دڵ ناکات
یاری ناکات بە بەفر
بەردێ ناگرێ لە گوێزی چر
چەژی ئاوی سەهۆڵ ناکات
لە بێگانە
ئەبم بە مەرگ و ئۆتۆم
گەر بخاتە ئەم زەوییە
دەمی بێڵێ
ئەو نەخشەیەی کە تیا ئەژیم
ئەو سنوورەی کە کێشراوە
هەر ئەمێنێ وەکو ماوە
هەڵناوەشێ بەهیچ هێزێ
وەك شاخەکان
تەمەنی من ئەی پارێزێ
مەرگ ئەکوژم
بەڵام مردن
ناگاتە من

* خواو شارە بچکۆلەکەمان
سێبەرێك لە ئاوازی ئەندێشەی دڵمایە
خەو بە هیواوە ئەبینێ
وەك ئاو پێنەکەنێ
بۆ خۆشەویستییەکی بێ کۆتایی
کە لە دڵی شاخەکانە نووسراوە
من هەمیشە بۆ کەشتییەك ئەگەرێم
بمگێرێتەوە بۆلای تۆ
هێشتا دیوارەکان هەر بەرزن
هێشتا زنجیرەکان هەر ئەستوورن
گیانە نامەکانم لە بای شەوایە
وریابە باران تەری نەکات
ئەو وێنانەی کە چنگی رەشەباکان
لە کۆڵانەکان ئەیچێنێ
تەمەنی دڵداریم بیر ئەخاتەوە
ئێمە هەر وا پێ پەتی نایین
چراکان هەر وا کز نابێ
شارەکەمان هەر وا خامۆش نابێ
ئەو خەوەی کە باپیرم دیبووی دێتە دی
وا منداڵەکان دلاقە لە قوڕ گیراوەکان دەکەنەوە

* ئاگادارییەك
من ناتوانم... بە زمانی ئێوە بدوێم
ناتان ناسم... ناتان ناسم...
ئەی ئێوە ئەزانن من کێم
میوانێکم پەنجەرەکانم رەشەبایە
فەرهەنگێکم.. وشەکانم ..
وشەی پێش لەدایکبوونی یاسایە.

* ئەستێرە
گشت ئەستێرە کۆچەرەکان
گەڕانەوە و لەسەر شووشەی پەنجەرەکان
هەڵنیشتن و لانەیان کرد
هەر ئەستێرەکەی من نەبێت
کوێ بگەڕێم
چ دارستانێ.. کام دێ..
کام گرد.. کام ڕێ
ئای ئەترسم ئەستێرەکەم
وەك دایکم ون ئەبێ!!

* گەردەلوولی سپی
هەموو تۆزقاڵێکی لەشی خۆت
کرد بەپێ و هەر نەگەیشتی بە هەواری
ست فاتیمەکەی جاری جاران...
هەموو تۆزقاڵێکی هەستی خۆت
کرد بە چاو و جارێکی تر کەوی نیگات
تێری نەخوارد لە بۆنی بارانی کوردستان
هەموو تۆزقاڵێکی دڵی خۆت
کرد بە دەست و نەگەیشتە پرچی کچێکی کوێستان
هەموو تۆزقاڵێکی گیانی خۆت
کرد بە باڵ هەڵفریت و هەڵفریت هەڵفریت
تۆ هەر نەگەیشتی بە سەیوان...
هەموو تۆزقاڵێکی لەشی خۆت
کرد بە دەنگ و گۆرانیت وت
دەنگت زریانی شەو بردی و
نەگەیشتە منالانی وڵاتێکی بێ ئاو و نان

* گەڕانەوە
گەر نەیانهێشت لەناو بەفری کەژەکاندا
یاری بکەن بخزێن
وەرن لە کوێستانی دڵمدا
ڕەشماڵێ گەورە هەڵبدەن و
گۆرانی دڵداری... بڵێن...
کە گەورە بوون ڕەشماڵەکە بپێچنەوە
بەبێ دەنگ
ئەستوونەکانی بکەنە: گالۆك و پاچ... و تفەنگ
لە چۆلەکەی هەڵگوردەوە
فێربن وڵات پەرستن
گەر دەتانەوێ سەربەرز بن
گەر مردن
دەستان تفەنگی تیابێ
نەك مەمکی ژن...
دەتانەوێ گەر مردیشن هەر نەمر بن
وەکو ڕەگی داری بەڕوو بە ناخی خاکی کوێستاندا
بڕۆنە خوار... بڕۆنە خوار...
بە ناخی خاکی کوێستاندا
کە کەمەرتانیان داپاچی
خوێنتان دەبێ بە ڕووبار...
تەم دەکات و دەژین لەگەڵ بەفرەکاندا

* پاشەڕۆژ
زۆردارەکان
لە سەرانسەری زەویدا
قوتابخانەی کینە و ڕق دادەمەزرێنن
بەلام ڕۆژێ هەژارەکان
یەك بەیەکی دەرووخێنن
لە گشت سووچێکی زەویدا
قوتابخانەی خۆشەویستی
پێکدەهێنن...
زۆردارەکان
سەرانسەری زەوی دەکەن بە زیندان
بەلام ڕۆژێ هەژارەکان
هەموو دەکەن بە گوڵستان
زۆردارەکان
سەرانسەری زەوی دەکەن
بە کارگە بۆ هەڵهێنانی..
بۆمبا و تفەنگ
بەلام ڕۆژێ هەژارەکان
سەرانسەری زەوی دەکەن
بە کارگە بۆ:
زاوزێی بووکە والای زۆر شەنگ
ئیتر ئەوسا:
نە کینە و ڕق...
نە زیندان ئەمێنێ نە جەنگ

* یەکەم خۆشەویستی
هێشتا چلەم نەچووبوو
نەمدەزانی لە بێشکەدام
یا زیندان...
نەمدەزانی دایکم ناشرینە یا جوان...
هیچی ترم نەدەزانی
هەر گریان...
خەوم بینی فریشتەیەك
سپی وەکو شەستە باران
چاو سەوز وەك دارستان
هێدی... هێدی
هاتە خوارەوە لە ئاسمان
جومگەی سینگمی یەکە یەکە
لێکترازان
ئەڤینی ئەم: چەم و دۆڵ و
شاخ و داخەی

لە دڵما چاند...
ئێستا دڵم
هیچی تری تیایدا نییە
هەر کوردستان و کوردستان

* خۆر
وڵاتەکەم تابوت نییە بینێنە چاڵ
لەژێر ژەنگی پێڵاوی ساڵەکاندا
وڵاتەکەم بۆمبایە
هەر دەتەقێ لەژێر پۆستاڵەکاندا
جا ئەو ساتە خۆر وەك گڵۆپ
دڵۆپ دڵۆپ
دابەش دەکرێت بەسەر هەموو
ماڵەکاندا

سەرچاوە:-
- گۆڤاری رۆڤار، ژمارە (٩٤)
- دیوانی لەتیف هەڵمەت.

## * تەیب جەبار وەکو شاعیرێک:-

عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی
فاروق مستەفا



بەرلەوەی چاوم بە شاعیر و ئەندازیار (تەیب جەبار) بکەوێت، دەقە شیعرییەکانیم ناسی، کە لەسەر لاپەرەکانی ڕۆژنامەی (تاتۆ)ی بەغدادی دەردەکەوت، بەتایبەتی کاتێك چاوم بەدەقێکی کەوت بەناونیشانی(بانگەشەی هەڵبژاردن)، ئەو دەقەم بەدەقێکی سەیر بینی، بەگەنجینە زمانەوانییە جیاوازەکانی لەگەڵ دەقی ئاسایی و ئاسراو، لایەنە جوانییەکانی دەقەکە ڕایکێشام، حەزم بەخوێندنەوەی کرد، دەوڵەمەندی و قوڵییەکەی نوقمی کردم، کاتێك ئاشنای دەقەکانی دیکەی ئەم شاعیرە بووم، زانیم چەندە تا چ ئاستێك دڵسۆزە و تا چ ئاستێك فراونە لە لەخۆگرتنی کەرەستەی هونەری و بەڵگەی بە پیت، کە لە ڕێگەیەوە لەسەر ژێکانی دەژەنێت، وتەیەکی بۆدلێرم بیرکەوتەوە کە دەڵێت : "شاعیر لەسەر بنمیچی جیهان دەوەستێت".

ئەویش لەسەر ڕێی ئاگربارانی دۆزەخەکەی بەرەو فیردەوسەکانی بەهەشتی قورتاربوون دەچێت، شاعیر کە هەست بە تەنیایی و کەلەکەبوونی سەختییەکان دەکات لەم جیهانە پڕ لە هەڵە و کارەستانە، هیچی نییە جگە لەوەی باوەش بە هاوارەکانیدا بکات، لەگەڵ دلیشیدا مانا ڕێدەکات و ئازارە بێ کۆتاکانی هەڵگرتووە.

تەیب جەباری شاعیر لە هەر سەردانێکیدا بۆ کەرکوك هەوڵ دەدات چاوی بە هاوڕێکانی بکەوێت بەبێ ئەوەی هیچیان لەبیر بکات، لەوانەیە ئەو ناوەی کەسوکارەکەی لێیان ناوە، بە ڕێکەوت نەبووە، بەڵکو هاوتەریبە لەگەڵ خودی کەسایەتی و کانزا و ناخییەوە.

سەرەتا هەنگاوەکانی لە گەڕەکی شۆڕیجەی کەرکوك دەستی پێکرد و تێدا خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیو دواناوەندی تەواوکرد، کاتێکیش شەرارەی شیعریش پێیدا تێپەڕی، تامی یەکەم قورتاربوونی کرد، بەوەی زانی کە سەختی قەدرەکەی لەسەر شانی هەڵدەگرێت و ئەم ڕێگەیەی کە لەبەردەمی کرایەوە هەر دەبێت پێدا تێپەڕێت، خۆشی و ناخۆشییەکانیشی ببینێت، تەنانەت ئەگەر وەرزەکە باراناوی بێت و سەرماکەشی جەستەکانی بەستووبێت، یاخود وەرزێکی گەرم و بەتین بێت و پەل و پۆ بەگەرمییەکەی بسووتێنێت و ئارەقەی پێ بکات؟

تەیب جەبار ڕێــرەوی خۆی ناسی و بەو ڕێــرەوەدا تێدەپەڕێت و تێدا دەروازەکانی رادەگەیەنێت، چونکە بەختەوەرییەکەی لەو درکاندنەدایە و لە چەندین دەرگای داخراو دەدات، چونکە ئەو بووە بە خاوەن پەیامێك، پەیامی وشەی باش، خەونی ئەو: داڕووخاندنی هەژاری و برسێتی و ئازارە، دەیەوێ سەرلەنوێ جیهان دروست بکاتەوە، جیهانێکی پاك و جوان، کە تێدا جیاوازی لەنێوان مرۆ و براکەی نەبێت، لە شیعرێکیدا بە ناونیشانی (لاواندنەوەی خۆڵەمێش) دەڵێت:

من ئێستا شەیدای.. هەواڵی تازەم،
هەر بەدوای وشەی پاکا دەگەڕێم.
من ئێستا شەیدای.. هەواری تازەم،
بەدوای کردەوەی چاکا دەگەڕێم.
وشەی پاك.. دوو دڵی لەناو دەبا.
گشت نهێنییەکانی دەدرکێنێ.
مرۆڤی دڵنیا.. دروست دەکا.
وشەی پاك، دەچێ بەگژ تووڕەیی..
چزووی دوپشکا.
لە هیچ سڵ ناکا.
وشەی پاك نامەی ئاو دەگەیەنێ..
بە لق و گەڵا.
بناغەی پتە و دادەمەزرێنێ.
وشەی پاك. گەنم پێدەگەیەنێ
وشەی پاك، پێستی زەوی کەوڵ دەکا و
بە شیلەی هەتاو ئاسمان سواغ دەدا
وشەی پاك، هەرەس
وشەی پاك، هەرەس..
بە کێوی دەردوبرین دەهێنێ.
وشەی پاك گشت ڕستەکان ڕێکدەخا.
ئەستێرەکان دەگەڕێنێتەوە مەداری خۆیان
سەرەتا و کۆتایی دیاری دەکا

تەیب جەبار رێـی خـۆی ناسی، ئەو نایەوێت لەرێگەی لابچێت، ئەو بە ئاگری شیعر داخ بوە، ئەوەش لەدوای ئەوەی شەرارەتێکی سوتێنەر پێیدا تێپەڕی و هەموو گالیسکەکانی سووتاند، تەنیا یەك رێیەك لەبەردەمیدا مایەوە، تاکو خۆی بە رووناکی ئەستێرە دوورەکان بنالێنێت، بە دڵە تێرەکەی و وشە تەرەکانی دەنگ کە لەخەونی دورگە دوورەکانەوە دێت، ئەو بە هۆنراوەی شیعر و ئازارەکانییەوە رەنگیان دەکات، هەوڵیش دەدات لە باخچەیەکدا بە درێـژ و پانی و قوڵیدا بیروێنێت.

شاعیر دەڵێت:

من حەز دەکەم
من حەز دەکەم،
لەو ئەشکەوتەی،
مەراسیمی یەکبوونی..
دالدەدا،
خۆم مات بدەم.
گوێ لە ترپەی..
دڵی ئاو بگرم،
وەختێ خاك هەڵیدەمژێ.
من حەز دەکەم،
بە خۆڵەمێشی..
ئاگردانی وەچەی نوێ،
دەست نوێژ بگرم.
دەست بێنم بە پشتی..
ئەو تەختەیەدا،
وەختێ گر دەگرێ.
من حەز دەکەم،
لە درزی سێبەرەوە،
تەماشای ناوچەوانی
ئاسمان بکەم.
وەختێ هەورێکت
سواڵی باران دەکا،
لێی دەتۆرێ.
من حەز دەکەم،
کاتێ لە دارستاندا..
پیاسە دەکەم،
تامی دەنگی دەرگا بکەم،
وەختێ دەکرێتەوە و پێوەدەدرێ.
من حەز دەکەم،
لە پرسەی شاعیرێکی..
نەناسراودا،
لەبەر دەرگا راوەستم
بۆنی شیعرێ بکەم،
خوا نە عافوی دەکا،
نە لە گوناحی خۆش دەبێ.
من حەز دەکەم،
بە چرپەی یار،
باخی وشە ئاو بدەم.
وەختێ لەو بنارە،
راکشام بۆ حەوانەوە،
هەناسەی یار..
کەپرم بێ.

ئەگـەر شـاعیر بـبی و نهێنییەکانت دۆزیبـێـتـەوە و بینینەکانت بۆ دەرخرابێت، ئایە دەیدرکێنی یاخود بەرگەی ئازارەکان دەگری، کاتێك گەڵەکانی ژیان بەرزدەکەیتەوە و دەمت شیر و شەربەتی درکەکانتی لێ دەبارێ.

سەختییەکانی شاعیر چەندە قورسە:

چەندە سەختە بەرگەی چارەنووسی بگرێت و باوەشی بە بەردەکەیدا کردبێت و بەدڵێکی وێران بەدەست ئازارەوە رێ بکات.

شوێنی تەیب جەبار لە چوارچێوەی نەخشەی شیعری کـوردی نوێدایە، دادەبـەزێـتـە چوارچێـوەی نوێبوونەوەی قۆناغی دووەم لە پێشکەوتنی شیعری کوردی، ئەو ماوەیەش بۆ سەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوو دیاری کراوە.

تەیب جەبار پێیخۆشە لە بەرزییەکانی رۆحەوە شیعر بخوێنێتەوە و تێکەڵی بکات بە هاوار و خەم و خۆشی و سۆزەوە تا (یۆتۆبیا)ی یەکەم شوێن و شاری منداڵێتی یەکەم، کە هەرگیز رەنگی رەنگەڵەکانی لەوەستان ناوەستێتەوە لەنێو ئەو هزرە تاڵەیدا، ئەو لەگەران لەنێو شاری کەرکوك دەستی پێکرد و لە شاری سلێمانی جێگیر بوو، بە تایبەتی لە شوێنێکدا کە نـاوی هـەوارە بـەرزەیـە، لـەوێـوە سـۆزی هۆنراوەکانی هەڵچوو.

تایبەتمەندی یەکەمی شاعیرەکەمان، خۆی دەبینێتەوە لە تەقینەوەی زمانەکەی و خزاندنی ئەو زمانەوانییەی کە دێـری شیعری پێ جوان دەبێتەوە، ئـەوەش ئەو بازنانەیە کە لـەبـەردەم وەرگـر دەکرێتەوە بۆ زیاتر چێژوەرگرتن لە تامی وێنەیەکی نوێ، ئەو بە بەخشینی رەنگی سپێتی بە تاریکی و ئەم جیاوازییە شیعرییەشی ئەفراند بۆ وێنەی سۆز و بیرکردنی سەردەمێکی جوان کە تێپەڕی و لەناوچوو و هەرگیز ناگەرێتەوە.

شاعیر دووەم کۆمەڵە شیعری بڵاوکردەوە لەژێر ناونیشانی (قصائد تلتفت الی الامام)، ئەو کۆمەڵە شیعرییەشی لە (دار الغاوون) بڵاوکرایەوە لە ساڵی ٢٠١٢ و تێدا هەشت دەقی شیعری نایابی لەخۆگرتبوو، لە پێشەنگی ئەم دەقانەش (ثلاث رباعیات خماسیة، یومیات راعي الهموم، قصائد تلتفت الی الامــام)، کـە لـەلایـەن عـەبـدوڵا بـەرزنجییـەوە وەرگێرایە سەر زمانی عەرەبی و ئەوە تێبینی دەکرێت لەم دەقانەدا، شاعیر لە لووتکەی دەقەکە بەپەت پەرۆشی وەرگر رادەکێشێت، کەئەوەش چلچراکەیەتی بۆ ناوەرۆکی دەق، کە دەگاتە دڵـی، تاکو لـەوێ تامی ئەو مەجازاتە بکات کە دەبینرێ و دەخزێ و دوای یەك دەگرن، هەر وەك جیهانە شیعرییەکەشی بەشێوەیەکی لێهاتوو و بەتین و سۆز بۆ باوەشی بەهەشتەکانی شوێنی یەکەمی دروست دەکات، لە منداڵی و پاکی و خۆرسکی.

چەندین ئەندازیار و پزیشك لەجیهاندا هەن لەپاڵ پیشەی رۆژانەیاندا بەدلسۆزی بۆ شیعر و وێنە و چیرۆك و وێنەکێشان و شانۆ دەسووتێن، بگرە هەندێکیان وازیان لە پیشەکەیان هێناوە و هەموو کاتێکی خۆیان بۆ ئەو هونەرە جوانانە تەرخان کردووە، نموونە زۆرە لە ئەدەبی جیهان و ئەم وڵاتانەی دەوروبەرماندا.

لای ئێمەش کۆمەڵێ پزیشك و ئەندازیار هەن چ وەك خوێندنەوەی ئەدەب بێت یان نووسینی دەقی ئەدەبی و هونەری بێت کاتێکی زۆری خۆیان لە پیشەی رۆژانەی خۆیان دەگرنەوە بۆ وشە و رەنگ و وێنە.

تەیب جەبار یەکێکە لەو ئەندازیارانەی کە دەمێکە بووەتە هاورێی نزیکی کتێب و خوێندنەوە و نووسین، بەڵام کەم نووسە، مەیلی زیاتری لەلای خوێندنەوەی کتێبەکەدا هەیە، ئەمە چ وەك ئەو نووسینە رەخنەییانەی کە جارجار دەیانووسێت و بڵاویان دەکاتەوە. یان وەك وەرگێران کە کەم جار بڵاویان دەکاتەوە یان وەك نووسینی دەقی شیعری کە لە سەرەتای حەفتاکانەوە دەستی پێکردووە و هەندێکیانی بڵاوکردووەتەوە بەشێکیانی لە کوردا خوێندووەتەوە و هەندێکیشیانی بەدەستنووسی لای خۆی ماونەتەوە و زۆربەشی فەوتاوە.

ئەگەر بمانەوێ زەمینەی زەمەنی یان دەیەی ئەم شیعرانەی تەیب دیاری بکەین، ئەوە دەڵێین سیماو و خەسڵەتی شیعری حەفتاکانی پێوە دیارە، تەنانەت هەندێك لەو شیعرانەشی کە لە هەشتاکاندا نووسراون یاخیبوون بەشێکی لە تیمە و وێنە و رستە و فەزای شیعری حەفتاکانی داگیر کردووە.

کەم شاعیری حەفتاکان دەبینرێن لەم تیمە و وێنانە خۆیان بەدوور گرتبێت زۆربەی دەقەکانی ئەو سەردەمە بەشێوەی راستەوخۆ و ناراستەوخۆ بانگەشەیان بۆ یاخیبوون تیایە، یاخیبوون لە دەسەڵات بەهەموو جۆرەکانییەوە، دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و ئیداری و نەریت و زەبر و زەنگی دەزگای کۆمەڵایەتی، یاخیبوون لە کۆنەپەرستی هەوڵدان بۆ دەربازبوون و گەیشتن بە بیر و وتە و کرداری نوێ کە بووبوون بە سونبل و دروشمی ئەو سەردەمە.

" لە بارەگای بێ هەستی شار
فرۆکەکانی هەڵبەستم
بۆمبای یاخیبوونی هەستم
دەهاوێژن
بەناو دەربەندی تاریکی دڵتا.. گڕی
فریشتەی شۆرش.. دەرێژن"
(شیعری کرێوەی هەورێکی تینوو - ١٩٧١)

ئەوە خەمی تاڵ
بیکەن بە نارنجۆك.. بیتەقێنن
ئەوە باری ساڵ
بیکەن بە کوانووی گڕ... بیبوخێنن
ئەوە گوڵی ئاڵ
بیکەن بە ئاڵای دڵ... بیشەکێنن)
(شیعری نامەیەك بۆ رەشەبا - ١٩٨٤)

ئەم دوو برگەیە تەواو نموونەی ئەو وێنە و رستەی شیعریانەن کە یاخیبوون و هەستی راپەرین و هۆشیاربوون پێکدەهێنن و شاعیران لەو وەختانەدا خۆیان لێدەدا. دیارە ئەو شیعرەی یەکەمی سەرەوەی کاك تەیبیش هەر لە ساڵی ١٩٧٢دا نووسراوە و لەو ساڵەشدا لە رۆژنامەی برایەتیدا بڵاوبووەتەوە.

هەموو کاتێکیش یاخیبوون گەشبینی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، واتە یاخیبوون لەکاتی تەقینەوەیدا دەبێت بەهاورێ و برای گەشبینی، یاخیبوو وەعی کراوەیی و باوەر و ئامادەبوون و گەشبینی لا دروست دەبێت، بۆیە هەر لەو کاتەدا لە شیعری دەیەی حەفتاکاندا گەشبینی و ئومێد و باوەر و لە بیربردنی کەوتن و هەرەس، لەپاڵ چەمکی یاخیبووندا بووە بە بوونیادێکی دیاری دەقەکانی ئەو سەردەمە (مەبەستمان ساڵانی پێش کارەساتی ١٩٧٥) ە، کە ئەدەبێکی بەرهەم هێنا جودا لە شیعری ساڵانی دوای (١٩٧٥) کە پربوو لە وێنە و رستەی پرکراو لە دوودڵی، بێئومێدی، رەشبینی.

بەپێی ئەوەی ئەم شیعرانەی کاك تەیب لەدایکبووی کاریگەری ئەو سەردەمەن و دەکەونە بەر ئەو پێوەرە شیعرییانە. ئەو پێش ساڵی ١٩٧٥ شیعری نووسیوە پر بووە لە ئومێد و کرانەوە و گەشبینی و روونبینی، لە دوای (١٩٧٥)یشەوە، دەقی نووسیوە بەر کاریگەری کارەساتی رەشبینی و پەشیمانی کەوتووە.

شێوازی پرسیار کردن لەم دەقانەدا دەستەباڵایە:
چۆن لەگەڵتا بم؟
تۆ پێشوازی لە هیچ هەورێ ناکەی
شریخەی سامناکی بروسکە، داتناچڵەکێنێ

هەندێك جار زمانی شێوازی پرسیارکردنەکە لە جیاتی دەهشە، مەنتیق جێگای دەگرێتەوە:
(مەپرسن: بۆ بێ وڵاتین؟
مەپرسن بۆ لە لوتکەی ئازارا بەندین؟)

وا هەست دەکەم ئەمانەیش بۆ دوو شت دەگەرێنەوە، یەکەمیان نزیك بوونی لە جیهانی ئەندازە، دوو جۆر مامەڵەکردن لەگەڵ زماندا کە ئەم زیاتر لەو جۆرە رستانەدا وەزیفەی گەیاندنی لە زمان گەرەکە.

منی ناو دەقەکانی تەیب جەبار منێکی دەستەجەمعین بە زاهیر و بەناو منن ئەگینا گوتار و ئارەزووی (کۆ)ن... (من)ی تەیب بارنەکراوە لە کێشە و خەمی منێکی تاك، یا پر نەکراوە لەباری دەروون و ناخ، منی کێشە گشتییەکان. یا خەم و ئاوات و ئارەزووی دەرەکی و کۆمەڵایەتییە... لەمەشدا دەقی تەیب هەر سەرچاوەی پێکهێنانی لە هەبوون و خەسڵەتی شیعری حەفتاکان وەرگرتووە.. هەر لێرەوە دەڵێین، بە بۆچوونی ئێمە منی دەقی نوێگەری یەکەم و دووەمی شیعری کوردی منێکی کۆمەڵایەتی و گشتییە کەمجار مۆرکی زات و کێشەی دەروونی پێوە دیارە، لەم بوارەدا وەرچەرخانەکە، بەرِوونی لە کۆتایی هەشتاکان و نەوەدەکانەوە روویداوە. منی دەقەکانی کاك تەیب هەر لەسەرەتاوە دەمانباتەوە بۆ

باوەشی کۆ و کۆمەڵ، تەنانەت زمانیش تیایدا لە زمانی تاکەوە دەکشێ بەرەو زمانی کۆ:

خەونی بە جیهانی بوون و یەك زەمینی و یەك مرۆڤدۆستی بێ جیاوازی رەگەز و زمان و سنوور، خەونێکی مرۆڤایەتی کۆنە، بەجیهانبوون پێش ئەوەی لە فیکر و سیاسەت و گوتاری ئیدیۆلۆجی و کۆمەڵایەتیدا بووروژێنرێت و بخرێتە روو، لە شیعردا خراوەتە روو، لای خۆمان لە کۆتایی نەوەدەکاندا لە گوتاری کورتی جیهانی سیاسی و رۆژنامەوانیدا خرایە روو، بەڵام شاعیران دەمێکە لە چوارچێوەی شیعردا و لەسەر رووبەری شیعری کورت دەستووری نێوان وڵاتانی جیهان دەسڕنەوە و لە خەونی شیعریدا ئەم دنیا گەورەیە دەکەن بە دێیەکی بچکۆلە: شیعری (سروودی دوا رۆژ)ی تەیب جەبار لەمبارەیەوە لە سرووودێکی جیهانی دەچێ، خەونی مرۆڤ و دنیا تێکەڵاو دەکات و دەیکات بەیەك:

"رۆژی دادێ
گڕی بەهار
بەر دەبێتە شار و لادێ
هەموو زەمین
دەبێتە یەك خانووی نەخشین
هەموو زەمین
دەبێتە یەك باخچەی رەنگین
مرۆڤ... سەرجەم
دەبێتە خاوەن یەك شارێ
دەدوێ بە یەك زمان یەك دەم"

ئەم شیعرەی لەگەڵ روونی و دیقەتا بە شیعرە چاکەکانی ناو دیوانەکە دەژمێردرێت، مادام بە جیهانی بوون و یەکبینایی خەونێکی کۆنی بەشەرییە، ئاساییە لە سیاسەت و فیکر و بیری کۆمەڵایەتی و ئەدەبیدا بە زمانەکانی جیهان لە هەموو شوێنێك مەوداکانی بنەخشێنرێت.

لەو رەخنەگرانەی کە دەقی شیعریی دەنووسن بە ئاگابوونیان لە مەنهەج و شێواز و رێگای رەخنەیی وایان لێدەکات لەکاتی نووسینی شیعرێکدا بکەونە ژێر کاریگەری پێوەری رەخنەیی و ئیلتیزامیان پێوە بکەن و لێیان دەرنەچن. پێموایە کاك تەیبیش بێوەفایی لەو پێوەرانە ناکات بۆیە زمانەکەی دەبێتەوە بە زمانێکی پێوەریی (لغە معیاریە) جارجاریش شێوازێکی مەنتیقی وەدەر ئەکەوێ.

لە کۆتاییدا دەڵێین: ئەم شیعرانە دوور لە حوکمدان و دەستنیشانکردنی نرخ، لە دایکبووی سەرچاوە کۆمەڵایەتی و شێوازە دیارەکانی دەیەی حەفتاکانن، ئەوانەیشی کە لە هەشتاکاندا نووسراون، بە وەفاوە ئینیتمایان بۆ ئەو دەیەیە ئاشکرا کردووە.

## * چیرۆکی ( شەتڵ)ی شێخ مارف بەرزنجی لەنێوان ستاتیکای دەنگ و دەرکەوتە فیکرییەکان:

دانا عەسکەر



کاتێ قسە لەسەر چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ دەکەین، سەرەتا دێین قسە لەسەر ئەو جیاوازییە ریشەییانە دەکەین کە لەفۆرم و تەکنیك و زماندا لەگەڵ ئەوەی پێش خۆیان بوونیان هەیەو بەرچاومان دەکەون، بۆ ئەوەی بزانین ئەدەبیاتی کوردی و بەتایبەتی چیرۆك، لەکوێیی ئەو گۆڕانکارییە ریشەییانەدان، بۆ ئەم مەبەستە زۆر گرنگە نووسەرانی کورد زوو زوو ئاوڕ لە ئەدەبیاتی کۆن و قۆناغەجیاوازەکانی ئەدەبی کوردی بدەنەوە، زۆر جار قسە لەسەر رەخنەی کوردی دەکرێ، وەك ئەوەی بوونی نییە، یاخود کاریگەریی بەسەر رەوتی ئەدەبی کوردییەوە نەبووە، یاخود نییە، بەبروای من سێ لەسەرچواری ئەو قسانەی لەسەر رەخنەی کوردی دەکرێن تا سەر ئێسقان راستن و بەمافێکی رەوای رۆشنبیریی کوردی دەزانم قسە یاخود رەخنە لەناوەندی رەخنەی کوردی بگرێ، دیارە ئەم بۆچوونە تەواوی رەخنەگرانی کورد ناگرێتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی رەخنەی کوردی رۆڵی چالاکی لەبەرەوپێشەوە چوونی ئەدەبی کوردیدا نەبووەو بەجورئەتەوە مامەڵەی لەگەڵ خودی رەخنەدا نەکردووە، بۆیە دەڵێم چەندە گرنگە ئەدەبی ئەمڕۆ بەسەربکەینەوە، دەیان جار گرنگە ئەدەبی پێش خۆمان بەسەر بکەینەوەو بزانین ئێمە چیمان لەوان وەرگرتووەو چ جیاوازییەکمان لەگەڵ دونیاو رۆئیای ئەواندا هەیە، ئایا ئەو کاریگەرییەی کەنەوەی نوێ وەك سوود وەرگرتن لە ئەدەبیاتی کوردی پێش خۆیان، چ لەرووی زەمەن و تەکنیك و فۆرم و زمانەوە، چ گۆڕانکارییەکیان بەسەر هاتووە، ئایا دەکرێ ئێمەی کورد وەك شانازی بەئەدەبەکەمان ئەو جیاوازییانە بخەینە روو، هەموو ئەم پرسیارو بۆچوونانە کاتێك ماڤ ووتنی دەبێ کە ئێمە دەقێکی کۆن بەسەربکەینەوەو قسەی لەسەر بکەین، کەدەڵێم کۆن بەو مانایە نییە کە ئێمە پێویستمان پێی نەبێ، بەڵکو مەبەست لەجیاوازی قۆناغە.

بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی دونیا لەژێر کاریگەریی ئەدەبی ریالستییە، ئێمەش بەشێکین لەو هاوکێشەیە، بەڵام دەکرێ بپرسین ئایا بەشێوەیەکی کاریگەر، ئەدەبیاتی ریالیستی گۆڕانکاریی ریشەیی بەسەر نەهاتووە؟ بەدڵنیاییەوە، بەڵێ، ئێمە زۆر جار لەدەقی رەخنەی کوردیدا ئەو حاڵەتەمان بەرچاو دەکەوێت کەبەشێکی زۆری چیرۆك یا رۆمانی کوردی بە دیدگایەکی ریالستی دەنووسرێت و هیچ گۆڕانکارییەکی ریشەیی لە تەکنیك و فۆرم و زمانی تیا بەدی ناکرێ، لەبەرانبەردا، نووسەری بابەتەکە ناچێتە ژێرباری ئەو جۆرە رەخنەیەوە، ئەوەی وا لە ئەدەبیاتی کوردی دەکات کە بە هیچ شێوەیەك پێش نەکەوێت، مامەڵەنەکردنێکی جیدیانەیە لەگەڵ رەخنەدا، لەبەرانبەردا جیاوازییانە رەخنەی کوردیش نەیتوانیوە ئەو جیاوازییانە بخاتەروو، کە ئەدەبیاتی دونیا چۆن توانای دەربازبوونی تیا دەرکەوت، بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی دونیا پشتی بە چەندرچوون و دەرکەوتە کۆمەڵایەتییەکان بەستووە، بۆ ئەم مەبەستە ئەدەبی ریالیستی سوودی لە تێڕوانین و سەرنجەکانی مامۆستای رۆمانی کۆمەڵایەتی (بەلزاك) وەرگرتووە، کە ئەمەش بەشێکە لەو هاوکێشە دیارانەی دەمانبنەوە بەردەم ململانێ سیاسییەکان کە بە پلە یەك مارکسستەکان بەقازانجی خۆیان شکاندیانەوە، لەبەرانبەردا ئەدەبیاتی دونیاش سوودێکی باشی لەو هاوکێشە سیاسی و ئەدەبییە وەرگرت، لەم بارەیەوە ئەدەبیاتی رووسی بوو بەسەرمەشقی گۆڕانکارییە فیکری و کۆمەڵایەتی و زمانەوانییەکانی دونیا، ئەم دیاردەیە چەندە سستمی سیاسی شکستی تیاهێنا، هێندەش گۆڕانکارییەکانی دونیای ئەدەب و هونەرو چەمکی رۆشنبیریی بەشێوەیەکی گشتی گرتەوە، بۆ نموونە سەرهەڵدانی سستمی سەرمایەداری، شکستی سستمی سۆسیالیستی لەگەڵ خۆیدا هێنا، دەکرێ بڵێین سەرهەڵدانی فیکرو فەلسەفە لە ئەدەبیاتدا، شکستی بە ئەدەبی کلاسیك هێنا، لەم سەرو بەندەدا، کاتێ باس لەشکستی ئەدەبی کلاسیك دەکەین، بەو مانایەیە کە هەمیشە عەقڵ و تێڕوانینی نوێ، تێگەیشتن و بۆچوونی پێش خۆی رەتدەکاتەوەو بەسوود وەرگرتن لەو دونیا جیاوازە، هەوڵدەدات بە دیدو تێڕوانینی جیاواز، رەوشی ئەدەبی بەرەوپێشەوە ببات، بۆیە دەکرێ لەهەر قۆناغ و سەردەمێکدا رەچاوی ململانێکان بکەین و بتوانین سوود لەو ئالوگۆڕییە وەربگرین و سەرنجەکان بخەینە روو.

یەکێك لەهۆکارە گرنگەکانی سەرکەوتوویی ئەدەبی ریالیستی، گرنگیدانە بە ئەدەبی کۆمەڵایەتی و چینایەتی کە رۆڵێکی کاریگەریی هەبووە لە هەردوو رووی سیاسی و ئەدەبییەوە، ئەم حاڵەتە زۆرجار رۆمان یا چیرۆك لەو بوونیادە سەرەکییەی خۆی دەترازێنێ و لەبری ئەم دوو بونیادە، کە (شوێن و کات)ن جەخت لەسەر مەسەلە فیکریی و فەنتازیی و ئامانجە گرنگەکانی خودی ئاراستەی رۆمانەکە دەکات، کە پەیامێکی فیکریی یا سیاسی و کۆمەڵایەتی لە پشتەوەیە، هونەرمەندی سومبولیست (مورە) دەڵێت: "دەبێ نووسەر هەوڵبدات فیکرو خەیاڵ بکات بە جێگری

واقیع"، ئەم ڕوئیایەی (مورە) ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە زەروورەتی گۆڕانکاریی لە ڕەوتی ئەدەبی و بەتایبەتی لەچیرۆك و ڕۆماندا، حالەتێکی زەروورییە، بۆیە ئەوەی زۆر جار سەبارەت بە گۆڕانکاریی باسی لێوەدەکرێ، ئەو دیدو ڕوئیایەیە کە تاکو ئەمڕۆ گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر نەهاتووە، بۆ ئەوەی جیاوازی لەدیدی کۆن و نوێ لەچیرۆکی کوردی بخەینە ڕوو، یاخود باشترە بڵێین جیاوازی نێوان چیرۆکی کۆن و نوێی کوردی کامانەن؟!

بۆ ئەم مەبەستە چیرۆکی " شەتڵ " ی نووسەر شێخ مارف بەرزنجی، دەکەینە دەروازەیەك بۆ ماناو دەلالەتەکانی گۆڕانکاریی لە چیرۆکی کوردیدا.

بەر لەوەی قسە لەم چیرۆکەی شێخ مارف بەرزنجی بکەین، دەبێ ئاماژە بەوە بدەین کە ئەم چیرۆکە (٥٠) ساڵ پێش ئێستا نووسراوەتەوە، کەواتە قسەکردن لەسەر ئەم چیرۆکە هەروا کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو دەبێ ئاماژە بەگرنگی قۆناغ و جیاوازیی دەرکەوتە عەقڵیی و زمانەوانیی و تەکنیکییەکان بدەین و بزانین، نووسەر تا چەند توانیویەتی کاریگەرییە ئینسانییەکان لەم دەقەدا تەوزیف بکات و چەند توانیویەتی کاریگەریی ئەدەبیاتی دونیا بخاتە خزمەتی دەقەکەیەوە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە، ئێمە دەبێ هەوڵبدەین و بزانین نووسەر لەم دەقەدا چ ئاماژەیەکی شاراوەی خستووەتە بەردیدەی خوێنەر، ئایا نووسەری کورد لە هەل و مەرجێکی سیاسی ناجۆردا، بەتایبەتی لە شارێکی وەك کەرکوك تاچەند توانیویەتی سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و ئەدەبی کوردی لەکەرکوك چ ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە، بەدیوێکی تر، ئایا نووسەر لەم چیرۆکەدا توانیویەتی بەتەکنیك و فۆرمێکی جیاواز لەگێڕانەوەیەکی ئاسایی وەك حیکایەت جیاکاریی بکات و برەو بە ئاماژە زمانەوانی و فیکرییەکان بدات، ئەو ئاماژانەی لەم دەقەدا بەدەردەکەون، ئاماژەی فیکریین یاخود کاریگەریی شکستە ڕۆحیی و جەستەییەکانە کە بەشێکی زۆری تاکی کۆمەڵگای ئێمەی تەنیوە؟!! ئایا چیرۆك لەو قۆناغەدا، تەنها دەرکەوتێکی غەریزەیی بووە بۆ پڕکردنەوەی شکستییەکان؟، گرفتی هاتنەپێشەوەی ئەم پرسیارانە لەچیرۆکی کوردی لەو قۆناغەدا، هەڵوێستەیەکە بەرانبەر سستی چیرۆکی کوردی لەم ساتەوەختەدا، ئەم ڕەشبینییە بەرانبەر چیرۆکی کوردی لەدرێژەی ئەم باسەدا سەبارەت بە چیرۆك، جیاوازی نێوان چیرۆکی کوردییە لە ماوەی (٥٠) ساڵدا.

ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی لەم چیرۆکەدا سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشا، ئەو دیدگا فەلسەفییەیە کە لای شێخ مارف بەدی دەکرێ، کە بەر لە (٥٠) ساڵ چیرۆکی کوردی توانیویەتی لە ڕووی زمان و فیکری تەکنیکەوە، مامەڵەیەکی ئینسانیانە لەگەڵ دەورووبەردا بکات، ڕاستە پرۆسەی نووسین بەشێکی کاریگەرە لە تایبەتمەندی واقیع، بەڵام زۆر گرنگە مامەڵەکردن لەگەڵ واقیع، وێنەی واقیع بێت کە ژیانی تێدا موومارەسە دەکرێ، ئەوەی کەباسی لێوە دەکەم، بەومانایە نییە کە گێڕانەوەی واقیع بێت، بەڵکو دەکرێ دیدگامان بۆ واقیع بەو ئاراستەیەدا بێت.

خاڵێکی تر کە بەلامەوە زۆر گرنگە، ئەویش ئەوەیە، ئەو گۆڕانە ڕیشەییەی لای شێخ مارف بەدی دەکرێ، کە لەو ماوەیەدا توانیویەتی ئاڵوگۆڕێك بە پرۆسەی گێڕانەوەی سەرد بکات و بە ڕوئیایەکی فیکریی و فەلسەفییەوە مامەڵە لەگەڵ چیرۆکی کوردیدا بکات.

هەموو ئەم حاڵەتانە بەلایەك، ئاستی مامەڵەکردن و گۆڕانکارییەکان لە چیرۆك لەلایەکی ترەوە، ئەوەی ئەم چیرۆکەی (شێخ مارف بەرزنجی) بخوێنێتەوە، تووشی شۆك دەبێت لەبەرانبەر بەشێکی زۆری چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ، ئەوەی مایەی هەڵوێستەکردنە سەبارەت بە چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ، ئەوەیە دوای (٥٠) ساڵ بەردەوامی، ئەگەر ئاوڕێك لە ڕابووردوی چیرۆکی کوردی بدەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، چیرۆکی کوردی بە شێوەیەکی گشتی نەیتوانیوە هەنگاوی جیدی بەرەوپێشەوە بنێت، بەبڕوای هەمووان ئەمە حاڵەتێکی زۆر ترسناکە، ژانرێکی گرنگی ئەدەبی کوردی بەو ئاراستەیەدا بڕوات و کەسێك خەمی لێنەخوات، بەشێکی زۆری ئەو چیرۆکانەی ئێستا دەنووسرێن، بەبڕوای من هیچیان نەیانتوانیوە، لە ڕووی فۆرم و زمان و فەنتازیا و فیکرەوە، لەچیرۆکی (شەتڵ)ی شێخ مارف بەرزنجی باشتربن، جارێکی تر دەیڵێمەوە، حەق وایە بەردەوام ئاوڕی جیدی لە ئەدەبیاتی پێش خۆمان بدەینەوە، ئاوڕدانەوەش لە ڕابوردوو، دوو دیوی گرنگی هەیە، یەکەم خاڵ دەستخستنە سەر نەرێنییەکانی فیکری و فەلسەفییەکانە، دووەم، هەوڵدان بۆ دەربازبوون لە ئیحساس و نەفەسی ڕابووردوو، ئەوەی من مەبەستمە، ئەوەیە، دەبێ هۆکارەکان چیبن چیرۆکی کوردی تائەم چرکەساتە بەهەمان بۆچوونی بەرلەو مێژووە بنووسرێت، ڕەنگە پرسیاری ئەوەشم لێبکرێت، من بە چ مافێك ئەم بڕیارە لەسەر چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ دەدەم، ئەمەش پرسیارێکە و دەکرێ لێمبکرێت.

زۆر جار باسمان لەوە کردووە، کە واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمە، دەیان ساڵ بەرلە ئێستا، هەرهەمان پرسیارمان لە خۆمان و دەورووبەر هەیە، ئایا دەکرێ هەمان پرسیارمان بەرانبەر ئەدەبیش هەبێ، بەمانایەکی تر، دەکرێ بەهەمان دیدو بۆچوون و ڕوئیاوە مامەڵە لەگەڵ چیرۆکدا بکەین؟، کاتێ باس لە ململانێی نەوەکان دەکەین، مەبەستمان ئەوەیە، هەرچی ململانێ هەیە دەبێ لەسەر بنەما فیکریی و مەعەریفییەکان بێت.

سەرەتا قسە لەسەر کارەکتەرەکانی ئەم چیرۆکە دەکەم، کارەکتەری یەکەم: گێڕەرەوەی سەرەکی ئەم چیرۆکەیە، کە ڕۆڵێکی لاوەکی لەم دەقەدا هەیە، بە بڕوای من ئەم مامەڵەکردنە لەگەڵ کارەکتەری سەرەکی، یاخود گێڕەرەوە، زۆر بە کەمی چیرۆکنووسی ئێمە بەم شێوەیە کاری لەسەر کردووە، ئێستاشی پێوەبێ بەشێکی زۆری چیرۆکنووسانی ئێمە، گێڕەرەوە دەکەنە پاڵەوانی سەرەکی بابەتەکانیان، ئەم حاڵەتە هێندە دەچێتە خزمەتی حاڵتە دەروونییەکانی نووسەرەوە، هێندە خزمەت بەدەق ناکات، بەواتایەکی تر ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ کارەکتەری سەرەکی دەرئەنجامی گرفتی حاڵەتە سایکۆلۆجیی و شکستە ڕۆحییەکانی خودی

نوسەرە، بۆیە ناتوانێ لەگەڵ جیاوازی واقیعی تاکەکەسیو دەستەجەمعیدا بگونجێتو هەموو گرفتو ئاریشەکانی واقیع لەخۆیدا دەبینێتەوەو بەزمانی (من)ی پاڵەوان دەدوێو دواجار قسەکردن لەبارەی کارەکتەرەکانی ترەوە، قسەکردنە بەزمانی (من)ی گێڕەرەوە. ڕاستە نووسەر داڕێژەری یەکەمی ئەو فیکرەیە، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەموو ئاریشەکان دیالۆگی پاڵەوان نییە، چونکە لەبنەڕەتدا کارکردن لەسەر واقیع، کارکردن نییە لەسەر واقیع بەڕوئیای پاڵەوان یاخود گێڕەرەوە، ئەم گرفتە زۆرجار چیرۆك یارۆمانی کوردی بەئاراستەی گێرانەوەی حیکایەت دەبات و جگەلەزمانو سایکۆلۆجییەتی گێڕەرەوە کەسو زمانی تری تیا بەدی ناکرێ، ئەمەبەلایەك، لەلایەکی ترەوە، دڵنیام ئەو نووسەرەی تا ئەم ساتەوەختە بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ چیرۆكو ڕۆماندا دەکات بە هیچ شێوەیەك نازانێ ڕۆڵی زمانو فەنتازیاو تەکنیك لە چیرۆكو ڕۆمان لە کوێدایە، لە هەمووشی گرنگتر ڕۆڵی زمانە لەم هاوکێشەیەدا، بۆیە دەبێ ئەوەباش بزانین، نووسەر لەبەرانبەر تەکنەلۆجیاو ململانێی فیکریو سیاسییەکان جگە لەزمان، چیتری پێیە مامەڵەیەکی فەنتازییو ئینسانی لە دەقدا بکات.

کارەکتەری دووەم: کارەکتەرێکی لاوەکییە، نووسەر زۆر سەرکەوتووانە دەیهێنێتە نێو هاوکێشەکانی ئەم دەقەوە، واتە، کارەکتەری دووەم، جێگا بە گێڕەرەوەی سەرەکی لەق دەکاتو ئەم هاوکێشە باوە تێك دەشکێنێ کە گرفتی بەشێکی زۆری بەحیکایەتکردنی چیرۆك چارەسەر دەکاتو دەبێتە پاڵەوانی سەرەکی ئەم چیرۆکە، کارەکتەری سێیەم (ئاغا)یە، لەم هاوکێشەیەدا گرنگترین کارەکتەر ئاغایە کەلەم دەقەدا جۆرێك لە پەراوێزخستنی پێوەدیارە، دیارە ئەم پەراوێز خستنەش دیوێکی جیاوازی ئەم دەقەیە کە نووسەر دەیەوێ لە ڕێی دەلالەتەکانی جیاوازی ژیانی دوو چینی دژبەیەکمان بۆ بخاتەڕوو، ئاغا پیاوێکی قومارچییە، هەموو سەرمایەی گوندەکەی بە قومار دەدۆڕێنێو جیاوازی نێوان گوندو شار لە ڕوویی کۆمەڵایەتیو سیاسیو فەرهەنگییەوە، نووسەری ناچارکردووە، بەدوای گرفتە سەرەکییەکاندا عەودال بێت، ئەمەش وای لێدەکات لە دیوەخانەکەی ئاغاوە دەستپێبکات، بەڵام ئەم حاڵەتە تووشی سەرئێشەی دەکات، چونکە جوتیارەکان باوەڕ بە مامۆستا ناکەن.

نووسەر بەم شێوەیە دەستپێدەکات: "لە ڕێگایەکی دوور ئەگەڕامەوە، .......... گەیشتمە شاری (ت) دەبوو سواری ئۆتومبیلێکی تر بم تا بگەمەوە ماڵ، زۆری نەخایاند ژمارەی ڕێبوار گەیشتە (٦) کەس، .......... منو ئەفەندییەکی کەمێك ڕێك وپێك لەپێشەوەو ئەفەندییەکی تر لەگەڵ سێ کەسی تر لەپشتەوە سوار بوون، هێشتا لە شارەکە دوورنەکەوتبوینەوە، هەردوو ئەفەندییەکە لەگەڵ یەکدا کەوتنە گفتوگۆ لەسەر نامەیەك کە بەدەستیانەوە بوو، لەو نامەیەدا داوایان لێ کراوە بەدرێژایی مانگی حوزەیران لە قوتابخانەدا بمێننەوە، لەکاتێکدا سەرەتای پشووی قوتابخانەیە".

ئەوەی لەم چیرۆکەدا بەدیدەکرێ وەك پێشتریش گووتم، شوێنی تەکنیكو فەنتازیای دیاریکردنی، یاخستنەڕووی کارەکتەرە پەراوێزخراوەکانە کە لە زۆربەی چیرۆكو ڕۆمانەکاندا بەدیدەکرێ، بەواتایەکی تر، زمانی دووەمی گێڕەرەوەیە، کە بەدیوە فەنتازیاکەی مامەڵە لەگەڵ دونیای دەق دەکات، ئەم مامەڵەکردنەی شێخ مارف لەگەڵ کارەکتەرەکانو پەراوێزخستنی گێڕەرەوەی سەرەکی، جۆرێکە لە کوشتنی دەنگی (من)ی پاڵەوان لەچیرۆکی کوردی، یاخود هەوڵێکە بۆ کوشتنی کارەکتەری (سۆپرمان)، بۆیە دەبینی دوابەدوای کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ، گێڕەرەوە، دانوستانەکان تەسلیم بەدەنگەکانی تری نێو چیرۆك دەکات، ئێمە ناڵێین ئەم تێڕوانینەی شێخ مارف کارێکی تازە بووە، بەڵکو مەبەستەکەمان ئەوەیە، تاکو ئەم ساتەوەختە زۆرێك لە چیرۆکنووسان بە هەمان دیدو ڕوئیای ئەم نووسەرە یاخود ئەو قۆناغە دەنووسن، دەکرێ ئێمە ئەمە پرسیارەکەمان بێت؟!!.

گێڕەرەوە جەخت لە گفتوگۆی نێوان دوو ئەفەندییەکە دەکات، ئەویش، گرفتی دوورخستنەوەیانە لەشار، بەرپێیەی ئەمان لەگەڵ چەندین کەسی دی ئاژاوەگێڕن، کۆدی سەرەکی ئەم چیرۆکە، گرفتی سیاسیو کۆمەڵایەتییە، نووسەر لەناو ئەم هاوکێشە ئەدەبییەوە، دەیان تێڕوانینی فەلسەفیمان بۆ دەخاتە بەردەستو هەرجارەی دەیخوێنیتەوە، دەرگای فەلسەفەیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە، هێندە فەلسەفیانە بۆ دونیاو دەورووبەر دەڕوانێ، ڕەنگە کەم بن ئەو چیرۆکنووسانەی ئەمڕۆ بتوانن وەك شێخ مارف ئینسانیانەو فەلسەفیانە بۆ واقیع بڕوانن، یەکێك لەدەرکەوتە گرنگەکانی چیرۆك (شوێنو کات)ە، لەم چیرۆکەدا بوونیان نییە، لە بنەڕەتدا نووسەر بەبێ ئاگایی ئەم دوو بنەماییەی فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، هێندەی گرفتی گەیاندنی فیکرە لای نووسەر، نیو هێندە خەمی شوێنو کاتی نییە، دواجار ئەوەی نووسەر لەم قۆناغەدا کاری لەسەر کردووە، بونیادێکی فیکرییو ئینسانیو ڕەهەندێکی سیاسی قوولیی هەیە، چونکە لە بنەڕەتدا خوێندنەوەی ئێمە بۆ فیکری نووسەرێك کە (٥٠) ساڵ بەرلەئێستا بابەتێکی نووسیبێ هەروا ئاسان نییە، لەکاتێکدا بەداخەوە هێشتا بەشێوەیەکی بەربڵاو نەمانتوانیوە نە لە چیرۆكو نە لەسەر ئەرزی واقیع ڕەهەندەکانی ئەو پرسیارو فیکرانە بکەین بە ڕابردوو.

ڕەهەندێکی تری هونەریی لەم چیرۆکەدا، وەستانە لە ئاست ڕۆڵی ستاتیکا لەم دەقەدا، چونکە لەبنەڕەتدا لەم قۆناغەدا، تەنانەت زۆرێك لە چیرۆکنووسەکانی دونیاش، هێندەی کاریان لەسەر ماهییەتی کێشە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان کردووە، هێندە ئاوڕیان لە ڕەهەندی ستاتیکا نەداوەتەوە، چونکە لە بنەڕەتدا هێندەی فۆرمە ستاتیییەکان چێژ بە خوێنەر دەدەن، ڕەنگە کایەکانی تری نێو دەق، بەقەد چەمکی ستاتیکا ڕۆڵیان نەبێ.

نووسەر دەڵێ: "ڕۆژێکیان منداڵێکم هەڵسانە سەر تەختە، بەکوردی لێم پرسی: چوارو چوار ئەکا چەند؟ بەسەزمانە وەك کەڕولاڵ وەستا وەرامی نەدامەوە، کە وتم

ئەربەعە زائید ئەربەعە؟ کوتوپڕ وەك توتی وتی: ثمانیة. ئەمجار باش تێگەیشتم ئەم منداڵەبەسەزمانە فێری دەنگ بووە، نەك فێری ژمارە".

یەکێك لەدەرکەوتە گرنگەکانی ئەم دەقە، کارکردنە لەناو ستاتیکای دەنگ، یا (مۆسیقا) ڕەنگە نووسەر لە بێئاگایی قسەی لەسەر چەمکی (دەنگ) کردبێ، بەڵام دواجار بۆخۆی گەرانێکی مەجازییە لە دونیا پەنهانەکەی دەق، زۆرجار کاری ڕەخنەگر لەکاری چیرۆکنووس قورسترە، یەکێك لەو دەرکەوتانە، دۆزینەوەی ئەو کۆدە ونبووانەیە، کە لەخوێندنەوەی سەرپێیدا هەستی پێناکرێ، بۆیە نووسەر لەبریی ئەوەی کایە گرنگەکانی ناو دەق بەهەند وەربگرێ، کە شوێن و کاتە، دێت بۆ گەیاندنی ڕەهەندە ستاتیکی و فیکرییەکان، ئەو هاوکێشەیە ئاوەژۆدەکاتەوە، چونکە لە بنەڕەتدا نووسەر لەم دەقەدا مەبەستێتی بە ڕەهایی فیکرەیەك بگەیەنێ و لەپاڵ ئەوەشدا ستاتیکاو تەکنیك، ئامادەگییان هەبێ، بەبڕوای من کارێکی سەرکەوتووە، بۆ نووسەرێك لەوقۆناغەدا توانیبێتی ستاتیکاو فیکر بەیەکەوە بگونجێنێ بەدیوێکی تر نووسەر هەوڵیداوە، دوانەی ستاتیکاو دەنگ لێك جیابکاتەوە، کاریگەریی دەنگ یاخود فێربوون لەژێر کاریگەریی دەنگ، ڕەنگە دیوی نێگەتیفی زۆرتر بێت لەدیوی پۆزەتیف، بەوپێیەی زمانی دایك لای ئەو منالە بەپرۆسەیکی داڕێژراوی فیکریی، ونە، بۆیە لێرەدا دەنگ، یا وەرگرتنی دەنگ بەدەر لە کاریی عەقلیی جگەلە دەنگێکی مۆسیقی نەشاز، هیچی تر نییە، ئەوەی نوسەر لێرەدا جەختی لەسەر دەکاتەوە، دەرکەوتە دەنگییە ڕەسەنەکانە.

دیوێکی تری ئەم دەقە، گۆڕینی دیوی نەشازی فیکرە بە مەعەریفە، بۆیە نووسەر دەڵێ: "دیوەخانەکەی ئاغاش کراوە بە قوتابخانە"، ئەگەرچی دەرکەوتە سیاسییەکەی ئەم چیرۆکە بە ئاشکرا بەدی دەکرێ، بەڵام خەیاڵی مەعەریفە لای نووسەر باڵی کێشاوە بەسەر حاڵەتە سیاسییەکان، کاتێ نووسەر لەم قۆناغەدا کار لەسەر بەمەعەریفە کردنی دیدی ئینسانەکان دەکاتەوە، ڕێك ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کەلەڕووی سایکۆلۆجییەوە کەسێکی شکستخواردوو نییە، بۆیە پەنا بۆ ڕەمزە مەعەریفییەکان دەبات، ئەویش (قوتابخانەیە) ئەوەی جیاوازی دەخاتە نێوان زانست و دیوەخانەوە، خودی عەقڵە کە نووسەر بە ڕۆحێکی ئینسانیانەوە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە، بۆیە دەڵێ: "قوتابخانە ئاغای دروست نەکردووە، دڵنیاشبن منداڵی ئاغا شوێنی باوکیان ناگرنەوە".

دیوێکی تری دەقەکە هەر لە سەرەتاوە، زۆر کات شکلێکی منەلۆگی بە خۆگرتوە، نووسەر لە ڕێی کارەکتەری مامۆستاوە، دەیان دیدو ڕەهەندی جیاوازمان بۆ دەخاتەڕوو، کاریگەریی ئەم شێوە وەسفکردنە، ئامانجەکانی دەچێتە خزمەتی پرسە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بەوەی بەشێکی زۆری ووردو درشتی ئەو کێشەو ئاریشانە دەخاتەڕوو، کە گرفتی ڕاستی نێوان واقیع و خەونی ئینسانەکانە، لەوانە، جیاوازی تەلارسازی نێوان شارو لادێ، ناردنی کچانی لادێ بۆ قوتابخانە، جیاوازی ژیانی ئینسانەکان، کەئەمەیان تا ئەم ساتەوەختە نەڕۆشنبیرو نەسیاسییەکان نەیانتوانیوە چارەسەری بکەن، ئەم دەرکەوتە فیکریی و ستاتیکییانە دونیایەك موفارەقەی فیکریی و مەعەریفیمان بۆ دەخەنە ڕوو، وەك ئەوەی نووسەر جەخت لە نەبوونی بینایەکی ڕێك و پێك بۆ قوتابخانە دەکاتەوە، هەرئەوە نییە، بینای ڕێکوپێك لەو لادێیەدا نییە، بەڵکو دەلالەتەکان دەمانبەنەوە بۆ بوونی ستاتیکای تەلارسازیی لە شار، دەکرێ ئێمە لە بەردەم ئەم پرسیارە تووشی جۆرێك لە نائارامی و دڵەڕاوکێ بین لەکاتێکدا ئەم گرفتە تاکو ئەم ساتەوەختە هەمان پرسیارە لە ئەدەبیاتی ئێمەدا.

فەنتازیای کارکردن لەم دەقەدا، بوونی بەشێکی زۆر لەکارەکتەرەکانی ئەم چیرۆکە لەناو ئۆتۆمبیلێکە، خودی گێڕەرەوەش، یەکێکە لەو کارەکتەرانە، نووسەر هەوڵیداوە لە ڕێی فلاشباگەوە بەتەکنیکێکی زۆر سەرکەوتوانە بەردەوامی بەچیرۆکەکەی بدات، لەوانە وەك پێشتر وتم، گێڕەرەوە خۆی یەکێکە لەسەرنشینی ئۆتۆمبیلەکەو حیکایەتەکە تەسلیم بەیەکێ لەو کارەکتەرانە دەکات کە لەسەرەتاوە وەك کەسێکی پەراوێزخراو هاتە ناو هاوکێشەکەوە، کە دواجار ئەو کەسە دەبێتە پاڵەوانی چیرۆکەکە، ئەوەی لەم چیرۆکەدا بەدیدەکرێ بەتەکنیکێکی زۆر جدییەوە مامەڵە لەگەڵ بونیادی ئەم دەقە دەکات، بۆ نموونە: ئەم دەقە لە زۆر شوێندا بەریتمی مەنەلۆگ دێتە باس و دیتن، بەڵام نووسەر بۆ ئەوەی سیمای پاڵەوانی سۆپرمان دەرنەکەوێ، یاخود لەو قەیدە مەنەلۆگییە ڕزگاری بکات، جار جار کارەکتەرەکانی دی دێنێتە قسەکردن و دیالۆگی نێوان سەرنشینەکانی نێو پاسەکە دروست دەکات.

هاوشێوەی ئەم چیرۆکەی (شێخ مارف) تا ئەم ساتەوەختە بوونی هەیە، زۆر چیرۆکم خوێندووەتەوە کە لەناو پاسدا حیکایەتەکەدەست پێدەکات و هەرلەوێش کۆتایی دێت، بەڵام سەرنجمداوە هیچییەك لەو پاڵەوان و گێڕەرەوەی چیرۆکەکەیە. لەکۆتاییدا دەڵێم ئەوەی (شێخ مارف بەرزنجی) کاری لەسەرکردووە دونیایەکی زۆر جیاوازی چیرۆکی کوردییە بۆ قۆناغی خۆی، بەڵام داخەکەم دوای (٥٠) ساڵ چیرۆکنووسانی ئێمە نەیانتوانی خۆیان لەو ریتمە ڕزگار بکەن و چیرۆکی کوردیش لەو قەیرانە چەقبەستووە ڕزگار بکەن، دیارە هۆکاری مانەوەی چیرۆکی کوردی لەو ئاستەدا، تەنها کاری چیرۆکنووسەکانمان نییە، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی کاری ناوەندی ڕەخنەی کوردییە کە نەیتوانیوە جیاوازییەکان بخاتەڕوو، بۆیە زۆرجار ڕەخنە، ڕووبەڕووی ناوەندی ڕەخنەی کوردی ئاستی چیرۆکی کوردی دەکرێتەوە.

* سەرچاوەکان:

١. (ریالیزم ودژەریالیزم لە ئەدەبیاتدا)، سیروس پرهام، وەرگێڕانی: د. میترا، لاپەرە (٥٧ – ٥٨).

٢. المتخيل السردي، مقاربات نقدية في التناص والرؤى والدلالة)، عەبدوڵڵا ئیبراهیم، لاپەڕەکانی (١٧ – ١٨، ٦١ – ٦٢ – ٦٣).

٣. (سەرجەم بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی (پشکۆ))، کۆکردنەوەو ڕێکخستنەوەی: سامان مارف بەرزنجی، عومەر مەعروف بەرزنجی، هەولێر، ١٩٩٣.

## * (لەتیف حامید)ی جوانەمەگو گەڕانێك بەدوای شتەکانی تردا:-

شێرزاد عەبدولڕەحمان



بزووتنەوەی بەردەوامی چیرۆکی کوردی، لە ماوەی تەمەنی درێژ خایەنیدا، گەلێ دەنگی وای هێنایە کایەوە کە نیشانەی داهێنانو ئەو گەشە سەندنە چڕەی پێوە دیاربوو کە چیرۆکی کوردی پێیدا ڕەت بوو. ئەو دەنگە داهێنەرانە، زۆریان بەشداربوون لەو هەنگاو و تەکانە تازەیەی کە چیرۆکی کوردی بەخۆیەوە بینیو بوون بەناسنامەی ڕاستەقینەی چیرۆکی تازەمانو.. بەم هەنگاوە چیرۆکی کوردی، لە سنووره تەسكو تروسکەکەی خۆی چووە دەرو بەتایبەتی لەدوای شەپۆلە بەهێزەکانی ساڵانی حەفتادا، ئەو دەنگانە لە چیرۆکی کوردی دا، بوون بە ناسنامە.

(لەتیف حامید بەرزنجی) ئەو دەنگە چڕو پڕ لە داهێنانە بوو، کە لە ماوەی چیرۆکنووسیندا، توانی لەگەڵ ئەو تاقیکردنەوە تازەیەی چیرۆکی کوردی حەفتامان زیاتر لە بەخششێك پێش کەش بە کتێبخانەی چیرۆکی کوردی بکاتو شوێن پێیەك لە چیرۆکی کوردی بۆ خۆی دیار بکات، کە نیشانەیەکی دیاری داهێنانو بەرەو پێشەوەچوونی جوڵانەوەی چیرۆکی تازەبوو.

لە ماوەیەکی کورتدا، چەپکە چیرۆکێکی پێشکەش کرد و، ئەم چەپکە چیرۆکەش. لەڕاستی دا و لەژێر ڕۆشنایی قووڵبوونەوەو ڕەخنە گرتندا، بەلای منەوە بۆی هەیە ببێ بەناسنامەی ئەو چیرۆکنووسە لێ هاتووەو بزرنەبوونی شوێن پێی لە مەیدانی تەکاندانی چیرۆکی کوردی بەرەو ئاسۆ تازەکانی.

(لەتیف حامید) بەلای منەوە، لە تاقیکردنەوە تازەکەی خۆیدا، خۆی لەو گیروگرفتانە ڕزگار کرد کە چیرۆکی کوردی تێی کەوتبوو، بۆیە لە دایکبوونی ئەو چیرۆکنووسە، لەدایکبوونی هەنگاوێکی گەورە بوو لە بەردەم چیرۆکی کوردیدا.. بۆیەش چەپکە چیرۆکەکەی (لەتیف حامید) ئەبێ بە(ناسنامە).

لە خوێندنەوەی چیرۆکەکانی (لەتیف حامید) مرۆڤ هەستی بەقووڵبوونەوەو شۆڕبوونەوەیەك ئەکات بەرەگی خۆشەویستی مرۆڤ و پاراستنی ژانو خۆزگە چڕەکانی ئادەمیزادی سەر ئەم خاکەی ئێمە. (لەتیف حامید) لە سەراپای چیرۆکەکانی دا، پاڵەوانەکانی لە ئێمەوە لە دایك ئەبێو بۆ ئەم زەوییە بەرینە گۆرانی ئەڵێن. لەوێوە خۆشەویستی خاك، تێکەڵ بەخەوە سەوزەکانی ئەبێ..

لە خوێندنەوەی بەرهەمی (لەتیف حامید)دا، بە ئاشکرا هەست بەو ڕۆشنبیریو خوێندنەوە چڕە ئەکرێت، کە کردوویەتی بەم چیرۆکنووسە بلیمەتە، زۆر جار بەرهەمەکانی بۆنی ئەدەبێکی وجودی لێ دێتو، کاریگەربوونی لەتیف حامید بەدەنگە تازەکانی چیرۆکی دنیا ڕوون ئەبێتەوە. وجودییەتەکەی (لەتیف حامید) خۆ بەدەستەوەدانی ژیان نییە، بەڵکو قووڵکردنەوەی خۆشەویستیو ژانە گەورەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمە پڕکێشەیە.

(لەتیف حامید) لە چیرۆکی کوردی دا، بەو تاقیکردنەوە، توانی دەنگێکی تازە دروست بکات.. وە لە ڕێبازی ڕاپۆرتکاری چیرۆك خۆی پەراندەوەو لەبەردەم ئامادەبوونێکی تردا خۆی دۆزییەوەو ستاتیکی تازەی خوڵقاند. ئەگەرچی (لەتیف حامید) ئەم ستاتیکەی بە تەنها نەخوڵقاند، بەڵام زیاتر توانیو لە هێزی چیرۆکنووسیندا هەبوو کە لەپاڵ هەنگاوەکەدا بەخششی نوێی تر پێش کەش بەچیرۆکی کوردی بکات. ئەم ستاتیکە لە چیرۆکی دەرەوە شتێکی تازە نییە، بەڵام سەبارەت بە دۆخی پەیدا بوونی چیرۆکی ئێمەو نەبوونی خوێنەریدا کە لەئاستی چیرۆکی ڕاپۆرتکاری بپەڕێتەوە بۆخۆ ئامادەبوونێ بەرامبەر بە شەپۆلەتازەکان بە قۆناغێکی ڕواڵەتی، تازە ئەژمێردرێت.

* * *

لەوەتەی هەستم بە چێژێکی ئەدەبی کردووە، چیرۆك ئەخوێنمەوە شەوانە هەندێ لەو چیرۆکنووسانە پەلم ئەگرن بۆ ڕیشەکێشکردنی، کە بەناخیاندا شۆڕ ئەبمەوە، لە کەمیانا هەست بەو شتە بزرانە ئەکەم کەبەدوایانا ئەگەڕێم. لە ماوەی خوێندنەوەی ساڵانی حەفتا، بەرهەمی چیرۆکنووسێك ڕای کێشام بەلای خۆی دا و بەگوڕتر پەلی گرتم.. لە ووردبوونەوە بەناخ ئەم چیرۆکەم نووسی هەستم ئەکرد لە هەگبەکەی دا شتێکی تازە هەیە وئەیەوێ گۆرانییەکی تازە تر بڵێ. هەر لە خوێندنەوەی یەکەم چیرۆکی دا (سێ هەنگاو بەرەو ئەودیو) فێری ئەوە بووم زیاتر هۆگری ببم.

بەڵام دوای ماوەیەکی دوور، کەمن تیایدا بەتاسەی بەیەك گەیشتنەوەیەکی تر بووم، لەپڕ (قوڵپی ڕشانەوەی ڕەش)م هاتە بەرچاو، کە ئەمیش زیاتر چێژی ئەوەی پێ

بەخشیم بەناخی دا شۆڕتر ببمەوە... ، دوای ئەوەی لە چەند چیرۆکێکی تردا خۆی پێشکەش بە خوێنەران کرد، هەستم ئەکرد لە چیرۆکەکانیدا، ئەیەوێ گەشتێ تەواو بکات.. بڕیارم دا کە لەگەڵ ئەو گەشتەدا بم.

* * *

لە ژمارەیەکی (هاوکاری) لەپڕ هەواڵێکی تاڵ رایچڵەکاندم (لەتیف حامید .. مرد).. مردنی ئەم ئینسانە لەلام شتێکی ئاسایی نەبوو.. هەروەکو سەراپای چیرۆکەکانی شتێکی ئاسایی نەبوون. بەمردنی ئەم چیرۆکنووسە، چیرۆکی کوردی، مەرگی گەورەترین‌و سەراسیمەترین دەنگی ناشت.. مردنی (لەتیف حامید) شتێکی ئاسایی نەبوو، چونکە بلیمەت بوو، چونکە کورد بوو، چونکە هەڵوێستێکی گەورەبوو..

(لەتیف حامید) بەغەریبی کۆچی دوایی کرد، کۆچەکەی هێندە تاڵ بوو لە ڕۆژژمێری تەمەنی ئەو ڕۆژانەی کە لە فرمێسکە تاڵەکانی خۆی ئەگەوزا غەریبتر بوو. بەڵێ .. کۆچی هەندێ مرۆڤ غەریبییە .. وە (لەتیف حامید) کۆچەکەی پڕ بوو لە باران‌و مردنی زیاتر لە مانایەکی بەخشی. ئاواتە سەوزەکانی (لەتیف حامید) هەر سەوزە، دڵدارەکەی لەتیف هەر ماوە.. تا پرچی تێکەڵ بە فرمێسکە تاڵەکان ئەبێ..و.. مردنی ئەم ئینسانە گەورە (لەدایك بوونەوە)یە.

* ڕۆژژمێری شاری سەلجوقی:

پێش ئەوەی هەرچییەك بڵێین سەبارەت بە (شاری سەلجوق) پێویستە بیری خوێنەر بەلای ئەوەدا رابکێشین کە تێگەیشتن لە هەر بەرهەمێکی تازە، پێویستی بە ئامادەبوونی خوێنەری تازە هەیە کە توانستی ئەوەی هەبێ، شان بداتە بەر ئەو بەرهەمە ئازایانەو لە توانستی دابێ، خۆی بۆ ئەو ئامادەبوونە قاڵ بکات. ئەگەرچی سنوورێکی دەستکرد دانانرێ بۆ لێکدانەوەی خوێنەر، بەڵام ئەوەی خۆی لەبەردەم ئەم چیرۆکانەی – لەتیف حامید– ببێنتەوە، ئەبێ ماوەی خۆهیلاك کردن تەرخان بکات بەنیازی ئەوەی دووچاری شپرزەبوونی ئایدیایی نەبێ لە قوولبوونەوە بەناخی (لەتیف حامید)دا.

ئینجا، جارێکی تر پەنجەم بۆ ئەوە درێژکرد، کە تاقیکردنەوەی نوێ پێویستی بەخولقاندنی خوێنەری نوێ هەیە.

(ڕۆژژمێری شاری سەلجوق) پاڵەوانەکانی زمانی دانیشتووانی ئەو شارەیە کە هەمیشە خەوی قورس ئەیانباتەوە، بەڵام چیرۆکنووس وانەبێ کە هەمیشە خەوی قورس ئەیانباتەوە، بەڵام چیرۆکنووس وانەبێ کە دیمەنی ئەوشارە خەو قوورسەی لە ماوەی کامیرایەکی عاتیفی ووشك‌و برینگ دەربڕی بێ.. بگرە بوومەلەرزەی ئەو هەموو (دەنگوباسە) تاڵەی کە لە ناخی ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکەوە هاتوون، لەبیری خوێنەردا ئەتەقنەوە و چیرۆکنووس، بە زیندوویەتی ڕواڵەتە ژانگرتووەکانی ژیانی شارەکە ئەکات بە تابلۆیەکی بەهێزو، ڕەنگەکانی ئەم تابلۆیە تێکەڵ بە ئەندێشەو ئازارەکانی مرۆڤ ئەکات. بەڵام لە شوێن پێکەوتن‌و دەنگدانەوەی بەسەرهاتە سەرەکییەکان‌و گیروگرفتە زەقەکانی ئەو شارە، دووچارو ڕووبەڕووی ئاژاوەیەکی ئایدیۆلۆژی ئەبێتەوەو خوێنەر زیاتر لە جاران، تووشی ئەبێ بە پچرپچریەکی فیکری. هەندێ جاریش، لەیەکچوونێکی شیعری لەیەك چونێکی شیعری سفت ئەپەرژێتە ناو چیرۆکەکەوە، وەزمانی چیرۆك، ئەبێ بەزمانی شیعر!. (من ئاواتەکانم هەڵئەچن‌و دائەمر کێنەوە. وەك پەنجەیەکی ناو مۆمی تولو ئەتوێمەوە. کڵپەی ئاگرەکەی لە تەمەنم ئالأوە لە شەختەی کوانوەکاندا بۆ پاپۆڕەوانێك ئەگەرێم. بەدرێژایی زستان بەهار هەڵ ئەهێنمەوە (لەتیف حامید) لەو چیرۆکەوە پەیوەندییەکی مرۆڤایەتی‌و نەتەوەیی لەگەڵ دانیشتووان (جەماوەر) لەیەکیان گرێ ئەداتەوە، کەئەمە سیمایەکی ئاشکرای هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی (لەتیف حامید) ە:

(هەست بەوە ناکەم کە شتێکی جیاوازبم لە خەڵکەکەی. شێوەی هەڵبزرکاویان کرووزە ئەخاتە دڵمەوە. ناسنامەکەم ئەم شارەیە.. تاد). هەروەکو خۆشی لە لێدوانێکی ئەدەبیدا ووتی:(من ئازارێکی قوولم.. کە بە ناخی خۆما شۆرئەبمەوە، هەست بەوە ناکەم کە شتێکی جیاوازبم لە خەڵکەکەو بەتەنها خۆمم ناوێت) ئەم ڕوانینە گەشەی چیرۆکنووس، لە بەرەو پێشەوەچووندا بووەو کارتێکردنی ئەم پەیوەندییە ئایدیۆلۆژییە ڕاستەقینەیە لەنێوان (لەتیف حامید) و (جەماوەر) چیرۆکنووس ئەکات بە زمانی ڕاستی ڕووداوەکانی ئەو شارەو بەرهەمەکانی ئەبێ بە خەوێکی سەوزی دانیشتوان.

بۆیە گەڕان بەشوێن بزربوونی خەوی قورسی ئەو شارە، بووە بەهێمایەکی فیکری – کۆمەڵایەتی پەیوەندار کە (لەتیف حامید) لە هەموو چیرۆکەکانی دا بۆی ئەسووتێ.

ئەم پەیوەندییە چڕەی چیرۆکنووس و مرۆڤ، پەیوەندییەکی قووڵی سیاسی و لایەنگیرییە لەپێناو شکاندنی کۆت‌و پێوەندی کێشەکان‌و ڕەنگ ڕشتنی خۆزگەکانی دانیشتووانی ئەو شارەو ئامادەبوونی هەڵسانەوەو لەدایکبوونێکی تر.

ئەوبارە دەروونییەی چیرۆکنووس تیایدا ژیاوە، واتە (مەنەلۆژی ناوخۆیی) ڕەنگدانەوەی ناخی تابلۆکانی ئەو شارەیە گۆرانییەکی خامۆشە هەزارو یەك پاڵەوانی تر ئەیگێڕنەوە. و.. زەمان ژیانەکانی ئەو شارەی کردووەتە کۆڵ خۆی. چیرۆکنووس وەك پاڵەوانێکی تراژیدی نوێ (پاڵەوانێکی یاخی) بیر ئەکاتەوەو هەڵوێستی خۆی دەستنیشان ئەکات کە بتوانێ دڕ بەو خەوە تاڵ و قورسە بدات: (خۆشەویستی خاکەکەی نەخشەیەکی توورەی بۆ هەنگاوەکانم کێشاوە. لە سامناکی ڕووداوەکانا لە شەختەی کوانوەکاندا بۆ پاپۆڕەوانێك ئەگەڕێم وەنەوز لە دوو ملیۆن چاو بەماڵ‌و خۆری گیراو بژیەنێتەوە. خەوەکانم بێ سەرو بنن هەریەکەیان سەدەیەك ئەخایەنن). ئینجا وەك (لافتی) یەك، یا بڵێین پاڵەوانێکی ژانگرتووی مەبەسی‌و، جارجاریش سەوداسەرێکی وێلی (ڕۆستۆفسکی) ئەیەوێ سنوورەکان بشکێنێ و گڕ بەرداتە تابلۆی خەو بردنەوە: (خاکەکەی نەخشەیەکی توورەی بۆ هەنگاوەکانم کێشاوە. خەوێکی قوورس ئەرژێتە چاویانەوە.

هاوڕێکانم هەست بەشپرزەیی ناکەن. بەزۆرە ملێی خۆم

نەبێ دالدەی شەوێکم نادەن. شێوەی هەڵبزرکاویان کرووزە ئەخاتە دڵمـەوە..) لـێرەدا، چیرۆکنووس لە چوارچێوەی نەخشەکانی خـەونـی خـۆیو دانـیشـتـووان، ئاسۆیەکی گـەورەتـر بـەدی ئـەکاو پـەنجـەرەیـەکـی تـازەتـر ئـەکاتـەوە، بـەڵام لـە چـیرۆکـەکـەدا، هەست بە لەدایکبوونی (گـومـان) و رارایـەکـی فیکری ئەکرێت: ( ئەم خـەواڵـووە، لەناو ئەم هـەمـوو خـەڵـکـەدا بۆچـی مـنی هـەڵـبـژاردووە) یـان (زۆرتـر بەلای ئەوەدا ئـەڕۆم کە شتێکی لە منا دیبێو شایەستەی متمانە بم) کەچی لە کاتێکی تردا ئەڵێ: (هەست بەوە ناکەم کە شتێکی جیاوازبم لە خەڵکەکەی، یا ئەبێ شایەستەی ئـەوەبم، لێرەدا چیرۆکنووس، دووچاری دووفاقی فیکری ئـەبـێـتـەوە، ئینجا ئـەگـەرچی چیرۆکـنـووس ئـەو کێشانە ئەشکێنێ کە ڕووداوەکـانـی ئەو شـارەی گـرموڵە کـردووە و بە هەڵسانەوەیەکی مرۆڤانە بەگژ ئەو واقیعە تاڵەدا دێتەوە، بەڵام هێشتا هەرگومان ئەکا..! بەڵام لەوە خۆی ئەدۆزێتەوە کە : (ئەبێ شتێکی لەمندا دیبێو شایەستەی متمانەبم..) لێرەدا، دیسانەوە، پەیوەندییە جەدەلییە کە گرێ ئەداتەوە، کە بە گرینگییەکی فیکری نێوان چیرۆکنووسو دانیشتوان ئەدرێتە قەڵەم، ئەگەرچی ئەو گومانە شکستی نییە لە توانای چیرۆکنووس. هەروەکو لە دوایین چیرۆکەکەدا ئەڵێ: (کێ ئەڵێ من خەواڵووم؟!) چیرۆکنووس هەر پێچ ئەکاتەوەو بە (پێیان بڵێ جێی پێی خۆیان داگرن، کێ ئەڵێ من خەواڵووم؟!) کـەدوا دێـڕی چیرۆکـەکـەدا جێمان ئەهێڵێ کە بـەڕای من گـەورەتـرین داهێنانی فیکری لـە کۆتاییە چڕەکـەدایـە. چیرۆکنووس لەم (ڕۆژژمێری شاری سەلجوقی)یەدا، (خەو) ئەکات بە وەسیلەیەك بۆ گەیشتن بە خەوەکانی ئادەمیزادی سەر ئەم خاکە، ڕاستیشە کە خەو بەشێك ئەبێ لە خۆزگەی سـەوزی مـرۆڤـە سەراسیمەکانو کێشەی خاکەکە. بـەڵام مرۆڤی شۆڕشگێڕ، یا پاڵەوانی تراژیدی بەدەستە پاچەیی نامێنێتەوە بەرامبەر بە ناکۆکیو کێشە بنەڕەتییەکانی ژیان، بەڵکو خۆی هەوڵی ئەوە ئەدا کە ژیان دروست بکات.

* (زەرد، سوور، سەوز، شین):-

(لەتیف حامید) لە چیرۆکی (زەرد، سوور، سەوز، شین) دا دووچـاری دڵـەڕاوکـێ بوو. لە لەحزەیەکی خێرادا پتر لە پێویست وێنەی پتر لە کارەساتێك ئەکێشێ، بەبێ ئەوەی دەسنیشانی سـەرەنجامو ئاکامی ئەو ڕووداوانـە بکات بە پەیوەندییەك. لە سەرەتاو لە بازنەی دەرەوەی چیرۆکەکەدا، ئەم پچڕپچڕییەی شێوازی ئەم جارەی چیرۆکنووس وەك شەقڵێکی ئاشکرا خۆی دیار ئەدات. ئینجا، چیرۆکنووس، چەند بەسەرهاتێ لە شێوەی دەنگوباسێکی ساردو سڕ ئەداتە دەستەوە، بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی ئایدیایی ئەم گیروگرفتانە لەیەکتر نزیك بخاتەوەو یەکێتییەکی هاوبەشی بابەتی، سەرەنجامی ئـەو کێشە سەرەکییەکانە بگرێتە خۆی، بۆیە پچڕانی بیرۆکە گوێ نەدراوەکەی (لەتیف حامید) شێوەیەکی ستاتیکی ئاڵۆزی وەرگرتووەو ئەم دیاردەیەش لە چیرۆکەکانیدا شەقڵێکی دیارە، بەڵام ئەم ئاڵۆزییە لابەلایی بۆ؟! لام وایە خوێنەرێك، چیرۆکنووس خۆی نییە، کە ئەو ڕووداوانەی لە ئەنجامی واقیعێکی بەرچاوەوە تۆمارکردبێ، بۆیە شیکردنەوەو سەرەتاو کۆتایی چیرۆکەکە، پێویستی بە خوێنەرێك هەیە کە زیاتر لە شتەکانی (لەتیف حامید) خۆی نزیك خستبێتەوەو پەیوەندییەکی ئاسایی نەبێ لەگەڵ ئەو دەنگە تازەیە. لایەنە ناوەڕۆکییەکانی چیرۆکەکە کوان؟! .

فۆرم دەستی بەسەر ئەم لایەنانە دا گرتووە، ئەگەرچی ئەو فۆرمە نەیتوانیوە هێزەکانی داهێنانی ئەو چیرۆکە بشارێتەوە و نەبووەتە هۆیەکی سەرەکیی لە شاردنەوەو خنکاندنی ناوەڕۆکە بنچینەییەکە. لە چیرۆکەکەدا ئیسفرازاتو ژانی (داخلی) واتە نەزعە سایکۆلۆجییەکان زۆرن، پاڵەوانێکی وا لە چیرۆکەکەدا شوێن پێی دیار نییە کە سەوداسەری کێشەیەکی دیاری کراوبێ.

پاڵەوانەکانی ناو ئەم چیرۆکە کۆمەڵە کەسانێکی وێڵنو، ئەلقەی مەبەستێکی ئاشکراش چیرۆکـەکـە ناگرێتـەوە، بگرە چیرۆکنووس، وەك دەرهێنەرێکی سینەمایی کۆمەڵە هـەڵوێستێـکـی دەستـنیـشـان کــردووەو هـەوڵـی نـەداوە بیکات بەتاقە تابلۆیەك. بۆیە شیکردنـەوەی دیوەکانی ئەودیوی چیرۆکەکەو هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی دیوارەکانی، قووڵبوونەوەیەکی لە ئەندازە بەدەری تێدا دەرئەکەوێ، بەڵام گرینگتر لـەم هەموو شتانە ئەوەیـە چۆن (لەتیف حامید) وەك چیرۆکنووسێك توانیوەیەتی پەیوەندی لەنێوان کچو کوڕێك دروست بکاتو چمکی دڵداری بەلای پاڵەوانەکانی چیرۆکەکە چی ئەگەیەنێ؟!. ئاشکرایە، ئەو پەیوەندییە، یا ئەو لەیەککگرێ دانە عاتیفییە هەر وا بە ڕووتی وەرنەگیراوە لەنێـوان ئـەو دوو پـاڵـەوانە کە بنجی ڕووداوەکـانـی ئەو چیرۆکـەیـان لـەسـەر بنیات نـراوە. خۆشەویستییەکە، لە چمکێکی کاڵی دڵـداری، ئەپەڕێتەوە، بۆیە پەیوەندییەکی ڕامیاریو کاڵی کێشەکە، ئەبێ بە مەسەلەیەکی گەورەتر لە قەوارەی پەیوەندییەکی ئاسایی:-

(چاوەکانت پڕن لە هەنگوین. خۆنواندن کارێکی سوود بەخشە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بتوانی قسەکانت ڕیز بکەیت) + (هەتاو خزە.. ئەخلیسکێتە خوارەوە!).

هەندێ خوێنەر، دڵنیام کە نـاوی هەندێ لە کەسانی ناو چیرۆکەکە دێت، بۆ ئـەوە دەچن کە خستنە بەر چاوو هێنانەوەی ئەو چەند ناوە لەناوەڕۆکی چیرۆکەکەدا شتێکی لاوەکـیو خەیاڵییە. بـەڵام لە ڕاستـیدا گرێـی کێشەکان هەموویان یەك سەریان لێ ئەبێتەوەو ئەم ناوانە بە پاڵەوانی چیرۆکەکە ناژمێردرێن، بەڵام کێشەی ناو بابەتی چیرۆکەکە چڕتردەکەنەوە (مەلا حەکیم وا سەرکەوت. بارام کەوتبووە سۆراخی برای. ئەمە عومەرە فێ یە تا..) هێنانەوەی ئەم کەسانە لـەپـڕ بـەبێ هیچ گـرێ دانـەوەیـەکـی ئایدیۆلۆژی پەیوەندار بەو مەسەلانەی لە چیرۆکەکەدا هاتووە، زیاتر پـەیـوەنـدی خوێنەر بـە چیرۆکەکە دوور دەخـاتـەوە بۆیە، خوێنەر، لە قووڵبوونەوە بە ناخ پاڵەوانە بزرەکانی چیرۆکەکە، دووچاری ڕازی ئەبێ.

بۆمان ئـالـوێ، بـەسـووكو هاسانی کـەسانی چیرۆکەکە لـە یـەکـتر نـزیـك بخـەیـنـەوە، ئـەگـەر بۆشمـان بـلـوێ، ئەبێ لەنێوان هەریەکێك لەم ناوانە (.) دابنێنو ئەمە بکەین بە

نیشانەی جیاکردنەوەی ئەو پاڵەوانە، لەگەڵ کەسانی تری چیرۆکەکە. ئەم رواڵەتە لە چیرۆکی تەمو مژی تازەدا زۆرە، بەڵام ئەگەر پەیوەندییەکی جەدەلی پاڵەوانەکانی لە یەکتر نزیك نەخستەوە، خوێنەر رووبەرووی شێراوییەکی فیکری ئەبێتەوەو چیرۆکەکەش سەرەگرێی کێشە بنەرەتییەکەی کلیلی وون ئەبێ! چیرۆکنووس، لەم چیرۆکەشدا باسی (خەو) ئەکات، بەڵام خەوەکانی پاڵەوانی ئەم جارە هێندە بێ سەروبنن کە لەگەڵ سەرجەمی بیرۆکەی چیرۆکەکەی تردا (رۆژژمێری شاری سەلجوق بەیەکتر ناگاتەوە:- ئەڵێن (ئەڵێن خەو پەیوەندییەکی زۆری هەیە بەرابردووەو کارناکاتە سەر سبەینێ). چیرۆکنووس، نازانم، ئەیەوێ بەمە چی پەیوەندییەك دروست بکات؟!.

کوا ئەو خەوە سەوزانەی مرۆڤەکانی سەر ئەم خاکەی ئێمە چاوەڕوانی ئەکات؟! سبەینێ، بمانەوێ، بەشێکە لەو خۆزگانەی چیرۆکنووس و هەموو رێبوارە ژانگرتووەکانی تر لە دەروونیان گێنگڵ ئەدات. مرۆڤی سەر ئەم خاکە نەك هەر لە نووسیندا، بەڵکو لە هەموو چرپەیەکیدا، لە ساتەکانی چاوەڕوانی بێ کۆتایی ئەژیو لە خەوەکانی دا بۆ ئەو شارە هەنگاو ئەنێ کە بۆی ئەسووتێ! ئەمانەی هەمووی بەلایەکداو، دواهاتن زنجیرەی رووداوەکانی تری چیرۆکەکە بە لایەکی تردا، چونکە هەتا بڵێی ئاکامێکی ساردو سڕ و رووتی هەیە کە ئەڵێ: پێش ئەوەی کابرا لۆق درێژەکە بکاتە لامان .. دەستت دایە دەستم و ووتت: بابڕۆین).

### * قوڵپی ڕشانەوەی ڕەش:-

هەواڵم دا لە لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی چیرۆکی (قوڵپی رشانەوەی رەش)دا، دەستنیشانی ئەنجامی بە رووداوکردنی ئەم چیرۆکە بکەم لەگەڵ تری (لەتیف حامید) ئەوی راستی بێ لە ئاکامی ئەو شیکردنەوە گەیشتن بەوەی (لەتیف حامید) لە شێوازی چیرۆکنووسینی دا، رێچکەو رەنگی دیاریکراوی خۆی هەیەو، من لە سەراپای چیرۆکەکاندا شتێك نابینم کە ناوی لێ بنرێ (تەکاندن) لەنێوان چیرۆکێکی (لەتیف حامید) لەگەڵ چیرۆکێکی تری دا سەرباری ئەوەی کە زەمەنی دانانی ئەو چەند چیرۆکەی بەراووردیان ئەکەم لە یەکترەوە دوورن، بەڵام چ لە ناوەرۆك و چ لە فۆرم. وەلە هەموو پەیوەندییە هونەرییەکانی تر شتێکی زیادی نەخستووەتە سەر تاقیکردنەوەکەی خۆی. یەکێك لە سیفەتە راستەقینەکانی هونەرمەند ئەوەیە کە هەوڵی جێ گۆڕینی خۆی بدات تێدا مسۆگەر کردووەو سەرەتای لە چیرۆکی (لەتیف حامید) دا بەروونی ئەبینرێ، واتە شێوازی (لەتیف حامید) تەنها لەم چیرۆکەدا تووشە خۆجوینەوەی تاقیکردنەوەکە نەبووە، بەڵکو لە سەراپای چیرۆکەکاندا رووبەرووی ئەم نیشانە بووەتەوە.

گرتنەبەری شێوازی تایبەتی لە پەیوەندییە ئەدەبییە هەمەجۆرەکاندا، بەلای منەوە، بەمەرجێکی ناوەندی دائەنرێ، نەك سەرەکی، ئەگەرچی زۆر لەوانەی لە بواری فیکری دا کار ئەکەن رایان وایە، شێوازی نووسینی تاکە نووسەرێك، ئەبێ نیشانەو دەنگی خۆی هەبێ. (لەتیف حامید) لە (قوڵپی رشانەوەی رەش) باسی چی ئەکات؟! پاڵەوانە سەراسیمەکانی کێن؟! ئینجا، چی هەیە ئازارە گەورەکەیان قووڵو چڕتر بکاتەوەو لەپێناوی چی ئەژین؟! هەڵبەتە، من نامەوێ بەخۆم رابببوورم تا کلیلی هیچ بەرهەمێکی ئەدەبی، نەك چیرۆکی لەتیف حامید، بدەمە دەستی خوێنەر. ئەوەندەی کە هەستی پێدەکرێ، کێشەی چیرۆکەکە دەماو دەم خۆی پێش کەش دەکات، بەبێ ئەوەی پاڵەوانەکان خۆیان بدرنەوە، ناسنامەی چیرۆکەکە دیارە.

بیری لەتیف حامید، لەم چیرۆکەدا کانیاوێکی چڕو پڕی وایە کەهەر چەندە تێی هەڵبهێنجێنرێ دوایی نایەت. لە (قوڵپی رەشانەوە) دا ئەگەرچی پەردەیەکی تەمو مژی هەیە، بەڵام چیرۆکنووس لە توانای دا هەبوو کە لەودیوی پەردەکە وێنەی مرۆڤی ئازاردراو نیشان بدات، وە مرۆڤە ئازار دراوەکە وانەبێ بەرامبەر بە ئازارەکە کە دەستە پاچەیی بیگرێ.. بەڵکو .. لەو دیوی پەنجەرەوە هەتاو بەدی ئەکات. چیرۆکنووس، واقیع تێکەڵ بە موعاناتە مرۆڤایەتییەکە ئەکات. شێوازی ئازارە گەورەکە کە لەوێنە گرتنی هونەری دا گەلێ قووڵتر بووەتەوە، وەچیرۆکنووس بەناخی ئازارەکە چووەتە خوارەوەو بەدوای شتە بزرەکاندا ئەگەڕێ. بەوردبوونەوە بەناخی چیرۆکەکەدا، ئەگەینە ئەوەی ئاستی هونەری فراوانترە لەلایەنە ناوەرۆکی یەکان. هەر رستەو کێشەیەکی بچووك شایانی ئەوەندەی هەبوو، گەورەتر بکرێتەوەو ئەتوانم چیرۆکەکە ناوبنێم زیاتر لە چەند مەسەلەکی کێشاوەو چیرۆکنووس ئەم چیرۆکەی لەپێناوی ئێمە نووسیوەو.. خۆشەویستی خاکەکە تێکەڵە بە خۆزگەی مرۆڤەکە. (ئاسمان لێوی قرچەوە بوو. لە شەقامەکاندا پەنگیان ئەخواردەوە. وەك لێشاو بەناخی زەوی دا ئەچوونە خوارەوە. برینەکانی خۆی بە هەورییەکی تەنك ئەپێچایەوە).

(لەتیف حامید) لە هەنگاوەکە بەردەوامە .. بەشێکە لە ئازارە گەورەکە: – (هەناسەی لە خۆی بری بوو. هەر کە ئەستێرەیەك ئەکشا دەنگێکی تری لە تەزبیحەکەی ئەپساند.).. وەدیسان ئەو رستە دووبارە ئەکەمەوە: (برینەکانی خۆی بە هەورییەکی تەنك ئەپێچایەوە)و (گەردەلوولێکی سوور شوێن پێیەکانی دەشاردەوە).. خۆشەویستی مرۆڤە ئازاردراوە کە ئەبێ بە گۆرانی زەوی.. ئەبێ بەلەدایکبوونەوە. سەراپای (قوڵپی رشانەوەی رەش) و شیکردنەوەو نرخ دان هەر رستەیەك لەو چیرۆکەو (شیتەڵ کردن)ی هەر گۆرانییەك، قەزییەیەکی بنەرەتیو کێشەیەکی ئادمیزادانەی ئەم سەردەمەیە. پاڵەوانەکانی ئەم چیرۆکە، زیاتر لە چیرۆکەکانی تر بەگژ گیروگرفتەکاندا دێنەوەو زنجیرەی بیرۆکەکە تابلۆیەکی چاو نەترسییە: (مردن ئەبەخشن بە ژیان). لە هەموو چیرۆکەکاندا، لەتیف حامید، مردن بە ژیان ئەبەخشێ. وە پاڵەوانەکانی ئەم چیرۆکەش پارچەیەکی نەپچڕاوی کارەساتەکەن وە ئاسۆی بیر کردنەوەشیان بەرامبەر رووبەروو بوونەوەی (هەڵسانەوە) سیمایەکی گەشە لە بەرێی هەنگاونانە مرۆڤایەتی – یەکەو بۆ پارێزگاری لە مانەوەی گۆرانیو دڵداری هەتاوو زەوی پاڵەوانەکان تراژیدین.. وە چیرۆکنووس هەڵوێست دروست

ئەکات لەپێناو لەیەك بەستنەوەی (تەزبیحە پساوەکە) و (چاوی گەشی ئەستێرە بزرەکان).

*** (بەشێك لە داستانی سواڵکەرە نەناسراوەکە):-**

ئاخۆ ئەوداستانەی کە چیرۆکنووس باسی ئەکات باسی چیمان بۆ بکات؟! وادیارە داستانەکە، پێویستی بە گێڕانەوە نییە، چونکە زۆربەمان. وادیارە لە سوێرایی ڕووداوە تاڵەکانیدا پەنجەمان لە ڕووی خۆر گرتووە. هەروەکو چیرۆکنووس ئەڵێ (ڕووداوەکەتان بۆ ناگێڕمەوە) منیش بە نیازی ئەوەی خوێنەر خۆی، خۆی لە ئاوێنەی کارەساتەکەدا بەدی بکات ئەم شتانە دووپات ناکەمەوە. لەیەککردنەوەی ئەم چیرۆکە، لەگەڵ چیرۆکەکانی تردا، بوونی ئەو دیالۆکە تازەیە کە لە چیرۆکەکەدا ئەبینرێ. دیالۆکەکەش شتێکی رووت نییە، بەڵکو پەیوەندییەکی لە یەك نەپچڕاوی هونەری بەیەکترەوە هەیە. هەرچەندە چیرۆکنووس، لەم چیرۆکەیدا، بە پێچەوانەی شتەکانی تر، هەوڵی ئەوەی داوە زمانی چیرۆکنووسینی بگۆڕێ، بەڵام دیسانەوە دووچاری – ڕەمز – و – مژ– ێکی تر ئەبێتەوە. ئینجا ئەو کەسەی بیەوێ (لەتیف حامید) بخوێنێتەوە، ئەبێ پاڵپشتێکی ئایدیۆلۆژی هەبێ، تا بتوانێ گرێکانی چیرۆکی (لەتیف حامید) بکاتەوەو بە ئاسانی بەو کلیلە دەرگاکانی ئەو ژوورە داخراوانە بکاتەوە کە (لەتیف حامید)ی تێدا ئەژی. لە جێگەی خۆیەتی، بەهۆی ئەم چیرۆکەوە پەنجەیەکیش بۆ ئەوە درێژ بکەم کە

(لەتیف حامید) لە داهێنانە تەکنیکییەکەداو لە ڕێبازی فیکری دا، دووچاری ووشە سواندن نەبووە و وەك هەندێ چیرۆکنووس نەیویستووە خۆی لە مەداری سەرگەردانی بابەتە سواوەکانی بداتەوە. وەزیاتر بڵێم، بەهرەی نووسینی چیرۆك لەلایەن (لەتیف حامید)ەوە، بەهرەیەکی چڕوپڕی وا ئەگرێتە خۆی کەلە بەردەم دووڕیانێکی پاشەڕۆژی دا خۆی ئەدۆزێتەوە.

(بەشێك لە داستانی سواڵکەرە نەناسەکە) ڕووەو کێشەیەکی نەتەوایەتی بووەتەوە، نەك چینایەتی.. ئەم دیارییە لە زۆر لایەنی بیری چیرۆکنووسدا خۆی نیشان ئەدات. (لەتیف حامید) مرۆڤ ئەبەستێتەوە بەو خاکەی لەسەری خۆزگەکانی لە دایك ئەبێ و خۆشەویستی مرۆڤەکە لە سنوورێکی دیاریکراو جێ ئەهێڵێ و لەنێو کێشەی بچووك دا ئەم مرۆڤە سەراسیمە نقوم ئەکات. بە سەرنج دانی لایەنە فیکرییەکە، ئەوە روونە ئەبێتەوە، کە هەڵوێستی بەیەکدا چوون واتە دژایەتی لەم چیرۆکەدا بەئاشکرا ئەبینری پاڵەوانەکان لە بازنەی هەوەڵی چیرۆکەکەدا ئەوەندە ڕەش بینن کە تارمایی وەرزی خۆشەویستی بەهار لێیانەوە دوورن و، لە کۆتایشدا بەپێچەوانەوە، گەشبینی و ئامادەبوونێك!.

لەم چیرۆکەدا، چیرۆکنووس، زۆر بەراستگۆیی لەگەڵ زاتی خۆی ئەدوێ. گۆرانی منالان و (خەنجەری کاکەمەم دودەمە) ئەکا بە هێزێکی گەورە بۆ پێکهێنانی کێشەیەك، کە چیرۆکێك دروست ئەکات، ئاواتی سەوزی (لەتیف حامید) بۆ ئەوەی (پڕ بەدڵ بەستەیەك بڵێم) ڕقی پاڵەوانی چیرۆکەکەی – قووڵتر کردووەتەوە بۆیە، هەوڵی ئەوە ئەدات کە تەکانێکی گەورەتر بداتە پاڵەوانەکە لەپێناو تۆڵەسەندنەوە. لێکدانەوەی چیرۆکنووس، گەلێ جار شپرزەییەکی پێوەدیارە.. هەتا سنووری ئەوەی (کەس ناتوانێ کڕیارو فرۆشیار لە یەکتری جیابکاتەوە) ڕاستە بەهەیت و هووت و سەردەمی کێشەی گەورەکان، ڕەش وسپی یەکتر ماچ ئەکا، بەڵام وانەبێ ڕاستییە بنچینەییەکان نقوم بکرێن. وەسف، وەك سیمایەکی چیرۆکنووسین لەم (سواڵکەرە نەناسراوە) و زۆربەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی تری (لەتیف حامید) هێزێکی گەورەی بە چیرۆکەکانی داوە بەمە توانستی ئەوەی لەباردا هەبووە کە بەهۆی وەسفەکەوە، زیاتر کێشە بنچینەییەکانی ناواخن چیرۆکەکە لە خۆی چڕتر بکاتەوە:– (خەوی ژێر سوورە چناری چەماوە ڕۆژێکی لە تەمەنمان کەل کرد. دانیشتوان ڕەشەبای چەپلەیان هەڵساندبوو چاوە قلیشاوەکان وەکو کورە داگیرساوە.. تاد). بەخوێندنەوەیەکی ووردتری (بەشێك لە داستانی سواڵکەرە نەناسراوەکە) و زۆربەی چیرۆکەکانی تری چیرۆکنووس، ئەگەینە ئەو ئەنجامە، کە چیرۆکنووس خۆی زیاتر بەلایەنی ئایدیۆلۆژی – لایەنگیری ئەبەستێتەوە. نەك بابەتی سەر کەشی وا کە هیچ لە کێشە گەورە مرۆڤایەتی یەکان نەگۆڕن.

*** پاڵەوان لە چیرۆکی (لەتیف) حامیدا:**

حەسەن جاف

لەتیف حامید یەکێکە لە سەربازە لەبیرچووەکانی چیرۆکی کوردی، ئەمە راستییەکە زۆر بەداخەوە دەبێ بگوترێ، بەڵام هۆیەکەی چییە؟ ئەمەیان مەسەلەیەکە یەخەی هەر هەموومان دەگرێتەوە بە چیرۆکنووس و رەخنەگرو هاوڕییانی لەتیف و کەس و کارەکەیشی. مەبەستیش لەم نووسینە تاوانبار کردنی دیاردەیەکە هەزاران جار لەسەر لاپەڕەی گۆڤارو رۆژنامەکاندا باسمان لێوە کردوەو داوای چارەسەرمان بۆ کردوە، بێ ئەوەی هەر یەکێك لە ئێمە هەوڵی ئەوەی دابێ، لەلای خۆیەوە یەکەم هەنگاو بنێ، گومانیشی تیانییە کە دوورترین رێگا لە یەکەم هەنگاوەوە کورت دەبێتەوە. ئەو دیاردەیە، بریتییە لە یادکردنەوەو رێزلێنانی نووسەرانمان. پێشەنگەکانی کاروانی نووسینی کوردی بن وەك: حوسێن حوزنی و دڵدارو شێخ نوری شێخ ساڵح و موحەرەم محەمەد ئەمین و عەبدوڵڵا جەوهەرو شێخ مارف بەرزنجی و گیوی موکریانی.. هتد، ئەمانەو کەسانی دیکەش، کە چەپۆکی مەرگ خامەی لە دەستیان خستە خوارەوەو چەپۆکی کەمتەرخەمی ئێمەش خەریکە وێنەو روخساریانمان لە بیر دەباتەوە، یان ئەوانەی هێشتا لە ژیاندان و هەموو یەکێك لە ئێمە دان بەوەدا دەنێت کە یەکەم هەنگاوی دڵداریمان لەگەڵ ووشەی کوردیدا لەوانەوە دەس پێدەکات وەك: عەلائەدین سوجادی، تۆفیق وەهبی، شێخ محەمەدی خاڵ، بلە، ئەحمەد هەردی، کامەران، شاکر فەتاح.. هتد.

کورد زۆر لە مێژەوە گوتویەتی: "تۆ بۆ باوکت چۆن بێت، ئەولادیشت بۆ تۆ وا ئەبێت". دەبا ئێمەش ئەم رێچکەیە بشکێنین و یاساو دەستوورێکی تازە دابرێژین، کە هەموومان بە پێویست و پیرۆزی دەزانین، یادی ئەو رۆڵە بە ئەمەکانەی ووشەی کوردی بکەینەوە: لە یادی کۆچ کردنیاندا شتێکیان لەسەر بنووسین، نووسینەکانیان کۆبکەینەوەو دیدارو فیستیڤاڵانە بانگ بکەین و رێزیان لێ بنێین، تاکو لەدوا رۆژدا، کە مێردەزمەی مەرگ سوار سنگی ئێمەش دەبێت و خامەمان لە دەست دەفرێنێ ئەوە نەبێ بەدوا قۆناخ و دوا وێنەی ئێمە لە بەرچاوی وەچەی دوارۆژو لە تارماییەکی لێڵ و تەماوی بەولاوە هیچی ترمان لێ نەمێنێتەوە.

لەم روانگەیەوەو بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە پیرۆزە ئەم توێژینەوەیە نووسراوە. ئەمرۆ واخەریکە دە ساڵ بەسەر کۆچی (لەتیف حامید)دا تێ دەپەڕێ بێ ئەوەی هیچی بۆ کرابێ، لەگەڵ ئەوەی (لەتیف) یەکێکە لەو کەسانەی رۆڵێکی دیارو دان پیانراویان هەیە لەتازە کردنەوەی چیرۆکی کوردیدا. لە راستەقینەشدا (لەتیف حامید) چیرۆکنووسێکی ئاسایی نیەو چیرۆکەکانی رووکەش نین و بەئاسانی خۆیان بەدەستەوە نادەن، چونکە زادەی بیرێکی قووڵ و رۆشنبیرییەکی فراوان و دەریایێکی پان و بەرین و بێ کەنارن و پێویستیان بەمەلەوانێکی شارەزاو بە ئارام هەیە بچێتە قووڵایی ئەو دەریایەو لەسەرخۆو هێدی دەنکە مرواریەکانی دەربێنی و ملوانکەی شانازی و پێ زانینی لێ دروست بکات و گەردنی چیرۆکی کوردییان پێ برازێنێتەوە. لەلای خۆمەوە نامەوێ بەهیچ جۆرێك ئەو (ئیحایە) بە ئێوەی بەرێز بدەم کە ئەو مەلەوانە منم، نەخێر، بەڵکو ئەم نووسینەم تەنها هەوڵێکە یان بابڵێم هەنگاوی یەکەمە، جا ئەگەر بتوانم (لەتیف حامید) بخەمەوە بیر نووسەران و رەخنەگرانمان، ئەوا خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم لە دوو لایەنەوە: لایەنی یەکەم، بەوەی کە هەوڵم داوە نووسەرێکی تازەکەرەوەو چیرۆکنووسێکی لێهاتووم لە کونی تاریکی لەبیر چوونەوەوە هێنابێتەوە بەر تیشکی چاوی ئەدیبان و خوێنەران، بەڵکو ئەوانیش بەپێی توانست شتێکی بۆ بکەن. لایەنی دووەم، بەوەی کە رەنگە ئەم نووسینە ببێتە هاندەرێك بۆ بنەماڵەی لەتیف، بکەونە خۆیان، بەرهەمەکانی کۆبکەنەوەو لە چاپی بدەن و ماف و یادی ئەو رۆڵە هونەرمەندەیان لە دەستی رۆژگار بپارێزن.

بەهەر حاڵ، وەك گوتم، هەرکام لەم دوولایەنە بێتەدی من خۆم بەسەربەرزو بەختیار دەزانم. ئەم هەوڵەشم تەنها مۆمێکە لەسەرگۆڕی ئەوبرا چیرۆکنووسەماندا دایدەگیرسێنم بەئومێدی ئەوەی بتوانم هەندێك لایەنی هونەری چیرۆك لای ئەم نووسەرە بخەمە روو. ناچاریشم لەبەرئەوەی کەس دەستی یارمەتی بۆ درێژ نەکردم، پەنا بەرمە بەر ئەو پێنج چیرۆکەی بڵاوی کردوەتەوەو بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. (سێ هەنگاو بەرەو ئەودیو)، لە رۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە (٤٣)، رۆژی (٣١)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٠) دا بڵاوکراوەتەوە.

٢. (قوڵپی رشانەوەی رەش)، لە رۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە (٢٣)، رۆژی (١٠)ی تەمموزی ساڵی (١٩٧١)دا بڵاوکراوەتەوە.

٣. (رۆژژمێری خەواڵویەکی شاری سەلجووقی)، لە رۆژنامەی (هاوکاری)، ژمارە (٣٩)، رۆژی (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧١)دا بڵاوکراوەتەوە.

٤. (بەشێك لەداستانی سواڵکەرە نەناسراوەکە)، لە گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (١)، ساڵی (١٩٧٢)، لاپەرە (٤٦ – ٤٩)دا بڵاوکراوەتەوە.

٥. (زەرد، سوور، سەوز، شین)، لە گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (٩)، ساڵی (١٩٧٣)، لاپەرە (٢٥)دا بڵاوکراوەتەوە.

٦. بێ لەم چیرۆکانە، لە رۆژنامەی (هاوکاری)دا چاوپێکەوتنێك لەگەڵ (لەتیف حامید)دا بڵاوکراوەتەوە بەناونیشانی (لەتیف حامیدو شتەکانی سەردەمێکی کە) ئەم چاوپێکەوتنەش (کاك ئەحمەد شاکەلی) ناردویەتی و لە ژمارە (٣٤) لە رۆژی (٢٥)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧١)ی ئەو رۆژنامەیەدا بڵاوکراوەتەوە.

٧. ووتارێکی (لەتیف) کە بەعەرەبی لە رۆژنامەی (التآخي) لە رۆژی (٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٠) دا لەژێر ناونیشانی (مستلزمات الثورة والتجديد في الشعر الكردي المعاصر) بڵاوی کردبووەوەو بریتییە لە باسێك کاتی خۆی لەدیداری یەکەمی شیعری کوردیدا لە کەرکوك

خوێندبویەوە، ئەو ووتارەم لە (لەتیف) هەڵمەتی شاعیرەوە پێ گەیشت زۆر سوپاسی دەکەم.

٨. جگە لە مانەی بڵاوکراونەتەوە، (کاك محەمەدی مەلا کەریم) پێی ڕاگەیاندم کە (لەتیف حامید) چیرۆکێکی بۆ گوڤاری (تووتن) ناردبوو، بەڵام بڵاو نەکرایەوەو لەدواییشدا – وەك کاك محەمەد دەڵێت – ئەو چیرۆکە وون بوو و گەلێکیش بۆی گەڕابوو، بەڵام بەداخەوە بۆی نەدۆزرابوەوە.

بێ لەو هۆیانەی پێشتر باسم کردن، شتێکی دیکەش هانی دام بۆ نووسینی باسەکەم، ئەویش ئەوەیە کە (لەتیف) یەکێکە لەو نووسەرە کەمو دەگمەنانەی ڕەخنەگر دەتوانێ بەئاسانی هێڵێکی فیکری بدۆزێتەوە کە نووسینەکانی بەیەکەوە دەبەستن، بێ ئەوەی هیچ دژایەتییەك لەنێوان چیرۆکێكو یەکێکی تردا بدۆزێتەوە، ئەمەش بەبڕوای من لە سێ شتەوە هاتوە:

یەکەمیان: دەسەڵاتو گەییویو تێگەیشتنی (لەتیف حامید) لە هونەری چیرۆك.

دووەمیان: ڕۆشنبیرییەکی قووڵ کە دەبێتە پاڵپشتو یاریدەدەری نووسینەکانی.

سێیەمیان: (لەتیف حامید) نووسەرێکی لێهاتوو زیرەك بوو، دەیزانی بۆ کێی دەنووسێو چیی دەنووسێو بۆ چیی دەنووسێ.

لەم باسەوە، دێمەوە سەر باسەکەمو هەوڵ دەدەم ئێوەش لەگەڵ خۆمدا بۆ ئەو گەشتە بەلەزەتەی ناو دەریای هونەری (لەتیف) بەرم. لە پێش هەموو شتێکدا هەوڵ دەدین ئاکارو ئەدگارە گشتییەکانی پاڵەوان لە چیرۆکەکاندا دەس نیشان بکەین، ئەم ئەرکەش، هەرچەندە بەڕواڵەت گران بێت، بەڵام لە ڕاستەقینەدا، زۆر ئاسانە چونکە وەك پێشتر گوتمان (لەتیف حامید) نووسەرێکی ڕۆشنبیرە دەزانێت چی دەنووسێت. هەر لەبەر ئەمەشە کە چیرۆکەکانی سیماو نیشانە فیکرییەکەی خۆیان وون ناکەن، بەهەمان شێوەش پاڵەوانەکانی یان لە ڕاستەقینەدا پاڵەوانەکەی ئاکارو ئەدگارە تایبەتییەکانی دەپارێزێ، بۆیە دەتوانم بڵێم ئەم پێنج چیرۆکە یەك چیرۆکنو پاڵەوانەکانیشیان هەر یەکە. سەلماندنی ئەم بۆچوونەشم وەنەبێ کارێکی دژوار بێت، چیرۆکەکان خۆیان چرامان دەدەنە دەستو بەرچاومان ڕووناك دەکەنەوەو ڕێمان بۆ خۆش دەکەن بەرەو ئەو مەبەستە، هەروەها (لەتیف) خۆشی یارمەتییەکی جوامێرانەمان لەم ڕووەوە دەدات. لەو چاوپێکەوتنەی باسمان کرد، کە باسی پاڵەوان لە چیرۆکەکانی خۆیدا دەکات دەڵێت: "تەنها پاڵەوانێکم هەیە، ئەویش وەکو سارتەر دەس نیشانی کردوە، مرۆڤێکی تازەیە، ژیانی لە کۆتاییەوە دەست پێدەکات. جەنگاوەرە ئاگر بەرئەداتە قۆناغەکان، ئەوەندە مەرگی کەسانی کەی دی وای لێ هاتوە نایەوێ خۆی بژی بەقەد ئەوەی ئەیەوێ کەسانی دیکە سەرکەون.. ئەم لە سەرکەوتنی خۆی بێزارە، ئەم بێزارییە سەرچاوەی ئازایەتییەکی بێ پایانە، ئێمە ئەبێت بەمرۆڤ مرۆڤێکی تر مرۆڤێکی باشتر"، کەواتە وەك وتمان پاڵەوان لەهەر پێنج چیرۆکەکەدا یەك پاڵەوانەو ئەدگارەکانیشی هەریەکە.

بۆیە دەتوانین ئاکارە تایبەتییەکانی پاڵەوانەکەو هێڵە سەرەکییەکانی چیرۆکەکان لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە.

١. پاڵەوانێکی یاخیی گەشبینی نامۆ.

٢. خۆشەویستییەکی قووڵو بێ سنووری خاكو نەتەوە.

٣. بێ ئاگایی و خامۆشی خەڵکی شارەکەی، کە جەفەنگی نەتەوەکەیەتی، بێ پەروایی هێندێ جار تاونبارکردنی هەوڵو کۆششەکانیو خۆکەرکردنی لەئاست ئەو ئێشو ئازارو ئەشکەنجانەی دووچاریان دەبێت کە ئەمەش هۆیەکی گرنگی هەست کردنییەتی بەنامۆییەکەی.

٥. مرۆڤە ئامێرەکانو یاساوڵە کەڵبە درێژەکان کە جەفەنگی زۆردارو داگیرکەرن.

بەڵام پێش ئەوەی باس لەهەر کام لەم ئاکارانەوە بکەین دەگەڕێینەوە سەر (لەتیف)، بزانین خۆی چی دەڵێتو چۆن ئەم هێڵە سەرەکییانەمان بۆ دەستنیشان دەکات.

ئێمە گوتمان ئەم پاڵەوانەی (لەتیف) بزێوو یاخیو کۆڵنەدەرە، جا بابزانین خۆیشی وا دەڵێت یان نا؟: "لە سەرەتای ئازارو ڕاچەنینی پاڵەوانەکەمەوە دەست پێ ئەکەمو ئەویش لە بزێوی خۆیا مۆڵەتی من نادات بەو ڕێگەیەدا ببیەم کە بۆم کێشاوە، هەردەم لە پێشمەوە بەرەو ئەو شوێنەی مەبەستییەتی تەکان ئەدات"، دەربارەی نامۆیی پاڵەوانەکەشی دەڵێت: "وەك ئەوەی (سان جۆن پێرس) ئەیگێڕێتەوە: وام ئەزانی لەگەڵ خەڵکا ئەژیم.. کاتێکم زانی زەوی بۆنێکی سەیر ئێق ئەکاتەوە، ئەم جیهانە خەڵەفاوە، جیهانێکی پڕ لە بارزگانییە، چەن ووڵاتێکی گەورە لە هەراج دایە، تاوەکو لە ژێر قرچەی خۆرا بفرۆشرێن. گردۆڵکەکان فس ئەکرێنەوە. ووڵاتەکان لە نێو بۆنی گەڵا نرخێکی هەرزانیان بۆ دائەنرێت جامبازەکانی کڕینو فرۆشتن هاتن.. چەن پیاوێك بوون لەدوورەوە هاتبوون، دەستکێشی پیسیان لە دەس کردبوو، بۆ ئەوەی زیاتر دڵ ڕەقی بنوێنن دوایی هەموو دادپەروەرەکان هاتن، ئەوانەی وا پۆلیس کۆئەکەنەوە، یاساوڵ ئەگرنە خۆیان، دوایی شەماشەکان هاتن ئەوانەی هەڵپەی پایەی ڕابەری ئەکەن بەم جۆرە لەنێوان پەشێوەکانا خەومان ئەبینی"[٢].

کە دێنە سەرباسی شارەکەی کە گوتمان ڕەمزی نیشتمانو نەتەوەکەیەتی بەم چەشنەی خوارەوە خۆشەویستییەکەی خۆی دەر دەبڕێ: "شارێکە خۆشەویستەکەمی تێدا لە دایك ئەبێت.. شارێکی بێ یاساوڵو دیوارو شایە"، لە دواییدا کە دێتە سەر باسی ئەو ئێشو ئازارانەی ناخی دەهەژێننو مێشکی جەنجاڵ دەکەن، بەم جۆرە باسیان لێو دەکات: "من ئازارێکی قوولم، کە بەناخی خۆما ئەچمە خوارەوە، هەست بەوە ناکەم کە بە تەنها خۆمم ئەوێت، کە شتێکی جیاوازم لە خەڵکی شارەکەم، بەڵکو مرۆڤایەتی هەڵئەبژێرم، هەموو کەسێك لە خۆیابوونو سەربەستییەکی تایبەتی هەیە، لە ڕێگەی کردارەکانمەوە". ئەمە پوختەی بیروراکانی (لەتیف) حامیدی نووسەرو ڕۆشنبیرە کە بەهیچ جۆرێك ناتوانێت، هەرچەندە هەوڵیش بدەیت، دێڕێك یان ڕستەیەك بدۆزیتەوە، لە چیرۆکەکانیدا، دژیان پێچەوانەی ئەم بیروڕایانە بێت. بۆ

سەلماندنی ئەم بۆچوونەشمان هەوارمان دەگوێزینەوە ناو کوێستانی پڕ گوڵزاروو سەوزایی چیرۆکەکانی و لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆیدا بەراوردیان دەکەین تا دەگەینە ئەو ئینجامانەی پێشتر باسمان لێوەکرد.

چیرۆکی یەکەمی (سێ هەنگاو بەرەو ئەودیو) پاڵەوانەکەی بە بڕیاری کۆمەڵ شێتەو لە شێتخانە توونـد دەکرێت، هەر چەندە دەشزانن وا نییە، بەڵام بەرژەوەندیان لەوەدایە کە بە شێت لەقەڵەم بدرێت: "ئەو شێتە بۆچی بەرەڵڵا کراوە؟ خۆشار بێ خاوەن نییە؟"، کەواتە لێرەوە یەکەم نیشانەی ئەم پاڵەوانەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە مرۆڤێکی سەرکەش و بزێوەو کۆمەڵەکەی لێی دەترسێ و نایگرێتە خۆی و دەیەوێ لە کۆڵی بێتەوە بەهەر شێوەو هەر ڕێگایەك بێت.

لە چیرۆکی دووەمـدا (ڕۆژمـێری خـەوالـویـەکـی شـاری سەلجووقی) هەمان پاڵەوانی بزێوو یاخی بەدی دەکەین لـێرەدا بەشێتی لـە قـەڵـەم نـادەن چونکە وادیـارە یاخی بوونەکەی ئەوەندە کاریگەرەو کۆمەڵی وروژانـدوە شێت خانە چارەسەری نەکات، بۆیە پەنا براوەتە بەر زیندان بۆ خپ کردنی یەکجارەکی دەنگی ئەو رۆڵـە ئازایە: "گەورەم ئەمە ئەو یاخییە سەرپێچی فرمانەکانی بەرێزتانی ئەکرد، نۆ رۆژ لـەمـەو پـێش شـاری لـێمـان هـاوردە بـووە کـوڵ"، پاڵەوانی چیرۆکی سێیەم (قوڵپی ڕشانەوەی ڕەش) هەمان ئاکاری هەیە، بەڵام کۆمەڵ لێرەدا ڕێگایەکی تازەی لەگەڵدا گرتوەتەبەر، هەوڵی داوە بیگرێتە ئامێزو لە قسەی خۆش و هەڵخلەتێنەر، لە ڕێی ڕاستی لابدات و لە خشتەی بەرێت، لە هەمان کاتیشدا سنوورو بەربەستی بۆ دابنێت و لغاوی بگرێتە دەست: "ئەوەندە بزێو مەبە.. دوامان کەوە هێشتا نۆرەی ئەوەت نەهاتوە پێش کەوی".

سواڵـکەرە نەناسراوەکەی چیرۆکی چـوارەم نموونەی پاڵەوانی ڕێوی و یاخی و سەرکەشەو بەتەواوی پێچەوانەی ئەو کۆمەڵەی تێدا دەژی دەوستێ و ڕەفتار دەکات. هۆی ئەم دژایەتییەش لە دواییدا دێینەوە سەری: "بە بۆنەی ڕۆژی ساڵی تازەوە، شار ڕازاوەتـەوە، لافتەکان خراونەتە ڕوو، بە چوار دەورمان دەشەکێنەوە"، کەواتە خەڵـکی لە ئاهەنگدان، "ئەی ئەم لە چی دایە؟ هەگبەکەی بەشانیا دەداتـەوەو زۆر بەشانازییەوە دەڵێت: دەستم کردە سرینەوەو گۆڕین"، بۆیە دیسانەوە لێی دەپـەڕن و چوار دەوری دەگرن و کەلەبچە بۆ مەچەکی دەکـەن، "هـەر کە کـەوتـمـەڕێ چوار دەورم گیراو بازنگیان بـۆ مەچەکم بـرد"، وەنـەبـێ تەنها بـەم شێوەیە ویستبێتیان بێ دەنگی کەن، بەڵکو هەوڵی ئەوەشیان داوە هەڵی بخلەتێنن و بیکڕن، بەڵام ئەم سەرکەشە یاخیە بەهیچ جۆرێك (لـەکـڕیـن نـایـەت)، "چـەن جارێکیش بە تۆمەتی دەستکردو درۆ لە بەندیخانەیان توونـد کردوە، جارێکی کە بە تاوانی پەیوەندی کردنیا لەگەڵ تاونبارێکی ڕاکردوا بەند کراوە".

لە دوا چیرۆکدا (زەرد، سـوور، سـەوز، شـین)، وێنەی پاڵەوانێکی تێکۆشەرو خاوەن ڕابوردویەکی خەباتگێڕانەمان بۆ دەکێشێ: "کە لە زانستگا بەیانەکەمانیان دڕاند، چاوت لێم بـوو چـۆن چۆکم پـێ یـان دادا". بـەڵام تـۆ بڵێیت ئەو کۆمەڵە هـەروا بە ئاسانی بـەوە قایل بن و وازی لـێ بێنن. ئـەم چۆکیان پـێ دابـدا؟ نەخێر! ئەمجارەیان بەشێتخانەو بەندیخانە وازی لـێ ناهێنن، هـەر چەندە ئـەو هەوڵەشیان داوە: "لەو کاتەوە کە خۆم لە ماڵتانا شاردبوەوە گەلی شت ڕووی داوە"، ئەمجارەیان بیرە بۆگەن و لە بازنەی تاواندا وڵاوەکەیان، ڕێیەکی تازەتری دۆزیوەتەوە بەڵکو بەو هۆیەوە چۆکی پێ دابدەن، لە ڕێـی ڕاسـتی خۆی لای بدەن، هەوڵ دەدەن دلخوازەکەی لێ بکەن: " سەرم هەڵبڕی چاوم پێت کەوت.. بەرەو پیرت هاتن و ویستیان لە منت بکەن"، ئەمەیان ئەدگاری یەکەمی پاڵەوانەکەی (لەتیف) بوو بزێوی و یاخی گەری، لە پاڵ ئەمانەشدا باسی نامۆیی کەسی چیرۆکەکانمان کرد، ئەوجا بابزانین ئەم قسەیەمان تا چەن بردەکات، بەڵام پێشتر دەبـێ بپرسین مـرۆڤ بۆچی و کـەی لە کۆمەڵەکەیدا نامۆ دەبێت و هەست بەو تەنیاییە دەکات کە خاسییەتێکی زەقی نامۆییەکەیە. کاتێ کە مرۆڤی ڕووناکبیرو ووردبین، هەست بەکەم و کوڕی کۆمەڵ دەکات و هۆیە ڕاستەقینەکانی دەدۆزێـتـەوە لـەلای خۆیەوە هـەوڵ دەدات ئەو کەم و کوڕو کەلێنانە پڕ بکاتەوە، کاتێ کە کومەڵ بە تـەواوی بێ ئاگا دەبێت لەو پیلانانەی بۆی دادەنرێت بەمەبەستی. شێواندن و لە خشتەبردن و فەوتاندن، یان بە ئاگایە بەڵام هیچ ناکا یا هیچی بۆ ناکرێ، جا لە کەم دەسـەڵاتـی و ترسەوە بێ، یا لەپێناو بەرژەوەندی کاتیدا بێ، یا لەکەم هۆشی و لە ئاستی ڕووداودا نەبوونەوە بـێ، یانیش بەقسەی زل و دروشمی بریقەدار هەڵخەڵەتانەوە بـێ، یان هەر هۆیەکی دیکە.. ئا لەو کاتانەدا مرۆڤە هۆشمەندو ڕووناکبیرو ووردبینەکان هەست بە نامۆیی و تەنیایی دەکەن، هەست دەکەن خەڵـکەکە لە ئاست ڕووداوەکاندا نین، بێ ئاگان، تەنانەت ئەمانیش تاونبار دەکەن، جارێك لە شێتخانەیان توونـد دەکەن، جارێك لە زیندانیان قایم دەکەن، جارێك دەیانکوژن، جارێك دلخوازو خۆشەویستیان لێ دەکەن.. هەر جارەی شێوەیەك و هەر کاتی ڕێگایەك. بەڵام دەبێت لێرەدا ڕاستییەکی جەوهەری هەیە لە بیرمان نەچێت، ئەویش ئەوەیە کە نامۆیی پاڵەوانەکە دوورە پەرێزی و ئەنجامێکی سروشتیی خۆشەویستییە قووڵەکەی خاك و نەتەوەکەیەتی هەر لەبەر ئەمەشە کە دەبێتە هۆیەکی هاندەرو پاڵ پێوەنەری بەرەو بەدی کردنی ئاسۆیەکی نوێی گۆڕان و تازەکردنەوەی کۆمەڵگاکەی.

پاڵەوانی چیرۆکی یەکەممان هەست بەتەنیایی دەکا کە یەکەم قۆناخی نامۆییەکەیەتی: "لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا هەر خۆم بەدی ئەکەم"، ئەم تەنهاییەشی لەوەوە هاتوە کە: "لێرەدا هیچ شتێك لە جێی خۆیدا نییە، سەیری هەر لایەك ئەکەم شوێن دەستی نەزانی و وێڵی پێوە دیارە"، نەکو هەر شتەکان بەڵکو کەسەکانیش: "کەس لە بەرگی خۆیا نەبوو هەر لە بلقی ئاو ئەچوون، شارەکەم لەلا بلقێکی گەورە بوو"، لە هەمان کاتیشدا، ئـەم بـێ پەروایە نە کۆڵی پـێ دەداو نە لە پەیامە پیرۆزەکەی پەشیمانی دەکاتەوە: "من ئێستا ژوورەکەمان بە شێوەیەکی تر ئەرازێنمەوە.. بە جۆرێك کە بگونجێ لەگەڵ ئارەزووماندا"، کە دەچنە سەر چیرۆکی دووەم پاڵەوانەکە دەبینین زۆر بە قووڵی هەست بە نامۆییەکە دەکا و

بەم شێوەیە بۆمانی روون دەکاتەوە: "من هاوولاتییەکی شاری سەلجووقم، هەست بەوە نەکەم کە شتێکی جیاوازم لە خەڵکەکەی شێوەی هەڵبزرکاوان کرووزە ئەخاتە دلمەوە، کە چی ئەوان من ناناسنەوە، راستی منیان لێ شاراوەتەوە"، بە زۆرە ملێی خۆی نەبێت داڵدەی شەوێکی نادەن، بەڵکو لەوەشەوە هاتوە کە ژیانی خۆیو خەڵکەکە لە بازنەیەکی داخراوی بێ سەرەتاو کۆتاییدا دەخوولێتەوەو سەرجەم ئەو ژیانە دەکاتە شتێکی بێ هودەو ئامانج: "ئەمرۆ وەك دوێنێ، دوێنێ وەك ئەمرۆ"، ئەوەی زیاتر ئازاری ئەم پاڵەوانە خەستتر دەکاتەوە ئەوەیە کە تەنانەت هاورێ کانیشی دەرکیان بەم بارە ناهەموارە نەکردووەو هەستی پێ ناکەن چونکە وەکو ئەم ووردبینو بەدیقەت نین: "هاورێ کانم وەکو من لە شت وورد نابنەوە هەست بە شپرزەیی ناکەن، وا خراوەتە دڵیانەوە کە شوێن لەمە خۆشتر نابێت، رۆژ نییە بەزمو سەما نەگێرن"، ئەمەشمان بەلاوە سەیر نابێت کە دەزانین هاورێکانی خەو بە بەشێك لە ئاواتەکانیان دەزانینو بەهۆیەکی لە باری راکردن لە واقیعی دادەنێن: "خەوبینین بەشێکە لە ئاواتەکانمان".

لە (قولپی رشانەوەی رەش)دا دیسانەوە هەمان وێنە دووبارە دەبێتەوە: "ئەمانەی دەوری هەموو خپ خەوتوون"و پەرواو ئاگا لە پیلانی دوژمنو: "بێ سەرو شوێن دەشتیان داوەتە بەر نازانێ بەرەو کوێ مل دەنێن"، ئەم بارە خامۆشیەو بێ پەروایيە خەلکەکە ئاگر لە دەروونیا دەکاتەوە، نە ئەوەیە بتوانێ خۆی لێیان دابڕێ چونکە ئەمە پێچەوانەی بڕواو ئاواتەکانییەتی، نە ئەوەشە ئەو لێشاوە بەربەست بکا، لەبەر ئەوەی ئەمەشیان لە توانای تاقە کەسێکدا نییە: "مردنی ئەمانە گر بەرئەداتە دلی، ناتوانێ خۆی لێیان دابڕێ، ئەم لێشاوە لێخنەیشی پێ بەربەست ناکرێ"، ئەم پاڵەوانەش وەك ئەوانی دی تەنهایە: "وا بەتەنها کەوتە رێ لەم ژیانە شێواوەدا"، خەڵکەکەش بە هەمان دەستوور لە بەرزمو رەزمی خۆیان دانو: "مۆڵەتی ئەم نادەن بێتە دوو"،و پەیتا بە بەر گوێدا دەدەن: "نۆرەت نەهاتوە ددان بە خۆتا بگرە". سواڵکەرە نەناسراوەکەش هەست بەتەنیایی دەکات لە ناو کۆمەڵێکی خەواڵووی خەو خۆشدا کە وەك: "شێرە کوللەی لاق شکاو"یان لێ هاتووەو: "لەژێر سێبەری درەختێکا خەوێکی خۆشیان"، لێ کەوتوە بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە: "خەوی ژێر سوورە چناری چەماوە"، رۆژێکی لە تەمەنیان کەل کردوە، کەچی هێشتا بای ئەوەیان پێیە رێ لەم بگرنو نەهێڵن بەکامی دلی خۆی بەستەیەك بڵێت: "لە توانامـا نیە پڕ بە دلی خۆم بەستەیەك بڵێم".

لە چیرۆکی (زەرد، سوور، شین)دا پاڵەوان خاوەنی هەمان ئاکارەو بەهیچ شێوەیەك لە پاڵەوانەکانی تر جیا ناکرێتەوە، بە هەمان رێو شوێن پاڵەوانێکی نامۆی گەلو یستو خاك پەرستە لەناو کۆمەڵێکی بێ ئاگاو خامۆشدا، هەموو شتێك گۆڕاوەو کەس کەس ناناسێتەوە، تەنانەت لە شارەکەی خۆشیا وەك نابەڵەد ناوی هاتبوو: "کەلە گەشتەکەم گەرامەوە هیچ شتێك وەکو خۆی نەما بوو شەقامەکان بە تەواوی ناناسییەوە، هاورێکانم شێوەیان شێوابوو، بەنابەڵەدی ئەسوڕامەوە"، خەلك دەوروبەری لەوە دەچێت لە: "خەوێکی خۆش"دا بن، لەبەر ئەمەیە بەدڵدارەکەی دەڵێت: "ئەم کۆرە شایستەی ئەوە نەبوو منو تۆ یادی خۆمانی تیا جێ بهێڵین".

ئەمەی ئێستا باسمان کرد نیشانەی یەکەمو دووەمی پاڵەوانەکان یا لەراستیدا پاڵەوانەکەی (لەتیف) بوو، لێرە بەدوا دەچینە سەر ئەدگاری سێیەم کە گوتمان بریتییە لە خۆشەویستییەکی بێ سنووری خاكو نەتەوە، ئەم راستییەشمان لە گشت دێرێکی چیرۆکەکاندا بۆ دەردەکەوێ. پێش ئەوەی نموونە بخەینە پێش چاو خوێنەری بەرێز پێویستە ئەوە بلێن کە نامۆی پاڵەوانەکە باشترین بەڵگەی ئەم خۆشەویستییەیە کە باسی دەکەین، ئەی ئەگەر وانەبێت بۆ ئەوەندە بیر لە ئازارو دواکەوتویی کۆمەڵەکەی دەکاتەوە، چۆنە واهەست بە ئاواتو خەونەکانیان دەکات، لەپێناو کام بەرژەوەندی خۆیدا هەوڵ دەدات چارە سەرێکیان بۆ بدۆزێتەوەو تووشی جۆرەها ئازارو سەرکوت کردن بێ. چیرۆکەکانیش پڕن لە بەلگە، لە چیرۆکی یەکەمدا پاڵەوانەکە دەڵێت: "لێرەدا هیچ شتێك لە جێی خۆیدا نییە، سەیری هەر لایەك ئەکەم شوێن دەستی نەزانیو وێڵی پێوە دیارە"، بەلام وەنەبێ لە ئاست ئەم بارە ناهەموارەدا دەستەو سان بوەستێ. کە دەبینێ هیچ شتێك لە جێی خۆیدا نەماوە، یەکسەر بریار دەدات: "من ئێستا ژوورەکەمان بە شێوەیەکی کە ئەرازێنمەوە"، بەلام چۆنی دەرازێنێتەوە؟ وەك خۆی دەیەوێ، کەواتە دەبێت وەك تاکێك بیر بکاتەوەو بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لەبەر چاو بگرێ! کە ئەمەش پێچەوانەی رەوشتی ئەوە، چونکە ئەو دەیەوێ ژوورەکەی یان شارەکەی یا وولاتەکەی: "بە جۆرێك کە بگونجێ لەگەڵ ئارەزوومانا" برازێنێتەوە. خەواڵووەکەی شاری سەلجووق، شەیدای شارو خەلکەکەیەتی کە رەمزی نیشتمانو نەتەوەکەین، لە هەموو چیرۆکەکانا (شار)و (خەلك) بەم واتایەو بۆ ئەم مەبەستە وەك جەفەنگ بەکار هێنراون: "من هاوولاتییەکی شاری سەلجوقم ناسنامەکەم ئەم شارەی پێوەیە، خۆشەویستی خاکەکەی نەخشەیەکی تووڕەی بۆ هەنگاوەکانم کێشاوە، کلپەی ئاگرەکەی لە پەرەی تەمەنمەوە ئالاوە، رەنگە هەڵقرچاوەکەی ئاوازێکی تراجیدی بەخشیوە بە گۆرانییەکانم. من هاوولاتییەکی شاری سەلجوم، هەست بەوە ناکەم کە شتێکی جیاوازم لە خەڵکەکەی شێوەی هەڵبزرکاویان کرووزە ئەخاتە دلمەوە"، ئەم خۆشەویستەی ئەوەندە قوولو مەرگ داکوتاوە، بەلایەوە مەبەست نییە ئەگەر خۆیشی بفەوتێ، تەنها مەبەستو ئامانجی ئەوەیە پەیامە پیرۆزەکەی رابگەیێنێ، بۆیە داوا لە خەڵقی شارەکەی دەکات: پێی خۆیان دابگرن، نەخشەی شاری سەلجووق نەدۆڕێنن لە: "قولپی رشانەوەی رەش)دا، نەخشەی هەمان مرۆڤی گەل ویستو خاك پەرستمان بۆ دەکێشێ. کە خەڵکی شارەکەی گیرۆدەی دەستی ئەو پەتا پیسە دەبنو وەك: "خێڵی هەجیجیان لێ دێ"، "وبێ سەرو شوێن دەشت دەدەنە بەرو نازانن"، بەرەو کوێ مل ئەنێن: "کسپە لە دەروونییەوە هەڵدەسێو وەك رۆڵەیەکی بە ئەمەکی ئەو کۆمەڵە خۆی لێیان دانابڕێ هەر چەندە بە مرودشیان دەزانێ" مردنێ ئەمانە گر بەر ئەداتە دلی، ناتوانێ خۆی لێیان دابڕێ"، بەلام لەبەر ئەوەی ئەمیش

وەك ئـەوان: "ژەنـگی چەند سـاڵـەی دیـوەخـان لـە کەڵکی خستبو"، لێشاوەکەی پێ بەربەست نەدەکرا، هەروەها هێزی دوژمنیش زۆرو بەتواناو دەسەڵاتن، بۆیە: "لەرێکی بەگڕا چوونان نەبوو"، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەر بڕیار دەدات شتێك بکات و لە ئاست ڕووداوەکاندا بێ هەڵوێست و بێ دەسـەڵات ڕانـەوەسـتێ: "ئەبێ هەر بێمە دەسـت". ئەم هاتنە دەستەشی لەبەر خۆی نە، چونکە کە خۆیشی وەك ئەو خەڵکە ژەنگی هەڵهێنا بێ ولە ڕێکی بەگڕا چوونی زۆردارنا نەمابێ، ئەی نەوەکانی داهاتووکە هەمان مەترسی هەرەشەیان لێدەکاو ڕەنگە تووشی ئەو هەڵدێرەی ئەمان بن، دەبێ چی بکەن؟ لەبەر ئەمە دێتە دەست، لەپێناو کۆمەڵ و وەچەکانی دوای خۆی: "بەڵام با نیشانەیەك جێ بهێڵێ، لەمە بەولاوە هیچی تری بۆ ناکرێ، کۆمەڵەکەی دواوە با بەبۆنی کەلاك نەکەون"، ئەوە تەنها شتێکی پێی بکرێ و گرنگترین شتیشە سواڵکەرە نەناسراوەکە، لە سەرەتادا وامان تێدەگەیەنێ کە بەهار دوورەو هەروا بە ئاسانی چاومان بە گوڵاڵە سوورەو نێرگزی لاپاڵی شاخەکان و پانتایی دەشتەکان زاخاو نادەین، چونکە ئەو ڕاستییانەی ئەو دەیزانێت، خەڵکەکەی لێ بێ ئاگان ئەوان باوەڕیان وایە کە: "پاشا چاوی زۆر بڕ ئەکات و جەنگاوەرە"، لە کاتێکدا ئەم باشتری دەناسێ و دەزانێ کە چاوەکانی پاشا: "بەر پێی خۆی پێ نابینێ" و جەنگاوەریش نیە بەڵکو مرۆڤێکی بـەزیـوە. بۆیە کە پێشبینییەکانی دێنەدی و پاشا لە ناو دەچێت ئەوسا هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵدەکێشێ و پڕ بـەدەم هـاوار دەکـات: "بەهـار نزیکە"، خۆشەویستییەکەشی لە سنووری چاوەڕوانـی کوژرانی پاشادا ناوەستێ، بەڵکو هەوڵ دەدات خەڵکەکەش لەگەڵ خۆیدا فێری بەستەی تێکۆشان و نەبەزین بکات، کە منداڵانی دێ: "بەیەك دەنـگ هاواریان ئەکرد خەنجەری کاکەم دوو دەمـە"، ئـەم بیری وەدەکـردەوە: "قسەیەکی لـەوە خۆشتر بخەمە سەر زاریـان" و لە کاروانیش دانەبڕێ: "ئەم خۆشی بخەمە سەرزاریان" و لە کاروانیش دانەبڕێ: "نەم ئەتوانی لە کاروان داببڕێم"، بە هیوای ئەوەی دەرفەتێکی بۆ بڕەخسێ و ئـەوەی دەیـەوێ و دەیـزانـێ باشە بیکات: "پڕ بەدڵی خۆم بە ستەیەك بڵێم"، بەڵام لە دواییدا بێزار دەبێت، ئەوان لە پـرخـەی خـەوێـکـی خـۆشـدان، ئـەو خـەوەش ژیـانـیـان کەل دەکـات، بۆیە بڕیار دەدات خۆی لە ڕیزەکان بکشێنێتەوە: "لە ژێر سێبەری درەختێکا خەوێکی خۆشیان لێ ئەکەوت، کە چاویان ئەکردەوە خۆیان لە بەهەشتێکی خۆشا ئەبینی" بەگورجی خۆم لە ڕیزەکەیان کشانەوە" چونکە باش دەزانێت ئەو بەهەشتەی ئەمان دۆزەخی ڕاستەقینەیەو بەهەشتیش بـەخـەون نایاتە دی، بەڵکو بەخەباتی بێ وچـان بنیات دەنـرێ، بەدۆزینەوەی ڕێگەیەکی تازە نەکو تەنها بۆ ژیان بەڵکو بۆ مردنیش" باوکم لەسەرەمەرگا وتـی:- جوامێر، ڕۆڵە تۆ ڕێگەی من مەگرە، ئازا ئەو کەسەیە ڕێگەیەکی تازە ئەدۆزێتەوە بۆ ژیان و مردنی خۆی".

لە زەرد، سوور، سەوز، شین" دا ئەم خۆشەویستییەی باسی لێوە دەکەین، خەستترو قووڵترو بەرجەستەتر دەبێت و خۆی دەنوێنێ، لێرەدا کۆمەڵ لە تاکدا کۆکراوەتەوەو ناوی دڵدارو خۆشەویستی لێ نراوە. خۆشەویست لەم چیرۆکەدا وەکو ئەوانی دی، زۆر هەڵدێرو کەندەڵانی لەبەردەمدا ئامادە کراوەو کوێرە ڕێی بۆ ساز دراوە بەمەبەسی لە خشتەبردن.

سـەرەتـا لـەبـەر ئـەوەی بـاش لـە دڵـداری نەگەیشتووە، دەترسێت " لەشت وەك شەختە ساردبوو وادیـار بـوو لە دڵـداری نەگەیشتبووی!" لە هەمان کاتیشدا ناتوانێ لە قسەی باوکی دەرچێت" ئەو ڕۆژەی دوا بڕیارت دا ووتت: ئەگەر وانەکەم باوکم شار بەدەرم دەکات" جا ئەم لە دڵداری نەگەیشتنە و مل کەچییەی بۆ باوکی کە لێرەدا چەفەنگی بیری کۆنە وای لێدەکات بگاتە ڕادەی ئەوەی خۆشەویستییەکەی و خۆیشی بدۆڕێنێت" هاوینی ساڵی شەست و شەش بیستم کە خۆشەویستییەکەت دۆڕانـدوە" هەرچەندە لەوەپێشیش دەیگوت" من پێ چەوت دانانێم، خۆشەویستی تۆ بە ماڵی دونیا نـاگـۆڕمـەوە، دڵـی نـاحەز خـۆش نـاکـەم"، بـەڵام دڵی نـاحـەزی خـۆش کـردو خـۆی دۆڕانـد. ئـەم خـۆدۆڕانـدنـەش بارێکی جارەکی بوو لە بەر دوو هۆ:

یەکەمیان: چونکە مرۆڤێکی ڕەسـەن و دەروون پاکەو تەنها لە توێکڵدا گۆڕاوەو ناواخنی هەر بە پاکژی ماوەتەوە.

دوومیان: ئەم وەك مرۆڤێکی هەڵگری پەیامی ئەڤینی ڕاستەقینە لە هەوڵی بێ وچانی خۆی ناکەوێت تا دەیهێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست و لە هەڵەکەی پێشووی پەشیمانی دەکاتەوە " وابـزانم تازە خەریکی لە قسەکانم ئەگەیت، لێوی دوێنی ئەکرۆژت"، ئیتر دوای ئەوە دەکەوێتە پەلەقاژەی ڕزگاربوون" هەستم کرد کە لە قووڵایی شەوێکی ڕەنگاوڕەنگا پەلە قاژەی ڕزگـار بـوون ئەکەیت"، کە ڕۆژگـاریـشـی دەبێت بـەم جۆرە دەگـۆڕێ" ڕق، ڕەشەبای لە دەروونتـا هەڵکرد، بروسکەی خستە لەشتەوە، هەڵسایتەوە، هەڵسایتە سەرپێ" و" پێش ئەوەی کابرا لۆق درێژەکە بگاتە لامان دەستت دایە دەست و ووتت: با بڕۆین".

تا ئـێرە، ئـەوەی باسمان کـرد ئـەدگـارە تایبەتییەکانی پاڵەوان بوو لە چیرۆکەکانی لەتیف حامیددا وەکو بینیشمان پاڵەوانێکی نامۆی یاخیی کۆڵـنـەدەر، هەمیشە خەمێکی گەورە لە دەروونیا گینگڵ دەدات و خۆشەویستییەکی مەزن لەگەڵ خوێنیا بە دەمارەکانی لەشیا دێت و دەچێت، بەردەوام بیر لە دۆزینەوەی هۆیە ڕاستەقینەکانی نالەباری و شێواوی ژیـان و چارەسەرکردنان دەکـاتـەوە، بـەڵام تۆ بڵێیت هەروا بە ئاسانی کارەکەی بۆ مەیسەر ببێت و ڕێـی بۆ گوڵ ڕێژ کرابێت؟ لە هەموو کات و شوێنێکدا، لەگشت بارو زرووفێکدا ئەو جۆرە مرۆڤانە لە باتی ڕێـگـەی گوڵ پـۆش، بەڕێگەی ئەشکەنجەو ئـازاردا دەڕۆن، ڕێـگـەی بە مرۆڤە ئامێرەکان تەنراو بزمار ڕێژکراو، لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا فوارەی خوێنی دڵی ئەڤینداریان بەڵە گوڵاڵە سوورەی ڕێ ڕۆشن کەرەوەن، گشت برینێك گورێکی تازەیان دەداتێ، بەڵام هەموو کۆت و زنجیرەکانی ئەم دونیا پڕ زۆردارییە لە بڕوای پۆڵاینیان کەل ناکات و لە پەیامی پـیرۆزی خۆیان پەشیمانیان ناکاتەوە، پەیامی هێنانە دیی "شارێکی بێ یاساوڵ و دیوارو شا" وەك لەتیف خۆی دەڵێت. لێرە بـەدوا دەچینە سەرباسی دەعبا کەڵبە درێژەکان، یاساوڵەکان، کابرای لۆق درێژ، شارۆخ شا،

هتد لەو ڕەمزانەی بەکاری هێناون بۆ هێزی زۆردارو خاوەن دەسەلات‌و داگیرکەر، لە چیرۆکی یەکەمدا، هەرچەن دەکەن ئەم پالەوانە سەرکەشە یاخییان بۆ بەربەست ناکرێ، ناچار پەنا دەبەنە بەر ڕێگایەکی چەپەلی وەك خۆیان: بەشێت لەقەلەمی دەدەن‌و لە شێتخانەی توڕند دەکەن، تاکو لەژێر چاودێریی خۆیاندا بێت‌و لێی خافل نەبن، پێشتریش هەمان شتی بەرانبەر کراوە" ئەمە یەکەمجارم نییە کە ئەخرێمە ژێر چاودێرییەوە.. کە بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆم نەخشەی ژیانم ئەکێشن" بەلام ئەم هەر لە کۆششی خۆی ناکەوێ‌و بریار دەدات ژوورەکەی ولاتەکەی، بە ئارەزووی خۆی برازێنێتەوە وبەکر مەرگەوەریش لە حەپە بخات" من ئێستە ژوورەکەمان بە شێوەیەکی کە ئەرازێنمەوە.. بە جۆرێك کە بگونجێ لەگەل ئارەزمانا.. بەلام باجارێ ئەو بەکر مەرگەوەرە لە حەپە بخەم".

خەوالووەکەی شاری سەلجووق چەندەها هێزی ناحەزو دژ ڕێی لێ دەگرن‌و دوای ئەوەی گشت شێوەکانی لە ناوبردنیان تاقی کردەوەو سەرکەوتنیان وەدەس نەهێنا، پەنا دەبەنە بەر لە خشتە بردن‌و هەلخلەتاندن" ڕێگەیەکی تری لەگەلا ئەگرن باجارێ ئاشتی کەینەوە" کە ئەمەش دادیان نادا، ئەوسا دەگەڕێنەوە سەر شێوە کلاسیکییەکەی گشت زۆردارانی جیهان یاساول - " ئەمرۆ کە چاوم چوە خەو دوو یاساول لەبەر دەمما چەقین"، داریش پوازی لە خۆی نەبێ ناقلیشێ، بۆیە ئەمیش بەدلێکی شکاوو پڕ ئازارەوە دەلێت: " یەکێکیانم ئەناسییەوە، خەلکی یەك گەڕەك بووین" ئیتر بەرەو زیندانی ژمارە ١٢ - بەرێ دەکرێت‌و بێ ناوونیشان تێدا قایم دەکرێت‌و شوێنەواریشی نامێنێ.

لە " قولپی ڕشانەوەی ڕەش" دا تەنها لایەك یان کەسێك نییە وەکو ڕەمزی زۆردارو چەوسێنەر بەکار هێنرابێ، بەلکو کۆمەلێك هێماو جەفەنگ بۆ ئەم مەبەستە دانراوە:

یەکەمیان: پەتای لارەشەیە کە هەرەشەیەکی گەورە لە خەلکی شار دەکات‌و ڕۆژ لە مرۆڤایەتیان دەخات" پەتایەکی پیس کەوتبوە شارەوە، لارەشە هەتا ئەهات دری بە خەلکەکە ئەدا، یەك لە دوای یەك خۆیان ئەدا بەدەستەوە، لە لیستەیەکی تایبەتی دا تۆمار ئەکران" وەك هەر شتێکی دیکە تۆمار دەکرێت.

دووەمیان: " شارۆخ شا" یەکە" ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ددانی تیژ ئەبوو، بەخەرمان درۆی بۆ دانیشتووان هەل ئەڕشت".

سێ یەمیان:" مالومەکەی" لەمەڕ خۆیانە، کە هەرچەندە دەوری زۆرداری پێ نەسپێرراوە، بەلام کارەکەی ئەمیش کە هەول ئەدا پالەوانەکە لە کۆششی پیرۆزی خۆی سارد بکاتەوەو چاو بەستەکێی لەگەلدا بکات، لە ئاکامدا لەگەل هینەکەی ئەواندا یەك دەگرنەوە" یەکەم جار خۆی بە مالوومەکەیان ناسی لێی وردبووەوە، دەسی دایە پشتیاو پێی ووت" ئەوەندە بزێو مەبە.. دوامان کەوە.. هێشتا نۆرەی ئەوەت نەهاتووە پێش کەوی"). بەلام ئەم بەم قسانە هەلناخلەتێ‌و واز لە هەولی بێ وچانی خۆی ناهێنێ‌و بریار دەدات بکەوێتە ڕێ بەرەو بەدیهێنانی ئاواتەکانی گەل‌و نیشتمانەکەی، هەرچەندە ڕێگەش بەهەزاران مرۆڤە دەعباکان تەنراوەو دەیانەوێ لەناوی بەرن‌و شوێنەواری بسرنەوە" ڕێگە تەنرابوو بە دەعبا کەلبە درێژەکان کە قەستیان ئەکرد بە کەلبە توێکی جگەری هەلدرن" ئەمانە هەموو دەزانێت‌و حیسابی خۆی بۆکردن، بەلام ئەوەی ئازاری گیانی دەدات ئەوەیە ئەم مرۆڤە دەعبایانە بەم نامۆ نەبوون" ئەیتوانی بە هاسانی شێوەیان بکاتەوە، زۆریانی لە چمکێکی چیرۆکەکەی باوکی دا خوێندبۆوە".

سوالکەرە نەناسراوەکە باوکێکی هۆشیارو دووربینی هەیە ولەسەرە مەرگدا ئامۆژگای ئەوەی ڕێگەیەکی تازە بدۆزێتەوە بۆ ژیان‌و تەنانەت مردنی ئەمیش نەکاتەوە" باوکم لەسەرە مەرگا ووتی:- جوامێر ڕۆلە تۆ ڕێگەی من مەگرە، ئازا ئەو کەسەیە ڕێگەیەکی تازە ئەدۆزێتەوە بۆ ژیان‌و مردنی خۆی" بەلام تۆ بلێیت دەعبا کەلبە درێژەکان هەروا بە ئاسانی لێی گەڕێن چۆنی دەوێ وابژی‌و چۆنیش هەلدەبژێرێ وا بمرێ؟! لە سەرەتادا هەول دەدەن بیکڕن، بەلام " لەکرین نایەت" دوای ئەوە تاوانی درۆی بۆ ڕیز دەکەن" جارێکی کە بە تاوانی پەیوەندەی کردنیا لەگەل تاوانبارێکی ڕاکردوودا بەند کراوە" لەپاشاندا هەر یاساولە ددانی لێ جیڕ دەکاتەوەو بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕێن تا لە بەندیخانەی قایم کەن " یاساولێکی گەوج ددانم لێ ئەسوێ، چەکمە لەپێ یەکی دڕ پێم پێ ئەکەنێ"، تا لە دواییدا پێش ئەوەی هەنگاو بنێ‌و ملی ڕێگا بگرێ چوار دەوری دەگرن کەلەبچەی لە مەچەك توڕند دەکەن" هەر کە کەوتمەڕێ چوار دەورم گیراو بازنگیان بۆ مەچەکم کرد".

لە چیرۆکی " زەرد، سوور، سەوزن شین" دا هەمان کۆسپ‌و تەگەرەو مرۆڤە ئامێردەکان دووبارە دەبنەوە، بەلام لەم چیرۆکەدا یەك کەس کراوە بە جەفەنگی ناوەندیی هێزی زۆردار کە مرۆڤە لاق درێژەکەیەو بەهەموو شێوەیەك هەول دەدات بیترسێنێ" هەرچەند لێی ورد ئەبمەوە ئەبینم بەو سێ شاخەی کە لێی ڕواوە هەرەشەم لێ ئەکات". بەوەش وازی لێ ناهێنێ. بەلکو هەول دەدات دلدارەکەشی لێ بکات کە لێرەدا دەشێ ڕەمزی خاك یا نەتەوە یا بیرو باوەڕ بێت. ئەم هەولەشی لە قۆناخێکدا سەر دەگرێ" هاوینی سالی شەست‌و شەش ئینجامی هەول‌و کۆششی بێ وچانی ئەم وردە وردە لە دلداری دەگات " وابزانم تازە خەریکی لە قسەکانم ئەگەیت" بۆیە لە هەلوێستی پێشووی پەشیمان دەبێتەوە " لێوی دوێنێ ئەکرۆژیت" چیتر نەهەرەشەی کابرای لۆق درێژ، نە قسەکانی باوکی، ئەو هەلەیەی پێ دووبارە ناکەنەوەو بریاری خۆی دەدات " ڕق ڕەشەبای لە دەروونتا هەلکرد، بروسکەی خستە لەشتەوەو هەلسایتە سەرپێ" و" پێش ئەوەی کابرا لۆق درێژەکە بکاتە لامان دەستت دایە دەست و ووتت: بابڕۆین".

دووبارە، لە کۆتاییدا دەلێمەوە، ئەگەر ئەم نووسینەم لەتیف حامیدی هێنابێتەوە بیر ئەدیب‌و ئەدەب دۆستان‌و لە دواییشدا ببێتە هاندەرێك بۆ کۆکردنەوەو لە چاپدانی بەرهەمەکانی ئەوسا هەست دەکەم ڕەج‌و ماندوو بوونەکەم لەجێی خۆیاندا بوون‌و زۆر بەختیار و سەربەرزیش دەبم.

## * خوێندنەوەیەکی شیکاری بۆ چیرۆکەکانی بەکر دەرویش و سالار ئیسماعیل سەمین:-

جەمال نووری

ئەگەر بمانەوێ قسە لە بارەی کورتە چیرۆك بکەین لە خورماتوو، ئەوە بەبێ گومان پێویستە لەسەر ئەزموونە جۆراوجۆرەکان بوەستین کە لەماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا چیرۆکی تێدا پـەرەی سەند، ئەمە جگە لە ئەزمونی چیرۆکنووسی لێهاتوو ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، کە توانی بگاتە لووتکە بە بەرهەمە چیرۆکە لێهاتوویەکانییەوە، بەشێوەیەك لە ڕێگەی کەرەستەکانییەوە توانی ڕەهەندێکی هونەری ڕەسەن بۆ چیرۆکی کوردی هاوچەرخ زیاد بکات، پێدەچێت قسەکان بەشێوەیەك لە شێوەکانی لەگەڵ ئەزموونی چیرۆکنووسی کۆچکردوو دکتۆر فاروق عەلی عومەریشدا بگونجێت، کە ئەزموونی نەخۆشییەکی سەختی کێشا، بۆیە کۆمەلە چیرۆکەکەی بە زمانی عەرەبی بڵاوکردەوە و تێدا توانی بەسەر زمانەکەدا زاڵ ببێت و سەرکەوتووش بوو لە پێشکەشکردنی ئەزمونێکی چیرۆکیی نایاب، بە بابەتگەلێك و شێوازی لەخۆگرتنی بابەتەکان، ئەگەر تەمەن هەلێکی زیاتری پێ ببەخشایە، ئەوە ئەزمونگەلێکی گرنگتری پێشکەش دەکرد، لەم هاوشێوە ڕەخنەییەشدا، لەسەر ئەزموونی چیرۆکنووس سالار سەمین و بەکر دەرویش دەوەستین، کە هەوڵیان داوە نموونەی چیرۆکی جیاواز پێشکەش بکەن و وەکو بەهایەکی جوان، گرنگیان بە بونیاتنان و پەرۆشی و گێڕانەوە داوە، کە دڕەوشانەوە و ئامادەی کاریگەر دەبەخشێت.. لەوانەشە خوێندنەوە شیکارییەکەم بۆ دوو کورتە چیرۆك ئاماژەیەك بێت بۆ سەرکەوتنی مامەڵەکردنی ئەو دوو چیرۆکنووسە لەگەڵ واقعی چیرۆك و پێشکەشکردنی تەکنیکی هونەری لە دارشتنەوەی کاری چیرۆك، کە لەسەر بەخششی ئەم وتارە بکرێتەوە و لە هەمان کاتیشدا سوودیان لە ئەزمونە جۆراوجۆرەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات وەرگرتبێت.

کۆمەڵە چیرۆکی بەکر دەروێشم هەڵبژارد لەژێر ناونیشانی (ومضيت مع الحياة)، هەمان ئەو ناونیشانەیە کە چیرۆکنووس بۆ کۆمەڵە چیرۆکەکەی دەستنیشانی کردووە، ئەوەش نەك بەهۆی ئەوەی چیرۆکنووس جیاوازە لە لەخۆگرتنی بابەتەکان و هونەرەکەی، بەڵکو لەبەر ئەوەی مێژووی ژیان لێهاتوویەك دەگێڕێتەوە کە بێ ئومێدی کۆڵی پێ دەدات و پەرش و بڵاودەکاتەوە، جگە لەو هۆکارانەی کە تووشی بوو و ژیانی وێران کرد، شوێنەکەش وەکو شایەدێك و کارلێکەرێکە لەبڵاوکردنەوەی قێزەوەنی و دروستبونی قەیران، کە بەردەوام لە میحوەری گەشتەکەیدا بۆ گەڕان بەدوای مانای ژیان لکابوو بە کەسایەتییەکەیەوە و وێرانی دەکرد و چاودێری جوڵەی هەموو ڕۆشنبیران و ناخەکانی دەکرد، تەنانەت شکستەکانیش کاریگەری لەسەر ئەو ژیانە کردوە کە بەهەستکردن بە بۆشای و بێ ئومێدبون لە گـەڕان بە دوای مـانـای بـوون و بـەردەوامـبـون گـەمارۆ



دراوە، چونکە ڕۆشنبیر هەر بە سادەیی، پێشوازی لێکراو نییە و هەلێکی بۆ نارەخسێت تاکو گوزارشت لە خەون و ئەندێشەکانی و ئارەزوەکانی بکات، هەرچەند چیرۆکنووس هەوڵی داوە نێوان ئێستا و ڕابردوو لە ڕێگەی کەسانێك و ڕووداو گەلێکەوە تێکەڵ بکات، کە لەهەمان کاتدا سەر بە ئێستا و ڕابردوون، (بەدرێژایی شەو لە ناخی خۆمدا بەدوای خاڵێکی وندا دەگەڕێم، تاکو سبەینێمی لەسەر جێگیر بکەم)، سبەینێ وەکو چیرۆکەکە وەسفی دەکات، گەشتێکی بێ سوود و عەبەسییە لە وردەکارییەکانی کەش و ڕێڕەو و ونگە و سۆزەکان، چونکە ئەو لەدوای هەموو شتێك بەهۆی قەیرانی فیکرەوە هاتە بوون (هەمیشە بەم شێوەیە بەدوای شتدا دەگەڕێم و کار بۆ شتێکی تر دەکەم، شتێك لە مێشکمدایە و زمانی شتێکی دیکەی لەسەرە)، هیچ شتێکی نوێش ئاشکرا ناکات، بەڵکو مێژووی ژیانی دەخاتە ڕوو کە ئاڵۆزی پشکاندوویەتی و ئەو هۆشیارییەش لێڵ دەکات کە بە هەستێکی تاکلایەنانەوە بەدەستیهێناوە بۆ تێگەیشتن لە ڕاستییەکان و بەسەر ئەو کەسانەشدا تێپەڕیوە کە سەرقاڵی خەمی ژیانی ڕۆژانەن (ڕوومکردە خاڵێکی نەنزانراو، لەگەڵ بای غەریبیدا بڵاوبوومەوە)، لێرەدا وەکو نیمچە هەوڵێکی هەموو ڕۆشنبیرێك دەدات، تاکو لە ڕێگەی بینینە کراوەکەیدا واقعی خۆی بگۆڕێت، بەشێوەیەکی یاخی لەسەر هەموو شتێکی بەدگۆڕاو، نەك مرۆیی لە کۆمەڵگەکەیدا (بە ئارەزوویەکی تیندارەوە لوولدرابووم، بۆ ئەوەی شتگەلێکی زۆر لە دەرووبەرم بگۆڕم، بیرم لەوە دەکردەوە نەخشەی خۆم بگۆڕم و سەرلەنوێ باڵای خۆم بونیات بنێم، لەنێو ئەو بیرکردنەوانەدا بووم، سەرلەنوێ چوومە نێو بازاری (چوار کۆڵان)، پاڵەوانیش دوودڵی ناکات لە سەردانی شوێنەکان بۆ ئەوەی بەشێوازێکی جیاواز بیانناسێت، بەڵکو بتوانێت لە ڕێگەی بیرکردنەوە و پێشنیارەکانی ئەو واقعە لەنێو نوقمی

ترس لە نەخۆشی دەربێنێت بە وشەگەلێکی بێ بایەخ، کە ناگاتە ئاستی ویستەکانی پاڵەوان بۆ گۆڕینی واقع و دواتر بە جوولەیەکی رۆتینییەوە بگوازرێتەوە بۆ هۆڵی سینەما، دواتر روویکاتە کەناری رووبار، کە لەوێدا هەستکردنی بە وونبون سەرلەنوێ دەتەقێتەوە، لەنێو ئەو کەسانەی کە دێن و دچن و لای کتێبخانەی (سەباح) تاوێك دەوەستێت، کە تێدا هەمیشە شتە ونبوەکانی دەدۆزێتـەوە لە رێگەی هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێبەکان و (بۆنە سەیرەکەی) بەکڕینی کۆمەڵە شیعرێکی شاعیرێکی تورکمان بە ناوی (قەرە وەهاب) ئیکتیفا دەکات، لەکاتی گەڕانەوەشیدا تێکەڵی ئەو گێژاوە دەبێت کە باری دەروونـی تێکدەدات (وەکو داوڵ لەگەڵ با رێم کرد، بەتاڵ و پوچ)، چونکە پاڵەوان هەست بە شکانەوە و دواکەوتـوێتی دەکـات لە شکستەکان و بـەردەوام بیر لە بەدیهێنانی خەونێکی هەڵهاتوو دەکات، لەو واقعەی کە بە دەزگاگەلێکی زۆرەملێ و سەپێنراو دەبێتە هۆی رەوانەوەی ئازادی، ماڵی عێـراقی بە سەرچاوەی نیگەرانی و رارایی و ئاڵۆزی سیاسییەوە رێکدەخات، کە بریتییە لە ململانێی هێزەکان و بەشێوەیەکی هەمیشەیی رکابەری دەکات (خەونم بەوەوە دەبینی گەشتێك بۆ شوێنە چۆڵەکان بکەم بۆ شاری خورافات لە دەرەوەی خشتە و بەربەستەکان، لەوێ ڤانکوخ و کێڵگە گەنمە زەردەکانی و پانتایی فراوانەکانی...)، گەڕانەوە بۆ دوو توێیەکانی ئەم خەونە هیچ مژدەیەك نابەخشێت (چیتر زەمـەن پەرۆشم ناکات، من بە ساردی رادەگـوزەرم، لەگەڵ رێگا، چیتر خۆر گەرمم ناکاتەوە).

ئـەگـەر دەلالـەتـەکـان هـەموو جەخت لـەسـەر نەگەتیڤی پاڵەوان و کەڵکەڵە دەروونییە نەخۆشییەکان دەکات، بەرەو بەدەستهێنانی خـود، لە رێـگـەی بـەردەوامبـوونـی مرۆڤی لەتکراو و لەگەڵ شتەکان، ئەوە لە هەمان کاتیشدا بەشێوەیەك خەون دەبینێت، بۆ گۆڕینی واقعەکە، بەڵام سوور بوون لەسەر گۆڕانکاری تووشی پێکادادان دەبێت لەگەڵ واقع و وردەکارییە پەرجوەکانی، لە مۆتەکەکان و تەڵەکان بۆ راوکردنی وشە و راودوونـانـی خەونەکان و لەناوبردنی ویستەکان، دواتر دەچێتە گۆڕێکەوە تاکو گرێبەستێکی ئاشتەوایی بکات، یاخود لەوانەیە بگەڕێت بەدوای ئاستێکی تردا بۆ دیالۆگ لەگەڵ مـردووەکـان (گۆڕستانەکەمم بەجێهێشت و لەگەڵ غەریبایەتی خۆم وەکو داڵێکی بێ ئومێد رۆیشتم) خورماتوو لای ئەو وەکو (سێوێکی پێگەیشتوو، بۆنێکی خۆشی لێدێت) بەڵام بەخێرایی بۆنی ناخۆشی لێوە دەردێت پڕە (لە پیسی و شەقامە قەرەباڵغەکانی و ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو و لافیتە و شوێن نهێنی و ئاشکراکان)، سەرەڕای ئەوەی پاڵەوانەکە ئەو واقعە بەهەموو عەیبەکانییەوە رەتدەکاتەوە، بەڵام بینینە ورد و سەرپەرشتییەکانی کار دەکات لە چاوەڕوانی رۆژێکی نوێ و شکۆدار، تێدا بەسەر ئەم هەموو دیاردە هەنووکەیەدا سەرکەوێت کە دەستی بەسەر هەموو شتێکدا گرتووە و ئەو بوارە رۆشنبیرییەی لەناوبردووە کە سەرەوەی دیمەنی رۆژانەی گرتووە و بەرەو باشتر دەیگۆڕێت، دواتر پاڵەوانەکە پشت بە رای ئەلیۆت دەبەستێت و پرسیار دەکات (ئەو ژیانە کوا کە لەپێناویدا وون بووین؟) ئەم پرسیارە وجودییەش



هەستە دەرپۆقیوەکانی دەلکێنێت بە قێزەوەنی و غەریبییەوە (دڵم تێکدەئاڵێت لە رێکردنی خوێن لەناو شادەمارەکانم) هەر وەك ناوەستێتەوە لە ناوهێنانی ناو و ناولێنراوەکان وەکو (چایخانەی حەمورابی و عەشتار و عەرشی یاسەمین)، بەو هۆنراوەیەدا سەردەکەوێت کە دەیویست بە تێکەڵاوکردنی رابردوو و ئێستا بیوروژێنێت، بەهەموو بەیانە مەعەریفی و ژیانگوزەرانییەکەیەوە، لەکۆتاییدا پاڵەوانەکە بڕیاری خۆکوشتن دەدات وەکو قورتاربوونێك لەو واقعەی کە رۆشنبیر تێدا توانای لەخۆگرتنی کەرەستە زانستییە کردارەکانی و بینینە نوێگەرایەکانی نییە بۆ گۆڕینی هیچ شتێك... پاڵەوانەکە بە قەیرانەکانییەوە رەنگدانەوەی خوودی نووسەرە لە رووبەڕووبوونەوەی ئەو ناماقووڵییەتەی کە زیاتر جێگیر بوە و چەسپاوە لە جیهانەکەماندا، کە تێدا پاڵەوانەکەی بەکر دەروێش، ئینساف تێدا بەدی نەکرد بۆ بەردەوام بون لەگەڵی سەرەڕای هەموو ئەو زیانانەی کە پێیگەیشت، بەڵام سالار ئیسماعیل سەمین-ی چیرۆکنووس بە بەهرەکانییەوە توانی کار لەسەر کاراکردنی رۆڵی هاوسەنگی بابەتی رەمزی بکات، کە تێدا درامایەك دروستبوو لەگەڵ پێکیشتنی رووداوەکان و ئاڵۆزییەکانییەوە لە چیرۆکی (المتاهة)، لەوانەیە زۆر جیاواز بێت لەگەڵ بەکر دەروێش کە کورتەی ژیانی رۆشنبیرێکی لە دێرەکاندا ریـز کرد و تێدا رووبـەڕووبـونـەوەی لەگەڵ ناشرینییەکان دەرخست، بـەڵام سـالار سەمین سەرقاڵی ئەوە بوو کە هزرە ئینتیلاکراوەکەی ببێتە زریانێك بەسەر پاڵەوانەکەی و دوورخـراوێك لە بیابانێکی وشکدا کار بۆ دەرکردنی ئاو دەکات لە بیرێکی ئاو، لەوانەیە چیرۆکنووس ویستوبێتی بیابان و سـەگ و بیر بەکاربێنێت بۆ ئـەوەی چیرۆکەکەی بکات بە پانۆرامایکی سینەمایی (لە ناوەڕاستی ئەو بیابانە سووتاوەدا کە بەدرێژایی ونگەکان پڕە لە شەپۆلی خەم و پەژارە).

چیرۆکخوانەکە بەدێرێك دەستپێدەکات باس لە هەواڵی

پاڵەوانەکە دەکات (کرێکاری سەر مزەخەی ئاوەکە)، کە تێدا دەڵێت (نیگەران بوو، ئارامی لێبرابوو، بەهۆی وەڕینی ئەو سەگەی کە تازە لەدایکبببوو و بەردەوام دەنوزایەوە، لەنێو ئەو خێوەتگەیە بە تەنیایی)، وەکو ئەوەی بڵێ چیرۆکخوانەکە ویستویەتی بەداهێنانکردنە فانتازیاکەی شوێنێك بۆ چیرۆکەکەی بسەپێنێت، لە لێواری بیابانێکی دووخراو و زۆرەملێ بۆ ئەو کرێکارەی کە لەشانی چیاکان هاتووەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی ببێتە کەسێکی پەشیمان لە بیابانەکاندا و لە ڕێگەی زمانەکەیەوە چیرۆکخوانەکە وێنای دیمەنی گەلەسەگی برسی دەکات کە بەبێ هودا بەدوای تەرمی منداڵ و ژنان و پیرەکان دەگەڕێت کە لە زەوییەکی غەریبدا نێژراون، وەکو بڵێ قەدەری ئەوان لەگەڵ ژیانە کارەساتبارەکانیاندا کە کوردن، مردنەکەشیان لە شوێنێ دوور و لە بیابانێکی وشك بێت، چیرۆکخوانەکە توانیویەتی بەبێ ئەوەی ناو بهێنێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا، ئاماژە بۆ نیشتمانی جوانی بکات لەو بینا پتەوەدا بۆ ناوەرۆکی چیرۆك، پێدەچێت ئەو پەرۆشییەی کە پاڵەوانەکەی پاراستووە بۆنی خوێن بێت (لەم بیابانەدا ماوەیەکە بۆنی خوێن لەگەڵ شنەبای شەودا دێت، ڕۆحی غەریبەکان لەنێو ئەم شوێنە وشك و چۆڵ و ستەمکارەدا توایەوە)، دوای ئەوەی گلۆپی کاروانی ئۆتۆمبێلەکان لەدووری کرێکاری سەر مزەخەکە وەستا، نیگەرانی سەرچاوەی گرت و کرێکارەکەش بە تەواوەتی جەنجاڵی گەران بوو بەدوای شیکردنەوەیەکی لۆژیکی بۆ بوونی ئەم ئۆتۆمبێلانە (لەو شەوەدا چاوەکانی تامی خەویان نەکرد، بە بەیانییەکەشیدا لە ئاسۆکانەوە ڕووناکی سەری دەرهێنا، بە شکاوی و بەقەدەرێکی نارەواوە)، وێنەکان تێکەڵ بە دیمەنی ڕۆژانە دەبن، بۆ ئەوەی ئەم دوورخراوە دۆخەکەی لێ تێکبچێت، وای لێهاتووە ئارام ناگرێت، چونکە ڕاستی لە تەنیشتی ڕوویدا، ئەمەش وای لێدەکات چیتر گرنگی بە ڕانە مەڕە گەڕاوەکان بۆ نێو هۆزەکان نەدات، کە نیشتەجێی نێو ڕەشماڵەکانن و باوەشیان بە وەڕینی سەگدا کردووە، چونکە ئەو بە تەواوەتی سەرقاڵی زانینی ئەو نهێنیانە بوە کە دەوری داوە و پرسیاری لەلا دروست دەکات، ئەو پرسیارانەی کە هەمیشە مایەی دوودڵی بوون بۆی، بۆ دواجار بڕیار دەدات نزیك ببێتەوە لەو شوێنەی کە لەو شەوەدا ئۆتۆمبێلەکان لێی وەستان، (دواتر بەردەوام بوو لە ڕێکردنەکەی، تاکو گەیشتە شوێنی مەبەست، بەتەواوەتی خۆی چەماندەوە، تێبینی کرد جێی پێی مرۆڤێکی زۆر لەسەر گلەکە دروستبوە، ئەو جێ پێیانەش تێکەڵی شوێنی تایەی ئۆتۆمبێلەکان بوونە، ئێستا بڕیارم دا، ناوی ئەم شوێنە بنێم وونگە (متاهة) شتە نەزانراوەکانی غیاب، بیابانی مۆتەکە.

بەم شێوەیە شوێنەکە دەبێتە هەیمەنەتێکی سەرقاڵکەر و ئاڵۆز بۆ پاڵەوانەکە، چونکە ڕووی ڕاستەقینەی ئەو قێزەوەنییە دەپۆشێت، کە ڕووبەڕووی عێراقییەکان بوەوە و پاڵەوانەکەش دوای ماوەیەك ملوانکەیەی مێخەك دەدۆزێتەوە کە بە میروو نەخشێندراوە و قاشێکی گەورەی خەنەیی لەسەر شێوەی دڵ ناوەڕاستی گرتووە، ملوانکەکەش بە دیارییەکەوە بەستراوە، دیارییەکەش خاوەنەکەی دڵخۆش دەکات کە ئەگەر ژن بێت یاخود پیاو، ئەمە بەدەر لە بەدەستهێنانی جوانییەکی زیاتر بۆ ژن، دواتر پاڵەوانەکە بۆی دەردەکەوێت کە (ئەو ملوانکەیە بە ملوانکەکەی گەلاوێژی کچم دەچێت .. هەمان ملوانکە مێخەکەکەیە) لە هەمان کاتیشدا تێبینی ئەوەی کرد کە سەگە برسییەکان ڕەشەباڵغییان لە شوێنێکدا کردووە کە تێدا هەنگاوەکان ون دەبێت، ئەو هەنگاوانەی کە نەیویست لەسەر ئەو بیابانە بمێنێتەوە و هاوارەکانی لەدژی جەلادەکان ڕابگەیەنێت، کە خەریکی کوشتنی بە کۆمەڵ و دەمکوتکردن و دەرکردنی کورد لە باوەشی شاخدا و مردنێکی خۆرایشی پێ ببەخشێ لەو بیابانە وشکەدا (ژمارەی سەگەکان لە زیادبوونی بەردەوامدا بوون، بەهۆیەوە بیابان بوو بە یەك پارچە لە وەڕینی سەگ، لەو کاتەدا ترسێکی لە قوڵاییەکانمەوە ڕەوا)، پێدەچێت چیرۆکخوانەکە لە گێڕانەوەیەکی بابەتییەو خودییەوە گواسترایەوە بۆ دررککردنی چیرۆکخوانێکی هۆشیار بەو کەرەستانییەوە کە بە لێهاتووی تەوزیفی دەکات، تاکو نیشانە و بینینێك ببەخشێت بە شێواز و تەکنیکەکانی، بەشێوەیەك کە باوەش بە بابەتەکەدا بکات لە گەرانی بەردەوام بە دوای ڕاستییەکان، سالاری پاڵەوان دەوەستێت بەو مانایەی کە وێژدانێکی زیندووە و شایەدی لەسەر هەموو ئەو گوناهانە بدات کە بازرگانانی جەنگ ئەنجامیان دا بۆ وێرانکردنی گەلەکانیان، بەبێ هیچ هۆیەك، پاڵەوانەکەش وەکو خەون ڕووخساری ڕاستی دەردەخات، لە وێنەی پیاوێکی پیردا کە سەگەکان لەسەر شوێنەواری تاوانەکە لادەبات و کتێبێکی گەورە پێشکەش دەکات کە لەسەری نووسراوە (ئاڤێستا) و بە سەگەکان دەڵێت (بەسە، سەگە هارەکان بەسە، ئێرە ئارامگەی غەریبانە، نەکەن خەونە خۆشەکەیان لێ تێکبدەن)، دواتر پیاوە پیرەکە دەڕوات بەرەو تاریکاییەکانی تاریکی، تاکو لاپەڕەیەکی نوێی مێژوو هەڵبداتەوە و بە شەڕ و کارەساتەکان پیسی بکات، کە بەردەوام هاوەڵی ڕێبازی نەوەکان دەکات لە نیشتیمانی چیا لەسەر مەرگ و کارەسات.

*** شیعری کوردیی هاوچەرخی کەرکوك لەنێوان ١٩٦١-١٩٧١ سیمای نوێگەریی :-**

د. محەمەد ئەحمەد سەعید(محەمەد کەساس)

**پێشەکی:-**

ئەم باسە لێکۆڵینەوەیەکی وەسفی مێژوویییە دەربارەی بزاڤی شیعری کوردی ناوچەی کەرکوك، لەنێوان ساڵانی ١٩٦١- ١٩٧١، لەبەر گرنگی و ناسکی ئەو قۆناغە مێژووییەی کەرکوك کە تیایدا ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کەلتووریی ئەو شارە لەهەڵکشان و داکشاندا بووە. کە کاریگەریی و نەقشی خۆی لەسەر رەوشی ئەدەبی کوردی (شیعر) بەجێهێشتووە، ئەمەو نەبوونی بابەتێکی ئەکادیمی ئەوتۆ لەو بارەیەوە، وێڕای کەمی سەرچاوەش وایکردووە کە لایەك لەو قۆناغەی شیعر بەسەر بکەینەوەو چەند شاعیرێك و نموونەی شیعرییان بکەینە کەرەسەی لێکۆڵینەوەکەمان کە بەسەر سێ تەوەرەدا دابەشکراوە.

*** تەوەری یەکەم**

شاری کەرکوك وەك شارێکی کوردستانی و فرە کەمینە لەقۆناغە جیاجیاکانی مێژوویدا، هەمیش پڕبەهاو گرنگ و بایەخداربووە، لە هەموو بوارەکانی ئابووریی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و دوایش رۆشنبیرییەوە، ئەمەی دواییان کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر بزاڤی شیعری کوردیدا هەبووە.

هەر لەپەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە سەرەتاتکێیەکی تری جووڵانەوەی ئەدەبی تیایدا سەریهەڵدا، کە جۆرە هاوکاریی و تەباییەکی هاوبەشی نێوان نووسەرانی کوردو کەمینەکانی تری تیا بەرچاوئەکەوت، ئەم سەرهەڵدانەش لەلایەن کۆمەڵی نووسەرو رۆشنبیری خەڵکی کەرکوکەوە لەکوردو عەرەب و تورکمان و ئاشوری لەنێوان ساڵانی ١٩٥٥-١٩٦٤دا هەوڵ و تەقەللایەکی ئەدەبی و هونەریی و شیعرییان دا، لەکوردەکان محێدین زەنگەنەو سەلاح فایەق و زوهدی داودی و حوسێن عەلی هەورامانی و عەبدولعەزیز خانەقاو یوسف حەیدەری، کە رۆڵی گرنگیان لەپێشخستنی باری رۆشنبیری شارەکەدا هەبووە ئەم دەستەیە ناوی گرووپی کەرکوك، یان (هاوڕێیانی بەد) یان لە خۆنا[1] بەکۆمەڵێ تێروانینی نوێوە بەرامبەر بەئەدەب و شیعر هاتنە مەیدانەوە، هەوڵی بەرەو پێشبردنیان ئەدا، هەر لەناو ئەم دەستەیەدا یوسف حەیدەری کورد لەگەڵ عەبدولسەمەد خانەقادا لەچەندین کۆبوونەوەدا لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری شارەکە بیریان لەدەرکردنی گۆڤارێك کردەوەکە بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بڵاوی بکەنەوە، مەخابن لەبەر جیاوازی بۆچوون و چۆنیەتی کارکردن هەندێ لەئەندامانی دەستەکە ئەو کارەیان نەهێنایە دی[2].

بێگومان هەوڵی ئەم دەستەیەش فاکتەرێکی هاندەر بوو بۆ پێشخستنی رەوتی ئەدەبی و شیعریی شاری کەرکوكو کاریگەری خۆی لەسەر شاعیران رەنگیدایەوەو تەنانەت توێژو ئەتنیە جیاوازەکانیش.

بوونی چەندین شاعیری تری کوردی پێش ئەم قۆناغە، کە توانییان بەشێکی ناوەرۆکە شیعرییەکانیان بخەنە بەردەم نەوەکانی داهاتوو، دەقەکانیان بوون بەکەرەسەو کەلتوورێکی زیندوو. وەك سەرچاوەو بەرهەمە شیعرییەکانی شاعیران سایری و لوتفیو شاکەلی و ئەسیری و مامەند کەرکوکی و شێخ عارفی بەرزنجی و چەندانی تر بەشیعرەکانیان گەشەیان بەبزاڤی شیعری کوردی کەرکوکدا.

ئەو پەیوەندییە رۆشنبیرییەی نێوان نووسەرو شاعیرو رۆشنبیرانی هەردوو دەڤەری کەرکوك و سلێمانی یا بەشێکی ئەدیبانی هەردوو لا ماوەیەکی ژیانیان لەکەرکوكو سلێمانی بەسەر بردووە، ئەمە وایکردووە جۆرە تێکەڵیی و ئاشنایەتییەك دروست بێت، شاعیرانی کوردی کەرکوك بەبزووتنەوە شیعرییە نوێیەکەی سلێمانی کاریگەربوون، کە گۆران و شێخ نوری شێخ سالح نوێنەرایەتیان کردو پاشان کامەران موکری و سالح دیلان و هاورێکانیان بەردەوامییان پێدا.

بەوەی کە کەرکوك لەباری ئابورییەوە ناوچەیەکی گرنگ و ستراتیژیی بوو کانزای نەوتی تێدا دۆزرابووەوە. پاش داگیرکردنی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە کۆمپانیا بازرگانییەکان بەرنامەی کاری چالاکی خۆیان تیادا پەرە پێدا. جۆرەپەیوەندی و ئاشنابوونێك لەنێوان دانیشتوانی کەرکوكو ئینگلیزەکان پەیدا بوو، کۆمەڵێ رۆشنبیرو نووسەری ئەو شارە بەهۆی ئەو تێکەڵییەوە فێری زمانی ئینگلیزی بوون، بەئەدەب و رۆشنبیرییەکەی ئاشنا بوون، وەك دەرکەوتووەکە رۆشنبیرانی کەرکوكو بەغدا پێش شوێنەکانی تری کوردستان و عێراق بە بزاڤی ئەدەبی و شیعریی ئینگلیزی ئاشنا بوون. کەواتە کەرکوك لەچاو شوێنەکانی تری کوردستان، رۆشنبیرەکانی لەو بارەیەوە لەپێشدا بوون، چونکە ((لە کۆتایی شەستەکاندا بەغداو کەرکوك بەهۆی پێگەی رۆشنبیریی هەردووکیانەوە بەهۆی بەیەکاچوونو پێکگەیشتنی بیرو باوەرو رەوتو رێبازەکانەوە، بەهۆی زۆری سەرچاوەی رۆشنبیریی بێگانەوە، کە بووە هۆی ئەوەی ببنە سەنتەرێكو رۆڵی بنەرەتیان بینی لە کاریگەریی و کارتێکردنی بۆ سەرهەڵدانی ئەڵقەی گۆرانی ئەدەبی کوردی لەعێراقدا)).[3]

بوونی چەندین گۆڤارو رۆژنامە کە لەپەنجاکانەوە دەرئەچوون وەك شەفەقو ئازادییو پێشرەو تاد. . . لاپەرەکانیان لەبەردەم نووسەراندا بۆ بڵاوکردنەوە ئاواڵەبوون زەمینەیەکی لەباری خولقاند بۆ هاندان و بڵاوکردنەوە.

دوای شۆرشی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ باری رۆشنبیریی کوردیی گۆرو تینێکی نوێی بەخۆوە بینی، کۆمەڵێ رۆژنامەو گۆڤاری تر ماوەیان بۆ رەخساو ئەوانەی پێشووش زەمینەی فراوانتریان بۆ خۆش بوو، بۆ ماوەیەك ئەگەر کەمیش بووبێ فەزایەکی ئازادیی دیموکراسی و رادەربرین کەوتەوە لەمپەرەکانی بەردەم نووسەران، لابران.

سەرهەڵدانی شۆرشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ی کوردو

بەرپەرچدانەوەی لەلایەن دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقەوە، کە بووە هۆی سەرهەڵدان و شڵەژانێکی ئەوتۆ دۆخێکی نالەباری بۆ کۆمەڵگای کوردەواری لەباری سیاسی و ژیارییەوە خولقاند. ئەو دەمە کورد ناخۆشترین دۆخی بەسەردا سەپێنرا، چونکە پەلاماری سەربازی سوپای عێراق بۆ سەر کوردستان و بەتایبەتی شاری کەرکوك و دەورووبەری و پاشەگەزبوونەوەی حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم لە بەڵێنەکانی خۆی بەرامبەر بەکوردو پاشانیش کودەتاکەی ساڵی ١٩٦٣ دەسەڵاتی بەعس، کەبەهەموو توانایەکییەوە لە هەوڵی سڕینەوەی سیمای کوردەواریدا بوو. هەر لەپەلاماری سەربازیی و قەدەغەکردنی هەرچی چالاکی رۆشنبیریی و کوردیی و داخستنی هەموو گۆڤارو رۆژنامە کوردییەکانەوە تاوەکو سنووردارکردنی رۆشنبیریی کوردی و سانسۆر دانان لەسەری، کەتارادەیەکی بەرچاو کاری کردە سەرکزیی جووڵانەوە رۆشنبیریی و ئەدەبییەکەی کورد. سەرباری شەری ناوخۆیی و ململانێی سیاسی خودی کۆمەڵگای کوردی و چوارچێوەو پرۆگرامە کلاسییەکەی شیعری کوردی و زاڵبوونی بەسەر فەزای شیعری کوردی بوون بەلەمپەر لەبەردەم بزاڤ و رێبازە نوێیەکەی شیعری کوردی کەرکوك.

. ئەمە لەلایەکەوە ماوەو مەودای بڵاوکردنەوەی ئاشکرای لەبەردەم شیعری نوێدا قەتیس کرد، لەلایەکی ترەوە وێرای ئەودۆخە ئاڵۆزەی کوردستان و شاری کرکوك. وێرای ئەو بەر تەسکبوونەوەیەی فەزای جووڵانەوەی رۆشنبیریی و ئەدەبی و شیعری کوردی، کۆمەڵێ شاعیر و کۆمەڵێ دەقی شیعری حزوورو ئامادەبوونی خۆیان سەلماند.

هەر لەسەرەتای ساڵی ١٩٦١-ەوە بەکۆمەڵێ دەق و ناوەرۆکی جیاجیاوە، بەگۆڕانێکی بەرچاوەوە، لەناوەرۆك و رووخسارەوە ئەو شاعیرانە هاتوونەتە مەیدانەوە، بەشێکی ئەو کۆشش و کارانە هەر لەدووتوێی دەستنووس و نامیلکەی جیاجیادا چ بەنهێنی چ بەئاشکرا خۆیان دەرخست، ئەم شاعیرانەو شیعرەکانیان لەکاریگەریی و کارتێکردنی ئەو فاکتەرانە بەدەرنین کە لەسەرەتای ئەم توێژینەوەیەدا ئاماژەیان بۆ کراوە. هەر ئەوانەش بوونە بناغەو بنەمای شیعرەکانیان، وەك بەردەوامیەکی بزاڤە شیعرییەکەی شاری کەرکوك. بوونە بەشێکی گرنگی کەلتووری رۆشنبیری و ئەدەبی ئەو شارە لە کەرکوکدا بەتایبەتی کۆتایی شەستەکان و دوای بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ی نێوان شۆڕشی کوردو حکومەتی ئەوسای عێرا قدا ئەتمۆسفێرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی گونجاوی بۆ رەخسا.

زەمینەیەکی لەباری لەبەردەم رەوتە ئەدەبی شیعرییەکەدا خۆشکرد، کە بەرگێکی نوێگەری بەبەرا کرد، چونکە بەشێکی زۆری چاپەمەنییە کوردییەکان لەعێراقدا لەلایەن کوردەکانەوە چاودێری ئەکران و بەڕێوەدەبران، هەروەها چەندین رێکخراو و دەزگای رۆشنبیریی و ئەدەبی زانستی تایبەت بەکورد دەرچوون و دامەزران، وەك بەرێوەبەرێتی خوێندنی کوردی، دەزگای رۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی، گۆڤاری بەیان و رۆشنبیریی نوێ و رۆژنامەی هاوکاری و دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کوردو گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد. کە هەموویان رۆڵی دیاریان لەجۆشدان و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی وشیعری کوردیی هەبوو. هەروەها بردنی بەرەو تازەکردنەوەو نوێگەری. هاوزەمان لەو قۆناغەدا لەسلێمانی لەلایەن دەستەیەکی شاعیرو چیرۆکنووس و رۆشنبیرەوە بانگەوازی روانگەیان دا، ئەم دەستەیە بەپرۆژەو پرۆگرامی نوێوە لەشیعرو چیرۆکدا هاتنە پێشەوە کە کاریگەریی دیاری لەنوێکردنەوەی ئەدەبی کوردیدا هەبوو، بەتایبەتی شیعر، سنووری بانگەوازەکەشیان سلێمانی و دەورووبەری تێپەراندو کەرکوکیشی گرتەوە.

گرووپی روانگە لەسەرەتادا لە ساڵی ١٩٧٠ بەیاننامەیەکی ئەدەبییان دەرکرد، هەندێ نووسەرانی کەرکوکیش لەسەر رێورەسمی ئەو گرووپە رۆیشتن، لەوانە سەلاح شوان کەچەند دەقێکی شیعریی لەگۆڤاری روانگەدا بڵاوکردەوەو نووسەرانی تری کەرکوکیش دوای پرۆژەو بەرنامەکەی ئەو گرووپە کەوتن و بانگەشەیان بۆ ئەکرد[٤].

ئەگەرچیش روانگە لەگەشەو پێشخستنی شیعری نوێی کوردی کەرکوکدا رۆڵی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێ شاعیرو نووسەر هەبوون کە پێش روانگە لەبواری نوێگەریدا رۆڵیان هەبوو، هەر لەو بارەیەوە فازڵ عەزاوی نووسیوێتی لەڕووی نوێگەرییەوە کەرکوك نەك تەنها لەسەر ئاستی کوردستان، بەڵکو لەسەر ئاستی عێراق دەورێکی باڵای هەبووەو دەسپێشخەربووە.[٥]

هاوشان لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بەیاننامەی روانگەدا، دەنگ و سەدایەکی تر هاتە ئاراوە، ئەویش بانگەوازەکەی گرووپی کفری بوو کەلەلایەن شاعیران لەتیف هەڵمەت و ئەنوەر شاکەلی و هاورێکانیانەوە دەرکرا. کە زەمینەو قسەو باس و گفتوگۆی ئەوەیان لەسەر بوو، کەبۆ پێش روانگەو کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم ئەگەڕێتەوە. بەڵگەی راستی ئەمەش لەتیف هەڵمەت خۆی پێ لەسەر ئەوە دائەگرێ و راشکاوانە ئەڵێ شارۆچکەی کفری لەشەستەکاندا مەکۆی بانگەوازی یەکەم پریشکی ئەم نوێگەرییە [٦] کەچی سەلاح شوان کە لەریزی شاعیرانی روانگەیە، لای ئەم وایە کەوا گرووپی کەرکوك بەچەند ساڵێك پێش گرووپی کفری کەوتووە، هەر ئەمانیش ئاگاداری نوێگەری عەرەبی و ئەورووپی بوون، هەروەها نووسینی شیعری نوێ بەزمانی عەرەبیش[٧].

کەواتە سەبارەت بەسەرهەڵدانی ئەو بزاڤە شیعرییەی کەرکوك و بوارە نوێگەرییەکەی ئەبێ ئاماژە بەهەوڵ و کۆششی ئەم سێ گرووپە بکەین.

١- گرووپی کەرکوك هاورێیانی بەد ١٩٥٥-١٩٦٤ کەپێشینەیەکی دێرینتری لەکەرکوکدا هەبوو.

٢- گرووپی کفری، کۆتایی شەستەکان، کە ئەندامانی لەهەندێ شوێن و سیمیناردا خۆیان بەگرووپی کەرکوك و کفری ناساندووە.

٣- گرووپی روانگە، کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان.

ئەم سێ گرووپە رۆڵی کاریگەرو بەرچاویان لەپێشخستنی ئەدەبی کوردی بەتایبەتی جووڵانەوە شیعرییە نوێگەرییەکەی

هەبوو، کە لەهەرسێکیاندا چەندین شاعیری کەرکوکی ئامادەیی و حزووریان هەبووە. تەقەللایەکی باشیان دا لەپێناوی بەرەوپێشبردنی شیعری کوردی و ئاراستەکردنی بانگەوازی شیعری کوردی بەرەو نوێگەریی و مکوڕبوون لەسەری، تەنانەت هەندێکیشیان بەزمانی عەرەبی شیعری نوێیان وتووە، وەك سەلاح فایەق و یوسف حەیدەری و تا دوایی. . .

هەر ئەم سێ گرووپە لەمەیدانی نوێگەریدا راوبۆچوونی جیاوازیان هەبووە. هەروەها کارتێکردنی سەرچاوەو لایەنی جیاجیاشیان لەسەر بووە، ئەکرێ بەم چەشنە لێکیان بدەینەوەو سەرچاوەی ڕۆشنبیرییان و خواستەکانیان دەستنیشان بکەین.

گرووپی کەرکوك زیاتر هەوڵیانداوە سوود لەکەلتووری ئەورووپی و رۆژئاوایی وەربگرن.

گرووپی کفری یان کەرکوك-کفری بەرەو شیعری کوردی رۆیشتووەو هەروەها کارتێکردن و هەزمکردنی زانستێتی و ئاشنابوون پێی و پاشان تێپەراندنی و کارتێکردنی شیعری عەرەبیش.

گرووپی روانگەش پێی لەسەر هاوچەرخێتی داگرتووەو کۆنیشی رەت نەکردووەتەوە.

هەرچی چۆنێك بێت لەباری شیعرەوە ئەم سێ گرووپە دەوری کاریگەرییان بۆ سەر شیعری کوردی هاوچەرخی کەرکوك هەبووەو بوون بەبنەمایەکی تۆکمە بۆ شاعیرانی نوێ و نەوەکانی داهاتووی دوای حەفتاکان بەئەزموونەکانیان ئاشنابوون شوێنیان کەوتن و هەمان ڕێبازیان پیادە کرد وەك، سەلام محەمەد، نەجیبە ئەحمەد، مارف عومەر گوڵ، عەبدولکەریم پەرەنگ و چەندانی تر وەك شاعیرانی ئەو قۆناغە دەرکەوتن.

### * تەوەری دووەم

لەم تەوەرەدا هەوڵئەدەین کە ئەزموونە شیعرییەکانی شاعیرانی ئەو قۆناغە بکەین بە نموونەو بەڵگەی توێژینەوەکەمان.

ئاشکرایە کە شاعیرانی سەدەی بیستەم هەر لە سەرەتای داگیرکردنی کوردستان لەلایەن ئینگلیزەوە، پاشان لە قۆناغی دەسەڵاتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقدا بە ناوەڕۆکە شیعرییەکانیان بەرهەمێکی زۆری شیعرییان لە هەموو بابەتەکاندا ئەفراندووە، بەتایبەتی نیشتمانی و نەتەوایەتی کە سەرپاکیان رەنگدانەوەی باری شڵەژاوی کوردستان و خەباتی ناوچەکە دژ بەداگیرکاری و خەباتی چینایەتی و ئاراستەکردنی بەرەو مرۆڤایەتی و پابەندبوون بەکێشەی کوردەوە بوون. لەپێناو وەدیهێنانی مافەرەواکانی خۆی، تەنانەت لەبەشەکانی تری کوردستاندا ناوەڕۆك و دەقە شیعرییەکانی مامەند کەرکوکی و ئەسیری، کە ئەزموونی شیعرییان لەبیستەکانی سەدەی بیستەمەوە تاوەکو چلەکان دەرکەوتن، هەروەها شاعیران شاکەلی و لوتفی کە تا هەشتاکان لەژیاندا بوون. (شێخ مارفی بەرزنجی)یش وەك کەرکوکییەك، وەك ئاگادار لە کێشە نەتەوەیی و نیشتمانی و مرۆڤایەتییەکان تا شەهیدبوونی بەخششی شیعریی هەبووە.

بۆ بەسەرکردنەوەی مێژووی شیعری ئەو قۆناغەی کەرکوك ئاماژە بەهەردوو شاعیر شێخ مارف بەرزنجی و لوتفی ئەکەین.

یەکەمیان شێخ مارف بەرزنجی هەر لە شەستەکاندا تا لەسێدارەدانی لە ساڵی ١٩٦٣دا بەو پێیەی کە ئاگای تەواوی لە دۆخی ئەدەب و شیعری و ڕۆشنبیریی میللەتەکەی و میللەتانی دەوروبەری بووە. هەروەها لەرەوت و قۆناغی کۆمەڵگای کوردەواری و دۆخی سیاسی کورد، دەوری چالاك و باڵا و حزووری تەواوی هەبووە، وێڕای کاری سیاسی خۆی، لایەنە ئەدەبییەکەی بەتایبەتی شیعر مەبەست بووە. ئەم بە ناوەڕۆکێکی نوێ و تۆکمەو رووخسارێکی جوانەوە سیمای شیعرەکانی رەنگین کردووە، چونکە ((شیعر وەك هەر هونەرێکی تر بەهرەیە، بەڵام خوێندنەوەو چاوگێڕان بەدەورو پشت داو تاقیکردنەوەی جۆربەجۆری ژیاندا بەهرەکە نەگەشێنێتەوە))[8]. کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا سیمای تازەگەریی و نوێگەرییەکی بەرچاوە، کەوا توانیویەتی ناوەڕۆك و شێوە لەگەڵ یەکدا بگونجێنێ. لە بەشێکی زۆری شیعرەکانیدا دەرکەوتووە کە هەمیشە ئومێدی بەژیان بووە، هاوشان لەگەڵ پێشکەوتنی زانست و هیوای نەتەوەکەیدا بووەو شیعری بۆ وتوون لەزیندانەوە، لە گرتووخانەی بەغداوە نووسیوێتی.

ئێمەی دەست بەستەی ناو زیندان
واباڵ ئەگرین
ئەفرین لەخۆشیانا ئەفرین
چونکە هاورێیەکی شیرین
وەك گاگارین
کوری جوتیارێکی زەمین
موژدەی سەرکەوتنی لینین
ئەبا بۆ ئاسمانی بەرین[9]

یان هەر لەزیندانەوە بەمجۆرە لەنەورۆز ئەدوێ:

ئەم نەورۆزەش لە زیندانە
ژیان نییە ئەمە ژانە
ژانیش سەرەتای ژیانە[10]

ئەم شیعرەی لە ٢١ی ئاداری ساڵی١٩٦٢دا وتووە کە سیمای بیرو باوەرێکی تۆکمەیەو نیشانەی بەرخودان و ورەبەرنەدانی پێوەدیارە.

شێخ مارف وەك شاعیرێك تێکەڵ بەبیری سیاسی بووە، ئاوێتەبوونی بەو نێوەندەو کاریگەریی شاعیرانی پێش خۆی و هاوچەرخیشی وەك گۆران و شێخ نوری کە کاریگەربوون بەبزوتنەوەی شیعری تورکی و پاشان رەنگدانەوەی ئەو بیروبۆچوونانە لای مارف بەرزنجی دیارو ئاشکرایە.

بەپێی ئەو ئاشنابوونەی لەگەڵ شاعیرانی سلێمانیدا، ئەمیش هەمان کارو چالاکی هەبووە. سەرەتای وەك ڕۆمانسییەك و پاشان ریالیزمی و تێکەڵکردنی هەردوو ڕێبازەکە لەشیعرەکانیدا دەرکەوتووە، چونکە ((باوەرێکی تەواوی بەرێبازی ریالیستی هەبووە، بەڵام بەوپەری ورياییەوە هەردوو رێبازی ریالیستی و ڕۆمانسی شێوەی پێکەوە

گرێداوە))[11].
بەم پێیە بەشێکی شیعرەکانی رەنگدانەوەی بیروباوەڕی سۆشیالیزمی پێوە دیارەو بەرەو بیری مرۆڤایەتی بردووە.
ئەو دۆخە ئالۆزەو سیاسەتی ئەو قۆناغەی عێراق بەگشتیی و کوردستان بەتایبەتی. کە کۆمەڵێ هیواو ئاواتی رۆشنبیران و سیاسەتمەداران خرایە گۆڕەوەو زیندە بەچاڵکران، بەشێکی ئەو مەینەتییە بەر شێخ مارف کەوت و لەگرتووخانە توند کرا. ئەو لەوێوەو لەو دۆخەدا وەك قارەمانێك لەبواری ئەدەب و شیعردا کۆڵی نەدا، بەشیعرەکانی پریشکی هیوای ئەدا بەکۆمەڵ، لەزیندانەوە چەندین دەقی شیعریی ئەفراندووە. کەبۆن و بەرامەی بیری مرۆڤایەتی و خەبات و تێکۆشانی لەخۆگرتبوون. بەشێکیان بەماوەیەکی کەم پێش لەسێدارەدانی وتووە وەك گاگارین و نەورۆزو کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، یان لەشیعری(گڵی گوڵ)لە٢٦ و ٢٧ ی کانوونی یەکەمی ساڵی١٩٦١ دا لەزیندان دایناوە بەجۆرێك هەست و سۆزی خرۆشاوی بۆ مرۆڤایەتی، بۆ کارو خەبات و چالاکی دەربڕیوەو سیمای هەرەوەزی و کۆڵنەدانی تیاچووەندووە.

لە هاوینا، لەرۆژانی گاقۆڕانا
چەماو وشکن
کانیاو لانەی مارو مشکن
زەوی سوورە بێگیان وەك تەنورە.
لەرۆژێکا، قرچەی گەرما، وەك دایکی ئاڵ گیان ئەکوژێ
تەری دەروونمان ئەمژێ.
من ئەمەوێ گۆماو پرکەم، جۆگا هەڵخەم پشتا و ئاودەم
بەهەرەوەز، سیروان و زێ پێك گەیەنم.
لافاو بێنم
دەشت و دەرو هەردەو تەلان
گەرمیان و کوێستان هەموو بکەین بەباخ و بێستان
هەتا. . .
نامەوێ دوو کێلی سامناك بم وەك دەعبا
زەوی داگیرکەم لە کۆمەڵگا
ئەمەوێ ئەو کاتەش گوڵ بم
هیچ نەبێ گڵ بم بۆ گوڵ بم [12]

لەشیعری ((دوورتر لە گەلاوێژ))دا هەر لەگرتووخانەی بەغاوە وتوویەتی کە هی ساڵی(١٩٦٢)ە لەوێدا بەراوردێکی دوو دۆخی جیا ئەکات، جاران و ئێستا کەتەواو مۆرکی رۆمانسییەتی پێوە دیارە.

جاران ئەستێرەی گەلاوێژ
پرشنگی هیواو ژیان بوو
ئێستا ئەمخاتە بیابان ئەمخاتە گێژ.
جاران گۆرانیم ئەهۆنی
لەباغی بەژن و باڵای یار
ئێستە مرواری ئەهۆنم
لەچاوانم دەروونم.
ئای لەمرواری گەرم و ساردی نا و دەروون
هی لەدەست چوون [13]

لەشیعری (شێتە ژیرەکەی نەوەی فەرهاد)دا [14].کەهەرهی زیندانە، پێ لەسەر ئەوە دائەگرێ کەپێکەوە گرێدانی هێزو عەقڵ وریایی و دانایییە، سووربوون لەسەر کارو ورە بەرنەدان هەتا گەیشتن بەئاوات بێگوێدانە هەر تانەو تەشەرێك، واتە سووربوون و مکوربوون لەسەر مەسەلە مرۆڤایەتییەکان.
شێخ مارفی بەرزنجی هەر لەپەنجاکانەوە هەوڵی تازەکردنەوەو نوێگەری داوە، بەشێکی شیعرەکانی تۆکمەو لەبارن و تەواو کێشەو گرفتەکانی ئەو رۆژگارەی خستووەتە روو، چارەسەرەکانیشی پێکاوە وەك ناوەرۆك ریالیزمی و رۆمانسییە، بەتەواوەتی لەسیماو شێوە کلاسییەکە چووەتە دەرەوە. بەمەش ئەتوانین بڵێین کە هەم لەرووی ناوەرۆك و هەم شێوەو رووخسارەوە پێشەنگی شاعیرانی کەرکوکە لەتازەکردنەوەو نوێگەریدا، شیعرەکانی سادەو ساکارو سەربەست و واقیعییانەن و ناخی کۆمەڵگایان شیکردووەتەوە. وێنەکانیش وێنەی خۆماڵیی و کوردەوارین. پاڵەوان و کەسێتییەکان چینی هەژارو زەحمەتکێش و خاوەن هێزو بازووی خۆیانن.
دووەمیان لوتفی لەباری رووخسارەوە، لەچوارچێوەی کلاسییەکەوە هێدی هێدی بەرەو بەکارهێنانی کێشی خۆماڵیی رۆیشتووە، لەرووی ناوەرۆکیشەوە لەبابەتە ئاساییەکانی ئەو قۆناغەی پێشووی ماوەتەوە، بەتایبەتی ئایینییەکە،لەوێوە بۆ باسی کێشەی فەلەستین، هەر لەو تێڕوانینەوە هەوڵیداوە خەباتی گەلی فەلەستین بخاتە بەرچاو و کوردی لێ هۆشیاربکاتەوە، لەشیعری (هاوار هاوارە)ی ساڵی ١٩٦٧ بەکورد ئەڵێ:

تۆزێ غیرەت کەن ئەی برای دینی
نەوەك باڵای وا بێتە سەرمان
ئەی کورد تەئریخی ئێوە شاهیدە
هەڵسن ئەمجارەش بکەونە جەولان [15]

هەر لەو سەردەمەدا دەسەڵاتی عێراقی لەبارنامەیدا بووە کە کوردستان وێران و کاول بکات و مەسەلەی کورد تور بداتە قوژبنی لەبیرچوونەوەوە. ئەو کارەساتە لوتفی نیگەرانکردووە.

وەرە کوردە قور بپێوین رۆژو شەوو سوبح ئێوار
کورەی شیوەن بەجۆش دەین با بناڵین پڕ بەزار
هەتا. . . .
لوتفی جەرگی گشت برینە ئاوی چاوی جارییە
دەروونم پڕ لەئاهو غەم داخی دڵمە سەد هەزار [16]

لە (مژدەی کوردستان)یشدا سادەو ساکارانە سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ کوردستان دەربڕیوە، هیوای خۆشی وشادی و سەرکەوتن بەکورد ئەبەخشێ، ئەم شیعرەی بەبۆنەی دەرچوونی بەیانی(١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠)ەوە وتووە، لەکورد ئەخوازێ کە خۆیان یەك بخەن و پاڵپشتی یەکتری بن.

داری بەختەکەت واهاتوەتە بەر
شنە شنێتی بەدەم سەباوە
هەتا. . . . . . . .
پشتی یەك بگرن ئەی میللەتی کورد
لەهەر کوێ هەن لەڕووی دونیاوە

لە بیرتان نەچێ دەستم بەدامان
ئەو غەدرەی کەوا لە کورد کراوە.(١٧)

وەك دەرکەوتووە سەرەتای شەستەکان بەهۆی سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلوولەوە باری رۆشنبیریی و مەودای بڵاوکردنەوەی بەرهەمی کوردی ناڵەبارو بەرتەسك بووەوە. بەرهەمەکان تەنها لە دووتوێی دەستنووس و نامیلکەی بڵاونەکراوەدا بوون. پاشان لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا تیشکی چاپیان بینی.

بێجگە لەو دوو شاعیرە لەشەستەکان بەدواوە بەتایبەتی ناوەراستی شەستەکان چەند شاعیرێکی کەرکوکی لەهەوڵ و تەقەلای خۆیان دا بەپشتبەستن بەو تێروانینە شیعرییەی پێش خۆیان و بەئاگاداربوون لەبەرهەم و بزاڤی شیعریی تری نەتەوەکانی دراوسێ و خوێندنەوەیان بۆ کەلتووری کوردی و نەتەوەکانی دەوروبەر، گەشەیان بە بزاڤی شیعری کوردیدا کە سیماو رواڵەتێکی نوێی بەخۆوە بینی هەم لەباری رووخسارو هەم لەباری ناوەرۆکەوە. لە ناویان دا لە زۆری بەرهەمدا سێ شاعیری لاو دەرکەوتن، لە شیعرەکانیاندا دەرکەوتووە کە پەیرەوی رۆمانسیی شاعیرانی سلێمانی شێخ نوری و گۆران و کامەران و دیلان یان کرد، چونکە شعرەکانیان رووخساری رۆمانسییانەیان هەڵگرتبوو، وەك لەتیف هەڵمەت کە بەشێکی شیعرەکانی ناو دیوانەکەی و خواو شارە بچکۆلەکەمان هی شەستەکانەو مۆرکی رۆمانسییەتی، هی ئەوانەی سلێمانی یان پێوە دیاربوو. بەتایبەتی لایەنە شۆڕشگێڕییەکەی.

زامی قووڵایی جگەری هەستیم
ئەپێچم بە گڕ بە چزووی ئازار
ئەکەومە دوای رۆژی سەربەستیم
بە پێچەوانەی دیواری شەوگار
یان..
چاوم ئاراستەی کەڵی ئاواتە
سەرنجم نوقمی بەهاری ئەوە
دوێنێ ئەیان وت:-
سەوزی ناگاتە
بەفرێك کە نوقمی تاریکە شەوە
نەیان ئەزانی کە ئەم وڵاتە
هەزاران ساڵە چاوگەی خەباتە
دوژمنی دیلی و زنجیری خەوە(١٨)

سەلاح شوانیش رۆمانسیانە خۆی دەرخستووە، بەشێکی شیعرەکانی لەکاریگەریی رۆمانسییەتی شاعیرانی سلێمانی بەدەرنین. وەك شاعیرێك بەشێکی ژیانی منداڵی و پەیوەستبوونی بەکەلتوورو باری ژیان و دیمەن و تابلۆکانی ئەو شارەو کارتێکردنی رۆشنبیری هاوچەرخی ئەو سەردەمەو تێکەڵاوی بەرۆشنبیریی کوردی لەبیرو بۆچوونیدا رەنگیدایەوە. لەناوەراستی شەستەکاندا وەك شاعیرێك دەرکەوت، بەشێکی شیعرەکانی لەناوەراستی شەستەکاندا وتووە. بەتایبەتی بەشی دووەمی دیوانەکەی (دڵدارەکەم گەواڵەیەکی پاییزی نییە) وەك خۆی ئەڵێ "پێنج پارچە شیعری سەرەتای ئەم بەشە لەو کۆمەڵە شیعرانەن کە لە ساڵی ١٩٧٠دا لێم ونبوون"(١٩) وەك رازێك ل٧٠ و ٧١، گۆران ل ٧٧، لەیادتە ل ٧٣و٧٤، تێرامان ل ٧٥، ئاهەنگێکی خوێناوی ل ٧٩-٨١، کە هی ساڵی ١٩٦٧ن، پەنجەرەیەکی خۆرنشێنی ل ٨٢-٨٤، هی ساڵی ١٩٦٨-ە، بۆ یادگار ل ٨٥-٩٠ هی کۆتایی ساڵی ١٩٦٩-یە(٢٠).

لە شیعری رازێك-دا کە هی (١٩٦٧)ە تەواو لاسایی گۆران و کامەرانی کردووەتەوە، کە زیاتر رەشبینی پێوەدیارە. هەروەها لەشیعری (گۆران)دا دیسان رەشبینییە، لە چاوەنواریدایەو کشانەوەو پاشگەزبوونەوەیە.

لەشیعری (لە یادتە)ی ١٩٦٧ خۆشەوستیەکی بێسنوورەو گفتوگۆو دایەلۆگێکی نێوان خودو خۆشەویستەکەی و پەیمانبەستن و هیچی تر.

لە(رازێك)دا بەدوویدا ئەگەڕێ و وێڵ و ئاوارەیەو ئاراستەی خۆی دیار نییە، ناوەرۆکێکی دڵداری و رۆمانسییەکی تەواوە:

بەدوای ئاواتی لە چاو دراوا
بە شوێن نیگای عەشقی دزراوا
بەبێ ئاگایی ئەرۆم دوور لەخۆم
ئەرۆم نازانم بەرەو کوێ ئەرۆم(٢١)

چامەکانی تریشی بەهەمان رووخسارو ناوەرۆك، لەشیعری (پەنجەرەیەکی خۆرنشینی) ساڵی ١٩٦٨دا کە لەچوارچێوەی عەشقێکی ونبوودا ئەخولێتەوە بەدوایدا ون و وێڵە. گەرانەوە بۆ ئاخی منداڵی یان خۆ بینینەوە لەخەیاڵدا. خەیاڵێکی رۆمانسیانە.

پاش سیانزە ساڵ بەدواوە وا
تازە لە بۆشایی شەوا
چاڵی گۆناکەت جێ دێڵی
تامی لێوە ساکارەکەی منداڵیتم
بە گەرمی و شیرینی جاران
لەگەڵ هەناسەی بەیان
وەکو باران بەسەر لێوی هەڵقرچاوما ئەبارێنی
لەرەی سینە هارەکەتم، پاش سیانزە ساڵ بۆ ئەهێنی.
هەتا . . .
ماچی ئەو دوو لێوەی جاران
کە بە زۆر ماچیانم ئەکرد
تازە ئەیهێنێتە خەوم(٢٢)

لە پارچە شیعری (بۆ یادگار)یشدا بەهەمان رێچکەدا رۆیشتووە.

ئەنوەر شاکەلی شاعیری کفری بەشێکی شیعرەکانی هی ساڵی (١٩٦٩)(٢٣) وەك ئەم شیعرانەی دیوانەکەی:-

مردنی شازادە، ٨ / ١٠ / ١٩٦٩، ١٠و١١ هۆنراوەیەك بۆ سلێمانی، ٩/١٠ / ١٩٦٩، ل ١٥-١٧، بەندیخانەو شەقامی شەو، ٢٠ -٢٧ /١٠ / ١٩٦٩، ل ٤٠ -٤٧، ونبوون لەناو شەودا، ٤ /١٢ / ١٩٦٩، ل٧- ٩.

ئەنوەر لەم شیعرانەشدا رەگەزی رۆمانسیانەی پێوە دیارە، لەهەندێکیاندا قووڵبوونەوە لە مێژوو، مێژووی خەباتی پڕ سەروەری شاخ و ناوچەی کوردەواری، پاڵەوانی راستەقینەی کورد. شێخ مەحمود، دوانزە سوارەی مەریوان بوونەتە

مۆتیڤی شیعریی و سیمایەکی رۆمانسیانەی شۆرشگێرییان هەڵگرتووە. لەشیعری (هۆنراوەیەك بۆ سلێمانی)دا ئەڵێ:

ئەو تەمەنە رەش و تاڵە
شەقامەکانی ئەخاتە سەر بڵێسەو گڕ
شۆرشی، توورەیی رقی چڕ
زەردەخەنەی ژێر پێی تەمەن ئەروانێتە
ئەو چەقۆیە ئەو خەنجەرەی کەوا پێتە
منالەکان دێن و دەچن.
خرمەخرمی چەپڵەرێزان ئەرێژنە
سەر پەیکەری شێخی گەورەی وڵاتەکەم
بالاشەی وەك بەردو ئاسن
گوللە ژەهر بیخواتەوە
باپایزی مانی شادی رووبارەکان پڕکاتەوە[٢٤]

کە تیایدا شێخی نەمرو دوانزە سوارەی مەریوان بوونەتە هێمای بەرخودان و خەبات و مێژووی سەروەریی.
یان لەشیعری (لە بەندیخانەی شەو)دا ئەڵێ:

بووکی تازەی چوارچێوەی گیان
ئەبەن بەرەو پەردەی جوانی
هۆشی خنکاوی گۆرستان
نووزەی باڵی پروکاوی
تاقگەی تیژی سەرکەوتنی دواهێرشی پیتی سامان
بیرەکانم ئەخاتە چاڵ[٢٥]

لەم شیعرەدا جۆرە لێکچواندنێك لەگەڵ بووکی لادێکەی گۆراندا هەیە. کاریگەرییەکەی لەسەر دیارە. لەرووی بیرو وێنەی شیعرییەوە.

لەژێر تارای سورمە چنا هەر جوانی دێ
کچی جووتیار بەرەو کۆشکی ئاغا کەوتە رێ
جوانی لادێ رووتی وەکو تەلی وەنەوشە
بەئاوریشم و بەئاڵتون ئەم کۆشك و حەوشە.
خراوەتە رێ بۆ پەردەی ئەتلەس و گورون
بۆ باخەڵی ئاغای پێش چاو بەچل چرا روون[٢٦]

ئەم شیعرانەی ئەنوەر شاکەلی و تەواوی دیوانەکەی وێنە شیعرییەکان و شێوازو دارشتنیان تەماوین و چرو ئاڵۆزن و خۆیان لە دەقی ئەو قۆناغە جیا ئەکەنەوە بێگومان ئەمەش نیشانەیەکی تری بزاڤی ئەونوێگەرییەی شیعری کوردییە.

### * تەوەری سێیەم

لەکۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا، شاعیرانی کەرکوک بەتایبەتی هەرسێ شاعیر لەتیف هەڵمەت و سەلاح شوان و ئەنوەر شاکەلی تەکان و گورێکی بەرچاویان بەشیعری کوردیدا. ئەویش هەنگاونان بەرەو نوێگەرییەکی هاوچەرخانەی دیارو بەرچاو. لەباری ناوەرۆکەوە یاخیبوونێکی توندوتوورەی بەخۆیەوە بینی. لەهەموو چاوپێکەوتن و نووسین و شیعرەکانیاندا ئاماژەیان پێداوەپێیان لەسەر داگرتووە. هەڵمەت ئەڵێ و خۆی بەدەستپێشخەر ئەزانێ:

((ئەڵێم وسوورم لەسەر ئەوەی کەوا یەکەم شاعیری کوردم کەوا لەزەمینەی شیعری کوردی هاوچەرخدا هەموو جۆرو شێوازە کلاسیکییەکانم بەپاچی نوێگەری رووخاندووە، ئەوەش لەدوای چاپ و بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە شیعری خواو شارە بچکۆلەکەمان. پێش ئەوەش بەساڵێ یەکەم دەقی شیعری تازەم لە گۆڤاری رزگاری کە لەسلێمانی دەرئەچوو بڵاوکردەوە، کەیەکەم دەقی بانگەوازی نوێگەرییە لەئەدەبی کوردیدا. دوای ئەو شۆرشەی کە گۆران لەکاتی خۆیدا لەشیعری تازەی کوردیدا تەقاندیەوە.[٢٧]

کۆپلەیەکی شیعرەکەشی لە گۆڤاری رزگاریدا بەم چەشنەیە:

لە شەپۆلی گەدەلوولی ستەم دا
لە لێلایی بیابانی پڕ تەم دا
زۆر لاشە کەوت لە سەنگەری باوەردا
بووبە گەردو چوو بە گەرووی رەشی هەورا.[٢٨]

گۆڤاری رزگاری تەواوی شیعرەکەی بڵاونەکردووەتەوە. دەقی چامە شیعرییەکەی بەگۆرانکارییەوە. لەدیوانەکەی خواو شارە بچکۆلەکەمان–دایە سەرەتاکەی بەمجۆرەیە.

لە دووکەڵی گەردەلوولی ستەما
لەلێلایی کەفی بیابانی تەما
لەناو دەمی جۆشی هەڵمەت و شەرا
لەسەر لێوی ئاگرینی سەنگەرا.
هەتا..
ئەوسا شەبەق ماچمان ئەکا بەنیگای چاو
لێوی تاسە ئەنێینە ناو دەمی هەتاو
گۆرێك ئەکەین بۆ دیلێتی و بۆ مردن.
بەستە ئەڵێین بۆ رووناکی. بۆ سەرکەوتن
پەیکەرێکیش دروست ئەکەین بۆ سەربەستی
بۆ کۆڵنەدان بۆ ژیان، بۆ خۆشەویستی[٢٩]

دوای شەش مانگ بەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو کۆپلەیەدا لەنامەیەکیدا بۆ گۆڤاری رزگاری لەدوو توێیدا چەند کۆپلەیەکی شیعریی ناردووە. ئەتوانین لەخانەی نوێگەری شیعری کوریدا دابنێین، چونکە سیماو رواڵەتێکی تازەگەری پێوە دیارە، دەربرینەکان بیری چروپرو قووڵن:

لە پشت دیواری مەرگەوە. دەست ئەگرم بەو پەنجەرانەوە
کە بەهەشتی ئاواتم ئەخوێنن
بەسەر لێواری وشە بەسۆزەکانا ئەرۆم بەرەو دوائامانجم
بەرەو سەرکەوتن بەرەو بەختیاری کوردستان
بەرهەمی جوان، نووسینی رێك هەڵبەستی قووڵ
وشەی تەماوی، چیرۆکی ژێر هەور
رستەی کەفاوی
وێنەی ناو گەردەلوول، یادگاری ناورەشەبا.[٣٠]

شیعرەکانی ناو دیوانی:خواو شارە بچکۆلەکەمانیش تەواو یاخیبوون و رەتکردنەوەی بەرهەمی کۆن و نەریتە پروپووچەکانەو ناونیشانەکانیشیان بیری تازەگەریی دەرئەخەن وەك ناونیشان ل٢٤–٢٨، لەباوڵێکی کلیل ون بوودا ل٢٩–٣٢، وشە سووتاوەکان ل٤٣و٤٤، ئەم کولەکانە ئەشکێنم ل٤٥–٥٢، پەیکەرێك بۆ خۆم ئەتاشم ل٥٩–٦٢، خواو شارەبچکۆلەکەمان ل٦٤–٦٥، هەڵەی شوێن پێکان ل٦٥و٦٦، ئەڵێن خۆی لەدارستانەکانایە ل٦٧و٦٨، لقی شەو هەتاو ئەگرێ ل٦٨، گەلای خوێ ئەوەرێ ل٦٩،

تارماییەکان ئەتوێنەوە ل٧٠ هتد.[٣١]

لەشیعری ((ئەم کوولەکانە ئەشکێنم))دا ئەڵێ:

ئەم کوولەگانە ئەشکێنم
ئەمە باوەڕی منە.
ئاگرەکەم ناتوێنەوە
تەمەنی من بڵێسەیەکی بێ خۆڵەمێشە
پەرستگاکان ئەڕووخێنم
وشەکانم ئاوێتەی ڕەگی زەوی ئەکەم.
یان
لمی ئەم بیابانە کەفاوییە ئەڕژێنمە
گلێنەی ناو ئەو تارماییەی کە دەرگاکان دائەخەن
کەس شمشێری ئەم کێلانانە هەڵنەکێشێ
ئەم هێلکانە هیچ هەڵنایەنن[٣٢]
یاخود..
خوێنی کوژراوەکان بانگم ئەکات
بۆ ئەوەی
وێنەیەکی پێ بکێشم
لەسەر تووڕەیی پەنجەرەکەمانا
ئەم گۆزە پڕ لەخۆڵانە
زیندە بەچاڵ ئەکەم
ئەم کووپە سوورانە ئەشکێنم.[٣٣]

ئەم چامەیە سەراپای پڕە لەدیمەن و تابلۆی یاخیبوون و پێداگرتن لەسەر ڕەتکردنەوەی هەموو نەریتە کۆن و پووچ و باوەکان، ڕەتکردنەوەی ترس و دوودڵیی لەناخی مرۆڤ و کۆمەڵگادا، پڕن لەهێمای بەرخودان و سەرنج و تێڕامانی وردو بیری نوێ وەك ئەم کولەکانە ئەشکێنم، پەرستگاکانم ئەڕوخێنم، ئەم هێلکانە هیچ هەڵ نایەنن، ئەم گۆزە پڕ لەخۆڵانە زیندە بەچاڵ ئەکەم، ئەم کووپە سورانە ئەشکێنم، کە بەرامەی یاخیبوونێکی بەرچاویان تێدایە.

هەر لەشیعری (ناونیشان)دا گیانی یاخیبوونەکەی بردووەتە ئاستێ بەرەو گەشبینی و ورە بەرزیی و یاخیبوون لەمردنیش. لەپێناو کوردو کوردستاندا. ڕەتکردنەوەی پیلانەکان و پووچەڵکردنەوەیان و بەخشینی نەمریی بەژیان. بەکوردستان و لەوێوە گۆرانی بۆ جوانی و ڕووناکی و فراوانی ژیان ئەچڕێ.

من نەمردووم، نە کوردستان گۆڕستانە
من هەر زیندووم تاسەر زیندووم
وەکو وشە وەکو ئاسمان
بەستە ئەڵێم بۆ ڕووناکی بۆ جوانی ئەم ژیانە.
یان...
جگە لە خۆم کەس ئەم خاکە ناکێڵێ
تامی بە ڕووی دۆڵناکات
یاری ناکا بە بەفر
بەردێ ناگرێ لە گوێزی چڕ
چەژی ئاوی سەهۆڵ ناکات
لە بێگانە ئەبم بە مەرگ و ئەتۆم
گەربخاتە ئەم زەوییە دەمی بێڵێ.
ئەمنەخشەیەی کە تیا ئەژیم
ئەو سنووری کە کێشراوە هەر ئەمێنێ وەکو ماوە.
هەڵ ناوەشێ بە هیچ هێزێ
وەك شاخەکان تەمەنی من ئەپارێزێ
مەرگ ئەکوژم.
بەڵام مردن ناگاتە من
من بای ژیان هەر ئەمژم. هەر ئەمژم[٣٤]

لەڕووی ڕووخساریشەوە کێشەکان، سەرواو ڕەیتمەکانی ناوەوەو دەرەوەی شیعرەکان وێنەو تابلۆی لەباروجوان، وێنەی شیعرییان ئەفراندووە.

بەخوێندنەوەی دیوانی خواو شارەبچکۆلەکەمان دەرکەوتووە، کە لەتیف هەڵمەت یەکێکە لەو دەنگە ناسراوانەی شیعری کوردی هاوچەرخ، بەگیانێکی شاعیرانەی نایابەوە پێشوازی لەژیان و شۆڕش ئەکات، دیوانەکەی، کۆمەڵە شیعری خواو شارە بچکۆلەکەمان بەخاڵێکی وەرچەرخان و گۆڕانێکی پرشنگداری شیعری نوێی کوردی لە قەڵەم ئەدرێ، لەشێوازی شیعری کۆن و ناوەڕۆکی کۆنی شیعر یاخیبوو، لەواقیعی فیکری تێکڕای کورد یاخیبوو، لەو ئەفسانە پرو پووچانەی نێوکۆمەڵگا[٣٥] لەدیوانەکەیدا زۆرترین ئەفسانەو بەشێکی کەلتووری ئەو نەریتە ئەفساناوییانەی ناو کۆمەڵگای کوردەواری ڕەتکردووەتەوە. کەئەوەش خۆی لەخۆیدا یاخیبوونێکە بەرامبەر نەریتە پڕوپووچەکانی نێو کۆمەڵگاکەی، جگە لەوەش ناونیشانی دیوانەکەی و مانشیتی قەسیدەکانی هێمای تازەگەریی و شێوازی نوێیان لەخۆگرتووە، وەك چرایەك لە شەپۆلی گەرداودا، پەیکەرێك لەپشکۆ، ئەوانەی کە پێشووتر باسکراون ئەو شیعرانەی و چەندینی تری بەشێوازێکی بەهێزو لە شێوەی پەخشاندا دایرشتوون و لەڕووی ڕووخساریشەوە ئازادو ڕەهاو سەربەستن لەشیعری نوێی کوردیدا بۆ یەکەمجار دەرکەوتوون، کە ئەمەش لەو کارتێکردنە شیعرییە کوردییەی پێشووەوە نەهاتووە، بەڵکو لەڕێگای شیعری عەرەبییەوە هاتووە. بەتایبەتی تەیارو گرووپی شیعری ٦٩ی فازل عەزاوی و هاوڕێکانییەوە بووە. کە ئەوساکە لەو سەردەمەدا باو بووە.[٣٦]

هەر ئەو دەقە شیعرییانەو ناونیشان و ئەو جۆرە ناوەڕۆکانەی شیعرەکانی شاعیر لەتیف هەڵمەت کە سیماوبەرامەیەکی یاخیبوونیان پێوە دیاربوو. لەو سەردەمەداو لەناو شاعیرانی هاوچەرخی خۆیدا، ئەودیمەن وێنە شیعرییانە جیایکردوونەتەوە، لەو بارەیەوە لەتیف حامید بەرزنجی ئەڵێ: ((ئەوەی لەوانی تر جیای ئەکاتەوە لەشیعرو بۆچوون فیکردا، تووڕەیی و یاخیبوونی نەوەکانمان بەرەو سەرکەوتن. بەسەر شێوازو دارشتنی رووت و داخراودا، لەدیوانەکەیدا، خواو شارە بچکۆلەکەمان ئاماژەو نیشانەیەکی جیاوازە لەسروشتی شیعریدا دائەنێ ئەوەو، کە موژدەیەکی لەدایکبوونی شیعری کوردی پێشکەوتوو دەرئەخات))[٣٧].

هەر ئەو یاخیبوونە لای ئەنوەر شاکەلی ئامادەبوونی تەواوی لەبەشێکی شیعرەکانی ناو دیوانەکەی (پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی) هەیە. پاشان بووەتە سیمای شیعریی لای شاعیرانی کەرکوک بەتایبەتی لەکۆتایی شەستەکان و سەرەتای

حەفتاكاندا. هەر ئەمانیش بەشێوەیەكی پراكتیكانە یاخیبوونی خۆیان ڕاگەیاند، ئەوەتانێ هەر ئەنوەر شاكەلی خۆی لەسەرەتای دیوانەكەیدا نووسیویێتی، ((هۆنراوەكانم بەوپەڕی شانازییەوە ڕوو لە خوێنەران و مێژووی ئەدەبیمان ئەكەن و وەكو پێشەنگی قۆناغێ سەر هەڵئەدەن كە قۆناغی گۆڕان بەجێئەهێڵێ و هۆنراوەی ئەمڕۆی كوردستان دیاری ئەكات))[٣٨].

شیعرەكانی ناو پرۆژەی كودەتایەكی نهێنی وەك (ونبوون لەناو وشەدا ل٧-٩و لەبەندیخانەی شەقامی شەو ل٤٠-٤٧ كەساڵی ١٩٦٩ن، بەدوایداو لە حەفتاكاندا وەك (سێ دەنگ لە مێژووەوە) شیعرەكانی گیانی تووڕەیی و یاخیبوونیان لەخۆ گرتووە، كە دەرەنجامی بێزارییەكە لەناو خودی كۆمەڵگاوە سەری دەرهێناوە، لەوێوە لە وشەو فەرهەنگی ناو كۆمەڵگا بێزارو یاخییە لەچامەی (ونبوون لەناو وشەدا)، ئەڵێ:

گڵۆپەكانی شارەكەم لەگێژاوی تەمی ڕەشا
ئەتوێتەوە، نیگای نەخۆشی كوێرێكەن
ئەڕۆم بەسەر شەقامێكا مەمك
باڵدارەكان شەقەی باڵیان دیاری شەوە
چەقۆی ئازار
داستانێكە بۆ كۆتایی گیانی نەوە
دیوارەكان دەرگای ئاسنی سارد
شەقامەكان،كواماڵەكەم؟
كوا ئافرەتی خۆشەویستی شەوی ژیانم.

تا ئەو كاتەی كە دەنگی بێزاریی و یاخیبوونی خۆی هەڵئەبڕێ و گلەیی لە مێژووی كۆمەڵ ئەكات.

هەورە تریشقەی زستانی ساردی ئەمساڵ
مناڵەكانی ناو بێشكەو دەسرازی یان
ئەترسێنێ وێڵمان ئەكات لە گروگاڵ
هەتا...
وشەكانی ناو فەرهەنگی ئەم خەڵكانە
كەوتوون لەسەر شەقامەكان
چرنووك ئەگرن لەپێی ڕێبوار
پیتەكانیان هەموو ڕۆژێ
لەگەڵ گزنگی بەیانا ڕوو ئەگۆڕێ.

ئەوانەی ناوێ وشەو كرداو بیری خۆی ئەوێ كە هەمیشە پاك و ژەنگ نەگرتوو بێت.

من ئەمەوێ وشەیەكی گەش و پاراو
بە درێژی تەمەن پاك بێ و ژەنگ نەیگرێ[٣٩]

یاخییە لەنەیارو دوژمن و نەریتە كۆنەكان تا دێت تووندتر ئەبێت و باڵدار لەئاگرا ئەسوتێنێ، مناڵەكان ئەخنكێنێ و ژەهر ئەكاتە ناو پەرداخی خەڵكی شارەوە، بەوە تەسەللاو تینوێتی خۆی ئەشكێنێ.

ئەمڕۆ ژمارەی دوژمنی ڕاستەقینەم هەر زۆر ئەبێ
باڵدارەكان لە ئاگرا ئەسووتێنم، مناڵەكان ئەخنكێنم
ژەهرێكی خەست ئەڕێژمە ناو پەرداخی
خواردنەوەی هەموو خەڵكی ئەم شارانە[٤٠]

دەربڕینەكانی شاكەلی هێمای خۆ نەگونجان لەگەڵ كۆمەڵدا ئەگەیەنن. ئەم خۆنەگونجانەش جۆرە یاخیبوونێك ئەگەیەنێ. بێگومان ئەمەش تا ڕادەیەك بەسەر هونەرمەند یان شاعیردا جێبەجێ ئەبێ. وەك چۆن ڕۆبیرت ريد، ئەڵێ: ((هونەرمەند یاخی ئەبێ، چونكە تەنها كەسێكە لەگەڵ كۆمەڵدا لە ململانێدایە یاخییە، چونكە خۆگونجانی لەگەڵ كۆمەڵدا نییە، هەر لەو بارەیەوە دیسان ئەڵێ: چەپاندنی هونەرمەند لە خۆگونجانی لەناو كۆمەڵگادا هەر خۆی لە بنەرەتدا بڕیاری عەقڵی هونەرمەند ئەدا))[٤١]، كە ئەمەش بەسەر دەربڕینەكانی شاكەلیدا جێبەجێ ئەبێ.

ئەگەرچی سەلاح شوانیش سەرەتای دەسپێكردنی شیعریی لەشەستەكانەوە بووەو شوێن پێی شاعیرانی سلێمانی هەڵگرتبوو، لەكۆتایی شەستەكان و سەرەتای حەفتاكاندا سیمایەكی یاخی گەرییانە لە شیعرەكانیدا بەرجەستە بوو وەك لەبەشی یەكەمی دیوانەكەیدا كە هی حەفتاكانە یاخیبوون و تووڕەیی خۆی بەرامبەر هەندێ نەریتی كۆمەڵگا نواند. وەك ڕێگرتن لەدەربڕینی سۆزی خۆشەویستی و دڵداری، هەر لەو ڕوانگەیەوە ئەو شیعرانەی بۆ دڵدارەكەی وتووە، لەشیعری ((دڵداری ئاونگی خەم))دا ئەڵێ:

دڵدارەكەم
یاخیبوونی من لە یاسای ئەم كۆمەڵە
لەوەدایە
تا ئەو پەڕی خۆشەویستی خۆشم بوێی
سەركەوتنی ژیانی من لەم جەنگەڵە
لەوەدایە
تا ئەوپەڕی خۆشەویستی خۆشم بوێی
خۆشەویستی لە ناو ئێمەدا تاوانە
بۆیە منیش بەژینی كۆن و نوێمەوە
لە ناو چارەكانی تۆدا ئە توێمەوە.[٤٢]

یاخود لەشیعری ((دەسا دەرگا بكەرەوە)) ئەڵێ:

دڵدارەكەم
هەموو خەڵكی ئەڵێن گوایە
دڵداری من لەگەڵ تۆدا
تەنها مردنی لە دوایە
منیش ئەوەن سەیری چاوەكانی تۆم كرد
تا چوومە ناو بیبیلەی چاوەكانتەوە
ئەوەن هانام بۆ دارستانی خەواڵووی چاوەكەت برد
تا تۆ بوویتە گلێنەی هەردوو چاوەكەم.
تۆ بوویتە گوڵەی خەمی دەستە چەپە نەبراوەكەم[٤٣]

یاخیبوونەكەی هەر لەدیاردە كۆمەڵایەتییەكە نییە، بەڵكو یاخیبوونێكی تری ڕاگەیاندووە كە لەدوو توێی بیرێكی شۆڕشگێڕی و نەتەوایەتیدا خۆی دەرخستووە لەشیعری ((هاوین))دا ئەڵێ:

بەسە ئیتر
چاوی ژەنگاویت هەڵبێنە
ئەو كێوەی بەفری پێش مێژوو بەستوویەتی
ئەو كێوەی ژەهری ئەژدیهاو لاشەی مردوو گرتوویەتی
هەڵ كەنین بروخێنین
تا تیشكی دەس و پێی بەستراو

بگاتە دەروازەی جیهان
تێکرا دەس دەینە بێل و پاچ
کوێرە بیرەکان بەجارێ پرکەینەوە
کۆشکە داروشاوەکانی شارەکەمان
برمێنین و لەنوێ دروستی کەینەوە.(٤٤)

لەقەسیدەی ((لە پێناوی خۆرێکی شێت دا))کە هی سەرەتای حەفتایە، خۆی و مانگ و ئەستێرەکان بەدوای ئاسۆیەکدا ئەگەرێ کە خۆری خنکاندووە، لە وێدا ململانێ و زۆرانبازی لەنێوان خودی خۆی و هێزێکی تردا دروست و بەرپا کردووە. کە لەسەرەتای بوونیەوە هەبووەو دەرکی پێکردووە، پاشان ئەخوازێ کە مەوداو توخوبی‌نێوان مان و نەمان نەمێنێ، بۆیە ئاگری کڵپەداری ئەوێ، خۆری شێت و ئازادیی ئەوێ.

با نەمێنێ لەنێوان مان و نەمانا
من ئاگری گروکڵپەدارم ئەوێ
خۆری شێت و هارم ئەوێ
سا وەکو کۆت لە ملمایە
تا ژەنگ ئەگرێت و ئەرزێ
ئەوسا پڕ بەپێ ڕائەکەم
بۆ ئەو شوێنەی خۆم ئەمەوێ(٤٥)

بەحەزو ئارەزووەکانی ئەو دۆخە چەقبەستووە ڕەت ئەکاتەوە بەجۆرێ دەریان ئەپەڕێنێ کە خوازیاری نوێگەرییە لەکردارو رەفتارو گوفتاردا.

بێگومان ئەمجۆرە یاخیبوونەش یاخیبوونە لەدەورو رۆژگارێکی پڕاوپڕ لەچەوسانەوەی بیر، خواستەکانی کۆمەڵ لەبەرامبەردا سەپاندنی بیرێکی کۆنەخواز کە هەمیشە کۆمەڵ رەتی ئەکاتەوە، چونکە دابرانە لەدیرۆکی خۆی.

سەلاح شوان ئەگەڕێتەوە بۆ مێژوو و ئاماژە بەزەردەشت و باوەرەکەی ئەکات بە مەزدەك و مەزدا ئەو خوایەی کە زەردەشت لێی ئەدوێ، ئاهورامەزدا بووەتە هێمایەکی پیرۆز. وە بەگیانێکی شۆرشگێرییەوە خۆی پێوە گرێداوەو پاشان بەستنەوەی ئێستا بەرابردووەوە بووەتە کرۆکی بیروباوەرەکەی، چونکە کۆمەڵگای کوردەواری خاوەنی باوەرێك بووەو لێی زەوتکراوە، ئەوەتانێ لەشیعری ((داستانی فریشتەیەك))دا ئەڵێ:

کابرا کوێرەکەی بەردەرگای مزگەوت
ئەو رێچکە خزەی پێ نیشان ئەدا
کەوشەکانی زەردەشتی لێ کەوت
بەڵام فریشتە گۆشەکراوی شۆڕشگێڕێتی
بێ کرمۆڵی ژەنگ لەبەرکردووی
کۆنە پەرستگای باپیرەی مردووی
چاو هەڵئەکۆڵێ
تاکو ئەو شەوقە دروستکراوە
دەربهێنێ کەلەناو چاوانیا خۆی مەڵاس داوە
داخی کوشتنی کۆرپەکەی مەزدەی پێ دەربهێنێ
شورەی ئاسۆری شەو بسووتێنێ
بت و بتخانە دابروخێنێ.
چونکە بە تەنها هەر خوایەك هەیە بروایەك هەیە (٤٦)

سەلاح شوان لەحەفتاکاندا بەئاشکرا بانگی یاخیبوونەکەی رائەگەیەنێ و خۆی لەناوەرۆکە ئاساییەکان ئەترازێنێ و بەرەو پابەندبوون بەنەتەوەو نەتەوایەتی و جووڵانەوەی شۆرشگێرییەکەی گرێ ئەدا، دواتریش بەشێکی شیعرەکانی لەگۆڤاری روانگەدا بڵاوکردەوە، خۆشی لەخانەی ئەو گرووپەدا دۆزیوەتەوەو بوو بە بەشێك لەوان.

لە شیعری ((لە روانگەی یاخی بوون و شۆرشگێرییەوە)) پێشمەرگەو کێشە رەواکەی کردووەتە کرۆکی چامەکە.

ئەی پێشمەرگەی رێگای وشکی نادیاری
لە گۆمی خوێنی پڕ گرمەی شەوی زاواو بوکێنیدا
پاش تەمەنێکی دڵداری چاوەکانت دوو بۆمبایە
بە دوای گڕی ئاواتەکەی زەردەشتەکەی کوردستانا ئەگەرێ.
یان...
لە یاخی بوون و شۆڕش و لە مردنا
خوێنی رژاوی کوردستان ئەکەیتە ملوانکەی دیاری
بۆ سنگی وەرزی شاخەکان. .
هەتا. . . .
لە یاخی بوون و شۆڕش و مەرگا
دەم ئەنێینە دەم شارەکەی خۆمان
دەم ئەنێینە گوێ مەمکە گەرمەکەی سەرسنگی ئاسمان.
یاخی لە خۆری بێ ناونیشانی درۆی ئەم شارە
شۆڕش لە دژی مێشکی بێ گیانی
تەسلیم بەندی دووای ئەم ئازارە.(٤٦)

یاخیبوونەکەی بوژانەوەی سەرلەنوێ ژیان و پابەندبوون بەخەبات و مانای یاخیبوونی نەتەوەیی لەخۆی گرتووە، چونکە ئەو قۆناغەی ژیانی کوردەواری ئەوەی هەڵگرتووە کەکت وەت لەو بۆچوونەی ئەلبیرت کامۆ ئەچێ یان رەنگدانەوەی ئەو بۆ چوونەیەتی کە ئەڵێ: ((تەنها خەسڵەتەکە ژیان ئەبوژێنێتەوە لەبوونی تاکدا وەك هێزێکی کاراو تیژرەو پاڵی پێوە ئەنێ بۆ رووبەرووبوونەوەی هەموو شتێ لەجیهاندا، لەیاساو سیستەمەکانی، رەوشتەکانی، بەهاکانی، نەریتەکانی، شێوازی ژیانی تەنانەت کەیانی خودی خۆشی))(٤٧)یاخود((یاخیبوون ئەو شۆرشەیە کە بەهاکان بەژیان ئەبەخشێ، ئەوکاتە بڵاوئەبێتەوە کە هەموو ژیان بگرێتەوە، جوانی و رەونەقئەبەخشێنێتەوە))(٤٨).

بێگومان ئەوبزاڤە شیعرییەی کوردی و ئەو نوێگەرییەی کە شاعیرانی کەرکوك لەو قۆناغەدا دەستیان دابوویە، لەدوولایەنەوە سیماو رواڵەتی دەرکەوتووەو دوو خەسڵەتی نوێی گرتە خۆ کە((یاخیبوون لەناوەوەو یاخیبوون لەدەرەوە))بوون.

ئەو گۆڕانە نوێیەی شیعری کوردی کەرکووك لەباری ناوەرۆك و بیری تازەوە کە خۆ دەربازکردنە لەو ناوەرۆکە ئاساییانەی شیعری پێشووی وەك خۆشەویستی و غەزەلی دڵداری و ستایش و بابەتی ئایینی بوو. ئینجا بەرەو بەکارهێنانی وشەو دەربرینی لەبارو پرکەف و کوڵ، جۆش وخرۆش ئامێزو شکاندنەوەیان بەباری دەربرینی بیری نوێ و بیرکردنەوەی قوڵ کە لەوەو پێش بەوجۆرە نەبووە.

واتە زمانێكی جیاوازتر لەوەی پێشوو، وەك چۆن ئەدۆنیس ئەڵێ: ((شاعیر وشەكان لەدەلاقە كۆنەكەی دائەماڵێ و شەحنی ئەكاتەوە بەدەلالەتی نوێ، بۆ ئەوەی شتێك بڵێ كە لەوە پێش نەوترابێت))[٤٩]، ئەمجۆرە گۆڕانەش وەك یاخیبوونێك و سیمایەكی تازە لەهەناوی دەقەكاندا خۆی دەرخست. لەدەرەوەی دەقیش واتە تەكنیك، وازهێنان لە سیستمی بەكارهێنانی كێش و سەرواى كۆن و بەكارهێنانی كێشی برگەیی و دانانی شیعری سەربەست و بابەتی پەخشانە شیعر.

هەر ئەو بزاڤە شیعرییەی كەركووك كە سیمای یاخیگەریی بەخۆوە گرتبوو. ئەوەش بۆ ئەو سەردەمە كارێكی نوێ بوو، چونكە گۆڕانێكی بەرچاوی تێدا دەركەوت و بەرەو نوێگەری هەڵكشا. ئەم جووڵانەوەیە، ئەم گۆڕانە نوێیە جێی سەرنج و تێرامانی گەلێ لەنووسەرانی ئەو قۆناغە بوو، وەك شاعیران خۆیان باسی لێوە ئەكەن كە مملانێ و دژایەتیانكراوە. لەمپەریان لەبەردەمدا دانـراوە. بەتایبەتی لەو دەمەی كەویستوویانە لەبەیاننامەیەكدا ئامانج و خواستەكانی خۆیان بخەنەروو. وەك ئەو هەولانەی لەیەكەمین كۆنگرەی نووسەران تەممووزی ١٩٧١و یەكەمین میهرەجانی شیعری كوردی لەكەركوك. كە بەدوایدا لەتیف هەڵمەت و عەبدولسەلام گیراون، پاشان بەهەوڵی هەندێ كەسێتی ئازاد كـراوە[٥٠]، هەر لەبەیاننامەكەیاندا دەركەوتووە كە لەتوانایاندا بووە پرۆژەیەكی نوێ بۆ شیعری كوردی و ئەدەبی كوردیدانێن، كە تیایدا سیماو شێوەی یاخیبوونێكی نوێ هەڵگرێ.

بەیاننامەكەش بەناونیشانی (شێتەكان، سەرنج، هەڵویست، پـرۆژە)بـووە كە بیرۆكـەی تـووندرەوی، سەرنج و تێرامـان و هـەڵوێستـوەرگـرتن و كـاروچالاكی نـوێی هـەڵگـرتـووە، بیرۆكەكەشی بۆ كۆتایی شەستەكان ئەگەڕێتەوەو سەردەمی بڵاوكردنەوەكەش ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٠ یە لەپەرەگرافێكیدا نووسراوە ((هەڵبەستی كوردی هێشتا دیلی ئەو قاوغەیە كە هەر لەمناڵییەوە كراوە بەپۆیلانەی، كاتی ئەوە هاتووە كە شۆڕشێك بەرپابكەین بەسەر هەموو ئەو سنوورو یاساو رژێمانەدا كە تاكو ئێستا هەڵبەستی كوردی شەتەك داوە، گۆڕانیش بێ شۆڕش نابێ))[٥١]، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ كە هەڵبەستی كوردی لەو بارە تەقلیدییە كلاسییە كۆنە رزگار بكەن، سنوورو دەستوورو یاساكانی بشكێنن، ئەوەش بەكاری گـۆڕان ئـەبێ و بـەرپاكردنی شۆڕشێكی نـوێ، هەم بۆچوونەكان و هەم كارەكان لەخۆیاندا بانگەوازێكی نوێگەرییەو ئـەوان پێشەنگی بـوون، هـەر ئـەو نوێگەرییە كە شاعیرانی كەركوك دەستیان دایێ و پێشەنگی بوون و روانگەییەكان ئاماژەیان پێكردووە. هەولیشیانداوە لێیان نزیكببنەوەو كارەكان بەهاوبەشی ئەنجامبدەن، لەو بارەیەوە شێركۆ بێكەس ئەڵێ: ((نوێكردنەوە تەنها لەروانگەدا نەبووە، بەڵكو لەجیلی كەركوكیشدا هەبووە، ئێمە یەكتریمان بینی و ویستمان بەیەكەوە بەیاننامەكە دەركەین، لەبیرمە من و حوسێن عارف پێكەوە چووین بۆ كەركوك، لەتیف حامیدو لەتیف هەڵمەتمان بینی، بـەڵام ئـەوان نەهاتنە پێشەوە لەبەرچەند هۆیەك، تائێستاش نازانم چی بـوو))[٥٢]، هەر لەو بارەیەوە وەك ئاماژەیەك بۆ نزیكبوونەوەی گرووپی روانگە لەشاعیرانی كەركوك دیسان شێركۆ بێكەس ئەڵێ: ((ئینجا لەهەمان كاتدا. ئەوەش دەڵێم دیوانی (خواو شارەبچكۆلەكەمان)ی لەتیف هەڵمەت، بەبڕوای من یەكێ بوو لەشتی تازەو جوانەكانی ئەو وەختە))[٥٣].

هەر لەتیف هەڵمەتیش لایەنێكی تری هەڵویستی روانگەی باسكردووە ئاماژەی پێداوە. كە ئەڵێ: ((لە ژمارە(٢٩و٣٠))) هاوكاری سـاڵی١٩٧٠ یەكێ لەروانگەییەكان بەبێ ناو وتارێكی بڵاوكردەوە، تیایدا ئەوەی دەربڕیوە كە ئەوان، واتا روانگەییەكان داوای جۆرە دەقێك دەكەن لەو دەقانەی خواو شارە بچكۆلەكەمان، ئەوەیش ئەوە دەگەیەنێ كە روانگەییەكان دوای دەركردنی بەیاننامەكەیان دەقێكی ئەوتۆیان نەبووە بیكەن بەنموونەی ئەو بابەتەی كە بانگەشەیان بۆ دەكرد، بەناچاری پەنایان بـردووە بۆ دەقەكانی دیوانـەكەی من ((خواوشارەبچكۆلەكەمان))[٥٤].

لەهەمان شوێندا ئەڵێ شێركۆ بێكەس وتوویەتی: ((خۆم بە لقی هـەتاوەكەت دا هـەڵواسی))[٥٥] كە هێمایە بۆ ئەو وێنە شیعرییە تازەیـەی لەهۆنراوەیـەكی دیوانـی خواو شارەبچكۆلەكەمان–دا ل٤١، وەك لەنووسین و چالاكی و ململانێكاندا دەركەوتووە ئەم دەستەیەی شاعیرانی كەركوك خۆیان بەگرووپی كەركوك كفری ئەناسێنن و ناوی گرووپیان لەخۆ ناوە. لە چاوپێكەوتن و سیمنارەكاندا ئاماژە بەرۆڵی خۆیان ئەدەن، گلەیی و رەخنە ئاراستەی رەخنەگران ئەكەن بەوەی كە رۆڵـیان فەرامۆش كراوەوماندوبوونیان بەهەند وەرنەگرتوون. . .

لەناو ئەم دەستەیەدا چەند دەنگێكی دیـاری وەك لەتیف هەڵمەت و ئەنوەر شاكەلی لەبواری نوێگەری شیعری كوردی كـەركـوك دەركـەوتـن، چونكە نـــوێخـوازی لـەسـەردەستی لەتیف هەڵمەت لەخواوشارە بچكۆلەكەمان و ئەنوەر شاكەلی لـەپـرۆژەی كـودەتـایـەكـی نهێنیدا دەستـی پێـكردووە كە لەكاتی خۆیدا سەداو دەنگدانەوەیەكی گەورەیان هەبووە لە شیعری كوریدا، ئەمە جگە لەكاریگەری روانگە بەتایبەتی لەلایەن تیۆری و بەرچاو خستنە ئەدەبییەكاندا[٥٦]، لەناو ئەم گرووپەدا جگە لەناوی لەتیف و ئەنوەر هی تری وەك لەتیف حامیدو ئەحمەد شاكەلی و چەند ئەدیبێكی تریش هەبوون. وەك خۆیان ئـامـاژەی پێدەكەن لەژێر كاریگەریی ئەدەبی عەرەبیدا بـوون و كـۆمـەڵی هـۆنـراوەی (المسرح والمرایا) ی ئەدۆنیسیان خوێندووەتەوە، بەتایبەتی دوای ساڵانی ١٩٦٥–١٩٦٨ پێچەوانەی گرووپی روانگە، زیاتر دووربوون لە كەلەپووری رۆشنبیری كوردی و نزیكبوون لەئەدەبی عەرەبییەوە [٥٧].

راستە لەكاریگەریی رۆشنبیری عەرەبی بەدەرنەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا كەلەپوری كوردی و رۆشنبیری كوردییان فەرامۆش نەكردووە، كۆمەڵێ رووداوی مێژوویی و ناوەرۆكی واقیعی كـوردەواری و بیری نەتەوایەتییان كـردووەتـە كـەرەسـەی دەربڕین لەشیعرەكانیاندا، وەك ئەو نموونانەی كە لە تەوەری دووەمی توێژینەوەكە ئاماژەیان پێدراوە. . .

وە نـەبێ هـەرتـەنـها ئـەو شـاعـیرانـەی كـە لـەدوو توێی

توێژینەوەکەدا رۆڵی کاریگەریان هەبێ لەپێشخستن و گەشەی شیعری کوردی کەرکوکداو هێنانەکایەی ئەو دیاردە نوێگەرییە، بەڵکو کۆمەڵێ شاعیری تریش بەبەرهەمی نوێی خۆیانەوە حزووریان هەبووە. لەرۆژنامەو گۆڤارو کۆرو سمینارەکانی ئەو قۆناغەی کەرکوك دەوریان هەبووە وەك جەبار جەباری و شێرزاد جەباری و فەرمان کەمەرو چەندین شاعیری لاوی تر کە ئەکرێ ببنە ناوەرۆکی باس و توێژینەوەیەی‌تر...

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:-**


(١) فاضل العزاوي، الروح الحية، جيل الستينيات، دمشق/١٩٧٠، د. محمد احمد سعيد. كەركوك‌و بزاڤی شیعری کوردی، نامەی دکتورا، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٢٤٧

(٢) ميديا يوسف الحيدري، يوسف الحيدري، ٢٠٠٠، ص ٢٢.

(٣) سامی شۆرش، الحركة الثقافية الكردية الحديثة، ١٩٧٠ -١٩٧٥، مراجعةو تسليط اضواء، جريدة المؤتمر، العدد، ٣٦، ١٧ كانون الثاني، ١٩٩٤، ص٩.

(٤) غەفور سالح عەبدوڵلا، ئەدەبی هاوچەرخی کەرکوك، ئاڵای رووناکبیری مانگ نامەیەکی رۆژنامەی ئاڵای ئازادی، ژمارە، (٥)، ٢/١٢/٣١. . ٢ ل٦.

(٥) هەر ئەو سەرچاوەیە، هەر ئەو لاپەرەیە.

(*) ئەم گروپە لە ١٤ تەمموزی ١٩٧٠ بەیاننامەبەکیان نووسیوەو لەژێر ناونیشانی (شێتەکان، سەرنج، هەڵوێست، پرۆژە)دا لە کۆنگرەی نووسەرانی هەولێردا، ساڵی ١٩٧١ ویستویانە بیخوێننەوە، هەروەها لە (میهرەجانی شیعری کەرکوك)یشدا بەهەمانشێوە هەوڵیانداوە، بەڵام نەیانهێشتوە. تەنانەت ململانێش کراون، دەقی بەیاننامەکەشیان لەکۆنگرەدا دابەشکردووە .

لەکفرییەوە بۆ کۆتاییەکان، گۆڤاری ماموستای کورد، ژمارە (٣٠ و ٣١)، ،١٩٩٦ ل ١٩. چاوپێکەوتن لەگەڵ لەتیف هەڵمەت.

(٦) زاهر الجيزاني، الشاعر لطيف هلمت، مرات مطلية بالشموع، جريدة العراق، ١١ حزيران، ١٩٩١

(٧) هەر ئەو سەرچاوەیە.

(٨) بدر شاكر السياب، جريدة المرفأ، ملحق مجلة الأذاعة والتلفزيون، العدد ١٦، ٢٥/ ١٢/١٩٧٦، ص ٨.

(٩) سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجی شەهید (پشکۆ) کۆکردنەوەو رێکخستنی سامان مارف بەرزنجی، عومەر مەعروف بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوەو ساغیکردوەتەوە، هەولێر، ١٩٩٣، چاپخانەی رۆشنبیری، ل ١١٥.

(١٠) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل ٩٩.

(١١) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٤.

(١٢) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٢٢ و ١٢٣.

(١٣) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٢٤.

(١٤) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٢٥-١٢٧.

(١٥) دیوانی لوتفی، شێخ لەتیف شێخ رەزا بەرزنجی، ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری لاوان، چاپی یەکەم، ١٩٨٤، ل٧٧.

(١٦) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٣٣.

(١٧) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٦٨ و ٦٩.

(١٨) لەتیف هەڵمەت، خواو شارە بچکۆلەکەمان، ئایاری ١٩٧٠، چاپخانەی الشمال، کەرکوك،ل ٥و٦.

(١٩) سەلاح شوان،دڵدارەکەم پایزە گەواڵەیەك نییە، دەزگای رۆشنبیری بلاوکردنەوەی کوردی، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٨، ل ٦٩.

(٢٠)سەلاح شوان، دڵدارەکەم پایزە گەواڵە یەك نییە، بغداد، ١٩٧٨.

(٢١) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٧١.

(٢٢) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٨٢.

(٢٣) ئەنوەر شاکەلی، پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی، ١٩٧٣، بەغداد.

(٢٤) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٥و١٦.

(٢٥) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٤٠-٤٥.

(٢٦) دیوانی گۆران، بەرگی یەکەم کۆکردنەوەو ئامادەکردن‌و پێشەکی بۆ نووسین محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغداد،١٩٨٠، ل٥٧.

(٢٧) الشاعر لطيف هلمت، حوار شهاب القرة لوسي، جريدة الأتحاد، عدد (٣١٩) في ٢١/٥/١٩٩٩، السنة السابقة، ص٨.

(٢٨) گۆڤاری رزگاری، ژمارە (٥)، ساڵی (١)، ٢٢/٦/١٩٦٩، ل٣٩.

(٢٩) لەتیف هەڵمەت، خوار شارە بچکۆلەکەمان، ئایاری ١٩٧٠ ، چاپخانەی الشمال، کەرکوك، ئایاری، ١٩٧٠، ل٢٠ -٢٢.

(٣٠) گۆڤاری رزگاری، ژمارە (٩)، ساڵی یەکەم، ٢١ کانونی یەکەم، ١٩٦٩، ل٢٣.

(٣١) لەتیف هەڵمەت، خواو شارە بچکۆلەکەمان، چاپخانەی الشمال، کەرکوك ئایاری١٩٧٠.

(٣٢) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٤٥-٤٧.

(٣٣) هەر هەمان سەرچاوەیە، ل٥١.

(٣٤) هەر هەمان سەرچاوەیە، ل٢٤و٢٦و٢٧.

(٣٥) عزالدين عبدالرضا، لطيف هلمت من دوامة الاستعداد لميلاد اخر، مجلة الثقافة، السنة الرابعة، ١٩٧٤، ص١٢٥-١٢٦.

(٣٦) کەمال میراودەلی، لەتیف هەڵمەت وەك دیاردەیەکی شیعری نوێ، سەرنجێك لەخواو شارە بچکۆلەکەمان، گۆڤاری هەتاوی ئەدەبی،ژمارە (٤و٥)، حوزەیران و تەمموزی ١٩٩٦، ل٤.

(٣٧) لطيف حامد البرزنجي، مستلزمات الثورة والتجديد في الشعر الكردي المعاصر، جريده التاخي١٠ /٦/١٩٧٠.


ئەم وتارە ئەدەبییەی لەتیف حامید بەیەکەم وتاری ئەدەبی دەربارەی شیعری کوردی هاوچەرخ لە قەڵەم ئەدرێ.

(٣٨) ئەنوەر شاکەلی، پرۆژەی کودەتایەکی نهێنی، ١٩٧٣، ل٥.

(٣٩) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٧-٩.

(٤٠) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٨.

(٤١) الطريق والحدود ((بحثا عن الذات الضائعة)) يوسف عبدالمسيح ثروت، مقالات في الادب والمسرح والفن، وزارة الثقافة والاعلام، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ل٤٧.

(٤٢) سەلاح شوان، دڵدارەکەم پایزە گەواڵەیەك نییە، ل١٢.

(٤٣) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٢٨.

(٤٤) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٩١و٩٢.

(٤٥) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٩٤.

(٤٦) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٩٨و٩٩.

(٤٧) گۆڤاری ڕوانگە، ژمارە (٢)، ساڵی١٩٧١، ل٢٦و٢٧.

(٤٨) يوسف عبدالمسيح ثروت، الطريق والحدود، بحثا عن الذات الضائعة، وزارة الثقافة والاعلام دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧، ص٤٨.

(٤٩) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٤٧، اسطورة سيزيف، البير كامو، ترجمة انيس زكي حسن.

(٥٠) ادونيس، الثابت والمتحول، صدمة الحداثة، دارالعوده، بيروت، ١٩٧٩، ص٢٩٢.

(٥١) لەکفرییەوە بۆ کۆتاییەکان، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژمارە (٣٠ و٣١)، ١٩٩٦، ل١٩.

(٥٢) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٢.

(٥٣) عەلی تاهیر حوسێن، کاریگەریی ڕوانگە لەنوێگەری شیعری کوردیدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سلێمانی، بەشی کوردی، ٢٠٠٠، ل٥٦وچاو پێکەوتنی عەلی تاهیر حوسێن لەگەڵ شێرکۆ بێکەس. ١٩٩٩/٣/٤، شوێن: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم-سلێمانی.

(٥٤) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٥٩.

(٥٥) لەکفرییەوە بۆ کۆتاییەکان، گۆڤاری مامۆستای کورد، ل١٥.

(٥٦) هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٥و١٦.

(٥٧) نەجات حەمید چەند سەرنجێکی ئەدەبی و زەقبوونەوەی خود لەناو وەهمێکدا، ڕۆژنامەی برایەتی، ژمارە(١٤٥)، ١٩٩٢، ل٣.

(٥٨) عەلی تاهیر حوسێن، کاریگەریی ڕوانگە لە نوێگەری شیعری کوردیدا، ل٥٤-٥٩.

### * ئەنجام

شیعری هاوچەرخی کوردی کەرکوك، یەکێك لە سیما دیارەکانی لەوەدا بوو کە ڕواڵەتێکی نوێگەری بەخۆوەگرت، کە لەسەرەتاوە سەرچاوەکەی لەکاریگەریی بزووتنەوە تازە گەرییەکەی ناوچەی سلێمانی بەدەربوو، لەسەرەتای شەستەکانەوە شاعیرانی کەرکوك بەو بزاڤە شیعرییەی سلێمانی کاریگەر بوون دواتر بەسوود وەرگرتن لە کاریگەریی ڕۆشنبیری ئەورووپی و ئەو بزووتنەوە ئەدەبییە شیعرییەی نووسەرانی شەستەکان و هەروەها جووڵانەوەی ڕوانگە. توانیان تەکانێکی تر بەبزاڤی شیعری کوردی بدەن و بەرەو پێشەوەی بەرن، چونکە لەدوو لایەنەوە گۆڕانیان بەسەردا هێنا لەباری ناوەرۆکەوە سەرچاوەو بنەماکەی گەرانەوە بۆ مێژووی دێرینی کوردو بایەخدان بەکەلتوورەکەی و کێشەکانی نەتەوەو خاك و نیشتمان بوو. هەروەها وازهێنان لەو سیستەمە کۆن و ئاساییانەی شیعری پێشوو. لەباری ڕووخساریشەوە خۆ دەربازکردن لەکۆت و پێوەندی کلاسییەکانی ئەدەبی کۆن.

هەر ئەو نوێگەرییە بەتایبەتی لەناوەڕاستی شەستەکانەوە تاوەکو سەرەتای حەفتاکان سیمای یاخیبوونێکی توندی بەخۆوە وەرگرت، یاخیبوون لەنەریتە دزێوەکانی کۆمەڵگا، لەکۆت و پێوەندو بۆچوونە کلاسیکییەکان، ئەو نوێگەرییەی کە شاعیرانی کەرکوك دەستیان دایێ نەقش و کاریگەریی و ڕەنگدانەوەی بەرچاوی هەبوو بۆ سەر نەوەکانی حەفتاکان و تەنانەت دوای ئەو قۆناغەش کە شیعری کوردی بەرەو کرانەوەو ئاقارێکی نوێ و بەرزتردا برد.

*** تازەگەریی لە شیعری کوردی کەرکوکدا لەنێوان هەرەس و ڕاپەڕین ١٩٧٥- ١٩٩١**

**پێشەکی:**

ئەم تۆژینەوەیە تۆژینەوەیەکی وەسفی و شیکارییە تایبەت بە بزاڤی نوێگەری شیعری کوردی...

کەرکوکیش بەو پێیەی شوێنی سەرهەڵدانی چەندین شاعیری کوردە هەر لە پیر ئەحمەدی کەرکوکییەوە تاوەکو ڕەنجوری و شاعیرانی کە بەدرێژایی سەدەکانی پێشوو لەبواری شیعردا حزووریان هەبووە. بەشێکی ئەدەبیاتی کوردییان فراوان کردووە. تێکستەکان لەسەرەتادا بەبابەتی ئاینی یارسان بووە پاشان بەرەو هەمەڕەنگی ناوەڕۆك ڕۆیشتوون.

بەوپێیەی ئەم شارە لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا شاعیرانی لەگەڵ قۆناغەکانی گەشەو پەرەسەندنی شیعردا لەگەڵ ئەو مێژوو گۆڕانەدا بووە. لە ئەدەبیاتی نوێ و هاوچەرخیشدا بووەتە گۆڕەپانی تازەگەری شیعری کوردی. هەر لەو ماوە مێژووییەیدا ئەوەندە باس و تۆژینەوە سەبارەت بەشیعر نەکراوە ئەگەر کرابێتیش کەم و دەگمەن بووە. چونکە کارەساتەکانی ڕۆژگاری کەرکوك لەمپەر بوون لەبەردەم گەشەی ڕۆشنبیری و ئەدەبیاتەکەیدا. ململانێکان ئەوەندە ئاڵۆزو سەخت بووە کەمتر لای لێکراوەتەوە.

وێڕای ئەوانەش لەکەرکوکدا شیعر بەهۆی شاعیرانەوە لەجوڵەو گۆڕان و گەشەدابووە. بەتایبەتی لەسەدەی بیستەم بەدوواوە. تایبەتی تر لەنیوەی دووەمی سەدەکەو دووا ساڵەکانی. کۆمەڵێ گۆڕانکاری لە شیعردا هاتە ئاراوەو سیمای نوێگەری لەخۆگرت هەر ئەم فاکتەرانە وایان کرد ئەم تۆژینەوەیەمان تەرخان بکەین بۆ ئەو ماوە مێژووییەی نێوان (هەرەس و ڕاپەڕین) (١٩٧٥- ١٩٩١) شیعری کوردی وەك پرۆژەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە بزاڤە شیعرییەکەی. کە خۆی لە چوار تەوەردا دەردەخات.

- لە تەوەری یەکەمدا کورتەیەکی مێژووی بارودۆخ و ڕەوشی ڕۆشنبیری و سیاسی کەرکوك.
- لە تەوەری دووەمیشدا تیشك خراوەتە سەر دیاردەی یاخی بوون وەك سیمایەکی نوێگەری لە شیعری کەرکوکدا.
- لە تەوەری سێیەمیشدا هەندێ ناوەڕۆکی نیشتمانی و نەتەوایەتی جیاواز لەهی پێشوو کە سیمایەکی تری نوێگەریەکەیەتی.
- لە تەوەری چوارەمیشدا ئاوڕێك لەنوێکردنەوەی ڕووخساری شیعردا دراوە. خرایە سەر خەرمانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردیمان.

بەو ئومێدەی چەمکێکی ئەدەبی کوردیمان خستبێتەڕوو.

*** تەوەری یەکەم:**

پوختەیەکی دۆخی مێژووی و ڕۆشنبیری و سیاسی کەرکوك وەك ئاشکرایە لەو چوار ساڵەی دانووستانی نێوان کوردو حکومەتی عێراقدا ١٩٧٠-١٩٧٤ فەزایەکی بەرەوپێشچوونی ڕۆشنبیری لێکەوتەوە. لە هەموو بوارەکاندا جۆرە ئازادییەك بۆ کورد هاتە ئاراوە. کۆمەڵێ دامودەزگای ڕۆشنبیری و کلتوری دامەزرا، هەر لە گۆڤارو ڕۆژنامەو کۆمەڵە ڕۆشنبیرییە ئەدەبییەکانەوە تاوەکو دەرچوونی چەندین کتێب و بابەتی ڕۆشنبیری نووسەرانی کوردی ئەو قۆناغە، هاوشان لەگەڵ گەشەی ئەو بزاڤە سیاسییەی کورددا جووڵانەوەیەکی ئەدەبی بەرچاو لەناو کۆمەڵگای کوردیدا بەرپابوو. بەتایبەتی لە بواری شیعرو چیرۆك و وتاری ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتیدا لەناویاندا شیعر ڕووەو گەشەیەکی بەرچاو و دیار پەرەی سەند، لەوێوە بانگەوازی ڕوانگەش وەك بەشێك لەو بزاڤە ڕۆڵی کاریگەرو کارای گێڕا لە برەوپێدان و گەشەی شیعری کوردیدا.

کەرکوکیش وەك شارەکانی تری کوردستان ئەو گەشە ڕۆشنبیرییەی گرتەوەو چەندین دامودەزگای ڕۆشنبیری و ئەدەبی تیادا دامەزرا وەك یەکێتی نووسەرانی کورد، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی، هەروەها لە بەشێکی زۆری ناوچە کوردنشینەکانیدا خوێندن بوو بە کوردی، ئیتر ڕێگا والابوو بۆ نواندن و دەرکەوتنی چالاکی هونەری و ئەدەبی بە گرتن و گیرانی کۆڕو سیمینارو شیعر خوێندنەوە بەم شێوەیە کەرکوك هەناسەیەکی بە بەرا هاتەوە، بەرهەمە ئەدەبی و چالاکییە هونەرییەکان برەویان سەند. تەنانەت وای لێهات هەرچی خوێندەوارو ڕۆشنبیرانی کوردی کەرکوك هەبوون بە پەرۆشەوە بەشداری چالاکی ئەدەبی و هونەری و سیمینارو کۆڕە شیعرییەکانی شارەکانی تری کوردستانیان ئەکرد.

گومانی تیا نییە لە ماوەی ئەم چوار ساڵەدا کۆمەڵێ شاعیر هاتنە مەیدانەوە وەك شاعیرانی لاوی ئەو قۆناغە دەرکەوتن، بە بەرهەمەکانیان فەزایەکی شیعری ئەوتۆیان خوڵقاند کە بووە هۆی گۆڕینی ناوەڕۆك و ڕووخساری شیعری.

لە ناوەڕۆکدا پەیوەست و پابەندبوون بە کێشەی میللەت و ئایدیای مرۆڤایەتییەوە. هەروەها لادان لەو تەقلیدە باوەی سیستمی کلاسیزمی شاعیرانی پێش خۆیان. لەگەڵ ئەوەشداو هەر لە ناوەڕۆکدا سیمایەکی دیاری یاخی بوون بە شیعرەکانیانەوە دەرکەوت...

ئەگەرچی ئەو قۆناغە هۆکارێکی پەرەو گەشەسەندنی شیعری شاعیرانی لاو بوو. هۆکارێکی تر کە بۆ خودی شاعیرە پێشەنگەکانی ئەو قۆناغە ئەگەڕێتەوە لەوانە لەتیف هەڵمەت و سەلاح شوان و سەلام محەمەدو چەندین ڕووناکبیری تری وەك لەتیف حامید...هتد. کە جووڵانەوەیەکی شیعری دەگمەن و دیاریان بەرپاکرد. لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردی کەرکوکدا بێ وێنە بوو. بەدوایاندا چەندین شاعیری تر هاتنە مەیدانەوە. ئەو پەیامەیان تەواوکردو بەردەوامیان پێدا. کۆبەندی هەموو ئەو بارودۆخە سەرهەڵدانی قۆناغێکی شیعری نوێی لێکەوتەوەو بووە ناسنامەی شیعری و ئەدەبی شاری کەرکوك...

دوای هەرەسیش کوردستان بووە گۆڕەپان و دوژمنانی کورد تەراتێنیان تیا ئەکرد. بە پاڵپشتی دەسەڵاتی عێراقی کورد زوڵم و ستەمێکی زۆری لێ کرا، خەڵکەکەی ڕاپێچی پرۆسەی بەزۆر کۆچپێکردن و بە عەرەبکردن و بە بەعسیکردن کرا، زۆرێك لە گوندەکانی وێران و خاپوورکران. ئەو کارەساتەش

سەراپای ناوچەی کەرکوکی گرتەوە..
وەك شارێکی کوردستانی دوژمنان هەمیشە چاویان تێ بڕیبوو. زۆربەی بەرنامەو پرۆسەکانی سێ کوچکەی بەعسیان لەوێدا جێبەجێ ئەکرد. بەتایبەتی گوندەکانو ناوەندی شارەکە، کە بەشێکی یەکجار زۆری دانیشتووانەکەی دەربەدەرکرانو ڕاگوێزران. بێگومان ئەمەش بووە هۆی پەرەوازەیی و ئاوارەیی زۆرێك لە ڕۆشنبیرو شاعیرەکانی کەرکوك و گیرسانەوەیان لە شارەکانی سلێمانی و هەولێرو بەغداو هەندەران...
پرۆسەی بەعەرەبکردنو بەعسیکردن ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕا لە گۆڕینی سیمای شارو لێکترازانی شیرازەی کۆمەڵایەتی شارەکە. ئەمەش وای کرد کە نووسەرانو شاعیران دوور لە زێدی خۆیان ژیان بەرنەسەر.
ئەم کارە نامرۆڤایەتیو دوور لە نەریتەکانی مافی مرۆڤ و بیری پێشکەوتنخوازانە کاردانەوەو کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر پرۆسەی ڕۆشنبیریو داهێنان بەجێهێشت. وێڕای ئەمەش دەسەڵات هەرچی دەزگاو یانەو ئەو لایەنانەی پەیوەندییان بە ڕۆشنبیریو کلتوری کوردییەوە هەبوو دایخستن. ئیتر زمانی کوردی لە خوێندنو پەروەردەدا قەدەغەکرا کە بووە هۆی دواکەوتنی پرۆسەی گەشەی ڕۆشنبیریو داهێنانی ئەدەبی لەناو خودی شاری کەرکوکدا. بۆیە ئەبینرێ کە بەشێك لە داهێنانو بەرهەمە ئەدەبییەکان شێوازی جۆراوجۆری وەرگرت. دیمەنو تابلۆکانی سروشتی کوردستان، مێژووی کورد، دیمەنەکانی خەباتی میللەتانی وەك فەلەستینو ئەفریقاو ئەمریکای باشوور بوونە هێماو کەرەسەی دەربڕینی شیعری لای شاعیرانی کورد. هەر بەو کەرەسانە، جۆرێك لە دەربڕینی خۆشەویستی بۆ نیشتمانو نەتەوەو مێژووەکەی ئەبوونە کەرەسەی داهێنانی شیعری لەپێناو ڕەواندنەوەی خەمو ئازارەکانی کوردی کەرکوك.
لەو قۆناغەش بەدواوە بەهۆی ئەو ستەمەی لە کورد کرا. زۆری زوڵمو ستەم گەیشتە ئاستێك ئیتر کورد لە ئۆدەی نەما دەستەو ئەژنۆ لێی دانیشتن، ئەوەبوو دوای ساڵێك ڕووناکیو ئاسۆیەك دەرکەوتو سەرلەنوێ بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد دەرکەوتەوە خوێنێکی تازەو ورەیەکی پۆڵاینی بەبەرا هاتەوە. بەرەبەرە ڕێکخستنە نهێنییەکانی کارو چالاکی خۆیان خستەوە گەڕو زۆرێك لە شاعیران خۆیان لەناو ئەو بزوتنەوەیەدا بینیەوە، پاشان خەباتیان گوێزایەوە بۆ شاخو شاخ بوو بە پەناگەی شۆڕگێڕان... بەم جۆرە دۆخێکی نوێ بۆ کورد هاتەکایەوە هەستکردن بە بوونی خود.
ئەو دۆخی هەڵسانەوەو سەرهەڵدانەوەی کورد تەکانێکی تری دا بە هەڵوێستی کورد خۆی، نووسەرانو ڕۆشنبیرانو شاعیران ئەو هێزەیان کرد بە پەناگەی خۆیان، هەندێکی تریشیان هەر بەو هەڵوێستەوە لە شار مانەوەو ناوە ناوە بە شیعرەکانیانو لەژێر ناوی خوازراودا شیعرو بەرهەمەکانیان لە دەزگاو میدیاکانی شۆڕشدا بڵاوئەکردەوە. ئەو شیعرو بەرهەمانەش هێمای بەرەڤانیو یاخی بوونو خۆشەویستی بۆ نیشتمانو نەتەوەو مرۆڤایەتی لەخۆگرتبوو، ئیتر کۆتو پێوەندی ترسو تۆقاندن ئەو توانایەی جارانی نەما.
لەم قۆناغەدا شیعر هەڵگری پەیامی بەرەڤانیو بەرگری بووە شاعیرانی کەرکوك چ لە شار چ لە شاخ حزووری بەرچاویان هەبووە. بە ناوەرۆکی تۆکمەو رووخساری لەبارو شیرینو خاوەن وێنەی هونەریو شیعری نوێوە هاتوونەتە پێشەوە. بە بەرهەمەکانیان شیعری کوردی ناوچەی کەرکوکیان لە قاڵبو هەندێ ناوەرۆکی باوو کۆن ڕسکاندو ئەدەبی کوردیمانیان پێ موتوربە کردووە، سیمایەکی نوێیان پێ بەخشی. کە لە تەوەرەکانی دواتردا بەشێکی ئەو سیما نوێگەرییانە ئەخەینە ڕوو و تاوتوێیان ئەکەین وەك یاخیبوونو ناوەرۆکی شیعریو ڕووخسار.

*** تەوەری دووەم:**

یاخی بوون..
یاخی بوون وەك دیاردەیەکی نوێ لە شیعری کوردیدا سەریهەڵدا، چونکە واقیعی کۆمەڵایەتی کوردەواریو ئەو زوڵمو ستەمەی کە بەدرێژایی مێژوو لێی کراوە، هەمیشە چەوساوەتەوە چ لەلایەن دەسەڵاتە داگیرکەرەکانەوە چ لەنێو خودی خۆیدا کە ململانێی چینایەتی تیایدا کاریگەری خۆی هەبووە. بۆیە لە ماوەی ژیانیدا جۆرەها یاخی بوون و بەرپەرچدانەوەو کاردانەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵگا یان لەسەر ئاستی تاکەکانی، یان خێڵو عەشیرەتەکان سەری هەڵداوە. هەندێ جاریش ئاسەواری خراپی لێکەوتووەتەوە هەر ئەم بەرپەرچدانەوەی زوڵمو ستەمەش لای بەشێکی زۆری ڕۆشنبیران ڕەنگی داوەتەوە. بەپێی توانستو گونجانو نەگونجانی باروودۆخ ڕاستگۆیانە بە ڕووی ئەو زوڵمو ستەمانەدا هەڵگەڕاوەتەوەو سەرکۆنەی ئەو دۆخەیان کردووە. تانەو تەشەریان لێ گرتووە.
ئەگەر لایەك لە شیعری نوێی کوردی بکەینەوەو بەپێی ئەو دۆخەی کۆمەڵی کوردەواریو ئەو گەشەیەی بەسەر شیعرو ئەدەبی کوردیدا هاتووە، ئەوا لای شاعیرانی کورد بوونیان هەیە بۆیە "یەکێك لە دیارترین هۆیەکانی یاخی بوون لە شیعری نوێی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ بوونی واقیعێکی نالەبارو نەگونجانی شاعیر لەگەڵ ئەو واقیعەو خەستبوونەوەی ئەو هەستە، دوای زیادبوونی هۆشیاریو بەرزبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری کە وای لێ ئەکات زیاتر هەست بە لێپرسینەوە بکات بەرامبەر بە پیشاندانی لایەنە نەنگو چەوتەکانی ئەو ژیانە تاڵە".[١]
وەك وتراوە شاعیری کورد بەرامبەر ئەو واقیعە تفتو تاڵە دەستەو ئەژنۆ لێی دانەنیشتووە بەڵکو هەر دیاردەیەکی دزێو، هەر نالەبارییەك کە بەسەر کورددا هاتبێ لە دەستی خۆیدا بووبێ یان هی دەرەکی، شاعیری کوردی کەرکوکیش بەرامبەر ئەو دیاردەیە هەڵوێستی هەبووە. سەرکۆنەی کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا یاخی بوونی خۆی ڕاگەیاندووە. یەکێ لەوانە لەتیف هەڵمەت کە لە هەموو ڕووداو و ئەو دیاردە دزێوانەی بەسەر کوردا یان دانیشتووانی شارەکەیدا هاتووەو پەیدابووە هەڵوێستی خۆی لە شێوازێکی یاخی بووندا نواندووە. لە شیعرەکانیدا بەرجەستەی دۆخێکی جێگیر لە بوونی کۆمەڵایەتیو سیاسیو مێژووی کۆمەڵگای کوردیدا ئەکەن

کە دەسەڵاتی کوردی لە رابردوو و ئێستادا هەوڵی گۆڕینی رووکەشیانە ئەدات نەك لە جەوهەردا لە هەناوی کۆمەڵگادا هەوڵی شاردنەوەو خەفەکردنی راستییەکان ئەدات نەك ئاشکراکردنیان. لەپێناو بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگادا.

لە شیعرێکیدا بەشێوەیەکی رەخنە ئامێزو پرسیارکردندا هۆشداری داوە کە دەسەڵاتی کوردی ئەوسا هیچی نەگۆڕیوە ئەوە ئەڵێ کە نە کۆمەڵگا نە دەسەڵات نە تاکەکان نەیانتوانیوە گۆڕانێکی بنەرەتی لە رووی گەوهەرو ناوەڕۆکەوە وەدەست بهێنن، بەڵکو گۆڕانی رووکەش‌و رازاندنەوەو ماکیاجە. ئەمەش ئەوەندەی تر لە پێشکەوتن‌و رزگاربوون دوورمان ئەخاتەوە لە دەقە شیعری (چیمان گۆڕی)*دا لەتیف پێ لەسەر ئەوە دائەگرێ کە هەر بەڵێنێ داومانە نەمانبردووەتە سەر ئەو بەرنامانەی بۆ گۆڕان کراون یان هەوڵیان بۆ دراوە. هیچ‌و هیچیان نەکردووە. نە لە نەریت نە لە هەڵوێست نە باری رۆشنبیری نە لە سیاسەت نەمانتوانیوە بچینە پێشەوە. بێگومان ئەم هەڵوێستە رەخنەو گلەیی‌و گازندەو یاخی بوونە لە کۆمەڵگا لە دەسەڵات، ئەم شکستە هی حەفتاکانە لەو قۆناغەشدا کورد بۆماوەیەك لە کوردستاندا دەسەڵاتی هەبوو تاوەکو ساڵی ١٩٧٤ ئەکرێ بەسەر ماوەی دوای ئەو دۆخەو ئێستاشدا جێبەجێ ببێ ئەوەتانێ تاوەکو ئێستاش کاریگەرییەکەی هەرماوە. ئەم دەقە بە یەکێ لە دەقە زیندووەکانی لەتیف ئەژمێردرێ:

هەرچیمان وت هەر دەیڵێین درۆیە
ژەنگ‌و درزی پردەکانی نێوانمانی
پێ سواخ دەدەین وەکو بۆیە
گۆڕانی چی، چیمان گۆڕی [٢]

بەڵێنەکان درۆ دەرچوون هەموو بۆیە بوون بۆ ژەنگ‌و درز، کەچی دڵیش لە ژەنگ‌و رق پاك نەکراوەتەوە.

لەتیف رووبەرووی دەسەڵات ئەبێتەوە کەوا کوردی لە خەم نەرسکاند پێچەوانەی ئەوە ئێمە کار بۆ بێگانە ئەکەین نەك میللەت، خواستەکانی ئەوانمان بەجێ هێناوە. بۆ خۆمان هیچمان نەکردووە.

ئۆتۆمبێلی سوڵتانەکانمان شۆری
دەستی چەوری دیوخانەکانمان شۆری
پێ‌و پێڵاوی بێگانەکانمان شۆری
بەڵام دڵمان هەر مایەوە بە شۆری
شۆڕینی چی چیمان شۆری؟
گۆڕینی چی، چیمان گۆڕی!
چ بیرێکی کۆنمان پسان
قەڵای کام زۆردارمان رمان [٣]

بەواتایەکی دی لەتیف لەم تێکستەدا لەوە دەدوێت، داخۆ ئێمە توانیومانە هیچ گۆڕانکارییەك لە گەوهەری شتەکاندا بکەین، یاخود تەنیا رووکەش شتەکانمان گۆڕیوە.[٤]

لەتیف لە شیعرەکانیدا بەتایبەتی نێوان هەرەس‌و راپەڕین‌و زیاتر لە حەفتاکان‌و هەشتاکاندا. لە باسی نیشتمانی‌و بیرو ئایدیولوژیای نەتەوایەتیدا، زۆرێك لە شیعرەکانی تام‌و بەرامەی یاخی بوونیان لەخۆگرتووە. بەرامبەر هەموو دیاردە دزێوەکان، دەسەڵاتی ئەوساو کۆمەڵگای کوردەواریدا دیمەن یان تابلۆیەکی لەو جۆرانە نییە پەیامێکی یاخی بوونی بۆ نەبێ وەك کەمال میراودەلی ئەڵێ "لە هەموو شەقامێکدا، هەموو شارێکدا هەموو شورایەکی شیعریدا هەستی یاخی بوونە لە دڵییەوە دەچنە قەڵەمەکەی‌و لە دەروونییەوە هەڵدەرژێتە سەر زمانی".[٥]

ئەگەرچی دیاردەی یاخی بوون لەناو کۆمەڵگادا هۆکارو فاکتەرەکانی بۆ کۆمەڵێ کارو کردەوەی دەسەڵات بێ یان تاکەکان. یان کۆمەڵگا بێت رەگ‌و بنەرەتەکانی بۆ ئەو سەردەمەی سەرهەڵدانی دیاردە دزێوەکانی ئەگەرێتەوە.. کەسانی هۆشیاریش هەر زوو هەستی پێ ئەکەن‌و بیرو هەڵوێستی خۆیان لەبەرامبەر ئەو کارانەدا دەرئەبڕن ئەشێ هەر کەسەو بەجۆرێك یان بە شێوازێك لە چیرۆکدا رەنگە وێناکردنی ئەو یاخی بوونە لە هەڵسوکەوتی پاڵەوان‌و کارەکتەرەکاندا بنوێنرێ. لە شیعریشدا شاعیر هەست‌و بیری خۆی بەرامبەر ئەو دیاردانە دەرئەبڕێ.

لە ئەدەبی کوردیدا بەتایبەتی لە شیعردا ئەکرێ بڵێین هەندێ دیمەن‌و تابلۆی یاخی بوون بۆ پێش ئەو ماوە دەستنیشانکراوە بگەڕێتەوەو کۆمەڵێ وێنەو تابلۆی شیعری لە شیعری شاعیران بەرچاو ئەکەون، چونکە ئەم دیاردەیە پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بە ئاڵوگۆڕە مێژووییەکانەوە هەیە لە هەر شوێنێکدا لەناو هەر میللەتێکدا، بەشێکی شۆڕشەکان شۆڕشە مێژووییەکان، هۆکارەکانی بۆ ئەو هەڵوێستی یاخی بوونانە ئەگەڕێتەوە واتە پەیوەندی بە واقیعی کۆمەڵگاوە هەیە. ئەم گوتەیەی عەبدولوەهاب بەیاتی بەسەر شیعری کۆمەڵگای کوردەواریدا جێبەجێ‌و پراکتیزە ئەکرێ کە ئەڵێ "لە پەنجاکان چەمکی شۆڕش لای ئێمە گەلێ روون‌و ئاشکراو دیارنەبووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێك لە یاخی بوون دژ بە دەرەبەگ‌و کۆنەپەرستی‌و دواکەوتوویی هەبووە، ئاشکرایشە لە هەموو شۆڕشێکی مێژوویدا، هەڵوەشانەوەی واقیعە کە شتێکی ئاساییە هەموو شۆڕشێکی مێژوویش بە رەتکردنەوەی یاخی بوون دەستی پێکردووە.[٦]

یاخی بوون سیمایەکی دیاری شیعری کەرکوکی ئەو قۆناغە بووە. مارف عومەر گوڵ بە بەراورد لەنێوان لێرەو لەوێ واتە ئێمە مەبەست کورد شۆڕش ئەوان دەسەڵاتە. یاخی بوونی خۆی وا دەرئەبڕێ:

لێرە نەفرەت لە خۆفرۆشان
لەوێ ترس‌و سەردانەوان
لێرە نەبەردو سەرسەختی
لەوێ نوشوستی‌و سەرمەستی
تف لە ئێوە تف لە فووتان
چیتان نەکرد بۆ شەوێکی سەرمەستیتان
ئەگەر تۆزێ کەرامەتتان تێدا مابێ
کوانێ هەستی سەربەستیتان؟ [٧]

مارف عومەر گوڵ بەو جۆرە دەسەڵاتی چەوسێنەری بەعسی ئەو قۆناغە رەت ئەکاتەوە بە جۆرێکی وا دای ئەشۆرێ. ئەمەش لوتکەی بێزاری‌و یاخی بوونە بەرامبەر بە دەسەڵات بێگومان ئەم هەڵوێستەش لە جورئەت‌و بێ باکیی‌و

نەترسانەوە سەرچاوەی گرتووە کە خۆی لە خۆیدا داهێنانە لە شیعردا. ئەو قۆناغەی ڕژێمی بەعس کوردی خستبووە ژێر فشارێکی زۆرەوە. ئازادی دەربڕین. بیرو هۆشیاریو بیرکردنەوە سامانو هەموو شتێکیان لێ قەدەغە کردبوو. وێڕای چەوسانەوەش کوشتنو بڕین تاکەکەسیو کۆمەلی کوردی. لەو دەمانەشدا کەسانی هۆشیارو خاوەن هەلوێست بەتایبەتی شاعیران کە لەپێش هەمووانەوە درکیان پێ کردووەو لەو بارە ستەمو جەورە یاخی ئەبوون. شاعیرانی کوردی کەرکوکیش وەك خاوەن هەلوێستو هەستیار بێدەنگ نەبوون رازو تووڕەیی خۆیان بە شیعر دەربڕیوە. ڕاستەوخۆ بێ یان ناڕاستەوخۆ یاخود بە هێما توانیویانە ئەو ستەمو زولمە ڕەت بکەنەوە دژی دەسەلات وەستاونەتەوە... چونکە کەسو یاخود مرۆڤی داهێنەرن "لەسەر مرۆڤی داهێنەرە یەکەم هەنگاو ڕەتکردنەوەی دەسەلاتە بە هەموو مانایەکەوە".[8]

سەلام محەمەدی شاعیریش هەر لە یەکەم دانانی شیعرەوە هەروەها ئەوەی چاپی کردووە. بە شیعری سەربەست دەستی پێکردووە. ئەویش وەك شاعیرانی هاوتەمەنی خۆی لەژێر کاریگەری ئەدەبی عەرەبیدا بووە. ئەو گۆڕانکارییانەی لە فەزای شیعری عەرەبی لە بەغدا هاتبوونە ئاراوە لای ئەمیش ڕەنگی داوەتەوە یەکێ لە سیما نوێگەرییەکەی سەلام ئەوەیە کە بە شیعری ئازادو سەربەست دەستی پێکردووە. هەروەها بەکارهێنانی ڕەمز لە دارشتنو وێنەکاندا، داهێنانی ناوەڕۆکی کۆمەلایەتیو سیاسی کردنیان بە کەرەسەی دارشتنی شیعری. بێ لەوەش بە کوردییەکی پەتی ڕەوانو گەڕان بەدوای وشەی بنجی کوردەواری نووسیوێتی. سەبارەت بە یاخی بوونیش ئەویش وەك شاعیرانی ترکۆمەلێ شیعری یاخی نووسیوە بەلام بەوەی لە وێنە شیعرییەکانداو بەکارهێنانی هێمادا. لەناو شیعرەکانیدا سروشتو کچو دلدارو نیشتمان کەرەسەی دەربڕینی شیعرین، هەروەها خەمی کۆمەلگاو چەوسانەوەی نەتەوایەتیو خەمی دابڕان لە زێد لە خۆشەویست لە هەموو دیمەنەکانی شار بوونەتە هەوێنی شیعری شاعیرانی کەرکوك. بۆ دەربڕینی تفتیو تالیو نەهامەتییەکانی میللەت ئەمانە لای سەلامیش وا ڕەنگ ڕێژکراوە. چونکە خەم وەك مۆتیڤ وەك کەرەسەیەك بووەتە کەرەسەی ئەفراندنی شیعری ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕەنگدانەوەی بارودۆخێکی ئالۆزی پڕ ستەمی کۆمەلایەتییە. ئەمانگەیەنێتە ئەوەی کە "هونەر دەرەنجامی وێنەیە وێنەش داهێنانی شاعیرو هونەرمەند ئەکاتە کارێکی هونەری".[9]

هەموو ئەم خەمو کەسەرانە لای سەلام ئەبنە مۆتیڤو جۆرە یاخی بوونێکی کۆمەلایەتی لێ ئەکەوێتەوە. دەربڕینەکەش زۆرجار بە کەرەسەی دیمەنو دیاردە سروشتییەکانەوە دەرئەبڕێ.

بۆ سالانی خۆشەویستیت ناخەیتە ژێر
گڕو پریشکی دەستاری ڕۆژگارەوە
بۆ نازانی تۆ نەفرەتت لێ کراوەو بێ ولاتی
ئیمشەو زامی ولاتەکەم
بووەتە کۆترێکی سپی
دلەکەی کردووەتە هێلانەی نازو
ماچم ئەکاو ماچی ئەکەم
ئەی سەرخۆشەکەی شەوانی بەفرباڕین
بیرەوەری خۆلەمێشە
ئەگەر نەڕۆی جێ ئەمێنی
تۆزی شوێن پێ ئەتخنکێنێ
ئەوا هاتن لە دورەوە ئەیانبینم
ڕەختو زینی ئەسپەکانیان
گۆشتی ویژدانی هەزاران دەربەدەرە[10]

ئەم تێکستە کۆمەلێ دەلالەتی یاخی بوونی لەخۆگرتووە. وەك بێزاربوون لە تەوقو ستەمی دەسەلات سەلام وا بە بەرامبەرەکەی ئەلێ بە خۆشەویستەکەی ئەلێ نەفرەتت لێ کراوە چونکە بێ ولاتی.

لەوێدا زامی ولاتو پەلاماری نەیاران بۆ سەر دلی خاك پاش دەربازبوونوکۆچو دیسانەوە گیرسانەوە لە ئامێزی ولاتێکی بلندو ئازادی وەك قەندیلو کوێستان.. ئەم بە هێماکان هەموو دیاردە دزێوەکانی چەوسانەوەی کۆمەلایەتی و نەتەوایەتیو سیاسی وێنا ئەکاتو وەك کەسێکی یاخی لەو دیاردانە. دێتە گۆو وێنەیەکی جوانمان پێ ئەبەخشێ.

لای کەساس جەباریش زیاتر یاخی بوون لە دەسەلاتو ستەمی بەعسە. لە چەندین تێکستی شیعری وەك نامەی ناو سەنگەرێك ل٥٩ و شەهید ل٦٣ و ٦٤ و گڕ ل٦٧ و تەقینەوە ل٦٩ و ٧٠ی دیوانەکەی زۆر بەتووندی یاخی بوونی خۆی ئاشکرا ئەکات.

لە شیعری تەقینەوە کە هی سالی ١٩٨٣ لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان بلاوکراوەتەوە. یاخی بوونەکەی تێکەل بە واقیعێکی یان دیمەنێکی شاری کەرکوك کردووە. ئەلێ:

لە شۆڕیجە
لە بناغەی خانوویەکی وێرانەوە
منالێکی ڕەشو ڕووتی مەچەك ئەستوور
وەك بروسکە سەری هەلدا
هەردوو دەستو قاچەکانی هاتنە یەكو
گرمۆلەبوون بوون بە بۆمبا
لەناو سکی مۆلگاکەدا تەقییەوە
لەو ڕۆژەوە مۆتەکەی ترس
لە هەناوی زۆردارانا بوو بە ڕەگو ڕیشەو ڕووا [12]

کەساس جەباری لە ڕوانگەی ئایدیۆلۆژییەتی سیاسیو نەتەوایەتییەوە ئەڕوانێتە دەسەلات بە شیعر یاخی بوونی خۆی ئاشکرا کردووە: دژ بە دەسەلات ڕژێمی بەعس. وەك پێشمەرگەیەك لە ڕووداوەکان ئەدوێ ئەمەش سیمایەکی یاخی بوونە. لە دیدی شاعیرانی نەوەی نوێدا هاتووەتە ئاراوە. چونکە "سەرجەم شیعری شاعیرانی نەوەی نوێ یاخی بوون بەگژاچوونێکی ژیرو وریا ئەخەنە بەرچاو کە لەلای هەریەکێکیانو بەپێی ئایدیۆلۆژییەتو فەلسەفەی تایبەتی خۆی لەسەر پرۆگرامێکی دیارو ئاشکرا بۆ ئامانجێکی ڕوون بەپێ ئەکرێن".[13]

ئەوەتا حەماسە نەتەوایەتییەکەیو رقە پیرۆزەکەی بە تەقینەوە دەرئەبڕێ وەك لە چەندین تێکستی تریشدا بانگی

یاخیبوونەکەی ئەدا نەك هەر ئەم بەڵکو شاعیرانی تری پێش خۆی چارەسەرەکان لە لوولەی تفەنگەوە ئەدۆزنەوە. شێرکۆ بێکەس ئەڵێ:

تەنیا لە لوولەی تفەنگدا
چاوی هەڵدێنێ
هەق بانگ ئەدا
تەنیا هەر لە ئاستی چەکا
داگیرکەر ملکەچ ئەکا! (١٤)

جۆرێکی تری بەرەڤانیی و یاخی بوون لە دیدو روانینی لەتیفدا وەها کارێکی کردووە کە بە هێما ئەو یاخیی و روانینە لە شیعرەکانیدا ئەخوڵقێنێ و تابلۆی نێو زیندانەکان دەرئەخات کە هی ستەم و زوڵم و زۆری دەسەڵاتە بەرامبەر بە تاکی کورد. تەنانەت کۆمەڵگاکەشی.

لە شیعری "بزمار"دا وا ئەدوێ

درۆ نییە ئەگەر وتیان لە بازاڕی جیهاندا
قلێ بزمار نەماوە
درۆ نییە
لە بەندیخانەکاندا
بە پەلو پۆی دڵدارانی گوڵ و خۆردا
داکوتاوە. (١٥)

هەر ئەم تابلۆیەش لای مارف عومەر گوڵ بەم جۆرە ڕەنگی داوەتەوە.

زیندان ڕۆژی چەندین کەسی وەکو منی لا میوانە
ئەی میوانی ژێر زەمینی ئەنگوستە چاو
ئەم زیندانە پڕ تاوانە
چەند شەهاب و چەند جەعفەر و چەند ئەنوەری تیا خنکاوە
یا باوەڕی گیانی چەندین کۆڵنەدەری تیا فریوە
بۆ سەر دەستی پێشمەرگەی شاخ
چەندین بەستەی قادر کابان
لێرە بوون بە لاوکی ئازارو ئاخ (١٦)

لای زۆربەی شاعیرانی کوردی کەرکوك یاخی بوون و ماناکانی پانتاییەکی فراوانی شیعرەکانیانی گرتووەتەوە دەلالەت و هێماو کەرەسەکانیش وشەی پێشمەرگە، شۆڕش، شەهید، زیندان و گڕ، تۆڵە، تا دوایی ئاماژەی یاخیبوونن، چونکە ئەو قۆناغەی دوای هەرەس و بەتایبەتی لە هەشتاکانداو لەوەش بەدواوە قۆناغێکی یەکجار پڕ ستەم و کوێرەوەری بووە بۆ کورد. کە وێرای سووتان و وێران و سوتماك کردنی خاکەکەی لە شارەکاندا گەنج و لاوی کورد راپێچی زیندانەکان ئەکران و بەتایبەت خەڵکە بوێرو خاوەن هەڵوێستەکان، بۆیە زیندان و پێشمەرگەو شەهید بووبوونە بەشێکی ژیانی کوردەواری نێو شاری کەرکوك، هەر ئەو ژیانە پڕ چەرمەسەرییەش لای شاعیرانی ئەبوونە بابەت و ناوەڕۆکی یاخی بوون.

کە ڕۆژهەڵات لە گەرمیاندا چی پۆستاڵی ژەندرمەیە
لەسەر ڕێگاو تەختایی دا
تەپ و تۆزی زرێپۆش و دەبابەیە
لە ئاسماندا گرمەگرمی ناپاڵم و فڕۆکەیە
لە شاخیشدا هەر قرمەی چەکی دەستی پێشمەرگەیە
کە شەویش هات کە ڕۆژێکی تریش هەڵات
لە شاخ و دەشت
وڕەو هێزو دەسەڵاتی داگیرکەران
گشتیان لەژێر پێڵاوەکەی پێشمەرگەدان (١٧)

شاعیرانی هەر زوو هەستیان بە ستەم کردووە. ئاگایان لە هەموو ئەو ئازارو نەهامەتیانەی میللەتەکەیان بووە. چ لە شار لە شێوەی هێمادا چ لە شاخیش وەك پێشمەرگە بە ئاشکرا شیعرەکانیان لە شێوەی یاخی بووندا ئاراستەی دوژمنانی کوردیان کردووە. کە دەسەڵاتی بەعسی ئەوسای بووە. چونکە "مرۆڤی یاخی لە نزیکەوە ئاگای لە عەزاب و هەژانی جوانییەکانی ژیانەو بە بروای ئەو دەبێ سیاسەتیش ملکەچی ئەو حەقیقەتە بێت". (١٨)

*** تەوەری سێیەم: ناوەرکی شیعری**

لەم تـەوەرەدا تیشك ئەخەینە سەر ناوەڕۆکی نیشتمانیو نەتەوەیی چونکە ئەم ناوەڕۆکە ئەگەر چی لە قۆناغەکانی پێشووشدا بوونیان هەبووە. شاعیران لە شیعرەکانیاندا وەك بابەتێکی سەرەکیی شیعر بایەخیان پێداوە، ئەشێ لەهەندێ قۆناغی جیادا لەو قۆناغەی دەسەڵاتی بەعسو ڕژێمی عێراقی ئەوەندە سانسۆری لەسەر دانەناوە، شیعرەکانیش زیاتر لە چوارچێوەی وڵاتو میللەتو هەندێ دیمەنی سروشتی کوردستاندا سووڕاونەتەوە بەڵام لەسەر شێوەو ڕووخساری کلاسیزمی بووەو تێکەڵ بەبیری ئاینی..

لەو ماوەیەدا شاعیرانی ئەو قۆناغە وێڕای ئەو دۆخە نائاسایەی کوردستان، کەرکوك بەتایبەتی سوسەیەك ئاسۆیەك نەبووە تاوەکو مرۆڤی کورد ئاخو داخەکانی خۆی هەڵبڕێژێ، چونکە بەر شاڵاوی گرتنو ڕاوەدوو ئەکەوت کەچی هەندێك لەشاعیرانی کورد ئازایانە خۆیان لە قەرەی ئەو باسو خوازانەداوە. بەشێوازی جۆراوجۆر ڕازو نیازی خۆیانو میللەتەکەیان دەربڕیوە.. بەتایبەت وڵات خاك کە لای میللەتانی سەر زەوی دایکە. دایکی تاكو کۆمەڵە. بۆ بەلای مارف عومەر گوڵ بووەتە دایكو بەباڵایدا هەڵ ئەدا لای ئەو دایك کوردستانە کوردستانی داگیرکراوەو ستەمی لێکراوە..

من دایکم هەر نەدیوە
بەڵام خۆشەویستی خاکی
پێکەیاندم
گڕی ژانی دڵی ئارامی هەژاندم
هەموو شەوێ دەستو پەنجەم دەناڵێنێ
دەستو پەنجەی گەنجەکانی
تا بەیانی خەویان لەبیردەچێتەوە
هەموو سەرچۆپی بۆ دەگرین
بۆ بەیانی
ئەی وڵاتە شیرینەکەم
لەمناڵیمەوە ئازار لە سینەم دەناڵێنێ
خەندەو خۆشیش لە سینەمدا کپ کەوتووە
من دایکم هەر نەدیوە. (١٩)

هەر لەم شیعرەدا شاعیر شیعرێکی بابلۆنیرۆدای کردووەتە هەوێنی شیعرەکە چونکە هەردووکیان چارەنووسو ژیانی میللەتەکەیان لە یەك ئەچن.

دیمەنی ڕقو تۆڵەی دوژمنانی کورد وای لە شاعیر کردووە لە ڕێگای پرسیارگەلێکەوە بێزارییەکان دەرئەبڕێ کەوا چۆن دوژمنان کوردستانیان کاولو وێرانکردووە. کردوویانەتە سووتماك. تەنانەت ڕەزو باخیشیان نەهێشتووە ئەوەتا ئامارژە بە شوێنە زاکەی مەولەوی ئەکات سووتانی ئەوێو سووتانو برژانی خۆی پێکەوە تێکەڵ ئەکات.

وا گوندەکەی مەولەویشمان بوو بە نەبوو
بڵێسەی ئەو وێرانەیە گەیشتە لام بە ئاسمانا نەهات بەڵام لەکوێ وە هات؟!
بەناو دۆڵو چەمەکانی کوردستانا
بەسەر پشکۆی ئاگردانی ئاخی خەمخۆری نیشتمانا
هاتو هەمووی بەگڕ سووتاند
منیش برژام وەکو قەقنەس منیش سووتام (٢٠)

سووتانی خاكو گوند سووتانی شاعیرە قەقنەس ئاسا لە ناڵینو گریانو سووتانایە ئەوەش لەپێناوی خەمی نیشتماندا.

لە پرسیارێکی تردا توورە ئامێز لە هۆڵی گوڵو لاولاوی نیشتمانو خاکدایە.

بۆچی کۆتی توورەی ڕقتان لە گەردنی
لاولاوی ناو سەوزەڵانی ئەم زەوییە دەئاڵێنن؟
بۆ چرنووکی ناحەزیتان لە کەمەری چیای گیانم گیر دەکەنو
هەرچی قینی ناکەس بەچەی مەرامتانە
بۆ سەر گوڵو هەڵاڵەی ناو مێرگەکانی نیشتمانمان دەبارێنن؟ (٢١)

ئەمانە هەموو پرسیاری شاعیرن لە کەرکوکەوە جەستەی خۆی تێکەڵ بە خەمی کوردستانو نیشتمان کردووە، بەوجۆرە پەردەی ڕقو کینەی ناحەزانی کورد هەڵئەماڵێ ئەم ڕقەی دوژمن وا لێك ئەداتەوە.

هەر لەنێو هەناوی ناوەڕۆکی نیشتمانیو نەتەوایەتییەوەو بەوپێیەی باسکردنی کوردستانو کورد لەو دەمەدا سانسۆری لەسەربووە. زۆر لە شاعیران گەلێکی تری وەك فەلەستینیان کردووەتە هێماو مۆتیڤی شیعرییان. چونکە ئەو گەلەش وەکو کورد خاکەکەی داگیرکراوەو بەش مەینەتو چەوساوەیە تاکە ڕێگایەك بۆ خەبات خەباتی چەکداری گرتووەتەبەر.

ڕژێمی عێراقیش یەکێ بووە لەو ڕژێمانەی کە خۆی بە دڵسۆزی ئەو گەلە زانیوە لەو دەروازەیەوە شاعیرانی کورد گەلی فەلەستینیان کردووەتە ئامارژەو هێمای بەرخودانی کورد. وەکو ڕەمزێك چەند تێکستێکیان پێشکەش بەو گەلە کردووە بۆ ئەوەی شیعرەکانیان لە سانسۆر دەربازبن ئەگینا وێڕای هاوسۆزی بۆ فەلەستین هەر مەبەستو ئامارژەکەش کوردو خەباتەکەی بووە، بۆیە شاعیر لەپاڵ ئەم پێشکەشکردنەدا مەبەستی دەرخستنی ستەمی داگیرکەر دژ بە کورد بووە. بەم شێوەیە دوژمنەکەی سەرکۆنە کردووە

با ئیتر بەس گلێنەمان لەبەر تۆفو لەژێر زوقما دابڕزێ
بۆچی دەبێ ڕێی ڕەهێڵەی تەمەنی شاخ
سەری بەرد بێ بداتەوە بەسەر شاخا
ئەی ڕێی ژیان بەردەبازو پەرینەوەی پێویست نییە
تا بگەیتە ئارامگەی بەختەوەری (٢٢)

ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٨٠ نووسراوە پێشکەش بە گەلی فەلەستینی کردووە. ئەو بارودۆخەی دوای هەرەس کوردی خستە نێوان بەرداشی ڕێکەوتنامەی جەزایری نێوان ئێرانو عێراقەوە کە دۆخێکی ئاڵۆزی بۆ کورد لێکەوتەوە هەرچی بەهاو ئیرادەیەکی هەبوو لێی داماڵرا. بەهاکانیش لێکترازانو بەرەو خاوبوونەوەو هەرەس ڕۆیشتن. کورد خاوەنی خودی خۆی نەبوو. دوژمنان بە ئارەزووی خۆیان ئەیهێناو ئەیبردن. ناوچەکە بووە جێی ماتەمو خاکساری، ئەم دۆخە کاردانەوەیەکی بەرچاوی لەسەر شاعیرانو ڕۆشنبیران

جێهێشت. وایکرد کە شاعیر لە ناخی خۆیدا برینداربێ. چەرمەسەرییەکان ئەوەندە قورس و گران بوون شاعیر پێی هەزم نەئەکرا. بۆیەکا بەشێوەیەکی وا هەلوێستی خۆیان دەربریوە. کە دەسەلات هەستی پێ نەکات وەك ناچارییەك پەنای بردووەتە بەر رەمزو هێما. نزیکترین و لەبارترین هێما گەلی فەلەستین بووە وەك لەپێشەوە ئامازەمان پێداوە.. ئەحمەد زامداریش ئاوارەبوونی کوردی لە دیدی ئاوارەی فەلەستینەوە بینیوە هەم وەك هاوسۆزو هاوئازاری فەلەستین. چونکە ئەوانیش وەك کورد بێ پەنابوون هەم بۆ خۆ رزگارکردن لەو سانسۆرەی رژێمی عێراق ئەوەتانێ ئاوارەی و خەمباری گەلەکەی بە دۆخی گەلی فەلەستین وێنا ئەکات لەژێر ناونیشانی "نامەیەکی ئاوارەیەکی فەلەستینی"دا سۆزو رازەکانی دەرئەبڕێ:

شیرینەکەم

زەردەپەری گەرمیان و کوێستان

ئاسۆی وشەکانم

کپی و مەنگێتی دەروونی پڕ لە هیوام

ئەی سەرەتاو دوا دێری هۆنراوەکانم

واتای شەوانی ژوانم

کاتێ ئاوارەی کوێستان دوور لە من بووی

گەرمیانی زامەکانم هاتنەوە ژان [23]

کێشەی چەوسانەوەی نەتەوایەتی زوڵم و ستەم لە میللەت و نیشتمان لای سەلام محەمەد کێشەیەکە برانەوەی نییە. دەستی ستەم ئەگاتە شەقام و بازاڕو شارو خەلکی هەژارو بێ دەرەتان هەموو ئەمانە ئەگۆڕێ و سیمای جوانی شار ئەسڕێتەوە.

سوارەکان دێن

ناوی شارو

شەقام و بازار ئەگۆڕن

دەست و پەنجەی خەلوزاوی

سیمای ناکام

چاوی قوولی فرمێسکاوی ئەسڕنەوە [24]

تێکستەکە رەنگدانەوەی ئەو رەوشە ئالۆزەی کوردی دوای هەرەسە بەتایبەتی لە شاری کەرکوك کە رژێم هەموو روالەت و سیماکانی ئەو شارەی گۆڕی و لە پرۆسەی بەعەرەبکردندا سیما جوانە گەورە کوردەوارییەکەی سڕییەوە.

لە شوێنێکی تردا دیمەنی مەرگەساتی کۆمەلی خستووەتە پێش چاو کە لای دەسەلاتی سەردەست ئەوەندە بەهاو نرخی نییە. چونکە بەها مرۆڤایەتییەکان لە دیدو ئایدیای بەعسدا نەبووە. سەلام ئەلێ:

بۆ سالانی خۆشەویستیت ناخەیتە ژێر

گرو پرشنگی دەستاری رۆژگارەوە

بۆ نازانی تۆ نەفرەتت لێکراوەو بێ ولاتی

بۆ نازانی

هەموو جیهانیش بسووتێ خەمت نانە

خەم ناسووتێ [25]

لەتیفیش یەکێکە لەو شاعیرانەی کەرکوك کە هەر لەسەرەتای شیعر نووسینیەوە لە کفری سەری دەرهێناوە، بەلام بەشێکی ژیانی لە کەرکوکدا بووە. بەرهەمێکی زۆرو بەپێزی هەیە. هەر لە خواو شارە بچکۆلەکەمان و ئامادەبوون بۆ لەدایکبوونێکی ترو پرچی ئەو کچە رەشمالی گەرمیان و کوێستانەو ئەو هۆنراوانەی تەواو ئەبن و تەواو نابن و سروودی هەژاران و گەردەلوولی سپی و تا دوایی کە ئەکەونە نێو ماوەی ئەم تۆژینەوەیەوە. هەریەکەیان رەنگدانەوەو رەنگ پێ دانەوەی قۆناغێکن لە قۆناغەکانی ژیانی خۆی و هەم میللەتەکەی، هەریەکەیان سیماو خاسیەتێکی تایبەتییان لەخۆگرتووە. لە کۆبەندی ئەو ناوەرۆك و بابەتە نوێیانەدا وەك دیاردەیەکی نوێگەری چ لەسەر ئاستی کوردستان چ لەسەر ئاستی کەرکوك کە خۆی لە چەندین خاسییەت و سیمادا ئەبینێتەوە وەك کەمال میراودەلی ئەلێ "چوار خاسییەتی شیعری لەتیف هەلمەت بەلای منەوە وەك دیاردەیەکی شیعری تەواو دەکەن:

١- لە تازەیی شێوەو ناوەرۆك

٢- لە یاخی بووندا

٣- لە ئەوپەری دلسۆزی و راستگۆی و سادەی و روونی [26]

بەشێکی زۆر لە شیعرەکانی لە خوێندنەوەیاندا دەرئەکەون کە جۆرە یاخیبوونێکی پێوە دیارە. یاخی لە بارودۆخ. لە دیاردە دزێوەکان. لە دەسەلات لە بیرو دیدی چەقبەستوو دواکەوتووی کۆمەل و تاکەکان کە لە تەوەری پێشودا ئامازەمان پێداوە. لەگەل ئەمەشدا سیمایەکی تر شیعرەکانی لە شێوە پەخشانە شیعردایە. کە لە کارتێکردنی شیعری عەرەبییەوە سەرچاوەی گرتووە. بەتایبەتی نەیاری رەوتی (شیعر ٦٩)ی فازل عەزاوی و هاورێکانی کە ئەوسا باو بوو[27] لە کەیسی نەتەوەیی و نیشتمانیدا یاخود ئەم ناوەرۆکە پانتاییەکی فراوان و بەرچاوی شیعرەکانی داگیرکردووە. سەبارەت بە نیشتمان وا روانیویەتییە خاك و نیشتمان خودی خۆی بە رەگ چاندووە چۆن لە خاکدا رۆئەچێ و پێیەوە وابەستەبووە. لە تێکستێکی دایەلۆگ ئامێزدا لەنێوان داربەروو و پەلە هەورێکدا لە زمانی داربەرووەوە ئەلێ:

داربەروویەکی تینوو بانگی پەلە هەورێکی کرد

ئەی پەلە هەورە دوورەکە بشکێنە تینوێتی لێلم

ئەی دارەکە وەرە بۆلام خۆت بدەرە بەر شەستەبارانی وێلم

وەرە بۆلام لێم مەترسە خۆ من نە پاچم نە بێلم

ئەی هەورەکە تۆ دووریت و ئاخر منیش

خۆ نەگەرچی بشمکوژی

تینوێتی تال و لێلم

لەم خاکەدا رەگم هەیەو جێی ناهێلم [28]

دایەلۆگ لەنێوان داربەروو و هەورو خودی شاعیر ئەوە ئەگەیەنێ کە مرۆڤ چی بەسەردابێ بەرگەی نەهامەتییەکان و دیاردەو رووداوە خەمناکەکان ئەگرێ چونکە وابەستەیە بە خاك و نیشتمانی خۆیەوە. وەك رەگی دارە خاکیش کە کوردستانە بەم شێوەیە ناخی خۆی والا ئەکات.

سالی هات و چوو کەو گەورە بوو

کە بالی گرت

شەوێ پەنجەرەکانی شکان

بانگی لێ کرد کچی سولتان

بۆ کوێ دەڕۆی ئەی کەوی جوان

کوێ لە کۆشم گەرمترە
چی لەم کۆشکە بەرزترە
کەوی فێرە بەفری کوێستان
وتی لوتکەی چیاکانی کوردستان [٢٩]

لەم تێکستەدا هەر تەنها وشەی کوردستان واتایەکی دیاری هەیە، بەڵام کەرەسەکانی تر کەو، سوڵتان، کچی سوڵتان، هەڵفرین هەموویان واتای تری وەك سوڵتان بۆ هێزو دەسەڵات، کەو، مرۆڤی نێو زیندان، ماڵی سوڵتان، کۆشك، چوێنراوە بە زیندان، کۆت و پێوەند. ئەگرینەوە وابەستەبوونی باڵندە. بوونەوەر بە خاك و زێدی خۆیەوە. لەتیف لە شیعرەکانیدا دایەلۆگی نێوان کەرەسەو پێکهاتەو دیاردەکانی سروشت و مرۆڤدا ئەخولقێنێ. لەپێناو ئەفراندنی بیرێك دەقێك کە سیمای نەتەوایەتی و نیشتمانی و مرۆڤایەتی ببەخشێ. دوور لە کۆت و پێوەند زۆرداری. دابڕان و شوێنی بنەڕەتی ئەو کەرەسانە یان وەك ئەو بوونەوەرانە کە هەموویان هێمان بۆ دۆخێکی تری تایبەت بە کوردو نیشتمانەکەی. وەك لەم دەقەدا هەورو یارو ڕەگەو هەڵگوردو کەو کە نموونەی ئەو دۆخەن.

ئەی هەورەکە مەڕۆ مەڕۆ
پەرو باڵی خۆت مەخەرە ناو ئاگرو گەردنی خۆت مەخەرە زەبری چەقۆ
وەرە دواوە لە هەر کوێ بێ قامچی ئێمەت
لەسەر پشتەو کۆتی ئێمەت لەملدایە
ناکرێنەوە لە ئەستۆت [٣٠]

لەم دایەلۆگ و گێڕانەوەیەدا هەر لەو دەقەی پێشوو ئەچن. کەو و کوێستان، کۆشکی سوڵتان لێرەدا هەور بەندیە بیابان زیندانە پاسەوان و حەسحەسەکان دەسەڵاتن کە بێدادی تیادا باڵادەستە.

دیسان هێماکان و نموونەو سونبولی تر دواتر هەر دێنە زمان کە لەپێناو خۆشەویستەکەیدا شاخ و کوێستانەکان کێومال ئەکات بۆ گوندەکان ئەگەرێ خۆشەویستەکەی لێیە. چاوەڕوانێتی. تاوەکو گەردانەیەك لەو گوڵی کەژو کێوانە بهۆنێتەوە لە گەردنی بدات. پاسەوانیش هەر بەدوایەوە تا لە پەل و پۆ ئەکەوێ، ئەڵێ:

من قاچم مرد
هەور قاقا پێ ئەکەنێ و وتی وەرە ماڵەکەمت
پێشانبدەم لەسەر هەڵگورد [٣١]

هەڵگورد چیایەکی کوردستانە شوێنی بەرخودانی کوردانە هێمای خەبات و تێکۆشان پەنای کوردە. دیسان ئەوە دووپات ئەکاتەوە کە هەور تایبەتە بە کوێستان کوێستانیش هێمایە بۆ کوردستان.

کوردستان ئەوەندە پیرۆزە لەتیف زۆر لەسەرووی خۆشویستنە مەجازییەکەوە (جەستەییەکەوە) دایناوە. ئەوەتا لە دەقی (پێشنیازێك بۆ خەلیفەی سەدەی تاوان)دا ئەڵێ:

لەبەر دەرگای سەدەی گەورەی تاوان دا
لە بارەگای سەدەی چەقۆو درۆو ژان دا
لێیان پرسیم کێت خۆش دەوێ
دڵدارەکەی تۆ کێیە؟
شیرینە یان خەجێ یە؟
کام پەرییە کام جوانە
پێیانم وت. دڵدارەکەم کوردستانە [٣٢]

خاك و وڵات کوردستان ئەوەندە لای پیرۆزەو بە قیبلەنوماو رووگەی خۆی ئەیچوێنێ. نەك وەك ئەوانەی بە ئافرەتی ڕووت و جوان بیبەن بۆ ئەو شوێنانەی مەبەستیانە. چونکە نەیاران و دوژمنان نەك هەر داگیرکردنی کوردستانیان مەبەست بووە. بەڵکو نیازی لەوە خراپتریان هەبوو. لەم تێکستەدا لەتیف پێیاندا هەڵئەشاخێ بە ورەیەکی پۆڵاینەوە باس لە پیرۆزی وڵات و باس لە بەرگری کردن و قوربانیدان بۆ میللەت ئەکات لەپێناو پاراستنیدا.

وڵات
کاتی هاتن وایانزانی وڵاتەکەم
ئافرەتێکی ڕووت و جوانە
پێیان دەکرێ بیبەن بۆ کام ئاودەستخانە
وایان زانی وڵاتەکەم ئافرەتێکی ڕووت و جوانە
شێت و شەیدای ئونگستیلەو مەمکدانە
دەخەڵەتێ بە دوو تەوقەو پێنج شەش شانە
نەیانزانی وڵاتەکەم کەعبەیە
هەزاران بە دەوری دا پاسەوانە [٣٣]

* **تەوەری چوارەم:**
**نوێکردنەوە لە ڕووخساردا**

لەم تەوەرەدا تیشك ئەخەینە سەر هەندێ بابەت لە بەکارهێنانی وشەو فرێزو وێنەی شیعری و دیوی دەرەوەی تێکستی شیعر بەتایبەت قافییە، چونکە ئەو تازەگەرییە کە لە شیعری کوردی کەرکوکدا هاتبووە ئاراوە نەك هەر لەرووی ناوەرۆکەوە بووە. بەڵکو ڕووخساریشی گرتەوە. لە گۆڕینی قافییەدا لە بەکارهێنانی وشەی نوێ و کوردی پەتی و وێنەی هونەری شیعریدا بەوپێیەی کە شیعر چەندین بونیادی سەرەکی هەیە پێکهێنەرەکانیش بریتیین لە "ئەزموونی شیعری و مۆسیقاو وێنەی هونەری و یەکێتی بابەت و بیرۆکە پێکدێ".[٣٤]

بۆیە لە شیعری کوردی کەرکوکدا بەکارهێنانی وشەی نوێ کە تایبەتمەندی و ڕەنگدانەوەی خەبات و تێکۆشانی نەتەوایەتی کۆمەڵگای کوردییان پێوە دیارە وەك پێشمەرگە، خەبات، گڕ، ئاگر، بەرخودان، شەهید ئازادی رزگاری تادوایی. ئەمانە مۆتیڤگەلێکی بەرچاوی شیعری شاعیرانی کوردی کەرکوکی ئەو قۆناغە بوون. کە کاریگەری دیاریان لەسەر ڕەنگ و بۆی شیعری کوردی هەبووە. تەکنیکی دەرەوەو کە لەگەڵ یاخی بوون لە ناوەرۆکدا بوون بە دوو سیماو خەسڵەتی ئەو تازەگەرییەی شیعری کوردی کەرکوك. بۆیەکا گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەردا هات.

شاعیرانی کەرکوك بەرە بەرە وازیان لە هەندێ ناوەڕۆکی تەسەوف و غەزەل و دڵداری و هێناو ئەو ناوەڕۆکانە بەرەو کزی ڕۆیشتن. لەگەڵیشیدا قاڵب و ڕووخساری شیعریان گۆڕی لە شوێنیدا قاڵب و ڕووخساری نوێیان هێنایە ئاراوە.

لە وێنەی شیعری و لە کێش و سەروادا.

سەبارەت بە بەکارهێنانی وشەی نوێ وەك شەهید کە هێمای قوربانیدان بۆ گەل و نیشتمانە لە شیعردا بووەتە مۆتیڤی شیعری شاعیرانی کەرکوکی ئەو قۆناغە. ئەوەتانێ شاعیر بۆ دایکی شەهید ئەنووسێ.

ئەو ئافرەتە رووی هەمیشە پێکەنین
هەتا ئێستا ملوانکەو مەدالیا
نەبوون بە هاوەڵی ژینی
دەنگی ئاخی پێوە دیار بوو
دەیوت ئەوەی بەختی یارە
هەروەکو من مەدالیاکەی بە گەردنی
وێنەی کورە شەهیدەکەی پێوە دیارە [٣٥]

لای ئەحمەد زامداریش وێنەی شەهید لە شەهیدبوونی دایکی منالێکی ساوادا ئەبینێ لە نامەی ئاوارەیەکی فەلەستین دا.

روانیم منالێکی ساوا
لە خوێنی دایکیا گلاوە
چنگ لە چنگ
تەکان ئەدا بۆ پێ دەشتی سنگی دایکی
ئەنگوست گیر ئەکا لە مەمکی
بۆ شاد بوون بە دڵۆپی هەنگوینی سپی [٣٦]

یاخود کەساس جەباری بەم شێوەیە شەهیدی وێنا کردووە، بە نامە پەیام بە تەتەر باڵدار بە سەنگەر چواندویەتی، چونکە هێمای بەرخودانە بۆ میللەتەکەی.

ئەو نامەیەی
نووسەرەکەت لە نامۆیی نووسیویەتی
بە پێنووسێ نەیئەنووسی بە هیچ رەنگێ
بە سور نەبێ.. [٣٧]

یان لە کۆپلەیەکی تردا ئەڵێ:

شەقەی باڵی ئەو باڵدارەی.
بە ئاسمانی شاری خەمدا تێئەپەری، تێئەپەری هەتاکو هەن
دوا هەواڵی لەناوچوونی کونەڕەوەریت هەڵگرتووە. [٣٨]

بۆ پێشمەرگە وەك وشە، وەك مۆدێلێکی تری شیعری کوردی، لە زۆر شوێندا بووەتە ناونیشانی قەسیدەو پارچە شیعریەکان، ئەوەتا مارف عمر گوڵ بە ناونیشانی پێشمەرگە، ئەڵێ:

لەبەر پێی ئەسپی پێشمەرگە
لوتکەی ئەم گرتوو سەری دانەوان
شەختەی رێگاوبان بوو بە کانی و ئاو
ئۆردووی داگیرکەر کەوتە ئاوەژەنگ دان [٣٩]

ئەحمەد زامداریش بۆ پێشمەرگە ئەنووسێ.

کەساس جەباری بە نامەیەك لە ناو سەنگەرەوە ئەرك و چالاکی و پەیامی پێشمەرگە وا دەرئەبڕێ. لە هی ساڵی ١٩٧٤ دا.

خۆشەویستم تۆ لەوێ یت و
کراسی خەم بۆ نامۆیی و دەربەدەری هاورازانت لەبەرئەکەی
ئەبیە هێمای بەرخودان و
بەگڕ خەونی تاڵ و تاوانی دوژمندا ئەچیەوە
ئێمە لێرە پێشمەرگەین ئەو رێبازەی گرتوومانە
رێگای پیرۆز هی سەرکەوتن
هەرگیز هەرگیز بەری نادەین [٤٠]

بێجگە لە شەهیدو پێشمەرگە لەناو تێکستەکان کۆمەڵێ مۆتیڤی تر هەن کە نیشانەی بەرخودان و بیرو دەربڕینی نوێن لە ناو شیعری کوردیدا کە پێشتر کەمتر بەدی کراون.

سیمایەکی تری هەرە دیار لەو نوێکردنەوەیەدا بەکارهێنانی وێنە هونەرییەکان (شیعرییەکان) لە دەقەکاندا کە وەك دیاردەیەکی بەرچاو لە شیعری ئەو قۆناغەدا ئامادەییەکی تەواوی هەیە. چونکە زۆرێك لەو وێنانە دەربڕی بارودۆخێك بوون نەئەکرا بە ئاشکرا راشکاوانە دەربڕێت. بەتایبەتی لایەنە یاخی بوونەکەو کێشە نیشتمانی و نەتەوەییەکان و بەشێکی ئەو دەربڕینانەش سۆزێکی راستەقینەی شاعیرانە. سۆزو خەیاڵ و ئەندێشەش بە چەندین لایەندا ئەشکێتەوە. وەك کێشەی نەتەوایەتی یان سۆزی خۆشەویستانەی شاعیر. گرنگ ئەوەیە ئەمانە ئەبنە هۆی ئەفراندنی دەقی شیعری لە وێنەیەکی جوان و لەبارو سەرنجراکێشدا وەك پێکهێنەرێکی بونیادی شیعری خۆی ئەنوێنێ. ئەویش بەهۆی ریزبەندکردنی کۆمەڵێ وشەی سۆزدارەوە، چونکە "شیعر جۆرە وێنە کێشانێکە بە وشە ئەنجام ئەدرێ بە مەرجێك پڕ هەست و سۆز بێت" ئەمەش ئاخاوتنی ساموێل کۆلێرجە کە رەخنەگرێکی ئینگلیزە وای وتووە. [٤١]

لە شیعری کوردی ئەو قۆناغەشدا، لای هەندێ شاعیر ئەو بەکارهێنانە حزووریان هەیە سەلام محەمەدیش وەك شاعیرێکی کەرکوکی نوێخواز بە شیعرەکانی توانی لە شەقڵ و سیمای ئەو نوێگەرییە نزیك بێتەوە بە پارچە شیعری (دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە) کە مێژووی نووسینی بۆ ساڵی ١٩٧٤ ئەگەڕێتەوە. دواتر کردییە ناونیشانی دیوانە شیعرییەکەی لە ساڵی ١٩٨٨ بە چاپی گەیاند. لەم پارچەیەو تێکستەکانی تریشدا. نوێگەرییەکی بەرچاو ئەبینرێ. چ لە رووی تەکنیك و چ لە رووی ناوەرۆکەوە. تێکستەکان پارچەی درێژن وەك ئاسۆی خۆرنشین، بارانی رەنگاورەنگ، تۆ کەناری یان رووباری، وەك هەزارانی تر ل٨٣ی دیوانەکەی، گەشت و پێناسین ل٧٩، شاری نهێنی ل١٠٧-١٠٧، تانیا ل١١١-١١٣ ساڵی ١٩٧٥. بۆ کچی کوێستان ل١٢١-١٢٣ ساڵی ١٩٨٥. [٤٢]

ئەو نوێگەرییەی کە سەلامی شاعیر دەستی دابوویە تیایدا ئەوەندە پابەند بە قافییەو سەرواوە نەبووە. لە رووی تەکنیکی دەرەوەی شیعر، بۆیەکا لە شیعرەکانیدا ئازادانە کۆتایی دێرە شیعرەکانی دارشتووە، چونکە بیرو هەستی دارشتنی شاعیر ئەشێوێنێ کە شاعیرانی کەرکوك ئەوەندە بایەخیان پێنەدا چونکە قافییە وەك وێستگەیەکی حەزی شاعیر کۆتایی هات باوابێ وەك چۆن نزار قەبانی ئەڵێ: "وای بە باش ئەزانین قافییە وێستگەیەکی حەز بێ. ئەوەی ئەیەوێت با بووەستێ ئەوەش نایەوێت کەیفی خۆیەتی، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە قەرەبوویەکی نووسین هەبێت". [٤٣]

سەلامیش بە کەیف و حەزی خۆی سەرواکانی شیعری هێناوەتەوە سەرپاکی شیعرەکانی پێ دارشتوون.

نامەیەکیت ا ا یت

به تیشکی ڕۆژ وشەکانت هەڵچنراوە  ب  اوە
کە شەو داهات  ج  ات
لەگەڵ خەندەی لا لێوی پەرداخەکەت  د  ەت
چاوەکانت ئەتروکێنێ  هـ  ێنێ [٤٤]

یاخود لە پارچەیەکی تردا:
شەوانی هاوین  ا  ین
دوو لێوی گەرم و ناسك  ب  سك
کچە کێوییەك کپ و تامەزرۆ  ج  رۆ
لە ئاگردانی دەمی تیۆریا  د  یا
ئەبوونە پشکۆ  هـ  کۆ
بەدەم هەناسە هەڵمژینەوە  و  ەوە
گوێم لێ بوو تاڵ تاڵ ئێسقانەکانی  ز  نی
ئەهاتنە برزەو سەماو هەڵپەڕین  ك  ین [٤٥]

لەم تێکستەو چەندینی تردا دەربڕینەکان ئەوەندە بەشێوەیەکی چڕوپڕ دەربڕاون و داڕێژراون شاعیر سیستمە زمانەوانییەکەی زمانی کوردی شکاندووە هەڵەی کردووە. وەك گوێم لێ بوو بۆ برزە، سەما، هەڵپەڕین ناشێ بەڵکو چاو بەکارئەهێنرێ لەجیاتی گوێ.

لای مارف عومەر گوڵیش و لەتیف و ئەحمەد زامدارو کەساس جەباری و شاعیرانی تریش ئەوەندە پابەندی سەروا نەبوون بەوەی بەکارهێنانی ئەم دیاردەیە سەروا ئەبێتە لەمپەر لەبەردەم دەربڕینی بیرو خەیاڵ و ئەندێشەی شاعیر ئەم پابەندنەبوونەش سیمایەکی نوێگەری ئەو قۆناغە بوون.

لای ئەحمەد زامداریش بەم جۆرەیە:
کەڵەکە برێی ڕۆژگارێکی شێت  ا  ێت
نازدارەکەم شابووکی جوان  ب  ان
پەرستگای دڵ  ج  دڵ
قیبلەی نیاز  د  از
فەرهەنگ چپەو باس‌وخواز  هـ  از
ئەی تاقانە ئەستێرەکەی ئاسمانی دڵ ز دڵ [٤٦]

لەتیف هەڵمەت هەمەرەنگی قافییەکان وا دەرئەکەوێ کە پابەند نییە بە قافییەو سەرواوە.
وتیان ڕووبار بۆ ناڵین و قەڵەمبازی  ا  زی
لەنگەر ناگرێ و ڕاناوەستێ  ب  ستێ
بۆچی گڵی کەناری خۆت  ج  ۆت
لە خۆت دەگری و بە هەردوو دەست  د  ست
وتی لەبەر ئەو ماسیانەی  هـ  ەی
ڕاوچی تۆڕیان لێ دەبەستێ  ب  ستێ [٤٧]

لای مارف عمر گوڵیش بەم شێوەیە سەرواکان داڕێژراوە.
شیعرەکانم وەکو کۆتر دێن و دەچن  ا  چن
کە پەنجەرەی هەڵفڕینیان لێداخرا یەخسیرکران  ب  ان
نیوە شەوێ بۆ دیلێتی گەڕانەوە  ج  ەوە
هەر شیعرێکی لەبەر دەمما بوو بە چراو  د  او
گەشایەوە وەك چراخان  هـ  ان [٤٨]

لە بەکارهێنانی وێنەی هونەریدا شاعیرانی کەرکوك هەم بەهۆی ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسییەی کەرکوکەوە هەم بۆ فراوانکردنی داهێنانە شیعرییەکان زۆر بە وردی و سەرنجەوە وێنە شیعرییەکانیان دارشتووە پانتاییەکی فراوانی تێکستە شیعرییەکانیانی گرتووەتەوە، بەوپێیەی کە چەمکی شیعر بریتییە لە "بیرو وێنەو مۆسیقا" هەروەها وەك بونیادو پێکهێنەرێکی گرنگی شیعرەکە بریتییە لە "ئەزموونی شیعری و مۆسیقاو ئەندێشەو وێنەی شیعری و یەکێتی بابەت و بیر".[٤٩]

بۆیە دووبارەبوونەوەی وێنەی شیعری لای سەلام محەمەد ئەبینین کە زۆر چڕوپڕەو بە شێوازێکی فراوان و هێما ئامێز تێکستەکانی دارشتووە بەوەی کۆمەڵێ دەلالەتی واتایی ئەهێنێ واتاکانیان ئەگوێزێتەوە بۆ واتایەکی نوێ لە دیمەن و تابلۆی سروشتەوە وەریان ئەگرێ و ئەیانگوێزێتەوە بۆ نێو دەقی شیعری و ئاوێنەکردنی بە سۆزو ئەندێشەیەکی جوان و بێ سنوور.

وێڕای ئاوازێکی ڕێك و لەبار بەدەر لە دیوی ناوەوەی تێکستەکان و گونجاندنی وشەو جۆرێك لە ڕێکخستنی ورد بۆ بەخشینی واتایەکی ورد کار ئەکات وەك چۆن لامبورن ئەڵێ "ئاوازی ناوەوەی دەقی شیعری ئاکامی هەڵبژاردنی وشەکان و ڕێکخستنیانە لەلایەك و پێکەوە گونجاندنی وشەکان و واتاکانیان لەلایەکی ترەوە".[٥٠]

سەلام محەمەدی شاعیریش بۆ بەدیهێنانی ئاوازی ناوەوەی شیعرەکان وشەی لەباری لە سروشت و دیمەنەکانەوە هەڵئەبژێرێ و ڕێکیان ئەخات و بەیەکەوە پرۆسەی گونجاندن ئەهێنێتە بەرهەم.

ئەی کچی جوان
شەوی بەهار کاتێ بەفر ئەتوێتەوە
ڕێژنەی باران
دانە. دانە
لێوی ئاگر هەڵئەمژێ
هەورە تریشقەو بروسکە
دێنە ناو ژووری دڵتەوە
تۆی ڕازاوەش
ئەبێت بە مانگ تریفەکەت وردە بەردو زیخ و چەوی
کەنارەکانی تانجەرۆ دائەپۆشیت [٥١]

ئەم تێکستە شیعرێکی ئازادو سەربەستە، تیایدا دەربڕینێکی پڕ لە سۆزو ئەندێشەیەکی بەرفراوانی هێناوەتە ناوەوە. تافێکی بەهاری لە شەودا بەفر ئەتوێنەوە. بارانیش گەرمی ئەکاتەوە. ڕێژنەی باران. لێوی ئاگرو هەڵمژین هەورە تریشقەو بروسکە ئەچنە ئامێزی دڵەوە. بە تیشکی ئەوانە تۆ ئەبی بە تریفەی مانگ و زیخ و چەوو کەنارەکانی ڕووبار دائەپۆشێ تەماشاکە چ تابلۆیەکی ڕەنگینی خوڵقاندووە، ئەفراندووە.

شاعیرانی کوردی کەرکوك بەشێوەیەکی لەبارو ورد مامەڵەیان لەگەڵ وێنەی شیعریدا کردووە توانیویانە کەرەسەکان لە سروشت و هەناوی واقیعی کۆمەڵی کوردەوارییەوە وەربگرن و بەشێوەیەکی ڕەمزی و هێماکاری شکاندوویانەتەوە بۆئەوەی بابەتەکە دەربڕی ناخی شاعیرو کۆمەڵ بێت لەپێناو خوڵقاندن و ئەفراندنی تێکستێکی شیعری نایابدا. بێ ئەوەی کە کردوویانە بە کۆڵەکەیەکی شیعر وایان کردووە

بێن بە گیان و جەستەی شیعری وەك چۆن رۆبەرت ئەرز روز ئەڵێ "ئەوە راستی نییە وێنە تەنها کۆڵەکەی شیعر بێت بەڵکو راستی لەوەدایە کە وێنە گەوهەری شیعرە لەهەمان کاتیشدا گیان لاشەکەیەتی".[52]

سەلام محەمەد شاعیری کەرکوکیش بەم جۆرە مامەڵە لەگەڵ وێنەی شیعریدا ئەکاو ئەیخوڵقێنێ.

شینایی خەم
رەشماڵێکی ئاگرین
بەسەر دەشتە چۆڵەکانی
تریفەی شووشە شکێنی
ئەستێرەکانا هەڵدابوو
ئاسۆش تەمی
ئاسمانی دوور دەکردە
دڵۆپی فرمێسکی وشك و
تێکەڵاوی تاسەی هەورەکانی دەکرد
تا لە زستان ببێتە
هەڵمی رەنگە جوانەکانی
پاش رەهێڵەو بارانی زۆر [53]

سەلام لەم کۆپلەیەدا وێنەیەکی وای نەخشاندووە، خەمی کردووەتە رەشماڵێکی ئاگرین بەسەر چۆڵدا بەسەر تریفەی فرمێسکی ئەستێرەکاندا هەڵ ئەدا، ئاسۆش ئاسمانی دور ئەکاتە خوێن، سوور هەڵئەگرێ و وشك ئەبێ و ئاوێتەی هەورەکانی ئەکات، لێرەدا خەم و شینایییە مۆرەکەی ئەبنە رەنگی رەش هەرچی دەشت و تریفەی ئەستێرەش هەیە دای ئەپۆشێ، ئاسۆش بەهەمان شێوە بووەتە پارچەیەك لە گیان و جەستەو ئاوێتەی یەکتری بوون دیمەنێکی ئەفرێندراوی ئاسکیان خوڵقاندووە.

لەتیف هەڵمەتیش بە خوڵقاندنی وێنەیەك بەم شێوەیە ناخی خۆی والا ئەکات و بەهێنانی کۆمەڵێ کەرەسە دەربڕینی رقی سەبارەت بە ئارایشتکردنی رازاندنەوەی شیعر بە ئارایشت و مۆدێلکاری ژنان و گەنجانی لە قەڵەم داوە.

چەنێ بڵێ من رقم لە بۆیەو چاو رشتن و
ئارایشت کردنی وشەیە
ئەویش بۆئەوەی وشەش وەکو
شێوەی جلوبەرگ و رووخساری هەندێ
کچۆڵەی نەفام و ژنی سەرلێ شێواوو
گەنجی بەرەڵڵا
لە مۆدێلکاری و ئەتەکێتبازیدا ئەشێوێ. [54]

سەلام محەمەد بۆ داهێنانی وێنەی شیعری لەنێو تێکستێکی شیعریدا کەرەسەکان ئەهێنێ و لەجیاتی رۆح و گیان و ناخی خۆی لەگەڵ یەکتردا ئەیاندوێنێ و تێکستێکی شیعری ناوازە ئەخوڵقێنێ.

لە سامالی پاش بارانی نیوە شەودا
خەم ئەبێتە تریفەیەك
بە مانگ ئەڵێ
تۆ جوانتری
یا ئەو رووبارەی هاژەی دێ
هەرچەندەکا هەڵم ناکاو
نابێتە پەلکەزێرینە
مانگیش ئەڵێ با ئەستێرەکان نەسووتێن
ئارامت بێ تا بەیانی
خۆر وەڵامت ئەداتەوە [55]

لەم تێکست و کۆپلەیەدا دیسان خەم ئەکاتە تریفەو لەگەڵ مانگدا ئەیدوێنێ ئەم دایەلۆگە بەرپا ئەکات تۆ جوانتری یان ئەو رووبارەی هاژەی دێ و هەڵم ناکات. پەلکەزێرینە دروست ناکات.

مانگیش وەڵام بۆ خۆر جێ ئەهێڵێ، دیسانەوە خەم ئەکاتەوە ماسیەکی تینوو لەگەڵ خۆردا ئەپەیڤێ ئەڵێ تۆ جوانتری یان گوڵە کێویلەی ماچێ کە بشفرێ ناگاتە لێوی دڵدار تا خۆر پێی ئەڵێ لە مانگت پرسیوە. ئیدی هەورەکان لێك ئەدەن و بریسکەو چەخماخە ئەدەن بەوە رێژنە باران دائەکاو لافاوێکی پیرۆز هەڵئەستێ.

دایەلۆگەکە کۆتایی دێت، بێگومان ئەمەش جۆرە داهێنانێکە کە کەرەسەکانی سروشت و دیاردەکان بەشدارن و ئەیانهێنێتە قسەو دیمەن و تابلۆیەکی هونەرییان پێ ئەنەخشێنێ..

* سەرچاوە و پەراوێزەکان:-

١- پەرێز سابیر، ڕەخنەی ئەدەبی کوردی‌و مەسەلەکانی نوێکردنەوە (شیعر)، هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨، ل٦١١.
(*) "چیمان گۆڕی" ناونیشانی دەقێکی شیعری لە کۆمەڵە شیعری "پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان‌و کوێستانمە" دایە. ئەم کۆمەڵە شیعرە لە ساڵی ١٩٧٧ چاپکراوە کە پڕە لە چەندین تێکستی شیعری تووڕەو یاخی وابەستە بوون بە خاك‌و نیشتمانەوە. هەڵوێستی نەتەوایەتی‌و نیشتمانی‌و تێکەڵ کردنی خۆشەویستی بە خۆشەویستی نیشتمان‌و خاك‌و نەتەوە. کە تیایدا وشەو دەستەواژەی شۆڕشگێڕی وەك سەنگەر، تۆڵە، ڕەگ، کوردستان، قوربانی..تاد. لە هۆنراوەی سادەو ساکاردا دەربڕاون هەموویان ئاماژەی یاخی بوون‌و پەیام بۆ خەبات‌و بەرخودان‌و یاخی بوونی بەرجەستەبووی کۆمەڵگای کوردەواری..
٢- پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان‌و کوێستانمە، شیعر، ١٩٧٧، ل١٠٧.
٣- هەر ئەو سەرچاوەیە ل١٠٨.
٤- غیابی پرۆژەی گۆڕانکاری لە شیعری "چیمان گۆڕی" عەتا قەرەداغی، ڕۆژنامەی ڕووناکبیری، ژمارە (٥) ٢٠٠٠/١٢/٣١.
٥- لەتیف هەڵمەت وەك دیاردەیەکی شیعری نوێ، سەرنجێك لە خواو شارە بچکۆلەکەمان، هەتاوی ئەدەبی ڕۆژنامە. ژمارە (٤و٥) ١٩٩٦.
٦- د.عەلی تاهیر بەرزنجی، کاریگەری ڕوانگە لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا، چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٨، ل١٣١ و ١٣٢.
٧- خۆری زیندان، شیعر، مارف عمر گوڵ، ١٩٨٦، ل٥٥.
٨- عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا، چەمکی یاخی بوون لە شیعری کوردیدا، گۆڤاری سبەی، ژمارە (٢) پایزی ١٩٩٣، ل١١.
٩- نظرية اللغة والجمال في النقد الادبي، سلوم ثامر، دار الحوار، اللاذقية، ١٩٨٣، ص٢٢٥.
١٠- دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، بارانی ڕەنگاوڕەنگ، ١٩٧٩، نووسراوە. سەلام محەمەد، ١٩٨٨، ل٤١-٤٥.
١١- بەهاکان کە نامۆ ئەبن، کەساس جەباری، سلێمانی، ٢٠٠٧.
١٢- هەر ئەو سەرچاوەیە ل٦٩ و ٧٠، گۆڤاری گزنگ، یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك، ژ١٧ ڕاپەڕین ك١، ١٩٩١.
١٣- گیانی یاخی بوون و بەگژاچوون لە شیعری نەوەی نوێماندا، حوسێن عارف، گۆڤاری گزنگ ژمارە (٢) ساڵی ١٩٧١، ل٦٦.
١٤- دیوانی شێرکۆ بێکەس بەرگی (١)، من تینوێتیم بە گڕ ئەشکێ، ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەك، سوید، ٢٠٠٩، ل٤٠٩ و ٤١٠.
١٥- پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان‌و کوێستانمە، ل٧٩.
١٦- خۆری زیندان، مارف عومەر گوڵ، ل.٣٠. ١٩٨٧، پێیان وتووم جا کە زیندان
١٧- خۆری زیندان، دەسەڵات، مارف عومەر گوڵ، ل٤٣، ١٩٨٧ ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٨٤ نووسراوە.
١٨- ئازاد بەرزنجی، چەند وێستگەیەکی ئەدەبی‌و فیکری، چاپی دووەم، ٢٠٠٦، ل١١٧.
١٩- مارف عومەر گوڵ، هێلانەی نوغرۆ، هۆنراوە، کەرکوك، ١٩٨٥، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٥، ل١٥ و ١٦.
٢٠- مارف عومەر گوڵ، هێلانەی نوغرۆ، هۆرەی سیامەند، ل٣٢.
٢١- هەر ئەو سەرچاوەیە ل٣٢و ٣٣.
٢٢- هێلانەی نوغرۆ، درەخت، ل٤٢.
٢٣- کودەتایەك لە پایتەختی دڵێکی شێتدا، ئەحمەد زامدار، ١٩٧٩، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٧٩، ل٢٦.
٢٤- سەلام محمد، دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە "بارانی ڕەنگاوڕەنگ" ١٩٨٨، ل٤٠.
٢٥- هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٤٠.
٢٦- کەمال میراودەلی، لەتیف هەڵمەت وەك دیاردەیەکی شیعری نوێ سەرنجێك لە خواو شارە بچکۆلەکەمان، ڕۆژنامەی هەتاوی ئەدەبی ژمارە (٤ و ٥) حوزەیران و تەموز، ١٩٩٦.
٢٧- هەر ئەو سەرچاوەیە، ئەو ژمارەیە.
٢٨- لەتیف هەڵمەت، پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان‌و کوێستانمە، سلێمانی، چاپخانەی کامەرانی، ١٩٧٧، ل١٦.
٢٩- هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٨و١٩.
٣٠- هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٧و١٨.
٣١- هەر ئەو سەرچاوەیە، ل١٨.
٣٢- هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٢٤.
٣٣- هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٨١.
٣٤- بناء القصيدة، الفني في النقد العربي القديم والمعاصر، مرشد الزبيدي، بغداد، ١٩٩٤، ص٤٥.
٣٥- مارف عومەر گوڵ، خۆری زیندان لە ساڵی ١٩٨١ نووسراوە، ل٧.
٣٦- ئەحمەد زامدار، کودەتایەك لە پایتەختی دڵێکی شێتدا، ١٩٧٩، ل٢٧.
٣٧- کەساس جەباری، بەهاکان کە نامۆ ئەبن، ٢٠٠٧، ل٦٣، کوردستانی نوێ ژ٧٧ ساڵی ١٩٩٢، شیعرەکە هی ساڵی (١٩٨٠)یە.
٣٨- هەر ئەو سەرچاوەیە ل٦٣.
٣٩- خۆری زیندان، مارف عومەر گوڵ، ل٥٧.
٤٠- بەهاکان کە نامۆ ئەبن، کەساس جەباری، ل٦٠، لە ١٩٧٤/٥/٣ لە ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق بڵاوبووەتەوە.
٤١- سیسل دی لویس "الصورة الشعرية" ترجمة احمد نصيف الجنابي وآخرين، ١٩٨٢، ص٢٣.
٤٢- سەلام محەمەد، دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، ١٩٨٨.
٤٣- نزار قەبانی، کۆمەڵە وتارێك، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە، تەها بابان، سلێمانی، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ ساڵی ٢٠٠٩.
٤٤- سەلام محەمەد، دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، ل٢٨.
٤٥- هەر ئەو سەرچاوەیە، ل٢٩.

٤٦- کودەتایەك لە پایتەختی دڵێکی شێتدا، احمد زامدار، ل٣.

٤٧- لەتیف هەڵمەت، سروودی هەژاران، ١٩٨٣، ل١١٥، شیعرێکی ونبوو.

٤٨- مارف عومەر گوڵ، هێلانەی نوغرۆ، ل٧٧.

٤٩- البناء الفني للقصيدة العربية، محمد عبدالمنعم الخفاجي، القاهرة، ص٤٥.

٥٠- في النقد العربي عند العرب، د.محمد تاهير درويش، مطابع سجل العرب، طبعة (٢)، ١٩٧٩، ص٩٧.

٥١- سەلام محەمەد، دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، ل٩١.

٥٢- عبدالرحمن نصرت، في النقد الحديث، دراسة مذاهب نقدية وأصولها الفكرية، بلا سنة، ص٢٦.

٥٣- سەلام محەمەد، دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، وەك هەزاران رێکەوتی تر، ل٨٣ و ٨٤.

٥٤- ئەو هۆنراوانەی تەواو ئەبن و تەواو نابن، لەتیف هەڵمەت ١٩٧٩، ل٣٩.

٥٥- دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، سەلام محمد، ل٩٣-٩٤.

*** ئەنجام**

دوای لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن لە هەندێ تێکستی شیعری شاعیرانی کەرکوك نێوان هەرەس و راپەڕین(١٩٧٥-١٩٩١) گەیشتینە ئەوەی کە شیعری ئەو قۆناغەی شاری کەرکوك، گۆرانکارییەکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە. لەباری تازەگەرییەوە کە بەهۆی گۆرانی رەوشی ئاڵۆزو ململانێی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتییەوە. لەگەڵ گۆرانی ئەو رەوشەی شیعری کوردیش گۆرانی بەسەردا هات و خۆی لە کۆت و پێوەندە تەقلیدیە کلاسیزمەکە رسکان. لەوێ شیعر بە ئاقارێکی نوێدا تێپەڕی. چەند سیمایەکی وەك یاخی بوون دژی دەسەڵات و دیاردە دزێوەکان و نوێبوونەوە لە ناوەرۆك و رووخساردا بەخۆوە گرت. خۆی لەو سیستەمە کلاسیزمە رزگارکردو بەرەو پەخشانە شیعرو شیعری ئازاد رۆیشتووە. ئەم گۆرانانەش وەك دیاردەیەکی تازەگەری لە شیعری کوردی کەرکوك و خۆی چەسپاند. کۆمەڵێ شاعیر چ لە شاخ و چ لە شار هاوشان لەگەڵ گۆرانەکان و بەرپەرچدانەوەی ئەو رەوشە ئاڵۆزەی کەرکوك و کوردستاندا بەرهەمە شیعرییەکانیان لە نموونەو تێکستی نوێ و تازەدا ئەفراند. کە موتوربە بوون بە بیری نیشتمانی و ئایدیۆلۆژیای نەتەوایەتی و خەبات و بەرخودانی بزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلی کوردستان...


*** سەرچاوەکان**

*** کوردییەکان:**

١- رەخنەی ئەدەبی کوردی و مەسەلەکانی نوێکردنەوە (شیعر) پەرێز سابیر، هەولێر، ٢٠٠٨، چاپی یەکەم.

٢- چەند وێستگەیەکی ئەدەبی و فیکری، ئازاد بەرزنجی، ٢٠٠٦، چاپی دووەم.

٣- کاریگەری روانگە لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا، عەلی تاهیر بەرزنجی، ٢٠٠٨، چاپی یەکەم.

*** عەرەبییەکان:**

١- البناء الفني للقصيدة العربية، محمد عبدالمنعم الخفاجي، القاهرة.

٢- الصورة الشعرية، سيسل.دى لويس، ترجمة أحمد نصيف الجنابي وآخرين، ١٩٨٢.

٣- بناء القصيدة الفني في النقد العربي القديم والمعاصر، مرشد الزبيدي، بغداد، ١٩٩٤.

٤- في النقد الحديث، عبدالرحمن نصرت، دراسة مذاهب نقدية وأصولها الفكرية، بلا سنة.

٥- في النقد العربي عند العرب، د.محمد تاهير درويش، مطابع سجل العرب، طبعة (٢)، ١٩٧٩.

٦- نظرية اللغة والجمال في النقد الادبي، سلام ثامر، دار الحوار، اللاذقية، ١٩٨٣.

*** دیوانە شیعرییەکان:**

١- ئەو هۆنراوانەی تەواو ئەبن و تەواو نابن، لەتیف هەڵمەت، ١٩٧٩.

٢- بەهاکان کە نامۆ ئەبن، کەساس جەباری، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٣- پرچی ئەو کچە رەشماڵی گەرمیان و کوێستانمە، لەتیف هەڵمەت، ١٩٧٧.

٤- خۆری زیندان، مارف عمر گوڵ، ١٩٨٣، چاپی دووەم.

٥- دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، سەلام محمد، ١٩٨٨.

٦- دیوانی شێرکۆ بێکەس، بەرگی (١)، سوید، ٢٠٠٩.

٧- سروودی هەژاران، لەتیف هەڵمەت، ١٩٨٣.

٨- کودەتایەك لە پایتەختی دڵێکی شێتدا، احمد زامدار، ١٩٧٩، سلێمانی، چاپخانەی کامەرانی.

٩- هێلانەی نوغرۆ، مارف عمر گوڵ، کەرکوك، ١٩٨٥، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٥.

*** رۆژنامەو گۆڤارەکان:**

١- رووناکبیری "رۆژنامە"، ژمارە (٥)، ٢٠٠٠/١٢/٣١.

٢- هەتاوی ئەدەبی "رۆژنامە"، ژمارە (٤و٥) حوزەیران، تەموز، ١٩٩٦.

٣- گۆڤاری سبەی، ژمارە (٢) پایزی ١٩٩٣.

٤- گۆڤاری گزنگ، ژمارە (٢) ساڵی ١٩٧١.

٥- گۆڤاری گزنگ، یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکوك، ژمارە (١٧) ك١ ١٩٩١.

٦- گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ساڵی ٢٠٠٩.

* یەكێتی نووسەرانی كورد.

مستەفا ساڵح كەریم
عەبدولستار جەباری

دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨) بۆ یەكەم جار لە عێراقدا (یەكێتی ئەدیبانی عێراق)یان دامەزراندو باوەشی بۆ ئەدیبان‌و نووسەران كردەوە، ئەدیبە ناسراو خاوەن ئەزموونەكان‌و نووسەرە لاوەكان بە هەموو چین‌و توێژو نەتەوەكانیانەوە بوونە ئەندام لەم یەكێتییەدا.
لە كۆنگرەی یەكەمدا شاعیری گەورەی عێراقی (جەواهیری) بە سەرۆك‌و ئەدیب‌و مێژوونووسی گەورەی كورد، رەفیق حیلمی بە جێگری سەرۆك‌و چەندین ناوی پرشنگداری تریش وەك د. سەلاح خالیس، د.عەلی جواد ئەلتاهیر، د.مەهدی ئەلمەخزومی‌و ئەلفرێد سەمعان بە ئەندامی دەستەی بەرێوەبەری هەڵبژێردران، هەر لە سەرەتاوە بەهاندانی حیزبی شیوعی عێراق، ژمارەیەكی دیار لە نووسەرانی كورد بوونە ئەندام لەو یەكێتییەدا، تەنانەت ژێر بەژێر ئەندامان ئاگادار كران كە وتارێك یان شیعرێك یان چیرۆكێك بلاودەكەنەوە لەژێر ناونیشانەكان بنووسن (ئەندامی یەكێتی ئەدیبانی عێراق).
دوای ساڵێك لە بەستنی كۆنگرەی یەكەم، كۆنگرەی دووەم لە بەغدا بەسترا، هەریەكە لە مستەفا ساڵح كەریم‌و كامیل ئەلبەسیر لەلایەن كوردەوە بەشدارییان كرد، كە بۆ ماوەی دوو رۆژ بەردەوام بوو، عەبدولسەمەد خانەقا وتاری نووسەرانی كەركوكی خوێندەوە، تیایدا ئاماژەی بەدەوری هەندێ ئەدیبی خراپ كرد كە بە ئاراستەیەكی دژ بە دیموكراسی كار دەكەن، لەم كۆنگرەیەدا عەبدولكەریم قاسم بەشداری كرد هەروەكو جاری پێشوو، سەرۆك‌و جێگرەكەی هەڵبژێردرا.
دوای كۆنگرەی دووەمی یەكێتی ئەدیبانی عێراق هەروەكو خولی یەكەم ئەمجارەش لیژنەی ئەدەبی كوردی سەرلەنوێ هەڵبژێردرا، كە لەم ئەدیبانە پێكهاتبوو، محەمەدی مەلا كەریم، محەمەد رەسوڵ هاوار، عەبدولسەمەد خانەقا، عەبدولرەزاق بیمار لیژنەكە چالاكانە كەوتە كارو پاشكۆی گۆڤارەكەشیان بە كوردی دەركرد، دۆستانی كورد وەكو:- جەواهیری، د.سەفا، ئەلحافز، د.سەلاح خالیس، د.عەلی جواد تاهیر، عەلی شۆك، ئەلفرید سەمعان، بەدیع عومەر نەزمی، عەدنان ئەلبراك، زۆر پشتیوانی ئەو لیژنەیەیان دەكرد، لەو ماوەیەدا دوو یادی گەورەیان بۆ بێكەس‌و پیرەمێرد سازكرد، هەروەها لە كۆچی دوای رەفیق حیلمی دا لە ٤ی ئابی ساڵی (١٩٦٠) دا لە باخچەكانی نووسەران بە رەسمی پرسەیان بۆ گرت.
بەوشێوەیە، یەكێتی نووسەرانی عێراق لەسەر كاروچالاكییەكانی بەردەوام بوو تا كوودەتای رەشی هەشتی شوباتی ساڵی (١٩٦٣)، لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێم كە ئەندامانی پارتی دیموكراتی كوردستان كاتی خۆی (تحفظ) یان هەبوو لە چوونە ناو ئەو یەكێتییەوە، چونكە دەیانوویست ئەدیبانی كورد یەكێتی تایبەتی بە خۆیان هەبێت، بۆ ئەو مەبەستەش یاداشتیان بە لێپرسراوان داو ئیمزاشیان كۆكردەوە، بەلام رەوشی سیاسی ئەو رۆژگارە وابوو كە رێكخراوەكان مەركەزیی بن، لەبەر ئەوە بە تەنیا یەكێتیی ئەدیبانی عێراق مایەوە، بەلام دوای وتارەكەی (عەبدولكەریم قاسم) لە كڵێسەی (مار یوسف)و جلەوخۆشكردن بۆ قەومیچییەكان‌و بەربوونی بەعسییەكان، دەستەیەك لەو قەومیچینانە كۆمەڵەیەكیان دروستكرد بەناوی (كۆمەڵەی نووسەران‌و دانەرانی عێراق) بارەگاشیان كردەوە، گۆڤاریشیان دەركرد، بەعسییە گەورەكان تێیدا بوونە بە ئەندام.
دوای ئەو كودەتا خوێناوییە نووسەرە پێشكەوتووخوازەكان كەوتنە بەر شالاوی گرتن‌و راونان‌و دەركردن لە كارەكانیان، یەكێتی نووسەرانیش كە بووە جێی متمانەی زۆرینەی نووسەران هەڵوەشێنراو دەرگاكەی مۆركرا، بەسەدان نووسەریش خرانە بەندیخانەكانەوەو سەدانیشیان خۆیان شاردەوە یان رووپانكردە هەندەران، جگە لەوەش دەیان كەسیشیان شەهید كران، لەوانە:- عەدنان ئەلبەراك، مەتی ئەلشێخ، حوسێن هەورامی، جۆرج تەللو، محەمەد حوسێن ئەبو ئەلعەیس، لەگەڵ كەسانی تریش لە ئەدیبان‌و رووناكبیران.
دوای كوودەتای دووەمی بەعسی لە تەمووزی ساڵی (١٩٦٨)دا سەرانی بەعس ویستیان بە وشەی پف هەڵدراوو نزیكبوونەوە لە هێزە نیشتمانییەكان وای بگەیەنن كە ئەوەی لە ساڵی (١٩٦٣)دا روویدا، دووبارە نابێتەوە.
بەو شێوەیەو بە هەموو جۆرێكی هۆكاری پروپاگەندەو دانووستان لەگەڵ لایەنە دیموكراتییەكان بەتایبەتی لە رێی كەسانێكەوە كە دەستیان نەچووبووە خوێنی هاووڵاتیانەوە، بۆ نموونە وەكو (عەبدولخالق ئەلسامەرائی)، كەوتنە كار بۆ نزیكبوونەوە لەو كەسایەتییە دیموكراتییەكان‌و چەپەكان، لە ئەنجامی ئەو پەیوەندییانە یەكێتیی ئەدیبانی عێراقیش سەرلەنوێ بووژایەوەو شوێنەكەی جارانیان وەرگرتەوەو جەواهیری بووە سەرۆك. یەكێتیی ئەدیبانی عێراق دەستی كردەوە بە چالاكی، بەلام ئەدیبانی كورد كە مارانگاز بووبوون بەدەست بەعسییەكانەوە ئەزموونی تاڵیان هەبوو، ئەو حەماسەتەی جارانیان نەبوو بۆ چوونە ناو یەكێتیی ئەدیبانی عێراقەوە، لەبەر ئەوە كەوتنە نەخشەدانان بۆ ئەوەی یەكێتییەكی سەربەخۆ دامەزرێنن بۆ نووسەرانی كورد، بۆ ئەوە مەبەستەش ئەدیبانی كورد لە كۆتایی ساڵی (١٩٦٩)دا كەوتنە جموجووڵ‌و پەیوەندیی كردن بەو كەسایەتییانەوە كە دەتوانن پشتیگیرییان بكەن.
دەستەیەك لە ئەدیبە دڵسۆزە ناسراوەكانمان داخوازییان پێشكەش بە وەزارەتی ناوخۆی عێراق كرد بۆ مۆڵەتپێدان بە رێكخراوێكی ئەدەبیی بەناوی (یەكێتیی نووسەرانی كورد) ئەوە بوو لە (١٠ی شوباتی ساڵی ١٩٧٠)دا وەزارەتی ناوخۆ مۆڵەتی دامەزراندنی ئەم رێكخراوە ئەدەبییەی پێدرا، كە دەستەی دامەزرێنەر پێكهاتبوو لەم بەرێزانە:-
جەماڵ عەبدولقادر بابان، د. مارف خەزنەدار، د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، د. ئیحسان فوئاد، د. نەسرین فەخری، د.

کاویس قەفتان، محەمەدی مەلا کەریم، کاکە مەم بۆتانی، خالید دلێر، حوسێن عارف، نوری عەلی ئەمین.
ئیتر دەستـەی کـەوتـە خـۆ بـۆ وەرگـرتـنی ئـەنـدامو دانـانـی پـەیـڕەوی نـاوخـۆو ئـامـادەکـاریـی بـۆ بـەستنی کۆنگرەی ئەدیبانی کورد ڕۆژی (٢٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٠) لە هۆڵی خولد لە (بەغدا) بۆ یەکەمین جار ئازادانەو دوور لە سانسۆڕو فشاری ئەمنی یەکەم کۆنگرەی خۆیان بەست.
* ئـەنـدامـانـی کـۆنـگـرەی یـەکـەمـی یـەکـێـتـیـی نـووسـەرانـی کورد:- ئەبو بەکر هەوری، ئەحمەد تاقانە، ئەحمەد دڵزار، ئـەحـمـەد عـوسـمـان، ئـەحـمـەد غـەفـوور، ئـەحـمـەد مـحـەمـەد ئیسماعیل، ئەحمەد هـەوری، ئەمین میرزا کەریم، ئیحسان فوئاد، بەدرخـان سـەنـدی، پاکیزە ڕەفـیـق حیلمی، پیربال مەحمود، تاهیر سادق، جەبار جەباری، جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی، جەلال دەباغ، جەلال میرزا کەریم، جەمال بابان، جەمال خەزنەدار، جەمال شارباژێری، حافز قازی، حەمە کەریم هەورامی، حەمید عوسمان، حوسێن عارف، خورشیدە بابان، داری ساری، ڕەئووف ئالانی، ساجدە ئاوارە، سەعید ئاکام، سـالح حـەیـدەری، سـالح هـەژار، سـادق بەهائەدین، سامیە شاکر، سامی عـەوال، سەبری بۆتانی، سەدرەدین عـارف، شوکور مستەفا، شێرکۆ بێکەس، عەبدولڕەحمان موفتی، عـەبدولـڕەحمـان هـەژار، عەبدولخالق عەلائەدین، عەبدولڕەزاق بیمار، عەبدولقادر قـەزاز، عەبدوڵلا پەشێو، عەبدوڵلا میدیا، عەلی شەونم، عوسمان مستەفا خۆشناو، عومەر عەبدولڕەحیم، عومەر کەریم عەزیز، عیزەدین مستەفا ڕەسـوڵ، فەرەیدون عەلی ئەمین، کاکە مەم بۆتانی، کاکەی فـەلاح، کـامل نـیزامـەدیـن (ژیـر)، کـاووس قـەفـتـان، کەریم زانستی، کەریم زەند، کەریم شارەزا، کەمال مەزهەر، کەمال ڕەئووف، کەمال غەمبار، مارف خەزنەدار، محەمەد ئەحمەد تەها (کامەران)، محەمەد ئەمین عوسمان، محەمەد ڕەسوڵ (هاوار)، محەمەد ئەمین کاردۆخی، محەمەد بەدری، محەمەد تاهیر حوسێن، محەمەد جەباری، محەمەد دەوران، محەمەد سالح سەعید، محەمەد شێخ حوسێن بەرزنجی (ع. ج. ب)، محەمەد شوکور خەلیفە، محەمەد عەلی مەدهۆش، محەمەد مەولوود (مەم)، مەجید ئاسنگەر، مەحمووود زامدار، مەدحەت بێ خەو، مەمدووح بریفکانی، مستەفا سالح کەریم، مستەفا نەریمان، نەسرین فەخری، نوری عەلی ئەمین، هۆگر گۆران.
(٣٣) ئەندام خۆیان پاڵاوت کە (٧٧) ئەندام دەنگیان بۆ دابوو بەم شێوەیە:-

- د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ/ ٦٢ دەنگ
- محەمەد مەلا کەریم/ ٥٧ دەنگ
- ئیحسان فوئاد/ ٥٥ دەنگ
- هەژار موکریانی/٥٠ دەنگ
- ئەحمەد دڵزار/ ٤٨ دەنگ
- د. مارف خەزنەدار/ ٤٦ دەنگ
- د. نەسرین فەخری/ ٤٥ دەنگ
- نووری عەلی ئەمین/٤٤ دەنگ
- ئەحمەد هەردی/ ٤٠ دەنگ
- محەمەد مەولوود/ ٣٥ دەنگ
- شوکور مستەفا/ ٣٣ دەنگ
- حوسێن عارف/ ٣٣ دەنگ
- سەعید ئاکام/ ٣٢ دەنگ
- مەمدووح بریفکانی/ ٢٨ دەنگ
- ئەحمەد غەفوور/ ٢٨ دەنگ
- جەلال دەباغ/ ٢٧ دەنگ
- عەبدولڕەزاق بیمار/ ٢٥ دەنگ

لە (١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٧١)دا کۆنگرەی دووەمی یەکێتی نووسەرانی کورد لە هەولێر بەسترا کە لە (١٤- ١٧) بەردەوام بوو.
لە (٣٠ی ئابی ساڵی ١٩٧١)دا یەکەم کۆنفرانسی یەکێتیی نووسەرانی لقی کەرکوك بەسترا، لە ئەنجامی هەڵبژاردن دەستەیەك هەڵبژێردرا، ئەوانیش لەناوخۆیاندا پۆستیان بەم شێوەیە دابەشکرد:-

١- شێخ ڕەئوف خانەقا، سەرۆك
٢- عوسمان مستەفا خۆشناو، جێگری سەرۆك.
٣- فوئاد تاهیر سادق، سکرتێر.
٤- ڕەزا شوان، ژمێریار.
٥- شێخ عەزیزی خانەقا، ئەندام.
٦- حوسێن بەرزنجی، ئەندام.

لقی هەڵبژێردراو، لەپاڵ بەرنامە ئەدیبە تەلەفزیۆنییەکەی سلێمانیدا ئەوانیش مۆڵەتی ئامادەکردنو پێشکەشکردنی بەرنـامـەیـەکـی تـەلـەفـزیـۆنـی مـانـگـانـەیـان وەرگـرت کـە لە تەلەفزیۆنی کەرکوکەوە پەخش بکرێ.
لە (٢١- ٢٢ی نـەورۆزی سـاڵی ١٩٧٢)دا لە شاری کەرکوك لەژێر دروشمی شیعرو نەورۆزو ئادار میهرەجانی یەکەمی شیعری کوردی سازکرا کە تێیدا جەواهیریو گەورە ئەدیبانی عێراق بەشداربیان تێداکرد.
لە (١٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٢) لەژێر دروشمی با وشەی کوردی پاك، چەکی تێکۆشانو پێشکەوتنمان بێ، لە بارەگای گشتیی یەکێتیی نووسەرانی کورد لەنزیك کۆشکی سپییەوە گیرا.
ڕۆژی (١٤ی شوباتی ساڵی ١٩٧٣)دا، هەر لەسەر بڕیاری کۆنگرە، دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی کۆبوونەوەیەکی لە بەغدا کرد کە نوێنەرانی گشت لقەکانیش ئامادەبوون، کۆبوونەوەکە لە چالاکیی سێ مانگی دوای کۆنگرە دواو چارەسەری بۆ هەندێك گیروگرفت دەستنیشان کردو چەند بڕیارێکی دا.
لەو سەردەمە شێخ عەزیزی خانەقا سەرۆکی لقی کەرکوك بوو، هەر لەو کۆبوونەوەیەدا نوێنەرانی لقی سلێمانی پەنجا دیناری بەشی خۆیان بە دیاری پێشکەش بە لقی کەرکوك کرد.
لە ساڵی (١٩٧٣)دا نەتوانرا کۆنگرەی چوارەم بگیرێت، چونکە ڕەوشی سیاسی بەرەو گرژیی دەڕۆیشت، لەلایەك هەندێ کێشە لەنێوان پارتیو حیزبی شیوعیدا ڕوویدا کە ئەمە ڕاستەوخۆ کاری کردبووە سەر ئەو ئەدیبانەی سەر بەو دوو حیزبە بوون، لەلایەکی تریشەوە نێوانی بەعسو

سەرکردایەتی سیاسی کورد رووەو ئالۆزی دەچوو، لە رۆژنامەی (التآخي)دا زنجیرە وتارێك دژ بە هەوڵەکانی بەعس بڵاوکرایەوە کە دەیانویست تۆمەت بدەنە پاڵ کورد بەمەبەستی پاشگەزبوونەوە لە خاڵەکانی رێکەوتننامەی ئادار، لەم رەوشەوە زنجیرەیەك لێك نووسین و ووتار لەنێوان (التآخي)و (الثورة)دا بەگەرمی دەستی پێکرد.

زۆرینەی ئەدیبی کورد ئاگاداری ئەو مەسەلە نەتەوەییە بوون و بەشداربوون تێیدا، رای گشتی لەگەڵ بۆچوونەکانی (التآخي)دا بوون.

لەگەڵ ئەم بارودۆخەشدا نووسەرانی کورد نەیانویست چیتر کۆنگرە دوابکەوێ، وەك بەرەنگارییەك بۆ فشارەکانی بەعس، دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەرانی کورد.

لە (١٠ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٤)دا کۆنگرەی چوارەم بڕیاردرا ببەسترێ، کۆنگرە لەکاتی دەستنیشانکراودا لە زانکۆی موستەنسریە لە بەغدا گیرا، ئەو کاتە د. ئیحسان فوئاد بەڕێوەبەری گشتی رۆشنبیریی کوردیی بوو.

دوای ئەوەی بەشێکی چاکی نووسەران و ئەدیبان چوونە شاخ و پاڵپشتی شۆڕشی کوردیان کرد، لە (گەلاڵە) کۆبوونەوەیەکی گشتی نووسەرانی کوردیان کرد لە شێوەی (پلینیومێکدا) بە سەرۆکایەتی (سالح یوسفی)، بۆ رێکخستنی کاری یەکێتیی و پڕکردنەوەی ئەو پۆستانەی کە خاوەنەکانیان نەهاتونەتە دەرەوە، پاشان یاداشتێکیان نووسی بۆ رووناکبیران و نووسەران و ئەدیبانی عێراق بە ناونیشانی (لەگەڵ کێن ئێوە؟).

لەدوای نسکۆی ساڵی (١٩٧٥)دا کە نووسەران گەرانەوە ئەو دەمە یەکێتیی نووسەرانی کورد مەرکەزییەتی نەمابوو، بەلام لقەکان، بەشێوەیەکی کاتیی لەلایەن دەسەڵاتەوە رێگەیان درابوو بە کارکردن و چالاکی، بەتایبەت کە ویسترابوو تێکەڵەیەك بن لەوانەی جێی مەترسی نین و ئەوانەش کە دۆستی حیزبی شیوعین، چونکە ئەو رۆژگارە بەعس و شیوعی بەرەیان هەبوو.

لقەکانی سلێمانی و هەولێرو دهۆك زۆر چالاك بوون و کۆڕیان دەبەست و میهرجانی ناوخۆییان بۆ شیعر خوێندنەوە رێکدەخست، بەوە دەچێت لەو ماوەیەدا لقی کەرکوك هیچ چالاکییەکی نەمابێت و لە کار کەوتبێت.

لە پایزی ساڵی (١٩٧٨)دا کۆنگرەی پێنجەم بەسترا کە بە کۆنگرەی (سەرکەوتن)ناوبرا.

لە (١٥- ١٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩١)دا کۆنگرەی حەوتەم لە شەقلاوە بەستراوە بە ئامادەبوونی مەسعود بارزانی و د. فوئاد مەعسوم و عەزیز محەمەد و کەریم ئەحمەد و سامی عەبدولرەحمان و سەرکردەکانی تری پارتە سیاسییەکانی کوردستان و چەندین کەسایەتی ناسراو.

٣٥کەس خۆیان پاڵاوت، هەڵبژاردن بەلیست نەبوو بەڵکو کراوە بوو کە هەر ئەندامێك بۆی هەبوو (١١)کەس بنووسێ واتا دەنگ بەیانزە کەس بدات کە دوای جیاکردنەوەی دەنگەکان بەم شێوەیە دەرچوو:-

١- د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، (١٢٧)دەنگ.
٢- فەلەکەدین کاکەیی، (١٢٤) دەنگ.
٣- عەبدولرەحمان فرۆری، (١٠٨)دەنگ.
٤- محەمەد موکری، (١٠٣)دەنگ.
٥- قوبادی جەلی زادە، (٧٩)دەنگ.
٦- محەمەد حەمە باقی، (٧٧) دەنگ.
٧- ئیدریس چەلکی، (٧٢) دەنگ.
٨- جەلال بەرزنجی، (٧٠) دەنگ.
٩- عەبدولرەقیب یوسف، (٦٣) دەنگ.
١٠- عەبدوڵڵا سەراج، (٦١) دەنگ.
١١- زاهیر رۆژبەیانی، (٦١) دەنگ.
١٢- سەعید ئاکام، (٦٠) دەنگ.
١٣- کەریم دەشتی، (٥٦) دەنگ.
١٤- نەژاد عەزیز سورمێ، (٥٢) دەنگ.
١٥- سەعدوڵڵا پەرۆش، (٥٢) دەنگ.
١٦- ئەبوبەکر خۆشناو، (٥١) دەنگ.
١٧- رەئووف بێگەرد، (٥١) دەنگ.
١٨- رێکا ئەحمەد، (٥٠) دەنگ.
١٩- حەمە کەریم هەورامی، (٥٠) دەنگ.
٢٠- نەوزاد رەفعەت، (٤٣) دەنگ.
٢١- حەسیب قەرەداغی، (٤٣) دەنگ.
٢٢- کەمال غەمبار، (٤٣) دەنگ.
٢٣- عەبدوڵڵا جوئدین، (٤٢) دەنگ.
٢٤- فوئاد قەرەداغی، (٣٩) دەنگ.
٢٥- عەبدولقادر سەرچناریی، (٣٧) دەنگ.
٢٦- ئازاد دڵزار، (٣٠) دەنگ.
٢٧- زاهیر ئەحمەد سەوز، (٢٩) دەنگ.
٢٨- ئەنوەر مەسیفی، (٢٩) دەنگ.
٢٩- خالید دلێر، (٢٤) دەنگ.
٣٠- تاڤگە ئەحمەد میرزا، (٢٤) دەنگ.
٣١- موحەمەد فەریق حەسەن، (٢٣) دەنگ.
٣٢- ئازاد عەبدولواحید، (٢٢) دەنگ.
٣٣- شەفیقە عەلی (لەیلان)، (٢١) دەنگ.
٣٤- جەلال خەلەف، (١١) دەنگ.
٣٥- غەیاسەددین نەقشبەندی، (٨) دەنگ.

پاش پرۆسەی ئازادی عێراق و گەرانەوەی زۆربەی نووسەرانی کورد بۆ شارەکەی خۆیان بۆ کەرکوك و دیسانەوە رێکخستنەوەی ماڵی نووسەرانی کورد لە کەرکوك، پێش ئەوەی کۆنفرانسی ئازادی لە ١٩ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا ببەسترێت لە هۆڵی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی کەرکوك بە ئامادەبوونی (١٢٥) نووسەری کەرکوکی، پێنج کەس هەڵبژێردران بۆ ئەندامی سەرەکی دەستەو دوو ئەندامی یەدەگ، کە بریتی بوو لە:- حەمە کەریم عارف، حەمە سەعید زەنگەنە، یوسف لەتیف، عەلی بەرزنجی، ئەحمەد تاقانە دوو ئەندام یەدەگەکە بریتی بوو لە:- جەلیل کاکەویس، فەیسەڵ هەمەوەندی لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٠)دا کۆنگرەیەکی تری نووسەران لە کەرکوك بەسترا، کە دەستەی کارگێری لقی نووسەرانی لە کەرکوك بەم جۆرە بوو:-

١- بورهان ئەحمەد، ٣٦ دەنگ، سەرۆك
٢- حەمە سەعید زەنگەنە، ٧٢ دەنگ، جێگری سەرۆك
٣- سەباح ئیسماعیل، ٣٩ دەنگ، بەرپرس بەشی پەیوەندییەکان
٤- نەوزاد شێخانی، ٥٦ دەنگ، بەرپرس دارایی
٥- ڕێبوار ڕەشید سەراب، ٤١ دەنگ، بەرپرسی کارگێری
٦- ستار ئەحمەد، ٣٧ دەنگ، بەرپرسی ڕۆشنبیری
٧- بەکر دەروێش، ٣٨ دەنگ، ئەندام
هەریەکە لە د. عەبدولکەریم محەمەد عەلی و فەیسەڵ هەمەوەندی وەکو ئەندامی یەدەگ دەرچوون.

* سەرچاوەکان:-
- یەکێتی نووسەرانی کورد، ڕێباز و هەڵوێست، مستەفا ساڵح کەریم، ٢١٠٢، لاپەرەی جۆراوجۆر.
- گۆڤاری گزنگ، ژمارە (١٠٦) لێکۆڵینەوەیەکی عەبدولستار جەباری لەسەر گۆڤاری گزنگ و کۆنگرەی یەکێتی نووسەران.

*** نووسەرانی شەقامی جمهووری**

ئازاد ئەحمەد ئەسوەد

کۆتایی ساڵانی حەفتای سەدەی بیست، کۆمەڵێ هاوڕێ بووین، لە سەرەتای تاڤ لاویماندا بووین، تەمەنی هیچ کامان لە بیست ساڵان تێنەئەپەڕی، تازە ئاشنایەتیمان لەگەڵ دنیای ئەدەبیات دا پەیدا کردبوو، سەرمەستی نەشئەی بڵاوبوونەوەی یەکەم بەرهەمی ئەدەبیمان بووین، کتێبخانەو چاپخانە ئەدەبییەکانی شار ئەگەڕاین بۆ بینین و ناسینی ئەدیب و هونەرمەندە ناسراوەکانی ئەو سەردەمە، فازڵ جاف، عەلی کەریم، جیهاد دڵپاك، جەلیل زەنگەنە، فهمی کاکەیی، محەمەد موکری، سەلام محەمەد، عەبدوڵڵا سەراج، ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، محەمەد عەبدولرەحمان زەنگنە، ئیسماعیل ڕۆژبەیانی، غەفور ساڵح، موعتەسەم ساڵەیی، حەسەن جاف، حەمە کەریم عارف و ئەحمەد کەریم زامداری برای..

کۆمەڵێ هاوڕێ بووین، خەونمان بە ئیستانبوڵ و ژیانێکی رامبۆیانەوە، کچە هیپییەکانی ئەورووپاوە ئەبینی. سەرمەستی گۆرانییەکانی داریوش و شڤان پەروەرو سێلدا باغچانی تورکی بووین. ژیان تامی شیرو هەنگوینی ئەدا، هەموو ڕۆژێکمان کەشفێکی نوێ بوو، وەکو نووسەرو ئەکتەری کۆمێدی ئەڵمانی کارڵ ڤالەنتین ئەڵێ: (تەنانەت پاشەڕۆژیش لە رابردوودا جوانتر بوو) لە ڕاستیدا چێژی ئەو ڕۆژانە، ئەوەندەی بۆ چێژو خۆشیی تاڤ لاوی ئەگەڕێتەوە، ئەوەندە بۆ بارودۆخی سیاسیی ناگەڕێتەوە. بە واتایەکی دی، بارودۆخی سیاسیی وڵات هەر چۆنێك بێ، هێندە کاریگەریی لەسەر تاڤ لاوی نابێ وەکو خۆشترین قۆناغی ژیان. ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە بریتی بوون لە، کەریم پەرەنگ، مارف عومەر گوڵ، جەمیل ئەمین، ئەحمەدی مەلا، مستەفا گەرمیانی، فایق سەعید، نەوزاد ئەحمەدئەسوەد، ئەدیب نادر، عەلی شێخ عومەر، نەجات حەمید ئەحمەد، ئیحسان حاجی غەفوور فەتاح، عزەدین مەجید (لەناو بزووتنەوەی کۆمونیستیدا ناسراو بە جەماڵ ئەیوب)، عەبدوڵڵا قادر دانساز، ئیبراهیم عەلی ئەحمەد (بڵندی شێوەکار)، گارا ڕەسووڵ، تاریق عەزیز (خەبات)، غازی عاسی زەندی و من هەندێ هاوڕێی تر.

هەر لەو سەردەمەدا نەجیبە ئەحمەد حەکیم و دڵپاك تاهیرمان ناسی، کە هەردووکیان تاقە دەنگی شیعریی ئافرەت بوون لە کەرکوك. دڵپاك لەپاڵ شیعر نووسین دا بێژەریش بوو لە تەلەفزیۆنی کەرکوك، بەڵام نەجیبە، کە ئەوسا دەنگێکی دیاری شیعری کوردی بوو لەگەڵ محەمەد حەمە باقی دا شیعری ڕۆمانسی و بوێرانەیان بۆ یەکدی ئەنووسییەوە، بەهۆی دابونەریتی کۆنەپارێزی خێزانەکەیەوە کە هاتووچۆی دەرەوەیان لێ قەدەغە کردبوو، بە دەگمەن هاتوچۆی کتێبخانەی ئاسۆی ئەکرد. تەنیا بۆی هەبوو هاتوچۆی چەمچەماڵ بکات کە لە یەکێك لە قوتابخانەکانیدا مامۆستا بوو. بەهۆی جەمیل ئەمینەوە کە دراوسێییان بوون، نامەو شیعرمان لەگەڵ نەجیبەدا ئەگۆڕییەوە.

لەبەر نەبوونی هیچ دامودەزگایەك و کۆمەڵەیەکی ئەدەبی یان هونەری یاخود ڕۆشنبیری لەو شارەدا، کتێبخانەو چاپخانەکانمان کردبووە شوێنی بەیەکگەیشتن و یەکتر ناسین و مشتومڕی ئەدەبی و سیاسیمان. بە ڕۆژ لە کتێبخانەی ئاسۆدا کۆ ئەبووینەوە، یان لە گازینۆی ئەسر دائەنیشتین، کە چاپخانەیەکی دوو نهۆمییەو ئەڕوانێتە سەر شەقامی جمهوری، ئەو شەقامەی دەمەو ئێواران تا شلوکوت ئەبووین، محەمەد ماغووت وتەنی، بە سەدان کیلۆمەتری کەلەکە کراو بەسەریا هاتووچۆمان ئەکرد، پاشان بەدەم فەلافل خواردنەوە بەرەو گازینۆی "ام الربیعین" کە ئەکەوتە نێو دارو درەختەکانی تەپەی مەلا عەبدوڵڵاوە، ئەڕۆیشتین. لەوێ تا نیوەشەو درێژەمان بە وتووێژی ئەدەبی و سیاسییەکانمان ئەدا، پاشان هەر بەپێ بە کۆمەڵ، بە شەقامە نیمچە تاریکەکانی شاردا ئەگەڕاینەوە. زۆر جاریش بەپێ بۆ عەرفە (پاریسی کەرکوکییەکان) ئەچووین، کە گەڕەکێکی مەسیحییەو ئینگلیزەکان لە ساڵانی سیی سەدەی ڕابردوودا خانووەکانیان لەسەر شێوازی خانووی ئینگلیزی بۆ کرێکارانی کۆمپانیای نەوت دروست کردبووو پەرژینی ماڵەکان لە دارو دەوەنی کورت، کە پێی ئەڵێن نینا، کرابوون. ئێوارانی هاوین کورو کچانی شار لە سێکند کلاس - ی عەرفە (نزیك ماڵی جان دەمۆ) کۆ ئەبوونەوەو ئایس کرێمیان ئەخواردو لە پارك و شەقامەکانی ئەوێدا پیاسەیان ئەکرد. بەپێی مۆدەی جلوبەرگی ئەو سەردەمە، زۆر بەمان کراسی گوڵ گوڵیی رەنگاورەنگ و پانتۆڵی چارلستۆنمان لەبەر ئەکرد کە ناوقەدی تەسك و دەرلینگی نیو مەتر پان بوو. زوڵف و قژمان درێژ ئەکرد، مۆدەیەك بوو (خەنافس)یان پێ ئەووت، لاسایی کردنەوەی تیپی مۆسیقای (بیتڵز)ی بەریتانی بوو. بەڵام هەندێ لە هاوڕێکانمان، جەمیل و فایق و مستەفاو نەوزادو عەزەدین زۆر جار جلوبەرگی کوردییان لەبەر ئەکرد، بەتایبەتی لە بۆنە ئەدەبی و هونەرییەکاندا کە بە زمانی عەرەبی بەڕێوە ئەچوون و ئامادەبووان لە هەموو نەتەوەکان بوون.

زۆربەیان، بۆ تەواوکردنی کەسێتیی شیعریمان، تووشی دەردەنازناو بووین، کەریم عەبدوڵڵا قادر نازناوی (پەرەنگ)ی هەڵبژارد، مارف عومەر (بەرزنجی) بوو، نەوزاد ئەسوەد (ئاوارە)بوو، دڵپاك تاهیر (کاوانی)، منیش ئازاد شەیدا، بەڵام خەبات عارف قەناعەتی پێ هێنام کە ناوەکەی خۆم کوردییەو پێویستیم بە نازناو نییە. ئەوانی دی، بە پێچەوانەوە، سەرەتا بە ناوی خۆیان ئەیاننوسی، دواتر نازناویان بۆ خۆیان هەڵبژارد، مستەفا محەمەد دواتر بوو بە گەرمیانی، فەخرەدین محێدین بوو بە ئەدیب نادر، ئەحمەد محەمەد مەلا عومەر بوو بە ئەحمەدی مەلا. دەرهێنەری سینەمایی حوسێن دواتر بوو بە سێودین، کە لەگەڵ سەباح کەریم دا وەکو دووانە هەمیشە پێکەوە ئەبینران.

ئەوەی ئێمەی لە ئەدیبە لاوەکانی دی جیا ئەکردەوە، وتووێژە ئەدەبییەکانمان هێمنانە بوو، بەخیلیمان نەئەکرد لە

دابەشکردنی ئەو زانیاری‌و رۆشنبیرییە هەژارەی هەمانبوو، تێبینییەکانمان لەسەر شیعری یەکدی رووخێنەرانە نەبوون، نەمانئەزانی رژدی‌و رق چییە، هەمیشە هانی یەکدیمان ئەدا. بەرامبەر بەو جیددی‌و خۆبەزلزان نەبووین بە پێچەوانەوە، وتوێژو گفتوگۆکانمان هەمیشە تێکەڵ بە گاڵتەو گەپ ئەبوو.. لەنێوان نەوزاد ئەسوەدو مستەفا گەرمیانی دا نهێنییەک هەبوو پەیمان پێ نەئەبرد، هەمیشە ستایشی شیعرو نووسینی یەکدییان ئەکردو لەگەڵ بەرهەمەکانی نووسەرانی جیهاندا بەراوردیان ئەکرد. تومەز ژێر بە ژێر رێک کەوتبوون ستایشی بەرهەمی یەکدی بکەن‌و یەکدی نەشکێننەوە. هەموومان لەو سەردەمەدا هەڵگری بیری چەپ بووین، بیری چەپیش لە حەفتاکان‌و، تەنانەت هەشتاکانیش دا، ئینجلی ئەدیب‌و رۆشنبیری کورد بوو، بەڵکو هێڵی سوور بوو کەس بۆی نەبوو بیبەزێنێ. ئەبوایە لە کۆتایی هەموو چیرۆکێکدا چینی پرۆلیتاریا سەرکەوتنی بەدەست بهێنایەو، لە کۆتایی هەموو شیعرێکیشدا خۆرێکی گەش هەڵبهاتایە، ئەگینا بەر نەفرەتی مارکسیستەکان ئەکەوت‌و بە شاعیر یان نووسەری وردە بۆرژوا، تەنانەت بە پیاوی ئیمپریالیزم تۆمەتبار ئەکرا. نازم حیکمەت‌و پابلۆ نێروداو فلادیمێر مایاکۆڤسکی‌و یەڤگینی یەفتوشێنکۆو گارسیا لۆرکاو لوی ئەراگۆن‌و پۆل ئیلوارمان ئەخوێندەوە، نەک وەکو تازەگەرێک، بەڵکو لەبەر ئەوەی کۆمونیست بوون. لەراستیدا ئەو بۆچوونە کرچوکاڵەی ئێمە بۆ مارکسیزم زیانی زۆری بە پێشکەوتنی ئەدەبیمان گەیاند. بەڵام لەو شاعیرانە، رامبۆو بۆدلێریشمان ئەخوێندەوە. بە ژیانە بۆهیمییەکەی رامبۆو، ڤان کۆخ سەرسام بووین، ئەو شێوە ژیانەی رامبۆمان بە ئاوات ئەخواست، وەکو ئەو بێ پارەو پووڵ، بە پێ‌و بە قاچاخ بە سواری شەمەندەفەرو کەشتی ئەم وڵات‌و ئەو وڵات بکەین.. ساڵانێک دواتر، زۆربەمان بەو ئەزموونەدا تێپەڕین.

ئەو ئەدیبانەی لەو سەردەمەدا لە شارەکانی دیبەوە ئەهاتن بۆ لامان، لە هەولێرەوە کەریم دەشتی‌و کەریم سۆڤی، کە لەگەڵ مارف دا خوێندکاری زانکۆ بوون لە بەغدا، ئەبووبەکر خۆشناو، کە تازە کۆمەڵە شیعری "کۆڵۆمبس کیشوەرێکی تر دەدۆزێتەوە" ی چاپ کردبوو، هەروەها کتێبێکی لەسەر ژیانی چێ گیڤارای لە عەرەبییەوە وەرگێڕابوو، ئەبوبەکر، گەرچی شیوعی نەبوو، بەڵام هەر لە رقی بەعسییەکان، بەشداریی لە ئاهەنگی ساڵیادی حیزبی شیوعی ئەکردو خۆی سەرخۆش ئەکرد. نەک هەر ئەوە، ساڵی (١٩٨٠) کاتێ خوێندکار بوو لە زانکۆی موستەنسریەی بەغدا، خوێندکارە فەلەستینییەکانی سەر بە بەرەی میللیی رزگاریخوازی فەلەستین (الجبهة الشعبیة لتحریر فلسطین) جەماعەتی جۆرج حەبەش، کە حیزبێکی مارکسی بوو، لەگەڵ خوێندکارە بەعسییەکان دا بەشەر هاتن، خۆشناو لایەنگیریی خوێندکارە فەلەستینییەکانی کرد. هەروەها لە هەولێرەوە فەیسەڵ دێهاتییش سەردانی ئەکردین. فەیسەڵ ئەیویست لاسایی وجودییەکان بکاتەوەو ژیانێکی بۆهیمییانە بژی.. بەڵام وجودییەت لای کورد، وەکو مەریوان وریا قانع ئەڵێ لە فەلسەفەوە بوبووە نەعل لە پێکردن‌و ریش درێژ کردن‌و جلوبەرگی شرو پۆخڵ لەبەرکردن..

لە کفرییەوە عەبدوڵڵا قەرەداغی زووزوو سەردانیی ئەکردین. عەبدوڵڵا قەرەداغی پرۆژەیەکی بەدەستەوە بوو کە شیعری هەموومان تەرجەمەی عەرەبی بکات. لەگەڵ (د. سەلاح خالس)ی سەرنووسەری گۆڤاری (الثقافة) رێککەوتبوون کە لە هەر ژمارەیەکدا مەلەفێک لەسەر یەکێک لە شیعری ئێمە بڵاو بکەنەوە. ئەوە بوو مەلەفێکیان لەسەر مارف عومەر گوڵ بڵاوکردەوە، ئیتر پاش ئەوە راگیرا.. قەیس قەرەداغییش ژمارەیەکی زۆر شیعری کوردیی تەرجەمەی عەرەبی کردبوو بریار بوو لە کتێبێکدا چاپی بکات.. لە سلێمانییشەوە خەبات عارف‌و جەمال غەمبار ئەهاتن.

خەبات عارف لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا دیارترین دەنگی شیعریی بوو لەناو نەوەکەی خۆیدا. ئێمە هەموو هەفتەیەک بەپەرۆشەوە چاوەرێی دەرچوونی هەفتەنامەی "بیری نوێ" مان ئەکرد، تا شیعری خەبات عارف بخوێنینەوە. ئەو هەر لەسەرەتاوە دەستبەرداری بنەما تەقلیدییەکانی شیعر بوو، وەکو کێش‌و سەرواو، هەروەها نوقم بوون لە رۆمانسییەتێکی هەرزەکارانە، کە ئەوساو ئێستاش، شیعری کوردیی ئیفلیج کردووەو رێی لە گەشەسەندنی گرتووە. خەبات لەو شاعیرە دەگمانانە بوو کە لە سەردەمێکدا پەخشانە شیعر، یاخود شیعری ئازادی ئەنووسییەوە، کە بە هیچ جۆرێ دەرچوون لە کێش بە شیعر دانەئەنرا. بەڵام خەبات سەلماندی، کە شیعر شیعرەو کێش‌و سەروا ناپێورێ. خەبات هەرچەندە بە ئینتیما شیوعی بووو بەدەر نەبوو لەو رەوتە باوە، بەڵام ئەو پتر گرنگیی بە هونەری شیعریی، بە شیعرییەتی دەق ئەدا وەک لە ئایدیۆلۆجیای سیاسی. شیعری وەکو "ئەمە خۆشەویستیی منە" نیکۆس بیلۆیانێس" سەمای مەرگ، ئەوسا ئەوین شیرین بوو وەک نیگای مەستی چاوەکانت، تاڵ بوو وەکو دوورکەوتنەوەت" تۆ چرایەکی ئازاری لەشەوانی تەنیاییمدا دائەگیرسێنی سەرسامی کردبووین بە تەکنیکە نوێکانی بە بینای رستەو وشە نوێکانی کە غەریب بوو بۆ ئەوسای شیعری کوردیی. شیعری کوردیی ئەوسا، تەنانەت ئێستاش، پڕە لە گوڵ‌و ئەستێرەو خۆرو باران‌و بەهارو رووبارو شەوو ئاسمان‌و عەشق‌و.. موفرەداتی شیعری کوردی لەو سنوورە بەرتەسکە تێناپەڕێ‌و، خەیاڵی شاعیری کورد لەوە زیاتر بڕ ناکات.

ساڵی (١٩٧٩) لە سلێمانی کۆڕێکی شیعری بۆ شاعیرە لاوەکان کرایەوە، کە جگە لە خەبات عارف، عوسمان شەیداو حەمە سەعید حەسەن‌و زۆر شاعیری دیش بەشدارییان تیا کردو، حەمە فەریق حەسەن کۆڕەکەی بەڕێوەی ئەبرد. لەو کۆڕەدا، بە پێچەوانەی زۆربەی شاعیران کە بە هاوارو قیرەقیر شیعریان ئەخوێندەوە، خەبات بە دەنگێکی زۆر هێمن و لە سەرخۆ، تەنانەت هەندێ جار بە چرپە، کە بە حاڵ گوێت لە دەنگی ئەبوو، شیعری خوێندەوە. بەپێی پێویست دەنگی بەرزیان نزم ئەکردەوە، بەڵام نەیئەقیراند. خەبات کاسێتێکی کۆڕەکەی بۆ ناردم، زۆر لە شاعیرانی کەرکوک لەبەریان گرتەوە. من ئەوەندە بە دەنگ‌و ئیلقای شیعریی خەبات کاریگەر بووبووم، لە کۆڕەشیعرییەکانمدا لاساییم ئەکردەوە.

سالّی (١٩٨٠) کۆمەلّەی هونەرە جوانەکانی کورد لە هەولێر کۆڕێکی شیعریان بۆ کردینەوە، کە جگە لە من، ئەنوەر مەسیفی ودلّپاك تاهیرو نزار خەیلانی و هەندێ شاعیری دیش بەشدارییان تیا کردو، عەبدولوەهاب تالّەبانی کۆڕەکەی ئەبرد بەڕێوە. ئازاد جندیانی لەسەر کۆڕەکەی نووسیو لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا بلاّوی کردەوە، تیایدا ئەلێ: بەرای من شیعرەکەی ئازاد ئەحمەد لە ڕووی شێوەو ناوەڕۆك و شێوازی خوێندنەوەدا باشترین شیعر بوو... سوپاس بۆ خەبات عارف کە فێری خوێندنەوەی شیعری کردم.

پێم وایە هاوینی سالّی (١٩٨٠)بوو خەبات، جارێك لەو جارانەی هاتووچۆی کەرکوکی ئەکرد، ڕێی کەوتە مالّمان. ئەو ژوورەی تیای دانیشتین پانکەی تیا نەبوو. خەبات، کراسە سپیەکەی بەری لەئارەقەدا خوسا. لەو دانیشتنەدا، کە نەوزاد ئەحمەد ئەسوەدی براشم ئامادە بوو، باسی شیعرو مارکسیزمو، گۆڕینی دنیامان ئەکرد! تاقە بابەتی حەفتاکان و هەشتاکان، هەروەکو خۆی لەم دواییەدا لە ئیمەیلێکدا بۆی نووسیم! ئەمویست بەهار بهێنمە بەر دەرگاتان...

ئێوارەیەکی هاوینی سالّی (١٩٧٩) لە کەرکوك، لەبەردەم کتێبخانەی ئاسۆدا لە شەقامی جمهوری، شێرکۆ بێکەسمان بینی، لەگەلّ فازڵ جاف و عەلی کەریم و محەمەد موکری و فەهمی کاکەیی و ئەواندا وەستابوو، سیگارێکی بە دەستەوە بوو، بە ڕوخسارێکی جددییەوە ئەیڕوانییە خەلّك و شەقام. ئێمەش، کۆمەلێ لاوی تازە هەلّچوو، تازە ئاشنا بە ئەدەب، شەیدای شیعری شێرکۆ. مارف عومەر گولّ، کەریم پەرەنگ، مستەفا گەرمیانی، جەمیل ئەمین، ئیحسان حاجی غەفور، نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، فایق سەعیدو من، بەشەرمەوە لەولاترەوە وەستابووین بە ئیعجابەوە تێمان ئەڕوانی، ڕووشمان نەئەهات بچینە لای، بەخێرهاتنی بکەین و خۆمانی پێ بناسێنین، مارف عومەر گولّ، چووە لای و داوەتی کرد، بەلاّم شێرکۆ زۆر بە ئەدەب و بە خەندەیەکەوە داوای لێبوردنی کردو، پاشان لەگەلّ فازڵ جاف و ئەوان بەرەو نادی بەرێکەوتن. ئەوە یەکەم و دوا جارم بوو شێرکۆ ببینم. ئەم هاتنەی شێرکۆم لە شیعری "ژیانێکی ڕامبۆیانە"دا تەوزیف کرد:

"ئەگەڕێمەوە حەفتاکان.
ئێوارەیەکی یەسینینی بوو، چرووت بەدەستێ، لە مارکیز ئەچوو، لەبەردەم کتێبخانەی ئاسۆدا وەستابوو.
وتیان ئەوە شێرکۆ بێکەسە. تەمێ ڕژایە ئەو ناوە. پەڕوتووکی فریشتە بارییە سەر شان و ملمان.

### * کەریم پەرەنگ:-

لەناو ئەو نەوەیەی ئێمەدا کە لە کۆتایی حەفتاکان دا لە کەرکوك سەریهەلّدا، کەریم پەرەنگ و مارف عومەر گولّ لە هەمووان دەرکەوتووترو پڕبەرهەمتر بوون. پەرەنگ لەپالّ شیعر نووسیندا لە عەرەبییەوە تەرجەمەی ئەکردو بابەتی ڕەخنەیی و ئەدەبیی بلاّوکردەوەو نۆپەرێتی بۆ منالاّن ئەنووسی، بەلاّم پتر وەك شاعیر ناسرا. خەیالّێکی شیعریی بەرفراوان، کوردییەکی پەتی و ڕەوان، هەتا سەر



ئێسقان کاریگەر بە زمانی توحفەی موزەفەرییەو ڕشتەی مرواری و ڕۆمانەکانی یەشار کەمالّ بە تەرجەمەی شکور مستەفا. لەوێوە نازناوێکی شیعریی دەگمەن و ناوازەی بۆ خۆی هەلّبژارد، پەرەنگ، واتە پشکۆ. هاوڕێتیی من و کەریم پەرەنگ بۆ هاوینی سالّی (١٩٧٨) ئەگەڕێتەوە، کاتی لەگەلّ کۆمەلێ هاوڕێدا لە کۆلاّن بە بێجامەوە وەستابووم، لاوێکی قۆزی لاوازو بالاّبەرز، سوورو سپی، بە ڕۆژنامەیەکەوە لێم نزیك بۆوەو وتی، تۆ ئازاد شەیدای؟ منیش ئەو کاتە تازە دەستم بە شیعر نووسین کردبوو، ئەو نازناوم بۆخۆم هەلّبژارد بۆ ئەوەی سیفەتێکی شاعیرانە بەخۆم بدەم! وتی: شیعرێکت لە پۆستەی خوێنەرانی پاشکۆی عێراق دا بلاّو بووەتەوە" شیعرەکەی بۆ خوێندمەوە، من لە خۆشییانا قاچم ئەلەرزی. بۆ چەندین شەو خەوم لێ نەکەوت، تەنانەت کاری لە وانەکانی قوتابخانەشم کرد. پێم وابوو ئیتر منیش ناوم کەوتە نێو ناوان، لەگەلّ شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەلّمەت و ئەواندا ناو ئەبرێم. ئیتر لەو ڕۆژەوە پەرەنگ بوو بە نزیکترین هاوڕێم. هەموو ڕۆژێ لە شۆڕیجەوە تا شەقامی جمهوری و کتێبخانەی ئاسۆ، بگرە تا عەرەفە بەپێ ئەچووین و بەپێ ئەهاتینەوە. هەرگیز نایەتە یادم جارێك لە جاران پێکەوە سواری تێمس بووبین، تێمس (یان پۆلۆنی) پاسێکی بچووك بوو لە دۆلّمشەکانی تورکیا ئەچوو (١٢ - ١٥) نەفەری ئەگرت، لە حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانیشدا ئامرازی گواستنەوەی سەرەکی بوو لە کەرکوك. مام ڕۆستەم و مامە ڕیشە لە حەفتاکان دا شوفێری تێمس بوون، پێش ئەوەی ڕوو لە چیا بکەن.

پەرەنگ لاوێکی زۆر قسەخۆش و نوکتەچی بوو. بەدەم ڕێوە لەسەر جادە بەدەنگی بەرز شیعری ئەم و ئەوی بە شێواوی بۆ ئەخوێندینەوەو بە پێکەنینی ئەمێناین، یان گۆرانیی ماملێی بۆ ئەووتین. جارێکیان من و پەرەنگ و مستەفا گەرمیانی و فایق سەعیدو نەوزاد ئەسوەد، لە شەقامێکی نزیك گازینۆی مەجیدییە ئەپەڕینەوە، فایق و مستەفا و نەوزاد هەرەمەکییانەوە دوور لە خەتی پەڕینەوە کە ئەوسا پەیڕەو ئەکرا، لە شەقام پەڕینەوە، پەرەنگ ڕووی لەمن کردو

وتی: (کوره ئەمانه زۆر شۆڕچەیین).

لەبەر ئەوەی پەرەنگ شیوعی بوو، لەگەڵ باوکما هەمیشه له کێشەدا بووم‌و داوای لێ ئەکردم دوور کەومەوه لێی. وشیاری برامی (که ئەوسا مێردمنالبوو) ڕاسپاردبوو به دزییەوه شوێن پێمان بکەوێ‌و چاودێریمان بکات. شەویش که ئەگەڕامەوه ماڵ شەڕی لەگەڵ ئەکردم.

له (١٩ی ئاداری ساڵی ١٩٧٩)دا یەکێتیی نووسەرانی کورد له بەغدا کۆڕێکی شیعریان بۆ کردینەوه. له کەرکوکەوه کەریم پەرەنگ‌و مارف عومەر گوڵ‌و ئەحمەدی مەلاو عەبدوڵڵا دارتاش‌و من بانگ کرابووین. ئەبوو دڵپاك تاهیریش بەشداریی بکات، بەڵام باوکی نەیهێشت بۆ بەغدا بچێت. هەروەها له شارەکانی دییەوه، مەوجود سامان‌و ئەبوبەکر خۆشناوو کەریم سۆفی‌و هەندێ شاعیری دیش بەشدارییان کرد. لەتیف هەڵمەت کۆڕەکەی بەڕێوەبردو دکتۆر عزەدین مستەفا ڕەسول، سەرۆکی ئەو کاتەی یەکێتیی نووسەرانی کورد، وتاری پێشەکیی لەسەر شیعری لاوان خوێندەوه. لەبەر ئەوەی یەکەم کۆڕی شیعری بوو له ژیانماندا هەموو شڵەژابووین، کەریم پەرەنگ تەنانەت پێش ئەوەی ناوی بانگ بکرێ، لەتیف هەڵمەت هێشتا خەریکی خوێندنەوەی پارچەیەك له شیعرەکەی ئەوبوو، خۆی گەیانده سەر سەکۆ. له کاتی شیعر خوێندنەوەشدا دەستی ئەلەرزی‌و لەگەڵیا کاغەزەکانی دەستی ئەلەرینەوه. منیش بەهەمان شێوه شڵەژابووم، ئاگام لەخۆم نەبوو چۆن گەیشتمه سەر سەکۆ، دەستم کرد به قیرەقیرو دەست ڕاوەشاندن، وامئەزانی ڕووبەڕووی پیاوانی ڕژێم وەستاوم‌و دەست ئەکەم به چاویانا. گوێم لێ بوو لەتیف هەڵمەت له پشتەوه به چرپەوه وتی: (تۆزێ هێواش، دەنگت داگره).

کەریم پەرەنگ لەو کۆڕەدا، که بەناوی عەبدولکەریم پەرەنگەوه بەشداریی کرد، یەکێك له جوانترین شیعری خۆی خوێندەوه، شیعری (خەونێکی تر له ڕەشماڵەکەی زەرێدا). بەڕای هەمووان، شیعرەکەی پەرەنگ‌و مارف عومەر گوڵ جوانترین شیعری ئەو کۆڕه بوون. کەریم دەشتی بابەتێکی به عەرەبی لەسەر کۆڕەکەی نووسی و له ڕۆژنامەی (العراق) دا بڵاوی کردەوه، هەمان ڕای دەربڕی. ئەحمەدی مەلا لەو کۆڕەدا، که بەناوی تەواوی خۆی (ئەحمەد محەمەد مەلا عومەر) بەشداریی کرد، شیعری "ئەحمەد ئاغا"ی خوێندەوه، که لەسەر ئەو کرێکارانه بوو بەیانیان زوو لەمەیدانی ئەحمەد ئاغای ناوجەرگەی شاری کەرکوك کۆئەبوونەوه تا خاوەن کارەکان بێن‌و بیانبەن بۆ کار، بەڵام زۆربەیان بەنائومێدی ئەگەڕانەوه. ئەبوبەکر خۆشناو، بەریش‌و کاسکێت‌و کراسێکی خاکییەوه که هەر له چێ گێڤارا ئەچوو کۆمەڵێ شیعری کورتی خوێندەوه، لەوانه شیعرێك بۆ کەرکوك، لەو بارودۆخه سیاسییه دژوارەدا هاواری ئەکرد: بۆنی بێدەنگی ناخۆشه ئەی شاری ژان. خۆشناو زۆرترین چەپڵەی بۆ لێدرا. ڕاو بۆچوونه ڕەخنەییەکانی کەریم پەرەنگ لەسەر شیعرەکانی ئێمه یاخود شیعری کەسانی دی جێگەی بایەخ بوو. بۆ وێنه سەلاح شوان له شیعری " شەوێك له شەوانی سیمرخ"دا ئەڵێ" ئەمشەو سێ شەوه بەتەنیام" پەرەنگ ئەیووت بۆچی سێ شەو؟ ئەو پێی وابوو ژمارەکه هەرەمەکییەو قابیلی گۆڕینه، ئەمەش له بەهای شیعرکه کەم دەکاتەوه. یەکێکی دیش لەو تێبینییه گرنگانەی پەرەنگ، وتی شاعیری کورد بووسکی پەیامەکەی ئەهێڵێتەوه کۆتایی، به شێوەیەکی دی، شاعیری کورد شیعرێکی تەواو لەسەر وێنەیەك یاخود دێڕێکی جوان بنیات ئەنێ.

کەریم پەرەنگ ساڵی (١٩٨٠)، شەڕی عێراق – ئێران تازه دەستی پێ کردبوو، لەگەڵ ئەدیب نادردا وڵاتیان بەجێهێشت‌و بەرەو تورکیا و بولگاریاو ڕۆمانیا بەڕێ کەوتن، بەڵام ئەدیب غەریبیی کەرکوکی ئەکرد، خۆی بۆ نەگیراو پاش دوو مانگ گەڕایەوه. پەرەنگ له کۆتایی ئەو ساڵەدا خۆی گەیانده نەمساو تا ئێستاش لەوێ له ڤیەنای پایتەخت ئەژی.

*** مارف عومەر گوڵ:-**

مارف عومەر گوڵ، سەرەتا به ناوی (مەعروف عومەر



بەرزنجی)یەوه بەرهەمه ئەدەبییەکانی بڵاوئەکردەوه، بەڵام لەبەر ئەوەی نووسەرێکی تر هەبوو به ناوی عومەر مەعروف بەرزنجی، له مارفی خۆمان بەتەمەنترو ناسراوتر بوو، ئەمەش جێی چەواشەی خوێنەرو ئەدیبان بوو، بەتایبەتی کاتێ ئەچوو بۆ (دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی) له بەغدا بۆ وەرگرتنی موکافەئەی بەرهەمه بڵاوکراوەکانی، نەیان ئەدایەو وایان ئەزانی هی (عومەر مارف بەرزنجی) یە، هەروەها عومەر مارف بەرهەمەکانی خۆی له میدیاکانی حیزبی شیوعیدا بڵاو ئەکردەوه، مارفی لەمەڕ خۆشمان کاتێ بابەتێکی بۆ ڕۆژنامەی برایەتی ئەنارد، که هی پارتی بوو، بۆیان بڵاو نەئەکردەوه، به عومەر مارف بەرزنجیی تێگەیشتبوون. لەبەر ئەم هۆیانه مارف دەستبەرداری ناوی هۆزەکەی بوو و ناوی باپیری بەکارهێنا، (سەی گوڵ)، بەم

جۆرە بوو بە مارف عومەر گوڵ. مارف زۆری حەزی لە پیاسە ئەکرد، هەمیشە بەدەم ڕێوە گۆرانییەکانی مامڵێی ئەوتەوە، نوکتەو سەربوردەی ئەدیبانی کوردو عەرەبی بۆ ئەگێرایەوە، کە بۆ ئێمە بینینیان خەون بوو. مارف ئەوسا دەنگێکی شیعریی دیار بوو لە کەرکوك، لەپاڵ شیعردا خەریکی نووسینی بابەتی ئەدەبیو هونەریی بوو لەسەر مۆسیقاو سینەماو شتی دیش، لەوانە، بابەتێك لەسەر گۆرانییەکانی حەسەن گەرمیانی لە کۆتایی ساڵانی نەوەت دا مارف لە بەلجیکا بوو، من لە سویسراوە پەیوەندیم پێوە کرد، کە داوای ناونیشانەکەمی کرد، وتم بنووسە: سویسرا - ئازاد ئەحمەد! لەڕاستیدا ئەوە ئاماژە بوو بۆ بابەتێکی مارف کە ساڵی (١٩٧٧) لەسەر مردنی چارلی چاپلن لە گۆڤاری بەیان بڵاوی کردەوە بە ناوی "سویسرا" چارلی چاپلن" چاپلن کە دوا ساڵەکانی ژیانی لە سویسرا بەسەربرد، ئەوەندە بەناوبانگ بوو، هێندە بەس بوو هەوادارانی لەسەر زەرفی نامەدا بنووسن: سویسرا - چارلی چاپلن بۆ ئەوەی بگاتە دەستی! مارف لە ناوەڕاستی هەشتاکان دا کۆمەڵە شیعرێکی بەچاپ گەیاند بەناوی (هێلانەی نغرۆ). ساڵی (١٩٨٦) ڕووی لە شاخ کرد، پاشان خۆی گەیاندە ئۆکرایناو لەوێ بڕوانامەی دکتۆرای لەسەر جینۆسایدو ئەنفال هێنایەوە. پاش تەواو کردنی خوێندن وەکو پەنابەرێك ڕووی لە بەلجیکا کرد. لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا گەڕایەوە بۆ وڵاتو ئێستا ڕاگری کۆلیجی یاسایە لە زانکۆی سلێمانی.

ساڵی (١٩٨٤) زاهیر ڕۆژبەیانیو مارف عومەر گوڵو من، لە دانیشتنێکی ئەدەبیدا لە ماڵی زاهیر، لەژێر کاریگەریی شیعری ئەدۆنیسو، پاش قەناعەتێکی پێشوەختو گفتوگۆکردن لەو بابەتە، بڕیارمان دا گۆڕانکاری بەسەر فۆرمی شیعرەکانمان دا بێنینو دەسبەرداری خاسیەتە تەقلیدییەکانی شیعر بین وەکو کێش ولیریکیەتو وشە باوەکانی ناو شیعری کوردیی ئەو کاتە. زاهیر لەو دانیشتنەدا وەکو ڕەخنەگرێك دەوری مێنتۆری ئەبینی. بەڵام مارف ڕای لەگەڵ ئێمەدا جیاواز بوو و پێی وابوو ئەکرێ بە هەمان خاسییەتەکانی ئێستای شیعر داهێنان بکرێ. مارف هەتا ئێستاش لەسەر هەمان ئەو ڕایە ماوە، ئێستاش کە شیعرێك لە ڕووسییەوە بە کێشو سەرواوە وەرئەگێڕێ لە پەراوێزدا ئەنووسێ: بە شیعرەوە وەرمگێڕاوە!

### * ئەحمەدی مەلا

ئەحمەدی مەلا لە گەڕەکی عەرەسەوە ئەهاتە لامان، لاوێکی باڵابەرزی ڕەشیق، سمێڵ ڕەشو قژ لوول، پتر کاریگەر بوو بە ئەدەبی عەرەبیو، بەتایبەتی لەژێر کاریگەریی سەیابدا شیعری ئەنووسی. ئەحمەد سەرەتا بە زمانی عەرەبی دەستی بە نووسین کرد، هەندێ شیعرو تەرجەمەی لە ڕۆژنامەی (الراصد)ی بەغدادی بڵاو کردەوە، لەوانە چەند شیعرێکی لەتیف هەڵمەتی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی. پاشان لەگەڵ لێدانی شیوعییەکان دا ساڵی (١٩٧٩) ئەو ڕۆژنامەیەش داخرا.

ئەحمەد لاوێکی زۆر قسە خۆشو نوکتەچی بوو. ساڵی



(١٩٨٠) لە پەیمانگای نەوت دا خوێندکار بووین، ئەبوو پاش تەواو کردنی ساڵی یەکەم، سێ ساڵ پراکتیك بکەین لە کۆمپانیای نەوت، پاشان ساڵی دووەمی خوێندن تەواو بکەینو دیپلۆما وەربگرین. ساڵی یەکەممان بوو، لە ئەحمەدمان پرسی چی وەڵامی خەڵك بدەینەوە گەر لێیان پرسین" خەریج چین" ئەحمەد وتی: ئەڵێین" خەریك مەعهەدین" جارێکیان لە بەغداد، منو ئەحمەدی مەلاو سەباح شەریف (کە دواتر لە سویسرا بوو بە نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، لەناو پاسێکی (١٨) نەفەری دا لە (باب الشرجی)یەوە بۆ ئەعزەمییە ئەچووین، لەڕێ مایینێکمان بینی، ئەحمەدو سەباح کەوتنە مشتومڕی ئەوەی ئاخۆ مایین ئەزێ یان نازێ، ئەحمەد بە دەنگێکی بەرز وتی: نازێ، نازێ.. کاکی شوفێر وتی" نازل؟ یەکسەر پاسەکەی ڕاگرت، پێی وابوو دابەزین هەیە، پاشان کە بۆی دەرکەوت دابەزین نییە کەوتەوە ڕێ، ئەحمەد وتی: کورە بابە ئەزێ!.

هاوینی (١٩٨٠) کاتێ خوێندکاری ئامۆژگای نەوت بووین، منو ئەحمەدی مەلا لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك - تەرکیزی کۆن، لە بابەگوڕگوڕ پراکتیکمان ئەکرد، شەوان بە پێ، بە سەفەرتاسەوە، بۆ عەرەفە ئەچووینو لای چوار شمشێرەکە یەکمان ئەگرتەوە، لە دوورەوە گوێمان لە شووتی شەمەندەفەری کۆمپانیا ئەبوو ئەهات کرێکارانی دەوامی ڕۆژی ئەهێنایەوەو ئەبرد بۆ دەوام. ئەم دیمەنە لە ڕۆمانی "زاکیرەی با" ی ئەحمەدی مەلاو، لە شیعرەکانیشیدا ڕەنگی داوەتەوە.

کە بووین بە سەرباز، منو ئەحمەدی مەلا پێکەوە لە (٥/ ١٢/ ١٩٨٠)دا بە نابەدڵی بەرەو خان بەنی سەعد - دیالە بەڕێ کەوتین. لەبەر ئەوەی چەند هەفتەیەك لە سەربازیی دوا کەوتبووین، لە مەعەسکەر دووچاری سووکایەتییەکی زۆر بووین. پاش ئەوەی بۆ بەغدایان نەقل کردین بە چوار مانگ،

ئەحمەدی مەلا هەلات. منیش سالێك پاش ئەوە هەلاتم، ئەحمەد بۆ دەرەوەی ولات، منیش بۆ ناو هێزی پێشمەرگە. ئەحمەد هەتا لە کەرکوك بوو شاعرێکی تەقلیدیو کەم بەرهەم بوو، رەنگە باشترین شیعری لەو سەردەمەدا شیعری "ئەحمەد ئاغا" بێ کە سالی (١٩٧٩) لە کۆڕە شیعرییەکەی بەغداد خوێندیەوە. بەلام پاشان، لە کۆتایی هەشتاکان دا، کۆمەلە شیعری "زەردك" ی لە سویسرا بلاوکردەوە. زەردك لە راستی دا موفاجەئەیەکی شیعری بوو بۆ ئەو کاتە، شیعری مۆدێرین بوو بە هەموو مانای وشە، زیرەکانە سوودی لە ئەزموونی رامبۆ، بەشێوەیەکی کەمتریش ئەدۆنیس بینی. ئیدی نەشیعری ئەحمەدی مەلا، نەشیعری کوردی بە گشتیی، وەکو خۆی نەمایەوە. پەخشانە شیعری کوردی، گەر هەبووبێ، لە زەردکەوە گۆڕانیکی رادیکالیی بەسەردا هات، بەکارهێنانی موفرەداتی گەرمیانیو وشەی (ناشیعری) کە تا ئەو کاتە قەبوول نەئەکرا، زمانێکی تایبەت، دوور لەو بازنە تەسکەی شیعری کوردیی تیا نوقم بووبوو، رستەی درێژو یەك لەدوای یەك بێ بەکارهێنانی خالبەند، مامەلەیەکی تایبەتو جیاواز لەگەل کەلەپوور، ئەمانەو گەلێکی دی لە خاسیەتە نوێکانی زەردك بوون.

ئەحمەدی مەلا سالی (١٩٨١) لەگەل سەباح شەریفو مستەفا گەرمیانی دا هەلاتن بۆ ئێرانو پاشان بۆ سویسرا. ئەحمەد پاش ئەوەی حەوت سال لە شاری جنێڤ مایەوە، بۆ خوێندن رووی لە فەرەنسا کردو بروانامەی دکتۆرای لەوێ هێنایەوە. ئێستاش لەگەل خێزانە ئیسپانییەکەیدا لە ئیسپانیا ئەژی.

*** جەمیل ئەمین**

**باوکی روحیی هاورێیانی شەقامی جمهوری**

هاورێتیی منو جەمیل ئەمین بۆ ناوەراستی حەفتاکان ئەگەرێتەوە، کاتێ قوتابیی قۆناغی ناوەندی بووین لە ئامادەیی شۆڕیجەی کوران. جەمیل لەناو یەکێتیی قوتابیانی کوردستان دا کەسی دووەم بوو لەدوای فازل عوسمان. بەیانییەکیان، کاتێ لەگەل کۆمەلێ هاورێ دا لە گۆرەپانی قوتابخانە وەستابووم، نوورەدین چاوشین، کە یەکێك بوو لە ئەندامانی یەکێتیی قوتابیان، هاتە لامەوەو وتی تۆ ئازاد ئەحمەدی؟ وتم بەلێ، وتی زەحمەت نەبێ لەگەلما وەرە بۆ بارەگا. مەبەستی بارەگای یەکێتیی قوتابیان بوو لە قوتابخانەکەمان. من زراوم چوو! گەرچی یەکێتیی قوتابیان بارەگایان بەئاشکرا هەبوو بەلام زۆربەی ئەندامنیان، لە بەرەبەری شۆڕشی (١٩٧٤)دا، لە ترسی رژێمی بەعس بە نهێنی کاریان ئەکردو تەنانەت هاتوچۆی بارەگاشیان بە شێوەیەکی ئاشکرا نەئەکرد. لە راستیدا ترسی من تەنیا لە رژێم نەبوو، بەلکو پتر لە باوکم بوو کە هەمیشە هەرەشەی لێ ئەکردین توخنی سیاسەت نەکەوین!. کاتێ چووینە ژوورەوە، جەمیل ئەمین لەوێ بوو، وتی ئەمە خۆی نییە. لەراستیدا ئەوان بەدوای ئازاد ئەحمەدی برای نەوزاد ئەحمەد داودەی گۆرانیبێژدا ئەگەران.

ئەوەندەی پێ نەچوو شۆڕشی (١٩٧٤) دەستی پێ کردو، جەمیل ئەمین لەگەل ئیحسان حاجی غەفور فەتاحو فازل عوسمانو نوورەدین چاوشینو ئەکرەم حەسەن بازیانیو ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانو مامۆستایان پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کرد، بەرادەیەك قوتابخانەیان چۆل کرد کاری لە وانەکانیشمان کرد. بەلام شۆڕش دەستخەرۆی کردنو ئەو پێشوازییەی لێ نەکردن کە شایانی بوون، تەنانەت ناویان قوتابیان نابوو" هێزی جێگرو نانخۆر"! پاش توانەوەی شۆڕشو گەرانەوەیان بۆ شار، جەمیلو ئیحسان بیری چەپیان هەلگرت. ئیحسان پەیوەندیی بە حیزبی شیوعی عێراقییەوە کرد، بەلام جەمیل وەك مارکسییەکی سەربەخۆ مایەوە.

لە کۆتایی حەفتاکان دا پەیوەندیمان توندوتۆلتر بوو، هەموو رۆژێك یەکمان ئەبینی. لەناومان دا تەنیا جەمیل خۆی لە قەرەی نووسین نەئەدا. بەلام جەمیل رۆشنبیرێکی ئینسایکلۆپیدیایی بوو، شارەزایی لە هەموو بوارێك دا هەبوو، لە ئەدەبو هونەرەوە بیگرە تا مێژووی حیزبە سیاسییەکانی عێراقو شۆڕشەکانی جیهان. هەموو ژمارەیەکی رۆژنامەو گۆڤارە ئەدەبییەکانی ئەخوێندەوەو ئەیپاراستن، گۆڤاری بەیان، رۆژی کوردستان. رۆشنبیری نوێ، رۆژنامەی هاوکاری، هەفتەنامەی پاشکۆی عیراق. لە هەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکی ئەدەبیو پیشانگایەکی شێوەکارییو نمایشێکی شانۆیی دا، کوردی بوایە یان عەرەبی، ئامادە ئەبوو. جەمیل کاریگەریی لەسەر هەموومان هەبوو، هەموو گوێمان لێ ئەگرت. جەمیل کەسێك بوو بە کێشی لەشولار پەنجا کیلۆ گرام نەئەبوو، بەلام لاوێکی قۆزو سەرنجراکێش بوو. ریشێکی تەنکی دانابوو هەر لە داریوش ئەچوو. کەسێکی زۆر هێمنو لەسەرخۆ بوو، هەرگیز دەنگی هەلنەئەبری، هەرگیز نەیئەزانی توورەیی چییە، نەیئەزانی رقو کینە چییە، هەموومانی وەکو یەك خۆش ئەویست. ئێمە لەوەوە فێر بووین یەکدیمان خۆش بوێت. بەرهەمەکانمان پێش بلاوکردنەوە بۆ یەکدی ئەخوێندەوەو سەرنجو تێبینیمان لە یەکدی وەرئەگرتو یەکدیمان هان ئەدا بێ ئەوەی هەست بە رژدی بکەین بەرامبەر بەیەك، بێ ئەوەی کێبرکێ بکەین. لەراستیدا ئەوەی هاتوچۆی کتێبخانەی ئاسۆی کردبێ، ئەوەی لە شەقامی جمهوری لەگەل جەمیل ئەمین دا پیاسەی کردبێ مەزنیو میهرەبانیی ئەو مرۆڤەی بۆ دەرکەوتووە. جەمیل ئەمین بووەتە بەشێکی گرنگو دانەبراو لە ژیانمان، باوکی روحی ئەوەی ئێمە بوو.

لە کاتێکدا ئێمە بە چاوی حیزبی شیوعیی عێراقییەوە ئەمانروانییە مارکسیزم، جەمیل جۆرێکی دیی لە مارکسیزم بێ ناساندین. لە کاتێکدا ئێمە زۆربەمان پەیوەندیمان کرد بە کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستانەوە (کە ئەوسا ناوی کۆمەلەی مارکسی – لینینیی کوردستان بوو) لەبەر ئەوەی هەم مارکسیزمو هەم بیری نەتەوایەتیی پێکەوە گرێدەدا جەمیل وای نەکرد، ئەو وەکو ئێمە هەرزەکارو نەتەوەچیو هەلەشە نەبوو، وەکو ئێمە بە سادەیی لە مارکسیزم نەگەیشتبوو، بەلکو بە قوولیو هێمنی بیری ئەکردەوە. مەسەلەی ئینتیما نەبوونی جەمیل بە هیچ لایەنێکەوە بۆ ئێمە لوغزێك بوو چەند سالێك دوای ئەوە بۆمان کرایەوە. هەر لە رێی جەمیل

ئەمینەوە، نەجمەدین فاتیح شکورمان ناسی، کە دواتر لەناو هێزی پێشمەرگەدا بە شێروان ناسرا. شێروان لە ڕێکەوتی (٥/ ٣/ ١٩٨٢) لە گوندی قازانی نزیك ئۆردوگای پیرەمەگروون لەگەڵ ئەنوەر حەسەنی سەرکردەو ١٠ پێشمەرگەی دیی تیپی ٢١ی کەرکوك لە شەڕێك دا لەگەڵ جاشەکانی قالە فەرەج بە پاڵپشتیی کۆپتەری جەنگی، شەهید کران. لەو شەڕەدا، وەك ئەگێڕنەوە، شەهید شێروان قالە فەرەجی پێکاو برینداری کرد، لە خۆشیی دا حەماس گرتیو هەستایە سەرپێو وتی: کوشتم! لەو ساتەدا بە فیشەکی جاشەکان ئەپێکرێو شەهید ئەکرێ. پاش شەهیدبوونی شێروان، ڕێکخراوی (کارگەران)، کە ڕێکخراوێکی مارکسی بوو لەناو ڕژێم و هێزی پێشمەرگەشدا بە نهێنی کاریان ئەکرد، بەیانێکیان لەسەر دەرکردو شەهید شێروانیان وەکو ئەندامێکی سەرکردایەتیی خۆیان ناساند. ئەو ڕێکخراوە، لەسەرەتای شۆڕش دا بڕیاریان دا بەنهێنی لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان دا خەبات بکەن. یەکێتی کە ئەوسا ڕێکخراوێکی نیمچە بەرەیی بوو، جگە لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانی کوردستان، خەتی گشتیی لە خۆ گرتبوو بۆ کەسانێك نە کۆمەڵە بوون نە شۆڕشگێڕان، بەڵکو بێلایەن بوون. ڕێکخراوی کارگەرانیش کە ئەوسا یەکێتییان وەکو لایەنێکی پێشکەوتنخواز ئەناساند پێیان وابوو ئەکرێ لەناو هێڵی گشتیی دا بەنهێنی درێژە بە خەبات بدەن لە دژی ڕژێمی بەعس. ژمارەیەکی بەرچاوی ئەندامیان هەبوو لەناو یەکێتی دا بە نهێنی کاریان ئەکرد، لە هەموویان ناسراوتر نەجمەدین فەقێ عەبدوڵڵا بوو کە لە گۆڤاری "کۆمەڵە" دا لێکۆڵینەوەی ئابووریو سیاسیی بەپێزی بڵاو ئەکردەوەو، چەند کتێبێکیشی لەسەر تەعریبی کەرکوك و شتی تر بەچاپ گەیاند. بەڵام هەر ساڵێك پاش ئەوە، یەکێتی خەتی گشتیی نەهێشت و بەوەش جێگە بە بیروباوەڕی جیاواز لێژ کرا.

لەوەوە بۆمان دەرکەوت جەمیل ئەمین پەیوەندیی بە کارگەرانەوە کردووە، بەڵکو ئەشێت یەکێك بێت لە دامەزرێنەرانی ئەو ڕێکخراوە، گەر پەیوەندیی تایبەتیی نێوان خۆیو نەجمەدین فاتیح (شەهید شێروان) لەبەرچاو بگرین. جگە لەوە، لە گفتوگۆ سیاسییەکانمان دا هەمیشە یەکێتیی وەکو لایەنیکی پێشکەوتنخواز وەسف ئەکرد گەرچی ئینتمای پێوە نەکردبوون، هەروەها وەسف کردنی حیزبی شیوعیی عیراقی بە حیزبێکی تەحریفیو، بەرگری کردنی لە (مارکسیزمی ڕاستەقینە). لە ناوەڕاستی هەشتاکان دا لەگەڵ شەهید ئازاد هەورامی دا باسی جەمیل ئەمینمان کرد، بەو پێیەی هەورامی هاوڕێیەکی نزیکی جەمیل و شەهید شێروان بوو، هەورامی وتی کە جەمیل سەر بە ڕێکخراوی کارگەرانە. کاتێ ئەم قسەیەی ئازاد هەورامیمان بە جەمیل گەیاند، نکۆڵی لێ نەکرد، بەڵکو بەرگریی لە بیروباوەڕی خۆی کردو پاساوی بۆ هێنایەوە. پاش نەمانی کارگەران، ڕەوتی کۆمۆنیستی سەری هەڵدا، جەمیل ئەمین، پێم وایە، یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی ئەو ڕەوتە، کە دواتر بوو بە حیزبی کۆمونیستی کرێکاری. بەڵام جەمیل مارکسییەکی سەرسەخت و توندڕەو نەبوو، بەتایبەتی لەم دە ساڵەی دوایی دا، بەڵکو کەسێکی واقیعیو پراکتیکی بوو هەمیشە بە قووڵیو هێمنی بیری ئەکردەوە.

جەمیل ئەمین لە (١٧/ ٨/ ٢٠١١) بە نەخۆشیی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد.

*** مستەفا گەرمیانی**

هەر لەو سەردەمەدا مستەفا گەرمیانیمان ناسی، لاوێکی ئیسکانیی ڕووخۆش و هەمیشە لێو بەخەندە، چوست و



گەشبین و پڕ خۆزگەو ئاوات، تازە دووچاری یەکەم ئەزموونی خۆشەویستی بووبوو لەگەڵ مەهاباد قەرەداغی. تازەش دەستی بە شیعر نووسین کردبوو. شیعری ڕۆمانسیی نزار قەبانی ئاسای بۆ مەهاباد ئەنووسی، مەهابادیش هەمان شێوە شیعری بۆ مستەفا ئەنووسی. مستەفا، بە پێچەوانەی زۆربەمان کە پەتای نازناو گرتبوومانی، بە ناوی خۆی، مستەفا محەمەد ئەینووسی. شیعرەکانی بە زۆری لە هەفتەنامەی (پاشکۆی عێراق)دا بڵاو ئەکردەوە. زۆربەی شیعرەکانی مستەفا لەلایەن نوورەدین محەمەد سەعیدەوە تەرجەمەکرانە عەرەبیی ولە ڕۆژنامەی (العراق)دا بڵاوکرانەوە. نوورەدین لاوێکی کەرکوکیی بوو خوێندکاری ماستەر بوو لە بەشی سۆسیۆلۆجیا لە زانکۆی بەغداد، لە ناوەڕاستی هەشتاکان دا لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبیل لە ڕێگەی نێوان کەرکوك - بەغداد گیانی لەدەست دا. مستەفا گەرمیانی ساڵی (١٩٨١) لەگەڵ ئەحمەدی مەلاو سەباح شەریف هەڵاتن بۆ ئێران و لەوێوە خۆیان گەیاندە سویسرا. پاشان مستەفا لە سەرەتای نەوەتەکان دا ڕووی لە سوید کرد. لە پاش ڕووخانی ڕژێمی سەدام گەڕایەوە کەرکوك، تا لە زنجیرە

تەقینەوە تێرۆیستییەکەی ڕۆژی (١٦/٧/ ٢٠٠٧)ی کەرکوك دا شەهید بوو.

*** (فایق سەعید)**

کە فایقمان ناسی تازەماڵیان لە (ڕومادی)یەوە هاتبۆوە



کەرکوك، هەر لەوێش چووبووە بەر خوێندن، بۆیە زمانە عەرەبییەکەی لە کوردییەکەی باشتر بوو، هەندێ شیعری لەتیف هەڵمەتو مارف عومەر گوڵی وەرگێڕایە عەرەبی. ئەو کاتە بەناوی خۆی باوکی، (فایق عەبدولکەریم)ەوە بەرهەمەکانی بڵاو ئەکردەوە. پاشان کاتێ لە سەرەتای ساڵانی نەوتدا ڕووی کردە سوێدو، زانکۆی لەوێ تەواو کردو پیشەی مامۆستایی گرتەبەر، ئیتر بە تەواوی پشتی لە ئەدەبیات کردو کاتی خۆی بۆ بواری پەروەردە تەخان کرد، گەرچی وەرگێڕانی ئەدەبییشی کردووە، لەوانە ڕۆمانی "یەکەمین مامۆستا"ی جەنگیز ئیتماتۆڤ.

فایق پێم وایە بەهۆی سیاسەتی تەعریبو ڕاگواستنیان بۆ ڕومادی، ڕوحی کوردایەتیی لە هەموومان بەتینتر بوو. لە زۆربەی بۆنە ئەدەبیو هونەرییەکانی شاری کەرکوك دا کە هەمووی بە زمانی عەرەبی ساز ئەکرا، فایق وەکو تەحەددایەك جلی کوردیی لەبەر ئەکرد. ساڵی (١٩٧٩) کۆڕێکی شیعری بۆ شاعیری فەلەستینی خالید عەلی مستەفا کە لە بەغدا ئەژیا، لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتیی ڕاگەیاندنی ناوخۆ (مديريه الاعلام الداخلی)دا ساز کرا. لەو کۆڕەدا فایق سەعید، کە زمانە عەرەبییەکەی لە هەموومان باشتر بوو، پرسیاری شیعری کوردیی لێ کرد، لە وەڵامدا خالید عەلی وتی کە تەنیا شیعری شێرکۆ بێکەسی خوێندۆتەوە.

*** هاوڕێیانی تەپە:**

**ئەدیب نادر، نەجات حەمید، عەلی شێخ عومەر.**

لەڕێی عەلی شێخ عومەر قەرەداغی، کە هاوڕێی هەموو نووسەرانی کەرکوك بوو، لە ئامادەیی پیشەسازیی کەرکوك ناسیم، هاوڕێیان تەپەمان ناسی، ئەدیب نادر، نەجات حەمید، خالید مەجید فەتحوڵڵا کە ئەوسا کۆمەڵە شیعرێکی چاپ کرد بەناوی "خونچەکانی گەرووی تەپە" محەمەد مەشعەل، فەیسەڵ هەمەوەندی. ئەدیب نادر ئەوسا بەناوە ڕاستەقینەکەی خۆی، فەخرەدین محێدین، بابەتی ئەنووسی. نازناوە ئەدەبییەکەی هەڵبژاردنێکی هەرەمەکی نەبوو، لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا کاتێ لە ئێران پەنابەر بوو ویستی بە پاسپۆرتێکی ساختەوە خۆی بگەیەنێتە ئەورووپا. پاسپۆرتەکە بە ناوی ئافرەتێکەوە بوو، (ئەدیبە قادر)، ناچار بوو دەستکاریی بکات، ئەوە بوو ناوی یەکەمی بگۆڕێ بۆ (ئەدیب)، ناوی دووەمیشی بۆ (نادر) کە ناوی باپیریەتی، بەم جۆرە ناوی پاسپۆرتەکە لە (ئەدیبە قادر)ەوە بوو بە (ئەدیب نادر). ئەدیب، بەپێچەوانەی هەموومانەوە، بە شیعر دەستی پێ نەکرد. یەکەم بەرهەمی بڵاوکراوەی بابەتێك بوو لەسەر ئیزرا پاوند، پاشان شیعرێکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی "لۆرکا" ئەدیب ئەوسا کەسێکی کەمدوو هێمن بوو، بەڵام لە وتووێژی ئەدەبی دا دیپلۆماسیەتی نەئەزانی، ڕەخنەو تێبینییەکانی لەسەر نووسینی هاوڕێکانی تا ڕادەیەك توند بوو. بەڵام ڕەنگە کەس وەکو ئەدیب هاوڕێ نووسەرەکانی خۆی خۆش نەویستبێ، ئەبوو ڕۆژانە سەر لە کتێبخانەی ئاسۆ - تاقە شوێنی پێکگەیشتنی ئەدیبانی کەرکوك - بدات بۆ بینینی هاوڕێکانیو گفتوگۆی ئەدەبیو سیاسییو پیاسە کردن لە گەڵیاندا... ئەوسا گوێمان لە گۆرانییەکانی بۆنی ئێم Boney M ئەگرت. ڕاسپوتین، مابەیکەر، دادی کوول، وامان ئەزانی لە شەقامەکانی لەندەن، یان لەسەر پردی (گۆڵدن گەیت بریج)ی سان فرانسیسکۆدا پیاسە ئەکەین. ئێستاش لە بەریتانیا منو ئەدیب کە گوێمان لە گۆرانییەکانی بۆنی ئێم ئەبێ وا ئەزانین ساڵی (١٩٧٩)یەو لە شەقامی جمهوری کەرکوك دا پیاسە ئەکەین. ڕۆژێکیان لە کتێبخانەی گشتی دا لەگەڵ هاوڕێیانی تەپەو ژۆرێك لە هاوڕێیانی تر دانیشتنێکی نافەرمیمان کرد لەسەر شیعری لەتیف هەڵمەت. ئێمە هەموومان هەواداری لەتیف هەڵمەت بووین، تەنیا نەجات حەمید نەبێ، پشتگیریی ڕەخنەکانی ئازاد عەبدولواحیدی ئەکرد لە شیعری هەڵمەت. بەڵام نەجات شارەزاییەکی باشی لە ڕێبازە ڕەخنەییەکاندا هەبوو لەگەڵ تەمەنیدا، کە تەنیا (١٨) ساڵ بوو، نەئەگونجا. ڕەخنەکانی نەجات لە شیعری لەتیف هەڵمەت لۆجیکیو مەلموس بوونو لەگەڵ شیعری جیهانیدا بەراوردی ئەکردو گوتەی ڕەخنەگرانی جیهانی ئەهێنایەوە.

بە پێچەوانەی هەموومان، عەلی شێخ عومەر سەرچاوەی خوێندنی جۆراوجۆر بوو، کتێبی وجودیو ئایینییشی ئەخوێندەوە، بە شێوەیەکی کەمتریش مارکسی. لەناوماندا تەنیا عەلی شێخ عومەرو جەمیل ئەمین خۆیان لە قەرەی نووسین نەئەدا، بەڵام عەلی خوێنەرێکی باش بووو بۆچوونو تێبینییەکانی جێی سەرەنج بوون. لە باسکردنی مەسەلە

فیکری و فەلەسەفییەکان دا زمانی گێڕانەوەی نوکتەی بەکار ئەهێنا.
هەر لە کتێبخانەی گشتیی کەرکوك دا گارای هونەرمەندی شێوەکارمان ناسی بێ ئەوەی بزانین هونەرمەندە. هەر لە یەکەم دانیشتن دا گارا هێرشی کردە سەر ڕژێمی بەعس و بە "عیسابە"ی ناو بردن، کە ئەمە لەو سەردەمەداو بۆ کەسێك کە نەیناسیت ئاسایی نەبوو. بەڵام گارا دڵی پڕبوو، گوندەکەیان (شۆراو) کە نزیك کێڵگە نەوتییەکانی باباگوڕگوڕ بوو، لە شەستەکاندا ڕووخێنرا بووو خەڵکەکەی ئاوارە بوبوون، ماڵی گاراش هاتبووە ڕەحیماوا. ئیتر دوای ئەوەی متمانەمان بەیەك کردو هەموو ڕۆژێك لە کتێبخانەی گشتیی دا یەکمان ئەبینی.
ساڵی (١٩٧٨) هونەرمەندی شێوەکار مدحەت کاکەیی لە ئیسپانیاوە بە بڕوانامەی دیپلۆماوە لە بواری هونەری شێوکاری دا گەڕایەوە کەرکوك. مدحەت کاکەیی یەکەم کورد بوو ئەو بڕوانامەیە لەو وڵاتەدا بەدەست بێنێ. مدحەت هێشتا بۆنی ئیسپانیای لێ ئەهات، پێشانگای ئەکردەوەو تابلۆکانی، کە تەجریدیی و جیاواز بوون لە تابلۆ ئینتیباعییەکانی هونەرمەندانی کورد، بە سلاید نمایش ئەکرد. سلاید بۆ ئێمە شێوازێکی نوێی نمایش بوو پێم وایە مدحەت کاکەیی یەکەم شێوەکاری کوردە بەکاری هێنابێ.

*** ئامادەیی پیشەسازیی کەرکوك.**

لە ئامادەیی پیشەسازیدا، ساڵی (١٩٧٩)، من و دڵپاك تاهیرو ئەکرەم گەلۆزی، کە دواتر لەناو هێزی پێشمەرگەدا بە شێرکۆ ناسرا، پەیوەندیمان کرد بە (کۆمەڵەی مارکسی – لینینی کوردستان)، کە پاشان بوو بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان. سەرشانەکەمان عادل شەریف بوو، ئەویش هەر قوتابی بوو لەگەڵماندا، دواتر لەناو تیپی ٢١ی کەرکوکدا بە مامۆستا عادیل ناسرا. شانەکەی ئێمە سەر بە (کۆمیتەی هێرش)بوو. سەیر ئەوە بوو من تا چەند ساڵێکیش دوای ئەوە هەر وامئەزانی سەر بە (کۆمیتەی ئاگر)ین. بەر لەوە، هەموومان هاوسۆزی حیزبی شیوعی عێراقی بووین، گەرچی ئینتمامان پێوە نەکربوو، پەرەنگ و ئیحسان نەبێ. پێمان وابوو کە حیزبی شیوعی نوێنەرایەتیی مارکسیزمی ڕاستەقینە ئەکا لە عێراق دا، هەتا کۆمەڵەمان ناسی. ئێمە ئینتمامان بە "(کۆمەڵە)وە کرد لەبەر ئەوەی کۆمەڵە هەم ڕێکخراوێکی مارکسی بوو، کە لەگەڵ تەوژمی باوی ئەو سەردەمەدا ئەگونجا، هەم ناسۆنالیستی بوو، کە خواست و ئارەزووە نەتەوایەتییەکانمانی تێر ئەکرد. بەم جۆرە ئەو ڕێکخراوو حیزبانە بە ختووکە دانی سۆزی نەتەوایەتی لەلایەك و، بیری باوی مارکسیزم لەلایەکی دی، دزەیان ئەکردە ناومان و ڕووبەڕووی ڕژێمێکی درندەیان ئەکردینەوە. تەنها لەسەر ئینتیما کردن بەو ڕێکخراوانەوە چەندین لاوو هەرزەکار ژیانیان لەسەر دانا، یەکێك لەوانە کەریمی برای ئەحمەدی مەلا بوو، کە هێشتا تەمەنی نەگەیشتبۆوە بیست ساڵ، لەسەر ئینتیما بۆ ڕێکخراوێکی نهێنی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ئیعدام کرا.

لەو قۆناغەدا، دڵپاك تاهیر لەپاڵ شیعر نووسیندا بێژەریش بوو لە تەلەفزیۆنی کەرکوك. ئەوسا تەلەفزیۆن بەدەست کەمیی کادیری ئافرەتەوە ئەیناڵاند، تەنیا هەردوو خوشك (نەسرین و پەروین مەحموود) هەبوون وەکو بێژەرو ئامادەکار کاریان ئەکرد. لەسەر داوای ئەو دوو خوشکە، کە لەگەڵ ماڵی دڵپاك دا دراوسێ بوون لە گەڕەکی ئیسکان، دڵپاك لە تەلەفزیۆن تەعین بوو. ئەوە بوو بە ڕۆژ دەوامی ئامادەیی ئەکردو دوو ئێوارانیش، پاش دەرچوونمان لە قوتابخانە، لە ئێستگەی تەلەفزیۆنەوە پاسێکی ١٨ نەفەرییان ئەنارد بە شوێنیا. ئەو ئێوارانەش کە دەوامی تەلەفزیۆنی نەبوو، پاش دەوامی قوتابخانە چەند سەعاتێکمان پێکەوە بەسەر ئەبردو پاشان بە پێ ئەگەڕاینەوە.. دڵپاك لە نیوەی یەکەمی هەشتاکاندا، بەهۆی ئەو پاڵەپەستۆ سیاسییەی لە تەلەفزیۆن لەسەری بوو، کەرکوکی بەجێ هێشت ولە هەولێر نیشتەجێ بوو، ئیتر بەیەکجاری دەستبەرداری شیعر بووو ڕووی لە شانۆ کرد.
لەباسی ڕۆژانی ئامادەییدا، جێی خۆیەتی ڕووداوێکی سەیر بگێڕمەوە، ڕۆژێکیان من و دڵپاك لە گۆڕەپانی ئامادەیی دا وەستابووین، قوتابییەك، کە خەڵکی یەکێك لە گوندەکانی ناوچەی شوان بوو، لێمان نزیك بووەوەو وتی حەز ئەکەم خۆمتان پی بناسێنم، منیش شاعیرم، ناوم کەریم دەشتی یە! لە ڕاستیدا ناوی کەریم بوو. وتم من کەریم دەشتیی شاعیر ئەناسم خەڵکی هەولێرە، وتی شیعری بڵاوکراوەم هەیە، بۆتانی ئەهێنم. کاتێ شیعرەکانی بە دەستنووس بۆ هێناین، یەکسەر ناسیمانەوە کە هی کەریم دەشتیی شاعیری هەولێرییە، پێشتر لە گۆڤاری بەیان دا خوێندبوومانەوە. بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی شیعری خۆیەتی...
ماوەیەك دوای ئەوە قوتابییەکی هاوڕێی کەریم دەشتی یە ساختەکە هاتە لامانەوە وتی کەریم نیازی پاك نییەو ئەیەوێ لە دڵپاك نزیك بێتەوە!

*** فازڵ جاف و ئەوان**

نووسەرانی نەوەکەی پێش ئێمە، کە بە تەمەن کەم تا زۆر دەیەیەك لە خۆمان گەورەتر بوون، بە حوکمی تەمەن و ئەزموون جیاواز بیریان ئەکردەوەو، دەمێك بوو مارکسیزمیان لە بیرو مێشکی خۆیاندا تەکاندبوو، یارمەتیدەرو هاندەر نەبوون بۆ ئێمە، بەڵکو جۆرە ساردوسڕی و دابڕانێکی ئەدەبی لەنێوان ئێمەوە ئەواندا هەبوو، لە ڕاستیدا هەردوو لامان بوبووینە هۆکاری ئەو پەیوەندییە ساردوسڕە. ئێمە کە لە سەرەتای ژیانی ئەدەبیماندا بووین و پێویستیمان بە هاندان و دەستگرتن هەبوو، بەڵام هەڵسوکەوتی ئەوان لەتەك ئێمەدا جۆرە لە خۆبایی بوونێکی پێوە دیار بوو، بەتایبەتی کە هەندێکیان ئەوسا لە لووتکەی داهێنان و ناوبانگدا بوون. بە پێچەوانەوە ئێمە لەلایەن ئەدیبانی دەرەوەی شارەکەمان پتر هان ئەدراین، بەتایبەتی شێرکۆ بێکەس و مەحمود زامدارو، هەندێ ئەدیبی لاو، وەکو خەبات عارف و عەبدوڵڵا قەرەداغی. بەشێکی تری ئەو ساردوسڕی و دابڕانە ئەگەڕێتەوە بۆ خۆمان، ئەحمەدی مەلا نەبێ کە بیرو بۆچوونی



ئیسلامی بوو، هەموومان هەڵگری بیری مارکسی بووین، بێگومان مارکسییەکی کرچوکاڵ کە لە میانەی وتوویژی نێوان خۆمان و خوێندنەوەی یەك دوو کتێبی مارکسی کە شیوعییە عێراقییەکان وەریانگێرابووە سەر زمانی عەرەبی، وەکو عەبدولرزاق ئەلساق، لەلامان گەڵاڵە بوبوو، ئیتر هەموو فیکرێکی دیمان ڕەت ئەکردەوە. هەر لەم ڕوانگەیەوە، فازڵ جاف و ئەوانمان بە عەبەسی و جودی تۆمەتبار ئەکرد تەنیا لەبەر ئەوەی ئەوان مارکسی نەبوون و، پتر گرنگییان بە شانۆی کامۆ بێکت و یۆنسکۆ شانۆی عەبەس ئەدا، گەرچی بواری نیشکردنی فازڵ جاف شانۆی مەلحەمیی بریخت بوو. ئەو دابرانەی نێوان ئێمەو ئەوان، کە خەتاکەی بۆ هەردوو لامان ئەگەڕێتەوە، زیانی پێبەخشین و کاریگەریی نەرێنی هەبوو لەسەر پێشکەوتنی ئەدەبیمان.

هەموومان لە هەشتاکاندا یەکە یەکە، تەنانەت پێش ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت و بلۆکی سۆشیالیستی، دەستبەرداری بیروباوەڕی مارکسی بووین. پێم وایە نەوزاد ئەسوەد دوایین کەس بوو واز لە فیکری مارکسیزم بێنێ، ئەگینا تا کۆتایی هەشتاکانیش سەرچاوەی نووسینەکانی خاڵی نەبوو لە پلخانۆف و نووسەرە مارکسییەکانی تر. مەریوان وریا قانیع ئەیووت: یەك سەدەیە باوی پلخانۆف نەماوە، کەچی نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد لە یەخەی نابێتەوە!

### * دیاردەی لەتیف هەڵمەت

"مێژووی ئەدەبی کوردی"ی عەلائەدین سەجادی یەکەمین کتێبی کوردی بوو لە ژیانما بیخوێنمەوە. گەرچی کتێبەکە ناوی ئەدەبی کوردی بوو بەڵام تەنیا شیعر بوو، کە ٢٥ شاعیری کلاسیکی لەخۆ گرتبوو. هێندە عاشقی ئەو شاعیرە کلاسیکیانە بووم چەندین دەفتەرم بە خەتی خۆم بە شیعری ئەوان پڕ کردەوە، هەتا دیوانی" پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و کوێستانە"ی لەتیف هەڵمەت کەوتە بەردەستم. ئەو کۆمەڵە شیعرە بە جۆری کاری تێ کردم بوو بە هاندەرێك

کە دەست بە نووسینی شیعری نوێ بکەم. ئەوەی پتر سەرسامی کردم ئەو بوو شاعیر پەیامی شیعریی ئەدرەسی خوێنەر ئەکرد، لەگەڵ خوێنەردا گفتوگۆی ئەکرد، موفرەداتی ژیانی ڕۆژانەی بەکار ئەهێنا. ئەرێ، کچی ئاخر.. ئەی تۆ بۆچی.. ئێ کچی تۆ.. هیچ دوور نی یە، دەگۆڕانیم بۆ بڵێ دەی، هتد، بەستەی خۆش خۆش، وشەی جوان گوڵە گوڵە، نیشتمان دایکە دایك، هەروەها ناونیشانی دوورو درێژو سەیر سەیر، بتانەوێ و نەتانەوێ ڕۆژێ لە ڕۆژان ئالی هەر بۆ شارەزوور دەگەڕێتەوە" هەر دوانزە شمشێرەکەی دوانزە سوارەی مەریوان" پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و کوێستانە" لە هەمووش گرنگتر، جورئەتی دانپیانان و درکاندنی نهێنی، کە بۆ ئەو سەردەمە ئاسایی نەبوو. شێتی بوو:

من سەرەڕای ئەوەی کە زۆر لات و زگارو خەمگینم.
هەتا بڵێی لەڕو سیس و ناشیرینم" بۆ کچێك کە نەیدیوم"

هەروەها لە چاوپێکەوتنێکدا کە مستەفا ساڵح کەریم لە (پاشکۆی عێراق)دا لەگەڵیا سازی دا، هەڵمەت ئەڵێ: پاسکیل نازانم لێخوڕم و رقم لە ماتماتیکە.. لە ڕاستیدا لەتیف هەڵمەت زمانی شیعریی لە بورجی عاجەوە هێنایە ناو خەڵك. لەتیف تەنانەت لە دیوانەکانی پێشووشی، خواو شارە بچکۆڵەکەمان"و" ئامادە بوون بۆ لە دایك بوونێکی تر" کە تا ڕادەیەك تەمومژاوی بوون، وشەو دەستەواژەیەکی



ئەوتۆی بەکار ئەهێنا جێی هەڵوەستەی خوێنەر بوون، ئەم کوولەکانە ئەشکێنم، پەرستگاکان ئەرووخێنم، گیانە لەناو بۆگەنی تەرمەکانا بۆت ئەگەڕێم، گیانە دوێنێ ئەو کفنەم دری کە میوانەکەمان منی تیا شاردبووەوە، وا منداڵەکان دەلاقە لە قوڕ گیراوەکان ئەکەنەوە، ئەگێڕنەوە، کاتێ لەتیف هەڵمەت بە بازاڕەکانی شۆڕیجەدا تێنەپەڕی دووکاندارەکانی ئەیانووت: کوولەکانتان بشارنەوە! لەتیف نەك هەر شیعرەکانی، بەڵکو هەڵسوکەوت و وتەکانیشی جێی سەرنج و مشتومڕ بوون.

بۆ نموونە ئەیووت" ئەگەر گوڵ نیت درك بە" چونکە مرۆڤی پاسیڤو پشتگوێخراو ناچێتە مێژووەوە. ئەو شیعرو گوتە نائاساییانەی لەتیف لە کەرکوکدا لەناو خەڵکی ئاساییشدا ناوبانگیان بۆ پەیدا کردبوو، گەرچی لەتیف لە شارەکەدا بە بنەماڵەوە ناسراو بوون. شێخ مەحموودی باوکی لەتیف هەڵمەت، پیاوێکی کورتە باڵای سمێڵ فش، کەواو سەڵتەی سەوزی لەبەر ئەکرد ئەتووت ئامۆزای شێخ مەحموودی حەفیدە. بەجۆرێ عاشقی شیعری لەتیف هەڵمەت بووم، بەر لەوەی بە دیداری بگەم چەندین جار خەونم پێوە ئەبینی، لە هەموو خەونەکانیشما لەتیف هەڵمەت کەسێکی باڵابەرزو چوار شانەو لە خۆبایی بوو. لەتیف هەڵمەت، ئەوسا لە بەغدا لەگەڵ سەبری بۆتانی دا سەرپەرشتیی هەفتەنامەی (پاشکۆی عێراق) یان ئەکرد، رۆژانی هەینی ئەگەڕایەوە کەرکوك. رۆژێکی هەینی هاوینی ساڵی (١٩٧٨)بوو، لەبەردەم کتێبخانەی ئاسۆدا کەریم پەرەنگ بە لەتیف هەڵمەتی ناساندم. وەکو عاشقێك لە یەکەم ژووان دا بێ، کاتێ تۆقەم لەگەڵ کرد هەموو گیانم کەوتە لەرزین. لەتیف هەڵمەت، بە پێچەوانەی خەونەکانەوە، کەسێکی لاوازو بچکۆلەو، تا بڵێی خاکی بوو. بە جۆرێ هانی دام متمانەم بەخۆم پەیدا کردەوە. ئیتر پاش ئەوە هەرچی شیعرم بۆی ئەنارد لە پاشکۆی عێراق دا بڵاوی ئەکردەوە، سەرەتا لە پۆستەی خوێنەران، پاشان لە لاپەرەی سەرەکی. یەکەم شیعرم لە ئازاری ساڵی (١٩٧٩)دا لە پاشکۆی عێراق بەناونیشانی "خەمی شیرین" بڵاو بۆوە.

بەجۆرێ عاشقی لەتیف هەڵمەت بووم، تەنانەت لاسایی رێورۆیشتن و شێوەی قسە کردنیشیم ئەکردەوە. وەکو ئەو، جانتایەکی بچکۆلانەم ئەخستە بن هەنگڵم و لەگەڵ کەریم پەرەنگ دا پێکەوە لە شۆریجەوە بەپێ ئەچووین بۆ "شارع جمهوری". تەنانەت هەندێ لە هاورێ نزیکەکانم هەستیان بەم هەڵسوکەوتەی من کردبوو. هەموو شیعرەکانی لەتیفم ئەزبەر کردبووو بۆ هاورێکانم ئەخوێندەوە. ئیتر لەتیف هەموو رۆژانێکی هەینی کە ئەهاتەوە کەرکوك، ئەبوو بە جەژن، هەموو لەدەوری کۆ ئەبووینەوەو رۆژەکەمان پێکەوە بە پیاسەو دانیشتنی چایخانەو وتووێژی ئەدەبی بەسەر ئەبرد. رۆژێك، هەر هاوینی (١٩٧٨)بوو، لە شەقامی مەجیدیەوە بەرەو قشڵە رێمان ئەکرد، لاوێکی قۆزو باڵا بەرز بەرامبەرمان هات، لەتیف هەڵمەت پێی ناساندین، وتی ئەوە محەمەد موکریی چیرۆکنووسە، پاشان پێکەوە چووین لە قاتی سەرەوەی گازینۆی نەسر دانیشتین، لەوێدا لەتیف باسی شاعیرێکی کرد شیعرێکی بۆ ناردبوون لە پاشکۆی عێراق بۆی بڵاوبکەنەوە بەڵام رەت کرابوو، لەتیف وتی: لە شیعرەکەدا نازانم ئەڵێ ژووری چاوەکانت؟. موکری بە پێکەنین و ئیشارەتی دەست وتی: ژێرزەمینی چاوەکانت؟. ئەو تێبینیانەی هەڵمەت و موکری زەنگێك بوو بۆ ئێمە کە هەمیشە پەنامان بۆ مەجانیەت و دەستەواژەی حازربەدەستئەبرد.

لەو سەردەمەدا کێشەیەکی ئەدەبی هەبوو لەسەر شیعری لەتیف هەڵمەت، کە خوێنەرانی شیعری لەتیفی کردبوو بە دوو گرووپەوە، لایەنگران و نەیاران. سەرقافلەی نەیارانی شیعری لەتیف، ئازاد عەبدلواحید بوو. ئازاد زنجیرە رەخنەیەکی بڵاو کردەوە لەسەر ئەو ستایلە شیعرییە سادەیەی لەتیف هەڵمەت پێی ئەنووسی، کە پێی وابوو وشك هەڵاتنی بەهرەی شیعرییە لای لەتیف. لەولاشەوە کەمال غەمبار بە زنجیرە وتارێك وەڵامی ئازادی ئەدایەوەو بەرگریی لەو شێوازە شیعرییەی لەتیف ئەکرد. لەڕاستیدا ئازادی رەخنەگری لاو لەو تەمەنەدا، کە بیست ساڵ ئەبووو نە ئەبوو، رێ تێ نەئەچوو خاوەنی خەزینەیەکی رۆشنبیریی وابێ گورزلە هەیبەت و شاعیرێتیی لەتیف هەڵمەت بدات، کە ئەوسا لە ترۆپکی داهێنان و ناوبانگ دا بوو، بەتایبەتی پاش بڵاو بوونەوەی"پرچی ئەو کچە". ئەو کاتە دەنگۆی ئەوە هەبوو کەسانێکی دیاری ناو رۆشنبیریی کوردی لەپشت ئازادەوە بن و یارمەتیی بدەن یاخود هانی بدەن. پەنجەی تۆمەتیش بۆ فازڵ جاف و محەمەد موکری و مەحموود زامدارو ئەوان درێژ ئەکرا. سەلام محەمەدی شاعیریش چووە پاڵ ئەو گرووپەو وتارێکی رەخنەیی توندی لە رۆژنامەی هاوکاری دا بڵاو کردەوە تیایدا ئەڵێ لەتیف هەڵمەت هیچ ئیزافەیەکی نەخستووەتە سەر شیعری کوردی.

فازڵ جاف و ئەوان رەخنەو تانووتەکانیان لە شیعری لەتیف نەئەشاردەوە، گەرچی بڵاویان نەئەکردەوە. بەڵام ئێمە وەکو قەدیسێك ئەمانڕوانییە لەتیف هەڵمەت و، هەرچیی بڵاو ئەکردەوە پێی سەرسام ئەبووین، نەك تەنیا وەکو بەهای شیعری، بەڵکو وەکو هێمایەکیش بۆ بەگژداچوونەوەی رژێم. لەتیف لە شیعرێکدا ئەڵێ: کە دڵ کوێر بێ خۆرەتاویش شەوی تارە ئەگەر پشیلە پۆلیس بێ هەموو مشکێك تاوانبارە. لەکاتیکدا ئێمە بە بوێریی لەتیف سەرسام بووین کە بە ئاشکرا پۆلیس دادگایی ئەکات، فازڵ جاف ئەیووت: ئەمە شیعر نییە، نوکتەیە.

بەڵام رەخنەکانی ئازاد عەبدلواحید لە شیعری لەتیف هەڵمەت، دواتر، گومانی لا دروست کردین لەسەر ئەو ستایلە شیعرییەو، جۆرە قەناعەتیکیش بە بۆ چوونە رەخنەییەکانی ئازاد، بەتایبەتی پاش دامرکانەوەی روحی هەرزەکارانەی شۆرشگێری لەلامان و، جیاکردنەوەی شیعر لە سیاسەت و، روانینە شیعر وەکو شیعر، ئەم قەناعەتەش بە شێوەیەکی تایبەت پاش بڵاوبوونەوەی کۆمەڵە شیعری "زریان"ی ئەنوەر قادر محەمەد لەلامان چەسپ بوو. زمانە شیعرییەکەی زریان کارێکی زۆری تێ کردین ووای لێ کردین بە خۆماندا بچینەوەو گۆڕانکاری بەسەر زمان و شێوازی شیعریماندا بهێنین.

* سەلام محەمەد

سەلام محەمەدم بۆ یەکەم جار ساڵی (١٩٧٩) لەبەردەم کتێبخانەی ئاسۆدا بینی، برادەرێکی خزمی خۆی بەیەکی



ناساندین، لاوێکی لاوازو باڵابەرز، خەندەیەکی هەمیشەیی لە سمێڵە خورماییو چاوە سەوزەکانی دا ئەبریقایەوە. سەلام ئەوسا خوێندکاری کۆلیجی یاسای زانکۆی بەغدا بوو، کۆتایی هەفتە ئەگەڕایەوە کەرکوك. ناسینی سەلام محەمەدو تەوقە لەگەڵ کردنی، بۆ منێکی هەرزەکاری عاشقی شیعری سەلام، یەکێك بوو لەو ساتە خۆشانەی خەونم پێوە ئەبینیو، گوڕو تینی شیعریی پێ ئەبەخشیم.

زۆربەی شیعرەکانی سەلام محەمەدم ئەزبەر کردبوو، بەتایبەتی شیعرە درێژەکانی، دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، داری زەنگیانە، نۆپەرێتی خۆشەویستی، تینوێتیو زستانی جوان، ئاکسلو سارا..و، بۆ هاوڕێکانم ئەخوێندنەوە، تەنانەت ئەوانەش کە سەودایان لەگەڵ شیعردا نەبوو، ئەمویست ئەو گۆڕانکاریانە ببینم کە بەسەریان دا دێت کاتێ گوێی لێ ئەگرن. لە قوتابخانە، لەسەر شەقام، لەماڵەوە لەبەر ئاوێنە، شیعرەکانی سەلامم بە ئیلقاو دەست جووڵانەوە ئەخوێندەوە.

## * گرووپی کەرکوك

ئێستا کە بەو ڕۆژانەدا ئەچمەوە، نازانم بۆ ناوی "گرووپی ئەدەبیی کەرکوك"مان بەرگوێ نەکەوتبوو. گەرچی زۆربەی ئەدیبانی ئەو گرووپە، فازل عەزاوی، سەرگۆن پۆلس، موئەیەد ڕاوی، ئەنوەر غەسانی، جان دەمۆ، سەلاح فایق، قەشە یوسف سەعید، بۆ دەرەوەی وڵات کۆچیان کردبوو، بەڵام هەندێکیان هێشتا لە کەرکوكو شارەکانی تردا مابوونەوە، جەلیل قەیسی، محێدین زەنگنە، یوسف حەیدەری، قەحتان هورمزی..، خوێندنەوەی ئەو گرووپە لەکاتی خۆیدا، بێگومان، کاریگەریی خۆی ئەبوو لەسەر ئەدەبی ئێمە، گەر ڕێ نیشاندەرمان هەبوایە. هەروەها، هیچ جۆرە پەیوەندی یەکیشمان لەگەڵ ئەدیبانی نەتەوەکانی دیی شارەکەدا نەبوو، بەتایبەتی ئەدیبانی تورکمان. لەڕاستیدا ئاسەواری شەڕی کوردو تورکمان لە تەمووزی (١٩٥٩)دا هێشتا لە ئارادا بوو، ڕەنگە هۆکاری سەرەکیی ئەو دوور کەوتنەویەش بووبێ. لەو شەڕەدا، کە پەنجەی تۆمەت بۆ حیزبی شیوعی درێژ ئەکرێ، کەسانێکی بێتاوان لە هەردوو نەتەوە بوون بە قوربانی.

## * کۆتایی ئاهەنگ

چێژو نەشئەی سەردەمی لاویو هاوڕێتییو ئەدەبیمان هێندە دەوامی نەکرد، ئاگری جەنگ گەیشتبووە داوێنمانو خەریك بوو تەمەنمان ئەسووتێنێ. کەوتبووینە نێوان دوو دۆزەخەوە، لەلایەك سەدامو جەنگە دۆڕاوەکەی کە هەشت ساڵی خایاند، لەلایەکی دی شەڕی کورد کوژیی حیزبە کوردییەکان لە چیادا کە ئەویش هەشت ساڵی خایاند. زۆربەی هاوڕێکانمان ڕێگەچارەیەکی دییان هەڵبژارد، کۆچ. هەموو کۆچیان کردو بەسەر ئەم جیهاندا پەرتو بڵاو بوونەوە. کەریم پەرنگ بەر لە هەمووان، لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٠)دا بۆ نەمسا کۆچی کرد. دوا بە دوای ئەو، ئەحمەدی مەلاو مستەفا گەرمیانیو سەباح شەریف ساڵی (١٩٨١) لەڕێی ئێرانەوە خۆیان گەیاندە سویسرا، ئەحمەد لە جنیڤەوە بۆ فەرەنسا پاشان ئیسپانیا ڕۆیشت، مستەفا لە ئێرانو پاکستانەوە بۆ سویسراو پاشان بۆ سوێدو پاش ڕووخانی ڕژێمیش گەڕایەوە کەرکوك، تا لە تەقینەوە تێرۆریستییەکەی ڕۆژی (١٦/ ٧/ ٢٠٠٧)دا شەهید کرا. لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا ئەدیب نادر بۆ ئێرانو لەوێوە بۆ بەریتانیا ڕۆیشتو، پاش ڕووخانی ڕژێم گەڕایەوە کەرکوك. گارا لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا لە ئێرانەوە بۆ ئەڵمانیا چوو. فازل جاف ساڵی (١٩٨١) لە سەربازی هەڵاتو خۆی گەیاندە سوێد. فەهمی کاکەیی لە سەرەتای هەشتاکاندا پەیوەندیی کرد بە هێزی پێشمەرگەو، لە کۆتایی ئەو دەیەیەدا بۆ سوێد کۆچی کرد. جەبار کەریم، خاوەن کتێبخانەی ئاسۆ، لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا بە تۆمەتی ئینتیما بۆ ڕێکخراوێکی نهێنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) دژ بە ڕژێمی بەعس دەستگیرا کراو حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو، بەڵام ساڵی (١٩٨٨) بەر لێبوردنی گشتی کەوتو بەرەڵا کرا، پاش ئەوە بۆ هۆڵەندا هەڵات. مارف عومەر گوڵ ساڵی (١٩٨٦) چوو بۆ ئۆکرایناو پاشان بەلجیکا. عەبدوڵڵا قادر دانساز لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا بۆ سوێد، فایق سەعید (١٩٩٠) بۆ سوێد، سەلام محەمەد بۆ سوێد. ئیحسان حاجی غەفوور لە کۆتایی هەشتاکاندا بە خێزانەوە بۆ هۆڵەندا ڕۆیشتن. تارق عەزیز (خەبات) بەر لە هەموومان، ساڵی (١٩٨٠) بە مەبەستی خوێندن ڕووی لە ئیتاڵیا کردو تا ئێستاش لەوێ ئەژی، ڕۆژنامەنووسێکی ناسراوەو لە چەند ڕۆژنامەیەکی ئەو وڵاتەدا وەکو فریلانس (سەربەخۆ) کار ئەکات. منیش

لە سەرەتای هەشتاکاندا پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەوە کردو، ساڵی (١٩٩٧) دوایین کەس بووم لە هاورێکانم وڵات بەجێ بێڵم، تا لە بەریتانیا گیرسامەوە. لە هاورێکانمان تەنیا نەجات حەمیدو نەوزاد ئەحمەد ئەسوەدو عەلی شێخ عومەر مانەوە.

سوپاس بۆ هاورێیانی شەقامی جمهوری. هاورێیەتیی ئەوان مانای بە ژیانم بەخشی. ئەوان منیان هاویشتە ناو دنیای جوانی ئەدەب. ئەوان نەبوونایە رەنگە ئێستا مامۆستا بوومایە لە کوێرە دێیەکدا، یان راهێنەری فوتبۆلی یانەیەکی پلە دە، یان دارتاشێك لەگەڵ بانگی نیوەڕۆدا دووکانەکەم دائەخستو رووم لە مزگەوت ئەکرد، یاخود فەرمانبەرێك لە کۆمپانیای نەوت ئێواران بە دوو عەلاگە سەموونو میوەوە ئەگەڕامەوە ناو ماڵو منداڵ.. خۆشنوودم کە لەسەردەمی ئەوان دا ژیام. گەر بۆم لوا دووبارە بژێمەوە، هەر ئەوان ئەکەمەوە بە هاورێم، هەر کەرکوك ئەکەمەوە بە زێد.

*** حەبیبە خانمی کەریم بەگی جاف (١٩٢٤-١٩٩٧) ژنەجافێك لە کەلارەوە**

**ئەحمەد باوەڕ**

ژنە جافێك لە ناوچەی گەرمیان و لە کەلارەوە، ئەو ژنە شاعیرو ئافرەتە شۆخەی نێو هۆزی جاف و بەگزادەکانی جافی کەلار بووە کە لە ڕۆژگاری خۆی و بەتایبەتی لە چلەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا، لە ڕێگای گۆڤاری بەناوبانگی (گەلاوێژ) و زیاتر لە (٧٠) حەفتا ساڵی پێش ئێستاوە ناوبەناو شیعری هۆنیوەتەوەو بەشێوازێکی گشتیش زۆرێك لە خوێندەوارەکانی نێو بەگزادەی جافی ئەودەمانەیش لە ڕێگای باوەڕپێکراوەکانی ئەوکاتەی شاری



کفری و خانەقینی وەك: سابیری حاجی فەتحوڵڵای عەتار کە بە سەڵتەزەرد (١٩١٦ - ١٩٨٦)یش ناسراوبووە، مەلا عارفی مەلا یەحیای ئەردەڵانی خانەقینی (١٩١٢-١٩٩٨)، سەید ئیبراهیمی سەید حەسەنی عەتار (١٩١٠-١٩٨٤) و هەروەها عەبدولعەزیزی نورمحەمەد واتە مامۆستا عەزیز پشتیوان (١٩١٢-٢٠٠١)ی بەناوبانگەوە، مانگانە بەشداری (اشتراك) گۆڤاری ناوبراویان هەبووەو تەنانەت دەشگوترێت گۆڤارێکی وەك گەلاوێژ و بەشێك لە گۆڤارو بڵاوکراوە کوردییەکانی ئەو دەمانەی دی لەنێو خانەوادەو بەگزادەکانی جافی گەرمیان و کەلاردا دەستاو دەستیانکردووە بۆ خوێندنەوە، شانبەشانی هەموو ئەوانەش خوێندەوار و شاعیرو نووسەرانی دیاری وەك: حەمەسەعید بەگی جاف (١٩٢٦ - ١٩٩٦)[1]، کە خاوەنی کتێبخانەیەکی گەورەش بووە لە لیوای کەرکووك و کەلاردا، لەگەڵ هەریەك لە محەمەد ئەمین بەگی جاف (١٩١١-١٩٦٥)[2]، شێخ ئەحمەدی شاکەلی (١٩٠٢-١٩٨٢)[3]، مستەفا نەریمان (١٩٢٥-١٩٩٤) و محەمەد ئەحمەد قەرەداغی (١٩١٧-١٩٧٣) و چەندینی دی لەو شاعیرو نووسەرانەی گەرمیان و کەلار و شاکەل بوون، کە لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری گەلاوێژ و تەنانەت گۆڤارو بڵاوکراوەکانی دواتریشدا بەبەردەوامی نووسین و بەرهەم و بابەتی وەرگێڕانی خۆیانیان بڵاوکردووەتەوە. هەروەها حەبێ خانمی جافیش تارادەیەك بەهەمان شێوەی ئەوان و وەك سەرەتایەك بۆ کاری نووسین و بڵاوکردنەوە هەوڵی داوە دەنگی شیعریی خۆی بگەیەنێتە نێو کاروانی ڕۆژنامەنووسی و ئەدەبیاتی کوردی ئەو سەردەمەوە، بەتایبەتی لە ناوچەو گوندێکی دوورە دەست و کەلارێی وەك کەلاری ئەو دەمانەوە، کە ئەمەش بۆخۆی هەڵدەگرێت لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی وردتری لەبارەوە بکرێت لە داهاتوودا.

وەکو دەگوترێت ئەم ژنەجافەی شاعیریش بۆ خۆی دەبێتە حەبیبە(حەبێ) خانمی کچی کەریم بەگی کوڕی فەتاح بەگی کوڕی حەمەپاشای جاف و هاوکات دایکی ناوی (دورسن) خانمی کچی عەزیزی شاسواری کوڕی ئەلك بووە لە تیرەی تەرخانی هۆزی گەورەی جاف، هەروەها دەشبێتە خوشکی شاعیری ناسراوی ناوچەی گەرمیان و کەلار محەمەد ئەمین بەگ (مینە جاف) لە دایك و باوکەوە و هاوکات دەبێتە دایکی ئاسۆ جاف (١٩٤٩ - ٢١ / ١٢ / ١٩٨٧)[4]. حەبێ خانم بەپێی یەکەمین تۆماری (سجل)ی قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی کە ئێمە دیومانەو هەندێك جاریش بۆ مەبەستی کار و توێژینەوەی زانستی خۆمان تارادەیەك سوودمان لێ وەرگرتوون، قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی بۆ یەکەمین جار لە ساڵی خوێندنی (١٩٣١-١٩٣٢)دا و بە هەوڵی حەمەبەگی جاف (١٩٠٤-١٩٣٢) کە ئەندامی دووەمین خولی (١٩ی

ئاداری ١٩٢٨ - ١ی تەمووزی ١٩٣٠)[5] پەرلەمانی عێراقی سەردەمی پاشایەتی بووە کراوەتەوەو سەر بە بەرێوەبەرایەتی پەروەردەی لیوای کەرکووکی ئەوکاتە بووە حەبێ خانمیش یەکێك بووە لە قوتابییە سەرەتاییەکانی ئەم قوتابخانەیەو بەپێی یەکەمین تۆماری (سجل) ئەو قوتابخانەیەش بێت، ئەوا ناوبراو لە ساڵی (١٩٢٤) زاییندا هەر لە کەلار هاتووەتە دونیاوە و لە ساڵی خوێندنی (١٩٣٤-١٩٣٥)دا، بەتەمەنی گەورەیی واتە لە (١٠) ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن، دوای چەند ساڵێك لە درێژەدان بەخوێندن و لە ساڵی (١٩٣٨)دا، کە تارادەیەك فێری خوێندنەوەو نووسین بووە، وەك ئەوەی لە خانەی (تێبینی-ملاحظات)و لە بەرانبەر ناوەکەیدا نووسراوە: (لەبەر گەورەیی تەمەنی وازی لە خوێندن هێناوە)[6]. حەبێ خانم تا بڵێی: ئافرەتێکی سپیکاری، زۆر شۆخی، قسە لە ڕووی، بەزن و باڵاجوانی سوارچاك بووە، وەك لە پیرو بەساڵاچوانی کەلارو ناوچەکەشم بیستووە، زۆرجار و لە تەمەنی گەنجێتی دا، بە بەرچاوی کۆمەڵانی خەڵکی گەرمیانەوە وەك سوارچاکێکی کارامە و زۆر شارەزایانە ئەسپی خۆی تاوداوە[7]. تەنانەت هەر ئەو شۆخی و جوانییە سەرنج ڕاکێشەی بووە، کە ببێتە مایەی ئەوەی لە تەواوی ناوچەی گەرمیان و پێ دەشتی شێروانەی ئەودەمانەدا ناوی بێتەوە نێو گۆرانی و شیعریی فۆلکلۆری کوردییەوە:

(حەبێ خان و وەی حەبێ خان
گوڵ مەجلیسی.. دیوەخان
حەبێ خان و وەی حەبێ خان
گوڵ مەجلیسی ناو دیوەخان)

وەك ئەوەی دواتریش ئەم بەیتە فۆلکلۆریانە لەلایەن زۆرێك لە هونەرمەندانی ناسراوی ناوچەی گەرمیانی وەك: شکور خەیات (١٩٤٠)لە پەنجاکان و حوسێن عەلی (١٩٣٢-١٩٩١) لە شەستەکان و هەروەها سەلاح داودەش (١٩٤١-٢٠١٣) لە حەفتاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا هەریەکەو بەجۆرێك ڕۆحێکی نوێیان بەبەردا کردووەتەوە، تا ئەوکاتەی لێرش بەدواوەوە سەری کێشاوە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەلایەن هونەرمەندی ناسراوی کورد ئیسماعیلی سابووریییەوە بە شێوازو بە ڕیتمێکی نوێوە گۆرانی (حەبێ خانی) وتراوەتەوە[8]. هەروەها لە ناوەندەکانی ساڵی (١٩٧٥)دا، کە ئێمە بەماڵەوە لە ناوچەی (بنکوورە)ی سەر بە شاری خانەقینەوە، دوای ئاوارەبوون و تەعریبکردنی ناوچەکەمان، لەلایەن حکومەتی بەعسی لە ناوچووەوە، کە هاتینە کەلاری ئەودەمانە بۆ ماوەی چەند ساڵێك بووین بە دراوسێی ماڵی خوالێی خۆشبێت مەحموودبەگی ڕەزابەگی جاف (١٩٢٣ - ١٩ی ئاداری ١٩٧٥)، کە (حەبێ خانم) هەم هاوسەر و هەم ئامۆزای بوو، بەڵام مەحموود بەگ خۆی ماوەیەکی زۆر نەبوو، لە ژیاندا نەمابوو، وەك دەگوترا بەهۆی نەخۆشی دڵەوە لە گوندی (خەیال)ی ناوچەی (بنکوورە) کۆچی دوایی کردووەو لە شارۆچکەی (قزرەبات) و بە تەنیشتی ڕەزابەگی باوکییەوەو لە نێو مزگەوتی مەحموود پاشای جاف (١٨٤٥-١٩٢١)دا نێژراوە[9]. تەنانەت ئەوکاتەش حەبێ خانم هێشتا هەر لە جۆشی جوانی و لە هەرەتی سەرتۆپی خۆیدابوو، سروە خانمی کچی تارادەیەك لە ئێمە هەراش ترو وەکتر هەر لەگەڵ ئێمەدا خوێندکاری قۆناغی سەرەتایی قوتابخانەی کەلار بوو، بەڵام مەحموود بەگی هاوسەری بەپێی زۆرێك لە سەرچاوەکان، هەر لە هەرەتی لاوی و لە چلەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا ئەندامێکی دیاری سەر بە حیزبی هیوای ناوچەی گەرمیان و شاری خانەقین بووەو لەگەڵ ئەوەشدا یەکێك بووە لەوانەی کە لەگەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی ناسراوی باشووری کوردستان و دەرەوەیدا بە سەرۆکایەتی مامۆستا ڕەفیق حیلمی(١٨٩٨-١٩٦٠) و ئەندامێتی چەند کەسایەتیەکی دیاری وەك: ئیبراهیم ئەحمەد (١٩١٤-٢٠٠١)، ڕەشیدی ئیسماعیل ئاغای باجەلان (١٩٢٠ - ٢٠٠١)، عیزەت عەبدولعەزیز (١٩١٢-١٩٤٧)، مستەفا خۆشناو (١٩١٢-١٩٤٧)، عەزیز پشتیوان (١٩١٢-٢٠٠١) مەلا سەید حەکیمی خانەقین (١٨٩٢-١٩٥٧)، حاجی عەلی خانی ئەکبەری (١٨٨٦-١٩٧٢)، عەلی حەمدی بێدۆهی (١٩١٨-١٩٦٤)... و دەیان کەسایەتی دی، وەك ئەندامێکی ئەوکاتەی هیوا، بەشداری لە ڕۆژانی کۆنفرانسی حیزبی هیوای ساڵی (١٩٤٤)دا کردووە لە کەلار و دواتریش بەشداریەکی کارای ئەو پلان و کۆبوونەوەیەشی کردووە، کە دواتر و لە هەمانساڵدا، بەشەو لە گوندی (گێژەکان)ی نزیك شاری کەلاری ئێستا بەستراوە کە لە مێژووی ناوچەکەدا بە(کۆبوونەوەی قەنیلە) ناسراوە و بەزۆریش پلان و کارەکانی بە سەرۆکایەتی مەلا سەید حەکیمی خانەقین و بەمەبەستی پاڵپشتیکردن لە شۆڕشی مەلا مستەفای بارزانی (١٩٤٣-١٩٤٥) بەڕێوەچووە[10]. هەروەها حەبێ خانمی جاف پێش ژیانی هاوسەری، یەکێك بووە لەو کچە بەگزادانەی جاف کاتێك لە ناوەندی چلەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا باوەڕپێکراوی (یانەی سەرکەوتنی کوردان) واتە مەعرووف جیاووك باڵەکی (١٨٨٥-١٩٥٨)[11] و هەردوو هاوەڵەکەی کە هەریەك لە عەبدولڕەحمان ئەفەندی واتە عەبدولڕەحمانی نووری جانی کۆیی (١٩١٠-١٩٧٦)[12] و باران جیاووك بوون لە شاری بەغداوە بەرەو کوردستان و لە ڕێکەوتی (١٧ی تەمووزی ١٩٤٣) دا، دوای ئەوەی سەردانێکی دوو ڕۆژەی شاری خانەقینی ئەودەمانەیان کردووەو (یارمەتی و دەستگرۆیان) بۆ یانەی سەرکەوتنی کوردان لەنێو دانیشتووانەکەیدا کۆکردووەتەوە. بە یەك دوو ڕۆژێك دواترو لە ڕێکەوتی (١٩ی تەمووزی ١٩٤٣)دا، بە ناوچەی (بنکوورە)داو بەنێو هۆزەکانی باجەلان و جموور و تاڵەبانی دا تێپەڕیوون و ئەوجا لە تەنیشت (قەڵای شێروانە)ی مێژوویییەوە لە ڕووباری (سیروان) پەڕیونەتەوە، بۆ بەری گەرمیان و لەوێشەوە گەیشتونەتە ئاوایی کەلار و بەتایبەتی بۆ ماڵی کەریم بەگی جاف (١٨٨٥-١٩٤٩)، بەجۆرێك جگە لەوەی کە زۆرێك لە بەگزادەکانی جاف هەریەکەو بەپێی توانای خۆیان یارمەتی و دەسگرۆیەکی زۆرباشی(یانەی سەرکەوتنی کوردان) و شاندەکەیان کردووەو بەسەریەکەوە زیاتر لە (٢٠٠) دووسەد دیناری ئەوکاتەیان وەك یارمەتییەك بە یانەی سەرکەوتنی کوردان بەخشیوە، هاوکات حەبێ خانمیش وەك کچە بەگزادەیەکی ئەوکاتە، کە بەرانبەر بە ناوەکەی و وەك ئەوەی لە ڕیزی باربوودەرانی یانەی

سەرکەوتنی کورداندا، ناوی بە: ((کچی کەریم بەگ)) هاتووە، لەو کات و ڕێورسمەدا، کە هێشتا تەمەنی نزیکەی (١٩) ساڵ بووە، ئەویش لای خۆیەوەو وەك هەستێکی کوردانەی خاوێن بۆ یانەی سەرکەوتنی کوردان بری (٢) دوودیناری ئەوکاتەو هەروەها مینەجاف (١٩١١-١٩٦٥)ی برایشی بری (١٠) دیناری بەیانە بەخشیوە، سەرەرای ئەوەش پارچە شیعرێکی خۆی وەك ستایش کردنێك بۆ یانەی سەرکەوتنی کوردان نووسیوە بە ناونیشانی: (بۆ یانەی سەرکەوتن)[١٣]، وەك ئەوەی لە بەشێکیدا نووسیویەتی:

بژی ئەی یانەی سەرکەوتن و سەربەرزی کوردان
بەدایم شادو سەربەرز بی هەتا دەوران ئەکات دەوران
لەگەڵ دەرکەوتنی ناوت هیوای سەرکەوتنی کوردە
کە چونکە تەمبەڵی حوری و قەڵایی عیلم و عیرفان
لە زوانی خۆم و کوردستانەوە عەرزت ئەکەم (یانە)
بڵندو پاك و سەربەرزیی، خوا پیرۆزت کا لێمان
هەموو فەخرت ئەکەین پێوە چونکە فەخری کوردانی
بەسەربەستی دەوامی تۆیە پێویستمان لە لای یەزدان
لەسەر کورد گشتی پێویستە بە هەر ڕۆژێ کە ناو نریاین
بەجەژنی ناوبەرن، بەو ڕۆژە بێژن جەژنی کوردستان[١٤]

هەر وەك دەشگوترێت لەسەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردووەوە حەبێ خانم پەیوەندی بە(پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە کردووەو لە ڕێکخراوی (خەباتی پارتی) لە کەلار ماوەیەك، درێژەی بە کاروچالاکی خۆی داوە[١٥]. هەروەها لە ساڵی (١٩٦٣)ەوە کە مەحموود بەگی هاوسەری پەیوەندی دەکاتە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە لە ناوچەی (قەرەداغ)، حەبێ خانمیش ناچار دەبێت بەماڵەوەو لەبەر خوێندنی منداڵەکانی لە کەلارەوە پەنایان بردووەتە نێو خزمەکانی و بەتایبەتی ماڵی حەمەرەشید بەگی کۆکس لە گوندی (بانسنووق)ی سەر بە(ناحیە قەرەتەپە)ی شاری کفری، کەچی لەوێش موختاری گوندی (بانسنووق) کە ناوی (مەممند) دەبێت، لای کار بەدەستانی حکومەت و بەتایبەتی لە ڕێگای بەڕێوەبەری ناحیەی قەرەتەپەی ئەوکاتەوە کە لە هۆزی عەزەی عەرەب دەبێت، بەخراپی بۆیان تێدەکەوێت و دەکەونە دژایەتی کردن و بانگردنی بەردەوامیان لە ڕێگای پۆلیسەوە، تا ئەوکاتەی دووبارە دەگەڕێنەوە کەلار و نێو کەسوکاری، هەرچەندە کەسایەتییەکی وەك: بەبانی برایم فەلامەرزی زەنگەنە لە گوندی (قوبە)ی سەر بەناحیەی ناوبراو لە ڕێگای هەریەك لە بەڕێوەبەری ناحیەو بەرپرسی پۆلیسەوە کە ناوی (سەباح سەمەری) دەبێت داکۆکیان لێ دەکات و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هاوردو بردەی حەبێ خانم بە ناحەقی و بەکارێکی نارەواو نەشیاو دەزانن بەوەی کە لە بنەماڵەیەکی گەورەیەو هاوکات کچی کەریم بەگی جاف بووە[١٦].

حەبێ خانم لە ماوەی ژیانیدا کۆمەڵێك شیعری میللی هەبووەو لە بۆنەو یادەوەریی جۆر بەجۆردا وتوونی، بەلام بەداخەوە بە زۆری لە ناوچوون، وەکو وتمان حەبێ خانم کە دەبێتە خێزانی مەحموود بەگی رەزا بەگی جافی ئامۆزای، لەبەری ئەم مێردکردنەی ئەم کوڕو کچانەی هەبووە لەوانە: ئاسۆ جاف کە ماوەیەك فەرمانبەری شارەوانی کەلارو دواتر بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانی عێراق، هەروەها گەرمیان و رزگار کە بەداخەوە لە تەمەنی گەنجیدا کۆچی دواییان کرد، بەلام خێزانیان هەبوو، هەروەها مامۆستا محەمەد و لەیلا خانم و سروە خانمی خێزانی شاهۆبەگی کوری مستەفا بەگی جاف، جا سەبارەت بەو پارچە شیعرەی نێو گۆڤاری گەلاوێژ و وەك ئەوەی من لە دەیان ساڵی پێش ئێستاوە بیستوومە، ناوبراو ئەو پارچە شیعرەی کە کاتی خۆی لە گۆڤاری (گەلاوێژ)ی، ژمارە (٧) ساڵی (٤) چوارەمی تەمووزی ساڵی (١٩٤٣)دا و بە ناونیشانی (لایە لای)و بەناوی خواستراوی (لە کەلارەوە-ژنە جافێك) ەوە بۆی بلاوکراوەتەوە[١٧]. بێگومانم لەوەی کە ئەمەیان شیعری خۆیەتی و زۆر بەداخەوە بەهەڵە کەوتووەتە نێو دیوانی محەمەد ئەمین بەگی جافی (مینە) برایەوە، هەر وەك دەشگوترێت کاتی خۆی شیعری ناوبراوی (لایە لای) لە ڕێگای حەمەسەعید بەگی جاف (١٩٢٦-١٩٩٦) ەوە، لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بۆ بلاوکراوەتەوە، کە بریتییە لە پارچە شیعرێکی درێژی لاوانەوەو ستایش، کە لە ستایش و بۆ (حەسەن)ی برا بچووکی واتە دکتۆر حەسەن جافی نووسیوە وەك ئەوەی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بلاوکراوەتەوە هاتووە:

لایە لای

هەی لایە لایە حەسەن لای لایە
لە خوام گەرەکە بگەیتە پایە
پایە بڵند بی بەرزبێ مەقامت
بەو شەرت سەربەستی کورد بێ مەرامت
هیواو خەیاڵت حورریی کوردان بێ
روحت فیدایی ڕێی نیشتمان بێ
چاوت لە بەرزی و ژینی وڵات بێ
فیدایی وەتەن لەلات خەڵات بێ
کوڕەیم گوێ بگرە لە دەنگی دایە
بە دڵی خوێنینەوە بۆت ئەکەم لایە
پەردەی دڵەکەم پڕ لە خوێناوە
بۆ زەلیلی کورد جەرگم براوە
هەی لایە لایە حەسەن لای لایە
کەی لە نەزانین رزگار بووینایە
ڕۆڵەم نازانم بۆ خەوت نایە
ئێشی بێ کەسی کورد لە دڵتایە
بۆیە من شیری سپیت پێ ئەدەم
بە خوێنی جگەر پەروەردەت ئەکەم
سەرو گیان و ماڵ گشتی فیدا کەی
قەومەکەت لەژێر جەهل رەهاکەی
کورم پێت ئەڵێم تۆ کورد زمانی
نەمامی نەورەس باخی کوردانی
دەخیلت بوگم کوڕەی نەخشینم
تازە گوڵغونچەی گوڵزاری ژینم
کە پێ گەیشتی ئەمەت تەدبیربێ
ئەم کزەی کوردەت دایم لە بیربێ
هیچ درێغ نەکەی بە ڕۆح و بەگیان

تا وەرنەگیرێ تۆڵەی کوردستان
هەی لایە لایە حەسەن لای لایە
نازانم بۆچی تۆ خەوت نایە
ئەڵبەت تۆش وەك من دڵ پڕ برینی
بۆ کوردی بەد بەخت جگەر خوێنینی
ئێشی کوردستان تۆی لە تۆی دڵتە
بۆیە بەم شەوە تەپاوە تلتە
حەسەن من هیوام وایە بە یەزدان
زوو بێیتە بەرهەم بە عیلم و عیرفان
ببی بە ئەسباب بۆ یەکێتی کورد
گەردنی نیفاق بشکێنی ورد ورد
رۆڵەم بۆ پارە چاو لە خوار نەبی
قەت دوژمنی کورد بۆ ئەغیار نەبی
هەی لایە لایە حەسەن لای لایە
لەم گێژی غەمە کەی دەرچووینایە

من نازانم ئەو پارچە شیعرەی سەرەوەی حەبێ خانم وەکو وتمان کە لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا و بەناوی خواستراوی (ژنە جافێکی کەلار)ەوە بڵاوکراوەتەوە، ئەگەر هی خوالێخۆشبوو حەبێ خانم بێت کە دڵنیام لەوەی توانای شیعری لەو بابەتەی هەبووە، ئەوا پارچە شیعرێکی هەر زۆر بەرزەو خۆ ئەگەر هی مینە جافی براو کاکیشی بووبێت، وەك ئەوەی لە دیوانەکەیدا هاتووەو تارادەیەك جیاوازی لە نێوان هەردوو دەقەکەشدا هەیە، ئەوە دەیەها بەرزتر، ماوەتەوە بڵێین حەبێ خانمی کەریم بەگی جاف لە رێکەوتی (١١ی تەمووزی ١٩٩٧)دا، لە گەرمیان (کەلار) و لە تەمەنی (٧٣)ساڵیدا، کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (کەلاری کۆن) بە تەنیشتی هەرسێ کورە جوانە مەرگەکەیەوە: ئاسۆ، گەرمیان و رزگارەوە نێژراوە و جێی سەرنجە ئەم دەقە شیعرییەی لای خوارەوەش کە بۆخۆی بریتییە لە پارچە شیعرێکی تری بڵاونەکراوەی و لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەمی رابردوودا، لە کەلار نووسیویەتی و هاوکات لە هەمان تەرزو نەفەسی ئەو شیعرە دوور و درێژەی دەچێت، کە لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا پێشتر بڵاوی کردووەتەوە[١٨].

قەت فریو نەبن بەم دەنگ و باسە
بەندی و ئەسارەت هی کوردە راسە
سەیری کەن دەستان چەندێ جوانە
بەخوێنی یەکتر.. خەنە بەندانە
ئەم چەند شیعرانەم بۆ لاوی کوردان
لە بیرتان نەچێ شەری (چوار ملان)
مەیکەن بە هەواو زەوقی سەر کورسی
لە یەك مەکوژن بۆ غەرەز شەخسی
تەگبیرێ بکەن.. بە دێهات و شار
بادەری بخەین.. راستییەکەی ئازار
(کەلار-١٩٧١)

* پەراوێزو سەرچاوەکان:

1-حەمەسەعید بەگی جاف: لە ساڵی (١٩٢٥)دا، لە کەلار لەدایکبووە، پلەکانی خوێندنی هەرلەم ناوچەیەوە دەستپێکردووە، یەکێکە لە خوێندەوارو رووناکبیرەکانی سەدەی رابردوو، دەیان نووسین و وەرگێڕانی لە گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکانی وەك: (گەلاوێژ، هیوا، هەتاو، روناهی، بەیان، رۆشنبیری نوێ و رەنگین)دا بڵاوکردووەتەوە، لەسەردەمی خۆیدا، خاوەنی گەورەترین کتێبخانەی شەخسی بووە لە سنووری لیوای کەرکووکدا و لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا تاڵانکراوە، بەرهەمێکی چاپکراوی هەیە بە ناوی (ئاوارە)وە، ماوەیەکیش لە بواری رۆژنامەوانیدا، کاری کردووە و لە رێکەوتی (١٦ی مارتی ساڵی ١٩٩٦) دا، لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە لە گۆڕستانی (مەحموودپاشای جاف)ی شارۆچکەی قزرەبات نێژراوە. بروانە: خوسرەو جاف، پرسە، ئاهەنگی چلەی ماتەمینی خوالێخۆشبوو محەمەد سەعید بەگی جاف (٩/ ٥ / ١٩٩٦)، (بەغدا: ١٩٩٩)، ل ٦٤-٧٣، محەمەد فاتح، پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشووردا، (هەولێر: ٢٠١٤)، ل ٤١٣.

٢-محەمەد ئەمین بەگی جاف: لە ساڵی (١٩١١) دا، لەنێو (قەڵای شێروانە) ی شاری کەلاردا، هاتووەتە دونیاوەو نازناوی شیعری (مینە) بووە، دوای ئەوەی ژیانی هاوسەری پێکەوە ناوە بەزۆری لە گوندی (گۆبان) سەرووی کەلار ژیاوە، لە شەری ئاوباریکی (١٩٣١) دا، شانبەشانی هێزەکانی شێخ مەحموودی حەفید دژی حکومەتی عێراق و بەریتانیا جەنگاوە، لە گۆڤاری گەلاوێژدا بەرهەمی شیعری بڵاو کردووەتەوە و خاوەنی دیوانێکی شیعری گەورەیەو لە ساڵی (١٩٦٥) دا، لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی بەگزادەکانی جاف لە گوندی (سەید خەلیل) نێژراوە. بروانە: (مستەفا نەریمان، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەورو پشتی، (بەغدا: ٢٠٠٧)، ل ٩٧-١٠١، مستەفا نەریمان، دیوانی مینەجاف، پێشەکی دکتۆر حەسەن جاف، (بەغدا: ١٩٩٠)، ل ٣).

٣-شێخ ئەحمەدی شاکەلی: لە ساڵی (١٩٠٢)دا، لە گوندی شاکەلی ناوچەی گەرمیان لەدایکبووە. سەرەتا بەشێك لە بەرهەمە شیعریەکانی خۆی لە گۆڤارەکانی: گەلاوێژ، هەتاو و دەنگی گێتی تازەدا بڵاوکردووەتەوەو ماوەیەکیش وەکیلی کەریم بەگی جاف و سەرپەرشتیاری دێهاتەکانی بووەو بەوەکیلی لایەن عەزیل باسی لێوە کردووە سەرەرای ئەندامێتی لە هیوادا تا ئێستاش دیوان و بەشێك لە یاداشتەکانی، چەند جارێك لە شاری بەغدا و هەولێر وڵاتی ئێران و تورکیا چاپکراوەتەوەو لە (١٤ ی شوباتی ١٩٨٢) دا، کۆچی دوایی کردووە. بۆ زیاتر بروانە: شێخ ئەحمەدی شاکەلی، دیوان و یاداشتی شێخ ئەحمەدی شاکەلی، ل ١٣-١٦، مستەفا نەریمان، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەورووپشتی، (بەغدا: ٢٠٠٧)، ل ١٨٢.

٤-ئاسۆ جاف: دەبێتە کوری گەورەی مەحموودی رەزابەگی جاف و لە ساڵی (١٩٤٩) دا، لە کەلار هاتووەتە دونیاوە،

لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی سەدەی رابردوودا، کە چاودێر (مراقب)ی شارەوانی کەلاربوو، یەکێك لە هەڵوێستە لە بیرنەکراوەکانی ئەم کەسایەتییە ئەوەی بوو کە لە ساڵی (١٩٨٠) داو لە بارودۆخ و رۆژگارێکی زۆرناسکدا، کە پێشمەرگەیەکی سەر بە هێزەکانی ئەوکاتەی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بە ناوی عەلی حەسەن مکایەلییەوە، کە بە (سەرکەوت) دەناسرا، لە شەرێکی قارەمانانە و لەناوجەرگەی گەرمیان و بەتایبەتی کە لە گوندی (خاڵەبەگ) شەهید بوو، دواتر تەرمەکەی کەوتە دەستی جاش و هێزەکانی حکومەتی عێراقەوە لە کەلارو هێنرایە نێو (مزگەوتی گەورە)ی شاری کەلارەوە، ئەوکاتە من قوتابی قۆناغی یەکەمی ناوەندی بووم، ئاسۆ جاف یەکێك بوو لەوانەی شانبەشانی بەشێك لە دانیشتوانی کەلار و وەك هەڵوێستێکی نیشتمانی و جەماوەری ئەوکاتە ناسکەی کورد ئازایانە سەرپەرشتی شوشتن و ناشتنی تەرمی ئەو پێشمەرگە شەهیدەی کرد تا گەیەنرایە گۆڕستانی (کەلاری کۆن) و تەنانەت لەنێو رێکخستنەکانی شاری ئەوکاتەی یەکێتیشدا وەك هەڵوێستێك بۆی تۆمارکراو لە قەڵەم درا، هەرچەندە ناوبراو دواترو بۆ ماوەیەك، بوو بەئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانی عێراق و بەچەند ساڵێك دواترو لە رێکەوتی (٢١ی کانوونی یەکەمی ساڵی١٩٨٧)دا، بە نەخۆشی و هەر بەگەنجی لە شاری کەلار کۆچی دوایی کردو لە گۆڕستانی (کەلاری کۆن) نێژرا.

٥-عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات العراقیة، ج١٠، ط٧، دارالشؤون الثقافیة العامة، (بغداد: ١٩٨٨)، ص ٢٩٠.

٦-قەیدی ژمارە (١)، قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی (گەرەکی کەلاری کۆن)، ساڵانی (١٩٣١-١٩٣٤)، ئەحمەد باوەر، تۆفیق ئەفەندی و یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی لە کەلار ١٩٣١-١٩٥٨، ئەکادیمیای کوردی (گۆڤار)، ژمارە (٣٥)، ساڵی (٢٠١٦)، (هەولێر: )، ل ١١١

٧-دیدەنی لەگەڵ حەمید ناسر وەیسی زەنگەنە، کەلار، (٢٥ی مارتی ٢٠١٧).

٨-دیدەنی لەگەڵ هونەرمەند شکور خەیات، کەلار (١١ی ئایاری ٢٠١٧)، دیدەنی لەگەڵ خەسرەو جاف، هەولێر، (١٠ی ئایاری ٢٠١٧).

٩-دیدەنی لەگەڵ مامۆستا حوسێن مەحموود عەلی کەلاری، کەلار (٨ی ئایاری ٢٠١٧).

١٠-بروانە: ئەحمەد باوەر، پارتی هیوا لە دروستبوونییەوە لە شاری کەرکووك تا هەڵوەشانەوەی لە کۆنفرانسی کەلاردا ١٩٣٧ - ١٩٤٥، کەرکووك (گۆڤار)، ژمارە (١)، ساڵی (سلێمانی: ٢٠٠٠)، ل ٩٢-١١٢.

١١-مەعرووف جیاووك باڵەکی: مەعرووف عەلی ئەسغەر ئەفەندی کوری حاجی مەمولوود ئەسعەد بەدیعوئەلزەمانە. بەرەسەن خەڵکی گوندی (سەرێشمە)ی ناوچەی باڵەکایەتییەو لە ساڵی (١٨٨٥) لە شاری بەغدا هاتووەتە دونیاوە، پلەکانی خوێندنی هەر لەم شارەو دواتر خوێندنی باڵای لە ئەستەمبوڵ و شاری بەغدا تەواوکردووە، ماوەیەك لە بواری رۆژنامەوانیشدا کاری کردووە. جگە لەوەش پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ نوێنەری کورد بۆ کۆنگرەی ئاشتی شەریف پاشای کوری سەعید پاشای خەنداندا هەبووە. لە ساڵانی جەنگی یەکەمیشدا کە لە سوپای عوسمانیدا دەبێت لەلایەن هێزەکانی بەریتانییەوە دەستگیر دەکرێت و دوور دەخرێتەوە بۆ هیندستان، دوای جەنگ کە دەگەڕێتەوە شاری بەغدا و ماوەیەك بەکاری پارێزەرییەوە خەریك دەبێت، ماوەیەکیش نوێنەری شاری هەولێر لە پەرلەمانی عێراقیدا و لە ماوەی ساڵانی (١٩٤٤ - ١٩٤٦)دا، دەکرێتە موتەسەریفی سلێمانی و لە رێکەوتی (١٩٥٨/١/٢٣) لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی شێخی چۆڵی لە شاری هەولێر نێژراوە، جگە لە کاری سیاسی و کارگێری لە ژیانیدا چەند کتێبێکی لە بوارەکانی: مێژوو، فۆلکلۆر و رووناکبیری گشتیدا بڵاو کردووەتەوە. بروانە: ئازاد عوبێد ساڵح، رۆڵی سیاسی و رووناکبیری مەعرووف جیاوك ١٨٨٥ - ١٩٥٨، (هەولێر: ٢٠١٢)، ل ١٣ بەدواوە، ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی لە رۆژگاری پاشایەتی دا ١٩٢٥-١٩٥٨، (هەولێر: ٢٠٠٧)، ل٨٩.

١٢-عەبدولرەحمانی نوری جان: عەبدولرەحمان محەمەد ئەحمەد، کە بە (نوری جان) ناسراوبووە، لە رێکەوتی (١ی تەمووزی ١٩١٠)دا، لە گەرەکی (قەڵا) ی شاری کۆیە هاتووەتە دونیاوەو کاکە حەمەی باوکیشی بەزۆری بەکاروباری (چەخماخ سازی)یەوە خەریك بووە، لە تەمەنی (٦) شەش سالییەوە کە باوکی کۆچی دوایی دەکات، بە زۆری پەروەردە کردن و پێگەیاندنی ئەم و هەریەك لە (سدیق) ی برای و خوشکەکانی: (ئامینە، حەلیمە و حەبیبە) دەکەوێتە ئەستۆی زەهوە مەلاسەعیدی دایکیانەوەو لە شاری (کۆیە) قۆناغی خوێندنی سەرەتایی تەواو دەکات و دواتریش بەمەبەستی درێژەدان بە خوێندن روودەکاتە شاری بەغداو تا ئەوکاتەی لەساڵی (١٩٢٥-١٩٢٦) دا، خانەی مامۆستایانی باڵا (دار المعلمین العالیة) تەواو دەکات و لە شارەکانی کۆیە، ئامێدی، بەغدا و شاری سلێمانی مامۆستایەتی کردووە، جگە لەوەش لەرووی خەت خۆشییەوە وەك یەکێك لە خەت خۆشەکانی سەردەمی خۆی ناسراوەو تەنانەت لێرەش بەدواوە بەیەکجاری لە شاری بەغدا دەگیرسێتەوەو هاوکات بەهۆی هەڵوێستی نیشتمانییەوە بۆ ماوەی (٣) لە وەزیفە دوور دەخرێتەوە لە رووی زیرەکی و لێهاتووییەوە مامۆستا تاهیر ئەحمەد حوێزی وەك: خوێندکارێکی زیرەك و لێهاتوو باسی لێوەکردووە بەوەی هەموو رۆژانی (پێنج شەمووان) لە گۆڕەپانی قوتابخانەو لەنێو ریزو ئاپۆرەی خوێندکاراندا چەپڵەی ئافەرینی بۆ لێدراوە، بەجۆرێك هەر ئەم لێهاتوویی و توانایەی بووە کە ببێتە مایەی ئەوەی لە داهاتوودا کۆلێژەکانی: ئادابی بەشی کۆمەڵناسی، کۆلێژی یاسای بەغداو هەروەها بروانامەی دبلۆم لە یاسای گشتی و شەریعەی ئیسلامیدا بەدەست بهێنێت و دواتریش بە مەبەستی درێژەدانی خوێندنی باڵا رووی لە وڵاتی فەرەنسا کردووەو بروانامەی (ماستەر) ی لە بواری یاسادا لە زانکۆی سۆربۆن بەدەست هێناوەو پاش گەڕانەوەی لە ساڵانی (١٩٦٤ - ١٩٦٥) لە زانکۆی قاهیرەی وڵاتی میسر بروانامەی

دکتۆرای لە بواری یاسادا بەدەست هێناوە و ناونیشانی تێزەکەی: (القضاء الاداري في العراق حاضره ومستقبله – دراسة مقارنة – جامعة القاهرة: ١٩٦٥)، بەجۆرێك ئەم هەموو بایەخی بە خوێندن و زانست و گەڕان وای لێکردووە، کە شارەزاییەکی بەرچاوی لە زمانەکانی: عەرەبی، فەرەنسی، ئینگلیزی، فارسی و تورکیدا هەبووە، لێرەش بەدواوە بەیەکجاری لە شاری بەغدا دەگیرسێتەوەو هاوکات بەهۆی هەڵوێستی نیشتمانییەوە بۆ ماوەی (٣) سێ ساڵی تەواو لە وەزیفە دوور دەخرێتەوە، بەوەی کە لایەنگیری بزووتنەوەی رەشید عالی گەیلانی (مایسی ١٩٤١) بووە، جگە لەوەش بۆ ماوەیەك، لە چلەکانی سەدەی بیستەمی رابردوودا، بەسکرتێری دەستەی بەڕێوەبردنی (یانەی سەرکەوتنی کوردان) هەڵبژێردراوە، لەگەڵ ئەوەشدا هاوکارێکی بەردەوامی خەڵکانی هەژارو بەتایبەتی ئەو خوێندکارانەی کوردبووە، کە لە شاری بەغدا درێژەیان بە خوێندن داوە، وێڕای هەمووئەوانەش وەك نووسەرێك کۆمەڵێك بابەت و نووسینی جۆربەجۆری لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەوکاتەی بەغدادا بڵاوکردووەتەوەو لەسەرەتای حەفتاکانی سەدەی رابردوودا خانەنشین دەکرێت و بەزۆری بەکاروباری پارێزەرییەوە خەریك دەبێت، تا ئەو کاتەی لە ڕێککەوتی (٩ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦) کۆچی دوایی دەکات لە گۆڕستانی (کەکۆن)ی شاری کۆیە نێژراوە و لەدوای خۆی کۆمەڵێك نووسین و بەرهەمی جۆربەجۆری بەزمانی کوردی و عەرەبی لە دوو بەجێماوە لەوانە: فرسان مريوان الأثنا عشر، المساجد الاسلامية، ابن رشد وفلسفته، الكندي وفلسفته، شرح قانون الاصلاح الزراعي، بەڵام دەستنووسەکانی بە زۆری ئەمانەن: مێژووی کۆیە، کوردستانی بادینان، وضع الشعب الكردي في القانون الدولي، حقوق الشعب الكردي في الدستور العراقي. بڕوانە: تاهیر ئەحمەد حوێزی، مێژووی کۆیە، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، بە یارمەتی ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی ئۆتۆنۆمی کوردستان چاپکراوە، چاپخانەی نمیر، (بەغدا: ١٩٨٤)، ل ١٩٠، دەستنووسێکی حاکم کرمانج عەبدولڕەحمان نورجان، کە خۆی بە سوپاسەوە بۆی ناردووین. (کۆیە، ٨ی شوباتی ٢٠١٧).

١٣–ئەحمەد باوەڕ، کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن، وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار، شارەوانی کەلار، (سلێمانی: ٢٠٠٤)، ل ١٠٦.

١٤–بڕوانە: دیوانی مینە جاف، کۆکردنەوەو ڕێکخستنی: مستەفا نەریمان، پێشەکی: دکتۆر حەسەن جاف، مكبعه الجاحظ، (بەغدا: ١٩٩٠)، ل ٨٤، یادگاری یانەی سەرکەوتن، پەیامی تیروعات، باربو، چاپخانەی نەجاح (بەغدا: ١٩٤٤)، ل ٦٦.

١٥–جووتیار کەلاری، یاد ئانینەوەی حەبیبە خانی شۆڕشگێڕ، خەبات (ڕۆژنامە)، ژمارە (٨١٨)، (٦ی تەمووزی ٢٠١٠)، ل ١٧.

١٦–دیدەنی لەگەڵ مامۆستا حەسەنی حەمەڕەشیدبەگی بانسنوق لە کەلار، (٩ی ئایاری ٢٠١٧).

١٧–بڕوانە: گەلاوێژ (گۆڤار)، ژمارە (٧)، ساڵی (٤)، تەمووزی ١٩٤٣، ل ٣٢–٣٤.

١٨– دیدەنی لەگەڵ مامۆستا محەمەدی مەحموود بەگی ڕەزابەگی جاف، کەلار، (٧ی ئایاری ٢٠١٧).

*** بنکەی رووناکبیری گەلاوێژ لە کەرکوک و کەلار:-**

**بوار نورەددین**

لە یەکەم کۆنفرانسی لقی کەرکوکی بنکەی رووناکبیریی گەلاوێژ لە رۆژی ٥ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣ لە هۆڵی شەهید (سیروان تاڵەبانی) بە ئامادەبوونی دەستەی باڵای بنکەی گەلاوێژ و (٦٠) ئەندام، کە (٢٣) کەس خۆیان کاندید کردبوو، ئەنجامەکەی بەم شێوەیە بوو:-

- فەیسەڵ تاهیر هەمەوەندی، ٣٣ دەنگ بەرپرسی لق.
- دانا عەسکەر قادر، ٢١ دەنگ لێپرسراوی رۆشنبیری.
- بورهان ئەحمەد محەمەد، ٢٩ دەنگ، جێگر.
- سەراب (رێبوار رەشید)، ٢٥ دەنگ پەیوەندییەکان.
- ستار ئەحمەد محەمەد شێخانی، ٢٤ دەنگ لێپرسراوی دارایی.
- ئاوێزان نووری حەکیم، ١٨ دەنگ، تایپیست.
- سەیفەددین سابیر، ١٨ دەنگ ئەندامی یەدەگ.

لە کۆنفراسی دووەمدا ئەنجامەکە بەم شێوەیە بوو:-

- فەیسەڵ هەمەوەندی، بەرپرسی لق.
- عومەر سەیدە، لێپرسراوی رووناکبیری.
- ئاوێزان نووری، لێپرسراوی دارایی.

بە بریاری بنکەی گەلاوێژ لە رۆژی ٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦ ستافی پێشوو سرکراو ستافی نوێ دانرا:-

- دانا عەسکەر، بەرپرسی لق.
- شێرکۆ شەریف، سکرتێری رووناکبیری.
- ستار شێخانی، لێپرسراوی دارایی.

لە کۆنفرانسی سێیەمی لقی کەرکوکی بنکەی رووناکبیریی گەلاوێژ، بە ئامادەبوونی دەستەی باڵای بنکەی گەلاوێژ، لە رۆژی ٢٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠١١ لە هۆڵی (لوبنان) لە کەرکوک ئەنجامەکان بەم شێوەیە بوو:-

- سەیفەددین سابیر، ٢٨ دەنگ بەرپرسی لق.
- عەلی عومەر، ١٨ دەنگ لێپرسراوی دارایی.
- عەبدولرەحیم سەرەرۆ، ١٥ دەنگ، لێپرسراوی رووناکبیریی
- شێرکۆ شەریف، ١٥ دەنگ یەدەك
- ئومێد مەحموود، ١٨ دەنگ یەدەك.

* چالاکییەکانی لقی کەرکوك:

١- کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بۆ (دڵشاد عەبدوڵڵا)، لە رۆژی ٢٥ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤.

٢- کۆرێك بۆ (مەلا بەختیار) بە ناونیشانی (ئیسلامگەرایی لە هاوکێشەی دیموکراسیدا)، لە رۆژی ١٥ی شوباتی ساڵی ٢٠٠٤، لە هۆڵی شەهید (سیروان تاڵەبانی).

٣- کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بۆ سەلاحەرەش، لەتیف فاتیح فەرەج، ئیدریس عەلی، دانا عەسکەر، بورهان ئەحمەد، ئاوێزان نووری، هیجران شێواو، ستار ئەحمەد.

٤- نۆژەنکردنەوەی مەزارگەی شاعیر (ئەسیری) لە گردی شێخ محێدین لە رۆژی ١٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٣.

٥- یەکەمین فیستیڤاڵی لقی کەرکوك بۆ شیعر و چیرۆك و لێکۆڵینەوە لە رۆژانی (٢٢-٢٥)ی نیسانی ٢٠٠٤ بەناونیشانی (رەنگاڵەکانی کەرکوك بەستەی ئازادی دەچرن).

٦- دروستکردنی پەیکەرێك بۆ (ئەسیری)ی شاعیر لە رۆژی ٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤ لە گەرەکی (ئیسکان).

٧- کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بۆ بورهان ئەحمەد، مەهدی زریان، دانا عەسکەر، ئاوێزان نووری، لەتیف فاتیح فەرەج، رووزار ئەحمەد، لە رۆژی ١٠ی نیسانی ٢٠٠٥ لە خورماتوو.

٨- کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بۆ شاعیرانی خورماتوو، لە رۆژی ١٠ی نیسانی ٢٠٠٥ لە شاری خورماتوو.

٩- هەفتەی رووناکبیری لە رۆژی ٧-١٣ی حوزەیرانی ٢٠٠٥.

رۆژی یەکەم: کۆرێك بۆ (د. ئازاد عەبدولواحید) بە ناونیشانی سۆسیۆلۆژیای شیعری کوردی.

رۆژی دووەم: کۆرێك بۆ دانا عەسکەر بەناونیشانی (گەرانەوە بەدوای مرۆڤ بوون).

رۆژی سێیەم: کۆرێك بۆ لەتیف فاتیح فەرەج بەناونیشانی (بزووتنەوەی رۆژنامەگەری لە کەرکوك.

رۆژی چوارەم: کۆرێك بۆ (بورهان ئەحمەد).

رۆژی پێنجەم: کۆرێك بەناونیشانی (ئەزموونی شیعری لەتیف هەڵمەت).

رۆژی شەشەم: کۆرێك بۆ (عومەر سەیدە) بەناونیشانی (خوێندنەوەی چەند قەسیدەیەك لە رۆژنامە کوردییەکانی کەرکوك).

رۆژی حەوتەم: کۆرێك بۆ (فەیسەڵ هەمەوەندی) بەناونیشانی (خوێندنەوەیەك بۆ چیرۆك).

١٠- کۆرێك بۆ (عەبدولرەحمان خەلیفە) بەناونیشانی دەستوور و ماددەی ٥٨ لە رۆژی ٢٦ی تەمموزی ٢٠٠٥.

١١- کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بۆ ئازاد عەبدوللەتیف، عومەر عەبدول گۆریان، دێرین حامد، لە رۆژی٣٠ی ئەیلولی ٢٠٠٥.

١٢- کۆرێك بۆ ستران عەبدوڵڵا بەناونیشانی:(رەوشی ئەدەب و رووناکبیری لە کەرکوك)، ٢٠٠٥

١٣- کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بۆ (ناهیدە حوسێنی) لە رۆژی ١٢ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦.

١٤- کۆرێك بۆ (عارف قوربانی) بە ناونیشانی (مێژوویی تەعریب لە شاری کەرکوك، لە ساڵی ٢٠٠٧.

١٥- کۆرێك بۆ (شاخەوان کەرکوکی) بەناونیشانی (کەرکوك لە دیدی کەرکوکییەکانی دەرەوەی وڵات).

١٦- کۆرێکی چیرۆك خوێندنەوە بۆ چیرۆك نووس (سەمەد ئەحمەد).

١٧- کۆرێك بۆ (د. فوئاد رەشید) بەناونیشانی جیهانی بوونی ئەدەبی کوردی، لە رۆژی ١٩ی نیسانی ٢٠٠٧.

١٨- کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بۆ شاعیرانی کەرکوك لە سلێمانی لە رۆژی ٧ی مایسی ٢٠٠٧.

١٩- کۆرێکی چیرۆك خوێندنەوە بۆ چیرۆکنووس (جەلیل کاکە وەیس) لە رۆژی ٢٦ی تەمموزی ٢٠٠٧.

٢٠- کۆرێکی شیعر خوێندنەوە بۆ (کەژاڵ ئەحمەد) لە رۆژی ١٦ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨.

٢١- کۆڕێك بۆ (دانا عەسکەر) بەناونیشانی: (لەپێناو گرنگیدان بەژانری ڕۆمان، کوشتنی زمانی دژەکان لە سایکۆلجییەتی (من) لە گێڕەوەی ڕۆمانی (جێتەنگی گوڵەکان)ی نەوزاد یوسف کاکەیی لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨.

٢٢- کۆڕێك بە ناونیشانی: (ڕاپەڕین و پرسیارە بێ وەڵامەکان) بۆ لەتیف فاتیح فەرەج لە ڕۆژی ١٩ی ئاداری ٢٠٠٨.

٢٣- فیستیڤاڵی دووەمی لقی کەرکوکی بنکەی ڕووناکبیری گەلاوێژ بۆ شیعر و چیرۆك و لێکۆڵینەوە لە ڕۆژانی ١٠-١١ی نیسانی ٢٠١٠.

٢٤- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ لالۆ ڕەنجدەر، لەتیف فاتیح فەرەج، دانا عەسکەر، سەراب، ژووان کەریم، لە ڕۆژی ١٤ی نیسانی ٢٠١٠.

٢٥- کۆڕێکی چیرۆك خوێندنەوە بۆ حەمە سەعید زەنگنە، فەیسەڵ هەمەوەندی، نەوزاد یوسف کاکەیی، لە ڕۆژی ٢٠ی تەمموزی ٢٠١١.

٢٦- کۆڕێك بۆ (ئەمین شوان) بەناونیشانی (شێخ ڕەزا) وێستگەیەکی ڕووناکبیری گەورە، لە ڕۆژی ٩ی نیسانی ٢٠١١.

٢٧- کۆڕێك بۆ (د. ئازاد عەبدولواحید) بە ناونیشانی (دەسەڵاتی دەق و بنەما بابەتییەکانی شیعری سابیری) لە ڕۆژی ١٤ی کانوونی یەکەمی ٢٠١١.

٢٨- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ حەسەن جومعە، تابان ئەنوەر، ئارام دووشیوانی، ئالان عومەر، لە ڕۆژی ٢٧ی کانوونی یەکەمی ٢٠١١.

٢٩- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ سەربەست کەرکوکی لە ڕۆژی ٢٦ی کانوونی دووەمی ٢٠١٢.

٣٠- کۆڕێك بۆ حوسێن عومەر بەرزنجی، بەناونیشانی لە یادی (١٠٣) ساڵەی کۆچی دوایی شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە ڕۆژی ١٩ی کانوونی دووەمی ٢٠١٢.

٣١- کۆڕێك بۆ (خالید کاوێس) بە ناونیشانی: خوێندنەوەیەکی واقیعیانە بۆ کتێبی (ئەو هەتیوەی نابێت بە پیاو) (عەزیز نەسین) لە ڕۆژی ٢ی شوباتی ٢٠١٢.

٣٢- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ (عەبدوڵلا سلێمان - مەشخەل لە ڕۆژی ١٩ی شوباتی ٢٠١٢

٣٣- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ ڕابەر ڕەشید، فاخیر بلباس، ڕەفعەت کەرکوك، شکور ساڵەیی، لە ڕۆژی ٤ی ئاداری ٢٠١٢.

٣٤- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ مەهدی زریان، ستار ئەحمەد، مەحموود نامۆ، لە ڕۆژی ١٥ی ئاداری ٢٠١٢

٣٥- کۆڕێك بۆ (بەکر لەتیف) لە ڕۆژی ٢٥ی ئاداری ٢٠١٢.

٣٦- کۆڕێك بۆ (سمکۆ محەمەد) بەناونیشانی: کۆماری ڕۆشنبیری و دەسەڵاتخوازی لە ڕۆژی ٢ی نیسانی ٢٠١٢.

٣٧- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ عوبێد ئەحمەد، سەنگەر سەلاحەددین، ئەحمەد سابیر، عوسمان دەروێش، لە ڕۆژی ١٢ی نیسانی ٢٠١٣.

٣٨- کۆڕێك بۆ شاتوو ئەمین بەناونیشانی ئەنفال و کاریگەری لەسەر شوناسی نەتەوەیی لە ١٧ی نیسانی ٢٠١٢.

٣٩- مەراسیمی ڕێزلێنان بە بۆنەی تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ خزمەتکردنی وشەی پیرۆزی کوردی بۆ نووسەران و ڕووناکبیران کەرکوك: ئەمین شوان، محەمەد سابیر، جەلیل محەمەد شەریف، حەمید خالید کەریم. لە ڕۆژی ١ی مایسی ٢٠١٢.

٤٠- بەخشینی خەڵات و ڕێزلێنان لە پ.د. زەنوون پیریادی لە ڕۆژی ١٦ی حوزەیرانی ٢٠١٢.

٤١- کۆڕێك بۆ د. ئازاد عەبدولواحید بەناونیشانی لوتفی لەنێوان دەسەڵاتی ئایینی و ئایدیای ناسیۆنالیزمیدا لە ڕۆژی ٢٨ی حوزەیرانی ٢٠١٢.

٤٢- کۆڕێك بۆ هیمداد شاهین بەناونیشانی تێرامانێکی فەلسەفییانە بۆ وجود و عەدەم لە ڕۆژی ٧ی تەمموزی ٢٠١٢.

٤٣- کۆڕێك بۆ شێخ ستار عەبدوڵلا بەرزنجی بەناونیشانی مێژووی وەرزش لە شاری کەرکوك لە ڕۆژی ٩ی تەمموزی ٢٠١٢.

٤٤- کۆڕێك بۆ د. عادل گەرمیانی بەناونیشانی: سەرەتاکانی ڕۆمانی کوردی لە ڕۆژی ١٠ی تەمموزی ٢٠١٢.

٤٥- کۆڕێك بۆ د. ڕەفیق شوانی بەناونیشانی زمانی کوردی زمانێکی ئارییاییە نەك هیند و ئەورووپی لە ڕۆژی ١١ی تەمموزی ٢٠١٢.

٤٦- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ چنوور نامیق لە ڕۆژی ١٦ی تەمموزی ٢٠١٢.

٤٧- کۆڕێك بۆ سەباح بازرگان دەربارەی ڕەفیق حیلمی لە ڕۆژی ١١ی ئابی ٢٠١٢.

٤٨- ڕێزلێنان لە خەباتی پەنجا ساڵەی هونەرمەنج عەبدوڵلا محێدین لە ڕۆژی ١٣ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٢.

٤٩- کۆڕێکی چیرۆك خوێندنەوە بۆ سەلمان شێخ بزێنی، عوسمان دەروێش، حەمە سەعید زەنگەنە لە ڕۆژی ٤ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

٥٠- کۆڕێك بۆ د. ئازاد عەبدولواحید دەربارەی ناسنامەی شیعری هیجری دەدە لە ڕۆژی ٣١ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

٥١- کۆڕێك بۆ لەتیف فاتیح فەرەج بەناونیشانی: کاریگەریی تەکنەلۆجیا لەسەر خوێندنەوە لە ڕۆژی ٩ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

٥٢- کۆڕێك بۆ شێخ حوسێن بەرزنجی دەربارەی صابری لە ڕۆژی ٢٢ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٢.

٥٣- کۆڕێك بۆ زاهیر شکور بەناونیشانی ڕۆڵی ڕاگەیاندنی کورد لە ئاست پرسە نەتەوەییەکان لە ڕۆژی ٢٩ی کانوونی دووەمی ٢٠١٢.

٥٤- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ ڕووزار ئەحمەد، نەوزاد ئەحمەد کاکەیی، سەلاح گەرمیانی، سامی ڕەفیق، خەلیل کاکەیی، لە ڕۆژی ١٥ی کانوونی دووەمی ٢٠١٣.

٥٥- کۆڕێك بۆ حوسێن عومەر بەرزنجی دەربارەی شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە ڕۆژی ١٩ی تشرینی دووەمی ٢٠١٣.

٥٦- کۆڕێك بۆ تەها تەیفوور بەناونیشانی: ڕاگەیاندکاری مولتەزیم و ڕاگەیاندکاری نامولتەزیم لە ڕۆژی ٢٢ی شوباتی

٢٠١٣.

٥٧- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ سەلاح قابیل و فەرمان هیدایەت لە ڕۆژی ٢ی ئاداری ٢٠١٣.

٥٨- کۆڕێك بۆ سەباح بازرگان، میقداد محەمەد، محەمەد زەکی تاڵەبانی، لە ساڵیادی کۆچی دوایی عەبدوڵڵا عەبدولڕەحمان زەنگنە لە ڕۆژی ٧ی ئاداری ٢٠١٣.

٥٩- کۆڕێك بۆ د. زرار سدیق تاروجەیی بەناونیشانی بەڵگە و زانیاری نوێ لەسەر کەرکوك و دەوروبەری لە ڕۆژی ٩ی ئاداری ٢٠١٣.

٦٠- کۆڕێك بۆ سەباح بازرگان دەربارەی گەڕەکی ئیمام قاسم لە ڕۆژی ١ی نیسانی ٢٠١٣.

٦١- کۆڕێك بۆ شوان داودی بەناونیشانی: میدیای کوردی لە دوای (١٠٥) ساڵ لە ڕۆژی ٢٢ی نیسانی ٢٠١٣.

٦٢- کۆڕێك بۆ د. ئازاد عەبدولواحید بۆ کەلتووری ژیان لە ڕۆژی ٢٧ی نیسانی ٢٠١٣.

٦٣- کۆڕێك بۆ عەبدولڕەحیم سەرەڕۆ بەناونیشانی: گرووپی هەستیارترین دەزگای پێکەیاندنی کۆمەڵایەتی لە ڕۆژی ١٥ی مایسی ٢٠١٣.

٦٤- کۆڕێك بۆ محەمەد ئەحمەد بەناونیشانی: گرنگی خوێندنەوە بۆ منداڵان لە ڕۆژی ١٦ی مایسی ٢٠١٣.

٦٥- کۆڕێك بۆ شاڵاو محەمەد بەناونیشانی ئیتیك و بەرپرسیارێتی میدیایی لە ڕۆژی ٥ی حوزەیرانی ٢٠١٣.

٦٦- کۆڕێك بۆ عادل عومەر عەلی بەناونیشانی ڕۆڵی باوك و دایك لە هاندانی منداڵەکانیان بۆ خوێندنەوە لە ڕۆژی ٦ی حوزەیرانی ٢٠١٣.

٦٧- ڕێکخستنی مەراسیمێك بۆ دیای ٤٠ ساڵەی کۆچی دوایی شێخ ڕەئووف خانەقا لە ڕۆژی ٢٣ی حوزەیرانی ٢٠١٣.

٦٨- کۆڕێك بۆ شکۆفە محەمەد بەناونیشانی (تیشکێك لەسەر فاکتەرەکانی ئەندازیاریی زانکۆی کۆیە دەربارەی پرۆژەی گەشەپێدانی شار و گوندەکانی کوردستان لە ڕۆژی ٢٧ی حوزەیرانی ٢٠١٣.

٦٩- کۆڕێك بۆ د. ئازاد عەبدولواحید بەناونیشانی جیاکردنەوەی زمانی ناوزراندن و ڕەخنە لە میدیای کوردیدا لە ڕۆژی ٢٠ی تەمموزی ٢٠١٣.

٧٠- کۆڕێك بۆ ستار مستەفا دەربارەی یاسای ٢١ی ساڵی ٢٠٠٨ لە ڕۆژی ٤ی ئابی ٢٠١٣.

٧١- کۆڕێك بۆ د. سالار باسیرە بەناونیشانی ڕۆڵ و کاریگەری حیزب لەسەر سیستمی سیاسی لە ڕۆژی ١٧ی ئابی ٢٠١٣.

٧٢- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ ستار ئەحمەد، سەلاح قابیل، زەمان کاکەیی، عەبدولڕەحیم سەرەڕۆ لە ڕۆژی ٢٤ی ئابی ٢٠١٣.

٧٣- کۆڕێك بۆ هێلین لەتیف دەربارەی: چۆن بتوانین مامەڵەی تەندروست لەنێوان مامۆستاو خوێندکار دروست بکەین لە ڕۆژی ١٢ی ئەیلولی ٢٠١٣.

٧٤- کۆڕێك بۆ سەردار جاف بەناونیشانی سروود وەك فاکتەری و ئەدان لە ڕۆژی ١٨ی ئەیلولی ٢٠١٣.

٧٥- کۆڕێك بۆ عەلی شێخ عومەر بەناونیشانی ڕەخنەسازی و دەمە ئاوێزان لە ڕۆژی ٢١ی ئەیلولی ٢٠١٣.

٧٦- کۆڕێك بۆ سەباح بازرگان بە ناونیشانی دەربارەی کەسایەتی کەرکوك ئەجمەدین کەرکوکی لە ڕۆژی ٢٦ی ئەیلولی ٢٠١٣.

٧٧- کۆڕێك بۆ شاعیرانی لاو: ڕەئووف شوانی، حەمەی شەم، نەجات زامدار لە ڕۆژی ٣ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٣.

٧٨- کۆڕێکی شیعر بۆ ستار ئەحمەد لە ڕۆژی ٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٣.

*** لقی کەلاری بنکەی گەلاوێژ:-**

لە ساڵی ١٩٩٨دا دامەزراوە و دەستەکانی ئەم لقە بەم شێوەیە بووە:-

لە ساڵانی (١٩٩٨-٢٠٠٢)

- مەجید ساڵح، بەرپرسی لق
- عەبدوڵڵا حەسەن قادر، ئەندامی لێپرسراوی دارایی.
- ئەحمەد شاکەلی، ئەندامی لێپرسراوی ڕووناکبیری.

لە ساڵانی (٢٠٠٢-٢٠٠٤)

- فایەق ڕەحیم محەمەد، بەرپرسی لق.
- عەبدوڵڵا حەسەن قادر، ئەندامی لێپرسراوی ڕووناکبیری.
- ئاسۆ وەهاب ئەحمەد، ئەندامی لێپرسراوی دارایی.

لە ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٥)

- ئاسۆ وەهاب ئەحمەد، بەرپرسی لق.
- کاروان یاروەیس، ئەندامی لێپرسراوی دارایی.
- ئەحمەد ڕەحیم محەمەد، ئەندامی لێپرسراوی ڕووناکبیریی.

لە ساڵی (٢٠٠٧ - ؟)

- ئاسۆ وەهاب ئەحمەد، بەرپرسی لق و لێپرسراوی دارایی.
- ئەحمەد ڕەحیم محەمەد، ئەندامی لێپرسراوی ڕووناکبیریی.

*** چالاکییەکانی لقی کەلاری بنکەی گەلاوێژ:-**

١- کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ شێرکۆ بێکەس لە ڕۆژی ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨.

٢- پیشاندانی فیلمی تایتانیك لە ڕۆژی ٦ی شوباتی ١٩٩٩.

٣- کۆڕێك بۆ تەها سلێمان بەناونیشانی:- ئایینی ئیسلامی لە ڕۆژی ٧ی شوباتی ساڵی ١٩٩٩.

٤- شەوی شیعر بۆ شاعیران: ڕەحمان خانی، ساڵح هەلاج، تەها سلێمان، ڕزگار حاجی حەمید، مەحموود وەهاب، لە ڕۆژی ٢-٣ی کانوونی دووەمی ١٩٩٩.

٥- نمایشی فیلمی گیروگرفتەکانی مەیموون لە ڕۆژی ١٧ی شوباتی ١٩٩٩.

٦- سیمنارێك بۆ تەها سلێمان، مەجید ساڵح، فایەق ڕەحیم دەربارەی: ڕفاندنی ئۆجەلان و ئایندەی کێشەی کورد لە ڕۆژی ٢٦ی شوباتی ١٩٩٩.

٧- نمایشی فیلمی (باڵندەی تاریکی) لە ڕۆژی ١٢ی مارسی ١٩٩٩.

٨- ئاهەنگێك بەبۆنەی ڕاپەڕین و نەورۆز لە ڕۆژی ٢١ی مارسی ١٩٩٩

٩- کۆڕێك بۆ ستران عەبدوڵڵا دەربارەی: پەراوێزکەوتووانی کوردەواری لە ڕۆژی ٩ی نیسانی ١٩٩٩.

١٠- کۆڕێك بۆ (هەڤاڵ وەیسی) بەناونیشانی:
(ئەمڕۆ و ئایندەی کێشەی کورد) لە ڕۆژی ١٠ی مایسی ١٩٩٩
١١- کۆڕێك بۆ خالید سلێمان بەناونیشانی:
ئیشکالییەتی نێوان ڕووناکبیری و کۆمەڵگە لە ڕۆژی ١٥ی حوزەیرانی ١٩٩٩.
١٢- نمایشی فیلمی (لەو دیو دیوارەکانی ئەمریکا) لە ڕۆژی ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٩٩.
١٣- نمایشی فیلمی (سپارتاکۆس) لە ڕۆژی ٢ی تەمووزی ١٩٩٩.
١٤- نمایشی فیلمی جۆراوجۆر لە ڕۆژانی (٢٤-٢٩)ی تەمووزی ١٩٩٩.
١٥- نمایشی فیلمی (ئەلتفرە) لە ڕۆژی ١ی ئابی ١٩٩٩.
١٦- کۆڕێك بۆ (خالید مەحموود) بەناونیشانی خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی (اوهام النخبة ونقد المثقف) لە ڕۆژی ١١ی ئابی ١٩٩٩.
١٧- نمایشکردنی شەش فیلم لە ڕۆژانی(٢٣-٢٨)ی ئابی ١٩٩٩.
١٨- کۆڕێك بۆ تەها سلێمان بەناونیشانی:
(بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی کوردی و ئەزموونی دیموکراسی) لە ڕۆژی ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٩٩.
١٩- پێشانگای شێوەکاری بۆ غازی محەمەد لە ڕۆژی ٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٩٩.
٢٠- کۆڕێك بۆ عەبدوڵڵا قەرەداغی بەناونیشانی کێشەی کورد لە سەردەمی جیهانێکی گۆڕاودا لە ڕۆژی ١٧ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٠ لە کەلار.
٢١- پێشانگا بۆ ئامیق بابا جان و سەرتیپ جەبار لە ڕۆژی ٢ی مایسی ٢٠٠٠ لە کەلار.
٢٢- کۆڕێك بۆ هاوژین مەلا ئەمین بەناونیشانی ئیسلام ئایدۆلۆجیا، مەعریفە لە ڕۆژی ٢٠ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠ لە کەلار.
٢٣- کردنەوەی پێشانگا بۆ هەر یەکە لە ئەبوبەکر عەلی، ئەحمەد خۆشنووس، ئاسۆ وەهاب، لە ماوەی نێوان ١١ی تشرنی دووەمی ٢٠٠٠ تا ٢٩ی نیسانی ٢٠٠١ لە کەلار.
٢٤- کۆڕێك بۆ سەید سوبحی بەناونیشانی: کاکەیی لە پەراوێزی مێژوودا لە ڕۆژی ٥ی حوزەیرانی ٢٠٠١ لە کەلار.
٢٥- سازکردنی کۆڕ بۆ ئەم بەڕێزانە:-
- پشتیوان ئەحمەد، ڕۆشنبیر و دەسەڵات.
- ئەکرەمی میهرداد، کورد گەران بەدوای خوددا.
- عەدنان عوسمان، دەوڵەتی عەلمانی و دەوڵەتی ئیسلامی.
٢٦- پێشانگای شێوەکاری هاوبەش بۆ شەش هونەرمەند لە ڕۆژی ٢٥ی ئەیلوولی ٢٠٠١.
٢٧- هەفتەی ڕووناکبیری لە ڕۆژانی ٥-٩ی شوباتی ٢٠٠٢ دەربارەی چیرۆك و شیعر و لێکۆڵینەوە.
٢٨- سێیەمین فیستیڤاڵی ئەدەبی منداڵان بۆ شیعر و چیرۆك لە ڕۆژی ١ی نیسانی ٢٠٠٢.
٢٩- وەرزی ڕووناکبیری لە ڕۆژانی ٢٥-٢٧ی نیسانی ٢٠٠٢ بۆ شێوەکار و شیعر و چیرۆك.
٣٠- پێشانگای هونەری کاریکاتێر بۆ ئەحمەد خۆشنووس لە ١٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢.
٣١- پێشانگای شێوەکاری بۆ ئاسۆ وەهاب و کامەران یاروەیس لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢.
٣٢- پێشانگای هونەری بۆ ئەحمەد خۆشنووس لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ لە دەربەندیخان.
٣٣- کۆڕێك بۆ (مەجید ساڵح) بەناونیشانی (ڕاگەیاندن و کاریگەری لەسەر ڕای گشتی) لە ڕۆژی ٤ی ئەیلوولی ٢٠٠٣.
٣٤- پێشانگای شێوەکاری بۆ ئاسۆ وەهاب لە ڕۆژی ١٤ی ئەیلوولی ٢٠٠٣.
٣٥- کۆڕێکی چیرۆك خوێندنەوە بۆ فایەق ڕەحیم، مژدە مەحموود لە ڕۆژی ١٦ی ئەیلوولی ٢٠٠٣.
٣٦- پێشانگای شێوەکاری بۆ ئەحمەد خۆشنووس لە کفری لە ڕۆژی ١١ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣.
٣٧- پێشانگای تایبەتی بۆ ئاسۆ وەهاب لە ڕۆژی ٨ی مارس ٢٠٠٤ لە ناحیەی ڕزگاری.
٣٨- کۆڕێك بۆ (ئاریان ڕەئووف) بەناونیشانی (کۆمەڵگەی مەدەنی) لە ڕۆژی ٢٨ی تەمموزی ٢٠٠٤ لە کەلار.
٣٩- چالاکی بە بۆنەی یادی ١١٠ ساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردی و جیهانی کتێب لە ڕۆژانی ٢٣-٢٤ی نیسانی ٢٠٠٨.
٤٠- هەفتەی ڕووناکبیری لە لە ڕۆژانی ٧-١٤ی نیسانی ٢٠١٢ لە کەلار.
٤١- ڕێزلێنانی ساڵح هەلاج لە ڕۆژی ٢٩ی حوزەیرانی ٢٠١٢.
٤٢- ڕێزلێنان لە ئازاد حەمە لە ڕۆژی ١١ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٢.
٤٣- ڕێزلێنان لە دەشتی کەلهوڕی لە ڕۆژی ١٨ی ئاداری ٢٠١٣.
٤٤- دەرکردنی ١٠ ژمارە لە گۆڤاری زیپان.
٤٥- دەرکردنی چەند نامیلکەیەك بە زمانی کوردی و عەرەبی.

*** ئەوانەی جێ پەنجەیان ماوە لە ( جماعە کرکوك ):**

**فاروق مستەفا**

بە کۆچی چیرۆکنوس و ڕۆماننوس دکتۆر زوهدی داودی لەم جیهانەدا لە وڵاتی ئەڵمانیا، مەشخەڵێکی تری ڕۆشنبیریی کوژایەوە کە هەردەم گۆڕەپانی ڕۆشنبیریی عێراقی ڕووناك دەکردەوە، هەروەها کۆڵەکەیەکی تری (جماعە کرکوك) کەوت کە پشتیان پێ بەستبوو، ئەمەش کۆستێکی تر بوو کە بەسەر (جماعە)دا هات، کە لە ئێستادا تەنها دوانیان ماون ئەوانیش فازڵ عەزاوی کە لە لەدایکبووە لە ساڵی (١٩٤٠)ە و لە ئەڵمانیا دەژێت و سەلاح فایەق کە لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٥) کە چل ساڵی لە فیلیپین بردووەتە سەر نازانم ئێستا ئەو وڵاتەی بەجێهێشتووە و لە تورکیا نیشتەجێیە هەر وەکو ئەوەی ئازاد ئەسوەدی برادەری بۆی گێڕامەوە کە گوایە لە تورکیا بینیویەتی.

چۆن جماعە کرکوك لەمەودوا خۆی نیشان دەدات لەدوای کۆچکردنی دەمووچاوە دیارەکانیان لەم چەند ساڵانەی دواییەوە:-

جەلیل قەیسی لە ساڵی ٢٠٠٦ چاوی لێکنا، سەرگۆن پۆلس ساڵی ٢٠٠٧ ئەنوەر غەسانی ٢٠٠٦ لە وڵاتی کۆستاریکا، یوسف سەعید ساڵی ٢٠١٢ لە دوایش موئەیەد ئەلڕاوی٢٠١٥، پێش دەرچوونی دیوانی سێیەمی بەناونیشانی (سرد المفرد) لە پێش هەمووشیانەوە لە ساڵی ١٩٩٣ یوسف حەیدەری جیهانی بەجێهێشت، جان دەمۆش لە ئوستالیا جیهانی بەجێهێشت.

ئەم کۆمەڵەیە هەرچەند ڕۆیشتن بەڵام ناوبانگیان و جوانکارییەکانیان سەرتاپای عێراقیان داگیرکردووە، بەڵکو سنووریان بەزاندووە و چوونە دەرەوەی عێراق، دەنگیان گەیشتە دوورترین شوێن ئەویش کۆستاریکا کە ئەنوەر غەسانی دوا گۆچانی کۆچی لەوێ بەجێهێشت، یان وەکو فازڵ عەزاوی بەرهەمەکانی لە ئەڵمانیا دەنگ و ناوبانگی داوەتەوە، ئەویش بە وەرگێڕانی ڕۆمانەکەی بەناوی (آخر الملائكة) کە کۆڵن ویلسن نووسینی لەسەر کردووە.

دووەمیشیان سەلاح کە لەگەڵ خۆیدا لە گەڕان و سووڕانەکانیدا قەڵا و پرد و گەڕەك و بێستان و فەرهەنگەکانی لە جانتاکەی هەڵگرتووە و فریای تەنیایی خۆی دەکەوێت کە لەگەڵیدا بە گوێدا دەچرپێنن.

زۆربەی ئەم کەسایەتییە بەرچاوانە کۆچیان کرد بەرەو بەغدا لەسەرەتادا عەزاوی لەدوایدا غەسانی و ڕاوی و یوسف حەیدەر کە توانی فەرمانەکەی کە مامۆستا بوو گواستییەوە بۆ حیللە لەدوایدا لە بەغدا لە ناری خست کە چووە لای هاوڕێکانی تر، کە لەدوایدا سەلاح فایەق بوو، تەنها جەلیل قەیسی لە کەرکووك مایەوە تا ٢٠٠٦.

لەدوای گۆڕینی ڕژێم بایەخ بە بەرهەم و چالاکییەکانی دراو بەدوای هەواڵەکانیان دەچوون و ئەو تاقیکردنەوە ئەدەبییەیان کە بەردەستیان هێنا دەیان لە خەونەکان بریندار بوون.

هەموو لایەك دان بە ڕۆڵی ئەو کۆمەڵەیە دادەنێن لە چالاکی ئەو کۆمەڵەیە و دەوڵەمەندی بزووتنەوەی ڕۆشنبیری لە عێراق لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، کاریان بە دڵسۆزی کرد و بەراستگۆیی نووسیان، نووسینەکانیان لە ئاوەزی هەموو ئەوانەدا ماوە کە چاویان پێکەوتووە و لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا زۆر بە ئەرك و خەباتگێڕ بوونە.

لەلایەکی تری ئەم پێشکەوتنانەیان کە لە بوارێکی تردا ناوبانگیان سەند ئەویش شیعر بوو، کە ڕێبازێکی بەرچاویان خستە ڕوو لە بواری شیعری پەخشان، کێڵانەکانیان لە زەوییەکی پاکیزەدا بوو، کەشتییەکانیان هەڵگری جۆرەها ئەندێشە و نامۆیی بۆچوونەکان بوون کە لە زۆر لە شوێنە دوورکانەوە ڕێچکەیان دەبەست.

دەتوانم تایبەتمەندییەکی تریان بخەمەڕوو، کەهاوڕێیەتییەکی درێژ خایانیان هەبوو، بەشێکیان لە ناوەڕاستی پەنجاکان و بەشێکیان لە شەستەکاندا هەڵتۆقیون، ئەم هاوڕێیانە تا دوا ساتەکانی ژیانیان بەردەوام بووە.

لەبەردەم مرۆڤدا تەنها ئەوە دەمێنێتەوە کە ڕێز و نەوزاش بۆ سێکوچکەیی هاوڕێیەتی سەرگۆن پۆلس و ئەنوەر غەسانی و موئەیەد ڕاوی دابنێین، هەرچەندە هەر یەکەیان سەرگەردانی ئەو وڵاتە فراوانانە بوون، موئەیەد لە ئەڵمانیا و سەرگۆن لە ئەمریکا و غەسان لە کۆستاریکا، بەڵام هەموو دەم چاوپێکەوتنەکانیان دووبارە دەرکردەوە لە ڕۆژە جوانەکانی کەرکووك ڕووباری خاسە و شەقامی تەکساس کە ئەمەش بەڵگەی وەفای مرۆڤبوونی نیشتمانە، هەر وەکو ئەوەی لە کۆمەڵە شیعری دووەمی موئەیەد بەناوی (ممالیك) ڕەنگی داوەتەوە کە ئاخافتن لەگەڵ هاوڕێکانی دەکات ئەوانەی کە کۆچیان کردووە و لە ئاوەزیاندا ماوەتەوە.

فازڵ عەزاوی لە هەموو نووسەرەکانی (جماعە) دەوڵەمەندتر بوو کە هەموو دۆزەکانی ئەدەبی دەخستە ڕوو بەتایبەتی لە شیعری پەخشاندا و نووسینی ڕۆمانی دەوڵەمەند بە ڕووداوەکانی وەکو ئەوەی کە لە (آخر الملائكة) دا باسی سەردەمی منداڵی و گەنجی و تێکەڵبوونی ڕووداوەکان بە میسۆلۆجیای داب و نەریت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ڕووداوە مێژووییەکان پێویستە ئاماژە بەو یاداشتانەی بکەین کە لە (الروح الحیە) هەیە، کە دەیەوێت گۆڕەپانی ڕۆشنبیری شەستەکانی سەدەی ڕابردوو بخاتە ڕوو، لە هەمان کاتدا خاوەنی بەیانی شیعرییە کە لە کاتی خۆیدا لە گۆڤاری شیعر ٦٩ بڵاوی کردەوە لە عێراق لەگەڵ هەر یەکە لە سامی مەهدی، خالید عەلی مستەفا و فەوزی کەریم، ئەو بەیانە شیعرییەی بەرپەرچدانەوەی توندی لێ کەوتەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی (الروح الحية)ی عەزاوی و (الموجة الصاخبة)ی سامی مەهدی و (شعراء البيان الشعري)ی خالید عەلی مستەفا.

سەلاح فایەق، یەکێکە لەوانەی کە بەدڵسۆزییەوە ماوە لەو جیهانە شیعرییەی کە باکورەی ئەو شیعرەی دیوانەکەیەتی بە ناونیشانی (رهائن) لە ساڵی ١٩٧٥ لە دیمەشق بە چاپ گەیەنراوە، لەپای کتێبەکانی تری وەکو (ومضات)، (دببە في مأتم)، (نملة في جنازة) و گەلێکی تر، شاعیر ئاوەزێکی

بەپیتی هەیە كە وەكو كاریز هەڵدەچێت، زۆر یارمەتی وێنەی شیعری دەدات دەربارەی فەنتازیا و نامۆیی و سەرسووڕمان و بڕینی بەربەستەكانی باو هەر بۆیە شاعیرێكی وەكو (عەباس بیضون) وەسپی داوە بەوەی (كاهناً من كهان الشعر).

ئەوەی جێگەی ناخۆشییە لەم كۆمەڵە، بزربوونی كۆمەڵەی موئەیەد ڕاوی بوو بەناوی (نزهة في غواصة) كە لە ساڵی ١٩٦٩ لە بەشی چاودێریی عێراق بزر كرا، بەدەستنووسی مایە و ڕێگەی چاپكردنی نەدرا و شاعیر داوای نەكرد و چاپی نەكردەوە لە شوێنێكی تر، دەستنووسەكە بزر بوو بەڵام پارچە پارچەی لێرەو لەوێ بەدەردەكەوت، دەربارەی جەلیل قەیسیش هەر بەم جۆرە ڕۆمانێكی مایە و لەوانەیە تاكو ئێستاكە لەنێوان پاشماوەی دەستنووسەكانی مابێت و پێویستە ڕووناكی خۆی ببینێت.

ئەم هاوڕێیانە زۆرێك لەبەرهەمەكانیان لە بەشێكی زۆر لەم جیهانە بڵاوبوونەتەوە و پێویستی بەدەستێكی سپی هەیە بۆ ئەوەی كە هەموو ئەم بەرهەمانە كۆبكاتەوە و بیانگەڕێنێتەوە و شەن و كەونی بەرهەمەكانیان بكەن، لە هەمان كاتدا نزای تەمەن درێژی بۆ فایەق عەزاوی و سەلاح فایەق دەكەین كە بەردەوام بن لە جوانكاریی و نووسینەكانیان.

* سەرچاوە:-

- پاشكۆی ڕۆژنامەی (المدى) بەناونیشانی (تاتو)، ژمارە (٩٠) لە ٦ی شوباتی ساڵی ٢٠١٨، لاپەڕە (١٥).

## بەشی سێیەم

# زار و زاراوەکانی کەرکوك

سەرکەوت عەبدوڵلا حوسێن

ئـەوەی گرنگە بـەلای ئێـمـەوە شـێـوەزاری کـەرکـوك لەناو زارەکانی کوردیدا دیاری بکەین:
لـەلای تۆفیق وەهـبی شـێـوەزاری کەرکوك دەکەوێتە بەشی کرمانجی باشوور کە چەند لقێکی لێبووەتەوە وەك (موکری، سۆرانی، سلێمانی)و سنەیی هەروەها د. جەمال نەبەز زاری کەرکوکی لە بەشی کرمانجی ناوەراست دیار کردووە ئەویش چەند لقێکە وەك زارەکانی سلێمانیو موکریو سنەییو ئـەردەڵانـیو کەرکوکیو گەرمیانیو هـەولێریو سۆرانیو شاربازێری.
لای د. کەمال فوئـاد، شـێـوەزاری کـەرکـوك دەکـەوێـتـە بەر بەشی کرمانجی خواروو کە پێکدێت لە سلێمانیو سنەییو موکریو سۆرانی، کە دەڵێین سۆرانی مەبەست شێوەزارەکانی کەرکوكو گەرمیانیش دەگرێتەوە.
لـە نەخشەکەی مـیـهـرداری ئێزیدییە، کـە شـێـوەزارەکـانـی زمـانـی کـوردی دیـاری کـردووە، سەرەتا زمـانـی کـوردی لە چوارچێوەی لقی زمانی ئێرانی نـاو خێزانە زمانە هیندۆ ئەوروپییەکان دیاریی کردووە پاشان زمانی کوردی کردووە بە چەند زارێکی سەرەکییەوە شێوەزارەکانیشی بە وردی دەستنیشان کردووە کە ئەمانەن:
کرمانجی کردووە بە دوو بەش کرمانجی باکوورو کرمانجی باشوور، پەهلەوانی کە پێکهاتووە لە گۆرانیو زازایـی، لە شێوەزارەکانی کرمانجی باشووردا کە بە سۆران بەناوبانگە شێوەزارەکانی گەرمیانی باسکردووە.
سەرەرای ئەوەی زمانی عەرەبی زمانێکی فەرمییە لە کەرکوك زۆر بایـەخ و گرنگیی پـێـدراوە، زمـانـی کـوردیـش خۆی پاراستووەو تایبەتمەندێتی خۆی ڕاگرتووە وەك زمانێکی سەربەخۆ لەلایەن هەموو کوردێکی شاری کەرکوکەوە بە کارهاتووە جگە لە کاریگەری کۆمەڵایەتیو ئابووریو چەند هۆکارێکی تر بووەتە هێمایەك بۆ مانەوەی[1].
بە بۆچوونی ئێمە شێوەزاری کەرکوك شێوەیەکە لە زاری گەرمیان، چونکە کەرکوك دەکەوێتە سەر هێڵی پانی دەشتی گەرمیان، بۆیە بە گـەرمەسێر دادەنـرێـت، کەرکوك یـەکێکە لە شارە گەورەکانی باشووری کوردستان دەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵی پانی (٣٤ - ٣٦)و هەردوو هێڵی (٤٤ - ٤٦)و نێوان هەردوو زێی بچووكو سیروان، ئاوو هەوای کەرکوك لە هاویندا گەرمەو لە زستان دا مام ناوەندییە، (٣٣١)م بەرزە لە ئاستی ڕووی دەریاوە[2].
لەلای فوئاد محەمەد خورشید: پاش ئەوەی دیالێکتەکانی جیـاکـردووەتـەوە هـەر زارەی چەند ناوچەیەکی تـری لێ بووەتەوە کە ئەمانەن.
١-موکریو شنۆو نەغەدەو مەراغەو میانرواوو شاهێن دژو سەقزو بۆکانو بانەو سەردەشتو سۆرانو هەولێرو دەشتی هەولێر.
٢-ئەردەڵانیو سنەو بیجارو کەنگەوەرو جوانرۆ.
٣-سلێمانی (بابانی)و دەوروبـەری وە هەندێ ناوچەی خانەقین.
٤-گەرمیانیو کفریو قەرەتەپەو کەرکوكو دووزو شوان[3].
بـە بـڕوای ئێمەش شـێـوەزاری کـەرکـوك دەکـەوێـتـە بەشی شێوەزاری گەرمیان وەك باسمان لێوەکرد، چونکە ناوچەکە ناوچەیەکە گەرمیانە، گەرمیان ئەو ناوچانە دەگرێتەوە، کە لە کەرکوك بە خوارەوە قسەی پێ دەکەن تا دوا ئاوایی زاری ناوەراست[4].
* هۆزەکانی شاری کەرکوك:
شـێـوەزاری کـەرکـوك بەشێکە لـە شـێـوەزاری گەرمیان کە پێکهاتووە لە قسە پێکەرانی ئەو هۆزە سەرەکییانەی ناو شارەکەو دەوروبەری[5].
هۆزەکانی ئـەم ناوچەیە پێکهاتوون لـەو هـۆزو خێڵانە کە لە دەورووبـەری کەرکوك ناوچەی گەرمیانو ئەو ناوچانەی پێشوو سەر بە پارێزگای کەرکوك بوونەوە ئێستا دابراون بەهـۆی گـۆڕیـنی نەخشەی شـارەکـە بە پلانی ڕژێـمـەکـانـی پـێـشـووی عـێـراق، بۆیە شـێـوەزاری کـەرکـوك بەشێکە لە شێوەزاری گەرمیان کە پێکهاتووە لەم هۆزە سەرەکیانە:

١-هـۆزی زەنگـەنـە: ئـەم هـۆزە لـە کـەرکـوك‌و ناوچەکانی دەورووبــەری کەرکوك دا ئەژین ڕێژەیەکی زۆری شارەکە پێکدێنن. بۆ زیاتر بڕوانە[٦].

٢-هـۆزی جـەبـاری: ئـەم هـۆزەش لـەنـاو شـاری کـەرکـوك‌و گەرەکانی شۆریجەو قادسییەو حوریەو ئیسکاندا نیشتەجێن لە دەورووبــەری شارەکە کە سەر بە ناحیەی قادر کەرەم ئێستاش بووە بەناوی ناحییەی تەکێی جەباری.

٣-هـۆزی کاکەیی: ئەمانە لەسەردەمانێکی زۆر کۆنەوە نیشتەجێی شاری کەرکوکن بەتایبەتی بەهۆی بوونی چەند کەسایەتییەکی پیرۆزیان لە م شارەو لە دەورووبــەری وەك (ئیمام ئەحمەد) کە بووتە هۆی نیشتەجێ بوونیان لە دەوری ئیمامەکە وەك (موسەلا، چای)[٧]. بۆ زیاتر زانیاری لەسەر هۆزی کاکەیی‌و لێکۆلینەوە لەسەریان بڕوانە[٨]. هەروەها لە ئاواییەکانی دەورووبــەری کەرکوك‌و ناحیەی داقووق‌و تۆبزاوە عەلی سەرای نیشتەجێن.

٤-هۆزی شێخانی: ئەم هۆزەش لە شاری کەرکوك ناوچەی قادر کەرەم‌و گوندەکانی بۆڵەو قەلاّ و قەشقەو چەم سورخاو ژاڵا.. نیشتەجێن[٩].

٥-هۆزی داودە: ئەم هۆزە لەناو شاری کەرکوك‌و دەورووبەری کەرکوك دەژیـن وەك حەفتەغارو داقـوق‌و دووزخـورماتوو چەند گوندێکی تر.

٦-هۆزی تالەبانی: ئەم هۆزە نیشتەجێ کەرکوکن بەتایبەتی لـە گـەرەکـی بەرتەکییەو ئیسکان‌و شـۆریجـەو هـەروەهـا لە ناحیەی داقـوق‌و قـادر کـەرەم‌و لـەیـلان‌و قـەرە حەسەن، تالەبانییەکان لە (بەرتەکییە) تەکییەیەکی گەورەیان هەیە ئێستاش شێخ یوسف نوری کوری شێخ علی کوری شێخ جمیل ئەرکی بەڕێوەبردنی تەکییەکەی گرتووەتە ئەستۆ[١٠].

٧-هۆزی جاف: ئەم هۆزەش پێکهاتەیەکی گەورەی شاری کەرکوك پێکدەهێنن لە گەرەکەکانی کەرکوك دا نیشتەجێن بە تایبەتی گەرەکی شاترلوو هەروەها لە دەورووبەری کەرکوك‌و قەزای چەمچەماڵ‌و کفری‌و ناحیەی سەنگاو نیشتەجێن.

٨-هــۆزی هــەمــەوەنــد: ئـەمـانـەش نـیـشـتـەجـێـی شـاری کەرکوکن لەناوچەکانی چەمچەماڵ‌و دەورووپشتی بازیان بڵاوبوونەتەوە[١١].

٩-هـۆزی شـوان: ئەم هـۆزە لە دانیشتووانە کۆنەکانی ناو شـاری کەرکوکن گوندی شـوان لە ئەحمەد ئاغای کەرکوك بووە پاشان بووە بە گەرەکێك بەناوی خۆیانەوە[١٢].

١٠-هۆزی شێخ بزێنی: ئەم هۆزە لە گەرەکی ڕەحیماوا و دەورووبەری نیشتەجێن لەناو شارەکە لە دەرەوەی کەرکوك لە هەردوولای زێی بچووکدان لە گوندەکانی توتلی‌و قەرەسالم‌و کاولەسوار... نیشتەجێن.

١١-هۆزی سالەیی: ئەمانە لە سێ شوێندا هەن لەناوچەی گل‌و کەرکوك‌و قەرە حەسەن گوندی (سەرپیر)ی نزیك پردێ [١٣].

١٢-هۆزی ڕۆژبەیان: ئەم هۆزە زیاتر لەناو شاری کەرکوك لە گەرەکی شۆریجەدا نیشتەجێن شوێنی بنەرەتی خۆیان دێی فەرقان‌و تۆبزاوەو مەتارەو لەیلانەو کۆمەڵگای خەبات، خدر بەگ ڕۆژبەیانی سـەرۆك هـۆزی عەشرەتی ڕۆژبەیانی بوو لە سـەدەی دوانـزەی کۆچی لەناوچەی قـەرە حەسەن ناندەرێکی بە ناوبانگ بووە شوێنی بنەرەتی فەرقان بووە ئەم پیاوە ئاوی لە خاڵۆبازیانییەوە ڕاکێشاوە بەرەو لەیلان بۆ کشتوکاڵی‌و ماڵداری[١٤].

١٣-هـۆزی گل: ئەمانەش وەکو هەموو هۆزەکانی ناو شار پانتایەکی گـەورەیـان گـرتـووە لـە دەشتەکانی گـەرمیان‌و دەورووبەری کەرکوك (٥٠) گوندیان هەبووە لەناو شارەکەش زیاتر لە شۆریجەو حوریەو قادسییەن.

١٤-هـۆزی دەلـۆ: ئەمانە بەشێکیان لـە شـاری کـەرکـوك‌و بەشێکیان لە باوەو بەشەکەی تریان لەناوچەی شوانن ئەم ناوچەیە بە دەلۆی سەرخاسە بەناوبانگە[١٥].

١٥-هـۆزی بیبانی: ئـەمـانـەش لـە کـەرکـوك بەتایبەتی لە گەرەکی ڕەحیماوا‌و ئیسکاندا و لە دەورووبــەری کەرکوك دەژین مەڵبەندی سەرەکی ئەم هۆزە گوندی بیبانی گەورەیە، ژمارەی گوندەکانی (٣٦) گوندە، هۆزەکە دەکەوێتە نێوان هـۆزەکـانـی شـوان لـە ڕۆژهــەڵات‌و شێخ بـزێـنی لـە باکورو سالەیی لە ڕۆژئاواوە.

١٦-هـۆزی بـەرزنجی: ئـەم هـۆزە لـەنـاو شـاری کـەرکـوك لە ئیسکان‌و شۆریجەو حوریە لە دەورووبــەریـش لەناوچەی قادر کەرەم دان وە لە گوندەکانی عومەر گەدەو قەرەوەیس‌و ژاژوەو میرەسوورو عوسمان لەکەو پەلکانەو شۆریجەی شێخ عەبدولرەحمان.

١٧-هۆزی بابان: ئەم هۆزە بەشێکە لە هۆزی بابانی ڕەسەن کە لە دەورووبەری شاری سلێمانی بوون پاشان ئەم بەشەیان شۆڕبوونەتەوە بەرەو کەرکوك و لەناو شارو لە دەورووبەری ژیاون[١٦].

١٨-هۆزی گۆمەیی: ئەم هۆزەش لە دەورووبەری کەرکوك - دووز - داقوق- لەناو شاری کەرکوك لە شۆریجەو حوریە نیشتەجێن.

١٩-هـۆزی لـەك: ئەم ئەم هـۆزەش وەك هۆزەکانی تری ناو شاری کەرکوك بەشێکی پێکهاتەی ئەم شارە پێکدێنن لە گەرەکەکانی شۆریجەو حوریەو قادسییەو... نیشتەجێن.

٢٠- هۆزی زەند: ئەم هـۆزەش بەشێکی پێکهاتەی شاری کـەرکـوك پێکدێنن ئەمانەش لـە پـاشـمـاوەی لەشکرەکەی کەریم خانی زەندەوە مانەتەوە لەناو کەرکوك‌و دەورووبەری بڵاوبوونەتەوەو نیشتەجێ بوون[١٧].

٢١-هەروەها چەندین هۆزی تر لەم شارەدا نیشتەجێن وەك پالانی‌و قەلا سێوکەو ڕەباتی... لەناو شارەکەدا نیشتەجێن.

* دابەشکردنی شێوەزارەکانی شاری کەرکوك:

١- شێوەزاری گەرەکی ئیمام قاسم:

گەرەکی ئیمام قاسم گەرەکێکی کۆن‌و دێرینی شارەکەیە، یەکێکە لە گەرەکە هەرە کۆنەکان لە دوای گەرەکەکانی نێو قەلا مێژووی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٥٤٨)ی زایینی، ئەو سەردەمە ٢١ ماڵی لێ بووە[١٨]. هەروەها چەنین مزگەوتی دێرین‌و تەکییەی تیایە بەناوبانگترینیان مزگەوتی ئیمام قاسم‌و تەکییەی شێخ ئیبراهیم‌و شێخ عەبدولکەریمی کەسنەزانی ئەم تەکییەیە لە وڵاتی ئێران‌و سعودییەو پاکستان سەدان دەروێش ئەهاتنە زیارەتی شێخ،

هەروەها چەندین ناودارو نووسەر لەم گەڕەکە هەڵکەوتوون وەك ئەسیری و ڕەنجوری (گەڕەکە ئاوەدانەکانی خوار قەڵا لە سەرەتادا بریتیبوون لە ئیمام قاسم، ئاخور حوسێن، پریادی، چقور ئاوچی، موسەڵاو چای)[19].

دانیشتووانی ئەم گەڕەکە کوردن و بەزاری ناوەڕاست قسە دەکەن و هۆزەکانی جاف و زەنگەنە و شوانی و ساڵەیی لەم گەڕەکەدان و زیاتر خەڵکەکەی دانیشتووی سەنتەری کەرکوکن نەك دەورووبەری[20].

٢- شێوەزاری گەڕەکی ئیسکان:

کە دەڵێین ئیسکان مەبەست ئیسکانی تازەو ئیسکانی کۆنە، ئیسکانی کۆن لە ساڵانی پەنجاکان دروستکراوە لەلایەن ئینگلیزەوە شێوەی خانووەکان شێوەیەکی نوێیە لە بیناسازیدا بە خشت دروستکراوە، هەروەها ئیسکانی تازە ئەم گەڕەکەش لە ساڵانی شەستەکان دروستکراوە حکوومەتی ئەو سەردەمە زەوییەکانی دابەشکردووە بەسەر فەرمانبەران و پۆلیس و خەڵکی تردا، ئەم گەڕەکە مێژووی دروستبوونیان زۆر کۆن نییە گەڕەکێکی نوێیە دانیشتووەکانی زۆربەی کوردن، ژمارەیەکی کەم لە تورکمان و عەرەبی تێدایە، بەڵام ڕژێمی بەعس لە ساڵانی حەفتاکان و لە سەرەتای حەفتاکان بە تایبەتی دوو گەڕەکی بە ناوی (کرامە – حی موسەننا) دروستکرد لەناو چەقی ئەم گەڕەکانە بۆ شێواندنی دیمۆگرافیای شارە کوردییەکان.

هۆزەکانی (جاف و زەنگەنە و شوانی و جەباری و شێخانی و ساڵەیی و...) لەم گەڕەکانە جێ نیشینن شێوەی ئاخاوتنیان شێوەزاری سۆرانییە واتا زاری ناوەڕاست.

هەروەها گەڕەکەکانی ئازادی و پریادی و موسەڵاو ڕەحیماواو شاگراوو ئەڵماس و ڕێ ی بەغدا تەپەو...، ئەمانە هەموو بە زاری ناوەڕاست قسە دەکەن.

٣-شێوەزاری گەڕەکی شۆڕیجە:

گەڕەکی شۆڕیجە یەکێکە لە گەڕەکە کوردنشینەکانی شاری کەرکوك لە سەرەتای دروستبوونییەوە شوێنێکی گرنگ و بایەخدار بووە، گەڕەکی شۆڕیجە سەرەتا دێیەکی سەر بە کەرکوك بووە دواتر تێکەڵ بە شارەکە بووە پاش فراوانبوونی شارەکە[21]. ئەم گەڕەکە بوو بە سەنتەری گردبوونەوەی زۆربەی هۆزو خێڵەکانی سنووری قەرە حەسەن و قادر کەرەم و لەیلان و خاڵەبازیانی و داودە لەلایەکی ترەوە شوێنی کارکردن و مەیدانی ئیش کردن و کرێکاری بووە پاش دۆزینەوەی گەچ و قایەو دروستکردنی گەچ لە کورەکانی دەورووبەری کەرکوك وەك کورەکانی جەوەڵبۆرو لەیلان ئەمە وای کرد ئەم ناوچەیە گەشەو پەرەبسێنێ ببێتە بنکەیەکی ئابووری بەهێز بۆ ناوچەکەو کۆبوونەوەی هەزاران کرێکارو دروستبوونی دەستی کار لەناوچەکەو هاتنی هەزاران کەس بۆ ئەم شوێنە لەملاو ئەولای شارەکانی تری کوردستانەوە ئەمەش وای کرد بەناوبانگترین وەستای بیناسازی سپی کاری... لەم شوێنە هەڵکەوت ناودارترینیان لەناو شارەکە وەك عەودل سەرلەرزێن و وەستا ڕەشیدو سەید عەزیزو صابر شامارو سەید حەسەن.

هەروەها لە ڕووی کشتوکاڵییەوە لە ناوچەکانی قەرە حەسەن و لەیلان و خاڵوبازیانی و قادر کەرەمەوە بەرووبوومەکانیان ئەهێنایە ئەم گەڕەکەو ئەمەش هۆیەکی تر بوو بۆ کۆبوونەوەی هۆزەکانی گەرمیان لەم شوێنەدا وەك شێخان و زەنگەنە و کاکەیی و ڕۆژبەیانی و گل و جەباری و... لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەبەر ئەوەی کۆمەڵی کوردەواری پابەندن بە عورف و عاداتی کۆمەڵایەتییەوە زیاتر لە یەك شوێن کۆدەبوونەوە دەتوانین بڵێین هۆکاری ئابووری کۆمەڵایەتی هۆیەکی گرنگ بوو بۆ کۆبوونەوەی ئەم هۆزو خێڵانە.

لە شێوەزاری شۆڕیجەدا ئەم بێچووە شێوەزارانە کۆبوونەتەوە: بێچووە شێوەزاری کاکەیی، شێخانی، زەنگەنە، ڕۆژبەیانی، سیامەنسووری، کە شێوەی ئاخاوتنیان شێوەزاری گەرمیانی قسە ئەکەن لەگەڵ هۆزەکانی تری ناو گەڕەکەکە.

* بێچووە شێوەزارەکانی ناو شاری کەرکوك:

١- بێچووە شێوەزاری کاکەیی:-

ئەم بێچووە شێوەزارە بەشێکی فراوانی ناو شاری کەرکوکی گرتووەتەوە بە زمانی ماچۆ قسە دەکەن هەموو خێزانێکی کاکەیی پابەندن بە زمان و دابونەریتی ناو کاکەیی یەوە، هۆزی کاکەیی هەروەك دیارە کۆمەڵێ پرەنسیپ و داب و نەریتی خۆیان هەیە لەسەری ئەڕۆن و پەیرەوی دەکەن هەر تاکێکی ناو هۆزەکە لەو دەستوورە لانادەن[22].

زۆر بە وردی پەیرەوی زمانی خۆیان دەکەن گەورە و بچووکیان هەر بەم شێوەزارە قسە دەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی کاکەیی لە کەرکوك دا پانتایەکی گەورەی گرتووەتەوە لە شوێن و گەڕەکە جیاجیاکانی کەرکوك جێنشین بوونەو بۆیە ئەو کاکەییانەی لە گەڕەکی شۆڕیجە جێ نشینن بە شێوەزاری گەرمیانی قسە دەکەن لە دەرەوەی خێزانی خۆیان، هەر لە شۆڕیجە دا گەڕەکێك هەیە بەناوی گەڕەکی کاکەییەکان، ئەو کاکەییانەی لە گەڕەکی ئیسکان و ڕێی بەغدان بە شێوەزاری ئیسکان و ئیمام قاسم قسە دەکەن کاتێ لە سنووری شێوەزارەکەی خۆیان دەردەچن، ئەو کاکەییانەی نزیك گەڕەکە تورکمان و عەرب نشینەکانن کاریگەری ئەم زمانانە کاری تێکردوون، هەروەك لە نەخشەکەدا روون کراوەتەوە کاکەیی دابەش بوون و نیشتەجێ، بوونیان لە گەڕەکەکانی (غەرناتە و عروبە و شۆڕیجە و ئەلنەسر و عەسکەری و ئەلئەسراو ئەلمەفقودین و ڕێگەی بەغداو ئیسکان و موسەڵا چای ولە قەڵا) نیشتەجێن.

٢- بێچووە شێوەزاری زەنگەنە:-

هۆزی زەنگەنە لە کەرکوك و ناوچەکانی دەورووبەری کەرکوك نیشتەجێن ڕێژەیەکی زۆری دانیشتووانی شارەکە پێکدەهێنن، لە دوو لقی سەرەکی پێکهاتووە، سەرووی ئاوە سپی، باشوورو ڕۆژهەڵاتی کفری و ناوچەی سەرەکیی جێنشینی ئەم هۆزەیە[23].

هەروەها بەشێکن لە زەنگەنەی کوردستانی باشوور لە کفرییەوە بۆ کەلار، پارسایی و گۆران و کرمانجی باشوور[24].

زەنگەنە لە گوندەکانی مەلا هۆمەرو تەپە عەلی و خدران و شێخ لەنگەر قەرە بلاغو...، ئەمانە سەر بە ناحییەکانی پیوازو قەرەتەپەو سەر قەڵاو قادر کەرەمن، هەر لە ناحیەی قادر کەرەم هۆزی گەورەی زەنگەنەو جەباری و شێخانی و

بەرزنجەو گلو تاڵەبانی[٢٥]. لەناو ئەم ناحیەیەدا کۆبوونەتەوە. ئەم هۆزە پێکهاتەیەکی گەورەن لە شاری کەرکوك شێوەی قسەکردنیان زاری ماچۆیە کاتێ لەناو خێزانو کەسوکاری خۆیان دەبن بە شێوەزاری خۆیان قسە دەکەن کاتێ زەنگەنەیەك قسە دەکات شێخانییەك دەتوانێ وەڵامی بداتەوە جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان ئاخاوتنەکانیانەوە نییە تەنها چەند وشەو زاراوەیەك نەبێ ئەگەرنا بنەمای رستەکانو مۆرفۆلۆجیو سینتاکس لەم شێوەزارەدا وەکو شێوەزاری کاکەییو شێخانییە، کاتێ لە دەرەوەی سنووری خێزانی خۆیان دەردەچن بە تایبەتی ئەوانەی لە گەڕەکی شۆڕیجەن بە شێوەزاری شۆڕیجە قسە دەکەن واتە شێوەزاری گەرمیانی، ئەم هۆزەش لە گەڕەکەکانی (شۆڕیجەو ئیسکانو ئازادیو ئیمام قاسمو عەرفەو قادسییە)ن، لە زۆربەی زۆری گەڕەکەکانی ناو شاری کەرکوکدا نیشتەجێن، بەڵام لای نەوەی نوێ ئەم شێوەزارە سواوە کەم بەکاردێ تەنها لای ریش سپییەکان نەبێت.

٣- بێچووە شێوەزاری شێخانی:-

هۆزی شێخانی وەکو هۆزەکانی تری شاری کەرکوك بەشێکی گەورەی پێکهاتەی شارەکە پێکدەهێنن لە کەرکوكو دەوروبەری جێنشینن لە گوندەکانی قەڵا مکایلو قەشقە پولەو چەم سورخاو لەناو ناحیەی قادر کەرەمو نەورۆزو میل ناسر (کە ٨٠٪ شێخانە)و قەڵغانلوی چەند گوندێکی تر نیشتەجێن.

هەروەها لەناو شاری کەرکوکدا لە گەڕەکی شۆڕیجە زیاتر نیشتەجێن لە گەڕەکەکانی حورییەو قادسییەو ئیسکانو ئازادیو ڕەحیماواو ئیمام قاسمو ئەلعەسکەریو ئازار..).

ئەم هۆزە شێوەی ئاخاوتنیان زاری ماچۆیە، ڕۆنانی رستەیان هەروەك شێوەزارەکانی کاکەییو زەنگەنەیە تەنها لە ڕووی واتای وشەوە یان بڵێین جیاوازی چەند وشەیەك هەیە لەنێوانیان، قسەپێکەرانی ئەم شێوەزارە لەناو خێزانەکانیان دا بە شێوەزاری خۆیان ئەدوێن، بەڵام لە دەرەوەی خێزانەکانیان بە شێوەزاری گەرمیان قسە دەکەن واتا ئەوانەی کە لە سنووری شێوەزاری شۆڕیجەن. ئەو شێخانیانەی لە گەڕەکەکانی تری شارەکە جێنشینن بە شێوەزاری ئیسکانو ئیمام قاسم قسە دەکەن واتە زاری ناوەراست.

٤- بێچووە شێوەزاری ڕۆژبەیانی:-

ئەم بێچووە شێوەزارە بەشێکی شێوەزاری شۆڕیجە پێکدەهێنێت کە شێوەی شێوەزاری گۆرانە، بەڵام تێکەڵە بە وشەی تورکی وەك وشەی: کەمەر= بەرد، دام= خانوو.

قسە پێکەرانی ئەم بێچووە شێوەزارە شێوەزارێکی تایبەتی خۆیان هەیە زیاتر لەناو شاری کەرکوك لە گەڕەکەکانی شۆڕیجەو حورییەو قادسییە نیشتەجێن لە دەرەوەی کەرکوك لە دێی فەرقان کە جێی بنەڕەتی خۆیانە، هەروەها لە دێی مەتارە و لەیلانو هەردوو تورکەشکانی سەروو و خواروو تۆبزاوەو کۆمەڵگەی خەبات لە هەولێر. قسەپێکەرانی ئەم شێوەزارە لەناو خێزانەکانیاندا بە شێوەزاری خۆیان قسە دەکەن لە کاتی ئاخاوتندا بەتایبەتی لەنێوان خێزانەکانو نەوەی نوێ ئەم شێوەزارە زۆر بە وردی پابەندن بە دابو نەریتی خۆیانو پارێزگاری شێوەزارەکەیان کردووەو قسەی پێدەکەن، بەڵام لە دەرەوەی خێزانی خۆیان بە شێوەزاری گەرمیانی قسە ئەکەن.

٥- بێچووە شێوەزاری (عەجەمی) زاری باشوور:-

ئەم شێوەزارە لەناو کەرکوکدا پێیان دەڵێن عەجەمەکان زیاتر جێنشینی تەپەو عەرەفەو ئەڵماسو ساحە تەیارانن، چونکە ئەمانە زۆریان لەو خێزانانەن کە لە خانەقینو لە ئیسلام ئابادەوە هاتوون ئەمانە بۆ کار و کەسابەت لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك کاریان کردووە کە ئەوکاتە بە (IPC) ناوبراوە قسەپێکەرانی ئەم شێوەزارە لەناو خۆیاندا زۆر بە وردی پەیڕەوی زارەکەی خۆیان دەکەن گەورەو بچووك قسەی پێدەکەن، بۆیە هەر لە تەپە گەڕەکێك هەیە بەناوی گەڕەکی عەجەمەکانەوە ئەمانەش پێکهاتەیەکی گرنگی شاری کەرکوك پێکدەهێنن، بەڵام لە سنووری دەرەوەی خێزانەکانی خۆیان بە شێوەزاری ئیسکانو ئیمام قاسم قسە دەکەن. شێوەی قسەکردنیان زاری باشوورە واتا فەیلیو خانەقینە.

٦- بێچووە شێوەزاری شوانی کێشك:-

هۆزی شوان هۆزێکی گەورەی ناو شارەکەیە ئەم شێوەزارە دەکرێتە دوو بەشەوە: شوانی سەر خاسەو شوانی کێشك، (شوان گەلە هۆزێکی گەورەیە لە باکوری کەرکوك لەنێوان رووباری خاسەو زێ نیشتەجێن)[٢٦].

أ- شوانی سەرخاسە: کە پێکهاتووە لە گوندەکانی (ئیلجاغو ئۆمەرمەندانو تورکمان باغو مەحمە خانو قادر علی ئۆمەر بەگو قەرەبلاخو قەمەرو مام ڕەشو چەند گوندێکی تر) شوانی کێشك لەم گوندانە نیشتەجێن.

ب - شوانی کێشك: لەم گوندانە نیشتەجێن (جەوە جەوەو قولی بەگو تۆراغو دووبزنیو قادر زەمەو حەسار تەهاو کارێزو بیراڵكو عەلی بەیانو دارەختیارو تەرەقەو دووشیوانو نەیبەسەرەو ناڕوجەی حاجی جەرجیسو ناڕوجەی ئەحمەد ڕەجەبو ناڕوجەی حەمە بلەو تەپە کوڕەی سەروو و تەپە کوڕەی خواروو).

تێکرای گوندەکانی هۆزی شوان ژمارەیان (٧٥) گوندەو (١٧) گوندیان بە شێوەزاری زاری باشووری قسە دەکەن وەکو شێوە زاری خانەقینو بەدرەو سعدییەن[٢٧].

هەروەها لەناو شاری کەرکوك لە گەڕەکەکانی ڕەحیماواو تەپە نیشتەجێن لە گوندی (کتکە) کە لەناو سالەییە بە هەمان شێوەزاری شوانی کێشك قسە دەکەن.

" شێوەزاری شوانی کێشك لە ڕووی جیاوازی ڕێزمانییەوە سەر بە کۆمەڵەی زاری کوردی باشورییە کە ڕێزمانی تایبەت بەخۆی هەیەو جیاوازە لە زارەکانی تری زمانی کوردی.

٧- بێچووە شێوەزاری سیامەنسوری:-

ئەم بێچووە شێوەزارە بەشێکە لە پێکهاتەی گەڕەکی شۆڕیجە سەرەتای جێنشینیان لە دێی سیامەنسوور بووە لە ناوچەی قەرەحەسەن. کە پێکهاتووە لە دوو ئاوایی (ئاوایی سیامەنسوری کۆنو سیامەنسوری تازە) ئەمانەش وەك هۆزەکانی تری ناو شارەکە دابەشبوون بەسەر گەڕەکانی

شۆڕیجەو حوریەو ئیمام قاسمو ڕەحیماوا، هەروەها لە شارەکانی تری کوردستان نیشتەجێن لە بەغداش بەتایبەتی چەند خانەوادەیەك هەن تا ئێستاش پابەندن بەکارهێنانی ئەم بێچووە شێوەزارە لەناو خێزانەکانیان دا، هەر ئەم بێچووە زارەش بەشێکە لە زاری گۆران و بەشێکە لە زارەکانی شاری کەرکوك. لە کۆتایی ئەم بەشەدا لەناو شاری کەرکوك دا دوو شێوەزاری بنەرەتی قسەی پێدەکرێت: شێوەزاری ئیسکان و ئیمام قاسم، شێوەزاری شۆڕیجە.

شێوەی ئاخاوتنی کاکەیی و سیامەنسوورو شێخان و زەنگەنەو زۆر لە یەکەوە نزیکن لە ڕووی سینتاکس و عەرەبی شێوەزاری باشوور دەبێتەوە وەك: مێشم – لاکام را چیت – ئۆما – نان ئامۆڕن...

هەروەها بێچووە شێوەزاری شوانی کێشك و بێچووە شێوەزاری عەجەم – فەیلی ئەمانەش سەر بە زاری باشوورن ڕۆنانی ڕستەیان جیاوازە لەگەڵ زاری ناوەڕاستدا بۆ بەراورد لەنێوان بێچووە شێوەزارەکاندا.

هەروەها ناوچە تازەکان وەك دەورووبەری شۆڕیجەو مەلعەبەکەو پەنجا عەلی و فەیلەق و ئەمانەش کە ئاوارەی گەڕاوەی پاش پرۆسەی ئازادین هەریەك لەوانە لە ناوچەی جیا وشاری جیاوە گەڕاونەتەوەو شێوەو شێوەزاری نوێیان

بێجوە شێوەزارەکانی ناو شارەکە بەم شێوەیەیە:

کەرکوك

| کاکەیی | شێخانی | زەنگەنە | ڕۆژبەیانی | شوانی کێشك | عەجەم (فەیلی) | سیامەنسوری |
|---|---|---|---|---|---|---|

فۆنەتیکەوە تەنها چەند وشەیەك نەبێت لەنێوان ئەم بێچووە زارانەدا بەدی دەکرێت ئەم چوار بیچوە شێوەزارە سەر بە زاری گۆرانن کە بە زمانی ماچۆ ناو دەبرێت، بەڵام بێچووە شێوەزارەکانی تری ناو شارەکە بە تایبەتی بێچووە شێوەزاری ڕۆژبەیانی جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ شێخان و زەنگەنەو سیامەنسوورو کاکەیی دا هەیە کە تێکەڵ بە وشەی تورکی و هێناوەتە ناو ئاخاوتنی شاری کەرکوکەوە. ئێستا جگە لە زمانی فەرمی کە زمانی کوردی و عەرەبی هەر نەتەوەیەك لە تورکمان و کلدو ئاشوور سەرەڕای ئەوەی قوتابخانەی تایبەت بە خۆیان هەیە لە شارەکە لەناو دامودەزگاکانی حکومەتی عێراقی فیدراڵ لە شاری کەرکوك زمانیان دانی پێنراوە.

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**

Mmohamad amin qadir، the linguistic-1 situation in kirkuk asociolinguistic study page٢٨٨.

٢- بورهان ئیبراهیم رزگاری، کەرکوک و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٥٨-١٩٦٨ کەرکوک، ژمارە(٤) سالی ٢٠٠٣.

٣- فوئاد حەمە خورشید، زمانی کوردی و دابەشبوونی جوگرافیای دیالێکتەکانی لاپەرە(٦٣).

٤- عەبدوللا حوسێن رەسول، مێژووی شێوەزاری گەرمیان، لێکۆلینەوەیەکی زمانەوانی مێژوویيە، گۆڤاری زانکۆیا دهۆك، پەربەند٥، ژمارە ١، لاپەرە١.

٥- د. رەفیق شوانی، زارە جیاوازەکانی پارێزگای کەرکوک و کاریگەری راگوێزن بەسەریانەوە، لاپەرە ١٠٧، گۆڤاری هاواری کەرکوك، ژمارە ٥، ٢٠٠١

٦- هاشم عاسی کاکەیی، بەرکولێك لە مێژووی زەنگەنە کەرکوك و شێوەزارەکانی زمانی کوردی، لاپەرە ١٦٣.

٧- گۆڤاری کەرکوك، ژمارە ٤، سالی٢٠٠٣.

٨- د. نوری یاسین هەرزانی، الکاکیة دراسة انتروبولوجیة والاجتماعیة، لاپەرە ٤٩

٩- قاسم یاسین وعدنان داود، التوزیع الجغرافي للعشائر في لواء کرکوك لاپەرە ٦٩

١٠- گۆران فەتحی، کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت، مزگەوت و تەکێ و خانەقا دێرینەکانی کەرکوك، ٢٠٠٣

١١- د. نوری تالەبانی، منطقة کرکوك ومحاولات تغیر القومیة، ص١٣٣

١٢- اطلس کرکوك، التوزیع الجغرافي للعشائر في لواء کرکوك، ص٦٩

١٣- گۆران فەتحی، کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت، مزگەوت و تەکێ و خانەقا دێرینەکانی کەرکوك، ٢٠٠٣

١٤- محەمەد جەمیل رۆژبەیانی، المعروفون من الروزبیانیة في الکتب التاریخیة، ص٣٠٠

١٥- بورهان ئیبراهیم رزگاری، کەرکوك و بزووتنەوەی رزگاری خوازی کورد ١٩٥٨-١٩٦٨ کەرکوك، ژمارە(٤) سالی ٢٠٠٣.

١٦- فوئاد حەمە خورشید، العشائر الکردیة، مطبعة الحوادث، بەغداد ١٩٧٩

١٧- ظاهر علی، کەرکوك لە کۆنەوە تا ئەمرۆ، نضال الطلبة، مجلة ثقافیة، العدد(١١) سنة،١٩٧٣

١٨- گۆران فەتحی، کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت، مزگەوت و تەکێ و خانەقا دێرینەکانی کەرکوك، ٢٠٠٣

١٩- عەلی مەحموود محەمەد، کەرکوك شاری قەلا و ئاگر و خوێن، رێگا چارەسەرە، لاپەرە١١٣.

٢٠- موعتەسەم سالەیی، ناودارانی گەرەکی ئیمام قاسم لە شاری کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك ژمارە٤، سالی ٢٠٠٥.

٢١- گۆران فەتحی، کەرکوك بۆ مێژوو دەدوێت، مزگەوت و تەکێ و خانەقا دێرینەکانی کەرکوك، ٢٠٠٣

٢٢- د. نوری یاسین هەرزانی، الکاکیة دراسة انتروبولوجیة والاجتماعیة، لاپەرە ١٧٢

٢٣- سەباح ئارام، هاواری کەرکووك، ژمارە٢، لاپەرە ٨٩، شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ و خوێندنەوەی نوێ.

٢٤- میهردادی ئیزدی، چەردە باسێك لەبارەی کوردانەوە، لاپەرە٢٠١

٢٥- مستەفا زەنگەنە و شاهۆ ئیسماعیل، قادر کەرەم، تێروانینێکی هەمەلایەنانە، هاواری کەرکوك، ژمارە(٢) لاپەرە٧١.

٢٦- میهردادی ئیزدی، چەردە باسێك لەبارەی کوردانەوە، لاپەرە ٢٠٠

٢٧- هاواری کەرکوك، ژمارە (٢)، لاپەرە، هۆزەکانی شوان - شێخ بزێنی - سالەیی - بیبانی، ئاماری سالی ١٩٥٧، ئا- هاواری کەرکوك.

٢٨- د. رەفیق شوانی، گۆڤاری زانکۆ، زاری شوانی، لاپەرە٢٤، ژمارە (٢٠)ی سالی ٢٠٠٧

*** دروستەی سینتاکسی لە شێوە ئاخاوتنی ناوچەی کەرکوکدا.**

**سیروان سەمین ئەحمەد.**

**ناوچەی کەرکوك فرە پێکهاتەو فرە زمانە لەناو زمانی کوردیشدا، کۆمەڵێك شێوەزار لەخۆ دەگرێت، بەپێی ئەو دابەشکردنانەی بۆ زارەکانی زمانی کوردی کراوە، ناوچەی کەرکوك قسەپێکەرانی زاری گۆران، کرمانجی ناوەڕاست، کرمانجی باشووری لەخو دەگرێت.**

**لە شێوە ئاخاوتنی کەرکوکدا ڕستە لە رووی ریزبوونی کەرەستەکانییەوە، جیاوازییەکی زۆری نییە لەگەڵ زاری کرمانجی ناوەڕاست، واتە ڕستە لەم شێوە زارەشدا بە سیستەمی (S. O. V)یە، بەڵام جیاوازییەکانی زیاتر ئەرك و جێکەوتەی کلیتیکی ڕێکەوتن دەبینرێت.**

**لە شێوە ئاخاوتنی کەرکوکدا ئامرازی خستنە پاڵی (ی) دەرناکەوێت، کاتێك ناوە دەرخراوەکە بە کۆنستانت کۆتایی هاتبێت، بەڵام ئەگەر ناوە دەرخراوەکە بە ڤاوڵ کۆتایی هاتبێت ئاسایی ئامرازەکە دەردەکەوێت.**

**لە شێوە ئاخاوتنی کەرکوکدا، ریزبوونی کلیتیك لە دروستەی مۆرفۆسینتاکس بەپێی جیاوازی تاف دەگۆڕێت بە جۆرێك لە کاری رابردووی تێپەڕ کلیتیکی دەستەی (م. مان، ت، تان، ی، یان) ئەرکی بکەری و بەرکاری دەبینن، بەردەوام کلیتیکی بەرکاری دێت و بەدویدا کلیتیکی بکەری دێت.**

**جیاوازی تاف و تێپەڕی و تێنەپەڕی کردار دوو چەشنی کلیتیکی بکەری لە شێوە ئاخاوتنی کەرکوکدا دێنێتە ئاراوە بەجۆرێك لە تاڤ رابردووی تێپەڕدا کلیتیکی دەستەی (م. مان، ت، تان، ی، یان) ئەرکی بکەری دەبینێت، لە تافەکانی تردا کلیتیکی دەستەی (م. ین، یت. ن، ێت/ ات. ن) ئەرکی بکەری دەبینن، بەڵام لە شێوە ئاخاوتنی شوانی کێشکدا جیاوازی تاف و تێپەڕی تێنەپەڕی جیاوازی چەشنەکانی کلیتیك ناهێننە ئاراوە، بەجۆرێك یەك دەستە کلیتیکی بکەری هەیە، لە تاڤ رابردووی تێپەڕیش ئەوە دەستەیە ئەرکی ڕێکەوتنی بکەری دەبینن.**

**لە شێوە ئاخاوتنی شوانی کێشکدا، ریزبوونی کلیتیك لە دروستەی مۆرفۆسینتاکسدا بەپێی جیاوازی تاف ناگۆڕێت، بەردەوام کلیتیکی دەستەی (م. مان، ت. تان، ی. یان) ئەرکی بەرکاری و کلیتیکی دەستەی (م. ین، یت. ن، ێت/ ات. ن) ئەرکی بکەری دەبینن و بەجۆرێك بەردەوام کلیتیکی بکەری دێت بەدوایدا کلیتیکی بەرکاری.**

**لە شێوە ئاخاوتنی کەرکوکدا گواستنەوەی کلیتیکی بکەری لە کاری رابردووی تێپەڕدا لەسەر جێکەوتەی کردارەوە بۆ سەر جێکەوتەی بەرکار گواستنەوەیەکی خورتییە، بەڵام لە شێوە ئاخاوتنی شوانی کێشکدا گواستنەوەی خورتی بوونی نییە بەهۆی ئەوەی یەك دەستە کلیتیکی ڕێکەوتنی هەیە کلیتیکی بکەری لە جێکەوتەی چەسپاوی خۆی دەمێنێتەوە، کە جێکەوتەی کردارە.**

**کرتاندن بەپێی یاساو دەستووری زمان ڕێگە پێدراوە، جگە لە کرتاندنی بکەرو بەرکار... لە شێوە ئاخاوتنی شوانی کێشکدا ئەسپێکتی (دە) بەردەوامیش بە ئارەزوو دەکرتێنرێت.**

**پریپۆزیشنەکانی (لە، بە بۆ) کاتێك بە جێناوی لکاو جێگیر دەکرێن، لە شێوە ئاخاوتنی کەرکوکدا فۆرمەکانیان دەگۆڕێت بۆ (پێ، تێ، لێ) بە لە شێوە ئاخاوتنی شوانی کێشکدا فۆرمەکانی (لە، بە، بۆ) هیچ گۆڕانێکیان بەسەرنایەت و وەکو خۆیان دەمێننەوە.**

*** زارە جیاوازەکانی پارێزگای کەرکووك و کاریگەری ڕاگوێزان بەسەریانەوە.**

**د. ڕەفیق شوانی**

پەیدابوونی زار لە زماندا، شتێکی سروشتییە، کەمو زۆر لە هەموو زمانێکدا، زار پەیدا دەبێت: لە سەرەتاوە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی قسەکردن لەناو زمانەکەدا، پاشان ئەم جیاوازییە بەهۆی باری سیاسیو جیاوازی باری کۆمەڵایەتی و جوگرافی و جیاوازی سروشتییەوە[1].

دەبێتە هۆی دروستبوونی زارو، ئەمەش بەهۆی گۆڕانو پێشکەوتنی کۆمەڵ و زیادبوونییەوە، بە تایبەتی فراوانبوونی ڕووبەری شوێنی قسەکردنی زمانەکە، وەك لە ناوچەیەك یا، ئەو زارانە بەرەو فراوانی دەچن[2].

گەشە دەکەن و زار لە زمانەکەدا زیاد دەبن لە هەندێك زماندا زار زیاترە، ئەویش بەهۆی بارودۆخی نەتەوەو وڵاتەکەوە، بەتایبەتی بۆ نەتەوەیەکی وەکو کورد، کە زمانەکەی خۆی لە خۆیدا زاری زۆرە، ئەمەش بەهۆی سروشتی ئاڵۆزی وڵاتەکەیەوە جیاوازی پلەی کۆمەڵایەتی میللەتەکەی، باری سیاسی نەتەوەی کوردیش بەهۆی دابەشکردن و دابرانی وڵاتەکەیەوە، بۆ چوار بەش و بۆ ژێر دەسەڵاتی سێ نەتەوەی جیاوازی وەکو عەرەب و تورك و فارسەوە، لە هەر بەشێکیدا یەکێك لەو سێ زمانە کاری لە زمانەکەی کردووەو زیاتر زارەکانی زمانی کوردی، ناوچە جیاوازەکانی لە یەکتر دوور خستووەتەوەو دیاردەی زۆربوونی زار لە زمانەکەیدا گەشەی کردووەو کۆمەڵی کوردیشی لە یەکتر دابڕیوەو شێوەیەکە، کە بەهۆی جۆری دەربڕینەوە کوردی پارچەکانی کوردستان لە یەکتر جیا دەکرێتەوەو کاریگەری زمانی نەتەوە دەسەڵاتدارەکەی پێوە دیارە، ئەمجا زۆربوونی زارە کوردییەکانیش لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازی هەیە، لە هەندێك ناوچە زارێك یا زیاتر هەیە، وەکو لە سنووری پارێزگایەکدا چەندین زاری جیاوازی گرتووەتە خۆی[3].

دەبینین لە پارێزگایەکی تردا زاری کەمترە[4].

سنووری پارێزگای کەرکوك، لەڕووی بوونی زاری جیاوازی زمانی کوردییەوە، ناوچەیەکە فرەزاری پێوە دیارە، زارەکانیشی بە شێوەیەکە، کە هەریەکەی سەر بە دیالێکتێکی گەورەیەو لە سەردەمێکی مێژووییدا زمانی ئەدەبی بووەو خاوەن شیعرو ئەدەبیاتی خۆی بووە، زارەکانی پارێزگای کەرکوك، لە ناوچە جیاجیاندا جیاوازییان بەرادەیەکی زۆر زەحمەت یا لە یەکتری تێناگەن، مەگەر بەزارە گشتییەکەی قسە بکەن ئەویش زاری گەرمیانی و کەرکوکییە.

لەم باسەدا هەوڵ ئەدەین زارەکانی ئەم پارێزگایەو شوێنی قسەکردنیان دیاری بکەین، جیاوازی نێوانیانیش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ڕێزمانی، بەرادەیەکی زۆر کەمیش بۆ جیاوازی جوگرافی، لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ هۆی کۆچکردن[5].

وبوونی خێڵ و هۆزی جیاواز لە ناوچەی گەرمیان و پارێزگای کەرکوکدا، کەم پارێزگا هەیە وەکو ئەم پارێزگایە هۆزی زۆری لێبێت وەکو: شوان، تاڵەبانی، ساڵەیی، بیبانی، شێخ بزینی، جاف، داودە، کاکەیی، گل، جەباری، شێخانی و بەرزنجەیی، زەنگنە، پاڵانی، قەڵاسێوەکەیی، دەلۆ، هەمەوەندی، ڕۆژبەیانی، سیامەنسوری، لەك، کەلوڕی، زۆربەی ئەم هۆزە کوردانەی کەرکوك بەزاری جیاوازی جیاواز قسە دەکەن و زاری جیاوازی خۆیان هەن زارەکانیشی ئەمانەن: شوانی، کاکەیی و زەنگنەو جەباری و شێخانی (زمانی ماچۆ قسە دەکەن)، گەرمیانی، کەرکوکی، جاف[6].

شێخ بزێنی، بیبانی، کەرکوکی، گەرمیانی،[7] شۆڕیجەیی ...هتد.

ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە، کە زۆربوونی ئەم زارە جیاوازانەی سنووری ئەم پارێزگایە، ڕەسەنایەتی و کوردبوونی ناوچەکە لەڕووی مێژووییەوە دەگەیەنێت، بەوەی، کە لە بنچینەوە شوێن و زێدی باوباپیرانی کوردەو خەڵکانی تریش غەوارەن و باری سیاسی و ئابووری بوونیایی لەوێدا قوتکردۆتەوە.

لەلایەنێکی تری سەنجراکێش لەم لێکۆڵینەوەیەدا، بۆ کوردێتی ئەم ناوچەیە، بوونی زاری کاکەیی و شێخانی و زەنگنەیە، کە هەرسێکیان دیالێکتی گۆرانی ئەسڵ پێکدێنن[8].

زمانی ئایینی کاکەیە (ئەهلی حەق - یا ئایینی یارسان) بەزارێکی ناوچەی کەرکوك، ڕێورەسمی بەڕێوەدەچێت، ئەمەش لە ڕووی ئایینەوە دیسان کۆنی و بنچینەی کورد لەم ناوچەیە دەسەلمێنێت، کە یەکێك لە ئایینەکانی زایندەی نیشتمانی کورد، تیایدا بڵاوبووەتەوەو کتێبی پیرۆزی (یارسان)، (دەورەی بە هلول) ئەم ئایینەی پێ بڵاوبووەتەوە[9].

سنووری پارێزگای کەرکوك، کە مەڵبەندی زارە جیاجیاکانی زمانی کوردییە دەکەوێتە نێوان پارێزگاکانی هەولێرو موسڵ و تکریت و دیالەو سلێمانییەوە، ئێستا تووشی سیاسەتی چەوتی ڕاگوێزان بووەو لەگەڵیدا هەموو دیاردەکانی ئەم پارێزگایەی گرتووەتەوەو ناوچەیەکی فراوانی کردۆتە باڵە مێشێك.

*** زارەکانی سنووری پارێزگای کەرکوك**

شوانی: بریتییە لە زاری شوان، شوانی کێشك، لە بنەڕەتدا دووەمیان سەر بە زاری کوردی باشووری لوڕییە [10].

لە ئەنجامی سیاسەتی کۆچ پێکردنەوە، بەتایبەتی بەشی شوانی کێشك، لە سەرووی ڕۆژهەڵاتی کەرکوك قسەی پێدەکەن و لەڕووی جیاوازی ڕێزمانییەوە، سەر بە زاری کوردی باشوورییەو جیاوازە لە زارەکانی تری سنووری پارێزگای کەرکوك، مەڵبەندەکەی دێی ڕێدارە ٢٥کم لە کەرکوکەوە دوورە ئەم هۆزە بەشێکە لە هۆزی بەناوبانگی کوردی شوانکارەیی کە لە ناوچەی لوڕستان تا سەدەی پێنجەمی کۆچی دەوڵەتی گەورەیان هەبووە پاشان لەلایەن سەلجوقییەکانەوە ڕووخاون[11].

لە زاری خانەقین و سنەیی و گەرووسییەوە زۆر نزیکەو

ئەگەرچی جیاوازی کەمی ڕێزمانی بەتایبەتی لەڕووی دەنگسازیو ڕستەسازیەوە هەیە.
ئەم زارە بەهۆی سیاسەتی ڕاگوێزانەوە، لە بیری نەوەی ئێستا چووەتەوەو بە زارە گشتیەکەی ناوچەی کەرکوک قسە دەکەن، بەلاّم لەلای خەڵکی بەساڵاچوّوە لە بیر نەچووەتەوە، زۆر بە کەمی بەکاردێت، زیاتر بە زاری خەڵکە زۆرە کە قسە دەکەن بەهۆی سیاسەتی ڕاگوێزانەوە لە دوای ئەنفالەوە لە ساڵی (١٩٨٨)ەوە بەرەو نەمان بووەتەوە.
کاکەیی: ئەم زارە لە ناوچەی کاکەیی دێهاتی داقوق لە باشووری شاری کەرکوك لەلایەن هۆزی کاکەییەوە قسەی پێدەکەن.
لەڕووی ڕێزمانو قسەکردنەوە بە زارێکی دیالێکتی گۆران دادەنرێتو بە زمانی (ماچۆ) بەناوبانگەو لەگەڵ شێخانیو جەباریو زەنگەنەی نزیك کفری گۆرانی ئەسل پێکدێنن.
لە دێهاتی وەك: عەلی سەرا، توّپزاوە، زەنقر، عارەب کۆیی... هتد، خەڵکی ئەم ناوچەیە، بەزۆر کراون بە عارەب.
دابو دەستووری ئایینی کاکەیی (ئەهلی حەق) بەم زارە بەڕێوەدەچێتو لەگەڵ زەنگەنەو شێخانیدا گۆرانی ئەسل پێکدێنن زایندەی ئەم ئایینەن، لە باوەشی چیای زاگرۆسدا بلاّوبووەتەوەو باوەڕیان بە نەمری هەیەو (سوڵتان سەهاك) بەرزترین پلەی ئایینەکەیانە پاش خوای پەروەردگار، ئەم زارە شیعرو ئەدەبیاتو پەندی یەکجار زۆری هەیە، ئایینەکەی لە زۆر شوێنی تردا بلاّوە، وەکو لە ڕۆژهەلاّتی کوردستان بەتایبەتی لە هەندێك مەڵبەندی سەرەکی ئایینی ئەهلی حەقە، نەك زارێکی دیالێکتی گۆران بێت [١٢].
ئەم زارە لە دوای ساڵی (١٩٨٨)ەوە بێجگە ئەوانەی لە ناوچەکە ماونەتەوە بەهۆی سیاسەتی ڕاگوێزانو ئەنفالەوە لە ئوردوگا زۆرەملێکاندا لای نەوەی نوێ لەبیر چووەتەوەو مەگەر دەگمەن نەبێت، بەلاّم لەلای نەوەی پێش بەرپاکردنی ئەم سیاسەتە زارێکی ئاساییە لە قسەکردنیدا، گەورەترین شاعیریان هیجری دەدەیە [١٣].
هونەرمەند حوسێن عەلی خەڵکی ئەم ناوچەیەیە لە دێی (حەفتە غار).
جەباریو زەنگەنەو شێخانی: لە ناوچەکانی (شێخانی) ی قادر کەرەم، بریتییە لە (١٩) ئاوایی (١٤) ناوچەی زەنگەنە، بەتایبەتی زەنگەنەی نزیك کفری (گۆرانی ئەسڵە) لە ڕۆژهەلاّتی شاری کرماشانیش بەکاردێتو مەڵبەندەکەی (گەهوارە)یە بۆ ئایینی ئەهلی هەق (کاکەیی) ئەم زارانەی ناوچەی کەرکوك لەگەڵ هەورامیدا جیاوازییان زۆر کەمەو بە زمانی (ماچۆ) ناوبانگی دەرکردووە، لە ناوچەی قەرە حەسەنو جەباری لە باشووری ڕۆژهەلاّتی شاری کەرکوك قسەی پێدەکەن شاعیری ناودار مەلا فەتاحی جەباری، کە بە دیالیکتی گۆران، هەورامی شیعری نووسیوەو دیوانی هەیە، سەر بەم زارەیەو خەڵکی جەبارییەو زاری گفتوگۆکردنی بووە.
مەقامی ڕەسەنی کوردی لەم ناوچەیەدا سەری هەڵداوەو بەم زارەش ئەو مەقامە جیاوازانەی گەرمیان دەوترێت وەکو خاوکەر، خورشیدی، قەتار، ئای ئای ... هتد ئەمەش بەڵگەیەکی زیندووی کوردبوونی پارێزگای کەرکوك دەگەیەنێتو ئەم گۆرانییانەش لە ناو شاری کەرکوکدا زۆرباوەو لە تەکیەو خانەقا کوردییەکانی شاردا جاران باوبوونەو گەرەکی شۆڕیجەی کەرکوك، بەر تەکیە لە کەرکوکدا نموونەی ئەم بۆچوونانەنو گۆرانیو مەقام بێژانی وەکو عەلی مەردان، سەلاّح داودە، حەمە درێژ هەن.
ناوچەکانی ئەم زارە لەرابردوودا شوێنی سەربازی بووە و لە خاوەنی حەرام کراونو خاوەن سامانێکی دەوڵەمەندی فۆلکلۆرو شیعر پەندی کوردینو زارەکەش لەلای نەوەی نوێی ئۆردوگا زۆرەملیکاندا، لە پاش ڕاگوێزانیو ئەنفالی ساڵی (١٩٨٧)ەوە لەبیرچووەتەوە خەڵکی ناوچەکەش بە شێوەی کەرکوکیو گەرمیانیش قسە دەکەن، ئەم سێ زارە لەگەڵ کاکەیی دەکرێ بڵێن (گۆرانی ئەسڵ) پێکدێنێ.
جاف: هەندێکی لە ناوچەی سەنگاوی سەر بە قەزای چەمچەماڵ پارێزگای کەرکوك، قسەی پێدەکەنو بە جافە ڕەشکە بەناوبانگن، ئەویش لە هەموو دێهاتەکانی نا، چونکە دێهاتی: زەنگەنەشی بەردەکەوێتو لە ناوچەی شارەزووریش قسەی پێدەکەن[١٤].
لە ئێستادا سەر بە شاری سلێمانییە وەکو ناوچەی کارگێری، هەروەها لە کەلار، کولەجۆ، جوانرۆ، بە زاری زۆربەی تیرەکانی جاف دادەنرێت، جاف شارەزوور، دێی، (بویەر)ی ژاوەرۆی سنە وەکو زاری جافین. ئەم ڕەسەنایەتییە بوونی جاف لە کەرکوك پەیوەندی کەرکوك بە ناوچەی کوردییەکانی ترەوە دەگەیەنێ.
گەرمیانی:[١٥] دەتوانرێت ناوچەی باشوورو باشووری ڕۆژهەلاّتی کەرکوك، خورماتوو، کفریو کەلار، قەرەتەپە، سەرقەلاّ، پێباز، ناحییەی مەیدانو هۆرێن ئەو شوێنانەی کە سەر بەم ناوچانەن بێجگە لە زارە سەرەکییەکەی کاکەییو شێخانیو زەنگەنە کە لەڕووی جوگرافییەوە سەر بەم ناوچەیەن بەم زارە گشتییەی گەرمیانیش قسە دەکەن، ئەم زارە زیاتر زاڵە بەسەر شێوە زارەکانی تری ئەم ناوچەیە، وەکو زارێکی گشتی لێهاتووە، بۆ ناوچەکەو ئەوانی تر شێوە زارن.
گەرەکی شۆڕیجەی ناو کەرکوکیش لە باشووری ڕۆژهەلاّتی شارەکە سەر بەم زارەیە، لەڕووی قسەکردنو فۆلکلۆرو گۆرانیو دابو نەریتو جلو بەرگەوە، هۆزی داودە وەکو شۆڕیجەی ناو کەرکوك قسە دەکەن، تارادەیەك جیاوازە لە گەرمیانی زۆربەی ئەم ناوچانە، مەڵبەندی قەزاکانی لێدەرچێت تووشی سیاسەتی ڕاگوێزانو ئەنفال بوونو تێکەڵییان لە زاری تردا بووە، ئێستا لە دوای ساڵی (١٩٩١) ەوە ئاوەدانکراوەتەوە دێهاتی ناوچەی قادر کەرەم، قەرە حەسەن، لەیلانی لێدەرچێت.
کەرکوکیش دەکرێت وەکو ناوببرێتو جیاوازبێت لە زارەکانی گەرمیانی کە لەناو شاری کەرکوکدا بێجگە لە گەرەکی شۆڕیجە [١٦].
ناوچەی شوان بێجگە لە شوانی کێشك، ساڵەیی هەندێك لە ناو پردێ بەلای هەولێرەوە، تا شاری چەمچەماڵیش، بە هێڵێکی ئەندازەیی، بە تایبەتی لەلای باکووری ڕێگای گشتی

نێوان ئەم دوو شارەدا [١٧].
ئەگەرچی لەم سەردەمەدا زاری سلێمانی، لە رۆژهەڵاتی ئەم ناوچەیەوە پەلی هاویشتووە تا چەمچەماڵو ئاغجەلەریش، دێهاتی باشووری رۆژئاوای كەركوكو نێوان كەركوكو دووبزیش بەم شێوەیە قسە دەكەن.
دێهاتی سەر بەم زارەش راگوێزرانو ئێستا پاش راپەرینی ئاداری ١٩٩١ هەندێكی وەكو دێهاتی ئاغجەلەر، چەند دێیەكی شوان، ئاوەدانكراونەتەوە بە شێوەیەك قسە دەكەن كە لە زمانە ئەدەبییەكەوە زۆر نزیكە، كە بە كەمێك جیاوازییەوە، گەورەترین شاعیری ناوداری كەركوك شێخ رەزای تاڵەبانییە، خالسی، ئەسیری، ئەورەحمان بەگی نفوس، شێخ مارف بەرزنجی شاعیرو نووسەرە، لەتیف حامد، لەتیف هەڵمەت، سەلاح شوان.. سەلام محەمەد (داماو) هتد.
بیبانی: هەرچەند وەكو هۆز ناو دەبرێت، بەڵام پێدەچێت پەرشو بلاوبێت [١٨]. و یەك دوو دێی سەر بە پردێ وەكو بیبانی گەورە، بیبانی بچووك دەگرێتەوەو تارادەیەك قسەكردنیان لە زاری شوانی كێشكەوە نزیكەو لە رابردوودا شوێنێكی سەربازییەو خەڵكەكەش پەرشو بلاوبوونەتەوە.
شێخ بزێنی: [١٩] دەكەوێتە باكوورو باكووری رۆژئاوای ناوچەی شوانەوە لەرووی كارگێرییەوە هەندێكی بە زۆر سەر بە ناوچەی تەقتەقو هەندێكی تری وەكو دێی عەمدۆن، مەرزیخەی خواروو، كانی رەش، قەرەناو، جگیلە..هتد، سەر بە مەڵبەندی رێداری ناحیەی شوان بوون، وەكو هۆز شێخ بزێنین، ئەم هۆزە لەگەڵ هۆزی شواندا چەند جارێك تا ساڵی (١٩٨٨)ی سەردەمی راگوێزران بوونەو لە پەیمانی (زەهاو) هوە لە ساڵی (١٦٣٩ز) هەندێكیان بەرەو قونیاو ئەنكەرەو ئەرزەرۆم راپێچ كراون [٢٠].
ولە شاری هەولێریش هەن، زاری شێخ بزێنی زۆر لە زاری هەولێرییەوە نزیكە بە كەمێك جیاوازییەوە.
چەند دێیەكی ئەم زارو هۆزەی شێخ بزێنی، بەر ناوچەی قەڵاسێوكەی سەر بە مەڵبەندی ئاغجەلەر دەكەوێت، وەكو دێهاتی ئەودیوی چیای خاڵخاڵانی ناوچەی شوان بە لای باكورو رۆژهەڵاتەوە وەكو: گردخەبەر، سەرچنار، توتەقەڵ، سماقە، قەسرۆك، برایم ئاغا، كانی هەنجیر..هتد.
ئێستا ئەم دێهاتانە واتە دێهاتی پشت خاڵخاڵانو ئەوبەری زێی بچووك بە لای تەق تەقەوە لە دوای راپەرینەوە ئاوەدانكراونەتەوە.
ئەم ناوچەیە بە زۆری خەڵكەكەی بەر ئەنفالی چوار كەوتن، تا ئێستاش بێ سەرو شوێنن، كە لە ناوچەكانی شوان، شێخ بزێنی، قەڵا سێوكە، بەری كۆیە كە لە (١٩٨٨/٥/٤) [٢١].
زارەكەشیان دەچێتەوە سەر زاری سۆرانی سەر بە دیالێكتی كرمانجی ناوەراستەو لە ناوچەكەشیدا، شێوە زاری (لەكی) هەیە، كە لە كۆنەوە لە ناوچەی زەهاوەوە راگوێزراونو ئێستا كەمتر قسەی پێدەكەن، شێخ بزێنی دەوری (٥٠كم) لە كەركوكەوە بەلای باكوورەوە دوورەو داب نەریتی تایبەت بە خۆیان هەیەو تارادەیەك لە ناوچەكانی تری كەركوك چ وەكو زاریش جیاوازنو دوور دەكەونەوە.
بێجگە لەم زارانەی سەرەوە هەندێك شێوەزار یا شێوەی قسەكردنی جیاواز لە ناوچەی كەركوك بەدی دەكرێت وەكو: لەكی، كەلوری كە بەهۆی سیاسەتی كۆچ پێكردنو راگوێزانەوە بەپێی پەیمانی (زەهاو) لە ساڵی (١٦٣٩) زایینییەوە لە ناوچە جیاجیاكانی كوردستانو شوێنی تر بلاوبوونەتەوە لە كەركوك، لە هەولێر بە پەرشو بلاوی هەنو لە ناوچەی كەركوك دێی (كەلور) بەو ناوەوە نراوە كە ئێستا ئەویش راگوێزراوو ئەنفالكراوە، لەمبەرو لەوبەری زێی بچووك لە سنووری هۆزی شێخ بزێنی نێوان كەركوكو هەولێریش چەند دێیەك هەن.
ئەنجام:
١- بوونی زمانو زەوی لە شوێنێكی دیاریكراودا، دوو بنەمای بەهێزی بوونی ئەو نەتەوەیە دەگەیەنێتو لەم شوێنەدا دەیسەلمێنێت، كە بە میللەتو بە زەویو خاكەوە هی ئەو نەتەوەیەیە، مێژووی كۆنو نوێ ئەمەی سەلماندووە.
٢- كەركوك بە هەموو ناوچەكانییەوە لەرووی زمانو زارە جیاوازەكانییەوە كوردنو بوونی زاری جیاواز لەوێدا كوردبوونی كەركوك دەسەلمێنێ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە نكوڵی لە بوونی كەمینەی میللەتی تر بكرێت.
٣- بوونی زۆربەی هۆزە كوردەكان لە كەركوك، كە رەگو ریشە مێژوویان كۆنە، دیسان كوردبوونی كەركوك دەسەلمێنێ، كە ئێستا بەهۆی سیاسەتی راگوێزانەوە پەرشو بلاوبوونەتەوەو كاریگەری زاری ناوچەی نوێی نیشتەجێبوونیان بەسەرەوە دیارە.
٤- بوونی ئاینو مەزهەبی جیاواز، بە تایبەتی ئەو ئایینانە كە زایندەی نیشتمانی كوردنو لە داوێنی چیای زاگرۆسەوە بلاوبوونەتەوە، وەكو ئایینی كاكەیی (ئەهلی حەق - یارسان) یشی پێدەڵێن لە پارێزگای كەركوكدا رەسەناتی كوردبوونی دەگەیەنێت بێجگە لەوەی، كە بە زمانی كوردی رێورەسمی ئاینەكە بەرێوە دەچێت.
٥- سەرهەڵدانی هونەری مەقامو (ئای ئای)، گۆرانی جیاوازو تایبەت بەم ناوچەیە مۆركو رەسەنایەتی كەركوك دەسەلمێنێتو هونەری مەقامە بەناوچەكانی تری كوردستاندا بلاوبووەتەوە.
٦- شاعیرو نووسەرە كۆنەكانی ئەم ناوچەیە وەكو شێخ رەزای تاڵەبانی، خالسی، هیجرە دەدە، شاعیرەكانی تری هۆزی كاكەیی دیسان كوردبوونی كەركوك دەگەیەنێت.
٧- جێبەجێكردنی سیاسەتی راگوێزانو ئەنفالكردن خۆیان كوردبوونی پارێزگای كەركوكو شارەكەی دەسەلمێنێ، ئەگەر وانییەو كورد نییە، بۆ ئەم شارە بەر ئەو دوو سیاسەتە جیاوازە كەوتووەو ئەم زارانە سنووری پارێزگاكە بەهۆی نیشتەجێكردنی خەڵكەكەیەوە، لەلای نەوەی نوێوە لە بیرچووەتەوەو بە گەرمیانیو كەركوكی قسە دەكەن.
٨- بوونی خانەقاو تەكیە كۆنەكانی وەكو خانەقای بنەماڵەی سەید ئەحمەدو تەكیەی تاڵەبانیو خادم سوجادە نیشانەی كوردبوونی شارەكەن.

*** پەراوێزەکان:-**

١- ا /د. علي عبد الواحد وافي، علم اللغة، القاهرة، ١٩٧٧، ل ١٧٥.

ب/ عەبدولرەحمان ئەمین زەبحی، قاموسی زمانی کوردی (و)، ١٩٧٧، ل٥٢.

٢- سەرچاوەی ژمارە (١)، ل١٦٩.

٣- هەمان سەرچاوە، ل١٧٩.

٤- د. رەفیق شوانی، هۆی پەیدابوونی زارو سەرهەڵدانی زمانی نەتەوەیی، گۆڤاری زانکۆی دهۆك، ژمارە (٦)، بەرگی (٢)، ١٩٩٩، ل ٧٩١ - ٨٠٦.

٥- سەرچاوەی ژمارە (١)/ ا، ل١٧١.

٦- تەنها لە هەمان سەرچاوەیدا باسیکردووە، ل ٤٢.

٧- یەکەمی: لای غازی فاتیح وەیس، فوئاد حمه خورشید، لە کتێبی زارەکانی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەدین باسکراوە، لەمەوبەر سنووری فراوانی ئەم پارێزگایە خرابووە بەر زاری سلێمانی، کە ئەمە هەڵەیەکی زانستییە.

٨- فؤاد حمه خورشید، اللغة الكردية، التوزيع الجغرافي للهجاتها، بغداد، ١٩٨٣، ل٢٧.

٩- د. جمال نبز، المستصغفون الكرد واخواتهم المسلمون، لندن، ١٩٩٧، ص ١٠٣، حاشية٢٨.

١٠- د. رەفیق شوانی، گۆڤاری کاروان، ژمارە (١٥١)، ٢٠٠٠، ل ٢٥- ٣٨.

١١- م، جەمیل رۆژبەیانی رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٧)، ل١٤- ١٧.

١٢- د. رەفیق شوانی، دابەشکردنێکی نوێی زارەکانی زمانی کوردی، لێکۆڵینەوەیەکی دەست نووسە هێشتا بڵاونەکراوەتەوە، ل٣.

١٣- ئەم شاعیرە کوردەو بە کوردیو تورکمانیش شیعری نووسیوە.

١٤- هەمان سەرچاوەی ژمارە (١٢)، ل ٤.

١٥- هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

١٦- هەمان سەرچاوەی ژمارە (١٢).

١٧- ناویان وەکو زار نەهاتووەو لە هیچ شوێنێك نەمدیوە باسکرابێ.

١٨- لە بەرنامەی (کاروان) کە لە تەلەفزیۆنی میدیاوە سیروان رەحیم بڵاوی دەکاتەوە بە تەلەفۆن لەناو تورکیاو لە حوزەیرانی ٢٠٠٠ ئەمەی روونکردەوە.

١٩- د. رەفیق شوانی، رۆژنامەی برایەتی، ژمارە (٣٠٨٥) لە یادی ئەنفالی چوارەمدا لە ٢٠٠٠/٥/٨.

٢٠- زانیاری خۆمو چاوپێکەوتن لەگەڵ کاك بیهرۆز ئەردەلانی، پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتی کوردستان ئێران رۆژی (٢٠٠٠/٢/٣)، رۆژی پێنج شەممە، لە شاری شاری کۆیە.

٢١- لەم سنوورەدا دێی (لەکیش)هەن، بۆ نموونە دێی قەشقەی سەر بە قوشتەپەی هەولێر.

*** زارو هۆزی شوان لە کوێوە هاتوون.**

ئەمجا زاری شوانیش یەکێکە لەو چەندین زارو شێوەزارانەی میللەتەکەمان کە پێشتر هەر باسی نەکراوە، یا دەگمەن هێمای بۆ کراوە چری ئەو دیاردەیە دەگەیەنێت بە تایبەتی لەناو کۆمەڵە زاری کوردی باشووریدا کە لە چەندین شێوەزارو جۆری جیاوازی قسەکردنی پێکهاتووەو دابرانی رۆڵەی ئەم کۆمەڵە زارە لە ناوچەی زارەکانیتر، بەهۆی پەیرەوکردنی سیاسەتی جۆراوجۆری وەك سیاسیو مەزهەبییە بۆ دوورخستنەوەیان، بۆیە باسکردنی رێزمانی ئەم زارەو دیاریکردنی سنووری جوگرافی ناوچەکەی کارێکی بە سوود دەبێت بۆ رێزمانی نەتەوەیی لەلایەكو بۆ سەلماندنی کوردبوونی ئەم زارەو شێوەکانی کە ئەو سیاسەتە دیاریکراوە هەوڵی دابرانی داوە.

دیسان جێگای خۆیەتیو بە پێی پەیوەندی بە باسەکەوەو گرێدانی ئەو زارانە بە یەکترەوە، هێما بۆ بوونی بەڵگەی مێژوویی بکەین، کە کوردبوونی زاری لوری دەگەیەنێت، چونکە ئەم شێوەزارانەی تر لایەنی لە یەکچوونیان وەکو زمانی کوردی لەنێوانیان روونو ئاشکرایە، ئیتر چۆن دەبێت زاری لوری لە کوردو زمانەکەی داببرێت.

ئەمجا شێوە زاری شوان وەکو ئەوەی شێوە ئاخاوتنی هۆزی شوانی ناوچەی کەرکوکە، لە بنەرەتدا ئەم هۆزی شوانە دەچێتەوە سەر هۆزی گەورەی شوانکارەی وڵاتی ماد لە بەشی باشووری ئێرانی کۆن، بەڵام پاشان بەهەر هۆیەکەوە بووە، هۆزی شوانکارەی کورد کەوتوونەتە هەرێمی فارسیەوە (أقليم فارس)، ئەمجا بەهۆی زۆریو راگوێزانی دەسەڵاتی هەخامەنشییەکانەوە بووە، کە لە دوای دەوڵەتی ماد دەسەڵاتی ئێرانیان گرتە دەست، یا بەهۆی قاتوقری کۆچبەر بوونەوە گوێزراونەتەوە بۆ هەرێمی فارس [1].

یا بەهۆی شەرو شۆری نێوان داریۆشی هەخامەنشیو ئەسکەندەر بووە، یا هەندێ بنەماڵەی پاشای ئەشکانی پەرتی، خەڵکی نەهاوەند بەرەو ئەو هەرێمە کشاون [2].

ئەمجا هۆزی شوانکارە لە سەرەتای سەردەمی زایندا هۆزی کورد لە وڵاتی فارس زۆر هەبوونەو فەرمانرەواییان دامەزراندووەو دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست ولە ئێرانی کۆنا تەنها دوو هۆز سەر بەخۆبوون یەکێکیان شوانکارەیەو دووەمیان هەرێمی تەبریتانە، دەوری پێنج سەدە بەردەوام بووەو ئێستاش لەم سەردەمەدا وڵاتی شوانکارە هەرێمێکە کەوتووەتە نێوان فارسو کرمانو کەنداوەوە [3].

هۆزی شوان لە لورستانیش [4] هەنو لەرووی قسەکردنەوە سەر بە کۆمەڵەزاری کوردی باشوورێن، پاشان شوان پێدەچێت لە دوای دابەشکردنی کوردستانەوە واتە لە ساڵی (١٥١٤ز) بە پەیمانی زەهاو لە (١٦٣٩) بەرەو ناوچەی کەرکوك کۆچیان کردووەو دێی (دارەمان)ی نێوان رێگای کەرکوك - هەولێر بە ناوی پایتەختەکەی پێشوویانەوە بووە کە لێوەی هاتوون بە ناوی (دار الامان)ـەوە لە ناوچەی قەڵای (نێگ) [5].

کە شوێنی دەسەڵاتیان بوو، ئەردەشێر پاپك پاشای دەوڵەتی ساسانی لە هۆزی شوانکارە بووەو هۆزی شوانی ئێستا دەچنەوە سەر ئەو شوانکارەیە کە بە زارێکی تایبەتی قسە دەکەن و جیاوازە لە زارو زارەکانی تری پارێزگای کەرکوك.

*** ڕێزمانی زاری شوان**

زمانی کوردی وەکو هەر زمانێکی تر، جیاوازی قسەی کردنی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تری تێدایە. ئەم جیاوازییە لە زمانەوانیدا پێی دەوترێت زار (دیالێکت – لهجە) زاریش بریتییە لە لێکچوون و جیاوازی نێوان زارو زمانەکەی، واتە لێکچوونی ڕێزمانی زارو زمانەکە لەلایەك و لایەنی جیاوازی ڕێزمانەکەیان لەلایەکی ترەوە.

واتە هەموو ڕێزمان و دەستووری زارەکە بە تەواوی جیاواز نییە لە ڕێزمان و دەستووری زمانەکە، ئەگەر بە تەواوی جیاواز بێت، ئەوا زمانێکی سەربەخۆی لێ پەیدا دەبێت و زارەکە لە زمانەکەو خەڵکی ناوچەی زارەکەش دەبنە گرووپ یان ڕەگەزو میللەتێکی جیاواز ولە خەڵکی ناوچەکانی تری زمانەکەی کە لێی جیادەبێتەوە. لێرەدا لێکچوونی نێوانیانیش واتە نێوان زارو زمانەکە بە تەواوی لە هەموو ڕوویەکی دەنگسازی، وشەسازی و ڕستەسازییەوە، وەکو یەك نین، لێکچوونی نێوانیان لە هەندێك ڕووی دەنگسازیی، وشەسازی و ڕستەسازییەوەیە.

بۆ نموونە هەر زارێك چەند دەنگێکی تایبەت بەخۆی هەیەو بەو شێوەش چەند وشەو حاڵەتی ڕێزمانی تایبەت بە خۆی لە هەرسێ ئاستی دەنگسازی، وشەسازی و ڕستەسازی هەیە، کە لە زمانەکە یا زارەکانی تردا نییە یاله یەك دوو زار هەیە ولەوانی تردا نییە. ئەمە سروشتی پێکهاتنی زارە لە هەر زمانێکدا، بێجگە لەوەی دیاردەی گشتییان وەکو یەکە لە ئاستەکاندا.

لێرەدا پێویستە هەندێك نموونە بهێنینەوە لەڕووی جیاوازی دەنگسازی نێوان زارو زاری تر لەگەڵ زمانی نووسیندا وەکو: دەنگی (ڵ) لە وشەی (گوڵ) لە کەرکوك و سلێمانی، ئەم دەنگە لە شێوەزاری سۆرانیدا دەبێتە (ڕ) لە هەمان وشەدا (گوڕ)، لە کرمانجیدا دەبێتە (گول)، (چاو) لە کوردی ناوەڕاستدا، لە کرمانجیدا بووەتە (چاڤ) (٦).

کەم ـــ کێم (ە ـــ ێ)

ماردین ـــــ مێردین (ا ـــــ ێ)

لە وشەسازیشدا وەك:

سەوز لە کەرکوك و سلێمانی، کەسك لە زاری سۆرانیدا ئێستا لە کەرکوك و سلێمانی، هەنوکە لە سۆرانی و لە کرمانجیدا دەبێتە ڤێکاڤێ، نوکە.

*** پێناسەی زار**

لە فەرهەنگی زانستی زماندا بەم جۆرە پێناسە دەکرێت، ڕێگایەکە خەڵك قسەی پێدەکات، بەزۆری هێمای جوگرافی یا لە ناوچەیی یا ڕۆشنبیری وەردەگرێت، بۆیە زار یا جوگرافییە یا کۆمەڵایەتییە، هەر زمانێك چەند زارێکی هەیەو هەر یەکەی تایبەتێتی خۆی هەیەو جیای دەکاتەوە لەوانی تر لەڕووی دەنگی یا زاراوە یا ڕێزمانی یا گەردانی و وشەسازی، زار پەرەدەسێنێت وبە درێژایی زەمان بەهۆی بایەخی جوگرافی سیاسی و ڕۆشنبیرییەوە دەبێتە زمانێکی سەربەخۆ (٧).

ئەمە دیاردەیەکی گشتی نییە، زار بەپێی تایبەتێتی و چۆنیەتی دەربڕین کە هەیەتی بەم شێوەیەش پێناسە دەکرێت: سیستەمێکی زمانییە (٨).

بە درکاندن و وشەو پێکهاتەکانی بەتایبەتی لەو زمانە جیادەبێتەوە کە لقێکە لێی تایبەت دەبێت بەوەی وەریدەگرێت لەگەڵ گۆڕانی زەمان و لقی تری وەکو زار لێ دەبێتەوەو زارەکان بە پێی ئەو ناوچانەی کە بەکاری دەهێنن و بەپێی ئەو چینە کۆمەڵایەتییانەی کە قسەی پێدەکەن دابەشدەکرێن، هەروەها بەپێی دووری و نزیکی لەو زمانەی کە لێوەی وەرگیراوە یابەپێی زارە نموونەییەکەوە دابەشدەکرێت.

گۆڕانی کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری و سیاسی لە مێژوودا دەبێتە هۆی ئەوەی زارێك لە زماندا بەرەو سەربەخۆیی برواتو ببێتە زمانێکی سەربەخۆ، بە میللەت و زمانەوە لە زمانە بنچینەییەکەی کە لێوەی هاتووە جیاببێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر ببێتە زمانی نووسین.

لە ڕستەسازیشدا: نیشانەی کۆ لە کوردی باشووریدا (گەل) ە، لە کوردی ناوەڕاستدا (ان)ە،

بوونی حاڵەتی نێرو مێ لە کرمانجیدا وەکو نیشانەی (ا) بۆ مێ لە وشەی: کچا من، مالامن، بۆ نێریش دەبێتە (ێ) وەکو: کورێ من، دەستێ من بۆ خستنەسەر (اچافە) بوونی نیشانەی خستنەسەر لە کرمانجی و سۆرانیدا وەکو: زانکۆیا دهۆکێ، دەچمە ماڵێ وەکو (ێ) لە کۆتایی وشەی (دهۆك، ماڵ)و نەبوونی لە زمانی ستاندەری کوردی بەم شێوەیەیە.

زانکۆی دهۆك، دەچمە ماڵەوە، پاشکۆی وشەکە (ەوە) بۆ دووبارە کردنەوەیە، ئەم کورتەیە پێویستە بۆ نیشاندانی لایەنی لە یەکچوون و جیاوازی نێوان زارو زمانەکەی دەکرێت نموونەی زۆرتر بهێنرێتەوە، بەڵام باسەکە لەو حاڵەتەدا لە سنووری خۆی دەردەچێت و دەبێتە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردی، ئەمە تەنها بۆ ڕوونکردنەوەو تێگەیاندنە لە جیاوازی زارو زمان لەلایەك ولایەنی لە یەکچوونیان لە قسەکردندا.

ئەم بابەتە تەرخانە بۆ نیشاندانی ڕێزمانی زاری شوان کە دەچێتە ناو کۆمەڵە زاری کوردی باشووری زمانی کوردییەوە کە باشووری کوردستان دەگرێتەوە لەڕووی جوگرافییەوە، لێرە بەدواوە ئەمە ڕووندەکەینەوە.

*** دیاریکردن و پێناسەی زاری شوان.**

وەکو سەرەتایەك لە دوو ڕووەوە ئەم زارە دەناسێنین، کە هەردووکیان پێویستە بۆ ئاشکراکردن و دیاریکردنی لەڕووی:

١- سنووری زارەکەوشوێنی جوگرافی

٢- زاری شوان سەر بە کام کۆمەڵە زاری زمانی کوردییە؟

لە خوارەوە ئەم دوو لایەنەی زارەکە ڕووندەکەینەوە:

١- سنووری زارەکەو شوێنی جوگرافی: زاری شوان، زاری

خەڵکێکە لە ناوچەی شوانی سەر بە پارێزگای کەرکوک بەکاردەهێنرێت‌و جیاوازە لە زاری ناوچەی کەرکوک‌و تەنانەت هەر لە ناوچەی شوان خۆی زارێکی تری جیاواز لەم زارە هەیە کە وەکو خەڵکی کەرکوک‌و سلێمانی قسە دەکەن بە جیاوازییەکی زۆر کەمەوە.

شوێنی ئەم زارە دەکەوێتە باکوورو باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوک [9].

بەدووری ٣١کم، سنوورەکەی لای ڕۆژهەڵاتی ناوچەی قەڵاسێوکە سەر بە ئاغجەلەرە، لە باکوورەوە شارۆچکەی تەقتەق‌و دێهاتەکانییەتی کە شێخ بزێنییە، لە خۆرئاواوە، هەندێك دێهاتی شێخ بزێنیە هەندێکی لەرووی کارگێرییەوە سەر بە ناحیەی شوانەو هی تری سەر بە تەقتەقە، لەلای باشوورو باشووری ڕۆژئاواوە ناوچەی ساڵەیی سەر بە پردێ‌و شاری کەرکوکە، مەڵبەندی ناوچەکە دێی ڕێدارە کە لەسەر ڕێگای نێوان کەرکوک – کۆیە کەوتووە.

لەرووی جوگرافییەوە شوان دەکەوێتە نێوان هێڵی (٤٤ –٤٥) درێژی‌و نێوان هێڵی پانی (٣٥ – ٣٦)ەوە [10].

ناوچەی شوان لە سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە مەڵبەندی ناحیەی لێ بووە.

٢– زاری شوان سەر بە کام کۆمەڵە زاری زمانی کوردییە؟

شێوەزاری شوان کە شێوەیەکی تایبەتی پێکدێنێ، جیاوازە لە زارو شێوە زارەکانی تری زمانی کوردی، لەگەڵ ئەمەشدا بەپێی دیاردەی لێکچوون‌و جیاوازی نێوان زارو زمان، زاری شوان لەناو زمانی کوردیدا لەرووی دەنگسازی، وشەسازی‌و ڕستەسازییەوە دەچێتە سەر کۆمەڵە زاری کوردی باشووری، چونکە لایەنی لەیەکچوونی لەرووی ئاستە جیاوازەکانەوە لەبیربچێت کە لە هەندێك ڕووی زمانەوانییەوە، لایەنی جیاوازیش لەگەڵ ئەم کۆمەڵە زارەدا دەگرێتە خۆی.

ئەم حاڵەتە لایەنی لە یەکچوونی جیاوازی نێوان زارو شێوە زار لەلایەك‌و لەنێوان زارو زاری تر یا لەنێوان زارو زمانەکەدا هەیەو لەرووی زانستی زمانەوە ئەم دیاردەیە بەدی دەکرێت‌و ئاساییە.

هۆی نزیکایەتی شێوەزاری شوان لەگەڵ کۆمەڵە زاری کوردی باشووری زمانی کوردیدا لە خوارەوە بە نموونەوە دەردەخەین.

بوونی دەنگی (م) لە هەردوو زاری کوردی باشووری‌و شواندا ئەگەر پێشی بزوێنی (ی) بێت دەگۆڕێت بە (و) یا بە پێچەوانەوە لە هەردوو زارەکەدا، نموونە:

| [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|---|
| و – م | نیو | نیم | نیم |
| ۆ– وێ، و | جۆ، تۆ | جوێ – تو | جوێ – تو |
| و – ف | جوت | جفت (١١) | جفت |
| و – وی | شو | شوی | شوی |
| وێ – وی | خوێن – نوێ | خوین /خون، نو | خوین، نو |
| وو– وی | دوور، ژوور، زوو | دویر، ژویر، زوی | دویر، ژویر، زوی کویر (کوور) |
| ێ – ی | ئێمە، ئێوە | ئیمە، ئیوە | ئیمە، ئیوە. |

لەرووی وشەسازیشەوە، نموونەی جۆراوجۆری وشەی لە یەکچووە، هاو واتا هەن‌و لە ئاخاوتنی زاری شوان‌و کوردی باشووریدا بەکاردەهێنرێن.

نموونە:

| [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|
| جەواڵ، گونیە | جواڵ، گونیە | جوواڵ، گونی (ع جەلیلیان: ٥٧٦) (١٢). |
| چەقۆ | چەقو | چەقو |
| چەقێنراو | چەقیاگ | چقیاگ، چۆقیاگ (ع جەلیلیان: ٢١٤). |
| ژوور | حوجرە، ژویر، هۆدە | حوجرە |
| دەوەن، دار | درخت، دار | دار |
| ژان، ئێش | دەرد، ژان، ئێش | دەرد، ژان. |
| گەورە | درشت، هەراش | درشت |
| دەزگر | دەسگر | دەستگر |

| | | |
|---|---|---|
| تەپاڵە | سەرگین | سەرگین (عەباس جەلیلیان ل٤٢٠) |
| دوژمن | دژمن | دوژمن |
| شێت | دێوانە/ شێت | دیوانە/شێت |
| خەوتن | خەفتن | خەفتن (ع جلیلیان: ٢٧٥) |
| هەڕشتە | هەڕشتە | ڕشتە |
| ڕەنگدار | ڕەنگین | ڕەنگدار |
| ڕۆشن | ڕوشن | ڕووشن |
| ڕۆشنایی | ڕوشنایی، ڕوناکایی | ڕوشنای |
| تکەتك | چکەچك | چکەچك (ع جەلیلیان: ٢١٤) |
| زبر | زبر | زەور |
| زستان | زمستان/ جستان | زمسان |
| کوتاڵ | کویتاڵ | |
| دووپشك، دووپشکە | دوپیشتك، دوپیشك | دوپیشتەکی |
| دۆشین | دووشین | دووشین |
| دەروێش | دەورێش/دەروێش | دەورش |
| درۆزن | درووزن | درووزن |
| بەڵامك | بەڵامك | بلامك (دەکرێتە ناودەم کاروبەرخ تا دایکی نەمژیت). |
| دڵ ئێشە | دڵێشە | دڵ ئیشی |
| قەیسی | زەردەلوی | زەردالو |

ئەم نموونانە دەری دەخاتو دەیسەلمێنێ کە زاری شوانو کۆمەڵە زاری کوردی باشووری وشەو یەك دوو دەنگی بزوێنیان وەکو یەکن یا زۆر لە یەکترەوە نزیکن، جارێك هەندێك نموونەی وشەکان مەگەر لە بواری دەنگدا ئەویش زۆر بە کەمی ئەگینا وەکو یەکن.

لێکچوونی زاری شوانو زاری کوردی باشووری.
لە خوارەوە بە نموونەوە چۆنیەتی گەردانکردنی فرمانی لە هەردوو زارەکەدا نیشان دەدەین، تا بە هۆیانەوە لایەنی لێکچوونو جیاوازییان دەرکەوێت

| [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|
| وینم – دەبینم | ڕانەبردوو | وینەم ڕاستییەکەی (وینم)ە گۆڕیویانە (١٣). |
| بۆرە – وەرە | داخوازی | بورە |
| دیتم – دیم | ڕابردوو | دیدم |
| وەتم – وتم | ڕابردوو | گوفتەم |
| تو ترسی – تۆ دەترسیت | ڕانەبردوو | تو ترسی |
| گەرنیای – ئەگەر نایەی | ڕانەبردووی نەرێ | گەر نائی |
| برشنە – برێژن | داخوازی بۆ کۆ | وریژن |

| | | |
|---|---|---|
| نەنالم – نەنالم | رانەبردووی نەریّ | ننالم، نەنالم |
| بگەرم – بگەریم | رانەبردووی مەرجی | بنگرم، بنگەرم |
| بوین – ببینە | داخوازی بۆ تاك | بوین، بوینە |
| ویشم – دەلیم | رانەبردوو | یژم – یەژم |
| نیزانی – نازانی/ ت | رانەبردووی نەریّ | نزانی |
| نەشکیاگ، نەشکست، نەشکاو | رانەبردووی نەریّ | نشکست، نەشکست |
| بگەردم – بگەریم | رانەبردووی مەرجی | بگەردم |

* زارو جیاوازی دۆخ و دەربرین.

زار بریتییە لە جیاوازی قسەکردن بۆیە جیاوازی دەنگو دەربرینی تیدایە ئەمجا چ زمان و چ زارو شیوەزار لە ژمارەیەك دەنگی تایبەت بە خۆیان پیکدیت، بەهۆی لیکدانی ئەم دەنگانەوە قسەکردن ئەنجام دەدریت، هەر زمانیك لە بوونی دەنگەکانیدا تایبەتیتی خۆی هەیەو بەهۆیەوە جیادەبیتەوە چ زمان لە زمانی ترو چ زار لە زارو شیوەزاری تر.

هەر زمان و زاریك لە دەربرینی دەنگەکانیدا لەلایەن زمانزان و ئاخیوەری زمانی نەتەوەکەوە دەناسرینەوە.

لیرەدا مەبەست لە چۆنیەتی دەربرینی هەر دەنگیك یا چەند دەنگیك لەلایەن خەلکی ئەو زمان و زارو شیوەزارەوەیە، کە مۆرکی پیوە دەگریت و پیی دەناسریتەوە کە خەلکی کوییە یا خەلکی کام ناوچەی شیوە زارە؟، بۆ نموونە دەنگی (ل) لامی قەلەوی ناوچەی موکریان تا ناوچەی مەرگەو پشدەرو بگرە تارانیەش لە ناو وشەدا جیاواز لە هەمان دەنگی (ڵ) لامی قەلەو کە لە سلیمانی و کەرکوك دەردەبریت، هەروا بۆ نموونە وەم لە وشەکانی: دەلیم/ ئەلیم، گولالە، بەلگە، دەلگە، قەلادزی...هتد.

درکاندنی دەنگی (س) لە ناوچەی موکریان دەربرینی تایبەت بە خۆی هەیە، جیاواز لە هەمان دەنگ لەناو وشەدا لە ناوچەکانی تر، وەك دەنگی (س) لە وشەی (سەلاح) جیاوازە لە دەربرینی هەمان دەنگ لە ناوچەی تردا، لە یەکەمدا سوك و ئاسکە، لە ناوچەی تر ئەم سوکییەی نییە، دەنگی (چ)، (س)، لە ناوچەی سۆران بەتایبەتی هەولیر جیاوازە لە دەربریندا وەك لە ناوچەی تر بە شیوەیەکی قەلەو یا فیشاری دەنگی لەسەرە وەك:-

چوسوانم لە جیاتی چوزانم یا لە وشە (سە) واتە سەگدا (ج) لە (جەلال)و (جمیل)دا.

دەربرینی دەنگی (ك) لە ناوچەی کەرکوکدا بەتایبەتی لە وشەکانی وەك

کەرکویك، کویر (کور) ك ــــ ك

سەکوی (سەکۆ) ك ــــــــ ك ئەلۆفۆنی دەنگی (ك)ە

دەنگی (ش) وەك لە وشەی: شوی (شو).

(ج): جوی (جولەکە).

دەنگی (گ) لە هەورامیدا لە وشەکانی (گیپە، گیا، گیان،...) دەنگە دیاریکراوەکانی نموونەکانی سەرەوە لەگەل دەنگە بنەرەتییەکانی زمانی کوردیدا ئەلۆفۆنیان (هاودەنگ) پەیداکردووە ئەم نموونەیەکی بچووکی پەیدابوونی زارو شیوەزار لە زماندا.

ئەم دیاردەیە لە دەربریندا وەکو دەسەلاتیکی یاسای ریزمانی (government grammer) حوکم دەکات بە دیاری کردنی قسەکردنی ناوچەیەك کە سەر بەکام زمان و کۆمەلە زارە، لەم رووەوە شیوە زاری ناوچەی شوان دەچیتەوە سەر کۆمەلە زاری کوردی باشووری زمانی کوردی کە لەم شیوانەی وەك: لوری، فەیلی، کەلوری، کرماشانی، لەکی، خانەقینی، گەرووسی کە دەکەونە باشووری کوردستانی گەورەوە وەك بوونی دەیان و سەدان وشەی وەك یەك و دۆخی ریزمانی جیاجیا وەك بۆ نموونە:-

١- نیشانەی کۆ لەم زارەدا بریتییە لە (گەل) وەك: کورگەل، سەگەل کچگەل، کچەل.

هەرچەندە نیشانەکانی تری دۆخی کۆی (ان، ات، هات، ها) کە لە زمانی ستاندەری کوردی زارو شیوە زارەکانی تردا هەیەو لیرەش بەلام بە کەمی و بە کاریگەری دەوروبەر لە ئاخاوتندا بەکاردیت وەك:

مەرو مالات.

میوەهات

باخات/ باخ و باخات

سەوزەوات – هوات

٢- بوونی نیشانەی بانگ کردنی (ە) بۆ تاکی نیر لە زاری شوان و کۆمەلە زاری کوردی باشووریدا وەك: (مامە، خالە، کاکە، هەندیك جار بۆ خۆشەویستی دەربرین بۆ کەسانی تەمەن بچووك: کاکۆ بەکاردیت و بەبی مەبەستیش هەندیك جار (خالۆ) بەبی مەبەست دەبیتە (خالۆ) بە (و)ی کورت.

ئەگەر وشەکانی تاکی نیر بە بزوین کۆتایی بین هەروەکو خۆیان بەکاردەهینرین نیشانەی (ە)ی بانگ کردن لە بەرامبەر بزوینی وشەکاندا دەرناکەون وەك: ئاموزا، برازا، میمکزا.

(ی): بۆ بانگکردنی تاکی میّ وەك: میمی بۆ خوشکی دایك و باوك و ئافرەتی تەمەن گەورە.

(یّ): بۆ بانگکردنی تاکی میّ وەك کچیّ بەگشتی بۆ ئافرەتە. هەندیك وشەش هەن مین کەچی وەکو نیشانەی نیر بەکاردین وەك: تاتە یا تاتك بۆ ئافرەتی گەنج یا خوشکی گەورە بەرانبەر (کاکە) دەگریتەوە بۆ برای گەورەو بەگشتیش بەکاردیت.

(ینە): بۆ کۆی نیرو میّ بەکاردیت لە بانگکردندا: کورینە، کچینە، خزمینە، ژنینە (١٤).

٣- نەبوونی ئامرازی پەیوەندی لە بەستنی كەرەسەكانی گرێدا، وەك ماڵ برام، شار كەركویك، ژن چاك، پیاو خراپ لە جیاتی ماڵی برام، شاری كەركوك، ژنی چاك..هتد.
نەبوونی ئەم جۆرە بۆ دۆخی خستنەسەر لە زمانی نووسینی كوردی.
ئەگەر گرێ ناوییەكە بۆ دەرخستنی چەشن و جۆری شتێكی ماتەری (مادە)بێت هەنگوسیلەی ئالتوین، مەسینەی نایلۆن، كفتەی ساوەر.

*** زاری شوان لەرووی دەنگناسییەوە (فۆنۆلۆجی)** [١٥].

دەنگناسی (فۆنۆلۆجی): زانستییەكە باس لە چۆنیەتی دەنگەكانی زمانێكی دیاریكراو لەرووی چۆنیەتی و شێوەی دەربڕین و ئاوازی قسەكردن دەكات.
چۆنیەتی قسەكردن و دەربڕین لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی ترو تەنانەت لە زارێكی زمانەوە بۆ ئەویتر جیاوازەو هەر زمانێك دەربڕینی تایبەت بە خۆی هەیەو ئەو تایبەتێتی دەربڕینە لە زمان و زاری زمانێكی تر جیای دەكاتەوە.
روونكردنەوەیەك
بنەمای هەر زمانێك دەنگەكانێتی كە بەهۆیەوە وشەكانی زمانەكە بەپێی سیستەمی بەكارهێنانییەوە پێكدێت، بۆیە دەنگ بچووكترین كەرەسەی زمانی قسەكردنەو لە نووسیندا بەهۆی هێمای تایبەتییەوە دیاری كراون و دەناسرێنەوە كە بریتییە لە پیت بە بچووكترین پارچەی نووسین دادەنرێن، مەرج نییە هەر زمانێك ئەلف و بێی تایبەت بەخۆی هەبێت ولەلایەن زانایانی زمانی نەتەوەكەوە دانرابێت لە هەموو دنیادا چەند ئەلف و بێیەك هەیە وەك ئەلف و بێی یا پیتی بزماری، رێنووسی هیرۆگلیفی، پیتی ئارامی، پیتی لاتینی، پیتی سلاڤی و سریلیك، پیتی زمانی چینی و گریكی، ئەلف و بێی زمانی عەرەبی و.. هتد.
ژمارەی ئەلف و بێیەكان دیاری كراون و لەلایەن زانای زمانی میللەتانی ترەوە بە دەسكارییەوە ئەم ئەلف و بێی زمانی عارەبی دەسكاری كراوەو بۆ نووسینی زمانی تر بەكارهێنراوە. وەك لەلای كورد، فارس، تورك، (سەردەمی عوسمانلی)، هیندی و پاكستانی هەریەك لەم میللەتانە بەپێی یا نزیك لە دەربڕینی زمانەكەی خۆیان پیتە عەرەبییەكانیان كە ئەلف و بێی تایبەت زمانی عەرەبییە دەسكاری كردووەو بەهۆی خاڵ و هێمای تایبەتەوە گونجاندووە بۆ نووسینی زمانەكەی خۆیان، بۆ نموونە لە زمانی عارەبیدا دەنگی (پ) نییەو دەنگی (ب) هەیە لە كوردیدا گۆڕانیان بەسەر ئەم دەنگی (ب) هێناوەو بە دانانی سێ خاڵ كراوەتە (پ) كە دەنگێكی تایبەتە بە زمانی و دەربڕینی كوردی بە هەمان شێوەش دەنگەكانی (چ، گ، ڤ، ڕ، ژ، ڵ، ێ، ۆ، وو،...) لە دەنگی (ج، ك، ف، ر، ز، ل..)ی ئەلف و بێی عارەبییەوە داناوەو دەسكارییان كردووەو رێنوس تایبەت بە زمانەكەی خۆیان داناوە.
دانانی رێنوسی یا بوونی رێنوسی بۆ هەر زمانێك كارێكی گرنگ و زانستییە، زمانی هەر نەتەوەیەك رێنووس یا ئەلف و بێی نەبێت، ئەوا ئەو زمان و میللەتە بوونی دیار نییەو درەنگ بێ یا زوو ئەنجامی لەناوچوون و فەوتانە، یا لەناو نەتەوەی پێشكەوتووی خاوەن شارستانیەت و رێنوس و ئەلف و بێدا دەتوێتەوە، بۆیە دەبینین و لە مێژووی چ كۆن وچ نوێشدا، لە هەندێك ولاتدا نەتەوەی باڵادەست و خاوەن دەسەڵاتی ئەو ولاتە زمانی خۆی و رێنوسی دەچەسپێنێت و بەهۆی یاساوە زمان و رێنوسی میللەتی بچووك با ژێر دەسەلات قەدەغە دەكات، لەم رووەوە وتراوە گەر بتەوێت میللەتێك لاواز بكەیت یا نەمێنی، رێنووسی زمانەكەی قەدەغە بكە، ئەوا وردە وردە ئەو میللەتە بەرەو لاوازی و دیارنەبوون و گومرایی هەنگاو دەنێت و پاشان نامێنێت و دەفەوتێت و لەناو میللەتە باڵادەستە خاوەن دەسەڵاتەكەدا دەتوێتەوە، لە مێژووی كۆندا دەیان نموونەی وا هەیە وەكو توانەوەی میللەتانی گۆتی، كاسی، ئۆرارتۆیی، خالدی، سۆمەری، لەناو نەتەوەی گەورەی مادا و سۆمەریش لەناو عارەبدا تواونەتەوە، یا میللەتی هیندییە سوورەكان لە وڵاتی ئەمەریكادا.
بۆیە پێویست لەسەر زانایانی هەر میللەتێك و میللەتیش بەگشتی پارێزگاری لە زمانی و رێنوسی خۆیان بكەن و بەكاری بهێنن، ئەمەش دەبێتە پاراستنیان، بەپێی ئەم دیاردەیەش بەكارهێنانی دوو رێنوسی جیاواز یا دوو زاری جیاواز لە نووسیندا لەلایەن یەك میللەتەوە وردە وردە بەرەو دووركەوتنەوەیان دەبات لە یەكتر، پاشان دەبنە دوو میللەتی جیاواز، چونكە ئاگایان لە یەكتر نابێت و نەوەی ئایندەشیان لە رابردوویان دادەبڕێت، دەكرێت بڵێین بەهۆی قەدەغە كردنی ئەلف و بێی عارەبی دەسكاری كراو لە لایەن توركیای نوێوە بە فەرمانی ئەتاتورك و چەسپاندنی رێنوسی لاتینی، نەوەی توركی نوێ ئاگایان لە رابردووی خۆیان كە سەردەمی عوسمانلییە نییە، چونكە بە هەزاران نووسراو و دانراو و كتێبیان بە ئەلف و بێیەك هەیە كە لاتینی نییە لە پێشتردا تۆزیان لەسەر نیشتووەو بێ سوود ماوەتەوە.
مەبەست لەم دەربڕینە پێویستە ئێمەی كوردئاگاداری زمان و رێنوسی خۆمان بین و بەرەو پێشەوەی بەرین، تا لە ناو نەچین و لەناو چەندین نەتەوەی دەسەڵاتداری وەك تورك، فارس و عەرەب و هیتر نەتوێینەوە.

*** دەنگەكانی زاری شوان**

دەنگەكانی وەكو دەنگی زارەكانی ترو زمانی كوردی لە دەنگی بزوێن، نەبزوێن و نیمچە بزوێن پێكهاتووەو لەناو ئەو دەنگانەدا دەنگ و دەربڕینی تایبەت بەخۆی هەیە.
١- دەنگە بزوێنەكان: ئەو دەنگانەن كە لە دەربڕیندا بە ئاسانی دەردەبڕین ولە ماوەی دەربڕینیاندالە رێگای ئەندامانی ئاخاوتنەوە هیچ كۆسپ و تەگەرەیەك نایەتە رێگایان، ئەم دەنگانە هەن: (ە، ا، و، ۆ) (زۆر بە كەمی هەیە)، وو، وێ، وی، ی، ێ [١٦].
بزرۆكە (ا) بزوێن لە زمان و زارەكانی كوردیدا لە سەرەتای وشەو برگەوە نایەت، نموونە لەناو وشەدا:
١- ە: دەرد، كەفتم، وەتم،
٢- ا: خودا، سەرا، كانی سارد، ئەم دەنگە هەندێك جار دەگۆڕێت بە دەنگی (ێ) وەكو ژمارە - ژمێرە.

٣- و: کول، گول، قور.
٤- ۆ ــ و: ئەم دەنگە نییە یان کەمە، لەم زارەداو دەگۆڕێت بە (و)ی کورت، وەکو: مۆرد ــ مورد ــ بور (ڕەنگ)، (ڕۆژ)، یا لە هەندێك نموونەدا دەگۆڕێت بە دەنگی واوی درێژ (وو) وەکو: زۆر ــ زوور، لە هەندێك وشەی تردا دەگۆڕێ بە (وی) وەکو: ڕۆن ــ ڕوین.
لەگەڵ ئەوەشدا کە دەنگی (ۆ) دەگۆڕێت بە (و، وو، وی) کەچی لە هەندێك وشەی زارەکەدا دەردەکەوێت و بەکاردێت: خۆر، ئیمرۆ، دشۆم، نۆك، شۆك، [17].
چۆك (هۆی بوونی لەم جۆرە وشانەدا ئەوەیە کە ئەمانە وشەی هاوبەشی نێوان زمانی کوردیو ئەم زارەن.
٥- (وو): ئەم دەنگە لە زاری شواندا زۆر دەگمەنەو دەگۆڕێت و دەبێتە (وی) وەکو: دوور ــ دویر، شوو ــ شوی، ژوور ــ ژویر ی ژوێر (لێرەدا بووەتە وێ).
مووسل، مویسل یا میسل، مەحموود ــ مەحمید ــ موی ــ می.
بەڕوو ــ بەڕوی، زوو ــ زوی [18]. جوو ــ جوی.
(وو): بەکەمی لەم جۆرە وشانەشدا دەردەکەوێت: دوو، بووك لە هەندێك وشەشدا دەنگی (وو) دەبێتە (وێ):
سوور ــ سوێر، (سویر)یش دەوترێت، چوین.
وو ــ ی: بوون ــ بین، پووز ــ پیز [19].
ئەمە نموونەی گۆڕانی دەنگی واوی درێژە لە زارەکەدا بەرانبەر زمانی نووسین، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە خوارەوە نموونەی وشەی تایبەت بەخۆی هەیە.
٦- وێ: سوێر واتە سوور بۆ ڕەنگ
٧- وی: خوین، شوین، واتە (شیوەن)، ئەسکوی، روی (ڕوو)، کویتاڵ.
٨- ی: هەنجیر، شیر، وازی.
٩- ێ: دێ، ڕێ، جێ، هێش، هێلکە، هێواش، هێلاش.
١٠- (ا): بزرۆکە: دخۆم، دشۆم، ژن.
٢- نیمچە بزوێن:
ئەم دوو دەنگە نیمچە بزوێنن وەکو: (و، ی) کە پێشتر نموونەمان بۆ هێنایەوە وەك:
١- و: وازی، بەور، داو
٢- ی: یار، شایی، کایە، دەی.
٣- نەبزوێنەکان: دەنگەکان ئەمانەن و هەریەکەی بەپێی بوونیان نموونەیان بۆ دەهێنینەوە، وەك لەسەرەتاو، کۆتاییو ناوەڕاستەوە، لە هەر شوێنێکی وشەدا نەبوو نیشانەی پرسیار (؟) دادەنێین. نموونەو دەنگەکان:
٣- و (هەمزە): ئەیرە (ئێرە)، ئاسیاو، ؟ نەو (لە ناوەڕاستی وشەی کوردییەوە نایەت).
٤- ب: بەو بەیخەندین، زۆراب.
٥- پ: پینگە (پۆنگە)، پەرپوت، تەپ.
٦- ت: تاتك، پەتك، تورت.
٧- ج: جاجگ، جون (جونکردن تصنیف)، جاجم، گەوج.
٨- چ: چرادان، هەڵقاچین، پر.
٩- ح: حەور، (گۆمی قول)، حەتحەتووەتە (جۆری ملوانکە)، پەح.
١٠- خ: خۆر، خۆیشك، قۆخ.
١١- د: دوێت، کادان، دادو بێداد.
١٢- ز: زاخێر، زەردگ.
١٣- ڕ: ڕێدار، گردار، کویر (کوڕ).
١٤- ر: دار، کرم، کار.
١٥- ژ: ژویژگ (ژوژگ)، ڕۆژ، پێژمەرگە.
١٦- س: سەلك، ئاسیاو، کاس.
١٧- ش: شەوە، شاکانی (حەسودی)، کش.
١٨- ع: عاسمان، بێعار، باع (دەنگی بزن).
١٩- غ: غاردان، بوغە، قوغ (کوخ ژوور یاکەپری دروستکراو لە قامیش) واتە کوخ.
٢٠- ف: فەریك، بەفر، پف.
٢١- ڤ: ڤرە، کڤە، کیڤ.
٢٢- ق: قاقڕ (عەردی خراپ)، قاقز، لەق، قوینە (تەمەڵو بێ خێر).
٢٣- ك: کەمچەك (کەوچك)، چاکردنەوە، ڕك، کرك (دەنگ) کویتاڵ.
٢٤- گ: گەندە، گاشە، گورگ.
٢٥- ل: لاڵ، کللك، پەل.
٢٦- ڵ:؟ گەواڵە، گڵ.
٢٧- م: میمك، مامر، نەرم، کرم، درم.
٢٨- ن: نەردەوان، دانان، نان، چان (لە جیاتی جەنجەرە لە دارو پوش دروستدەکرێ).
٢٩- هـ: هەردە، هەراش، مەهانە؟.
لێرەدا دەردەکەوێت کە (٢٨) دەنگ بە بزوێن و نەبزوێنەوە لە زاری شوانی سەر بە کۆمەڵە زاری کوردی باشووری زمانی کوردی هەیە، واتە (٩) بزوێن و (٣٨) نەبزوێن بە هەردوو نیمچە بزوێنی (و، ی)یەوە.
دەنگەکانی ئەم زارە هەندێکیان لە سەرەتاو ناوەڕاستو کۆتایی وشەوە دێن هی تریان هەیە تەنها لە سەرەتاو کۆتاییەوە دێن هەیانە لە ناوەڕاستو کۆتاییەوە دێن.
تێبینی دەربارەی دەنگی (و) لە سەرەتاو کۆتایی وشەوە دێت وەکو: ئارد، ئەز، ئێمە، لەناوەڕاستەوە نایەت ئەمەش تایبەتێتییەکی ئەم دەنگەی زمانی کوردییە، لە کۆتاییەوە وەکو: نەو.
دەنگی (و) فۆنیمە [20].
وەك: ئەو، شەو، نەو.
نەو ــ نەو
نەبزوێنی لێکدراو، لەناو نەبزوێنەکانی زمانی کوردیو زاری شوان یەك دوو دەنگی نەبزوێنی وەکو (نگ، ڵ) هەیە وەکو یەك دەنگ دەردەبڕێن و لە دەنگێك دەچن، نموونە: دەنگ، ڕەنگ، Dej rej چنگ Cij
دەنگی نیمچە بزوێنی (و) لەم زارەدا ئەگەر بکەوێتە دوای بزوێنەوە لە هەندێك وشەدا بەزۆری دەگۆڕێت بە دەنگی (ف) وەکو:
مزگەوت ــ مزگەفت ــ حەوت ــ حەفت، چەوت ــ چەفت
بزوێنی دوانە (بزوێنە لێکدراوەکان)
مەبەست لەو بزوێنانەن کە لە دەربڕیندا پێکەوە دێن و

کەرت ناکرێتو ناپچڕێتو پێکەوە هەردووکیان ئاوازێك پێکدەهێنن لە دەربڕیندا. وەك:-
١- ا و: دەستاو، تالاو، شالاو، پاراو.
داو، باو، راو، خاو، قاو، جاو، ناو [٢١].
٢- ە و: کەو، رەو، شەو، حەو.
٣- و ی: خوین، شوین، (شیوەن، جوین (جون - پۆل)، هەنگوین، شوی، ئەسکوی (ئەسکوی چێشت تێکردن).
٤- و ێ: وێران، شوێن، نوێژ.
٥- ە ی: دەی، کەی، حەی، وەی، سەی، (وەکو بلێی سەیری وانییە، پێدەچێ کورتکراوەی سەیر بێت).
٦- و ێ: هۆی، دۆیها.
٧- ا ی: ئای، های، چای، وای.
لە فەرهەنگی زمانەوانیو سەرچاوە دەنگناسییەکاندا (فۆنۆلۆجی) بزوێنی دووانە (diphthong)، بەم جۆرە پێناسە کراوە: دەنگێکە لە دوو دەنگی بزوێنی سادە یالە بزوێنێکی سادەو نیمچە بزوێنێك لە یەکەیەك بەدوای یەکدا هاتوون وەکو لە زمانی ئینگلیزی: /aw لە وشەی /cow لە/ow لە/uw/boat لە iy/boot لە/ey/seat، bait بزوێنی دوولا ئەشیٚ نزم بێت یا بەرز بێت [٢٢].

* دەنگە ئەلۆفۆنە دارەکان

لە شێوەزاری شواندا هەروەك لە زمانی نووسیندا، هەندێك دەنگ لە ئەنجامی کاری دەنگی دەوروبەرو نزیکیەوە، چۆنیەتی دەربڕینی دەگۆڕێت بێ ئەوەی کار لە گۆڕینی واتای وشەکە بکات، ئەمەش پێی دەوترێت هاودەنگی ئەلۆفۆن، وەك:-
دەنگی (ك) گەر لە دوایەوە دەنگی (ی، ێ، وی، وێ) دەگۆڕێت بەلام لە نووسینی کوردی بە ئەلفو بێی عارەبی دەرناکەوێت، بەلام لێرەدا هێمای (ك) بۆ شێوەی گۆڕانەکە لە نووسیندا دیاری دەکەین، تا بتوانین جیاوازی لەنێوان دەنگی (ك)و (ك) دووەمیان ئەلۆفۆنی یەکەمە بکەین، نموونە:
کا ـــ ك
کی ـــ ك ئەلۆفۆنی دەنگی یەکەمە
کە (ك)ە.
کوێر ك
گوێ گ هەردووکیان ئەلۆفۆنی هەردوو دەنگی (ك) و (گ) ن.
ه هەرد خ داخ، داغ
ع عەرد غ خەم، غەم
ئەو دەنگانەی کە لەم زارەدا ئەلۆفۆن پەیدا دەکەن ئەمانەن:
ك، گ، ه، ع، غ، خ.
دەنگە گۆڕکێ لەم زارەدا
دەنگە گۆڕکێ دیاردەیەکی ئاساییو هەستپێکراوە لە زمانەوانیدا، بەهۆی کردەی ئاخاوتنەو روودەداتو هەست پێدەکرێت. دەنگە گۆڕکێ جۆری جیاوازی هەیە وەکو لێکچوون، گۆڕین، گونجان، بێجگە لە گۆڕینی دەنگو بە دەنگی تر لە زارە جیاوازەکانی زمانی کوردیو لەم زارەشدا بەهۆی بوونی هەندێك دەنگو نەبوونییەوە روودەدات.

لێکچوونی دەنگ لە دەنگێکی تر کە سازگەیان نزیك یەکتر بنو شوێنی یەکتر دەگرنەوە بەبێ ئەوەی کار لە گۆڕینی وتای وشە بکەن ئەمەش هەر گۆڕانی دەنگییە، نموونە:
ێ ـــ ا: مێ پاـــ پێ نێزانم ـــ نازانم.
ن ـــ م: بەرامبەر ـــ بەرانبەر (م ـ ن)، کەرامباوگاوك ـــ کەرانباوگاوك.
ف ـــ و حەفت، مزگەفت ـــ حەوت، مزگەوت (ف ـ و)
ێ ـــ ی: پارشیم، نیم ـــ پارشێو، نیو (م ـ و).
م ـ و: کەمچك ـ کەوچك
ح ـ ه: حەرەکە ـ هەرەکە، حەق ـ هەق
ئ ـ ع: ئاسمان ـــ عاسمان.
گۆڕینی دەنگ لە دەنگی تر بەهۆی قورسایی دەربڕینەوە، لە ئەنجامی کۆبوونەوەی دوو دەنگی وەکو یەك لە وشەیەکدا یەکێکیان دەگۆڕێت، نموونە:-
پاش شێو ـــ پارشێو لەم زارەدا بەمجۆرەیە.
پاش شیم ـ پارشیم: گۆڕینی (ش)ی یەکەم بۆ (ر) لە ئەنجامی کۆبوونەوەی هەردو دەنگی (ش) کە قورسە لە سەر زار.
زستان ـــ جستان لە ئەنجامی کۆبوونەوەی دوو دەنگی نزیك لە یەکتر وەکو (ز) و(س).
یەگکرتنی دەنگ: کۆبوونەوە دوو دەنگی وەکو بەدوای یەکدا کە هەمان دەنگەن لەبەر ئەوەی هەمان شێوەو هەمان دەربڕینی هەیە دەبن بە یەك وەکو: پاککردنەوە ـــ پاکردنەوە.
تێچوونی دەنگ لە ئەنجامی هاتنی هەمان دەنگ لە شوێنێکی تری وشەکەدا بەهۆی قورسایی دەربڕینەوە دووەمیان تێدەچێت وەکو دار بەدەم ـ لە (دار بەردەم)ەوە هاتووە، ناوی شوێنە.
پەیدابوونی دەنگ لە زاری شواند لەنێوان دوو نزیك یەکتر وەکو دەنگی ئاوازەدار (voiced)و دەنگێکی کپ (-voice less) بۆ ئاسانی دەربڕین وەکو (م) لەنێوان (ز)و (س) لە وشەی زستان دەبێتە زمستان: زستان ـــ زمستان.
گۆڕینی دەنگ بە دەنگی تر بەهۆی کپیو ئاوازەدارییەوە، دەنگی کپ لە بەرانبەر ئاوازەداردا تێدەچێت: پێشمەرگە ـــ پێژمەرگە.
دەستگر ـــ دەزگر
دەستگیران ـــ دەزگیران
دەسبێن ـــ دەزبێن (شوان کە دەخەوێت پەتێك دەکاتە مل مەرێك بۆ ئاگاهێنانەوەی لە مەترسی گورگ).

یا تێچوونی دەنگی ئاوازەدار لە بەرانبەر دەنگی کپدا وەکو تێچوونی دەنگی (د) لە بەرانبەر دەنگی کپی (ك): سارکردنەوە ـ ساردکردنەوە.
گۆڕینی دەنگ لە سەرەتای وشەوە بە دەنگی تر بێ گۆڕانی واتا:
ئاور ـ هاور
عەرد ـ هەرد.
ورچ ـ هورچ، حورچ (بە شوانی دەڵێن: ویشی حورچ یا ورچ بن حەلەقە، ئەوەندە حێلە).

*** پەراوێزکان:-**

**١- هەرێمی فارس بریتییە لە: کازرون، فەسا، دارای، نەیریز، ئیستەهبانات، لار، بوشەهر، شیراز، جەهروم، فەیروز ئاباد، هەرێمێکی گەورەیەو شاری شیراز ناوەندێتی، بڕوان: موحەممەد جەمیل ڕۆژبەیانی، هەرێمی شوانکارەی کورد لە هەرێمی فارس و ئیسفەهان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەرگی ٨، بەغدا، ١٩٨١، ل ١٦١ -١٩٨.**

**٢- موحەممەد جەمیل ڕۆژبەیانی، هەمان سەرچاوە، ل١٦٠.**

**٣- هەمان سەرچاوە.**

**٤- حەمیدی ئیزەد پەناه، فەرهەنگی لەك و لوڕ، بەغدا، ١٩٧٨، ل ٢٠.**

**٥- محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، بە بالآی تەئریخی جافا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١٣٧)، بەغدا، ١٩٩٦، ل ١٤- ١٧.**

**٦- د. رفیق شوانی، چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی، ل٦٦.**

**٧- د. محمد علی الخولی، معجم علم اللغە النظري، ل٧٣.**

**٨- د. رمزی منیر بعلبگی، معجم المصگلحات اللغویە، انگلیزی - عربی، لبنان، ١٩٩٠، ل ١٤.**

**٩- د. ڕەفیق شوانی، گۆڤاری هاواری کەرکوك، ژ (٤)، ل ٣٥- ٤٧.**

**١٠- جمعە خورشید، الاگلسی الشامل، گ١، بغداد، ١٩٨٧، ص ٦٢.**

**١١- دکتور غلام حسین کریمی دوستان، کردی ایلامی، بروسی گویشی بدره، سنندج، دانشگاه کردستان، ١٣٨٠، ل ١٦٦.**

**١٢- عەباس جەلیلیان، فەرهەنگی باشوور، کوردی - فارسی - هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٥٧٦.**

**١٣- دێی وا هەیە لە شێوەزاری (شوان وینم) بەکاردەهێنن وەکو دێی سمایل بەگی، ئەمە لەلای بەساڵاچووەکانیاندا.**

**١٤- د. ڕەفیق شوانی، ٢٠٠١، ل ١٨٦.**

**١٥- دەنگناسی: فۆنۆلۆجی، دەنگسازی: بۆ فۆنەتیك بەکارهێنانیان گونجاوە.**

**١٦- د. ڕەفیق شوانی، چەند بابەتێکی ڕێزمان و زمانی کوردی، ل ٢٨٤ - ٢٨٥.**

**١٧- شۆك: جۆرە نەخۆشییەکە لە گەنم و دەغڵ و دان و دەدات لە بەهاری زۆر باراندا ڕەنگی ڕەشە.**

**١٨- زوی: لە هەندێك شوێنی ناوچەکەدا (زی)یش بەکاردێت وەکو هێشتا زییە، ئێستا بەکارنایەت.**

**١٩- د. ڕەفیق شوانی، چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی، ل ٢٨٧.**

**٢٠- د. ڕەفیق شوانی، (و) هەمزە دەنگ و فۆنیمە لە زمانی کوردیدا، پاشکۆی عێراقی ڕۆشنبیری، ژمارە (٣٤٣)، ١٩٩٥**

**٢١- قاو: لە جیاتی چەرخ بابەتێك بەکاردێت بەهۆی ئەستێ و بەردەوە دەخرێتە نێوانیانەوەو بە لێکدانی ئەستێ و بەردەکە قاوەکە کە لە دار زۆر وشك بەکاردێت دەسوتێت و جگەرەی پێ دادەگیرسێنن.**

**٢٢- د. محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري، ل ٧٥.**

***ووشە و دەستەواژەی تایبەت بە دەڤەری کەرکوک:-**

**گەلێك ووشەی جۆراوجۆر هەیە کە لە نێو کەرکوکدا ناوبانگی خۆی هەیە و هەموو نەتەوەو پێکهاتەکانی کەرکوك بە کاری دەهێنن، هەریەکەی مەغزا و توانای خۆی هەیە لە دەربریندا کە بەشێکی تایبەتمەندی دەڤەرەکە و ئەو زاراوانەی کە لەو ناوچانەدا هەیە دەوریان بۆ پێگەیشتن و داڕشتنی بێژەت کردنی زار و زاراوەکان.**

**ئەو ووشانەی لەم دەڤەرەی کەرکوکدا هەیە، بەتایبەتی لەنێو کەرکوك خۆیدا، تایبەتمەندی ئەو ئاو و هەواو ژینگەیە کە کەسەکان لە ژیانی رۆژانەدا مامەڵەی پێوە دەکەن لەنێو بازار، باری ئابووری، پەیوەندی کۆمەڵایەتی، خۆشی، ناخۆشی، گۆکردنی هەڵسووکەوتەکان.**

**ئەگەر سەیری ئەم ووشانە بکەین دەبینین، کە هەڵگری گەلێك دەرهاویشتەی مێژووین کە توانیوویێتی بەو شێوەیە دابتاشرێت کە تایبەتمەندی ئەو شوێنە لە خۆی بگرێت.**

**تێکەڵکێشی ووشە و زاراوەی کوردی و تورکمانی لە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی رۆژانەدا دەوری سەرەکی هەیە لە پێگەیاندنی یان دروست بوونی ئەو ووشانەدا.**

**١- مسکی . لیمۆ**
**٢- جەردام . ئاوی وەستاو**
**٣- بتوینی . یەکپارچەیی**
**٤- چاو متکن . جۆرێکە لە گاڵتەکردن، چاوێ بچێتە قووڵا.**
**٥- دەم هەپك . دەم و قەپۆز ناشرین، هەپك ئەو دارەیە بۆ تەون بەکاردەهێنرێت.**
**٦- تۆخماغ . کووتەکی سەر خڕ**
**٧- تاوێر . تاشەبەردی گەورە**
**٨- حوحانێ . ئەو یارییەی منداڵان لە چیچکانێ دادەنیشن.**
**٩- دوێر و خەزنە . دوو ژوور بەرامبەر یەکتری**
**١٠- کوسکی . شیشێکی گەورە، وەکو شیش وایە**
**١١- سەرما زوو . سەرخڕ**
**١٢- ئاش . چێشت**
**١٣- جاجك . بنێشت**
**١٤- قۆندەرە . پێڵاو**
**١٥- مامر . مریشك**
**١٦- قایم . پتەو**
**١٧- دگان . ددان**
**١٨- یاپراغ . دۆڵمە**
**١٩- یارکۆکی . گێزەر**
**٢٠- قورباقە . بۆق**
**٢١- دومبەڵەك . تەپڵ**
**٢٢- قات**
**٢٣- قاقووشی . کۆلارە**
**٢٤- تاشە بەرد . بەردی گەورە**
**٢٥- تورشی - شلە**
**٢٦- خەنینەوە - پێکەنین**
**٢٧- حەمام لش . یەکێك کە خۆی شۆردبێ تا سەرمای نەبێت**
**٢٨- خەوتن . نووستن**
**٢٩- چاووش . گۆرانی بێژی میللی**
**٣٠- قل . دانە**
**٣١- ئاغارتمە - گەچکاری**
**٣٢- هەرە - منشار**
**٣٣- قاپی . دەرگا**
**٣٤- دەلاقە . دەروازە**
**٣٥- بیبسوو .**
**٣٦- قایە . بەرد**
**٣٧. نوورە . گەچی قایم . پتەو**
**٣٨- تووك . موو**
**٣٩- حەبل، پەت . گوریس**
**٤٠- زریزە . زنجیر**
**٤١- قاپ . دەفری**
**٤٢- رووخسەت . مۆڵەت**
**٤٣- سەتڵ - پەقرەج**
**٤٤- جەبەڵ . چیا . جەوەڵ**
**٤٥- قاپ قاپ . جۆرە پێڵاوێکە لە دار دروست ئەکرێت.**
**٤٦- موختاتە . قەڵەم دادەر**
**٤٧- سوورگی . لاستیکی سڕینەوە**
**٤٨- هەراش - گەورە**
**٤٩- هەرتوومان . هەرزن**
**٥٠- قەوزە**
**٥١-توولە تووتکە سەگ**
**٥٢- سە . سەگ**
**٥٣- قەڵەم . پێنووس**
**٥٤- دیشلەمە . شەکری کلۆ**
**٥٥- دەفتەر . پەراو**
**٥٦- لۆقەندان . تاقی هەڵگرتنی شیرەمەنی لە نێو ماڵاندا**
**٥٧- شلکێن . خەت خەتێن**
**٥٨- توورش . مزر یا ترش**
**٥٩- تفت . توون**
**٦٠- رەسم . وێنە**
**٦١- شۆر . سوێر**
**٦٢- گەرۆل . بەرەلا**
**٦٣. شیشڵدان . میزڵدان**
**٦٤. تاس . جام، دەفری ئاو خواردنەوە**
**٦٥- پەقرەج . دەفری گەورە**
**٦٦- قەڵماسنگ . بەردەقانی**
**٦٧- تەختە . دار**
**٦٨- قەبر . گۆڕ**
**٦٩- قەبرسان . گۆڕستان**
**٧٠- خاووخلیچك . شلووشاو، بێ هێز**
**٧١- فێڵباز . تەڵەکە باز**
**٧٢- قاچ . پێ**
**٧٣- تۆلانسیك . مەچەك**
**٧٤- هالیگە . قەبرغە**

٧٥- بەخت . چانس
٧٦- حەمام - گەرماو
٧٧- سەقەت . چەوت
٧٨- قاشقاشێن - کوسکوسێنە
٧٩- خشپش - دەستبازی
٨٠- حەلیماو - چێشتێك ئاوی دابێتەوە
٨١- قزڵ - نەرمە گۆشت
٨٢- قوتیلە - چرادان
٨٣- کاگێر، کاجیر - چەناگە
٨٤- پرچ - قژ
٨٥- گوپ -
٨٦- قایە - بەرد
٨٧- زیخ - چەو
٨٨- تیرە - بەکرە
٨٩- قوم - لم
٩٠- کوسکی - باڵتە
٩١- نوخان - نینۆك
٩٢- قازمە - پاچ.
٩٣- خاکەناز - بێڵ
٩٤- بووخ - هەڵم
٩٥- سەلام قووچ - چەرخو فەلەك
٩٦- تەرە توورە - تەرەتیزە
٩٧- قازان - مەنجەڵ
٩٨- تەختە - دار
٩٩- رۆڵە - باگردێن
١٠٠- چنگاڵ - چەتەڵ
١٠١- ناوکە - گولەبەرۆژە
١٠٢- قەلەموون - عەلەشیش
١٠٣- بەز - دونگ
١٠٤- بەفر - سەهۆڵ
١٠٥- ئالوبالو - ئالوو
١٠٦- تۆپێن - تۆپان
١٠٧- میمك - پوور
١٠٨- شەعەر بەنات - پەشمەك
١٠٩- سازك - ترخێنە
١١٠- نەجار - دارتاش
١١١- قەڵماسنگ - قوچەقانی
١١٢- قورباقە - بۆق
١١٣- قوشمە، خەلاس بەخەلاس - راوێن راوێن
١١٤- خاس - کاهوو
١١٥- زام - برین
١١٦- تیکە - پاروو
١١٧- شامداری - گەنمە شامی
١١٨- ئەژاژك - باوێشك
١١٩- تاتە - خوشکی گەورە
١٢٠- دادە - خوشکی گەورە
١٢١- قاقر - زەوی خراپ
١٢٢- عەرد - زەوی

١٢٣- قول - قاچ
١٢٤- زگ - سك
١٢٥- چامرلغ - پاشکر - خۆبەستنەوە بە یەکێکەوە.
١٢٦- منجر - فرە وێژەیی، دەمدرێژ.
١٢٧- حونەر - سەرسوورمان لە شتێك.
١٢٨- قالدرمە - پەیژە.
١٢٩- شرینقە لێدان- دەرزی لێدان.
١٣٠- گزگل - کورت و خرە و بچووك.
١٣١- کەرەتێکی تر - کاتێکی تر
١٣٢- لێ نەبان کردن - غەشیم خۆگێل کردن
١٣٣- مەرزیب - ئاوەرۆ
١٣٤- ملەقووتێ - سەرەتاتکێ
١٣٥- دەگە - گورز، تاتۆ
١٣٦- شفرە - گوێزان
١٣٧- زۆج - بێ ئاگا، کاڵ فام
١٣٨- تەحین - راشی
١٣٩- دەورە - خوول
١٤٠- وایەرمەن - کارەباچی سەیارە
١٤١- قمقمۆك - مارمێلکە
١٤٢- ئەشرەفی - گوڵەباخ
١٤٣- مەزادخانە - کۆنەفرۆشی
١٤٤- فاق - جلگرە
١٤٥- شەقاوە - گوندە
١٤٦- خاوە - سەرانە
١٤٧- فگور - گەلۆر
١٤٨- قاپووت - پاڵتۆ
١٤٩- نەگبەت - بەدبەخت
١٥٠- قایش - پشتێن
١٥١- سندانە - ئینجانە
١٥٢- جەعدا - شەقام
١٥٣- یاریچی - یاریزان
١٥٤- لە حەولی - لە هەولی
١٥٥- تۆپزی - بە زۆر
١٥٦- حەولودەولیان بوو - هەوڵ و تەقەللا
١٥٧- شاتەشات - هاتووهاوار
١٥٨- قرساندن - دەیقرسێنی
١٥٩- نەردەوان - پلیکانە
١٦٠- مکور - پێداگری
١٦١- هەرتك - راستەوخۆ
١٦٢- هەلا هەلا - لەت لەت
١٦٣- هەرا - ئاژاوە و دەنگە دەنگ
١٦٤- ئارمان - ئامانج
١٦٥- هەپنێ - کاتێك
١٦٦- هەڵقۆر - خۆ هەڵقورتاندن
١٦٧- کورکە کورك - نووزە نووز
١٦٨- بەزای - هاوتەمەنی
١٦٩- تازێ - پرسە
١٧٠- دەغیە زل - روح زل

١٧١- عەرد - زەوی
١٧٢- بەیداغ - ئاڵا
١٧٣- لەبز - لێو
١٧٤- بابوج - جۆرە پێڵاوێکە لە دار دروستدەکرێت
١٧٥- ئیرح - حرس
١٧٦- چاوقرپان - چاو نوقاندن
١٧٧- قەپات-بەیەکێك دەوترێت کە خاوەن زۆر شت بێت
١٧٨- قەپات - داخستن
١٧٩- قاش - لەت
١٨٠- دێوەرە - عارەبانەی گەرۆك
١٨١- روخسەت - ئیزن
١٨٢- عەزێ - کراس
١٨٣- حەڵوا -خواردنێکە لە تەحین و دۆشا دروست دەکرێت
١٨٤- وێر گوڵ - هێمای فاریزە لە نووسیندا
١٨٥- قەڵس - توورە
١٨٦- سەغڵەت - نائارام
١٨٧- ئیزن وەرگرتن - مۆڵەت پێدان
١٨٨- حەمکە - هەموو

# پێرست

## * پێرست ئەدەب و رۆشنبیری لە دەڤەری کەرکوك

تاکو ئێستاکە هیچ بەڵگەیەکی شوێنەواری ئەوتۆ نەدۆزراوەتەوە ئەو ڕاستییە یەکلا بکاتەوە یاخود تاوتوێی ئەو بوارە بکات کە باس لە چۆنییەتی زمانی ئەو نەتەوانەی سەردەمی چاخە بەردینەکان بخاتەڕوو، بەڵام ڕێی تێناچێت کە خاوەنی ئەو شارستانیانە زمانێکیان نەبووبێت تاوتوێی کارەکانی ڕۆژانەیانی پێ کردبێت، یان بە بارێکی تردا بڵێین ئەو ئاوازە دەنگییەو جووڵەیە چی بووە هەموویانی پێکەوە گرێ داوەو ئاخافتنیان پێی کردبێت. گۆڕانکاری چاخە بەردینەکان هەنگاو بە هەنگاو ئەو ڕاستییەی یەکلا کردووەتەوە کە بتوانێت پێشکەوتن لە هەموو بوارەکاندا بەدەس بهێنێت کە پێشکەوتنی زمانو گۆکردنی دەوری هەبووە لەبەرەو پێشچوونی بنەماکانی لێکگەیشتن.

دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە
2023